# تەفسیری ڕەوان

﴿بۆ تێگەیشتنی قورئان﴾

نوسینی:

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی ﴿سێیەم﴾

جزمی ﴿٧، ٨، ٩﴾

بسم الله الرحمن الرحيم


* ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان
* نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی
* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
* ژمارەی سپاردن: ﴿٢١٤٠﴾ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.
* چاپو دیزاین: ﴿سامان محمد أمین﴾.

## پەیوەندی جوولەکەو نەصرانیەکان بە موسوڵمانانو دوژمنایەتی جوولەکەو بڕواهێنانی کەشیشو ڕەبەنەکان

﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانًا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ (٨٢) وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ (٨٣) وَمَا لَنَا لَا نُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡحَقِّ وَنَطۡمَعُ أَن يُدۡخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلصَّٰلِحِينَ (٨٤) فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (٨٥) وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ (٨٦) ﴾.

پاش ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا؛ حاڵو چۆنیەتی ئەهلی کیتابی بەیان کردوو ریسوایی‌و عەیب‌و عاریانی دەرخست، پوچەڵی‌و بێ بناغەیی بیروباوەڕی جوولەکەکانی دیاری کرد، هەروەها بیروباوەڕی گەندەڵو بێ بناغەی مەسیحیەکانی (سێ خودایی‌و عیسا خودایی....) روون کردەوە، ئەمجار دەست دەکا بە دیاری کردنی هەڵوێستیان لەبارەی دۆستایەتی‌و دژایەتی کردنیان بۆ موسوڵمانان، ئەوەش دەخاتە ڕوو؛ کە جوولەکەکان ئەو پەڕی دژایەتییان هەیە بۆ موسوڵمانان، لەم ڕووەوە لەئاستی کافرەکاندان، بەقەدەر ئەوان رقیان لە موسوڵمانانە، بەڵکوو لەوانیش زیاتر رقیان لێیانە؛ بۆیە لە ئایەتەکەدا جوولەکەکان پێش موشریکەکان خراون.

ئیبنو مەردەویهی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: لەهەر شوێنێك جوولەکەیەك موسوڵمانێکی بۆ هەڵبکەوێ هەوڵی تیرۆرکردنی دەدا، ئەوەتا قورئانیش ئەوە دوپات دەکاتەوە کە: نەصرانیەکان بەرامبەر موسوڵمانان لە جوولەکەکان نەرمترن‌و لە ڕووی خۆشەویستیەوە بۆ موسوڵمانان لە جوولەکەکان نزیکترن!

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً......﴾ چەند رایەك هەیە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە سەعیدی کوڕی موسەییب‌و ئەبو بەکری کوڕی (عبدالرحمن)و عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ریوایەت دەکا؛ کە گوتوویانە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمەری نارد بۆ حەبەشەو نامەیەکیشی پێدا نارد بۆ نەجاشی‌و کاغەزەکەی پێغەمبەری پێدا: ئەویش خوێندییەوە، ئەمجار بانگی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب‌و هاوەڵانی - کە لەگەڵیا بوون - کردو، ناردی بە دوای قەشەو راهیبەکانداو کۆی کردنەوە، پاشان داوای لە جەعفەر کرد کە: سورەتی (مەریەم)یان بەسەردا بخوێنێ، کە بۆی خوێندن ئیمانیان بە قورئان هێناو موسوڵمان بوون. هەموو چاویان پڕ بوو لە فرمێسكو

هۆن هۆن ئاو لە چاویان دەڕژایە خوارێ، ئەو کۆمەڵە ئەوانەن کە خوا دەربارەیان ئایەتی ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً﴾ تا دەگاتە ﴿ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ی ناردۆتە خوارێ. دووبارە ئیبنو ئەبی حاتەم لە سەعیدی جوبەیرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: نەجاشی سێ کەسی لە پیاو چاکو هاوەڵانی خۆی نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەویش تەشریفی سورەتی (یس)ی بەسەرا خوێندن، هەموو دەستیان کرد بە گریانو وتیان: ئای ئەمە چەند لەوە دەچێ کە بۆ عیسا نێردراوەتە خوارێ!! ئیتر ئەو ئایەتە دەربارەی ئەوان هاتۆتە خوارێ!

نەسائی لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئایەتی ﴿وَإِذَا سَمِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ...﴾ دەربارەی نەجاشیو هاوەڵانی هاتۆتە خوارێ. طەبەرانی لە ئیبنو عەبباسەوە هەمان ڕا دەگێڕێتەوە. طەبەری دەڵێ: قسەی ڕاست ئەوەیە کە: خودای مەزن ستایشی گرۆهێکی کردووە کە گوتوویانە ئێمە نەصرانین، پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) بە نزیکترین گرۆهی بۆ موسوڵمانان حلێب کردوونو ناوی بردوون، دەگونجێ مەبەست بەو گرۆهە هاوەڵانی نەجاشی بێت، دەشگونجێ مەبەست گەلو نەتەوەیەك بێت لەسەر ئایینی عیسا بووبن، بانگەوازی پێغەمبەری ئیسلامیان پێ گەیشتبێو کە گوێیان لە قورئان بووبێ بۆیان دەرکەوتبێ کە ئەو ئاینە ئایینێکی حەقو ڕاستەو ئەوانیش لووتبەرزیان نەنواندبێو موسوڵمان بووبن!!

﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ سوێند بێ ئەی فروستادە! ئەتۆ دەستت دەکەوێ دژوارترین خەڵك لەبارەی دوژمنایەتی کردنیان بۆ موسوڵمانان جوولەکەو ئەوانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن، سەرڕەقترین دوژمن بۆ موسوڵمانانی سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئان جوولەکەکان بوون، چونکە کوفرو خوانەناسی ئەوان کوفری ڕقەبەریو ئینکاری کردنو ژێرخستنی حەقە، بەڵکوو دوژمنایەتیەکەیان لە دوژمنایەتی موشریکەکانیش قوڵترە، چونکە لە ئایەتەکەدا جوولەکە پێش موشریکەکان خراون، هەر لەبەر زێدەڕەوییان لە دوژمنایەتی

کردنـی خواناسـاندا، چـەند پێغەمبـەریان کوشـتوون، تەنانـەت چـەند جـار هـەوڵو تەقـەڵلایان دا پێغەمبـەری ئیـسلامیش تـیرۆر بکـەن، ژەهریـان بـۆ کـردە نـاو خواردنـەوە، سـیحرو جادوویـان لێ کـرد، دەنەدەنـەی موشریکەکانیـشیان دەدا کـە لەشکرکێشی بکەنـە سـەر موسـوڵمانان، ئـەمجار لـە پلـەی دووەمـدا بـۆ دوژمنایـەتی کردنی موسوڵمانان موشـریکە بتپەرسـتەکانن، چـونکە ئـەوانیش حەقیقـەتی ئـایین نازانن، خودای تاكو تەنیا ناناسن، جوولەکەو موشریکەکان دەشوبهێنە یـەکتری لـە کوفرو سەرڕەقیو یاخی بوون لە خوداو ژیان خۆشەویستیو خۆویستیدا، هـەروەها لە کـەم سـۆزیو بـێ ڕەحمیـدا، لـە دەمـارگیریو ڕەگەزپەرسـتیدا، بـەڵام عەرەبـەکان کـەمێ لـە جوولەکـەکان دڵنـەرمتر بـوون، سـەخی تەبیعـەتو میـوان نـەوازە بـوون، بەهێزترین زیانو بەرەبەرکانێ کە تووشی بانگەوازیی ئیسلام بـوو لەخـەڵکی نیـوە دورگەی عەرەبییەوە بوو، بە تایبـەتی دانیـشتوانی مەککەو طائیفو دەوروبـەریان ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى﴾ سوێند بـی ئـەتۆ دەسـتت دەکەوێ نزیکترین گرۆهی ئادەمیزاد لەبارەی خۆشەویستیەوە بۆ موسوڵمانان تاقمو کۆمەڵێك کە دەڵێن: ئێمە نەصرانین.

بێگومـان پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) باشـترین یارمـەتی لـە مەسـیحییەکانی حەبەشـە دەبینـێ، زۆر بـە ڕێکـوپێکی پـەنای کۆچـەرە موسوڵمانەکانیاندا، ئـەو موسـوڵمانانەی کـە پێغەمبـەر لەسـەرەتای پەیـدا بـوونی ئایینی ئیسلامدا ناردنی بۆ حەبەشە لە ترسی ئـەوەی نـەوەکوو کافرەکانی مەککە زیانیان پێ بگەیەنن.

هەروەها پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسـەر بێ) چـەند نامەیـەکی نـارد بـۆ لای پاشاو مەلیکی گەلو نەتـەوەکانی ئـەو سـەردەمە، وڵامـی مەسـیحیەکان لـە هـەموو ئەوانی تر جوانتر بوو، هیرقەل ڕۆم لـە شـام، کـە نامەکـەی پـێ گـەیی هـەوڵیدا کـە گەلەکەی موسوڵمان ببن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، چونکە گەلەکەی مێشك وشـكو کۆنەپەرست بـوون، ئـیتر بـە نامەیـەکی ڕێـزو ئـیحترام وڵامـی پێغەمبـەری دایـەوە.

موقەوقیس کە پاشای قیبطییەکان بوو لە میصر، ئەویش وڵامێکی زۆر جوانی دایەوە، لەگەڵ نامەکەشیدا دیارییەکی شیاوی نارد، پاشانیش کە وڵاتی میصر لەلایەن موسوڵمانەکانەوە رزگار کرا دانیشتوانی لە نزیکەوە هەڵس‌و کەوتی موسوڵمانانیان بینی خێرا ڕوویان کردە موسوڵمان بوون. قیبطییەکان لە هەموو کەس خێرا تر بوون بۆ موسوڵمان بوون.

ئەصحەمە (نەجاشی) پادشای حەبەشە لەگەڵ دارو دەستەکەیدا موسوڵمان بوون، کاتێکیش ئەصحەمە کۆچی دوایی کرد پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی مردووی لەسەر کرد بە غائیبی‌و خەفەتیشی بۆ خواردو تازیەی بۆ گرت.....

ئەمجار پەروەردگار هۆی دۆستایەتی‌و خۆشەویستی مەسیحییەکانی دەربارەی موسوڵمانان بۆ روون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ﴾ ئەو دڵنەرمی‌و خۆشەویستییەی مەسیحیەکان بەرامبەر موسوڵمانەکان ﴿بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە کە: ئەو مەسیحیانە زانایان تێدان، ﴿وَرُهْبَانًا﴾ خوداپەرست‌و تاعەتکەریان تێدان، کە هەمیشە بانگەوازی خەڵك دەکەن بۆ ڕەوشت بەرزی‌و خۆنەویستی‌و دونیا نەویستی ﴿وَأَنَّهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ ئەوان لە ئاستی حەقدا ملکەچ‌و فەرمانبەردارن، لە بیستنی حەق‌و ویژدان بەکارهێنان لووتبەرزی نانوێنن، هەمیشە ترسی خودایان لە دڵدا جێگیر بووە، بێ فیزو بێ دەعیەو تەکەبوورن، ملکەچی حەق‌و راستین، بەشێك لە فەضیلەی ئایینەکەیان بۆخۆ بەکەمزانین‌و فەرمانبەرداری‌و گەردنکەچییانە بۆ هەموو فەرمانڕەوایەك، بەڵکوو فەرمانیان پێ کراوە کە تەنانەت دوژمنیشیان خۆش بوێ، بە هیچ شێوەیەك شەڕەنگێزیان تێدا نەبێ، ئەگەر لە رووەتی راستیان دان خێرا لا رووەتی چەپیان بۆ ئامادە بکەن؛ هەموو ئەم رەوشت‌و بنەما ئایینەیان کاری کردۆتە سەر جەماوەری مەسیحی‌و بە ئاشتیخواز هاتوونەتە پێش چاو، بێگومان وا لە مەسیحییەکان گێڕدراوەتەوە کە بە خۆشی‌و ناخۆشی دەستەڵاتی سەپاو بەسەریاندا قبووڵ بێ، بە پێچەوانەی جوولەکەکان ئەوان ئەگەر بە ناچاری ڕەزامەندی خۆیان بەرامبەر شتێك دەرخست

له دڵداو به نهێنی جۆرەها فرتو فێڵو پیلان دەخەنە کار بۆ لێ رزگار بوونی، چونکه شەریعەتی جوولەکە هەمیشە لە دڵو مێشکی شوێنکەوتوانیدا تۆوی دەمارگیریو رەگەزپەرستیو چینایەتیو تایەفەگەری دەچێنێ، چونکه شەریعەتەکەیان تایبەتە بە ڕەگەزی نەتەوەی ئیسرائیلو ئەحکامەکانی لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە.

﴿وَإِذَا سَمِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ الْحَقِّ﴾ ئەوانەی کە دەڵێن: ئێمە مەسیحین کە گوێیان لەو قورئانە دەبێت کە بۆ پێغەمبەر نێردراوە، دەبینی چاویان پڕ دەبێت لە گریانو هۆن هۆن فرمێسك دەبارێنن بەهۆی ئەو حەقو ڕاستییەی کە قورئان بۆیان بەیان دەکاتو ئەوانیش ئەو حەقە دەزانن، لوتبەرزیو دەعیە زلی نابێتە لەمپەر لەبەردەم قبووڵ کردنی حەقدا، دەزانن کە محمد ئەو پێغەمبەرەیە کە لە ئینجیلدا مژگێنی بە هاتنی دراوە، ئەمجار بێ سێو دوو قبووڵی بانگەوازییەکە دەکەن ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ دەڵێن: خودایە! ئێمە ئیمانمان هێناوە بڕوامان بە پەیامی پێغەمبەرەکەت کرد، شوێن شەریعەتی (محمد) دەکەوین، لە گرۆهو تاقمی ئەوانە حلێبمان بکە، کە شایەدی دەدەن بە ڕاستی هاتنە خوارەوەی قورئان بۆسەر پێغەمبەر؛ شایەدی دەدەین کە خودا تاكو تەنیایە.

ئیبنو مەردەوەیهیو ئیبنو ئەبی حاتەمو حاکم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ﴿فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ واتە: لە ئوممەتی (محمد)مان حلێب بفەرموو، لە رۆژی قیامەتدا بمانکە بە شایەد بەسەر باقی گەلەکانی ترەوە چونکە بوون بە شایەد بەسەر باقی گەلەکانی ترەوە تایبەتمەندی ئوممەتی (محمد)ە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا – البقرة/١٤٣﴾.

داوا دەكەن خودا ئیمانەكەیان لێ قبووڵ بكا، لەگەڵ ئومەتی (محمد) بیان نووسێ، چونكە خودا ئومەتی (محمد)ی كردووە بە شایەد بەسەر خەڵكانی ترەوە، ئەوان لە كتێبی خۆیاندا بە ڕیوایەتو پشتاوپشت ئەوەیان پێ گەیشتبوو كە پێغەمبەری ئاخر زەمان ئایینی خودا تەواو دەكاو بە شەریعەتی ئەو شەریعەتی خودا تەواو دەبێ، شوێنكەوتوانی ئەو پێغەمبەرە دەبنە شایەدو بەڵگە بەسەر گەلو نەتەوەكانی تردا.

ئەمجار جەخت لەسەر وتەیەكی پێشوو دەكەنەوەو دەڵێن: ﴿وَمَا لَنَا لاَ نُؤْمِنُ بِاللّهِ وَمَا جَاءنَا مِنَ الْحَقِّ﴾ بۆچی چی لەمپەرێك هەیە بتوانێ ئێمە لە موسوڵمان بوون مەنع بكا؟ چ بەڵگەیەكمان بەدەستەوەیە بڕوا بە خودای تاكو تەنیا نەكەین؟ چ شتێك ئێمە لە شوێنكەوتنی ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارە دەگێڕێتەوە؟ چ شتێك هەیە ئێمە لە قبووڵكردنی ئەو نامە ئاسمانییە حەقە پەشیمان بكاتەوە؟ بە تایبەتی كە بۆمان دەركەوت ئەم پێغەمبەرە ئەو گیانە حەقەیە كە مەسیح موژدەی بە هاتنی داوە، وە نیشانەكانی دیاری كردووە!! ﴿وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبَّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ﴾ بەتەمای ئەوەین كە پەروەردگار بمانخاتە ڕیزی گرۆهی صالحو ڕاستانەوە ئەوانەی بە هۆی بیروباوەڕی ڕاستو دروستەوە، بەهۆی فەضیلەو ڕەوشتی جوانەوە دڵو دەروونیان سافو بێ گەرد بوون، ئەوانەی شوێنكەوتووی ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارەن؛ كە شوێن دەستباشیو ئاكار چاكیو لێهاتوویان لە لامان ئاشكرا بوو، بە چاوی خۆمان بینیمان چ ئاشوبو ئاژاوەیەك لەپێش هاتنی ئایینی ئیسلامدا بڵاوبووبووەوە موسوڵمانان چۆن جیهانیان هێمنو ئاسایش كردەوە.

بەكورتی هیچ لەمپەرێك نیە نەهێڵێ موسوڵمان ببین، دوای ئەوەی بەڵگەو نیشانەمان دەست كەوتو زانیمان ئەو ئایینە ئایینێكی حەقو خودا ویستە، مایەی خۆشبەختی هەردوو دنیایە.

ئەمجار پەروەردگار پاداشتی باشیان لەسەر ئەم هەڵوێستو بیروباوەڕیان دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَأَثَابَهُمُ اللّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا

وَذَلِكَ جَزَاء الْمُحْسِنِينَ﴾. خودا له پاساوى ئەو نيمانه پتەوميانداو داننانيان به حەق‌و راستيدا پاداشتى دانەوه به باشترين پاداش كه بريتييه له باخ‌و باخاتى بەهەشتى بەرين‌و بەرفراوان‌و رازاوه، ئەو بەهەشتەى كه بەژێر دارەكانيدا جۆگەلەو جۆبار دەكشێن‌و جوانى‌و رازاوەيى‌و پۆشتەو پەرداخى زياتر به باخەكان دەبەخشن، ئەوانه لەناو ئەو بەهەشتەدا بۆ هەتا هەتايه دەمێننەوه، ئەوه پاداشتى چاكەكارانه؛ ئەوانەى له شوێنكەوتنى حەق‌و راستيدا بەجوانى دێنەدەست‌و منجه منج ناكەن، لەهەر جێگايەك حەق ببينن شوێنى دەكەون، لەهەر كەسێكەوه حەق ببيستن گەردنكەچى دەبن.

پێويسته ئێمه دەربارەى خۆشى بەهەشت‌و چۆنيەتى ئەو لەزەت‌و خۆشيه له چوارچێوەى قورئانى پيرۆزو فەرموودەى صەحيحى پێغەمبەر (درووودى خواى لەسەر بێ) دەرنەچين، چونكه خۆشى گيان‌و رەزامەندى خودا نه بەئاخاوتن وەصف دەكرێ، نه دەتوانرێ به قسەى ئاسايى ئادەميزاد تەعبير لەو خۆشييه بدرێتەوه!! ئێمه له جيهانێكداين جوداوازه لەو دونيايه، چ له بارەى وەصف‌و چۆنيەتييەوه، چ لەبارەى تايبەتمەندييەوه، چەندێك ئێمه بەوەصف‌و ثەناى ئەو نيعمەتانەوه خەريك بين ئەو وەصفەى كه خودا دەربارەى خۆشى بەهەشت دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ – السجدة/١٧﴾. ناتوانين وەكوو پێويست تەعبيرى لێبدەينەوه. دوا بەدواى باس كردنى پاداشى باشى چاكەكاران، دێته سەر باسى خراپەكاران‌و دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ئەوانەى كافرن‌و ئايەتەكانى خودا به درۆ دەخەنەوه، ئينكارى تاك‌و تەنهايى خودا دەكەن‌و پێغەمبەرايەتى (محمد) رەت دەكەنەوه، ئايەتەكانى قورئان به درۆ دەخەنەوه ئەوانه دەبنه جەهەنەمى‌و تێيدا دەمێننەوەو لێى دەرناچن، له زمانى عەرەبيدا (جحيم) به ئاگرێك دەڵێن كه زۆر گەرم بێت.

## هەموو شتێکی پاكو خاوێن حەڵاڵو ڕەوایە بۆتان

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾.

وەكوو زانیمان ئەم سورەتە (سورة المائدة) بە فەرمان كردن بە پابەند بوون بە عەهدو پەیمان دەستی پێ كرا، ئەوەش بریتیە لە پابەندبوون بە سنوورەكانی خوداوە، ڕێزگرتن لە حەڵاڵو حەرام، خودا چی حەڵاڵ كردووە بە حەڵاڵی بزانی، چی حەرام كردووە خۆی لێ بپارێزی؛ ئەمجار فەرمانی كرد كە بە هیچ شێوەیەك شتێك خودا حەرامی كردبێ بە حەڵاڵی حسێب نەكەین وەكوو دەفەرموێ:

﴿لاَ تُحِلُّواْ شَعَآئِرَ اللّهِ﴾ لێرەدا ئەم ئایەتەی كە ئێستا دەست دەكەین بە ڕاڤە كردنی بە پێچەوانەوەیە، داوا دەكا شتێك خودا حەڵاڵی كردبێ بە حەرامی دانەنێن، هەروەها پاش ئەوەی یەزدان مەدحی مەسیحیەكانی كرد، بەوەی نزیكترین گرۆهو تاقمن بۆ موسوڵمانان لەبارەی خۆشەویستیو دۆستایەتییەوە هۆكارەكەشی بەوە هێنایەوە كە زانای ڕەبەنو دونیا نەویستیان تێدانو ئەوان كاریان تێ كردوونو ئاوا ڕەوشت بەرز بوون؛ وێ دەچێ موسوڵمانان وا تێ بگەن كە ئەمە هەڵتانی ئەوانە بۆ ڕەبەنیو دونیا نەویستی، ئەوەش بەخۆ گرتنەوە لە خواردنی خۆشو واز هێنان لە ئافرەتو لەبەر نەكردنی پۆشاكی ڕێكو پێكو خۆ جەڕە بابەدان، ئیتر بەم ئایەتە پەروەردگار ئەوەی لێ قەدەغە كردن كە وەك قسیسو ڕەبەنەكان بكەن كە ژن هێنانیان لە خۆ قەدەغە كردبوو، توخنی

خواردنی خۆش‌و خواردنەوەی بەتام نەدەکەوتن‌و خۆیان لە چلەخانەو دێرەکانـدا بەند کردبوو.

ئیبنو جەریری طەبەری‌و ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنو مەردەوەیهی لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی کۆمەڵێك لە ئاوەڵانی پێغەمبەر هاتۆتە خوارێ کە عوثمانی کوڕی مەظعوون یەکێك بوو لەوان. ئەو کۆمەڵە هاوەڵە وتیان: خۆمان دەخەسێنین، خۆشی‌و ئارەزووی دونیا واز لێ دێنین، وەکوو رەبەنەکان بەرگی دونیا نەویستی لەبەر دەکەین، دەبینە گەڕیدە؛ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە بەوەی زانی لە دووی ناردن‌و فەرمووی: زانیومە خەیاڵێکی واتان هەیە، وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَنَامُ، وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ فَمَنْ أخَذَ بِسُنَّتِي فَهو مِنِّي ومن لم يأخذْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي».

سوددی دەڵێ: ئەو کۆمەڵە هاوەڵە دە کەس بوون (عوثمانی کوڕی مەظعوون‌و عەلی کوڕی ئەبو طالیب)یان تێدابوون.

ئیبنو جەریرو ئیبنو مونذیرو (ئەبو شەیخ) ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری لە عیکریمەوە دەڵێن: عوثمانی کوڕی مەظعوون‌و عەلی کوڕی ئەبو طالیب‌و ئیبنو مەسعوود ئەلیقدادی کوڕی ئەلئەسوەدو (سالم) مەولای ئەبو حوذەیفەو قودامە، هەرکەسەیان لەماڵی خۆیاندا گۆشەگیر بوون‌و لە خێزانەکانیان دوورکەوتنەوەو پۆشاکی تەرکی دونیاییان پۆشی‌و خواردنی خۆش‌و بەتامیان واز لێ هێنا؛ جگە لەو جۆرە خواردن‌و پۆشاکەی کە گەریدە ئیسرائیلییەکان بۆ خۆیان دیاری کردبوو، ویستیتان خۆیان بخەسێنن، بڕیاریاندا شەو شەونوێژ بکەن‌و بەڕۆژ بەرۆژووبن، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ﴾. ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! شت لەخۆتان حەرام مەکەن‌و خواردنی خۆشی حەڵاڵ‌و هەرشتێك حەڵاڵ بێ‌و لەززەتی تێدابێ‌و بەبێ فەرمانی

شەرع لەخۆتانی قەدەغە مەکەن؛ بەم جۆرە بە مەبەستی خودا پەرستیو خودا لەخۆ رازی کردن ئەو شتە حەڵاڵانە لەخۆتان قەدەغە مەکەن، سنوور بەزێنی مەکەن؛ ئەو شتانەی بۆتان حەڵاڵ کراوە مەچن لەخۆتانی حەرام بکەن، هەروەها زێدەڕەویش مەکەن لە بەکارهێنانی شتی حەڵاڵ، تەجاوزکاری مەکەن، بەم جۆرە حەڵاڵ حەرام بکەن، یان زێدەڕەوی بکەن لە بەکارهێنانی حەڵاڵ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ – الأعراف/٣١﴾.

جا کە ئایەتەکە هاتە خوارێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدووی ناردنو پێی فەرموون: ﴿إنَّ لأنفسِكُمْ عَلَيْكم حَقاً، وأنَّ لأعيُنِكُمْ حقاً، وانَّ لأهلِكم حقاً، فَصَلّوا وناموا، وصُومُوا وافطِروا، فليس مِنَّا مَنْ تَرَكَ سُنَّتَنا﴾.

ئیتر هەموو وتیان: خودایە! تەصدیقی پەیامەکەت دەکەین، شوێن ئەو شەریعەتە دەکەوین کەبۆ پێغەمبەرت ناردووە.

ئەمجار هۆکاری جڵەوگیرییەکەی لە سنوور بەزێنی بەیان کردو فەرمووی: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ خودا کەسانێکی خۆش ناوێ کە سنوور بەزێنی دەکەنو لە چوارچێوەی شەریعەت دەردەچن، جا زێدەڕەویو دەرچوونەکەیان بە نیازی خودا پەرستی بێت، یان بەنیازی تر بێ، هەروەها شت لەخۆ حەرام کردنەکەیان بە سوێندو فۆتۆ بێ، یان بێ سوێندو نەزر بێ چوون یەکە.

ئەمەش تایبەتمەندییەکی میانەڕەوی ئیسلامە، زێدەڕەوی تێدا نییە، نە خۆگرتنەوە لەخۆشیو لەززەتە حەڵاڵەکانی دونیا بەڕەوا دەزانێ، نە ماددە پەرستیی بەلاوە ڕەوایە، هەرگیز ڕەبەنیو سۆفیگەریتیو چلە کێشانی بەلاوە ڕەوا نییە، ئەگەر لە سنوور دەرچێو نیشاتی ئادەمیزاد دامرکێنێو ئازاری جەستەو زەبوونی هێزو توانای لەڕادە بەدەری تێدابێ، هەروەکوو چۆن نوغرۆ بوونی لە شەهوەتو ئارەزودا زیاد لە ئەندازەی بەلاوە حەرامەو پەسەندی ناکا، واتە: دەبێ ئادەمیزاد هەوڵ بدا پەیڕەوی ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بکا!

پاش ئەوەی پەروەردگار جڵەوگیری لەوەکرد کە ئادەمیزاد نەفسی لە لەززەتو خۆشی جیهان بگێڕێتەوەو زیاد لە ئەندازە لغاوی بکا، ئەمجار بە شێوەیەکی ئیجابی فەرمانی کرد – بەڵام فەرمانێك ئیباحە بگەیەنێ – بە ئادەمیزادان کە لە رزقو رۆزیی حەڵاڵ بخۆنو بخۆنەوەو فەرمووی: ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ حَلاَلاً طَيِّبًا﴾ بخۆنو بخۆنەوە لەو رزقو رۆژییەی کە خودا پێی داونو بۆی حەڵاڵ کردوونو بە خاوێنی داناوە بۆتان، توخنی خواردنو خواردنەوەی حەرام مەکەون؛ جا چ ئەو شتە حەرامە خودی خۆی حەرام بێ وەکوو مردارەوە بوو خوێنی ڕەوانو گۆشتی بەراز..... یان لە رێگەی دەست تێخستنو کار پێ کردنەوە حەرام بێ وەکوو سوودو قومارو دزیو بەرتیل ..... هتد.

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە وشەی (ڕزق) حەڵاڵو حەرام دەگرێتەوە، ئەمە دەکرێتە بەڵگە بۆ رەتدانەوەی ئەوانەی کە دەڵێن: حەرام (رزق) نیە.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان دەکا بەوەی کە لە هەموو شتێکدا بە گوێرەی بەرنامەی خودا کار بکەنو سنوور بەزێنی نەکەن ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِيَ أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ خۆتان لە تۆڵەو سزای ئەو خودایە بپارێزن کە بڕواتان پێیەتی، لە هەموو کاروبارێکی ژیاندا پارێزگاریی سنوورەکانی بکەن؛ خواردنو خواردنەوەتان، پۆشاكو پەیوەندیتان لەگەڵ ئافرەتان لە چوارچێوەی سنووری خودا بێ، هەموو کاتێ بترسن لە سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا.

فەرمان بە خۆپاراستن لە سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا لێرەدا کە باس کرا بۆ هەڵنانو سوور بوونو پارێزگاری کردنە لەسەر ئەو شتانەی کە خودا وەصییەتی پێ کردوون کە بەردەوام بن لەسەری، هێنانی ئەمر بە تەقوا پاش جڵەوگیری لە بەحەرام دانانی شتی حەڵاڵ، بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستەیە، کە دژایەتی نیە لە نێوان کەڵك وەرگرتنو لەززەت بینین لە ڕزقی حەڵاڵو تەقوا کردن.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ – البقرة/١٧٢﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ – الأعراف/٣٢﴾.

ئەوەوی دەفەرموێ: مەبەست بە (طیبات) ڕزقی حەڵاڵە...، ئەوەی لەم دوو ئایەتە وەردەگیرێ ئەوەیە:

١- ئەوەیە ئەم ئایەتانە بە بنەمایەکی سەرەکی دەژمێردرێن لەو بنەما ئیسلامیانەی بانگەوازی بۆ میانەڕەوەیو ئاسانکاری دەکەن، ئەوپەڕی یاسا دروستیو لێبووردویو مامناوەندی لە کاروباری ژیانو ئایینی لە خۆ گرتووە، ئاوێنەیەکی باڵا نمایە بۆ وازهێنان لە زیادەڕەوی لە ئاییندا، زۆر بە ڕێکوپێکی لایەنی پێویستی ژیانی ئادەمیزادی لە خۆ گرتووە، لایەنی گیانو جەستەی بەرچاو گرتووە.

٢- بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە ڕەبەنی حەرامو ناپەسەندە.

بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتێك دەهێنێ دەڵێ: سێ کەس لە هاوەڵان هاتنە خزمەت خێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ پرسیار کردن لە عیبادەتی پێغەمبەرو چۆنیەتی هەڵسوکەوتی، کە پێیان گوترا؛ بەلایانەوە کەم بوو، دوایی گوتیان: بابە ئێمە لە کوێو پێغەمبەری خودا لە کوێ؟ ئەو خودا لە هەموو گوناهێکی خۆش بووە!! ئەمجار یەکێکیان گوتی: من هەتا هەتایە شەو نوێژ دەکەمو شەو ناخەوم؛ ئەوەی تریان وتی: من هەموو رۆژێك بەرۆژو دەبمو هەرگیز رۆژو ناشکێنم، یەکێکی تریان وتی: منیش ژن ناهێنمو خۆم بە ڕەبەنی دەهێڵمەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتە لایانو فەرمووی: ئەوە ئێوەن ئاواو ئاواتان گوتووە؟ ساوەڵلاهی من لە هەموانتان زیاتر لە خودا دەترسمو تەقواو خۆپاراستنم لەو شتانەی دەبنە هۆی نارەزامەندی خودا لە هەمووانتان زیاترە، بەلام من وا دەبێ بەرۆژو دەبم وا دەبێ بەرۆژو نابم. شەو نوێژیش دەکەمو دەخەوم، ژنیش مارە دەکەمو دەچمە لای، هەرکەسێ بە ڕێبازو سوننەتی من ڕازی نەبێ لە من نیە.

ئیمام ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ هَذَا الدِّينَ مَتِينٌ فَأَوْغِلُوا فِيهِ بِرِفْقٍ» ئەم ئایینە قایم‌و پتەوە لەسەرەخۆو بە هێدی هێدی بچنە ناوی.

ئایەتی ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالاً طَيِّباً﴾ خواردن‌و خواردنەوەو پۆشاك‌و نامێری سواری‌و هەر وەسیلەیەکی ژیان کە حەلاڵ بێ دەگرێتەوە، بۆیەش هەر باسی خواردنی کرد، چونکە خواردن‌و خواردنەوە گەورەترین لەززەت‌و هۆکارن بۆ پەرەپێدان بە ژیان!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ژیانیدا خواردنی تایبەتی نەبووە، بەڵکوو چی ئامادە بوایە ئەوەی دەخوارد، جاری وا هەبووە خۆشترین خواردەمەنی نۆش کردووە وەکوو گۆشت! جاری واش هەبووە نانی جۆ لەگەڵ خوێدا، یان لەگەڵ زەیتدا، یان لەگەڵ سرکەدا نۆش کردووە، جاری وا هەبووە تێر بووەو جاری واش هەبووە زۆر برسی بووە، هەڵس‌و کەوتی نموونە بوو بۆ دەوڵەمەندو هەژار، بە گوێرەی باری ئابووریشی ماڵی بەخشیوە بە شێوەیەکی مامناوەندی!

وەکوو لە ژیاننامەو سیرەتیشیدا نووسراوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زۆرتر گرنگی بە جۆری خواردنەوە داوە تا خواردەمەنی، خۆشترین خواردنەوەشی ساردو شیرنی بووە پێکەوە! وەکوو ئاوی شیرین کراو بە هەنگوین، یان دۆشاوی خورما، یان ترێ.

## سوێندی لەغوو سوێندی دانەبەسراوو کەفارەتەکانیان

﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ

مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَٱحْفَظُوٓاْ أَيْمَٰنَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا جڵەوگیری لە حەرام کردنی شتی حەڵاڵ کرد بەهۆی ئەوەوە کە کەسانێك ویستبوویان بە چلە کێشیو ڕەبەنی ژیان بەسەر بەرنو لەززەتو خۆشی لە خۆیان قەدەغە بکەن، سوێندیشیان خواردبوو، پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد کە دەربارەی سوێندەکانیان چی بکەن. ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتەی دوایی وەڵامی دانەوە، حوکمی فەرمبووی سوێند لێ کەوتنی دیاری کرد.

طەبەری لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ کە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ....﴾ هاتە خوارێ.

دەربارەی ئەو کەسانەی کە چوونە لای ژنو گۆشت خواردنیان لە خۆیان یاساغ کردبوو؛ چوونە لای پێغەمبەر عەرزیان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە چی لەو سوێندانەمان بکەین کە خواردوومانن؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ.....﴾ خودا ئێوە ناگرێ لەسەر سوێندخواردنێك کە بەبێ مەبەست لە دەمتان دەردەچێ! سزا نادرێن لەسەر ئەو سوێندانەی کە لەدەمی سوێندخۆران دەردەچێ، عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (لە غوو ئەیمان) ئەوەیە کابرا لە ناوەندی ئاخاوتندا دەڵێ: نەبە خوا بەڵێ بەخوا، فلان شت وایە، یان وانیە،

شافیعی بەلایەوە (لغو الأيمان) ئەو شێوەیەو ئەوەش حوکمەکەیەتی. بەڵام زۆربەی زانایانی شەرع دەفەرموون: (لغو الأيمان) ئەوەیە کە: هەواڵی رابوردوو سەردەم بە سوێندەوە بڵێو پێی وابێ هەواڵەکە وەکوو ئەو ڕایدەگەیەنێ وەهایە، بەڵام وا نەبێ.. بەڵگەشیان فەرموودەیەکی ئیبنو عەبباسە کە دەڵێ: (لغو الأيمان) ئەوەیە سوێند بخۆی لەسەر شتێك کەوایە، کەچی وا نەبێ. لەسەر ئەم شێوە سوێندخواردنە لێ پرسینەوە نیە، لە دونیادا کەفارەتی لەسەر نیە، لە قیامەتیشدا سزای نیە. ﴿وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ﴾ بەڵکوو سزاتان دەدا لەسەر سوێندێك کە بە سووربوونەوە جەختی لەسەر بکەیو بڵێی سوێندم وابێ فلان شت دەکەم یان نایکەم؛ ئەمە ئەگەر سوێندەکەی لە خۆخست، لێپرسینەوەی لەسەرە..، جۆرە سوێندێکی تر هەیە؛ سوێندی (غەمموس) (سوێندی بە درۆ)ی پێ دەگوترێ، ئەویش سوێندێکە بە مەبەستو سووربوونەوە ئەنجامی بداتو درۆش بێ، جا بۆ رابوردوو بێ، یان بۆ حاڵی حازر بێ. کەوابوو جۆری سوێند سیانن (سوێندی لەغوو، سوێندی دامەزراو، سوێندی غەمموس).

طەبەری لە ئەبو مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: سوێند سێ نەوعە: سوێند هەیە کەفارەتی هەیە، سوێند هەیە کەفارەتی ناوێ، سوێند هەیە لێپرسینەوە لەسەر خاوەنەکەی نیە. ئەو سوێندەی کە کەفارەتی هەیە ئەوەیە: پیاو سوێند دەخوا لەسەر نەکردنی کارێك دوایی دەیکا، ئەوە پێویستە کەفارەت بدا. سوێندی بێ کەفارەت ئەوەیە: کابرا سوێند بخوا لەسەر شتێك بە ئەنقەست درۆی تێدا بکا، ئەم جۆرە سوێندە کەفارەتی تێدا نیە. سوێندێك کە لێپرسینەوەی تێدا نیە ئەوەیە: کابرا سوێند دەخوا لەسەر کارێك پێی وایە بەو شێوەیە کەچی وا دەرناچێ ئەوە (لەغوو یەمینە)و هیچ شتێکی لەسەر نیە.

سوێند کاتێك دادەمەزرێو بە سوێند حلێب دەبێ کە سوێند بە خودا، یان سیفەتێك لە سیفەتەکانی بخورێ، چونکە ئەحمەدو خاوەنانی شەش کتێبەکانی فەرموودە لە ئیبنو عومەرەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ڕیوایەت دەکەن کە

دەفەرموێ: «مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ» جگە لە خوداو سیفەتەکانی بەهەر شتێکی تر سوێند بخورێ دانابەسترێ بەڵکوو حەرامە.

فوقەهای ئیسلام لە سوێندی غەمووسدا دوو ڕایان هەیە:-

حەنەفیو مالیکییەکان دەڵێن: کەفارەتی نیە، واتە: بە کەفارەت قەرەبوو ناکرێتەوە، چونکە سزای سوێندی غەمووس سوتاندنە بە ئاگری دۆزەخ.

ئیمامی شافیعیو کۆمەڵێکی تر لە شەرع زانان، دەڵێن: پێویستە کەفارەت بدا چونکە پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ – البقرة/ ٢٢٥﴾. بەڵکوو ئێوە دەگرێ بەهۆی کەسبی دڵتان، کەسێکیش بە ئەنقەست درۆ بکا؛ ئەوە بە دڵ تاوانی کردووەو شیاوی سزادانە لەسەری؛ چونکە بە دڵ سووربووە لەسەر درۆ کردن لە سوێندەکەیدا. تاوانەکەش پەروەردگار کەفارەتەکەی دیاری کردووەو دەفەرموێ: ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ کەفارەت بە قەرەبوو کردنەوەی ئەو تاوانە، خۆراکدانە بە دە کەسی هەژار لە خۆراکێکی مامناوەندی کە خۆتان دەیدەن بە ماڵو منداڵی خۆتان ﴿أَوْ كِسْوَتُهُمْ﴾ یان پۆشتەکردنی دە هەژار ﴿أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ یان ئازاد کردنی کۆیلەیەك، واتە: کەسێك سوێندی خوارد دوایی سوێندەکەی هەڵوەشایەوە، یان بە ئەنقەست هەڵی وەشاندەوە، یان لە بیری چوو دەبێ کەفارەتی سوێندەکەی بدا بەمەرجێ دەوڵەمەند بێ، لەم سێ شێوەیە سەرپشك دەبێ کامەیان دەکا باشە:-

١- خۆراکدان بە دە هەژار بۆ هەر هەژارەی شەش سەدو حەفتاو پێنج غرام لە جۆرە خواردنێکی مامناوەندی دانیشتوانی ئەو شارە نە زۆر باش بێ نە زۆر خراپ بێ، هەریەکەیان ژەمێك نانو گۆشتیان بداتێ ئەمە ڕای حەسەنی بەصریو موحەممەدی کوڕی سیرینە.

حەنەفییەکان دەڵێن: ئەندازەی خۆراکەکە وەکوو سەرفیترە وایە، واتە: نیو ڕبە گەنم، یان ڕبەیەك خورما، یان جۆ، یان ئارد، یان نرخەکەیان (ڕبە بە کێشانە دوو کیلۆو حەوت سەدو پەنجاو یەك غرامە) واتە: دوو ژەم نانخواردنی وا تێریان بکا،

ژەمی نیوەڕۆو ئێوارە، چونکە ئیمامی عەلی لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: (يُغَدِّيهِمْ وِيُعَشِّيهِم) ئەبو حەنیفە دەڵێ: دەشێ دە ڕۆژ خۆراك بدا بە هەژارێك.

٢- پۆشاکدان بە دە هەژار، پۆشاك بە گوێرەی شوێن دەگۆڕێ، شافیعییەکان دەڵێن: بۆ هەر یەکەیان کراس یان دەرپێ یان مێزەر، حەنەفییەکان دەڵێن: کەمترین پۆشاك دەبێ بە جۆرێك بێ زۆربەی جەستە دابپۆشێ!

٣- ئازاد کردنی کۆیلەیەك. بەلای شافیعیو مالیکییەوە مەرجە دەبێ کۆیلەکە موسوڵمان بێ، ئەبو حەنیفە پێی وایە: مەرج نیە موسوڵمان بێ بەڵکوو ئەگەر کۆیلەکە موسوڵمانیش نەبێ هەر دەبێ.

﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ﴾ کەسێك توانای ئەنجامدانی یەکێ لەم سێ جۆرە کەفارەتەی نەبوو، پێویستە سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ بەلای حەنەفییەکانو حەنبەلییەکانەوە دەبێ سێ ڕۆژەکە بە شوێن یەکەوە بن، شافیعییەکانو مالیکییەکان دەڵێن: مەرج نیە بە شوێن یەکدا بێن.

حەنەفییەکانو حەنبەلییەکان بەڵگەیان ئەو قیرائەتەیە کە حاکمو ئیبنو جەریری طەبەری لە ڕێگەیەکی ڕاستەوە هێناویانە؛ دەڵێن: ئوبەی کوڕی کەعب ئەم ئایەتەی بەم جۆرە دەخوێندەوە ﴿ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مُتَتَابِعَاتٍ﴾ ئەم قیرائەتە لە ئیبنو مەسعودیشەوە ڕیوایەت کراوەو لە نوسخەی موصحەفی (ربیع)یشدا چەسپاوە، (سوفیانی ئەوری)یش هەروای هێناوە، ئیبنو مەردەویهی لە ئیبنو عەبباسەوە هەمان قیرائەتی نەقڵ کردووە!

شافیعیو مالیکییەکان دەڵێن: ئەو قیرائەتە قیرائەتێکی (شاذە) قیرائەتی شاز نابێتە بەڵگە، قیرائەتی (متواتر) نەبێ ناکرێتە بەڵگە.

کەسێك زیاد لە بژێوی شەوو ڕۆژێکی هەبێ بۆ خۆیوماڵو منداڵی بە دەوڵەمەند حلێب دەکرێ، چی زیاد بوو لە بژێوی ئەو شەوو ڕۆژە دەبێ بدرێ بە کەفارەت.

ئیبنو جەریر لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنی بەصرییەوە ریوایەت دەکا کە دەڵێن: کەسێك سی درهەمی زیوی هەبێت پێویستە خۆراك بدا، ئەگینا بەرۆژوو دەبێ!

شایەنی باسە کاتێکی دیاری کراو نیە بۆ کەفارەتدان، بەڵکوو وا باشە پەلە بکرێ لە ئەنجامدانی، ئەگەر نەخۆش بوو، کاتێك بە رۆژوو دەبێ کە بتوانێ، ئەگەر ناساغییەکەی بەردەوام بوو، ئەوا دەکەوێتە بەر رەحمەتی خودا، میراتگرەکانیشی دەتوانن کەفارەتەکەی بۆ بدەن.

﴿ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ﴾ ئەوەی گوترا: کەفارەتو قەرەبوو کردنەوەی سوێندەکانتانە کە سوێندوخوارد، بە گوێرەی شەرع، هەرکاتێ سوێندتان بە خودا، یان بە ناوێکی، یان بە سیفەتێکی خواردو سوێندەکەتان لێ کەوت، بەو جۆرەی کە بۆمان شی کردنەوە کەفارەت بدەن.

﴿وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ﴾ پارێزگاری سوێندەکەتان بکەن، پابەندی سوێندەکەتان بن‌و هەوڵ بدەن سوێند لە خۆتان مەخەن! یان پارێزگاری بکەن بەم جۆرە کە سوێندەکەتان لێ کەوت کەفارەتەکەی بدەن، یان پارێزگاری سوێندەکەتان بکەن بۆ هەر شتێکی هیچ‌و پووچ سوێندێك مەخۆن، لە شتی راستیشدا سوێند زۆر مەخۆن، چ جای سوێندی درۆ!! کە سوێندیشتان خوارد لەبەر پێویستی‌و بەرژەوەندیی نەبێت سوێندەکە لە خۆتان مەخەن! ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ﴾ بەم شێوە روون کردنەوەیە پەروەردگار ئەحکامی ئایینەکەتان بۆ شی دەکاتەوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئامادە باش‌و گونجاو بن بۆ سوپاس کردنی خودا بەو شێوەیەی کە پێی خۆشەو لێی ڕازییە دەبێتە هۆی زیاد بوونی فەزڵ‌و ئیحسانی‌و جێگای رەزامەندیی زاتی پاکی.

## شەرابو قومارو نوصوبو ئەزلام حەرامن

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ (٩٠) إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ (٩١) وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ (٩٢) لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (٩٣) ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا جڵەوگیریی لەوە کرد کە: خەڵکی لە خۆیانەوە شتی حەڵاڵو خۆش لە خۆیان یاساغ بکەن، ئەوە بوو فەرمووی: ﴿لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ﴾ تا دەگاتە ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ حَلاَلاً طَيِّباً﴾ لە کۆی ئەو شتە خۆشانە شەرابو قومار بوو، ئیتر لە ئایەتەکانی داهاتوودا پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە شەرابو قومار ناچنە خانەی شتە خاوێنو حەڵاڵەکانەوە، بەڵکوو ئەوانیش پیسو حەرامن!

بێگومان شەرابو قومارو ئەزلام دیاردەیەکی هەرە بە دەرەوەی ژیانی کۆمەڵگای سەردەمی نەزانی بوو، جۆرێك بوو لە دابو نەریتی چەسپاو ڕۆچوو بە ناخی کۆمەڵگای جاهیلیدا، ئادەمیزادانی ئەوسەردەمە بەشێوەیەکی فراوان شەرابیان دەخواردەوەو خۆیان پێ هەڵدەنایەوەو پێشبڕکییان لە ڕازاندنەوەی کۆڕو مەجلیسی عارەق خواردنەوەدا دەکرد، پێدا هەڵدانی شەرابو جۆرەکانی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە شێعرو وتاری ئەو سەردەمەدا ڕەنگی دابووەوە، شاعیرەکان پێشبڕکێو خۆ تاقیکردنەوەیان تێدا دەکرد، وێڕای گەرم کردنی کۆڕو مەجلیس بە شەرابو پێدا هەڵدانی بە شێعر حەیوان سەربڕینو گۆشت برژاندنو ئامادەکردنی خواردەمەنی خۆشو بە تام دیاردەی زەقی خاوەن سامانەکان بوو، ئاژەڵیان دەهێنا لەسەر بەردە تایبەتەکانی دەوروپشتی کەعبە، واتە: (نصب)ەکان سەریان دەبڕینو بە خوێنەکەیان ئەو بەردانەیان سوور دەکرد، هەروەکوو چۆن ئەو حەیوانانەیان سەر دەبڕین بۆ بتەکانیانو خواکانیان. هەر لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵ بۆ کۆڕو مەجلیسەکانی ئارەق خواردنەوەدا قوماریشیان دەکردو لە ڕێگەی (أزلام) قوداحەکانیان کە گۆشتی کوشتیەکانیان پێ دابەش دەکردو هەر کەسە بە شێوەی (خۆمو بەختم) بە گوێرەی چۆنیەتی قەدەحەکەی بەشی خۆی دەبرد، ئەو کەسەی قەدەحی بەرزی بەردەکەوت بەشی باشی دەبرد،، بەم شێوە دەهاتە خوارێ تا وای لێ دەهات هی وا دەبوو قەدەحەکەی هیچی بەر نەدەکەوت، وا دەبوو کابرای خاوەن کوشتی بۆخۆی هیچی پێ نەدەبڕا، ئاوا بەو شێوە دابو نەریتێکی سەردەمی نەزانی لەو کۆمەڵگا نەفامییەدا ڕەنگی دەدایەوە، بە گوێرەی بیروبۆچوونی پڕوپووچو گومراییان هەڵسو کەوتیان دەکرد.

ئایینی ئیسلام لەسەرتای پەیدابوونیەوە چارەسەرکردنی ئەم دیاردە ناشیرینو نەشازەی نەکردە بەرنامەو خۆی پێوە خەریك نەکرد، چونکە ئەم دیاردە ناشیرینانە ڕەگو ریشاڵی بیروباوەڕی فاسیدو بێ بناغە دروستی کردبوون؛ چارەسەر کردنیان ڕاستەوخۆو بێ ڕیشەکێش کردنی ڕەگەکانیان ماندوو بوونو

کات بـه فیرۆدانـی بـێ هـوده دەبـوو، بۆیـە ئـاینی ئیـسلام ماوەیـەکی دورو درێـژ خـەریکی چەسـپاندنی بیروبـاوەڕی یەکتاپەرسـتیو چـاندنی تـۆوی ئیمـان لـە دڵـی خەڵکەکـەداو دانـانی بناغـەو پایـەی پتـەوی ئیمـان بـە خـوداو راسـت کردنـەوەی بیروباوەڕی شێواوی ئەو کۆمەڵگایە بوو.

بەڵێ ئیسلام لە ناخەوە ئەو خەڵکەی گۆڕی، گۆڕانکارییەکـەی لـە نـاخی دڵانـەوە بوو، بۆی روون کردنەوە، خودایەتی چیەو چۆنە؛ لە بتپەرستییەوە خـستنیە سـەر خوداپەرستیو یەکتاپەرستی، تاکە خودای خۆیان بەحەق ناسی، دەروونیـان ئامـادە بوو بۆ وەرگرتنـی فـەرمانو جڵەوگیری خـودای حـەقو راسـت، ئـەمجار چارەسـەری دیــاردەی عــارەق خواردنـــەوەی کــرد، چارەســـەرکردنێکی بنـــبڕو ریـــشەکێش! چارەسەریکی سەتاسەریو هەمیشەیی! چارەسەرێکی نەخشە بۆ کێشراوو بناغە بـۆ دانراو.

بۆیە لە سەرەتاوە ئیسلام نەهات هەوڵی لە ناوبردنی ئەو دابو نەریتە نەشازانە بدا! بەڵکوو لە بیروباوەڕەوە دەستی پێ کرد، لە شایەتومانەوە لـە شیعاری ﴿لا إلـه إلا الله﴾ وە دەستی پی کرد، سێزدە ساڵ بە بـەردەوامی خـەریکی چانـدنو روانـدنی بیروبــاوەڕی خوداپەرســتیو یەکتاپەرســتی بــوو، فێــری ئــەوەی کــردن چــۆن گەردنکەچــی فــەرمانی پــەروەردگار بــن، هــەتا وا رام بــوونو دەروونیــان بـۆ خوداپەرستی خوسا، هەرشتێك خودا بەلایەوە باش نـەبێ بەلایانـەوە بـاش نـەبوو، چـی پـەروەردگار پێـی خـۆش نـەبێ پێیـان خـۆش نـەبوو؛ ئـەمجار دەسـتکرا بـە قەڵاچۆکردنی دیاردە نالەبارەکانی سەردەمی نەزانی، دەست کرا بە پاك کردنـەوەی خڵتـەو پڵتـەی سـەردەمی نـەفامی لـە بـارەی کۆمەڵایـەتیو ئـابوریو دەروونـیو رەوشــتیو هــەڵسو کەوتــەوە، قەڵاچــۆکردنی دابو نــەریتی عــەرەقو دیــاردە دزێوەکانی کاتێك دەستی پـێ کـرا موسـوڵمانان بـێ سێو دوو وەریـان گـرت؛ کاتێـك فـەرمان بـە قەڵاچـۆکردنی دیـاردەی شـەراب خواردنـەوە کـرا موسـوڵمانان جگـە لـە فەرمانی خودا هیچ فەرمانێکی تریان بـەلاوە پەسـەند نـەبوو!! موسـوڵمانان بـە دڵ

هاتبوونە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە بە دڵو بە گیانو لێبڕانەوە، ئەو ئایینەیان وەرگرتبوو، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) چی پێ ڕاگەیاندن بەبێ سێو دوو قبووڵیان بوو، سەرپێچی کردنیان نەبوو، ئەگەر تاوانێکیان لێ رووبدایە، دەهاتنە خزمەتیو جەستەی خۆیان دەخستە بەر حوکمی ئەو ئایینە، چی بڕیار دەدا بابیدا، کابرا زینای لێ روو دەدا، بۆخۆی دەهات بە زوبانی خۆی پێی لە تاوانەکەی دەناو ئامادە بوو بەردەباران بکرێو لەو تاوانە رزگاری بێ.

کاتێك شەراب بە یەکجاری یاساغ کرا، هەبوو پیاڵە شەرابەکەی بەدەستەوە بوو فڕێی دا، یەکسەر فەرمانی خودا بوو بە لەمپەڕو پەردە لە نێوان لێوی تێنویانو شەرابی خۆشو گوارا!!

کە ئایەتی یاساغ کردنی یەکجارەکی شەراب هاتە خوارێ یەکسەر موسوڵمانان دەستیان کرد بە ڕژاندنی کوپە شەراب! تەنانەت لە ناو کوچەو کۆڵانی مەدینەدا وەکوو لافاو جۆگە شەراب خوڕە خوڕی دەهات!!

شایانی باسە یاساغ کردنی شەراب قۆناغ قۆناغ بووەو شتێکی کوتو پڕی نەبووە، پێش یاساغ کردنە یەکجارەکییەکە چەند قۆناغێکی تری بڕی بوو.

قۆناغی یەکەم ئاماژە بۆ کردنێكو تیر هاویشتنێکە کە پەروەردگار ئاڕاستەی موسوڵمانانی کرد لەم بارەوە لە سورەتی (النحل/٦٧)دا کە لە مەککە هاتۆتە خوارێ دەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا – النحل/٦٧﴾ ئەمە یەکەم لە دەرگادانی هەستی موسوڵمانان بوو، ئەوە بوو ناوی شەرابی هێنا، بەڵام بە رزقو رۆزیی پاكو خاوێنی حلێب نەکرد، واتە: رزقو رۆزیی شتێکەو عەرەق شتێکی ترە.

قۆناغی دووەم ئەوەبوو: قورئان لە وەتەری هەستی ئایینی موسوڵمانانی داو لە رێگەی تەشریع دانانەوە ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا – البقرة/٢١٩﴾ی نارده خوارێ، ئەمەش ئاماژە بۆ کردنو پێ راگەیاندنە کە دوور کەوتنەوە لە شەرابو قومار باشترەو،

واباشه موسوڵمانان دەستبەرداری بن، چونکه کەم شت هەیه له سوود خاڵی بێ، بەڵام حەرامو حەڵاڵی ئەو شته پابەنده به کەمو زۆریی سوودو زیانەکانی.

ئەمجار قۆناغی سێیەم دێته پێشەوه که قورئان جڵەوگیری له موسوڵمانان دەکا که به هیچ جۆرێك لەکاتی نوێژدا توخنی عەرەق خواردنەوه نەکەون، ئەوەبوو: پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ که دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ – النساء/٤٣﴾. له شەوو ڕۆژدا له پێنج کاتدا نوێژ واجبه کاتەکانیشیان لێك نزیکن، نێوان نوێژەکان بەشی سەرخۆش بوونو به هۆش خۆهاتنەوه ناکا، ئەمەش تەنگەبەر کردنی هەلی عەرەق خواردنەوەیه، به تایبەتی عادەتی (صەبوح) که بەیانیان دەیانخواردەوە، یان عادەتی (غەبوق) که دوای عەصر، یان دوای شێوان کۆڕی عەرەق خواردنەوەیان گەرم دەکرد، به تەواوی ئەم عادەتانەیان لێ شیوا! وێڕای ئەوەی که ئەم یاساغ کردنه لەکاتی نوێژەکان وەزنێکی تایبەتی هەبوو له دڵی موسوڵماناندا؛ چونکه دژایەتییەکی لای موسوڵمان دروست کرد له نێوان ئەنجامدانی نوێژەکانیو ئەنجامدانی کاری عەرەق خواردنەوەکەیدا.

قۆناغی چوارەمو کۆتایی یاساغ کردنو بنبڕکردنی یەکجارەکییه، ئیبنو جەریر له ئەبولەیسەرەوه دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب نزای له خوا دەکرد دەیگوت: خودایه! دەربارەی عەرەق ڕوونکردنەوەیەکی تەواومان بۆ بنێره[1] ئیتر ئەو ئایەتەی سورەتی (البقرة) هاته خوارێ که دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ بانگی عومەر کراو ئایەتەکەی بۆ خوێندرایەوە، عومەر پاڕایەوە له خودا وتی: خودایه ڕوون کردنەوەیەکی تەواومان بۆ بنێره، ئیتر ئایەتی سورەتی (النساء) هاته خوارێ که دەفەرموێ: ﴿لاَ تَقْرَبُواْ

---

[1]- مامۆستا سەید قوطب دەفەرموێ: پێ دەچێ ئایەتەکەی سورەتی (النحل) حەزرەتی عومەری تووشی دڵەراوکێ کردبێ دەربارەی عەرەق.

الـصَّلاَةَ وَأَنـتُمْ سُـكَارَى﴾ ئايەتەكـە بـۆ عومـەر خوێندرايـەوە، وتـی: خودايـە! روونكردنەوەيـەكی تـەواومان بـۆ رەوانـە بفـەرموو: ئـيتر ئايـەتی سـورەتی (المائـدة) هاتە خوارێ كە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـواْ إِنَّمَـا الْخَمْـرُ وَالْمَيْـسِرُ وَالأَنـصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْـسٌ مِّـنْ عَمَـلِ الـشَّيْطَانِ﴾ تـا دەگاتـە ئـەوە كـە دەفـەرموێ: ﴿فَهَـلْ أَنـتُم مُّنتَهُونَ﴾ كە ئەم ئايەتە هاتە خوارێو عومەر پێی زانـیو بـۆی خوێنـدرايـەوە وتـی: خودايە وازمان هێنا[٢].

جا كـە دوای سـێ ساڵو دوای جـەنگی ئوحـوود ئـەم ئايەتانـە هاتنـەخوارێ هـەر ئەوەندە پێويست بوو كە جارِ درا بە نـاو مەيخانـەو يانـەكانی نـاو مەدينـەدا وتيـان شـەراب حـەرام كـراوە، ئـيتر ئـەوەی كـە پيالّـەی شـەرابی بەدەسـتەوە بـوو شـكاندی، ئەوەی قومە عەرەقی لە دەمدا بوو تفی دايـەوە، كوپـەو ديـزەی شـەرابيان شـكاندو ديارەدی عەرەق خواردنەوە لە ناو ئەو كۆمەڵگە موسوڵمانەدا بـاوی نـەماو وازی لێ هێنـدرا! هـەر دەتگـوت: ئـەو ئادەميزادانـە لـەوە پـێش نـە شـەرابيان خواردۆتـەوەو نەسەرخۆش بوون!

ئەمجار با بزانين قورئانی پيرۆز چۆن ئەو فەرمانە تەشريعييە ئاراستە دەكات؟؟

دەربـارەی هاتنـەخوارەوەی ئـەم ئايەتـە، نەسـائیو بەيهـەقیو عەبـدی كـوڕی حەميدو ئيبنو جەريرو ئيبنو مونزيرو ئيبنو مـەردەويهی لـە ئيبنـو عەبباسـەوە دەگێڕنـەوە دەفـەرموێ: ياسـاغ كردنـی شـەراب دەربـارەی دوو هـۆزی ئەنـصار هاتـە خـوارێ عـەرەقيان خواردبـووە، كـە سـەرخۆش بـوون هەنـدێكيان دەسـتيان لێـك وەشاند، كە وەهۆش خۆ هاتنەوە جێگای جرِنووكو شوێن دەستی يەكتريان بە دەمو چاوی يەكترييەوە دەبينی، هەيان بوو دەيگوت: ئەم برايەم وای لێ كـردم، لـە پێـشدا هيچ رِقيان لە يەكتر نەبوو، بەڵام كابراكە دەيدی ئاوا زامـار كـراوە، گلـەيی دەكـردو دەيگوت: وەڵڵاهـی ئەگـەر ئـەم بـرادەرە بـەزەيی بـە منـدا بهاتايـە ئێجگـار ئـاوای لێ

---

[٢] – خاوەنی سوننەكان ئەم ريوايەتەيان گێراوەتەوە.

نەدەکردم، هەتا لە ئاکاما ڕق‌و کینە کەوتە دڵیانەوەو وای لێ هات دژایەتییان تێ کەوت.

دووبارە ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەویەی لە سەعدەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری داوەتی ئێمەی کرد، چووین شەرابمان خواردەوە تا وامان لێ هات سەرخۆش بووین، ئیتر ئەنصاری‌و قوڕەیشییەکان وتیان: نەخێر ئێمە لە ئێوە ڕێزدارترین، ئیتر پیاوێکی ئەنصاری لاشەویلە حوشترێکی بادایە دەم‌و لووتی سەعد، لووتی قڵیشاند. سەعد دەڵێ: ئیتر من هاتمە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) و ئەم ڕووداوەم بۆ گێڕایەوەو ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ.......﴾.

ئیمامی بوخاری لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: مەی گێڕ بووم لە ماڵی طەڵحە، ئایەتی یاساغ کردنی شەراب هاتە خوارێ، ئیتر جاڕ درا بە ناو مەدینەدا طەڵحە پێی گوتم: بچۆ دەرێ بزانە ئەو بانگ‌و جاڕدانە چیە؟ کە گوێم ڕاگرت جاڕچی دەیگوت: شەراب یاساغ کراوە، ئیتر طەڵحە گوتی: بچۆ کوپە شەرابەکە بڕێژە، چووم ڕشتم، شەرابەکە لە خورما دروست کرابوو!

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو موسوڵمان بوون ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ﴾ بێگومان ئەو شەرابەی دەیخۆنەوەو هەموو شتێك کە سەرخۆشتان بکا ﴿وَالْمَيْسِرُ﴾ قومار بە هەموو جۆرەکانیەوە ﴿وَالأَنصَابُ﴾ ئەو بەردە تایبەتیانەی کە حەیوانیان لەلا سەردەبڕن، ئەو بتانەی قوربانیان لە کن سەردەبڕن ﴿وَالأَزْلاَمُ﴾ ئەو پارچە دارانەی کە لە شێوەی تیردا بوون لە سەردەمی نەزانیدا شتیان پێ دابەش دەکردن‌و بەخت‌و شانسی خۆیان پێ تاقی دەکردنەوە، ئەمانە هەموویان ﴿رِجْسٌ﴾ پیسن، خودا پێی خراپن، پێی ناخۆشە توخنیان بکەون ﴿مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ﴾ ئەوە شەیتان کردیەو ئەو بۆتان جوان دەکاو لە پێش چاوتان دەیڕازێنێتەوە! لەو شتانە نین خودا پێی ڕازی بێ‌و ئافەرینتان لێ بکا لەسەر

ئەنجامدانی! دەی کە وابێ ﴿فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ واز لەو خواردنو کارە پیسانە بێننو خۆتانی لێ دوور بخەنەوە بەڵکوو بە مراز بگەنو دەروونتان پاكو خاوێن ببێو ڕزگارتان ببێ لە کرداری پیسو جەستەتان ساغڵەم بێو خۆشەویستی بکەوێتە ناوتانەوە.

ئەمجار پەروەردگار دوو مەفسەدەی قومارو شەراب دەست نیشان دەکا مەفسەدەیەکی دونیاییو مەفسەدەیەکی ئاینیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ﴾ ئەوەی کە شەیتان دەیەوێ ئەوەیە: کە ڕقو کینە بخاتە نێوانتانەوە لە ڕێگەی شەرابو قومارەوە هەڵتان لێ بەدەست بێنێو ئەمنو ئاسایشو تەباییو براییتان لە ناودا نەمێنێ! بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکیدا کە عوثمانی کوڕی عەففان بە (مەوقوفی) دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: «الْخَمْرَ أُمُّ الْخَبَائِثِ» شەراب خواردنەوە سەرچاوەی هەموو تاوانێکە. بەزاریش فەرموودەیەکی (مەرفوع) لە عەبدوڵلای کوڕی هومەرەوە نەقڵ دەکا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مُدْمِنُ الْخَمْرِ كَعَابِدِ وَثَنٍ» شەرابخۆری هەمیشە وەکوو بتپەرست وایە.

هەروەها شەیتان لە ڕێگەی عەرەق خواردنەوەوە کە دەبێتە هۆی سەرخۆشیو بێ عەقڵی، لە ڕێگەی قومارەوە کە دەبێتە هۆی خودا لە یاد چوونەوە مەبەستێکی تریشی هەیە ئەویش ﴿وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ﴾ دەیەوێ نێوە لابدا لە یادی خوداو هۆشتان بەسەر خودا پەرستیو یادی خوداوە نەمێنێ، یادی خودا کە هۆی دڵئارامیو دڵخۆشییە لە دونیاو لە قیامەتدا لە بیرتان بچێتەوەو هۆشتان بەسەریەوە نەمێنێ، هەروەها لاتان بدا لە ئەنجامدانی کاری چاكو بە سوود. نوێژ ئادەمیزاد دەگێڕێتەوە لە خراپەو خراپەکاریو دڵو دەروونی ئادەمیزاد پاك دەکاتەوە لە چڵکی گوناه.

شەراب کە عەقڵو هۆشی برد، ڕێزو نرخیش ناهێڵێ! تواناو دەسەڵاتی ئەنجامدانی خێرو چاکەش دەفەوتێنێ! چونکە کابرای شەرابخۆر ناتوانێ خۆ لە تاوانی دیکەش بپارێزێ! ئەمە جگە لەوەی کە شەراب زیانی تەندروستیشی هەیە بۆ هەموو ئەندامێکی جیهازی هەزمو ئەعصاب، بەڵکوو جاری وا دەبێ زیانەکەی دەتەنێتەوە بۆ منداڵەکانیشی، وا دەبێ منداڵی ئەوانەی کە عەرەق خۆرن گێلو نەفام دەردەچن، وا دەبێ عەرەق خواردنەوە دەبێتە هۆی تەڵاق کەوتنو هەڵوەشانو تێکچوونی خێزانو پەرتەوازە بوونی منداڵی بێ تاوان بەبێ سەرپەرشتیار.

قوماریش کە سەردەکێشێ بۆ قازانج بەبێ ماندوو بوون بۆ لایەنێکو زیانی لایەنەکەی تر، بێگومان ئاگری دژایەتیو ڕقو کینە هەڵدەگیرسێنێو زۆر وادەبێ قومارچییەکان دەبێتە شەڕیانو جنێودانو لێکدان لە نێوانیاندا ڕوو دەدا.

بەکورتیو پوختی شەرابو عەرەق زیانی زۆریان هەیە، زیانی تەندروستیو کەسایەتیو کۆمەڵایەتی، دەبێتە هۆی چاندنی تۆوی دوژمنایەتیو ڕقو کینە، زیانی ئایینیشی هەیە کە یادی خودا لە بیردەباتەوەو لە نوێژکردنی لادەدا، زیانی ئابوریشی هەیە ماڵو سامان خەرج دەکا لە شتێکدا جگە لە زیان هیچی تری لێ شین نابێ!

هەروەها قوماریش زیانی دەروونیو دەمارگرژیو دڵەڕاوکێو زیانی کۆمەڵایەتیو ئایینیو ئابوری تێدایە وەکوو شەراب خواردنەوە، زیانەکانی زۆرو هەمەجۆرن!

خەمر – عەرەق – شەراب: ئاوی ترێیەکە کە کەف هەڵدا، ئەم وشەیە بەلای جەماوەری شەرع زانانەوە بە هەموو شلەمەنیەکی سەرخۆشکەر دەگوترێ. هەرشتێك بە خواردنەوەی عەقڵ تێك بچێو دابپۆشرێ پێی دەگوترێ: خەمر.

حەنەفیەکان دەڵێن: ئەو کاتەی خەمر یاساغ کرا، عەرەبەکان جگە لەو خەمرەی کە لە ئاوی ترێ دروستیان دەکرد هیچی تریان نەدەزانی. کەوابوو خەمر ناوە بۆ

ئەو شلەمەنيەى كە لە ئاوى ترێ دروست دەكرێو سەرخۆش دەكا! ئەگەر شتێكى تر هەبێ سەرخۆش بكا پێى ناگوترێ خەمر. هەرچەندە بەلايانەوە هەرشتێك سەرخۆش بكا حەرامە. چونكە عيلەتى حەراميیەكە سەرخۆش كردنە.

بەڵام جەماوەرى شەرع زانان دەڵێن: خەمر ناوە بۆ هەر شتێك عەقڵ دابپۆشێو سەرخۆشى بكا. كەوابوو جگە لە ئاوى ترێ شلەمەنيە سەرخۆشكەرەكانى تريش بە نەصصى قورئان حەرامن، ئەمە ڕاى ئيبنو عومەريشە ئەم گوتويەتى: خەمر حەرامەو لە پێنج شت دروست دەكرێ لە ترێو خورماو هەنگوينو جۆو گەنم. خەمر ناوە بۆ هەر شتێك عەقڵ دابپۆشێو تێكى بدا، ئەمە ڕاى ئيبنو عەبباسيشە.

ئيمامى ئەحمەدو خاوەنى سوننەكان جگە لە نەسائى لە نەعمانى كوڕى بەشيرەوە فەرموودەيەكى پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) ڕيوايەت دەكەن دەڵێ فەرموويەتى: «إِنَّ مِنَ الْحِنْطَةِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الشَّعِيرِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الزَّبِيبِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ التَّمْرِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الْعَسَلِ خَمْراً».

ئيمام ئەحمەدو موسليمو خاوەنى سوننەكان لە ئيبنو ماجەوە ئەويش لە ئيبنو عومەرەوە فەرموودەيەك دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) فەرموويەتى: «كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ» واتە هەرچى سەرخۆش بكا خەمرە، هەموو خەمرێكيش حەرامە.

ئيمام (محمد)ى كوڕى حەسەنى شەيبانى قوتابىو هاوەڵى ئەبو حەنيفە پێى وايە: هەموو شلەمەنييەكى سەرخۆشكەر بەڵگەى حەراميیەكەى ئەو فەرموودەى پێغەمبەرە (دروودى خواى لەسەر بێ) كە ئيمام ئەحمەدو خاوەنى سوننەكان لە جابيرەوە نەقڵيان كردووە؛ دەڵێ: پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) فەرموويەتى: «مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ» هەر شتێك زۆرەكەى سەرخۆش بكا كەمەكەشى حەرامە.

قوماريش حەرامە، هەرشتێكيش وەكوو قومار بچێ دەچێتە خانەى قومارەوە، تەنانەت يارى (هەڵماتێنو واغواغێن)يش ئەگەر لەسەر ماڵ بوون حەرامن. ئيمامى

عەلی فەرموویەتی: شەترەنج ئەگەر لەسەر ماڵ بوو وەکوو قومار وایە، هەروەها یاری (نەرد)یش. ئەگەر شەترەنج لەسەر ماڵ نەبوو بەلای جەماوەری زانایانەوە حەرامە؛ چونکە ڕق‌و کینە دەخاتەوەو یادی خودا لە بیر دەباتەوە، نوێژ لە بیر دەباتەوە، شافیعی بەلایەوە (مەکروهە) ناباشە چونکە کات بە زایەدانی تێدایە.

دوای ئەوەی پەروەردگار هۆکارو حیکمەتی حەرام کردنی مەی‌و قوماری ڕوون کردەوە، جەختی لەسەر حەرامییەکەیان کردەوەو فەرمووی: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾؟ ئایا ئێوە واز دەهێنن؟ کۆڵتان لێ دا؟! واتە: لەگەڵ ئەو هەموو زیان‌و خراپییەی کە مەی‌و قومار لە خۆیان گرتووەو شایانی ئەوەن کە دەستبەرداریان بن؛ ئایا ئێوە وازتان لێ هێنان؟! ئایا وەکوو خۆتان ماونەوەو هیچ نەگۆڕاون‌و هەر دەڵێی پەندو ئامۆژگاریتان نەبیستووە؟!

پەروەردگار لە ئایەتەکەدا بە چەند جۆر حەرامی مەی‌و قوماری دووپات کردۆتەوەو، عیلەت‌و بایبسی بۆ هێناوەتەوە، لە قورئاندا زۆر بە کەمی بایبس بۆ ئەحکامی شەرعی هێندراوەتەوە بەڵام لێرەدا بە درێژیی حیکمەت‌و عیلەتەکانی بەیان کردوون:

١- ناوی ناون پیس، وشەی (رجس)ی بۆ بەکار هێنان، لە زمانی عەرەبیدا ئەو وشەیە ئەو پەڕی پیسی‌و قیزەونی دەگەیەنێ!

٢- کردنی بە هاوشانی بتپەرستی‌و بەخت گرتنەوەو خۆم‌و بەختم کە لە داب‌و نەریتە پڕو پووچەکانی سەردەمی نەزانی بوون!.

٣- خستنیە خانەی کردەوەکانی شەیتان چونکە دەبنە کان‌و سەرچاوەی فەسادو نارەزامەندیی خودا!.

٤- خۆپاراستن‌و دوورکەوتنەوە لێیان هۆی رزگار بوون‌و سەفرازین.

٥- کردنی بە هۆی دروست بوونی دوژمنایەتی‌و ڕق‌و کینە، کە هەردووکیان دەبنە هۆی تاوان‌و فەساد لە ماڵ‌و نامووس‌و گیان‌و جەستە!.

٦- گردنی بە لەمپەڕو مانیع لە یادکردنی خوداو لە نوێژکردنی رێك و پێك، کە یادی خوداو نوێژ، کۆڵەکەی ئایینن و تێشوو کەرەسەی موسوڵمانانن.

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر حەرامی مەیی و قومار دەکاتەوەو هەڕەشەی توند ئاڕاستەی ئادەمیزاد دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ﴾ فەرمانبەرداری فەرمانی خودا بن، گوێ بیستی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بن، چیتان پێ راگەیەندراوە لە خوداو پێغەمبەرەوە دەربارەی خۆپاراستن لە مەی خواردنەوەو قومار کردن و باقی شتە حەرامەکانی تر پابەندی بن و بەموو لێی لانەدەن!! ﴿وَاحْذَرُواْ﴾ بترسن لەو ناڕەحەتی و بەخت ڕەشییەی کە تووشتان دێ ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بکەن؛ بترسن لە بەرپابوونی فیتنەو ئاژاوەو تێدا چوونی ماڵ و گیان لە دونیادا، سزای سەخت و کوشندە لە قیامەتدا، چونکە خودا هیچ شتێکی حەرام نەکردووە ئیللا زیانی تێدایەو لەبەر زەرەرو زیانەکانی یاساغی کردووە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – النور/٦٣﴾.

جا ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە پشتان هەڵکردو پابەندی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەر نەبوون ئەوە بزانن ﴿فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ پێغەمبەری ئێمە ڕاگەیاندنی لەسەرە، ئەوا ڕەوانەکراوی ئێمە پەیامی خۆی پێ گەیاندن، ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دا، ئیتر ئێوە تازە بیانووتان بەدەستەوە نامێنێ و عوزرو بەهانەتان دەبڕێ. کەسێك ترسێندرا عوزری نامێنێ!! ئەوەتا پێغەمبەر پەیامی خودای پێ ڕاگەیاندن و تێی گەیاندن، ئەمجار کێ سەرپێچی بکا ئەوە بە دەستی خۆی خۆی دەخاتە ئاگری دۆزەخەوە، پێغەمبەر لێیان بەرپرسیار نیەو داکۆکیان لێ ناکاو ناتوانێ سزایان لێ دووربخاتەوە، ئەوانە بۆخۆیان یاخی بوون سەرپێچی فەرمانی خودایان کردووە، کاریان لای خودایەو ئەویش بە توانایە دەتوانێ پڕاو پڕ سزای یاخی بووان بداتەوە.

کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێو مەینۆشی تێدا حەرام کرابوو، بە پیسو کاری شەیتان دانرابوو، هەندێ لە هاوەڵان وتیان: ئاخۆ حاڵی ئەو هاوەڵانەمان چۆن بێ کە مردوونو مەینۆش بوون؟ یان وتیان: دەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێ کە لە جەنگی ئوحوددا کوژراونو شەرابەکە لە گەدەیاندا بوو (واتە پێش حەرام بوونی)؟؟

هەندێ گومان پەیداکەر کە دەیانویست ئاشوبو ئاژاوە بڵاوبکەنەوە لە هۆکارەکانی داهێنانی شەریعەتدا کەم بایەخی پەیدا بکەن، ئەوانیش جۆرێ لەو قسانەیان فڕێ دەدا، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ﴾ تاوانو تۆڵە سەندنەوە نیە لەسەر ئەوانەی خاوەن بڕوا بوونو کردەوەی باشیان ئەنجام داوە. واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەر هەبووەو پێش یاساغ کردنی مەی. لە دونیا دەرچوون، وەکوو حەزرەتی (حەمزە) هەروەها لەسەر ئەوانەی کە لە ژیاندا ماونو پێش یاساغ کردنی مەیو قومار مەینۆش بوونو قوماریان کردووە وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود؛ ئەوانە هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە، چونکە شەریعەتو یاسا کاردانەوەیان بۆ دواوە نیە، گرنگ ئەوەیە دوای هاتنەخوارەوەی ئایەتی یاساغ کردن نەیخۆنەوە!.

پێش هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە حەڵاڵ بووە! بەمەرجێك ﴿إِذَا مَا اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ تەقواکار بووبن، بڕوایان بەو حوکمانە هەبووبێ خودا ناردوونیە خوارێو کردەوەی باشیان ئەنجام دابن، ئەو ئەرکو واجباتەی لەسەریان بووە وەکوو نوێژو ڕۆژو بە ڕێکوپێکی جێبەجێیان کردبێ.

﴿ثُمَّ اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ﴾ ئەمجار خۆیان پاراستبێ لەو شتانەی لێیان قەدەغە کراوەو بڕوایان هەبووبێ بەو پەیامەی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نێردراوە ﴿ثُمَّ اتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ﴾ ئەمجار بەردەوام بووبن لەسەر خۆپارێزیو چاکەکارییو کردەوەی چاك، سەرپێچی فەرمانی خودایان نەکردبێ، ﴿وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾

پەروەردگار چاکەکارانی خۆش دەوێ‌و پاداشی چاکەکارییەکەیان دەداتەوە، چاکەی ڕاستی‌و کار درووستیان پاشگوێ ناخات![1]

کەواتە: مەبەست بە تەقواو ئیمان لە جاری یەکەمدا پەیداکردن‌و هەبوونی خودی تەقواو ئیمانەکەیە، لە جاری دووەمدا مەبەست بەردەوام بوونە لەسەر ئەو تەقواکاری‌و ئیمان دروستیە، لە جاری سێیەمدا مەبەست خۆپاراستنە لە ستەمکاری‌و هەرگیز زیانی بۆ کەس نەبووبێ لەگەڵ خەڵکدا چاکەی کردبێ‌و بە هانای لێقەوماو هەژارانەوە چووبن.

مامۆستا (سەید قوطب) دەفەرموێ: باشترین ڕاڤە کە بۆ ئەم ئایەتە کرابێ ئەوەیە: کە ئیبنو جەریری طەبەری کردوویەتی‌و دەڵێ: مەبەست بە (تقوی) لە جاری یەکەمدا وەرگرتنی فەرمانی خودایە بۆ قبووڵ‌و بڕوا پێ کردن‌و گەردنکەچی بۆی‌و کارپێکردنی!

(تقوی) لە جاری دووەمدا مەبەست بەردەوام بوونە لەسەر ئەو بڕوا پێکردنە! (تقوی) لە جاری سێیەمدا بریتییە لە خۆ نزیك کردنەوە لە خودا بە خێرو چاکە کردن.

لەم شیکردنەوەی ڕابورد ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە: ئایەتەکە عوزری تێدایە بۆ ئەوانەی کە مردوون‌و بەڵگەیە لەسەر ئەوانەی کاتی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەو

---

[1] - لێرەدا مامۆستا (سەید قوطب) دەفەرموێ: لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا نووسراوێکم نەبینی کە دڵم پێی ئاو بخواتەوە، دەربارەی دووبارەو سێ بارەبوونەوەی وشەی (تقوی) جارێك لەگەڵ (ئیمان‌و عەمەلی صالح) جەڵێك لەگەڵ (ئیمان)دا، جارێکیش لەگەڵ (ئیحسان)دا.

بۆخۆشم نەمتوانی تەفسیرێکی وا بکەم کە دڵم پێی ئاو بخواتەوە، لە چاپی یەکەمی تەفسیری (في ظلال القران)دا چەندێکم کرد نەمتوانی تەفسیرێك بۆ ئەو دووبارە بوونەوەی وشەی (تقوی) بدۆزمەوە، لە کۆتاییشدا دەفەرموێ تا ئێستاش نەمتوانیوە تەفسیرێکی وا بۆ ئەم ئایەتە بکەم کە دڵم لێی ڕازی بێ.

في ظلال القرن ج ٣٩/٣ – ٤٠ دار أحياء التراث العربی ط ٥.

دوایی لە ژیاندا بوون... چونکە کە ئایەتی مەی هاتنە خوارێ هاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کردو وتیان: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێ کە مردوون‌و مەینۆش بوون‌و پارەی قوماریان خواردووە؟؟؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ!

دوای هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە ئیمامی عومەر ویستی (حەد) لەسەر قودامەی کوڕی مەظعوونی جومەحی جێبەجێ بکا کە یەکێك بوو لەوانەی کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە، شایەتییان لێدا کە دوای حەرام کردنی مەی بەم ئایەتە، مەی خواردۆتەوە. ئیمامی زوهری دەڵێ: جارود سەرەك خێڵی عەبدولقەیس‌و ئەبو هورەیرە شایەتییان لە قودامەی کوڕی مەظعوونی جومەحی دا کە مەی خواردۆتەوە عومەر ویستی جەڵدەی لێ بدا، قودامە وتی: تۆ مافی ئەوەت نیە چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ...﴾ عومەر فەرمووی: ئەتۆ لە ئایەتەکە حاڵی نەبووی، ئەگەر تۆ لە خودا ترس‌و خۆپارێز بوویتایە خۆت دەپاراست لەوشتەی خودا حەرامی کردووە! ئیبنو عەبباسیش دەفەرموێ: ئەم ئایەتە نێردراونە خوارێ عوزرن بۆ مردووان‌و بەڵگەن لەسەر زیندووان، ئەوەی لە ئایەتەکە وەردەگیرێ بە کورتی ئەم حوکم‌و زانیاریانەن:

١- مەی لەساڵی سێیەمی کۆچی یاساغ کراوە لەدوای رووداوی جەنگی ئوحوود! ئیبنو حەجەر رایەکی هێناوە دەڵێ: ساڵی هەشتەمی کۆچی حەرام کراوە، شافیعی دەڵێ: حەددی مەی خواردنەوە چل دارە، جەماوەری زانایانی تر دەڵێن: هەشتا دارە.

٢- ئایەتەکە حەرامی مەی‌و هەموو شتێکی تری سەرخۆشکەری لەخۆ گرتووە، هەروەها قومارو هەموو یاریەکی تری لەو جۆرە کە وەکوو قومار بچێ حەرام کردووە.

٣- حەرام کردنی مەی بە سێ قۆناغ یان چوار قۆناغ بووە! ئەم ئایەتە دوا قۆناغ بووەو بێ پێچو پەنا بەروونی حوکمی حەرامی مەیو قوماری تێدایە.

٤- جەماوەری زانایان لە یاساغ کردنی مەیو بەکارهێنانی وشەی (رجس) بۆیو فەرمان کردن بە خۆ لێ پاراستنی حوکمیان بە پیسی مەی کردووە.

بڕێ زانای تر وەکوو رەبیعەو لەیثی کوڕی سەعدو موزەنی هاوەڵی شافیعیو بڕێ زانای تری بەغدادییو قەزوێنی پێیان وایە مەی پاکە، تەنها خواردنەوەو فرۆشتنی حەرامە. سەعیدی کوڕی (الحدادی) فەرمووی دەڵێ: ئەگەر پیس بووایە لە کۆڵانەکانی مەدینەدا نەیان دەڕشتو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نەیی لێ دەکردن، وەکوو چۆن نەیی لێ کردن لە پیسایی کردن لەسەر رێگەو کۆڵانان.

٥- کە دەفەرموێ: ﴿فَاجْتَنِبُوهُ﴾ خۆ لێ پاراستنی رەهاو (مطلق) دەگەیەنێ، واتە: بە هیچ جۆرێك نابێت سوودی لێ ببینـدرێ نە بە خواردنەوە نەبە فرۆشتن یان بەکارهێنانی بۆ دەرمانو شتی تر، چونکە ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا حَرَّمَ بَيْعَهَا». ئەوەی خواردنەوەی یاساغ بێ فرۆشتنیشی یاساغە، هەروەها کە دەربارەی تەداوی کردن بە خەمر لە پێغەمبەریان (درودی خوای لەسەر بێ) پرسی فەرمووی: «إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهُ دَاءٌ» مەی دەرمان نییە بەڵکوو دەردە.

بوخارییو هی تریش لە ئیبنو مەسعوودەوە فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَجْعَلْ شِفَاءَكُمْ فِيمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ».

بەڵام حەنەفییەکان بەلایانەوە دروستە لەکاتی ناچاریدا دەرمان کردن بە مەیو بە زەهرو بەپیسی تر، ئەگەر زاندرا بە کەڵکی دەرمان دێ دروستە بەڵگەشیان ئەم

ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ — الأنعام/١١٩﴾.

٦- ئەگەر مەی لە خۆیەوە بوو بە سرکە، ئەوە بەلای هەموو زانایانەوە پاك دەبێتەوەو خواردنەوەی دروستە. بەلام کردنەوەی بە سرکەی مەی واتە: بە شت تێ کردن بکرێتەوە بە سرکە ئەوە جەماوەری زانایان بەلایانەوە نادروستە، چونکە کاتێ هاوەلان داوایان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد کە رێگەیان بدا (مەی)ی منداڵێکی هەتیو بکەنەوە بە سرکە فەرمووی: نابێ‌و نەی لێ کردن، ئیتر سەرپەرشتیاری هەتیوەکە کە عوسمانی کوڕی ئەبولعاص بوو رشتی!

حەنەفییەکان دەڵێن: مەی بە دەرمانێکی وەکوو خوێ‌و شتی تر ئاوەها بکرێتەوە بە سرکەو ئەمجار بخورێتەوە دروستە، چونکە کردنەوەی بە سرکە بریتییە لە لابردنی وەصفە فەسادەکەی، واتە: چاك کردن‌و وا لێ کردنی بۆ ئەوەی بە کەڵك بێ، دەی چاك کردن‌و پاك کردنەوەی شتی پیس دروستە.

٧- جەماوەری زانایانی سەلەف‌و هی تریش رایان وایە: هەرشتێك سەرخۆش بکا خواردنەوەی حەرامە، جا کەم بێ یان زۆر بێ، کاڵ بێ یان کوڵاو بێ، لە ترێ دروست کرابێ یان لە شتی تر، هەر کەسێك لەو شتە سەرخۆشکەرانە بخواتەوە داری حەدی لێ دەدرێ! جا ئەو مەیەی لە ترێ دروست دەکرێ بەبێ کوڵانەوە سەرخۆش دەکا، ئەوە بە تێکڕای رای زانایان حەرامە، کەم بێ یان زۆر بێ! ئەو مەیەی لە غەیری ترێ دەردەهێنرێ جەماوەری شەرعزانان بەلایانەوە یاساغە، بەلام ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف رای جیاوازیان هەیە دەربارەی مەی کە لە ترێ دروست نەکرابێ‌و کەم بێ نەگاتە ئەندازەی سەرخۆش کردن، یان لە ترێ دروست کرابێ بەلام کوڵابێتەوە ئەگەر کەم بێ نەگاتە ئەندازەی سەرخۆش کردن بەلایەوە حەڵاڵە!!

بەڵام رای فتوا پێدراو لە مەزهەبی حەنەفییەکان رای موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانییە کە بەلایەوە کەمو زۆر لە شتی سەرخۆشکەر حەرامە... بەڵگەی ئەو فەرموودەیەیە کە نەسائیو ئیبنو ماجەو هی تریش لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەتیان کردووە کە دەفەرموێ: «مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ».

حەنەفییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە (حەد) لە غەیری خواردنەوەی خەمردا بە سەرخۆش بوون نەبێ پێویست نابێ!

## نێچیرکردن لەکاتی ئیحرامدا. جەزای نێچیری کێوی

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٤﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًۢا بَـٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّـٰرَةٌ طَعَامُ مَسَـٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ ۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ ۚ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَـٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ

عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٩٦﴾﴾.

لەوەپێش پەروەردگار فەرموویی: ﴿لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ﴾ ئەمجار مەیو قوماری لێ چەرت کردنو حوکمی حەرامییان بەسەردا درا، لە چوارچێوەی شتە حەڵاڵەکاندا ئەمان ئەمجار دێ جۆرێکی تریش چەرت دەکا ئەویش راوە نێچیرە لەکاتی ئیحرامدا، واتە: راوکردن لەکاتی ئیحرام حەرامەو نابێ موسوڵمانان بیکەن!

ئیبنو ئەبی حاتەم دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ......الآية﴾ لە موقاتیلەوە نەقڵ دەکا دەڵێ: ئەم ئایەتە لەکاتی عەمرەی حودەیبییە هاتۆتە خوارێ، لەو کاتەدا موسوڵمانان ئیحرامیان بە عەمرە بەستبوو، ئیتر وا بوو باڵندەو ئاژەڵی کێوی خۆیان لە موسوڵمانان نزیک دەکردەوە بە جۆرێک کە نێچیر کردنیان زۆر ئاسان بوو بۆیان، دەیانتوانی بەدەست بیان گرن بە شمشێر بیان کوژن وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ﴾ تەنانەت موسوڵمانەکان تەماعیان لێ غاڵب بوو ویستیان نێچیریان بکەن، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان بە خودایەتی خوداو پێغەمبەرایەتی (محمد) هەیە ﴿لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ﴾ سوێند بە خودا، دڵنیابن پەروەردگار، ئێوە تاقی دەکاتەوە بە ناردنی نێچیرێکی زۆرو لێتان نزیک دەبنەوەو بۆتان بەیدەست دەبن، دەتوانن نێچیرە بچووکەکان بەدەست بگرن، نێچیرە گەورەکان بە شمشێر بکوژن. وشەی (بشیء) کە بە (نەکیرە) نەناسراوی هێندراوە، تەحقیرو هیچو پووچی دەگەیەنێ بۆیەش بەو شتە کەم بایەخە تاقیکرانەوە بۆ ئەوەی ئاماژە بێ کە کەسێک نەتوانێ خۆ لەبەر ئەو تەماعە رابگرێو فەرمانی خودا بشکێنێو نێچیری بکا، دیارە لەکاتی تەنگانەو لە

شوێنی تەنگانەو تەماعی زۆردا هەر خۆ ڕاناگرێو فەرمانی خودا دەشکێنێ؛ دیارە خۆگرتنەوەو خۆپاراستن لە شتێك کە نەفس حەزی لێیەتیو بە ئاسانی بە دەستەوە بێ، زیاتر نیشانەی تەقواو لە خوا ترسییە، تا خۆپاراستنو خۆگرتنەوە لە شتێك کە بە ناخۆشی دێتە دەست!!

ئەوە بوو ساڵی (حودەیبییە) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە هەزارو چوار صەد کەس لە هاوەڵانی بەرەو مەککە ڕۆیشتن بە نیازی عەمرە ئیحرامیان بەست، قورەیشییەکان ڕێگەیان لێ گرتن، تا لە ئاکامدا بە پەیمانو سوڵحی (حودەیبییە) کۆتایی هات، لەو ماوەدا کە موسوڵمانەکان لە ئیحرامدا بوون ئاژەڵی کێویو باڵندەیەکی زۆر بەبێ تەقیو ترس هاتنە ناو موسوڵمانەکانەوە، بە جۆرێك دەیانتوانی بەدەست بیانگرنو بە ڕمەکانیان بیانکوژن، بەڵام لەبەر خودا خۆیان پاراستو خۆیان لە خواردنی ئەو گۆشتە خۆشەی ئەو نێچیرانە گرتەوە، پەروەردگار ئەو تاقمە موسوڵمانانەی بەتاقی کردەوەو لە تاقی کردنەوەکە دەرچوون! وەکوو چۆن کاتی خۆی بەنو ئیسرائیلییەکان بە ڕاو کردنی ماسی بەتاقی کردەوە بەڵام ئەوان لە تاقی کردنەوەکە دەرنەچوون (بەیارمەتی خودا لە ئایەتی - ١٦٣ - ی سورەتی ئەعرافدا بە درێژی باسی تاقیکردنەوەکەی بەنو ئیسرائیلییەکان دەکەین).

ئەمجار پەروەردگار هۆی تاقی کردنەوەی موسوڵمانەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لِيَعْلَمَ اللّهُ مَن يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ﴾ بۆ ئەوەی خودا دەری بخاو بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە؛ کێ لە خودا ترسو پابەندی فەرمانەکانیەتی، ئەوەی کە خودا لە ئەزەلدا زانیویەتی لای ئادەمیزادانیش زاندرابێ، بزانن کێ فەرمانبەردارە، کێ سەرپێچی کەرە! بڕوا پتەوی وا لە ئینسان دەکات بە نهێنیو ئاشکرا لە خودا بترسێو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بێ.

بە کورتی خودا دەیەوێ هەڵسو کەوتی کەسێکتان لەگەڵدا بکا کە بیەوێ بە تاقیتان بکاتەوە، بۆ ئەوەی دڵو دەروونتان پاكو پاڵفتە بکا، ئەگینا خودا بۆخۆی

زاناو ئاگادارە، لە ئەزەلدا دەزانێ کێ باشەو کێ خراپە، پێویستی بە تاقی کردنەوە نیە!!

﴿فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ کەسێك دوای ئەم روون کردنەوە چڕوپڕە، سنوور بەزێنی بکا لەکاتی ئیحرامدا لە ئاخی حەرەمدا نێچیرەوانی بکا، ئەوە لە قیامەتدا سزای توندی دەدرێو دەخرێتە ئاگری دۆزەخەوە، چونکە ئەگەر دوای ئەم روون کردنەوەو پێ راگەیاندنە سەرپێچی فەرمانی خودا بکا، مانای ئەوە دەگەیەنێ کە گوێ بە تاقی کردنەوەو فەرمانی خودا نادا، سەرپێچی کردن دوای پێ راگەیاندن‌و تێگەیاندن لووت بەرزیی‌و رقەبەریی دەگەیەنێ! ئەمجار پەروەردگار بەم ئایەتەی دوایی راوکردنی ئاژەڵ‌و پەلەوەری وشکانی لەکاتی ئیحرامدا یاساغ کردو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ ئەم جڵەوگیرییە گشتییە بۆ هەموو موسوڵمانێکە چ پیاو چ ئافرەت، تاقی کردنەوەکەی ئایەتی پێشوو کە فەرموویەتی: ﴿لَيَبْلُوَنَّكُمُ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە خودایەتی خوداو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو قورئان کردووە، نێچیر مەکوژن، هیچ ئاژەڵ‌و پەلەوەرێك بێ گیان مەکەن لەو کاتەدا کە ئێوە ئیحرامتان بە حەج یان بە عەمرە، یان بە هەردووکیان بەستووە، نە بە ڕاستەوخۆ نەبە ناڕاستەوخۆ! بەم رەنگە هی تریش شارەزا بکەن بۆ شوێنی نێچیرەکە، وەکوو دەگوترێ: (فیل لە خودا ناکرێ!). ئایەتەکە ئەو حوکمە دەگەیەنێ کە ئیحرام بەستوو راو کردنی لێ قەدەغەیە لە ناوەوەی بەست (حرم)یان دەرەوەی بەست، بۆ کەسێکیش ئیحرامی نەبەستبێ لە ئاخی حەرەمدا راو کردنی لێ یاساغە.

جەماوەری زانایان دەڵێن: ئیحرام بەستوو بۆی رەوایە لە گۆشتی نێچیر بخوات، بەمەرجێك نێچیرەکە بۆ ئەو نەکرابێ، چونکە نەسائی‌و تیرمذی‌و دارەقوطنی لە جابیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «صَيْدُ الْبَرِّ لَكُمْ حَلاَلٌ مَا لَمْ تَصِيدُوهُ أَوْ يُصَدْ لَكُمْ» نێچیری وشکانی بۆ ئێوە حەڵاڵە، بەمەرجێ خۆتان نێچیری نەکەن، یان بۆتان نێچیر نەکەن.

حەنەفییەکان دەڵێن: خواردنی گۆشتی نێچیر بۆ ئیحرام بەستوو حەڵاڵە لە هەموو حاڵێکدا، بەمەرجێ ئەوەی نێچیرەکەی گرتووە ئیحرام بەستوو نەبێت! دەڵێن زاهیری مانای ئایەتەکە پشتگیری رای ئێمە دەکا چونکە ﴿لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ ئایەتەکە نێچیر گرتنو کوشتنی لە ئیحرام بەستووان قەدەغە کردووە، نەك خواردنی گۆشتی نێچیر، کە کەسێکی تری ئیحرام نەبەستوو گرتبیەتی یان کوشتبیەتی!!

ئەمجار پەروەردگار قەرەبوو کردنەوەی نێچیر گرتنو نێچیر کوشتنی ئیحرام بەستوو دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا﴾ هەرکەسێك لە ئێوە لەکاتی ئیحرام بەستندا بە ئەنقەست نێچیر بکوژێو راوی بکا ﴿فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ﴾ تۆڵەو قەرەبوو کردنەوەکەی دەبێ کوشتیەك سەر ببڕێ بە ئەندازەی نێچیر کراوەکەو وەکوو ئەو بچێ، ئەگەر کەمتیاری راو کرد دەبێت بەرانێك بکا بە قوربانی، لە جیاتی ئاسك مەڕ سەرببڕێ، لە جیاتی کەروێشك دەبێ گیسك سەربڕێ، ئەگەر وێنەی نێچیرەکەی دەست نەکەوت دەبێ بەهاکەی بکاتە خێر.

ئەو راو کردنەی ئایەتەکە جڵەوگیری لێ دەکا، راو کردنی ئاژەڵی کێوییە کە گۆشتی حەڵاڵ بێ، کەوابوو: تۆڵە لەسەر کەسێك نیە ئیحرامی نەبەستبێو ئاژەڵی ماڵی وەکوو (مەڕو بزنو رەشەوڵاخو حوشتر......) سەربڕێ، یان ئاژەڵێکی کێوی راو بکا کە گۆشتی نەخورێ، وەکوو دڕندە، یان وەکوو ئەو گیانلەبەرانە بن، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە پێنج فاسیقەکەی ناو بردوون کە کوشتنیانی بە رەوا داناوە ... کە (قەلەڕەشەو دووپشكو کۆلارەو مشكو سەگی نەهێن گر)ن. ئیمامی مالیك، گورگو شێرو پڵنگو ئەو جۆرە دڕندانەی وەکوو سەگی نەهێن گر حلێب کردووە، چونکە ئەو دڕندانە زیانیان زۆرترە.

ئیمامی عومەرو ئیمامی عەلیو ئیبنو مەسعوودو هاوەڵانی تریش فەرموویانە: لەجیاتی نوعامە دەبێ حوشترو لە جیاتی گاکێوی رەشەوڵاخێك سەربڕدرێ!

ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف دەفەرموون: پێویستە بەهای نێچیرە کوژراوەکە بدا، بەهاکەش بە گوێرەی شوێنو کاتی نێچیر کردنەکە دیاری دەکرێ! چونکە بەهاو نرخ بە گوێرەی شوێنو کات دەگۆڕدرێن، هەروەها پەروەردگار وێنەی نێچیر کراوەکەی پێویست کردووە، دەی خۆ وێنەی ئەو نێچیرە دەگمەنە، کەوابێ پەنا دەبەین بۆ بەهاکەی کە لە مانادا بە وێنە حلێب دەکرێ! جا هەرکاتێ ویسترا قەرەبووی نێچیرەکە بە ئاژەڵێکی ماڵی یان بەهاو نرخ پڕ بکرێتەوە، ئەوە پێویستە ﴿يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ دوو کەسی عادڵو لێزانو موسوڵمان هاو وێنەیی یان نرخەکەی دیاری بکەن، چونکە یەکسانی لە نێوان نێچیرو وێنەکەیدا پێویستی بە دیاری کردنی دوو کەسی شارەزاو لێزان هەیە، لەم ڕووەوە کە یەکسانیەکەیان لای زۆر کەس نادیارە!

جا کە بڕیاری سەربڕینی ئاژەڵێکی ماڵی هاووێنە درا بۆ قەرەبوو کردنەوەی نێچیرەکە، دەبێ لە حەرەمی مەککەدا سەری ببڕێ، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ﴾ تۆڵەو قەرەبوو کردنەوەکە دەبێ کوشتییەك بێ لە پەنا کەعبە سەرببڕێو گۆشتەکەی بەسەر هەژارانی بەستی کەعبەدا دابەش بکرێ!. ﴿أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ﴾ یان دەتوانێ کەفارەت بدا، ئەویش خۆراکدانە بە هەژاران بۆ هەر هەژارێك موددێك خواردەمەنی، یان لەبارتەقای خواردەمەنییەکەدا بەرۆژووبێ.

ئەگەر ئاسکێك یان ئاژەڵێکی لەو بیچمە کوشت، دەبێ مەڕێك سەببڕێ لە مەککەو گۆشتەکەی بەسەر هەژارانی حەرەمدا دابەش بکا، ئەگەر مەڕەکەی بۆ هەڵنەسووڕا، دەبێ خواردەمەنی بدا بە شەش هەژار، ئەگەر ئەوەشی بۆ هەڵنەسووڕا دەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، ئەگەر نوعامەیەکی کوشت یان کەرەکێوییەکی کوشت دەبێ حوشترێك سەرببڕێ، ئەگەر بۆی هەڵنەسووڕا دەبێ خواردەمەنی سێ هەژار بدا، خواردەمەنییەکە بریتییە لە (مد)ێك کە پێی تێربن، ئەگەر خواردەمەنییەکەی بۆ هەڵنەسووڕا دەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

ئەو شتانەمان لەسەر سنوور بەزێن پێویست کرد ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ﴾ بۆ ئـەوەی سزای سەرپێچییەکەی خۆی بچێژێ، چونکە سنووری خودای شکاندووە دەبێ تۆڵەی لێ بسێندرێتەوە یان بە ماڵ، یان بە کردەوەی بەدەنی!!

﴿عَفَـا اللَّـهُ عَمَّـا سَـلَفَ﴾ خـودا خـۆش بـووە لەوەی کە پـێش پـرس کـردن بـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـەکاتی ئیحرامـدا نێـچیرتان گرتـوونو کوشتوون، ئەوە خودا لەسەر ئەو کارەتان سزاتان نادا.

﴿وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْـهُ﴾ کەسێك دوای ئـەم نەهیـە ئاشکرایە بگەڕێتـەوە بـۆ عادەتی پێشووی‌و، نێچیر بگرێ‌و سەرپێچی فەرمانی خودا بکا؛ ئەوە دڵنیا بن خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوە باش باش سزای دەداو کەسیش نیە بەرگری لێ بکا. ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ﴾ خودا باڵا دەستەو هەرکارێکی بوێ دەیکات. خاوەنی تۆڵەو سزای سەختە بۆ ئەو کەسانەی کە سوورن لەسەر ئەنجامدانی تاوان.

ئایەتەکە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە سزای دونیایی کاتێك بری سزای قیامەت دەکەوێ، ئەگەر تاوانەکە دووبارە نەکاتەوە، ئەگەر دووبارەی کردەوە شیاوی تۆڵە لێ ستاندنە، لە دونیادا؛ کەفارەت لێ ستاندن‌و لە قیامەتیشدا ئاگری دۆزەخ.

بەڵام ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ﴾ حەڵاڵ‌و ڕەوایە بۆ ئێـوە نێـچیری دەریـا، واتـە: ڕاو کردنی گیانلەبەرانی دەریا بۆتان حەڵاڵە ﴿وَطَعَامُهُ﴾ هەروەها ئەو گیانلەبەرانەی کە شەپۆلەکانی دەریـا فڕێیـان دەدا بـۆ قـەراخی! دروسـتە بـۆ مرۆڤـی ئیحـرام بەسـتوو خواردنی گۆشتی گیانلەبەرانی دەریا، زیندووبن یان مردوو بن، شەپۆل فڕێی دابـێ، یان بۆخۆی سەر ئاو کەتبێ یـان لـە گـۆلاوو دێـراودا گیریـان خواردبـێ، یـان شـەپۆل فڕێی دابن‌و ئاویان لێ بڕابێ، چونکە خاوەنانی چوار سوننەکان لە ئەبو هـورەیرەوە گێڕاویانەتـــەوە: پێغەمبـــەر (دروودی خـــوای لەســـەر بـــێ) لـــەبارەی دەریـــاوە فەرموویەتی: «الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ» دەریا ئاوەکەی پاکە، مردارەوەبووی پاکە.

﴿مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ واتە: گیانلەبەرانی دەریامان بۆ حەڵاڵ كردوون تا سوودی لێ وەربگرن، لە ماڵەوە بن یان لە سەفەردا بن، كەسێك لە ماڵەوە بوو، با لە نێچیری دەریا بخوا بە تازەیی، كەسێك لەسەفەردا بوو با لە گۆشتی هەڵگیراو لە سەلاجەدا بخوا ئەگەر سەفەرەكەی لە بەحرا نەبوو، نێچیری دەریا سوودو لەززەتی تێدایە لەسەفەرو لە حەضەردا چ بە خواردن بێ یان بە هەڵگرتن‌و پەزمەندە كردن (إدخار) بێ، یان بە سوود لێ وەرگرتن بە غەیری لێ خواردن وەكوو دەرهێنانی لوئلوئو مرواری، یان زەیت لێ وەرگرتن، یان ئەو سودەی لێ دەبیندرێ لە ئێسقان‌و ددان‌و عەنبەر لێ پەیدا كردن...

﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ بەڵام نێچیری وشكانی، ئاژەڵ یان پەلەوەر، كە بە شێوەیەكی سروشتی دروست بووبێ زاوزێیان لە وشكانیدا دەبێت‌و بە شێوەیەكی سروشتی كێوین‌و نامۆن، تا لە ئیحرامدا بن نێچیر كردنی ئەو گیانلەبەرانە یاساغە لێتان!

بەڵام ئەگەر یەكێكی ئیحرام نەبەستوو راویان بكا، یان بۆ خۆتان پێش ئیحرام بەستن نێچیریان بكەن، ئەوە دەتوانن لە گۆشتەكەیان بخۆن!! وەكوو لە پێشەوە زانیمان كە جەماوەری شەرع زانان بەلایانەوە رەوایە كە ئیحرام بەستوو لە گۆشتی نێچیری وشكانی بخوا، بەمەرجێ بۆخۆی نێچیری نەكا، یان بۆی نێچیر نەكەن! حەنەفیەكان بە لایانەوە رەوایە كە ئیحرام بەستوو لە گۆشتی نێچیری وشكانی بخوا، بەمەرجێك ئەوەی نێچیری دەكا لە ئیحرامدا نەبێت؛ واتە: ئەگەر ئەو كەسە لەبەر خاتری ئیحرام بەستووە كە نێچیر بكا، هەر بۆی حەڵاڵە، یەكەم چونكە زاهیری ئایەتەكە ئەوە دەگەیەنێ، دووەم ئاماژە بەو فەرموودەیەی كە (محمد) لە ئەبو حەنیفەوە ئەویش لە ئیبنولمونكەدیرەوە ئەویش لە طەڵحەی كوڕی عەبدوڵلاوە كە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە باسی خواردنی گۆشتی نێچیرمان دەكرد لەلایەن ئیحرام بەستووەوە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) خەوی لێ كەوتبوو دەنگمان بەرز كردەوەو پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ)

بەخەبەر هات فەرمووی: ئەوە كێشەی چیتانە؟ عەرزمان كرد دەربارەی خواردنی گۆشتی نێچیر بۆ كەسێك لە ئیحرامدا بێت، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كردین بە خواردنی.

ئەمجار پەروەردگار كۆتایی روونكردنەوەكەی حوكمی نێچیری بە فەرمان كردن بە تەقوا هێناو فەرمووی: ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِيَ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ واتە: خۆتان بپارێزن لەو شتانەی كە خودا نەهی لێ كردوون، وەكوو نێچیر كردن لەكاتی ئیحرام بەستن‌و هەموو تاوانێكی تری وەكوو مەینۆشی‌و قومار كردن... هتد. بترسن لە خودا بەو رەنگە پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەكانی بن، دڵنیا بن ئێوە لە ئاكاما هەمووتان دەچنەوە لای خوداو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، حیسابی توندو تیژتان لەگەڵ دەكا، سزای یاخی بووان دەداتەوەو دەیانخاتە ناو دۆزەخەوە، پاداشی ئەوانە دەداتەوە كە فەرمانبەردارن بە بەهەشت‌و رەزامەندیی خۆی لێیان!.

## پلەو پایەی كابەو مانگەكانی حەرام‌و چۆنیەتی دیاری ماڵی خوداو نیشانە كراو

﴿ ۞ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَۚ ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٩٧ ﴾.

ئەمجار پەروەردگار پلەو پایەی كەعبەو مانگەكانی كە بە (شهر الحرم) بەناوبانگن‌و شەڕ كردن تێیاندا یاساغە، دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿جَعَلَ اللّهُ الْكَعْبَةَ

الْبَيْتَ الْحَرَامَ قِيَامًا لِّلنَّاسِ﴾ پەروەردگار کەعبە کە (بەیتولحەرامە) کردوویەتی بە هۆکاری ئەوە کە خەڵکی کاروباری ئایینیو دونیاییان چاك بکەن، هۆکارێکی سەرەکیە بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی ئەو خەڵکانەی کە لە دەوروبەریدا نیشتەجێ بوون، چونکە وڵاتی مەککە وڵاتێکە نە کشتو کاڵی تێدا دەکرێ نە ئاژەڵی تێدا بەخێو دەکرێ، بەدەگمەن نەبێ پێویستیاتی دانیشتوانی تێدا دابین ناکرێ، ئیتر پەروەردگار کەعبەی لە دڵی ئادەمیزادانـدا خۆشەویستو رێزدار کردووە، حەزیان لە دیدەنی کردنی هەیەو لە هەموو لایەکەوە خەڵکی بۆی دەچنو بۆی دەکشێن؛ ئەم هاتنو کۆبوونەوەی ئادەمیزادان لە دەوری کەعبە دەبێتە هۆی نازو نیعمەت بۆ خەڵکەکەی دەوروبەری؛ سوودی ئابوریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری لێ وەردەگرن، هەر وەکوو چۆن دانیشتوانی ئەو هەرێمە لە سایەی کەعبەوە لە ئەمنو ئاسایشدا دەژینو کەس دەستدرێژی ناکاتە سەریان ﴿وَالشَّهْرَ الْحَرَامَ﴾ هەروەها پەروەردگار ئەو مانگانەی کە شەڕ کردن تێیاندا یاساغ کراوە کە مانگی (ذولقەعدەو ذولحیجەو موحەڕڕەمو رەجەب)ن، کردوونی بەهۆی دابین کردنی پێویستیاتی خەڵکی، کە لەم مانگانەدا ئادەمیزادان بەرگی شەڕ دادەنێنو ترسو خۆفیان نامێنێ، دەتوانن هاتوچۆی بازرگانی بکەن، بەدڵنیاییەوە هاتوچۆی شارەو شار بکەنو ترسی لەدەستدانیماڵو سامانی خۆیانو گیان لەدەست دانیان نەبێ، لەو مانگانەدا زۆربەیان دەیانتوانی بژێوی ساڵەکەیان پێکەوە بنێن ﴿وَالْهَدْيَ وَالْقَلاَئِدَ﴾ هەروەها پەروەردگار ئەو کوشتییانەی کە دەکرێن بە دیاری بۆ کەعبەو ئەو حەیوانانەی کە ملوانکەیان لە ملی دەکرێ لەکاتی بردنیان بۆ دیاری کەعبەو سەربڕینیان لەوێ کردوونی بەهۆی دابین کردنی بژێو بۆ دانیشتوانی دەوروبەری، چونکە ئەو کوشتیانە لەوێ سەردەبڕێنو گۆشتەکەیان بەسەر هەژارانی ئەو دەفەرەدا دابەش دەکرێو پێویستییاتیان جێبەجێ دەبێ.

لە سۆنگەی کەعبەوە دانیشتوانی مەککە پلەوپایەیەکی تایبەتییان پێ دراوە، لە ماڵو گیانی خۆیان دڵنیان؛ بێگومان عەرەبەکان لەناو خۆیاندا هەمیشە شەڕو

هەرایان بوو خەریکی یەکتر کوشتنو یەکدی تاڵان کردن بوون، بەڵام لەناو بەست (حرم)دا دەستیان بۆ یەکتر درێژ نەدەکرد، تەنانەت وا دەبوو: پیاو لە ناو بەستدا تووشی دوژمنی بابەکوشتەی خۆی دەبوو، یان بکوژی کوڕی خۆی دەبینی، هیچ دەستی بۆ درێژ نەدەکرد، ئەگەر کابرا گەورەترین تاوانی ئەنجام بدایە لە ناوبەستدا کەس لاقەی نەدەکرد، هەر کەسێ پەنای بۆ ئەو خانووە ببردایە پەنای دەدرا، کەس تێیدا نەدەترسا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ – العنكبوت/٦٧﴾. لەوێدا هەزاری برسی تێری دەخوارد، لەم ڕووەوە کە بەهۆی ئەنجامدانی کاری حەج لە هەموو لایەکەوە ئادەمیزادان ڕوویان تێ دەکرد، لەوێ کوشتیو دیارییان سەردەبڕی، گۆشتەکەیان بەسەر هەژاراندا دابەش دەکرد، ئیتر بەهۆی حەج کردنو کۆبوونەوەی ئادەمیزادان لەوێ، وڵاتێکی ئاوا ڕەقەنو بێ کشتو کاڵو ئاژەڵ، ئاوەدان بۆتەوە، ئەگەر بەهۆی کەعبەوە نەبوایە کەس تێیدا نیشتەجێ نەدەبوو! پەروەردگار نزاو پاڕانەوەی تێدا گیرا کردووە، پاداشی چاکەی تێدا دووچەندانە کردۆتەوە، بۆ ئەوەی موسوڵمانان هەوڵی دیدەنی بدەن، هەر وەکوو چۆن کۆبوونەوەی ئەو هەموو خەڵکە لە چوارلای دونیاوە کە دێن بۆ دیدەنی کردنی گەلێك سوودبەخشە، تەنانەت هیچ کۆبوونەوەیەکی سەردەم بەو جۆرە سوودبەخش نیە.

هەروەها کردارەکانی حەج چەند سوودێکی ئایینی تێدایە، حاجی دیاردەی دووره پەرێزی لە هۆکارەکانی دونیا ویستی پێوە دیارە، لە خودا نزیك دەبێتەوەو خۆی لەو شتانە دەپارێزێ کە خودا نەی لێ کردوون! بە پۆشاکێکی تایبەتی کفن ئاساوە لە خودا دەپاڕێتەوە، بە جۆرێك کە زیاتر لە هەڵسوکەوتی حەشرو نەشری ڕۆژی قیامەت دەکا! دڵنیاییو دڵ ئارامی بۆ پەیدا دەبێ، خێرو بێری دونیاو قیامەتی دەست دەکەوێ... سەعیدی کوڕی جوبەیر فەرموویەتی: کەسێ بێتە خزمەت ئەم ماڵی خودایەو داوای شتێکی دونیایی یان قیامەتی لێ بکا دەستی دەکەوێ!.

لە راستیدا کاتو سەردەمی حەج کردن ئەگەر وەکوو پێویست ئەنجام بدرێ — جگە لە پاککردنەوەی دڵو دەروونو گوناه شتنەوەو رزگار بوون لە تاوان — سوودو قازانجی تریشی هەن؛ چونکە حەج کۆڵەکەیەکی پتەوە بۆ ئیسلامو هۆکارێکی فرە مەزنە بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان موسوڵمانانو بەهێز کردنو گەشەپێدانی برایەتی نێوان موسوڵمانان، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ — الحجرات/١٠﴾. هەروەکوو هۆکارێکی گەلێ گرنگە بۆ مشتو ماڵ کردنی گیانی ئایینیو بەهێز کردنی هەستی هاریکاری نێوان موسوڵمانان بە گشتی؛ چ حکومەتەکانیان چ نەتەوەو گەلەکانیان، لە هەموو سووچو قوژبنی سەرزەویدا لە هەموو بوارەکانی ئابوریو کۆمەڵایەتیو رامیاریو زانستیو.....هتد.

﴿ذَلِكَ﴾ ئەو رێز پێدانە بە کەعبەو مانگەکانی حەرامو کوشتیو دیاری نیشانە کراو بۆ کابەو دابین کردنی ئەمنو ئاسایش لە ناوچەی بەستی کەعبەداو لە رۆژگاری مانگەکانی کە شەڕیان تێدا قەدەغەیە، هەموویان سوودبەخشنو بۆ ئادەمیزادو بەرژەوەندیان تێیاندا دابین دەکرێ ﴿لِتَعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ بۆ ئەوەی بەسەرنجو تێفکرینەوە بزانن کە خودا زانایە، هەرچی لە ئاسمانو زەویدا هەیە پەروەردگار ئاگای لێیەتیو دەزانێ بەرژەوەندیان لە چیدایە ﴿وَأَنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی تێبگەن کە پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێکی لێ گوم نابێت!

بێگومان هیچ گەلو نەتەوەیەك لە کۆنو نوێدا نەیانتوانیوە ئەمنو ئاسایش بە بەردەوامی بۆ وڵاتێك لە وڵاتان دابین بکەنو نەهێڵن بڕەی بڕەی کوشتو کوشتاری تێدا رووبدا!!

بەڵێ؛ ئەو رێزلێنانەی کەعبەو دانانی بەستو یاساغ کردنی شەڕو کوشتو کوشتار تێیداو هەروەها یاساغ کردنی شەڕ لەدەقەری دەوروبەری لەچەند مانگێکی دیاری کراودا، بۆ ئەوەیە: کە ئادەمیزادان بزانن کە خودا سروشتی ئادەمیزاد

دەزانێ‌و ئاگای لە پێویستیاتی دڵ‌و دەروونیان هەیە، دەزانێ گیانیان بۆچی هوتاف دەکێشێ! بۆ ئەوەیە کە ئادەمیزاد بزانن کە خودا بۆیە شەریعەت‌و یاسا دادەنێ تا پێویستی سروشتی بەندەکانی دابین بکرێ، بۆ بەپیرەوە هاتنی حەزو ئارەزووی ئەوانە!! جا هەرکاتێ دڵی ئادەمیزادان هەستیان بە رەحمەت‌و کاردروستی پەروەردگار کرد لە دانانی یاساو نیظامدا، دەزانن کە گونجان‌و تەناسوقێکی گرنگ هەیە لە نێوان ئەو یاساو نیظامەو سروشتی ئەواندا، ئەوکاتە بۆیان روون دەبێتەوە کە خودا زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو نهێنی‌و شاراوەو ئاشکرایەکی ئاسمانەکان‌و زەویداو هیچ شتێکی لێ گوم نابێ!

## ترساندن لەسزای خوداو هەڵنانی ئادەمیزاد بۆ چاکەکردن

﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئادەمیزادانی ترساند لەوەی کە سنووربەزێنی لە چوار شتدا بکەن، بەوەی کە فراوانی‌و گشتیەتی زانستی پەروەردگاری راگەیاندو ئەوەی روون کردەوە کە خودا هەموو شتێك دەزانێ‌و هیچ شتێکی لێ هون نابێ، ئەمجار لە ئایەتەکانی داهاتوودا خەڵکی هوشیار دەکاتەوە کە

سزای سەرپێچیکەر دەداو هەموو کارو فەرمانێك بەدەستی خۆیەتی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەنها راگەیاندنی لەسەرەو هیدایەتو تەوفیقو پاداش دانەوە، تایبەتە بە زاتی پەروەردگارەوەو کەسی تر مافی ئەوەی نیە! حیکمەتو عەدالەتیش داخوازی ئەوەن کە جوداوازی نێوان پاكو پیس، چاكو خراپ بکرێ! بۆیە دەفەرموێ: ﴿اعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ دڵنیا بنو بزانن کە خودا تۆڵەو سزادانەوەی سەختو بە ئێشو توندە، بزانن خودا هیچ شتێکی لێ گوم نابێ، هەرکەسێك لە خودا یاخی بێ سزای بە ئێشی دەدرێتەوە ﴿وَأَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بزانن کە خودا لێخۆشبوو بە بەزەییە بۆ ئەو کەسانەی بەکردارو گفتاری چاك دڵو دەروونی خۆیان پاك دەکەنەوە، بڕوای پتەویان هەیەو تەنها خودا دەپەرستن، ئەو تاوانانەی پێش موسوڵمان بوونیان ئەنجامیان داون هیچ لێپرسینەوەیەکیان لەسەر نیە، هەروەها ئەو تاوانانەی کە بە نەزانی ئەنجامیان داون بەمەرجێك خێرا تۆبە بکەنو پەشیمان ببنەوە خودا لێیان خۆش دەبێ، هەروەها خودا لەسەر تاوانی بچووك سزایان نادا بەمەرجێك خۆیان لە تاوان کردنی گەورە بپارێزن، بەڵکوو تاوانە بچکۆلەکانیان دادەپۆشێو لە ناو کردارە چاکەکانیان دەتوێنەوە! وەکوو چۆن پیسایی کەم لە ناو ئاوی زۆردا نموودی نیەو دەپوکێتەوە، سەرباری ئەوەش خودا رەحمەتو رەزامەندی خۆی دەکاتە سەربارو پارسەنگ.

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە ئیمانو باوەڕ پێویستی بە خەوفو رەجا هەیە، ترسان لە سزادانو هومێدی رەحمەتو رەزامەندی دەبێ پێکەوە بن، دەبێ بڕوامان وابێ کە پەروەردگار ئێمەی بە بێ هودە دروست نەکردووە، بەڵکوو لێپرسینەوە هەیەو سزای سەرپێچیکەرو پاداشتی فەرمانبەردار دەدرێتەوە!

لە ئایەتەکەدا سزاو عیقابی پێش لێخۆشبوونو رەحمەت خستووە تا ئاماژە بێ بۆ ئەوەی کە لایەنی رەحمەتو لێخۆشبوونی زاڵە بەسەر سزاو عیقابیدا، چونکە رەحمەتی خودا پێش رقو غەزەبی کەوتووە. وەکوو لە حەدیثدا چەسپاوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي».

هەروەها وەکوو لە شوێنێکی تری قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ – المائدة/١٥﴾.

پەروەردگار لە ئایەتەکەدا لەبەرامبەر وشەی (عقاب) دوو وەصفی هێناون (غفور، رحیم – لێبوردوو بە بەزەیی)، ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەمە وردەکارییەکی گرنگی تێدایە، ئەویش ئەوەیە: کە سەرەتای دروست کردن و بەدیهێنان لەبەر رەحمەت بووە وا دیارە کۆتاییش لەسەر رەحمەت و بەزەیی دەبێ!

ئەمجار بەرپرسیارێتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَّا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ﴾ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) جگە لە پێ ڕاگەیاندن بەولاوە هیچی تری لە ئەستۆ نیە، ئەو ناتوانێ بە تۆپزی خەڵك بخاتە سە رێگای هیدایەت و تەوفیقیان بدا بۆ ئیمان هێنان، ئەوەی ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرە تەنها پێ ڕاگەیاندن و ئامۆژگاری کردنە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ناتوانێ ئاگادار بێ بەسەر هەموو کردارێکدا کە موکەلەفەکان ئەنجامی دەدەن، ئاگای لە نهێنی و پەنامەکی خەڵك نیە، بۆیە ناتوانێ حیساب و لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئادەمیزادان بکاو سزاو پاداش لەسەر کردارو گوفتاریان دیاری بکا.

﴿وَاللّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ خودا زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەو شتانەی ئاشکرایان دەکەن ئەوانەی دەیشارنەوە، خودا دەیزانێ و هیچی لێ گوم نابێ، ئەو شیاوی حیساب کردنە لەگەڵ ئادەمیزادان و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکاو سزاو پاداشیان بۆ دەستنیشان دەکا! وەکوو لە شوێنێکی تردا پەروەردگار بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ – الرعد/٤٠﴾.

ئەمجار پەروەردگار دوو حەقیقەتی دژ بەیەك دەچەسپێنێ کە هەریەکەیان سزاو پاداشی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوانەش حەقیقەتی پیسی و حەقیقەتی پاکییە! فەرمووی: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بە هەموو ئادەمیزادێك رابگەیەنە کە ﴿لا يَسْتَوِي

الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ﴾ هەرگیز پیسو پاك چوون یەك نین، کرداری باشو خراپ وەکوو یەك حیسابیان بۆناکرێ. زیان بەخشو سوود بەخش نابن بە یەك، حەڵاڵو حەرام، ستەمکارو دادپەروەر، زاناو نەزان، چاكو خراپ، موسوڵمانو کافر......هتد. چوون یەك نین، هەریەکەیان پاداشو سزای تایبەتی خۆی هەیە! حیکمەتو دادپەروەریش نیە کە یەکسانی بخرێتە نێوان چاكو خراپەوە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ – ص/٢٨﴾.

ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: بە هیچ شێوەیەك پیسو پاك یەکسان نین ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ﴾ با زۆری پیسییەکە سەرسامت بکاو سەرنجت رابکێشێ! شتی پیس زۆرو هەمە جۆرە:

پیسی خەڵك، پیسی ئاژاوەگێرانو فێڵبازان، پیسی ماڵو دارایی حەرام، پیسی ریباو بەرتیلو خیانەتکاران، لە بەرامبەر کەمی پاکیدا. کەمی راستاڵان، کەمی چاكو خۆڕاگران!! کەمێك حەڵاڵ وەکوو معاشی دادوەری دادپەروەر، قازانجی بازرگانی راستگۆو دەستپاك باشترە لە ماڵی حەرامی زۆر وەکوو بەرتیلو ریباو دەستبڕین لەم رووەوە کە تەرازووی باشو خراپ ئاکامەکەیانە، خۆراکی کەمو بە سوود باشترە لە خۆراکی خراپو تێکچوو با زۆریش بێ، کاڵای باش با کەمیش بێ لە کاڵای خراپی زۆر باشترە، هەروەها تاقمو کۆمەڵێکی باش لە ئادەمیزادان زۆر باشترە لە کۆمەڵانی خراپو ئاژاوەگێڕ، کۆمەڵی موسوڵمانی کەمو ئازاو خۆڕاگرو خاوەن بیروباوەڕ، زۆرجار وادەبێ سوپایەکی زۆری بێ شوماری ترسنۆكو بێ بڕوا تێك دەشکێ!! بەڵکوو وا دەبێ چەند کەسێکی خاوەن ئاوەزو زیرەكو دانا کاری وا ئەنجام دەدەن، کۆمەڵانێکی زۆرو بێ شومار پێیان ئەنجام نادرێ، زانایەکی داناو لێزان هەزاران نەزانو کەم عەقڵ دەکاتە خزمەتچی خۆی!

﴿فَاتَّقُواْ اللّهَ يَا أُولِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ خۆتان لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خودا بپارێزن ئەی هۆشمەندان! مەهێڵن شەیتان بەسەرتاندا زاڵ بێ،

زۆریـی ئـه‌هلی بـه‌تاڵو ئـاژاوه‌گێڕ، زۆریـی مـاڵی حـه‌رامو دارو ده‌سـته‌ی لـه ڕێ ده‌رچووان هه‌ڵتان نه‌خه‌ڵه‌تێنێ، چونکه هۆشمه‌ند ئه‌و که‌سه‌یه په‌ند وه‌ربگرێو تێ بگاو بیربکاته‌وه، له سزای خودا بترسێ، به‌ڵکوو ئێوه به‌م ته‌قواو خۆپارێزییه ڕزگارتان ببێ، ڕێگای سه‌رفرازیو سه‌رکه‌وتنو به‌خته‌وه‌ری بگرنه به‌ر، خێرو خۆشی دونیاو قیامه‌ت ده‌سته‌به‌ر بکه‌ن.

به‌تایبه‌تی بانگه‌وازییه‌که‌ی ئاراسته‌ی هۆشمه‌ندان کرد چونکه ئه‌وان خاوه‌ن عه‌قڵو فامن، ده‌زانن؛ ئاکام به چی ده‌گاو به تێفکرینو بیرکردنه‌وه ئاکامی باش به‌ده‌ست دێنن، به‌ڵام نه‌زانو گێلو نه‌فامو که‌وده‌نه‌کان هیچ ئامۆژگارییه‌ك کاریان تێ ناکاو به هیچ شتێك حاڵی نابن، بۆیه خیطابه‌که ئاراسته‌ی خاوه‌ن عه‌قڵو فامه‌کان کرا!!

## شتێك نیگای پێ نه‌هاتبێ زۆری لێ مه‌کۆڵنه‌وه‌و پرسیاری تێدا مه‌که‌ن

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ (١٠١) قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ثُمَّ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ (١٠٢) ﴾ .

پاش ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار ئه‌وه‌ی ڕاگه‌یاند که ئه‌رکی سه‌رشانی پێغه‌مبه‌ر (درودی خوای له‌سه‌ر بێ) ته‌نها ڕاگه‌یاندنه‌و ئه‌رکی سه‌رشانی پێ ڕاگه‌یاندراوانیش ئه‌نجامدانی ئه‌رکه‌کانه‌و پابه‌ند بوونه به فه‌رمانو نه‌هییه‌کانی په‌روه‌ردگاره‌وه به‌س، نه‌ك پرسیارو لێکۆڵینه‌وه‌ی نابه‌جێ بکه‌ن؛ که پرسیار له‌و

شتانە نەکەن کە پێویست بە پرسیار کردن نەکا، بۆ ئەوەی ئەو پرسیار کردنە نەبێتە هۆی لەسەر پێویست بوونی ئەرکی قورس‌و لە توانادا نەبوو... فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان بە خوداو پێغەمبەرەکەی هێناوە! پرسیار لە شتی غەیبی‌و پەنامەکی‌و ئەو شتانەی پرسیار کردن لێیان بێ هودەیە مەکەن، هەروەها پرسیار لە کاروباری ئایینی‌و وردو نهێنی مەکەن، لەو شتانە مەکۆڵنەوە کە قورئان باسی نەکردوون‌و نیگای پێ نەهاتووە! نەوەکوو ئەرکی سەرشانی ئێوەو باقی موسوڵمانانیش قورس بێ‌و پرسیارکردن‌و لێکۆڵینەوەکەتان ببێتە هۆی قورس کردنی باری سەرشانتان‌و، ئەوجار نەتوانن ئەنجامی بدەن‌و ببێتە نەهامەتی‌و خراپە بۆتان‌و پەشێمانی بەدەست بهێنن. ﴿وَإِن تَسْأَلُواْ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ﴾ ئەگەر پرسیار لەو شتانە بکەن کەنیگای ئاسمانی لێیان بێ دەنگ بووە، یان پرسیار لە شتی زۆر وردو پەنامەکی‌و پەی پێ نەبراو، یان پرسیار لە بارەی ئەرکی قورس‌و لە توانادا نەبوو بکەن لەو کاتانەدا کە نیگا دێتە خوارێ پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەی ئاشکرای بکاو بیکاتە ئەرکی سەرشانتان‌و ئەو کاتە نەتوانن ئەنجامی بدەن‌و ببێتە هۆی چارەڕەشیتان!!.

ئیبنو کەثیر دەڵێ واتە: لە خۆتانەوە پرسیار قووت مەکەنەوە، چونکە لەوانەیە بەهۆی پرسیار کردنی ئێوەوە ئەرکەکان قورس بکرێن، یان ماوەکەیان تەنگ بکرێتەوە، ئیمامی موسلیم لە عامیری کوڕی سەعدەوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: خراپترین‌و تاوانبارترین موسوڵمان کەسێکە پرسیار لە شتێك بکا کە حەرام نەبووبێ‌و بەهۆی پرسیاری ئەوەوە حەرام ببێ. بەڵام ئەگەر ئایەتێکی (موجمەل) قورئانی هاتە پێش چاو، پرسیار بکەی لە روون کردنەوەی ئەوە قەیناکا.

هەر ئیمامی موسلیم لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: « إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ

الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنَعَ وَهَاتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ».

هەر ئیمامی موسلیم ئەم حەدیثەی بە شێوازێکی تر گێڕاوەتەوە، زۆربەی زانایانی ئیسلام دەڵێن: مەبەست بە (كَثْرَةَ السُّؤَالِ) پرسیار کردنی بێ ڕێگاو جێگایە، کە کابرا لە خۆیەوە پرسیار قوت بکاتەوەو لە باس‌و ڕووداودا ئەگەرو فەرەضیات دروست بکا، بێگومان سەلەفی صاڵح ئەم جۆرە قووڵ بوونەوەو پرسیارە نالەبارانەیان بەلاوە پەسەن نەبووە بە نابەجێیان داناون!!

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پرسیار کردن بۆ ڕوون کردنەوەی حوکمی موجمەل‌و مانای ئاشکرای لە قورئاندا ڕەوایە، وەکوو پرسیار کردن‌و داواکردنی ڕوونکردنەوەی تێرو تەسەل دەربارەی حەرام بوونی عەرەق لە پاش هاتنەخوارەوەی ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرە. بەڵام پرسیار کردن لە شتێك کە سوود بەخش نەبێ، یان پرسیار کردن دەربارەی حوکمی مەسەلەیەك کە حەرام نەکرابێ، یان نەکراوە بە ئەرك بەسەرشانی موسوڵمانانەوە، یان ئەو شتە وانیە پرسیاری لێ بکرێ، پێویست نیە پرسیاری تێیدا بکرێ، یان پرسیار کردنەکە ئەرك‌و قورسایی دەخاتە سەر موسوڵمانان، ئەوە ئەو جۆرە پرسیار کردنانە حەرامن ﴿عَفَا اللَّهُ عَنْهَا﴾ پەروەردگار بڕێ شت هەیە چاوپۆشی لێ کردووە لە قورئاندا باسی نەکردووەو لێی بێ دەنگ بووە، ئێوەش لێی بێ دەنگ بن ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ پەروەردگار لێخۆشبووە بۆ ئەو کەسانەی بە هەڵە پرسیاری نا بەجێیان کردووەو دوایی پەشیمان بوونەوە، تۆبەیان کردووە. حەکیم‌و لەسەرخۆیە پەلە لە سزادانتان ناکا لەسەر ئەو سەرپێچی‌و هەڵانەی کردووتانن!!

دارەقوطنی‌و هی تریش فەرموودەیەکیان لە ئەبو ئەعلەبەی خوشەنی (جرثوم بن ناشر) ڕەزای خودای لێ بێ گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر

بێ) فەرمووی: « إِنَّ اللَّهَ فَرَضَ فَرَائِضَ فَلاَ تُضَيِّعُوهَا، وَحَدَّ حُدُودًا فَلاَ تَعْتَدُوهَا، وَحَرَّمَ أشياءً فَلاَ تَنْتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ رُخْصَةً لَكُمْ لَيْسَ بِنِسْيَانٍ فَلاَ تَبْحَثُوا عَنْهَا »[1]

پەروەردگارچەند فەرزێکی لەسەر ئێوە فەرز کردووە ئاگاتان لێیان بێو پاش گوێیان مەخەن! چەند سنورێکی داناون ئێوە سنوور بەزێنی مەکەن چەند شتێکی حەرام کردووە بە کەمتەرخەمی سەیریان مەکەن هەتکی ئەو حورمەتە مەکەن! لە هەندێ شت بێ دەنگ بووە رەحمی بە ئێوە کردووە نەك لە بیری چووە، کەوابێ لێکۆڵینەوەیان تێدا مەکەنو تێیاندا قووڵ مەبنەوە.

ئەمجار پەروەردگار حاڵو وەزعی برێ گەلو نەتەوەی رابوردووی وەکوو گەلی صالح پێغەمبەر باس دەکا ئەو گەلو نەتەوەیەی پرسیاریان کرد دەربارەی چەند مەسەلەیەك کە حوکمەکەیان پێ راگەیاندرا ئیتر پاشگوێیان خستن دەفەرموێ: ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ﴾ بێگومان ئەم پرسیارە نابەجێیانە هەر ئیشی گەلو نەتەوەی تۆ نیە ئەی پێغەمبەر!! ئەو جۆرە پرسیارە قەدەغانە پێش ئێوە گەلو نەتەوەی تریش کردوویانن. کە حوکمەکەیان پێ راگەیاندرا ئەمجار بڕوایان پێ نەکردو پاشگوێیان خستن ﴿ثم أَصْبَحُواْ بِهَا كَافِرِينَ﴾ ئیتر پێی کافر بوون! واتە: کە پرسیارەکەیان کرد ئێمەیش حوکمەکەمان بۆ روون کردنەوە، بەڵام سوودیان لێ وەرنەگرت، چونکە ئەوان پرسیار کردنەکەیان بۆ تێگەیشتنو فێربوون نەبوو، بەڵکوو بەمەبەستی گاڵتە پێ کردنو لاقرتێ بوو دەیانویست ئەزیەتی پێغەمبەرەکەیان بدەن.

---

[1] سەیری تەخریجی ئەم فەرموودەیە بکە لە (ریاض الصالحين ص/٥٣٦) تەحقیقی عەبدولعەزیز بن رباحو هاوەڵانی.

بوخاریو موسلیم له ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: «مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ».

واتە: ئەوەی نەهیم لێ کردوون خۆتانی لێ بپارێزن. ئەوەی فەرمانم پێ کردوون بە گوێرەی توانا ئەنجامی بدەن، ئەوەی کە گەلو نەتەوەکانی پێش ئێوەی بە فەتارە داوە زۆر پرسیار کردنیان بوو؛ پرسیاری نابەجێو دژایەتی کردنی پێغەمبەرەکانیانو بێ گوێی کردنیان بوو، هەر لەو ماناو مەفهومەدا ئیمامی ئەحمەدو موسلیمو نەسائیو ئیبنو ماجە فەرموودەیەکی تر لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ ».

## ئەو ئاژەڵانەی نەفامەکان لە خۆیان حەرام کردبوو

﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

جـا ومكـوو چـۆن پـهرومردگار نـههی كـردووهو ئـادهمیزادانی مـهنع كـردووه لـه پرسیار كردنو لێكۆڵینهوه لهو شتانهی كه پێویست نیه لێكۆڵینهومیان تێدا بكرێ، ههر بهو جۆرمش مهنعی كردووه كـه لـه خـۆوه بـڕێ شـت لهسـهر خۆیـان پێویـست بكهن. لهم روانگهوه گومرایی ئادهمیزادانی سـهردهمی نـهفامی دهسـت نیـشان دهكـا، لهو شتانهدا كه لهسهر خۆیان حهرام كردبوو، بهبێ ئـهوهی كـه رهزامهنـدی خـودای لهسهر بێ، ئهوهی راگهیاند كه ئهو كاره، لاسایی كردنهوهیـهو بـهتاڵو پێچهوانهی زانستو ئایینه، دهفهرموێ: ﴿مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ﴾.

(بحیره) ئهو حوشـترهیه كـه گوێچكهی دهقڵیشێننهوه كاتێـك كـه پێـنج سـك دهكـاو ئاخیرهكهیان مێینه دهبێ، ئیتر ئهو وشتره گۆشتو شـیری لهسـهر ئافرهتـان قهدهغـه دهبوو، ئهگهر ئـاخر سـكی نێرینـه بـوو سـهردهبڕێو گۆشـتهكهی دهخـورێ لهلایـهن پیاوو ئافرهتانهوه.

(سائبة) وشترێكه مهرهخهس دهكراو نهزر دهكرا بۆ بتهكانیان لـهكوێ بلهوهڕایـه ئارهزووی خۆی بوو، باری لێ نهدهنرا، كوڵكهكهی نهدهبرایـهوه، شـیرهكهی بـۆ میـوان نهبوایه نهدهدۆشرا!

(وصیلة) حوشترێكه دهسك بكا دوانكه دوانكه، یان مهڕ حـهوت سـك بكـا دوانكـه دوانكه، جا كه له جاری حهوتهمدا یان دهیهمدا نێـرو مـێ بـبن نێرهكـه سـهرنابڕن لهبهر خاتری مێیهكه، شیری دایكهكهشیان نهدهبوو ئافرهت بیخۆنـهوه تایبـهت بـوو به پیاوان!.

(حـام) وشـتره نێرێـك كـه لای خاوهنهكـهی ده جـار پـهڕیبێ ده وهرز مێینـهی لێ چاك كرابێ. ئیتر ئهو حوشتره باری لێ نهدهنرا له هیچ پاوانێك نهدهگهڕێندرایـهوه، لهكوێ حهزی لێ بوایه لهوێ دهلهوهڕا.

واته: پهرومردگار ههرگیزاو ههرگیز یاساو شـهریعهتی حـهرام بـوونی (بـهحیرهو سائیبهو وهصیلهو حامی) دانـهناوه ﴿ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَـذِبَ﴾

بەڵکوو خەڵکانی سەردەمی نەفامی بە حەرام کردنی بەروبووم‌و گۆشتی ئەو جۆرە ئاژەڵانە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن.

چونکە بۆخۆیان یاساو داب‌و نەریتیان دادەنان‌و پاڵ خودایان دەدان‌و دەیانگوت: ئەمە خودا وای داناوە ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ زۆربەیان عەقڵیان بەوە ناشکێ کە ئەو هەڵبەستنە لەسەر خودا بێ عەقڵی‌و بێهۆشییە، کوفرو بتپەرستییە، خودا رازی نیە بەندەکانی کافر ببن‌و فەرمان بە کافر بوون ناکا.

وەکوو دەڵێن: یەکەم کەس ئەم شتانەی حەرام کردو بتپەرستی بۆ عەرەبەکان داهێنا: عەمری کوڕی لوحەی خوزاعی بوو، ئەو بوو ئایینی ئیبراهیمی تێك دا (بوحیرەو سائیبەو حامی) داهێنا.

بوخاری فەرموودەیەکی عائیشە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا، وَرَأَيْتُ عَمْرًا يَجُرُّ قُصْبَهُ، وَهُوَ أَوَّلُ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ».

طەبەری لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بیستم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە ئەکثەمی کوڕی جەونی گوت: ئەی ئەکثەم! (عەمری کوڕی لوحەی کوڕی قومعەی کوڕی خیندیف)م بینی ریخۆڵەی خۆی رادەکێشا لە ناو ئاگردا، کەسم نەبینیوە وەکوو ئەو لە تۆ بکاو هێندەی تۆ لەو بچێ! ئەکثەم وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) ترسم هەیە ئەو لێکچوونەمان زیانم پێ بگەیەنێ،

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نەخێر زیانت پێ ناگەیەنێ، تۆ موسوڵمانی‌و ئەو کافرە، ئەو یەکەم کەس بووە ئایینی حەزرەتی ئیسماعیلی تێك دا، یاسای (بوحەیرەو سائیبەو حام)ی داهێنا.[1]

---

[1] هەمان سەرچاوە.

ئەو نەفامانە ئەوەندە لەسەر داب‌و نەریتی خۆیان سوورن! ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ﴾ ئەگەر بەو موشریکانە بگوترێ: واز لەو داب‌و نەریتە پوکاوانە بێنن، وەرن موسوڵمان بن‌و بە گوێرەی قورئان هەڵس‌و کەوت بکەن، ئەحکامی ئەو کتێبە نێردراوە جێبەجێ بکەن، کە هەموو حوکمێکی بە بەڵگەی بەهێزەوە پشتگیری دەکرێ، وەرن گوێ لە ئامۆژگاری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بگرن کە راگەیەنەری قورئانەو حوکمە موجمەلەکانی شی دەکاتەوە، لە وڵامدا ﴿قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا﴾ دەڵێن: ئەوەمان بەسە کە لە باوک‌و باپیرانمان بۆمان ماوەتەوە، ئەوان بۆ ئێمە پێشەواو مامۆستان‌و ئێمە شوێنکەوتووی ئەوانین. ئیتر پەروەردگار قسەکانیان رەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ﴾ بۆچی نازانن کە باوک‌و باپیریان هیچ لە شەریعەت‌و یاسایان نەزانیوەو هەرگیز نازانن رێگەی راست‌و خێر لە کوێوەیە، قەت بەرژەوەندی دین‌و دونیایان نەزانیوە!!

بەڵکوو ئەوان لە گومڕایی‌و فەوزولیتەی بتپەرستیدا، لە ناو گێژاوی بیروباوەڕی پڕوپووچدا نوغرۆ بوون، ئەوان بە ئارەزوو هەوانتە شەریعەت بۆخۆیان دادەنێن، ئەوەتا یاسای کچ زیندەبەچاڵ کردن، عەرەقخواردنەوە، ستەم کردن لە ئافرەت‌و هەتیو، تاوان کردنی گەورەو هەمە جۆر، هەڵگیرساندنی شەڕوشۆڕ بەبێ هۆی رەوا، خۆشکردنی ئاگری دوژمنایەتی ......هتد، پەیڕەویان کردووەو دەیکەن.

ئەم ئایەتە هەڕەشەیەکی توندو سامناکە بۆ ئەو کەسانەی کە لاسایی کوێرانە دەکەنەوە بەبێ تێفکرین‌و وردبوونەوە شوێن خەڵکی تر دەکەون، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَ يَهْتَدُونَ – البقرة/١٧٠﴾.

بەڵێ عەرەبە موشریکەکان پێیان وابوو: ئەوان لەسەر ئایینی ئیبراهیمن، کە لە خوداوە هێناویەتی! ئەوان هەرگیز ئینکاری هەبوونی خودایان نەکردووە، بەڵکوو دانیان بە هەبوونی خودادا دەنا، بڕوایان وابوو کە خودا خاوەن دەسەڵاتەو بە

دەسەڵاتی خۆی بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، بەڵام وێڕای ئەوەش بۆ خۆیان شەریعەتو یاسایان بۆ خۆیان دادەناو پاشانیش پێیان وابوو، وایان دادەنا کە ئەوە شەریعەتی خودایە، واتە: بە دەم خوداوە درۆیان هەڵدەبەست، بەمەش بوون بە کافرو بێ بڕوا، ئیتر هەر لەم روانگەوە لە هەموو شوێنو کاتێکدا هەر کۆمەڵو ئەنجومەنێك یاسا بۆخۆیان دابنێن پێیان وابێ یان پێیان وانەبێ کە ئەوە شەریعەتی خودایە بە نەفامو کافر حسێب دەکرێنو دەچنە ریزی کافرەکانی سەردەمی نەفامییەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) روونی کردۆتەوە، شەریعەتەکە هیچ تەمو غوبارێکی بەسەرەوە نیە، پێویستی بەوە نیە کەس لە خۆیەوە شتی بە ناوەوە هەڵبەستێو ئەمجار پێی وابێ کە لە خوداوەیە!

بۆیە پەروەردگار هەموو ئەوانەی ئەو ئیدیعایە دەکەن بە کافرو خوانەناس دروشم داریان دەکا، ئەمجار دەیانخاتە ریزی نەفامو بێ عەقڵەکانەوە، چونکە ئەگەر هۆشیان هەبوایە شتیان بەدەم خوداوە هەڵنەدەبەست، ئەگەر فامیان بکردایە پێیان وانەدەبوو کە ئەم درۆو هەڵبەستەیان بۆ بەسەر دەچێ!.

ماوەتەوە ئەوە بزانین کە مانای ئیستینکاری ئایەتەکە ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ﴾ ئەوە نیە، کە ئەگەر باوكو باپیریان شتێکیان بزانیایە دروستو رەوا دەبوو بۆ ئەوانە کە شوێنیان بکەوتنایەو وازیان لە قورئانو روون کردنەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بهێنایە...

بەڵکوو ئایەتەکە بۆ تەقریری واقیعی ئەوانو واقیعی باوكو باپیرانیانە کە پێش ئەوان باوكو باپیرانیشیان شوێن ئەو دابو نەریتە دەکەوتن کە لەوە پێش لە باوكو باپیرانیانەوە بۆیان مابووەوە، یان شوێن ئەو یاسایە دەکەوتن کە خۆیان بۆ خۆیان دادەنا!.

ئیستینکارەکە ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ بە هیچ جۆرێك کەس پەنا بۆ ئەوە بەرێ شەریعەت بۆخۆی دانێ، شوێن شەریعەتو یاسای دانراوی باوكو باپیرانی

بکـەوێ، لـە کاتێکـدا کـە شـەریعەتی خـودا لـە بەردەسـتدا بـێ‌و پێغەمبـەر ڕایگەیاندبێ‌و ڕوونی کردبێتەوە.

## دوای فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە هەموو شتێك بەدەست خوایە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾.

جا کە لە ڕوون کردنەوەی حاڵ‌و چۆنیەتی کافرەکان بووەوە،قسەو هەڵوێستیانی دەست نیشان کـردن،، ئـەمجار هاتـە سـەر حـاڵ‌و چـۆنیەتی موسـوڵمانان‌و سـیماو دروشمیان دیـاری دەکـا، ئـەرکی سەرشـانیان ڕوون دەکاتـەوە، هەڵوێـستیان بەرامبـەر خودا نەناسان‌و بیروبۆچوونیان بۆ دیاری دەکا، ڕووبەڕووی حـساب‌و پـاداش‌و سـزای خودایـان دەکاتـەوە، بـە تـەرازوو پێـوەری یـەزدانی کـارو کردەوەکانیـانی هەڵدەسەنگێنێ.

ئیمامی واحیـدی لـە ئیبنـو عەبباسـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) نامـەی نووسـی بـۆ خـەڵکی هەجـەر کـە مونـذیری کوڕی سـاوی بەسەریانەوە بوو، بانگەوازی کـردن بـۆ موسـوڵمان بـوون، یـان سـەرانە بـدەن، کـاتی نامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گەیشت‌و بـۆی خوێندنـەوە، خەڵکەکـە هەمەجۆر بوو عەرەب‌و جوولەکەو گاورو صابیئەو ئاگرپەرستیان تێدا بـوو، تێکـڕا هـەموویان وتیـان: سـەرانە دەدەیـن‌و موسـوڵمان نـابین، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) نامـەی بـۆ مونـذیر نووسـی؛ فـەرمووی: بـە هـیچ جۆرێـك سـەرانە لـە عەرەبەکان قبووڵ مەکە، ئەوان یان دەبێ موسوڵمان ببن یان دەبـێ شـەڕیان لەگـەڵ

بکرێ‌و بە شمشێر بکوژرێن، بەڵام ئەهلی کیتاب‌و مەجووسەکان سەرانەیان لێ وەربگرە، جا کە مونذیر نامەکەی پێغەمبەری (درووودی خوای لەسەر بێ) بۆ خوێندنەوە عەرەبەکان موسوڵمان بوون‌و ئەهلی کیتاب‌و مەجووسەکانیش سەرانەیان دا، عەرەبە دوورووەکان وتیان: (محمد) سەیرو سەمەرەیە، لە لایەکەوە پێی وایە، کە خودا ناردوویەتی بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ هەموو کەس بکا تا موسوڵمان ببن، سەرانە لە ئەهلی کیتاب نەبێ لە کەسی تر وەرنەگرێ، سەیرە ئەوەی لە موشریکەکانی هەجەر قبووڵ کرد لە موشریکەکانی عەرەبی وەرنەگرت، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان بە خوداو پێغەمبەرەکەی هێناوە ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ پارێزگاری نەفسی خۆتان بکەن‌و خۆتان لە تاوان‌و سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خودا بپارێزن، هەوڵ بدەن خۆتان لە خودا نزیک بکەنەوە، کردەوەی چاک بکەن، گوفتارو کردارتان باش بێ! خۆتان لە سزای خودا رزگار بکەن. ئەگەر ئێوە بۆخۆتان خوداپەرست‌و فەرمانبەردار بن، ﴿لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ گومرایی خەڵکی تر زیانتان پێ ناگەیەنێ، ئەگەر ئێوە رێگای هیدایەت‌و راستی بگرنە بەرو حەقخوازو بە حەق گەیشتوو بن، گومرایی کەسانی تر نزیک بن لێتان یان دوور بن زیانتان پێ ناگەیەنێ! ﴿إِلَى اللّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ هەر بۆلای خودایە گەڕانەوەتان، هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆلای قاپی یەزدان، ئەو کاتە هەواڵی کردارو گوفتارتان دەداتێ‌و پێتان دەڵێ: چیتان کردووەو چیتان گوتووە، هەر کەسەتان بە گوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداشی دەدرێتەوە! چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە!.

پێویستە ئەوە بزانرێ کە ئەم ئایەتە نابێتە بەڵگە بۆ وازهێنان لە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە، بەڵکوو ئایەتەکە راستییەك روون دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە: کە کەس لە باتی تاوانی یەکێکی تر سزا نادرێت، ئایەتەکە بنەمای بەرپرسیاریەتی ئادەمیزاد روون دەکاتەوە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:

﴿كُـلُّ نَفْـسٍ بِمَـا كَـسَبَتْ رَهِينَـةٌ – المـدثر/٣٨﴾. ﴿وَلاَ تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى – الأنعام/١٦٤﴾.

بەهەر حاڵ ئایەتەکە داوا دەکات: کە موسوڵمان بینـای کەسایەتی خـۆی بکـا، رەوشتو ئەخلاقی خۆی جوان بکا، بیروباوەڕی بەهێز بکا، لە کردنی هەموو خێرو چاکەیەکدا، بـۆ خۆپاراسـتن لـە هـەموو گونـاهو تاوانێـك پـشت بـە خـۆی ببەسـتێو ئیعتیمادی سەرەکی لەسەر خۆی بێ.

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە موسوڵمان کۆمەڵێکن جودان لە خەڵکی تر، لە نـاو خۆیانـدا هاریکـارو یـەکگرتوون، بۆیـە پـەروەردگار پێیـان دەفـەرموێ: ئێـوە بەرپرسیاری نەفسی خۆتانن، پاکی بکەنەوە، بەرپرسیاری کۆمەڵی خۆتانن ئاگاداری بکەنو بیپارێزن، چ زیان بە ئێوە ناگا کە خەڵکی تـر گـومڕا ببـێ؛ بەمـەرجێ ئێوە خۆتان ڕێگای هیدایەت بگرن، ئێوە گەلو نەتەوەیـەکی هاریکـارن لـە نێـو خۆتانـدا، هەندێکتان وەلیو خۆشەویستی یەکترن، پەیوەندیتان بە کەسی ترەوە نیە.

ئایەتەکـە بنـەما سـەرەکییەکانی سروشـتی گـەلی موسـوڵمان دادەڕێـژێ، شـێوەی پەیوەنـدییان بـە گـەلانی تـرەوە دیـاری دەکـا! موسـوڵمانان پـارتو حیزبـی خـودان، خەڵکانی تر پارتی شەیتانو ئەهریمەنن، بۆیە لـە نێـوان موسوڵمانو ناموسـوڵماندا وەلائو هاریکاری نیە، نابێ ببـێ، چونکە لـە بیروبـاوەڕدا هاوبـەش نـین، لـە هۆکـارو ئامانجدا جیاوازن.

بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە موسوڵمانان واز لە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بهێنن، گەلی موسوڵمان کە یاساو نیظامی یەزدانییان لەسەر زەوی خۆیـان چەسپاند، ئەمجار دەبێ بانگەوازی ئادەمیزاد بکەن بۆ ئیسلام، هەوڵی هیدایەتـدانو تێگەیانـدنیان لـە ئیـسلام بـدەن، هـەوڵ بـدەن دادوەری لـە نـاو کۆمەڵـدا سـەقامگیر بکەن، ئایەتەکە ئەرکی فـەرمان بـە چاکەو نـەهی لـە خراپـە لـە کۆڵ کـەس ناخـا، بـەرەنگاری کردنـی شـەڕو گـومڕاییو جـەنگان دژی ملـهوڕان ئـەرکی هەمیـشەیی موسوڵمانانە، گومڕاترین ملهوڕ ئەو کەسەیە کە دەستدرێژی دەکاتە سەر دەسـەڵاتی

خوداو لاسایی خودا دەکاتەوە، خەڵکی دەکاتە بەندەی شەریعەتو یاسایەك کە شەریعەتی خودا نیە.

خاوەنەکانی سوننەن (أصحاب السنن) دەگێڕنەوە دەڵێن: حەزرەتی ئەبوبکر رەزای خودای لێ بێ، لە کۆڕێکا هەستایە حەواو سوپاسو ستایشی خودای کردو ئەمجار فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ بێگومان ئێوە مانای ئەم ئایەتە وەکوو پێویست ناکەن، مانایەکی لێ وەردەگرن جودایە لە مانای حەقیقی خۆی! من بۆخۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت: دەیفەرموو: موسوڵمانان ئەگەر مونکەریان بینیو نەیانگۆڕیو هەوڵی لابردنیان نەدا، لەوانەیە پەروەردگار بە سزایەکی گشتی سزایان بدا!

بەڵێ بەم شێوە حەزرەتی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) تێگەیشتنو بۆچوونێك کە بە هەڵە چووبووە مێشکی هەندێ کەسەوە راستی کردەوە! بێگومان ئەمڕۆ موسوڵمانان زۆر پێویستیان بە ئەو جۆرە راستکردنەوە هەیە، چونکە ئەنجامدانی ئەرکی گۆڕینی مونکەر ئەمڕۆ دژوارترە! چەند ئاسانە کە نەفس نزمو ورە رووخاو پەنا دەبەنە بەر تەئویل کردنی ئەم ئایەتەو بەو جۆرە راڤەی دەکەن کە لە نارەحەتیو تەنگو چەڵەمەی جیهان رزگاریان ببێ، ئەرکو زەحمەتی تێکۆشانیان لە کۆڵ بکەوێ!.

بەڵام لێرەدا راستییەك هەیە پێویستە موسوڵمانان باش بیزانن و هەمیشە لەبەر چاویان بێت! ئەویش ئەوەیە ئەم ئایینە پایەدار نابێ ئیللا بە ماندوبوونو جیهاد نەبێ، راگیر نابێ ئیللا بە کردەوەو هەوڵدان نەبێ، پێویستە بۆ ئایین هەمیشە کۆمەڵێك هەبن بانگەوازی بۆ بکەنو خۆیانی لە پێناودا بەخت بکەن، خەڵکی بیننەوە سەر جادە راستەکەی ئیسلام، خودایەتی خودا لەسەر زەوی بچەسپێنن، ئادەمیزادان لە بەندایەتی کردنی بەندە رزگار بکەن بۆ بەندایەتی کردن بۆ خودا،

بۆ بەرقەرار بوونی شەریعەتی خوداو کار پێ کردنی لە ژیانی خەڵکدا، ئەمجار موسوڵمانان رزگاریان دەبێ‌و ئەرکی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەیان لە کۆڵ دەکەوێ!.

سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێت: ئایەتی ﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ پاش فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەیە، واتە: ئێوە ئەرکی سەرشانی خۆتان کە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەیە ئەنجامی بدەن، ئیتر دوای ئەوە، ئەگەر کەسێك کە گوێی نەگرت زیان بە ئێوە ناگا.

بەڵام ئەگەر ئایەتەکە دەرحەق ناموسوڵمانان هاتبێتە خوارێ، ئەوە هیچ ئیشکالێکی تێدا نیەو ماناکەی بەم جۆرە دەبێ؛ پارێزگاری هاوئایینانی خۆتان بکەن‌و بەرژەوەندی دونیاو ئایینیان بپارێزن، ئیتر گومرایی کافرەکان زیان بە ئێوە ناگەیەنێ! فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە هەرکاتێ هومێدی کاریگەری تێدا هەبوو یان بەرپەرچدانەوەی ستەمکاری تێدا هەبوو! ئەرکێکی پێویست‌و دیاری کراوە، بەڵام هەرکاتێ ترسی زیانێکی تایبەتی بۆ خۆی هەبوو، یان دەترسا لەوەی فیتنەیەك بۆ موسوڵمانان بخاتەوە، یان ببێتە هۆی کەوتنە فەلاکەتەوە، بەم جۆرە لێی مەعلوم بێ یان گومانێکی بەهێزی هەبێ، کە ئامۆژگارییەکەی سوودی نابێ، یان دەبێتە هۆی لە ناوچوونی خۆی، ئەوە پێویستی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەی لە کۆڵ دەکەوێ.

## شایەتی گرتن لەسەر وەسیەت کردنی کاتی مردن

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ

غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْـَٔاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ .

جا وەکوو زانیمان لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە سەرەنجام گەڕانەوەی هەموو ئادەمیزادان پاش مردن بۆلای خودایە حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکاو بە گوێرەی کردارو گوفتاریان پاداشو سزایان دەداتەوە، کەوابوو گونجاوو جێی خۆیەتی کە باسی وەصیەتو پێویستییەکانی بکا؛ لە پێش مردنداو دەبێ وەکوو چەندو چۆنی شایەد بە مەبەستی پارێزگاری کردنی

ماڵو سامانو پارێزگاری حەقی خەڵك فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ........الآية﴾.

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئیمامی بوخاریو دارەقوطنیو طەبەریو ئیبنولمنذیر لە عەکرەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێ: تەمیمی داریو عەدی کوڕی بەداء کە نەصرانی بوون لە سەرەدەمی نەزانیدا بازرگانیان لە شامەوە بۆ مەککە دەکردو لەوێ زۆر دەمانەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوانیش شوێنی بازرگانیەکەیان گۆڕی بۆ مەدینە، واتە: هاتنە مەدینە. بودەیلی (السهمی) مەولای عەمری کوڕی عاص بە هیوای بازرگانی لەگەڵیان کەوتو چوونە دەرەوەی شام بە مەبەستی بازرگانی، کە ماوەیەك رۆیشتن لە رێگا (بودەیل) نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی سەخت بوو، زانی کە دەمرێت بۆیە وسیەتنامەیەکی نووسیو خستیە ناو شتوومەکەکانیەوە پێی گوتن: کە شتوومەکەکانی بە کەسو کارەکەی بسپێرنەوە، کە بودەیل مرد، شتەکانیان لێك کردەوە جامێکی زیوی بە زێڕ زەرکەفت کراویان تێدا بوو، دەریان هێناو شتەکانیان وەکوو خۆی لێ کردەوە، کە هاتنە مەدینە شتوومەکەکانیان دایەوە بە کەسو کاری (بودەیل)، کە لێکیان کردنەوە وەسیتنامەکەیان تێدا دۆزیەوە، جامە زیوەکەی تێدا نەبوو، داوایان لێ کردن ئەویشیان بۆ بگێڕنەوە، وتیان: هەر ئەو شتانە بوونو ئەوانیشمان داونەوە بە خۆتان، وتیان: ئەوە وەسیەتنامەو نووسراوی خۆیەتی، بەدەستی خۆی نووسیویەتیو لیستی شتەکانی تێدایە!! وتیان: هیچمان لێ پاش نەداوەو هەر ئەوەندە بوون، دوایی کێشەکەیان گەیاندە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەویش سوێندی دان کە هیچ شتێکیان نەشاردۆتەوە هیچیان لێ هەڵنەگرتووە، دوایی لە مەککە جامەکە دۆزرایەوە، وتیان لە عەدی کوڕی بەداءو تەمیم کڕیومانە، ئەمجار دوو پیاویان لە خزمی بودەیل (السهمی) هێناو سوێندیان خوارد کە ئەم جامە هی فلانە کە مردووە. ئیتر جامەکەیان لێ وەرگیرایەوەو

درایەوە بە میراتگرانی بودەیل[1]. لەم بارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ......﴾الآية.

ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا کردووە شایەتیدانی راستو دروست لە نێوانتاندا ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾ کاتێ مردن یەخەی هەریەکێ لە ئێوەی گرت، واتە: کە تووشی دەردی وا بوون گومانی ئەوەتان لێ دەکرد پێی دەمرن ﴿حِينَ الْوَصِيَّةِ﴾ لەکاتی وەسیەت کردندا دوو شایەت بگرن شایەتەکان دەبێت بریتی بن لە ﴿اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ دوو شایەتی عادل لە موسوڵمانان یان لە خزمو خوێشی خۆتان ﴿أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾ یان دوو شایەتی غەیری موسوڵمان یان غەیری خزمو خوێش ئەگەر موسوڵمان یان خزم دەست نەکەوت ﴿إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾ ئەگەر ئێوە لەسەرە مەرگدا بوونو بەڵای مردن یەخەی پی گرتنو ئێوەش وەسیەتنامەتان نووسیبوو، دوو کەس کە پێتان وابوو عادڵن، چیماڵو سامان پێتان بوو تەسلیم بە ئەوانتان کردو دوایی مردن، دوو شایەتەکە شتومەکەکانیان هێنایەوە بۆلای میراتگرەکانو ئەوانیش لێیان کەوتنە گومانەوەو پێیان وابوو خیانەتیان کردووە، بەم شێوە شایەتیەکەیان لێ وەربگرن ﴿تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلاَةِ﴾ رایان بگرن لە دوای نوێژی عەصر چونکە دوای نوێژی عەصر کاتی دادگای کردنو حوکم دان بووە لە وڵاتی حیجازدا، لەو کاتەدا قازیو دادوەر ئەرکی خۆیان ئەنجام داوە، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست دوای نوێژی نیوەڕۆیە، بڕێکیش دەڵێن: دوای هەر نوێژێك بێ دەبێ، ئەمجار سوێندخواردنو شایەتی دانو تەئمین کردن بەو شێوە، لە ناو کۆمەڵێك

---

[1]- لە دواییدا تەمیم بەیعەتی بە پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کردو موسوڵمان بوو، جا دەیگوت وەڵلاهی پیغەمبەر راستی فەرموو من جامەکەم دەرهێناو هەڵم گرت (تفسیر الطبری م ٧ – ص ٧٥).

خەڵك و لە دوای نوێژ بۆ وروژاندنی هەستی ئایینی و شەرمەزار کردنە لە حاڵەتێکدا کە درۆو خیانەتی لێ دەربکەوێ بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن!!

بە هەر حاڵ زۆربەی زانایان پێیان وایە: کە مەبەست بە (الصلاة) نوێژی عەصرە. چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) عەدی و تەمیمی لەو کاتەدا سوێنددا، لەوە دواش کاری دادگایی و قەزاوەت کردن لەو کاتانەدا بووا.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەگەر شایەتەکان موسوڵمان نەبوون ئەو کاتە مەبەست بە نوێژ نوێژی ئایینی خۆیانە.

طەبەری دەفەرموێ: مەبەست بە نوێژ نوێژی موسوڵمانانە؛ چونکە پەروەردگار وشەکەی بە (الصلاة) هێناوە – ئەلیف و لامی – پێوە لکاندووە بۆ ئەوەی بسەپێ بەسەر نوێژێکی زانراودا، جوولەکەو گاور زۆر جۆرە نوێژیان هەن، کەوابێ دەزانین کە مەبەستەکەی نوێژی دیاری کراوی موسوڵمانانە نەك نوێژی موتڵەق.

﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ﴾ ئەگەر لە راستگۆیی شایەتەکان کەوتنە شکەوە، سوێندیان دەدەن بە خودا، واتە: داوایان لێ بکەن کە سوێندتان بۆ بخۆن بە خودا، کە ﴿لاَ نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا﴾ بڵێن: ئێمە بەم سوێندخواردنەمان نامانەوێ ماڵ و سامانی دونیامان دەست بکەوێ، بەم جۆرە سوێند بە درۆ بخۆین، نەخەیر سوێند بە درۆ ناخۆین و چی دەڵێین راست دەکەین، بە سوێندەکەمان مەبەستمان دەست کەوتنی ماڵی دونیا نیە. ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ تەنانەت ئەگەر سوێند بۆ خوراوەکەمان یان شایەدی بۆ دراوەکە خزم و خوێشی خۆشمان بێ!

واتە: ئێمە بۆ ماڵی دونیا سوێند بە درۆ ناخۆین ﴿وَلاَ نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللّهِ﴾ دەبێ لە سوێندەکەشیاندا بڵێن: ئێمە شایەتیدانێك ناشارینەوە کە خودا فەرمانی کردووە بە ئەنجامدانی، چیمان لایە بە راست و رەوانی دەیگێڕینەوە، چۆن خودا فەرمانی کردووە بە هەڵگرتن و پارێزگاری کردن و ئەدا کردنی ئێمە ئاوا ئەنجامی دەدەین، خۆ ئەگەر وا نەکەین ﴿إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الآثِمِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێمە سوێند بە درۆ بخۆین

یـان لایـەنی خزمایـەتی لەبەرچـاو بگـرین، درۆ لـە شـایەتیدانەکەماندا بکـەین، شایەتییەکەمان بشارینەوە، ئەوە ئێمە تاوانبارینو شیاوی سزای تۆڵە لێ ستاندنین.

بـە کورتی دەبـێ شـاهیدەکە سـوێند بخـوا کـە حـەقو راسـتی دەڵـێ: دادوەرانـە شایەدیەکەی ئەدا دەکا، لایەنی سوودو قازانجی دونیایی کاری تێ ناکەن، نە کەم نـە زۆر شایەتیەکەی ناشارێتەوە خودا چۆن فەرمانی پێ کردوون ئاوا ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەن. جا ﴿فَإِنْ عُثِرَ عَلَى أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا﴾ ئەگـەر دەرکـەوت کـە شـایەتەکان درۆیـان کـردووە، خیانـەتیان لـە شـایەتیدانەکەیاندا کـردووە، شایەتیەکەیان شاردۆتەوە کارێکیان کردووە کە پێی تاوانبـار بـوون ئـەوە ﴿فَـآخَرَانِ يَقُومَانُ مَقَامَهُمَا﴾ سـوێندەکە رەت دەکرێتـەوە بـۆ میراتگرەکان دوو پیـاو لـە خزمـی مردووەکە سوێند دەخۆن لە شوێنی شایەتەکان ﴿مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الأَوْلَيَـانِ﴾ ئەوانەی کەوا نزیکن لە مردووەکەو شیاوترین کەسانێکن بۆ میرات گرتن ﴿فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا﴾ سوێند دەخۆن بە خوداو دەڵێن: سوێند خـواردنو شـایەدی ئێمـە راسـترە لـە شـایەتیدانی ئـەوان، دەڵـێن: ئـەوان خیانـەتیان لـە شـایەتیەکەی خۆیانـدا کـردووە، ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان بـە رێـکو پێکـی ئـەنجام نەداوەو سوێندیان بە درۆ خـواردووە ﴿وَمَـا اعْتَـدَيْنَا﴾ دەڵـێن: ئێمـە دەسـتدرێژیمان نەکردۆتـە سـەر ئـەو دوو شـایەتەو بـە هەوانتـە بـە خیانـەتکاریان حلێـب ناکـەین، بـەڵکوو بەڵگەمان هەیە لەسەر داواکـەمان ﴿إِنَّـا إِذًا لَّمِـنَ الظَّـالِمِينَ﴾ واتـە: دەبـێ لـە سـوێندەکەیاندا بڵێن: ئێمە ئەگەر دەستدرێژی بکەینە سـەر حـەقو بـە درۆ سـوێند بخۆین ئەوە ئێمە ستەمکارین ستەم لە خۆمان دەکەین، بەوە کـە خۆمـان دەخەینـە بەر نارەزامەندی خوداو تۆڵە ستاندنەوە! ئەمجار پەروەردگار حیکمەتی دانانی ئەم جۆرە شایەتیدانو سوێند خواردنـە دیـاری دەکـا دەفـەرموێ: ﴿ذَلِـكَ أَدْنَى أَن يَـأْتُواْ بِالشَّهَادَةِ عَلَى وَجْهِهَـا أَوْ يَخَـافُواْ أَن تُـرَدَّ أَيْمَـانٌ بَعْـدَ أَيْمَـانِهِمْ﴾ ئـەو یاسـایەی کـە بـۆ ئێوەمان داناوە کە دەبێ ئەمانەت لادانراوەکە؛ وەصیەت لـەلا کراوەکە، لەبەرامبـەر

خەڵکدا لە پاش نوێژو لە مەشهەدێکی سامناکدا سوێند بخوا، ئەمە نزیکترین ڕێگەیە کە شایەتەکان شاهیدیەکەی خۆیان بە ڕێك و پێکی ئەدا بکەن، بەبێ گۆڕانکاریو کەم و زیاد تێدا کردن، چونکە لە پاش نوێژو لە مەشهەدێکی ئاوادا کابرای سوێندخۆر کەم وا هەیە ڕێگە بە خۆی بدا خیانەتکاریبکا، جگە لەوە ترسی ئەوەشی دەبێ کە سوێندەکە بدرێ بە میراتگرەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی ریسوایی و ناو زڕاندنی لە ناو خەڵکدا، کەوابێ ترسی خوداو ترسی ریسوا بوونی لە ناو خەڵکدا داخوازی ئەوەن کە لە خیانەت کردن دووره پەرێز بێ! ئەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر ڕاستگۆیی لە شایەتییدانەکەیاندا کردووە، بەوە کە کۆتایی حوکمەکەی هێنا بە هەڵنەرێکی هەمیشەیی و زاتی و کە ئەویش تەقوای خودایەو فەرموویی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ خوداتان لە یاد بێ، لە سزاو تۆڵەی بترسن! لە سوێند خواردندا خیانەت نەکەن، بە هۆی سوێندی بە درۆ ماڵ و سامان کۆمەکەنەوە، ﴿وَاسْمَعُواْ﴾ ئەم حوکمانە ببیستن بیستنی تێفکرین و وەرگرتن و کاری پێ بکەن، ئەگەر وا نەکەن دەبن بە فاسق و یاخی بوو لە چوارچێوەی حوکمی خوداو شەریعەتی خودا دەچنە دەرێ و لە ژێر خێمەی هیدایەتی خوادا نامێننەوە، شیاوی سزاو تۆڵە دەبن، ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ پەروەردگار یارمەتی گەل و نەتەوەی فاسیق و لە ڕێگا دەرچوو نادا، کەسێك سەرپێچی فەرمانی خودا بکاو گوێڕایەڵی شەیتان بێ خودا سەرفرازی ناکا.

ئیمامی طەبەری دەفەرموێ: زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان پێیان وایە ئەم ئایەتە موحکەمە، واتە: حوکمەکە نەسڕاوەتەوە، هەر کەسێکیش ئیدیعای نەسخ بوونەوەی ئەم ئایەتە دەکا با بەڵگەی خۆی بخاتە ڕوو؛ (مەبەست ئەوەیە بەڵگەی بە هێزی دەست ناکەوێ)!.

جا وەکوو لە پێشەوە باسکرا ئەم ئایەتانە دەربارەی عەدی کوڕی بەراءو تەمیمی داری هاتنە خوارەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە گوێرەی دەقی ئەو

ئایەتانە رەفتاری لەگەڵ تەمیمو عەدیو کەسو کاری ئەو مردووەی کە وەسیەتی لایان کردبوو کرد.

لەدوای کۆچی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) رووداوێکی تری وا رووی داو هەر بەپێی حوکمی ئەم ئایەتانە رەفتار کرا!.

ئیبنو جەریر لە شەعبیەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: لە - داقوقا - پیاوێکی موسوڵمان دەکەوێتە حاڵەتی مردنەوە، کەسی موسوڵمانی دەست ناکەوێ بیکاتە ئەمیندارو وەسیەتیان لا بکا بیانکا بە شایەت بەسەر وەسیەتنامەکەیەوە، ئەمجار دوو پیاوی مەسیحی دەکات بە شایەد. ریوایەتەکە دەڵێت: ئیتر ئەم دوو کابرا مەسیحییە دێن بۆ کوفە بۆ لای ئەبو مووسای ئەشعەری کە لەوێ والی دەبێ وەسیتنامەکەو کەلەپورەکەی دەبەنە خزمەتی!

ئەبو مووسا دەفەرموێ: ئەم رووداوە رووداوێکە لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) رووی داوەو لەو کاتەوە تا ئێستا رووی نەداوەتەوە، ئیتر ئەبو موسا بە گوێرەی دەقی ئایەتەکان رەفتاری لەگەڵ کردنو هیچ کەسێك لە موسوڵمانان رەخنەی لەم کارەی ئەبو مووسا نەگرت!

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) دەفەرمون: وەك ئێستا لەبەر چاومە کە ئەو دوو گاورە هاتن بۆ ماڵی ئەبو مووساو راسپاردەکەیان دایە دەستیو ئەویش نامەکەی کردەوە کە ئەوان هێنابوویان لە لایەن ئەو موسوڵمانەی کە ئەوانی کردبوو بە شایەتو ئەمیندار.

ئاشکراشە کە ئەم سورەتە لە دوا دوایی هاتنەخوارەوەی قورئان هاتۆتە خوارێ، بۆیە زانایان دەفەرموێ: ئەم سورەتە هیچ ئایەتێکی لێ نەسڕاوەتەوە، کەوابێ پێویستە هەر ڕوداوێکی لەم جۆرە روو بدا بەو شێوە رەفتاری لەگەڵ بکرێ.

دیارە ئێستا ئامێری جۆراو جۆر پەیدا بوون دەتوانرێ لە رووداوی ئاوەها کەڵکیان لێ وەربگیرێ،، بۆ نموونە کابرا کە دەکەوێتە حاڵەتی مردن دەتوانێ بەخەتی خۆی وەسیتنامەو راسپاردەکانی بنووسێ، یان بە تەسجیلو ڤیدیۆ

تەسجیلی بکا، یان بە تەلەفون و فاکس وەسیەتەکەی بگەیەنێ، یان بە هۆی دائیرەی دادگاو پۆلیس و بانقەوە .... هتد. کارەکە ئەنجام بدرێ، بەلام ئەگەر وا رێکەوت رووداوێکی لەو جۆرە هاتە پێشەوەو لە کۆمەلگایەکی وادا بوو کە ئەو جۆرە هۆکارو ئامێرانەی تێدا نەبوون ئەوە دەبی بە گوێرەی دەقی ئایەتەکان رەفتار بکرێ.

**زانایانی ئیسلام لەم سێ ئایەتە چەند حوکمێکیان دەرهێناوە هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:**

١- هەلنانی موسولمانان بۆ وەسیەت کردن و گرنگیدان پێی هەموو کاتێ، چ لە مالەوە چ لەسەفەردا بن.

٢- شایەت گرتن لەسەر وەسیەتەکە بۆ ئەنجامدانی.

٣- دەبێ شایەتەکان دوو پیاوی موسولمانی عادل بن.

٤- ئەگەر وا رێکەوت موسولمان دەست نەکەوت لەبەر ناعیلاجی دەکرێ دوو ناموسولمان بگیرێ بە شایەت. لێرەدا زانایانی ئیسلام رای جیاوازیان تێدا پەیدا بووە؛ جەماوەری فوقەها دەلێن: رستەی ﴿آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾ لە ئایەتەکەدا حوکمەکەی هەلوەشاوەتەوە بە رستەی ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء – البقرة/٢٨٢﴾. هەروەها بە رستەی ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ – الطلاق/٢﴾، ئایەتی دەین کە رستەی ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ﴾ی تێدایە لە دوا دوایی ئایەتەکانی قورئان لەم بارەوە هاتنە خوارەوە کەوابێ حوکمی ئەم حوکمی ئەوی سڕیوەتەوە، ئەو رۆژگارە ئیسلام تەنها لەمەدینەو چەند شوێنێکی تری ولاتی حیجازدا هەبووە، بۆیە لەبەر ناعیلاجی شایەتیدانی ئەهلی کیتاب وەرگیراوە، بەلام ئەمرۆ موسولمانان لەهەموو شوێنێك هەن، کەوابێ شایەتیدانی کافر دروست نیەو کاری پێ ناکرێ: زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن کە شایەتی فاسق وەرناگیرێ دەی خۆ کافر پلەی بێ دینیو گومرایی زۆر لەهی فاسق خراپترە! کەوابێ شایەتی کافر قبوول نیە نەبەسەر موسولمانانەوەو نە بەسەر کافرەکان خۆیانەوە.

ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: شایەتیدانی کافر لەسەر کافر دروستە بەڵام لەسەر موسوڵمان دروست نییە، چونکە ئایەتەکانی قورئان کە لەبارەی شایەتی هاتوون ئوسلوبو سیاقیان دەربارەی موسوڵمانانە، وەلێ شایەتیدانی ناموسوڵمان لەناو خۆیاندا وەردەگیرێ چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ – آل عيمران/٧٥﴾، ئەهلی کیتاب هی وایان تێدایە ئەگەر ماڵو سامانێکی زۆریشی لادابنێی خیانەتی تێدا ناکاو بە رێكو پێکی دەتداتەوە.

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە لەناو ئەهلی کیتابدا هی وایان تێدایە ئەوەندە دەست پاکە ئەو ئەندازە ماڵەشی بخەیە ژێر دەست خیانەتی تێداناکا! کەوابێ باشتر ئەمینی دەربارەی کەسوکارو هاو ئایینانی خۆی ئەنجام دەدا. هەروەها قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – الأنفال/٧٣﴾. ئایەتەکە ویلایەتو سەرپەرشتیاری بۆ یەکتری بۆ چەسپاندوون، دەی خۆ سەرپەرشتیارییو ویلایەت لە شایەتیدان گرنگترە....

هەروەها ریوایەتەکەی جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) کە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: جوولەکەکان پیاوێكو ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تاوانی زیناکردنیان خستبوونە پاڵ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «أئتوني بأربعة منكم يشهدون».

زیاد لەوە ئەهلی ذیممە لەناو خۆیاندا مامەڵەی کڕینو فرۆشتن دەکەن، شەڕو هەرایان لەناودا روودەدا، جگە لەخۆیان شایەتی تریان دەست ناکەوێ، کێشەکانیان دەبەنە دادگای موسوڵمانان، ئەگەر قازی موسوڵمانان شایەتی خۆیان لێ وەرنەگرێ زۆر لە مافەکانیان دەفەوتێ، ستەمو ئاژاوەو پشێوی دەکەوێتەوە، کەوابوو پێویستە شایەتییان لەسەر خۆیانو بۆ خۆیان لێ وەربگیرێ، ئەمە رای پەسەندو عەمەلیە.

هەروەها دەربارەی شایەتیدانیان لەسەر موسوڵمانان پێویستە کار بەڕای ئیمام ئەحمەد بکرێ کە دەڵێ لەبەر ناچاریو نەبوونی وەکوو: لەسەفەردا دروستە

شایەتی ناموسوڵمان بۆ موسوڵمان! بەڵگەش ئایەتەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ﴾.

ئیبنو تەیمیە دەڵێ: رای ئیمام ئەحمەد دەربارەی وەرگرتنی شایەتی لێیان لەم باسەدا بۆ کاتی ناچاری‌و پێویستییە، ئەمەش داخوازی ئەوە دەکا لەهەر کات‌و شوێنێکدا ناچاری هەبوو، شایەتییەکەیان لێ وەردەگیرێ! خۆ ئەگەر بگوترێ: ناموسوڵمان لەهەر شوێنێکدا موسوڵمان دەست نەکەوت شایەتی لێ وەردەگیرێ! بەڵام دەبێ لەگەڵ شایەتیدانەکەیدا سوێندیش بخوا، ئەوە وێدەچێ. چونکە رێ دەکەوێ کابرای موسوڵمان لە غەریبیدا دەکەوێتە حاڵەتی سەرەمەرگ‌و موسوڵمانی دەست ناکەوێ بیکاتە شایەت‌و وێدەچێ سپاردەی لابێ قەرزی لابێ یان قەرزی لای خەڵك بێ، زەکاتی لەسەر مابێ! کەفارەتی لەسەربێ! جا ئەگەر دروست نەبێ ناموسوڵمان بکا بەشایەت! زۆر لەمافی خۆیی‌و خەڵکی تریش دەفەوتێ.

٥- ئایەتی ﴿تَحْبِسُونَهُمَا﴾ بەڵگەیە لەسەر بەندکردن، چونکە دڵنیایی‌و گەیشتن بەقەناعەت لەکاروباری ماڵ‌و ساماندا یان بەرەهن دەبێ یان بە کەفالەت! دەی کە ئەمانە نەبوون تەنها بەندکردن دەبێ بۆئەوەی بەهۆی بەندکردنەوە کابرا وا لێ بکرێ ئەو مافەی لایەتی بیداتەوە، یان دەربکەوێ کە هەژارو نەبووەو وازی لێ بهێنرێ!! بەڵام گەیشتن‌و دەستکەوتنی مافی جەستەیی؛ ئەو مافانەی کە بریکارییان تێدانیە، وەکوو حەددو تۆڵە، ئەوە بە بەندکردن نەبێ نابێ!.

ئەبو داودو تیرمیذی‌و هی تریش گێڕاویانەتەوە لە بەهزی کوڕی حەکیم، ئەویش لە باوکیەوە، ئەویش لە باپیرییەوە؛ دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بەبۆنەی تۆمەتێکەوە، پیاوێکی بەندکرد. هەروەها ئەبو داود لە عەمری کوڕی (الشريد)ەوە لە باوکیەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ» کە فەرمووی: (يُحِلُّ عِرْضَهُ) بە سەرزەنشت کردن تەمبێ دەکرێ.. کە دەفەرموێ: (وَعُقُوبَتَهُ) مەبەست بەندکردنیەتی.

٦- کە دەفەرموێ: ﴿مِن بَعْدِ الصَّلاَةِ﴾ ئاماژەیە بۆ دیاریکردنی کاتو شوێنی سوێند خواردنەکە، واتە: هەڵبژاردنی کاتێك کە لەدڵو دەروونی سوێند خۆرەکاندا کاریگەر بێ، بە ئومێدی ئەوەی کەڕاست بڵێن: لە شایەتیدانو سوێند خواردنەکەیاندا.

زۆربەی زۆری زانایان دەفەرموون: مەبەست لە (بَعْدِ الصَّلاَةِ) دوای نوێژی عەسرە، چونکە شوێنکەوتووانی هەموو ئایینەکان رێزی کاتی دوای نوێژی عەسر دەگرن، خۆیان دەپارێزن لەوەی کە درۆی تێدابکەنو سوێندی بەدرۆی تێدا بخۆن. لە حەدیثیی صەحیحدا هاتووە؛ دەفەرموێ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ» هەرکەسێ سوێندی بەدرۆ بخوا لەدوای نوێژی عەسر، رۆژی قیامەت دەگا بەخودا، خودا رەحمی پێ ناکاو رقی لێیەتی. هەروەها دیاریکردنی شوێنی سوێند خواردنەکە، وەکوو لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە مالیكو ئەحمەدو ئەبو داوودو نەسائی ریوایەتیان کردووە؛ ئیبنو ماجە بە صەحیحی داناوە، ئیبنو حوزەیمەو ئیبنو حەببانو حاکم بە صەحیحیان داناوە، لە جابیرەوە بە مەرفوعی ریوایەتیان کردووە؛ کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَحْلِفُ أَحَدٌ عِنْدَ مِنْبَرِى كَاذِبَاً إِلاَّ تَبَوَّأَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ». لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکی تر بەم مانایە ریوایەت کراوە، نەسائی لە ئەبو ئومامەی کوڕی ثەعلەبە بە مەرفوعی ریوایەتی کردووە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ حَلَفَ عِنْدَ مِنْبَرِى هَذَا بِيَمِينٍ كَاذِبَةٍ يَسْتَحِلُّ بِهَا مَالَ امْرِىءٍ مُسْلِمٍ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يُقْبَلُ اللهُ مِنْهُ صَرْفاً وَلاَ عَدْلاً».

ئیتر جەماوەری فوقەها ئەم ئایەتەو ئەم فەرموودانەیان کردووە بە بەڵگەی ئەوە کە دروستە قورسایی بخرێتە سەر سوێند خۆرو توندو تیژی لەگەڵدا بەکاربهێنرێ، بەمجۆرە لە شوێنێکی پیرۆزی وەکوو ناو کەعبە، بەتایبەتی لەنێوان روکنو مەقامی ئیبراهیمدا، یان مزگەوتی مەدینە، لەنزیك مینبەری پێغەمبەر (دروودی خوای

لەسەر بێ) یان لە بەیتول مەقدیس لای (صخرة) لە ڕۆژی جومعە دوای نوێژی عەسر سوێند بدرێ!!

ئیمامی رازی دەڵێ: شافیعی گوتوویەتی: لەسوێند داندا توندو تیژی لەگەڵ سوێندخۆر بەکاردەهێنرێ لە مەوزوعی خوێنو تەڵاقو ئازادکردنی بەندەو ماڵو دارایی ئەگەر گەیشتە دووسەد دیرهەمی زیو، واتە: کاتو شوێنەکەی لێ تەنگ دەکرێتەوەو زێدە گرنگی پێ دەدرێ، لە مەککە دەبرێتە ناو کەعبە؛ لەنێوان روکنو مەقامدا سوێند دەدرێ، لە مەدینە لای مینبەری پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ)، لە بەیتول مەقدیس لای (صخرة) لە وڵاتانی دیکە دەبرێتە پیرۆزترین مزگەوتەوە لەلای مینبەرو بەرەو رووی ڕۆگە سوێند دەدرێ!

٧- ئایەتەکە بەڕوونی ئەوەی تێدایە کە دەبێ توندو تیژی لەگەڵ سوێندخۆر بکرێ، بەجۆرێك کە سامو هەیبەتێك بە سوێند خواردنەکە ببەخشێو بەشێوەیەك بێ کابرا لە درۆکردنو خیانەت بگێڕێتەوە؛ توندو تیژی لەگەڵدا کردنەکە بەچوار شت دەبێ:

أ/ کات: ڕۆژی جومعە دوای نوێژی عەصر.

ب/ شوێن: وەکوو نێوان روکنو مەقامی ئیبراهیم لە کەعبەدا، یان نزیك مینبەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدینە، یان لای (صخرة) لە بەیتول مەقدیس، بەڵام ئەبو حەنیفەو بوخاری دەفەرموون: سوێند لەسەر خوراوەکە کەم بێ یان زۆر، گرنگ بێ یان نا، پێویست ناکا کەس لەنێوان روکنو مەقام، یان لای مینبەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سوێند بدرێ! وەلێ: ئیمامی مالیك رەئی لەگەڵ ئیمامی شافیعیدایە، لەوەدا کە دەڵێ: سوێندی گرنگ وەکوو سوێند خواردن لەسەر مەوزوعی خوێن دەبرێتە نێوان روکنو مەقام بۆ کەسێ لە مەککەو دەوروبەری بێ، بۆ دانیشتوانی مەدینەو دەوروبەری دەبرێتە لای مینبەری پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ).

ج/ چۆنیەتی سوێند خوّر: موطەررەفو ئیبنول ماجیشونو برێ فوقەهای شافیعی دەڵێن: دەبێ سوێند خۆرەکە بەراوەستانەوەو رووی لە قیبلە بێ کە سوێندەکە دەخوا، ئیبنو کەنانە دەڵێ: بە دانیشتنەوە سوێند دەدرێ.

د/ توندو تیژیی کردن لە وشەی سوێندەکەدا: برێ دەڵێن: دەبێ بڵێ: سوێند بەخوا، بڵێ قەسەم بەخوا. ئیمامی مالیك دەڵێ: دەبێ بڵێ: سوێند بەو خودایەی – هیچ خودای تر نین جگە لەئەو – هیچ مافێکی ئەوانم لا نییە، ئەوەی لێم داوادەکەن بێ بناغەیە.

حەنەفییەکان دەڵێن: بەس دەڵێ (بەخودا) هیچی تری لێ زیادناکا، ئەگەر قازی گومانی لێ پەیداکرد، سوێندەکەی لەسەر توند دەکرێ؛ بەم نەوعە بڵێ: سوێند بەو خودایەی هیچ خودای تر نین جگە لەئەو هەموو نهێنیو ئاشکرایەك دەزانێ، رەحمانو رەحیمێکی وەهایە؛ ئاگاداری نهێنیو ئاشکرایە وەکوو یەك، خیانەتی چاو دەزانێ، شاردراوەیی ناو دڵ دەزانێ! شافیعی دەفەرموێ: دەتوانرێ سوێندەکە قورس بکرێ بەهۆی قورئان دانان لەبەردەمیا.

٨- ئەندازەی ئەو ماڵەی کە سوێندی تێدا دەخورێ، ئیمام مالیك دەفەرموێ: نابێ لەسێ دیرهەم کەمتربێ، واتە: بە ئەندازەی ئەو ماڵە کە دەستی پێ دەبڕدرێ! شافیعی دەفەرموێ: نابێ لەبیست دینار کەمتربێ، واتە: دەبێ بگاتە ئەندازەی نیصابی زەکات.

٩- لەراستیدا حەق وایە هەواڵی شایەد وەرگیرێو بڕوای پێ بکرێ بەبێ سوێنددان چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ﴾ کەوابوو کاتێ شایەد سوێند دەدرێ کە گومان لە هەواڵەکەی دا پەیدابێ، ئەگەر شایەدەکە عادڵ نەبوونو دادوەر لێیان کەوتە گومانەوە سوێندیان دەدا، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿ان ارتبتم﴾ ئەگەر گومانتان بۆ پەیدابوو، کەوابێ هەرکاتێ گومان دروست نەبوو سوێنددان نابێ! بەڵام ئیمرۆ شایەدو سوێنددان لە دادگاکان بۆتە دیاردەیەکی گشتی.

۱۰- ئایەتەكە بەڕەوای داناوە كە داواكەر (مدعي) شایەتی بۆ خۆی بداو هەر لەگەڵ سوێندی لەسەر داواكەی خوارد مافەكەی بۆ دەچەسپێ ئەمەش پێچەوانەی ئەو قاعیدە فیقهییەیە كە دەفەرموێ: (البینة علی المدعي والیمین علی من انكر) ئەوەش ئەوپەڕی دادپەروەری تێدایە جا لەبەر ئەم پێچەوانەیە جەماوەری زانایان دەڵێن: حوكمی ئەم ئایەتە سڕدراوەتەوە.

وەڵامی ئەوانەی كە دەڵێن: ئایەتەكە موحكەمەو حوكمەكەی باقییە دەڵێن: قبوڵكردنی سوێندی داواكەر (مدعي) لەبەرئەوەیە: كە داوالێكراو خیانەتی تێدا دەركەوتووەو تاوانبار بووە. ئەمەش لەگەڵ قاعیدەی ئوصولدا یەك دەگرنەوە چونكە لایەنی داواكەر بەهێز دەبێ، ئەگەر داوالێكراو سوێند رەتبكاتەوە، یان قەرینە هەبێ لەسەر راستی داواكەی ئیتر بەدیكردنی خیانەت لەداواكراو، دەبێتە هۆیەك بۆ بەهێزكردنی داوای داواكەر (مدعي). چونكە هەموو كاتێ سوێند لایەنی ئەو كەسە دەگرێ كە داواكەی بەهێزترە.

۱۱- ئایەتەكە بەڵگەیە لەسەر رەوایی سوێندی رەتكراوە، واتە: رەتكردنەوەی سوێند لە داوالێكراوەوە بۆ داواكەی.

۱۲- شایەنترین كەس لەو میراتگرانەی داوایان هەیە بۆ قبووڵ كردنی سوێند لێیان ئەو كەسەیە كە نزیكترە لە مردووەكە.

## لەرۆژی قیامەتدا پرسیار لە پێغەمبەران دەكرێ دەربارەی ئاكامی بانگەوازییەكەیان

﴿ ۞ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ ﴾ .

دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمانی کرد بە ئادەمیزاد بەتـەقوا کـردنو ترسـاندنی نە شاردنەوەی وەسیەتو شتی تریش، بەشوێن ئـەوەدا هەڕەشـەی تونـدی لەهـەموو ئادەمیزاد کردو ترساندنی لە مەشهەدو رووداوێـك کـە لەپێـشیانەو رۆژیـی قیامـەت تووشی دێن، داوای لێ کردن کە خۆیان لە سزاو تۆڵەی ئـەو رۆژە بپـارێزن، هەمیـشە ئەو رۆژەیان لـەیاد بێو، ئـەو مەشهەدو لێکۆڵینـەوەو پرسـیارو وەڵامـەیان لـەپێش چاو بێو خۆیـانی بـۆ ئامـادە بکـەن. ﴿يَـوْمَ يَجْمَـعُ اللّـهُ الرُّسُـلَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) یادی ئەو رۆژە بکەرەوە کـە رۆژی قیامەتـە، ئـەو رۆژەی کە پەروەردگار هەموو پێغەمبەران کۆ دەکاتەوە، لە رووی سەرزەنشتو لۆمەکردنی گەلەکانیانەوە روو دەکاتە پێغەمبـەرانو ﴿فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ﴾ دەفـەرموێ: کـە ئێـوە بانگەوازی نەتـەوەکانی خۆتـان کـرد بـە چ شێوەیەك بـە پیر بانگەوازییەکەتانـەوە هـاتن؟ ئایـا بڕوایـان پـێ کـردنو گـوێ بیـستی ئامۆژگارییـەکانتان بـوون؟ ئایـا سەرپێـچیان کـردو روویـان لێ وەرگێـڕان؟؟ ئەڵبەتـە خـودا بۆخـۆی دەزانـێ بانگەوازییەکەیان چۆن بووەو، وەڵامەکەشیان چی بـووە؛ وەلێ ئاڕاسـتە کردنـی ئـەم پرسـیارانە بـۆ سەرزەنـشت کردنـی ئەوانەیـە کـە بڕوایـان نـەکردووە، بـۆ ئـەوەی پەنجەی پەشیمانی بگەزنو لێیان روون بێ کە خودا لە هەموو شـتێك دەکۆڵێتـەوە، لە هەموو کەس دەپرسێتەوە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّـذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ – الأعراف/٦﴾.

یان کە دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ – الحجر/٩٢ – ٩٣﴾. دەی جا ئەگەر بگوترێ: بۆچی پەروەردگار پرسیاری لە شـتێك لێ کـردن کـە خـۆی زۆر باشـتر لـەوانی دەزانـێ!؟ دوو وەڵامـی هەیـە: یەکـەم بـۆ ئـەوەی بـە پێغەمبەران بزانێنێ گەلەکانیان چییان کردووە ئـەو کـارو کردەوانـەی دوای ئـەوان کردویانەو ئەوان پێیان نەزانیوە بۆیان دەربخا.

دووەم: بۆ ئەوەی گەلو نەتەوە سەرپێـچیکەرەکان ریـسوا بکا لەبـەر چـاوی ئـەو خەڵكو خودایەدا ببێتە جۆرە سزایەك بۆیان.

ئەم پرسیار کردنە بۆ هەردوولایە؛ بۆ پێغەمبەرەکانو بۆ گەلەکانیشیانە! یان کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ، بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ – التكوير/ ٨ – ٩﴾.

ئەم پرسیارە بۆ شاهیدەکانە! نەك بۆ تاوانبار، مەبەست سەرزەنشتو نارەزایی دەربڕینە بەرامبەر کارەکە.

ئەم پرسیارو وەڵامە بە گوێرەی مەوقیفەکانی رۆژی قیامەت دەگۆڕێن لە بڕێ مەوقیفدا پەروەردگار پرسیارەکان ئاراستەی پێغەمبەران دەکا، بۆ ئەوەی شایەدی بدەن لەسەر گەلەکانیان، جاری وا دەبێ پرسیار لە نەتەوەکان دەکا، جاری وا هەیە پرسیار لە دوژمنەکان دەکا، وا دەبی پرسیار لە شایەد دەکا، مەوقیفی واش هەیە پرسیار لە هەر دوولا دەکا.

هەروەها پرسیار لە پێغەمبەران دەکا ئاخۆ گەلو نەتەوەکانیان دوایی چییان کردووە؛ چ دابو نەریتێکیان داهێناوە، ئەوانیش لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا ﴿قَالُواْ لاَ عِلْمَ لَنَا﴾ وتیان (دەڵێن:) خودایە! ئێمە هیچ زانیارییەکمان نیە جگە لەو بڕە زانیارییەی کە تۆ لە ئێمە باشتر لێی دەزانی، زانیاری ئێمە لە ئاست زانیاری رەهاو موطلەقی تۆدا دەبێ چی بێ؟ ئەتۆ ئاگاداری هەموو شتێکی، زانیاری ئێمە لە ئاقار زانستی تۆدا وەکوو نەبوو وایە. ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ بێگومان زاتی تۆی پەروەردگار زاناو ئاگادار بە هەموو نهێنیو شتە پەنامەکییەکان، ئەوەی لە ئادەمیزادان نادیار بێ، یان لەبەر ترسو بیمی تەنگو چەڵمەی رۆژی قیامەت لە یادیان بچێ لای تۆی یەزدانی زاناو ئاگادار ئاشکراو نمایانە. چونکە زانیاری تۆ گشتیو فراوانە هەموو شتێکی ئاشکراو نهێنی دەگرێتەوە، هیچ شتێکی لێ گوم نابێ. بەڕاستی دیمەنێکی سامناکەو مەوقیفێکی ترسناکە!!

کۆکردنەوەی ئەو هەموو پێغەمبەرانە کە لە رۆژی جیاجیادا یەك لەدوای یەك نێردراون، هەریەکەیان لە شوێنێك، هەریەکەیان بۆ گەلو نەتەوەیەكو هۆزێك رەوانە کراون، هەموویان – وێڕای جیاوازی کاتو شوێنو گەلو نەتەوەکانیان –

یـەك بانگـەوازیان کـردووە، بـۆ یـەك مەبەسـت هـەوڵیان داوە، بـۆ یەکتاپەسـتیو خوداناسیو گەردنکەچیو فەرمانبەرداری بۆ زاتی پاکی یەزدان.

ئادەمیزاد ئەو پێغەمبەرانـە کـە نێـردراون بـۆ سـەر ئـەو هـەموو گەڵو نەتـەوە جـۆراو جۆرانــە لــەو رۆژگــارو ســەردەمو شــوێنە جیاجیایانــەدا ئــەو رۆژە کــۆ دەکرێنەوە، جۆرەها شایەتیدانو هەڵوێستیان بەرامبەر گەلـەکانیان هەیـە، جۆرەها وەڵامیــان دراوەتــەوەو دەیخەنــە روو، ئەمانــە هــەموو لەبــەردەم پــەروەردگار کۆدەبنەوە، چاوەڕێی پرسیارو چاوەڕوانی ئاکامن، ئاشکرایە ئـەوە دیمەنێکـە بـیر لێ کردنەوەی موچوڕکە بـە جەسـتەدا دێنـێو پێـست گـرژ دەکـاو، دڵـە خورپـێ پەیـدا دەکا:! خۆ ئەگەر رەحمی خودا نەبێ، لەو مەشهەدەدا کەس هیچی لـە بـیر نامێنـێو کـەس سـەر کەسـی ناپـەرژێ! رۆژی بـەرەوڕوو کردنەوەیـە، بـەرەوڕوو کردنــەوەی ئـادەمیزادان بـە پێغەمبـەرەکانیان، بـەرەوڕوو کردنـەوەی بـە درۆخـەرەوەکان بـەو پێغەمبەرانــەیان کــە بــە درۆیــان خــستوونەوە، بــۆ لۆمــەو سەرزەنــشت کردنــی سەرپێچیکاران، بۆ دووپات کردنەوی ئەو راستییەی کە ئەو پێغەمبەرانە لە خوداوە نێـردراون، ئـایینی خودایـان هێنـاوە، ئـەوان بەرپرسـیارن لـە پەیامەکـەیان؛ لەگـەڵ نەتەوەکانیان! بۆیـە کـە پرسـیار ئاڕاستەیان دەکـرێ، بەیـەك دەنـگ ئیعلانـی ئـەوە دەکەن کە زانیاری حەقو راست لای زاتی پەروەردگارە، ئەو زانیارییـەی لای ئەوانـە دەربارەی گەلەکانیان لـە ئاسـتی زانیـاری خـودادا وەکـوو نـەبوو وایـە!! بـە ئـەدەبو حیـشمەتەوە لـە خزمـەت پـەروەردگاردا بەندایـەتیو زەلیلـی خۆیـان رادەگەیـەنن بەیەك دەنگ دەڵێن: خودایە ئێمە هیچ زانیارییەکمان نیـە، ئێمـە ئاگامـان لـە هـیچ نەبووە ئـەو زانیارییـەی دەربارەیـان هەمانـە لـە ئاست زانیـاری تـۆدا وەکـوو نـەبوو وایە.

## یادخستنەوەی موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا

﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًاۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِيۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِيۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِيۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾.

وەکوو لە مانای ئایەتی پێشوودا گوترا: مەبەست بە فەرموودەی خودا ﴿مَاذَا أُجِبْتُمْ﴾ سەرزەنشتو لۆمە کردنی گەلو نەتەوە سەرپێچیکارو یاخی بووەکانی پێغەمبەرانە، ئاشکراشە شیاوترین گەلو نەتەوە بە لۆمە کردن، ئەو مەسیحییانەن کە عیسایان کردووە بە خودا، چونکە یاخی بوونو تانەو تەشەری گەلو

ـەتەوەكانی دیكە تەنیا ئاڕاستەی پێغەمبەرەكان كراوە؛ بەڵام دەستدرێژیو تانەی مەسیحییەكان ئاڕاستەی زاتی پاكی خودا كراوە، شتی وایان بۆ هەڵبەستووە كە زۆر ـەزاتی پاكو بەرزی ئەوەوە دوورە، ئەوەتا ئەوانە دەڵێن: خودا ژنو منداڵی هەیە، ـیدیعای ئەوە دەكەن كە عیسا كوڕی خودایەو، مەریەمی دایكی خێزانی خودایە!! ـۆیە پەروەردگار دێ لەو ڕۆژەداو لەو مەشهەدەدا نیعمەتەكانی خۆی، یادی عیسا ـەخاتەوە؛ كە لەڕاستیدا ئەو نیعمەتانە موعجیزەو چەسپێنەری ـێغەمبەرایەتیەكەیەتی، پاڵپشتو پشتگیری دەكەن لەسەر پەیامەكەی، هەر وەكوو چۆن پشتگیری پێغەمبەرانی تریشی كردووە بە موعجیزە، مەبەستیش بە وەبیرهێنانەوەی ئەو نیعمەتو موعجیزانە بۆ عیسا ریسواكردنی مەسیحییەكانە!! سەرزەنشتو لۆمەكردنیانە لەسەر ئەو پڕو پاگەندەیەی كە بۆ عیسایان هەڵبەست، چونكە هەریەكێ لەو نیعمەتانە ئەوە دەگەیەنێ كە عیسا ئادەمیزادو بەندەی خودایە، نەك خودابێ، یان كوڕی خودابێ، یان بەشێك بێ لەخودا!...... دەبا بزانین ـاخاوتنی ئەو مەشهەدە چییەو حەزرەتی عیسا چۆن وەڵامی پەروەردگاری تاكو تەنیا دەداتەوە؟؟..

﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەو دیمەنە بۆ گەلو ـەتەوەكەت باس بكە؛ كە خودا عیسا لەو مەشهەدە سامناكەدا رادەگرێ، خیطابی خۆی ئاڕاستە دەكاو، دەفەرموێ: ئەی عیسای كوڕی مەریەم! ﴿اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ﴾ یادی نیعمەتی من بكەرەوە كە بەسەر خۆتو دایكت دا رشتمن!! بەبێ باوك لە دایك دروستم كردی، كردمی بە موعجیزەو نیشانەی باڵادەستیو بە توانایی خۆم، نیعمەتم بەسەر دایكتدا رشت بەوە كە تۆم كرد بە بەڵگەو شایەت لەسەر داوێن پاكی لەو تاوانەی كە ستەمكاران ومپاڵیان دابوو نەفامو گەوج بوختانیا بۆ دەكرد، كە لەسەر بێشكە تۆمان هێنایە زوبانو شایەتیت دا بە داوێن پاكیو بی تاوانی دایكت ﴿إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾ تۆم بەهێز كرد بەهۆی ناردنی فریشتەی سرووش كە جوبرەئیلە، كردمی بە پێغەمبەر، نیگامان بۆ ناردیو پلەو

پایەی پێغەمبەریت پێ درا، لە تەمەنی منداڵیو گەورەییتدا بانگەوازی خەڵکت کرد بۆ خوداپەرستی، موعجیزەی سەرسوڕهێنەرمان پێ بەخشی بۆ پشتگیری کردن لە راستی پێغەمبەرایەتیەکەت بەم جۆرە کە ﴿تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً﴾ ئادەمیزادانت بانگ دەکرد بۆ خوداپەرستیو ئاخاوتنت لەگەڵدا دەکردن لە تەمەنی ساواییتدا کە لەسەر بێشکە بووی لە تەمەنی گەورەیشدا داوێن پاکی دایکت رادەگەیاندو بەرپەرچی ستەمکارو بوختانکەرانت دەدایەوە، دەتگوت: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا، وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا – مریم/ ٣٠ – ٣١﴾، هەروەها ﴿وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ یادی ئەو نیعمەتە بکەرەوە کە فێری نووسینو خوێندنەوەم کردی، دەتوانی کتێب بخوێنیتەوەو زانستی بە سوود بۆ دینو دونیات فێر ببیت، وشەی ﴿الْحِكْمَةَ﴾ زانستی نەظەریو عەمەلی دەگرێتەوە ﴿وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ﴾ فێری تەوراتم کردی، ئەو تەوراتەی کە لە پێش تۆدا بە نیگا بۆ موسامان ناردبوو، هەروەها (ئینجیل)مان بۆ ناردی کە پەندو ئامۆژگاری تێدایە، باس کردنی ئەم دوو کتێبە دووا بە دوای وشەی (الكتاب) بۆ زێدە رێزو قەدر زانییانە! ئەگینا وشەکە ئەوانیش دەگرێتەوە!.

هەروەها ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي﴾ یادی ئەو موعجیزە بکەرەوە کە پێمان بەخشیوی؛ بەویستو ئیرادەی ئێمە دەتهێنا لە قوڕ لاشەیەکت دروست دەکرد لە شێوەی باڵندەدا ئەمجار فووت بەو لاشەیەدا دەکرد، بەویستو ئیرادەی ئێمە دەبوو بە باڵندەیەکی خاوەن گیان. ئەتۆ لاشەیەکت رێکدەخستو فووت پێدا دەکرد پەروەردگار دەیکردە باڵندەو گیانی بەبەردا دەکرد ﴿وَتُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي﴾ هەروەها بە شێوەی موعجیزە کوێری مادەرزادو بەڵەکت چاك دەکردەوە، بە ویستو ئیرادەی ئێمە! هەروەها ئەو نیعمەتە بێنەوە یادی خۆت؛ کە موعجیزەی مردوو زیندووکردنەوەمان پێ بەخشی بووی، مردووی

چەند ساڵ لەوە پێش مردوو لە گۆڕا، بانگت لێ دەکرد بە ئیزنو ئیرادەی ئێمە گۆڕی هەڵدەتەکاندو زیندوو دەبووەوەو هەڵدەستایەوە.

هەروەها ﴿وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ﴾ یادی ئەوە بکەرەوە کە لە شەڕو مەبەستی بەنو ئیسرائیلی پاراستمیو نەمهێشت فرسەتت لێ بێنن ﴿إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ ئەو کاتەی کرای بە پێغەمبەرو بە بەڵگەو موعجیزەوە هاتیە لایانو پەیامی خۆتت پێ ڕاگەیاندنو بەڵگەت لەسەر ڕاستی پەیامەکەت نیشان دان، بەڵام گەلەکەت بڕوایان پێ نەکردیو سەرپێچیان کرد ﴿فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەوانەی کافر بوونو بڕوایان پێ نەکردی لەوان، وتیان: ئەم دیاردانەی عیسا دەیانوێنێ سیحرو جادوویەکی ئاشکرایە، فڕی بەسەر موعجیزەوە نیە، پەروەردگار هەموو نیعمەتەکانی بە شێوەی کرداری ڕابوردوو هێنان، بۆ ئەوەی ئاماژە بێ لەسەر ڕوودانیان.

هەروەها ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ﴾ یادی ئەو نیعمەتە بکەرەوە کە ئیلهامم خستە دڵی حەوارییەکانەوە ﴿أَنْ آمِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي﴾ کە ئیمان بێنن بە خودایەتی خۆمو پێغەمبەرایەتی عیسا؛ بۆ ئەوەی ببنە هاوڕێو یارمەتیدەرت ئەوانیش ﴿قَالُوَاْ آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ﴾ وتیان: خودایە ئیمانمان هێناو بڕوامان بە خودایەتی تۆ هەیەو عیساش بە پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی تۆ دەزانین، خودایە! تۆ بە شایەد بە ئێمە موسوڵمانین!!

ئاشکرایە وشەی ﴿أَوْحَيْتُ﴾ لێرەدا بە مانا ئیلهامو خستنە دڵە، نەك ئەو سروشو نیگایەی بۆ پێغەمبەران کراوە، لە چەند شوێنی تریشدا وشەی ﴿وحي﴾ بە مانا ئیلهام هاتووە؛ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ – القصص/٧﴾، یان ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا – النحل/٦٨﴾.

مەبەست لە هێنانی موعجیزاتی عیسا لێرەدا ئاگادار کردنەوەی مەسیحییەکانە، کە بیروباوەڕەکەیان بەتاڵەو پێویستە واز لەو بیروباوەڕە بێنن، چی دیکە ئادەمیزادێکی ئاساییو لە دایکبووی وەکوو عیسا نەکەن بە خودا، ئادەمیزادێك کە وەکوو ئادەمیزادێکی تر دەخواو دەخواتەوەو سەرئاو دەکاو خەوی لێ دەکەوێ......هتد.

## ناردنە خوارەوەی سفرەو خوان بۆسەر بەنو ئیسرائیل لەسەر داوای حەوارییەکان

﴿ إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۖ قَالَ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ ۖ وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ ۖ فَمَن يَكْفُرْ

يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾.

له ئایەتەکانی پێشوودا هەشت نیعمەت، یان بڵێین: هەشت موعجیزەی یەکی یەکی کە پەروەردگار بەخشیبووی بە عیسا باس کران، ئێستا دێتە سەر باس کردنی نیعمەتی نۆیەم کە موعجیزەیەکی ترە لەسەر راستی پەیامی عیساو پێغەمبەرایەتیەکەی، ئەویش چیرۆکی سفرەو خوانە، کە لەسەر داوای عیسا، پەروەردگار ناردیە خوارێ تا ببێتە بەڵگە لەسەر باڵادەستیو بە توانایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی عیسا بۆ ئەوەی خەڵکی بڕوای پێ بکەنو ئیمانی پێ بهێنن دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ ئەی محمد! یادی ئەو کاتە بکەرەوەو ئەو چیرۆکە بۆ ئادەمیزادان بگێڕەوە، کە هاوەڵە راستاڵەکانی عیسا؛ حەوارییەکان، بە عیسایان گوت: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾ ئایا پەروەردگاری تۆ رازی دەبێ بەوە کە لە ئاسمانەوە سفرەو خوانمان بۆ بنێرێتە خوارێ ئایا شتی وامان بۆ دەکا؟؟

**راڤەکەرانی قورئان لەسەر رستەی ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ چەند رایەکیان هەیە:**

١- دەڵێن: چونکە پرسیارو رووداوەکە لە حەوارییەکانەوە بووە، ئەوانیش بڕوادار بوونو پێیان وابووە: کە خودا بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستە، کەواتە: مانای ﴿يَسْتَطِيعُ﴾ لەسەر شێوەی خۆی نیە، بەڵکوو بە مانای (يَفْعَلُ)وە، واتە: پرسیارەکە لە تواناو دەسەڵات نیە بەڵکوو پرسیارەکە لەوەیە ئایا دەیکات یان نا؟! ئایا ئەگەر داوای شتی وا بکەی وەڵامت دەداتەوە یان نا؟! واتە: ئەوان هەرچەندە بڕوای تەواویان هەبوو بەدەسەڵاتو توانای خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەڵام ویستیان بە چاوی خۆیان ببینن بۆ زێدە دڵنیاییو بەهێزبوونی باوەڕەکەیان!

وەكوو چۆن حەزرەتی ئیبراهیم داوای لە خودا كرد فەرمووی: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى؟﴾ خودایە پیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەكەیەوە؟ چونكە شتێكی ئاشكراو نومایانە كە زانستی نەظەری‌و هەواڵ جاری وا دەبێ شوبهەو رەخنەی ئاڕاستە دەكرێ، بەڵام زانستێك كە لە بینینی بە ئاشكراو بەرچاوەوە پەیدا ببێ شك‌و گومان رووی تێ ناكا! فارس دەڵێن: (شنیدن كی بود مانندی دیدن) هەر بۆیەش حەوارییەكان وتیان: ﴿وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ وەكوو لە دواوە دێ. حەزرەتی ئیبراهیمیش – دروودی خودای لەسەر بێ – لە وەڵامی پەروەردگاردا كە پێی فەرمووی: ﴿أَوَلَمْ تُؤْمِن﴾ فەرمووی: ﴿وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي – البقرة/۲٦﴾.

۲- ئیمامی (السدی) دەفەرموێ: (یستطیع) لێرەدا بە مانای (یطیع)وەو (سین) كە زیادە ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ واتە: ئایا ئەگەر تۆ ئەی عیسا!داوا لە خودا بكەی بۆ ناردنە خوارەوەی سفرەو خوان لە ئاسمانەوە خودا بە قسەت دەكا؟

۳- ئیمامی طەبەری دەفەرموێ: باشترین مانا بۆ رستەی ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ ئەوەیە بگوترێ:

ئایا ئەگەر داوا لە خودا بكەی كە سفرەو خوانمان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێتە خوارێ خودا وەڵامت دەداتەوەو ئەوەت بە قسە دەكا؟

٤- برێكیش دەڵێن: بەگوێرەی قیرائەتێك كە ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبَّكَ﴾یە، رستەكە وشەیەكی لێ بڕدراوە، لە بنەڕەتدا رستەكە بەم جۆرەیە ﴿هَلْ يَسْتَطِيعُ سُؤَالَ رَبَّكَ﴾ ئەی عیسا دەتوانی پرسیار لە خودا بكەی؟؟ ئەو كاتە وشەی (استطاع) لەسەر مانای خۆی دەبێ!

بەهەر حاڵ حەزرەتی عیسا پرسیارەكەیانی پێ خۆش نەبوو بۆیە وەڵامی دانەوە كە واز لەو داوایە بێنن ﴿قَالَ اتَّقُواْ اللّهَ﴾ وتی: تەقوای خودا بكەن‌و لە سزای بترسن‌و واز لەم داواكارییە بێنن كە لە داوا ناقۆڵاكانی بەنی ئیسرائیلی دەچێ كە داوایان لە مووسا كردو داواكەیان رەت كرایەوە، چونكە داواكەیان پەلپ‌و بیانوو

بوو ئێوەش پەڵپو بیانووی وا مەگرن ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە راست دەکەن لە داوای ئیمان پێتەویتاندا، چونکە ئەو جۆرە پەڵپو بیانووە لەگەڵ ئیمانی راستو پتەودا کۆنابێتەوە.

ئەمجار حەوارییەکان عوزر دەهێننەوەو هۆی سەرەکی داواکەیان روون دەکەنەوە ﴿قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا﴾ داواکردنەکەمان پەڵپو بیانوو نیە بەڵکوو دەمانەوێ نیی بخۆین، برسیمانەو پێویستیمان بە خۆراك هەیە، سەربارەی ئەوەش ﴿وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ دەمانەوێ دڵنیا بینو بڕوامان بە هێز ببێ ﴿وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا﴾ یەقینو زانیاریمان بۆ زیاد ببێ لەسەر تواناو دەسەڵاتی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی تۆو هیچ گومانو دڵەراوکێمان نەمێنێ!! چونکە زانیارییەك کە لە رێگەی بینینەوەدەست بکەوێ بە هێزترە بۆ دابین کردنی مەبەست لە زانیارییەك کە لە رێگەی بەڵگەوە بە شێوەی نەظەری پەیدا ببآ ﴿وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ ئەگەر ئەو سفرەو خوانەمان بۆ بێتە خوارێ ئێمە دەبین بە شایەد لەسەر ئەو موعجیزەو لای ئەو بەنو ئیسرائیلییانەی کە حازر نین بۆیان باس دەکەین، یان ئەو کاتە ئێمە شایەدی دەدەین بە تاكو تەنهایی خوداو، بە تواناو دەسەڵاتی بێ سنووریو، باڵادەستی بەسەر هەموو شتێکدا، شایەتیش دەدەین کە تۆش بە راستی پێغەمبەریو لە خوداوە رەوانە کراوی، بەمەش ئیمانمان زیاد دەکاو دەشبێتە هۆی موسوڵمان بوونی خەڵکی تر.

جا کە حەزرەتی عیسا لە نیازەکەیان گەیشتو زانی مەبەستەکەیان پەڵپو بیانوو نیە، ئەم نزایەی لە خودا کرد: کە فەرمووی: ﴿قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾ عیسای کوڕی مەریەم دەستی نزاو پاڕانەوەی بەرز کردەوەو فەرمووی: پەروەردگارا! ئەی ئەو کەسەی هەموو ئیشو کارێکی ئێمەت بە دەستە؛ سفرەو خوانێکمان لە ئاسمانە وە بۆ بنێرە خوارێ، بە شێوەیەك ئەمانە بە چاوی خۆیان ببینن ﴿تَكُونُ لَنَا عِيداً﴾ ئەو رۆژەی سفرەو خوانەکەی تێدا دێتە

خواریَ ببێتە جەژن‌و ڕۆژی شادی‌و خۆشی بۆ ئێمەی خاوەن باوەڕو خوداپەرست، یان ئەو سفرەو خوانە ببێتە بژێوو نیشانەی ڕێزلێنان لە ئێمە لە ڕۆژی جەژندا! ﴿لِّأَوَّلِنَا﴾ ببێتە جەژن بۆ یەکەم گرۆهی ئێمەی موسوڵمان بووی حاڵی حازر کە ئەم نزاو پاڕانەوەیە دەکەین، واتە ئێمەی خاوەن باوەڕ ﴿وَآخِرِنَا﴾ هەروەها ببێتە جەژن بۆ ئەوانەی کە دوای هاتنە خوارەوەی سفرەو خوانەکە ئیمان دێنن.

هەندێك دەڵێن: واتە: ئەو سفرەو خوانە بەشی هەموویان بکا، واتە: ئاخر کەس وەکوو یەکەم کەس لێی تێر بخوا! ﴿وَآيَةً مِّنكَ﴾ ئەو سفرەو خوانە بکە بە نیشانە لەسەر ڕاستی بانگەوازییەکەم‌و ڕاستی پێغەمبەرایەتییەکەم‌و بێتە هۆی شارەزایی بوونی قەومەکەم بۆ ڕێگەی ڕاست‌و خوداپەرستی ﴿وَارْزُقْنَا﴾ لەو سفرەو خوانە رزق‌و رۆژیمان بدەریَ، رزق‌و رۆژیمان لە شتی تریش بۆ دابین بکە، کە بیکەینە غیذاو خۆراکی جەستەمان ﴿وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ تۆی پەروەردگار چاکترین رزق‌و رۆژی دەری، رزق‌و رۆژی دەدەی بە کەسانێك مەیلت لێ بێ، بەبێ ئەندازە، گەنجینەی رەحمەتت بێ سنوورو فراوانە.

تێبینی ئەوە دەکریَ: کە حەزرەتی عیسا لە دۆعاو پاڕانەوەکەیدا سوودو فائیدە ماددییەکانی سفرەو خوانەکەی خستە دوای سوودەکانی ئایینی‌و سوودە کۆمەڵایەتییەکانی، بە پێچەوانەی داوای حەوارییەکان کە سوودە ماددییەکانیان پێش خست!

دوعاکەی حەزرەتی عیسا گیرا بوو ﴿قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ﴾ پەروەردگار وادەی بە عیسا داو فەرمووی: ئەو سفرەو خوانەی داوات کرد، بۆتان دەنێرمە خواریَ، جارێك یان چەند جارێك! وادەی خودا حەقەو وتەی ڕاستەو بەڵێنی خۆی بە جێ هێنا. سفرەو خوانی لە ئاسمانەوە بۆ ناردنە خواریَ بەڵام ئەم وادەیە مەرجێکی لەگەڵدا بوو فەرمووی: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ﴾ هەر کەسێك لە ئێوە دوای هاتنە خوارەوەی ئەم سفرەو خوانە کافر بێ‌و بڕوا بە تاك‌و تەنیایی خودا

ـەکا ﴿فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لاَّ أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ﴾ بێگومان من سزای دەدەم سزایەکی وەها کەسی تر لە کافرەکانی جیهانی ئەو سەردەمە بەو شێوە سزا ـەدابێ! چونکە دوای بینینی ئەو بەڵگەیە بە چاوی خۆیان، هیچ بڕوبیانوویەکیان ـمێنێ بۆ ئەوەی بە کافری بمێننەوە، یان گاڵتە بە نیشانەکانی خودایەتی خوداو ـەسەلاتو توانای بێ سنووری بکەن!!

هەندێك دەڵێن: ڕۆژی هاتنە خوارەوەی سفرەو خوانەکە ڕۆژی یەك شەممە ـوود. بۆیە ئێستا مەسیحییەکان ڕۆژی یەك شەممە دەکەنە ڕۆژی پشوودان!

هەندێك دەڵێن: خواردەمەنییەکە نانو گۆشت بووە، هەندێك دەڵێن: نانو گۆشتی ماسی بووە. ئیمامی سیوطی فەرموودەیەکی ریوایەت کردووە دەفەرموێ: ـفرەو خوانەکە لە ئاسمانەوە نێردرایە خوارێ نانو گۆشتی لەسەر بوو، فەرمانیان ـێ کرا ڕۆژ بە ڕۆژ بیخۆنو هیچی لێ پەزمەندە نەکەن بۆ ڕۆژی دوایی. بەڵام ـەوان بەرچاو تەنگیان کردووو، لێیان هەڵگرت بۆ ڕۆژی دواتر، خودا غەزەبی لێ گرتنو کردنی بە مەیموونو بەراز! ئیبنو عومەر دەڵێ: کوشندەترین سزای ڕۆژی قیامەت بۆ مونافیقەکانو ئەوانەی کافر بوون لە تاقمی داواکەری سفرەو خوانو ـەرو دەستەی فیرعەون.

طەبەری دەفەرموێ: قسەی ڕاست ئەوەیە: کە بگوترێ: سفرەکە خواردەمەنی ـەسەر بووە، دەگونجێ گۆشتو ماسیو نان بووبێ، یان جۆرە میوەیەکی بەهەشت ـووبێ بزاندرێ چ جۆرێك بووە باشە، نەشزاندرێ زیانی تێدا نیە! (تفسیر الطبری - ج /٧/ ٨٨).

**حەزرەتی عیسا بەرانەتی خۆیو دایکی رادەگەیەنێ دەربارەی بیرو بۆچوونی مەسیحییەکان کە دەڵێن: خۆیو دایکی خودان**

﴿ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ

عَظِيمٌ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌۢ ﴿١٢٠﴾﴾.

دوای ئـەوەی پـەروەردگار نیعمەتـەکانی خـۆی بـۆ حـەزرەتی عیـسا ژمـاردن هەریـەکێ لـەو نیعمەتانـە موعجیزەیەکیـشن بـۆ عیـساو نیـشانەی بەندایـەتیو پێغەمبەرێتی بوون! ئەمجار باسی ئەوە دەکا کە لە رۆژی قیامەتدا لـە مەشهەدێکی سەهمناکو ترسناکدا پـەروەردگار پرسـیارێکی خەتـەرناك ئاراستەی عیسا دەکـا بـۆ سەرزەنشت کردنو نـارەزایی دەربـڕین لـە قەومەکـەی کـە ئـەو هـەموو سەرپێچیو بوختانو خیانەتکارییەیان ئەنجام داوە، هـەروەها بـۆ ئـەوەی پێیـان رابگەیـەنێ کـە عیـسا لـەو تۆمـەتو بوختانانـە رزگـاری دەبـێ. ئـەوەتا لێـرەدا پـەروەردگار رووی خیطابی خۆی دەکاتە پێغەمبەرو دەفـەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ﴾ ئەی محمد! ئەو رۆژە بۆ گەلەکەت باس بکە، کە پەروەردگار پرسـیارێکی گـرنگ لـە مەشهەدێکی ترسناکدا ئاراستەی عیسا دەکاو دەفەرموێ: ئەی عیسای کوڕی مەریـەم ﴿أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ﴾؟؟ ئـەوە تـۆ بـە ئادەمیزادانـت گوتووە منو دایکم بـە خـودا بـزانن‌و لـە جیـاتی خـودا ئێمـە بپەرسـتن؟؟ واتـە: لـە یەکتاپەرسـتییەوە ببنـە موشـریك‌و هـاوەڵ پەیداکـەر بـۆ خـوداو لـە تـەك خـودادا خودایەکی تر، یان چەند خودایـەك قـەرار بـدەن، جـا پێیـان وابـێ کـە ئـەو هاوەڵـە سوودو زیان دەگەیەنێ یان نـا، بـۆ خـۆی سـەربەخۆ کـاری پـێ ئـەنجام دەدرێـن یـان پێویستی بە ئیزنی خودا هەیە، چوون یەکـەو بـە موشـریك حلێـب دەکـرێ، وەکوو پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَـؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّـهِ - یـونس/١٨﴾. یـان دەفـەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى - الزمر/٣﴾.

جا هەرچەندە ئایەتەکە لەشێوەی پرسیاردا ئاڕاستە کراوە، بەڵام لە راستیدا پرسیار نیە، بەڵکوو سەرزەنشتو لۆمەیەو ریسوا کردنی ئەوانەیە کە پێیان وایە عیسا خودایە، یان بە شێکە لە خودا، بۆ ئەوەی ئینکاری کردنی عیسا لەو بارەوە کاریگەرتر بێ لە بەدرۆخستنەوەیان لە ریسوا کردنو سەرزەنش کردنیان، یان بۆ پێزاناندنی عیسایە کە گەلەکەی دوای ئەوەی ئەو لەدونیا دەرچووە چۆن گۆڕانو بوختانیان بەدەم خۆیو دایکییەوە هەڵبەستووە، ئایەتەکە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، کە مەسیحییەکان مەریەمو عیسای کوڕیان بە خودا داناون، چونکە دەیانپەرستنو بەندایەتیان دەکەن، هەروەها دەڵێن: مەریەم هەرگیز ئادەمیزادی لێ نەبووە بەڵکوو ئەوەی لێی بووە خودا بووە، هەندێکیشیان پێیان وایە: مەریەم یەکێکە لە سێ ئوقنوومەکانی: باوك، کوڕو روحولقودوس بێگومان پەروەردگار لە هەموو کەس باشتر دەزانێ کە حەزرەتی عیسا ئەوەی بە گەلەکەی نەگوتووە، بەڵکوو رێگەی خوداپەرستیو یەکتاپەرستی نیشان داون بەوپەڕی دڵسۆزییو لێبڕانەوە ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داوە!.

کەواتە: لە راستیدا پرسیارەکە ئاڕاستەی ئەو خوا گرتووانە کراوە! بەڵام بە رواڵەت پرسیارەکە ئاڕاستەی حەزرەتی عیسا کراوە، وەڵام دانەوەکەش هەر دەبێ لە ئەوەوە بێ ئەوەندەی تر مەشهەدەکەی پڕ سامو ترس کردووەو تاوانی شەریك پەیدا کردنو بە خودا زانینی عیسایان لێ ئەستەم بووە ریسوایان دەکا!!

بەراستی شەریك دانان بۆ خوداو بە خودا زانینی عیساو دایکی تاوانێکی ئەوەندە گەورەو لە عەقڵ دوورە ئادەمیزادێکی ئاسایی ناتوانێ بیدرکێنێو لافی پێوە لێ بدا! کێ دەتوانێ ئیدیعای خودایەتی بکا؟ لە کاتێکدا دەزانێ بەندەیەو دروست کراوە؟! دەی باشە چۆن پێغەمبەرێکی بەرێزی وەکوو عیسای کوڕی مەریەم لافی خودایەتی لێ دەدا؟! لەوە پێشیش کە خودا ئەو هەموو نیعمەتو موعجیزەیەی پێ بەخشینو کردی بە پێغەمبەرو فروستادەی خۆی؟؟ دەبێ چۆن لەم پرسیارە گرنگە رزگاری ببێ؟ چۆن بەرەو رووی ئەو ئیدیعای خودایەتییە

بێتەوە؟ لە کاتێکا عیسا بۆ خۆی هەرگیز لافی خودایەتی لێ نەداوەو بەندەیەکی راستاڵو ملکەچو فەرمانبەردارە! بۆیە وەڵامەکەی عیسا پڕە لە ترس و لەرزو بەوپەڕی داماوی و سەرکزیی و سیمای بەندایەتییەوە رووبەڕووی پرسیارەکە دەبێتەوە، سەرەتا بە پاک و بێگەردی و بەرزی پەروەردگار دەست پێ دەکا ﴿قَالَ سُبْحَانَكَ﴾ دەڵێ: خوایە! تۆ پاک و بێ عەیبی، بەرزو بێ هاوەڵی، تاک و تەنیاو بالادەست و پەروەردگاری، کەی بەندەیەکی وەکوو من رایەی دەکەوێ ناماقووڵی وا بکا؟! ﴿مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقّ﴾ من رایەم ناکەوێ و ناگونجێ بۆ من شتێک بڵێم کە بۆ زاتی پاکت نەشێ، ناگونجێ بۆ من قسەیەک بکەم کە مافی کردنی ئەو قسەیەم نەبێ، چۆن بەندەیەکی وەکوو من رێ بە خۆی دەدا لافی خودایەتی لێ بدا؟! ئەمجار دەکەوێتە بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە نەبووەو هەرگیز بانگەوازی بۆ ئەوە نەکردووەو زاتی پەروەردگار دەکاتە شایەد لەسەر بێ تاوانیی و بەرائەتی لەو تاوانە گەورەو دەڵێ: پەروەردگارا! ئەمن هەرگیز شتی وام نەگوتووە ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ﴾ خۆ ئەگەر شتی وام گوتبێ بێگومان تۆ زانیوتەو ئاگاداری، تۆ تاک و تەنیاو زاناو داناو پەروەردگاری ﴿تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي﴾ تۆ هەموو ئاشکراو نهێنی و پەنامەکی ناو دڵی من دەزانی ﴿وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ﴾ بەڵام من ئەو شتانەی لە زانستی تایبەتی خۆت دەیشارییەوە بە هیچ جۆرێک پەی پێ نابەم و لێی بێ ئاگام، ئەوەی فێرم نەکەی نایزانم، وا دەبێ فێری ببم لە بیرم دەچێتەوە ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ بێگومان تۆی پەروەردگار هەموو نهێنی و پەنامەکییەکت ئاگا لێیەو دەزانی چی دەبێ چۆن بووەو چی لێ دێ!

ئەمە وەڵامی عیسا بوو، نەیگوت من ئەوەم گوتووە یان نەم گوتووە، بەڵکوو زانینی ئەوەی حەواڵەی زانیاری بەرفراوان و بێ سنووری خودا کرد کە هەموو شتێکی لێ ئاشکراو نومایانەو هیچی لێ ون نابێ، ئەوە بوو وتی: ئەگەر من ئەوەم

گوتبێ ئەوە تۆ دەیزانیو ئاگاداری پێی، ئەمەش ئەوپەڕی ڕێز گرتنو ئەدەب دەگەیەنێ، ئەوپەڕی زەلیلیو گەردنکەچی خۆی بۆ خودا دەردەبڕێ!!

ئەمجار پەروەردگار قسەی عیسامان بۆ دەگێڕێتەوە کە چی بە گەلەکەی گوتووەو فەرمانی بە چی پێ کردوون، حەقیقەتو ڕاستی ئەوەی بە گەلەکەی ڕاگەیاندووە ئاشکرای دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ﴾ ئەمن هیچ شتێکم دەربارەی بیروباوەڕی خودا پەرستی پێ نەگوتوون جگە لەوەی فەرمانت پێ کردووم بە گەیاندنی کە بریتی بوو لەوەی تەنیا خودا بپەرستن کە پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەشەو منیش وەکوو ئێوە بەندەی بێ دەسەڵاتو دروستکراوی ئەو پەروەردگارەم! تەنیا جیاوازی من لەگەڵ ئێوە ئەوەیە: خودا کردوومی بە فروستادەی خۆیو بۆلای ئێوەی ناردووم بانگەوازیتان بکەم بۆ خوداپەرستیو بەندایەتی کردنی! ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ﴾ تا لە ناویاندا بووم چاودێریم دەکردنو ئاگام لە کردارو گوفتاریان بوو، نەم دەهێشت قسەی نابەجێ بکەن! هەمیشە داوام لێ دەکردن کە قسەی حەق بڵێنو خۆیان لە کردارو گوفتاری نابەجێ بپارێزن، ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ﴾ کاتێکیش منت مراندو بردمتەوە بۆلای خۆت ئیتر من ئاگام لێیان نەماوەو نازانم چییان کردووەو چییان گوتووە، تۆ بۆخۆت چاودێری کردارو گوفتاریان بوویتو ئاگات لە هەڵسو کەوتیان بووە ﴿وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ تۆ بەسەر هەموو شتێکدا ئاگاداریو هیچت لێ گوم نابێ، ئاگات لێیەو شاهیدی.

ماموستا سەیید لێرەدا دەفەرموێ: ظاهیری دەقەکانی قورئان ئەوە دەگەیەنن کە پەروەردگار عیسای مراندبێو ئەمجار بەرزی کردبێتەوە بۆ لای خۆی، بڕێ ئاسارو فەرموودەی پێغەمبەریش (درووودی خوای لەسەر بێ) ئەوە دەگەیەنن کە حەزرەتی عیسا زیندوو بێو لە پلەو پایەیەکی تایبەتیدا خودا لای خۆی دایناب‌ێ!! لێرەدا – بەڕای من – هیچ دژایەتییەک نابیندرێو ج گیرو گرفتێک پەیدا نابێ لە نێوان

ئەوەی خودا حەزرەتی عیسای لە ژیانی سەر زەوی بێ بەش کردبێ‌و مراندبێتی‌و لای خۆی لە پلەوپایەیەکی تایبەتیدا ئێستا زیندوو بێ!!

ئەوەتا: بە گوێرەی دەقی ئایەتی قورئان شەهیدەکان ژیانی دونیایان لە کیس دەچێ‌و بە رواڵەت دەمرن! وەلێ لە هەمان کاتدا لای خودا زیندوون‌و خواردن‌و خواردنەوەیان هەیە، بەڵام شێوەی ژیانەکەیان چۆنەو چۆن نیە؟ ئێمە نایزانین ئەو شێوە ژیانە چۆنە! هەروەها شێوەی ژیانی حەزرەتی عیسا سەلامی خودای لێ بێ نازاندرێ چۆنەو چۆن نیە.

زۆربەی راڤەکەرانی قورئان لەسەر ئەوەن کە رستەی ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي﴾ مەبەست مردنی گیان دەرچوون نیە، بەڵکوو مەبەست بەرزکردنەوەیە بۆ ئاسمان، چونکە لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ – آل عمران/٥٥﴾. شێخ حەسەنی بەصری دەفەرموێ: وشەی (وفاة) لە قورئاندا بە سێ جۆر مانای هاتووە:

١- وەفات: بە مانا مردن‌و گیان دەرچوون بێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا – الزمر/٤٢﴾ واتە: ئەو کاتەی تەمەنی تەواو دەبێ.

٢- وەفات بە مانای نوستن بێ دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ – الأنعام/٦٠﴾، واتە: دەتانووێنێ.

٣- وەفات بە مانای بەرزکردنەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ – آل عمران/٥٥﴾، واتە: وەرت دەگرم‌و بەرزت دەکەمەوە.

ئەمجار حەزرەتی (عیسا) کارەکان هەموو حەواڵەی پەروەردگار دەکاو بەندایەتی هەموو ئادەمیزادەکان بۆ خودا دووپات دەکاتەوە، جەخت لەسەر بەتوانایی زاتی پەروەردگار دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ﴾ هەموو شتێك بەدەست خۆتە، ئەگەر لەسەر تاوانەکەیان سزایان بدەی ئەوە دادپەروەری خۆتەو ئەوان بەندەی خۆتن. ﴿وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەوەشدا کە موشریك‌و تاوانبارن لێیان خۆش ببی، ئەوە دەسەڵات‌و صەلاحیەتی

خۆتەو كەس رايەى ناكەوێ رەخنەت لێ بگرێ، تۆ بەهێزو خاوەن تواناو دەسەلاتى، دەتوانى پاداش يان سزايان بۆ دەست نيشان بكەى، حەكيمو داناى هەرچى بكەى حيكمەتەو لە جێى خۆيدايەو كارى بێ رێو جێ ناكەى! ئەوان بەندەى تۆن‌و ئەتۆش پەروەردگاريانى، ئەتۆ لە هەموو كەس شياوترى بە كاروبارى ئەوان، نە من‌و نە غەيرى من لە مەخلوقات لەتۆ بە رەحمتر نين، كەس بەقەدەر تۆ لە حالى ئەوان شارەزا نيە، تۆ سزاو پاداشيان دەدەيەوە بە گوێرەى زانستى رەهاو موطلەقى خۆت كە ئاگادارى نهێنى‌و ئاشكرايانى، تۆ دەزانى كێ موسولمانى يەكتاپەرستەو كێ سێ خودايى‌و موشريكە.

لێرەدا پرسيارێك سەر هەلدەدا ئەويش ئەوەيە: دەگوترێ: حەزرەتى عيسا چۆن رێگەى بە خۆى دا كە بلێ: ﴿وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ﴾ ئەگەر لێيان خۆش ببێ لە كاتێكدا خودا لە تاوانى شەريك بۆ خودا دانان خۆش نابێ؟!

لە وەلامدا دەلێين: مەبەست لە قسەكەى حەزرەتى عيسا ئەوەيە: كە هەموو كارێك بەدەست خودايەو چى بوێ دەيكاو چى ويست بريارى لەسەر دەداو كەس نيە بەرەنگارى بكاو حوكم‌و بريارى هەلوەشێنێتەوە. رستەى ﴿إِنَّ اللَّـهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ ئەوە تەقريرى ئەمرى واقيعەو بەبەلگەى بيستراو (الدليل السمعي) چەسپاوە، هەرچەندە بە گوێرەى عەقل‌و بەراى ئەهلى سوننە رەوايە خودا لە تاوانبار خۆش ببێ‌و سزاى فەرمانبەردارى بدا!! ئەم رايە لەوەوە سەرچاوەى گرتووە كە خودا ئيرادەو قودرەتى رەهاى هەيە هەرچى بوێ بيكا دەيكا، بەلام موعتەزيلەكان دەلێن: پێويستە خودا سزاى تاوانبار بدا ئەگەر نەشى دا خودا لە خودايەتى ناكەوێ! قسەكەى حەزرەتى عيسا ئەوە ناگەيەنێ كە داواى شەفاعەت بكا بۆ قەومەكەى چونكە كەسێك شەريك بۆ خودا دابنێ شەفاعەتى بۆ ناكرێ! جا وەكوو لە سياقى ئايەتەكەدا تێبينى دەكرێ‌و وەردەگيرێ ئەوانەى ئيديعاى خودايەتيان بۆ عيساو دايكى كردووە هيچ رۆلێكيان لە مەشهەدەكەدا نيە، وا ديارە

ـموان لە شەرمەزاری‌و پەشیمانیدا نازانن چی بڵێن! کەی ئەوان بەو هەموو تاوان‌و ریسواییەوە زاتی ئەوە دەکەن سەرهەڵبڕن‌و وەڵام بدەنەوە؟!

کەواتە با ئێمە خۆیان پێوە خەریك نەکەین‌و بزانین مەشهەدەکە چۆن کۆتای دێ؟ مەشهەدەکە بە شێوەیەکی سەرنج راکێش کۆتایی دێ، بە رستەیەك رستەیەکی یەکلاکەرەوەو دیاری کردنی پاداش کۆتایی مەشهەدەکە دێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾ جەماوەری قورئان خوێنان وشەی (یوم) یان بە (مضمومی) خوێندۆتەوە لەسەر ئەم شێوە خوێندنەوەیە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبێ: پەروەردگار لە کۆتایی پرسیارو وەڵامەکەدا فەرمووی: ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە کە راستگۆیان سوود لە راستگۆیی خۆیان دەبینن، راستگۆیی لە بیروباوەڕدا، راستگۆیی لە شایەددانیاندا، راستگۆیی لە قسەو هەڵس‌و کەوتیاندا. ئیمامی نافیع وشەی (یوم)ی بە (مەنصوبی) خوێندۆتەوە، ئەوکاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبێ: پەروەردگار فەرمووی: ئەوەی کە عیسا گوتی: لە رۆژێك دایە؛ کە راستگۆیان سود لە راستییەکانیان دەبینن. ئەمجار پەروەردگار شێوەو جۆری ئەو سوودە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ بۆ ئەو راستگۆیانە هەیە باخ‌و سەیرانگای بەهەشت کە بە ژێر دارەکانیاندا جۆگەو جۆبار دەکشێن‌و، ژیانیان تێیدا خۆشتر دەبێ! ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ هەتا هەتایە لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە وێڕای ئەو لەززەت‌و خۆشییە جەستەییانە ﴿رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾ پەروەردگاریش لێیان رازییە، ئەوانیش رازین لەو پاداشتەی پەروەردگاریان، ئەمەش لەززەتێکی گیانیەو خۆشبەختی‌و کامەرانییەکی وەهایە کە بە نووسین‌و گوتن پێناسە ناکرێن‌و هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چەند دڵخۆشکەرەن‌و فەرەح بەخشن بە دڵ‌و دەروون، چ بە مراز گەیشتن‌و ئاوات بەدیهێنانێکە! بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئائەو خۆشی‌و لەززەت‌و بە مراز گەیشتنە بە مراز گەیشتنی مەزن‌و گەورەیەو ئەوپەڕی خۆشبەختی‌و کامەرانییە!

چونکە رزگار بوون لە دۆزەخو دوورکەوتنەوە لێی ئەوپەڕی بە مرازگەیشتنو خۆشبەختییە، خۆشیو لەززەتە جەستەییو گیانیەکانی ناو بەهەشتیش سەربار!!

ئەمجار پەروەردگار شتێك دێنێتە پێشەوە کە زۆر گونجاوە لەگەڵ ئیدیعای مەسیحییەکان کە بە خودا زانینی عیسایە تا بە شێوەیەکی نا راستەوخۆ بەرپەرچی ئیدیعاکەیان بداتەوە، ئەوەتا لە کۆتایی باسەکەداو لە دوادوای مەشهەدە سامناكو ترسناکەکەدا جاڕی دەسەڵاتداریو خاوەنیەتی خودا هەڵدەداو دەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەر بۆ خودایە خاوەنیەتی ئاسمانەکانو زەوی ﴿وَمَا فِيهِنَّ﴾ ئەو شتو حەشاماتەی تیایاندایە هەمووی دروست کراوو موڵکی خودان نەك هی عیسا یان یەکێکی تر ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خودای بالادەست تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە هەر شتێکیش خودا دەسەڵاتی بەسەردا هەبێ دروستکراوی ئەوەو بە ویستو ئیرادەی ئەو هاتۆتە کایەوە، یەکێکیش لەو بەندەو دروستکراوانە عیساو مەریەمی دایکییەتی؛ ئەدی ئێوەی مەسیحی چۆن ئیدیعای خودایەتیان بۆ دەکەنو دەیانبەنە پلەو پایەی خودایەتیەوە؟ چۆن ئەو مافە بە خۆتان دەدەن ئەم دەستدرێژییە لە خودا بکەن؟

## سورەتی ئەنعام (الأنعام)

ئەم سورەتە پیرۆزە شەشەم سورەتە لە قورئانی پیرۆز، ناونراوە بە سورەتی (ئەنعام) چونکە دووجار وشەی (انعام)ی تێدا هاتووە.

﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ مِمِّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعَامِ نَصِيبًا – الأنعام/١٣٦﴾.

﴿وَقَالُواْ هَذِهِ أَنْعَامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لاَّ يَطْعَمُهَا إِلاَّ مَن نّشَاء بِزَعْمِهِمْ –الأنعام/١٣٨﴾.

ئەم سورەتە بە یەکجار هاتۆتە خوارێ؛ ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: سورەتی ئەنعام، لە مەککە بە شەو بە یەکجار هاتۆتە خوارێ، حەفتا هەزار فریشتەی بە دەورەوە بوو، بە دەنگی بەرز تەسبیحاتی خودایان دەکرد. ئیبنو عومەر – خوایان لێ رازی بێ – دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سورەتی (ئەنعام)م بۆ هاتە خوارێ بە یەکجار، حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدا بوو، تەسبیحو تەحمیدیان دەکرد، هۆی ئەم زێدە گرنگی پێدانە؛ ئەوەیە: کە هەموو بەڵگەو دەلیلی یەکتاپەرستیو دادوەریو باسی پێغەمبەرایەتیو زیندووبوونەوەی قیامەتو پووچەڵ کردنەوەی رێبازی خوانەناسانو پڕوپووچ خواهانو رەتدانەوەی بەرنامە چەوتەکانی لە خۆ گرتووە. ئەوەشمان لە یاد نەچێ برێ لە ئایەتەکانی وێ نەچێ لە مەدینە هاتبنە خوارێو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کردبێ کە بخرێتە سەر ئەم سورەتەو لە شوێنی خۆیان بنووسرێن. پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی مائیدەوە لەم رووەوەیە: کە هەردووکیان؛ بەرەپەرچدانەوەی ئەهلی کیتابیان لە خۆ گرتووە، دژی هەڵوێستو بیروباوەڕیان دەدوێن، هەروەکوو چۆن حوکمی خواردەمەنی حەرامو گۆشتی ئاژەڵەکان دیاری دەکەن، هەروەها بیروباوەڕی ئادەمیزادانی سەردەمی نەفامی رەت دەکەنەوە کە دابو نەریتیان وابوو؛ برێ ئاژەڵیان دیاری دەکرد بۆ بتەکانیانو خواردنی گۆشتی ئەو جۆرە ئاژەڵانەیان لە خۆ حەرام دەکرد، بە خەیاڵی خۆیان لە بتەکانیان نزیک دەبوونەوەو بە تاعەت بۆیان حلێب دەکرێ!

زانایانی ئیسلام فەرموویانە: ئەم سورەتە بنەماو سەرچاوەیە بۆ بەرپەرچ دانەوەی موشریك‌و خوانەناسان‌و ئەوانەی بڕوایان بە زیندوبوونەوەو حەشرو حیساب‌و لێکۆڵینەوە نیە، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە بە یەکجار هاتبێتە خوارێ، چونکە مەبەستی سورەتەکە هەموو بەڵگەهێنانەوەو چەسپاندنی عەقیدەو بیروباوەڕە! هەرچەندە شێوازی بەڵگەکان جۆراوجۆرن. زانایانی زانستی کەلام بنەمای زانیارییەکانی خۆیانیان لەسەر ئەم سورەتە دامەزراندووە، چونکە زۆر ئایەتی تێدان بە ئاشکرا بیروباوەڕی قەدەرییەکان رەت دەکاتەوە! ئەم سورەتە وەکوو سورەتە مەککییەکان زۆر گرنگی بە لایەنی بنەمای بیروباوەڕ داوە، جەخت لەسەر چەسپاندنی خودایەتی خوداو نیگاو پێغەمبەرایەتی‌و زیندوبوونەوەو پاداشدانەوە دەکا!

بۆ چەسپاندنی باوەڕ بە ئەم بنەمایانە دوو جۆر ئوسلوب بەکار دێنێ ئوسلوبی تەقریرو ئوسلوبی تەلقین. لە بارەی شێوازی تەقریرەوە ئەوەتا بەڵگەی زۆرو زەبەندە لەسەر هەبوونی خوداو تاك‌و تەنیایی ئەو زاتە پیرۆزە دەهێنێتەوە، بە شتی سەلمێندراوو حاشا هەڵنەگر خودامان پێ دەناسێنێ، بەو شێوە کە دروست کردنی بوونەوەر پاڵ خودا دەداو خودایەتی حەق‌و موتڵەق بۆ ئەو دەچەسپێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ یان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ یان ﴿وَهُوَ اللّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الأَرْضِ﴾ ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ﴾ لەبارەی شێوازی تەلقین‌و دەرس دادانەوە ئەوەتا بەڵگەو دەلیلی زۆر رادەنوێنێ‌و فێری پێغەمبەریان دەکا بۆئەوەی لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەکاریان بێنێ‌و بتوانێ بەرەنگارییان بکاو بۆڕیان بدا، ئەویش لەڕێگەی پرسیارو وەڵامەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، قُل: لِلّهِ كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ یان ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً؟ قُلِ: اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَخَتَمَ عَلَى قُلُوبِكُم، مَّنْ إِلَـهٌ غَيْرُ اللّهِ يَأْتِيكُم بِهِ﴾ یان ﴿قَالُواْ لَوْلاَ نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ، قُلْ: إِنَّ اللّهَ قَادِرٌ عَلَى أَن

ـــزَلَ آيَـةً.....﴾ پوختـەی ئـەو بنـەما سـەرەكيانەی ئـەم سورەتە لـەخۆی گرتـوون ئـەمانەن:

١- چەسـپاندنی بيروبـاوەڕ لـە ڕێگـەی ئيقنـاعو كـارتێكردنو لێكۆڵينـەوەو توێژينەوەو پرسيارو وەڵام دەربارەی خوداو تاكو تـەنيايیو صيفاتو نيـشانەكانی خودا لە خودی ئادەميزادەكانداو لە بوونەوەرداو كاريگەريی لە كردارو گوفتاردا.

٢- چەسپاندنی پـەيامی پێغەمبەرايـەتیو نيگـاو ڕەتدانـەوەی شـوبهەو گومـانی كافرەكان بە بەڵگەی عەقڵیو زانستیو هەستەكانەوە.

٣- چەسپاندنی ڕۆژی قيامەتو زيندوبوونەوەو حيسابو لێكۆڵينـەوەو پاداشـتو سزا لەسەر كرداری دونيا، چاكە بە چاكەو خراپە بە خراپە.

٤- شيكردنەوەی بنەمای ئـايينو ئـەخلاقو دابو نـەريتی كۆمەڵايـەتیو جـەخت لەسەر ئەو وەسييەتو ئامۆژگارييانەی كە لە هـەموو ئـايينێكی ئاسمانيـدا جـەختی لەسەر كراوە.

٥- ئايين لە سەردەمی ئادەمەوە تـا ئـايينی (محمد) (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) يـەك بنـەمايان هەيـەو يـەك مەبەسـتو سـەرەنجاميان هەيـە. كـەوابێ بـەش بـەش كردنی ئايينو برواهێنان بـە هەنـدێكیو بـروا نـەكردن بـە بڕێكـی دژی بنـەماكانی ئايينی خودايە!

٦- خۆشـبەختیو نەگبـەتی، سـزاو پاداشـی قيامـەت لەسـەر خراپـەو چـاكە پەيوەندی بە كردەوەی ئادەميزاد خۆيەوە هەيە.

٧- ئادەميزادەكان لە چوارچێوەی ياسـاو نيظـامی كەونـدا كـە خـودا بـۆی ديـاری كردووە بە ويسـتو ئـيرادەی خۆيـان دێـنو دەچـنو كـار دەكـەن، زۆرەملـێو زەخـت كردن نيە، چ دژايەتيەك لە نێوان ويستو ئيرادەی خـوداو كـرداری ئـادەميزادا نيـە، چونكە (قـەدەر)ی خـودا بريتييـە لـە پەيوەنـدی كردنـی كـارلێكراوو كارلێكـەر بـە گوێرەی زانستو دانايی زاتی بێچوونی.

٨- دادپـەروەریی خـودا داخـوازی ئەوەیـە؛ کـە جیـاوازی بخاتـە نێـوان گـەل‌و نەتەوەکانەوە، ستەمکاران لە ناوبەرێ‌و نازو نیعمەتی خۆی بەسەر خوداپەرستاندا برێژێ‌و لە زەویدا جێگیریان بکا.

٩- خودا سەرچاوەی یاسا دانانە؛ حەڵاڵ کردن‌و حەرام کردن بەدەست خۆیەتی، بۆ هیچ کەس ڕەوا نیە لافی خودایەتی لێ بداو یاساو شەرع بۆ ئادەمیزادان دابنێ.

١٠- پێویستە ئادەمیزاد لە حاڵ‌و چۆنیەتی‌و بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان کەڵك وەربگرێ، تێبفکرێ ئەوانەی پابەندی فەرمانی خودا نەبوون چییان بەسـەر هـات. هـەروەها لـە بوونـەوەر وەرد ببێتـەوە بەڵگـە لەسـەر بـەتوانایی دەسـەڵاتی خـودا بێنێتەوە.

١١- ئادەمیزادەکان لە ژیاندا لە پێشبڕکێ‌و ململانێدان، لە بۆتەی تاقیکردنـەوەدان بۆ ئەوەی چاك‌و خراپ دەرکەون‌و بزاندرێن، سزاو پاداشیش چاوەڕوانی هەمووانـە. پـەروەردگار مۆڵـەتی بەنـدەکانی دەداو لەسـەر خراپـە، زۆرجـار خێـرا تۆڵـەیان لێ ناسێنێ، بـۆ ئـەوەی بـە خۆیانـدا بـچنەوەو خۆیـان چـاك بکـەن، بـەڵام هـەرگیز پـەروەردگار خراپـەو چـاکەی کـەس پاشـگوێ ناخـاو هـیچ شـتێك ئیهمـال ناکـا! ڕەحمەت‌و سۆزو بەزەییشی بێ سنوورو فراوانەو بەشی هەموو کەس دەکا!

## بەڵگەکانی هەبوونی خوداو تاك‌و تەنهایی زاتی پاکی‌و بەڵگەی زیندووبوونەوە

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ

تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾ ﴾.

ئەمجار پەروەردگار لەڕوانگەی ئەم ئایاتانەوە بەڵگە لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنیایی‌و زیندووبوونەوە دێنێتەوەو دەفەرموێ:

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ هەموو جۆرە ستایشێك بە هەموو زوبانێك‌و لە هەموو كات‌و شوێنێكدا بۆ پەروەردگاری تاك‌و تەنیایە، بۆ بەدیهێنەری ئاسمانەكان‌و زەوییە، هەر ئەو شیاوی سوپاس‌و ستایشە، چونكە بەخشش‌و نیعمەتەكانی بەسەر ئادەمیزادا زۆرو هەمە جۆرن، یەكێك لەو نیعمەتانە دروستكردنی ئاسمانەكانە، كە ئەو هەموو ئەستێرەو كاكەشانەو مانگ‌و ڕۆژەی تێدان كە بۆمان بوون بە چراو ڕووناكی، هۆی گەشەو نەشوونومای ئادەمیزادو ئاژەڵ‌و ڕووەكن، هەروەها بۆشایی فراوان كە بڕێكی هەوای تێدایەو دریژ، پێدەری ژیانە، هەروەها ماددەی ئەثیر كە هۆی گواستنەوەی دەنگە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر، هەروەها بڕێ لە نیعمەتەكانی یەزدان، هەبوونی زەوییە؛ كە قەرارگای مەخلوقاتەو سەرچاوەی رزق‌و ڕۆزییە، هەموو ئەم بوونەوەرە بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادەو لە خزمەتی ئینساندایە، ﴿وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾ هەروەها تاریكی‌و ڕووناكی دروست كردووە، شەوو ڕۆژی داهێناوە بۆ ئەوەی بەندەكانی سوودیان لێ وەربگرن، شەو بۆ حەسانەوەو نووستن‌و ڕۆژ بۆ هەوڵدان‌و كۆششكردن‌و دەستەبەركردنی بژێوو پێداویستی ژیان. جا وەكوو ئیمامی سوددی‌و جەماوەری ڕاڤەكەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بە ﴿الظُّلُمَاتِ﴾ تاریكایی شەوەو مەبەست بە ﴿النُّور﴾ ڕووناكی ڕۆژە، ئەمەش ڕەت كردنەوەی بیروباوەڕی ئاگرپەرستان (الثنویة)ی تێدایە، ئەوانە كە پێیان وایە دوو خودا هەن؛ دەڵێن: ڕووناكی خوداو بەدیهێنەری خێرە، تاریكی خوداو بەدیهێنەری شەڕە!

قەتادە دەڵێ: هۆی پێشخستنی ﴿السَّمَاوَاتِ﴾ لە ﴿وَالأَرْضَ﴾و ﴿الظُّلُمَاتِ﴾ لە ﴿النُّور﴾ ئەوەیە: کە پەروەردگار ئاسمانەکانی پێش زەوی بەدیهێناوە تاریکی پێش رووناکی دروست کردووە، بەهەشتی پێش دۆزەخ دروست کردووە، جنسی تاریکییە حیسییەکانی پێش رووناکی هێناوەتە کایەوە، سەرەتا ماددەی بوونەوەری دروست کردووە کە بریتی بووە لە دووکەڵێکی رەش یان (سەدیم) وەکوو زانایانی فەلەکناسی دەڵێن؛ ئەمجارە رۆژو مانگو ئەستێرەکان دروست کراون، تاریکاییە مەعنەوییەکانیش وەکوو نەزانیو کوفرو شیرك پێش نووری زانستو نووری باوەڕو نووری یەکتاپەرستی دروست کراون بە گوێرەی قورئان نووری زانستیو ئیمانو یەکتاپەرستی دوای تاریکی نەزانیو کوفرو شیرك بەدی هێنراون وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – النحل/٧٨﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەمو ئەبو شەیخ لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە؛ واتە: رستەی ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ رەتکردنەوەی بۆچوونی زیندیقەکانە، کە دەڵێن؛ خودا تاریکیو خووونفوسو دووپشكو هیچ شتێکی خراپو ناشیرینی دروست نەکردووە، دەڵێن؛ بەس رووناکیو شتە جوانەکانی بەدی هێناون. رستەی ﴿وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾ رەتکردنەوەی ئاگرپەرستەکانە کە دەڵێن؛ تاریکیو رووناکی هەڵسوڕێنەری بوونەوەرن وەکوو لەوە پێش ئاماژەمان بۆ کرد! ئەمجار بەم رستەیەی دوایی رەددی کافرە هاوبەش پەیداکەرەکانی عەرەب دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِم يَعْدِلُونَ﴾ واتە: ئەمجار ئەوانەی کافرو هابەش پەیداکەرنو ئینکاری نیعمەتەکانی خودای گردکار دەکەنو هاوبەش بۆ خودا دادەنێن! شتی تر دەکەن بە هاوشانی پەروەردگارو دیپەرستن، هاواری لێ دەکەن بۆ دابین کردنی پێویستییەکانیان، داوای دوورخستنەوەی زەرەرو زیانو هێنانی خێروبێر لەو خودا درۆزنانە دەکەن! لە کاتێکدا ئەم خودا درۆزنانە ناتوانن بۆ

خودی خۆیان سوودیان هەبێ، پێیان ناکرێ زیان لە خۆیان دوور بخەنەوە چ جای بۆ خەڵکی تر! ئەمجار پەروەردگار رووی خیطاب دەکاتە هاوبەش پەیداکەران؛ ئەوانەی هاوشانیان بۆ پەروەردگار داناوە، بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە لەسەر تاک‌و تەنیایی خۆی‌و زیندوبوونەوەی رۆژی قیامەت‌و دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئێوەی لە گڵ دروست کردووە، واتە: باوکی ئێوە کە ئادەمەو هەموو رەگەزی ئادەمیزاد لە ئەو کەوتۆتەوە لەگڵ دروستمان کردووە، دوایی ئەوەی زۆری لێ کەوتۆتەوەو هەموو کون‌و قووژبنێکی زەوییان گرتۆتەوە، هەروەها باقی زیندەوەرانی سەر زەوی کە دروستی کردوون. دوای ئەوەی کە گیانیان بەبەردا دەکرێ پێویستییان بە گژوگیا هەیە؛ چونکە خوێن‌و گۆشت‌و ئێسقان لە خۆراك پەیدا دەبێ‌و خۆراکیش لە گژوگیای زەوی پەیدا دەبێ، گژوگیاش لە ئاوو گڵ پەیدا دەبێ، کەوابێ هەموو زیندەوەرێك لە گڵ پەیدا دەبێ!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ کە تەمەنی هەموو دروستکراوێکی دیاری کردووە؛ دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قَضَى أَجَلاً﴾ پاشان تەمەنی ژیانی ئادەمیزادی دەستنیشان کردووە، لە رۆژی لە دایکبوونەوە تا رۆژی مردنی، ﴿وَأَجَلٌ مُّسمًّى عِندَهُ﴾ تەمەن‌و ماوەی بەرقەراربوونی ژیانی هەموو ئادەمیزادێك لای خودا خۆیەتی، ئەم تەمەنە ناوبراوە لە زیندوبوونەوەی ناو گۆڕەوە دەست پێ دەکا، تا رۆژی زیندوبوونەوەی قیامەت، ژیانی ئەم ماوەیە پێی دەڵێن: ژیانی بەرزەخیی.

ئیبنو عەبباس‌و موجاهید دەڵێن: مانای ﴿قَضَى أَجَلاً﴾ واتە: تەمەنی ژیانی دونیا، کە بە مردن کۆتایی دێ ﴿وَأَجَلٌ مُّسمًّى﴾ تەمەنی ژیانی قیامەتە. واتە: ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە پەروەردگار دوو جۆر ئەجەلی بۆ بەندەکانی داناوە، ئەجەلێك بۆ ژیانی هەموو کەسێك کە بە مردن کۆتایی دێ، ئەجەلێکیش دوای مردنی دونیا دەست پێ دەکا کە بە زیندوبوونەوە دەست پێ دەکا!

هەموو تەمەنێك لای خودا دیاری كراوە؛ واتە: سەرەتاو كۆتای هەیە! لەو ئەندازە زیادو كەم ناكا، پێش‌و پاش نابێ، جگە لە خودا خۆی كەسی تر ئاگاداری بەسەر چۆنیەتی‌و كات‌و ماوەی تەمەندا نیە، تەنانەت پێغەمبەران‌و فریشتە نزیكەكانی بارەگای ئەقدەسیش ئەم جۆرە زانیارییەیان نیە! كەوابوو مەبەست لەو دوو جۆرە ئەجەلە، یەكێكیان ئەجەلی ئادەمیزادو دونیایە، ئەوی تریان ئەجەلی قیامەتە!! دەربارەی جۆری ئەجەلی یەكەم قورئان لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ – النحل/٦١﴾. دەی سەرباری ئەم هەموو بەڵگانە لەسەر تاك‌و تەنیایی خوداو هەبوونی رۆژی قیامەت‌و زیندوبوونەوە ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ﴾ كەچی ئێوە ئەی كۆمەڵی كافرو هاوبەش پەیداكەران؛ دەكەونە شك‌و گومانەوەو بڕواتان بە زیندوبوونەوە نیە، پێتان وایە ژیان تەنها بریتییە لە ژیانی دونیاو بەس، پاش لە دونیا دەرچوون ئیتر ژیانی تر نیە!؟ لە كاتێكدا خودا بابا ئادەم:- كە باوكی هەموو ئادەمیزادە- لە گڵ دروستی كردووەو دوایی نەوەو رەچەڵەكی لێ كەوتۆتەوە، جگە لە ئادەم‌و حەوا، بناغەی هەموو ئادەمیزادێك دڵۆپە ئاوێكە هیچ‌وپووچ لە منداڵدانی ئافرەتدا جێگیری دەكەین‌و دوایی گیانی بەبەردا دەكەین لە ناو تاریكایی پەردەو منداڵداندا، پێداویستی ژیان‌و گەشەكردنی بۆ دابین دەكەین‌و دوایی لە دایك دەبێ‌و پێ دەگا! دەی كەسێك ئاوا دەسەڵاتی هەبێ لە سەرەتاوە شت دروست بكا؛ بێگومان دروستكردنەوەی لا ئاسانتر دەبێ.

ئەمجار بەڵگەیەكی تری لەسەر تاك‌و تەنیایی خۆی هێنایەوەو فەرمووی: ﴿وَهُوَ اللّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الأَرْضِ﴾ ئەو پەروەردگارە كە ناوی ﴿اللّـه﴾یە هەر ئەو خودایەو شایانی پەرستنە لە ئاسمانەكان‌و زەویداو ناسراوە بە خودایەتی‌و هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەویدا هەیە گەردنكەچی فەرمان‌و دەسەڵاتی ئەو خودایەیە: كە ناوی ﴿اللّـه﴾یە... لە رووی خۆشەویستی‌و لێ ترسانەوە – جگە لە كافران‌و بێ باوەڕانی ئادەمیزادو جنۆكە – هەموو شتێك‌و هەموو كەسێك دەیپەرستن‌و

بەندایەتی دەكەن! بێگومان ناسینی خودا بە ناوی ﴿اللّـه﴾ لە كۆمەڵگای عەرەبە موشریكەكاندا دیاردەیەكی ئاشكراو نومایان بوو، ئەوەتا پەروەردگار لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ (العنكبوت/٦١).

هەر وەكوو لە سورەتی (الزمر/٣٨) جارێكی تر وێنەی ئەم ئایەتە دووبارە بۆتەوە.. هەر لەشێوەی ئەم جۆرە پرسیارو وەڵامەدا قورئان چەند جارێكی تر ئەم راستییەی دووبارەو سێبارە كردۆتەوە[١].

كەواتە: عەرەبە موشریكەكان بڕوایان بە خودا هەبووەو پێیان وابوو: كە بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوی خودایە؛ كە ناوی ﴿اللّـه﴾یە. كەسی تر نیە ئەو كارانەی لێ رەچاو بكرێ.

﴿يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهرَكُمْ﴾ شتی نهێنیو ئاشكراتان وەكوو یەك دەزانێ، لە زانستی خودادا پەنامەكیو نومایان چوون یەكە، بەسەر هەموو شتێكدا بە تەواوی ئاگادارە، هیچی لێ گوم نیە، هەرچی پەنامەكیو شاردراوەی ئاسمانەكانو زەوی هەیە لە ژێر تیشكی زانستی ئەودا ئاشكراو نومایانە!

﴿وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾ هەر كردارو گوفتارێك ئەنجامی دەدەن، چاكو خراپو خێرو شەڕ، كەمو زۆر خودا پێی دەزانێو ئاشكراو عەیانە لای، پاداشو سزاتان لەسەریان دەداتەوە!

ئەوەی لە مانای ئەم ئایەتە تێبینی دەكرێ بەلگەهێنانەوەو چەسپاندنی بیروباوەڕی یەكتاپەرستیو هەبوونی خودایەكی پەروەردگارو كارسازو بەدەسەڵاتو بێ هاوەڵو بێ هاوشانە! خودایەك كە شیاوی هەموو سوپاسو ستایشێكە، چونكە خاوەنی نیعمەتو بەخششی زۆرو زەبەندەیە!

---

[١] بڕوانە سورەتی المؤمنین ئایەتی ٨٠ — ٩٠، سورەتی النحل ٦١ — ٧٠، هەروەها سورەتی الزخرف/٨٤ كە دەفەرموێ: {وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَهٌ}.

ئایەتەکان بەڵگەهێنانەوەن لەسەر دەسەڵاتی خودا، لەسەر زانیاریو ویستو ئیرادەی! لەم رووەوە کە هەواڵمان پێ دەدا کە خۆی ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناوەو رەنگ رێژو نەخشەکێشی کردوون، بە سافو بێ کەندو چاڵو دەوەن دێتە بەرچاومان، مانگو رۆژو ئەستێرەی جۆراو جۆری تێدا خولقاندوون بۆ جوانی، هەڵمو هەوری تێدا داناون بۆ نیشانە، زەوی راخستووەو کردوویەتی بەسەرچاوەی رزقو رۆژی گیانلەبەران، جۆرەها گیانلەبەری تێدا بلاو کردۆتەوە، کێوەکانی وەکوو سینگ تێدا داکوتاون، شیوو دۆڵو رێگاو بانی تێدا دروست کردوون، جۆگەو چەمو زێی گەورەو بچووکی تێدا رەوان کردوون! بیرو کانیاوو سەرچاوەی ئاوی تێدا هەڵقوڵاندوون، لە شوێنی وادا هەیە لە بەردی رەق سەرچاوەی ئاو هەڵدەقوڵێنێ ئەمانەو زۆر نیشانەی تریش لە ئاسمانەکانو زەویدا بەڵگەی بەهێزن لەسەر تاکو تەنیایی خوداو گەورەییو بێ هاوەڵی، ناوی ﴿اللّـه﴾یە، پەرستراوە لە ئاسمانو زەویدا، خۆی کارگێڕو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، تەمەنی هەموو شتێك لای خۆی ئاشکرایەو نمایانەو دیاری کردووە هیچی لێ هون نابێو ئاگاداری هەموو شتێکە!

## هۆی کافربوونی ئادەمیزادان بە ئایەتی خوداو، هەڕەشە لێکردنیان بەسزاو تۆڵە

﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ

عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَـٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾ ﴾.

ئەمجار هۆی بڕوانەهێنانی کافرەکان بەخودا باس دەکاو هەواڵمان دەداتێ کە هاوبەش پەیداکەران‌و سەرڕەق‌و ملهوڕەکان، کە موعجیزەو بەڵگەیەکیان لەسەر تاك‌و تەنیایی خودا بۆ بنێردرێ راستی پەیامی پێغەمبەر بچەسپێنێ پشتی تێ دەکەن‌و گرنگی پێ نادەن‌و بە وردی تێی نافکرن‌و دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلاَّ كَانُواْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بزانە ئەو موشریکانە هەر نیشانەیەکی خودایان بووبێ‌و بەڵگەبێ لەسەر راستی پەیامت‌و پێغەمبەرایەتی تۆ بسەلمێنێ، ئەوان پشتی لێ هەڵدەکەن‌و تێی نافکرن، ئەوان هەرگیز بیر لە قورئان ناکەنەوەو لێی ورد نابنەوە، ئەو قورئانەی لە پەروەردگاریانەوە بۆیان نێردراوە، هیچ بیر لە دروستکراوی دەستکردی ئەو خودایە ناکەنەوە، کە پەروەردەی کردوون، لەکاتی زەبوونی‌و بەهێزیدا بژێوی پێ داون، نازو نیعمەتی بەسەرا رشتوون، ئاسمان‌و زەوی بۆ رام کردوون‌و سوودی لێ وەردەگرن، لە خودی خۆیانداو لە ئاسمان‌و زەویدا بەڵگەی چەسپێنەر هەن، لەسەر دەست رەنگینیی‌و کارسازی خودا، کەچی ئەوان لە ئاست هەبوونی ئەم هەموو بەڵگەو دەلیلانەدا چاوی خۆیان دەقونجێنن‌و گوێی خۆیان دەئاخنن‌و پشتی لێ هەڵدەکەن، تەنانەت گاڵتەشیان پێ دێ‌و بەلاقرتێ‌و گاڵتەبازییەوە روویان لێ وەردەگێڕن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ – الأنبياء/٢﴾.

قورطوبی دەڵێ: مەبەست بە ﴿آيَاتِ﴾ موعجیزەیە؛ وەکوو لەت بوونی مانگ‌و ئەو جۆرە شتانە، ئیبنو کەثیریش هەر ئایاتی بە موعجیزە راڤە کردووە، دەڵێ: مەبەست بە ئایات ئەو بەڵگەو دەلیلانەن کە تاك‌و تەنهایی خودادەچەسپێنن!!

﴿فَقَدْ كَذَّبُواْ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءهُمْ﴾ هۆی ئەو روو وەرگێڕانو پشت هەڵكردنەشیان لە ئایەتەكانی خودا بە دۆرخستنەوەی ئەو ئایینە حەقو راستەیە كە سەرداری پێغەمبەران بۆی هێناون ئەویش ئایینی پاكو خاوێنی ئیسلامە! ئەمجار پەروەردگار لەسەر ئەو پشت هەڵكردنو روو وەرگێڕانەیان هەڕەشەی توندیان ئاراستە دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنبَاء مَا كَانُواْ بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ﴾ دڵنیابن ئەومیان بەسەرەوە ناچێ، لەوەدووا هەواڵی ئەو بە درۆخستنەوەیان دەزانن‌و ئاكامی ئەو هەڵوێستە نادروستەیان‌و روو وەرگێڕان‌و گاڵتەكردنەیان تووش دەبێتەوە بە كوشتن‌و فڕاندن‌و دەركردن لە وڵات تۆڵەیان لێ دەسێندرێتەوە!

بێگومان ئەم وادەیە هاتەدی‌و موشریكەكان تووشی گرانی‌و قات‌و قڕیی بوون رۆژی جەنگی بەدرو رزگاركردنی مەككە تووشی تێكشكان‌و چەرمەسەری بوون!

ئیمامی رازی دەڵێ: پەروەردگار حاڵ‌و چۆنیەتی كافرەكانی بە سێ پلە دەستنیشان كرد، پلەی یەكەم روو وەرگێڕان‌و تێ نەفكرین لە بەڵگەو نیشانەكانی خودا، پلەی دووەم بەدرۆخستنەوەی ئەو بەڵگەو موعجیزانە، پلەی سێیەم گاڵتەكردن بەو موعجیزەو نیشانانە، تاوانی هەموو پلەیەكیش لە تاوانی پلەی پێشوو گەورەترە، چونكە وا دەبێ كابرا روو لە شتێك وەردەگێڕێ لەبەر ئەوە نیە بڕوای پێی نیە بەڵكوو لەبەر ئەومیە پێی نازانی‌و لێی غافڵە، وا دەبێ كەسێك شتێك بە درۆ دەخاتەوە بەڵام نایگەیەنێتە ئاستی گاڵتە پێ كردن[1] كەوابێ تاوانی پلەی سێیەم كە گاڵتە پێ كردنە لە تاوانی پلەی پێشوو گەورەترە!

ئەمجار پەروەردگار ئەو راستیە دووبارە دەكاتەوە؛ كە هەڕەشەكردنی لە سەرپێچیكاران بە سزادانیان دەستوورو دابێكی خۆیەتی‌و دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْاْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ﴾ ئایا ئەو بەدرۆخەرەوانەی ئایینی ئیسلام، ئەو روو وەرگێڕانە لە قورئان‌و موعجیزەكانی

[1]- تەفسیری كەبیری فەخرەدینی رازی ج /٢/١٥٧.

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، نەیانبیستووەو نەیانزانیوە ئێمە چەند گەلو نەتەوەمان لە پێش ئەوان بە هیلاك بردووە، چەندان گەلو نەتەوەی وەكوو گەلی عادو ثەمودو گەلی فیرعەونو گەلی (لووط)مان بەفەتارە داوەو لە بێخ دەرمان هێناون، ئەوانەی پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆخستەوە، هەرچەندە ئەوانە هێزو توانامان پێ دابوون، رزقو رۆژیمان پێ دابوون، دەسەلاتو فەرمانڕەواییمان پێ بەخشیبوون بە جۆرێك كە ئەو دەسەلاتو چەسپان لە زەویداو رزقو رۆژییەممان نەداوە بە ئێوەی هاوچەرخی پێغەمبەری ئیسلام!

﴿وَأَرْسَلْنَا السَّمَاء عَلَيْهِم مِّدْرَارًا﴾ ئاسمانمان بۆ رام كردن بۆ ئەوەی بە گوێرەی پێویست بارانیان بۆ ببارێنێ ﴿وَجَعَلْنَا الأَنْهَارَ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ﴾ جۆگەو جۆبارمان بە ژێر نیشتەمەنیەكانیاندا دەڕۆیاند، واتە ئەوان لە كافرەكانی قورەیش ساماندارتر بوون، بارانیان بۆ دەباری بە شێوەیەكی رێكو پێك، جۆگەو جۆبار بە ژێر خانووەكانیاندا دەكشان! ژیانێكی بەختەوەرو كامەرانیان هەبوو! بەلام كە كوفرانیان بەرامبەر نیعمەتەكانی خودا كردو تاوانیان ئەنجام دان، پێغەمبەرەكانیان بە درۆخستنەوە ﴿فَأَهْلَكْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ بەهۆی ئەو تاوانانەیانەوە لە ناومان بردن، تەفرو توناكمان كردنو لە بێخمان دەرهێنان! ﴿وَأَنْشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ دوای ئەوان نەتەوەیەكی ترمان هێنایە گۆڕی ژیانەوە، چینێكی ترمان خستنەسەر زەویو ئەركی ئاوەدان كردنەوەمان خستنە ئەستۆ، بۆ ئەوەی زەوی ئاوەدان بكەنەوەو سوپاسی پەروەردگار بكەن! بەكورتی ئایەتەكە ئاماژە بۆ ئەوە دەكا؛ كە دوو جۆر تاوان بوون كە بوون بەهۆی لە ناوبردنی گەلەكانی پێشوو؛ یەكەم بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرەكانیان، دووەم ناشوكریو سپلەییان بەرامبەر نیعمەتەكانی پەروەردگار وەكوو لە شوێنێكی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ

الْوَارِثِينَ، وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا، وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ – القصص/٥٨ – ٥٩﴾.

مەبەست لەم هەرِەشە كردنە ئامۆژگاری كردنی دانیشتوانی مەككەیەو ترساندنیانە لەوەی كە هەمان سزاو بەلاّو نارِەحەتیو چەرمەسەری كە تووشی نەتەوە پێشینەكان بووە، لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەكانیانو سپلەّییان بەرامبەر نیعمەتەكانی خودا تووشی ئەمانیش ببێ، لە كاتێكدا كە نەتەوە پێشینەكان لەمان بەهێزتر بوون، ساماندارتر بوون، كورِو خزمو كەسو كاریان زیاتر بووە، لە باری ژیارو زەویو ئاوەدانكردنەوەدا زۆر لە قورِەیشییەكان پێشكەوتووتر بوون!

## سەررِەقی كافرەكانو رەتكردنەوەی داواكارییەكەیان كە بریتی بوو لە ناردنە خوارەوەی كتێب یان فریشتە ناردن

﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

ئایەتەكانی پێشوو برِێ هەلّوێستی موشریكەكانی مەككەی دەست نیشان كرد، لێرەش بەولاوە ئایەتەكان بەردەوامن لەسەر ئاشكراكردنی هەلّوێستی جۆراو

جۆريـان كـه بريتييـه لەسـەر رەقـیو دژ بەحـەق وەسـتانو گومـان خـستنە سـەر ئيـسلامو بەرامبـەری كردنـی، بەتايبـەتی شـوبهەو گومانـەكانيان ئاراسـتەی نيگـاو پێغەمبەرايـەتی حـەزرەتی (محمـد) دەكـرد (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئـەوان ئينكاری سێ بنـەمای سـەرەكی ئايينيـان دەكـرد كـه بريتـی بـوون لـه بـڕوا بـەتاكو تـەنهايی خـوداو زيندوبوونـەوەی دوای مـردنو پێغەمبەرايـەتی حـەزرەتی (محمـد) (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ).

جـا وەكـوو كەلـەبی دەگێڕێتـەوە: دەڵـێ: موشـريكەكانی مەككـه وتيـان: ئـەی (محمد)! سوێند بەخوا ئێمـه ئيمانـت پـێ نـاهێنين هـەتا لـەخوداوە پـەڕاوێكمان بـۆ نەهێنی چوار فريشتەی لەگەڵدا بن لـەپێش چاوی خۆمـان شـايەدی بـدەن كـه ئـەو پـەڕاوە لەلايـەن خـوداوە هـاتووەو تـۆيش فروسـتادەو رەوانـەكراوی خـودای، ئـيتر پەروەردگار ئەم ئايەتەی نارده خوارێ كه دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾. ئەگەر بماننارداية بۆسەر تۆ پـەڕاوێك لـه كاغـەزدا بـۆ خۆيـان دەسـتيان لێ بدايـه، كافره بـێ بڕواكان دەيانگوت: ئەمە جگه لە سيحرو جادو هيچی تر نيه.

لەم ئايەتەدا پەروەردگار هۆی بڕوانەكردنی كافرەكانو ئيمان نەهێنانيان ديـاری دەكـا، ئـەوە روون دەكاتـەوە: كـه ئەوانـه بيـانوی سـەيرو سـەمەرە دێننـه پێشەوە، داوادەكـەن پـەڕاوێكی لەكاغـەز نوسـراودا بنێرينـه خـوارێ، چـوار فريـشتەشی لەگەڵدابنو شـايەتی بـدەن لەسـەرئەوەی كـه لەلايـەن خوداوەيـەو پـشتگيری راسـتی پێغەمبەرايـەتی پێغەمبـەر بكـەن! ئـەمجار هـەر ئيمـان نـاهێنن، چـونكه بەڕاسـتی روويـــان وەرگێـــڕاوە، بەڵگـــەو دەليـــل كاريـــان تێناكـــەن، تەنانـــەت ئەگـــەر داواكارييەكانيشيان جێبەجێ بكرێن بيانوی تر دێننه پێشەوە.

بێگومـان هـۆی سـەرەكی بەدرۆخـستنەوەيان بـۆ ئـايينی حـەقو راسـت روو وەرگێڕانيانـه لـه ئايەتـەكانی خـوداو داخـستنی هـەموو پەنجـەرەو ديـدەوانیو وردبوونـەوەو تێفكـرين، لەكارخـستنی هـەموو هێـزو توانايـەكی تێگەيـشتنو

تێفکرینە، تەنانەت ئەگەر ئێمە ئەی محمد! کتێبێکی نوسراو لەکاغەزدا بۆ تۆ بنێرینە خوارێ یان لەنێوان زەوی‌و ئاسماندا رایبگرین‌و بەچاوی خۆیان ببینن‌و چاویان لەهاتنە خوارەوەی بێ، کە گەیشتە سەر زەوی دەستی لێ بدەن! دەڵێن: ئەمە سیحرو جادووەو فێڵ‌و چاوبەستەیە لێمان کراوەو بنەماو حەقیقەتی نییە!

ئایەتەکە فەرمووی: ﴿فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾ چونکە دەست لێدان بەهێزترین بەڵگەی حیسسییەو کەمتر فێڵی لێ دەکرێ هەروەها وشەی (نزلنا) بە موشەدەدی، رستەی ﴿كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ﴾ کە کتێب هەردەبێ لەناو کاغەزدابێ‌و (لمس) هەر بەدەست دەبێ ئەمانە هەموو موبالەغەو جەخت کردنن بەوشێوە هێنراون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پشت هەڵدەکەن‌و روو وەردەگێڕن‌و دەڵێن: ئەمە سیحرو جادووە لێمان کراوە، ئاوا بێ پەروا ئینکاری شتە حیسسییەکان دەکان!.

هەر لەم روانگەوە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ، لَقَالُواْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ – الحجر/١٤ – ١٥﴾.

ئیبنو مونذیرو ئیبنو ئەبی حاتەم لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بانگی نەتەوەکەی خۆی کرد بۆ موسوڵمان بوون‌و ئاخاوتنی لەگەڵدا کردن زەومەعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەلیب‌و نەضری کوڕی حاریثی کوڕی کەلدەو چەند کەسێکی تر وتیان: ئەی محمد! ئەگەر فریشتەت لەگەڵدا بووایەو لەجیاتی تۆ قسەی بکردایەو لەگەڵت ببینرایە؟! ئیمانمان پێ دەهێنا ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿وَقَالُواْ لَوْلا أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ﴾ واتە: کافرەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد، وتیان: بۆ فریشتە نانێردرێتە سەری؟ ئەگەر (محمد) راست دەکا پێغەمبەرە بۆ فریشتەی لەگەڵدا نییە! پشتگیری بکاو یارمەتی بدا؟ وەکوو ئەوە بڵێی وا تێگەیشتبوون کە پێغەمبەرایەتی‌و ئادەمیزادی پێکەوە ناگونجێ!! دەشیانزانی کە پێغەمبەر (درودی

خوای لەسەر بێ) ئادەمیزادە، ئیتر نەدەچووە عەقڵیانەوە پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ وەکوو لەشوێنێکی تردا لەمبارەوە لەسەر زوبانی کافرە سەر رەقەکانەوە دەفەرموێ: ﴿مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ – المؤمنون/٣٣﴾، یان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا – الفرقان/٧﴾.

ئیتر پەروەردگار ئەم پێشنیارەشی بەدوو بەڵگە رەتکردنەوە؛ یەکەم فەرمووی: ﴿وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ الأَمْرُ ثُمَّ لاَ يُنظَرُونَ﴾ ئەگەر بەگوێرەی پێشنیاری ئەوان فریشتەمان بناردایە خوارێ و سەرپێچییان بکردایە یەکسەر بڕیاری لەناوچونیانمان دەدان و مۆڵەتمان نەدەدان بۆ ماوەیەك و بە كاڵەخۆ موسوڵمان بوونایە، بەڵکوو یەکسەر لەخوداوە سزایان بۆ دەهات، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا نُنَزِّلُ الْمَلائِكَةَ إِلاَّ بِالحَقِّ وَمَا كَانُواْ إِذًا مُّنظَرِينَ – الحجر/٨﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَائِكَةَ لَا بُشْرَى يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ – الفرقان/٢٢﴾...

دووەم دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلاً﴾ ئەگەر لەتەك ئادەمیزاد سرووشتدا فریشتەمان بناردایەتە خوارێ، دەبوایە ئەو فریشتەیەش لەشێوەی ئادەمیزاددا بووایە تا بیانتوانیایە ئاخاوتنی لەگەڵدا بکەن و شتی لێوە فێرببن، ئیتر ئەوکاتەش دەکەوتنە هەمان سەر لێ تێکچوون و سەرلێ شێواوییەوە، چونکە ئەویش لەشێوەو روخساری ئادەمیزاددا دەبوو پێی دەگوتن: من رەوانەکراوی خودام بۆ لای ئێوە، وەکوو چۆن ئێستا پێغەمبەر (محمد) (دروودی خوای لەسەر بێ) پێتان دەڵێ: ئێوەش دەتانگوت ئێمە داوای پێغەمبەری فریشتەمان کردووە ئەمە ئادەمییە!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە ئەوەیە: ئەگەر فریشتەمان بناردایە سەریان دەبوایە لەشێوەی پیاودا بوایە، چونکە ئەوان توانای ئەوەیان نییە ئاخاوتن لەگەڵ فریشتە بکەن و سەیری بکەن لەم رووەوە کە فریشتە لەنوور دروستکراوە واتە: ئامانجەکەیان نەدەهاتە دی، چونکە ئەگەر فریشتەکە لەشێوەی خۆیدا بووایە،

ئەوان نەیاندەتوانی ببینن، ئەگەر لەشێوەی پیاویشدا بووایە ئەوکاتە دەیانگوت تۆ فریشتەنیو ئادەمیزادی کەوابوو هەمان هەڵوێستی ئێستایان دەنواندەوە!.

﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾ دەمانکردە گرێ کوێرەکەو چاوبەست لەسەریانو لێمان دەشێواندن ئەوەی بۆخۆیان لەخۆیان شێواندووەو کردوویانە بەگرێ کوێرەکەو پەڵپو بیانوو! واتە هەمان بەزمەکەی خۆیان دەهاتەوە کایەوەو دەیانگوت: ئێمە داوای فریشتەمان کردووە، ئەمەی بۆمان نێردراوە ئادەمیزادە!!؟

بەکورتی داواکردنی هاتنی فریشتە بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی پەڵپو بیانوویەکی نابەجێیە، لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: ئەگەر فریشتە بنێرین یەکسەر ئیمانی پێ نەهێنن هیچ مۆڵەتیان نادەین دەستبەجێ لەناویان دەبەین.

دووەم: ئەگەر لەفەرزی مەحاڵدا لەناویان نەبەین ئەو فریشتەیەی بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی دەینێرین دەبێ لەشێوەو روخساری ئادەمیزاددا بێو ئیتر پەڵپەکەیان هەر دەمایەوەو دەمکوت نەدەکران..

## سەرەنجامی ئەوانەی گاڵتەیان بە پەیامی پێغەمبەران کردو بەدرۆیان خستنەوە

﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ﴾.

وەکوو زاندرا کافرەکان پەڵپو بیانوی نابەجێیان دەگرت، گاڵتەیان بە پێغەمبەر دەهات، دەمێك دەیانگوت: بۆچی فریشتەی لەگەڵدا نیە پشتگیری بکا، چاخێك داوای ئەوەیان دەکرد: کە فریشتەیان بۆ سەر بنێردرێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی ئەنجام بدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە بیستنی ئەم داوا نابەجێیەیان زۆر دڵتەنگ بوو، ئیتر پەروەردگار ئەم دوو ئایەتەی دوایی نارده خوارێ، بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو سووککردنی ئەو ئێشو ئازارانەی لە کافرەکانەوە پێی دەگەیشتن... وێڕای دڵدانەوەکەش وادەو بەڵێنیشی تێدایە بۆ موسوڵمانان بە سەرکەوتنو بەختەوەری دونیاو قیامەتو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بە زاتی خودا بێگومان زۆر گاڵتەو لاقرتێ کراوە بەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ، گەلو نەتەوە پێشینەکانیش وەکوو نەتەوەکەی تۆ گاڵتەیان بە پێغەمبەرەکانیان کردووە؛ وەکوو لە شوێنێکی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلاَّ كَانُواْ بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ – الحجر/١١﴾. ئەمە دابو نەریتی هەموو گەلو نەتەوەیەك بوو کە پێغەمبەریان بۆ نێردراوە، بە درۆیان خستۆتەوەو گاڵتەیان پێ کردوون، دژی بانگەوازی حەقو یەکتاپەرستی وەستاون، ئەو هەڵوێستی دژ بە حەق وەستانە تایبەت نیە بە کافرەکانی قورەیشەوە؛ بەڵام با ئەوانو هەموو کەسێکی وەکوو ئەوان باش بزانن کە ئەو گاڵتە کردنو پەڵپ گرتنەیان بۆ سەر ناچێو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن؛ چونکە گەلە پێشینەکان سەرپێچی کردنیان بۆ سەر نەچوو، بەڵکوو ﴿فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُواْ مِنْهُم مَّا كَانُواْ بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ﴾ دەوری ئەو کافرانەی دا کە گاڵتەو لاقرتێیان بە پێغەمبەرەکانیان دەکرد، ئەو سزاو تۆڵەیەی کە گاڵتەیان پێ دەهات، سزاو عەزابی بێ ئامانی خودا دەوری دانو تێکیەوە پێچانو بەرەو توونی نەمان گلۆری کردنەوەو لە ناوی بردن، ئەو سزاو تۆڵەیەی پێغەمبەرەکان هەڕەشەیان پێ لە گەلو نەتەوەکانیان کرد کە ئەگەر بڕوا نەهێنن لە ناو دەچن، ئەوانیش گاڵتەیان پێ دەهات، هاتە سەریانو دەوری دانو لە ناوی بردن! یان سزاو تۆڵەی بڕوا

نـەکردنیان بـەو شـتە هـەقو راسـتانەی کـە پێغەمبـەرەکانیان پێیـان ڕاگەیانـدنو گاڵتەکردنیان بە پێغەمبەرەکان دەوری دانو تێکی شکاندنو لە ناوی بردن!

ئەمـە دڵنـەوایی کردنـی پێغەمبـەرەو شـارەزایی کردنیـەتی بـە سـوننەتو دابو نەریتی خودا، بەرامبەر سەرپێچیکارانو ئەوانەی پەیامی خـودا بـەدرۆ دەخەنـەوە، بۆ ئەوەی بە هەڵوێستی نادروستیان دڵتەنگ نەبێ، لە هـەمان کاتـدا مزگێنییـە بـۆی بە سەرکەوتنو بەختەوەری سەرەنجامو ئاکامی باشی بۆ خۆیو ڕێڕەوانیـەتی، هـەر لە ڕوانگەی ئەم مـوژدەو بەڵێنانـەوە پـەروەردگار لـە یـەك ڕۆژدا پێـنج ملهوڕی لـە سەرانی قورەیش بۆ لە ناو برد، تۆڵەی گاڵتە کردنیانی لێ ستاندن، ئـەوەتا یـەزدانی مەزن منەت بەسەر فروستادەی خۆیدا دەکاو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ – الحجر/٩٥﴾. بەکورتی گاڵتەکردنەکـەیانت لەسەرشـان گـران نـەبێ، خـۆ ڕابگـرە لـە بەرامبەر ئەو سپڵەییو گاڵتە کردنەیان بە تۆ دەربارەی بەندایەتی کردنیان بۆ من، بەردەوام بە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانـەکانم، بانگـەوازی بکـە بـۆ یەکتاپەرسـتیو گەردنکەچـی بـۆ فەرمانبـەرداریم، پێیـان ڕابگەیەنـە ئـەوان ئەگـەر درێـژە بـە سەرپێـچی کردنیـا بـدەنو لـە ڕێبـازی گـومڕایی لانـەدەنو نەیەنـە سـەر ڕێگـای هیدایەت، هەمان دەردی سەریو سزادانی بەسەر گەلە پێـشینەکانمان هێنـا، بەسـەر ئەوانیشی دێنین، پەلە دەکەین لە سزادانیانو لە ناویان دەبەین.

جا وێدەچێ ئەو سزایەی کە دێتـە سـەر ئەوانـەی گاڵتـە بـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێ) دەکـەن، بـە گوێرەی سـوننەتو دابو نـەریتی خـودا بەرامبـەر سەرپێـچیکاران، جێگـای شـكو گومـان بـێ لـەلای کافرەکـان، چـونکە ئـەوان مێـژوو نازانن، رەنگە بڕوا بە هـەواڵی ڕووداوەکـان نەکـەن، بۆیـە پـەروەردگار فـەرمانی بـە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کـرد کـە ڕێگایـەکیان نیشان بـدا بتـوانن لـەو ڕێگایەوە بگەنە یەقینو دڵنیابن لەسـەرەنجامو ئاکامو فـەرمووی: ﴿قُلْ سِيرُواْ فِي الأَرْضِ ثُمَّ انظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ ئـەی محمـد! بـە موشـریکەکان بڵێ: بەوانە بڵێ: کە نینکاری ڕاستی ئـەو پەیامـەی تـۆ دەکـەن، بڵـێ دە بـڕۆن گەشـتو

گوزار بکەنو بگەڕێن بە ناو شوێنەواری ئەو گەلو نەتەوانەی کە لە پێش ئێوەدا لە زەویدا جێگیرمان کردبوونو هێزو تواناو دەسەڵاتی ماددی زۆرمان پێ دابوون؛ ئەمجار لەکاتی گەڕانو هاتووچۆتاندا ورد ببنەوە لە شوێنەوارو پاشماوەی ئەو نەتەوانەی کەوا بەر سزای خودا کەوتوونو بە هیلاك چوون، تێبفکرن ئەوان چییان بەسەر هاتووەو سەرەنجامیان بە چی گەیشتووە، سەیری شوێنەواری نەتەوەی فیرعەونو نەتەوەی لوطو هی تریش بکەن، بڕوانن‌و پەند وەربگرن، بترسن لەوەی ئێوەش بەدەردی ئەوان بچن، خۆتان بپارێزن لەو بەدبەختیو چارەڕەشییەی کە تووشی ئەوان هاتووە، ئەوە جگە لە سزای قیامەتو سووتاندنیان بە ئاگری دۆزەخ؛ هەروەها بڕوانن چۆن یەزدان پێغەمبەرانو بەندە موسوڵمانەکانی بەسەر موشریك‌و بتپەرستەکاندا زاڵ کردوو خوداپەرستانی لە مەینەتی رزگاری کردن.

لە ئایەتەکەدا تێبینی ئەوە دەکرێ کە کۆتایی ئایەتەکە بە ﴿عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ دوایی هات نەك ﴿عَاقِبَةُ الْمُسْتَهْزِئِينَ﴾ لە کاتێکدا قسەو مەبەستی کۆتایی لە ئایەتەکەدا دەربارەی گاڵتەچییەکانە نەك بە درۆخەرەوەکان! پەروەردگار لە چاخەکانی پێشوودا هەموو بەدرۆخەرەوەکانی لەناوبردن، هەرچەندە هۆی سەرەکی بۆ لەناوبردنەکەیان پێشنیاری گاڵتەچییەکان بوو کە پەڵپی سەیرو نابەجێیان بە شێوەیەکی لاقرتێ لە پێغەمبەرەکانیان دەگرت، جا کە پەڵپەکەیان هاتە جێ، گاڵتەچییەکانو ئەوانی تریشیان پابەند نەبوون، پەروەردگار لە ناوی بردن، جا کە ئەوانەی پێغەمبەرەکانیان بە درۆخستەوە شیاوی لە ناو چوونو تەفروتونا کردن بووبن! دەبێ حاڵی گاڵتەچییەکان چۆن بووبێ؟؟ بێگومان ئەوان شیاوتر بوون بۆ لەناوبردن.. هەر بۆیەشە پەروەردگار لە نەتەوەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) تەنیا گاڵتەچییەکانی لە ناوبردنو گوێی بە پێشنیارەکەیان نەدا، بۆ ئەوەی نەگبەتییەکە بە درۆخەرەوەکان نەگرێتەوە ئەوانەی کە لەوە دوا وازیان لە هەڵوێستی خۆیان هێناو موسوڵمان بوون.

ئایەتەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە گاڵتە کردن بە پێغەمبەران لە لایەن گەلەکانیانەوە داب‌و نەریتێکی کۆن‌و بلاّوو چەسپاو بووە، ناردنی سزاو تۆڵە لە لایەن خوداوە بۆ ئەو گاڵتەچی‌و بەدرۆخەرەوانەو تەفروتونا کردنیان داب‌و نەریتێکی خودایی بووەو لە جێی خۆیدا بووە! تۆڵەیەکی دادپەروەرانە بووە!

مێژوو باشترین شایەدە، هەموو گاڵتەچی‌و بە درۆخەرەوەیەك لە رابردوو ورد ببێتەوە.. بزانێ خوانەناسان چییان بەسەر هاتووەو چۆن سزا دراون‌و لە بەدبەخت‌و چارەڕەشیدا سەرنگوون بوون! ئایەتەکە ئەوەش دەگەیەنێ کە گەشت‌و گوزار کردن بە مەبەستی ورد بوونەوەو پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لە شوێنەواری نەتەوە پێشینەکان کارێکی پەسەندو باشە!.

## هەندێ بەڵگەی تر بۆ چەسپاندنی تاك‌و تەنهایی خوداو زیندوبوونەوە

﴿ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ

ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ ﴾.

لەم ئایەتانەی دوایشدا قورئان جەخت لەسەر بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام دەکاتەوە، کە لەسێ بنەمای سەرەکیدا خۆی دەنوێنێ:

یەکەم: سەلماندنی هەبوونی خودای گردکارو بەیەك ناسینی.

دووەم: سەلماندن و چەسپاندنی رۆژی زیندوبوونەوەو گەڕانەوە بۆ دەشتی مەحشەر، بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە.

سێیەم: سەلماندن و بڕواکردن بە پێغەمبەرایەتی و فروستادەیی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵێ ئایەتەکان ئەم بنەمایانە جەخت دەکەنەوەو بە شێوەی پرسیارو وەڵام سێ بنەماکان دووپات دەکاتەوە، ئەمەش شێوازێکی ترە لە شێوازەکانی سەلماندن و چەسپاندنی بیروباوەڕ لە دڵانداو سەرنج ڕاکێشانی بیسەران و خوێنەران بۆ ئەوەی لە بیستن و خوێندنەوەی بەڵگە سەلمێندراوەکان لۆس نەبن و وەڕزو جاڕسی بەسەریاندا نەیە.

جا کە سەلمێندرا کە خودا خولقێنەرو بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکان و ئەوەی تێیاندایە لە گیاندارو بێ گیان و دارو بەردو ئاوو هەوا... هتد. ئەوەش دەسەلمێندرێ کە ئەو خودایە دەتوانێ سەرلەنوێ جارێکی تر ئەو ئادەمیزادو گیانلەبەرانەی تر زیندوو بکاتەوە، شتێکی ئاشکراو حاشا هەڵنەگرە کە پەروەردگار پاشایەکی فەرمانڕەوایە، پاشای فەرمانڕەواش فەرمان و نەهییەکانی دەبێ جێبەجێ بکرێن لەلایەن بەندەکانیەوە، کەوابێ پێویستە کەسێك هەبێ ئەو فەرمان و نەهییانە بگەیەنێ! ئەو کەسانەش کە هەڵدەستن بە گەیاندنی فەرمان و

نەهییەکانی پێغەمبەرانن، کەوابوو ناردنی پێغەمبەرو فروستادە لەلایەن خوداوە بۆسەر بەندەکانی شتێکی پێویستو زەرورییە! بۆیە دوابەدوای ئایەتەکانی پێشوو پەروەردگار جارێکی ترو بە شێوازێکی تر، جەختی لەسەر ئەو بنەما سەرەکییانە کردەوەو فەرمووی: ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەی محمد! ئەی فروستادە! بەو موشریکانەی نەتەوەکەت بڵێ: ئەو ئاسمانانەو ئەو زەوییەو ئەوەی تێیاندایە هی کێیە؟ کێ خولقاندوونی؟ کێ هەڵسورێنەرو راگرو خاوەنیانە؟ ئەم بوونەوەرە هی کێیەو کێ خاوەنیەتی؟ مەبەست لەم پرسیار کردنە سەرزەنشتو لۆمە کردنیانە، چونکە ئەو موشریکە عەرەبانەی سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بڕوایان هەبوو کە خودا بەدیهێنەرە... وەکوو قورئان لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ – لقمان/٢٥﴾. بەڵام لەگەڵ هەبوونی ئەو بڕوایەشدا بەندایەتییان نەدەکرد، هاوشانو شەریکیان بۆ بەڕەوا دەزانی!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە فروستادەی خۆی دەکا، کە لە جیاتی ئەوان وەڵام بداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُل لِلَّهِ﴾ ئەی محمد! بڵێ: ئاسمانەکانو زەویو هەرچی تێیاندایەو هەموو بوونەوەر هی خودایەو ئەو راگرو هەڵسورێنەرو بەدیهێنەریەتی! ئەم وەڵامە لە جیاتی کافرەکان دەدرێتەوە، چونکە ئەوان بۆخۆیان دان بەوەدا دەنێن! یان لەم رووەوەیە: کە تێیان بگەیەنێ؛ کە هەر ئەو جۆرە وەڵامە راستەو، پێویستە ددان بەوەدا بنێن کە هەموو بوونەوەر موڵکی خودایە! هیچ خیلافو راجیاییەك نیە لە نێوان منو ئێوەداو ناتوانن رایەکی تر بێننە کایەوەو کەسێکی تر بکەنە خاوەنی بوونەوەر! خاوەن دەسەڵاتو فەرمان رەوا هەر خۆیەتی، خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، هەموو شتێك بەدەست خۆیەتی، خودایەکی وەهایە ﴿كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ لەسەر خۆی پێویست کردووە بەرامبەر بەندەکانی خاوەن رەحمو بەزەیی بێ! بەگوێرەی رەحمو شەفەقەتی خۆی حیساب لەگەڵ بەندەکانی بکا، هەبوونی ئەم رەحمو بەزەییە داخوازی ئەوەیە: کە

زیندوبوونـەوەی قیامـەت هـەبێ؛ بـۆ ئـەوەی هـەموو کـەس سـزاو پاداشـی خـۆی بدرێتـەوە، چـونکە ئـادەمیزاد کـە لێـی روون بـوو، دوا رۆژ حیـساب‌و لێکۆڵینـەوەی لەگەڵ دەکرێ روو لە کاری خێر دەکاو واز لـە خراپـەکاری دەهێنـێ! هـەبوونی ئـەم هەستە ئایینیە دەروونیە، رێگا چارەیەکی باشە بۆ پاککردنەوەو مشت‌و ماڵ کردنی دەروون‌و بەزەیی هاتنەوە بە ئـادەمیزادان، خـۆ ئەگـەر تـرسی سـزای رۆژی قیامـەت نەبوایـە جیهـان پـڕ دەبـوو لـە پـشێوی‌و ئـاژاوەو خراپـەکاری‌و تـاوان، سـەرزەوی دەشـێواو یاسـای کۆمـەڵ تێـك دەچـوو! کـەوابوو: هەڕەشـە کـردن بـە سـزای رۆژی قیامەت نیشانەیەکی رەحمەتی خودایە.

لە بوخاری‌و موسلیمدا فەرموودەیەك هەیە: ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتـەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهُ لَمَّا خَلَقَ الْخَلْقَ، كَتَـبَ كِتَاباً عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي»[1]. واتە: کاتێك پـەروەردگار ویـستی خـۆی هێنایـە دی‌و بوونـەوەری هێنایـە وجـوود لـە لەوحولـمەحفوظـدا ئەمـەی چەسـپاندو ئـەم بەڵێنـەی دا: کـە ناوەڕۆکەکـەی بریتـی بـوو لـەوە: کـە رەحمـەت‌و بەزەیی زۆر لە خەشم‌و قاری زۆرترە. ﴿لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيـهِ﴾ ئـەم رستەیە وەڵامە بۆ پرسیارێکی مەزندە کراو، واتە: وێ دەچێ کە فەرمووی: ﴿كَتَـبَ عَلَـى نَفْـسِهِ الرَّحْمَـةَ﴾ پرسـیار بکـرێ بڵـێن: ئـەم رەحـم‌و بەزەییـە چـییە؟ ئـەویش فەرمووی: بەشێك لە رەحم‌و بەزەیی پەروەردگار بـۆ بەنـدەکانی ئەوەیـە: لـە رۆژی قیامەتـدا زینـدووتان دەکاتـەوەو کۆتـان دەکاتـەوە، بـۆ لێکۆڵینـەوەو پـاداش‌و سـزا، کۆکردنـەوەتان لـەو رۆژەدا بـۆ حیـساب‌و لێکۆڵینـەوەو سـزاو پـاداش وەرگرتنـەوە شتێکی حەتمیەو هیچ شك‌و گومانی تێدا نیـە. خـۆ ئەگـەر تـرسی سـزای ئـەو رۆژە نەبێ سەرزەوی پڕدەبێ لە ئاشووب‌و خراپەکاری، یاسای کۆمەڵایەتی تێك دەچێ‌و، بەهێز زەبوون دەخواو هیچ شتێك نابـێ دەسـتی زۆردار بگـرێ‌و، سـەرزەوی دەبێتـە

[1] وفي رواية (سبقت غضبي).

جەنگەڵستان! ئـەم سەرزەنـشتو لۆمـەو یادخـستنەوەیە لـەناو ئەوانـەی کـە ڕۆژی قیامـەت کۆدەکرێنـەوە بەتایبـەتی ئاڕاسـتەی ﴿الَّـذِينَ خَـسِرُواْ أَنفُـسَهُمْ﴾و ئەوانـە دەکرێ کە سروشتی خۆیان تێکداوە پەنجەرەو دیدەوانی هیدایەتیان لەسـەر خۆیـان پێـوە داوە، پـەیڕەوی هـیچ جۆرە هیدایـەتێك ناکـەن، چونکە ئـەوان لەبەرئـەوەی لەدونیادا سەریان لەخۆیان تێکداوە خۆیان بەفیڕۆ داوە، ئیمانیـان بـەڕۆژی قیامـەت نییـەو بەڕاسـتی نـازانن، ئـەوان کـەم بیردەکەنـەوەو کـەم هـەوڵی بەڵگـە هێنانـەوە دەدەن لەسەر بنەما سـەرەکییەکانی ئیسلام، ئەگـەر هـەوڵیش بـدەن ناگەنـە ئامـانج، چونکە بەهۆی زەبوونی ویستو ئیرادەیان خۆ لەبەردەم لۆمەی لۆمـەکاران نـاگرنو ناتوانن ڕای خۆیان فەرز بکەنو خاوەن کەسایەتیو بیروباوەڕی خۆیان نـین! ئـەوان هەرگیز ئیمان ناهێنن! بەکورتی سەرکەوتنو بەمراز گەیـشتن لـەدونیاو قیامەتـدا بـەبێ زانـستی ڕاسـتو وردی بـەرزو هەڵنـەر بـۆ کـارکردن بـەگوێرەی زانیارییەکـە دەستەبەر نابێ! کەسێك یەکێ لەم دوو ڕەوشتە سەرەکییەی لەدەست بچن، خۆشی بەخەسار داوەو مـاڵی خـۆی وێـران کـردووەو کەسـایەتی خـۆی لەدەسـت داوە، هـۆی خەسـارەت مەنـدییەکـەیان ئەوەیـە: کـە ئیمـان نـاهێنن بـڕوا بـە زیندوبوونـەوەو لێکۆڵینەوەو حیسابو کیتاب ناکەن، ترسی سزای ئەو ڕۆژەیان نییە!! ﴿وَلَهُ مَا سَكَنَ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ هەروەها هەر بۆ خودایە هەرچـی لـە شـەوو ڕۆژدا ئـارام دەگـرێو خـۆ حەشـاردەدا، پـەروەردگار هـەموو شـتێك دەبیـستێو پێـی دەزانـێ! هەرشـتێك شـیاوی بیـستن بـێ ئـەو دەیبیـستێ! گـوێی لـەدەنگی قاچی مێروولەیـە کـە بەشـەو بەسـەر بـەردی لـوس دا تـێ دەپـەڕێ، ئاگـای لەهـەموو جووڵـەو خـشپەو هاتوچۆیەکیەتی، بەپێچەوانەی بیسەری ترەوە کە ناتوانێ گوێی لەدەنگی نزم بێو دەنگی گەورەش کەڕی دەکاو سیستەمی بیـستنی تێـك دەدا! زانـاو ئاگاداری هـەموو شـتێکە، هـیچ شـتێك نییـە لـەژێر زانـستی ئـەو دەرچـێ ئاگـای لەهـەموو هەسـتو نەستێکی بەندەکانیەتیو هەموو جمو جووڵەیەکیان کۆنترۆڵ دەکا! ئیمامی عـەلی دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە ئەوەیـە.. کـە زانـستی خـودا هـەموو شـتێك دەگرێتـەوە

﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ – الغافر/١٩﴾ شێوەی روانینی چاو دەزانێ، ئاگای لەنهێنیو شاراوەی ناو دڵ هەیە! کەوابێ ئاگونجێ گوێی لەبانگی بانگەوازیکەران نەبێ! ناشێ ئاگای لە پێویستی موحتاجان نەبێ، پێویستی بەوە نییە، وەلیو خۆشەویستی ئەم جۆرە هەوالانەی پێ رابگەیەنن، یان تکاکار قەناعەتی پێ بکەنو رای پێ بگۆڕن![1] پەروەردگار بۆ خۆی رابردوو داهاتووی هەموو کەس دەزانێو هیچی لێ هوون نابێ!

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ مَا سَكَنَ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ وەکوو ئایەتێکی تر وایە کە دەفەرموێ: ﴿وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ – النحل/٨١﴾ واتە: کە ئاگادار بێ بەسەر شتە خامۆشەکانی شەودا، دیارە بەسەر شتە گەڕۆکەکاندا بە ئاسانی ترو باشتر دەتوانێ ئاگاداربێ، هەرچەندە بەنیسبەت خوداوە جیاوازی نییە لەنێوان ئەو زانیاریو ئەم زانیارییەدا هەموو زانیارییەك بۆ خودا چوون یەکە!

دوای ئەم فەرموودەیەی کە ئاراستەی پێغەمبەری کرد کە بریتی بوو لە وەبیر هێنانەوەی ئادەمیزادو تێگەیاندنی بەوە کە خودا خاوەنی هەموو شتێکەو هەڵسوڕانی هەموو بوونەوەر بەهێزی ئەوە، هەموو شتێك دەبیستێو ئاگای لەهەموو شتێکە، ئەمجار لێرەدا فەرمانی پێدەکا کە حەقیقەتێکی تر بە نەتەوەکەی رابگەیەنێ کە بریتییە لەوەی کە هەموو ویلایەتێك هەموو مەزنایەتیو خودایەتیەك، هەموو پەرستشو بەندایەتی کردنێك هەر بۆ خودایە! دەبێ ئادەمیزاد لەهەموو شتێکدا پشت بەهێزی لەبن نەهاتووی زاتی بێچوون ببەستێو فەرمووی: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا﴾ ئەی (محمد)! پێیان بڵێ: ئایا دەشێ جگە لەخودای مەزن کەسێکی تر بکەم بە وەلیو سەرپەرشتیاری خۆم؟؟ واتە: بڵێ: من جگە لەخودا کەسێکی تر ناکەم بە پشتیوانو سەرپەرشتیارو سوودم پێ بگەیەنێ یا زیانم لێ دوورخاتەوە! جگە لەزاتی مەزن کەسێکی تر شیاوی ئەوە نیە؛

---

[1] تفسير المنار (ج ٤٢/٧).

بێگومـان زاتـی بێـچوون ﴿فَـاطِرِ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ بەدیهێنـەری ئاسمانـەکانو زەوییـە، لـە نـەبووەوە هێناونیـە وجـودو رەخـساندوونی، ئاسمانـەکانو زەوی یەکپارچە بوون، کوتلەیەکی دووکەڵی بوون، پەروەردگار لێکی جیاکردنەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا – الأنبياء/٣٠﴾. ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: نەمـدەزانی مانـای ﴿فَـاطِرِ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ چـییە؟ تـا رۆژێ دوو عـەرەبی دەشـتەکی هاتنـە لام لەسـەر بیرێك کێشەیان هەبوو لەناوەندی قسەکانیاندا یەکێکیان وتی: (أنا فطرتها) واتە: من هـەڵم کەنـدووەو دروسـتم کـردووە، ئـیتر ئـەو کاتـە بەباشـی لـە وشـەی (فـاطر) تێگەیشتم.

لەڕستەی ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾دا ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە خودایەك بـە ویستو ئیرادەی خـۆی ئاسمانـەکانو زەوی بـەدی هێنـاوە، هـەر ئـەو شـیاوی ئەوەیـە رووی نـزاو پاڕانـەوەی لێ بکـرێو پـشتی پـێ ببەسـترێ، کەسـی تـر رایـەی ناگـەوێ دەستی لەبـەردا پـان بکرێتـەوە!! چونکە ئـەو خودایـەکی وەهایـە ﴿وَهُـوَ يُطْعِـمُ وَلاَ يُطْعَمُ﴾ رزقو رۆزیی ئەدا بە گیانلەبەرانو بژێوییان دەداتێو بۆخـۆی پێویـستی بـە رزقو رۆزیی کەس نییەو موحتاجی هیچ شتێك نییە! هەموو بەندەکان پێویستیان بە رزقو رۆزیی خودا هەیە، پێویستە هەموویان پەرستشو بەندایەتی بـۆ ئـەنجام بدەن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُـدُونِ، مَـا أُرِيـدُ مِـنْهُم مِّـن رِّزْقٍ وَمَـا أُرِيـدُ أَن يُطْعِمُـونِ، إِنَّ اللَّـهَ هُـوَ الـرَّزَّاقُ ذُو الْقُـوَّةِ الْمَـتِينُ الـذاريات/٥٦ – ٥٨﴾. ئـەم ئایەتانـە بـە ئاشـکرا ئـەوە دەگەیـەنن: کـە پێویـستە ئادەمیزادەکـان داوای رزقو رۆزیـی هـەر لـەخودا بکـەن! بـەڵام پێویـستە هۆکـارە مادییەکان دەسـتەبەر بکـەنو هـەوڵو تێکۆشـانو لێکۆڵینـەوە ئـەنجام بـدەنو پـشت بەخودا ببەستن، نابێ رزقو رۆزیی نە لەبت، نە لە ئادەمیزاد، وە نە لەکاربەدەست،

وه نه له ئادەمیزادی ئاسایی داوابکات! رزق‌و رۆزیی ئادەمیزادان هەمووی بەدەستی خودایە!

ئەی فروستادە! که ئەم بەڵگەیەت بۆ چەسپاو سەلێندرا کێ شیاوی خودایەتی‌و پەرستنەو، کێ بۆ سەرپەرشتیاری‌و والییەتی دەشێ ﴿قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ﴾ پێیان بڵێ: مـن لـەخودای زانـاو دانـاو بـەرەحم‌و بـاڵا دەسـتەوە فـەرمانم پێکراوە: که لەناو ئـەم نەتـەوەدا یەکـەم کەسبم، کـه گـەردن کـەچ بم بـۆ فـەرمانی یـەزدان، بـۆ هـەموو کارێکی بـاش‌و پەسـەند پێـشەنگ‌و سەردەسـتە بم، هەرشتێك بانگەوازی بۆ بکەم بۆخۆم یەکـەم کـەس بم بـڕوای پـێ بێـنم‌و لـەپێناویا تێکۆشـم خەباتی بۆ بکەم ﴿وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ دوای ئـەوەی گـەردن کـەچ‌و پابەنـدی فـەرمانی خـودا بـووم، پـێم گوتراوە: کـه لـەگرووپی موشـریکەکان نـەبم‌و هـەرگیز هاوشان بۆ خودا بەڕەوا نەبینم‌و کەس نەکەم بە شەریکی یەزدان، ئەمن بێ بـەریم لەخۆتان‌و ئایینتان؛ هەرگیز من ئایینی ئێوەم پێ قبووڵ ناکرێ!!.

بـەکورتی مـن فـەرمانم پێکـراوە بـە پابەنـدبوون بـە ئـایینی ئیـسلام‌و یـەکتا پەرستی، نـەهیم لێکـراوە لـەفرە خـودایی‌و بـێ دینـی، بـێ بـەریم لـە شـیرك‌و هـەوا خواهانی!.

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بـێ) کـرد کـە سزای ئەوانە دیاری بکا کە سەرپێچیی فـەرمان‌و نەهییـەکانی پـەروەردگار دەکـەن‌و پێی فەرموو: ﴿قُلْ إِنِّيَ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئەی فروسـتادە! بـەو موشریك‌و خوا نەناسانە بڵێ: من دەترسم ئەگـەر سەرپێـچی فـەرمانی پـەروەردگار بکەم‌و لێی یاخی بم، کە سزاو تۆڵەی رۆژێکی گەورەترو ترسناك‌و بێ ئامانم تووش ببێ، کـە رۆژیـی قیامەتـە، رۆژێکـی سامناك‌و خەتـەرناك، ئـەو رۆژەی پـەروەردگار مـەخلووقاتی تێـدا کۆدەکاتـەوەو بـەوردی حـساب‌و لێکۆڵینـەوەیان لەگەڵـدا دەکـا، رۆژەکـەی وەصـفدار کـردوە بـە گـەورە، چـونکە کـاری گـەورەی تێـدا روودەدا، پەروەردگار تێیدا دەردەکەوێ‌و، دیوانی لێکۆڵینەوەو تۆڵەو پاداش دادەنـێ، رۆژێکـە

کەس وەسەر کەسی ناپەڕژێو ڕۆژیی نەفسی نەفسییە، ڕۆژێکە کڕینو فرۆشتنی تێدا نییە، خزمایەتیو دۆستایەتیو تکاکاری بۆ یەکتر لەگۆڕێ نییە، جگە لەخودا کەس خاوەن دەسەڵات نییە، هەموو شتێ بەدەستی خودا خۆیەتی، تەرازووی خێرو شەڕی، وردبینو ورد خوێنەرەوەیەو گەردیلەو بچوکتریش حلێب دەکا!! جا کە ئەم هەڕەشەیە بەم جۆرە ئاڕاستەی پێغەمبەر کرابێ! ئەی دەبێ خەڵکی تر بڵێن چیو حاڵو وەزعی ئەوان چۆن بێ؟؟.

بەڕاستی ﴿مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُ﴾ کەسێك لەوڕۆژەدا ئەو سزاو ترسو عەزابەی لێ دوور بخرێتەوەو رزگاری ببێ، یان کەسێك لەو سزاو عەزابە لابدرێو نەیگرێتەوەو لێی کەنارگیر بکرێو دوایش بچێتە ناو بەهەشتەوە، ئەوە بێگومان خودا رەحمی پێ کردووەو بەزەیی پێدا هاتۆتەوە، ﴿وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ﴾ ئائەو رزگاربوونە لەسزاو عەزابو بەمراز گەیشتن بە بەهەشتو نیعمەتەکانی سەرکەوتنو بە مراز گەیشتنێکی گەڵێ مەزنو گەورەیەو هیچ سەرکەوتنو بەمراز گەیشتنێکی تری ناگاتێ.

## خودا دەتوانێ زیان لەئادەمیزاد دووربخاتەوە. شایەتیدانی پەروەردگار بەڕاستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ). رەتکردنەوەی بیروبۆچوونی موشریکەکان دەربارەی فرەخودایی

﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾ قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ

شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ .

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی روونکردەوە کە لەداخوازییەکانی رەحمەتی خودایە کە مۆڵەتی بەندەکانی دەدا بۆئەوەی بە ئارەزووی خۆیان کاربکەن ئەمجار هەموانیان لەرۆژی قیامەتدا کۆدەکاتەوە بۆ حساب و لێکۆڵینەوە، کەسێکیش لەو رۆژەدا سزای لێ لابدرێ و لە دۆزەخ دووربخرێتەوەو بخرێتە بەهەشتی رازاوەو خۆشەوە ئەوە بەمراز گەیشتووە!! ئەمجار بە شوێن ئەو روون کردنەوەدا ئەوەش روون دەکاتەوە؛ کە هەر داخوازی رەحمەتی خودایە کە خێرو سوود بۆ بەندەکانی دەستەبەر دەکاو شەڕو زیانیان لێ دوور دەخاتەوە، لە دونیاشدا جگە لە خودا کەسی تر دەسەڵاتی کاریگەرو سەربەخۆی نیە، هەر ئەو هەڵسوڕێنەرو کارگێڕەو هەموو شتێك بەدەست خۆیەتیو فەرمووی: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ﴾ پەروەردگار هەواڵمان دەداتێ: کە هەر خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، زەرەرو زیانو سوودو قازانج هەمووی بەدەستی خۆیەتی، گۆڕانکاری دەکا لە ناو دروستکراوانیدا بەو شێوەیەی کە دەیەوێ و مەبەستیەتی، کەس ناتوانێ حوکمو بڕیاری هەڵوەشێنێتەوە، یان نەهێڵێ ئەنجام بدرێ، لەم روانگەوە رووی خیطاب دەکاتە هەموو ئادەمیزادێك و دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد ئەگەر زیانو تەنگو چەڵەمەیەکت تووش هات، ئێشو ئازارو نەخۆشیو هەژاریو دڵتەنگییەکت تووش بوو، کەس نیە بتوانێ ئەو ناخۆشییەت لەسەر لابەرێ ئازارت لەسەر سووك بکا مەگەر خوا، جگە لە پەروەردگارت کەس ئەو دەسەڵاتەی نیە، هەر ئەو بە تواناو بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا ﴿وَإِن

يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەگەر خێرو خۆشییەکت بۆ دەستەبەر بوو، لەش ساغیو دەوڵەمەندیو دەسەڵاتو ڕێزو نرخێکت پێ درا ئەوە بزانە لە خوداوەیەو ئەو بۆی ڕەخساندووی، چونکە خودا دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هەر زاتی ئەو باڵادەستو خاوەن هێزو تواناو فەرمانڕەوایە، هەر ئەوە هەموو شتێك گەردنکەچیەتی، هەموو لووت بەرزو ملهوڕو خاوەن دەسەڵاتو هێزو توانا لە ئاستی دەسەڵاتی ئەودا نموودیان نیە! هەموو قانگەڵاشکی بەردەم ڕەشەبای سەختن! ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ زاتی بێچوونی پەروەردگار خاوەن قارو دەسەڵاتو هێزو توانای بێ وێنەیە لە ژوور بەندەکانیەوە، باڵادەستو زاڵە بەسەریانەوە، هەموو کەسو گشت شتێك لە ئاست دەسەڵاتی یەزداندا هیچو زەبوونە. ﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾ پەروەردگار زاناو دانایە لە هەموو کارو کردەوەیەکیدا، لە هەموو بڕیارو حوکمێکیدا، خەبەردارو لێزانە بە دانانی هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا، کەسێك شیاوی شتێك نەبێت نایداتێ، کەسێك شیاو نەبێت بۆ لێ ستاندنەوەی خێر، خێرو بێری لێ ناسێنێتەوە! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا، وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ – فاطر/٢﴾.

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (خودایە! کەس نیە بتوانێ ببێتە لەمپەری بەخشینت، کەس نیە بتوانێ بەخشندە بێ بە کەسێك تۆ بەخشایشت لێ قەدەغە کردبێ، دەوڵەمەندیی کەس تۆ دەوڵەمەند ناکا! هەموو شت هی خۆتەو بۆ خۆتەو بە کەیفی خۆت گۆڕانکاری تێدا دەکەی).

ئەمجار پەروەردگاری مەزن پشتگیری پێغەمبەری خۆی دەکا بە شایەتیدانو گەواهییەك کە گەورەترین شایەتیدانو گەواهیدانە، ڕاستترینو دروستترین شایەتییە، ئەویش شایەتیدانی پەروەردگارە لە نێوان پێغەمبەرو موشریکەکاندا، شایەتیدانێك کێشەی نێوان پێغەمبەرو کافرەکان یەکالا دەکاتەوە! شایەتیدانێك

بەڵگەیە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) و پشتگیری پەیامەکەی دەکاو پەردە لەسەر حاڵو چۆنیەتی کافرەکان هەڵدەداتەوەو پوخلاواتی بیروباوەڕیان دەخاتە روو، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: چ شتێك لە رووی شایەتیدانەوە مەزنترە؟ کێ شایەتیدانی راستو دروستو جێگای متمانەیە؟ کە وەڵامیان نەبوو، دڵنیابە ناشیان بێ ﴿قُلِ اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ بڵێ: شایەتیدانی یەزدان لە شایەتی هەموو کەس گەورەترو راست ترو دروست ترە، خودا شایەدە لە نێوان منو ئێوەدا! جا کە خودا شایەد بێ لە نێوان پێغەمبەرو موشریکەکان، ئەوە گەورەترین کەس شایەتی دەدا! ئەمجار ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلِ أُوحِيَ إِلَـيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾ ئەی محمد! بڵێ: پەروەردگار ئەم قورئانەی بۆ ناردووم بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم لە سزاو خەشمو قاری خودا ئەگەر بە کافری بمێننەوەو ئیمان نەهێنن! مزگێنی سەرفیرازیو دونیاو قیامەتتان دەدەمێ، موژدەی چوونە بەهەشتتان پێ رادەگەیەنم، ئەگەر ئیمان بێننو بە قسەم بکەن! هەروەها هەمان هەڕەشەو موژدە ئاراستەی هەموو گەلو نەتەوەیەك بکەم کە ئەم قورئانەی پێ دەگا، لە عەرەبو ناعەرەب! قورئان ترسێنەرو موژدەدەرە بۆ هەر کەسێك بیگاتێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِـهِ مِـنَ الأَحْـزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ – هود/١٧﴾.

ئیبنو مەردەویەیو ئەبو نەعیم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: هەرکەسێك قورئانی پێ بگا، وەکوو ئەوە وایە، راستەوخۆ پێم راگەیاندبێ! پاشان ئەم ئایەتەی ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ﴾ خوێندەوە بۆ پشتگیری وتەکەی!.

ئیبنو جەریر لە موحەممەدی کوڕی کەعبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: هەرکەسێك قورئانی پێ بگا وەکوو ئەوە وایە: کە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی ڕاگەیاندبێ!!

عەبدوڕڕەزاق لە قەتادەوە دەربارەی ئایەتی ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئایینی خودا بە خەڵکی ڕابگەیەنن! لە خوداوە تەبلیغ بکەن، کەسێك ئایەتێکی قورئانی پێ گەیشتبێ بێگومان فەرمانی خودای پێ گەیشتووە.

ئیبنولمونذیرو ئیبنو جەریرو ئەبو شەیخ؛ ئیبنو حەییانی ئەنصاری لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: (کەسێك قورئانی پێ گەیشتبێ وەکوو ئەوە وایە: پێغەمبەری بینیبێ) ئەم مانایە سەعیدی کوڕی جوبەیریش گێڕاویەتیەوە.

ئەبو شەیخ لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بڕێك دیلیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: ئایا ئێوە بانگەوازی ئیسلامتان پێ گەیشتووە؟ وتیان: نەخەیر! ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مەرەخەسی کردن‌و پاشان ئایەتی ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَـٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾ی خوێندەوە ئەمجار فەرمووی: ڕێگەیان بۆ بەرەڵا بکەن، تا دەگەنە شوێنی خۆیان، چونکە بانگەوازییان پێ نەگەیشتووە!

ئەمجار پەروەردگار ئیعلانی بەرائەتی خۆی لە هاوبەش پەیداکەران کردو، فەرمانی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد کە شایەدی بە تاك‌و تەنهای خودا بداو بەرائەتی خۆی لە هاوبەش پەیداکەران ڕا بگەیەنێ، یەخەی خۆی لێیان دادڕێ‌و فەرمووی: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ؟؟﴾ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە شایەدی دەدەن کە لە تەك خودای مەزندا خودای تر هەن شیاوی پەرستن بن؟! زانایان دەڵێن ئەم شێوە ئاخاوتنە تەقریر دەگەیەنێ‌و مەبەست ئینکارو دووری لە واقیعە! ئەمجار فەرمان بە فرۆستادەی خۆی دەکا کە وەڵام بداتەوە، دەفەرموێ:

﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ بڵێ من شایەدی وا نادەم، ئەوەی شیاوی پەرستن‌و خودایەتییە تەنها یەك خودایەو بەس، کەسی تر شیاوی بەندایەتی بۆ کردن نیە! ﴿وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ من بێ بەریم لە ئەو بت‌و صەنەمانەی ئێوە بە خودایان دەزانن، جگە لە خودای بێ هاوتا، کەسی تر بە خودا نازانم وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِن شَهِدُواْ فَلاَ تَشْهَدْ مَعَهُمْ – الأنعام/١٥٠﴾. چونکە شایەتیدانی ئەوان هیچ بنەمایەکی راستی نیە، ئەوان شوێن هەواو هەوەس کەوتوون، لە ئاستی بەڵگەو دەلیلی زۆرو زەبەندەدا گوێچکەی خۆیان ئاخنیوە، چاوی خۆیان قونجاندووە، ئەگینا بەڵگەو دەلیلی زۆر هەن لەسەر تاك‌و تەنیایی خودا، ئەگەر سەیری خودی خۆیان بکەن، ئەگەر سەیری بوونەوەر بکەن تاك‌و تەنهایی خودایان بۆ دەردەکەوێ، تەنانەت لە فیطرەتی ئادەمیزاددا هەستی ئەوەی دروست کردووە کە خودایەك هەیە خاوەنی بوونەوەرە هەموو رەوشتی بەرزی‌و کەماڵی تێدان لە رەوشتە نزمەکان دوورە! هیچ کەم‌و کورییەکی تێدا نیە! خودا بۆخۆی، فریشتەکانی، زانایان، تێکڕا شایەتی دەدەن لەسەر تاك‌و تەنهایی پەروەردگار! وەکوو دەفەرموێ: ﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ – آل عمران/١٨﴾.

## خاوەن نامەکان پێغەمبەر دەناسن‌و بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستن، رۆژی قیامەت موشریکەکان خۆیان لە شەریك دانان بۆ خودا تەبرییە دەکەن

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ

عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

ئایەتەکانی پێشوو بەهۆی پرسیارو بیروبۆچوونی موشریکەکان کە دەربارەی رەوشتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاراستەی جوولەکەو فەلەکانیان کرد، ئینکاری ئەوەیان کرد، کە تەوراتو ئینجیل بەڵگەی ئەوەیان تێدا بن، کە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) بچەسپێنن...

پەروەردگار لەوەپێش ئەوەی روون کردەوە: کە شایەتیدانی خودا بۆ چەسپاندنی پێغەمبەرایەتییەکەی بەسەو پێویست بە بەڵگەی تر ناکا! ئەمجار لێرە بەولاوە ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەو خاوەن نامانە (جوولەکەو مەسیحی) درۆ دەکەن لەوەدا کە دەڵێن: ئێمە موحەممەد ناناسین! چونکە ئەوان پێغەمبەر دەناسنو رەوشتو نیشانەکانی لە تەوراتو ئینجیلدا روون کراونەوە، تەنانەت چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن ئاوایش پێغەمبەر دەناسن! ریوایەت کراوە کاتێک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چووە مەدینە ئیمامی عومەر بە (عەبدوڵڵای کوڕی سەلام)ی گوت: ئەم ئایەتە بۆ پێغەمبەر نێردراوەتە خوارێ، ئەم ناسینە چۆن چۆنیە؟ عەبدوڵڵای کوڕی سەلام گوتی: ئەی عومەر! ئەمن پێغەمبەرم بینی یەکسەر ناسیم؛ بەڵکوو باشترین لە کوڕی خۆم دەیناسم، چونکە من نازانم ژنەکەم

چی کردووە، واتە: کێ ناڵێ خێزانەکەم خیانەتی لێ نەکردووم! ئەمن شایەدی دەدەم کە موحەممەد رەوانەکراوی خودایەو هیچ شك و گومانم لەوەدا نیە.

بۆیە قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّـذِينَ آتَيْنَـاهُمُ الْكِتَـابَ يَعْرِفُونَـهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمُ﴾ ئەو گەل و نەتەوانەی لەوە پێش نامەمان بۆ رەوانە کردوون کە جوولەکەو فەلەن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەناسن و ناسینەکەیان هەڕەمەکی نیە، بەڵکوو چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن ئاواش پێغەمبەر دەناسن. بەهۆی ئەو هەواڵ و سەرگوزەشتەو پێناسانەی لە پێغەمبەرە پێشینەکانیانەوە پێیان گەیشتووە! نیشانەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە کتێبەکانیاندا ئاشکراو نومایانەو هەموو پێغەمبەرێك مزگێنی بە هاتنی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) داوە، پێناسەو رەوشت و زێدو نیشتمان و شێوەی کۆچ کردن و نیشانەی گەل و هۆزەکەیان باس کردووە...!بۆیە ئینکاری کردنیان بۆ پێغەمبەرایەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) جێگای سەرسوڕمانەو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ ئینکاری کردنیان بۆ پێغەمبەرایەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەوانە خۆیان لە دەست داوە، بەدەستی خۆیان خۆیان تووشی نەگبەتی و چارەڕەشی کردووە، ئینکاری کردنەکەیان لە هی موشریکەکان دەچێ کە ئەوانیش لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو بەڵگە حاشا هەڵنەگرانە ئینکاری پێغەمبەرایەتییەکەیان دەکرد، کەوابێ هەردوولا موشریکەکان و خاوەن نامەکان داخوازییەکانی عەقڵ و ئاوەزو زانست و مێژوویان پاشگوێ خستووەو پەندیان لێ وەرنەگرتووە! موشریکەکانی عەرەب و مالوم و قەشەکانی جوولەکەو نەصارا بەرژەوەندی ماددی و پلەو پایەی دونیایان بە لاوە گرنگترە لە ئیمان هێنان بە پێغەمبەرێك کە نیشانەو پێناسەی لە تەورات و ئینجیلدا نووسراوەو دەیخوێننەوە، ئەوان پێیان وایە: ئەگەر ئیمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بێنن،

پلەو پایەی لێپرسراوی‌و سەرکردەییان لە کیس دەچێ‌و دەبنە موسوڵمانێکی ئاسایی وەکوو باقی موسوڵمانانی تر.

ئا ئەو موشریك‌و خاوەن نامانەی ئینکاری پێغەمبەرایەتی موحەممەد دەکەن ئەوانە خۆیان لە دەست داوە کەوتوونە بەر رق‌و غەزەبی خودا، لەبەر پەیوەندییان بە پلەو پایەی نا پایەداری دونیاوە، لەبەر زەبوونی ئیرادەو ناکەس بە چەییان‌و پاشگوێ خستنی ئامۆژگاری پێغەمبەرە پێشینەکان! ئەوانە ئەو کۆمەڵ‌و تاقمەن کە ئیمان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) ناهێنن! ئەوانەن کە گیرۆدەی دوو بیرۆکەی دژ بەیەك بوونەوە، لەسەر خودا درۆ هەڵدەبەستن‌و بەبێ ئەوەی بەلگەیەکیان هەبێ!.

بیروباوەڕێك کە بە بەلگەی صەحیح چەسپابێ بە لایانەوە درۆیەو بڕوای پێ ناکەن، سەریان لێ شێواوەو گومڕا بوون، نازانن چ دەکەن‌و چی دەڵێن، دەمێك دەڵێن: ئەگەر خودا بیویستایە ئێمە هاوبەشپەیداکەر نەدەبووین، باوکانیشمان بتپەرست نەدەبوون! جارێك دەڵێن: خودا فەرمانی پێ کردووین کە بت پەرست بین، جارێکی تر دەڵێن: ئەم بتانەی کە دەیان پەرستین لای خودا تکامان بۆ دەکەن، چەلێك دەڵێن: (بەحیرەو سائیبە) خودا لێمانی حەرام کردوون، وەختێکیش بۆ ئەوە دەچن کە قورئان درۆو هەڵبەستراوە، یان دەڵێن: سیحرو جادووە، ئیتر بڕوا بە پێغەمبەر ناکەن، ئیمان بە پەیامەکەی ناهێنن!. واتە: ئینکاری کردنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆ فەوتاندنە، بە فەتارچوونی نەفسە ماڵوێرانی دونیاو قیامەتیانە!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە؛ کە درۆ هەڵبەستن لەسەر خودا ستەم کردنە لە نەفس‌و دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ کێ لەو کەسە تاوانبارترە کە بەدەم خوداوە قسە هەڵدەبەستێ؟؟ واتە: هیچ کەس لەو کەسە ستەمکار تر نیە کە لەسەر خودا شت هەڵدەبەستێ‌و لافی ئەوە لێ دەدا کە رەوانە کراوی خودایەو لە کاتێکدا خودا نەیکردووە بە پێغەمبەرو رەوانەی نەکردووە، یان

پێیان وایه: كه خودا هاوەڵی هەیه، منداڵی هەیه، یان بتپەرستی دەكەن بەو هیوایه كه بتەكان له خودایان نزیك بكەنەوەو شەفاعەتیان بۆ بكەن ﴿أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ﴾ هەروەها كەس لەو كەسه ستەمكار تر نیه كه ئایەتەكانی خودا بە درۆ دەخاتەوە، بەڵگەو نیشانەی هەبوونی خودا رەت دەكاتەوە!.

وەكوو تێبینی دەكرێ: موشریكەكانی مەككه هەردوو تاوانەكەیان ئەنجام دەدان، ئەوەبووە بەدەم خوداوە درۆیان هەڵدەبەست لە هەمان كاتیشدا نیشانەی تاك‌و تەنیایی خودایان رەت دەكردەوە، بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) نەبوو، ئاشكراشه ﴿إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ كه ستەمكاران رزگاریان نابێ، درۆ هەڵبەست‌و بە درۆخەرەوە هەرگیز بە مراد ناگەن، هیچیان بە ئاوات ناگەن‌و بەسەریانەوە ناچێ، بەڵكوو سزاو تۆڵەی ستەمكارییان لێ دەستێندرێ ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ ئەی محمد! ئەو رۆژەیان بۆ باس بكە كە هەموانیان كۆدەكەینەوە بۆ حیساب‌و لێكۆڵینەوە، ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان كردووەو ئەوانەی ستەمیان لە خەڵكی كردووە وێكڕا راپێچی دەشتی مەحشەریان دەكەین! ﴿ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ ئەمجار روو دوكەینە ئەوانەی كە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە بە تەوسەوەو بە شێوەیەكی لاقرتێ‌و گاڵتە پێ كردن‌و سەرزەنشتەوە، پێیان دەڵێین: ﴿أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ؟﴾ كوان لە كوێن ئەو خودا درۆزنانەی پێتان وابوو شەریكی خودان‌و لە دونیادا دەتانپەرستن، هاناتان بۆ دەبردن‌و پشتان پێ دەبەستن! ئەوە چییان لێ هاتووە؟ بۆ لێتان گوم بوون؟ وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ – القصص/٦٢﴾. لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَرَى مَعَكُمْ شُفَعَاءكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاء لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ – الأنعام/٩٤﴾. بەڵام ئەوان لە وەڵام دانەوەدا دەپەشۆكێن‌و سەریان لێ تێك دەچێ؛ بەڵگەی دروست‌و راستیان بەدەستەوە نیە، دەست بەجێ ئینكاری شەریك دانان بۆ خودا دەكەن‌و لە

هەڵوێستی دونیایان پاشگەز دەبنەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ پاشان ئاکامو سەرەنجامی شەریك بۆ خودا دانانیان، یان ئاکامی کوفرو خودا نەناسییان، یان بەڵگەو دەلیلیان لەکاتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەمان لە گەڵیاندا عوزر هێنانەوە نیە لەو هەڵوێستو کردارانەیان، بەڵکوو دەست دەکەن بە سوێند خواردنو دەڵێن: سوێندمان بە خودا ئێمە شەریکمان بۆ خودا دانەناوە!!

ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە لە بڕێ وێستگەو هەڵوێستی ڕۆژی قیامەتدا موشریکەکان ئینکاری ئەوە دەکەن کە شەریکیان بۆ خودا دانابێ، بە خەیاڵی خۆیان ئەو ئیعتیراف نەکردنە سوودی بۆیان هەبێو ڕزگاریان ببێ، لە بڕێ وێستگەو مەوقعیشدا ئیعتیراف بە شەریك دانانی خۆیان دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا هَؤُلاء شُرَكَآؤُنَا الَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوْ مِن دُونِكَ – النحل/٨٦﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا – النساء/٤٢﴾. پرسیار لە ئیبنو عەبباس کرا دەربارەی ئایەتی ﴿وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا﴾ لە وەڵامدا فەرمووی: کافرەکان، کە بۆیان ڕوون دەبێتەوە، کە جگە لە موسوڵمانانو خوداپەرستان کەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە دەڵێن: وەرن با ئینکاری شەریك بۆ خودا دانان بکەین، لەسەر ئەم بنەمایە ﴿قَالُواْ: وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ ئەمجار پەروەردگار دەمیان مۆر دەکاو زمانیان دەبەستێ، ئیتر دەستو قاچیان دەکەونە قسە کردنو شایەتیدان ﴿وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا﴾ واتە: ئەوان لە ڕاستیدا ئیعتیراف بە واقیعی حاڵی خۆیان دەکەن دان بە تاوانەکانیاندا دەنێن، لەو حاڵە سەر لێ تێکچوونو شپرێوەدا ئینکاری شەریك دانان بۆ خودا دەکەن، جارێك پێ لە ڕاستی دەنێنو جارێکیش ئینکاری دەکەن؛ ئەمەش بەهۆی ترسو تاسانو سەر لێ شێوانەوەیە!!

هەڵوێستی دونیایان پاشگەز دەبنەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ پاشان ئاکامو سەرەنجامی شەریك بۆ خودا دانانیان، یان ئاکامی کوفرو خودا نەناسییان، یان بەڵگەو دەلیلیان لەکاتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەمان لە گەڵیاندا عوزر هێنانەوە نیە لەو هەڵوێستو کردارانەیان، بەڵکوو دەست دەکەن بە سوێند خواردنو دەڵێن: سوێندمان بە خودا ئێمە شەریکمان بۆ خودا دانەناوە!!

ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە لە برێ وێستگەو هەڵوێستی رۆژی قیامەتدا موشریکەکان ئینکاری ئەوە دەکەن کە شەریکیان بۆ خودا دانابێ، بە خەیاڵی خۆیان ئەو ئیعتیراف نەکردنە سوودی بۆیان هەبێو رزگاریان ببێ، لە برێ وێستگەو مەوقعیشدا ئیعتیراف بە شەریك دانانی خۆیان دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا هَؤُلاء شُرَكَآؤُنَا الَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوْ مِن دُونِكَ – النحل/٨٦﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا – النساء/٤٢﴾. پرسیار لە ئیبنو عەبباس کرا دەربارەی ئایەتی ﴿وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا﴾ لە وەڵامدا فەرمووی: کافرەکان، کە بۆیان روون دەبێتەوە، کە جگە لە موسوڵمانانو خوداپەرستان کەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە دەڵێن: وەرن با ئینکاری شەریك بۆ خودا دانان بکەین، لەسەر ئەم بنەمایە ﴿قَالُواْ: وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ ئەمجار پەروەردگار دەمیان مۆر دەکاو زمانیان دەبەستێ، ئیتر دەستو قاچیان دەکەونە قسە کردنو شایەتیدان ﴿وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا﴾ واتە: ئەوان لە راستیدا ئیعتیراف بە واقیعی حاڵی خۆیان دەکەن دان بە تاوانەکانیاندا دەنێن، لەو حاڵە سەر لێ تێکچوونو شپرێوەدا ئینکاری شەریك دانان بۆ خودا دەکەن، جارێك پێ لە راستی دەنێنو جارێکیش ئینکاری دەکەن؛ ئەمەش بەهۆی ترسو تاسانو سەر لێ شێوانەوەیە!!

ئـای کـە ڕووبـەڕوو بوونەوەیـەکی سـامناك‌و بەسـەرکردنەوەیەکی ترسـناك‌و مەوقیفێکی ریسواکەرمیە!؟ بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿انظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَى أَنفُسِهِمْ﴾ سـەیر بکـەو تێبفکـرە، چـەند بـی ئـابڕوون، چـۆن خۆیـان بـە درۆ دەخەنـەوەو؟؟ ئـاوا درۆی شـاخدار هەڵدەبەسـتن، ئینکـاری شـەریك دانـانی خۆیـان دەکەن‌و بەو جۆرە سوێند دەخۆن‌و دەڵێن: ئێمـە هـەرگیز شـەریك‌و هاوەڵمـان بـۆ خودا دانەناوەو هەڵوێستی وامان نەنواندووە!!

﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ ئـەمجارەش وردببـەرەوەو تێبفکـرە، چـۆن ئـەو شەریکانەی بۆخودایان هەڵدەبەستن لێیان گوم دەبـن کـرداری شـەریك دانانیـان بـۆ خودا لە بیر نامێنـێ، تەنانـەت حاشـای لێ دەکەن‌و دانـی پیـا نـانێن‌و ناچـنە ژێـری! وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ، مِن دُونِ اللَّهِ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا – غافر/٧٣ – ٧٤﴾.

## بڕێ هەڵوێستی سەرپێچیکارانەی موشریکەکان دەربارەی قورئان

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ ۖ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا حاڵو چۆنیەتی کافرەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوون کردەوە، سەرلێ شێواوی‌و شپرێویانی دەرخست، بەم جۆرە کە جارێك دەڵێن: شەریکمان بۆ خودا دانەناوەو دەمێکیش ددانی پێدا دەنێن‌و ئیعتیراف بە هەڵوێستی خۆیان دەکەن، ئەمجار لێرە بەولاوە پەیامی ئەوە ڕادەگەیەنێ کە هەندێك لەو موشریکانە ئیمان ناهێنن‌و چییان لەگەڵدا بکرێ، چەند هەوڵ تەقەللایان لەگەڵدا بدرێ بێ سوودە!.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەبو سوفیانی کوڕی حەربو وەلیدی کوڕی موغیرەو نەضری کوڕی حاریثو عوتبەو شەیبەو کوڕانی ڕەبیعەو ئومییەو ئوبەی کوڕانی خەڵەف گوێیان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گرتو دوایی ڕوویان کردە نەضرو وتیان: ئەی ئەبو قوتەیلە! ئەوە موحەممەد چی دێژێ؟ ئەویش وتی: سوێند بەو کەسەی ئەم شوێنەی کردووە بە ماڵی خۆی نازانم چی دەڵێ، تەنها دەبینم دوو لێوی دەجوڵێنێ‌و چیرۆكو سەربردەی کۆن دەگێڕێتەوە، وەکوو چۆن من دیرۆکی کۆنتان بۆ دەگێڕمەوە، نەضر زۆر بە دەمو پل بوو، بۆ گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ڕابوردووان، زۆر کات چیرۆکی خۆش‌و بە تامی بۆ قوڕەیشییەکان دەگێڕایەوە.

ئەبو سوفیانیش وتی: من برێك لە قسەکانی بە حەقو ڕاست دەزانم، ئەبو جەهل وتی: نەخەیر وا نیەو تۆ هەڵەی، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ﴾ لەو موشریكو کافرانە کۆمەڵێك هەن دێنە لاتو بۆ ئەوەی گوێ لە خوێندنەوەی قورئانت بگرن، بانگەوازی‌و ئامۆژگاری تۆ ببیستن؛ وەلحاڵ ئەوە سوودیان پێ ناگەیەنێ‌و قازانجی لێ ناکەن، چونکە ﴿وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا﴾[1]. ئێمە دڵیانمان

---

[1]- اكنة: کۆی (کنان)ە وەکوو چۆن (أسنە) کۆی (سنان)ە بە مانا پەردەو داپۆشەرە! (وقر) واتە: گوێ گرانی.

پـەردەپۆش كـردوون‌و لـە ئایەتـەكانی قورئـان‌و ئامۆژگاریـیـەكانت حـاڵی نـابن، گوێچكەیانمان ئاخنیون‌و قسەو ئامۆژگاری بە سوود نابیستن! واتە: دروست كردنـی لەمپەڕو پەردە كە ناهێڵن ئەوانـە لـە قورئـان حـاڵی بـبن‌و پابەنـدی بـبن‌و ماناكای قبووڵ بكەن بەهۆی هەڵوێستی لاساكەرەوەی خۆیانە، بەهۆی پـشت هـەڵكردن‌و روو وەرگێڕانی دەست ئەنقەستی خۆیان‌و سـوور بوونیـان لەسـەر مـل نـەدان بـە حـەق! ئەوان بە ویستی خۆیان وورد نابنـەوە لـەو ئایـەت‌و ئامۆژگاریيانـەی دەيبيـستن بـە وردی بیری لێ ناكەنەوە بۆ ئەوەی جیاوازی بخەنە نێوان حەق‌و بەتاڵەوە!

ئایەتەكە تەشبیهو لێكچواندنی پـەردەو لەمپـەڕە مەعنەوییـەكان بـە پـەردەو لەمپەڕە حیسسییەكانی تێدایە، واتە: دڵ كە پەردەپۆش كرابێ‌و هـیچ شـتێكی پـاڵ نەكەوێ، گوێچكەیەك كە ئامۆژگاری بەسوود وەرنەگرێ‌و پەندو ئامۆژگاری كاری لێ نەكـەن بیـستن‌و نەبیـستنی چـون یەكـە، گـوێ لێ بـوون بـەبێ كـار پـێ كـردن هـیچ سوودی نیە، ئەو كەسەی ئایەتی قورئان دەبیستێ‌و كاری پێ ناكا وەكوو ئەوە وایـە: گوێچكەی بە قوڕقوشم ئاخندرابێ.

بۆیە بۆ چەسپاندنی ئەم راستییە دەفـەرموێ: ﴿وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ آيَةٍ لاَّ يُؤْمِنُواْ بِهَـا﴾ چەندێك بەڵگەو دەلیل‌و نیـشانەی ئاشـكراو روون ببیـنن لەسـەر هـەبوونی خـودای تاك‌و تەنیاو بی هاوەڵ، لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی‌و پەیامت، ئەوانە بڕوایان پێ ناكەن‌و كاریان تێ ناكەن! نە تێدەگەن‌و نەویـژدانیان هەیـە دان بـە راسـتیدا بنـێن، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْـمَعَهُمْ لَتَوَلَّـواْ وَّهُـم مُّعْرِضُـونَ – الأنفـال/٢٣﴾. ئەوانـە گومڕاییەكەیان بـە جۆرێكـە هـیچ ئامۆژگاری‌و بانگەوازییەك كاریان تێ ناكا ﴿حَتَّى إِذَا جَـآؤُوكَ يُجَادِلُونَـكَ﴾ تەنانـەت كـار دەگاتـە ئـەوە ئەوانـە دێنـە لات‌و دەمـەدەمێت لەگەڵـدا دەكـەن، دەیانـەوێ بیروباوەڕی پووچ‌و بەتاڵی خۆیان بە ئایینی راست‌و حەق بخەنە بەر چاوو ئـایینی راستی تۆ بە درۆ بخەنەوە! ﴿يَقُولُ الَّـذِينَ كَفَـرُواْ إِنْ هَـذَآ إِلاَّ أَسَـاطِيرُ الأَوَّلِـينَ﴾ ئـەو خودانەناسـانە كـە گوێیـان لـە قورئـان دەبـێ دەڵـێن: ئەمـە جگـە لـە چـیرۆكە

هەڵبەستراوە کۆنەکانی گەلە پێشینەکان بەولاوە هیچی تر نیە! ئەمە لەو چیرۆکە درۆو تورەهاتانەیە؛ کە مێشکی رەشە خەڵکەکەی پێ بەنج دەکەن! ﴿وَهُمْ﴾ ئەوانە وێرای بە درۆ خستنەوەی پێغەمبەر ﴿يَنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ داکۆکی لەوە دەکەن خەڵك بڕوا بە پێغەمبەر بکەنو گەردنکەچی فەرمانی قورئان بن ﴿وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ﴾ بۆخۆشیان لێی دوور دەکەونەوە... واتە: ئەوانە دوو تاوان بە یەکەوە ئەنجام دەدەن، نە بۆخۆیان سوود لە قورئان وەردەگرن نە دەهێڵن کەسانی دیکە سوودی لێ وەربگرن!.

حاکمو هی تریش لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو طالیب هاتۆتە خوارێ؛ داکۆکی لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکرد نەیدەهێشت کافرەکانی قورەیش ئازاری بدەن! بۆخۆشی ئیمانی پێ نەدەهێناو لە پەیامەکەی دوور دەکەوتەوە!

ئیبنو ئەبی حاتەم لە سەعیدی کوڕی هیلالەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی مامەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتۆتە خوارێ! کە بە ئاشکرا پارێزگاریان لێ دەکردو نەیاندەهێشت کافرەکان زیانی پێ بگەیەنن! وەکی تریش لە ناخەوە ئیمانیان پێ نەدەهێناو لێی دوور دەکەوتنەوە ﴿وَإِن يُهْلِكُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ سەرەنجامیش ئەوانە هەر خۆیان بە فەتارەو فەوتاندن دەدەن، خۆیان تووشی چارەڕەشیو بەدبەختی دەکەن، کەچی هەست بەو بەدبەختییەی خۆیان ناکەن، بەڵکوو پێیان وایە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە فەتارە دەدەنو لە ناوی دەبەن، بێگومان ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چونکە هەموو ئەوانەی دژایەتی پێغەمبەریان کردو بەردەوام بوون لەسەر دژایەتی کردنی لە ناو چوونو فەوتانو بە مراد نەگەیشتن، بڕێکیان بە کارەساتی تایبەتیو بڕێکیشیان لە شەڕی بەدردا کوژرانو هەندێکیشیان لە شەڕەکانی تردا لە ناو چوون، دیارە بە شوێن بە هیلاك چوونی دونیایاندا بە فەتارە چوونی قیامەتیش هەیەو تووشی دەبن! ئایەتەکەش هەردوو بە هیلاك چوونەکان دەگرێتەوە هەرچەندە لە هی دونیادا ئاشکرا ترە.

## هەڵوێستی کافران لەکاتی بینینی دۆزەخدا، یان چۆنیەتی بەهیلاك چوونیان

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَـٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

لەوەپێش نیشانەو رەوشتی ئەوانەی دیاری کرد کە ناهێڵن خەڵك شوێن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بکەونو بۆ خۆشیان لێی دوور دەکەونەوە، لە سەرەنجامدا ئەوەی راگەیاند: کە ئەوانە تەنها خۆیان بە هیلاك دەبەنو چارەرەشی تووشی خۆیان دەکەن! ئەمجار لەم ئایەتانەی دواییدا چۆنیەتی ئەو بە هیلاك چوونەیان شی دەکاتەوەو هیواو خۆزگە خوازییان لەکاتی بینینی ئاگری دۆزەخدا دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار سەرەنجامو حاڵو چۆنیەتی کافرەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ئەی بیسەرو گوێگر! ئەگەر تۆ ئەو کافرو خوانەناسانە ببینی لەو کاتو ساتە سامناکەدا کە فریشتەی سزاو تۆڵە، دۆزەخیان پیشان دەدەنو دوایی راپێچی ئەو دەریا سوتمانەیان دەکەنو تینو گەرمایی ئاگریان پێ دەگاو هاڵاوی گەرمو شاڵاوی بڵێسەی بێ ئامانیان بۆ دێو دەزانن کار لە کار ترازاوەو سەرەنجامی بەدبەختیو چارەرەشی خۆیان دەبینن، سەرت سوڕ دەمێنێو سامو دەهشەت دەتگرێ، حاڵو وەزعێکت چاو پێ دەکەوێ بە وشەو رستە دەرنابڕدرێو ناتوانی بە قەڵەمو بە زوبان باسی بکەی!!!

تـۆ دەبینـی ئـەو کاتـە ئـەوان پەشـیمان دەبنـەوە بـەڵام پەشـیمانی بـێ سـوودە، ئاواتــەخوازن جــارێکی دی بگێڕدرێنــەوە بــۆ دونیــا!! هاواریــان لێ هەڵدەســتێو ﴿فَقَالُواْ﴾[1] دەڵێن: ﴿يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ﴾ خۆزگا بگێڕدراینایـەوە بـۆ جیهـانو بـچووینایەوە بۆ سەر حاڵی سروشتی رابردوومان ﴿وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَـاتِ رَبِّنَـا﴾ ئایـەتو نیـشانەکانی تـاكو تـەنهایی خودامـان بـە درۆ نەخـستایەتەوە، بـە رێـكو پێکـی بڕوامـان پـێ بکردنایەو پابەندی فەرمانو نەهییـەکانی پـەروەردگارمان بوینایـەو ﴿وَنَكُـونَ مِـنَ الْمُـؤْمِنِينَ﴾ لـە تـاقمو گرۆهـی موسـوڵمانان بووینایـەو بڕوامـان بـە خـوداو تـاكو تـەنیایی‌و باڵادەسـتی زاتـی پـاکی هەبوایـە، بڕوامـان بـە رۆژی قیامـەتو هـەبوونی فریشتەو راستی‌و پیرۆزی کتێبە ئاسمانیەکانو پێغەمبـەران ببوایـە، لـە تاوانـەکانی لـەوە پێـشمان پەشـیمان بووینایـەوە، کـردارو رەفتارمـان بـاش بوایـەو خودامـان لـە خۆمان رازی بکردایە!!

پەروەردگار رەتی دانەوەو فەرمووی: ﴿بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: نەخەیر! ئەوان لەم ئاوات خواستنەیان راست ناکەنو ئەگەر راستـیش بکـەن ئـەو حەزو ئاواتانەیان نایەتە دی، چونکە ئەگەر بیشبرێنەوە بـۆ جیهانو ئـەوان لەسـەر کـوفری خۆیـان بـەردەوام دەبـن، حـاڵو وەزعیـان گـۆڕانی بەسـەردا نایەتـەوە، لـە بیروباوەری پڕوپووچی خۆیان پاشگەز نابنەوە!

واتە: ئەم ئاواتو تەمەننا کردنەیان لەبەر ئەوە نیە کـە حـاڵو سروشـتیان گـۆڕا بێ، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە: ئـەو شـتەی لـە دڵـی خۆیانـدا دەیـشارنەوە لێیـان ئاشـکرا دەبـێ، ئاکـامی ئـەو بیروبـاوەڕە خـراپو پووچـەیان چـاو پـێ دەکـەوێ! سـزای خراپەکاریان تووش دێتەوە، ئیتر ئەکەونە ئەمری واقیعەوەو غەمو پـەژارە روویـان تـێ دەکـاو رووناکییـان نامێنـێو کـەس نیـە لـە هاواریـان بـێو ئاواتـەخوازی رزگـار

---

[1] زۆرجار قورئان هەواڵی داهاتوو بـە تـەعبیری رابـردوو ئـەنجام دەدا بـە مەبەسـتی موبالەغـە کردن لە پەیدابوونیدا بۆ ئەوەی شكو گومان لە پەیدابوونیدا نەبێ!

بوونن بەوەی بگەڕێندرێنەوە بۆ دونیاو واز لەو هەڵوێستو کردارانەیان بێنن کە بوونە هۆی بەدبەختیو چارەڕەشی هەتا هەتاییان، وەکوو چۆن کەسێك ئازارێکی هەبێو نەخۆشییەکی پڕ ئازاری هەبێ داخوازی مردنیەتی بۆ ئەوەی لەو ئازارە رزگاری ببێ! نەك لەبەر ئەوەیە کە مردنی پێ خۆش بێ!.

پوختەی قسە ئەوەیە: پەروەردگارمان ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە تەمەننا کردنی ئەو کافرانەی کە تەمەننا دەکەن، ئەوە ناگەیەنی کە گۆڕانکاری بەسەر سروشتیاندا هاتووە، بەڵکوو بەهۆی ئەوەوەیە: کە ئەو شتانەی لە خەڵکیان دەشاردەوە ئاشکرا دەبێ، سەرەنجامی کردارە خراپەکانیان دێتەوە رێ، لە تۆڵەی ئەوەدا ئاگری دۆزەخ دەوریان دەدا، ئەوانیش بۆ ئەوەی لەو چارەڕەشییە رزگاریان بێ، ئەو هەوڵو تەقەلالایە دەدەن، ئەو پێشنیارو تەمەننایە دەردەبڕن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّـهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ، وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون – الزمر/٤٧ – ٤٨﴾.

ئەمجار پەروەردگار بێ پەروا لەم پەشیمان بوونەوەیان بە درۆیان دەخاتەوە، ئەوە رادەگەیەنێ کە پەشیمان بوونەوەو تەمەننا کردنەکەیان بە راست نیە، دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ﴾ ئەگەر بشگەڕێندرێنەوە بۆ دونیا، ئەوە دەگەڕێنەوە بۆسەر خراپەکارییەکانیانو دەست دەکەنەوە بە سەرپێچی کردنو دووڕوویيو تاوانکاریو کوفرو بێدینی، چونکە سروشتی تاوانکاری لەگەڵ خوێنیان تێکەڵاو بووە، سەرپێچی کردنو درۆو دووڕوویيو تاوانکاری شتێکی سروشتییە لە جەستەیاندا رەگی داکووتاوە، ئەگەر – لە فەرزێکدا – بگێڕدرێنەوە بۆ دونیا سەر لە نوێ ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەنو بڕوا بە حیسابو تۆڵەو سزاو پاداشتی قیامەت ناکەن! ئەگەر بگەڕێندرێنەوە بۆ جیهان بڕوا بە ژیانی جیهان دەکەنو بڕوا بە ژیانی قیامەت ناکەن! دەڵێن: ژیان هەر ژیانی دونیایەو دەژین ژیان بەسەر دەبەینو زەمانە لە ناومان دەبا، پاداشو سزای قیامەت نیەو بێ بناغەیە... زیندوبوونەوە نیە، ژیان هەر بریتییە لە ژیانی جیهان، ئەمە هەڵوێستی ماددە

پەرستەکانە؛ ئەوانەی کە بڕوایان بە غەیب نیە! ﴿وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ ئەوانە لە تەمەننا کردنو وادەدان بەوەی ئەگەر بگەڕێندرێنەوە بۆ جیهان کاری چاك دەکەنو ئیمان دەهێنن، درۆ دەکەنو درۆزنن‌و راست ناکەن ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دونیا هەمان هەڵوێستی لەوە پێشییان دەنوێننەوەو ﴿وَقَالُواْ إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا﴾ دەڵێن: ئەم ژیانە کە هەیە تەنها بریتییە لە ژیانی جیهان‌و بەس، ژیانی تر نیەو ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ ئێمە کە مردین جارێکی تر زیندوو ناکرێینەوە دوای ژیانی دونیا ژیانی تر نیە!!. هەر بەو جۆرە هەموو گرۆهە ماددییەکان بڕوایان بە غەیب نیەو هەرگیز چاوەڕوانی خێرو چاکەیان لێ ناکرێ!

## هەڵوێستی موشریکەکان لە حزوری پەروەردگاردا لە رۆژی قیامەتدا، یان چۆنیەتی حاڵیان لە قیامەتداو حەقیقەتی دونیا

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٠﴾ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُواْ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌۖ وَلَلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

لـە ئایەتـەکانی پێـشوودا پـەروەردگار باسـی حـاڵو چـۆنیەتی کافرەکـانی کـرد، ئەوەی روون کردەوە کە ئەوان چۆن ئینکاری حەشرو نەشرو زیندوبوونەوەو رۆژی قیامەت دەکەن لەم ئایەتانەی دواییدا حاڵو چۆنیەتی ئەو کافرانە بـەیان دەکا کـە لە رۆژی قیامەتدا چییان بەسەر دێو تووشی چی دەبن... ئەمجار حەقیقەتی دونیا دەست نیشان دەکاو بەرامبەریەکی نێوان دونیاو قیامـەت دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَلَـوْ تَرَى إِذْ وُقِفُواْ عَلَى رَبِّهِمْ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! یان ئەی بیـسەر! ئەگـەر ببینـی ئـەو کاتەی کافرەکان؛ ئەوانەی هاوەڵیـان بـۆ خـودا دانـاوە، پێغەمبـەرەکانی خودایـان بـە درۆ خستۆتەوە، کە تۆ ببینی لەو کاتەیدا کە فریشتەی تایبەت ئەوانە را دەگرێ بۆ حیسابو لێکۆڵینـەوە، بـۆ پرسیارو وەڵامو دادگـایی کردنیـان دەسـت نیـشان کردنـی ئاکامیان دەبینی وەزعیان شپرێوە، دیمەنیان چرژاوو بزرکاوە بە جۆرێـك کـە زمـان کۆڵەو پێنووس کولە لە دەربڕینی ئەو دیمەنەو تەعبیرێك نیە بتوانێ ئەو وەصـفە بگەیەنێ! جا وەکوو یـەکێك پرسـیار بکـا بڵـێ: ئەمانـە لـەم حـاڵو وەزعـەدا چـییان ئاراستە دەکرێو چ قسەیەکیان پی دەگوترێ؟؟.

﴿قَـالَ أَلَـيْسَ هَـذَا بِـالْحَقِّ﴾ ئەوکاتـە پـەروەردگار پێیـان دەفـەرموێ: ئـەرێ ئـەم زیندوبوونەوەو حەشرو نەشرو بەهەشتو دۆزەخو باڵادەستی منو تاكو تەنیاییو بـێ بـاکیم حەقیقـەت نـین؟ ئـەوەی لـە دونیـادا لەسـەر زمـانی پێغەمبـەرەکانم لـەم بارەوە پێتان راگەیاندرا راست نەبوو؟ هیچ شكو گومانێکی تێدایە؟ ئەوەتا چۆنتان پـێ راگەیەنـدراوە، ئـاوا هاتۆتـە دی، کەچـی ئێـوە بـە درۆتـان خـستوونەتەوە! ئـیتر کافرەکان لە وەڵامی ئـەم پرسـیارە ریـسواکەرەدا ﴿قَـالُواْ بَلَـى وَرَبِّنَـا﴾ دەڵێن: بـەڵێ، سوێند بە پەروەردگار ئەمە حەقیقەتو چەسپاوەو هـیچ شـكو گومـانی تێـدا نیـە، سـەیرە بـەم جـۆرە دان بـە تاوانبـاری خۆیانـدا دەنـێنو سـوێند لەسـەر کـافریو خوانەناسـی خۆیـان دەخـۆنو شـایەدی لەسـەر کـوفرو خراپـەکاری خۆیـان دەدەن! ئیعـتیراف بـەوە دەکـەن کـە لـە دونیـادا کـافر بـوونو سەرپێـچی فـەرمانی خودایـان کردووە!! ئیتر پەروەردگار وەڵامیـان دەداتـەوەو بڕیـاری یـەزدانی دەردەچـێ، ﴿قَـالَ

فَذُوقُواْ العَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ پەروەردگار دەفەرموێ: دەی کە ئەوە کردارو هەڵوێستتان بووبێ‌و ئاوا بۆ خۆتان ددان بە تاوانەکانتاندا بنێن، دەی سزای بە ئێش بچێژن بە هۆی کوفرو بێدینی‌و بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرەکان، بەهۆی ئەو هەڵوێستەی کە لە دونیادا لەسەری بەردەوام بوون‌و تا مردن لەسەری سوور بوون.

ئەمجار پەروەردگار بە شێوەیەکی گشتی هەواڵی ئەوە رادەگەیەنێ کە هەرکەسێك زیندوبوونەوەو حەشرو گەیشتن بە خودا بە درۆ بزانێ خەسارەتمەندەو سەرەنجامی چارەڕەشییەو دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَاء اللّهِ﴾ بێگومان خەسارەتمەند بوون ئەو کافرو خوانەناسانەی بڕوایان بە قیامەت نەبوو، بڕوایان بە زیندوبوونەوە نەبوو حیساب‌و لێکۆڵینەوەی خودا لەگەڵیاندا بە درۆ دەزانی‌و پێیان وا بوو شتی وا نابێ‌و نایەتەدی. هەرچی پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەرانی وادەی دابوو ئەوان بە درۆ حلێبیان دەکردو گاڵتەیان پێ دەهات‌و بە خەیاڵ پلاویان دەزانی! هۆی ئەم خەسارەتمەندییەیان، بڕوا نەبوونیانە بە رۆژی قیامەت، چونکە ئینکاری کردنی زیندوبوونەوەی پاش مردن‌و بڕوا نەکردن بە هەبوونی حیساب‌و لێکۆڵینەوەو پاداش‌و سزا سروشتی مرۆڤایەتی چەواشە دەکاو بیرو هۆشی ئادەمیزاد دەشێوێنێ‌و بەرەو تاوان‌و ستەمکاری پەلکێشی دەکەن، لەم بارەوە لە ئینکاری کردنی رۆژی قیامەت هەوڵ‌و تێکۆشانی کافرەکان کورت هەڵدێنێ لەسەر بەدەستهێنانی خۆشییە کاتییەکانی دونیاو پێشبڕکێ کردنی نا شەریفانە بۆ دابینکردنیان، لە خۆبایی بوون‌و هەوڵ دان بۆ زاڵ بوون بەسەر خەڵکی ترداو چەوساندنەوەیان‌و ملهوڕی کردن لەسەر زەوی، ئاژەڵ ئاسا ئادەمیزاد تێك بەردەبن‌و هیچ شتێك لە شەڕو هەرا نایانگێڕێتەوە جگە لە بێ دەسەڵاتی، هێزو توانا حوکم دەکاو بێ دەسەڵات بەش خوراوو دابڕاوە!

ئەمە راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، ئەوەتا: پێشکەوتووترین گەل‌و نەتەوەی سەر زەوی لە بواری زانست‌و فەلسەفەدا ئەوانەن کە باڵەخانەی شارستانییەت بە تۆپ‌و

دەبابەو تەيارەو باروت تێك دەڕوخێنن، وشكو تەڕ بەيەكەوە دەسوتێنن، شارو پردو كارگەو پرۆژەی خزمەتگوزاری لێك هەڵدەوەشێننو بەوپەڕی بێ ویژدانیەوە وڵات وێران دەكەن! ئەو بێ بڕواو ملهوڕو سەرپێچیكەرانە لەسەر هەڵوێستی ناڕەوای خۆیان بەردەوام بوون ﴿حَتَّى إِذَا جَاءتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً﴾ هەتا لە ناكاوێكو لە پڕ قیامەتیان هاتە سەرو ڕۆژی دونیا خراپ بوونیان پێ گەیشتو مردن یەخەی پێ گرتن تۆزقاڵێك بواری نەدان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (مَنْ مَاتَ قَامَتْ قِيَامَتُهُ) كەسێ مرد ئەوە بە نیسبەت ئەوەوە قیامەت رابووە. جا ئەو كاتەی ڕووبەڕووی سەرەنجامی چارەڕەشی خۆیان دەبنەوەو ئاگاو مەصیری خۆیانیان بۆ ڕوون دەبێتەوە، هاواریان لێ هەڵدەستێو ﴿قَالُواْ يَا حَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا﴾ دەڵێن: ئەی خەفەتبارو خەسارەتمەند خۆمان لەو سەوداو مامەڵەی ئێمە كردوومانە، چەند ڕەنج بە خەسارو مایە پووچین شتێكمان نەكردووە پاداشی تێدا بێ بۆمان! هەرچی كردوومانە بریتییە لە تاوانباریو گوناهی گران كردووین.

جا ئەوانە پەلكێش دەكرێن بۆ حیسابو لێكۆڵینەوە، هیچ بڕوایەكیان بە خۆیان نیە، دەزانن كەتاوانبارن ﴿وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ﴾ حاڵو وەزعیان بەو جۆرەیە كە تاوانەكانیان لە كۆڵ داوەو لە ژێر باری گوناهدا نقەیان دێ ﴿أَلاَ سَاء مَا يَزِرُونَ﴾ ئاگاداربەو بزانە كە ئەوان كۆڵێكی خراپیان لە كۆڵ داوەو بەدبەختو چارە ڕەشن!!.

ئەمجار پەروەردگار حەقیقەتی دونیا ئاشكرا دەكاو دەفەرموێ: ﴿وما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ حاڵی دونیا جگە لە گاڵتەوگەپ زیاتر هیچی تر نیە، واتە: كردەوەی ئادەمیزاد لە جیهاندا دوو جۆرە: جۆرێكیان هیچ سوودو قازانجی تێدا نیە ئەوەش كردەوەی دونیایی ڕووتە؛ كردەوەیەك كە دونیایی بێو بەس، كە زۆربەی كردەوەی خەڵك لەو جۆرەیە. ﴿وَلَلدَّارُ الآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ بێگومان ماڵی

قیامــەت باشــترین ماڵــە بــۆ خوداپەرســتانو ئەوانــەی ترســی خودایــان لــە دڵو دەروونـدایـە، بـە پێـچەوانەی دونیـاوە کـاری قیامـەت هـەمووی پـڕ بایـەخو بـاشو سوودمەندن، گاڵتەو گەپی تێدا نیە، کاری خوداپەرستانو راستاڵان ئەوانـەی دونیـا ئـاوەدان دەکەنــەوە بــە کــارو کــردەوەی قیامــەت... فەرموودەیــەك هەیــە ئیبنــو عەبدولبەڕ لـە ئـەبو سـەعیدی خودرییـەوە ریوایـەتی کـردووە، تیرمـنیش لـە ئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەتی کـردوە بـە حەدیـسێکی حەسـەنو غـەریبی دانـاوە؛ دەڵـێن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویـەتی: «الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَـا فِيهَـا، إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ ذِكْرَ اللَّهِ وَالْعَالِمُ وَالْمُتَعَلِّمُ شَرِيكَانِ فِي الأَجْرِ، وَسَائِرِ النَّاسِ هَمَجٌ لاَ خَيْـرَ فِيهِ»[١].

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە تیرمیذی لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «لَوْ كَانَتِ الـدُّنْيَا تَعْـدِلُ عِنْـدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ»[٢].

ئەمجا لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفـەرموێ: ﴿أَفَـلاَ تَعْقِلُـونَ﴾ ئـەو راستییە دووپات دەکاتــەوە کــە ئادەمیزادەکــان زۆربــەی کــات بــیرو هۆشــیانو کــردارو گوفتاریــان وا ئاراستە دەکەن کە لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیان بگونجێ! بـەڵکوو زۆرجـار لـە رێگـەی بیر کردنەوەو کردارو گوفتاریانەوە زیان بە خۆیـان دەگەیـەنن. ئـەوەش دەگەیـەنێ کە گوێ نەدان بە دونیاو کۆڵ پێوە هەڵنەگرتنی کارێکی پەسەندە، چونکە زۆربـەی کـاری دونیـا گاڵتــەو گەپــەو سـەرەنجامی سـوودبەخش نیـە، خۆشـیو لەززەتـەکانی کاتین، کاڵاو شتومەکەکانی بەرقەرار نین، بە پێچەوانەی کاروباری قیامەتەوە؛ کە

---

[١] دونیا نەفرەت لێکراوە، ئەوی لـە دونیاشـدایە نـەفرەت لێکـراوە، مەگـەر شـتێك یـادی خـودای تێدا بێ، یـان سـەر بکێشێ بۆ یـادی خـودا، مامۆسـتاو خوێنـدکار هاوبەشـن لـە پاداشـدا، ئـیتر خەڵکانی تر بێ سەرو بەرەن، هیچ خێرو سوودێکیان تێدا نیە.

[٢] واتە: ئەگەر دونیا لای خودا نرخی باڵە مێشوولەیەکی هەبوایـە قومـە ئـاوێکی لێ نـەدەدا بـە کافر.

سوودی باشیان هەیە لەزرەتو خۆشی بەردەوامو پایەدارە، خۆهەڵەوگیر کردن بە قیامەتەوە باشە بۆ کەسێك خۆ لە کوفرو بێدینیو تاوان بپارێزێ! کەوابێ بۆچی هۆشتان نایەتەوە؟ بۆ تێناگەنو ئەم راستییانە هەزم ناکەن؟!!.

## غەمباریی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بەهۆی روو وەرگێڕانی گەلەکەیو هۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانی پێشوو

﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِى۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِىَ نَفَقًا فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِى ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾ .

پاش ئەو موناقەشەو داکۆکی کردنو بەربەرەکانیەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرا، ئەمجار دێتە سەر کاریگەریی ئەو سەرپێچی کردنەی کافرەکان لەسەر دڵو دەروونی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و دڵ خۆشی دانەوەی پێغەمبەر بەوەی کە ئەو هەڵوێستەی کافرەکان شتێکی تازە بابەت نیەو لەوە

پێشیش گەلو نەتەوە پێشینەکان هەمان هەڵوێستیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان بووە، بۆ ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دڵی بە خۆی نەمێنێ...

تیرمیزیو حاکم لە ئیمامی عەلییەوە ریوایەت دەکەن: دەفەرموێ: ئەبو جەهل بە پێغەمبەری گوت: ئێمە خۆت بە درۆ ناخەینەوە، بەڵکوو پەیامەکەت بە درۆ دەزانین! ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ﴾ی ناردە خوارێ.

سوودی دەڵێ: ئەخنەسی کوڕی شورەیقو ئەبو جەهلی کوڕی هیشام بەیەك گەیشتن، ئەخنەس بە ئەبو جەهلی گوت: ئەی ئەبولحەکەم تۆ دەربارەی موحەممەد چی دەڵێیو تێم بگەیەنە، ئایا راست دەکا یان درۆ؟ ئێستا هەر خۆمانینو کەس گوێی لێ نیە راستم پێ بێژە! ئەبو جەهل گوتی: وەڵلاهی دڵنیابە موحەممەد راست دەکاو هیچ کاتێ ئەو پیاوە درۆی نەکردووە، بەڵام شتێك هەیە: ئەویش ئەوەیە: ئەگەر بەرەبابی قوصەی ئاڵاو ئاوگێڕانو حیجابەو دیوەخانو پێغەمبەریەتی بۆخۆیان قۆرخ بکەن ئەدی چی بۆ بەرەبارەکانی تری قورەیشی بمێنێتەوە؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، کەواتە: هەردوو ریوایەتەکە کۆکن لەسەر ئەوە کە ئایەتەکە دەربارەی ئەبو جەهل هاتۆتە خوارێ!.

موقاتیل دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی حاریثی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدی کوڕی قوصەی کوڕی کیلاب هاتۆتە خوارێ، کە ئەم خوانەناسە بە ئاشکرا پێغەمبەری بە درۆ خستەوە، بەڵام کە لەگەڵ خاوو خێزانی خۆیدا دادەنیشت دەیگوت: موحەممەد پیاوی درۆ نیەو من جگە لە راستگۆیی هیچی تری گومان لێ ناکەم، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ﴾ ئێمە زانیومانە دەزانین کە ئەو کافرو خوانەناسانە تۆ بە درۆ دەخەنەوەو پەیامەکەت رەت دەکەنەوە، ئەتۆش بەو هەڵوێستەیان دڵتەنگ دەبیو غەمو پەژارە داتدەگرێ، چونکە تۆ دڵسۆزی ئەوانیو بەرژەوەندی ئەوانت مەبەستە، بەڵام ئەوان نەفامو گێلو تێ نەگەیشتوون، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئەم

هەڵوێستو دڵسۆزییەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفًا – الكهف/٦﴾ یان دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ – فاطر/٨﴾.

سەرچاوەی ئەم هەڵوێستو بەدرۆ خستنەوەی کافرەکان بۆ تۆ شتێکی دەست نەنقەستەو سەرپێچی کردنی بێ بنەماو بێ بناغەیەو بەڵگەیان بە دەستەوە نیە، ﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ﴾ ئەوانە لە راستیدا تۆ بە درۆزن نازانن، ئەتۆ لە دیدی ئەوانەوە راستگۆو متمانە پێ کراوی، لەوە پێش درۆیان لێ نەبیستووی‌و خیانەتیان لێ نەبینیوی، هەموو کردارو گوفتارێکت لە ناویاندا ئەمانەتو راستی بووە، ﴿وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ﴾ بەڵکوو ئەوانی ستەمکارو سەر ڕەق بەربەرکانی حەق‌و راستی دەکەن، ئینکاری نیشانەکانی ئایەتەکانی خودا دەکەن‌و بەڵگەی تاک‌و تەنیایی خوداو راستی پەیامەکەت رەت دەکەنەوە! لەبەر کورتە ناموسی‌و لەدەست نەدانی بەرژەوەندییە تایبەتیە تەسکەکەی خۆیان بڕوات پێ ناکەن‌و بەربەرکانێت دەکەن؛ ئەگینا دەزانن کە پێغەمبەری‌و راست دەکەی!!.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئەبو یەزیدی مەدەنیەوە ریوایەتی دەکا؛ دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تووشی ئەبو جەهل بوو، تەوقەی لەگەڵ کرد پیاوێك بە ئەبو جەهلی گوت: ئەوە چیە دەتبینم تەوقە لەگەڵ ئەو هەتیوە دەکەی؟.

ئەبو جەهل وتی: سوێند بە خودا من دەزانم کە ئەو پێغەمبەرە، بەڵام کەی رەوایە بۆ ئێمە شوێن بەرەی عەبدولمەناف بکەوین؟ ئەمجار ئەبو یەزید ئایەتی ﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ﴾ی خوێندەوە.

ئەبو صالح‌و قەتادە دەڵێن: مانای ئەم رستەیە ﴿وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ ... الاية﴾ بەڵام ئەو ستەمکارانە دەزانن‌و ئاشکرایە لایان کە تۆ رەوانەکراوی خودای‌و کەچی ئینکاری دەکەن‌و دژی ئەو حەق‌و راستییە دەوەستن، تۆش ئەی پێغەمبەر خەفەت بەو هەڵوێستەی ئەوان مەخۆ، پەرۆشی ئەوانت نەبێ، صەبرو ئارام بدە بە دڵی

خۆت‌و چاو لە پێغەمبەرەکانی پێش خۆت بکە! ئەوە سروشتی ئادەمیزادە لە سەردەمی کۆن‌و نوێدا ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ دڵنیابە کە لە پێش تۆدا چەند پێغەمبەرێك – بە تایبەتی ئولولعەزمەکان – بە درۆ خراونەوەو ئازار دراون، ﴿فَصَبَرُواْ عَلَى مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ﴾ ئەوانیش خۆیان راگرتووەو سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان‌و کۆڵیان نەدا ﴿حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا﴾ تا خودا یارمەتی بۆ ناردوون‌و بە مراد گەیشتوون وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ؟ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ – البقرة/٢١٤﴾ هەڵبەتە یارمەتی خودا لەکاتی پێویستدا حازرو ئامادەیە ﴿وَلاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ﴾ ئەمە داب‌و نەریتی خودایە بۆ هەڵوێستی گەل‌و نەتەوەکان بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان، سوننەت‌و داب‌و نەریتی خودا گۆڕانی بەسەردا نایە، خاوەن پەیام دەبێ ئەزیەت‌و ناخۆشی ببینێ، تووشی جۆرەها چورتم‌و نارەحەتی ببێ! صەبر بگرە وەکوو چۆن پێغەمبەرە ئولولعەزمەکان صەبریان گرت! دڵنیابە خودا داکۆکی لە خاوەن بڕواکان دەکا، ئەمە بڕیاری خودایەو بڕیاری خودا پاشگەزبوونەوەی تێدا نیەو وادەو بەڵێنی دێنە جێ‌و هەرگیز گۆڕانیان تێدا ناکرێ!

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ – فاطر/٤﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ – الحج/٤٢﴾. ئایەتەکە دڵدانەوەیەکی ترە بۆ پێغەمبەرو شارەزا کردنیەتی بۆ داب‌و نەریتێکی هەمیشەیی نێوان پێغەمبەران لەگەل گەلەکانیاندا، بۆ ئەوەی بزانێ کە ئەو یەکەم کەس نیە کە ئاوا بە درۆ دەخرێتەوە! کەوابێ ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرە کە خۆڕاگربێ لەسەر پەیامی خۆی‌و کۆڵنەدەربێ بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ – الأحقاف/٣٥﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا – المزمل/١٠﴾.

بێگومان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەوپەڕی ئیخلاص و لێبڕانەوە پەیڕەوی ئەم فەرمانەی پەروەردگاری کردو لەسەر گوێڕایەڵی خۆی بەردەوام بوو، هەمیشە لە تێکۆشان و هەوڵدان و بانگەوازی کردندا بوو؛ ئاکامی ئەم خۆڕاگری و صەبرو ئارامەی بەروبوومی بەخشی و بانگەوازی ئیسلامی سەرکەوتنی بەدەست هێناو، ئایینی ئیسلام گەیشتە زۆربەی کون و قوژبنی سەرزەوی و چرای رووناکی ئەم ئایینە پیرۆزە لە هەموو شوێنێکدا درەوشایەوەو ئاڵای (لا اله الا الله محمد رسول الله) لە زۆربەی ناوچەکانی دونیادا هەڵکرا، حیکمەتی ئەم دووبارە کردنەوەو سێ بارە کردنەوەی فەرمان بە صەبرگرتن و بار قووڵییە دەرکەوت، کە جار دوای جار پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی دەکرد کە صەبر بگرێ و چاو لە پێغەمبەرەکانی پێشوو بکا، چونکە چاو لێکردن و شوێن کەوتنی خۆگران ئارامی دەدا بە دڵ و دەروون و عەزیمەت بە هێز دەکاو هومێدی رزگار بوون نزیك دەکاتەوەو موژدەی سەرکەوتن دەبەخشێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا – الأنشراح/٥ – ٦﴾.

ئەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر ئەوە کردەوە؛ کە گۆڕانکاری لە داب و نەریتی خودادا نیەو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان ئێمە سەرگورشتەی پێغەمبەرەکانی پێشوومان بۆ گێڕایتەوە، باسی هەڵوێستی گەل و نەتەوەکان بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان و خۆگرتنی پێغەمبەرەکان لەسەر ئەم بە درۆخستنەوەو ئازاردانەی گەلەکانیان و کۆمەکی خودا بۆ پێغەمبەرەکان و زاڵ بوونیان بەسەر دوژمنەکانیانداو بە دوورو درێژی شی کراوەتەوە، چۆن وانیە: ئەوە نیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ – غافر/٥١﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ – الروم/٤٧﴾.

یارمەتی خودا بۆ بەندەکانی مەرجی خۆی هەیە؛ کە بیروبڕوای پتەوە بە باڵا دەستی و تاك و تەنیایی خودا، هەرکاتێ ئەو مەرجە هاتە دی، ئیتر یارمەتی خودا

ئامادەیە، هەرکاتێ موسوڵمانان راستگۆ بن لەگەڵ خودادا، خودا یارمەتییان بۆ دەنێرێ ﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ – الحج/٤٠﴾. یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ – محمد/٧﴾.

ئەمجار پەروەردگار ویستی کە بەتەواوی شوێنەواری غەمو پەژارەی سەرپێچیکردنی کافرەکان لە دڵی پێغەمبەر دەربهاوێو زیاتر دڵنیای بکا کە بەرپرسیارێتی بڕوا نەکردنی ئەو کافرانە لە ئەستۆی ئەودا نیەو پێویست ناکا بە ئیمان نەهێنانی ئەوان ئەم دلگران ببێو فەرمووی: ﴿وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ﴾ ئەگەر روو وەرگێڕانی ئەوانت لەسەر شان قورسەو زۆرت پی ناخۆشە کە بڕوات پێ ناکەن دلگرانی بەوەی کە داوای موعجیزەی جۆراو جۆرت لێ دەکەن پەلپت پێ دەگرن، جارێك دەڵێن: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا﴾ جارێکی تر دەڵێن: دەبێ بەچاوی خۆمان ببینین فریشتە لە ئاسمانەوە کتێب بۆ ئێمە بێنێتە خوارێ هەروەها ئەو پەلپو بیانووەی کە خودا لە سورەتی (الأسرى) ئایەتی (٩٠ - ٩٣) باسی کردوون...هتد. ئەوە ﴿فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي الْأَرْضِ﴾ ئەگەر دەتوانی تونێلێك لە زەویدا لێ بدەو زەوی کون بکەو پێیدا بگەڕێ ﴿أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ﴾ یان پەیژەو قالدرمە هەڵبەستە بەرەو ئاسمان پێیدا سەر بکەوە بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمانو پێیاندا بگەڕێ ﴿فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ﴾ موعجیزەیەك لەو موعجیزاتەی ئەوان داوای دەکەن بۆیان بێنە!! بەڵام تۆ تەنها پێغەمبەرو رەوانە کراوی بۆسەر ئادەمیزادو راگەیاندنت لەسەرە، ناتوانی بەبێ ویستی ئێمە هیچ شتێك ئەنجام بدەی، هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێ موعجیزە بنوێنێ، ئەگەر یارمەتی خودای لەگەڵ نەبێ. ئەتۆ پەیامی خۆت بگەیەنە، بە دڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە، کاریگەری پەیامەکەت لە دڵو دەروونیاندا بەدەست خودایەو دەسەڵاتی تۆی تێدا نیە، ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَى﴾ ئەگەر خودا بیویستایە هەموویانی دەخستە سەر رێبازی ئیسلامو هیدایەتی دەدانو ئیمانی لە

دڵدا دروست دەکردن و وەکوو فریشتە هەموویان خودا پەرست دەبوون، یان وای دروست دەکردن کە ئامادەباشیان تێدا بێ بۆ ئەوەی مل بۆ حەق نەوی بکەن و بە قسەی پێغەمبەران بکەن، بەڵام خودای پەروەردگار ویست و ئیرادەی وایە؛ ئادەمیزاد جوداوازییان هەبێ، هەر کەسە بۆخۆی و بە ویستی خۆی ڕێبازی حەق یان ناحەق هەڵبژێرێ، هەرکەسە بەرپرسیاری کردەوەی خۆیەتی، پاداش و سزا بە گوێرەی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە، سروشتی ئادەمیزاد وا دروست کراوە کە بیروباوەڕی جیاوازیان هەبێ، ویستی خودا وایە. ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا – يونس/٩٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ ... هود/١٨٩﴾. ئیبنو عەبباس لەبارەی مانای ﴿وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَى﴾ دەفەرموێ: پێغەمبەر (درورودی خوای لەسەر بێ) پێی خۆش بوو سەرجەم ئادەمیزاد ئیمانی پێ بهێنن و شوێنی بکەون! پەروەردگار پێی ڕاگەیاند کە تەنها ئەوانە بڕوات پێ دەکەن کە لە زانستی خودادا بە بەختەوەر نووسراون.

جا ئەی محمد! ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! کە ئەم ڕاستیانەت بۆ دەرکەوت و زانیت ویستی خودا دەربارەی دروستکراوانی خۆی چۆنە و چۆن نیە! زانیت کە داب و نەریتی خودا گۆڕانکاری تێدا نیە، ﴿فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾ تۆ مەچۆرە ریزی ئەوانەوە کە نازانن سوننەتی خودا چۆنە، مەبە بە یەکێك لەوانەی کە ئاگاداری داب و نەریتی خودا نین لە بوونەوەردا! وردبەرەوە لەو شتانەی کە پێچەوانەی سوننەتی خودان و خۆتیان لێ بپارێزە، چونکە داب و نەریتی خودا لە دروست کراوانی خۆیدا حیکمەتێکی زاتی بێچوونە و بۆخۆی دەزانێ بۆچی وا دەکاو وای کردووە!

## ڕەتکردنەوەی بانگەوازی پێغەمبەر لەلایەن موشریکەکانەوەو پەلپ گرتنیان بۆ هاتنە خوارەوەی ئایاتو موعجیزە

﴿ ۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە، کە ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئادەمیزادی لەسەر هیدایەت کۆدەکردنەوە، هەموو کەس موسوڵمان دەبوو، بەڵام نەیویستووە کە سروشتی ئادەمیزاد وا دروست بکات کە هەموویان خودا پەرست بن، یان بە زۆرەملێ موسوڵمانیان بکا، بەڵکوو حیکمەتو ئیرادەی وا داخواز بووە کە جوداوازییان هەبێ بۆ ئامادەباشی بۆ وەرگرتنی فەرمانو نەهی، هەر کەسە بۆخۆی سەربەستو ئازادبێ بۆ هەڵبژاردنی رێگای راستو حەق، یان چەوتو خراپ، هەیە بە ویستی خۆی رێگای هیدایەت دەگرێتە بەرو هەیە رێگای گومڕایی هەڵدەبژێرێ!

ئەمجار لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە گرۆهی یەکەم ئەوانەن کە گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگرنو لە نیشانەو بەڵگەکانی ورد دەبنەوە، گۆرەو تاقمی دووەم کە تێ ناگەنو شت نابیستنو وەکوو مردوو وانو هیچ شتێك کاریان تی ناکاو فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ﴾ روو وەرگێڕانی ئەوانەت لەسەر دڵ گران نەبێ، پێت ناخۆش نەبێ کە ئەو کافرانە روو لە خۆتو بانگەوازییەکەت وەردەگێڕن بڕوا بە تاكو تەنیایی خودا ناکەنو تۆ

بە پێغەمبەر نازانن، چونکە کەسانێك گوێبیستی بانگەوازی تۆ دەبن، کە کەلامی خودا ببیستن بە بیستنێکی ژیرانەوە تێ بگەن‌و، گوێیان لە حەق بێ‌و رێگای هیدایەت بگرن، سروشتیان پاك بێ‌و حەقخواز بن، دڵ‌و دەروونیان پاڵفتە کراوو بێ غەل‌و غەش بێ راستی وەربگرن؛ بەڵام کافرو خوانەناسەکان ئەوانە روو لە خۆت‌و بانگەوازییەکەت وەردەگێڕن‌و تۆ پێکیشی ئەوەیان لێ دەکەی کە بڕوات پێ بکەن‌و موسوڵمان ببن، ئەوانە لە ریزی مردوواندان‌و، دەنگی حەق نابیستن، لە بانگەوازی تۆ تێ ناگەن‌و لە قسەی باش‌و بە سوود حاڵی نابن، چونکە ئەوان لە بەڵگەو نیشانەکانی خودا ورد نابنەوە، پەندو ئامۆژگاری لە ئایەتەکانی قورئان وەرناگرن‌و بیرێك لە خۆیان ناکەنەوە! هۆی ئیمان نەهێنان‌و واز نەهێنانیان لە کوفرو بێدینی ئەوەیە: کە بە رێك‌و پێکی فکر لە قورئان ناکەنەوەو لە ئایەتەکانی ورد نابنەوە وەکوو مردوویەکی بێ گیان‌و هەست‌و خوست وان، ئەوانە دڵیان مردووە وەکوو مردووی حەقیقی وان‌و بە تۆ زیندوو نابنەوە، وازیان لێ بێنە ﴿وَالْمَوْتَى يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ﴾ مردوو خودا زیندوویان دەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ ئەمجار بۆلای پەروەردگار دەگەڕێنەوە، لە پاش مردن، سەرلەنوێ زیندوویان دەکاتەوەو راپێچی دەشتی مەحشەریان دەکاو دادپەروەرانە حیساب‌و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکاو سزاو تۆڵەیان لێ دەستێنێ، مەبەست بە رستەی ﴿وَالْمَوْتَى يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ﴾ نموونە هێنانەوەیە بۆ دەسەڵاتی پەروەردگارو هەر ئەو دەتوانێ کە ناچاریان بکا بۆ ئیمان هێنان، چونکە هەر ئەم دەتوانێ لە رۆژی قیامەتدا مردووان لە گۆڕ راست بکاتەوە، ئەمجار بۆلای خۆی دەیانباتەوەو کۆیان دەکاتەوە، هەر خودا دەتوانێ دڵ‌و دەروونیان بە بیروباوەڕ ئاوەدان بکاتەوە، ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! دەسەڵاتی ئەوەت نیە بە تۆبزی موسوڵمانیان بکەی! هیدایەتدانی ئەوان بەدەست خودایە نەك بەدەست تۆیە!!

ئەمجار پەروەردگار نموونەیەك لە دژایەتی‌و سەرڕەقی‌و ئینکاری ئەو کافرانە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْلاَ نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ بۆچی

موعجیزەیەك لەو موعجیزانەی ئێمە پێشنیارمان كردن بۆی نەهاتە دی‌و هیچ كامێ لەو ئایەتانەی بۆ ئەنجام نەدران؟ وەكوو وشترەكەی صالح‌و عەصای مووسا سفرەو خوانی نەتەوەی ئیسرائیل‌و هەڵقولانی سەرچاوەو دروست كردنی باغ‌و بێستانی بە دارخورماو دارو میوە دەورە دراو، كەوتنە خوارەوەی پارچە پارچەی ئاسمان بۆ سەریان، هاتنی كۆمەڵێك فریشتەو شایەتیدانیان بە راستییەتی پەیامەكەی پێغەمبەر، دروست كردنی خانوویەك لە زوخروف، هاتنەخوارەوەی نامەیەك لە ئاسمانەوەو ئەمانە بە چاوی خۆمان ببینن!......هتد.

پەروەردگار بەرپەرچی دانەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ إِنَّ اللّهَ قَادِرٌ عَلَى أَن يُنَزِّلٍ آيَةً﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: پەروەردگار دەتوانێ هەركامێ لەو موعجیزانە بنێرێتە خوارێ كە ئەوان پێشنیاریان كردووە، بەڵام خودا وا دەخوازێ كە دوایان بخاو بە دییان نەهێنێ، چونكە ئەگەر بە گوێرەی پێشنیاری ئەوان موعجیزەكان بنوێنێ‌و ئەوجار بڕوای پێ نەكەن دەست لە عاست لە ناویان دەباو سزای توندیان دەدا، وەكوو چۆن لەگەڵ گەل‌و نەتەوە پێشینەكاندا ئەو جۆرە هەڵوێستەی نواندووە، چەند گەل‌و نەتەوە پێش ئەوان پێشنیاری موعجیزەیان كردووەو پەلپیان لە پێغەمبەرەكەیان گرتووە دوایی كە موعجیزەكە هاتۆتە دی‌و بڕوایان پێ نەكردووە خودا لە ناوی بردوون، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَن نُّرْسِلَ بِالآيَاتِ إِلاَّ أَن كَذَّبَ بِهَا الأَوَّلُونَ وَآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَا وَمَا نُرْسِلُ بِالآيَاتِ إِلاَّ تَخْوِيفًا – الإسراء/٥٩﴾. كە دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ مەبەستی ئەوەیە؛ خودا دەتوانێ ئەو موعجیزەیەی ئەوان داوای دەكەن بیهێنێتە دی، ولێ حیكمەت‌و دانایی خۆی داخوازی ئەوەیە: موعجیزەكە بەدی نەهێنێ، بەڵام زۆربەی ئەوان نەفامن‌و نازانن كە ئەوان كاتێك لە رووی بیانووو پەڵپەوە داوای ئەو جۆرە موعجیزانە بكەن خودا بۆیان ئەنجام نادا، ئەگەر زاناو ژیر بوونایە لە رووی سوود بەخشی‌و دوور لە پەڵپ گرتن داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان دەكرد، ئەو كاتە پەروەردگار بە باشترین شێوە داخوازییەكەی بۆ جێبەجێ دەكرد، چونكە ناردنە

خوارەوەی موعجیزە کە بەهۆی پەڵپ گرتنەوە بنێردرێ ئەگەر یەکسەر ئیمانی پێ نەهێنن دەبێتە هۆی لە ناوچوونیان.

واتە: سەرباری هەبوونی قورئان کە وەك رۆژی رووناك وایە، ئەگەر پەڵپ بگرنو داوای موعجیزەی ماددی تر بکەن... ئەگەر لە فەرزێکدا ئەو موعجیزانە بێنە دی، ئەو کاتە بڕوایان پێ ناکەنو پاشگەز دەبنەوەو ئیمانی پێ ناهێننو دەڵێن: سیحرو جادوبازییە! وەکوو لە شوێنێکی تردا قورئان ئاماژە بۆ ئەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ – الأنعام/٧﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ – القمر/٢﴾.

## زانیاری خوداو دەسەڵاتو توانای تەواوو بێ کەمو کوڕییە، هەموو شتێك لە قورئاندا دیاری کراوە

﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە دەسەڵاتو توانای تەواوی هەیە بۆ ناردنە خوارەوەی هەموو موعجیزەو نیشانەیەك، ئەگەر بەرژەوەندی ئادەمیزاد لە ناردنەخوارەوەی هەر موعجیزەیەکدا بێ دەینێرێتە خوارێ، ئەمجار بەڵگەو دەلیل لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە بەوە کە هەمیشە زاتی پەروەردگار چاودێری

دروست کراوانی خۆی دەکاو بەرژەوەندی هەموو گیانلەبەرێکی لەبەرچاو گرتووە، بژێوی هەموویان دابین دەکا! جا کە دیاردەی رەحمەت و فەضلی بگاتە هەموو گیانلەبەرێك، دیارە دریغی ناکا لە ناردنە خوارەوەی هەر موعجیزەیەك ئەگەر بزانێ بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدایەو بەختەوەرییان پێ دەگەیەنێ! دیارە زانست و دەسەلات و بەتوانایی خودا لەوپەڕی تەواویدان و هەر شتێك پێویستبێ بزاندرێ، لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کردووە؛ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ﴾ نیە هیچ گیانلەبەرێك کە بەسەر زەویدا بڕوات ﴿وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ﴾ یان باڵندەیەك کە بە دوو باڵی بفڕێ ﴿إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ مەگەر گرۆهو گەل و نەتەوەیەکن لە چەشنی ئێوە، ئەوانیش چین و توێژ و کۆمەڵ کۆمەڵ و گرۆهـ گرۆهن، وەکوو ئێوەی ئادەمیزاد، رزق و رۆژییان، تەمەن و کاتی لە ناوچوونیان، سروشت و رەوشت و داب و نەریتیان دیاری کراوە، پەروەردگار بەڕێوەیان دەباو چاودێری کاروباریان دەکاو بەرژەوەندییان دەپارێزێ، بۆیەش تەنها ناوی باڵندەو پێڕۆی سەرزەوی هێنا، چونکە کافرەکان تەنها هەر ئەوانەیان بە چاو دەبینی، ئەگینا مەلەکوتی ئاسمانەکان گەلێ شتی وای تێدایە کە هەر خودا بۆخۆی عیلمی پێیەتی و کەسی تر پێیان نازانێ، زیندەوەری وایان تێدایە: کە هەر خودا بۆخۆی دەیزانێ و کەسی تر ئاگای لێیان نیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ، وَهُوَ عَلَى جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَاء قَدِيرٌ – الشورى/٢٩﴾. هەڵبەتە قورئان کەتەلۆکی بوونەوەرە، وەکوو دەڵێن نامەی کەونە، کورتەیەکە لە زانست و زانیاری لەوحولمەحفوظ ﴿وَمَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ هیچ شتێك نیە لە لەوحولمەحفوظدا[1] باسمان نەکردبێ و نەخشەو پیلانمان بۆ دیاری نەکردبێ (لەوحولمەحفوظ) جیهانێکی تایبەتییە لە جیهانی غەیبی خودا،

[1] ئیمامی رازی و کۆمەڵێکی تر لە راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە کە مەبەست بە (الكتاب) قورئانەو چونکە لامی عەهدو تەعریفی پێوەیەو ئەویش بۆ قورئان دەگەڕێتەوە.

هەرشتێك بووەو دەبێ تێیدا دیاری کراوە، ئەندازەی هەموو شتێك، تەمەن‌و قەبارەو چۆنیەتی مانەوەو گۆڕانیان تا ڕۆژی قیامەت لەوێدا دەست نیشان کراوە؛ واتە: زانستی هەموو بوونەوەر لای خودا چەسپاوە، هیچ شتێکی لێ گوم نابێ‌و لە یادی ناچێ، رزق‌و ڕۆژی هەموو گیانلەبەرێك لە وشکانی‌و دەریاو هەوادا هەمووی لەلایەن پەروەردگارەوە دابین دەکرێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللهِ رِزْقُهَا، وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ – هود/٦﴾.

لە ژیانی دونیادا هەر پەروەردگار دروستکەرو چاودێرو رزق‌و ڕۆژی دەری گیانلەبەرانە، خۆی بەخێو کەرو بژێو دەریانە ﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ ئەمجار هەموویان پاش مردن سەرلەنوێ بۆلای خودا ڕاپێچ دەکرێنەوەو دەبرێنە گۆڕەپانی مەحشەر بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوەو هەر کەسە بە پێی کردەوەی خۆی سزای پاداشی دەداتەوە، تەنانەت تۆڵەی ئاژەڵی بێ شاخ لە ئاژەڵی شاخدار دەستێنێ!! ئیمامی ئەحمەد لە ئەبو زەڕەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دوو مەڕی بینین شەڕە قۆچیان دەکرد، فەرمووی: «يَا أَبَا ذَرّ هَلْ تَدْرِي فِيمَ تَنْتَطِحَانِ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: لَكِنَّ اللّٰهَ يَدْرِي وَسَيَقْضِي بَيْنَهُمَا». واتە: ئەبو زەڕ! دەزانی لەسەر چی ئەو دوو مەڕە شەڕە قۆچیانە؟ ئەبو زەڕ وتی: نەخێر، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵام خودا دەزانێ‌و لەوە بەولاوە دادگاییان دەکا.

عەبدوڵلای کوڕی ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدی باوکیەوە ریوایەتێکی ئیمام عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێت) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ الْجَمَّاءَ لَتُقَصُّ مِنَ الْقَرْنَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». ڕۆژی قیامەت تۆڵەی ئاژەڵی بێ شاخ لە ئاژەڵی شاخدار دەستێندرێ! عەبدوڕڕەزاق لە ئەبو هورەیرەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەموو گیانلەبەرێك ڕۆژی قیامەت زیندوو دەکرێتەوەو دەبرێتە گۆڕەپانی مەحشەر،

ئاژەڵ‌و باڵندەو هەموو گیانلەبەرێکی تر، پەروەردگار بە دادگەری خۆی حیسابیان لەگەڵ دەکا، تەنانەت تۆڵەی ئاژەڵی بێ شاخ لە شاخدار دەستێنێ، ئەمجار پێیان دەفەرموێ: ببنەوە بە خۆڵ. هەربۆیەشە کافر دەڵێ ﴿يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا – النبأ/٤٠﴾. بەڵام چۆنیەتی ئەو تۆڵە ستاندنە چۆنەو چەندە ئەوە خودا بۆخۆی دەزانێ‌و ئێمە لێی بێ ئاگاین ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي الظُّلُمَاتِ﴾ ئەو کافرو خوانەناسانەی ئایەتەکانی خودا بە درۆ دەخەنەوە بڕوا بە تاك‌و تەنهایی خودا ناکەن، پەیامی پێغەمبەر بە راست نازانن ئەوانە لە نەفامی‌و تێنەگەیشتوویی دا وەکوو کەڕ وان؛ کە هیچ نابیستێ، بێ زمان‌و لاڵن بانگەوازی حەق نابیستن بەو جۆرەی سوودی لێ وەربگرن، قسەی حەق‌و راست ناکەن، ئەوان گۆدە گۆدو لۆژە لۆژیانە لە ناو تاریکیدا؛ تاریکی هاوبەش پەیداکردن‌و بتپەرستی، داب‌و نەریتی نەفامی‌و نەزانی! دەی کەسێك قسەی حەق نەبیستێ قسەی حەق نەکا، گێل‌و گەوج‌و نەفام بێ، شەوەزەنگی شیرك‌و بتپەرستی‌و داب‌و نەریتی نەزانی داپۆشیبێ چۆن رێگای حەق‌و راست دەدۆزێتەوە؟ چۆن لە قوڕەلیتەی سەر لێ شێواوی دێتە دەرو رزگاری دەبێ؟ ئەوانە وەکوو لە ئایەتێکی تردا باسیان دەکا دەفەرموێ: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لاَّ يُبْصِرُونَ، صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ – البقرة/ ١٧ – ١٨﴾. ئەوانە نەفام‌و نەزان‌و بێ ئاگان لە تێفکرینی ئەوەو بیر لێ کردنەوەی...!

پەروەردگار بۆخۆی ئارەزووی خۆیەتی چی بوێ‌و چۆنی بوێ رێگای لێ گوم دەکاو سەری لێ دەشێوێنێ‌و بەدبەخت‌و چارە ڕەش دەبێ ﴿وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ کەسێکیش خودا بیەوەێ هیدایەتی بدا دەیخاتە سەر رێگای راست‌و رەوان‌و بەختەوەری دونیاو قیامەت دەبێ.

رێگا لێ هون کردن‌و شارەزایی کردن بە ویستی خودایە، ئەمەش بە گوێرەی زانستی فراوان‌و بێ سەروبنی خۆی دەربارەی دروست کراوانی خۆی، کەسێك کە

خـودا ڕێگـای لێ هـون دەکـا بـەهۆی ئەوەوەیـە خـۆی پـشت لـە بانگـەوازی حـەق هەڵدەکا؛ لەبـەر لوتبـەرزیو ملـهوڕی سـەیری نیـشانەکانی هـەبوونی خـودا ناکـا. کەسێکیش خودا هیدایەتی بدا، شارەزای بکا بۆ ڕێگای ڕاست بـەهۆی ئەوەوەیـە بـە ڕێكو پێکی عەقڵو هۆشی بـە کـار هێنـاوە، بـە وردی سـەیری بەڵگـەو نیـشانەکانی خـودای کـردووە، چـاوو گوێـچکەو عـەقڵو هۆشـی خـۆی بەباشـی بـە کـار هێنـاوە، زانستیانە هەڵسو کەوتی کردووە کوێرانە لاسای کەسانی پێش خـۆی نەکردۆتـەوە، کەواتە: ئادەمیزاد بە ویستو ئیختیاری خۆی کاری چاکە، یان خراپە، ئەنجام دەداو خـوداش ڕێگـای لێ نـاگرێ، پـەروەردگار زانیـاری بـە هـەموو گوفتـارو کردارێکـی ئادەمیزاد هەیە، بەڵام بە کارو گوفتارە باشەکانی ڕازییەو بە خراپەکانی نارازییە.

### لەتەنگانەدا پەنا هەر بۆ خودا دەبرێ

﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ

﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوپەڕی نەفامی کافرەکانی دەست نیشان کرد، ئەوەشی ڕاگەیاند کە عیلمو زانیاری زاتی بێچوونی هەموو شتێك دەگرێتەوەو هیچ شتێك نیە لە بوونەوەردا لە زانستی پەروەردگار یاخی ببێ، ئەمجار دێ ڕاستیەکی تر دەخاتە ڕوو ئەوەیش ئەوەیە: ئەو خوانەناسانە ئەگەر بەلاو میحنەتێکیان بەسەردا هات هانا بۆ خودا دەبەنو دەکەونە پاڕانەوەو لالانەوەو لەکاتی ترسو ناخۆشیدا باش باش خودا دەناسن، چونکە ئەوکاتە دەچنەوە سەر سروشتو فیطرەتی خۆیان کە یەکتاپەرستییە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتَكُم إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللَّهِ﴾ ئەی محمد! بەو موشریكو خوانەناسانە بڵێ: وەرن پێم بڵێنو تێم بگەیەنن: ئەگر سزای سەختی خودا هاتە سەرتانو بەلای سامناکی وەکوو ئەو بەلایانەی تووشی گەلو نەتەوەکانی پێش ئێوە هات؛ تووشی ئێوە ببێ، ئەگەر وەکوو ئەوان زەوی ژێرتان ڕۆچێ، باوو بۆرانێکی غەزەبتان بەسەردا بباریێ، گێژەڵوکەو وەیشوومەو زریانو ڕەشەباو لافاو ڕاتان ماڵێو تێکتانە وەپێچێ، هەورە بروسکە لێتان بدا، ئایا ئێوە جگە لە خودا لەوکاتانەدا هانا بۆ کێ دەبەن؟ ئەگەر قیامەت لەسەرتان ڕاببێو دیاردەو نیشانە ترسناکەکانی بەدی بێن جگە لە خودا، داوا لە کێ دەکەن ڕزگاتان بکاو ئەو بەلایانەتان لەسەر لابەرێ! ئایا پەنا بۆ بتەکانتان دەبەنو داوا لەوان دەکەن فریاتان بکەون؟ یان داوا لە خودا دەکەن؟

﴿أَغَيْرَ اللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئایابۆ رزگار بوونتـان لـەو تـەنگـو چـەڵەمانە جگە لە خودا داوا لـە کەسـی تـر دەکـەن؟ ئەگـەر راست دەکـەن بتـەکانتان هـاوەڵو هاوبەشـی خـودان دە داوا لـەوان بکـەنو هانـا بـۆ ئـەوان بـەرن!! نەخـەیر ئاشـکرایە لەکاتی تەنگانەدا هاوار ناکەنە بتـەکانیان ﴿بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ﴾ بـەڵکوو هـەر داوا لـە خودا دەکەنو پەنا بۆ ئەو دەبەنو لە بارەگای ئەو دەپاڕێنەوە ﴿فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِنْ شَاءَ﴾ پەروەردگار بـە گوێرەی حیکمـەتو دانـایی خـۆی، ئـەو ناخۆشـییەتان لەسەر لادەبا، لەو تەنگـو چەڵەمەیە رزگارتان دەکا! ﴿وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ﴾ لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا ئـەو بتانـەی دەیانکەنـە هاوبەشـی خـودا لـە بیرتـان دەچـنەوەو بـە خەیاڵتاندا نایە هاواریان بکەنێ! جگە لـە خـودا کەسـتان بـە بـیردا نایـە! وەکـوو لـە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الْضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُورًا - الأسـرار/٦٧﴾. یـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ - لقمان/٣٢﴾.

چونکە پەروەردگارلـە بنـەمادا یەکتاپەرستیو داننـان بـە هـەبوونی خـودای بـێ هاوتای ئاوێتەی سروشتی ئادەمیزاد کردووە، گەردنکەچی بۆ پەروەردگارو بڕوا پـێ بـوونی شـتێکی سروشـتییەو سـەرەکییە، خواپەرسـتی شـتێکی جەوهەرییـە لـە سروشـتی ئـادەمیزاددا، بتپەرسـتیو لادان لـە ئـایینی حـەق لاسـایی کردنـەوەی خەڵکانی ترە، پەیدا بوونی لاوەکییـە لـە پێکهاتـەی ئـادەمیزاددا، جـا کـە ئـادەمیزاد دەکەوێتە تەنگـو چەڵەمەوە هانـا بـۆ خـودا دەبـەنو لەبـەر قـاپی رەحمـەتی ئـەودا دەپاڕێنـەوەو دەلالێنـەوە! چـونکە هەسـتە سروشـتیەکە بـە ئاگـادێ، رۆڵـی خـۆی دەبینێ! وەکوو دەفەرموێ: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ - الروم/٣٠﴾.

ئـەمجار پـەروەردگار بـۆ پەنـدو ئامۆژگـاری کردنـی ئادەمیزادەکـانی سـەردەم سەرگوزشتەی بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان دەگێڕێتـەوە بۆ ئـەوەی بـە بەنـدەکانی بزانێنێ کە دابو نـەریتی خـودا وایـە دەیـەوێ بەنـدەکانی بـە جیـددی بیپەرسـتن، هەرگیز رازی نابێ کە لاساریو کەمتەرخەمی لە خوداپەرستیدا بکەن!

جا بۆ ئەوەی کافرەکانی قورەیش ئەسپی سەرکەشـیو گومڕاییـان بگێڕنـەوە، واز لە بێدینی بهێننو بگەڕێنەوە سەر خودا پەرستیو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلنَآ إِلَى أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ لەم ئایەتەدا پەروەردگار سوێند دەخـواو بـە پێغەمبـەر رادەگەیـەنێ کـە چەند پێغەمبەرێکی ناردووە بۆسەر گەلە پێشینەکان، کە زۆر لە گەلی ئەو دڵڕەقتر بـوون، زۆرتـر لـە شـیركو بێـدینیو سـتەمکاریدا قـوڵ بوونـەوە، چـونکە گـەلی پێغەمبەری ئاخیر زەمان لەکاتی تەنگانـەو ناخۆشـیدا تـەنها خـودا دەناسـنو هـاوار دەکەنە ئەوو پەنای بۆ دەبەن، بەڵام گەلە پێشینەکان بـە هـیچ شـتێك دڵیـان نـەرم نەبوو هـیچ بـەڵاو موصیبەتێك ئـەوانی هۆشـیار نـەکردەوە، ئـەی محمـد! دڵنیابـەو بـاش بزانـە کـە ئێمـە ناردوومانـە بـۆ سـەر گـەلو نەتـەوەکانی پـێش تـۆ چـەند پێغەمبـەرو فروسـتادەو رەوانـەکراوی خۆمـان بـۆ ئـەوەی گـەلو نەتـەوەکانیان بترسێنن لە سزاو عەزابی خودا ئەگەر سەرپێچی بکەن، موژدەی بەهەشتو پاداشی باشیان بدەنێ ئەگەر پابەند بـن بـە فـەرمانی خـوداوە! بـەڵام ئـەو گـەلو نەتەوانـە پەنـدو ئامۆژگـاری کـاری تـێ نـەکردنو پـشتیان هـەڵکردو پێغەمبـەرەکانیان بـە درۆخستەوەو یـاخی بـوون سەرکێشیان کـرد ﴿فَأَخَـذْنَاهُمْ بِالْبَأْسَـاءِ وَالـضَّرَّاءِ﴾ ئێمـە بەرەڵاو سزای بـە ئێـشمان بـۆ نـاردن، تووشـی جۆرەهـا تـەنگو چـەڵەمەمان کـردن، بـەڵاو موسـیبەتی سـامناکمان بەسـەردا هێنـان ﴿لَعَلَّهُـمْ يَتَـضَرَّعُونَ﴾ بـەڵکوو ئـەوان تەمبێ خواردو ببنو واز لـە سەرکەشـیو بـێ دینـی بهێـنن! چونکە بـەڵاو تـەنگو چەڵەمەو ناخۆشی دڵو دەروونی ئادەمیزاد مشتو ماڵ دەکاو خاوێنی دەکاتەوە، وا لە ئادەمیزادی لووت بـەرزو لـە خۆڕازی دەکـا کـە چاوێك بـە خۆیـدا بگێڕێتـەوەو بیرێك لە رابردوو داهاتووی خۆی بکاتەوە، خۆ بخاتە پـەنای خـوداوە، جـا سـەرباری

ئەم ئامۆژگاری‌و تاقی کردنەوەو مشت‌و ماڵ کردنە، زۆربەی زۆری ئەو خەڵکە عارنانێن‌و پەند وەرناگرن، ئەم هەموو کارەساتە جۆراو جۆرانە کاریان تێ ناکەن ﴿فَلَوْلا إِذْ جَاءهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ﴾ دەی بۆچی کەبەلاو کارەساتی دڵ تەزێنی ئێمەیان پێ گەیشت نەکەوتنە پاڕانەوەو لالانەوە؟ کاشکێ ئەو تەنگ‌و چەڵەمانە کاریان تێ بکردنایەو وەهۆش خۆ بهاتنایەوە، بەلام کوا ئەوانە ئەوەند خاوەن هۆش‌و فامن تەمبێ خواردوو بن؟ نەخێر تەنگانەو بەلای سەخت‌و سامناك کاری تێ نەکردن‌و دڵیان نەرم نەبوو ﴿وَلَكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ بەڵکوو دڵیان ڕەقتر بوو زیاتر گومڕا بوون‌و سەرکەشیان کرد ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ شەیتانیش ڕێگای گومڕابوونی بۆ جوان کردن‌و زیاتر بێدینی لەدڵ دا شیرین کردن بەڕاستی کارێکی ناشیرینیان کردو ڕێگایەکی سامناکیان گرتەبەر کە سەرەنجامەکەی سووتانیانە بە ئاگری دۆزەخ! ئەمجار یەزدانی مەزن ئاکامی سەرکەشییان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ﴾ کاتێك روویان وەرگێڕا لەو هەڕەشەو ترساندنەی پێغەمبەرەکان ناڕاستەیان کردن، گوێیان بۆ موژدە پێدانی بەهەشتیان نەگرت‌و لاساریيان نواند، ئامۆژگاری پێغەمبەرەکانیان لە بیر خۆ بردەوە، زانرا کە ئەوانە بە هیچ کلۆجێك ئیمان ناهێنن، ئەوەی کە لە عیلمی ئێمەدا چەسپاوە دەرحەق ئەوان هاتە دی ﴿فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ ئێمەیش بۆزیاتر هەڵخەڵەتاندنیان‌و ڕۆچوونیان لە گومڕاییدا دەرگای رزق‌و رۆژیمان بۆ کردنەوە، هەرزانی‌و خێرو خۆشی کاتی دونیاییمان بەسەردا ڕشتن، لەش ساغی‌و ئەمن‌و ئاسایشمان بۆ دابین کردن ﴿حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ﴾ ئەوەندە ژیان‌و گوزەرانمان بۆ خۆش‌و ئاسان کردن، ماڵ‌و منداڵی زۆرمان پێدان‌و تا کەیف خۆش بوون پێی‌و ئەوەندەی تر خۆیان لە خۆ گۆڕاو لوتبەرزییان نواند ﴿أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً﴾ لە ناکاوێك گرتمانن، بە سزای بە ئێش لە بیخمان دەرهێنان‌و ئاسەوارمان بڕینەوە ﴿فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾ کاتێك بە خۆیان زانی کە تازە ڕێگای رزگار بوونیان نیەو لە هەموو

خێرو خۆشییەك بێ بەشن‌و سەرەنجامی سامناك‌و سزای سەختی جەهەننەم چاوەڕێیانە!

﴿فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئەو گەل‌و نەتەوانەی کە ستەمیان لە خۆیان کرد بەوەی کە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوەو سوور بوون لەسەر بتپەرستی‌و بێدینی دوابڕاو کران‌و ریشەو رەچەڵەکیان لە بێخ دەرهێنراو لە ناوبران‌و کەسیان لێ دەرنەچوو ﴿وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودای مەزن‌و پەروەردگاری بوونەوەرە، لە پاساوی ئەو نیعمەتە گەورانەی کە پەروەردگار بەسەر پێغەمبەرەکانی‌و خوداپەرستاندا رشتی کە بەو جۆرە گرۆی کوفرو ئیلحادو بتپەرستی سزادان‌و تۆڵەی ستەمکاریی لێ ستاندن‌و جیهانی لێ پاك کردنەوە، ئەمە ئاماژەیە بەوە کە لەناوبردن‌و لە بێخ دەرهێنانی ستەمکاران نیعمەتی خودایەو بەلاو موصیبەت پەندو ئامۆژگاریان تێدایەو پێویستە سوودیان لێ وەربگیرێت؛ ئەوەش دەگەیەنێ کە رۆچوون لە خۆش گوزەرانی‌و رابواردن‌و زۆری ماڵ‌و منداڵ جاری وا هەیە دەبنە پێشەکی بۆ هاتنی سزاو تۆڵەی یەزدانی، ئەو خۆش گوزەرانی‌و ماڵ‌و منداڵ زۆرییە دەبێتە مایەی هەڵخەڵەتاندن‌و لە خشتەبردن (خودا لە هەموو کارێکی ناپەسەند بمانپارێزێ!).

ئایەتەکە ئەوەش دەگەیەنێ کە یادی خودا لە کۆتایی هەموو ئیشێکدا پێویستە، نابێ کەمتەرخەمی لێ بکرێ! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ – یونس/١٠﴾. ئیمامی ئەحمەد لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەرکاتێك دیت پەروەردگار وێڕای سەرپێچی کردنی بەندەو تاوان کردنی کەچی ژیانی بەختەوەری پێ بەخشی ئەوە خودا هەڵی دەخەڵەتێنێ‌و لە خلیسکی دەبا، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئایەتی ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ی خوێندەوە... (طەبەرانی‌و بەیهەقی)یش فەرموودەیەکیان بەم

مانایە ریوایەت کردووە. بەڵام رەوشتی موسوڵمان جیاوازە لە رەوشتی کافرەکان، موسوڵمان هەرگیز بە خۆش گوزەرانی لە خۆی بایی نابێو لەکاتی بەڵاو موصیبەتدا خۆڕاگرو بە ئارام دەبێت. ئیمامی موسلیم لە صوهەیبەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا بە مەرفوعی، دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ئیشی موسوڵمان سەیرە؛ هەموو کارێکی خێرو بێرە، ئەمەش بەس بۆ موسوڵمان وایەو بۆ کەسی تر وانیە، موسوڵمان ئەگەر خۆشی پێ گەیی سوپاسی خودا دەکاو ئەمە دەبێتە خێرو بێر بۆی، ئەگەر بەڵاو موصیبەتی تووش هات صەبر دەگرێو ئارام دەبێ ئەمەش دەبێتە خێر بۆی!

## هەندێ لە بەڵگەی دەستەڵاتو توانای پەروەردگارو تاكو تەنهایی زاتی پاكیو ئەركی پێغەمبەران

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَـٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾

وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾.

لێرە بەولاوەش ئایەتەکان پەیوەندیان بە ئایەتەکانی پێشووەوە هەیە، هەر لە تەوەری باسی پێشوودا دەسوڕێنەوەو بۆ چەسپاندنی هەبوونی دەستەڵاتو توانای خوداو بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر هەبوونی خودای تاكو تەنهاو بێ هاوەڵ، هەروەها لە باسی روون کردنەوەی ئەرکی پێغەمبەرو لێپرسراویەتی ئەو فروستادەیە لەبەرامبەر گەلەکەیدا دەخولێنەوە، بە جۆرێك کە سەردەکێشێ بۆ پووچەڵ کردنەوەی بیروباوەڕی هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوداو بتپەرستی بە هەموو جۆرەکانیەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ اللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَارَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو هاوبەش پەیداکەرە بە درۆخەرەوە ناپەسەندانە بڵێ: وەرن پێم بڵێن ئەو کارەی کە ئێوە دەیکەن چیە؟ بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە، چۆن ئاوا لە خودا غافڵو کەمتەرخەمن! باشە پێم بڵێن: ئەگەر خودا ئامێری بیستنو دیتنتان لێ وەربگرێتەوە، واتان لێ بکات کەڕو کوێر ببن نە هیچ ببیستنو نە هیچ ببینن ﴿وَخَتَمَ عَلَى قُلُوبِكُم﴾ دڵتان مۆر بکاو دەرگای تێگەیشتنو هەست کردنی دابخات، (ئەم ئامێرانە ئەگەر لە کار بکەون، کاروباری ئادەمیزاد دەشێویو بەرژەوەندیەکانی دەفەوتێن، زیانی دینیو دونیایی پێ دەگا!) دەی باشە ئەگەر خودا ئەم هەستانەتان لە کار بخا، ئەم ئامێرانە لە ئادەمیزاد بسێنێتەوە کێ هەیە جگە لە خودا ئەو ئامێرانەتان پێ ببەخشێتەوە؟ دیارە هەر خودا ئەم ئامێرانەی پێ بەخشیوونو هەر ئەویش ئەگەر لە کار کەوتن وەگەڕیان دەخاتەوە، ساکەوابێ پێویستە کەسی تر بە شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ کردن نەزانداری، جگە لە خودا، هەر ئەو شایەنی پەرستنو مل بۆ کەچ کردنە، کەسی تر رایەی ناکەوێ ئەو پلەو پایەیەی بدرێتێ!.

﴿مَّنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللّهِ يَأْتِيكُم بِهِ انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ﴾ ئەی محمد! سەیر بکە چۆن ئایەتەکان شی دەکەینەوەو راڤەیان دەکەین، مەبەستەکان دووبارەو سێ بارە دەکەینەوە، چمك و شێوەو شێوازی دەقەکان دەگۆڕین و جۆراو جۆر رایان دەنوێنین، جارێ هومێد بەرنانەوەو دەمێ هەڕەشە کردنە، لێرە تەرغیبو تەماع بەرنانە، لەوێ ترساندن و هەڕەشە کردنە، هەموو بەڵگەکان ئەوە دەگەیەنن جگە لە خودای باڵا دەست و تاك و تەنیاو زانا خودای تر نین، هەرچی جگە لەو پەروەردگارە بپەرستێ بە تاڵ و تاوانەو لە رەوڕەوەی ئادەمیزاد لای داوەو خۆی چارە ڕەش کردووەو گومڕاو سەرلێ شێواو بووە ﴿ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ﴾ پاشان بڕوانە! ئەوانە چۆن رووی خۆیان وەردەگێڕن و پشت هەڵدەکەن؟!!.

﴿قُلْ أَرَأَيْتَكُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللّهِ بَغْتَةً﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: وەرن تێم بگەیەنن و هەواڵم پێ بدەن، ئەگەر لە پڕێکا بەبێ ئەوەی ئێوە ئاگاتان لێ بێت عەزابی خودا بێتە سەرتان و بە خۆتان نەزانن تا تێکتانەوە دەپێچێ ﴿أَوْ جَهْرَةً﴾ یان پێشەکی ئاگادار بن و چاوتان لە عەزابەکە بێ کە بەرەو رووی ئێوە دێ بە ئاشکرا ببینن! پێم بڵێن: ئێوە لەو کاتەدا چی دەکەن و هەڵوێستان چی دەبێ؟ خۆ ئەگەر ئەو عەزابە هات ﴿هَلْ يُهْلَكُ إِلاَّ الْقَوْمُ الظَّالِمُونَ؟﴾ جگە لە تاقم و گرۆهی ستەمکارو کافر کەسی تری تێدا ناچێ و نافەوتێ، سزاکە هەر ئەوانە دەفەوتێنێ کە هاوبەشیان بۆ خودا داناوەو سوورن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، واتە: دابو نەریتی خودا وایە لەو جۆرە سزایانەدا پێغەمبەران و شوێن کەوتوانیان رزگار دەبن، سزاکە ئەوانە دەگرێتەوە کە ستەمکارو سەر ڕەق و دڵ ڕەشن!

ئەمجار ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ ئێمە کە پێغەمبەران دەنێرین و ناردوومانن بۆ دوو مەبەست ناردوومانن و کارەکەیان لە دوو شتی سەرەکیدا کورت هەڵهێندراوە، موژدە بدەن بە موسوڵمانان بە بەهەشت و خێرو خۆشی، هەروەها کافرە بێدینەکان لە

سـزای خـودا کـە ئـاگری دۆزەخـە بترسـێنن، ئـەرکی پێغەمبـەر پـێ ڕاگەیانـدنو بانگەوازی کردنـە ﴿فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ﴾ کەسـێك بـە پیر بانگەوازییەکەیەوە بچێو ئیمان بێنێو کرداری باشو چاك بکاو شوێن ڕێبازی پێغەمبەران بکەوێ ئەوە ﴿فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ترسی سزای دوا ڕۆژیان لەسەر نیە، لە سزای داهاتووی دونیاو قیامەت ناترسێن، دڵنیان لە ڕەحمەتو بەخششی خودا ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ هەروەها پەرۆشی ئەوەشیان نیە کە لە دونیادا لە پاش خۆیان بە جێیان هێشتووە، چونکە خودا لە هەموو ترسو بیمێك دەیانپارێزێو چاودێرییان دەکا، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ – الأنبياء/١٠٣﴾.

موسوڵمانان لە دونیادا وەکوو موشریكو خوانەناسەکان خەمو خەفەت دایان ناگرێو بێ ئومێد نابن، چونکە خاوەن باوەڕ صەبرو ئارام دەگرێو هومێدی پاداشی لای خودای هەیەو بە هیوا دەبێ خودا بۆی پڕبکاتەوە، پەروەردگار شارەزای کردووە بۆ ئەوەی لەسەر نیعمەتو بەخشش سوپاس گوزار بێ، لەکاتی بەڵاو موصیبەتیشدا خۆگرو بە ئارام بێو خۆی بداتە دەست خودا ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا يَمَسُّهُمُ الْعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾ ئەوانەی ئایاتی خودا بە درۆ دەزانـنو پێغەمبەران بە درۆ دەخەنەوەو گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی ڕاناگرنو پشتیان لێ هەڵدەکەنو لە فەرمانو ڕێبازی خودا دەردەچنو تاوان ئەنجام دەدەن، ئەوانە سزای بە ئێشیان تووش دەبێ، سزای کوفرو بێدینیەکەیان لە دونیادا جۆرەها بەڵاو موصیبەتە، سزای قیامەتیشیان سەرباری ڕقوغەزەبی خودا لێیان، ئاگری دۆزەخە! ئەو خێرو خۆشییەی کە لە دونیادا کافرو بێدین هەیانە شتێکی کاتیو بڕاوەیە، لە بەرامبەر خێرو خۆشی قیامەتدا هیچو پووچو کەم بایەخن.

## سەرچاوەی زانیاری پێغەمبەر نیگاو سروشتەو ئەرکی ئەو پێڕاگەیاندنە، ترساندنە

﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ (٥٠) وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ (٥١) وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥٢) وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ (٥٣) ﴾.

ئەم ئایەتەی دوایش پەیوەندی بە ئایەتی پێشووەوە هەیەو مانای ئەو تەواو دەکا، ئەرکەکانی سەرشانی پێغەمبەران سنووردارو دەست نیشان دەکا، وەزیفەی

پێغەمبەرەکان دیاری دەکا بەوەی کە ئەوانە تەنها مـوژدەدەرو ترسێنەرن، ئـەوەی پێویستە ئەوان بیکەن گەیاندنی پەیامی خودایە بە خەڵك و بەس!

پەروەردگار لەم ئایەتانەی دواییدا فەرمان بە پێغەمبەری خۆی دەکا بـەوەی کـە بە خەڵکەکە رابگەیـەنێ کـە تـەنها مـوژدەدەرو ترسێنەرەو بـۆ ئـەو دوو مەبەسـتە سـەرەکییە رەوانـە کـراوە، مـافی ئـەوەی نیـە شـت بەسـەر خـودادا فـەرز بکا! دەڵێ فـەرمانم پـێ کـراوە کـە سـێ شـت لـە خـۆم دوور بخەمـەوە، لـەوبوارەدا دان بـەبێ دەسەڵاتی خۆم بنێم و خۆیان پێوە هەڵنەکێشم، یەکـەمیان: مـن گـەنج و خەزێنـەی خودام لانیە، دووەم: نهێنی نازانم، سێیەم: من ئادەمیزادم فریشتە نیم، سوودی ئەم داکـۆکی کردنـە لـە خـۆی ئەوەیـە: کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) بەندایـەتی و ملکەچـی خـۆی بـۆ پـەروەردگار را دەگەیـەنێ، بـە پێـچەوانەی ئـەو بیروباوەڕەی کە فەلەو گاورەکان دەربـارەی عیسا هەیانـە! هـەروەها دەسـت کـورتی خۆی رادەگەیەنێ لەوەدا کە ناتوانێ موعجیزەی داواکراو بە گوێرەی ویـستی ئـەوان بخاتـە روو، چونکە هێنـانی مـوعجیزە لـە دەسـەڵات و توانـای خودادایـەو ئـەو هـیچ دەستێکی لـەوەدا نیـە! مەبەسـتی ئەوەیـە: کـە بڵـێ: مـن نـە خـودام نـە فریـشتەم ئادەمیزادێکم و نیگام بـۆ دێ...... پـەروەردگار راستەوخۆو بـێ پـەروا فـەرمانی بـە پێغەمبەر کردو فـەرمووی: ﴿قُل لاَّ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّـهِ﴾ ئـەی محمـد! بـەو موشـریکانە بڵـێ: کـە داوای مـوعجیزاتی جـۆراو جـۆرت لێ دەکـەن و نـازانن پێغەمبەرایەتی چیەو چی نیە، بڵێ: گەنجینەی خودا لە ژێـر دەسـەڵاتی منـدا نیـە، توانای دابەش کردن و تەصەروف تێدا کـردنم نیـە، ئـەوە بەدەسـت خـودا خۆیـەتی، چۆنی دەبەخشێ و بە کێـی دەدا پەیوەنـدی بـە زاتـی بێچوونەوە هەیـە، مـن هیچم بەدەست نیە، ﴿وَلاَ أَعْلَمُ الْغَيْبَ﴾ هەروەها غـەیب زان نـیم و دەربـارەی نهێنـی هـیچ نازانم، ئەوە تایبەتە بە خـوداوەو هـیچی لێ نـازانم، جگە لـەوەی کـە خـودا بۆخـۆی بەسەر بڕێکیدا ئاگادارم دەکا، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَـا

يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا، إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ – الجن/٢٦ – ٢٧﴾. غەیب ئەوەیە خەڵك پێی نەزانن‌و هۆكاری زانینیان دەربارەی نەبێ، غەیب دوو جۆرە:

١- غەیبی حەقیقی: ئەوەیە؛ كە زانینی لە هەموو كەس نادیار بێ، تەنانەت فریشتەش هیچی لێ نەزانن، تەنها خودا خۆی دەزانێ!.

٢- غەیبی نیسبی: ئەوەیە؛ كە زانینی لە بڕێ تاقم‌و گرۆهی دروستكراوان نادیار بێ‌و لە بڕێكیان نا، ئەوەتا هەندێ زانیاری نادیار هەیە لە جیهانی فریشتەدا زانراوو ئاشكرایە، فریشتەكان پێی دەزانن بەڵام ئێمەی ئادەمیزاد پێی‌نازانین.

بەڵام هەندێ شتی نادیار هەیە بڕێ ئادەمیزاد هۆكاری زانینیان بەدەست هێناوە بڕێكیشیان بەهۆی نەزانینی هۆكارەكان نایزانن ئەمە ناچێتە چوارچێوەی جیهانی غەیبییەوە، واتە: ئەو زانیاریە غەیبییە نیە كە خودا تایبەتی كردووە بە خۆیەوە بەڵكوو نهێنیەكە بە هۆكار دەزانرێ ئەو هۆكارانەش سێ جۆرن:

ا- هۆكاری زانست ئامێز وەكوو بەڵگەی عەقڵی‌و زانستی: ئەوەتا زانایانی ماتماتیك ئاكامی نادیاری وا دەردەهێنن كە زۆربەی ئادەمیزادی تر پەی پێ نابەن، ئەوەتا بڕێ زانا بە هۆی زانستی تایبەتیەوە زۆر پێش وەخت كاتی گیرانی خۆرو مانگ دەست نیشان دەكەن، بە چركەو سات پاش‌و پێش ناكا.

ب- هۆكاری عەمەلی وەكوو بروسكەی ئەثیری (تەلەگرافی لاسیلكی) كە هەواڵی دووره وڵاتی پێ دەزاندرێ.

ج- برە نهێنییەكی تر هەیە، لە ڕێگای هۆكاری نەفسییەوە دەزاندرێ، وەكوو زانیارییەك كە بە هۆی فیراسەت‌و ئیلهام‌و قیافەوە دەزاندرێ، زۆربەی ئەم جۆرە زانیاریانە هەست كردنی نەفسین‌و جێگای متمانە نین، تا روو نەدەن بڕوای تەواومان پێیان نابێ.

﴿وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ﴾ هەروەها ناڵێم‌و لافی ئەوە لێ نادەم كە فریشتەم، بەڵكوو من یەكێكم لە ئادەمیزادو نیگام بۆ دێ لەلایەن خوداوە، ئەمن ناتوانم شتێك بێنم كە ئادەمیزاد دەسەڵاتی بەسەردا نەبێ.

بەکورتی من لافی خودایەتی لێ نادەم، نهێنی نازانم، فریشتە نیم کە وابی داوای شتێکم لێ مەکەن کە لە تواناما نەبێ، من بەندەیەکم لە ئادەمیزاد وەکوو ئێوە وام لە سروشتی ئادەمیدا، بە نیگا قورئانم بۆ دێ و راڤەو مانایم فێر دەکرێ، لەمەشدا من تاکە کەس نیم و لە پێش من زۆر پێغەمبەر رەوانە کراون و ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام داوە، ئەرکی پێغەمبەر کارکردنە بە گوێرەی ئەو نیگاو سروشەی بۆی دێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ من تەنها شوێن ئەو نیگایە دەکەوم کە بۆم دێ، چیم پێ بگوترێ ئەوە ئەنجام دەدەم و بە موو لێی لا نادەم! بەلگەی زۆرو زەبەندەشم بۆ هێناون لەسەر راستی ئەوەی کە دەیلێم، شتێك نالێم کە عەقڵی ئێوە قبووڵی نەکا، یان بوونی مەحاڵ بێ، دەی بۆچی ئینکاری دەکەن؟؟.

ئەمجار پەروەردگار سەرزەنشتیان دەکاو ئەوەیان بۆ روون دەکاتەوە کە گومڕاو شارەزا چون یەك نین و فەرمووی: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ﴾ ئەی محمد! بەو هاوبەشپەیداکەرە بە درۆخەرەوانە بڵێ: ئایا چونیەك و یەکسانن ئەوانەی شوێن حەق و راستی کەوتوون و شارەزای رێگای حەق کراون لەگەڵ کەسانێکدا کە رێگایان لێ گوم بووە لە شەقامە رێی حەق لایان داوە؟ چۆن کوێرو چاو ساغ وەکوو یەکن؟ ﴿أَفَلاَ تَتَفَكَّرُونَ﴾ ئەوە بۆچی بیر ناکەنەوە؟ بۆچی بە وردی و تێبینیەوە سەیری رووداوو شتەکان ناکەن تا بتوانن جوداوازی بخەن لە نێوان گومڕایی هاوبەش پەیدا کردن و شارەزایی بوون ئیسلامدا، لە قورئان و بەلگەکانی تاك و تەنیایی خودا تێبگەن و شوێن رێبازی پێغەمبەری ئیسلام بکەون و سەرفیرازی و بەختەوەریی هەردوو جیهان دەستەبەر بکەن! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ – الرعد/١٩﴾.

بە کورتی ئایەتەکان لەم تەوەرانەدا دەخولێنەوە یەکەم: چەسپاندن و سەلماندنی دەسەڵاتی خودایە بە شێوەیەکی رەهاو (مطلق) بە جۆرێکی وا کەس نیە نموونەی ئەو دەسەڵاتەی هەبێ، کە هەبوونی ئەو دەسەڵاتە بەلگەیە لەسەر هەبوونی خوداو

تاك و تەنهایی. دووەم: چەسپاندن و سەلماندنی قورئانە کە موعجیزەیەکی هەمیشەییە بۆ ڕاستی ئیسلام و ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی مەحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) کە لە خوداوە نێردراوە، دووپات کردنەوەی ئەوەش کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەسەڵاتی هێنانی موعجیزەی نیە بەبێ ڕەزامەندی خوداو هیچ شتێکی نائاسایی بەبێ یارمەتی و ڕەزامەندی خودا بۆ نایەتە دی. لە هەموو کاروبارێکیدا پێویستی بە پشتگیری پەروەردگار هەیە. ئەمەیە حەقیقەت و ڕاستی پێغەمبەرایەتی!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا، بە شێوەیەکی هەڕەشەی تایبەتی پێی ڕادەگەیەنێ کە موسوڵمانان بترسێنێ لە حیساب و لێکۆڵینەوەی قیامەت و دەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُواْ إِلَى رَبِّهِمْ﴾ ئەی محمد! بەهۆی نیگاو سروشەوە لە ڕێگەی ئایەتەکانی قورئانەوە، ئەوانە بترسێنە کە بڕوایان بە خودا هەیە و ترسی ڕۆژی حەشر و لێکۆڵینەوەی ئەو ڕۆژەیان هەیە، ترس و بیمی ئەوەیان هەیە کە ببرێنەوە بەرقاپی خوداو بەو تەرازووە ورد خوێن و وردبینە حیساب و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکا، ئەوانە بترسێنە کە پێیان وایە ﴿لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِ وَلِيٌّ وَلاَ شَفِيعٌ﴾ جگە لە پەروەردگار کەسی تر چاودێر و سەرپەرشتیار و یارمەتیدەریان نیە، کەس فریایان ناکەوێ و بە هانایانەوە نایە، بیانترسێنە ﴿لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکوو خۆیان لە سزاو تۆڵەی ئەو ڕۆژە بپارێزن؛ کارو کردارێك بکەن کە ببێتە مایەی ڕزگاری و سەرفرازییان لە ڕۆژی قیامەتداو پاداشتیان بۆ دووچەندانەو چەند چەندانە بکاتەوە. واتە: ئەوانە بترسێنە کە بڕوایان وایە: ڕزگاربوونیان و سەرفراز بوونیان لە ئاگری دۆزەخ بە هۆی ئیمان و باوەڕی تەواوو کردارو گوفتاری باشەوە دەبێ، بەهۆی پاڵفتە کردنی دڵ و دەروونەوە دەستەبەر دەبێ، نەك بە هۆی پیاوچاکی کەسانی ترەوە، صەلاح و کردارباشی باوك و باپیرو خزم و کەس و کار ئەوانە ڕزگار ناکا، شەفاعەتی شەفاعەتکاران سوود بە ئەوان ناگەیەنێ، وەکوو بیروباوەڕی موشریکەکان کە بێ ئاگان لەوەی تەوەری خۆشبەختی

له دونیاو قیامەتدا پابەندە بە تەزکیەی نەفس‌و پاککردنەوەی لە هەموو چڵك‌و پیسییەك کە ئەوەش بە هۆی بیروباوەڕی راست‌و دروست‌و رەوشتی بەرزو کرداری باش دێتە کایەوە، نەك بە شتێ تر!

ئەمجار پەروەردگار نەهی لە پێغەمبەر دەکا لەوەی کە گوێڕایەڵی مشەخۆرو کافرەکانی قورەیش بێ، ئەوانەی کە لە خۆشی‌و نازو نیعمەتەکانی دونیادا دەتلێنەوە، نەهی لێ دەکا کە دەربارەی موسوڵمانە هەژارەکان گوێڕایەڵی ئەو کافرە مشەخۆرانە نەبێ‌و هیچیان بە قسە نەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ ... الايـة﴾

ئیبنو حیببان‌و حاکم لە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصەوە دەگێڕنەوە کە گوتی: دڵنیا بن ئەم ئایەتە دەربارەی شەشە کەس هاتۆتە خوارێ: من‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو چوار کەسی تر، کافرەکان بە پێغەمبەریان گوت: ئەوانە دەربکە، ئێمە پێمان عەیبە لەگەڵ ئەواندا شوێن تۆ بکەوین، ئەگەر ئەوانت لەگەڵ نەبن ئێمە شوێنت دەکەوین، ئەم لەبەر راهاویشتن‌و پێشنیارە کاریگەرییەکی لە دڵی پێغەمبەردا پەیدا کرد: ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ‌و هەڵوێستی نەگۆڕی ئیسلامی دووپات کردەوە، بێ باکی پەروەردگارو بێ منەتی لە هەموو ئادەمیزادو بوونەوەر راگەیاندوو فەرمووی: ﴿وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾.

ئیمامی ئەحمەدو طەبەرانی‌و ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: کۆمەڵێ لە کافرە ملهوڕە قورەیشییەکان بەلای پێغەمبەردا تێپەڕین لەو کاتەدا خەبابی کوڕی ئەڕەت‌و صوهەیب‌و بیلال‌و عەممار لەلای پێغەمبەر بوون، کافرەکان وتیان: ئەی محمد! ئایا بە ئەوانە دڵخۆشی؟ ئەمانەن خودا لە ناو ئێمەدا منەتی خۆی بەسەردا رشتوون؟ ئەگەر ئەوانە دەربکەی ئێمە شوێنت دەکەوین، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ﴾ تا دەگاتە ﴿سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ﴾ی ناردە خوارێ، ئیبنو جەریری طەبەری‌و ئیبنولمنذیر لە عیکرەمەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: عوتبەی کوڕی رەبیعە، شەیبەی کوڕی رەبیعە موطعیمی

کوڕی عەدیو ئەلحاریثی کوڕی نەوفل لە پیاوماقوڵانی بەرەبابی عەبدولمەنافو گرۆی کوفرو ملهوڕ، هاتنە لای ئەبو طالیب پێیان گوت: ئەگەر خوا بکا برازاکەت ئەم کۆمەڵە کۆیلانە لای خۆی دەربکاو لە خۆی دوریان بخاتەوە رێزی لای ئێمە زیاد دەکاو رەنگە ئێمەیش بیرێك لەوە بکەینەوە کە گوێڕایەڵی بین، رێخۆشکەر دەبێ بۆ ئەوەی شوێنی بکەوین! ئەبو طالیبیش ئەم پێشنیارەی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوت، عومەری کوڕی خەطاب وتی: خۆزگە وامان بکردایە بزانین هەڵوێستیان چۆن دەبێ، ئیتر پەروەردگار ئایەتەکانی ﴿وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ...﴾ تا دەگاتە ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾ی ناردە خوارەوە، ئەو موسوڵمانە هەژارو کۆیلانەی کە کافرە ملهوڕەکان پێشنیاری ئەوەیان کردبوو دەربکرێن بیلالو عەمماری کوڕی یاسرو سالم – کە مەولای ئەبو حوذیفە بوو – صاع کە مەولای ئوسەید بوو – ئیبنو مەسعوودو میقدادی کوڕی عەمری واقیدی کوڕی عەبدوڵلای ئەلحەنظەلیو ئەمانە بوون. جا کە ئایەتەکان هاتنە خوارەوە ئیمامی عومەر هاتە لایانو عوزر خواهی بۆ هێنانەوەو لە قسەی خۆی پەشیمانی دەربڕیو ئایەتی ﴿وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا ... الآية﴾ هاتە خوارێ.

تێبینی ئەوە دەکرێ کە ئەم ریوایەتانە جوداوازییان تێدایە، بڕێکیان باسی ئایەتە نازڵ بووەکان دەکا تا دەگاتە ئایەتی (٥٣)، بڕێکیشیان ئایەتی (٥٤ - ٥٥)یش خستوونەتە پاڵ، ریوایەتی یەکەم ئیبنو مەسعودی لەگەڵ سەرانی قورەیشدا باس کردووە، ریوایەتە کۆتاییەکە ئیبنو مەسعوود لەگەڵ ئەوانەدا باس دەکا کە پێویستە دەربکرێن، بەهەر حاڵ لەگەڵ هەبوونی ئەو جوداوازییەی نێوان ریوایەتەکان، بەڵام هەریەکەیان پشتگیری ئەوی تریان دەکاو تێکڕا ڕاستی رووداوەکەو موناسەبەتەکە روون دەکەنەوە!

بەڵێ پەروەردگار بێ باکانە رێگای ئەوەی لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گرت کە قورەیشیە ملهوڕەکان لە خۆی نزیك بکاتەوە، موسوڵمانە بێ‌ۆمیەکان لە

خـۆی دوور بخاتـەوە، چـونکە تـەرازووی خـودا تەرازوویـەکی تایبەتییـە شـتەکان کێشانە دەکا، گوێ بە هێزو تواناو دەسەڵاتی ئەمو ئەو نادا، کێ زیاتر خوداپەرست بێ، ڕێزی لای خودا زۆرترو زیاترە، بۆیە لەگەڵ پێشنیاری کافرەکان بـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گەیشتو خەتورمیەك بە دڵی پێغەمبەر (صلى اللهُ عليـه وَسلمَ)دا هات، پەروەردگار ئایەتی نازڵ کـردو فـەرمووی: ﴿وَلاَ تَطْـرُدِ الَّـذِينَ يَـدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ﴾ ئەی پێغەمبـەر ئـەو موسـوڵمانانەی دەوروبـەرت مەڕەنجێنـە. نەچـی بـۆ دڵ ڕازی کردنـی ملهوڕەکانی قـوڕەیشو بـە هیـوای ئـەوەی ئـەوان دوات کەونو موسوڵمان بن ئەو تاقمو کۆمەڵە موسوڵمانەی کە لەگەڵتدان دەریان بکـەیو لە خۆتیان دوور بخەیەوە، نەکەی ئەو موسوڵمانە هەژارانەی خوداپەرستی دەکـەنو بـەیانیو ئێـوارە بەندایـەتی خۆیـان بـۆ خـودا تـازە دەکەنـەوە پاشـگوێیان بخـەیو دەریان بکەی، نەکەی ئـەو موسـوڵمانانەی هەمیـشە خواپەرسـتو ڕوو لـە خـوان لـە خۆتیان بڕەنجێنی.

مەبەست بە وشەی ﴿يَدْعُونَ﴾" ﴿يصلون﴾ـە، واتە: لـە بـەیانیو ئێـوارەدا نوێـژ دەکـەن، چـونکە لـە سـەرەتای هـاتنی ئـایینی ئیـسلامدا دووجـار نوێـژیان دەکـرد: نوێـژێکیان بـەیانیو ئـەوی تریـان ئێـوارە، یـان مەبەسـتەکە گـشتییەو بـە مانـا ﴿يعبدون﴾ـە، واتە: خوداپەرستی بە هەموو جۆرەکانیەوە، نوێـژ کـردن، پاڕانـەوە. قورئان خوێندن، یادکردنی خودا، کردارو گوفتاری باش...هتد. ئەو موسوڵمانەی کە لـە بـەیانی ئێـوارەدا، یـان لـە هـەموو کاتەکانـدا خوداپەرسـتی دەکـەنو هانـای بـۆ دەبـەنو لێـی دەپاڕێنـەوە ﴿يُرِيـدُونَ وَجْهَـهُ﴾ مەبەسـتیان بـەو خوداپەرسـتیەو پاڕانەوەیە ڕازی کردنی پەروەردگارە، تـەنها بەندایـەتیو ملکەچـی بـۆ ئـەو ئـەنجام دەدەنو طاعـەتو پاڕانـەوەیان بـۆ ئـەوەو بـەس، مەبەسـتیان ڕەزامەنـدی خودایـە. هەموو دۆعاو بانگ کردنو داوایەکیان ئاڕاستەی زاتی بێچوون دەکەن، چونکە هـەر ئەو زاتە شیاوی پەرستنو بەندایـەتی بـۆ کـردنو هاوار لێ کردنـە!! نموونـەی ئـەم

ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا – الكهف/٢٨﴾.

سەیرە هەڵوێستی موشریکە ملهوڕەکانی قوڕەیش دەق لە هەڵوێستی گەلە ملهوڕەکەی حەزرەتی نووح دەچێ: کە دەرمبەگو بە ناو پیاوماقوڵو لووتبەرزەکانی قەومی نووح پێیان گوت: ﴿وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ – هود/٢٧﴾. حەزرەتی (نووح)یش پێیانی گوت: ﴿وَمَآ أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ، إِنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ وَلَكِنِّيَ أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ – هود/٢٩﴾.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شوێنکەوتوو هاوەڵە پێشینەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەکوو شوێنکەوتووەکانی پێغەمبەرانی پێش خۆی وان، زۆربەیان چینی هەژارو بێ دەسەڵاتو بۆرە پیاو بوون، دوژمنەکانیان دەرمبەگو پیاوماقوڵو ملهوڕو مشەخۆرو لوتبەرز بوون، بە چاوێکی سووكو بێ نرخ سەیری ئەوانەیان دەکرد کە دەست پێشخەر بوون بۆ ئیمان هێنان، هەمیشە گاڵتەیان پێ دەکردن، خۆیان بە هاوشانی ئەوان نەدەزانیو پێیان وابوو ڕەوایە بۆیان کە ئیمان نەهێنن، لەم ڕوانگەوە کە ئەوانەی بڕوایان هێناوە لەو جۆرە کەسانەن کە ناشێ ئەمان بچنە ریزیانەوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو پێشنیاری ئەوەشیان دەکرد کە پێغەمبەرەکانیان، ئەو کۆمەڵە هەژارە خاوەن باوەڕە لە خۆیان دوور بخەنەوە وەکوو چۆن کافرەکانی قوڕەیش هەمان پێشنیاریان خستە بەردەم پێغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ).

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ کە خۆی بەرپرسیارە بۆ پاداشت دانەوەی ئەو موسوڵمانانەو کەسی تر ئەو دەسەڵاتەی نییەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ پاش ئەوەی خودا بۆخۆی شایەدی بۆ دان کە ئەوان موخلیصو ڕاستاڵن، ڕەزامەندیی خودایان مەبەستە لە کردارو گوفتاریاندا، جا کە وەکوو

دەڵێن: ئاوابن، ئەوە ئەی پێغەمبەر! تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە کە ظاهیربین بیو لەم ڕووەوە هەڵسو کەوتیان لەگەڵدا بکەی، خۆ ئەگەر لە حەقیقەتو ناوەڕۆکدا وانەبن، بەم جۆرە موخلیصو ڕاستاڵ نەبن، ئەوە حیسابو لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە لەسەر خۆیانەو زیانی بۆ تۆ نیە ﴿وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ﴾ هەروەکوو چۆن تۆش حیسابی خۆت لەسەر خۆتە لە بیروباوەڕی خۆت بەرپرسیاری، ئەوان لە کاری تۆ بەرپرسیار نین، هەر کەسە بۆخۆی بەرپرسیارە لە کاری خۆی، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ – الطور/٢١﴾. یان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ – المدثر/٣٨﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – الأنعام/١٦٤، الاسراء/١٥، فاطر/٩٨، الزمر/٧﴾.

کەوابێ بۆچی ﴿فَتَطْرُدَهُمْ﴾ دەریان دەکەییو لە خۆتیان دوور دەخەیتەوە؟ وامەکە، ئەوە ئیشی تۆ نیە، چونکە دەرکردن سزادانە سزادانیش دوای حیسابو دادگایی کردن لەسەر خودایە لەسەر تۆ نیە، تۆ بەس ڕاگەیاندنت لەسەرە! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ لَسْتَ عَلَيْهِم بِمُسَيْطِرٍ – الغاشية/٢٢﴾. کەوابێ موسوڵمانو خاوەن باوەڕان کۆیلەی پێغەمبەران نین، کردارو گوفتارە ئایینیەکانیشیان بۆ خودی پێغەمبەرەکانیان نین، بەڵکوو بۆ زاتی پەروەردگارە، جا ئەگەر پێغەمبەر مافی ئەوەی نەبێ خۆ بەسەر خەڵکدا بسەپێنێو مافی حیساب لەگەڵ کردنو سزادانی ئەوانی نەبێ، ئەوە دیارە خەڵکەکەش مافی ئەوەیان لەسەر پێغەمبەرەکانیان نیە، جا ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر وێڕای ئەم ڕوون کردنەوەو زانینی ئەم ڕاستیانە ئەو موسوڵمانە هەژارانە دەربکەیو لە خۆتیان دوور بخەیتەوە ﴿فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ ئەوە تۆ بەو کارەت دەچیتە ڕیزی ستەمکاران، ئەو زۆردارانەی کە ستەمیان لە خۆیان کردووە، بەدبەختیو چارەڕەشی سەرەنجامیان بۆخۆیان هێناوە!

**بە کورتی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەم راستیانەی لێ وەردەگیرێن:**

١- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خاوەنی گەنجینەی خودا نیەو دەسەڵاتی گۆڕانکاری کردنی نیە لە بوونەوەردا.

٢- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) غەیب زان نیە، وەکوو باقی ئادەمیزادەکانی تر چ لە نهێنیەکان نازانێ مەگەر خودا بۆخۆی هەندێ جار لە برێ نهێنی تایبەتی ئاگاداری بکا.

٣- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە رەگەزی فریشتە نیە، بۆیە برە کاروبارێك هەیە لە جیهانی فریشتەدا کە لە ئادەمیزادان نهێنیە پێغەمبەرانیش ئاگایان لێی نیە.

٤- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە گوێرەی نیگاو سرووش کار دەکا، هیچ بڕیارێك بەبێ ڕێنمویی نیگا (وحی) دەرناکا.

٥- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەسەڵاتی حیساب لەگەڵ کردنی موسوڵمانانی نیە، هەروەکوو چۆن دەسەڵاتی سزاو پاداشتیشی نیە!

٦- ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) موژدەدانە بە بەهەشتو ترساندنە لە ئاگری دۆزەخ.

٧- پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە حوکمی ئەوەی کە ئادەمیزادە بە گوێرەی ئیجتیهادو لێکۆلینەوە بە خەیاڵیدا هات کە موسوڵمانە کۆیلەو هەژارەکان لە کۆڕو کۆمەڵی خۆی دوور بخاتەوە، بە هیوای ئەوەی سەرەك خێڵو پیاوماقوڵانی قورەیش موسوڵمان ببنو بە شوێن ئەوانیشدا دەستو پێوەندەکانیان بێنە ژێر ئاڵای ئیسلامو بەمەش کۆمەڵی موسوڵمانان زۆر دەبنو چ زیانێکیش بە هاوەڵانی ناگا! ئیتر کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خەیاڵێکی لەم جۆرەی بەدڵدا هات یەکسەر ئایەتی ﴿وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ...﴾ هاتە خوارەوەو پێغەمبەری لەم بیروبۆچوونە گێڕایەوە...

ئەمەش بەلگەیەکی ترە لەسەر ئەوە کە قورئان نێردراوی خودایە لەلایەن زاتی کردگاری بێباکەوە، بۆ حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نێردراوە، چونکە ناگونجێو عەقڵ ڕێ نادا، کە بگوترێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆخۆی ئەم خەیاڵەی کردو هەر بۆخۆشی نەهی لە خۆی کرد. ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە هەڵوێستو قسەو بیروڕای موشریکەکان دەربارەی موسوڵمانە هەژارو بێ نەوایەکان تاقیکردنەوەو لە بۆتەدانی خوداییە بۆ کافرە ملهوڕەکانو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ ئاواو هەر بەو جۆرە بڕێ ئادەمیزادمان کردووە بە تاقیگەو هۆی ئیمتیحان بۆ بڕێکی تریان، واتە: ئێمە بەگوێرەی دابو نەریتی خۆمان کە لە سروشتی ئادەمیزاددا دامان ناوە، هەندێکیان دەکەین بە هۆکارو بۆتەی تاقیکردنەوە بۆ ئەوەی حەقیقەتو جەوهەری بڕێکی تریان دەر بکەوێ! وەکوو چۆن زەرنگەر ئاڵتونو زیو دەخاتە بۆتەوەو لە ناو ئاگردا جۆشی دەدا تا حەقیقەتو جەوهەرەکەیان دەربکەوێ! بۆ ئەوەی لەسەرەنجامدا بە شێوەی پرسیارێکی ئینکار ئامێز ڕوو بکەنە یەکترو لەبەر خۆیانەوە بڵێن: ئایا ئەمانەن خودا لە ناو ئێمەدا هەڵیبژاردوونو نیعمەتی ئایینی پێ بەخشیوون؟ وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِّيَقُولُواْ﴾ بۆ ئەوەی لەسەرەنجامو ئاکام دا کافرە ملهوڕە موشریکەکان بڵێن: ﴿أَهَؤُلاء مَنَّ اللّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا؟﴾ ئایا ئەم هەژارو لاکەوتەو کۆیلەو بۆرە پیاوانەن کە خودا لە ناو ئێمەدا نیعمەتی ئیسلامی پێ بەخشیوون؟ چۆن ئەوانە شایەنی ئەو ڕێزەن کە خودا لێی ناون؟!

بەکورتی: کافرەکان دەیانگوت: ئەوە وا نابێو وانیە، ئەگەر ئەمە نیعمەتو بەخشیشی خودایی بێ ئەوە ئێمە لە پێشترینو شیاوترین، چونکە ئێمە خوداماڵو سامانو ڕێزو دەسەڵاتی داوینێ!! ئەگەر ئەم ئایەتە خێرو بێری تێدا بوایە دەدرا بە ئێمە نەك بەو هەژارو کۆیلانە.

وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَا إِلَيْهِ – الأحقاف/١١﴾.

ئیتر خودای مەزن ئەو بیرو بۆچوونەیانی رەت کردەوە کە لە ڕووی لوتبەرزیو خۆبەزلزانیەوە سەری هەڵداوەو فەرمووی: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾ واتە: ئایا پەروەردگار نازانێ کێ سوپاس گوزارەو شیاوی ئەوەیە کە نیعمەتی ئیمانی پێ ببەخشرێ، بەڵێ خودا لە هەموو کەس باشتر دەزانێ کێ شیاوی ئەو نیعمەتەیەو تۆفیقی دەدا بۆ ئیمان هێنانو موسوڵمانیەتی، هەروەها زاناو ئاگادارەو دەزانێ کێ سوورە لەسەر کوفرو بێدینی، ڕیسوای دەکاو تۆفیقو سەرکەوتنی لێ دەگرێتەوە...

## برێ دیاردەی رەحمەتی خودا

﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار نەهی لە پێغەمبەر کرد کە موسوڵمانە هەژارو کۆیلەکان لە خۆی دوور بخاتەوە، ئەوەی لێ یاساغ کرد کە بە هۆی هومێدی موسوڵمان بوونی گەورە گەورەکانی قورەیش موسوڵمانە هەژارەکان لە کۆڕو کۆمەڵی خۆی دوور بخاتەوە، ئەمجار فەرمانی پێ کرد کە ڕێز لە هەموو موسوڵمانان بگرێو سڵاویان لێ بکا کە هاتنە لای تەحییەو سڵاوی رەحمەتی خودایان پێ بگەیەنێ!

عیکرمه دەڵێ: ئەم ئایەتەی دوایی دەربارەی ئەوانە هاتۆتە خوارێ کە لە لایەن موشریکەکانەوە پێشنیاری ئەوە کرابوو کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دووریان بخاتەوە، جا لەوە دوا هەرکە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) چاوی پێ دەکەوتن دەست پێشخەری دەکردو سڵاوی لێ دەکردن‌و دەیفەرموو: (الحمد لله الذي جَعَلَ فِي أمَّتِي من أمَرَنِي أنْ أبْدَأَهُمْ بِالسَّلَامِ).

ماهانی حەنەفی دەڵێ: کۆمەڵێك خەڵك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) وتیان: ئێمە تاوانێکی گەورەمان ئەنجام داوە، وابزانم وەڵامی نەدانەوە، بە هیچ جۆرێك لەم بارەوە قسەی لەگەڵ نەکردن، جا کە رۆیشت ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا﴾ واتە: ئەگەر گەل‌و هۆزێکی موسوڵمان هاتنە لات، بڕوای تەواویان بە قورئان‌و بە نیشانەکانی خودایەتی ئێمە هەبوو، بە کردارو گوفتار دانیان بەو ڕاستیەدا دەنا، هاتنە لات پرسیاریان دەکرد لە تاوانێك کە ئەنجامیان داوەو هۆکارێکی بە هێز پاڵی پێوە ناون بۆ ئەو تاوانە، پرسیار دەکەن ئاخۆ ڕێگای تۆبەو پەشیمان بوونەوەیان هەیە یان نا؟ ئەوە تۆ نائومێدیان مەکە ﴿فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾ پێیان بڵێ: سەلام‌و ئەمان‌و دڵنیاییتان لەسەر بێ، دوای تۆبە کردن‌و پەشیمان بوونەوەتان لێخۆشبوونی خواتان بۆ هەیە، ئەمجار هۆکاری ئەم لێخۆشبوون‌و دڵنیا کردنەوەی دیاری کردو فەرمووی: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ پێیان ڕابگەیەنە کە خوای ئێوە لە ڕووی فەضل‌و چاکەو ئیحسانەوە رەحمەت‌و بەزەیی بە خەڵکی لەسەر زاتی پاکی باڵادەستی خۆی پێویست کردووە!

بێگومان لە دابین کردنی ئەسبابی ژیان بە هەموو جۆرەکانیەوە، لە فێرکردنی هەموو زانستە کەسبییەکان، کە بۆ ئادەمیزادی ڕەخساندوون‌و بۆی دابین کردوون، بەڵگەی ئاشکرا هەن لەسەر بەرفراوانی‌و زۆریی ڕەحمەت‌و بەزەیی خودا بۆ بەندەکانی‌و بەخێوکردنیان لە ژیانی جەستەیی‌و گیانیدا!!

ئـەمجار بنـەماو یاسـایەکی ئـایینی دەربـارەی ڕەحمـەتو بـەزەیی خـوێ بـۆ موسوڵمانان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَنَّهُ مَـن عَمِـلَ مِـنكُمْ سُـوءًا بِجَهَالَـةٍ﴾ بڕیـاری خودا وایە: هەرکەسێك لە ئێوە کردەوەیەکی زیان ئامێزی ئەنجامدا، شتێکی کرد کە سەرەنجامی زیانبـەخش بـوو، نـەزانی پـاڵی پێـوە نـابوو بـۆ کردنـی ئـەو تاوانـە، ڕق هەڵسانو تـووڕەیی پێـی کردبـوو، یـان هـەوەس‌و ئـارەزووی لـە ڕادەبـەدەر تینـی بـۆ هێنابوو، وای لێ هاتبوو هەتکی نامووس بکاو سنووری ئایین ببەزێنێ ﴿ثُمَّ تَابَ مِـن بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ﴾ پاشان کە هەستی بە خۆی کرد تاوانی ئەنجام داوە پەشیمان بووەوەو تۆبەی کردو کردارو گوفتاری خۆی ڕاستاڵ کردن‌و پاشمـاوەی ئـەو تاوانـەی لـە دڵـی خۆی دەرهاویشت‌و، دڵ‌و دەروونی خۆی مـشت‌و مـاڵ کـردو، لـە چڵکی تـاوان پـاك‌و خاوێنی کردەوە، وای لێ کرد بشێ لە خودا نزیك ببێتەوە، سیما موسـوڵمان‌و رەفتـار چاك‌و گوفتار باش‌و دڵ پڕ لە ئیمـان بـوو، ئـەو کاتـە هەڵوێـستی خـودا بەرامبـەری هەڵوێـستێکی میهرەبانانـە دەبـێ، ﴿فَأَنَّـهُ غَفُـورٌ رَّحِـيمٌ﴾ پـەروەردگار لێخۆشـبوو بـە بەزییـە، بـەم دوو صـیفەتە کـە لێخۆشـبوونی بـەرفراوان‌و ڕەحـم‌و بـەزەیی بـێ ئەندازەیـە، مامەڵـەی لەگـەڵ دەکا، لـەو تاوانانـەی خـۆش دەبـێ کـە تۆبـەی ڕاسـت‌و دروستی لێ کردوون، بە ڕەحمەت‌و بەزەیی خۆی دایدەپۆشێ‌و چاکەی لەگەڵ دەکا. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَـا التَّوْبَـةُ عَلَـى اللَّـهِ لِلَّـذِينَ يَعْمَلُـونَ الـسُّوَءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ – النساء/١٧﴾.

مەرجە دەبێ تاوانبار زوو تۆبە لە تاوانەکەی بکاو درێـژە بـە تـاوان‌و سەرپێـچی نەدا، چونکە کە تاوان لەسەری بەردەوام بووی‌و درێژەی پـێ درا، دڵ‌و دەروون ڕەش دەکاو بەزەحمەت دوایی جڵەوی نەفس‌و شـەیتان دەگیرێتـەوە، تـاوان لێـی دەبـێ بـە خوو شتی سروشتی، بەرهەڵستکاری شتی سروشـتیش کـارێکی نەسـتەمەو زەحمـەت ئەنجام دەدرێ!!

**پوختەی مەرجەکانی تۆبەی ڕاستەقینە چوار شتن:**

١- پەشیمان بوونەوەی بنەڕەتی‌و حەقیقی لە گوناه.

٢- بڕیاردانو سوور بوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆ ئەو گوناهە لە داهاتوودا.

٣- گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە بە ستەمکاریی لە خەڵکی زەوت کردووە، یان گەردن ئازادییان لێ بەدەست بێنێ، واتە، دەبێ مافی ئادەمیزادان بگێڕێتەوە بۆیان.

٤- بە شوێن تۆبەکردنەکەدا کردارو گوفتاری باش بکا.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ کە حەقائیقی بۆ موسوڵمانان شی کردۆتەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێبازی تاوانباران دوور بکەونەوەو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نفَصِّلُ الآيَاتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئاوا هەر بەو جۆرە شی کردنەوەو ڕوونکردنەوانە ئەنجامەمان دا بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر تاكو تەنیایی پەروەردگارو ڕاستی پێغەمبەرایەتیو قەزاو قەدەرو ڕۆژی دواییو زیندوبوونەوە؛ ئایەتەکانی قورئان درێژە پێ دەدەمینو ڕوونیان دەکەینەوەو حەقیقەتی شەریعەتو یاسا ڕوون دەکەینەوە، هەموو حەقو ڕاستییەك دەچەسپێنین کە گرۆهی بەتاڵخواز پێیان ناخۆشە، بۆ ئەوەی پێناسەی ڕێبازی تاوانباران بکەینو بۆ موسوڵمانانی ڕوون بکەینەوە، جا کەڕێبازو نیشانەی تاوانبارانمان دەستنیشان کرد، ئەو کاتە هەرشتێك لەو جۆرانە نەبوو، ئەوە ڕێبازی موسوڵمانانە، ئەمە لەو جۆرە پێناسانەیە: کە بە دژی خۆی دەناسرێ وەکوو لە عەرەبیدا دەڵێن: (والأشياء تعرف بأضدادها).

## بڕینەوەی کێشەی نێوان پێغەمبەرو موشریکەکان

﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ۚ قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبْتُم بِهِ ۚ مَا عِندِي

مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾.

لە ئايەتەكانى پێشوودا پەروەردگار ئەوەى ڕاگەياند كە ڕێبازەكان ڕوون دەكاتەوە، پێناسەى ڕێبازى تاوانباران دەكا، حەقيقەتى شتەكان بۆ مەردوومان دەست نيشان دەكا، بۆ ئەوەى ڕێبازى تاوانباران دەربكەوێو بزاندرێ... ئەمجار لەم ئايەتەى دوويدا نەهى لە پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) دەكا كە پەيڕەوى ڕێبازى تاوانباران بكاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ئەى پێغەمبەر! بەو موشريكە خوانەناسانە بڵێ: من نەهيم لێ كراوە هەرشەم لێ كراوە ئەو خودا درۆزنانەى كە ئێوە لە جياتى خودا دەيانپەرستن بيانپەرستم؛ لێم ياساغو قەدەغەيە كە هانا ببمە بەر ئەو بتو صەنامانەى ئێوە هاواريان دەكەنێو هيواى هێنانى خێرو بەرپەرچدانەوەى شەڕيان لێ دەكەن! پێم گوتراوە: كە جگە لە خوداى مەزن بتو صەنەم يان بەندەو فريشتە نەپەرستمو هاواريان نەكەمێو لێيان نەپاڕێمەوە، بێگومان هەموو ئەوانە پاشگوێ دەخەمو پێم پيرۆز نينو بە خودايان نازانم لەمەشدا پشتم بە بەڵگەى حيسى هەستيارەكانو ئايەتەكانى قورئان بەستووە، كە هەموويان داكۆكى لەوە دەكەنو ئەوە دەچەسپێنن كە نابێ جگە لە خودا كەسى تر بە خودا بزانين، جگە لە خودا كەسى تر نەپەرستين ﴿قُل لاَّ أَتَّبِعُ أَهْوَاءكُمْ﴾ ئەى محمد! پێيان بڵێ: من شوێن هەواو ئارەزووى ئێوە ناكەوم ڕێبازى ئارەزووبازى ئێوە ناگرمە بەر، بەبێ بەڵگە شوێن

هیچ کەسێ ناکەوم، ئەگەر شوێن هەواو هەوەسی ئێوە بکەوم ﴿قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا﴾ ئەوکاتە من سەرلێ شێواو گومڕام ﴿وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾ من لە گرۆهی حەقخوازو هەقپەرستو شارەزا بە ئایینی ڕاست نیم، هیچ بەشێکم لە هەقو ڕاستو شارەزا بە ئایین نیە.

ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە کافرەکان هیچ هیدایەتێکیان نیە، بێگومان بەندایەتی کردن بۆ غەیری خودای مەزن گومڕاییو سەرلێ تێکچوونە، ئادەمیزادی ژیرو هۆشمەن قیزی لێ دەکاتەوەو لێی دوورە پەرێز دەوەستێ، خوداپەرستنو بەندایەتی کردن بۆ زاتی کردگار نیشانەی هۆشمەندیو ژیرییە، بەڵگەو بوڕهان دەیسەلمێنێ، بیرو مەنطیقی صەحیح پەسەندی دەکا...

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە بە کافرەکان بڵێ: من لە خوداوە شارەزایی کراوم، ئەو ڕێبازەی من شوێنی کەوتووم ڕێبازی حەقو خواپەسەندە ﴿قُلْ إِنِّي عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو کافرو موشریکانە بڵێ: من کە بیروباوەڕم پێچەوانەی ئێوەیەو بە پێچەوانەی ئێوە دەجوڵێمەوە، من لە خوداوە شارەزایی کراوم بۆ ڕێبازی ڕاست، بە نیگاو سرووش بۆم دەستنیشان کراوە، بە عەقڵو هۆش پەیم پێ بردووە، بەڵگەو دەلیلی عەقلی، نیشانەو بەڵگەی هەست ئامێز، وێڕای قورئان کە پڕە لە بەڵگەی زۆرو هەمەجۆری عەقلیو کەونی – تەنانەت پێغەمبەریش وەکوو خەڵکی تر ناتوانێ وێنەی بهێنێ – ئەو قورئانەی کە بەبەڵگەو بەبینەی چەسپاو پشتگیری لێ دەکرێو لە هەموو بوارێکی پێویست بۆ دینو دونیا دواوە؛ کەچی لە باتی ئەوەی بیکەنە بەرنامەی ژیانی خۆتانو پەیڕەوی فەرمانو نەهییەکانی بکەن ﴿وَكَذَّبْتُم بِهِ﴾ ئێوە ئەو قورئانەی کە بەڵگەی بەهێزی منەو لە خوداوە بۆم هاتووە، بە درۆی دەخەنەوە، جارێک یەژن سیحرو جادوبازییە، دەمێك دەڵێن: سەرگوزشتەی پێشینانە، هاوبەش بۆ خودا دادەنێنو یەکتاپەرستی ناکەن، سەرباری ئەوەش تەماعی ئەوەم لێ دەکەن کە من لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەو ڕاستیانەی کە هەمن شوێن ئێوەی گومڕاو سەر لێ شێواو بکەوم، کە

هیچ بەلگەو دەلیلتان بەدەستەوە نیە، جگە لە لاسایی کردنەوەی باب‌و باپیرانتان، لاسایی کردنەوەش بە بەلگە حلێب نیە، بەلکوو رازی بوونە بە نەزانی‌و نەفامی باب‌و باپیران!!

کافرەکان سەرباری ئەوەی کە ئیمانیان بە پێغەمبەر نەهێنا گاڵتەشیان پێ کردو دڵیان ئازار دەدا، جۆرەها لەمپەرو شوورەیان دروست دەکردن لەبەردەم بلاوبوونەوەی ئیسلام، تەحەدداى پێغەمبەریشیان دەکردو دەیانگوت: دە ئەگەر ڕاست دەکەی ئیمان نەهێنانی ئێمە دەبێتە هۆی هاتنی عەزاب، گەلە پێشینەکانیش کە ئیمانیان نەهێناوە، خودا بە عەزاب لە ناوی بردوون!؟ دەی وا ئێمە ئیمانت پێ ناهێنن با عەزابەکە بێ، ئیتر پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکاو کە پێیان بڵێ: ﴿مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ﴾ ئەو سزایەی کە پەلەم لێ دەکەن بۆتان بێ، بەدەست من نیە، هێنانی لە دەسەلاتی مندا نیە ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ﴾ بڕیاری ئەوە بەدەست پەروەردگارە، ئەگەر بیەوێ زوو ئەو عەزابەتان بۆ دەنێرێ‌و بە قوتارتان نادا؛ ئەگەریش بیەوێ سزاکە دوادەخا بۆ ماوەیەکی تر لەبەر حیکمەت‌و نهێنیەك کە خۆی دەیزانێ‌و من ئاگام لێی نیە، چونکە پەروەردگار هیچ کارێکی بێ حیکمەت نیەو کاری بێ جێ ناکا وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ – الرعد/٨﴾ هەموو شتێك لەلای ئەو بە ئەندازەو دیاری کراوە!!

﴿يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ پەروەردگار چیرۆك‌و سەرگوزشتەی حەق‌و ڕاست بۆ پێغەمبەرەکەی دەگێڕێتەوە، هەموو وادەو بەڵێن‌و هەڕەشەی ڕاست‌و بەجێیە، زاتی پاکی ئەو چاکترین دادوەرە بەوپەڕی ڕێك‌و پێکی‌و دادپەروەرییەوە دادگایی نێوان بەندەکانی دەکا، حوکمی ڕەوایە، هەرکاتێ ویستی چۆنی بوێ ئاوا ویستی خۆی دێنێتە دی‌و کەس نیە ببێتە لەمپەر!!

وەکوو گوتمان: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گەل‌و نەتەوەکەی خۆی بەوە ترساند کە ئەگەر ئیمان نەهێنن، لەسەر شیرك بەردەوام بن، خودا عەزابیان بەسەردا دەبارێنێ، بەسزای کوشندە لەناویان دەبا، گەلەکەشی پێکێشی ئەوەیان لێ

دەکرد کە بە زوویی عەزابیان بۆ بێ، وەکوو لە شوێنێکی تردا لەسەر زوبانی ئەوان؛ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ – الأنفال/٣٢﴾.

پەروەردگار رێنموویی پێغەمبەرەکەی دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەگەر من دەسەڵاتی هێنانی ئەو عەزابەم هەبوایە لە مێژبوو بۆم دەهێنانو تۆڵەم لێ دەستاندنو کێشەی نێوانی خۆمو ئێوەم دەبڕیەوە کۆتاییم پێ دەهێناو لەو کێشەیە رزگارم دەبوو، بەڵام ئەوە دەسەڵاتی منی تێدا نیەو لەو بارەوە هیچم بەدەست نیە، بڕیاری ئەوە لای خودایە، ﴿وَاللّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ﴾ خودا بۆخۆی لە هەموو کەس زاناترە بە ستەمکارانو دەزانێ کێ سەرپێچیکارو دڵ رەقو ستەمکارو ملهوڕە، دەزانێ کێ بە تەواوی گومڕا بووەو تازە هیوای ئەوەی لێ ناکرێ بگەڕێتەوە بۆ ئیمانو موسوڵمان ببێ، جا کە ئەو کارە بەدەست من نەبێ بەدەست خودا بێ، هەڵبەتە خودا بۆخۆی دەزانێو دەتوانێ چۆن سزایان دەداو بە چ شێوەیەك تۆڵەی ئەم ملهوڕیەیان لێ دەستێنێ، دیارە هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە، هەرکاتێ وەختی هات ئیتر بە چرکە قوتاریان ناداو بە بست بەسەریانەوە ناچێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ – الأعراف/٣٤﴾.

کاتی سزادانی ستەمکارانو چۆنیەتی ئەم سزادانە هەر خوا دەزانێو هەر بە دەستی ئەویشە، دوای دەخا بۆ کاتی خۆیو بە گوێرەی ویستی خۆشی ئەندازەی دیاری دەکا، ئەمانەو کارەکانی تریش هەموویان بە گوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی ئەنجامیان دەدا، ئەوەی کە دواخستنی، بەرژەوەندی تێدا بێ دوای دەخا، ئەو کارەی پەلەکردنی بەرژەوەندی تێدا بێ پەلەی لێ دەکا. لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدا ئەویش ئەوەیە دەگوترێ: بە چ شێوەیەك دەتواندرێ دژایەتی مانای ئایەتی ﴿قُل لَّوْ

أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لە وڵامی فریشتەکاندا فەرمووی: «بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا». وەڵامەکەی بەم جۆرە دەبێ: ئەم ئایەتە، کاتێ هاتە خوارێ کە ئەوان بە تەحەدداوە داوای هاتنی سزایان دەکرد، ئاماژەی ئەوەی تێدایە ئەگەر هاتنی سزاکە بەدەست پێغەمبەر بووایە، لەوانە بوو لە بەرامبەر ئەو هەموو تەحەدداو زەخت لێ کردنەدا بڕیاری سزادانەکەیانی بدایەو کۆتایی بە کێشەکە بهێنایە!

بەڵام حەدیثەکەی پێغەمبەر کە عائیشە ڕیوایەتی دەکا ئەوەی تێدا نیە کە کافرەکان داوای هاتنەخوارەوەی سزایان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کردبێ، بەڵکوو فریشتەی تایبەت ئەوەی بۆ پێغەمبەر پێشنیار کرد کە بیەوێ‌و ڕێگا بدا هەردوو کێوی دەرەوەی مەککە کە بە (الأخشبين) ناودەبرێن بەسەریان دابدرێ‌و هەموو کافرە خوانەناسەکان لە ناو ببرێن، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕەحم‌و بەزەیی نواندو هیوای خواست کە بۆ خۆشیان باش نەبن نەوەکانیان باش بن.

**چیرۆکی ئەم ڕووداوەش وەکوو لە موسلیم‌و بوخاری لە صەحیحەکەیاندا لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازیی بێت) گێڕاویانەتەوە بەم جۆرەیە:**

ڕۆژێك عائیشە عەرزی پێغەمبەری کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لە ڕۆژی ئوحوود تەنگانەترت هاتۆتە پێش؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ ناخۆشتر لەو ڕۆژەم تووش هاتووە، لەگەڵەکەی تۆوە ناخۆشتر لە ڕۆژی ئوحوود کە لە قوڕەیشییەکانەوە تووشم هاتبێ ڕۆژی (العقبة)یە کە بانگەوازیی ئیسلامم ئاراستەی بەرەی کوڕانی عەبد یالیل کوڕی عەبد کەلال کرد، بەڵام هیچ گوێڕایەڵێکیان نەنواندو بەو جۆرەی مەبەستم بوو وەڵامیان نەدامەوە، منیش بە غەمناکی ڕێگام گرتە بەر، کاتێکم زانی لای (قرن الثعالب)م کە سەرم

بەرز کردەوە ڕوانیم هەورێك سێبەری لێم کردووە، جوبرائیلی تێدایە، بانگی لێ کردم وتی: خوا قسەو باسی گەلەکەت کە دەربارەی تۆ کردیان بیستی، ڕەتکردنەوەکەیانی بینی، ئەوە فریشتەی تایبەت بە کێوەکانی بۆ لا ناردووی بۆ ئەوەی چیت دەوێ فەرمانی پێ بکەی ژێرەو زەبەریان بکا، ئیمجا فەرمووی ئیتر فریشتەی تایبەت بە کێوەکان، بانگی لێ کردمو سەلامی لێ کردمو وتی: ئەی محمد! پەروەردگار قسەی قەومەکەتی بیست، خودا منی بۆلای تۆ ناردووە بۆ ئەوەی چیم پێ بڵێی لێیان بکەم، ئەگەر دەتەوێ (الأخشبین)یان بەسەردا دەدەم، ئیتر پێغەمبەر فەرمووی: «بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا».

## زانینی پەروەردگار تەواوو رەهایە، ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەیە بۆ قارگرتن لە بەندەکانی

﴿ ۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۖ

وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ ﴾.

ئایەتەکانی لەمەودواش پەیوەندیان بە ئایەتەکانی پێشووەوە هەیە، چونکە پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿وَاللّـهُ أَعْلَـمُ بِالظّـالِمِينَ﴾ لەمەودواش فراوانی زانستی خودا ڕادەگەیەنێ، کە زانینی هەموو شتێکە لە هەموو شوێنێکو فەرمووی: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ﴾ گەنجینەی هەموو نهێنیەکان لای خودایە، هەر ئەو دەتوانێ گۆڕانکاریان تێدا بکا، هەروەها کلیلو ئامێرو هۆکاری گەیشتن بە گەنجو خەزێنەکانی لای خۆیەتیو جگە لە زاتی بێچوونی کەسی تر ڕایەی ناکەوێ ئاگاداری بەسەر ئەو نهێنیانەدا پەیدا بکا، هەر ئەو بە تەواوی زانستی هەیە دەربارەی غەیبو جگە لە زاتی پاکی ئەو هیچ کەسی تر ئاگاداریەکی لەو غەیبە نیە مەگەر خودا بۆخۆی بەسەر هەندێ نهێنیدا ئاگاداری بکا، کەواتە پێویستە جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی بۆ پێغەمبەرانو هەڕەشەو ترساندنی دوژمنەکانیان بە عەزابو قار لێ گرتن حەواڵەی زاتی بێچوونی بکەینو بڕوای تەواویشمان هەبێ کە پەروەردگار خیلاف وادە دەرناچێو چی بەڵێنی بە پێغەمبەرەکانی دابێ دەیانهێنێتە جێ، بەڵام کە جێبەجێ کردنەکە دوادەکەوێ ئەوە لەبەر حیکمەتێکی یەزدانییە!

ئیمامی بوخاری فەرموودەیەك لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکیەوە ڕیوایەت دەکا[1] دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: کلیلی غەیب

---

[1]- هەر بوخاری لە ڕێگەیەکی ترەوە هەمان حەدیثی ڕیوایەت کردووە، ئەوەتا جارێکی تر لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ئەم حەدیثەی ڕیوایەت کردووە.

پێنجن. کە لەم ئایەتەدا ئاماژەیان بۆ کراوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ، وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ – لقمان/٣٤﴾.

لە صەحیحی موسلیمدا لە عائیشەوە حەدیثێك ڕیوایەت دەكا، دەفەرموێ: كەسێك پێی وابێ پێغەمبەری خودا هەواڵی سبەینێ دەزانێ، دەتوانێ بڵێ سبەینێ فلان شت دەبێ ئەوە بێگومان بوختانی لەسەر خودا كردووە، چونكە خودا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ – النمل/٦٥﴾. یان دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا، إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ – الجن/٢٦ – ٢٧﴾.

پەروەردگار هیچ شتێكی غەیبی لێ هوون نیە، قسەو باسی ناو دڵ دەزانێ، نهێنی ناو دەروون دەزانێ، بەڵكوو ئاگادارە بەسەر نهێنی تریش لەوە. وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ، وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ – النمل/٧٤ – ٧٥﴾. یا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ – غافر/١٩﴾.

ڕستەی ﴿لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ﴾ی لە ئایەتەكەدا دووبارە كردۆتەوەو مەبەست جەخت كردنەوەی ڕستەی پێشووە. واتە: جوملەیەكی تەئكیدیە.

ئەمجار دەست دەكا بە شیكردنەوەو درێژەپێدانو دەست نیشان كردنی ئەو مانا موجمەلەی كە لە ئایەتەكەدا ئاماژەی بۆ كراوە، برێ لەو زانستییە نهێنیانە دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە بە هەرچی شتێ كە لە وشكانیو دەریادا هەیە، چەند نهێنی بێ چەند وردو پەنامەكی بێ خودا ئاگای لێیە، هیچی لێ نادیار نیە، تەنانەت گەردیلەیەكیش بێ چ لە زەویو چ لە ئاسماندا بێ خودا پێی دەزانێ، واتە: وەكوو چۆن شتە نهێنیەكان دەزانێ ئەو شتانەش كە ئێوە بە چاو دەیان بینن لێیان ئاگادارە، بەڵام زانینو بینینی ئێوە بۆ

شتە بینراوەكان زانیننێكی سەر سەرەكییە، زانینو بینینی خودا بنەڕەتیو گشتیو حەقیقیە ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا﴾ لە هەر شوێنێكو لە هەر كاتێكدا پەڵكە گەڵایەك لە دارێك هەڵوەرێ خودا پێی دەزانێ ئاگای لێیەتی، تەنانەت ئاگای لە جوڵانو لەرینەوەی هەموو لاشەو قەبارەیەكە، بەرد بێ یان دار بێ، بێ گیان بێ یان گیاندار بێ، بەڵكوو بۆ گیانداران زیاتر ئاگادارو چاودێری هەیە بە تایبەتی بۆ ئەوانەی كە موكەلەفو بەرپرسیارن لە ئەجنەدەوەو لە ئادەمیزاد هەموو حاڵو چۆنیەتیەكی پەیوەند پێیانەوە بەوپەڕی زانینەوە دەزانێ.

﴿وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ ئەگەر دانەوێڵەیەك، دەنكە میوەیەك، بەرە دارێك، بكەوێتە ناو كونی درزی زەوییەوە، كشتیار ژێر خاكی بكا، یان بۆخۆی بكەوێتە خوارێ؛ خودا ئاگای لێیەتیو پێی دەزانێو لێی بێ ئاگا نیە، وشك بێ یان تەڕ بێ، گیاندار بێ یان بێ گیان بێ، بچووك بێ یان گەورە بێ، بە نیسبەت زانیاری خوداوە چوون یەكەو یەكسانە! هەر بەو جۆرە زانیاری تەواوی هەیە دەربارەی هەموو بوونەوەر، هەموو ئەو زانستو زانیاریانەی كە هەیەتی بەردەوامو گشتیو نەگۆڕە، هەموو لەپەڕاوی یەزدانییدا كە لەوحولمەحفوظە چەسپاوەو دەست نیشان كراوە؛ ئەو لەوحولمەحفوظەی زانیاری دەربارەی هەموو شتێك تێدا ڕوون كراوەتەوە، تەمەنو كاتو شوێنو حاڵو چۆنیەتی هەموو شتێكی تێدا شی كراوەتەوە.

بۆ بە لەوحولمەحفوظ دەگوترێ (مبین)؟ چونكە پێش ئەوەی پەروەردگار بوونەوەر دروست بكا ڕاستی ئەو شتانەی تێدا چەسپاونو ڕوونیان دەكاتەوە، چی دەبێو نابێ لە ڕووداو كارەساتو هەر لە سەرەتای بوونەوەرەوە تا كۆتایی هەمووی تێدا تۆمار كراون وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا – الحديد/٢٢﴾.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: مەبەست بە (كتاب مبین) زانیاری خودایە نەك لەوحەلمەحفوظ.

بەکورتیو پوختی پەروەردگار نهێنیو ئاشکرا دەزانێ، شتی بەرچاوو پەنامەکی دەبینێ، ئاگای لە تەڕو وشکە، نهێنیو نهێنی تریش دەزانێ، ئاگاداری هەموو شتێکە لە بوونەوەردا (کلیات بێ یان جزئیات) بێ، عەرەضو رەنگ بێ، یان ئەصلو ناوەڕۆکو جەوهەر بێ.

ئەمجار پەروەردگار بڕێ دیاردەی تواناو دەسەڵاتی فراوانی خۆی ڕادەنوێنێ هەندێ شێوەی کاریگەر خۆی لە بوونەوەردا دەست نیشان دەکا، ئەو قۆناغانەی ئادەمیزادی پێدا تێدەپەڕێ، چۆنیەتی بەسەر بردنی ژیانو مردنو زیندوبوونەوەو حیساب لەگەڵ کردنی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ﴾ واتە: پەروەردگار خودایەکی وەهایە، لە شەودا گیانی بەندەکانی وەردەگرێتەوە لەکاتی نوستندا ئادەمیزاد وەکوو نیمچە مردوویەکی لێ دێو هەستو خوستی لێ دەبڕێ، ئەمە پێی دەگوترێ مردنە بچکۆڵە، نیمچە مردن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا، وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ، وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ – الزمر/٤٢﴾.

قورئان لەهەردوو ئایەتەکەدا باسی هەردوو جۆری مردنەکەی کردووە؛ مردنی بچکۆلەو مردنی گەوورە.

﴿وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ﴾ خودا ئاگادارەو دەزانێ بە ڕۆژ چی دەکەنو چی دەڵێن: ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی تێخزێنراوەو ئەوە دەگەیەنێ کە زانستی خودا هەموو شتێك دەگرێتەوەو هیچ هەڵسو کەوتێکی مەخلوقاتی خۆی بەشەو بە ڕۆژ لێ هون نابێو ئاگای لە هەموو کردارو گوفتارێکیانە، هەموو جوڵانەوەو ئارام گرتنێکیان دەزانێ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ – الرعد/١٠﴾.

دوای ئەنجامدانی مردنی بچکۆڵە بەسەرتاندا، وێڕای هەبوونی زانیاری تەواو ڕاستو دروست دەربارەی هەموو کارو گوفتارێکی ڕۆژانەتان ﴿ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ﴾ پاشان بە ئاگاتان دێنێتەوە لە ڕۆژدا بۆ ئەوەی کاروباری ڕۆژانەی خۆتان ئەنجام بدەن، ئەم هاتوو چوو نوستنو بە ئاگاهێنانەوەو هەوڵدانو تێکۆشانەشتان بە ڕۆژو بەشەو ﴿لِيُقْضَى أَجَلٌ مُسَمًّى﴾ بۆ ئەوەیە کە ماوەی دیاری کراوی تەمەنتان بەسەر بەرن، هەرکەسە ماوەی ژیانی دونیایی خۆی تەواو بکاو ڕۆڵی خۆی ببینێ، چونکە تەمەنو ئەجەلو کاتی مردنو شوێنی، لە زانیاری خودادا لەوە پێش دیاری کراوونو براوەتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمجار گەڕانەوەتان بۆلای خودایە، هەرکە کاتی خۆی هات زیندووتان دەکاتەوەو چیتان کردووە، بیرتان دێنێتەوەو دەیخاتەوە بەردەمتانو بە گوێرەی کردارو گوفتارتان سزاو پاداشتتان دەداتەوە، خراپە بە خراپە، چاکە بە چاکە. زۆر عادیلانە حیسابو لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدا ئەنجام دەدا، کەس نیە دەست بەردەستی بێنێو بتوانێ ببێتە لەمپەڕو نەهێڵێ دادگایی خۆی ئەنجام بدا، تەنانەت بەبێ ئیزنو ڕەزامەندی ئەو، کەسێك نیە بتوانێت شەفاعەت بکا ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾ پەروەردگار بەسەر بەندەکانیدا باڵادەستە، هەموو شتێك گەردنکەچو دەستەوسانە لە ئاست جەلالو گەورەیی خودا، هەر ئەو دەتوانێ پاش مردن مردووەکان زیندو بکاتەوە، چونکە کەسێك بتوانێ زیندوان بنوێنێو دوایی بە ئاگایان بێنێتەوە دەشتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە، یەزدان هەڵسوڕێنەرو کارگێڕی بەندەکانیەتی، چۆنی بوێو چی بوێ لێیان دەکا، دەیانخوڵقێنێ، دەیانژێنێو دەیانمرێنێ!

﴿وَيُرْسِلُ عَلَيْكُم حَفَظَةً﴾ خودا فریشتەی پارێزگار دەنێرێ بۆ پاراستنی جەستەی ئادەمیزاد، شەوو ڕۆژ پارێزگاری دەکەن، کردارو گوفتاری تۆمار دەکەن، هیچ شتێکیان لە بیر ناچێو هیچ شتێك پاشگوێ ناخەن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَامًا كَاتِبِينَ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ – الإنفطار/ ١٠

- ١٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ - ق/ ١٧ - ١٨﴾. یان دەفەرموێ: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ - الرعد/١١﴾.

ئیمامی بوخاریو موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە حەدیسێکیان ڕیوایەت کردووە - بەمەرفوعی - دەفەرموێ: فریشتەکان ئاڵو گۆڕی خۆیان لە ناو ئێوەدا ئەنجام دەدەن، واتە: لەکاتی نوێژی بەیانیو نوێژی عەصردا هەردوو تاقمەکە لاتان کۆدەبنەوە، ئەمجا ئەوانەی کە شەو لاتان بوون بەرز دەبنەوەو بۆلای خودای مەزن، پەروەردگار - هەرچەندە بۆخۆی زۆر لە ئەوان باشتر ئاگای لە ئێومیە - پرسیاریان لێ دەکا دەربارەی ئێوە، دەفەرموێ: لە چ شێوەو حاڵێکدا بەندەکانی منتان بەجێ هێشتن؟ ئەوانیش دەڵێن: کە بەجێمان هێشتن لە نوێژدا بوون، کە چووین بۆلایان لە نوێژدا بوون.

حیکمەتو مەبەست لە تۆمار کردنی کردەوەی ئادەمیزاد لەلایەن فریشتەی تایبەت - لە کاتێکدا کە خودا بۆخۆی زۆر باش ئاگادارە - هێنانی بەڵگەی ماددی حاشا هەڵنەگرە بۆ بۆڕدانی ئادەمیزاد، هەروەها ئادەمیزاد کە بزانێ هەرچی دەیکا خێرا فریشتەیەك لایەتیو کردەوەکانی تۆمار دەکا، لە سەرپێچی کردنو ئەنجامدانی تاوان خۆ دەگرێتەوەو ڕوو دەکات کاری باشو گوفتاری چاك. قورئانی پیرۆز لە شوێنێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا - الكهف/٤٩﴾.

پەروەردگار فریشتەی چاودێرو پارێزگار دەنێرێ بۆ سەر ئێوە بۆ تۆمار کردنی کردەوەکانتان ﴿حَتَّىَ إِذَا جَاء أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا﴾ تا کاتێك تەمەنی ژیانی دونیاتان تەواو دەبێتو کاتی مردنتان دێو مەرگ دەبێتە میوانی یەکێك لە ئێوە، ئەو کاتە فریشتەی نێردراوو ڕاسپێراوی ئێمە گیانەکە وەردەگرێتەوە ﴿وَهُمْ لاَ

يُفَرِّطُونَ﴾ وەلحالْ ئەو فریشتە چاودێرو ڕاسپێراوانە کە گیانەکە وەردەگرن کەمتەرخەمی ناکەنو زۆر بەباشیو لێهاتوویی گیانەکە لە خۆیان دەگرنو پەروەردگار چ شوێنێکیان بۆ دەست نیشان دەکا لەوێ دایدەنێن، ئەگەر لە کۆمەڵی چاکان بێ دەیخەنە بەهەشتەوە، ئەگەر لە کۆمەڵی گومڕایان بێ – پەنا بە خوا – دیخەنە دۆزەخەوە.

ئەو فریشتانەی هەڵدەستن بە گیان کێشان یارمەتیدەرو دەستو پێوەندی فریشتەی تایبەت بە گیان کێشانن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ – السجدة/١١﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: فریشتەی تایبەت بە گیان کێشان (مَّلَكُ الْمَوْتِ) یارمەتتیدەرو دەستو پێوەندی هەن، گیان لە لاشە دەردەهێنن، کە گەیشتە گەرو، ئەمجار فریشتەی تایبەت (مَّلَكُ الْمَوْتِ) وەری دەگرێ.

﴿ثُمَّ رُدُّواْ إِلَى اللّهِ مَوْلاَهُمُ الْحَقِّ﴾ پاشان ئەوانەی کە فریشتە گیانیان دەکێشن دەسپێردرێنەوە بە خوداو حەواڵەی دادگایی کردنو حیساب لەگەڵ کردنی خودا دەکرێنەوە! دەبرێنەوە بەر قاپی خودا کە خاوەنی راستتەقینەیانەو هەموو کاروبارێکیان بەدەست ئەوە. ئەو خودایەی کە بە حەقو دادپەروەری نەبی حوکم ناکا، هەرگیز ستەمی لێ چاوەڕان ناکرێ ﴿أَلاَ لَهُ الْحُكْمُ﴾ ئاگادار ببنەوەو بزانن کە دادگایی کردنو بڕیار دەرکردن، هەر بەدەست ئەوەو کەسی تر ڕایەی ناکەوێ دادگایی بکا، بڕیاری جێبەجێ دەکرێو کەس نیە حوکمو فەرمانی هەڵوەشێنێتەوە یان ڕای بگرێو نەهێڵێ تەنفیذ بکرێ ﴿وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ﴾ خودا خێراترین دادوەرو سەریع ترین حیساب گەرە، لە کورت ترین ماوەدا لێکۆلینەوەی بەندەکانی ئەنجام دەدا، حیسابو لێکۆلینەوە لەگەڵ یەکێك، لە حیسابو لێکۆلینەوەی یەکێکی تر بێ ئاگا ناکا.

له قورئـان پـيرۆزدا لەچـەند شـوێنێ مانـاى ئـەم ئايەتـه دووبـاره بۆتـەوه وەكـوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُم بِحُكْمِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ – النمـل/٧٨﴾. يـان دەفـەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ – الرعـد/٤١﴾. يـان دەفەرموێ: ﴿أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ – الزمر/٤٦﴾.

ئيبنو عەبدولبەڕ دەڵێ: ئـەو ئيشانەى كۆڕا هەيـە لەسـەر حـەرامىو خراپييـان سوود خـواردنو پـارەو پـوڵى گـەووادىو نـامووس فرۆشـىو لۆتيـەتىو زوڕنـاژەنىو جووزەلـە لێـدانو بـەرتيلو بـەرتيل كـاريىو كـرێ وەرگـرتن لەسـەر لاوانـدنـەوەى مردوو پاره وەرگرتن لەسەر خاڵ كوتانو كتێب گرتنەوەو لاف لێدانى غەيب زانىو هەواڵى ئاسمانى، هەروەها پاره وەرگرتن لەسەر قومارو هەموو يارييەكى بەتاڵ.

## تواناو دەسەڵاتى خودا بۆ رزگاركردنى ئادەميزاد له تەنگانەو تاريكى

﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

پەروەردگار لەوەپێش برێ بەڵگەى لەسەر ڕاستى خودايـەتى خـۆىو بـەرفراوانى زانيـارىو باڵادەسـتىو توانـاى بـێ ئەنـدازەى خـۆى هێنايـەوه، چـاودێرى خـۆى بـۆ بەندەكانىو ئاگادارى تەواوو تۆكمەى بەسەر بوونـەوەردا ڕاگەيانـد؛ لـەم ئايەتانـەى دوايشدا جۆرێكى تر له دەسەڵاتو تواناى بەرفراوانى خۆى ديارى دەكاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ تَدْعُونَهُ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً﴾ ئەى پێغەمبـەر! بـەو كافره موشريكانه بڵێ: كه بێ ئاگان له نيشانەكانى تاكو تەنهايى خوداو دەسـەڵاتى بەرفراوانو بێ ئەندازەى پێيان بڵـێ: ئەگـەر ئێـوه لـەكاتى گەشـتو هاتوچـۆتان بـۆ

هەندەران لە ڕێگەی بیابانو دەریاو وشکانیدا تووشی مەترسی باو بۆرانو زریانو گێژەڵوکەو لافاوو ڕەشەبا هاتنو ڕێگاتان لێ تێکچوو شەوەزەنگتان بەسەردا هات، یان ئۆتۆمبیلو شەمەندەفەرێك کە سواری بوون ڕەوتی دەرچوو لێخوڕ دەسەڵاتی بەسەردا نەما خەریك بوو وەرگەڕێ، یان باڵەفڕەو فڕۆکەی کە سواری بوون لە حەوادا کەوتە حاڵەتی خەتەرەوە، خەریك بووبکەوێتە خوارێو لە هەموو لایەکەوە ترسی مەرگو سەرتێدا چوون دەوری دانو ئاسۆی ڕزگاربوونتان لێ دیار نەبوو، یان لە بەحردا بە سواری بەلەمو گەمێ کەوتنە ناو گێژاوو شەپۆلی سامناکی دەریای بێ ئامانەوە، مۆتەکەی مەرگ لە هەر چوارلاوە لێتان نزیك بووەوەو کەڵبەی دڕندانەی لێتان گیر کرد! کێ ئێوە ڕزگار دەکا لەو سەخڵەتیو تەنگو چەڵەمەو کارەساتانە!! بەڵێ ئەوکاتە جگە لە پەنای خودا هیچ پەنایەکتان دەست ناکەوێ؛ ئالەو کاتەدا بە ئاشکراو بە نهێنی بە دەنگی بەرزو هاوار هاوارەوە بە ورتە ورتو لەبەر خۆتانەوە هاواری لێ دەکەنو لێی دەپاڕێنەوەو دەلاڵێنەوە دەنوزێنەوە، بەشێوەی ملکەچیو بێ دەسەڵاتی دەپاڕێنەوە وادەو بەڵێن دەدەن، سوێند دەخۆنو دەڵێن: ﴿لَئِنْ أَنجَانَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ ئەگەر خودا ئەم جارە لەم تەنگو چەڵەمە ڕزگارمان بکاو ترسی مەرگمان لێ بڕەوێنێتەوە، دەبینە پیاوچاكو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی پەروەردگار دەکەین، دان بە تاكو تەنهایی خودادا دەنێین، بە دڵسۆزی دەیپەرستینو شەریکی بۆ دانانێین.

وینەی ئەم ئایەتە لە قورئاندا زۆرە وەکوو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّى إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُواْ بِهَا جَاءتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُاْ اللّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنِّ مِنَ الشَّاكِرِينَ – يونس/٢٢﴾.

یا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الْضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ – الإسراء/٦٧﴾. بەڵێ لەکاتی تەنگانەدا هەموو خودا درۆزنەیەك لە بیر دەچێتەوەو

کەس هاواریان ناکاتێ؛ ئەگەر هاواریشیان لێ بکرێ هیچیان پێ ناکرێ، جا ئەی پێغەمبەر! کە ئەم ڕاستیانەت بە گوێچکەدا دانو واقیعو ڕووداوت حستە بەرچاویان ﴿قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾ بڵێ خودای باڵادەست چەند جار لەم تەنگو چەڵەمانەو هی تریش ڕزگاری کردنو ڕزگارتان دەکا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سەرباری ئەو هەموو چاکەو ڕەحمو بەزەییەی خودا، ئێوە کە ڕزگارتان بوو هەڵدەگەڕێنەوەو شەریك بۆ خودا دادەنێنو وادەو بەڵێنی خۆتان نابەنە سەر، خیانەت لە عەهدو پەیمانی خۆتان دەکەن، سوێندی جەخت لەسەر کراوی خۆتان لە بیر دەچێتەوەو پاشگەز دەبنەوە هەروەك نە باتان دیبێو نە باران!! بەمەش سپڵەییو ناکەس بەچەیی خۆتان دووپات دەکەنەوە...

## دەسەڵاتو توانای خودا بەسەر سزادانی یاخی بوواندا

﴿ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی یەزدان لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی ڕوون کردەوە کە بەتواناو دەسەڵاتە بۆ ئەوەی هاوبەش پەیداکەران لە تەنگو چەڵەمە ڕزگار بکا، ئەوە ڕادەگەیەنێ کە تواناو دەسەڵاتی ڕەهای هەیە، دەتوانێ بە شێوەی جۆراو جۆر

سزا بەو خوانەناسانە بگەیەنێ، لە شوێنی ئاسایش‌و بێ مەترسیشدا جۆرەها عەزابیان پێ بگەیەنێ ئەم ڕاگەیاندن‌و هەڕەشەشی بۆ ئەوەیە ئەو خوانەناسانە پەند وەربگرن‌و لە هەڵوێستی ناڕاست‌و نالەباری خۆیان پەشیمان ببنەوەو، بێنە سەر شەقامە ڕێبازی ئیسلام‌و بەختەوەری دونیاو قیامەت ببن، ئەمەش جۆرە تەعبیرێکە لە چەسپاندنی تاك‌و تەنهایی خوداو دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو کافرو موشریکە سەرڕەقانە بڵێ: پەروەردگار بالآدەستە، دەتوانێ جۆرەها سزاتان بۆ بنێرێ، جارێك لە ژوور سەرتانەوە سزاتان بەسەردا ببارێنێ وەکوو ئەو بەردەباران کردنەی بەسەر نەتەوەی لوطو ئەصحابولفیلی هێنا، یان وەکوو ئەو ناڵەو گرم‌و هوڕەی بەسەر گەلی ثەموودی هێنا کە بەهۆی گرمەی لە ڕادەبەدەرەوە لە ناوی بردن، یان وەکوو ئەو لێزمە باران‌و لافاوەی بەسەر گەلی نووحی هێنا ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾ یان عەزابتان بۆ بنێرێ لە ژێر قاچتانەوە وەکوو بومەلەرزەو بورکان‌و ڕۆچوون بەزەویدا، وەکوو چۆن قاروونی بە ماڵ‌و سامانەوە بە زەویدا بردە خوارێ ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾ یان وا سەرتان لێ دەشێوێنێ‌و دەتان کاتە چەند گروپ‌و تاقمێك‌و هەر یەکەی بۆخۆی راو بۆچوونێکی جیای هەبێ‌و هەر فیرقەو کۆمەڵە ڕابەرێکی هەبێ‌و دژایەتی‌و شەڕو ئاژاوە بکەوێتە ناوتانەوەو تێك بەر ببن‌و لێك رابکێشن هەر یەکەتان ئازار بەوی ترتان بگەیەنێ!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست بە ﴿مِّن فَوْقِكُمْ﴾ واتە: لەی ئەمیرو لێپرسراوەکانتانەوە سزاو ئازارتان بۆ بێ، مەبەست بە ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾ واتە: لەلایەن هەتیومچەو پیاوی خوێڕی‌و خزمەتکارەکانتانەوە تووشی سزای ناڕەحەتی ببن.

﴿انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بڕوانە ئێمە چۆن بە شێوەی جۆراو جۆر بەڵگەیان بۆ دێنینەوە، جارێك لە ڕێگەی هەستەکانەوە، دەمێ

لە ڕێگەی عەقڵ ئاوازەوە، چەلێك لە ڕێگەی هەواڵی پەنامەکیو غەیبییەوە، نیشانەی خودایەتیو تاكو تەنیایی خۆمیان بۆ دووپات دەکەمەوە، بۆ ئەوەی هۆشیان بەبەر خۆدا بێتەوەو بە وردی لە نیشانەکانی خوداو بەڵگەی خودایەتی تێفکرنو پەندو ئامۆژگاری وەربگرنو خۆیان باش بکەنو بەختەوەری هەردوو جیهان بەدەست بێنن!

ئاشکرایە وشەی (عذاب) بە شێوەی نەکیرە هاتووە بۆ ئەوەی هەموو جۆرە عەزابێك بگرێتەوە، ئەو عەزابەی کە زانراوە، ئەوەی لە داهاتوودا دێتە دی، یان ئەو عەزابەی کە شێوەکەی لە ئادەمیزاد نادیار بووە، دوایی پێی ئاشنا بوون، چونکە قورئان تازەگەرییو ئاوازەیی بەردەوامەو هەرگیز بڕانەوەی نیە، هەواڵی ڕابردوو هەواڵی سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئانو هەواڵی داهاتووشی لە خۆ گرتووە، شایانی باسە مانای ئەم ئایەتە لەسەدەی بیستەمدا بەباشی دەرکەوت، بە تایبەتی دوای ڕوودانی جەنگی یەکەمو دووەمی جیهانیو جەنگەکانی تری کە لەم ساڵانەدا ڕوویان دا زۆر بە ئاشکراو ڕوونی ماناکەی بۆ زانایان دەرکەوت، چونکە ئەو چەكو تەقەمەنییەی کە لەم شەڕانەدا بەکار هێنرا خەڵکی ئاگاداریان نەبوو، بێگومان پەروەردگار عەزابێکی سامناکی ناردە سەر گەلو نەتەوە ئەوروپییەکان؛ ئەوانەی کە جەنگیان دژی یەکتری بەپا کرد، ئەوەبوو فرۆکە قومبەلە هاوێژەکان لە هەواوە قومبەلەو باروتی خۆیان دەهاویشتە خوارەوە، هەر قومبەلەیەك هەزاران پارچە ئاسنو مەعدەنی کوشندەی تێدا بوو، ئەم فڕۆکە جەنگیانە هەزاران کیلۆمەتریان دەبڕی بۆ ئەوەی بگەنە جێگەی مەبەستی خۆیانو بارو باروتی خۆیان بەسەر شارو شارۆچکەکانی دوژمندا فڕێ دەداو چەند خانوو گەڕەکیان لەگەڵ زەویدا یەکسان دەکرد، کەسانێك کە بینویانە دەڵێن: کە فڕۆکەکان قومبەلەو باروتەکانی خۆیان ئاڕاستەی شارو شارۆچکەو گوندو کارگەو باڵەخانەکان دەکرد دەتگوت: بورکان دەتەقێو دەیەوێ دەوروبەری خۆی هەڵومشێنێو قیامەت ڕابێ، هەروەها گوللەی تۆپە دوور هاوێژەکان کە دەکەوتنە

کارو ئاگرو ئاسنی خۆیان لە دوورەوە ئاڕاستەی شارو سەربازگەو کارخانەو گوندو شارۆچکەکان دەکرد، هەروەها غەواصە جەنگیەکان کەلە ژێر ئاودا خۆیان ئامادە دەکردد بۆ ئەوەی بەرەنگاری گەمییە جەنگیەکانی دوژمن ببنەوە ئاگرو باروتی خۆیان ئاڕاستە دەکردن‌و کەم وا هەبوو ڕێگا بدەن ئەو گەمیٓ جەنگیاننە بە خۆیان‌و سەرنشینەکانیانەوە رزگاریان بێ، بەڵکوو زەبری کاریگەیان لێ دەوەشاندن‌و نوقمی ژێر ئاویان دەکردن‌و سەرنشینەکانیان دەبوونە خۆراکی ماسی‌و گیاندارانی تری دەریا.

لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمیش بەملاوە خۆمان دیمان چۆن لە شەڕەکانی جوولەکەو وڵاتە عەرەبیەکان، شەڕی عێراق‌و ئێران‌و لە بۆردومانی وڵاتە هاوپەیمانەکان بۆسەر عێراق چۆن لە حەواوە لە ژێرەوە لە هەر چوارلاوە دونیا دەبووە ئاگرو باروت‌و وەکوو بورکان دەتەقیەوەو نیمچە قیامەتێك ڕادەبوو، بە کورتی کەسێك بە چاوی خۆی ئەم شەڕانەی دیتبن‌و هاوبەشی جەنگەکانی کردبێ، زۆر بەباشی لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە حاڵی دەبێ‌و باش دەزانێ تەفسیری بکا! خۆ وڵات‌و گەل‌و نەتەوەیەکیش کە قونبەلەی زەڕڕەی پێدا درابێ یان چەکی کیمیایی‌و بایۆلۆجی‌و غازە جۆراوجۆرەکانی تێدا بەکار هاتبێ‌و بەو چەکە لێی درابێ، باشترو چاکتر مانای ئایەتەکەی تێدا ڕەنگ دەداتەوە! کەسانێك کە لەبەر شاڵاوی ئەو جۆرە چەکانە رزگاری بووبێ دەزانن ناردنی غەزەبی خودا لە ژوور سەرەوەو لە بن پێوە کاریگەریەکەی چۆنەو چۆن نیەو، چەند سامناك‌و ترسێنەرە؟ بەڵام لەگەڵ ئەم بەڵگەو ئامۆژگاری‌و هەڕەشەو تەماع بەرنانەدا زۆربەی گەلەکەی تۆ ئیمانیان نەهێناو نەهاتنە سەر ڕێگای ڕاست ﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ﴾ بەڵکوو زۆربەی گەلەکەت کە قورەیشیەکانن قورئانەکەتیان بەلاوە درۆیە، پەندو ئامۆژگاریەکانت ڕەت دەکەنەوە، گاڵتەیان بەو عەزابە دێ کە تۆ هەڕەشەیان پێ لێ دەکەی ﴿وَهُوَ الْحَقُّ﴾ وەلحاڵ ئەو قورئانە حەق‌و ڕاست‌و بێ شك‌و شوبهەیە، چی تێدایە ڕاست‌و دروستە، لە هیچ ڕوویەکەوە بەتاڵی‌و ناڕاستی ڕووی تێ ناکا،

هەروەها ئەو سزایەی کە هەرەشەتان پێ لێ کراوە، هەر دەبێ بیگەنێو تووشتان دەبێو ئێوە لەدەستی قوتارتان نابێ، ڕاستی قورئانو هاتنی عەزاب بۆ سەرتان دوو شتی حاشا هەڵنەگرنو هەستو عەقڵو ویژدان دەیسەلمێنن.

ئەمجار پێیان بڵێ: من دەسەلاتی ئەوەم نیە، بە زۆر موسوڵمانتان بکەم ﴿قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾ بڵێ من پارێزەرو خاوەن دەسەلاتو خۆسەپێنەر نیم بەسەر ئێوەوە، ئەوەم پێ نەسپێردراوە کە بە زۆر ئیمانتان پێ بێنم، ئەرکی سەرشانی من پێراگەیاندنە، ڕێگاتان پیشان دەدەمو تەماعی بەهەشتتان بەرنێمو لە ئاگری دۆزەخ بتان ترسێنم، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ – الأنعام/١٠٤﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ – الكهف/٢٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ – الغاشية/٢١ – ٢٢﴾ یان کە دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ – ق/٤٥﴾. هەموو ئایەتەکان ئەو ڕاستیە دووبارە دەکەنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێیان بڵێ: من ڕاگەیاندنم لەسەرە، ئێوەش بە پیرەوە هاتنو بەگوێ کردن، جا کەسێك شوێنم بکەوێو بەقسەم بکا کامەرانی دونیاو قیامەتی دەست دەکەوێ! کەسێکیش دژم بوەستێو بە قسەم نەکا بەدبەختو چارەڕەشی دونیاو قیامەتە.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لەوانە دەکا کە بڕوا بە قورئان ناکەنو گاڵتە بە هاتنی عەزاب دەکەن، دەفەرموێ: ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ﴾ هەر هەواڵێك قورئان ڕایدەگەیەنێ ڕاستەو کاتو شوێنی پەیدابوونی هەیە، هەموو هەواڵێکی حەقیقەتو ڕاستی خۆی هەیە، هەردەبێ ڕوو بدات تەنانەت با پاش ماوەیەکیش بێ؛ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ – ص/٨٨﴾. ئەمجار بەشوێن ئەو هەڕەشەیەدا هەڕەشەیەکی تری ئاراستە کردو فەرمووی: ﴿وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ لەوە پاش ڕاستی ئەو هەواڵانە حەقیقەتی بەڵێنو هەڕەشەکان

دەزانن، پەلە مەکە وادەو بەڵێن بە زاڵ بوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانیدا، هاتنی عەزاب بۆسەر ئێوەی موشریكو لە خوا یاخی بوو دێتە دیو ڕۆژێك لە ڕۆژان لە جیهانی واقیعدا دەبیندرێن!

## ڕوو وەرگێڕانو دوور کەوتنەوە لە هاونشینی ئەوانەی گاڵتە بەقورئان دەکەن

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ

﴿شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾.

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەنها ڕاگەیاندنی لەسەرە دەسەلاتی ئەوەی نیە بە زۆر دڵی خەڵك وا لێ بکا بڕوای پێ بکەن، ئەو بەدرۆخەرەوانەش دەبێ سەرەنجامی هەڵوێستی نادروستی خۆیان ببینن، ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکا کە هەرکاتێ ئەوان وێڕای کوفرو بێدینیو بەدرۆخستنەوەی قورئان دەستیان کرد بە گاڵتە کردن بە قورئانو لاقرتییان بە ئایین کرد، دەست بەجێ ئەو شوێنە، ئەو کۆڕو کۆمەڵە بەجێ بێڵێ...

ئیمامی طەبەری لە (السدی)یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: موشریکەکان کە دادەنیشتن لە کۆڕو کۆمەڵدا دەستیان دەکرد بە گاڵتە کردن بە قورئانو بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جنێویان پێ دەدا، لاقرتییان پێ دەکرد، ئیتر پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ)و هاوەڵانی کرد؛ کە لەوکاتەدا لەگەڵیان دانەنیشنو کۆڕو مەجلیسەکەیان بەجێ بێڵن تا دەچنە سەر باسێکی تر!

سەعدی کوڕی جوبەیرەو ئیبنو جورەیجو قەتادەو موقاتیل هەمان ڕیوایەتیان پەسەند کردووە.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! هەرکاتێ تۆو هاوەڵانت یان هەر کەسێکی تر کە موسوڵمان بێ، بینیتانو بیستتان کە موشریکەکان گاڵتەو قەشمەری بە قورئان دەکەن، روویان لێ وەرگێڕن، کۆڕو کۆمەڵیان بەجێ بهێڵن، لەگەڵیان دامەنیشن ﴿حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ﴾ تاوەکوو دەچنە سەرباسو خواسێکی ترو لەبارەی شتێکی ترەوە ئاخاوتن ئەنجام دەدەن... شیاوی باسە هەرکەسێکیش ئایەتەکانی قورئان بە شێوەی ناڕاستو بەتاڵ

تەئویل بکا، مانایەك بەسەر وشەو رستەکانیدا دابېرێ کە هەڵی ناگرن نابێ گوێی لێ بگیرێو لەگەڵی دانیشن، پێویستە کۆڕو مەجلیسەکەی بەجێ بهێڵدرێ، مەگەر کابرا توانای بەرپەرچدانەوەو دەمکوت کردنی ئەوانی هەبێ، ئەوکاتە کارەکەی دەبێتە جیهادو کۆشش کردن لە ڕێگای خودادا!

﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ﴾ ئەی خاوەن بڕوا! ئەگەر وا ڕیکەوت شەیتان ئەوەی لە بیر بردیتەوە کە دانیشتن لەگەڵ ئەو جنێوەرو گاڵتەبازانە قەدەغەیەو دانیشتیو کەوتیتە قسە کردنو گوێ گرتن لەگەڵیاندا پاشان بیرت کەوتەوە کە دانیشتن لەگەڵیان یاساغە، ئەوە ﴿فَلاَ تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ دوایی بیرت کەوتەوە دامەنیشە لەگەڵ ئەو تاقمو کۆمەڵە ستەمکارە کە ستەم لە خۆیان دەکەن بەوەی گاڵتە بە قورئانو پەیامەکەت دەکەنو بەدرۆت دەخەنەوە! لێرەدا خیطابەکە بۆ پێغەمبەرو هەموو موسوڵمانێکە، دەشگونجێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەبێ وەسوەسەی شەیتان شتی لە یاد بچێ ئەوەتا قورئان لە شوێنێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ڕێدەکەوێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شتی لە بیر بچێتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ – الكهف/٢٤﴾. تەنانەت حەزرەتی ئادەم کە خودا خواردنی داری گەنمی لێ قەدەغە کرد لە بیری چۆوەو لە دارەکەی خوارد! وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا – طه/١١٥﴾. حەزرەتی موساش فەرمانی خوای لە بیر چووەوە دوایی کە بیری کەوتەوە دەستی کردە پاڕانەوەو ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ – الكهف/٧٣﴾ لە ژیاننامەو سیرەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چەسپاوە کتێبەکانی حەدیث (صحاح السنة) تێیاندا تۆمار کراوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە نوێژدا سەهوو نیسیانی بەسەردا هاتووە، دوایی پاساوی بەوە داوەتەوەو فەرموویەتی: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي».

بـەڵام لـە بـواری ڕاگەیانـدنی سرووش‌و نیگـادا، لـە گەیانـدنی ئایینـدا هـەموو پێغەمبەران دوورن لە هەڵەو لە بیرچوونەوە، هەرشتێك خودا فەرمانی پـێ كـردبن بە گەیاندنی لە حەڵاڵ‌و حەرام هیچیان لە بیر نەچووەو هەموویان بە ڕێك‌و پێكی گەیاندووە، تەنانەت كە سرووش بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەهات‌و قورئانی بـۆ دەخوێندرایـەوە، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) خێـرا خێـرا لەبەر خۆیەوە دەیخوێندەوە، بۆ ئەوەی لە یادی نەچێ‌و زوو لەبەری بكا، ئەوە بوو: پەروەردگار پێی ڕاگەیاند كە پەلـە نـەكا، لەسـەر خودایـە كـە قورئـانی لـە دڵدا كۆ بكاتەوەو بیچەسپێنێ، وەكوو دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ – القيامة/١٦ – ١٩﴾.

لـەبیر بردنـەوەی شـەیتانی نـەفرین بـۆ بـڕێ كـارو كـردەوە لەسـەر دڵـی بەنـدە ڕاسـتاڵەكانی خـودا ناچێتە خانـەی هـەبوونی دەسـەڵات‌و توانـا بەسـەریاندا، واتـە: ئەگەر شەیتان شـتێكی لـە بـیر پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) یـان لـە بـیر موسوڵمانێك بردەوە، ئەوە ناگەیەنێ كە شەیتان تەصەروف‌و دەسەڵاتی بەسـەریاندا هەیە، كەوابێ لەگەڵ ئایەتی ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُم بِهِ مُشْرِكُونَ – النحل/٩٩ – ١٠٠﴾. دژایەتی پەیدا نابێ، واتە: لە بیرچوونەوەی شتێكی باش كە وەپاڵ شەیتان دەدرێ‌و دەڵێن: شەیتان لە بیری بردەوە، لەم ڕووەوە كە گوایـە بـە وەسوەسـەی ئـەو ڕوو دەدا بە سوڵتان‌و دەسـەڵاتی شـەیتان ئـاژمێردرێ بەسـەر ئـادەمیزادداو ناچێتە خانـەی ئـەو ڕێ لێ هـون كـردن‌و گـومڕایی كردنـەی كـە ئایـەتی سـورەتی (النمل)و ئایـەتی تـریش كـە بەنـدە موخلیـصەكانی خودایـان بـە دوور گرتـووە! نـەفیان لێ كردووە!؟

بـەكورتی ئایەتەكـە ئـەوە دەچەسـپێنێ كـە لـەبیر چـوونەوەی شـت لەلایـەن موسوڵمانەوە بەهۆی وەسوەسەی شەیتانەوە، ئەوە ناگەیەنێ: كە شەیتان باڵادەستە

بەسەریاندا، بەگوێرەی ئایەتەکانی قورئان بالادەستی شەیتان تەنها بۆ موشریك و کافرە، نەك بۆ موسوڵمان.

﴿وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ ج تاوانێك لەسەر ئەوانە نیە کە خۆ دەپارێزن لەدانیشتن لەگەڵ گاڵتەبازو جنێودەران و موحاسەبە ناکرێن، ئەمانە کە خۆیان بپارێزن لە کۆبوونەوە لەگەڵ ئەوانەی کە قەشمەری بە قورئان و پەیامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکەن، سزاو تۆڵەی قەشمەری کەرانیان لەسەر نیە، ئەوان کە خۆیان لە تێکەڵ بوون و دانیشتن لەگەڵ گاڵتەکەراندا بپارێزن و لێیان دوورە پەرێز بن، فەرمانی خودایان بەجێ هێناوە ﴿وَلَكِن ذِكْرَى لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکوو هەر ئەوەندەیان لەسەرە کە ئامۆژگارییان بکەن و خودایان بیر بخەنەوە، ئیتر بەسە، لە خودا بترسن و واز لە جنێودان و گاڵتە کردن بێنن...

موجاهید دەڵێ: واتە: فەرمانمان پێ کردوون کە ڕوویان لێ وەرگێڕن، لێیان دوورە پەرێز بن، بۆ ئەوەی یادی پەروەردگار بکەن پەندو ئامۆژگاری وەربگرن بەڵکوو خۆ بپارێزن لە گاڵتە کردن بە ئایەتەکانی ئێمەو خەریکی یادی خودا بن.

زومەخشەری دەڵێ: واتە: پێویستە لەسەر ئەوانەی کە لەگەڵیان دادەنیشن کە گوێیان لێ بوو: موشریکەکان جنێو دەدەن و گاڵتە بە قورئان و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکەن ئامۆژگارییان بکەن و ناڕەزایی خۆیان دەربڕن کۆڕەکەیان بەجێ بهێڵن، بەڵکوو حەیا بیانگرێ و واز لە جنێو و گاڵتە کردن بێنن.

جارێکی تر پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵانی کرد؛ کە خۆیان لە گاڵتەکەران بپارێزن و لێیان دوور بکەونەوەو فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا﴾ ئەی پێغەمبەر! هەروەها ئەوانەی شوێن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەوتوون! پشت هەڵکەن و ڕوو وەرگێڕن دوورە پەرێز بن لەو موشریکەکانەی کە ئایینی خۆیان کردووە بە گاڵتەبازاڕ؛ قەشمەری بە ئایینی خۆیان دەکەن بەوەی کە بتپەرستی دەکەن، بۆخۆیان بتەکە دروست دەکەن و دیخۆن، تەمەنی خۆیان لە شتێکدا بەسەر دەبەن کە سوودی لێ

نابینن، ئەمە گاڵتەو خۆ خەریك كردنی بێ سوودە، خۆیان هەڵەو گیر كردووە؛ روو ناكەنە ئیش‌و كاری باش، ئەمەش ئەوپەڕی لەهو خۆ خلافاندنە!

﴿وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ خۆشی ژیانی دونیای بێ بایەخ بای تێكردوون‌و لە خۆیان بایی بوون، ژیانی قیامەت‌و خۆشی دوارۆژیان فەرامۆش كردووە، ژیانی دونیایان بەسەر ژیانی قیامەتدا هەڵبژاردووە، خەریكی لەززەت‌و خۆشی دونیای بێ بایەخن! لە جیاتی ئەوەی لە ئایەتی قورئان ورد ببنەوەو تێی بفكرن‌و لێی تێبگەن‌و پابەندی فەرمان‌و نەهییەكانی بن، گاڵتە بە ئایەتەكانی دەكەن‌و جنێو بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَمَ)و هاوەڵانی دەدەن‌و سوكایەتیان پێ دەكەن‌و كردوویانن بە هۆكاری پێكەنین‌و ڕابواردن‌و كۆڕو كۆمەڵیان پێ گەرم دەكەن!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفەرموێ: ﴿ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ – الحجر/٣﴾. جا كە ئەوە هەڵوێستی كافرانە، ئەوە بیروباوەڕیانە، ئەوە كردارو گوفتاریانە، ئەتۆ لە ئیشی خۆت: كە ڕاگەیاندنە دریغی مەكە، ئەركی سەرشانی خۆت جێبەجێ بكە...﴿وَذَكِّرْ بِهِ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ﴾ تۆ بە ئایەتەكانی قورئان ئامۆژگاری خەڵك بكە، خودایان بخەرەوە یاد لە سزاو تۆڵەی بێ ئامانی بیانترسێنە، تا لە خێرو خۆشی‌و بەختەوەری دانەبڕێن‌و لە ئاكاما بەهۆی كردەوەی دونیایان لە دۆزەخدا گیر نەخۆن‌و نەبنە سوتماكی ئاگری بێ ئامان، تا تەسلیم بە هیلاكەت نەبن‌و نەبنە بارمتەی كردەوەكانی ژیانی دونیایان‌و بەدبەختی‌و چارەڕەشی بۆ هەتا هەتایە لە ئامێزیان نەگرێ: وەلحاڵ ئەو جۆرە كەسانە؛ ئەو نەفسە پیسانە ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللّهِ وَلِيٌّ وَلاَ شَفِيعٌ﴾ جگە لە خودا خزم‌و دۆستێكیان نیە؛ كە شەفاعەتیان بۆ بكا لە تەنگانە ڕزگاریان بكا، یارمەتیدەرو پشتیوانێكیان نیە كۆمەكیان پێ بكا، ئەوانە ستەمكارن ستەمیان لە خۆیان كردووە، كەسێكیش بۆخۆی ستەم لە خۆی بكا، بەدەستی خۆی خۆی چارەڕەش بكا، خودا شەفاعەتی كەسی بۆ قبووڵ ناكا، وەكوو لە ئایەتێكی تردا

دەفەرموێ: ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ – الغافر/١٨﴾، یا دەفەرموێ: ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ – البقرة/٢٥٤﴾. جا وەكوو شەفاعەتیان بۆ ناكرێ یان ئەگەر بۆشیان بكرێ كەڵك ناگرێ؛ جگە لە كردەوەی چاك‌و رەحمی خودا فیدیەو بەرتیل‌و بەدەڵیش هیچ سوودێكی نیە، ﴿وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لاَّ يُؤْخَذْ مِنْهَا﴾ ئەگەر ئەو بە قسە هەر شتێك ببەخشێ لێی وەرناگیرێ، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلاَ تَنفَعُهَا شَفَاعَةٌ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ – البقرة/١٢٣﴾. پەروەردگار بەم یاسا تۆكمەیە مەبدەئێكی سەرەكی‌و نەریتی سەردەمی نەزانی هەڵوەشاندەوە، كە پێیان وابوو: بتەكانیان لە دوا ڕۆژدا شەفاعەتیان بۆ دەكەن‌و لە سزای خودا ڕزگاریان دەبێ، وەكوو چۆن لە دونیادا بەهۆی بەرتیل‌و واسیتەو تكا كردن، برێ جار تاوانبار لە سزای پێویست ڕزگاری دەبێ! لە هەمان كاتدا بنەمایەكی سەرەكی دەچەسپێنێ؛ ئەویش ئەوەیە لە قیامەتدا ڕزگار بوون‌و ڕەزامەندیی خودا بە هیچ شتێك دەستەبەر نابێ مەگەر بە كردەوەی چاك‌و بڕوای پتەوو تۆكمەی وا كە دڵ‌و دەروون پاك بكاتەوە!

بەڵام كەسی نەفسی خۆی نزم بكاتەوە، كارو كردەوەی بیخاتە گێژاوی تاوان‌و گوناهەوە، ئایینی خودا بكاتە گاڵتەبازاڕو هۆی رابواردن‌و گەرم كردنی كۆڕو مەجلیس، بە ژیانی جیهانی بێ بەقا لە خۆی بایی بێ، ئەوە ڕۆژی قیامەت شەفاعەتی بۆ ناكرێ‌و ئەگەر بۆشی بكرێ بێ سوودەو كەڵكی نیە؛ تەنانەت ئەگەر بیەوێ بەرتیل‌و فیدیەش بدەن لێیان وەرناگیرێ!

ئەمجار ئەوە ڕادەگەیەنێ كە ئەم گومڕابوون‌و چارەڕەشی‌و بەندبوونەیان لە دۆزەخدا بەهۆی كردەوەی ناپەسەندی خۆیانەوە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أُبْسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْ﴾ ئەوانەی كە ئایینیان كردووە بە گاڵتەبازاڕو بە ژیانی دونیای بێ بایەخ لە خۆیان بایی بوون، ئەوانە بۆخۆیان پاداشی باشیان لە خۆیان یاساغ كردو

خۆیان سپارد بە سزاو بەهەشتی ڕازاوەو فراوانیان لێ قەدەغە کرا، ئەوانە بەهۆی ئەنجامدانی کردەوەی خراپو ناپەسەند تووشی ئەو چارەڕەشیە بوون! ئەوانە لە پاداشتی ئەو خۆ گومڕایی کردنە ئەو خۆ کردنەوەیان بە بارمتە لە دۆززەخدا ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ﴾ ئاوی کوڵاوی تام ناخۆشیان دەدرێتێ بۆ خواردنەوە، ئاوی گەرمو ناسازو بۆن ناخۆشیان درخوارد دەدرێ، کە ناوسکیان دادەوەشێنێ، ڕیخۆڵەکانیان لەتلەت دەکا! ﴿وَعَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ هەروەها سزای بە ئێشیان دەدرێ، بە ئاگری سوتێنەر کە بە جەستەی ئەوان هەڵدەگیرسێندرێ، ئەم سزاو ئازارانەیان ﴿بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾ بەهۆی ئەو کوفرو بێدینیەی کە بە درێژایی تەمەنیان لەسەری بەردەوام بوون، بە جۆرێك سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی بەتەواوی لە ڕێبازی سەفرازیو کامەرانی لایان داوە، واتە: قوڵبوونەوەیان لە کوفرو گومڕاییدا گەیشتۆتە پلەو ئەندازەیەك کە ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە کە ڕوو بکەنە ڕێگەی هەقو ڕاست!!

ئەمەش پەندو ئامۆژگارییە بۆ کەسانێك کە لە قورئان تێدەگەن، هەر بەوەندە بە تەسکەرە موسوڵمانن لە خۆیان بایی نابن، گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە موسوڵمانی ڕاست ئەو کەسەیە قورئان بکاتە پێشەوای خۆیو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بکاتە بەرنامەو ڕێبازی ژیانی خۆی، بەخەیاڵی سەوزو زرەخەون لە خۆی بایی نەبێو بەهیوای شەفاعەتو تکای تکاکاران پاڵی لێ نەداتەوە...

## بەهرەو سەروەریی ئیمان بەخوداو ریسوایی هاوەڵدانان بۆ خودا

﴿ قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ

ٱلشَّيَٰطِينُ فِي ٱلۡأَرۡضِ حَيۡرَانَ لَهُۥٓ أَصۡحَٰبٞ يَدۡعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلۡهُدَى ٱئۡتِنَاۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۖ وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُۚ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٧٣﴾ ﴾.

ئیمامی (السدی) دەڵێ: موشریکەکان بە موسوڵمانەکانیان گوت: ئێوە واز لە ئایینی (محمد) بهێنن‌و شوێن ڕێبازی ئێمە بکەون! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ‌و دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَنَدْعُو مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَنفَعُنَا وَلاَ يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَى أَعْقَابِنَا﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: ئایا ئێمە جگە لە خودای بالادەست‌و خاوەن نەفع‌و سوود گەیەنەر، شتێك بپەرستین کە نەتوانای سوود گەیاندنی هەبێ، نەبتوانێ زیانمان پی بگەیەنێ! ئایا دەتانەوێ بەرەو دواوە بگەڕێینەوە بۆ کوفرو بێ دینی؟! پاش ئەوەی نووری ئیمان بە ئیسلام دڵ‌و دەروونی ڕوشەن کردووینەوەو ڕزگارمان بوو لە گومڕایی. ئایا گونجاوو پەسەندە ئێمە سەرلەنوێ کافر ببینەوەو ڕێگای بەدبەختی بگرینەوە بەر؟!

**بەکورتی ئەوە شتێکی نەگونجاوو کارێکی نەفامییە، لەبەر ئەم هۆیانە:**

١- هەڵگەڕانەوەو ڕوو وەرگێڕان لە بانگەوازی پەروەردگاری باڵادەستو بەتوانا، ئەو خودایەی کەبیەوێ زیان دوور دەخاتەوە، کە بیەوێ سوود دەبەخشێ ڕووتێکردنە لە بانگەوازی بێ دەسەڵاتی وا توانای سوودو زیانی نیەو بەکەڵکی خودایەتی نایە.

٢- ئەمە گەڕانەوەیە پاشەو پاش خۆ هەڵداشتنە.

٣- کەسێك خودای بە بەزەیی‌و بەڕەحم لە گومڕایی ڕزگاری کردبێ‌و خستبێتیە سەر ڕێگای هیدایەت، کەس ناتوانێ گومڕای بکا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَهْدِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّضِلٍّ أَلَيْسَ اللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِي انتِقَامٍ – الزمر/٣٧﴾.

ئەمجار لەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێشدا وێنەی هەڵگەڕاوە لە ئایین لە ناشیرین حاڵێکدا کە بە خەیاڵی عەرەبەکاندا دەهات، نەخشەکێش دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَالَّذِي اسْتَهْوَتْهُ الشَّيَاطِينُ فِي الأَرْضِ حَيْرَانَ﴾ واتە: بێ ئاگا پاشەو پاش بگەڕێینەوە وەکوو ئەو کەسەمان لێ بێ کە شەیتان لەسەر هەواو ئارەزووی نەفس بە گێژو وڕی بردوویەتی بەزەویداو بێ عەقڵ‌و نەفام بە بیابان‌و چۆڵەوانیدا دەسوڕێتەوە، نازانێ لە کوێوە بۆ کوێ دەچێ! شەیتان لە زەویدا سەرگەردانی کردووە، وەلحاڵ ئەو سەرلێ شێواوە ﴿لَهُ أَصْحَابٌ يَدْعُونَهُ إِلَى الْهُدَى ائْتِنَا﴾ چەند دۆست‌و برادەرێکی هەیە، لەسەر ڕێگای ڕاست‌و دروست لە دوورەوە بانگی لێ دەکەن‌و دەڵێن: وەرە لای ئێمە، ڕێگای ڕاستت نیشان دەدەین لە گومڕایی‌و سەرلێ شێواوی ڕزگار ببێ!

پوختەی پەندو مەتەڵەکە ئەوەیە: کەسێك دوای ئیمان هێنان لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، وەکوو کەسێك وایە کە عەشق‌و شێتی وای لێ کردبێ ڕووی لە چۆڵ‌و بیابان کردبێ، حەیران‌و سەرلێ شێواو ملی ڕێگای هاتوو نەهاتی گرتبێ‌و نەزانێ بۆ کوێ دەچێ‌و چی دەکا، لە کاتێکدا، هاوەڵانی لەسەر ڕێگای ڕاست جێی هێشتبن‌و هەمیشە بانگی لێ بکەن‌و پێی بڵێن: وەرەوە بۆلای ئێمە وەڵامیان نەداتەوە، چونکە ئەو کوێرانەو نەفامانە ملی لێ ناوە چەندێك بانگی لێ بکەن ئەو گوێی لێ نیە، بە

قسەیان ناکا، ئەمە مەثەلو پەندی کەسانێکە کە شوێن رێبازی گومڕایان کەوتوون، بتپەرستی دەکەنو وا دەزانن لەسەر حەقنو هومێدیان بەو بتپەرستییەی خۆیان هەیە، هەتا مردن یەخەیان دەگرێو جگە لە پەشیمانیو هیلاکەتو چارەڕەشی چی تریان دەست ناکەوێ.

ئەی پێغەمبەر! بانگەوازی ئەوانە بکە، بۆسەر ڕێگەی ڕاستو ﴿قُلْ: إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ﴾ پێیان بڵێ: ئەو هیدایەتو ڕەهنومایەی خودا کە لە قورئاندا ناردویەتیە خوارێ ئەو هیدایەتو شارەزایی کردنی ڕاستەقینەیە، ڕێبازی ئیسلام ڕێبازی حەقو ڕاستە، نەك ئەو ڕێبازەی ئێوەی کافر لەسەری دەڕۆنو پەیڕەوی دەکەنو کوێرانە لاسایی باوكو باپیرانتان دەکەنەوە!

ئەمجار پێیان بڵێ: ﴿وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ فەرمانمان پێ کراوە کە پابەندو گەردنکەچ بین بۆ پەروەردگاری بوونەوەرو ئێمەیش پابەندو گەردنکەچ بووین ﴿وَأَنْ أَقِيمُواْ الصَّلَاةَ وَاتَّقُوهُ﴾ هەروەها فەرمانمان پێ کراوە؛ بەپەیڕەو کردنی بەرنامەی ئیسلامو بەجێهێنانی نوێژو تەقوا کردن؛ بەجێهێنانی نوێژەکان لەکاتی خۆیانداو بەو شێوەیەی کە خودا فەرمانی بە کردنیان کردووە، نوێژکردنێك کە دڵو دەروون پاك بکاتەوە، ئادەمیزاد لە خراپەو خراپەکاریی بگێڕێتەوە، تەقواش بریتیە لە خۆپاراستن لە هەر شتێك کە لە ئاکامی سەرپێچی کردنی ئایینی خوداوە شەریعەتی پیرۆزی پەیدا دەبێ.

واتە: پێیان بڵێ: ئێمە بە سێ شت فەرمانمان پێ کراوە بە ئیخلاص بۆ خوداو شەریکی بۆ قەرار نەدەین، نوێژەکانمان بە ڕێكو پێکی ئەنجام بدەینو خوداپەرستی بکەینو جگە لە زاتی پاکی کەسی تر بە خودا نەزانین، لە هەموو حاڵێکیشدا تەقوای خودا بکەین بە نهێنیو بە ئاشکرا خۆمان لەو شتانە دوور بگرین کە لێی یاساغ کردووینو سەرپێچی فەرمانەکانی نەکەین. ﴿وَهُوَ الَّذِيَ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ خودایەکی وەهایە؛ هەر بۆلای ئەو دەگەڕێندرێنەوە، ڕۆژی قیامەت

هەمووتان دەچنە بەر قاپیەکەی ئەو، حیساب و کیتابتان لەگەڵ دەکا، لەسەر کردارو گوفتارتان، سزاو پاداشتان دەداتەوە، جا کەواتە ناگونجێ و نابێ جگە لەو خودا خاوەن دەسەلاتە، کەسی تر بە خودا حلێب بکرێ! ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ پەروەردگار دروست کارو بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، خاوەن و هەڵسوڕێنەری کاروباریانە، چییان تێدایە دروست کراوی زاتی پەروەردگارن، هەموو شتێکی لە کات و شوێنی خۆیدا بەدیهێناوەو حیکمەت و دانایی خودا دەگەیەنن! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ، وَمَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ – الدخان/٣٨ – ٣٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً – آل عمران/١٩١﴾. بەڵێ هەموو کارێکی لەسەر بناغەی زانست و تواناو حیکمەتە، بۆخۆی کەریمی کارسازە، هەرشتێك بیەوێ بیکا دەیکا. ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ قَوْلُهُ الْحَقُّ﴾ (وشەی (یوم) کە مەنصووبە یان عەطفە بۆسەر وشەی (تقوی)ی پێشەوە یان بۆسەر وشەی (خلق) یان لە پێشەوە فیعلێکی وەکوو (أذکر) مەزندە دەکرێ). خۆ بپارێزن لە سزاو تۆڵەی ئەو ڕۆژەی کە خودا بەهەرشتێك بفەرمووێ ببە دەبێ، هیچ هێزو توانایە نیە بەرهەڵستی بێ و نەهێڵێ مەرامی خۆی بێنێتە جێ!

﴿قَوْلُهُ الْحَقُّ﴾ هەموو فەرمان و وتەی ئەو ڕاست و حەقن، هەرشتێ بیەوێ دروستی بکاو بەدی بێنێ، لەکاتی خۆیدا بەبێ دواکەوتن چۆنی بوێ ئاوا دێتە دی و، ئاتاجی بەکەس نیەو، ڕەزامەندی کەسی ناوێ، هەر ویست و ئیرادەی خۆی پەیوەندی بەو شتەوە کرد، فەرمانی تەکوینی ئاڕاستە کرد، دەست بەجێ بەبێ دواکەوتن ئەو شتە پەیدا دەبێ!

﴿وَلَهُ الْمُلْكُ﴾ خاوەنیەتی ڕاستی، سەڵتەنەت و دەسەلاتی تەواو هەر بۆ ئەوە کە خودایەکی بێ هاوەڵ و بێ هاوسەرو بێ باوك و دایك و کوڕو کچە، تاك و تەنیاو فەردو صەمەدە، واتە: کە لە جیهاندا بە ڕواڵەت بە شێوەی مەجازی دەڵێن: ئەوە

موڵکی فلانەو ئەمە موڵکی فیسارە لە دونیا ئەوەش نامێنێ، بەڵکوو موڵکایەتی تەواو هی هەموو شتێك بۆ خودایە ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّوَرِ﴾ لەو رۆژەدا کە فوو دەکرێ بە کەڕەنای صووردا جگە لە موڵکایەتی خودا هیچ خاوەنییەك نیە، تەنانەت بێ بڕواکانیش بۆیان دەردەکەوێ کە هەر خودا خاوەنەو کەسی تر خاوەندیەتی نیە.

ئەو خودایە خودایەکە ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ زاناو ئاگادارە بەسەر نهێنیو ئاشکرادا.

عالەمی غەیب: ئەو عالەمەیە کە لە ئێمە نادیار بێ، عالەمی شەهادە ئەو عالەمەیە کە بە چاو ئێمە دەیبینین. ئیبنو عەبباس دەڵێ: غەیب واتە: نهێنی، شەهادە واتە: ئاشکرا ﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾ پەروەردگار دانایە لە بەدیهێنانو دروست کردندا هیچ شتێك دروست ناکا، هیچ یاسایەك دانانێ ئیللا حیکمەتو بەرژەوەندی تێدایە خەبیرو ئاگادارە بەسەر نیەتو مەبەستی ناو دڵو دەروونو هەموو قسەو باسێك!.

## کێشەو وتو وێژی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ ئازەرداو هۆی وازهێنانی ئیبراهیم لە هاوەڵ دانان بۆ خودا

﴿ ۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً ۖ إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَىٰ كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّي ۖ فَلَمَّا أَفَلَ

قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

لێرە بەولاوە یەزدانی مەزن چیرۆك‌و سەرگوزەشتەی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ ئازەری باوکیدا دەربارەی بەتاڵی‌و هیچ‌وپووچی بتپەرستی‌و بە خودازانینیانمان بۆ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام هەڵوێستی ئیبراهیم بکاتە بەڵگە لەسەر عەرەبە موشریکەکان، چونکە هەموو گەل‌و هۆزێك هەموو نەتەوەو چین‌و توێژێك دان بە ڕێزداریی حەزرەتی ئیبراهیمدا دەنێن، ئیدیعای ئەوە دەکەن کە لەسەر ئایینی ئەون، جوولەکەو گاور بە ڕێزەوە ناوی دەبەن‌و ئیعتیراف بە پلەو پایەی دەکەن، جا کە ئیبراهیم ئاوا بەرەنگاری گەل‌و نەتەوەکەی ببێتەوەو بەو جۆرە موناقەشەیان لەگەڵ بکا دەربارەی بتپەرستی؛ جار لە دوای جار بە بەڵگە بۆڕیان بدا! ئەوە ئەرکی سەرشانی عەرەبەکانە کە خۆیان بە نەوەو وەچەی ئەو دەزانن هەست بە هەڵەی خۆیان بکەن‌و واز لە بتپەرستی بهێنن!! دەی با گوێچکەمان شل بکەین بۆ ئەو بەرەنگاری بوونەوەو موناقەشەیەی ئیبراهیم لەگەڵ گەلەکەیدا کە قورئان تۆماری کردووەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا

آلِهَةً؟﴾ ئەی محمد! یادی ئەوە بکەرەوە، ئەو چیرۆکە بۆ گەلەکەت بگێڕەوە کە ئیبراهیم بە ئازەری[1] باوکی گوت: سەرزەنشتی کردو، رەخنەی لێ گرت، لە شێوەیەکی نارەزای دەربڕیندا وتی: ئایا تۆ بە چ عەقڵێك چەند بتێك دەکەیە خوداو دەیان پەرستی؟! جگە لە خودا طاعەتو بەندایەتی بۆ ئەوان دەکەی؟! لە کاتێکدا خودای حەقو ڕاست (الله)یە ئەو کەسەیە کە بەدیهێنەری تۆو ئەوانیشە، هەر ئەو شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ کردنە، کەسی تر مافی ئەوەی نیە بە خودا حلێب بکرێو بەندایەتی بۆ ئەنجام بدرێ!!.

﴿إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ﴾ بێگومان، من خۆتو گەلەکەت دەبینم لە گومڕایی ئاشکرادان، خۆتو ئەوانەی وەك تۆ بتپەرستی دەکەن، ئەم هەیکەلە داتاشراوو دروست کراوانە بە خودا دەزانن‌و بەندایەتییان بۆ دەکەن، سەرلێ شێواوو نەفامن سەریان لێ تێك چووە، ڕێبازی ڕاستو حەق نادۆزنەوە، لە زەلکاوی نەفامیو نەزانیدا کوێرانە دێنو دەچن، هەڵس‌وکەوتو بیروباوەڕیان بێ بناغەو پووچو بەتاڵە، هەموو خاوەن هۆشو فامێك هەست بە سەرلێ شێواوی ئێوە دەکا، چونکە زۆر ئاشکراو نمایانە! دەی کێ لەو کەسە گومڕاترە چ گومڕاییەك لەوە ئاشکراترە پەیکەرێك بپەرستێ کە لە دار، یان بەرد، یان لە مەعدەنێك دروست کرابێ؟ بێی بەدەستی خۆت پەیکەرێك داتاشی، ئەمجار پلەو پایەی خودایەتی بدەیتێو بیپەرستیو بە پیرۆزی بزانی!! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ، وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ – الصافات/ ٩٥ – ٩٦﴾؟؟ بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە ئادەمیزادێکی خاوەن هەستو هۆشو ئاوەزو بیرو ئەندێشە دارو بەردێکی بێ گیان لە خۆی بە پیرۆزتر بزانێو بیگەیەنێتە پلەی خودایەتیو بیپەرستێ؟ دەی ئێوە چۆن ئەو بتانە دەکەنە خودای خۆتان؟ خۆ ئێوە لەوان

---

[1]- لە بارەی زێدو بنەچەی حەزرەتی ئیبراهیمو ئەو سەردەمو رۆژگارە تێیدا ژیاوە سەیری تەفسیری مەنار ج ٥٣٤/٧ – ٥٤٠دەکرێ.

بەرزترو ریزدارترن، ئێوە عەقڵو هۆشتان هەیە، بتەکان بێ گیانو بێ هەستن، ناتوانن مێشو مێشوولە لە خۆیان دوور بخەنەوە، دەی چۆن ئێوە دەیانکەن بە خوداو دەیانپەرستنو هیوای ئەوەتان پێیانە پارێزگاریتان بکەن، سوودتان پێ ببەخشنو زیانتان لێ دوور بخەنەوە؟! من بێزارمو دوورم لەو بتپەرستیەو ئێوە لە ئەوپەڕی ناپەسەندیو نەفامیدا دەبینم، ریگاتان لێ تێک چووەو سەرلێ شێواوو چارەڕەشو بەدبەختن، سەرەنجامو ئاکامتان چارەڕەشیو بەدبەختی ناو دۆزەخەو من لە ئێستاوە لێتان بێ بەریم!!

جا وەکوو ئاوا گومڕاییو سەلێ شێواوی باوکیو گەلەکەیمان پیشان ئیبراهیم دا، پێمان زاناند؛ کە ئازەرو گەلەکەی لە چ گومڕاییو بتپەرستیو نەفامییەکدان: ئەمجار زیاتر دڵی ئیبراهیممان رەوشەن کردەوە، هەستەکانیمان فراوان کرد، بە شێوەیەکی روونو ئاشکراتر، دەسەڵاتو توانای خودایەتی خۆمانمان پیشاندا ﴿وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ واتە: هەر بەو جۆرە، جار دوای جار گەورەییو فراوانیو رێکو پێکی بوونەوەرمان پیشانی ئیبراهیم دا، وامان لێ کرد بە هەستی روونو تێفکرینی وردو بیری بەرفراوانەوە سەیری مەلەکوتی ئاسمانەکانو زەوی بکا، لە ئەستێرەو رۆژو مانگ سەرنج بدا، لە جۆگەو چۆمو دەریاو کێو دەشتو بیابان رامێنێ، خودایەتی خودایان تێدا بدۆزێتەوە، بە دیهێنەری بە راستی بناسێو بەندایەتی خۆی بۆ رابگەیەنێو ببێتە ئەو پێغەمبەرە ئولولعەزمەی کە نموونەی پیاوچاکانو خوداپەرستانە، ئەو پێغەمبەرەی بە دووربینی خودایی، بەهەستی پاکی، بەدڵی رەوشەنو دەروونی بێ خەوشی بوونەوەری بینی، بەسەر وردیاتو شاراوەی ئاسمانو زەویدا ئاگادار بوو، بۆ ئەوەی لەم رێگەوە بەڵگە لەسەر تاکو تەنیاییو باڵادەستی خودا بهێنێتەوە! مەلەکووتی بەرزاییو زەویمان پیشان دا، گەلێ شتمان پێ ناساند، دەروونیمان گوشاد کرد، تێفکرینیمان راست ئامێز کرد، بەرچاومان روون کرد، شارەزاییمان کرد بۆ رێبازی بەڵگە هێنانەوەو بۆڕدانی بەرامبەرو دژ هەڵوێست، کۆمەکیمان پێ کرد، بوونەوەرو

مەلەکووتمان وەکوو پەڕاوێك خستە بەردەمو خوێندییەوەو تێی گەیشت، ﴿وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ﴾ بۆ ئەوەی دڵنیا بێ، قەناعەتی تەواو پەیدا بکا، کە هیچ کامێك لە بتو ئەستێرەو رۆژ ناشێ ببن بە خودا، ناگونجێ بە خودا بزاندرێن، چونکە هەموویان تازە پەیدا بوون، کاتێك بووە ئەوانە پەیدا نەبوون دوایی بەدی هێنراون؛ بەدیهێنەرێك بەدی هێناون، دروستکارێك دروستی کردوون، هەڵسورێنەرێك هەڵیان دەهێنێو ئاوایان دەکا، چاودێر سەرپەشتیارێك لە هاتووچۆو هەڵسورانیاندا جڵەویان دەکێشێ، ئەو دیاردانە بەڵگەو نیشانەی هەبوونی خودایەکی باڵادەستو بەتواناو زاناو دانان، پەروەردگاریەتی یەزدان دەچەسپێنن، بەڵگەو دەلیلی بەهێزن بۆ بۆڕدانی موشریکە گومڕاو سەرلێ شێواوەکان.

یەقینو دڵنیا بوون: جۆرە زانیارییەکی چەسپاوو قەطعییە دوای لاچوونی شوبهەو گومان بەهۆی تێفکرینو رامانەوە پەیدا دەبێ!

ئەمجار پەروەردگار برێ لەو شتانەی کە پیشان ئیبراهیم درا لە مەلەکووتی ئاسمانو زەوی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا﴾ کاتێك ئیبراهیم شەوی بەسەر هات ئەستێرەیەکی گەورەی پرشنگداری بینی، لە ئەستێرەکانی تر ورشەدارتر بوو، رووناکیو درەوشانەوەی لە ئەستێرەکانی تر جودا بوو، ئەویش یان ئەستێرەی (موشتەری) یان (زوهرە) بووە، جا وەکوو دەڵێن: برێ لە گەلو نەتەوەی ئیبراهیم ئەستێرە پەرست بوون، ئەستێرەی موشتەری گەورەترینو ناسراوترین خودا درۆزنەیەك بوون کە برێ ئەستێرە پەرست لە رۆمانو یۆنانە کۆنەکان دیانپەرستن! گەلو نەتەوەی ئیبراهیمیش لەو سەردەمەدا مامۆستاو پێشەوای ئەستێرە پەرستان بوون، ئیبراهیمیش بەمەبەستی بناغەدانان بۆ موناقەشەو قسە لەگەڵ کردنیانو لە ئاکاما بۆڕدانیان ﴿قَالَ هَذَا رَبِّي﴾ وتی: ئەو ئەستێرەیە خودای منە، کە دروست کراوی ئادەمیزاد نیەو کەس دەستی پێ ناگاو رووناكو پرشنگداریشە! خۆی خستە پێری ئەوانو بەدڵی ئەوان دەدوا، بۆ ئەوەی

بیانخاتە هەڵوێستێکەوە کە دوایی بەڵگەی هێنانەوەیە، یەکسەر بۆڕیان بدا، لەسەرتاوە وای خستە دڵیانەوە کە لەسەر بیروباوەڕی ئەوانەو ئەو ئەستێرەیەی بەلاوە خودایە، پاشان بە بەڵگەی هەست ئامێزو عەقڵی، گەڕایەوە سەریان‌و بیروباوەڕی چەسپاو لە دڵیاندا هەڵوەشاندەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ﴾ کاتێك ئەو ئەستێرەیە جووڵاو ئاوابوو لە پێش چاو ون ئەبوو، وتی: من شتی بێ دەوامی زوو لاچوو ئاوابووم ناوێ‌و خۆشم ناوێ‌و نایپەرستم، چونکە کەسێك سرووشت پاك بێ شتێکی خۆش ناوێ کە بەرقەرار نەبێ‌و بە نەمانی دڵ ناخۆش ببێ، چ جای بیپەرستی! کە پەرستن ترۆپی خۆشەویستیە، عەقڵ‌و هۆشی تەواویش ئەوەی چەسپاندوەو دەیچەسپێنێ، کە پەرستن شیاوی خودایەکی خازرو نزیك‌و بیسەرو بیناو چاودێرە، کە هەمیشە لە هیچ شتێك بێ ئاگا نابێ، لە هەموو شتێکدا نیشانەکانی هەبوونی دیارن، لە هەموو شتێکدا بەڵگەی تاك‌و تەنهایی خودا بدرەوشێتەوەو رەنگ بداتەوە، بەڵام هەرگیز بە چاوی ئاسایی نەبیندرێ چونکە ئەو شتانەی دەبیندرێن دروست کراون‌و هاو وێنەیان هەیە، خوداش لە هیچ شتێك ناچێ، لە هەموو شتێك شاردراوەتەوە، لە هەموو شتێك شوێنەواری دیارە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ – الأنعام/۳﴾ بەکورتی‌و پوختی حەزرەتی ئیبراهیم ئاماژە دەکا بۆ نەزانی‌و نەفامی گەل‌و نەتەوەکەی کە ئەستێرەیان دەپەرست، لەم رووەوە کە شتێکیان دەپەرست ئاوابوون‌و گۆڕان‌و نەمانی بەسەردا دەهات، هیچ ئاگاداری‌و هەست‌و شعورێکیان نەبوو بەرامبەر بەوانەی بەندایەتییان بۆ دەکردن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا – مريم/٤٢﴾.

ئەمجار لە شەوێکی تر داو بۆ هەمان مەبەست‌و بەهەمان هەڵوێستی نەگۆڕی خۆیەوە سەیری مەلەکووتی ئاسمانی کرد ﴿فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـذَا رَبِّي﴾ کاتێ بینی لە ئاسۆوە مانگ هەڵات‌و بە رووناکی خۆی سەر زەوی رەوشەن کردەوە،

وتی: ئەوە پەروەردگاری منە، ئەمەیان ورشەو رووناکی زۆرترە جا ﴿فَلَمَّا أَفَلَ قَـالَ: لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ﴾ کە ئەمیش وەکوو ئەستێرەکە ئـاوابوو ئیبراهیم بەدەنگی بەرز بۆ ئەوەی گەلەکەی گوێیان لێ بێ وتـی: ئەمـەش خودانیـە! خۆئەگـەر پـەروەردگارم شـارەزاییم نـەکاو هیدایـەتم نـەدا بـۆ رێگـای حـەق‌و یەکتاپەرستی ئەمن لە ریـزی گومڕاو سەرلێ شێواواندا دەبم؛ ئەوانـەی رێگایـان لێ گوم بووە، هیدایەتیان نەدۆزیوەتەوە جگە لە خودا شتی تریان پەرستووە، بەمـەش جارێکی تر بە گوێچکەی گەل‌و نەتەوەکەی‌دا دایەوە کە ئەوان لەسەر رێبازی پـوچ‌و بەتاڵن، هەر کەسێك پێـی وابـێ مـانگ شیاوی پەرستنەو بـە خـودا حلێب دەکـرێ، ئەوە گومڕایە! لە هەمان کاتدا ئەوەی پێ راگەیاندن کـە زانینـی عەقیـدەی راسـت‌و بێ غەوش پێویستی بە سروشتی خودایی هەیە، بۆیە لە جاری سێیەمدا ئیـبراهیم بە ئاشکرا بەرائەتو دوورە پەرێزی خۆی لە شەریك دانان بۆخودا راگەیاندو وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي﴾ کاتێ خۆر لە ئاسۆ بەدەرکـەوت رووناکیی بەسەر زەویدا پەخش کرد، لە ئەستێرەو مانگ گەورەترو روونـاکترو بـە سوودتر بوو؛ وتی: ئەمە خودای منە ﴿هَذَآ أَكْبَرُ﴾ ئەمە گەورەترین ئەستێرەیە کە بە ئاسمانـەوە ئێمـە دەیبیـنین، نـوورو روونـاکیی لـە هـەمووان زۆرتـرو بـەهێزترە، شیاوترە بۆ ئەوەی بە خودای خۆمی حلێب بکـەم ﴿فَلَمَّا أَفَلَتْ﴾ کـە ئـەویش وەکـوو ئەستێرەو مانگ ئاوا بوو، ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم داشی سوار بوو؛ کاتی ئەوەی بـۆ رەخسا کە بیروبڕوای خۆی بۆ قەومەکەی ئاشکرا بکاو خۆی لە موشریکەکان دوورە پەرێز بگرێ ﴿قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّـي بَـرِيءٌ مِّمَّـا تُـشْرِكُونَ﴾ وتـی ئـەی گـەل‌و نەتەوەکـەم! دڵنیـابن مـن دوورە پـەرێزم لـە بـت پەرسـتی‌و ئەسـتێرەو مـانگ‌و خـۆر پەرسـتن، هیچیان بە خودا نازانم‌و نایانکەمە گەورەو خۆشەویست‌و پەرستراوی خـۆم ﴿إِنِّـي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًـا وَمَـا أَنَـاْ مِـنَ الْمُـشْرِكِينَ﴾ ئـەمن لـەکاتی پاڕانـەوەو نزاکردنـدا لـە نوێـژو خوداپەرسـتیدا، روو دەکەمـە ئـەو خـودا

کردگـارەی کـە ئاسمانـەکانو زەوی بـەدی هێنـاون، رووی خـۆم وەردەگێـڕم لـە گومڕاییو روو لەحەق دەکەم، بە لێبڕاویو راستاڵانە ئایینی راست پەیڕەو دەکەم، ئایینێك بریتی بێت لە یەکتاپەرستی، بێ بەریم لە کۆمەڵی موشریکەکان؛ ئەوانەی لەگەڵ خودادا خودای تر دەپەرستن. بەڵکوو من بە دیهێنەری ئەستێرەو مانگو خۆرو ئاسمانەکانو زەوی دەپەرستم؛ ئەو کەسەی هەڵیان دەسوڕێنێو دەیانهێنێو دەیانبا، ئەو خودایەی بەدیهێنەری هەموو شتێکە، خاوەنو خودای هەموو شتێکە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ – الأعراف/٥٤﴾.

ئەوەی لە ئایەتەکانی رابوردوو وەردەگیرێ ئەوەیە کە نەتەوەی ئیبراهیم بتەکانیان بە خودا دەزانین، پێیان وابوو: شیاوی پەرستنن! ئەستێرەو مانگو خۆریشیان بە ئیلاهو ئەرباب دەزانین، واتە: پێیان وابوو؛ ئەوانە گەورەو خاوەنو هەڵسوڕێنەرو رۆڵگێڕن لە بوونەوەردا، حەزرەتی ئیبراهیم ئەوەی بۆ روون کردنەوە: کە ئولوهییەتو ربوبیەت هەردووکیان تایبەتن بە خودای کردگارەوەو جگە لە خودای مەزن، بوونەوەر ئیلاهو رەببی تری نیە!.

بە کورتیو پوختی حەزرەتی ئیبراهیم کەوتە قسە لەگەڵیانو بە هێدیو لەسەرخۆی خۆی بۆ دوژمنو بەرامبەرکەی شل کردو لەگەڵیاندا رۆیی، تا گەییشتە مەبەستو ئەمجار لێیان وەدەست هاتو بۆڕی دان...!

## بنەمای داهێنانی پەرستنی غەیری خودا لە بەردو دارو ئەستێرەو مانگو خۆر دوو شتە:

١- برێ نەفامو عەقڵ سووك برێ دیاردەی دەسەڵاتی خودایان لە هەندێ شتدا بەدی کردووە، ئیتر پێیان وابووە ئەو دیاردە هی زاتی ئەو شتە خۆیەتیو پابەندی سوننەتو یاسای یەزدانی نیە، ئیتر ئەو شتەیان بە خودا زانیوەو پەرستوویانە!.

ب- برێ مەخلوقات ئەو دیاردە تایبەتییانەیان کردنە هۆکار بۆ پەیوەندی کردن – لە بارەی سوودو زیانەوە – بە خودای کردگارەوە، وایان گومان برد، کە پەرستنی ئەو خاوەن دیاردانە هۆکارێکە بۆ رەزامەندیی خودا ئەو پەرستراوە جۆراو جۆرانە لای خودای مەزن دەبنە شەفاعەتکار بریان.

ئەمجار دوایی هاتوون لە شوێنی ئەو مەخلوقاتە پەرستراوانە پەیکەریان داهێنان، بتو صەنەمیان دروست کردن دەستیان کرد بە پەرستنیانو طاعەت بۆ کردنیان.

بێگومان گەلی ئیبراهیم لە بتپەرستیدا ئەوەندە تێگەیشتبوون کە بتو صەنەمەکان هیچ نابینن‌و نابیستن‌و توانای سوود پێ گەیاندن‌و زیان لێدانیان نیە، هەر ئەوەندە بوو لاسایی باوك‌و باپیرانیان دەکردەوەو کوێرانە بتپەرستیان ئەنجام دەدا، بۆیە بتەکانیان بە خودا دەزانین‌و دەیانپەرستن‌و بەس!پێیان وانەبوو! کاریگەرو رۆڵی بەرچاویان لە بوونەوەردا ببێ، لەبەر ئەوە ئەستێرەو مانگ‌و خۆریان بە خوداو رەب دەزانین، پێیان وابوو: ئەوان کاریگەریان هەیە لەسەر ئادەمیزادو دەوروبەری لە زەویدا، بروایان وابوو: خۆر بەخێوکەرو بژێوەدەری ئادەمیزادە، پێیان وابوو: مانگ کاروباری پاشاکان هەڵدەسورێنێ، گیانی ئازایەتی‌و پیاوەتیان پێ دەبەخشێ یارمەتی سوپاییان دەداو دوژمنیان تێك دەشکێنێ، هەروەها وایان دەزانی ئەستێرەی موشتەری پاشای خوداکانە، خاوەن‌و خودای دادوەری‌و یاسایە، پارێزەری ئەو دەرگایانەیە لە خەڵکی، بۆ یەکالا کردنەوەی کێشەکانیان تێیدا ئامادە دەبن، ئەستێرەی مەریخیشیان بە خودای نێچیرو دەسەڵاتی جەنگ دەناسی، ئەستێرەی زوهرەشیان بە خودای کەیف خۆشی‌و خۆشبەختی‌و کامەرانی دەزانی، پێیان وابوو ئەستێرەی (نیو) عەطارید خودای عیلم‌و دانایی‌یە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین کە هەڵوێستی حەزرەتی ئیبراهیم هەڵوێستێکی لێزانانەو موناقەشەو موجادەلە ئامێز بوو، بە رواڵەت چووبووە پۆشاکی

ئــادەمیزادێکی بــێ بــاوەڕەوە کــە هــەوڵی دۆزینــەوەی خــوداو بەدیهێنــەری راسـتەقینەبدا، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە دیاردەکـانی بوونـەوەررامێنـێو وردبێتـەوە! ئەگینا لە حەقیقەتو راستیدا حەزرەتی ئیبراهیم کەسێك نەبووە شكو گومانی لـە چەسپاندنی خودایەتی خوداو ربوبییەتـدا هەبێ، ئـەوەتا پـەروەردگار نـاوا وەسـفی ئەو زاتە پیرۆزەمان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّـا بِـهِ عَالِمِينَ، إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِـي أَنـتُمْ لَهَـا عَـاكِفُونَ – الأنبيـاء/ ٥١ – ٥٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ حَنِيفًا وَلَـمْ يَـكُ مِـنَ الْمُـشْرِكِينَ، شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ، وَآتَيْنَاهُ فِي الْدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُ فِـي الآخِـرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ، ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًـا وَمَـا كَـانَ مِـنَ الْمُـشْرِكِينَ – النحل/ ١٢٠ – ١٢٣﴾. یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّـي إِلَـى صِـرَاطٍ مُّـسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – الأنعام/١٦١﴾.

ئیمـامی موسـلیمو بوخـاری لــە ئــەبو هـورەیرەوە فەرموودەیـەکیان ریوایـەت کردووە؛ دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: «كُـلُّ مَوْلُـودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ» لە صەحیحی موسلیمدا فەرموودەیـەکی تـر هەیـە کـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ» ئایـەتێکی تـر هەیە دەفەرموێ: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ – الروم/٣٠﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِـن بَنِـي آدَمَ مِـن ظُهُـورِهِمْ ذُرِّيَّـتَهُمْ وَأَشْـهَدَهُمْ عَلَـى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى – الأعراف/١٧٢﴾.

جا ئەگەر ئەمە حاڵو چۆنیەتی باقی ئادەمیزادانی تـر بـێ، ئـەدی دەبـێ چـۆن ئیبراهیمێك کە بە خەلیلورەحمان ناو دەبرێو قورئان بـە (حنیـف)و (قانـت) نـاوی بردووە بە گوێرەی قورئـان هـەرگیز حـەزرەتی ئیـبراهیم شـەریکی بـۆ خـودا قـەرار نـەداوەو پیاوێـك نـەبووە لـە مـەقامو پلەوپایـەی گومانـدا بـێ‌و! لـە ئەسـتێرە پەرسـتییەوە بگاتــە خوداپەرسـتی!؟ کـەوابێ هـیچ شـكو گومـانی تێـدا نیـە کـە

حەزرەتی ئیبراهیم ئەستێرەو مانگو خۆری بە خودا نەزانیوە، بەڵام کە بەرواڵەت تێیان فکریوەو دانی بە خودایەتییاندا ناوە، ئەوە بۆ بۆڕاندنی قەومە موشریکەکەی بووە، ویستوویە بە قسەو بیروباوەڕی خۆیان ڕێگایان لێ بگرێو دەمکوتیان بکاو بەسەریاندا زاڵ ببێ!

## کێشەی نێوان حەزرەتی ئیبراهیمو گەلەکەی

﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۗ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ (٨٠) وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗاۚ فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ (٨١) ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ (٨٢) وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ (٨٣) ﴾ .

جا کە حەزرەتی ئیبراهیم لە رووی بەڵگەو موناقەشەوە رێگای لێ بڕینەوەو بۆڕی دان، ئەمجار پەنایان بردە بەر بەڵگەی لاوازترو نەفامانەتر ئیتر لەبەر نەفامیو نەزانی یا بەهۆی لاسایی کردنەوەیان بۆ باوكو باپیریان لەبەر ترسی نەمانی پلەو پایەو مڵكو سامانی جیهانی دەستیان کرد بە موناقەشەو موجادەلە لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیمدا وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَحَآجَّـهُ قَوْمُـهُ﴾ نەتەوەکەی ئیبراهیم دەستیان کرد بە موجادەلە کردن لەگەڵیدا، لەبەرامبەر بەڵگە بەهێزەکانی ئیبراهیمدا بەڵگەی لاوازیان دەهێنانەوە!! سەیرە ئەو بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرو بەگوێرەی ئاستی هۆشو بیریان تاكو تەنیای خودای بۆ دەچەسپاندنو پێی دەسەلماندن کە بەندایەتی کردنو طاعەت هەر دەبێ بەتەنیا بۆ خودابێ! ئەوانیش بەڵگەی گوماناویو لاوازیان دەخستە ڕوو؛ دەیانگوت هەبوونی چەند خودایەكو بە خودا زانینی ئەستێرەو مانگو خۆر چ دژایەتی لەگەڵ بڕوا بە خودا نیە، چونکە ئەو خودایانە لای خودا شەفاعەتمان بۆ دەکەن؛ کوێرانە لاسایی باوكو باپیری خۆیان دەکردەوە، ئیتر ئیبراهیم ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە سوورە لەسەر هەڵوێستی خۆیو ئەو بەڵگە لاوازانەی ئەوان کاری تێ ناکەن ﴿قَـالَ أَتُحَـاجُّونِّي فِـي اللَّـهِ﴾ ئایا ئێوە دەربارەی خودا کێشەم لەگەڵ دەکەنو دەتانەوێ بیروباوەڕی پڕوپووچی ئێوە پەسەند بکەمو جگە لە خودا شتی تر بە شیاوی خودایەتی بزانم؟! ئەوەتان بەلاوە سەیرە کە من دەڵێم: جگە لە خودا خودای تر نین؟ دەتانەوێ لەو بڕیارە لەو بیروباوەڕە ژێوان ببمەوە؟ ﴿وَقَـدْ هَـدَانِ﴾ وەلحاڵ ئەو خودایە رێگای هیدایەتی نیشانی من داوە، بیروباوەڕی حەقو ڕاستی خستۆتە دڵو دەروونمەوە، من دڵنیام لە ڕاستی بیروباوەڕی خۆمو، دەزانم کە من لەسەر حەقو ڕاستیم! دەی چۆن گوێ بۆ بیروباوەڕی بێ بناغەی ئێوە دەگرم، چۆن خۆم وەکوو ئێوە گومڕا دەکەم؟ چۆن شوێن لاسایی کردنەوەی ئێوە بکەوم؟ ئێوە بەبێ بەڵگە لاسایی باوكو باپیرانتان دەکەنەوە من چۆن شوێن ئێوە دەکەوم؟!

بەڵگە لەسەر بێ بناغەیی‌و پڕوپووچی بیروباوەڕی ئێوە ئەوەیە: ئەم خوا درۆزنانەی ئێوە دەیانپەرستن هیچیان پێ ناکرێ! چ کاریگەرییەکیان لە بوونەوەردا نیە دەی چۆن بە خودایان بزانم؟! دڵنیا بن من بە خودایان نازانم‌و ﴿وَلاَ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِ﴾ ناترسم کە لە عیلمی خودادا هاتنە خوارەوەی بەڵاو موصیبەتێك لەو شتانەوە بۆ من بەهۆی هۆکارێکەوە چەسپابێ‌و من تووشی ئەو نارەحەتییە ببم‌و زیانم وێ بکەوێ! ﴿أَفَلاَ تَتَذَكَّرُونَ﴾ ئایا ئێوە دوای ئەو روون کردنەوەو شی کردنەوەیەش تێنافکرن‌و ورد نابنەوەو بیرناکەنەوە: کە خوداکانتان هیچیان بەدەست نیە؟ نە دەتوانن زیان بگەیەنن نە دەسەڵاتی سوود بەخشینیان هەیە!! دەی کەوابێ ئێوە بۆچی بیرناکەنەوە هەتا بزانن کە ئەوانە ناتوانن زیان بە من بگەیەنن یان سوودم پێ بگەیەنن، دەسەڵاتی باڵا بۆ خودا خۆیەتی، جگە لە زاتی پاکی کەسی تر هیچی بەدەست نیە، جا ئەگەر پەروەردگار بڕێ سوودی بەخشی بە دروستکراوێکی یان دوورخستنەوەو بەرگری کردنی زیانی پێ دەبەخشێ، ئەوە نابێتە هۆی ئەوە: کە ئەو دروستکراوە لە پلەی دروستکراوەوە بەرز بکرێتەوە بۆ پلەو پایەی خودایەتی‌و پەرستن.

دوای ئەوەی ئیبراهیم رایگەیاند کە لە خودا درۆزنەکانیان ناترسێ، بەڵکوو تەنها لە خودا دەترسێ، ئەمجار سەرسوڕمانی خۆی راگەیاند لەوەی کە نەتەوەکەی ئەو لە خوداکانیان دەیترسێنن‌و بۆ خۆشیان لە خودای مەزن ناترسێن، کە حەق وایە لێی بترسێن‌و جێی خۆیەتی: فەرمووی: ﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلاَ تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا﴾ چۆن من دەترسم لەو خودا درۆزنانەی ئێوە کردووتانن بە هاوبەشی خوداو پێتان وایە سوودو زیانیان بەدەستە، لە حاڵێکدا ئێوە ناترسن لەوەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، ناترسن لەوەی دروستکراوێك دەکەنە هاوتای خودای زاناو داناو بەدیهێنەر کە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر بەخودا زانینی ئەو شتانەی ئێوە بە خودایان حسێب دەکەن، عەقڵ‌و هۆشیش ناتوانن هاوەڵ بۆ خودا بە رەوا بزانن، عەقڵی تەواو رێگە نادا بڕیاری ئەوە بدرێ

کە خودا هاوەڵی هەبێ لە بوونەوەردا هاوبەشی کارەکانی بکا، بێگومان بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی ئەوە دەگەیەنن کە خودا خودایەکی تاکو تەنیاو فەردو صەمەدە، کەوابوو شەریك دانان بۆ خودا کە ئێوە پەیڕەوی دەکەن ئەوە شیاوی ئەومیەو جێگای ئەومیە: کە ترسی لێ بکرێ؛ نەك من بترسم لە بتەکانی ئێوە، من چۆن لە مردووی بێ گیان بترسم، ئێوە لە خودای خاوەن دەسەڵاتو توانا ناترسن؟! جا کە ئەمە حەقیقەتو راستی بێ ﴿فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ج تاقمو گروپێکتان شیاوی ئەومیە کە لە سزای خودا ئەمین بێ، کۆمەڵی یەکتاپەرستان، یان کۆمەڵی موشریکەکان؟ کام تاقمو کۆمەڵیان لایەقی ئەومیە: کە لە ئاکامی بیروباوەڕی خۆی دڵنیابێ؟! کام دەستەیەیان رێبازی راستی پەیڕەو کردووەو لەسەر حەقە؟ ئایا ئەو کەسەی بەندایەتی بۆ خودایەك دەکا؛ کە خاوەنی هەموو شتێکەو سوودو زیانی بەدەستە، لەسەر حەقە؟ یان ئەو کەسەی شتێك دەپەرستێ کە هیچی بەدەست نیە؟! کام لەم دوو کۆمەڵە شیاوترە بە دڵنیاییو ئاسایش، کۆمەڵی یەکتاپەرست یان کۆمەڵی موشریكو ناڕاست، ئەگەر ئێوە خاوەنی زانستو تێفکرینن‌و شت دەزانن؟؟! بۆیەش لە شوێنی ﴿أَيُّنَا أَحَقُّ بِالأَمْنِ﴾ رستەی ﴿أَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالأَمْنِ﴾ی هێنا تا ئاماژە بێ کە ئەم بەرامبەری کردنە گشتیەو هەموو یەکتاپەرستێكو موشریکێك لە هەموو کاتو ساتو شوێنێك دەگرێتەوە، نەك هەر تایبەت بێ بەو کۆمەڵەی سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم، هەروەها بۆ ئەوەی راستەوخۆ پانەوپان هەڵەیان نەخاتە ئەستۆو تاوەکوو باش گوێی بۆ بگرنو پەنا بۆ رقەبەریی نەبەن!!

ئەمجار پەروەردگار بە شێوەیکی روونو ئاشکرا کۆمەڵی شیاو بە ئەمنو ئاسایش دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ ئەوانەی شیاوی دڵنیاییو ئەمنو ئاسایشن لە دونیاو لە قیامەتدا کە بڕوایان بە هەبوونو تاکو تەنیایی خودا هەیە، بە لێبڕانو دڵسۆزییەوە بەندایەتی خودا دەکەن، هیچ شتێك ناکەن بە هاوبەشو هاوەڵی، بیروباوەڕیان تێکەڵ بە

ستەمو تاوانباری ناکەن، بڕوایان بە خودا بڕوایەکی تۆکمەو دامەزراوە، هاوبەشی بۆ دانانێن.

ئیمامی ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو تیرمیذی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕنەوە: دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ﴾ هاتە خوارێ، هاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کرد وتیان: باشە قوربان کێ هەیە ستەمی لە نەفسی خۆی نەکردبێ؟ واتە: کێ هەیە تاوانی نەکردبێ؟ ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ – لقمان/١٣﴾ هاتە خوارێ ئەمە ریوایەتی ئیمامی بوخاریە! ریوایەتی ئیمامی ئەحمەد بەم جۆرەیە: دەڵێ ئایەتی ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ﴾ هاتە خوارێ، زۆر لەسەر شانی خەڵکەکە قورس بوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کێمان هەیە ستەم لە خۆی نەکا؟! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەبەست ئەوە نیە کە تێی گەیشتوون! ئایا ئێوە وتە پیرۆزەکەی بەندەی مەردو راستاڵی خوداتان نەبیستووە کە بە کوڕەکەی گوت: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ – لقمان/١٣﴾. واتە: مەبەست لە (ظلم) لە ئایەتەکەدا هاوبەش دانانە بۆ خودا! ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا﴾ ئەو بەڵگە بەهێزانەی کە ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر بێ) هێنانیەوە بۆ گەلەکەی هەر لە ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ﴾ تا دەگاتە ﴿وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ بەڵگەی ئێمە بوون ﴿آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ﴾ بە ئیبراهیممان بەخشین و فێرمان کرد بۆ ئەوەی بیکات بە رابەرو بەڵگە ﴿عَلَى قَوْمِهِ﴾ بەسەر گەلەکەیداو قەناعەتیان پێ بکاو واز لە رێبازی پووچی خۆیان بێنن و بێنە سەر رێگای حەقو خواپەسەند! ﴿نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ﴾ هەرکەسێك لە بەندەکانی خۆمان بمانەوێ بەرزی بکەینەوە، پلەوپایەی بدەینێ دەیدەینێ، لە دونیا پلەی زانستو دانایی پێ دەبەخشین و پلەی ئیمانو باوەڕی دەدەینێ، پلەی زانیاریی و دانایی، پلەی پێغەمبەرایەتی و رابەری دەدەین بە کەسانێك پەسەندیان بکەین و هەڵبژێراوی خۆمان بن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى

بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ – البقرة/٢٥٣﴾. لە قیامەتیشدا پلەوپایەی بەهەشتیان پێ دەبەخشین بە کامو مورادی خۆیان دەگەن، مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە: کە پەروەردگار بە بەخشینی بەڵگەی بەهێزو جۆراو جۆر پلەوپایەی حەزرەتی ئیبراهیمی بەرز کردەوە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ﴾ دڵنیابە خودای تۆ، دانایە لە گوفتارو کرداردا، هەموو وتەیەکی لە شوێنی خۆیەتیو هەموو کردەوەیەکی لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدا ﴿عَلِيمٌ﴾ زاناو ئاگادارە بە کاروباری دروستکراوانی، دەزانێ کێ شیاوی هیدایەت دانە، شارەزای دەکا، کێ شیاوی گومراییە سەری لێ دەشێوێنێ، چونکە کابرا بە ویستی خۆی ڕێگای ناراست دەگرێو گومرایی هەڵدەبژێرێ، خوداش داخوازییەکەی بۆ دێنێتە جێ! ئەوانە لە زانستی خودادا وا تۆمار کراون کە ڕێبازی گومرایی دەگرنە بەرو نایەنە سەر ڕێگای هیدایەت وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ جَاءتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ – یونس/٩٦ – ٩٧﴾. پەروەردگار بەگوێرەی دانایىو زانیاری خۆی پلەوپایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە کە شیاوی ئەو ڕێزلێنانو پلەو پایەیەن نەك لە گۆترەو هەرەمەکی، چونکە هەموو کردارو گوفتارێکی خودا پاكو بێ عەیبن، بە هەوانتەو بێ نەخشە نین.

ئەوە تێبینی دەکرێ؛ ناسینی خودا بە شێوەی تەواو بە نیگاو سرووش نەبێ پەیدا نابێ، ناسینی پێغەمبەران بۆ خودا زانینێکی زەروورىو ئاشکراو نمایانە، ڕووناکاییەکە دەخرێتە دڵیانەوەو دەروونیان ڕەوشەن دەکاو هەموو بەڵگەیەکی عەقڵىو نەقڵی بەهێزیان فێر دەکاو بەچاویان ڕوونو ئاشکرا دەبێ، بەجۆرێك بۆ ئەرکی پێغەمبەرایەتی شیاو بن!.

**ئیبراهیم باوکی پێغەمبەرانەو هەموویان لەسەر ڕێبازی ئەون**

﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ

أَسْئَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار سەرگوزشتەی حەزرەتی ئیبراهیمی بۆ گێڕاینەوە (سەلامی خودای لێ بێ) کە چۆن بە بەڵگەی بەهێز بەرامبەرەکانی خۆی بۆڕدان‌و بەسەریاندا زاڵ بوو، هەبوونی خوداو تاک‌و تەنیایی پەروەردگاری چەسپاند! ئەمجار جۆرەکانی نیعمەت‌و ئیحسانی خۆی بەسەر ئیبراهیمدا دەژمێرێ، یەکەمیان ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ﴾ دووەمیان ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ﴾ سێیەمیان ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا﴾ ئیسحاق‌و یەعقوبمان بە ئیبراهیم بەخشی، واتە: پەروەردگار رێزی لە ئیبراهیم گرت (سەلامی خودای لێ بێ) دوای ئەوەی کەوتەساڵەوەو پیری پێوە دیار بوو، خۆی‌و خێزانی بە هیوای ئەوە نەبوون تازە منداڵیان ببێ، کەچی فریشتە هاتنە لای‌و مزگێنی ئەومیان پێ دا: کە کوڕی دەبێ، فریشتەکان لەکاتی چوونیان بۆسەر گەلی لوط بۆ لە ناو بردنیان لایاندایە لای حەزرەتی ئیبراهیم‌و مزگێنی بەخشینی کوڕێکیان پێدا، ناوی ئیسحاق دەبێ، سارا خاتوون سەری سوڕماو بەلایەوە شتێکی نائاسایی بوو، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَاْ عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ، قَالُواْ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ رَحْمَتُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ – هود/٧٢ – ٧٣﴾.

مزگێنی ئەوەشیان پێدا کە ئیسحاق دەکرێتە پێغەمبەریش، هەروەها کوڕو نەوەو وەچەی لێ دەکەونەوە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ – الصافات/١١٢﴾. ئەمەش ئەوپەڕی مزگێنی‌و دڵ خۆشی کردنەو گەورەترین نیعمەتە، لەوەش خۆشتر ئەوە بوو: کە مزگێنی ئەومیان پێدا

که ئیسحاقیش کوڕی دەبیو ناوی یەعقوبی لێ دەنێو وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَقَ وَمِن وَرَاء إِسْحَقَ يَعْقُوبَ - هـود/٧١﴾. ئەم کوڕ پێ بەخشینە لەکاتی پیریدا پاداشو موکافەئە بوو بۆ ئیبراهیم (سەلامی خودای لێ بێ) لە پاساوی ئەوەدا: کە لە نەتەوەکەی گۆشەگیر بووە، وازی لێ هێنانو زێدو نیشتمانی بەجێ هێشتو بەرەو ئەو وڵاتو شوێنەی خودا فەرمانی پێ کردبوو کەوتە ڕێ، ئیتر پەروەردگار قەرەبووی دووره وڵاتیو گۆشەگیری لە خزمو کەسوکاری بەوە بۆ کردەوە؛ کە منداڵی صاڵحو خواناسو بەوەفای پێ بەخشین، بۆ ئەوەی ببنە فێنکایی چاویو بیرۆشی پێ بێن! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا - مريم/٤٩﴾. لێرەشدا فەرمووی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاً هَدَيْنَا﴾ ئیسحاقو یەعقوبمان پێ بەخشین، چونکە کوڕی کوڕیش بە کوڕ حلێب دەکرێ، هەردووکیانمان هیدایەت دانو شارەزامان کردن، وەکوو چۆن ئیبراهیممان هیدایەت داو پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیو حیکمەتو زیرەکیو بەهێزی بەڵگە هێنانەوەمان پێ بەخشی! بۆیەش هەر باسی ئیسحاقی کردو باسی ئیسماعیلی نەکرد، چونکە تەنها ئیسحاق بوو وەکوو موعجیزەو بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بە ئیبراهیم بەخشرا، چونکە لەو کاتەدا ئیبراهیم بۆخۆی پیر بووبوو، سارە خاتوونی خێزانیشی گەیشتبووە حاڵەتی لە سك وەستانەوەو نائومێدیو بە خەیاڵیاندا نەدەهات تازە منداڵیان ببێ، بەڵام پەروەردگار لە پاداشی بیروباوەڕی راستیو چاکەکاری لەگەڵ خەڵکداو رێكو پێکیو موسوڵمانیەتیو ئیخلاصدا، هەروەها دەرچوونی لە تاقیکردنەوەی سەربڕینی ئیسماعیلی کوڕیدا، کە لەسەردەمی پیریدا فەرمانی پێ کرا بە سەربڕینی ئیسماعیلو کردنی بە قوربانی، ئەویش یەکسەر بەمەبەستی جێبەجێ کردنی فەرمانی پەروەردگار ئیسماعیلی پاڵ خستو ویستی سەری ببڕێ، بەڵام یەزدانی میهرەبان قوربانی بۆ ناردو کارەکەی ئیبراهیمی پەسەند کردو ئیسماعیل لە سەربڕین رزگاری بوو. لە پاداشی ئەو جۆرە هەڵوێستو کارانەیدا

خودا لە حاڵەتی پیریدا ئیسحاقی پێ بەخشی. هۆیەکی تریش هەیە: بۆ ئەوەی کە هەر باسی ئیسحاقی کردو باسی ئیسماعیلی نەکرد، هۆیەکەش ئەوەیە، لێرەدا مەبەست بەم باس کردنە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیلین ئەوانیش هەموویان لە نەوەی ئیسحاق‌و یەعقووبن! حەزرەتی ئیسماعیل جگە لە حەزرەتی موحەممەد هیچ پێغەمبەرێکی تری لێ نەکەوتووەتەوە.

حەزرەتی ئیبراهیم لە نەوەی حەزرەتی نووحە، جا وەکوو چۆن هیدایەتی ئیبراهیممان دا ﴿وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ﴾ لە پێش ئەودا هیدایەتی نووحمان دا کە باپیری بوو، خودا نیعمەتی پێغەمبەرایەتی‌و دانایی لە کارو گوفتاریدا پێ بەخشی؛ ئەمەش نیعمەتێکی گەورەو مەزنە، پلەو پایەی حەزرەتی ئیبراهیم دەست نیشان دەکا! مەبەست ئەوەیە: کە بنەچەی ئیبراهیم رێزدارترین‌و پاك‌و خاوێنترین بنەچەیە، چونکە پەروەردگار کوڕی وەکوو ئیسحاقی پێ بەخشی، کوڕەزای وەکوو یەعقوبی دایێ، هەموو پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل لە وەچەی ئەم دوو پێغەمبەرانەن، ئیبراهیم بۆخۆشی لە پشتی پێغەمبەرانی بەرێزو پاك‌و خاوێنی وەکوو نووح‌و ئیدریس‌و شیت پەیدا بووە، باوك‌و باپیرانی پێغەمبەر بوون‌و کوڕو کوڕەزاو وەچەیان پێغەمبەر بوون، ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ حەزرەتی داوودو سولەیمان‌و ئەیوب‌و یونس‌و مووساو هاروون هەموویان لە نەوەو وەچەی حەزرەتی ئیبراهیمن، ئێمە بەو چەشنە پاداشی پیاوچاکان دەدەینەوەو پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی‌و حیکمەت‌و زانست دەبەخشین بە وەچەو نەوەکانیان.

هەندێك دەڵێن: راناو لە ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِ﴾ دەچێتەوە بۆ حەزرەتی نووح نەك حەزرەتی ئیبراهیم چونکە قاعیدەیەکی نەحوییان هەیە دەڵێ کە راناو دوو مەرجەعی هەبوون، یەکێکیان دوورو یەکیان نزیك، بۆ نزیکەکەیان بگەڕێتەوە باشترە، هەروەها چونکە لوط‌و یونس بەوەچەی ئیبراهیم حلێب ناکرێن هەروەها کوڕ بە(ذرية - وەچە) نازمێردرێ، ناگونجێ بگوترێ ئیسماعیل وەچەی ئیبراهیمە؛

بەڵام ئەم قسەی دوایی وەرناگیرێ چونکە زانایانی زمان دەڵێن (ذریـة) واتـە: نـەوە، ئیتر کوڕو کچی خۆی بێ یان لە وان بەرەو خوارتر بێ!

بـڕێکیش دەڵـێن: (ذریـة) بـۆ بنەچـەو نـەوە بـۆ هـەردووکیان بـەکار دەهێنـرێ بەڵگەشیان ئایەتی ﴿وَآيَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْـكِ الْمَـشْحُونِ﴾ ئەمـە ئەگـەر مەبەست بە ﴿الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ کەشتیەکەی حەزرەتی نووح بێ.

ئەوانەی کە رایان وایە: راناوی (من ذريته) بۆ ئیبراهیم دەچێتەوە نـەك نـووح؛ بەڵگـەیان ئەوەیـە دەڵـێن: باسـەکە باسـی حـەزرەتی ئیبراهیمـە باسـی نیعمەتـەکانی خودایە کە بە ئیبراهیمی بەخـشیوون، کـە باسـی نووحیـشی هێنـاوە بـۆ رێزلێنـانی ئیبراهیمە بۆ ئەوەی رای بگەیـەنێ کـە باپیریـشی نـووح بـووە، هـەروەها چونکە لـە ئایەتی تردا پەروەردگار ئەوەی راگەیانـدووە کـە پـەڕاوی ئاسمانـیو حیکمـەتی داوە بە وەچەو نـەوەی نـووحو ئیـبراهیمو لـە کوڕو نەوەکانیانـدا زۆر پێغەمبـەر پەیـدا بوون، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَـلْنَا نُوحًـا وَإِبْـرَاهِيمَ وَجَعَلْنَـا فِـي ذُرِّيَّتِهِمَـا النُّبُـوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِـنْهُم مُّهْتَـدٍ وَكَـثِيرٌ مِّـنْهُمْ فَاسِـقُونَ – الحديـد/٢٦﴾. هـەروا قورئـان نـاوی پێغەمبەرەکان تۆمار دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَـى وَعِيـسَى وَإِلْيَـاسَ كُـلٌّ مِّـنَ الصَّالِحِينَ وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ ئـەوەی تێبینـی دەکرێ لەم سێ ئایەتـەدا چوارده پێغەمبـەری تۆمـار کـردوون بـەڵام نـەهاتووە بـە گوێرەی مێژوو ریزبەندیان بکا، یان بە گوێرەی پلەو پایەو مەناقیب تۆماریان بکا، چونکە قورئـان کتێبێکـی مێـژووی نیـە رووداو تۆمـار بکا، هـەروەها پـەڕاوی پێـدا هەڵـدانو مـەناقیب نیـە، بـەڵکوو کتێبـی هیدایـەت دانو پەنـدو ئامۆژگـاریو رەهنومایی کردنە.

بـڕێ لـە زانایـانی تەفسیر دەڵـێن: حیکمـەتی ئـەو شـێوە ریـز کردنـەی قورئـان ئەوەیـە: پـەروەردگار پێغەمبـەرەکانی کـردوون بـە سـێ بـەش هـەر بەشـەیانو تایبەتمەندییەکیان هەیەو لە شتێکدا هاوبەشن.

بەشی یەکەم: کە ڕێزداران حەزرەتی (داوودو سولەیمان و ئەییوب و یوسف و مووساو هاروون)ن، ئەمانە پەروەردگار دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەرایەتی و رابەری پێ بەخشیوون، حەزرەتی داوودو سولەیمان وێڕای پێغەمبەرایەتی پاشاو خاوەن دەسەڵات و خاوەن سامان بوون، حەزرەتی ئەییوب وێڕای پێغەمبەرایەتی فەرمانڕەواو خاوەن سامان بوو، حەزرەتی یوسف سەرباری پێغەمبەرایەتی وەزیری و فەرمانڕەواو پارێزگار بووە، بەڵام ئەم دوو بە ڕێزە تووشی بەڵاو موصیبەت بوون صەبریان گرت، کەوتنە خۆشی و بەختەوەرییەوە سوپاسگوزار بوون. حەزرەتی مووساو هاروونیش وێڕای پێغەمبەرایەتی فەرمانڕەوا بوون؛ بەڵام نەگەیشتنە پلەی پاشایەتی، هەردوو پێغەمبەرێك لەم بەرێزانە تایبەتمەندییەکیان هەیە، تەرتیب لە نێوان ئەو جووت جووتانەدا ئەوەیە: لە پلەو پایەی دونیاییدا لە پلەو پایەی بەرزەوە بەرەو نزمی دێتە خوارێ؛ لە پلەو پایەی ئایینیدا ڕەنگە لە نزمییەوە بەرەو بەرزی بڕۆن! داوودو سولەیمان بەختەوەری ژیانی دونیایان و دەسەڵات و فەرمانڕەواییان زۆرو بەرفراوان بووە، حەزرەتی ئەییوب و یوسف بەو ڕێژەیە نەیان بووە، حەزرەتی مووساو هاروون لە ئەییوب و یوسفیش کەمتریان بۆ گوونجاوە، بەڵام لە رووی ئایینیەوە وا دیارە حەزرەتی مووساو هاروون پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی و ماندوبوون و بەری ماندوبوونەکەیان زۆرتر سوودبەخش بووە، حەزرەتی ئەییوب و یوسف لەم بارەوە نەگەیشتوونەتە ئەوان و ئەو پلەو پایەیان بەو جۆرە پێ نەدراوە، بەڵام ئەمان واتە: ئەییوب و یوسف چونکە لەکاتی بەڵاو موصیبەتدا خۆڕاگر بوون و لە ئاکامی ژیانی کامەرانی و خۆشگوزەرانیدا سوپاسگوزار بوون، لە حەزرەتی داوودو سولەیمان پلەیان بەرزتر بووە؛ بۆیە پەروەردگار لە دوای ناوهێنانی ئەو پێغەمبەرە بەرێزانە فەرمووی: ﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: لە پاداشتی راستاڵییاندا نیعمەت و خۆشگوزەرانی و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی وێڕای شارەزایی بوون و ڕەهنومایی کردنی ئایین و خەڵك خستنە سەر ڕێگای باشمان پێ بەخشیوون.

بەشی دووەم: ڕێزداران حەزرەتی (زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاس)ن، ئەمانەش تایبەتمەندیی ئەومیان هەیە: کە زۆر زاهیدو دونیا نەویس بوون، گوێیان بە خۆشیو ڕابواردنی دونیا نەداوە، هەوڵی پلەو پایەی پاشایەتیو فەرمانڕەواییو سامانداریان نەبووە، بۆیە یەزدانی مەزن صیفەتی (صالح)ی کرد بە پێناسەیان، هەرچەندە هەموو پێغەمبەرێك صالحو چاکەخوازە، بەڵام مەبەستی ئەومیە: ئەو صیفەتە بەوان شیاوترو گونجاوترە.

بەشی سێیەم: کە ئەم ڕێزدارانەن؛ حەزرەتی (ئیسماعیلو ئەلیەسەعو یونسو لوط)... بۆیە ئەمانەی خستە دواوە لە باسکردندا، چونکە هیچیان تایبەتمەندی پێغەمبەرەکانی پێشوویان نیە، نە وەکوو کۆمەڵی یەکەم فەرمانڕەواییو دەسەڵاتو پاشایەتییان هەبووە، نەوەکوو بەشی دووەم دوونیا نەویستو گۆشەگیر بوون! دوا بە دوای ناو هێنانی ئەم زاتانەو تەفضیلو ڕێزداری بۆ دیاری کردوونو فەرمووی: ﴿وَكُـلاًّ فـضَّلْنَا عَلَـى الْعَـالَمِينَ﴾ واتە: هەر یەکێ لەوانمان لە دروستکراوانی دی ڕێزدارتر کردووە، چونکە هەموو پێغەمبەرێك لە ئادەمیزادانی سەردەمی خۆی ڕێزدارترە، ئەگەر هەر پێغەمبەرێك بەرامبەری بکەی بە ئادەمیزادی سەردەمی خۆی. لە هەموو ئەو خەڵکە ڕێزدارترو گەورەترە، ئەگەر دوو پێغەمبەر یان زیاتر لەسەردەمێکدا هەبوون ئەوە وێڕای ئەوە کە لە ئادەمیزادەکان ڕێزدارترن بۆخۆشیان لە ناو خۆیاندا یەکیان لەوی تریان گەورەو ڕێزدار ترە. بۆ نموونە حەزرەتی ئیبراهیم لە حەزرەتی (لوط) کە هاوچەرخی بووە ڕێزدارترە. حەزرەتی مووسا لە حەزرەتی هاروونی برای، کە وەزیرو یارمەتیدەریشی بووە، ڕێزدارترە، حەزرەتی عیسا لە حەزرەتی یەحیا کە کوڕی پووری بووە ڕێزدارترو گەورەترە.

ئەمجار پەروەردگار باسی فەضلو گەورەیی خۆی بەسەر پێغەمبەرەکاندا دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آبَائِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَإِخْوَانِهِمْ وَاجْتَبَيْنَاهُمْ وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بڕێك لە باوكو باپیری ئەوانمان هیدایەت داو شارەزاییمان کردنو گەیاندمانن بە ڕێگەی حەقو هێزو توانای بەردەوام بوون لەسەر ئەو

رێبازەمان پێ بەخشین. هەروەها هەمان نیعمەتو رێزداریمان بەخشی بە هەندێ لە کوڕو وەچەو نەوەیان، لە براو برازایان، نەك بە هەمووانیان، چونکە وەکوو ئاشکرایە هەموو باوكو باپیرو نەوەو براو برازایان ئەم نیعمەتی هیدایەتەیان پێ نەبەخشراوە... ئەوەتا: باوکی حەزرەتی ئیبراهیم کافر بووە، کوڕی حەزرەتی نووح کافر بووە!!

لە ئایەتێکی تردا ئاماژەی بۆ ئەو راستییە کردووە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ – الحديد/٢٦﴾.

ئەمجار پەروەردگار وەصفی پێغەمبەرەکان دەکا بەو نیعمەتە تایبەتانەی کە پێی بەخشیوون. دەفەرموێ: ﴿وَاجْتَبَيْنَاهُمْ﴾ هەڵمان بژاردوونو پەسەندمان کردوون چەند رێزو فەضلو تایبەتمەندیمان پێ بەخشیوون ﴿وَهَدَيْنَاهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ شارەزاییمان کردوون بۆ رێگەی راستو هێزی مانەوەو بەردەوامیمان پێداون، بۆ ئەوەی لەسەر ئەو رێبازە بەردەوام بن، ﴿وَذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ ئەوە هیدایەتی خودایە دەیبەخشێت بە کەسانێك لە بەندەکانی کە بیەوێ پێیان ببەخشێ، ئەم جۆرە هیدایەتو شارەزاییەی کە بەو پێغەمبەرانە بەخشراوە بۆ ئەوەی بگەنە ئایینی راستو دروستو بەردەوام بن لەسەری، هیدایەتێکی خوداییو تەوفیقێکی تایبەتییە، لە هیدایەتو شارەزایی بوونی خەڵکانی دیکە جیاوازن.

## چونکە هیدایەت دوو جۆرە:

١- هیدایەتی تایبەتی: کە لە ئاکامی هەوڵو تێکۆشان پەیدا نابێ بەڵکوو بەخششێکی خوداییو پلەو پایەیەکی تایبەتی تایبەتییە کە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیو ئامادە باشی بۆ وەرگرتنی نیگاو سرووشی ئاسمانیە، خودا داویەتی بەبەندە هەڵبژاردە پەسەند کراوەکانی خۆی! ئەم جۆرە هیدایەتە مەبەستە لە ئایەتی ﴿وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى – الضحى/٧﴾دا.

٢- هیدایـەتێکی تـر هەیـە: بـە هـەوڵو تێکۆشـانی ئـادەمیزاد خـۆیو پارمـەتی خودایی دەستەبەر دەبێ، ئـەم جۆرە هیدایەتـە نیعمەتێکە بـۆ هـەموو خواناسـانو ئیسلامخوازان دێتە دی ئەم جۆرە هیدایەتە کە ئێمـە لـە رۆژدا رۆژانـە چـەند جـار دووبارەی دەکەینەوەو دەڵێین: ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمـتَ عَلَـيهِمْ – الفاتحة/ ٦ – ٧﴾. جا ئەو پێغەمبەرانە کە ئەو پلـەو پایـەو رێـزو نرخـەیان لای خودایە، دەبێ بەوپەڕی هێزو تواناوە، بە ئیخلاصو دڵسۆزییەوە بەندایـەتی خـودا بکەن ﴿وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ تەنانەت ئەو پێغەمبەرە هیدایەت دراوانـە، وێـڕای ئـەو هـەموو فـەضلو ڕێـزەی هەیانـە، ئەگـەر هاوبـەش بـۆ خـودا دابنێنو بە رەوای بـزانن پاداشـیان پـووچ دەکرێتـەوە هـەوڵو تێکۆشـانیان بـە فـیڕۆ دەچێ وەکوو کەسانی دیکەی خودا لێ رەنجاو کردەوەکانیان دەپوکێنـەوەو سـوودیان لێ نابینن، لێرەدا مەبەست راگەیاندنی ئەوەیـە: کـە هاوبـەش پەیـداکردن بـۆ خـودا تـاوانێکی زۆر زۆر گەورەیـەو فەرمووکردنـەوەی نیـە. وەکـوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَـئِنْ أَشْـرَكْتَ لَيَحْـبَطَنَّ عَمَلُـكَ – الزمر/٦٥﴾. دیارە وەکوو لە زانستی بەلاغـەدا هـاتووە دەڵێ (لـو) حـەرفی شـەرطە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە بەشەرت گیراوە کە هەر دەبێ بێتە دی، تەنانـەت جاری وا دەبێ مەرجەکە دەبەستێتەوە بە شتێکی مـەحاڵەوە کە هاتنە دی مەحاڵەو نابێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ – الزخرف/٨١﴾. یـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ – الأنبياء/١٧﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَى مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَـشَاء سُبْحَانَهُ هُـوَ اللَّـهُ الْوَاحِـدُ الْقَهَّـارُ – الزمـر/٤﴾. مەبەسـتەکە ئەوەیـە: کـە یەکـەم جـینو تـاقمو کۆمـەڵێك ئـەم قورئانـە دەدرێ بـە گوێـچکەیاندا تـەمێ خـوارد بـبنو بترسـن لـە هاوبەشـپەیدا کـردن بـۆ خـوداو بـە رەوا بینینـی هـاوەڵ بـۆ زاتـی پـاکیو واز لـە بتپەرستیو شـەریك بـۆ خـودا دانـان بێـنن، چونکە لـە جێیـەك ئـەو پێغەمبەرانـە

ئەگەر شەریك بۆ خودا دابنێن ئەوە حاڵیان بێ، ئەی دەبێ ئەم خەڵكەی تر كە زۆر دوورن لە كاری چاكە چییان بەسەر بێ!؟؟.

ئەمجار جارێكی تر هەڕەشەی بە سامو ترسناك ئاراستەی موشریكەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ﴾ ئەو پێغەمبەرانەی باسمان كردن پەیامەكەیان یەك پەیامە، بۆ یەك مەبەست نێردراون، هەموویان بانگەوازییان بۆ خوداپەرستیو بە تاكو تەنیا ناسینی خودایە، ئەو پێغەمبەرانە فەضلو نیعمەتمان بەسەردا رشتوون،كتێبی ئاسمانیمان بۆ ناردوون حیكمەتو داناییمان فێر كردوون، زانستی بە سوودو تێگەیشتن لە ئایینمان پێ بەخشیوون، هەموو كارو گوفتارێكمان لە جێی خۆیدایە، پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی كە گەورەترین پلەو پایەیە؛ كە دەدرێ بە ئادەمیزاد پێمان داونو نیگاو سروشمان بۆ كردوون حوكمو ئایینی پەسەندكراوی خۆمانمان بۆ روون كردوونەوە، هی وایان هەبووە بە منداڵی پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی دراوەتێ! وەكوو حەزرەتی یەحیاو حەزرەتی عیسا (سەلامی خودایان لەسەر بێ) هی وایان هەبووە هەر سێ بەخششەكەی دراوەتێ – دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی، داناییو حیكمەت، پێغەمبەرایەتیو رابەری – وەكوو ئیبراهیم مووساو داوود. ئەوەتا قورئان لەسەر زوبانی ئیبراهیم بۆمان دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا – الشعراء/٨٣﴾. لەسەر زوبانی موسا دەفەرموێ: ﴿فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ – الشعراء/٢١﴾. دەربارەی داوودیش دەفەرموێ: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ – ص/٢٦﴾. دەربارەی داوودو سولەیمان دەفەرموێ: ﴿وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا – الأنبياء/٧٩﴾. پێغەمبەری وا هەبووە دەسەڵاتی فەرمانڕەواییو پێغەمبەرایەتی دراوەتێ وەكوو ئەو پێغەمبەرانەی كە حوكمیان بە تەورات كردووە، هەیان بووە تەنیا پایەی پێغەمبەری پێ دراوە. جا ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلاءِ﴾ ئەگەر ئەو موشریكو خودانەناسانەی مەككە بڕوا بە كتێبە

ئاسمانییەکان‌و فەرمانڕەوایی پێغەمبەرایەتییان نەکەن ئەوە ﴿فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ﴾ ئێمە ئامادەباشیمان خوڵقاندووە بۆ گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری‌و پابەند بوون بە فەرمان‌و نەهییەکانی قورئانەوە لە نێو دڵ‌و دەروونی دەستەو تاقمێکدا کە هەرگیز ڕوو وەرگێڕان‌و پشت هەڵکردنیان لە حوکم‌و یاسای کتێبە ئاسمانییەکان نییەو بە تەواوی بڕوایان پێ دەکەن‌و هیچ شك‌و گومانیان لە ڕاستی‌و دروستی ئەو نیگاو سروشە نییەو نابێ، بە تەواوی بڕوا بە قورئان دەکەن چونکە کاکڵەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکانە، بە ڕێك‌و پێکی ئیمانی پێ دەهێنن‌و پابەندی حوکم‌و یاساکانی دەبن، بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ موسوڵمان بوون‌و ئیمان هێنان بە پەیامی قورئان، بڕێکیان یەکسەرو دەست بەجێ بڕوای پێ دەکەن، هەندێکیشیان لەوەدوا بڕوای پێ دەکەن!.

ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە (خوای لێ ڕازیی بێ) ڕیوایەت دەکەن، دەڵێن: لە مانای ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلاءِ﴾ ئەگەر دانیشتوانی مەککە؛ قوڕەیشییەکان ئیمان بە قورئان نەهێنن ﴿فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ﴾ دانیشتوانی مەدینەمان ئامادە کردووە بۆ ئیمان هێنان‌و بەرگریٚ کردن لە ئیسلام‌و پارێزگاری لە قورئان‌و بەرنامەی خودا!!

ئەوەی جێگای دڵنیاییەو دەتوانین بە ڕاستی بزانین ئەوەیە بگوترێ: مەبەست بەو دەستەو تاقمەی کە ئامادەباشییان تێدا خوڵقێندراوە بۆ ئیمان هێنان بە قورئان‌و پارێزگاری لە ئیسلام‌و بەرنامەی خودا، هاوەڵانی پێغەمبەر بە گشتی! جا دانیشتوانی مەککە یان مەدینە یان هەر شوێنێکی تر بن. ئەمجار پەروەردگار پەیوەندی نێوان ئەو پێغەمبەرانەو پێغەمبەری ئیسلام - صەلات‌و سەلام لەسەر هەموویان بە گشتی‌و حەزرەتی موحەممەد بە تایبەتی - دیاری دەکاو پەیامی هەموویان لە جەمسەرە سەرەکییەکەدا بۆ یەکەوە دەبەستێتەوە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّهُ﴾ ئەو هەژدە پێغەمبەرەی باسکران لەگەڵ وەچەو نەوەو براو خزم‌و کەس‌و کاریان کە خودا هیدایەتی خۆی پێ بەخشیوون، ئەوانە ئەو

پێغەمبەرانــەن کــە خــودا نامــەی ئاسمــانیو حیکمــەتو زانیــاریو دەســەڵاتو فەرمانڕەواییو پلەی پێغەمبەرایەتی پی بەخشیوون، ئەوانە لەسەر ڕێبازی حەقو ڕاست دەڕۆنو شارەزایی هیدایەتی خودایان پی بەخشراوە، نەك خەڵکانێ کە بتپەرستو خوانەناسو گومڕان، کەواتە: ﴿فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾ ئەی محمد! لەسەر ڕێبازی ئەوان بڕۆن، وەکوو ئەوان بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی بکە، بەندایەتیو خوداپەرستی ڕاست ئەنجام بدەن، ئەخلاقو ڕەوشتی جوان بڵاو بکەرەوە!!.

جا کە ئەم فەرمانە ئاڕاستەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کراوە دیارە ئاڕاستەی ئوممەتەکەشی کراوە، چونکە ئوممەتەکەی شوێنکەوتووی پێغەمبەرن لەم جۆرە فەرمانانەدا چ فەرمانێك ئاڕاستەی پێغەمبەر کرابێ شوێنکەووتوانیشی دەگرێتەوە!

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو کەسانە بڵێ کە بۆ لایان ڕەوانەکراوی، بڵێ: من لە پاساوی گەیاندنی قورئان بە ئێوە داوای کرێو سوپاسو ماڵو سامانو سوودی تایبەتی ناکەم، هەروەکوو چۆن هەموو پێغەمبەرەکانی پێش من لەسەر بانگەوازیو ڕاگەیاندنی پەیامی خودایی داوای کرێو سوپاسیان نەکردووە. وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى - الشورى/٢٣﴾. ئەمە ئەرکێکە خراوەتە سەرشانمو پەیامێکە پێم سپێردراوە کە بیگەیەنم ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ﴾ ئەم قورئانە کەهەیە بیرخەرەوەو ئامۆژگاریو ڕێ پیشاندەرە بۆ هەموو جیهانییان، پەڕاوی هیدایەتو بەرنامەی ژیانو کەتەلۆکی بوونەوەرە، تایبەت نیە بە چینو توێژێکەوە، یان بە گەلو هۆزێکەوە، یان بە چاخو سەردەمێکی تایبەتییەوە، پاساو قانونی خودایە، بۆ ئەوەی لە هەموو کونو قوژبنێکی سەر زەوی هەموو گەلو نەتەوەیەك تا دونیا دونیایە کاری پێ بکەن، پابەندی فەرمانو نەهییەکانی بنو بە موو لێی لانەدەنو بیکەنە بەرنامەو پرۆگرامی ژیانی دونیایانو لە هەڵسو کەوتیاندا ڕەنگ بداتەوە.

ئەوەی تێبینی دەکرێ: لەم ئایەتەدا هەژدە پێغەمبەر ناویان تۆمار کراوە، حەوت پێغەمبەری تریش هەن لە قورئاندا ناوی پیرۆزیان هاتووە ئەوانە: ئادەم باوکی ئادەمیزاد، ئیدریس، هوود، ذولکیفل، صالح، شوعەیب، حەزرەتی موحەممەد کە سەردارو کۆتایی پێغەمبەرانە، کۆی هەموویان دەکاتە بیستو پێنج پێغەمبەر ناسینیان پێویستەو ئیمانو باوەڕ بە هەبوونیان ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە، چونکە پەروەردگار لە قورئاندا یەکە یەکە ناوی تۆمار کردوون. ئێمەیش لێرەدا ناوی پێغەمبەرەکان بەم شێوەیە تۆمار دەکەین:

ئادەم، ئیدریس، نووح، هوود، صالح، ئیبراهیم، لوط، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، ئەییوب، شوعەیب، مووسا، هاروون، یونس، داوود، سولەیمان، ئیلیاس، ئەلیەسەع، زەکەرییا، یەحیا، عیسا، ذولکیفل، ئەمجار سەرداری هەموویان حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرانو پلەو پایەیان جیا جیایە، هی وایان هەیە یەزدان پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیو پاشایەتیو دادگایی کردنو فەرمانڕەوایی داوەتێ، هی ویان هەیە تەنها مەقامی پێغەمبەرایەتی پێدراوە! وەکوو کەمێك لەوە پێش لە راڤەی ئایەتەکەدا روون کرایەوە.

هەندێ لەو پێغەمبەرانە ئێستاش شوێنکەوتوویان هەن وەکوو ئایینی جوولەکەو مەسیحیو ئیسلام، هەندێکیان شوێنکەوتوویان نەماون، وەکوو شوێنکەوتووانی حەزرەتی ئیسماعیلو ئەلیەسەعو یونسو لوط. ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ کە تێکڕای پێغەمبەران لە فریشتە رێزدارترن، چونکە پەروەردگار دوای ناو هێنانی پێغەمبەرەکان فەرمووی: ﴿وَكُلاًّ فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ عالەمین کۆی عالەمە، عالەمیش ناوە بۆ هەموو هەبوو (وجود)ێك جگە لە خودا، فریشتەش بۆخۆیان عالەمێکن پێغەمبەران لەوانیش رێزدار ترن!.

وەکوو زانیمان ئایەتەکانی لە سێ تەوەردا دەسوڕێنەوە جەخت لەسەر سێ ئەرکی سەرەکی دەکەن، چەسپاندنی تاک و تەنیایی خودا پێغەمبەرایەتی، زیندوبوونەوە.

## سەلماندنی پێغەمبەرایەتی و ناردنی نامە ئاسمانییەکان

﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾﴾.

جا وەکوو زانیمان پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا لەسەر زوبانی حەزرەتی ئیبراهیم، بەڵگەی جۆراو جۆری لەسەر تاک و تەنیایی خودا هێنایەوە، هاوبەش پەیدا کردنی بۆ خودا رەت کردەوە، چەند بەڵگەی حاشا هەڵنەگری خستنە روو، ئەمجار دەست دەکا بە چەسپاندنی کاری پێغەمبەرایەتی و فەرمووی: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێکی جوولەکە کە ناوی مەلیکی کوڕی صەیف بوو: هاتە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەستی کرد بە وتەی ناڕێکو پێك لە خزمەتیا! ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سوێندت دەدەم بەو خودایەی تەوراتی بۆ مووسا ناردووە، ئایا تۆ لە تەوراتدا ئەوەت خوێندۆتەوە کە خودا مرۆڤی قەڵەوی خۆش ناوێ!؟ کابراش ماڵێکی قەڵەوی ورگ پان بوو، رقی هەڵساو سوێندی خوارد کە خودا هەرگیز ئایەتی بۆ سەر ئادەمیزاد نەناردۆتە خوارێ! بڕێ لە هاوڕێ جوولەکەکانی وتیان: هەی خوا گرتوو؛ چۆن خودا تەوراتی نەناردووە بۆ سەر مووسا؟! ئەویش سوێندەکەی پێشووی دوبارە کردەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿وَمَا قَدَرُواْ اللّهَ حَقَّ قَدْرِهِ...الآية﴾.

موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظی دەڵێ: پەروەردگار فەرمانی بە حەزرەتی موحەممەد کرد کە پرسیار لە ئەهلی کیتاب بکا دەربارەی خۆیو چۆن لە تەورات باسی کراوە؟ ئیتر حەسوودی بردنیان بە حەزرەتی موحەممەد وای لێ کردن کە بڕوا بە نامەی خوداو پێغەمبەری خوداش نەکەنو وتیان: هەرگیز خودا هیچ نامەیەکی بۆ هیچ ئادەمیزادێك نەناردووە، ئیتر پەروەردگار ئەو ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ اللّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ بێگومان ئەوانەی ئینکاری نیگایی خودایی دەکەن بۆ ئادەمیزاد – کە موشریکەکانی قوڕەیشن یان دەستەو تاقمێکی جوولەکەن – بەراستی ئەوانەی خودایان وەکوو پێویست نەناسیوە، وەکوو پێویستە ریزیان لێ نەگرتووەو بە پیرۆزیان نەزانیوە کە پێغەمبەرەکەیان بە درۆ خستۆتەوەو بڕوایان پێ نەکردووە، ﴿إِذْ قَالُواْ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ﴾ کاتێ وتیان: خودا هیچ کتێبێکی لە ئاسمانەوە نەناردۆتە خوارێ بۆسەر ئادەمیزاد.

ئیبنو کەثیر دەڵێ: ئەگەر بگوترێ ئەم ئایەتە دەربارەی کافرەکانی مەککە نازڵ بووە وێ چوو ترە! چونکە ئایەتەکە مەککییە، واتە: لە مەککە هاتۆتە خوارێ، جوولەکەش ئینکاری هاتنە خوارەوەی نامەی ئاسمانی بۆ سەر ئادەمیزاد ناکەن،

موشـریکەکانی قـورەیش ئینکـاری ئـەومیان کـردووە، پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی موحەممەدیان بـەلاوە درۆ بـووە، دەیـانگوت: چونکە (محمـد) ئـادەمیزادە بەکـەڵکی ئەوە نایەت نیگای ئاسمانی بۆ بێـت! وەکوو لـە شـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَكَـانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَى رَجُلٍ مِّـنْهُمْ أَنْ أَنـذِرِ النَّـاسَ – يـونس/٢﴾ يـان دەفـەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُواْ إِذْ جَاءهُمُ الْهُدَى إِلاَّ أَن قَالُواْ أَبَعَثَ اللّهُ بَشَرًا رَّسُولاً، قُـل لَّـوْ كَانَ فِي الأَرْضِ مَلآئِكَـةٌ يَمْـشُونَ مُطْمَئِـنِّينَ لَنَزَّلْنَـا عَلَـيْهِم مِّـنَ الـسَّمَاء مَلَكًـا رَّسُـولاً – الإسراء/٩٤ – ٩٥﴾. لە راستیدا کەسێك خـودا بـە باشـی بناسـێت، لـە ئـەوە حـاڵی ببێ کە یەزدان دەسەڵاتی تەواوی بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیـەو ئاگاداری هـەموو شتێکە لە هەموو شوێنێنك، بڕوای وا بێ کە رەحمەتو بەزەیی خودا بەشی هـەموو کەسـێ دەکـاو هـەرگیز لـە بـن نایـەن، ئـەو قەناعەتـەی بـۆ دروسـت دەبـێ کـە ئادەمیزادەکـان زۆر پێویـستیان بـە کتێبـی ئاسمـانی هەیـە، زۆر ئاتـاجی شـارەزایی کردنـی پێغەمبـەران دەبـن بـۆ دەسـتەبەر کردنـی خۆشـبەختیو کامـەرانی هـەتا هـەتایی، هـەروەها بـۆ دەسـتەبەر کردنـی پێشکەوتنی ئـادەمیزاد لـە رووی مـاددەو گیانەوە!!

بێگومان کۆمەڵی ئادەمیزاد لەسەرەتادا پشێوی هـەرەج مـەرەج بـووە، جیهـان لـە ژێر باری نائارامیو فەوضادا دەیناڵاند؟ پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردن بـۆ ئـەوەی کۆمەڵگا رێنمویی بکەن، قـانونو یاسـایان رێـك بخـەن، قـانونو یاسـایان فێـر بکـەن، ئەخلاقو رەوشتی جوانیان لە ناودا بڵاو بکەنەوە، رێگای پێـشکەوتنو شارسـتانیان بیـشان بـدەن، رێبـازی ئیـصلاحو کۆمەڵایـەتیو رەوشـتیان فێـر بکـەن، دەسـتی ستەمکارو ملهوڕ بگێڕنەوە لـە ستەمکاریو چەوساندنەوەی هـەژاران! جـا کەسـێك ئینکاری پەیامی پێغەمبەران بکا، دیارە بە باشـی خـودا نـاناسێو رێـزو پیرۆزی بـۆ دانانێت! ئەمجار پـەروەردگار پێغەمبـەر دەرس دادەدا کە چۆن بـیروڕای موشـریکە عەرەبـەکان رەت بکاتـەوە، ئەوانـەی کـە ئینکـاری نیگـاو پێغەمبەرایـەتی دەکـەن، فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی؛ حـەزرەتی محمـد کـردو فـەرمووی: ﴿قُـلْ مَـنْ أَنـزَلَ

الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: کێ تەوراتی نارده خوارێ بۆ سەر مووسای کوڕی عیمران؛ ئەو تەوراتەی کە بریتی بوو لە نوورو رووناکییەکی پرشنگدارو تاریکایی رامالی، هیدایەت بوو بۆ ئەوانەی پابەندی بوونو شوێنی کەوتن، لە تاریکاییو گومرایی رزگاریان بوو، گەیشتن بە نووری حەق! بەهۆی هیدایەتو رەهنومایی تەوراتەوە بوون بە جۆرە ئادەمیزادێکی تر... خۆ ئێوە بۆخۆتان دان بە گرنگی تەوراتدا دەنێن ئاواتەخوازی ئەوە بوون کیتابێکی ئاواتان بۆ بێ، ئەی ئەوە نیە دەتانگوت: ﴿لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَى مِنْهُمْ – الأنعام/١٥٧﴾ هەر بەو جۆرە تەورات کاریگەری هەبوو لە ژیانو هەڵسو کەوتی نەتەوەی ئیسرائیلدا، هەتا گۆڕانکاریان تێدا کرد، دەقەکانیان تێکدان، زۆر لە حوکمەکانیان شاردەوە، ئەگەرماڵێکیان پرسیارێکی ئایینی لێ بکرایەو حوکمی تەوراتەکە بە ویستی ئەو نەبوایە حوکمەکەی لە پارچە کاغەزێکدا دەنووسیەوە، ئەوەی مەبەستی بوایە پیشانی کێشەکەرانی دەداو زۆربەی حوکمەکانی تری دەشاردەوە. هۆیەکەش ئەوە بوو نوسخەی تەوراتەکە هەر لای ماڵەکان بوو نەیاندەهێشت بۆرە پیاوەکان فێری ببنو بیخوێننەوە! ئەم شاردنەوەیان لەو دەقانەدا دەکرد کە دوای رووخاندنی بەیتولمەقدیسو دەرکردنی جوولەکە لە عێراق نووسیویانەوە، واتە: ئەمە جگە لەو دەقانەی کە جوولەکە پێشینەکان لە بیریان چوو بووەوە! بەهۆی رووخاندنی بەیتولمەقدیس لێی فەوتا بوو، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ – المائدة/١٣﴾ بێگومان ماڵە جوولەکەکان حوکمی رەجم کردنی زیناکەریان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدینە شاردەوە، بەڵکوو لەوەش گەورەتریان پەردەپۆش کرد! مزگێنی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامو رەوشتو نیشانەکانیان دەشاردەوە دەیان گۆڕیو دەیانکرد پاشو پێشیان بە دەقەکان دەکرد ئیتر پەروەردگار فێری پێغەمبەری کرد کە ئەم ئایەتە بەسەر جوولەکەو غەیری جوولەکەدا بخوێنێتەوەو روویان تێ بکاو بڵێ: ﴿تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا

وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ حوکمەکانی تەورات دەکەنە پارچە پارچە، واتە: هەر بەشێکی بتانەوێ دەری بخەن‌و ناشکرای بکەن لە پارچە کاغەزێکدا دەینووسنەوەو بڵاوی دەکەنەوە بە ناو جوولەکەکاندا، بەشێکی زۆریشی کە حەز ناکەن بڵاوی بکەنەوە دەیشارنەوەو ناهێڵن رەشە خەڵکەکە پێی بزانن! ئەمجار روو بکەرە عەرەبەکان‌و پێیان بڵێ: ﴿وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُواْ أَنتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ﴾ پەروەردگار بەهۆی قورئانەوە هەواڵی رابوردووان‌و داهاتوانی فێر کردوون، هەواڵ‌و سەرگوزشتەیەك کە نە ئێوە زانیوتانە نە باوك‌و باپیرتان زانیویانە، نە دەشتانزانی، بەمەش منەت‌و فەضلی خودا رادەگەیەنێ بەسەر پێغەمبەرو موسوڵماناندا؛ بەوەی کە قورئانی پیرۆزی بۆ ناردوون، بنەمای بیروباوەڕی بە بەڵگەوە فێر کردوون، رەوشتی بەرزو چۆنیەتی مامەڵە کردنی لەگەڵ ژیاندا بۆ روون کردونەوە، جۆرەکانی خودا پەرستی بۆ دیاری کردوون بۆ ئەوەی دڵ‌و دەروونی خۆیان پاك بکەنەوە، باسی مامەڵەو گۆڕینەوەی کاڵای بۆ روون کردونەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی ئادەمیزاد سوودی لێ وەربگرن، هەروەکوو چۆن بنەمای یاسای ژیانی بۆ دامەزراندوون، فێری ئەوەی کردوون کە هەوڵ بدەن ئازادی‌و رێز دانان‌و مرۆڤایەتی‌و یەکسانی لە ناو کۆمەڵدا بڵاو بکەنەوە، ئەو راستیە بچەسپێنن کە تەرازووی رێزو نرخ طاعەت‌و خوداپەرستیە، کێ تەقواو کردەوەی باشی زۆرتر بێ رێزدارترە!

زومەخشەری‌و هەندێکی تر لە راڤەکەران پێیان وایە: ئەم ئایەتە کە ﴿وَعُلِّمْتُم...﴾ خیطابە بۆ جوولەکەکان واتە: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! ئێوە لەسەر زوبانی پێغەمبەری ئیسلام بەهۆی ئەو قورئانەی بۆی نێردراوە فێری گەلێ یاساو شەریعەت‌و داب‌و نەریت‌و هەڵس‌و کەوتی جووان بوو، کە لەوە پێش نە ئێوە نەباوك‌و باپیرانتان وێڕای ئەوەی هەڵگری تەوراتیش بوون نەیان زانیوە!! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ – النمل/٧٦﴾ هەندێك لەو شتانەی کە جوولەکەکان بەلایاندا نەچوون‌و

ئیسلام دەستەبەری کردووە تەواوکردنی ئایینی خۆیانە بەوە کە بنەماکانی بیروباوەڕی چەسپاندنو روونی کردنەوە، بە بەڵگەوە شی کردنەوەو پشتگیری لێ کردن، ئەخلاقو رەوشتی جوانی فێرکردنو دابو نەریتی لە بارو گونجاوی خستە روو کە میانەڕەویی بوو لە هەموو شتێکدا، لە نێوان بیروبۆچوونی جوولەکەو مەسیحیدا ئایینێکی مامناوەندی هێنایە کایەوە، ئەحکامی عیباداتو خوداپەرستیو مامەڵە کردنی وا ئاراستە کردن کە سوودی بۆ تاكو کۆمەڵ هەبێ، فەرمانڕەوایی کردە شوراو هاریکاری لە نێوان ئەهلی حیلو عەقددا شەریعەتی وا دانا کە یەکسانی بنوێنێ لە نێوان هەموو رەگەزو هۆزو نەتەوەو چینو توێژەکانی کۆمەڵدا، جوولەکەیەك لەبەر بنەچەو نەسەب، عەرەبێك لەبەر رێزو حەسەب لە یەکتر جیا نەکاتەوە مەرایی لەبەر موسوڵمان نەکا لەبەر ئەوە موسوڵمانە ستەم لە کافرێك نەکرێ لەبەر ئەوە کافرە، بەڵکوو تەرازووی هەموو هەڵسەنگاندنو رێزو نرخێك کردەوەو خوا پەرستیو پابەند بوونە بە فەرمانو نەهییەکانی قورئانەوە! کەوابێ دەبوایە زانایانی ئایینی جوولەکەو مەسیحی دوای هاتنی حەزرەتی موحەممەد بەم ئایینە بێ وێنەیە کە تەواوکەری هەموو ئایینەکانەو هیدایەتە بۆ مرۆڤایەتی، دەبوایە دەست پێشخەر بوونایە بۆ بڕوا کردن بە پێغەمبەرو ئایینەکەی چونکە ئەوان بەلای خۆیانەوە خاوەن عیلمو زانستن! دەی خۆ وا چاوەڕوان دەکرێ کە خاوەن عیلمو زانست کە پەیڕەوی عیلمو زانستی خۆی بکا، ئەگەر یەکێك هات لەو زاناترو راست ترو گونجاو تری پێ بوو یەکسەر بچێتە سەر بیروباوەڕی ئەوو شوێنی بکەوێ نەك بە پێچەوانەوە! بەڵام حەسوودیو رەگەز پەرستی مالو قەشەکانی جوولەکەو مەسیحیو کورسی پەرستیو پلەو پایەو خۆشەویستی دونیایان وای لێ کردن بە پێچەوانەوە هەڵسو کەوت بنوێنن.

ئیمامی طەبەری ریوایەتێکی تری بۆ ئایەتەکە بە لاوە پەسەندە! کە ﴿تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ بەگوێرەی ئەم قیرائەتە خیطابی ئایەتەکە بۆ عەرەبە موشریکەکانەو هەواڵدانە لە جوومکان بەوەی ئەنجامیان داوە؛ کە هاتوون

تەوراتیان لە چەند پەڕە کاغەزێکدا دەنووسیەوە بۆ ئەوەی گۆڕانکاری تێدا بکەن، دەهاتن کە ئەو دەقانە کە لەگەڵ مەبەستی گڵاوی خۆیان دەگونجاو بۆ رێ لە خەڵك گوم کردنو فێڵو تەڵەکە بازی دەستی دەدا لەچەند پارچە کاغەزێکدا دیان نوسیەوەو بڵاویان دەکردەوە، بڕێك لەو دەقانەی کە بەدڵی ماڵەکانیان نەبوو لەگەڵ نەخشەی خۆیان نەدەگونجا دەیانشاردەوەو ژێرلێویان دەدا، بڕێکیش لەو شتانەی دەیانشاردەوە عەرەبەکان پێیان دەزانی، یان قورئان هەواڵی پێیان دابوو: کەوابێ ئایەتەکە خیطاب نیە بۆ جوولەکەکان بەڵکوو خەبەریان لێ دەداو هەڵسو کردەوەیان بۆ عەرەبەکان دەگێڕێتەوە، لەسەر ئەم رایە ئایەتەکە مەککەییەو مەدینەیی نیە واتە لە مەککە هاتۆتە خوارێ.

سەیید قوطب خوا لێی رازی بێ ئەم شێوە قیرائەتەی پەسەند کردووە، لەسەر ئەو قیرائەتە ئاوا تەفسیری کردووە: ئەی محمد! بە عەرەبەکان بڵێ: کێ ئەو نامە ئاسمانییەی – کە مووسا هێنای بۆ بەنو ئیسرائیل – ناردۆتە خوارێ کە رێ نیشاندەرو نورو روناکاییو هیدایەت بوو بۆ ئادەمیزاد، لەو نامەیەی کە جوولەکەکان دەیکەنە پارچە پارچە بڕێکی دەشارنەوەو ناهێڵن رەشە خەڵکەکە بیان بینن، هەندێکیشی دەردەخەن بۆ بەجێهێنانی مەبەستە تایبەتییەکانی خۆیانو ئەنجامدانی فێڵو تەڵەکە بازیو سەر لێ شێواندنی ئادەمیزادان، ئەمجار پەروەردگار رووبەڕوویان بووەوەو منەتی خۆی بە سەردا کردن؛ بەوەی کە هەندێ هەواڵو رووداوی جوولەکەکانیان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لەپێش هاتنە خوارەوەی قورئاندا هیچیان لێ نەدەزانی کەوابێ ئەرکی سەرشانی ئەوانە کە سوپاسی خودا بکەن نەك ئینکاری ئەوە بکەن کە خودا بە نیگا ئەم زانیارییەی بۆ پێغەمبەری خۆی ناردبێ!.

پەروەردگار لەپاش ئاراستە کردنی پرسیارەکە لێیان نەگەڕا بۆ خۆیان وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە، بەڵکوو فەرمانی بە پێغەمبەر کرد کە باسەکەیان لەگەڵ یەکالا بکاتەوەو نەهێڵێ بیکەنە گۆڕەپانی کێشەو دەمە دەمێ! بۆیە بە پێغەمبەری

فەرموو: ﴿قُلِ: اللَّهُ﴾ ئەی محمد! بڵێ خودا ئەو کتێبەی ناردۆتە خوارێ بۆسەر موسا، هەروەها ئەم قورئانەی بۆ من ناردووە، یان بڵێ: خودا ئێوەی فێری قورئان کردووە، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ﴿قُلِ: اللَّهُ﴾ واتە: بڵێ خودا ئەو کتێبەی ناردۆتە خوارێ. ئیبنو کەثیر دەڵێ: لێرەدا هەر ئەم مانایەی ئیبنو عەبباس پەسەندە.

﴿ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ پاشان ئەی محمد! وازیان لێ بێنەو لێیان گەڕێ، با لە نەزانیو گومڕایی خۆیاندا یاری بکەن تا مردن یەخەیان پێ دەگرێو چنگیان لێ قایم دەکاو دەیانجەڕێنێ، جا ئەو کاتە دەزانن سەرەنجامی باش بۆ ئەوانە، یان بۆ بەندە خودا پەرستەکانە!!

ئەمجار پەروەردگار ڕۆڵی قورئان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهَذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ﴾ ئەم قورئانە کتێبێکە ناردومانەتە خوارێ بۆسەر تۆ، شارەزایی ئادەمیزاد دەکا بۆ ئایینی حەقو ڕێبازی ڕاست، هەر وەکوو چۆن لەوەپێش تەوراتمان ناردۆتە خوارێ بۆ سەر موسا، ئەم قورئانە ﴿مُبَارَكٌ﴾ خێرو بەرەکەتی زۆرو زەبەندەیە، لەهەموو ڕوویەکەوە بەرەکەتی تێدایە، موبارەك‌و پیرۆزە لە بنەمادا چونکە پەروەردگار لەلای خۆیەوە ناردویەتیە خوارێ، پیرۆزە چونکە بۆ سەر دڵی بێ خەوشی پێغەمبەر نێردراوەتە خوارێ، پیرۆزە لەڕووی قەبارەو پەڕەو دێڕو وشەکانیەوە قەبارەی کەم‌و مانای زۆر، ئەو مانایەی قورئان دەیانگەیەنێ بە چەندەها کتێبی لەو قەبارەیە ئەنجام نادرێن، پیرۆزە چونکە ئاڕاستەی فیطرەت‌و سروشتی ئادەمیزاد کراوە، چ لەوە پیرۆزترە کە خودا بۆ خۆی دەربارەی بفەرموێ پیرۆزە! ئەمە ئەوپەڕی پلەی پیرۆزییە!.

﴿مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئەم قورئانە تەصدیقی ئەو مانایانە دەکا کە لەپێش خۆیەوە لەلایەن خوداوە ناردراونە خوارێ، باوەڕ دەردەبڕێ بەو کتێبانە لەو شێوەیاندا کە گۆڕانکارییان تێدا نەکراوە، بڕوای بەو کتێبانە نیە لەشێوەی

گۆڕاویاندا، بڕوایان بەرامبەر دەردەبڕێ چونکە ئەو نامانە بیروباوەڕیان بە حەق هێناوە، بنەمای عەقیدەیان چەسپاندووە، هەموو ئایینەکان لەبارەی عەقیدەو بیروباوەڕەوە یەك پەیامن، بەڵام لەبارەی شەریعەتو ڕێبازەوە هەموو گەلو نەتەوەیەك شەریعەتو ڕێبازی خۆی جیاوازە.

مامۆستا سەیید قوطب دەڵێ ئەوانەی لەبارەی ئیسلام دەنوسنو دەڵێن: ئیسلام یەکەم ئایینە کە بیروباوەڕی تەواوی دەربارەی یەکتاپەرستی هێناوە، یان بیروباوەڕی تەواوی دەربارەی حەقیقەتی پێغەمبەرایەتیو پێغەمبەر هێناوە، یان یەکەم ئایینە کە عەقیدەی تەواوی دەربارەی قیامەتو زیندوو بوونەوە هێناوەو پێشیان وایە ستایشی ئیسلام دەکەن ئەوانە لە ڕاستیدا قورئان ناخوێننەوە، ئەگەر قورئانیان بخوێندایەوە دەیان بیست پەروەردگار ئەوە دەچەسپێنێ کە هەموو پێغەمبەرەکانی (درودی خوایان لەسەر بێ) یەکتاپەرستی تەواویان هێناوە کە بەهیچ جۆرێك دیاردەی هاوبەش پەیداکردنو هاوەڵدانان بۆ خودایان تێدا نییە.

هەموویان حەقیقەتی پێغەمبەرایەتییان بە نەتەوەو ئادەمیزاد ڕاگەیاندووە. ئادەمیزادیەتی پێغەمبەریان بۆ گەلەکانیان ڕوون کردۆتەوە، هەموویان گوتویانە کە سوودو زیانیان بەدەست نییە، غەیب زان نین هەموویان گەلەکانیان ترساندووە لەسزاو حیسابو لێکۆڵینەوەی ڕۆژی دوایی، هەروەها هەموو لایەنەکانی تری عەقیدەیان بە خەڵکی ڕاگەیاندووە، قورئان کە تەصدیقی کتێبە ئاسمانییەکان دەکا تەصدیقی ئەو عەقیدەو بیروباوەڕە دەکا کە تێیاندا هاتووە پێش گۆڕانکاریو دەست لێدانیان.

ئەو قسەو قسەڵۆکانەی ئەو نووسەرانە دەیڵێن: ئەوە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕۆشنبیری ئەوروپایی کە پێیان وایە: عەقیدەو بیروباوەڕ — هی ئاسمانیشی لەگەڵدا بێ — گۆڕانکاری گەشەکردنی تێدا دێتەجێ واتە: بەگوێرەی گۆڕانو پێشکەوتنی ئادەمیزاد عەقیدەو بیروباوەڕ دەگۆڕێ!!؟ هەرگیز ناتواندرێ داکۆکی لە ئیسلام بکرێ بە ڕوخاندنی ئەو بنەما عەقیدەییو بیروباوەڕانەی کە قورئان

دەیانــچەسپێنیَ! دەی بــا نووســەران‌و خوێنــەران لــەمجۆرە هەڵخلیــسکانە خــۆ بپارێزن[1].

ئـەمجار حیکمـەتی ناردنـە خـوارەوەی ئـەم قورئانـە وێـڕای پـشتگیری کـردن‌و بەڕاسـت دانـانی نـاوەڕۆکی کتێبـە ئاسمانییـەکانی پـێش خـۆی دەسـت نیـشان دەکـا دەفـەرموێ: ﴿وَلِتُنــذِرَ أُمَّ الْقُــرَى وَمَــنْ حَوْلَهَــا﴾ هـەروەها بۆئـەوەی بـەم قورئانـە دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری لەهەموو کون‌و قوژبنێکی سەر زەوی بترسێنیَ لـە سزای توندو سەختی یەزدان، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست بە ﴿مَنْ حَوْلَهَا﴾ هەموو وڵاتانی سەر زەوییە وەکوو پەروەردگار ئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿قُـلْ يَـا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا – الأعراف/١٥٨﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْـنَكُمْ وَأُوحِـيَ إِلَـيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ – الأنعام/١٩﴾. هەروا چەند ئایەتێکی تـریش هـەن کــە ئــەوە دەچەســپێنن کــە پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) پێغەمبەرایەتییەکەی گشتییەو بۆ سەر هەموو ئـادەمیزاد نێـردراوە لـە حـەدیثی صەحیحەیندا چەسپاوە کە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسـەر بیَ) فەرموویـەتی: «أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي» ئەمجار لەم پێنجانە ئەمەیان تێدایە «وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّـاسِ عَامَّـةً» بۆیـە دوابـە دوای ئـەوە دەفـەرموێ: ﴿وَالَّــذِينَ يُؤْمِنُــونَ بِــالآخِرَةِ يُؤْمِنُــونَ بِــهِ﴾ هـەر کەسـێك بـڕوای بـە زیندووبوونـەوەو ڕۆژی قیامـەت هـەبیَ بـڕوا بـەم کتێبـە پـیرۆزە – کە قورئانـە – دەکـەن بەمـەرجیَ بانگـەوازیان بکاتـیَ، چـونکە تـەواوترین هیدایـەتی تێـدا دەسـت دەکەویَ.

---

[1] في ظلال القرآن ج ٣/ ٢٠٤ – ٢٠٥.

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە ئەو خەڵکەی مەککەو غەیری مەککەش کە ئیمانیان بە قورئان نەهێناوە، دیارە ئیمانیان بە زیندووبوونەوە نەبووە بۆیە ئینکاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان کردووە!

﴿وَهُمْ عَلَى صَلاَتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی‌و قورئان هەیە، ئاگاداری نوێژەکانیشیان دەکەن لەکاتی خۆیاندائەنجامیان دەدەن روکن‌و مەرج‌و هەیئەتەکانیان بە ڕێك‌و پێکی ئەنجام بدرێ خاوەنەکەی لەهەموو جۆرە تاوانێك دەگێڕێتەوە، هەموو جۆرە عیبادەتەکانی تر جێبەجێ دەکا! ئەی ئەوە نیە قورئان لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ - العنكبوت/٤٥﴾.

## درۆ هەڵبەستن لەسەر خوداو سزای درۆ هەڵبەستن

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَـٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَـٰكُمْ

وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾ ﴾.

له ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە قورئان نامەیەکی ئاسمانییەو لەلایەن خوداوە نێردراوە بۆ سەر موحەممەد، ئەویش وەکوو تەورات وایە کە ئێوە ئیعتراف بەوە دەکەن کە بۆ موسا هاتووە، هەروەکوو ئەوەشی چەسپاند کە هەموو پێغەمبەرەکان ئادەمیزادن، ئەمجار دوای ئەوەی باسی هەندێ هەڕەشە دەکا کە ئاڕاستەی ئەو کەسانە کراوە کە بە درۆ ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکەن‌و خۆیان بەرەوانەکراوی خودا دەزانن فەرمووی: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خوداهەڵدەبەستێ؟؟ واتە: کەس لەوانە ستەمکارتر نیە کە لەسەر خودا درۆ هەڵدەبەستن وەکوو ئەوانەی کە دەڵێن: خودا هیچ نیگاو سروشێکی بۆ کەس نەناردووە! یان دەڵێن: خودا هاوەڵ‌و منداڵی هەن ﴿أَوْ قَالَ أُوْحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ﴾ یان بڵێ: نیگام بۆ کراوەو سرووشم بۆ هاتووە لە کاتێکدا هیچ نیگاو سروشی بۆ نەهاتووە، وەکوو ئەو درۆو بوختانەی کە موسەیلەمەی درۆزن لە وڵاتی یەمامە بڵاوی کردەوەو خۆی کرد بە پێغەمبەرو وتی نیگام بۆ هاتووە! یان ئەسوەدی ئەلعەنەسی لە وڵاتی یەمەن کە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی کرد، یان طولەیحی ئەلئەسەدی کە لە ناو هۆزی ئەلئەسەددا خۆی کردە پێغەمبەر، هەروەها هەر کەسێك‌و لە هەر شوێنێك‌و لە هەر چەرخێك ئیدیعای پێغەمبەرایەتی بکا!. ﴿وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ هەروەها کێ لەو کەسە ستەمکارترە بڵێ: منیش دەتوانم کتێبێکی وەکوو قورئان دابنێم، بڵێ من دەتوانم کتێبێکی وەکوو قورئان کە خودا ناردوویەتیە خوارێ واتە:

نامەیەکی وەکوو قورئان بەلیغو فەصیحو رەوان بخەمە روو وەکوو ئەو کۆمەڵە موشریکەی وتیان: ﴿لَوْ نَشَاء لَقُلْنَا مِثْلَ هَـذَا - الأنفال/٣١﴾. مەبەست وتەکەی ئەلنەضری کوڕی ئەلحاریثە (النضر بن الحارث) کە دەیگوت: قورئان چیرۆکو سەرگوورشتەی کۆنینەی پێشینانە یان دەیگوت شێعرو هەڵبەستە ئەگەر بمانەوێ دەتوانین وەکوو ئەو بڵێین‌و قورئانێکی ئاوەها دابنێین!.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی خۆی ئاراستەی ستەمکاران کردو فەرمووی: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ﴾ خیطابەکە بۆ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هەروەها بۆ هەموو بیسەرو خوێنەرێکە، واتە: ئەگەر تۆ ئەی محمد هەروەها ئەی بیسەرو خوێنەر! ئەگەر تۆ ببینی ئەوکاتەی ستەمکاران دەکەونە حاڵی مردنەوە، ئێش‌و ئازاری گیانکێشان لە هەموو لایەکەوە دەوریان دەدا، شتێك دەبینی کەباسی ناکرێ‌و نایەتە گوفتارو نووسین‌و چۆنیەتی حەقیقەتەکەی بە خوا نەبێ بەیان ناکرێ، ئەگەر بەیانیش بکرێ کەس ناتوانێ گوێی لێ بگرێ. ﴿وَالْمَلآئِكَةُ بَاسِطُواْ أَيْدِيهِمْ﴾ حاڵو وەزعیەت وایە فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن بۆ وەرگرتنەوەی گیانیان بە ئەوپەڕی گرژیو توڕەییو مڕوموچیو توندتیژیی‌و لێدان تێهەڵدانەوە؛ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمْ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ - محمد/٢٧﴾.

ئەمجار پەروەردگار فەرمانکردنی فریشتەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بە شێوەی سووکایەتی پێ کردن‌و ئەزیەتدانیان لەکاتی دەست درێژی کردنیان بۆ گیانکێشانیان پێیان دەڵێن ﴿أَخْرِجُواْ أَنفُسَكُمُ﴾ دەی خێراو بێ راوەستان گیانەکانتانمان پێ بدەن! یان ئەگەر ئازان گیانەکانتان لەم حاڵەتە رزگار بکەن!

زەمەخشەری دەڵێ: ئەمە تەمثیل‌و لێچواندنی فریشتەیە لەکاتی گیان کێشانی ستەمکارانا بە کردەوەو هەڵس‌و کەوتی خاوەن قەرزێك کە چوبێتە سەر قەرزدارەکەو بە گیری هێنابێ‌و چنگی لە یەخەی گیر کردبێ‌و مۆڵەتی نەداو پێی

بڵێ: دەی هەر ئێستا ئەو ماڵەی من کە وا بەلاتەوە بمدەرەوە سوێندم وابێ لێرە ناهێڵم بڕۆی تا لێت نەسێنمەوە، لەم شوێنە ناجوڵێم تا لە میلی چاوت ئەو پارەیە دەرنەهێنم.

هەندێك دەڵێن: پێویست ناكا تەمثیلو تەشبیهی تێدا بەكاربێنین بەڵكوو دەتوانین لەسەر حەقیقەتی خۆیان بیانهێڵینەوە، چونكە دەگوونجێ فریشتە بچێتە سەر شێوەی ئادەمیزادو بە شێوەی ئاخاوتنی ئادەمیزاد لەگەڵیدا گفتو گۆ بكەن.

هۆی ئەم كێشمە كێشمەو لێدانو تێهەڵدانە ئەوەیە كافرو خوانەناس كە دەگاتە سەرەمەرگ فریشتە موژدەی سزای دۆزەخی پێ دەدەنو نارەزامەندی خودای پێ رادەگەیەنن، ئیتر گیانەكەی لە جەستەیدا ئاخێ دەبێو نایەوێ بێتە دەرێ جا فریشتەكان لێی دەدەن بۆ ئەوەی گیانەكەی بەدەستەوە بداو[1] پێی دەڵێن: ﴿الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ ئەمرۆ ئەوپەڕی سووكایەتیتان پێ دەكرێ! وەكوو چۆن ئێوە درۆتان لەسەر خودا هەڵدەبەست، لوتبەرزیتان دەنواند لە شوێن كەوتنی نیگاو سروشی ئاسمانیو پەیڕەو كردنی رێبازی پێغەمبەرەكانی، بڕواتان بە نیشانەكانی خودا نەدەكردو پێغەمبەرەكانیتان بە درۆ دەخستەوە، شتی نابەجێو ناحەقتان بەدەم خوداوە بڵاو دەكردەوە؛ وەكوو ئەوە هەندێكیان دەیانگوت: خودا هیچ نیگایەكی نەناردووە بۆ هیچ كەس. یان ئەوانەی كەلافی پێغەمبەرایەتیان لێ دەداو دەیانگوت نیگامان بۆ كراوەو لە راستیشدا هیچ نیگایان بۆ نەكراوە، یان ئەوانەی كە ئینكاری كۆمەڵێك صیفاتی خودایان دەكرد یان خێزانو كوڕو كچیان بۆ دادەنان!.

كە دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ﴾ واتە: ئەمڕۆ مەبەست رۆژی مردنەكەیە ئەو رۆژەی كە گیانیان دەكێشرێو سزای گیانكێشانیان پێ دەگا. دەشگونجێ مەبەست ئەوكاتە درێژو ناخۆشە بێ كە لە دوای مردنیان لە بەرزەخو قیامەتدا سزا دەدەرێن.

---

[1] – تفسير المنبر ج ٥١٧/٧.

مامۆستا موحەممەد عەبدە ئەو رایەی بەلاوە پەسەندە کە دەڵێ: مەبەست بە ﴿الْيَوْمَ﴾ رۆژی قیامەتە، هەروەها دەفەرموێ دەستدرێژ کردنی فریشتە بۆ ستەمکاران بەمەبەستی سزاو ئازاردانیان لە رۆژی قیامەتدا دەبێو ئەو کاتە پێیان دەڵێن: ﴿الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ﴾ جگە لەم تەفسیرەی تەفسیری تر ناگونجێ بۆ ئەم ئایەتە مەگەر بڵێین: کاتی مردن سەرەتای رۆژی قیامەتە[1]. ئەمجار پەروەردگار لە رۆژی قیامەتدا پێیان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ بێ شكو گومان ئێوە ئێستا هاتوون بۆ لای ئێمە بە تەنیاو رووتو قووتو بێ ناونیشانی دونیاییتان، بێ دارو دەستەو یاساوڵو خزمەتکارو خزمو کەسو کار، بێ ماڵو سامانو چەكو تەقەمەنیو پۆشاكو ئامێری خۆ سەپاندنو هۆکاری خەڵك چەوساندنەوە، کەسێکتان لەوانە لەگەڵ نیە کە بە هاوەڵو هابەشی خوداتان دەزانین، یان پێتان وابوو لەم رۆژەدا شەفاعەتتان بۆ دەکەنو تکاکارتان دەبن لە سزای خودا رزگارتان دەکەن! لەسەرەتادا چۆنمان دروست کردوونو چۆن لە دایك بوون بە رووتو قووتی، ئاوا هاتوونەوە بۆ لامان تەنانەت سوننەتیش نەکراون!! حەزرەتی عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە وتی ئەی رەوانە کراوی خودا! ئەیەرۆ......! بۆ شەرمگا (العورة) ئەی هاوار ژنو پیاو بەیەکەوە بە رووتی حەشر دەکرێنو برێکیان سەیری ئەوانی تریان دەکەن؟! پێغەمبەر فەرمووی نا کەس سەیری شەرمگای کەس ناکا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ – عبس/٣٧﴾. کەس وەسەر کەسی ناپەرژێ.

﴿وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ﴾ ئەو ماڵو منداڵەی پێمان بەخشی بوون هەموویتان بەجێ هێشتووە، چی ماڵو سامانێ خودا پێی بەخشیبوون، چی منداڵو خێزانو خزمەتکارو دارو دەستەی لەگەڵتان بوو لە دونیادا هەمووتان جێ

[1] – تەفسیری مەنار ج ٦٢٦/٧ – ٦٢٧.

هێشتووەو سوودی لێ وەرناگرن بەڵکوو زیانتان پێ دەگەیەنن و سزاتان لەسەر سەختتر دەکەن!

﴿وَمَا نَرَى مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ﴾ نابینین شەفاعەتکارەکانتان لەگەڵتان بن. ئەو بت و صەنەمانەی دەتانپەرستن و پێتان وابوو شەفاعەتتان بۆ دەکەن، ئەو بت و صەنەمانەی کە پێتان وابوو هاوبەشی خودان لە پەرستشی ئێوەداو شیاوی تاعەت بۆ کردنن وەکوو خودا، واتە کە ئەوان بە خودایان زانین و پەرستیانن ئەوە دەگەیەنێ وەکوو خودا کردوویانن بە پەرستراوو خاوەن دەرحەق بە خۆیان. دەی کوان ئەو خودا درۆزنانەی بە هاوبەشی خوداتان حلێب دەکردن لە کوێن؟ نەهاتوون لەگەڵتان؟! بە جێماون!!. ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ﴾ بێگومان لەم رۆژەدا کە رۆژی قیامەتە هەموو پەیوەندییەکی دونیاتان پچڕا! هیچ پەیوەندیەکی دۆستایەتی، خزمایەتی، لێپرسراویەتی، بەرژەوەندیتان لەگەڵ یەکتر نەماوە کار لە کار ترازاوەو هەر کەسە خەمی خودی خۆیەتی کەس وەفریای کەس ناکەوێ ﴿وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ ئەو بت و صەنەمانەی کە لە جیهاندا پێتان وابوو شەفاعەتتان بۆ دەکەن لێتان ون بوون و نایان دۆزنەوەو (حیسابتان بیتی بووە) پەروەردگار لەو مەشهەدە سامناکەداو لەسەر سەری ئەو هەموو حەشاماتەی دەشتی مەحشەر بۆ زێدە ریسوا بوون و سزادان و ناهومێد کردنیان بانگیان لێ دەکاو دەفەرموێ: کوان ئەو شتانەی بە خوداتان دەزانین؟؟ دەبا بێن و فریاتان بکەون! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ – القصص/٦٢﴾. هەروەها پێیان دەگوترێ ﴿أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ، هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ – الشعراء/ ٩٢ – ٩٣﴾. بەڕاستی مەشهەدێکی سامناکەو بارودۆخێکی خەتەرناکە! خودا ئێمەو هەموو موسوڵمانێك بەسەر بەرزی لێی رەهاکا.

## دەسەڵاتی خودا لە بوونەوەردا

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ .

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا تاكو تەنیایی خۆی راگەیاندو بە بەڵگە چەسپاندی، چۆنیەتی پێغەمبەرایەتی روون کردەوەو هەبوونی رۆژی قیامەتو رووداوەکانی رانواندن! ئەمجار لێرەدا گەڕایەوە بۆ ئاراستە کردنی بڕێ بەڵگە لەسەر هەبوونی خودای کردگارو کارسازو بەدیهێنەر؛ کە بە کورتیو پوختی دەربارەی دروست کردنو بەدیهێنانو گیان پێدانو مراندنو ئەندازەکردنی شتەکانو نەخشەو شێوەی هاتو چۆی هەسارەو گەڕۆکەکانو ئەستێرەو مانگو خۆرو گۆڕانی شەو رۆژ دەدوێن، ئەوەتا لەم ئایەتانەی دواییدا دەربارەی بڕێ لە دیاردەی دەسەڵاتو توانای سەرسوڕهێنەرو حیکمەتو لێزانیو کاردروستی پەروەردگار دەدوێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى﴾ بێگومان پەروەردگار دەنکە تۆمو دانەوێڵە لە ناو زەویدا لێك دەکاتەوەو چەکەرەی پێ دەکاو دەیڕوێنێو سەوز دەبێو نەشوونما دەکاو دونیا دەکاتە گوڵو گوڵزارو سەوزاییو شیناوەرد! جۆرەها گژوگیاو رووەكو دانەوێڵەو میوەو بەروبووم لە هەموو رەنگو روخسارو تامو بۆنێك بەرهەم دێنێ، بەراستی ئەم دیاردانە گەورەترین بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودایەکی بالادەستی کردگاری کارسازو خاوەن حیکمەتو تواناو دانا! ئێمەی ئادەمیزاد بە وردی سەیریان ناکەینو لەبەر دووبارە بوونەوەو سێ بارە بوونەوە پێیان ئاشنا بووینو بەلامانەوە شتێکی ئاساییێن ئەگینا لە حەقیقەتدا بەڵگەو دەلیلی دەسەڵاتو کارسازی پەروەردگارن، لە لاپەڕەی بوونەوەردا تابلۆی پڕ نەخشو نیگاری خودای کردگارن! ئەی ئەوە نیە بۆخۆی رستەی ﴿فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى﴾ تەفسیر دەکاو دەفەرموێ: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ﴾ گژوگیاو دارو درەختی نەشونما کەری شێوە زیندوو لە دەنکە تۆمو دانەوێڵەیەکی رەقو تەقی نیمچە مردوو دەردێنێ! لە رێگەی رێکخستنی هۆکارو کارتێکراوەوە بەم شێوە دەنکە تۆمو دانەوێڵەکان لەناو خاکا بچێندرێن بە ئاو ئاوبدرێنو هەوا سازگار بێ کار سەردەگرێو تۆم دەتەقێو سەوز دەبێو وەبەر دێ!

پەروەردگار کشتوکاڵی سەوزو دارو درەختی زیندوو لە مردوویەکی رەقو تەق دەردێنێ! مەبەست بە زیندوو لێرەدا غیذا وەرگرتنو نەشوونما کردنە، مەبەستیش بە مردوو شتێکە کە غیذا وەرنەگرێو نەشونما نەکا وەکوو گڵو دەنکە تۆمو هێلکەو تۆمی ئادەمیزادو ئاژەڵ! ئەگەر بگوترێ زانستی تازە دەری خستووە کە هێلکەو تۆمی ئادەمیزاد ئاژەڵ گیانیان تێدایە! دەڵێین: مەبەستمان گیانێکە رواڵەتیو جمو جووڵی ئاسایی تێدا بێ! ئێستا برێک تەفسیری زانستیانەی تر بۆ ئەم ئایەتە دەکەنو دەڵێن: مەبەست بە دەرهێنانی زیندوو لە مردوو ئەوەیە کە زیندوو لە مردوو پێك دێ ئەوەتا زیندوو بە خواردن نەشونما دەکا خواردەمەنیش مردووەو بێ گیانە!

﴿وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ﴾ هەروەها پەروەردگار دانەوێڵەو دەنکە تۆمی رەقو تەقو بێ گیان لە گژوگیاو دارو درەختی نەشونماکەر دەردێنێ، هەندێك دەڵێن: مەبەست بە مردوو ئیفرازاتی جەستەیە وەکوو: شیرو ئارەقو شتی تر کە لە جەستەی ئادەمی یا گیانداری تر دێتە دەرێ! ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ؟﴾ بەدیهێنەری ئەم شتانە ئەو کەسەیە کە ئەوپەڕی دەسەڵاتو حیکمەتو لێزانی هەیە ئەویش پەروەردگاری تاكو تەنیاو باڵادەستو کار رەنگینو بێ هەمتایە! دەی ئێوە چۆن لە حەق لادەدەنو روو دەکەنە بەتاڵ؟ بە چ عەقڵێك لە تەك خودادا شتی تر بە خودا دەزاننو دەیپەرستن؟ چۆن شتێك دەکەنە هاوبەش بۆ خودا کە دەسەڵاتی هیچی نیە؟ تەنانەت شتی وا دەپەرستن مردوو بێ گیانە!؟

﴿فَالِقُ الإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا﴾ پەروەردگار بەدیهێنەری رووناکییە، دڕ بە تاریکایی دەداو رووناکیی بەیانی دەردەکەوێ دونیا رووناك دەبێو رەوشن دەبێتەوەو تاریکایی دەڕەوێتەوە، شەو بە خۆیو تاریکی را دەبێو ڕۆژ دێتە شوێنی، رووناکایی پڕشنگی خۆی بە جیهاندا پەخش دەکا.

لێرەدا پەروەردگار دەسەڵاتو توانایی خۆی بەسەر بوونەوەردا دیاری دەکا، رای دەگەیەنێ کە دەسەڵاتی بەدیهێنانی شتی دژ بەیەکی هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿فَالِقُ

الإِصْبَاحِ﴾ دژەکەشی هێنایە پێشەوەو فەرمووی: ﴿وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا﴾ شەوی بەدیهێناوە بۆ ئارام گرتن تێیدا، کە بە تاریکایی خۆی جیهان دادەپۆشێ‌و دونیا کش‌و مات دەبێ‌و گیاندارەکان تێیدا ئارام دەگرن‌و ماندوویان دەحەسێتەوە کفت‌و کۆی ئێش‌و ئازاری ئیش کردنی ڕۆژیان دەنیشێتەوە! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا، وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا، وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا – النبأ/ ٩ – ١١﴾. لە شەودا گیانداری ماندوو بو بەئیشی ڕۆژ دەحەسێتەوەو تێیدا ئارام دەگرێ، ئارامگرتنەکە ئارامگرتنی جەستەو ئارامگرتنی بیرو ئەندێشەو هۆش‌و دڵ‌و دەروونە! شەو کاتی ئارامگرتنە چونکە زۆربەی جم‌و جووڵی کە لە ڕۆژدا دەکرێ بە شەو ئەنجام نادرێ چونکە ڕۆژ ڕووناکەو دونیا ڕەوشەنە، شەو تاریکەو جیهان داپۆشراوە زۆربەی گیانداران لە ئادەمیزادو ئاژەڵ‌و باڵندەو خشۆکەکان واز لە گەڕان‌و کارکردن دێنن‌و دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ‌و هێلانەو لانەی خۆیان، بۆ حەسانەوەو پشوودان، کە ئەو حەسانەوە تەواو نابێ‌و نایەتە جێ بەبێ نووستن، چونکە بە خەو ئەندامەکانی جەستە، هەست‌و بیرو هۆش ئارام دەگرن‌و جم‌وجووڵی ئیختیاریان دەوەستێ! ئەندامەکانی ناوەوەی جەستە وەکوو دڵ‌و گورچیلەو جیهازی هەزم‌و مێشك تا ئەندازەیەك هێواش دەبنەوە؛ لێدانی دڵ کەم دەبێتەوە، هەناسەدان لەسەرخۆتر دەبێ هاتووچۆی خوێن لە بۆرییەکانی خوێندا کەمێك سستی تی دەکەوێ بە تایبەتی لە سەرەتای نووستندا کە هەست کردن لاواز دەبێ تەنانەت دەتوانین بڵێین: نیمچە مردنێکی بەسەردا دێ، جیهازی عەصەبی دەحەسێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەندامەکان بحەسێنەوە!

﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا﴾ خۆرو مانگ دێن‌و دەچن بە ئەندازەو بە حیساب‌و بە ژمارە بۆ گەیشتن بە ئاکامی خۆیان‌و تەواوکردنی ڕێڕەوی دیاری کراو بۆیان، خۆرو مانگ هەڵدەسوڕێن بۆ ئەنجامدانی بەرژەوەندی مەخلوقات، هەڵاتن‌و ئاوابوونیان‌و ئەو گۆڕانکارییەی ڕوودەدا لە گواستنەوەو دیمەنیان هەموو بە حیسابەو دیاری کراوەو نەخشەی داڕێژراوەو ئەوان ئەنجامی دەدەن، بۆ

هەریەکەیان قۆناغی دیاری کراوو ڕێڕەوی تایبەتیو شوێنی هەڵاتنو ئاوا بوونی خۆی هەیە، لە چوار وەرزی ساڵدا بە گوێرەی گۆڕانی شەوو ڕۆژ گۆڕانکاری بەسەر کاریگەرییان لە زەویدا دێ، بەڵام هەموو بە گوێرەی ئەندازەو حیسابی بۆ دیاری کراو وەکوو لە شووێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ – الرحمن/٥﴾.
یان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاء وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ – يونس/٥﴾.

**پەروەردگار لەم ئایەتەدا سێ نیشانەی ئاسمانی دیاری کردن:**

١- دڕدانی تاریکایی شەوو دەرکەوتنی ئاسۆی بەیانی، پەخش بوونەوەی رووناکایی بەسەر زەویدا کە جوانیو رازاوەیی بە وجود دەبەخشێ.

٢- دروست کردنی شەو بۆ حەسانەوەی جەستەو بیرو هۆش.

٣- دروست کردنی خۆرو مانگ بۆ زانینی مێژوو ساڵو وەرزو کات... ئاشکرایە ئادەمیزاد چەند پێویستی بە زانینی کات هەیە بۆ زانینی کاتی خودا پەرستیو مامەڵە کردنو مێژووی رووداویان.

زانایانی ئاسمان شوناسی کۆکن لەسەر ئەوە کە زەوی دوو جۆر سوڕانەوەی هەیە، سوڕانەوەیەکی بە دەوری خۆی بە بیستو چوار کاتژمێر ئەنجامی دەداو شەوو ڕۆژ لە ئەنجامی ئەم سوڕانەوەدا پەیدا دەبن. سوڕانەوەیەکی تر هەیە بە دەوری خۆردا لە ماوەی ساڵێکدا ئەنجامی دەدا بەمەش چوار وەرزە پەیدا دەبن.

﴿ذَلِكَ﴾ ئەو دەستکردو بەدیهێنانە، ئەو کار دروستیو کردەوە بەرزانە، ئەو رێکو پێکیو هاتووچۆو هەڵسوڕانە، ئەو گۆڕانکاری مردنو ژیانە ﴿تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ ئەندازە کردنو نەخشەکێشانی پەروەردگاری باڵادەستو زاناو کارسازە، کە بە دەسەڵاتی باڵاو زانستی فراوانو رەهاو توانای لە بن نەهاتوو حیکمەتو لێزانی خۆی بوونەوەری بەدیهێناوەو لێکی داوەو هەڵی دەسوڕێنێ، هیچ کام لەمانەی بێ هودە دروست نەکردووە، ئەوە ملیۆنەها ساڵە ئەو هەموو هەسارەو ئەستێرە کاکەشانە، مانگو خۆرو زەویو ئەو هەموو قەبارە زەبەللاحانەی کە هەر خودا

دەزانــێ چــونن‌و چــەند زلــن! دێــن‌و دەچــن‌و هەڵدەســوڕێن، بــەو ئەنــدازەی بۆیــان دانراوە بە گوێرەی ئەو نەخشەی بۆیان کێشراوە پاش‌و پـێش ناکەن‌و مـاتڵ نـابن‌و لە ڕێگەی خۆیان لانادەن‌و لێك ناخشێن‌و دەعم ناکەن‌و بەنزین‌و گازیان لێ نـابڕێ‌و بورغویان ناسوێن، هەر یەکەیان لە تەوەری خۆیدا ئەرکی خۆی ئـەنجام دەدا وەکـوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ – القدر/٤٩﴾.

ئــەمجار پەروەردگارنیــشانەیەکی تــری تــاك‌و تــەنیایی‌و باڵادەســتی خــۆی لــە نیشانەکانی عالەمی باڵا باس دەکـاو لـە تـەکیا سـوودو قازانجەکەشـی دەسـت نیـشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئەستێرە پرشنگدارەکانی بۆ ئێوە کردووە بە نیشانە، بۆ ئەوەی لە ناو تاریکایی وشکانی‌و دەریـادا ڕێگـەوبانی خـۆتـان بدۆزنـەوە، جا ئـەو تاریکاییە تاریکایی ئاشکرا بێ وەکوو تاریکایی شەو یان تاریکایی سەرگەردانی‌و وێڵ بوونی ناو بیابان‌و دەریا گەورەکان بێ!

هەڵبەتـە مەبەسـت بـە ئەسـتێرە پرشـنگدارەکان لێـرەدا غـەیری مـانگ‌و خـۆرە، چـونکە بـە ڕواڵـەت ئەسـتێرە نیـشانەی شـارەزایی‌و ڕێ دەرکـردنن، عەرەبـەکان لـە سـەردەمی خێڵـەکی‌و کۆنیانــدا بــە هــەڵهاتنی ئەســتێرە کاتیــان دیــاری کــردووە، چاودێری ئەو ئەستێرانەیان دەکرد کە لـە شوێن هـەڵاتو شوێن ئـاوابوونی مانگـدا هەڵدەهاتن‌و ئاوا دەبوون، لە قۆناغەکانی مانگ ڕێرەویان دەکردو هاتووچۆیان بوو، شارەزا بوونیان بە ئەستێرە بە دوو شێوە بوو:

١- زانینی کات لە شەوداو زانینی وەرزی ساڵ.

٢- زانینی ڕێگەی هاتووچۆ لە وشکانی‌و دەریادا.

بەپوختی پەروەردگار دوای باسکردنی بڕێ لەو نیعمەتانەی کە بە هۆی مـانگ‌و خۆرەوە بە ئێمە دەگەن‌و ئەو دوانە بـە قـەبارە گەورە دێتنـە بەرچاومان، ئـەمجار بــڕێ فــەضــڵ‌و گــەورەیی خۆیمــان یــاد دەخاتــەوە بــەوەی کــە ئــەو ئەســتێرە پرشنگدارانەی بۆ ڕام کردووین کە ئەمان لە پـێش چاوی ئێمـە بـە بچووك دیـاری

دەدەن. بێگومان لەم چەرخەی ئێمەدا دووربین‌و ئامێری چاودێری (مرصد)ی وا هەیە دووریی ئەو ئەستێرانە هەندێك نزیك دەكاتەوە پرشنگ‌و رووناكیان مەزندە دەكا، زانیارییەكی باش وەدەست كەوتووە دەربارەی خێرای هاتووچۆیان‌و دووریان لە ئێمەو قەبارەو زەبەللاحییان‌و ئەو شتانەی لێیان پێكهاتوون‌و، گەلێ زانستی تر دەربارەیان كە لەوەپێش نەزاندرابوو! ئاشكرایە ئەمڕۆ زانایانی ئاسماننناسی (علماء الفلك) بۆیان روون بۆتەوە كە ژماری ئەستێرەكان دەیان ملیۆن ئەستێرەی گەورەو بچووكەو بەڵكوو زیاتریش.[1]

---

[1] – لێرەدا بە پێویستی دەزانم برێك لە كتێبی پوختەی ئایینی ئیسلام ج١/١١٥ – ١١٧. راگوێزی ئێرە بكەم كە دەڵێ: لێرانەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، پرسیارەكەش ئەوەیە ئایا ئەم كەونە چەندەو چۆنەو چییە؟! لە وەڵامدا دەڵێین زانایانی ئاسماننناسی دەڵێن: زەوی بریتییە لە بەشێك لە بەشەكانی كۆمەڵەی خۆریی (المجموعة الشمسية) كۆمەڵەی خۆریش بەشێكن لە بەشەكانی شارە ئەستێرەكانی بۆشایی فراوان. زیاد لەمانەش چەند ئەیزەك‌و ئەستێرەی ئاگراوی‌و كلكدارو مانگی تر هەن.

دەی كەوابوو ژمارەی ئەو ئەستێرانەی كە لە مەجەرەی خۆماندا هەن‌و سەر بە كۆمەڵەی خۆرن‌و پێیان دەگوترێ كاكێشان (درب التبانة) چەندن؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر بە چاوی ئاسایی‌و عادەتی سەیریان بكەین دەبینین ژماری تێكرای ئەم ئەستێرانەی كە لەدوو نیوە كورەی باشوورو باكوردا دەبینرێن لە شەش هەزار ئەستێرە تێپەڕ ناكەن، بەڵام ئەگەر بە ئامێری دووربین‌و پێشكەوتوو سەیریان بكەین ژمارەیان زۆر زیاتر دەبێ! زانای ئاسماننناس (كابتین) دەڵێ: ژمارەیان بە (٤٠٠٠٠) ملیۆن دادەنرێ. مامۆستا (شابیلی) كە زانایایەكی فەلەكی دووربینی زانكۆی (هارفەرده)ە دەڵێ: ژمارەیان دەگاتە (١٠٠٠٠٠) ملیۆن ئەستێرە، ژمارەی مەجەرەكانیش دەگاتە (١٠٠) ملیۆن مەجەرە، هەر مەجەرەیەكیش چەند ملیۆن ئەستێرەی هەڵگیرساوو ئاگراوی تێدایە. دەی باشە قەبارەی ئەم ئەستێرانە دەبێ لە بەرامبەری قەبارەی خۆردا چەند بێ؟!

لە وەڵامدا دەگوترێ: خۆر بۆخۆی ئەستێرەیەكە وەكوو ئەو ئەستێرانەی كە بە ئاسمانەوە دەبینرێن، وەلێ كە بە گەورەتر لەوانی تر دێتە بەرچاومان لەبەر ئەوەیە كە لە ئێمە نزیكترە دەنا خۆی ئەستێرەیەكی مامناوەندییە، بچووكترین ئەستێرەیەك كە تا ئێستا دۆزرابێتەوە

بەڵام تا ئێستا زانایان نەیان توانیوە دووریی جگە لە چەند ئەستێرەیەك زیاتر بزانن، چونكە ئەوانی تر لەبەر زۆر دوورییان لە ئێمە چ زانیاریەك لە بارەیانەوە دەست نەكەوتووە، هەرچەندە ئێستا رۆژانە دووربینی پێشكەوتوو ترو ئامێری

---

ئەستێرەی (فان ماتن)ە، كە رەنگ بێ كەمێ لە گۆی زەوی گەورە تر بێ لەگەڵ ئەویشا ملیۆنێ ئەستێرەی ئاوا لە ناو قەبارەی گۆی خۆردا بە هاسانی جێی دەبێتەوە. بگرە پتریش، لە لایەكی ترپیشەوە ئەستێرەی (منكب الجوزاء) ئەوەندە گەورەو زەبەللاحە جێگای ملیۆنەها ئەستێرەی وەكوو خۆری تێدا دەبێتەوە، دەی باشە ئەم ئەستێرانە چەند لە ئێمە دوورن؟! لە وەڵامدا دەڵێین: كۆمەڵەی خۆر، كە زەویش لەوانە، ئەوەندە لە ئەستێرەكانی ترەوە دوورن دەتوانرێ بە گۆشەگیرێكی تەواو حسێب بكرێن لە فەزادا چونكە دووری خۆر لە ئێمەوە كەمتر لە (٩٣ ملیۆن میلە)، واتە: زیاتر لە چوارصەد جار بەقەی دووریی مانگ لە ئێمەوە دوورترە، خۆ كاتێك بمانەوێ ریژەیی دووری ئەستێرەكانی بزانرێ هەزار ملیۆنیش بەش ناكاو باس ناكرێ بەڵكوو پێویستە ئەو كاتە قسە لە ملیۆن ملیۆن بكەین، بۆیە زانایانی ئاسماننـاس هاتوون خێرایی رووناكییان كردووە بە ئامێری روون كردنەوەو زانینی ئەندازەی دووریی نێوان ئەستێرەكان، واشیان تەخمین كردووە كە خێرایی‌و تیژرۆیی رووناكیی لە چركەیەكدا (١٨٦٠٠٠) میلە، دوورترین ئەستێرەی گەڕۆك كە ناوی پلۆتۆیەو سەر بە كۆمەڵەی خۆرە رووناكی ئەومان بە چوار پێنج سەعات دەگاتێ لە كاتێكا گەیشتنی رووناكی لە نزیكترین ئەستێرەوە چوار پێنج ساڵ دەخایەنێ.

پێشكەوتووترین ئامێری دووربین‌و وێنەگرتن تا ئەمڕۆ هەر دەتوانێ ئەو ئەستێرانە ببینێ كە دوو هەزار ملیۆن ساڵی رووناكی لە ئێمە وە دوورن. ئەوەش زانراوە كە كۆمەڵەی ئەستێرەی سەر بە خۆر بە هێواشی بە دەوری تەوەرە (میحوەری) خۆیاندا دەسوڕێنەوە، هەروەها كۆمەڵەی ئەستێرەی تریش هەمان سوڕانەوەو جووڵانەوەیان هەیە. كەوابوو هەبوونی ئەم هەموو بلوێن ئەستێرەیەو دابەش كردنیان بەو شێوە رێك‌و پێكەو هەڵسوڕان‌و هاتووچۆیان بە گوێرەی نیزام‌و یاسایەكی دیاری كراوی وا كە بە هیچ جۆرێك لێك نەخشێن‌و دەعەم نەكەن‌و بەری رێگا بە یەكتری نەگرن ئا ئەمانە هەمووی گەورەترین بەڵگەن لەسەر هەبوونی خوایەكی خاوەن دەسەڵاتی بێ هاوبەش‌و بێ هاوتا كە هیچ بەڵگەیەكی تر نایگاتێ هەر بۆیەشە قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ، وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ – الواقعة/٧٥ – ٧٦﴾.

دووربـین تـر پەیـدا دەگـرێن، بـەڵام زانیـاری ئـادەمیزاد زانیارمیـیـەکی ئەنـدازەدارو سنووردارە فراوانی کەون‌و کائینات خودا نەبێ کەس نازانێ چەندەو چۆنە!. بـەڵام وەکوو دەڵـێن: (مـشتێك نموونـەی خەرمانێکـە) تێـڕوانین لـە مـانگ‌و خـۆرو ئـەو ئەستێرانەی لە ئێمە دیارن بیرکردنەوەو وردبوونەوە لێیان، دەبنە نیـشانەو بەڵگـە لەسەر هەبوونی خودایەکی کردگارو بەدیهێنەرو کارساز، بۆیـە پـەروەردگار کۆتـای ئایەتەکەی بەوە هێنا کە فەرمووی: ﴿قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُـونَ﴾ مەبەسـت بـە ئایەتـەکان لێـرەدا یـان ئایـەتی قورئـانی پـیرۆزە، یـان مەبەسـت بـە ئایـات نیـشانەو دیاردەکانی بوونەوەرە...

١- جـا لەسـەر مەبەسـتی یەکـەم مانـای ئـەوە دەگەیـەنێ: کـە ئـەم ئایەتـەو هـەر ئایـەتێکی تـر لـە ئایەتـەکانی قورئـان کـە ئـادەمیزاد هەڵـدەنێن بـۆ تێفکـرین‌و لێ وردبوونـەوە لـە بوونـەوەر؛ هـەموویان دانـایی‌و کارسـازیی‌و دەسـت ڕەنگینـی خـودا دەدەنوێنن، ئادەمیزاد بەم تێفکرین‌و لێکۆڵینەوەیە زانستی بۆ زیاد دەبێ.

٢- لەسەر مەبەستی دووەم: واتە: ئەو نیشانەو بەڵگانەی کە باڵادەستی‌و زانـستی فراوان‌و تواناو دەسەڵاتی ڕەهاو لێزانی پـەروەردگار دەچەسـپێنن، کەسـێك دەتوانـێ ئەو بەڵگانە لە تێڕوانینی بوونەوەرو عالەمی بەرزایی دەربێنێ‌و بیانـدۆزێتـەوە کـە خاوەن زانـست‌و هەسـت‌و هۆشـی تـەواو بـێ‌و پەنـدو عیـبرەت وەربگـرێ، نـەك هـەر بەوەندە وازبێنێ بڵێ بە خوا ئەوە شتێکی سەرسوڕهێنەرەو ناوازەیە.

کەواتـە ئـەو ئەسـتێرانە چـۆن لـە تاریکـایی‌و وشـکانی‌و دەریـادا ڕێگایـان پـێ دەدۆزرێتەوە بەو جۆرەش ڕێگایـان پـێ دەدۆزرێتـەوە بـۆلای خـوداو تاریکـایی دڵ‌و دەروون‌و ژیرییان پێ دەرەوێتەوە، دەبنە هـۆی ڕزگـار بـوون لـە گـومڕایی‌و گێـژاوی سەر لێ تێك چوونی بیروباوەڕ...

دوا بـەدوای بـاس کردنـی بـڕێ نیـشانەی دەسـەڵات‌و خوایـەتی خـۆی لـە زەوی‌و ئاسمانـدا بـڕێ نیـشانەی خودایـەتی خـۆی لـە خـودی خۆمانـدا بـۆ بـاس دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنـشَأَكُم مِّـن نَّفْـسٍ وَاحِـدَةٍ﴾ پـەروەردگار خودایـەکی وایـە:

ئێوەی لە یەك نەفس درووست كردووە كە ئادەمیزادی یەكەمە بە بابە ئادەم مەشهوورە لە ڕێگەی زاووزێوە ئێوەی لێ كەوتۆتەوە!

لە كەوتنەوەی ئەو هەموو ئادەمیزادە لە تاقە كەسێك بەڵگەی بەهێزو ئاشكرا هەن لەسەر دەسەڵاتو زانستو دانایی‌و تاكو تەنهایی خودا، وەبیرخستنەوەی ئەم ڕاستییە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: كە پێویستە هەمیشە ئادەمیزاد سوپاسگوزاری نیعمەتە جۆراو جۆرەكانی پەروەردگار بێ‌و شارەزایی كردنیشمانە بۆ یەكترناسین‌و هاریكاری كردنی یەكتری لەسەر چاكەو چاكەخوازی، بۆ ئەوەی ئەم جوداوازی ڕەنگو زمان‌و نەتەوەو هۆزو بەرەباب‌و خێزانانە ببنە هۆكاری خۆشەویستی‌و یەكترناسین‌و یارمەتیدانی یەكتری، نەك ببنە هۆی دوژمنایەتی‌و بەربەركانی‌و دژایەتی كردنی یەكتری!

﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ واتە: بۆ ئێوە هەیە شوێنی مانەوە لە منداڵداندا كە بە نوطفەیی دەخرێنە ئەوێوە، هەروەها شوێنی مانەوەی كاتیی كە لە پشتی باوكتاندا بۆ ماوەیەكی كاتی دەمێننەوە. یان (مُسْتَقَرٌّ) واتە: مانەوەتان لەسەر زەوی (مُسْتَوْدَعٌ) واتە: مانەوەی كاتی لە ژێر زەویداو لە گۆڕدا[1]. یان بە پێچەوانەوە (مُسْتَقَرٌّ) واتە: شوێنی مانەوەتان لە پشتی باوكتاندا، (مُسْتَوْدَعٌ) واتە: شوێنی كاتی مانەوەتان لە منداڵدانی دایكتاندا بۆیە پشتی پیاو كراوە بە شوێنی مانەوەی تۆو منداڵدان كراوە بە شوێنی بە ئەمانەت‌و كاتیی دانراوی تۆم، چونكە تۆم لە پشتی پیاودا پەیدا دەبێ‌و بە شوێنی قەرارو مانەوەی حلێب دەگرێ، بەڵام منداڵدان وەكوو زەرفێكی كاتیی وەكوو شوێنێكی كاتیی ئەو نوطفەیەی تێدا دادەنرێ[2].

تەفسیرێكی تر لە ئەبو موسلیمی ئیصفەهانی ڕیوایەت كراوە دەڵێ: (مُسْتَقَرٌّ) واتە: نێرینە (مُسْتَوْدَعٌ) واتە: مێینە، بۆیە بۆ نێرینە وشەی (مُسْتَقَرٌّ)ی بە كار

---

(١) – تفسير المنار ج ٣٠٨/٧.

(٢) – تفسير المراغي ج ٢٠١/٣.

هێناوە چونکە تۆم (نوظفە) لە پشتی پیاودا دەروست دەبێ، لە شوێنی مێینە وشەی (مُسْتَوْدَعٌ)ی بەکار هێناوە چونکە منداڵدان وەکوو زەرفێك وایە ئەو تۆمەی بۆ ماوەیەکی کاتی تێ دەکرێ، ئەم دێڕە شێعرە عەرەبییەی کردووە بە شایەد بۆ ئەم مانایە کە دەڵێ:

وَإِنَّمَا أُمَّهَاتُ النَّاسِ أَوْعِيَةٌ مُسْتَوْدَعَاتٌ وَلِلآبَاءِ أَبْنَاءُ

یان دەگوترێ: مەبەست بە (مُسْتَقَرٌّ) منداڵدانی دایکە مەبەست بە (مُسْتَوْدَعٌ) گۆڕە! دەتوانین وشەی (مُسْتَقَرٌّ ، مُسْتَوْدَعٌ) بە شێوەی ئیسمی فاعیل بخوێنینەوەو بیکەین بە موبتەدا بۆ خەبەرێکی قرتاو، بڵێین: ﴿فَمِنْكُمْ مُسْتَقِرٌّ﴾ واتە هەتانە لە جیهاندا جێگیر دەبێ‌و تەمەنی درێژ بەسەر دەبا، ﴿وَمِنْكُمْ مُسْتَوْدَعٌ﴾ هی واشتان هەیە مانەوەی لە جیهاندا زۆر نابێ مردن بە ساوایی یان بە گەنجی هەڵی دەپروکێنێ!؛ تەنانەت ئەگەر بە شێوەی ئیسمی (فاعیل)یش نەیان خوێنینەوە ئەم مانایانەیان بۆ دەگونجێ[1].

خاوەنی مەنار دەفەرموێ دوا مانا کە بەدڵمدا دێ بۆ مانای ﴿مُسْتَقَرٌّ﴾ ئەوەیە: کە مانای گیان بێ ﴿مُسْتَوْدَعٌ﴾یش بە مانا جەستە بێ!، مامۆستا مەلا عەبدولکریمی مودەڕیس دەفەرموێ: ﴿فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾...... لە پاش ئەوەی کە پەرەتان سەندو زۆر بوون‌و چەند لقتان لێ پەیدا بووو بڵاوبوونەوە بە جیهاندا بازە شوێنێکتان کرد بە جێگەی مانەوەو ئارامگرتن، واتە کردنتان بە شارو دێهات‌و ئارامتان گرت تیایاندا لەبەر ئەوە کە لەگەڵ ژێوارتانا رێ ئەکەوت‌و بازێ شوێنتان کرد بە شوێنی ئەمانەتی وەچەن کات‌و ساتێ تا دێنەوە بۆ جێگەی موناسیبترو بەسوودتر[2]...... بەهەر حاڵ تەفسیری تریشیان بۆ ئەم دوو وشەیە کردووە بەڵام بە پێویستم نەزانی زیاتر درێژە بە باسەکە بدەم!.

---

[1] – تفسير المنار ج ٦٤٠/٧.

[2] – تەفسیری نامی ج ١٨٣/٢.

﴿قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ بێگومان ئێمە ئەو ئایەتانەی کە داب‌و نەریتی ئێمە لە بوونەوەردا شی دەکەنەوە درێژەمان پێداون، ویست‌و ئیرادەی لە بن نەهاتوومان، زانستی فراوان‌و دانایی‌و لێزانینمان، بەخشش‌و رەحم‌و بەزەیی بێ ئەندازەمان شی دەکەینەوە بۆ کەسانێك تێبگەن‌و بزانن مەبەستەکان چین‌و پەی بە وردیات‌و نهێنی ئایەتەکان بەرن.

لە کۆتای ئەم ئایەتەدا فەرمووی: ﴿يَفْقَهُونَ﴾و لە کۆتایی ئایەتی پێشوو ﴿يَعْلَمُونَ﴾ی بەکارهێنا، چونکە دەرهێنانی حیکمەت‌و نهێنی لە دروست کردنی ئادەمیزاد لە یەك تاقە کەس‌و دوایی زاوزێ کردنیان‌و زۆر بوون‌و بڵاو بوونەوەیان‌و جوداوازی نێوانیان لە رەنگ‌و دەنگ‌و قەبارە‌و شێوە‌و روخسار‌و زیرەکی‌و کەودەنی‌و گەلێ دیاردە‌و رەوشتی تر کە دەبنە هۆی جوداوازی‌و نیشانەی یەکتری ناسینەوە، تەنانەت برای باوك‌و دایکی لێك جیاوازن، بەڵکوو دوانەی بەیەکەوە لەدایکبوو جیاوازی شێوە‌و روخسار‌و گەلێ شتی تریان هەیە! پێویستی بە قوڵبوونەوە‌و تێفکرینی زۆر ورد هەیە بەڵام زانینی هەڵهاتن‌و ئاوابوونی ئەستێرە‌و بوونیان بە نیشانەی شارەزایی لە وشکانی‌و دەریادا شتێکی ئاشکرایە‌و پێویستی بە وردبوونەوەی زۆر نیە.

ئەمجار نیشانەیەکی تر لە نیشانەکانی دروست کردن‌و بەدیهێنان لە جیهانی گژوگیا‌و رووەکدا دەخاتە روو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە کە بە دەسەڵات‌و توانا‌و حیکمەت بە ئەندازە گۆڕانکاری لە بوونەوەردا دەکا، لە بەرزاییەوە باران دەبارێنێ، پیت‌و بەرەکەت‌و رزق‌و رۆزیی بۆ بەندەکانی لە زەوی پێ پێك دێنێ، بەو بارانە زەوی مردوو ئاودێر دەکا‌و زیندووی دەکاتەوە، دانەوێڵە‌و تۆمی وشك‌و رەق‌و تەق سەرلەنوێ لێك دەکاتەوە‌و چەکەرە دەکا‌و دەژێتەوە‌و سەوز دەبێتەوە، جۆرەها گژوگیا‌و رووەکی جیاجیا لە رەنگ‌و روخسار‌و تام‌و بۆن‌و گەلێ تایبەتمەندی تردا لە زەوی دەردێنێ؛ لە کاتێکدا بە یەك ئاو ئاودەدرێن‌و لە یەك ئاخ دەروێن، وەکوو

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ - الرعد/٤﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ - الأنبياء/٣٠﴾.
ئەمە کە ئاو هۆی رووانو سەوز بوونە، شتێکی ئاشکرایەو هەموو کەس دەیزانێ، بەڵام لە راستیدا کاریگەری ئاو گەلێ لەوە گرنگترو گەورەترە، چونکە تیۆری زانستیو رای زانایان وایە؛ کە زەوی لەسەرەتادا پارچە ئاگرێکی گڕدار بووە، لە پاشان سارد بۆتەوەو بووتە وشکانیەکی کاکی بە کاکی، دوایی بەهۆی بارانو چەند شتێکی ترەوە سەرزەوی خۆڵێکی نەرمی لێ پەیدا بوو ئەمجار ئاوو بوو بەیەکێك لەو هۆکارە سەرەکییانەی کە هێزی رواندنو نەشو نومای تیا پەیدا بوو، ئەوەش بەهۆی چەخماخەی هەورە بریسکەوە کە مادەیەکی وەکوو نایترۆجینی لەگەڵ بارانەکەدا دەبارێنێتە سەرزەوی بەبێ ئەو ماددەیە خۆڵ هیچی تێدا ناروێ؛ ئەو ماددەیە ئێستا پێی دەگوترێ (سماد)...

جا ﴿فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا﴾ بەهۆی ئەو بارانەوە کشتوکاڵو دارستانی سەوزمان وەدەرهێناوە، ساقو پەلو پۆپو تەرزەو توولەمان لێ پەیدا کردوون، ئەمجار ئەو گژوگیاو دارو درەختانە بەروبووم دەگرنو پێ دەگەن ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ دانەوێڵەی بە مل یەکاچوو چین لەسەر چینیان لێ دەردێنین، ﴿وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ﴾ دەردێنین لە دارخورما لە پرزەو چڵو پۆپەی سەری هێشووە خورما کە شۆڕبوونەتەوە، کەسێ بیەوێ دەستی پێیان دەگاو دەتوانێ بیان چنێ، ﴿وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ﴾ هەروەها لەو سەوزاییە، رەزو باغی ترێ پێك دێنین هەوەرها باغی زەیتوونو باغی هەنار رێك دەخەین کە لە رەنگو شکڵدا لێك نزیکن، بەڵام لە بەروبوومدا زۆر لێك جیاوازن؛ هەیانە بەرەکەی شیرینە، هەیە مزرە، هەیە تاڵە، هەیە تامەکەی ترشە، هەیە تامێکی تری هەیە، رەنگی بەروبوومەکەش جیاوازو جۆراوجۆرە، رەنگاو رەنگو هەمەچەشنەیە!.

﴿انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ﴾ بە چاوێکی وردبینییەوە سەیری بەروبوومی ئەو باغانە بکەن، لە دانەوێڵەو بەری گژوگیاو بێستانو باغی جۆراو جۆری بروانن، چۆن سەر دەردێنێو پێ دەگاو کامڵ دەبێ!! چۆن لە وشکیەوە تەڕ دەبێتەوەو پڕ دەبێ لە ئاوو خێرو بەرەکەتو جۆرەها فیتامینات!! هەموو بەروبوومو میوەیەك تامی خۆی هەیە بۆنو قەبارەو شێوە روخسارو رەنگی خۆی هەیە، بەراوردێك لە نێوان میوەکاندا بکە، بیر لە تواناو دەسەڵاتی خودای کردگار بکەرەوە، سەیری بکە بڕوانە ئەو درەختە چۆن لەکاتی زستاندا رەشو رووتو وشكو برینگە، چۆن لە بەهاردا چرۆ دەکاو دەژێتەوەو بەو گەڵا تەڕوی تازەیە خۆی دەرازێنێتەوەو پۆشتەو پەرداخ دەنوێنێ؛ هەریەکەی رەنگو تامو بۆنو بەرامێکی لە خۆ گرتووە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ – الرعد/٤﴾.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەو شتانەی کە فەرمانمان پێ کردن تێیان بفکرن چەند نیشانەو بەڵگەی جۆراو جۆر هەن، لەسەر دەسەڵاتو توانای بەدیهێنەرەکەیان رەحمو بەزەییو حیکمەتی ئەو زاتە دەچەسپێنن، موسوڵمانانی خاوەن بڕوا بە خوداو شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانی سوود لەو تێفکرینو ورد بوونەوەیە دەبینینو ئیمانیان پێ بەهێز دەبێو دڵیان ئارام دەگرێ.

تێبینی ئەوە دەکرێ پەروەردگار لە ئایەتەکەدا چوار جۆر درەختی باس کردنو دارخورما، دارمێو، دارزەیتوون، دارهەنار! گژوگیاو رووەكو دانەوێڵەو خەڵەی پێش درەختەکان خست، چونکە بەروبوومی رووەكو دانەوێڵە بژێوە، بەروبوومی درەختەکان میوەیە، ئاشکراشە بژێو لە میوە گرنگترە، دارخورماشی پێش درەختەکانی دی خست، چونکە خورما خواردەمەنییەکی گرنگی عەرەبەکان بوو، بۆیەش لە دوای خورما باسی ترێی کرد چونکە باشترین جۆری میوەیە هەر بە

دەرکەوتنی سوودی لێ دەبینرێ بە بەرسیلەیی‌و بە ترێی پاشان دەکرێ بە دۆشاو بە سرکە!.

## هاوەڵ دانان بۆ خودا، دانانی کچو کوڕو خێزان بۆ خودا

﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ فَٱعْبُدُوهُ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار پێنج بەڵگەی لەسەر خودایەتی خۆی هێنایەوەو کەماڵی تواناو دەسەڵات‌و رەحمەتی بێ پایانی خۆی چەسپاند؛ ئەمجار دێتە سەر باسی ئەوەی کە هەندێ ئادەمیزادی نەفام هەن ئەجندە دەکەن بە هاوبەشی خودا، یان وەچەو ئەوەی بۆ دادەتاشن‌و کوڕو کچی بۆ بە رەوا دەزانن، فەرمووی: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ شُرَكَاء الْجِنَّ﴾ ئەو هاوبەش پەیداکەرانە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە لە

ئەجندە، فەرمانبەردارییان دەكردن لەو شتانە كە فەرمانیان پێ دەكردن. لێرەدا مەبەست بە جنۆكە فریشتەیە، چونكە ئەوان هەیان بوو فریشتەیان دەپەرستن.

ئەم تەفسیرە لە قەتادەو سوودییەوە ریوایەت كراوە! حەسەنی بەصری دەڵێ: مەبەست بە جنۆكە لێرەدا شەیاتینن! چونكە عەرەبەكان تاعەتی شەیاتینەكانیان دەكرد لە تاوان‌و شەریك بۆ خودا دانان، بڕێك دەڵێن مەبەست بە جنۆكە شەیتانە بڕێك گەل‌و نەتەوە بە خودای شەڕیان داناوە، وەكوو ئاگرپەرستەكان كە دەڵێن: یەزدان خودای خێرو رووناكییە، شەیتانیش خودای شەڕو تاریكییە!

سەیرە! ئەو موشریكانەی جنۆكەیان كردوون بە هاوبەشی خوداو بە قسەی ئەوان بتەكانیان دەپەرستن ﴿وَخَلَقَهُمْ﴾ وەلحاڵ پەروەردگار ئەوانیش‌و بتەكانیشی دروست كردوون غەیری ئەوانیشی بەدی هێناوە، دەی چۆن دروست كراو دەبنە شەریك‌و هاوەڵ؟؟ چۆن لەگەڵ خودادا شتی تر دەپەرستن؟! وەكوو حەزرەتی ئیبراهیم بە قەومەكەی فەرمووی: ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ، وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ – الصافات/٩٥ – ٩٦﴾. بە پوختی پەروەردگار تەنها خۆی خودایەو هەر ئەو بەدی هێنەرو خالقە. بۆیە پێویستە تەنها ئەو زاتە پاكە پیرۆزە بپەرسترێ‌و كەس نەكرێ بە هاوەڵ‌و هاوشانی.

﴿وَخَرَقُواْ لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ لەبەر نەزانی‌و نەفامی، لەبەر ئەحمەقی‌و گەمژەیی ئەو موشریكانە هاتوون كوڕو كچیان بۆ خودا داناوە بەبێ ئەوەی بزانن چی دەڵێن، نازانن لەسەر حەقن یان هەڵەن، بەڵكوو وتەیەكە كوێرانەو نەزانانە لە دەمیان دەردەچێ بەبێ ئەوەی لێی ورد ببنەوەو تێی بفكرن فڕێی دەدەن‌و وشەی ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ تەئكیدی مانای ﴿وَخَرَقُواْ﴾ دەكاتەوە، موشریكە عەرەبەكان دەیانگوت فریشتە كچی خودان، جوولەكە دەیانگوت عوزەیر كوڕی خودایە، نەصرانییەكان دەیانگوت عیسا كوڕی خودایە ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاك‌و بێ عەیب‌و خەوشە خودا دوورە لەو شتانەی پێیەوە دەڵێن: نە هاوەڵی هەیە، نە كوڕو نەكچی

هەیە! ئەو بۆخۆی بە دیهێنەری هەموو شتێکەو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرەو هاو وێنەی نییەو کەس لێی ناچێ‌و لەکەس ناچێ!

پەروەردگار ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ بەدیهێنەرو ئەندازیاری ئاسمانەکان‌و زەوییە، دروستی کردوون بەبێ ئەوەی لەوەپێش وێنەیان هەبووبێ، ﴿أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ﴾ چۆن خودا منداڵی هەیە؟ بە چ عەقڵ‌و هۆشێك ئەوانە منداڵ‌و نەوە بۆ خودا دادەنێن؟؟ خۆ پەروەردگار خێزانی نیەو ناشێ خێزانی هەبێ، منداڵی ئاسایی کە دەبێ لە ئاکامی بەیەك گەیشتنی ژن‌و مێرد پەیدا دەبێ: دەبێ نێرو مێیەك لە یەك رەگەز بن‌و لەیەك بچن! دەی خۆ خودا کەسی لێ ناچێ‌و لەکەس ناچێ، لە هیچ رەگەزێك نیە لەگەڵ هیچ مەخلوقێکیدا موناسەبەتی هاوشانی‌و لێکچوونی نیە، چونکە خودا دروستکارو بەدیهێنەری هەموو شتێکە، نە خێزانی هەیە نە منداڵی هەیە! خولقێنەری وەچەو نەوەیە لە رێگەی زاو زێی نێوان نێرو مێوە!! ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ هەموو شتێکی دروست کردووە بە دروست کردن! نەك لێی بووەو لێی کەوتۆتەوە، ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەوەی کە ئێوە بە کوڕو کچی خودایان دەزانن ئەوانە دروست کراوی خودان نەك منداڵی خودان.

﴿وهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار زانایە بە هەموو شتێك، زانینەکەی هی خودی خۆیەتی، کەس زانینی ئەوەی نیە، ئەگەر خودا منداڵی هەبوایە بۆخۆی لە هەموو کەس پێی زاناتر دەبوو، ئاماژەی بۆ دەکرد، بەڵام ئەوە درۆیەکی هەڵبەستراوو بێ بناغەیە نە بەڵگەی عەقڵی نە بەڵگەی نەقڵی نە نیگا، هیچ چەسپێنەرێکی نیە!

بەکورتی پەروەردگار هەبوونی منداڵی لە خۆ دوور خستەوە، چونکە ئەو بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوییە، لە کەس نەبووەو کەسی لێ نەبووەو نابێ! چونکە منداڵ لە بەیەك گەیشتنی نێرو مێ پەیدا دەبێ نێرو مێیەك یەك رەگەز بن، دەی خۆ خودا لە هیچ رەگەزێك نیە هیچی لێ ناچێ، کەس هاوشانی خودا نیە چۆن دەبێ هاوشانی بێ؟

جا كە ئەوەمان سەلماند كە خودا منداڵی نیە ﴿ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ﴾ ئەی موشریكەكان! ئەوە بزانن ئەو خودایەی كە ئەوە صیفاتو چۆنیەتییەتی، زاتی (الله)یەو خودای ئێوەیەو جگە لە ئەو خودای تر نین، بەدیهێنەری هەموو شتێكە، نە خێزانی هەیە نە منداڵ، هیچ چارەو ڕێگاتان نیە جگە لەوەی كە بیپەرستنو بە تاكو تەنهای بزاننو كەسی تر مەكەن بە هاوشانی، زاتی پاكی بێ خەوشو بێ وێنەیە، نە هاوەڵو نە هاوشانی هەیە، جگە لە زاتی خۆی هەموو شتێك دروست كراوی خۆیەتی، دروست كراویش پێویستە دروستكەری بپەرستێ، پەروەردگار ئاگاداری هەموو شتێكە، زانیاریەكەی زاتییەو لە كەسەوە فێری نەبووە، كەسێكیش دروستكەری هەموو شتێك نەبێ هەموو شتێك نازانێ، ئەگەر منداڵی هەبوایە بۆخۆی لە هەموو كەس باشتر پێی دەزانی، خەڵكیشی بەوە ئاشنا دەكرد، بە نیگاو بەڵگەی زانستی پێی دەسەلماندن! بەڵام ئەوانەی كە ئەم قسەیە دەڵێنو دەیڵێنەوە بوختانێكە هەڵیان بەستووە، هیچ زانستییەك پشتگیری ناكاو بەڵگەی عەقڵی نایسەلمێنێ ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ پەروەردگار وێڕای هەبوونی ئەو صیفاتە بەرزانەی، هەڵسوڕێنەری هەموو كاروبارێكە، بوونەوەر دێنێو دەبا بە زانستو دانایی بێ ئەندازە ڕایگرتووە، بژێوی هەموو بەندەكانی دەدا، بەشەوو بە ڕۆژ پارێزگارییان دەكا، جگە لە زاتی خودا كەسی تر پارێزگاری پێ ناكرێ، جگە لە خودا كەسی تر پێویسیاتی بەندەكانی پێ دابین ناكرێ، كەوابوو پێویستە ئێمە جگە لە پەروەردگارمان هیوامان بەكەس نەبێ، بۆ هەموو كارێك داوای یارمەتی لەو بكەین. ﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ﴾ پەروەردگار چاو نایبینێ بە بینینێكی وا چۆنیەتیەكەی بزاندرێ.

وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ – البقرة/٢٥٥﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ﴾ واتە لە دونیادا چاو نایبینێ، بەڵام موسوڵمانان لە رۆژی قیامەتدا دەیبینن، چونکە خودا بۆخۆی ئەمە دەچەسپێنێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ – القيامة/٢٢ – ٢٣﴾. ئاشکراشە نەبوونی زانیاری تەواو بە زانستی خودا ئەوە ناگەیەنێ کە هەر هیچ زانیارییەك نەبێ، وەکوو چۆن نەفی بینینی تەواو بە چاو ئەوە ناگەیەنێ کە بینین هەر نەبێ، دەگونجێ خودا ببینرێ بەڵام بینینی تەواو نا!!

کەوابوو ج دژایەتییەك نابینرێ لە نێوان ئەم ئایەتەو ئەو فەرموودە صەحیحانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە بینینی خودا دەچەسپێنن وەکوو دەفەرموێ: « إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَمَا تَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ كَمَا تَرَوْنَ الشَّمْسِ دُونَ سَحَابٌ؟» موسوڵمانان رۆژی قیامەت خودا دەبینن، بەڵام کافر نایبینێ، چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ – المطففين/١٥﴾. بەڵام ﴿وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ﴾ پەروەردگار چاوەکان دەبینێ بە بینینێکی تەواو هیچ چۆنییەتیەکی لێ هون نابێ.

﴿وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ پەروەردگار بۆخۆی زاتێکی لەطیفو نامادديە، بە جۆرێك چاو کوێرو کۆڵە لە بینینیو چۆنیەتی نازانێ، بەڵام زاتی پاکی هەموو وردیاتو چۆنیەتی شتەکان دەزانێو هیچ زانیارییەکی لێ گوم نابێ!

بەکورتیو پوختی پەروەردگار لەوە پەنامەکی ترە چاو ببینێ بەڵام ئاگاداری هەموو پەنامەکیو بینینێکە، ئەو بینین دەبینێ بەڵام هیچ چاوێك ئەو نابینێ.

بێگوما زانایانی زانستی تەشریح پێشکەوتنێکی زۆریان بەدەست هێناوە دەربارەی پێکهاتەی چاوو ئەرکەکانی دیتنو شێوەی بینین، هەروەکوو چۆن زانیاریان دەربارەی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان بینراوو چاوەکان شی کردۆتەوە بەڵام تا ئێستا نەیان توانیوە بە تەواوی حەقیقەتی چۆنیەتی بینینەکە بزانن.

**بەڵگەو نیشانەکانی نیگاو دەسەڵاتی خودا بۆ قەڵاچۆکردنی شیرك**

﴿ قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِيَقُولُواْ دَرَسۡتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكُواْۗ وَمَا جَعَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴿١٠٧﴾ ﴾.

پاش ئەوەی یەزدانی مەزن بەڵگەی جیاجیای لەسەر تاكو تەنهایی خۆی هێنایەوە، باسی دەسەڵاتو زانیاری بێ سنوورو فراوانی خۆی کرد، دەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی بانگەوازی ئیسلامیو پێغەمبەرایەتیو راگەیاندنی نیگای ئاسمانی لەلایەن پێغەمبەرەوەو دەفەرموێ: ﴿قَدْ جَاءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە رەهنوماییو رێ پیشاندەرتان بۆ هاتووە، ئەو بەڵگەو دەلیلانەی کە قورئان لەخۆی گرتوونو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەکانیدا شی کردوونەوە؛ بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی وا کە چەسپێنەری بیروباوەڕی راستو دروستنو پرۆگرامی ژیانی کامەرانینو یاسای گشتی کۆمەڵنو بنەمای سەرچاوەی ئەخلاقو رەوشتن! جا ﴿فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا﴾ کەسێك لە رەوانگەی ئەو بەڵگەو دەلیلانەوە حەقو راستی بینی ئەوە سوودو قازانجی بۆ خودی خۆیەتی، کەسێکیش لە ئاستی حەقدا کوێرو گومڕا بوو

لە ڕێبازی حەق لایدا ئەوە ستەمی لە خودی خۆی کردووە زیانی بە خۆی گەیاندووە! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا – يونس/١٠٨﴾. یان دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ – فصلت/٤٦﴾.

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا﴾ واتە: تاوانی ئەو لادانەی لەسەر خۆیەتیو زیان بە خۆی دەگا، ئەمە کینایەیە لە گومڕاییو بێ بڕوایی، مەبەست کوێری نابینا نیە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ – الحج/٤٦﴾. واتە: مەبەست پەردەپۆشیو چەواشەیی دڵو دەروونە.

﴿وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: من ڕەقیبو چاودێر نیم بەسەرتانەوە، من ڕاگەیەنەرو ترسێنەرم هەر ئەوەندەم لەسەرە پەیامی خوداتان پێ ڕابگەیەنم ئیتر هیدایەتو گومڕایی بەدەست خودا خۆیەتی.

﴿وَكَذَلِكَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ﴾ وەکوو چۆن لەم سورەتەدا چەند ئایەتێکمان هێنان بۆ شی کردنەوەو چەسپاندنی تاکو تەنهایی خوداو جەخت کردنەوە لەسەر ئەوە کە جگە لە پەروەردگار هیچ خودای تر نین، هەر بەو شێوەیە، لە هەموو شوێنێکدا ئایەتەکان دەگۆڕینو شییان دەکەینەوەو ئاڕاستەیان دەکەین، بە شێوازی جۆراو جۆر ئاییتیان بۆ ڕوون دەکەینەوە لەبەر ئەوەی ئەو کافرانە نەفامو نەزانن وا بە ئاسانی دەست بەرداری بیروباوەڕی پڕوپووچی خۆیان نابن.

هەروەها ﴿وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ﴾ بۆ ئەوەی موشریکە خوانەناسە بە درۆخەرەوەکان لە ئاکامدا بڵێن: ئەی محمد! تۆ ڕاست ناکەی ئەمە نیگای ئاسمانی نیە بۆت هاتووە بەڵکوو تۆ ئەمەت خوێندووەو فێر کراوی! واتە: گۆڕانکاری لە شێوەو شێوازی ئایەتەکاندا هەر جارەو بە گوێرەی پێویست ئوسلوبەکەیان دەگۆڕینو ئاڕاستەیان دەکەین بۆ ئەم مەبەستانەیە:

۱- بۆ ئەوەی ئەوانە ئامادەباشیان تێدایە بۆ ئیمان هێنان، بڕوا بکەن‌و ئیمان بهێنن.

۲- بۆ ئەوەی سەر رەق‌و کافرەکان بڵێن: ئەمەت لەلای خەڵکی تر خوێندووەو، ئەمە نیگای ئاسمانی نیە... وەکوو پێت وایە!

کافرەکان پێیان وابوو کە پێغەمبەر لەلای گەنجێکی رۆمی ئاسنگەری ناعەرەب فێری ئەم قورئانە دەبێ، ئەو کوڕە گەنجە لە مەککە ناوی قەیس بوو، شمشێری دروست دەکردن، وەکوو لە شوێنێکی تردا قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَـذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ – النحل/۱۰۳﴾.

۳- مەبەستی سێیەم لەو ئوسلوب گۆڕینە ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَلِنُبَيِّنَهُ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئەم قورئانەی کە ئەم هەموو ئایەتە جۆراو جۆرانەی لە خۆ گرتووە بۆ ئەو کەسانەی شی بکەینەوە کە حەقناس‌و حەقخوازن، راستی دەدۆزنەوەو شوێنی دەکەون، باطل‌و پووچ پێناسە دەکەن‌و خۆی لێ دەپارێزن؛ شیکردنەوەو روونکردنەوەی تەنها سوود بەخشە بۆ ئەوانەی خاوەن زانست‌و هەستن‌و عەقڵ‌و هۆشیان دەخەنە کار، لە ماناکانی قورئان ورد دەبنەوەو تێیان دەفکرن، ئەوانە لە ئاکامی لێ ورد بوونەوەو تێفکرین، حەقیقەت‌و بەڵگەکانی قورئانیان بۆ دەردەکەوێ... بەڵام نەفام‌و نەزانەکان کە لە ئایەتەکانی قورئان تێ ناگەن‌و هیچ کەڵکیان لێ وەرناگرن پێیان سوودمەند نابن!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەکا کە پابەندی نیگای ئاسمانی بێ‌و لانەداو دەفەرموێ: ﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ شوێن ئەو پەیامە بکەوە کە لە پەروەردگاری خۆتەوە بۆت نێردراوە، پابەندی ببەو لێی لامەدە، چونکە ئەوەی لە خوداوە بۆت نێردراوە حەق‌و راست‌و دروستەو هیچ گومان لە راستییەکەیدا نیە ﴿لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ ئەو خودایەی ئەو پەیامەی بۆ ناردووی خودایەکی تاک‌و تەنیاو باڵادەستەو هیچ خودا نین جگە لە خۆی، کە وابێ

شوێن پەیامەکەی بکەوەو خۆت ئامادە بکە بۆ ئەوەی ببیە پێشەواو رابەری ئادەمیزادانو لە گومڕایی رزگاریان ببێ ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ﴾ روو لە موشریکەکان وەرگێڕەو گوێیان پێ مەدەو بەوە خەفەتبار مەبە کە سوورن لەسەر کوفرو بێدینی، بە قسەکانیان کە دەڵێن: تۆ قورئانت لای کەسانی تر خوێندوەو نیگا نیە دڵتەنگ مەبە، لەبەرامبەر قسەکانیاندا خۆگربەو صەبرو ئارام بگرە، هەتا خودا دەرووی رەحمەتت لێ دەکاتەوەو بە سەریاندا زاڵت دەکا! چونکە حەق هەر دەبێ سەربکەوێ، هەرکاتێ گوفتارو کردار بە ئیخلاص ئەنجام دران سەرکەوتن دەستەبەر دەبێ! ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكُوا﴾ خۆ ئەگەر پەروەردگار بیویستایە ئەوانە کافر نەدەبوون، وەکوو فریشتە هەموویان خودا پەرست دەبوون، بەڵام ویستی خۆیەتیو بۆخۆی حەکیمو دانایە، چی بکاو چی بڕیار بدا کەس نیە بتوانێ بڵێ بۆ! پرسیاری لێ ناکرێ، ئادەمیزاد مافی ئەوەیان نیە بڵێن بۆچی ئەوە وایە؛ بەڵام ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێ! خودا بۆخۆی دەزانێ حیکمەت چیە؛ کە ئەوانە بە گومڕایی دەهێڵێتەوە! ئەگەر بیویستایە هەموو ئادەمیزادانی دەخستە سەر رێگای راست، بەم جۆرە وای دروست بکردنایە کە ئامادەباشییان تێدا هەبوایە بۆ ئیمان هێنان، بەڵام وای دروست کردوون کە ئامادەباشی هیدایەتو گومڕایشیان تێدایەو ئازادیو هەڵبژاردنیشی بۆ رەخساندوون، بۆخۆیان سەربەستن لە هەڵبژاردنی گومڕاییو هیدایەت.

﴿وَمَا جَعَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ ئەی محمد! تۆ پێغەمبەریو راگەیاندنت لەسەرە. ئێمە تۆمان نەکردووە بە چاودێر بەسەریانەوە گوفتارو کردەوەکانیان تۆمار بکەی. تۆ وەکیلو فەرمانبەری رزقو رۆزی ئەوان نیت! هیچ کاریگەرییەکت نیە لە هەڵسوکەوتی ئەواندا! تۆ بەسەر ئەواندا باڵا دەست نیت، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ – الغاشية/٢٢﴾. تۆ صیفەتی پاشاو مەلیکی ملهوڕت نیە، تۆ مزگێنی دەری بە بەهەشتو ترسێنەری لە دۆزەخ، خودا حیسابیان لەگەڵ دەکاو پاداشیان دەداتەوە.

## جڵەوگیری لە جنێودان بە بتو صەنەمەکان

﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍۢ ۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾.

ئایەتەکان پەیوەندییان بە ئایەتەکانی پێشەوە لەم بارەوەیە: کە کافرەکان بە پێغەمبەریان گوت: تۆ ئەم قورئانەت بە نیگا بۆ نەهاتووە بەڵکوو لای خەڵك فێری دەبی، ئیتر وێ دەچێ ئەو کاتە برێ موسوڵمان رقیان هەڵسابێ‌و لە رووی بەرنگاری کردنەوە جنێویان بە بتەکانیان دابێ ئیتر پەروەردگار ئەوەی لێ قەدەغە کردن، چونکە کە ئێوە جنێو بە خوداکانی ئەوان بدەن، ئەوانیش قسەی ناشیرین بە خودا دەڵێن، عەبدولڕەزاق دەڵێ: مەعمەر لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: موسوڵمانەکان جنێویان بە بتی کافرەکان دەدا، کافرەکانیش جنێویان بە خودا دەدا، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلاَ تَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ...﴾ی ناردەخوارێ ئیبنو عەبباس لە ریوایەتێکدا دەڵێ: کافرەکان بە پێغەمبەریان گوت:

ئەی محمد! جنێو بە خواکانی ئێمە مەدە واز بێنە، ئەگینا ئێمەش جنێو بە خوای تۆ دەدەین، ئیتر پەروەردگار نەهی ئەوەی لێ کردن کە جنێو بە بتەکانیان بدەن، بۆ ئەوەی ئەوان بە ناحەق جنێو بە خودا نەدەن! فەرمووی: ﴿وَلاَ تَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ فَيَسُبُّواْ اللّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ پەروەردگار نەهی لە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەکا لەوەی کە جنێو بە بتی موشریکەکان بدەن! جا هەرچەندە جنێودانەکە بەرژەوەندییەکی تێدایە بەڵام چونکە سەر دەکێشێ بۆ ئەوەی موشریکەکانیش جنێو بە خودا بدەن کە ئەمە تاوانێکی گەلێ گەورەو سامناکە. جنێودانەکەیان لێ قەدەغە کراو فەرمووی: ئەی موسوڵمانان! جنێو بە خودای موشریکەکان مەدەن؛ ئەو بتانەی دەیپەرستن! چونکە لەوانەیە سەر بکێشێ بۆ ئەوەی کە ئەوانیش بە ناحەقو نارەوا بۆ تووڕە کردنی موسوڵمانان جنێو بە خودا بدەن، لەم رووەوە کە نازانن خودا چەند گەورەو بەرێزو پیرۆزە! ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە خوداپەرستیو بەرژەوەندیی ئیسلامیی هەرکاتێك سەری کێشا بۆ تاوانو مەفسەدە دەبێ وازی لێ بهێندرێ، ئەوەتا: هەرلەم روانگەوە پەروەردگار فەرمانی بە مووساو هاروون کرد لەگەڵ فیرعەوندا بەقسەی نەرمو لەسەرخۆ ئاخاوتنی لەگەڵدا بکەن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى – طه/ ٤٤﴾.

جا وەکوو چۆن لەلای ئەو موشریكو خوانەناسانە خۆشەویستی بتەکانیانمان لەلا شیرین کردوونو لەبەر چاویان رازاندومانەوە ﴿كَذَلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ﴾ هەر بەو جۆرە بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك کردەوەکانیانمان لەلا شیرین کردوونو لە پێش چاویان رازاندومانەوە، هەر کەسە بیروباوەڕو گوفتارو کرداری خۆی پێ باشە! هەڵبەتە ئەم جوان کردنو رازاندنەوەیە بە شوێن ئیختیارو هەڵبژاردنی ئادەمیزادەکان خۆیان بۆ کردەوەکانیاندا پەیدا دەبێ، واتە: ئەوان بە ویستو سەربەستی خۆیان ئازادانە کردەوەو بیروباوەڕەکانیان هەڵدەبژێرن، ئەمجار خودا لە دڵیاندا شیرینی دەکا، ئەمە عادەتو سوننەتی پەروەردگارە لەگەڵ بەندەکانیدا.

ئـەوتان بۆخۆیـان ڕێبـازی چـاك یـان خـراپ بۆخۆیـان هەڵدەبـژێن، پـەروەردگاریش لەلایان شیرینی دەکاو توانای ئەنجامدانیشیان پێ دەدا...

ئەم جوان کردنو ڕازاندنەوەیە ئەوە ناگەیەنێ کە خودا تۆپزیو زۆرە ملێیان لێ دەکا! بەڵکوو ئەو شیرین کردنە ئەئەرو ڕەنگدانەوەی هەڵبژاردنی ئەوانە، نەك بـەو مانایـە بـێ کـە خـودا خۆشەویـستی کـوفرو بێـدینیو بتپەرسـتی لـە دڵیانـدا دەخوڵقێنـێ؟؛ چونکە ئەگـەر وا بـێ، دەبـێ ئیمـانو کـوفر، خێـرو شـەڕ، غـەریزەی سروشتی بن لە دەروونی ئادەمیزاددا؟؛ ئەوکاتە بانگەوازی بۆ چاکەکردنو وازهێنان لـە خراپـە بێهودەیـە، پـەروەردگاریش شـتی بێهـودە ناکـا، هـەروەها سـزاو پـاداش، نـاردنی پێغەمبـەرانو نیگـا بـۆ کـردنو ناردنـە خـوارەوەی نامـەی ئاسمـانی بۆیـان بێهودە دەبێ.

﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ ئـەمجار پـاش ئـەوەی کـە خـودا لێیان دەگەڕێ هەرکەسە بۆخـۆی ئازادانـە ڕێبـازی ژیـانی خـۆی هەڵدەبـژێرێ، دوای مـردنو زینـدوبوونـەوەی ڕۆژی قیامـەت دەچـنەوە بـەرقاپی پـەروەردگاری خۆیـانو هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە، سزاو پاداشی کردەوەکانیان دەداتەوە، چاکە بە چـاکەو خراپـە بـە خراپـە! جـا وەکـوو ئیبنـو جـەریری طـەبـەری لـە موحەممـەدی کـوڕی کـەعبی قـورەظییـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئاخاوتنی لەگەڵ قوڕەیشییەکاندا کرد! لە ئاکاما پێیان گوت: ئەی محمد! تـۆ پێمـان دەڵێی مووسا عەصایەکی پێ بوو لەبەردی دەدا ئـاوی لێ هەڵـدەقوڵا، عیـسا مـردووی زینـدوو دەکردەوە، گەلی ئەموود وشـتریان هـەبوو، بـە مـوعجیزەی صاڵح پێغەمبـەر لەبەرد پەیـدا بووبـوو!! دەڵێن: تـۆش موعجیزەیـەکمان لـەم جـۆرە موعجیزانـە بـۆ بنوێنـە تـا بـڕوات پـێ بکـەین، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: چیتان دەوێ بۆتان بنوێنم؟! وتیان کێوی (صەفا)مـان بـۆ بکـە بـە زێـڕ: پێغەمبـەر فەرمووی: ئەگەر ئەو موعجیزەیەم نواند ئیمانم پێ دێـنن؟ وتیـان: بـەڵێ بـە خـودا باوەڕت پێ دەکـەین، ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەسـتی کـرد بـە

پاڕانەوەو دوعا کردن! جوبرائیل هاتە خزمەتیو فەرمووی: ئەگەر بتەوێ کێوەکە دەکرێ بە زێڕ بەڵام ئەگەر پاش ئەوە بڕوایان پێ نەکردی، لە بێخیان دەردێنین، ئەگەر دەشلێی لێیان گەڕێ بەڵکوو هەیانبێ تۆبە بکاو موسوڵمان ببێ! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: باشە لێیان گەڕێ بەڵکوو بۆخۆیان بێنە سەر ڕێگای ڕاستو موسوڵمان بن! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێو فەرمووی: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءتْهُمْ آيَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا﴾ ئەو کافرە موشریکانە سوێندی جەخت لەسەر کراو دەخۆن؛ دەڵێن: ئەگەر موعجیزەیەکی ماددی، نیشانەیەکی لە توانای ئاسای بەدەرمان پیشان بدەی؛ ئیمە ئیمانت پێ دەهێنین، بڕوا دەکەین کە تۆ پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خودایو ئەو موعجیزەیەش لە خوداوە بۆ تۆ ئەنجام دراوە!

ئەمەش ئاماژەیە کە ئەوان زۆر سەرپێچیکارو سەر ڕەق بوون، چونکە پێیان وابوو: کە قورئان ناچێتە چوارچێوەی موعجیزاتەوە! مەبەستیان ئازاردانی پێغەمبەر بوو بەوە کە داوای موعجیزەی جیا جیای لێ بکەن! ﴿قُلْ إِنَّمَا الآيَاتُ عِندَ اللّهِ﴾ ئەی محمد! بەو کەسانە بڵێ: کە بەشێوەی هەوانتەو ڕەقەبەریو گاڵتەجاڕی داوای موعجیزەت لێ دەکەن؛ مەبەستیان فێربوونو شارەزاییو هیدایەت نییە، بەڵکوو ئامانجیان ئەزیەتدانو بەرەنگاری کردنە! پێیان بڵێ: سەرچاوەو دەسەڵاتی هێنانی ئەو موعجیزانە لای خودایە، ئەو دەتوانێ ئەو دیاردە نائاساییانە لەسەر دەستی من دەربخا، جا ئەگەر مەیلی بوو دەیانکاو مەیلیشی نەبوو نایانکا، ئەو بە گوێرەی داناییو زانایی خۆی کار دەکا، بەبی ڕەزامەندی خۆی هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێ هیچ موعجیزەیەك بنوێنێ... وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ – غافر/٧٨﴾. کەواتە: وا باشە ئێمە دەمی تێوە نەدەینو لێی بگەڕێین بۆخۆی چی بەباش دەزانێ با بیکا، دیارە خوداش ئیشی بێ هودە ناکاو کاری نابەجێ ئەنجام نادا!! لە وەڵامەکە ئەوە دەردەکەوێ کە ئەم جۆرە داواکارییە جێبەجێ ناکرێتو لەگەڵ حیکمەتو دانایی خودادا ناگونجێن.

ئەمجار دەستنیشانی ئەوە دەکا کە هاتنی ئەو داواکارییانەو جێبەجێ کردنیان هیچ سوودی نابێ، چونکە ئەگەر ئەو موعجیزە داواکراوانە بهێندرێتە جێش ئەوان هەر بڕوا ناهێنن‌و مەبەستەکە نایەتە جێ، بەڵکوو ئەگەر لە فەرزێکا موعجیزەکان بێنە دی‌و ئیمان نەهێنن سەرلەبەر هەموویان لەناو دەبرێن‌و ریشەکێش دەکرێن! بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ﴾ چی ئێوەی ئاگادار کردووە؟ ئەی پێغەمبەرو کۆمەڵی موسوڵمانان! کە ئاواتەخوازن ئەو داواکرییانە جێبەجێ بکرێن بەڵکوو ئەوان موسوڵمان ببن کێ بە ئێوەی زانـاندووە کە ئەو موعجیزانە هاتن ئەوان ئیمان دەهێنن؟؟ ﴿أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾[1]. لەوانەیە ئەگەر ئەو ئایات‌و موعجیزانە هاتن ئەوانە ئیمان نەهێنن، چونکە من دەزانم ئەو موعجیزانە ئەگەر بشهێن ئەوانە ئیمان ناهێنن بەلا ئێوە نازانن.

﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ چی بە ئێوەی زانـاندووە کە داواکارییەکەیان جێبەجێ کراوە موعجیزەکانیان بۆ ئەنجام درا ئێمە دڵیان لانادەین لە تێگەیشتنی حەق‌و راستی‌و چاوی دڵیان کوێر ناکەین لە بینین؟؟ کێ

---

[1] – وشەی (أَنَّهَا) دوو جۆر خوێندنەوەی هاتووە ئەگەر بە (مفتوحی) بخوێندرێتەوە دوو مانای هەیە:

أ (أن) بەمانا (لعل) ئەو کاتە وای لێ دێتەوە (وَمَا يُشْعِرُكُمْ لعل ألآيات إِذَا جَاءَتْ لاَ يُؤْمِنُونَ).

ب- (أن) لەگەڵ دوای خۆی مصدری مؤوەل بێ وشەی (لا) زیاد دەبێ واتە: وای لێ بێتەوە (وَمَا يُشْعِرُكُمْ أن ألآيات إِذَا جَاءَتْ لاَ يُؤْمِنُونَ).

٢- ئەگەر وشەی (أَنَّهَا) بە مەکسووری بخوێندرێتەوە ئەوە دەبێ لەسەر وشەی (يُشْعِرُكُمْ) راوەستی‌و بڕیاری ئەوە بدەی کە مەفعوولی دووەمی حەذف کراوە واتە وا مەزندە دەکرێ (وَمَا يُشْعِرُكُمْ أيمانكُمْ) ئەو کاتە ڕستەی (أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لاَ يُؤْمِنُونَ) رستەیەکی سەرەتایی‌و سەربەخۆیە واتە رستەکە وای لێ دێتەوە (وَمَا يُشْعِرُكُمْ ما يَكُونَ مِنْكُمْ إِذَا جَاءَتْ؟) جا وەکوو کەسانێك لێرەدا پرسیارێك راست بکەنەوە بڵێن کە ئایەتەکان؛ موعجیزەکان هاتنە دی چی روو دەدا؟ وەڵامی دانەوەو فەرمووی: (أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لاَ يُؤْمِنُونَ).

دەڵێ لەمپەڕ ناخەینە نێوان ئەوانو حەقو راستی! بە جۆرێك كە حەق بەدی ناكەن!

ئەوان ئەگەر هەرچی نیشانەو موعجیزە هەیە بۆیان بنوێنرێ بڕوا ناكەنو ئیمان ناهێنن، وەكوو چۆن یەكەمجار كە قورئان هات بۆسەریان لەمپەڕمان خستە نێوان ئەوانو ئیمان هێنان، چونكە بۆخۆیان بە تەواوی روویان لە حەقو راستی وەرگێڕاوە، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاء فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ، لَقَالُواْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ – الحجر/١٤ – ١٥﴾.

لە راستیدا كەسێك بە بەڵگەكانی قورئان دڵی نەرم نەبێو ئیمان نەهێنێ، ئەم هەموو بەڵگە زانستیانە نەبنە هاندەری بۆ موسوڵمان بوون، موعجیزەی ماددی تر كاری تێ ناكەنو موسوڵمان نابێ. ﴿وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ چی ئێوەی فێر كردووە كە ئێمە لە گومڕایی خۆیاندا نایانهێڵینەوە هەتا سەرگەردان ببن؟ واتە: لە توغیانو سنوور بەزێنیدا دەیان هێڵینەوە، وازیان لێ دەهێنین لە گومڕایی خۆیاندا بەسەرگەردانی بمێننەوە! بێگومان دڵێك كە ئیمان بە ئایەتی زۆرو زەبەندەی قورئان نەهێنێ؛ بڕوا بەو هەموو نیشانە جۆراو جۆرانەنەكا كە لە كەوندا بڵاوبوونەوەو قورئان سەرەنجیان بۆ رادەكێشێ، ئەوە دڵێكی قەڵبو هەڵگەڕاوەیە، هەر ئەو دڵەیە: كە یەكەمجار بانگەوازی بۆ كراو بە پیر بانگەوازییەكەوە نەهاتو حەقی وەرنەگرت! هەر ئەو دڵەیە: كە بانگەوازی قورئانی رەت كردەوە!

چی بە ئەو موسوڵمانانە دەزانێنی كە پێشنیاری ئەوە دەكەن داخوازی كافرەكان جێبەجێ بكرێ، كە ئەوان دوای دەركەوتنی موعجیزەكان لەسەر رەقی خۆیان واز دەهێننو لە گومڕاییدا نامێننەوە؟! چونكە خودا بۆخۆی دەزانێ كە ئەوان ئیمان ناهێنن، ئەگەر وەڵامی داواكارییەكەشیان بدرێتەوەو ئیمان نەهێنن شیاوی سزای سەختو ریشەكێش كردن دەبن.

بەڵێ خودا دەزانێ ئەگەر فریشتە بیتە لایان، ئەگەر مردوویان بۆ زیندوو بکەینەوەو قسەیان لەگەڵدا بکا وەکوو پێشنیاریان کرد، ئەوانە ئیمان ناهێنن، تەنانەت ئەگەر هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرمیان لەسەر کۆ بکەینەوەو بانگەوازییان بکا بۆ ئیمان هێنان ئەوان ئیمان ناهێنن، مەگەر خودا مەیلی لێ بێ، خوداش مەیلی نابێ چونکە ئەوان ئامادە نین روو بکەنە خودا، کۆشش ناکەن بۆ ئەوەی یارمەتییان بدا، ئەمە راستییەکەو زۆربەی خەڵك لێی بێ ئاگان.

ئەوانە لە گومراییدا رۆچوونو نایەنەوە سەر رێگای راست لە بەڵگەو دەلیلیان کەم نیە نیشانەو بەڵگەی زۆرو زەبەندەی لەبەردەمدا هەن، بەڵام دڵیان نەخۆشە، سروشتیان شێواوە. هیدایەتو تۆفیق پاداشێکە نادرێ بە کەس مەگەر ئەوانەی روو دەکەنە خوداو لە پێناو ئایینی خوادا کۆشش دەکەن!

**بە یارمەتی خودا ئەمڕۆ کە ڕۆژی هەینی ٢٤ محرم/١٤١٨ بەرامبەر ١٩٩٧/٥/٣ لە ڕەشنووسی ئەم جوزئی حەوتەمە بوومەوە لە سلێمانی لە ماڵی خۆمان گەڕەکی مامۆستایان لە ڕۆژگارێکدا سوپای تورکیا هاتبووە ناو قووڵایی خاکی کوردستانەوەو بە بیانووی پاکسازی گروپەکانی پەکەکە پێشڕەوی دەکردو هیچ لەمپەرێك نەبوو لە پێشیەوە بەرەنگاری ئەو هێرشە بکا**

## دیارده‌ی سه‌ر ره‌قی موشریکه‌کانو نا ئومیدی له‌ ئیمان هێنانیان

﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾.

له‌م ئایه‌ته‌ دوایی‌دا مانای ئایه‌تی ﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ی پێشه‌وه‌ شی ده‌كه‌ینه‌وه‌، په‌روه‌ردگار له‌م ئایه‌تانه‌دا ئه‌وه‌ روون ده‌كاته‌وه‌ كافره‌كان ئه‌گه‌ر هه‌موو داواكارییه‌كانیان جێبه‌جێ بكرێن ئه‌وان هه‌ر ئیمان ناهێنن، ئه‌گه‌ر فریشته‌یان بۆ بنێردرێته‌ خوارێ، مردوویان بۆ زیندوو بكرێته‌وه‌و قسه‌یان له‌گه‌ڵ بكا، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر هه‌موو بوونه‌وه‌ر شایه‌تی له‌سه‌ر راستی پێغه‌مبه‌ر بدا، ئه‌وان هه‌ر ئیمان ناهێنن چونكه‌ ئه‌وان له‌ گومڕاییدا نوغرۆ بوونو به‌ته‌واوی سه‌رگه‌ردان بوون.

له‌ ئیبنو عه‌بباسه‌وه‌ گێڕدراوه‌ته‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر (دروودی خوای له‌سه‌ر بێ) كۆمه‌ڵێك له‌ كافرو پیاو ماوقولانی مه‌ككه‌ هاتنه‌ لای‌و پێیان گوت: فریشته‌مان پیشان بده‌ شایه‌دی ئه‌وه‌ بده‌ن كه‌ تۆ پێغه‌مبه‌ری خودای، یان برێ له‌ مردووانمان

بۆ زیندوو بکەرەوە، تا پرسیاری ئەوەیان لیٚ بکەین دەربارەی ئەم پەیامەی تۆ ئایا حەقە یان بەتاڵە! یان خوداو فریشتە بێن بەرەو رووەمان بنەوە، راستەوخۆ شایەدی لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ بدەن، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرمویٚ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلآئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً﴾ ئەگەر ئێمە وڵامی ئەو کافرانە بدەینەوە کە بە سووربوونەوە سوێندیان دەخواردو دەیانگوت: ئەگەر ئێمە موعجیزەو نیشانەیەکی مادیمان بۆ بێ لەو موعجیزەو نیاشانانەی بۆ پێغەمبەرەکانی پێشوو هاتووە یەکسەر ئیمان دەهێنین، کافرەکان زۆرجار ئەم پێشنیارانەیان دەخستە روو دەیانگوت: ﴿أَوْ تَأْتِيَ بِاللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ قَبِيلاً – الإسراء/٩٢﴾ یان ﴿قَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّى نُؤْتَى مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللّهِ﴾. ئەگەر پێشنیارو داواکارییەکەی ئەوان جێبەجیٚ بکەین؛ فریشتە بنێرینە سەریان پێیان بڵێن: ئەم پەیامە لە خوداوەیە، راستی پێغەمبەرایەتی تۆ بچەسپێنن و شایەدی لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەت بدەن ئەوانە ئیمان ناهێنن و بروا بە پێغەمبەر ناکەن. یان مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: ئەگەر ئێمە فریشتە بنێرینە لای ئەو کافرانە، بە چاوی خۆیان جار دوای جار بیان بینن، یە گوێچکەی خۆیان شایەدی دانی فریشتەیان لەسەر راستی و پێغەمبەرایەتی تۆ ببیستن، ئەگەر مردووەکان زیندوو بکەینەوە هەواڵیان پیٚ بدەن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیت! وەکوو بۆخۆیان داوایان کردبوو کە قورئان لێیان دەگێڕێتەوە کە گوتوویانە: ﴿فَأْتُوا بِآبَائِنَا – الدخان/٣٦﴾. تەنانەت ئەگەر هەموو بەڵگەو نیشانەی بوونەوەر بخەینە بەرچاویان هەموویان شایەدی بدەن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیت، کۆمەڵ کۆمەڵ ئەو نیشانانەیان پیشان بدرێن ﴿مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ إِلاَّ أَن يَشَاء اللّهُ﴾ لەوانە نین کە ئیمان بێنن، ئامادەباشییان تێدا نیە بۆ بڕواکردن، چونکە بە چاوی وردبینیو تێفکرینەوە سەیری ئایەتەکان ناکەن! بەڵکوو بە چاوی گاڵتەجییانەو دژایەتی کردن سەیریان دەکەن، ئیمان ناهێنن مەگەر خودا مەیلی لیٚ بیٚ کە ئیمان بێنن، واتە: تا لەسەر ئەو بیروباوەڕە بن ئیمان ناهێنن مەگەر خودا هێدایەتیان بداو لەمپەری ئیمان نەهێنانیان لابەریٚ، هیدایەت و تۆفیق دەسەڵاتی خودایە، هەر ئەو دەتوانیٚ رۆڵی تێدا بگێڕیٚ! بەڵام دیارە خودا دوای ئەوەی کە عەقڵ و هۆشی پێداون و

رێگای نیشاندان‌و بە نیگاو لەسەر زوبانی پێغەمبەر بانگەوازی بۆ کردوون رێگای چاك‌و خراپی بۆ روون کردوونەوە ئەمجار لێیان گەڕاوە بە ویستی خۆیان چی دەکەن با بیکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ﴾ واتە: ئیمانی ئیختیاری‌و ئازاد، نەك ئیمان هێنانی بە زۆرە ملێ، کە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللّـهُ﴾ هەر مەبەستی ئیمانی ئیختیارییە، نەك ئیمانی زۆرە ملێ، (چونکە موستەثنا دەبێ لە پێڕی موستەثنا مینهو بێ).

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾ بەڵام زۆربەی ئەو موشریکانە نەفام‌و نەزانن، پێیان وایە: هەرکاتێ ویستیان ئیمان دەهێنن‌و هەرکاتێ ئارەزوویان لێ بوو کافر دەبن!! نەخەیر وا نیە گومانەکەیان هەڵەیە کەسێك ئێمە هیدایەتی نەدەین ئیمان ناهێنێ، کەسێك ئێمە ریسوای نەکەین‌و رێگای لێ هون نەگەین کافر نابێ!

زومەخشەری پێی وایە راناوی (هم) دەگەڕێتەوە بۆ موسوڵمانان ئەو کاتە مانای ئەم رستەیە بەم جۆرە دەبێ واتە: بەڵکوو زۆربەی ئەو موسوڵمانانە نازانن کە ئەو کافرانە موسوڵمان نابن، مەگەر خودا ناچاریان بکا بۆ ئیمان هێنان، پێیان وایە: کە بە هاتنەدی ئەو پێشنیارانەی کافرەکان پێشنیاریان کردوون موسوڵمان دەبن، موسوڵمانانەکان نازانن کە ئەو کارانە تەنانەت دوای هاتنی نیشانەکانیش هەر ئیمان ناهێنن، ئەو موسوڵمانانە ئاگاداری سوننەت‌و داب‌و نەریتی خودا نین دەرحەق بە بەندەکانی بۆیە برێ لە موسوڵمانانەکان ئاواتەخوازی ئەوە بوون کە پێشنیاری کافرەکان جێبەجێ بکرێن‌و چونکە پێیان وابوو جێبەجێ کردنی پێشنیارەکانیان دەبێتە هۆی ئیمان هێنانیان، ئەمە لە کاتێکدا ئەو موعجیزانە ئیمان هێنان بەسەر کافرەکاندا فەرز ناکەن سروشتی ئادەمیزادەکان ناگۆڕن بەڵکوو هەر کەسە بە ئیختیاری خۆی رێبازی خۆی هەڵدەبژێرێ! خۆ ئەگەر خودا بیویستایە ئیمان‌و بیروباوەڕی راستی لە دڵ‌و دەروونندا دەڕسکان بە تۆپزی ئیمانی پێ دەهێنان. ئەو کاتە چ پێویستی بە پێغەمبەر نەدەبوو! خۆ ئەگەر بیویستایە موعجیزەکانی وا لێ دەکردن کە سروشتی کافرەکان بگۆڕن‌و بە زۆر موسوڵمانیان بکەن، ئەو کاتە ئیمانەکەیان زۆرە ملێ‌و تۆپزی دەبوو، کەسب‌و ئیختیار نەدەبوو!

بەڵام پەروەردگار ویستی وا نەبووەو نە یویستووە خەڵکی بە زۆرە ملیٚ موسوڵمان بکا، بەڵگە لەسەر ئەم راستیە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمویٚ: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ – البقرة/٢٥٦﴾. ئایەتی پێشوو ئەوەی لیٚ وەرگیرا کە ئەو موشریکانەی ئەو جۆرە پێشنیارانەیان پێشکەش کردن دوژمنی پێغەمبەر بوون، چونکە ئەوان ئەو پێشنیارانەیان بۆیە پێشکەش کردن بڕوایان وابوو کە دەستەبەر نابن‌و ئەوکاتە رێگای تانەو تەشەردانیان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بۆ ئاچوغ دەبیٚ‌و بەڵگەیان سوار دەبیٚ.

پەروەردگار ویستی دڵخۆشی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) بداتەوە لەروانگەی روونکردنەوەی ئەوە کە ئەو دژایەتی کردنە داب‌و نەریتی هەموو گەل‌و نەتەوەکان بووە لەگەڵ پێغەمبەرەکانیانداو فەرمووی: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ﴾ وەکوو چۆن ئەو موشریکانەمان کردوون بە دوژمنی تۆو دژایەتیت دەکەن، بەو جۆرە بۆ هەموو پێغەمبەرێك کە لە پێش تۆوە رەوانە کرابیٚ دوژمنمان بۆ داناوە لە شەیاتینی ئادەمیزادو شەیاتینی جندۆکە، دەتوانریٚ بگوتریٚ مانای وایە: ئیمە شەیاتینی ئادەمی‌و جندۆکەمان کردووە بە دوژمن بۆ هەر پێغەمبەرێك کە رەوانە کرابیٚ.

موجاهیدو قەتادەو حەسەن دەڵێن: ئادەمیزادیش شەیاتینی تێدایە، ئیبنو جەریر ئەمەی بەلاوە پەسەندەو حەدیثە مەرفوعەکەی ئەبو ذەڕ کە لە چەند رێگەیەکەوە ریوایەت کراوە دەکاتە بەڵگەی پەسەند کردنەکەی! حەدیثەکە ئەوەیە: رۆژێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) دوای نوێژ فەرمووی: «يَا أَبَا ذَرّ: هَلْ تَعَوَّذْ بِاللّٰهِ مِنْ شَرِّ شَيَاطِينِ الإِنْسِ وَالْجِنِّ». ئەبو ذەڕ دەڵیٚ عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئادەمیزاد شەیاتینی هەیە؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: بەڵیٚ!.

ئیبنو عەبباس دەفەرمویٚ: هەموو یاخی بوو سەرڕەقێك ئادەمیزاد بیٚ یان جندۆکە ئەوە شەیاتینییە!

مانای ئەوەی کە خودا ئەمانەی گێڕاون بە دوژمن؛ ئەوەیە: کە سوننەت‌و داب‌و نەریتی خودا وا هاتووە کە شەڕەنگێزو یاخی بووو سەرڕەق ئەوانەی گویٚ بۆ حەق

شل ناکەن‌و توخنی چاکە ناکەون بەلوتبەرزی‌و رکەبەری هەڵس‌وکەوت لەگەڵ حەق‌و چاکەدا دەکەن، هەمیشە دژی ئەوانە دەوەستن کە بانگەوازی بۆ حەق‌و چاکە دەکەن! دوژمنایەتی پێغەمبەران‌و جێنشین‌و پەیڕەوکارانیان دەکەن! ئەمە عادەت‌و داب‌و نەریتی هەموو دوو شتی دژ بەیەکن کە یەکێکیان بانگەوازی بۆ پێچەوانەی ئەوی تریان دەکا، جا کە ڕێبازی یەکێکیان سەد دەر سەد حەق‌و ڕاست بوو ئەوە دوژمنایەتییەکە پاڵ ئەوی تریان دەدەرێ‌و ڕێبازی ئەو بەتاڵ‌و پووچ حلێب دەکرێ! چونکە ئەو هەوڵ دەدا زیان بە بەرامبەرکەی بگەیەنێ‌و هەموو هەوڵ‌و تەقەللایەك دەخاتە گەڕ بۆ زیانگەیاندن بە خاوەنی ڕێبازە حەقەکە! تەنانەت ئەگەر لێشی ڕوون بێ کە خاوەنی ڕێبازە حەقەکە بەرژەوەندی ئەوی دەوێ.

شایانی باسە کە هەموو خاوەن ڕایەکی پێچەوانە مەرج نیە هەوڵی ئەوە بدا کە زیان بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێ! ئەوانەی کە ئەو هەوڵ‌و تەقەللایە دەدەن یاخی بووو سەرەڕەق‌و سەرۆك مشەخۆرو دڵڕەقەکانن؛ ئەوانەی دەروونیان لەسەر ستەم‌و یاخی بوون‌و دژایەتی کردن ڕام بووەو دژایەتی کردنی حەق‌و ڕاستیان لێ بۆتە شتێکی سروشتی! ئەوانە شەیاتینن‌و ڕووخێنەری هەموو شتێکی حەق‌و بەسوودن. ئەوانە بەربادکەری ژیان‌و ئەخلاق‌و ڕەوشتن، جا چ لەرەگەزی ئادەمی بن یان لە ڕەگەزی جندۆکە بن.

ئەمجار پەروەردگار خراپترین جۆری دژایەتی کردنی ئەو شەیاتینیانە بۆ پێغەمبەرەکان کە بەرەنگاری کردنی بانگەوازییەکەیانە، ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾ هەندێکیان بۆ هەندێکیان قسەی ڕازاوەو ڕووکەش بۆیەکتر دەهاوێژن، بۆ ئەوەی هەڵیان بخەڵەتێنن؛ پێیان وایە: بەو ڕووکەش کردنە پووچەڵی‌و گەندەڵی ناوەڕۆکی قسەکانیان دادەپۆشن‌و کەس هەست بە مەبەستی پیسیان ناکات ﴿زُخْرُفَ الْقَوْلِ﴾ ئەو گوفتارو ئاخاوتنەیەیە کە بیسەر لە حەقیقەتی شتەکان لادەدا بۆ شتی ڕووکەش‌و بێ بناغە. ﴿غُرُورًا﴾ بەمانا بێ ئاگایی‌و بێ عەقڵی‌و بێ ئەزموونییە، لە

زمانی عەرەبیدا دەگوترێ (شاب غرور وفتاة غر) واتە: کەم ئەزموونن، بێ ئاگان لە کاروباری ژنو مێردایەتیو ژنو پیاوەتی.

بێگومان لە رۆژگاری ئێمەدا هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی بێ ئاگا بە قسەی لووسو پووس لەلای شەیتانەکانی سەردەم بە تایبەتی شەیاتینییەکانی سیاسەت گەیشتۆتە ئاستێکی فرە بەرز! ئەو سیاسەتمەدارە فێڵبازانە فێڵ لە پارتو گەلو نەتەوەش دەکەن! کۆیلایەتیان لەبەرچاو بە قسەی رازاوە دەکەن بە ئازادیو سەربەستی، بەدبەختیو چەرمەسەرییان بە کامەرانیو خۆش بەختی دەخەنە بەرچاو! ئەوانە بە چاوو راو، بە قسەی بۆشو بێ بناغە سەر لە خەڵکی دەشێوێنن ناوەکان دەگۆڕن، بەرەڵڵایی بە ئازادیو سەربەستی لە قەڵەم دەدەن، خێزان دەروخێنن، لەشفرۆشیو بەرەڵڵایی بێ سنوور بۆ ئافرەت بە خۆ رزگارکردنو گەیشتن بە مافی ئافرەت دادەنێن!.

سوبحانەڵڵا! ئافرەتیان لە پۆشاکی رێزو بەها رووت کردووە، خستوویانەتە سەر جاددەو لە تیاترۆخانەکاندا وەکوو کاڵا دەیفرۆشنو دەیکڕن، دەستدرێژی دەکەنە سەر شەرەفو نامووسی، هەڵسوکەوتی ئاژەڵانەی لەگەڵ دەکەنو بە قسەش مافی داگیرکراوی بۆ وەردەگرنەوەو کۆتو زنجیری ئایینی ئیسلامو کۆنەپەرستی لە دەستو قاچ دەکەنەوە!! ئەی ئەوە نیە لە رۆژی ١٩٩٧/٥/٢٤و لە رۆژانی دوایشدا چەند سیمینارێکیان لەسەر تەلەفزیۆن لە سلێمانی ساز کرد کۆمەڵێک بە ناو پارێزەرو مافی مرۆڤ گوایە داکۆکی لە ئافرەتێکی ستەملێکراو بە ناوی (کەژاڵ خدر)ەوە دەکەن بە ناڕەوا لەسەر تۆمەتێکی روون لەلایەن چەند کەسێکی خزمی مێردەکەیەوە لووتی بڕدرا بوو! ئەو کۆمەڵە بە ناو پارێزەرو ماف پەروەرانە لە باتی ئەوەی داکۆکی لەو ئافرەتە غەدر لێ کراوە بکەن؛ هاتن ئەم رووداوەیان کردە سەنگەرو چی تانەو تەشەر هەیە ئاراستەی خوداو پێغەمبەرو ئایینی ئیسلامیان کرد، تەنانەت کار گەیشتە ئاستێک عەطا ناوێك کە ئاسنامەی پارێزەری لە گیرفان نابوو بەبێ پێچو پەنا ئایەتەکانی قورئانی بەغەڵەت حسێب کردنو ئەوەی کە تا ئێستا هیچ بێدینو خوانەناسێك بە سەلمان روشدیشەوە نەیتوانیوە بیدرکێنێ لە سلێمانی لەسەر تەلەفزێن عەتای بەدبەخت بەرامبەر جەماوەری موسوڵمانی

سلێمانی بوێرانە شی کردەوە زۆربەی ئایەتەکانی قورئانی بە غەڵەت حلێب کردا!
هەڵبەتە چەند ئافرەتێکیش لەو لینگ هەڵپێتاوانە هەمان راو بۆچوونیان دووبارە کردەوە. بەراستی ئەم دیاردەیە زۆری دەوێ‌و ئەم هەویرە زۆر ئاو دەکێشێ بەڵام لێرەدا بە پێویستی نازانم زیاتری لەسەر برۆم!

﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر خودای تۆ مەیلی لێ بوایە ئەوە نەکەن‌و بیویستایە نەهێڵێ ئەو هەڵخەڵەتاندنە ئەنجام بدەن، دەیتوانی رێگایان لێ بگرێ! بەڵام سوننەت‌و داب‌و نەریتی خودا وا نەهاتووە سروشتی ئادەمیزادەکان وا بگۆڕێ، زۆرەملێ‌و تۆپزییان لێ بکا بە پێچەوانەی هەواو ئارەزووی خۆیان بجوڵێنەوە! بەڵکوو ویستی پەروەردگار وایە: کە هەر یەکێك لە ئادەمیزادو جندۆکە ئامادەباشیان تێدا بێ بۆ وەرگرتنی حەق‌و ناحەق، خێرو شەڕ، بۆخۆیان سەربەست‌و ئازاد بن لە هەڵبژاردنی هەر رێبازێك لەو دوو رێبازە، پەروەردگار عەقڵ‌و هۆشی پێداون رێگای راست‌و نا راستی بۆ روون کردوونەوە هەر کەسە بە ئیختیاری خۆی کام رێبازە هەڵدەبژێری با هەڵیبژێری! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ – البلد/۱۰﴾.

هەندێك لە وەسوەسەو قسەی نابەجێی ئەو شەیتانیانە بۆ هەڵخەڵتاندن‌و قسە رازاندنەوە گۆڕینی مانای ئەم ئایەتە پیرۆزەیەو ئاراستە کردنیەتی بە شێوەیەك کە مانانی تۆپزی‌و زۆرەملێی لێ وەربگیرێ دەڵێن: هەموو تاوانبارێك بیانوو (غدر)ی هەیە، چونکە کە لە خودا یاخی بووە یاخی بوونەکەی بە ویستی خودایەو ناتوانێ لە ویستی خودا دەربچێ! وەکوو ئەمەو دوا لەم سورەتەدا دێ؛ دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم حَتَّى ذَاقُواْ بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ – الأنعام/۱٤۸﴾ نەخەیر با بزانن هیچ بیانوویەکیان بەدەستەوە نیە، پەروەردگار هەرگیز نەیویستووە کردەوەی ئادەمیزاد بە زۆرەملێ بێ، پەروەردگار بە ویستی خۆی دروستی کردوون رێگای داون لە ژیاندا بە ویستی خۆیان چی دەکەن بیکەن، رۆژی قیامەت هەرکەسە بەپێی کردەوەکانی سزاو پاداشتی دەدرێتەوە.

﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! لێیان گەڕێ بەرمنگارییان مەکە، وازیان لێ بێنە با درۆو بوختان هەڵبەستن، با خەڵکی بە قسەی رووکەش و چاوو راو هەڵخەڵەتێنن و لە رێبازی حەق لایان بدەن، گرنگییان پێ مەدە، تۆ لەسەر بانگەوازی خۆت بەردەوام بە، ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە، پشت بە خودا ببەستە، خودا بەستە، یارمەتیدەرتە بەسەریاندا، ئەوەی لەسەر شانی تۆیە راگەیاندە، حیساب لەگەڵ کردن و لێکۆڵینەوەو پاداش و سزادانەوەیان لەسەر ئێمەیە ﴿وَلِتَصْغَى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ﴾ واتە: هەندێ لەو شەیاتینییانە قسەی رووکەش بۆ هەندێکی تریان دەهاوێژن، قسەی رازاوە بۆ یەکتری دەکەن، بۆ ئەوەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەرەکان هەڵخەڵەتێنن، هەروەها بۆ ئەوەی دڵی کافرو خوانەناسەکان ئەوانەی بڕوایان بە قیامەت نیە بەو قسە لووس و پووسانە کەمەندکێش بکەن، چونکە لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئەواندا دەگونجێ، بەڵام موسوڵمانانی خاوەن هەست و بیر: کە دووربین و وردبینن، بەو قسە رووکەش و پڕوپووچانە هەڵناخەڵەتێن.

﴿وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُواْ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ﴾ بۆ ئەوەی لە سەرەنجامدا بەبێ لێکۆڵینەوەو توێژینەوە، بەبێ ئەوەی بزانن ئەو قسانە راستن یان نا، رەزامەندی خۆیان بەرامبەر دەربڕن و بڕوایان پێ بکەن، رازی ببن بە قسەکانیان و کەسبی ئەوە بکەن کە حەزیان لێیەتی و دڵخوازیانە، تا کاتی خۆی دێ، ئیتر ئەو کاتە حەقی ئەوەڵ و ئاخریان لێ دەستێنم و تۆڵەی سەرپێچی کردن و چەواشەکاری و لە خشتە بردنی خەڵکییان لێ دەکەمەوە.

شەیاتینی ئادەمی ئاشکراو نومایانن، نموونەیان و وێنەی دوژمنایەتییان بۆ هەموو پێغەمبەرێك و بۆ هەموو حەق و راستییەکی کە هێناویانە بەڵگەنەویستە، دژایەتییان بۆ موسوڵمانان و شوێنکەوتووانی رێبازی حەق و ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە هەموو کات و شوێنێکدا بۆ هەموو کەس ئاشکراو عەیانە! بە چاوی خۆمان رۆژانە نموونەیان دەبینین و هەستیان پێ دەکەین!

بەڵام شەیاتینی جندۆکە – جندۆکە هەموویان – غەیبێکی خوداییی! ئێمە هیچییان لێ نازانین جگە لەو زانیارییانەی کە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێمان رادەگەیەنن لە رووی ئەوەوە کە ئایا لەم کەونەدا جگە لە ئادەمیزاو ئەو زیندەوەرانەی کە ناسراون لە زەویدا هیچ مەخلوقێکی تر هەن یان نا؟ لە بارەی مەبدەئەوە ئێمە بڕوامان بە فەرموودەی خودا دەربارەیان هەیە، بڕوامان بە هەواڵی قورئان هەیە، دەربارەیان لە چوارچێوەی ئەو زانیارییەی قورئان‌و حەدیث دەرناچین!

بەڵام نازانین ئەوانەی زانستیان کردووە بە مەتاڵ‌و دێوجامە، بۆ ئەوەی نینکاری ئەو شتانە بکەن کە پەروەردگار لە قورئاندا چەسپاندوویەتی پشت بە چی دەبەستن؟ بەڵگەیان چیە؟ خۆ وا گومان نابرێ کە زانیاری ئادەمیزاد پەی بە هەموو زیندەوەرانی سەر گۆی زەوی بردبێ‌و زانستی دەربارەیان وەدەست هێنابێ! ئاشکراشە زانیاریان نەگەیشتۆتە ئەو ئەندازەی بزانن چی لەسەر ئەستێرەکانی تر هەیە، ئەو زانیارییەی تا ئێستا دەربارەی سەر مانگ‌و ئەستێرەی مەریخ دەست کەوتووە چ زانیارییەکی ئەوتۆ نیە کە ئەو لاف‌و گەزافەی پێوە لێ بدرێ!

هەموو ئەو زانیاریانەی تا ئێستا بەدەست هاتوون هەر لە چوارچێوەی ئەوەدایە ئایا جۆری ژیانی سەر گۆی زەوی لەسەر هەندێ لەو ئەستێرانە دەستەبەر دەبێ یان نا؟! خۆ ئەگەر ئەو بیروبۆچوونانە ئەو تیۆرە زانستییانە بە لایەکیشدا بکەون بوونی ژیان لەسەر هەندێك ئەستێرە بسەلمێنن‌و لەسەر هەندێکیشیان نەیسەلمێنن، نابێ ئێمە بڕیاری نەبوونی جیهانی گیانلەبەرانی تر لە شوێنی تری بوونەوەردا بدەین، نەفامیە بە ناوی زانستەوە بڵێین لە بوونەوەردا – جگە لەسەر زەوی – جیهانی زیندەوەرانی تر نیە، لە رووی چۆنیەتی سروشتی ئەم جۆرە گیانلەبەرە دروست کراوەی کە پێی دەڵێن جندۆکەو بڕێکیان دەبنە شەیاتینی‌و ئاوێتەی شەڕو گومڕایی دەبن‌و ئادەمیزاد لە خشتە دەبەن، ئێمە جگە لەو زانیارییەی لە خوداو پێغەمبەرەوە پێمان گەیشتووە چی تریان لێ نازانین!

لەروانگەی قورئان‌و حەدیثی پێغەمبەرەوە دەزانین کە جندۆکە لە بڵێسەی ئاگر دروست کراون، دەتوانن لەسەر زەوی‌و ناو زەوی‌و ناو دەریاو ناو هەواو دەرەوەی زەویش ژیان بەسەر بەرن! توانای هاتووچۆی خێرایان هەیەو زۆر لە ئادەمیزاد تیژڕەوترن، هەیان خاوەن باوەڕو موسوڵمانە؛ هەیان بێدین‌و شەیتانە،

ئه‌وانـه ئـاده‌میزاد ده‌بینـن‌و ئـاده‌میزاد ئـه‌وان نـابینن، واتـه: له‌سـه‌ر شێوه‌و شکڵی خۆیان، هه‌ر خودا ده‌زانێ چـه‌ند مـه‌خلوقات‌و گیانله‌بـه‌ر هـه‌ن ئـاده‌میزاد ده‌بینـن‌و ئـاده‌میزاد ئـه‌وان نابینـێ. هـه‌روه‌ها شـه‌یاتینی جندۆکـه توانـای لـه خـشته‌بردن‌و گومڕاکردنی ئاده‌میزادیان هه‌یه‌و به وه‌سوه‌سه‌و ختووکه‌دانی ده‌روونه‌وه ئاده‌میزاد گومڕا ده‌که‌ن‌و له خشته‌ی ده‌به‌ن،به جۆرێك که نازانین بـه چ شێوه‌یه‌ك ئـه‌و کـاره ئه‌نجام ده‌ده‌ن! ئه‌و شه‌یاتینییه جندۆکانـه ده‌سـه‌ڵاتیان به‌سـه‌ر موسـوڵمان‌و خـاوه‌ن بـڕوای زوبـان په‌یوه‌سـت بـه نـاوی خـودادا نیـه، هـه‌رکاتێ شـه‌یتان‌و نـه‌وه‌کانی لـه موسـوڵمان نزیـك بوونـه‌وه‌و موسـوڵمان نـاوی خـودای هێنـا لێـی دوور ده‌که‌ونـه‌وه‌و هه‌ڵده‌تیزێنن، که له خودا بێ ئاگا بوو، لێـی نزیـك ده‌بنـه‌وه‌و وه‌سوه‌سـه‌ی ده‌خه‌نـه دڵه‌وه! موسوڵمانی ده‌م به ویردو سـه‌ڵاوات‌و دڵپه‌یوه‌سـت بـه خـودا لـه فـرت‌و فێڵی شه‌یتانی زه‌عیـف بـه‌هێزتره!، جیهـانی جندۆکـه له‌گـه‌ڵ جیهـانی ئـاده‌میزاد حه‌شـر ده‌کـرێن‌و حیـساب‌و لێکۆڵینـه‌وه‌یان له‌گـه‌ڵ ده‌کـرێ، بـه به‌هه‌شـت‌و دۆزه‌خ پـاداش‌و سزایان ده‌درێته‌وه وه‌کوو ئاده‌میزاد...

هێزو توانای جندۆکه له چاو هێزو توانای فریشته هه‌ر وه‌کوو نه‌بوو وایه! له‌م ئایه‌ته‌دا ئه‌وه‌مان زانی که په‌روه‌ردگار بۆ هـه‌موو پێغه‌مبـه‌رێك دوژمنـی شـه‌یاتینی له ئاده‌میزادو ئه‌جنـده دانـاوه، بێگومـان خـودا ده‌یتـوانی، ئه‌گـه‌ر مـه‌یلی لێ بووایـه نه‌یده‌هێـشت ئـه‌و شـه‌یاتینییانه هـیچ بکـه‌ن، ئه‌گـه‌ر بیویـستایه ئـه‌و شـه‌یاتینییانه یاخی نه‌ده‌بوون‌و ئاوێتـه‌ی شـه‌ڕ نـه‌ده‌بوون، دوژمنایـه‌تی پێغه‌مبـه‌رانیان نـه‌ده‌کرد، ئه‌زیه‌تی موسوڵمانانیان نه‌ده‌دا، ڕێگایـان لـه ئـاده‌میزاد ون نـه‌ده‌کرد، بـه‌ڵکوو خـودا ده‌یتوانی به زۆره‌ملێ بیانخاتـه سـه‌ر ڕێگـای ڕاسـت‌و ڕه‌وان، یـان ڕوویـان پـێ بکاتـه هیدایه‌ت‌و ڕاستاڵ‌و پیاوچاك بن،

ده‌یتوانی نـه‌هێڵێ بـه‌ره‌نگاری پێغه‌مبـه‌ران‌و ئـایینی حـه‌ق‌و موسـوڵمانان بکـه‌ن به‌ڵام په‌روه‌ردگار ئـه‌م ئه‌نـدازه سه‌ربه‌سـتییه‌ی پـێ داون، ڕێگـای داون کـه زیـان بـه خۆشه‌ویستانی خودا بگه‌یه‌نن – بـه ئه‌ندازه‌یـه‌ك کـه ویـستی خـۆی له‌سـه‌ریه‌تی – دایـناوه کـه خۆشه‌ویـستانی خـۆی تـاقی بکاتـه‌وه بـه‌و ئه‌نـدازه سه‌ربه‌سـتیه‌و بـه‌و توانایـه‌ی کـه پێـی داون، ئـه‌و شـه‌یاتینییانه ده‌سـه‌ڵاتی ئـه‌وه‌یان نیـه کـه ئه‌زیـه‌تی خۆشه‌ویـستانی خـودا بـده‌ن مه‌گـه‌ر بـه‌و ئه‌ندازه‌یـه‌ی کـه خـودا دیـاری کـردووه!

## قورئان بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەده (دروودی خوای لەسەر بێ)

﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار سەرکۆنەی کافرەکانی کرد؛ ئەو کافرانەی کە بە سوور بوونەوە سوێندیان دەخوارد کە ئەگەر موعجیزەی ماددیان نیشان بدرێ ئیمان دەهێنن! ئەوەشی روون کردەوە کە ناردنی ئەو ئایەتو موعجیزانە بێهودەن و سوودیان نابێ، چونکە ئەگەر پەروەردگار ئەو موعجیزەو نیشانانەش لەسەر دەستی پێغەمبەر ئاشکرا بکا ئەوانە هەر لەسەر کوفرو بێدینی دەمێننەوە، ئەمجار ئەوە ئاشکرا دەکا کە بەڵگەی بەهێز لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بە دوو شێوە دەستەبەر بووە:

یەکەم: پەڕاوێکی بۆ ناردۆتە خوارێ کە زانیاری زۆری لە خۆ گرتووەو شی کەرەوەو روون کەرەوەی هەموو شتێکی پێویستە، ئەوپەڕی رەوانبێژی لە خۆ گرتووە، ئادەمیزادان دەستەوسانن لە بەرامبەری کردنیو نەیان توانیوەو ناتوانن کتێبێکی لەو جۆرە بخەنە روو... ئاشکراشە ئەم دیاردە سەرناسا (معجزة)یەی قورئان باشترین بەڵگەیە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ).

دووەم: تەورات‌و ئینجیلە، کە بە روونی ئەوەیان تێدایە، کە موحەممەد (درووودی خوای لەسەر بێ) رەوانەکراوی خودایەو قورئان کتێبی حەق‌و راستە لە خوداوە بۆ ئەو هاتووەو بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد، بۆیە پەروەردگار فەرمان بە فروستادەی خۆی دەکا کە رووبەرووی کافرەکان بڵێ: ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا﴾ ئایا من جگە لە پەروەردگار دادوەرێکی تر دەستنیشان دەکەم؟ واتە: ناگونجێ بۆ من جگە لە خودا کەسێکی تر پەیدا بکەم، بۆ ئەوەی لە نێوان من‌و ئێوەدا حوکم بدا، چونکە هیچ حوکمێك لە حوکمی خودا دادوەری تر نیە، کەس لە خودا راستگۆ تر نیە ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا﴾ خودایەکی وەهایە قورئانی ناردۆتە خوارێ بۆ ئێوە، هەموو شتێکی تێدا شی کراوەتەوە، هەرچی بیروباوەڕو شەریعەت‌و یاساو زانستی پێویستە تێیدا روون کراوەتەوە! خۆ من ئەوە تەمەنم لە چڵ ساڵ تێپەڕی، لەوەپێش هیچ بابەتێکم لەو جۆرە زانیارییانە نەزانیوە، هەواڵی رابردوو داهاتووم ئاگا لێ نەبووە، ئەو جۆرە رەوانبێژی‌و شیرین گوفتارییەم پێوە دیار نەبووە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِ – یونس/١٦﴾. واتە: ئایا بۆ من رەوایە جگە لە خودا دادوەرێکی تر داوا بکەم؟ لە حاڵێکدا ئەو خودایە ئەرکی پرسیار کردنی لەسەر لابردوون چونکە کتێبێکی بۆ رەوانە کردوون کە بەیانکەرو رۆشنکەرەوەی هەموو شتێکە!

یان مانای وایە: داوا کردنی ئێوە بۆ هێنانی بەڵگەو موعجیزە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیم شتێکی بێهودەیە، چونکە دوو بەڵگەی روون‌و ئاشکرا هەن، پشتگیری پێغەمبەرایەتیەکەم دەکەن؛ ئەو بەڵگانە یەکێکیان نیشانەیەکی هەرە گەورەو گرنگە کە قورئانی پیرۆزو سەرئاسایە، قورئانێك کە وتەی پەروەردگارەو شاکاری دەستی کردگارەو بە ئاشکرا پێغەمبەرایەتی من دەچەسپێنێ، بەڵگەکەی تریشیان ئەوەیە: کە تەورات‌و ئینجیلە بە روونی ئەوەیان تێدایە؛ کە من پێغەمبەری خودام‌و قورئان کتێبێکی حەق‌و راستەو لە خوداوە بۆ من هاتووە.

﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ﴾ ئەگەر ئەو موشریکانە ئینکاری حەق‌و راستی قورئان بکەن‌و بە درۆی بخەنەوە؛ ئەوە با بزانن

كە ئەهلى كيتاب – جوولەكەو نەصرانى – دەزانن كە ئەو قورئانە لە خوداوە نێردراوە بۆ تۆ؛ چونكە نيشانەو رەوشتەكانى تۆ لە كتێبى ئەواندا روون كراوەتەوە، لەسەر زوبانى پێغەمبەرەكانى پێشوو مزگێنى بە هاتنى تۆ دراوە! وەكوو لە ئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ – البقرة/١٤٦﴾. عەبدوللاى كوڕى سەلام كە مالێكى جوولەكە بوو موسولمان بووبوو دەربارەى ئەم ئايەتە لێيان پرسى، وتى: بەڵێ ئێمە پێغەمبەر لە كوڕى خۆمان باشتر دەناسين! چونكە لە كتێبى ئێمەدا نيشانەكانى زۆر باش روون كراونەوە.

﴿فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ ئەى محمد! تۆ هەرگيز نەچيە ريزى گروپى ئەوانەى گومانيان هەيەو بە عەزمو جەزمەوە كارى خۆيان ئەنجام نادەن، چونكە ماتوڵ خودا ئەم نامەيەى بۆ ناردووى‌و حەق‌و راستە، خاوەن نامەكانيش ئەوە بە باشى دەزانن‌و باسى راستى پێغەمبەرايەتى تۆو قورئان لە تەورات‌و ئينجيلدا شى كراوەتەوە كەواتە تۆ لەو كەسانە مەبە كە دوو دڵ‌و گومانيان لە قورئان‌و پێغەمبەرايەتييەكەت هەيە! بێگومان ئاشكرايە كە پێغەمبەر هيچ شك‌و گومانێكى لە دڵدا نەبووە، ئەم نەهييەى كە ئاراستە كراوە بۆ زێدە هەڵنان‌و سووربوونە لەسەر پەيامەكەى، بۆ جۆشدانى جۆش‌و خرۆش‌و پەرۆشى‌و سۆزە لە دڵ‌و دەروونيدا دەربارەى ئايينەكەى، ئاماژەى ئەوەى تێدايە؛ كە ئەركى سەرشانى قورسەو هەميشە پيلانى جۆراو جۆرو بەهێز دژى خۆى‌و ئايينەكەى‌و هاوەڵانى دادەرێژن‌و پێويستە زۆر بە دڵ قايمى‌و ئيمان پتەوميەوە ئەركى سەرشانى ئەنجام بدا. وێنەى ئەم ئايەتە لە قورئاندا زۆرن؛ وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – يونس/١٠٥﴾. يان دەفەرموێ: ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَؤُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَاءكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ – يونس/٩٤﴾.

وەكوو وتمان: ئەم جۆرە نەهييانە ئەوە ناگەيەنن كە پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) شك‌و گومانێكى هەبووبێ، چونكە ئەمانە شەرت‌و ئەگەرن، ئەگەريش

مەرج نیە رووبدا! هەر بۆیەش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: نە گومانم هەیەو نە پرسیار دەکەم!

﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً لاَّ مُبَدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ﴾ کەلامی پەروەردگار کە قورئانە تەواوو بێ کەم و کوڕییە، پێویست بە لێ زیادکردن ناکا، کتێبێکی گشتیو موعجیزەو رەوانو بێ زیادەو بێ خەوشو لەنگییە، چی دەڵێ راستەو چ حوکمێك دەدا عەدلو رەوایە، راستە لە هەواڵە غەیبییەکاندا، عادلە لە داواکارییەکانیدا، هەرچی هەواڵی لێ داوەو باسی کردووە راستەو شكو گومانی تێدا نیە، هەرچی فەرمانی پێ کردوووە عەدلو دادپەروەرییە، هەرچی نەهی لێ کردووە بەتاڵو پووچو زیان بەخشە، بۆیە پەروەردگار داکۆکی لێ کردووە، قورئان شتێك خێرو سودبەخش نەبێت فەرمانی پی ناکا، شتێك فەسادو شەڕ نەبێ نەهی لێ ناکاو وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ - الأعراف/١٥٧﴾. هەرچی لە قورئاندا هاتووە لە فەرمانو داکۆکی، لە هەڕەشەو وادە پێدان، لە چیرۆكو هەواڵ کەلامی خودایەو گۆڕانکاری تێدا نەکراوەو ناکرێ، کەس نیە بتوانێ حوکمی هەڵبوەشێنێتەوە نە لە دونیاداو نەلە قیامەتدا.

﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ پەروەردگار شنەوایە، گوفتاری بەندەکانی دەبیسێ ﴿الْعَلِيمُ﴾ زاناو ئاگادارە بە هەڵسو کەوتو جمو جوڵی بەندەکانی هەر کەسە بە گوێرەی کردارو گوفتاری خۆی پاداشی دەدرێتەوە.

## گومڕایی موشریکەکانو نەیکردن لە خواردنی کوشتییان

﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾

فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾ .

دوای ئەوەی پەروەردگار وەڵامی شوبهەو چەواشەکارییەکانی کافرەکانی دایەوەو راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدی چەسپاند! ئەمجار باسی ئەوە دەکا: کە نابێ موسوڵمانان گوێ بۆ قسەی گەوج و نەفامەکان بگرن، نابێ هیچیان بە قسە بکەن، چونکە ئەوان رێبازی گومڕایی دەگرنە بەرو شوێن شك و گومانی گەندەڵ و فاسید دەکەون، بەمەش پەروەردگار دەیەوێ کەسایەتی سەربەخۆیی بۆ کۆمەڵی موسوڵمانان دابین بکاو وەکوو هێزێك حیسابیان بۆ بکرێ؛ ئەمە لە کاتێکدا کە زۆربەی دانیشتوانی سەرزەوی موشریك و گومڕا بوون!!

ئەبو داوودو تیرمیذی لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: کۆمەڵێك خەڵك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتیان: ئەی رەوانەکراوی

خودا! ئایا ئێمە لە گۆشتی ئەو گیانلەبەرانە بخۆین کە خۆمان دەیانکوژین کەچی لەوانە نەخۆین کە خودا دەیانکوژێ؟؟! ئیتر خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ﴾ تادەگاتە ﴿إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾.

ئیمامی واحیدی دەڵێ: موشریکەکان وتیان: ئەی محمد! پێمان بڵێ: مەڕو بزن دەمرن کێ دەیانکوژێ؟ پێغەمبەر فەرمووی: خودا دەیانکوژێ، وتیان: دەی باشە تۆ پێت وایە: ئەوەی کە خۆت‌و هاوەڵانت دەیکوژن حەڵاڵە، ئەوەی کە خودا دەیکوژێ حەرامە!! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ....﴾[1].

عیکریمە دەڵێ: کاتێك کە پەروەردگار ئایەتی یاساغ کردنی گۆشتی مردارەوە بووی ناردە خوارێ، فارسە ئاگرپەرستەکان دۆستایەتییان لەگەڵ قورەیشییەکانی مەککە هەبوو، نامەیان بۆ نووسین‌و وتیان: موحەممەدو هاوەڵانی پێیان وایە: شوێن فەرمانی خودا دەکەون،کەچی لایان وایە: ئەو ئاژەڵ‌و پەلەوەرەی خۆیان سەری دەبڕن حەڵاڵە، ئەوەی کە خودا دەیکوژێ حەرامە، ئەمە هەندێ دڵکرمێی بۆ هەندێ موسوڵمان پەیدا کرد ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ی ناردەخوارێ! طەبەرانی هەمان ڕیوایەتی بە شێوەیەکی تر گێڕاوەتەوە! بەڵام لە ناوەڕۆکدا چ جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نیە!

﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ﴾ نابێ بە هیچ شێوەیەك لە شەریعەتی حەق‌و قورئان لابدەی‌و روو بکەیە ڕێبازی گومڕایان‌و سەرلێ شێواوان، چونکە ئەوانیش شوێن گومان‌و بیروباوەڕی فاسید کەوتوون! ئەی محمد! ئەتۆو ئەوانەی لەگەڵتدان، ئەگەر لە کاروباری ئایینیدا شوێن زۆربەی دانیشتوانی سەرزەوی بکەوی کە هەموویان کافرو موشریکن، پێچەوانەی قورئان‌و شەریعەتی خودا هەڵس‌وکەوت بکەی، ئەوە لە ڕێبازی حەقی خودا لات دەدەن‌و گومڕات دەکەن‌و ڕێگای عەدڵ‌و حەق‌و راستت لێ گوم دەکەن، چونکە ئەوان جگە لە هەواو هەوەس‌و گومان‌و بیروباوەڕی پڕوپووچ شوێن هیچی تر ناکەون، ئەوان هیچ نرخێك بۆ بەڵگەو نیشانەکانی هەبوونی خودا دانانێن، هیچ گرنگییەك بە بەڵگەی

[1] – أسباب النزول للواحدي ص ١٢٨.

عەقڵی نادەن ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ﴾ ئەوانە تەنیا شوێن گومان دەکەون ﴿وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ﴾ ئەوان تەنیا مەزەندە دەکەنو بە هەوانتەو تەخمینو لابرِ شت دیاری دەکەن، مەزەندە کردنەکەشیان بێ بناغەو دوورە لە حەقیقەتو راستییەوە، بیروباوەڕیان لەسەر تەخمینو مەزەندە کردنی هەڵە دادەمەزرێنن، نەك لەسەر بورهانو بەڵگە.

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە زۆربەی دانیشتوانی سەرزەوی لە بارەی بیروباوەڕەوە سەرلێ شێواو گومڕابوون، هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، ئینکاری پێغەمبەرایەتیان دەکرد، سەرلێ شێواو بوون لە بارەی تەشریعو حەلاڵو حەرام دانانەوە، کە مردارەوە بووو خوێن خواردنو عەرەق خواردنەوەیان بەلاوە حەلاڵو رەوا بوو، بە ختو خۆڕایی برێ ئاژەڵیان لە خۆ حەرام دەکرد، ناوی بەحیرەو سائیبەو وەصیلەیان لێ دەنان، قورئان لە شوێنێکی تردا ئاماژە بۆ ئەمە دەکا کە زۆربەی دانیشتوانی سەرزەوی گومڕابوونو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ – الصافات/۷۱﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ – یوسف/۱۰۳﴾.

ئەم حوکمە قەطعییە کە زۆربەی دانیشتوانی سەرزەوی گومڕابوون، راستیەکە مێژووی هەموو گەلانی کۆنو نوێ پشتگیری دەکا، چونکە خاوەن نامەکان وازیان لە پەیرەو پرۆگرامی پێغەمبەرەکانیان هێنا بوو، گەلە بتپەرستەکان زۆر لە رێبازی خودا دوور کەوتبوونەوە، ئەمە یەکێکە لە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) چونکە ئەو نەخوێندەوار بوو، مێژوو بەسەرهاتی گەلانی نەخوێندبوەوە، ئەدی چۆن ئەم راستییەی دەزانیو ئاوا بەراشکاوی رایگەیاندو دەق لەگەڵ واقیعو رووداودا پڕاوپڕ دەرچوو؟

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ کە پێی گەیاندوویو قورئانی بۆ ناردوویو ئەو شتانە کە نەتدەزانی فێری کردوووی لە تۆ زاناترە، لە هەموو ئادەمیزادو مەخلوقاتی تر زاناترە بەو کەسانەی رێگای راستی خودایان لێ گوم بووە، لە هەموو کەس زاناترە بە هیدایەتدراوانو رێڕەوانی رێگای راستی یەزدان پەسەند؛ ئەمە هەڕەشە کردنەو

جەخت کردنەوەی مانای پێشووە، کە داوای کرد بە هیچ جۆرێك پەیڕەوی ڕێبازی ئەهلی ضەلال‌و گومڕایان نەگرنە بەر.

جا لەبەر ئەوەی موشریکەکان سەربڕینی گیانلەبەری کوشتییان بۆ بت‌و پەرستراوی خۆیان – جگە لە خودا – بە بنەمای بیروباوەڕی خۆیانیان دەزانی، حاڵ‌و وەزعی زۆربەی دانیشتوانی سەرزەوی کوفرو گومڕابوو، بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد بە کردەوەو هەڵس‌و کەوتێك کە بنەمای بڕوا بە خودایە؛ کە ئەویش خواردنی گۆشتی ئەو سەربڕاوانەیە کە ناوی خودای لەسەر دەهێندرێ‌و فەرمووی: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ﴾ واتە: خۆتان بپارێزن لە خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵ‌و پەلەوەرانەی کە لەبەر خاتری بت‌و صەنەم سەربڕاون‌و ناوی غەیری پەروەردگاریان لەسەرە هێندە (بسم اللّه)یان لەسەر نەکراوە ﴿إِن كُنتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواتان بە نیشانەو بەڵگە هیدایەت ئامێزەکانی یەزدان هەیە، دەتانەوێ عەقیدەی ڕێك‌و پێك لە دەروونتان بچەسپێ‌و هەرشتێك دژی ئەو بیروباوەڕە راستە بێ، ئێوە بە درۆو پووچی بزانن...!

ئەمە ڕێگا پێدانی روون‌و ئاشکرایە لە پەروەردگارەوە بۆ بەندە موسوڵمانانەکانی کە لە گۆشتی ئەم سەربڕاوانە بخۆن کە ناوی خودایان لەسەر دەبردرێ، بە مەبەستی چەسپاندنی بڕوا بە خوداو ڕەتدانەوەی عەرەبە موشریکەکان‌و غەیری ئەوانیش کە سەربڕینی ئاژەڵ‌و پەلەوەریان بە داب‌و نەریت‌و بنەمای ئایین‌و بیروباوەڕی خۆیان دەزانی‌و لە ڕێگەی سەربڕینی ئاژەڵەوە خۆیان لە بتەکانیان نزیك دەکردەوە.

ئەوەی لە ئایەتەکە وەردەگیرێ ئەوەیە: هەر سەربڕاوێك ناوی خودای لەسەر نەبرێ خواردنی حەڵاڵ نیە، وەکوو کافرەکانی قوڕەیشی خواردنی مردارەوە بوو ئەو سەربڕاوانەی کە بۆ بتەکانیان سەردەبڕی.

حیکمەتی گرنگی دان بەم مەسەلەیەو هێنانی لەتەك مەسەلەی بیروباوەڕ ئەوەیە: موشریکە عەرەبەکان‌و غەیری ئەوانیش، ئاژەڵ سەربڕینیان کردبووە ڕێ‌و ڕەسمێکی پەرستشکاریی، بەڵکوو خستبوویانە پلەی بنەمای عەقیدەو بیروباوەڕەوە ئاژەڵ سەربڕینییان کردبووە شوێنی پەرستنی خودا درۆزنەکانیان‌و لەکاتی

سەربڕینیاندا ناوی بتەکانیان بەدەنگی بەرزو قریوە قریو دەهێنا، ئەمەش جۆرە شەریك پەیدا کردنێکە بۆ خودا، چونکە عیبادەت کردن بوو بۆ غەیری خوداو بەرەوا زانینی هاوەڵ بوو بۆ خودا!

بەکورتی مەسەلەی ئاژەڵ سەربڕین بەشێکە لەو عیبادەتو پەرستشەی کە ئادەمیزاد ئەنجامیان دەدا بە مەبەستی لە خودا نزیك بوونەوە، لە سەردەمی گومڕایی‌و بتپەرستی ئادەمیزاددا حەیوان سەربڕین بووە پەرستن‌و ڕێزلێنانی غەیری خودا، واتە: ئاژەڵ سەربڕین بووە بەشێك لە بتپەرستی‌و شەریك دانان بۆ خودا، هەر بۆیەشە مەسەلەی ئاژەڵ سەربڕین لە چواچێوەی باسی کوفرو ئیمان‌و شیرك‌و یەکتاپەرستیدا هێنرایە کایەوەو لەم ئایەتەدا ئاوا خرانە پەنا یەکتری.

بێگومان تا ئێستاش هەندێ موسوڵمانی سافیلکە دەکەونە ئەو هەڵەیەوەو ئەو تاوانە دووبارە دەکەنەوە، دەهێنن حەیوان بە ناوی شێخێك، پیاوچاکێك، ئارامگەیەکەوە سەر دەبڕن، گوشتییان بۆ تەرخان دەکەن، ئەوەتا ئێستاش لە میصر گوێرەکەو مەڕو بزن بۆ سەید ئەحمەدی بەدەوی‌و غەیری ئەویش نەزر دەکەن، لێیان دەپاڕێنەوەو هانایان بۆ دەبەن ئەمەش شیرکێکی ئاشکرایە!

﴿وَمَا لَكُمْ أَلاَّ تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ﴾ چی شتێك ئێوەتان لێ قەدەغە دەکا کە لە گۆشتی ئەو حەیوانە سەربڕاوانە بخۆن کە لەکاتی سەر بڕیندا ناوی خودایان لەسەر هاتووە؟؟

﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ بێگومان بۆ ئێوە شی کراوەتەوە ئەو شتانەی لێتان قەدەغەیە، وەکوو لە ئایەتی ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ... — الأنعام/١٤٥﴾.دا بۆمان روون کردوونەوە، ئەو خواردەمەنی‌و گۆشتی حیوانەی لەوێدا دەست نیشان کراوە لێتان قەدەغەیە ﴿إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾ مەگەر پێویستی‌و زەرورەت پاڵتان پێوە بنێ بۆ خواردنی، واتە: ئەگەر برسیتان بوو خواردنی ترتان دەست نەکەوت، ئەوکاتە لەبەر ناعیلاجی حەرام حەڵاڵە، چونکە قاعیدە ئوصوڵییە کە دڵێ: (الضرورات تبيح المحظورات) بەڵام دەبێ بە ئەندازەی پێویست لەو حەرامە بخورێ‌و زێدە ڕەوی تێدا نەکرێ، چونکە قاعیدەیەکی تری ئوصوڵی هەیە دەڵێ: (الضرورة تقدر بقدرها) کەوابوو دروستە بۆ ناعیلاج کە بە

گوێرەی پێویستی خۆی لە حەرام بخواو خۆی لە مردن رزگار بکا! ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ واتە: بێگومان زۆربەی ئادەمیزاد وەکوو بۆ خۆیان گومڕابوونو سەریان لێ شێواوە ڕێگەش لە خەڵکی گوم دەکەن، لە ڕێگەی خواردنی گۆشتی ئەو حەیوانانەی کە بۆ غەیری خودا سەردەبڕدرێن ڕێگا لە خەڵکی گوم دەکەن؛ بەوە کە حەڵاڵیان لێ حەرام دەکەنو حەرامیان لێ حەڵاڵ دەکەن، ئەم ڕێ لێ گوم بوونو ڕێ لێ گوم کردنە بە ئارەزوو هەواو هەوەسی خۆیان ئەنجامی دەدەن، نەك لە ڕێگەی زانیارییەکەوە کە لە وەحی ئاسمان سەرچاوەی گرتبێ، یان لە بەڵگەو دەلیلی عەقڵییەوە سەری هەڵدا بێ.

سەرچاوەی ئەم هەواو ئارەزوو کارییە ئەوەیە: ئەو گەلو نەتەوەیەی حەزرەتی نووح (سەلامی خودای لەسەر بێ) بۆ لایان ڕەوانە کرابوو پیاوی خوداپەرستو ڕاستاڵیان تێدا بوو، کاتێك کە مردن پەیکەریان بۆ تاشین بۆ یادکردنەوەیانو شوێن کەوتنیان، دوایی بە درێژایی ڕۆژگار ڕێزیان لێ گیراو یادیان کرایەوە! دوایی ئادەمیزادی تر هاتن حیکمەتی دانانی ئەو پەیکەرانەیان لێ شێواو ئیتر لە تێپەڕ بوونی ماوەیەکی زۆر، ئەم ڕێز لێ گرتنەیان لێ بوو بە ئایینو پەرستشکاری، لەسەر ئەم بنەمایە بتپەرستی دامەزرا!

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ﴾ خودای تۆ ئەی محمد! کە ئەم هەموو ڕێنموونیو هیدایەتەی لەسەر زوبانی تۆ بە خەڵکی ڕاگەیاند، لە تۆش‌و باقی خەڵکی تریش زاناترە بەوانەی دەستدرێژی دەکەنو لە حەڵاڵەوە لادەدەن بۆ ئەو شتانەی خودا لێی حەرام کردوون، یان لە ئەندازەی پێویست لەکاتی زەرورەتو ناعیلاجیدا تێ دەپەڕێنن، خودا باش باش ئاگاداری تەجاوەزکاریو درۆو دەلەسەو خیانەتکارییە، سزای پڕاوپڕیان دەداتەوەو تۆڵەیان لێ دەستێنێ، وەکوو عەمری کوڕی لوحەییو گەلەکەی کە بەحیرەو سائیبەیان داهێنا، خواردنی گۆشتی مردارەوەبوویان بە حەڵاڵ دانا، هەروەها خواردنی گۆشتی ئەو حەیوانە سەربڕاوانەی کە ناوی غەیری خودایان لەسەر دەبرا بە حەڵاڵو ڕەوایان دەزانی.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە لە هەموو تاوانێك دوور بکەونەوەو دەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَاهِرَ الإِثْمِ وَبَاطِنَهُ﴾ واز لە هەموو تاوانێك بێنن، لە

هەموو حەرامێك دووربكەونەوە بە ئاشكراو نهێنی، لە كەمو زۆری، جا ئەو تاوانە تاوانێك بێ بە ئەندامی ئاشكرا ئەنجام بدرێن وەكوو دەستو قاچو زوبانو ئامێری داوێن پیسی، یان كردەوەی دڵو دەروون بێ وەكوو دڵپیسیو حەسوودیو لووتبەرزیو خۆبەزلزانین.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُواْ يَقْتَرِفُونَ﴾ بێگوما ئەوانەی تاوان دەكەن بە ئاشكرا، یان بە نهێنی كەم بی یان زۆر بێ سزای خۆیان دەدرێتەوە. چەندێك زێدە رەوی بكەن لە تاوان كردندا سزایان توندتر دەبێ، چەندێك ئەوان سروشتی خۆیان تێك بدەنو سووربن لە دووبارە كردنەوەو سێ بارە كردنەوەی تاوانەكانیان تۆڵەو سزایان سەختتر دەبێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەكدا پێناسەی تاوانی كردووە فەرموویەتی: «وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ» لە ریوایەتی موسلیمدا دەفەرموێ: «وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ. وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ» بەلام كەسێك تۆبەیەكی رێكو پێك بكا، لە تاوانەكانی پێشووی ژێوان ببێتەوە، ئەوە خودا لێی خۆش دەبێ، مەگەر مەیلی لێ بێ بە مەرجێ شەریك بۆ خودا دانەنێ! شەریك بۆ خودا دانان لێخۆشبوونی نیە ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء – النساء/١١٦﴾.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان دەكا بەوەی كە هەر حەیوانێك لەكاتی سەربڕیندا ناوی خودای لەسەر نەهێندرێ لێی نەخۆن ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ﴾ ئەی كۆمەڵی موسوڵمانان! گۆشتی حەیوانێك مەخۆن كە مردار بووبێتەوەو سەرنەبڕدرا بێ، یان سەربڕابێو ناوی خودای لەسەر نەهێندرابێ! یان بۆ غەیری خودا سەربڕابێ وەكوو ئەو حەیوانانەی كە موشریكەكان بۆ بتەكانیان سەریان دەبڕن، ﴿وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ حەیوان سەربڕین بۆ غەیری خوداو خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو لەخودا یاخی بوونو تاوانە...

ئەوەی لەم شوێنە وەردەگیرێ ئەوەیە كە مەبەست بە ﴿مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ﴾ ئەو حەیوانە بێ مردار بووبێتەوە، یان ناوی غەیری خودای لەسەر هاتبێ.

﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ﴾ بێگومان شەیاتینی ئادەمیزادو جندۆكە ختوكەی دڵی هاوەڵانو دۆستانی خۆیان لە موشریكەكان دەدەن بۆئەوەی

دەمێ دەمێ لەگەڵ پێغەمبەرو هاوەڵانی بکەن دەربارەی خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بەگوێی ئەو موشریکانە بکەن‌و بیرو بۆچوونی ئەوانتان بەلاوە راستبێ‌و پێتان وابێ مردارەوەبوو حەڵاڵە؛ ئێوەش وەکوو ئەوان موشریك‌و تاوانبارن، چونکە لە شەریعەتی خودا لاتان داوەو بیروباوەری پووچی موشریکەکانتان وەرگرتووە، ئەمەش بە شەریك دانان حلێب دەکرێ؛ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ – التوبة/٣١﴾. تیرمیذی لە بارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە لە کوڕی لە عەدی حاتەمەوە دەگێڕێتەوە کە بە پێغەمبەری گوتووە ئەی رەوانە کراوی خودا! کوا خۆ جوولەکەو مەسیحییەکان قەشەو مالەکانیان نەپەرستوون؟ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ: ئەو قەشەو مالانە حەرامیان بۆ حەلاڵ کردوون‌و جەماوەرەکەش گوێ بیستیان بوون، دەی ئەوە بە پەرستش حلێب دەکرێ!

زەجاج دەڵێ ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە هەرکەسێك شتێك حەلاڵ بکا کە خودا حەرامی کردووە، یان شتێك حەرام بکا کە خودا حەلاڵی کردووە، ئەوە بە موشریك حلێب دەکرێ، چونکە ئەو جگە لەخودا یاسا دانەرێکی تری داناوە!

## ئەو حوکمانەی لەم ئایەتانە وەردەگیرێن ئەمانەن:

١- هەر حەیوانێك موسوڵمان سەری ببڕێ‌و ناوی خودای لەسەر بهێنێ حەلاڵە.

٢- ئایەتەکە فەرمانی کردووە بە هێنانی ناوی خودا لەسەر ئاو خواردنەوەو حەیوان سەربڕین‌و هەموو خواردەمەنییەك.

٣- هەر حەیوانێك ناوی خودای لەسەر نەهاتبێ خواردنی گۆشتی حەلاڵ نییە؛ وەکوو مردارەوە بوو و ئەو حەیوانانەی کە سەر دەبڕدران لەسەر بەرد (نصب)ەکانی دەوری کەعبەو شوێنی تریش.

٤- شتی حەرام لەکاتی ناچاریدا حەلاڵە بەمەرجێ لە ئەندازەی پێویست تێپەڕ نەکا.

٥- هەرکەسێك حەرام حەلاڵ بکا، یان حەلاڵ حەرام بکاو شوێن غەیری حوکمی خودا بکەوێ، ئەوە کافرو موشریکەو جگە لەخودا شەرع دانەرێکی تری داناوە.

ئەو حەیوانانەی سەردەبڕدرێن بە بۆنەی دیدەنی پاشاو سەرۆك و لێپرسراوان، یا لەکاتی گەڕانەوەی حاجیاندا ئەوە بەلای حەنەفییەکان گۆشتەکەیان حەرام دەبێ، چونکە سەربڕینەکە مەبەستی غەیری خودای تێدایە. هەندێ لە شافیعییەکان رایان وایە: مەبەست لەو سەربڕینە دەربڕینی پێخۆش حاڵییە بەهاتنی ئەو کەسە. وەکوو سەربڕینی حەیوان وایە بۆ عەقیقە؛ کە کەسێك منداڵی دەبێ حەیوانی بۆ دەکا بە حەوتەم، پێخۆشحاڵ بوون بەو شێوە نابێتە هۆی حەرامبوونی،، بەڵام ئەگەر سەربڕینەکە لەژێر قاچی میوانەکەدا بوو، واتە: لەژێر پێیدا سەربڕا، ئەوە گۆشتەکەی حەرام دەبێ، چونکە ناوی غەیری خودای لەسەر دەهێندرێ!

٦- برێ لە شەرعزانان وا لە ئایەتی ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ تێگەیشتوون کە هەر حەیوانێك لەکاتی سەربڕیندا ناوی خودای لەسەر نەهێندرێ با موسوڵمانیش سەری بڕیبێ گۆشتەکەی حەرامە! ئەم مەسەلەیە مەسەلەی سەربڕینی ئاژەڵە بەبێ ناو هێنانی خودا جا ناونەهێنانەکە بە سەهوبێ، یان بە ئەنقەست بێ. ئەمەش زانایانی ئیسلام چەند رایەکیان هەیە:

أ/ داوود ظاهیری دەڵێ: ئەگەر موسوڵمان حەیوانی سەربڕی لەبیری چوو یان بە ئەنقەست ناوی خودای لەسەر نەهێنا گۆشتەکەی ناخورێ چونکە ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ.

ب/ شافیعییەکان دەڵێن: ئەگەر موسوڵمان حەیوانی سەربڕی‌و ناوی خودای لەسەر نەهێنا گۆشتەکەی حەڵاڵە، چونکە ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی مائیدە کە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ – المائدة/٣﴾ تا دەگاتە ﴿إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە سەربڕاو حەڵاڵە ئایەتەکە باسی هێنانی ناوی خودای نەکرد، ناوهێنانی خوداش بەشێك نیە لە سەربڕین، چونکە سەربڕین بریتییە لە بڕین‌و لەتکردن... ئەوەش هاتۆتە دی هەروەها ئەو فەرموودەشیان کردووە بە بەڵگە کە بوخاری‌و ئەبو داوودو ئیبن ماجەو نەسائی لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە (خوا لێیان رازی بێ)! دەڵێ کۆمەڵێك عەرزی پێغەمبەریان کرد (دروودی خوای لەسەر بێ): وتیان: گرۆکانی ئێمە تازە موسوڵمان بوون گۆشتمان بۆ دێنن نازانین ئایا ناوی

خودای لەسەر هێندراوە یان نا؟ ئایا لێی بخۆین؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «سَمُّوا وَكُلُوا» ناوی خودای لەسەر بێنن و بیخۆن! ئەبو داوود فەرموودەیەکی مورسەلی لە (الصلت السدوسی)یەوە گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: «ذَبِيحَةُ الْمُسْلِمِ حَلَالٌ ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَوْ لَمْ يَذْكُرْهُ» سەربڕاوی موسوڵمان حەڵاڵە، ناوی خودای لەسەر بێنێ یان نا!

بەڵام ئەوەمان لەبیر نەچێ ناوهێنانی خودا لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا شتێکی سوننەتە و پەیڕەو کردنی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێ).

ج/ جەماوەری زانایان (ئەبو حەنیفە، مالیك، ئەحمەد) پێیان وایە ئەگەر بە ئەنقەست ناوی خودای لەسەر نەهێندرا بە مردارەوەبوو حلێبە و گۆشتەکەی حەرامە، بەڵام ئەگەر لەبیری چوو حەرام نابێ! حەنبەلییەکان دەڵێن: ئەگەر بۆ نێچیر ناوهێنانی خودای لەبیرچوو گۆشتەکە حەرام دەبێ! واتە لەبیرچوونی ناوهێنانی خودا بۆ سەربڕینی قەیناکا بەڵام بۆ نێچیر حەرامی دەکا.

## نموونەی موسوڵمانی هیدایەتدراوو کافری گومڕا

﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾.

پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی باس کرد کە زوربەی دانیشتوانی سەرزەوی گومڕاو سەرلێ شێواون، شوێن گومان و خەیاڵی پڕوپووچ دەکەون بە

خەرساندن‌و مەزەندە کردن شت دیاری دەکەن، موشریکەکان کێشەو دەمە دەمێ لەگەڵ موسوڵمانەکان دەکەن دەربارەی ئایین.

ئەمجار لەم ئایەتەی دواییدا نموونەی حاڵی موسوڵمانی هیدایەتدراو کافری گومڕا باس دەکا، ئەوە روون دەکاتەوە کە موسوڵمانی هیدایەت دراوو وەکوو مردوویەك وایە کە زیندوبوو بێتەوە رۆشنایی درابێتێ‌و بەکاری بێنێ لە بەرژەوەندی خۆیداو لە ژیاندا سوودی بۆ خۆی‌و کۆمەڵ هەبێ. کافری گومڕاو سەرلێ شێواویش وەکوو کەسێك وایە لە تاریکیدا سەری لێ شێوابێ، بە هیچ لایەکدا رێ دەرنەکاو هەمیشە سەرگەردان بێ!

ئیمامی واحیدی لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: فەرموودەی پەروەردگار ﴿أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا﴾ مەبەستی پێی هەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبە، وەکوو دەڵێن: ئەبو جەهل هەندێ پیسایی ناو گەدەی ئاژەڵێکی هاویشتە سەر پشتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە کاتێکدا کە تەشریفی لە نوێژدا بوو، هەواڵی ئەم رووداوەیان بە هەمزە راگەیاند، ئەو هێشتا ئیمانی نەهێنابوو، ئەو کاتە ئەم هەواڵەیان دایێ تازە لە راو گەڕابووەوە، قەوسەکەی بە دەستەوە بوو، ئیتر بە تووڕەیی بەرەو ئەبو جەهل رۆیی عەمبازی بوو، دای گرت، ئەبو جەهل هاواری لێ هەڵساو دەیگوت: ئەی ئەبو یەعلا! ئەتۆ نازانی موحەممەد ئەوەی هێناویەتی عەقڵ‌و هۆشی لێ شێواندووین، جوێن بە خوداکانمان دەدا، پێچەوانەی داب‌و نەریتی باوك‌و باپیرانمانە؟ هەمزە وتی: کێ لە ئێوە بێ عەقڵ ترە؟ لەجیاتی خودا دارو بەرد دەپەرستن! «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ» ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ واتە: ئایا ئێوە ئەی موسوڵمانان! وەکوو ئەو شەیاتینییانە وان؟ یان وەکوو ئەولیاکانی ئەوان وان؟ کە بە قسەی پڕوپووچ‌و بێ بناغە دەیانەوێ خەڵکی هەڵخەڵەتێنن؟ ئایا کەسێك بەهۆی کوفرو نەزانییەوە مردووبێ‌و ئێمە بەهۆی ئیمان‌و باوەڕەوە زیندووی بکەینەوەو چرای رۆشنکەرەوە کە قورئانی پیرۆزە بیدەینێ بۆ ئەوەی کاروباری دونیایی‌و ئایینی خۆی پێ ئەنجام بدا وەکوو ئەو

كەسە وايە: كە بەناو تاريكى جۆراو جۆردا دەڕوا؟! تاريكى شەو، تاريكى هەور، تاريكى باران، بە هيچ جۆرێك ناتوانێ لەو تاريكييانە سەر دەركاو رزگارى ببێ! سەرگەردان دەمێنێتەوەو رێگاى رزگار بوون نازانێ، ترسو خۆفو سەرگەردانى هەميشەيىو لاوازىو زەبوونى لە هەموو لايەكەوە دەورەى داوە... كەسێكيش كەوتبێتە ناو تاريكى نەزانىو لاسايى كردنەوەى كوێرانەو فەسادى سروشتى هەرگيز لێى دەرناچێ، چونكە وەكوو دەگوترێ (تەيرى گول عاشق بە دارى زەقنەمووتە) ئەوانيش بەو گومڕاييە ئاشنا بوونو هەوڵى ئەوە نادەن لەو تاريكييە رزگاريان ببێو بكەونە ناو رووناكى، بەڵكوو جارى وا هەيە؛ ئەوانە لەو رووناكييە هەست بە ئازارو نارەحەتى دەكەن، وەكوو چۆن شەمشەمە كوێرە بە رووناكى نارەحەت دەبێ! ئەم ئايەتە بەراوردكردنو بەرامبەرى كردنە لە نێوان موسوڵمانانو كافراندا، لە رووى ئەو بەراوردكردنەدا زۆر ئايەتى قورئان هەن وەكوو ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ – الملك/٢٢﴾. يان دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالأَعْمَى وَالأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ – هود/٢٤﴾. يان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ، وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ، وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ، وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاء وَلَا الْأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاء وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ، إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ – فاطر/ ١٩ – ٢٣﴾.

بەكورتى ئەوە دوو جيهانن دوو جيهانى لە يەكترى جيا، جياوازى نێوانيان زۆرە، جيهانى موسوڵمانان كە پەروەردگار بە نوورى ئيمان زيندووى كردوونەوە، جيهانى كوفرو بێدينى كە لە گومڕايىو تاريكيدانو لێى دەرناچن.

بەڵێ موسوڵمانان پێش هاتنى ئەم ئايينە، پێش ئەوەى نوورى ئەم بيروباوەڕە بچێتە ناو دڵو دەروونيانەوەو زيندوويان بكاتەوەو ئەم هێزە بەهێزەيان تێدا بخولقێنێ، دڵيان مردبوو، گيانەكەيان تاريك بوو، كاتێك نوور خرايە دڵيانەوە، گيانەكەيان نوورو رووناكى تێكەوت ئاوەدان بوونەوە زيندوبوونەوەو خەملانو خۆيان سازدا بۆ وەرگرتنى فەرمانى يەزدانىو پەيڕەوكردنى بەرنامەى ئاسمانى، جا كە هيدايەت دان بۆ ئيمانو باوەڕ بە خودا، يان رۆچوونو چوونە ناو گومڕايىو

کوفرو سەرلێ شێواوی بەدەست ئادەمیزاد خۆی بێو بە ویستی خۆی لایەکیان هەڵبژێرێ؛ ئەوە پەروەردگار دابو نەریتی خۆی وا داناوە کە تەوفیقو یارمەتی زیاد بکا بۆ موسوڵمانان بۆ ئەوەی زیاتر بەرەو خێر برۆنو بڕوایان پتەوتر بێ، واز لە کافرو موشریکەکان بێنێ بۆ خۆیان لە کەندەڵانی گومڕاییدا کوێرانە هەنگاو هەڵنەنێن، بۆیە کۆتایی ئایەتەکە بەمە هێنا، کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ وەکوو چۆن بۆ موسوڵمانان ئایینی ئیسلامو بڕوا بە خودا لە دڵیاندا شیرین کراوەو لە پێش چاویان رازێندراوەتەوە، هەر بەو جۆرە کوفرو تاوانمان بۆ کافرەکان رازاندۆتەوە، واتە: بۆ هەر کۆمەڵێك کردەوەکانیانمان لە پێش چاو جوان کردوون، ئیمانو باوەڕ بە خودا لە پێش چاوی موسوڵمانان شیرین کراوە، کوفرو نەزانیو گومڕایی لە دڵی کافرەکاندا جوان کراوە؛ وەکوو دژایەتی کردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هەروەها سەربڕینی حەیوان بە ناوی بتو شێخو ئارامگای پیاو چاکانەوە، حەرام کردنی شتێك کە خودا حەرامی نەکردووە، حەڵاڵ کردنی شتێك کە خودا حەرامی کردووە!

ئیبنو کەثیر لە مانای ئەم ئایەتەدا دەڵێ: پەروەردگار بە تەقدیرو حیکمەتو دانایيو خۆی ئەو گومڕایی کوفرو بێدینیەی لە پێش چاویاندا جوان کردووە. لە دڵیاندا شیرینی کردووە... ئەمجار بۆ بەراوردکردن لە نێوان گرۆهی موسوڵمانو گرۆهی کافراندا فەرمووده‌یەکی لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدەوە هێناوە کە لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ خَلْقَهُ فِي ظُلْمَةٍ، ثُمَّ رَشَّ عَلَيْهِ مِنْ نُورِهِ، فَمَنْ أَصَابَهُ ذَلِكَ النُّورِ اهْتَدَى وَمَنْ أَخْطَأَهُ ضَلَّ». پەروەردگار لە عالەمی ئەزەلدا لە ناو تاریکیدا بەندەکانی خۆی دروست کردن، ئەمجار نوورو رووناکی بەسەردا پەخش کردن، جا کەسێك لەو عالەمی میثالەدا ئەو نوورەی رێ گەوتبێ هێدایەتدراوە، کەسێکیش رێی نەکەوتبێ گومڕابووە!!

ئەمجار پەروەردگار شتێك باس دەکا کە سوننەتو دابو نەریتی خۆی تێدا رەنگ دەداتەوە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا﴾ واتە: وەکوو چۆن دانیشتوانی مەککە کردەوەکانیان لە پێش چاو جوان کراوە، وێڕای ئەوەی کە فاسقو خوانەناسن، خودا کردوونی بە پیاو ماقووڵو ریش سپی مەککە!

هەر بەو جۆرە لە هەموو شارو شارۆچکەو نیشتەمەنییەکدا خاوەن دەسەڵاتو پیاو ماقووڵو دەست رۆیشتووەکانمان کردوون بە گەورەی تاوانبارانو کادرو بانگەوازیکەر بۆ کوفرو گومڕایی‌و لەمپەڕ لەبەردەم بانگەوازیکەرانی ئایینی خودا ﴿لِيَمْكُرُواْ فِيهَا﴾ تا لە ئاکامدا فرتو فێڵو چاوو راو بکەن لەو شوێنانەدا بۆ بەربەست کردنی ئایینی پیرۆزی خودا، دژی حەقخوازان بوەستن، چونکە ئەوان بە هۆی دەسەڵاتو دەست رۆیشتوویانەوە زیاتر دەتوانن رەواج بە گومڕایی‌و بێدینی بدەنو خەڵکی لە خشتە بەرنو پیلانی جۆراو جۆر دژی بانگەوازیکەرانی رێگای خودا دابرێژن!

ئەمە سوننەتو دابو نەریتی خودایە لە کۆمەڵگای ئادەمیزاددا کێشە دەخاتە نێوان حەقو بەتاڵ، دژایەتی لە نێوان کوفرو ئیماندا بەهێز دەکا، بۆ هەر لایەك لە حەقو لە بەتاڵ پەیڕەوکارو رێڕەوی خۆی هەیە، لێپرسراوو کارمەندو کارگێڕی کاریگەر هەیە، پێغەمبەرانو شوێنکەتووانیان لە ناو ئەم ململانێیەدا پەیدا دەبنو بانگەوازی حەقو راستی بە گوێچکەی بوونەوەردا دەدەن! مسکێنو بۆرە پیاوو رەشە خەڵکەکە دوویان دەکەون، ملهوڕو خاوەن دەسەڵاتو بە ناو پیاو ماقووڵانیان دژیان دەوەستن، خەڵکە مامناوەندییەکە یارمەتییان دەدەنو گەورە تاوانبارەکان بەرەنگارییان دەکەنو دژی بزوتنەوەی چاکسازی‌و پێشکەوتنو بنیادنان دەوەستن، ﴿وَمَا يَمْكُرُونَ إِلاَّ بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ بەڵام سەرەنجام سەرکەوتن هەر بۆ خوداپەرستانو پیاوچاکانە، تێشکانو لە ناوچوونو ریسوابوون بۆ کافرو گێرە شێوێنو چەواشەکارانە. ئەو گەورە تاوانبارانە کە فرتو فێڵ دەکەنو دژی پێغەمبەرانو شوێنکەوتووانیان پیلان دادەرێژن، زیانی پیلانو فێڵەکانیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوەو خۆیان زەرەرمەند دەبن! بەڵام ئەوان دووربین نینو دوا رۆژیان لەبەرچاو نیەو لە رابردوو پەندیان وەرنەگرتووەو هەستو شعوریان نیە، هەستی شارەزاییان نیە بزانن ئاکامی کردەوەکانیان چۆنەو چۆن نیە، نازانن چۆن هەڵسو کەوت بکەن!

ئەم ئایەتە پشتگیری یاسایەکی کۆمەڵایەتی دەکا، کە بریتییە لە کێشەو ململانێی مانەوەو مانەوەی شتە باشەکان (تنازع البقاء والبقاء للاصلح) وەکوو لە

ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ – الرعد/١٧﴾. بێگومان ئەم سوننەتو دابو نەریتە خودایییە لە کۆنیشدا هەر وابووەو هەر واش دەبێ، سوننەتی خودا گۆڕانی بەسەردا نایەت. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ، فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَاهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ – النمل/ ٥٠ – ٥١﴾. واتە: ئەوانەی پیلانیان دارِشتنو فرتو فێڵیان کرد بۆ مانەوەی پلەو پایەی خۆیان نەیانزانی کە سەرەنجامی پیلانو فێڵەکانیان بەرەو رووی خۆیان دەمبێتەوە، چونکە ئاگاداری یاساو سوننەتو دابو نەریتی خودا نەبوون ﴿وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ – فاطر/٤٣﴾. لە روانگەی ئەم ئایەتەوە راڤەکەرانی قورئان، مەسەلەی جەبرو قەدەریان هێناوەتە کایەوە؛ ئەهلی سوننەو جەماعە دەڵێن: ئەو کەسەی کردەوەکە – چاك یان خراپ – لە پێش چاوان جوان دەکاو لە دڵدا شیرینی دەکا خودای مەزنە، چونکە دەڵێن: هەموو کردەوەیەك دەبێ هەڵنەرو هاندەرێکی هەبێ بیهێنێتە دی، بە خەلقی خودا، ئەو هەڵنەرو هاندەرە بریتییە لە زانینو بڕوا بوونو گومان بردن بەوەی کە ئەو کردەوەیە سوودو بەرژەوەندی تێدایە، ئەم هەڵنەرو هاندەرە خۆی لە خۆیدا عەینی جوان کردنو شیرین کردنەکەیە؛ جا کە پەیدا کوننەدەی ئەم هەڵنەرو هاندەرە خودا بێ، دیارە ئەو کەسەی کردەوەکە لە پێش چاو جوان دەکاو لە دڵدا شیرینی دەکا خودای پەروەردگارە... ئەی ئەوە نییە پەروەردگار بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَالَهُمْ – النمل/٤﴾. موعتەزیلەکان دەڵێن: ئەو جوانکەرو شیرنکەرە بۆ کردەوەکان شەیتانە؛ ئەو شەیتانەی سوێندی خواردو وتی: ﴿لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بەهەرحاڵ ئاشکراو نمایانە ئەم رایەی موعتەزیلەکان رایەکی بێ هێزەو دژ بە ظاهیری قورئانە، چونکە قورئان بە ئاشکراو بە روونی ئەوەی راگەیاندووە: کە ئەو کەسەی کردەوەکە لە پێش چاو جوان دەکاو لە دڵدا شیرینی دەکا خودا خۆیەتی کەسی تر نییە.

## سەرڕەقی موشریکەکانو داواکردنیان بۆ پێغەمبەرایەتی

﴿ وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾.

پاش ئەوەی یەزدانی مەزن سوننەتی خۆی لە کۆمەڵگای ئادەمیزاددا روون کردەوە بەوەی کە لە هەموو کاتو شوێنێکدا لە هەموو شارو نیشتەمەنییەکدا کۆمەڵێك دەست رۆیشتوو خاوەن دەسەڵاتی تاوانبار هەن بەرەنگاری بانگەوازی پێغەمبەران دەکەن؛ ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەم دیاردەی سوننەتی خودایە لە سەرانی قورەیشیشدا هەیە، ئەوەتا گەورەکانی مەککە فێڵو تەڵەکەبازیو حەسوودیان پاڵی پێوە ناون کە هەڵوێست وەربگرن، هەرکاتێ موعجیزەیەك بێتە دیو راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد بچەسپێنێ پشت هەڵدەکەنو دڵێن ئیمان ناهێنین تا هەمان پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی نەدرێ بە ئێمەش... قورطوبی دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی وەلیدی کوڕی موغیرە هاتۆتە خوارێ کە گوتی: ئەگەر پێغەمبەرایەتی راست بووایە دەبوایە بدرێ بە من چونکە من لە موحەممەد شیاوترم بۆ ئەم پلەو پایەیە، من لە ئەو بەتەمەنترم کوڕو کەسو کارو ماڵو سامانیشم لەو زۆرترە.[1]

جا دەربارەی سەرکێشیو سەرڕەقی ئەو جۆرە کەسانە پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَاءتْهُمْ آيَةٌ قَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّى نُؤْتَى مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللّهِ اللّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾. ئەگەر بۆ سەر ئەو موشریکانە

[1] - تفسير القرطبي ج ٧/٨٠.

نیـشانەیەکی ئاشـکراو بەڵگەیـەکی بـەهێزیان لـە قورئانـدا بـۆ بـێ، راسـتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) بچەسپێنێ، یەکتاپەرستیو هیدایەتی تێدا بێ، راستگۆیی پێغەمبەر لە گەیاندنی پەیامەکەیدا دووپات بکاتەوە، لـە جیـاتی ئـەوەی یەکـسەر بـڕوای پـێ بکـەن، لـە رووی حەسـوودیو سـەرڕەقیو لووتبـەرزیو لـە خۆبـایی بوونـەوە، هـەروەها لـەو روانگـەوە کـە پێیـان وایـە: پێغەمبەرایـەتی پلـەو پایەیـەکی دونیاییـە، دەڵـێن: ئێمـە بـڕوا ناکـەینو ئیمـان ناهێنین، هەتا ئێمەیش وەکوو موحەممەد پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیمان نەدرێتێ، مـوعجیزەو نیشانەی کـەونی لەسـەر دەسـتمان دیـاری نـەدەن؛ واتـە: دەبـێ وەکـوو پێغەمبەرانی پێشوو موعجیزەمان لەسەر دەست دەربکەوێ وەك لێك جیابوونەوەی ئاوی دەریا بۆ مووسا، چاك کردنـەوەی لاڵو بەڵـەكو زیندووکردنـەوەی مـردوو بـۆ عیسا.

ئیبنو کەثیر دەڵێ ماناکە بەم جۆرەیـە: هـەتا فریـشتە نەیەتـە لامـانو پـەیامی پێغەمبەرایەتیمان بۆ نەهێنێ ئیمان ناهێنینو وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ أَوْ نَرَى رَبَّنَا – الفرقان/٢١﴾.

لەمـەوە ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێ کـە موشـریکەکانی مەککـە تـەمای ئـەوەیان هەبوو، کە لـە پلـەو پایـەی پێغەمبەرایـەتی بـدرێ بـە هەنـدێکیان؛ وەکوو قورئـان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا: لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ، أَهُـمْ يَقْـسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ – الزخرف/٣١ – ٣٢﴾. مەبەست بە (القريتين) مەککەو طائیفـە. لـە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿بَـلْ يُرِيـدُ كُـلُّ امْـرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَى صُـحُفًا مُّنَـشَّرَةً – المدثر/٥٢﴾.

بەکورتی کافرەکانی مەککە ئەوە رادەگەیەنن کە ئەوان بڕوا بە پێغەمبەرایەتی محمد ناکەن مەگەر بـۆ خۆیـان هـەمان پلـەو پایـەی پێغەمبەرایـەتییان پـێ بـدرێ. ئـیتر پـەروەردگار بـە تونـدی رەدی دانـەوەو بیروبۆچـوونی هەڵـەو بـێ بناغـەیانی ئاشکرا کردوو فەرمووی: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ واتـە: خـودا باشـتر دەزانـێ پلـەو پایـەی پێغەمبەرایـەتی بـەکێ دەبەخـشێو کـێ شـیاوی ئـەو رێـز لێنانەیـە. پێغەمبەرایەتی پلەو پایەیەکی ئاینیە مەرجو پێویستیاتی تایبـەتی خـۆی هەیـە،

فەضڵو بەخششێکە لە خوداوە دەدرێ بەو بەندانەی کە بۆ ئەو ئەرکە هەڵیان دەبژێرێ، پلەو پایەیەك نیە بە تێکۆشانو ماندوبوون پەیدا بکرێ؛ یان بە هۆی رەگەزو بنەماڵەوە بدرێ، یان بەهۆی شتە تایبەتمەندیە دونیاییەکانی رواڵەتی وەکوو ماڵداریو هەبوونی کەسو کارو منداڵی زۆرو سەرۆکایەتی هۆزو نەتەوە بە ئینسان بدرێ، بەڵکوو پێغەمبەرایەتی پلەو پایەیەکە دەبەخشرێت بە کەسێك کە سروشتی خاوێن بێ، دڵو دەروونی صافو بێ گەرد بێ، گیانی پاك بێ، ژیاننامەو رابردووی بێ عەیبو خەوش بێ، خێر خۆشەویستو حەقخوازبێ، ئەوانە نەفامو نەزانن، نازانن کە پێغەمبەرایەتی ئەرکێکی گەورەو سامناکە، ئەمرێکی کەونیە کە ئیرادەی ئەزەلو ئەبەد پەیوەست دەبێ بەجەموجووڵی بەندەیەك لە بەندەکانی خوداوە، عالەمی باڵای بەرفراوان پەیوەست دەبێ بە جیهانی ئادەمیزادی سنووردارەوە، لە رێگەی پێغەمبەرایەتییەوە ئاسمان بە زەوییەوە پەیوەندی دەکا، دنیای تێدا دەلکێ بە قیامەتەوە، حەقیقەتی کوللیو رەها لە دڵی ئادەمیزادێکدا نومایان دەبێ، لە واقیعی خەڵكو لە جەمو جووڵی مێژوودا رەنگ دەداتەوە، ئادەمیزاد لە ئادەمیزادیەتی خۆی رووت دەبێ بۆ ئەوەی بۆ خودا بصوڵحێ، نەك تەنها نیەت پاکیو کردەوەی خالصی بەڵکوو پێویستە ئەو شوێنەی کە ئەم ئەرکە گرینگەی تێ دەچێ پاڵفتەو خاڵص بێ، چونکە لە ئەرکی پێغەمبەرایەتیدا خودی پێغەمبەر خۆی پەیوەست دەبێ بەو زاتە حەقە پاکەوە! هەڵبەتە کاتێك پەیوەست دەبێ کە زاتی ئەو پێغەمبەرە ئامادەباشی تێدا بێ بۆ وەرگرتنی راستەوخۆ بەبێ لەمپەرو بەربەست، هەر خودا بۆخۆی دەزانێ کێ بۆ ئەم ئەرکە گرنگە زۆر گرنگە دیاری دەکاو لە ناو هەزاران ملیۆن ئادەمیزاددا هەڵی دەبژێرێو نیگای بۆ دەکاو دەفەرموێ تۆ بۆ ئەم ئەرکە گرنگە دیاری کراوی!! ئەوانەی کە چاوەڕوانی ئەوەن ئەم پلەو پایەیان بدرێتێ یان داوا دەکەن بیاندرێتێ؟؛ وەکوو پێغەمبەران فریشتە بێنە لایانو نیگایان بۆ بێنێ ئەوانە لە سروشتێکن کە ناگونجێن بۆ ئەم ئەرکە[1]

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند ئاراستەی ئەوانە دەکا؛ کە لە ئیمان هێنان دوا دەکەونو بڕوا بە بانگەوازی پێغەمبەر ناکەنو، دەفەرموێ: ﴿سَيُصِيبُ الَّذِينَ

---

[1] – ئەمە بە دەست لێدانەوە لە (في ظلال القران ج ٣٧٨/٣) وەرگیراوە.

﴿أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ اللّهِ﴾ لەوە بەولاوە سوکايەتیو زەليلی تووشی ئەو تاوانبارانە دەبیّ، بۆ هەتا هەتايیّ لە ناو ئەو ريسوايیو سوکايەتييەدا دەمێننەوە ﴿وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ﴾ هەروەها سزای بە ئێشيان دەدریّ لە تۆڵەی ئەو هەموو فرتو فێڵو پيلان دارِشتنەو سزای ئەوەی کە لووتبەرزييان کرد لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرانو گەردن کەچ نەبوون بۆ پەيرِەوکردنی پەيامەکەيان، بۆيە لە تۆڵەی ئەو لووتبەرزیو خۆبەزلزانييەيان زەليلو ريسوايان دەکەين.

وەکوو لە ئايەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ – غافر/٦٠﴾.

جا چونکە فرتو فێڵو پيلان دارِشتن زۆربەی کات بە پەنامەکیو نهێنیو قورتو پێچ هێنانە بەر شت ئەنجام دەدریّ، بۆيە سزاکەيان سزايەکی توندو بە ئێشە لە رۆژی قيامەتدا هەر بۆيەشە دەفەرموێ: ﴿وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ﴾ لە تۆڵەی ئەو مەکرو فێڵو تەڵەکەبازييەياندا سزای بە ئێشيان لەلايەن خودا بەسەردا دەدریّو پراوپرِ تۆڵەيان لیّ دەسێندرێتەوە...﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا – الكهف/٤٩﴾.

مەبەست لە سزادانيان لەلايەن خودا ئەوەيە: ئەو سزايە برِيارو دادوەری خودا داخوازيەتیو لە ئەزەلدا چەنديەتو چۆنيەتی دياری کراوە.

## دابو نەريتی خودا دەربارەی ئەوانەی ئامادەباشيان تێدايە بۆ برِواهێنانو ئەوانەی ئامادە نين موسوڵمان بنو پاداشتی هەردوو لايان

﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا

يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾ .

ئـەم ئایەتانـەش پەرەپێـدەرو تەواوکـەری موناقەشـەکردنی هەڵوێـستی موشـریکەکان، ڕەتدانـەوەو بۆڕدانیانـە، پوچـەڵ کردنـەوەو بـە پاشـدا بردنـەوەی بەڵگەو دەلیلەکانیانە، مەسەلەکە دەبڕێنێتەوەو ئەوە دیاری دەکا: کە ئـەوان ئیمان ناهێننو ئامادەباشـیان تێدا نیـە بـۆ وەرگرتنـی؛ وەکوو چـۆن لـە ئایـەتی پێـشوودا ئەوەی ڕاگەیاند؛ کە ئەوان شیاوی پلەی پێغەمبەرایەتی نین... لێرەشـدا ڕاسـتەوخۆ پێیان دەڵێ: ڕێبازی حەقو ڕاست بۆ هەموو کەسێکی خاوەن عەقڵو هۆش ئاشکراو نومایانە، کەسێك وەری بگرێو پەیڕەوی بکا، بەهەشتی دەدرێتێ، کەسێکیش پشتی تـێ بکـاو ڕووی لێ وەربگێـڕێ بـە ئـاگری دۆزەخ سـزای دەدرێ، کاروبـار هـەمووی بەدەست خودایە، بۆ خۆی لە بەندەکانی بێ منەتو بێ باکە، بە موسـوڵمان بـوونی هەموو ئـادەمیزاد خودایـەتی ئـەو زیـاد ناکـا، ئەگـەر هەمووشـیان پـشت لـە ئیـسلام هەڵکەنو بە موشریکی بمێننەوە لە خودایەتیی کەم ناکا!

جا ﴿فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ﴾ کەسێك خودا بیەوێ تۆفیقی بدا بۆ ڕێگای حەق‌و خێرو موسوڵمان بوون؛ کەسێك بە ویستی خودا شیاوی ئەوە بێ کە بانگەوازی قورئان وەربگرێ، ئەوە خودا دڵی بە نوورو رووناکی خۆی دەکاتەوەو ئایینی پیرۆزی ئیسلامی تێدا جێگیر دەبێ‌و یارمەتی دەدرێ بۆ وەرگرتن‌و گەشەسەندنی بیروباوەڕ لە دەروونیدا، پەروەردگار دڵی دەکاتەوەو ئیمانی لەلا خۆشەویست دەکاو ئارامیی پێ دەگرێ، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَى نُورٍ مِّن رَّبِّهِ – الزمر/٢٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ – الحجرات/٧﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: واتە: دڵی فراوان دەکا بۆ یەکتاپەرستی‌و ئیمان بە تاك‌و تەنهایی خودا.

عەبدولڕەزاق لە ئەبو جەعفەرەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەربارەی مانای ئەم ئایەتە پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن پەروەردگار دڵی ئەو کەسە گوشاد دەکاو فراوانی دەکا؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نور يقذف فيه فينشرح له وينفسح) وتیان باشە، ئەم دڵ فراوان بوونە نیشانەیەکی هەیە مرۆڤ پێی بزانێ؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی نیشانەکانی ئەمانەن: «الإِنَابَةُ إِلى دارِ الْخُلُودِ وَالتَجَافِي عَنْ دارِ الْغُرُورِ وَالْإِسْتِعْدَادُ لِلْمَوتِ قَبْلَ نُزُولِ الْمَوْتِ».

تێفڕدانی ئەم نوورو رووناکیە دەبێ لە شوێنی خۆیدا بێ، بخرێتە دەروونێکەوە سروشت پاك بێ، ئامادەباشی تێدا بێ بۆ خێرو چاکەو ئارەزووی شوێنکەوتنی حەقی هەبێ.

﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء﴾ کەسێك بەهۆی شەریك بۆ خودا دانانەوە سروشتی پیس بووبێ بە تاوان دڵ‌و دەروونی پیس بووبێ خودا بیەوێ ڕێگای لێ گوم بکا، وای لێ دەکا سینگی تەنگ بێ، ئیمانی تێ نەچێ، ئەو تەنگییە ناهێڵێ خێرو چاکە ڕوو لە دڵ‌و دەروونی بکا، نموونەی ئەو کەسە وەکوو کەسێك وایە کە بەرەو حەوا بەرز ببێتەوە هەست دەکا بە تەنگەنەفەسی‌و هەناسە سواری؛ دەڵێی کارێکی لە توانا بەدەر ئەنجام دەدا، چونکە

بەرز بوونەوەی بەرەو حەوا كارێكی لە توانا بەدەرەو ئادەمیزاد بە وزەی خۆی ناتوانێ ئەنجامی بداو بە ڕواڵەت نموونەی ئیشە مەحاڵەكانە! جا پەروەردگار ئاواو بەوجۆرە سینگی ئەوانەی دەیەوێ گومرایان بكا تەنگ دەكا.

﴿كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ هەر بەو جۆرەش شەیتان دەست رۆیشتوو دەكا بەسەر ئەو جۆرە كەسانەو هەموو كەسێكی تر كە بڕوای بە خوداو پێغەمبەر نەبێ! ئیتر شەیتان زەفەری پێ دەباو گومڕایی دەكاو لە ڕێگای حەق لای دەداو سەرگەردان دەبێ!

وشەی ﴿الرِّجْسَ﴾ وەكوو موجاهید دەڵێ: هەر شتێك كە خێری تێدا نەبێ! زومەخشەری دەڵێ: بەمانا ریسواكردنو تۆفیق نەدان دێ.

﴿وَهَذَا﴾ ئەم ئایینی ئیسلامەی كە خودا دڵی هەندێ لە بەندەكانی بۆ گوشاد دەكا ﴿صِرَاطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا﴾ ڕێبازی خودا پەسەندە، ئەو ڕێبازەیە كە خودا بۆ بەندەكانی پەسەندی كردووە، ڕێبازێكی راستو دروستو بێ قۆرتو پێچە، چونكە ڕێبازی خودایە، ڕێبازی خوداش نابێ خوارو خێچی تێدا بێ، ڕێبازەكانی تر خوارو نارێكو پێكن. ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذی فەرموودەیەكی پێغەمبەریان ڕیوایەت كردووە كە دەربارەی قورئان فەرموویەتی: «هُوَ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، وَحَبْلُ اللّهِ الْمَتِينُ، وَهُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ وَالنُّورُ الْمُبِينُ». قورئان كە پرۆگرامی ئایینی ئیسلامە، ڕێگای راستی بێ قۆرتو پێچە، حەبلی قایمو پتەوی پەروەردگارە، كەسێ دەستی پێوە بگرێ لە گێژاوی گومڕایی رزگاری بووە، قورئان یادخەرەوەیەكی حەكیمو دانایە رووناكییەكی ئاشكراو نومایانە.

﴿قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ بێگومان ئایەتەكانی قورئانمان شی كردوونەوەو روونمان كردوونەوە بۆ كەسانێك كە بیر لەو پەیامە بكەنەوە كە پێیان گەیشتووە، بۆ هەموو كاروبارێك پەنای بۆ بەرنو بیكەنە بەرنامەی ژیانیان، بەمەش زێدەتر دڵنیا دەبن، بیروباوەڕیان پتەوتر دەبێ، وەكوو زیاتر پەند ئامێز دەبنو گەردنكەچییان بۆ پەروەردگارو كردەوەی چاكیان زیاتر لە هەڵسو كەوتیاندا رەنگ دەداتەوە.

﴿لَهُمْ دَارُ السَّلاَمِ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ هەیە بۆ ئەو کەسانەی پابەندی ڕێبازی راستی خودان، مەنزڵگای ئاشتیو ئارامیو دڵنیایی لە بەهەشتدا لای پەروەردگاری خۆیان ﴿وَهُوَ وَلِيُّهُمْ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ خودا بۆخۆی چاودێرو سەرپەرشتیاریانە، لە پاداشتی ئەو کردەوە چاکانەی لە دونیادا ئەنجامیان داون.

﴿وَيَوْمَ يِحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ ئەی محمد! یادی ئەو چیرۆكو ڕووداوانە بکەرەوە کە بۆتی دەگێڕینەوە، ئەو خەڵکە بترسێنە لە ڕۆژێك کە پەروەردگار هەموو ئادەمیزادو جنۆکەو شەیاتینی لە دەشتی مەحشەردا کۆ دەکاتەوە، ئەمجار خیطابیان ئاڕاستە دەکەینو دەڵێین: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُم مِّنَ الإِنسِ﴾ ئەی گرۆهی شەیاتینیو جنۆکە! ئێوە زۆرتان لە ئادەمیزاد گومڕا کردو سەرتان لێ تێکدانو سەرگەردان بوون! ﴿وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ الإِنسِ﴾ ئەو ئادەمیزادانەی کە بە گوێی شەیتانەکانیان کردووەو بە قسەی ئەوان هەڵخەڵەتاون وەڵامی پەروەردگار دەدەنەوەو دەڵێن: ﴿رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ﴾ ئەی پەروەردگار! هەر یەکێك لە ئێمەو جنۆکەکان سوودمان لە یەکتر بینیوە؛ ئادەمیزادەکان سوودیان لە جنۆکە بینیوە، لەم ڕووەوە کە جنۆکەکان ئادەمیزادەکانیان شارەزا کردووە بۆ ڕێگای گومڕاییو ڕابواردنو ئارەزووبازیی، جنۆکەکانیش سوودیان لە ئادەمیزادەکان وەرگرتووە لەم ڕووەوە بە قسەیان کردوونو یارمەتییان داون بگەن بە مرازی خۆیان کە گومڕایی کردنی ئادەمیزادەکانە ﴿وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِيَ أَجَّلْتَ لَنَا﴾ گەیشتینە ئەو ماوەیەی بۆت دیاری کردبووین کە مردنە، یان ڕۆژی زیندوبوونەوەیە! ئەم وەڵامەی ئادەمیزاد ئیعتیرافو دان پێدانانە بەوەی کە ئەوا گوێبیستی شەیاتینییەکان بوون، شوێن فەرمانو ڕەفتاریان کەوتوونو خوداو پێغەمبەرو زیندوبوونەوەیان بە درۆ زانیوە. واتە: مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە: کە ئێمە لەم ڕۆژە سامناکەدا کە ڕۆژی زیندوبوونەوەو تۆڵەو پاداشە، دان بە تاوانەکانماندا دەنێین، ئەی خودایە! حوکمو بڕیاری خۆت چییە دەربارەمان ئەنجامی بدە، چیمان لێ دەکەی لێمان بکە، تۆ لە هەموو دادوەرێك دادوەر تری، ئێمە ئێستا پەشیمان بووینەوە، پەنجەی پەشیمانی دەگەزینو هیچ دەرەتانو پەنایەکمان نیە!!

ئەمجار پەروەردگار وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئاگری دۆزەخ جێگای ئێوەو ئەوانەشە کە گومڕایان کردوون و ڕێگایان لێ تێک داون بۆ هەتا هەتایێ تێیدا دەمێننەوە لێی دەرناچن مەگەر خودا حەز بکاو بیەوێ لە شوێنێکەوە بگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی تر، بۆ خواردنەوەی ئاوی کوڵاو تر، یان گواستنەوەیان لە ئاگری دۆزەخەوە بۆ سزای زەمهەریر، لە هەردوو حاڵەکەدا گواستنەوەیە لە سزایەکەوە بۆ سزایەکی ترو ڕزگار بوونیان لە سزا نایەتە دی.

ڕیوایەت کراوە دەڵێن: ئەوانەی دەخزێندرێنە دۆڵێکەوە زەمهەریرەکەی ئەوەندە توندو بە هێزە کە ڕەگو دەماریان لێك جودا دەکاتەوە، ئەمجار هاوار دەکەن کە بیان گوازنەوە بۆ دۆزەخ چونکە سزای ئەوێیان توندترە! ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خودای تۆ حەکیم و دانایە لە پاداشت دانەوەی بەندەکانیداو دەزانێ کێ شیاوی چیەو چ سزایەك هەڵدەگرێ!

تێبینی: ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئایەتی ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ ... الآية﴾یان کردووە بەبەڵگە لەسەر بۆچوونی خۆیان، دەڵێن: هیدایەت و گومڕایی لە خوداوەیە؛ واتە: پەروەردگار بەدییان دەهێنێ، بەم مانایە ئادەمیزاد دەتوانێ ئیمان بهێنێ و، دەتوانێ کافر ببێ، توانای ئادەمیزاد بەنیسبەت ئەم دوو لایەنەوە وەکوو یەك وان، بەڵام تواناکەی پابەندە بە هەبوونی هەڵنەرو هاندەرێك لە ناخدا، دەبێت بانگەوازیکەرێك هەبێ لە دڵدا بانگەوازی بکا، یان بۆ بڕوا هێنان یان بۆ کافر بوون، ئەو هەڵنەرو هاندەرو بانگەوازیکەرە، پەی بردنە، یان زانینە، یان گومان بردنە، بەوەی کە ئەو کردەوەی دەیکا بەرژەوەندی تێدایە یان زیان، جا ئەگەر لە دڵیدا ئارەزووی بەرژەوەندی و سوود پەیدا بوو، ئەوە ئیشەکە دەکا، ئەگەر لە دڵیدا ئارەزووی زیان و فەساد پەیدا بوو، وازی لێ دێنێ، دەی پەیدا بوونی ئەم حەزو ئارەزوویانە، ئەم هاندەرو بانگەوازیکەرانە، هەر بەدەست خودایە، تێکڕای توانای ئادەمیزادو هاندەرو پاڵنەرە خوداییەکان کردەوە کە دەیهێننە دی.

کەوابێ ئادەمیزاد ئیماندار نابێ مەگەر خودا لە دڵیدا ئەوە بڕسکێنێ کە ئیمان سوودبەخشەو بەرژەوەندی تێدایە، واتە: قەناعەتی زاتی لا پەیدا ببێ، کە ئەو بارە سوودی هەیە بۆی، هەرکاتێك لە دڵدا ئەم بڕوایە دروست بوو، ئیتر دڵ حەزی لێ

دەکـاو هـەوڵی وەدیهێنـانی دەدا، ئەمـەش خـۆی لـە خۆیـدا گوشـاد بـوونی دڵو دەروونەو سینگ فراوان بوونە! کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (انشراح الصدر).

## دەسەڵاتی ستەمکاران بە هەندێکی تریانداو سەرزەنشت کردنی کافران لە ئیمان نەهێنانیان

﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾﴾.

لـەوەپێش پـەروەردگار ئـەوەی روونکـردەوە کـە ئـادەمیزادو جنۆکـە برێکیـان دۆسـتو خۆشەویـستی یـەکترینو سەرپەرشـتیاری یـەکتری دەکـەنو یـەکتر هەڵدەخەڵەتێننو رێگا لە یەکتری تێك دەدەن، ئەمجار ئەوە روون دەکاتـەوە کـە بـە هەمان شێوەش برێ ستەمکارمان کردووە بە سەرپەرشتیارو یارمەتیدەری هەنـدێ ستـەمکاری تـرو دۆستایەتیو پەیوەنـدیان بەیەکەوە بەستووە وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ وەکوو چۆن ئـادەمیزادو جنۆکە هەندێکیانو دۆستو سەرپەرشتیاری یەکترین برێ ستەمکاریشمان کـردووە

بە دۆستو سەرپەرشتیاری هەندێ ستەمکاری تر؛ یارمەتی یەکتری دەکەن، بە گوێرەی نەخشەو سوننەتی یەزدانی لە بوونەوەردا ستەمکاران هەندێکیان کۆمەکی بە هەندێکیان دەکەن، هەروەکوو چۆن هەندێ موسوڵمان پشتگیری یەکتری دەکەن لە روانگەی ئەو کردەوانەیانەوە کە ئەنجامی دەدەن... وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – التوبة/٧١﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – الأنفال/٧٣﴾.

قەتادە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: پەروەردگار کە ئادەمیزاد دەکاتە دۆستو سەرپەرشتیاری یەکتری لە رێگای کردەوەکانیانەوە دەیانکاتە وەلیو یارمەتیدەری یەکتری، کەوابوو موسوڵمان لە هەر شوێنێ بن، دۆستو یارمەتیدەری یەکترن، ئیمانداریش بە تەمەنناو هیواخوازی یان بە رێشو جلو بەرگو سەرو سیما نیە، ئیمان لە دڵدایەو کردەوە نیشانەیەتی.

ئەبو شەیخ کوڕی ئەبو حەییان لە مەنصووری کوڕی ئەلئەسوەدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیارم لە ئەعمەش کرد دەربارەی ئەم ئایەتە وتم: چی لێ دەزانی؟ وتی: زانایانی ئیسلام لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا وتوویانە: هەر کاتێ کۆمەڵ خراپ بوو، خراپەکانیان دەبنە گەورەیان، فەرمانڕەوایی و پاشایەتی دەدرێ بە خراپەکانیان! ئەمەش دەبێتە هۆی لە ناوچوونی کۆمەڵو نەتەوە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا – الإسراء/١٦﴾.

دۆستایەتی و هاریکاری و سەرپەرشتیاری ستەمکاران بۆ یەکتری بەم جۆرە دەبێ کە یەکتریان خۆشبوێ یارمەتی یەکتری بدەن، یان هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا دەبنە کاربەدەستو فەرمانڕەوا، هیچ ستەمکارێك نیە بەبێ ئەوەی زەواڵێکی نەبێ، واتە: هەموو زاڵمێك زەواڵێکی هەیە، ستەمکاریش ئەوانە دەگرێتەوە کە ستەم لە خۆیان دەکەن، هەرکەسێك دەبێتە فەرمانڕەواو کاربەدەستی کۆمەڵێك لە کردەوەو رەوشتدا لەوان دەچێ، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: هەرکاتێ خودا لە گەلو نەتەوەیەك رازی بوو پیاوە باشەکانیان دەکاتە گەورەو لێپرسراویان، لە هەر گەلو

نەتەوەیەکیش نارازیی بوو خراپەکانیان دەکاتە گەورەو فەرمانڕەواو کاربەدەستیان!

بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندە لە هەموو ستەمکارێك کە کاروباری خەڵکی دەکەوێتە ژێر دەست.

ئەمجار پەروەردگار درێژە بە هەڕەشەکانی دەدا، کافرو خوانەناسانی ئادەمیزادو جنۆکە دەترسێنێو حاڵو چۆنیەتی ڕۆژی قیامەتیان ئاشکرا دەکا، پرسیاریان لێ دەکاو بۆ خۆشی باشتر لەوان وەڵامی پرسیارەکە دەزانێو ئاگای لێیەتی؛ دەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا﴾ ئەی گرۆهی جنۆکەو ئادەمیزاد! ئایا پێغەمبەران لە خۆتان نەهاتنە ناوتان؟ ئاشکرایە پێغەمبەران هەر لە ڕەگەزی ئادەمیزاد دەبن، لە جنۆکە پێغەمبەر نابن!

جەماوەری سەلەفو خەلەفی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەمە کۆکن کەوابێ لە وشەی ﴿مِّنكُمْ﴾دا تەغلیب بەرچاو گیراوە.

دەتوانرێ بگوترێ مەبەست بە پێغەمبەری ئادەمیزاد ئەو پێغەمبەرانەن کە ناویان لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)دا هاتووە، مەبەست بە پێغەمبەری جنۆکە ئەو جنۆکانە بن کە گوێیان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگرتو دوایی دەچوونەوە بۆ ناو گەلو نەتەوەکانیان دەیانترساندنو ئامۆژگارییان دەکردنو پەیامی پێغەمبەری ئیسلامیان پێ ڕادەگەیاندن!! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ – الأحقاف/٢٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا – الجن/١﴾.

کاری ئەو پێغەمبەرانە بریتییە لەوە ئایاتی ئیمانو ئەحکامو ئەخلاقو ڕەوشت بەسەر گەلەکانیاندا دەخوێننەوەو لە ڕوداوو حیسابو لێکۆڵینەوەی ڕۆژی حەشر دەیانترسێننو هەڵیان دەنێن کە پابەندی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی پەروەردگار بن.

جا لە وەڵامی ئەم پرسیارو سەرزەنشتو لۆمە کردنەدا ﴿قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَى أَنفُسِنَا﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا لە حوزووری پەروەردگاردا دەڵێن: بەڵێ شایەتی دەدەین کە پێغەمبەران هاتوونە لامان پەیامی پەروەردگاریان پێ ڕاگەیاندووین، لەم ڕۆژەیان ترساندووینو پێیان ڕاگەیاندووین کە ئەم ڕۆژەمان دێتە ڕێ، بەڵام ئێمە بە درۆمان خستوونەتەوەو بڕوامان پێ نەکردوون، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ – الملك/٩﴾.

ئەوانە بەدەستی خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە سەریان لە خۆیان تێك داوە ﴿وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَافِرِينَ﴾ خۆشەویستی ژیانی دونیاو جوانی ئامێرەکانی ژیانو شەهوەتو ئارەزووبازییو ماڵو سامانو منداڵو خزمو کەسو کار ئارەزووی پلەو پایەی شانو شەوکەت؛ ئەوانی هەڵخەڵەتاندووەو سەرگەردان بوون، زێدەڕۆوییان لە هەڵەوگێر بوون بە ژیانەوە کردووە، بەهۆی بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرانیانو ئینکاری کردنی موعجیزەکانیان بەفەتارە چوونو خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون، بەدبەختو چارەڕەش کەوتوون، لە قیامەتدا بۆخۆیان شایەدی لە خۆیان دەدەن کە کافرو خوانەناس بوونو لە جیهاندا پابەندی فەرمانو ئامۆژگاری پێغەمبەرانیان نەبوون.

﴿ذَلِكَ﴾ ئەم ناردنی پێغەمبەرانەو هەوڵدانیان بۆ شارەزا کردنی ئادەمیزادو ناردنە خوارەوەی نامەی ئاسمانی بۆ سەر پێغەمبەرەکان بەهۆی ئەوەوەیە ﴿أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ﴾ کە سوننەتو دابو نەریتی خودا وەهایە: هیچ کەسێك سزا نادات تا بانگەوازی حەقی پێ ڕانەگەیەنێ، هیچ گەلو نەتەوەیەك ڕیشەکێش ناکا تا پێغەمبەر نەنێرێتە سەریانو بانگەوازیان پێ ڕانەگەیەنێو سەرپێچی نەکەن! گەلو نەتەوەی بێ ئاگاو پەیام پێ نەگەیشتوو سزا نادا، لە ناویان نابا، بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەرو ترسێنەری ناردووە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خلَا فِيهَا نَذِيرٌ – فاطر/٢٤﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ – النحل/٣٦﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً – الإسراء/١٥﴾.

که دهفهرموێ: (ظلم) دوو مانا ههڵدهگرێ:

١- (ظلم) به مانا (شرك) بێ واته: خودا کهس به هۆی (شريك) بۆ خودا دانان له نهخافڵ نافهوتێنێ، تا ئاگاداريان نهکاتهوهو به هيلاکيان نابا.

٢- به هيلاك بردنهکه به ستهمکاریو ناههقی نيه بهبێ ئاگادارکردنهوهو ناردنی پێغهمبهرو بێ ڕاگهياندن ئهنجام نادرێ!

بهکورتی خودا ستهم له هيچ کامێك له بهندهکانی ناکا، بهڵام ئادهميزاد بۆخۆيان ستهم له خۆيان دهکهنو تاوانهکه له خۆيانه!! بهڵکوو ههر بهڵاو تهنگانهو ناخۆشييهك تووشی خهڵك بووه يان تووشيان دهبێ لهبهر کرداری خراپی خۆيانهو سزای وازهێنانيان له ئايينه، عهيبو نهنگييهکه له خۆيانه، نهك له ياساو شهريعهتی خودا دايه!

﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ بۆ ههموو خاوهن کردهوهيهك – خودا پهرستی يان سهرپێچی کردن – پلهو ئهندازهيهك ههيه، خودا دهيگهيهنێته ئهو پلهو پايهی سزاو تۆڵهی لهسهر دهداتهوه، چاکه به چاکهو خراپه به خراپه! پهروهردگار ئاگادارو زانايه به ههموو کردهوهيهك، هيچ کردهوهيهك نيه خودا پێی نهزانێو ئاگاداری نهبێ، بهڵکوو ههموو کرداو گوفتارێك سهرژمێر دهکاو دهينووسێو بۆيان تۆمار دهکا، بۆ ئهوهی له ڕۆژی خۆيدا تۆڵهو پاداشتيان لهسهر بداتهوه، لهکاتی گهڕانهوهو تۆڵهو لێکۆڵينهوهدا پاداشتو سزای خۆيان وهربگرنهوه.

## ههڕهشه له کافران به ڕيشهکێش کردنيانو ترساندنيان به سزای دۆزهخ

﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأَتٍ

وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ .

پاش ئەوە پەروەردگار پاداشتی چاکەکاران‌و سزای تاوانبارانی ڕاگەیاند، باسی ئەوەشی کرد، کە هەموو کەسێك، هەر گەل‌و نەتەوەیەك پلەو پایەی خۆی هەیە لە بارەی تاعەت‌و لە بارەی سەرپێچی کردنەوە، ئەمجار ئەوە ڕوون دەکاتەوە: کە پەروەردگار چ پێویستی بە تاعەتی بەندەکانی نیە، بە بەندایەتی کردنیان بۆ خودا خودایەتی زیاد نابێ، هەروەکوو چۆن تاوانباری تاوانباران لە خودایەتی ئەو کەم ناکاتەوە، چونکە پەروەردگار بە زاتی پاکی خۆی ئاتاجی بە کەس نیە، بەڵام خاوەنی ڕەحمەت‌و بەزەیی گشتیە، دەتوانێ ئێوە لەناو بەرێ، گەل‌و نەتەوەیەکی تر بێنێتە کایەوە! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَرَبُّكَ الْغَنِيُّ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ ئەی محمد! خودای تۆ لە هەموو دروست کراوانی بێ ئاتاجە، لە هەموو ڕوویەکەوە، بەندایەتی کردنیان بۆی لە خودایەتی ئەو زیاد ناکا، کافر بوون‌و سەرپێچی کردنیان لە فەرمانەکانی زیان بە خودایەتییەکەی ناگەیەنێ! بەندەکانی لە هەموو حاڵ‌و وەزعێکدا پێویستییان بە خودا هەیە، سەرباری ئەوەش ڕەحمەتی خودا بۆ بەندەکانی گشتی‌و فراوانەو هەموو کەس دەگرێتەوە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – الحج/٦٥﴾ دەربارەی بێ ئاتاجیشی فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاء إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ – الفاطر/١٥﴾. ڕستەی ﴿وَرَبُّكَ الْغَنِيُّ ذُو الرَّحْمَةِ﴾ کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ، واتە: جگە لە خودا کەس دەوڵەمەند نیە، بەزەیی‌و ڕەحمەت هەر لە ئەوەوەیە، جگە لە خودا شتەکانی تر مومکینن‌و خاوەن ئاتاجن، کەوابێ ئەوەمان بۆ دەچەسپێ کە جگە لە خودا هیچ کەسێك‌و هیچ شتێك بێ ئاتاج نیە، ڕەحمەت‌و بەزەیی هەر لە خوداوەیە، هەموو بوونەوەر بۆ بوون‌و بەرقەرار بوون پێویستیان بە خودا هەیە.

﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِن بَعْدِكُم مَّا يَشَاءُ كَمَا أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ آخَرِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی کافرو خودانەناس! باش بزانن‌و دڵنیا بن ئەگەر خودا بیەوێ لە ناوتان دەباو دەتانفەوتێنێ وەکوو چۆن لەوەپێش سەرپێچیکاران‌و دژ بە پێغەمبەرانی لە ناو بردوون‌و فەوتاندوونی؛ وەکوو نەتەوەی عادو ثەموودو نەتەوەی صالح‌و هۆزی لوطو هۆزی توببەع...هتد.

ئەگەر خودا بیەوێ ئێوەی کافرو خودانەناس، موشریك دانیشتووی مەککەو دەورووبەری لە ناو دەباو ڕەگەزو چین‌و توێژێکی تر دێنێتە کایەوە، لە ئێوە باشترو فەرنابەردار تر! پەروەردگار دەتوانێ لە پاش لە ناوبردنی ئێوە هەر گەل‌و هۆزێك بە شیاوی بزانێ بیخاتە جێگای ئێوە، وەکوو چۆن توانیویەتی ئێوە بخاتە شوێن گەل‌و هۆزی تر! واتە: پەروەردگار لە یەك کاتدا توانای لە ناوبردن‌و هێنانەدی‌و دروست کردنی هەیە. بێگومان ئەم هەڕەشەیەی پەروەردگار لە کافرەکانی مەککە هاتە دی، ئەوە بوو ملهوڕو سەرانی موشریك‌و کافری قوڕەیشی لە ناو بردن‌و موسوڵمانە کۆچەرو یاریدەدەرانی خستە شوێنی ئەوان‌و لە ئەوانەوە دەوڵەتی ئیسلام دامەزراو پەرەی سەندو بوونە نموونەی ڕەحمەت‌و مرۆڤ دۆستی لە مێژوودا، لە شەڕو ئاشتیدا ئاوێنەی باڵانوما بوون بۆ حەقخوازی‌و دادپەروەری... تەنانەت غوستاف لۆبون – وابزانم فەرەنسییە – دەڵێ هەرگیز تا ئێستا مێژوو ڕزگارکەری وەکوو ئەوانی نەبینیوە!

دوای ئەو هەڕەشە توندەی ئاراستەی کافرەکانی کرد، بە لەناو بردن لە دونیاداو ترساندنی؛ ئەمجار هەڕەشەیەکی تریان ئاراستە دەکا کە بریتییە لە سزای ڕۆژی قیامەتیان‌و فەرمووی: ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ﴾ ئەی محمد! بیانترسێنەو پێیان بڵێ: ئەو سزاو چەرمەسەرییەی بەڵێنتان پێدراوە لە ڕۆژی قیامەتدا دڵنیا بن دێتە ڕێتان‌و تووشتا دەبێ هیچ شك‌و گومانتان نەبێ! ﴿وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾ ئێوە ناتوانن ئەو سزاو عەزابە لە خۆتان دوور بخەنەوە، ناتوانن لەبەری هەڵبێن، یان بیگێڕنەوەو لە خۆتانی لابدەن، ئەگەر ئێوە ببنە ئێسکە ڕزیوو خۆڵەمێش پەروەردگار دەتوانێ سەرلەنوێ وەکوو خۆتان لێ بکاتەوە، پەروەردگار باڵادەستەو دەتوانێ قار لە بەندەکانی بگرێ...

ئیبنو ئەبی حاتەم فەرموودەیەکی لە ئەبو سەعیدی خودریەوە گێڕاوەتەوە؛ دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (يَا بَنِي آدَمَ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ، فَعُدُّوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ الْمَوْتَى، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لآتٍ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ)

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەیەکی تری ئاراستە کردو فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو کافرو موشریکانە بڵێ: ﴿يَا قَوْمِ اعْمَلُواْ عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ﴾ ئەی گەل‌و هۆزەکەم! بەردەوام بن لەسەر ڕێبازی خۆتان، ئەو ڕێبازەی خووتان پێوە گرتووە بەلاتانەوە ڕێبازی ڕاستەو پێتان وایە لەسەر حەق‌و هیدایەتن، دە لێی لامەدەن‌و پەیڕەوی بکەن؛ ئەمنیش لەسەر ڕێبازی بیروباوەڕی خۆم بەردەوام دەبم‌و لێی لانادەم، من لەسەر ئایینی ئیسلام‌و بانگەوازی کردن بۆ ئەو ئایینەو صەبرو ئارامگرتن لەسەر ئەزیەتدانی ئێوە بەردەوام دەبم‌و سوور دەبم لەسەر تێکۆشان‌و هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ﴾ لەوە بەولاوە دەزانن کێ سەرەنجامی باش وەدەست دێنێ‌و کرداری پەسەند دەبێ‌و خانووی ڕازاوەی بەهەشتی چنگ دەکەوێ! لەوە بەولاوە دەزانن ئێمە یان ئێوە بەختەوەرو سوودمەندن دەبین؟ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ اعْمَلُواْ عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ، وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ - هود/١٢١ - ١٢٢﴾.

زومەخشەری دەفەرموێ: ئەمە شێوەیەکە لە ترساندن‌و هەڕەشە کردن!! ڕەوان‌و کورت‌و پاراوو پوخت‌و وێژە ئاسایە، ڕستەکانی تا بڵێی جوان‌و شیرین‌و ڕازاوەن، هەڕەشەکەش توندو سامناکە، ئەوەش دەگەیەنێ کە ترسێنەر لەسەر حەقەو ترسێندراوو هەڕەشە لێ کراو ناحەق‌و بێ بەڵگەو دەست بەتاڵە، ئەم جۆرە هەڕەشەیە لە قورئاندا زۆر جار دووبارە بوونەوە وەکوو ﴿اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ - فصلت/٤٠﴾. یان کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ - سبأ/٢٤﴾.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە حاڵ‌و وەزعی گەل‌و نەتەوەکان بەگوێرەی کردەوەکانیان نەخشەکێش کراوە، سەرەنجامی هەموو کردارو گوفتارێکیش سزاو

پاداشی خۆی هەیە، چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە. کەوابێ با دڵنیابن کە پاشەڕۆژو سەرفرازیو سەرکەوتن سەرەنجام بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانیەتی نەك بۆ کافرو موشریکەکان، ئەوان لە مراز ناگەن، چونکە ﴿إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ بێگومان ستەمکارانو بێ باوەڕان ناگەنە ئامانجی باشو سەرەنجامیان باش نابێ، هەرگیز پەروەردگار ستەمکاران سەرناخاو ناهێڵێ بە مراز بگەنو سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، ئەوان پشت بە غەیری خودا دەبەستنو بە هیوان بتەکانیان یارمەتیان بدەن، جگە لە خوداش کەس هیچی بەدەست نیە، ئەو ستەمکارە ملهوڕانە هەرچەندە لە جیهاندا بۆ ماوەیەك دڵشادو دەست ڕۆیشتوو بنو گوزەرانیان خۆش بێو باش ڕابوێرنو خۆ بلێسنەوە بەختەوەریەکەیان پایەدار نیەو درێژخایەن نابێو زۆری پێ ناچێ لە کیسیان دەچێ!

بەڵێ ئەمە سوننەتو دابو نەریتی خودایە، سەرکەوتن بۆ ستەمکارانو ملهوڕان نیە، سەرەنجام بەختەوەری بەدەست ناهێنن، ئەوان لە جیاتی شوکرانە زمێریو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودا، سپڵەییو کوفرانی نیعمەتەکانی پەروەردگار دەکەن؛ بۆیە شیاوی ئەوەن پەروەردگار لەناویان بەرێو گەلو هۆزێکی تر بخاتە شوێنو جێگایان. ئەمەش چاوەڕوان کراوەو هاکا ڕوویدا! چونکە ئەمە دابو نەریتی خودایە ستەمکاران لە ناو دەباو بەندە باشەکانی دەکاتە جێنشینو میراتگریان؛ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ، وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ – إبراهيم/ ١٣ - ١٤﴾.

سوپاسو ستایش بۆ خودا! پەروەردگار وادەو بەڵێنی خۆی بۆ پێغەمبەری ئیسلام هێنایە دی، یارمەتی دا، لە وڵاتدا جێگیری کرد، بەسەر موشریکە عەرەبەکاندا زاڵی کرد، هەر لە ژیانی خۆیدا نیمچە دوورگەی عەرەبو وڵاتی یەمەنو بەحرەین لە کوفرو بێدینی پاك کرایەوەو ئاڵای ئیسلامی تێدا هەڵکرا! لە پاش لە دونیا دەرچوونی خۆیشی لەسەر دەستی جێنشینە بەڕێزەکانی زۆربەی وڵاتو هەرێمو شارو کۆمەڵگای ئەو ڕۆژگارە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی

موسوڵمانانەوەو ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە خۆرهەڵاتو خۆرئاواو باشوورو باکوردا بڵاوبووەوە، چەند دەوڵەتو حوکمڕانی موسوڵمان یەك بە دوای یەکدا هاتنو ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجامدا، تا موسوڵمانان پابەندی ئایینی ئیسلام بوونو پەیڕەوی قورئانی پیرۆزیان کردو بە شەریعەتی خودا حوکمیان دەکرد، ئاڵای بەرزو پیرۆزی (لا الـه الا الله محمد رسول الله) لە زوربەی وڵاتو هەرێمەکاندا دەشەکایەوە! بەڵام سەد مەخابن کاتێك موسوڵمانان ڕوویان لە قورئان وەرگێڕاو پشتیان لە ئایین سارد بۆوە، گیانی فیداکاریو تێکۆشانەکەیان تێدا کز بوو، تووشی نسکۆ هاتنو گلانو سەرەنگرێ بوونو تا ئێستاش نەهاتوونەتەوە تایەو وەسەر خۆ نەهاتوونەوە!

هەر کاتێکیش موسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆ ژێر ئاڵای ئیسلامو قورئان بکەنە پەیڕەو پرۆگرامی خۆیان، هەمان نگینو دەسەڵاتو فەرمانڕەواییان دێتەوە دەستو باڵادەست دەبنەوە، ئەمە بڕیاری خودایەو وادەو بەڵێنی خۆیەتی، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:

﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ – المجادلة/٢١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ، يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ – غافر/ ٥١ – ٥٢﴾.

## دابو نەریتی سەردەمی نەفامی دەربارەی کشتوکاڵو بەروبومو ئاژەڵو منداڵ کوشتن

﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا

كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْۗ سَآءَ مَا
يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ
مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ
لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْۖ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا
فَعَلُوهُۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾ وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ
وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ
حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً
عَلَيْهِۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟
مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ
عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُۚ
سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ قَدْ خَسِرَ
ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ

ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِۚ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٤٠﴾.

لەوەپێش پەروەردگار نارەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر بیروباوەڕی موشریکەکان کە بەشێك لەو بیروباوەڕە پووچو بێ بناغەیان ئینکاری کردنی ڕۆژی قیامەتو زیندوبوونەوەو پاداش‌و سزای ڕۆژی دواییە.

ئەمجار لێرەدا چەند نموونەو شێوە هەڵس‌و کەوت‌و حوکم‌و یاسای هەڵبەستراوو پڕوپووچیان باس دەکا؛ کە لە خۆیانەوە بەهەوانتە بڕێ بەروبوومو میوەو خواردەمەنی، حەرام‌و حەلاڵ دەکەن، زیندەبەچاڵ کردنی کچ بەڕەوا دادەنێن، بە بەهانەی گوزەران‌و کەم دەستی یان هەر هۆیەکی تر منداڵی خۆیان دەکوژن! دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا﴾ لەو بەروبوومو کشتوکاڵەی کەوا پێکی دێنن لەو ئاژەڵ‌و زیندەوەرە ماڵیانەی بەخێویان دەکەن بەشێك دیاری دەکەن بۆ خوداو بەشێکی تریشی دیاری دەکەن بۆ بت‌و صەنەمەکانیان، واتە: دوو بەش جیا دەکەنەوەو دیاری دەکەن ﴿فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ﴾ بەم ڕەنگە دەیانگوت: ئەم بەشە بۆ خودایەو بۆ ئەو تەرخان کراوە، کە ئەمەشیان دەگوت: ﴿بِزَعۡمِهِمۡ﴾ بەپێی بیروبۆچوونی پووچی خۆیان بوو، هیچ بەڵگەیەکی زانستی‌و ئایینی ڕاست‌و خوداپەرستیان نەبوو! ﴿وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا﴾ دەستیان بۆ بەشەکەی تریشیان ڕادەداشت‌و دەیانگوت: ئەمەش بۆ بتەکانمانە، تایبەتە بەوانەوە، لەڕێی ئەم بەخشێنەوە خۆمان لە پەرستراوەکانمان نزیك دەکەینەوە.

بەم شێوەیە بت‌و صەنەمەکانیان کردبوون بە هاوەڵی خوداو بەشێك لە ماڵ‌و دارایی خۆیانیان تەرخان دەکرد بۆ ئەوەی لە پێناو ئەو خودا درۆزنانەیاندا صەرفی بکەن، بەندایەتییەکی کوێرانەی ئەو بت‌و صەنەمانەیان دەکردو حەرام کردن‌و حەلاڵ کردن: کە دوو شتی تایبەتمەندی پەروەردگارن وەپاڵ بتەکانیان دەداو پلەو پایەی خودایەتییان بۆ دەچەسپاندن.

﴿فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلاَ يَصِلُ إِلَى اللّهِ وَمَا كَانَ لِلّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَى شُرَكَآئِهِمْ﴾ ئەو بەشەی بۆ بتەکانیان دیاری دەکرد هیچیان لێ نەدەدا بە خودا، بەڵام ئەو بەشەی بۆ خودایان دیاری دەکرد وا دەبوو بۆ بتەکانیان صەرف دەکرد! دەهاتن بەشی خودایان بۆ میوان و منداڵ و هەژاران و خەرج دەکرد، بەشی بتەکانیشیان بەسەر پاسەوان و خزمەتچی و دارو دەستەی بتخانەکانیان دابەش دەکرد، ئەگەر شتێ لەبەشە دیاریکراوەکەی خودا بکەوتایە گەڵ بەشی بتەکان، ئەوە هەڵیان نەدەگرتەوەو نەیان دەخستە گەڵ بەشەکەی خودا، دیانگوت خودا دەوڵەمەندەو پێویستی پێی نیە، بەڵام ئەگەر شتێك بەشی بتەکانیان بکەوتایە پاڵ بەشەکەی خودا دەیانخستەوە پاڵ بەشی بتەکانیان! ﴿سَاء مَا يَحْكُمُونَ﴾ بەڕاستی حوکم و بڕیارو هەڵسوکەوتیان خراپ و ناپەسەندە دابەش کردن و کردەوەکانیان نەگونجاوو نەشیاون! دروستکراوێکی مردووی بێ دەسەڵات، دارو بەردێکی ڕەق و تەق و بێ گیان دەکەنە هاوەڵی خوداو وەکوو ئەو بەشی بۆ دیاری دەکەن و بەڵکوو زیاتریش.

بەڕاستی ئەم دابەش کردنەیان دابەش کردنێکی ستەمکارانەیە، بەشە خراپ و کەمەکە بۆ خودا دیاری دەکەن و دوایی لێشی دەدزنەوە، وێڕای ئەوەی کە ئەوانە شیاوی ئەوە نین بکرێن بە هاوەڵی خودا دەیانکەن بە هاوبەشی، وەکوو خودا بەشیان بۆ دیاری دەکەن، سەرباری ئەوەش بەشی خودا کەم و کوڕ دادەنێن و ئەمجار لێشی دەدزنەوە! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ – النحل/٥٧﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا لَهُ مِنْ عِبَادِهِ جُزْءًا إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ – الزخرف/١٥﴾. یان دەفەرموێ: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى، تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَى – النجم/ ٢١ – ٢٢﴾.

ئەم موشریکانە بەم جۆرە هەڵوێست و کردەوانەیان سنوور شکێنی و دەستدرێژیان کردۆتە سەر مافی خودا لە بواری تەشریع و خودایەتیدا، هاتوون هاوەڵ و هاوبەشیان بۆ خودا داناوە، لەتەك ئەو زاتە بەرزو پیرۆزەدا شتی تر بە خودا دەزانن، بەڵکوو بت و صەنەمەکانیان بەسەر خودادا پاساو داوەتەوە، بەلایانەوە لە خودا لەپێشترو شیاوترن! لە وەرگرتنی ئەم بڕیارو بیرو بۆچوونەیاندا پشتیان بە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و بەهێزی عەقڵی و نەقڵی

نەبەستووە، بڕیارێکە بەھەوانتە دەری دەکەن! بیروبۆچوونێکە کوێرانە شوێنی کەوتوون!!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: دوژمنانی خودا کە بەروبوومێکیان هەڵدەگرتەوە، یان میوەو داهاتیان کۆ دەکردەوە، بەشێکیان لێ جیا دەکردەوە بۆ خوداو بەشێکیشیان دادەنا بۆ بتەکانیان ئەو بەشەی بۆ بتەکانیان دادەنا ژمارەو کێشانەو پێوانەیان دەکردو پارێزگارییان دەکرد، ئەگەر بە هۆی با، یان بە هۆی هەر شتێکی تر بڕێ لە بەشی بتەکانیان بکەوتایەتە سەر بەشی خودا دەیانگێڕایەوە بۆسەر بەشی بتەکانیان! ئەگەر لە بەشەکەی خودا بکەوتایەتە سەر بەشی بتەکان وازیان لێ دەهێناو لێی دەگەڕان... ئەگەر قاتو قڕی پەیدا بوایە بەشی خودایان دەخواردو بەشی بتەکانیان بۆ بتەکان خەرج دەکرد.

هەر بەو جۆرە بڕێ مەڕو ماڵاتی خۆیان وەلا دەنا دەیانکردنە (بەحیرەو سائیبەو وەصیلەو حامی) گۆشتو بەروبوومەکانیان لە خۆیان یان لە بڕێکیان حەرام دەکردو تەرخانیان دەکردن بۆ بتەکانیان، پێیان وابوو بەو شت لە خۆ حەرام کردنە خۆیان لە خودا نزیك دەکەنەوەو خودا لە خۆیان ڕازی دەکەن!

جا وەکوو چۆن خودانەناسان خوویان بەوە گرتبوو کە بەروبوومو ئاژەڵو دانەوێڵە لە نێوان خوداو بتەکانیان دابەش بکەن بەلایانەوە کارێکی باشو خودا پەسەند بوو! ﴿وَكَذَلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلاَدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ﴾ هەر بەو جۆرە ئادەمیە شەیتانەکانو کاهینو زێوانو پاسەوانەکانی بتخانەکانو جنۆکەی شەیاتینیەکان، کوشتنی منداڵە بێ تاوانەکانیان لە پێش چاوی زۆربەی بتپەرستەکان جوان کردووەو لە دڵیاندا شیرینیان کردووە، بە جۆرێك پێیان وابوو کارێکی مەردانە ئەنجام دەدەن!

موجاهید دەفەرموێ: (شُرَكَآؤُهُمْ) شەیتانەکانیان کە فەرمانیان پێ دەکەن، لە ترسی هەژاریو نەداری منداڵەکانی خۆیان زیندەبەچاڵ بکەنو بیانکوژن.

سوددی دەفەرموێ: واتە: شەیاتینیەکان فەرمانیان پێ کردوون کە زارۆکە مێینەکانیان بکوژن ﴿لِيُرْدُوهُمْ﴾ بۆ ئەوەی گومرایان بکەنو سەریان تێدا بچێو سروشتیان تێك بچێو بگەنە ئەوپەڕی درندەیی بە جۆرێك باوك بەدەستی خۆی

جەرگی خۆی سەربېڕێ، یان كچۆڵە بچكۆلانەی خۆی بە زیندووی ژێر خاك بكا... ﴿وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ یان بۆ ئەوەی ئایینەكەیان لێ بشێوێنن – مەبەست ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم‌و ئیسماعیلە – چاك‌و خراپیان لێ تێكەڵ بێ!

هۆی ئەم جوانكردن‌و ڕازاندنەوەیە ئەوەبوو شەیاتینیەكان موشریك‌و بتپەرستەكانیان دەترساند، كە ئێستا یان لەوە دوا، تووشی هەژاری دەبن‌و ناتوانن ماڵ‌و منداڵ بەخێو بكەن. هەروەها دەیانترساندن بە لەكەدار كردن‌و نەنگی بەسەردا هاتن، بۆیە ئەوانیش كە كچیان دەبوو لە ترسی ڕیسوایی‌و هەژاری‌و مارە كردنیان لە ناهاو كووف دەیانكوشتن، زیندەبەچاڵیان دەكردن، بۆیە پەروەردگار كردەوەكانیانی بەلاوە ناپەسەندەو هێرشیان دەكاتە سەرو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ، بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ – التكوير/ ٨ – ٩﴾.

شەیاتینیەكان وایان دەخستە دڵیانەوە كە منداڵ كوشتن‌و كچ زیندەبەچاڵ كردن كارێكی پەسەندەو لە خودایان نزیك دەكاتەوە، هەر بۆیەش عەبدولمطەلیبی باپیری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر خۆی نەذر كرد كە عەبدوڵلای كوڕی سەربېڕێ‌و بیكاتە قوربانی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆ ئەو بڕیارەی عەبدولمطەلیبی باپیری كردووەو فەرموویەتی: (أنا إبن الذبيحين) مەبەستی پێی عەبدوڵلای باوكی‌و حەزرەتی ئیسماعیلە كە حەزرەتی ئیبراهیم ویستی سەری ببڕێ.

﴿وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا فَعَلُوهُ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە ئەو جۆرە كردارە ناپەسەندانە نەكەن، نەیاندەكرد! كردەوەكانیان بەگوێرەی ویست‌و ئیرادەی پەروەردگارە! حیكمەت‌و دانایی خودا داخوازیانە!

ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت ئەم ئایەتەیان كردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە كردەوەی موشریكەكان هەمووی بە ویستی خودایەو ئیرادەی ئەوی لەسەرە!

موعتەزیلە دەڵێن: ئەم مەشیئەتۆ ویستەمەنییە مەشیئەتێكی (ئیلجائییە)، واتە: پەروەردگار ویستی وایە كەوا ئەوانە بەرەڵلا بكا بەویستی خۆیان كردارو گوفتاری خۆیان هەڵبژێرن‌و ئەنجامی بدەن، بەبێ ئەوەی كە هیچ جۆرە ملكەچییەكیان لەسەر بێ.

ئەوەشمان لە بیر نەچێ پەروەردگار دەتوانێ وا بکا هەموو کەسێ موسوڵمان بێ، بەم جۆرە سروشتی ئادەمیزاد وا دروست بکا ئامادەباشی تەواویان تێدا بێ بۆ خوداپەرستی؛ لە ناخدا هاندەرو هەڵنەریان تێدا بڕسکێنێ هەر لەگەڵ بانگەوازی ئایینیان بیست خێرا موسوڵمان ببن، یان هەر سروشتەکەیان وا بخوڵقێنێ خوداپەرست بن، وەکوو فریشتە کە هەر بە سروشت خوداپەرستن و هەرگیز لە خودا یاخی نەبن!

﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! وازیان لێ بێنە خۆیان و بیروباوەڕی خۆیان؛ تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرەو بەس! حیساب و لێکۆڵینەوەو سزاو تۆڵە لەسەر ئێمەیە و چاریان دەکەین...

جۆرێکی تر لە کارە ناپەسەندو جاهیلیەت ئاساکانیان ئەوەبوو ئاژەڵ و بەروبووم و کشتوکاڵەکانیان دەکردە سێ جۆرو بۆ هەر جۆرێکیان بڕیاری تایبەتیان بۆ دەدا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ هَذِهِ أَنْعَامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لاَّ يَطْعَمُهَا إِلاَّ مَن نّشَاء﴾.

١- دەیانگوت ئەم ئاژەڵ و خواردەمەنی و بژێوە پاوانەو تایبەتە، بۆ کەس نیە سوودیان لێ وەربگرێ، بەڵکوو تایبەتن بە بتەکانمان و لە پێناو خوداکانماندا خەرج دەکرێن، نابێ کەس لێیان بخوا، جگە لە پاسەوان و خزمەتچی بتخانەکان و پیاوەکانمان نابێ بە هیچ جۆرێ ئافرەت لێیان بخوا! ئەم بڕیارو حوکمەیان دەدا ﴿بِزَعْمِهِمْ﴾ بە بیروبۆچوونی خۆیان بوو بەڵگەو دەلیلیان بەدەستەوە نەبوو.

٢- ﴿وَأَنْعَامٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا﴾ جۆرێك لە ئاژەڵەکانیان بەرەڵڵا دەگرد وەکوو فیلەکەی خاوەن شکۆ بلەوەڕێن و کەس لە هیچ شتێك نەیانگێڕێتەوە، کەس بەریان لێ نەنێ و کەس سواریان نەبێ، واتە: بڕێ لە ئاژەڵەکانیان دەکردە (بەحیرەو سائیبەو حامی) دایان دەبەستن و هیچیان پێ نەدەکردن، هەر دەلەوەڕان و خۆیان دەلستەوە، کەس بۆی نەبوو نە باریان لێ بنێ نە سواریان ببێ!

٣- ﴿وَأَنْعَامٌ لاَّ يَذْكُرُونَ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهَا﴾ بڕێ لە ئاژەڵەکانیان سەردەبڕی ناوی خودایان لەکاتی سەربڕینەکەدا لێ نەدەهێنا، بەڵکوو ناوی بتەکانیان لەسەر دەبردو بۆ ڕێزلێنانی ئەوان سەریان دەبڕین کە دەچوون بۆ حەج کردن سواریان نەدەبوون و لەسەر پشتی ئەو ئاژەڵانە (لبیك)یان نەدەگوت.

موجاهيد دەڵێ: هەندى لە وشترەكانيان وا ديارى دەكرد هەرگيز ناوى خودايان لەسەر نەهێنن، سواريان نەبن، نەياندۆشن، شتيان پێ كێش نەكەن، هيچ كارێكيان پێ ئەنجام نەدەن!

ئەم ديارى كردنەى ئاژاڵەكانيان بەو جۆرە كردبووە بناغەى بيروباوەڕيانو بە ئايينو حوكمى خودايان حليب دەكرد ﴿افْتِرَاء عَلَيْهِ﴾ بەدەم خوداوە شتيان هەڵدەبەست، ئەم بيروباوەڕو حوكمەيان بە درۆ پاڵ خودا دەدا، خودا لێيان بەرييە، شەرعو ياساى واى بۆ ئەوان دانەناوە، جگە لە خوداش كەس مافى ئەوەى نيە شت حەرامو حەڵاڵ بكا، تەشريع دانان تايبەتى خودايە، كەس ئەو مافەى نادرێتىو شياوى ئەوە نيە!!!

﴿سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ پەروەردگار تۆڵەى ئەم درۆ بەدەم هەڵبەستنەيان لێ دەكاتەوە، سزاى ئەم سەرپێچى كردنەو دانانى حوكمو ياساو حەڵاڵ كردنو حەرام كردنەى كە لە خۆيانەوە ئەنجامى دەدەن ئاگرى دۆزەخەو تێيدا دەسوتێندرێن.

ئەمجار پەروەردگار جۆرێكى تر لە تەشريعو ياساكانيان؛ لە حەڵاڵ كردنو حەرام كردنەكەيان باس دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَذِهِ الأَنْعَامِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَى أَزْوَاجِنَا﴾ دەيانگوت ئەو بێچووە شيرەى لە سكى ئەم ئاژەڵانەدا هەيە كە بەحيرەو سائيبەن تايبەتن بۆ پياوەكانمانو حەڵاڵو زەلاڵى ئەوانەو لە مێينەكانمان قەدەغەيە ئەگەر ئاژەڵەكە بەچكەيەكى نێرى ببوايە، تەرخانيان دەكرد بۆ پياوەكانيانو نەدەبوو ئافرەتەكانيان لێى بخۆن! ئەگەر ئاژەڵەكە بەچكەيەكى مێينەى ببوايە مەرەخەسيان دەكرد بۆ زاوزێو سەريان نەدەبڕى.

﴿وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَاء﴾ ئەگەر بێچووەكە بە مردارەوەبوويى لە دايك بوايە ئەوە پياوو ئافرەت تێيدا هاوبەش دەبوون، ئاوا بەو جۆرە ئەو بڕيارانەيان دەدا، ئاوا بەدەم خوداوە شتيان حەڵاڵو حەرام دەكرد، هيچ بەڵگەو چەسپێنەرو سەلمێنەريان نەدەبوو، تەنها بە هەوانتەو خەياڵ پلاوى خۆيان ئەم حوكمانەيان دەدا، ﴿سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ﴾ لەوە بەولاوە پەروەردگار تۆڵەى ئەو درۆو دەلەسەو بوختانو بەدەم هەڵبەستنەيان لێ دەكاتەوە ﴿إِنَّهُ حِكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خودا داناو

لێزانه له کارهکانیدا، ئیشی نابەجی ناکا، زاناو ئاگاداره بەسەر هەموو شتێکداو هیچی لێ گوم نابێ، ئەو بوختانکەرانه له دەستی رزگاریان نابێ! وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی تره که دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذَا حَلاَلٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ لاَ يُفْلِحُونَ – النحل/١١٦﴾.

ئەمجار پەروەردگار نارەزایی خۆی بەرامبەر کچ زیندەبەچاڵ کردن دەردەبڕێو سەرزەنشتو ئەنجامدەرانی ئەو کاره درندانەیه دەکاو هەڕەشەیان ئاراسته دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُواْ أَوْلاَدَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بێگومان خەسارەتمەندو بەدبەختو چارەڕەش بوون ئەو کەسانەی که منداڵی خۆیان دەکوژن، کچیان زیندەبەچاڵ دەکەن، ئەو نیعمەتەی که خودا پێی داون له خۆیانی دەبڕن، ئاوا بەبێ عەقڵیو نەفامیو درندەیی جەرگی خۆیان له ناو دەبەن، هەڵسو کەوتی نەزانانه دەنوێنن... ئەوانه به شێوەیەکی نەزانیو ئەحمەقانه منداڵەکانی خۆیان دەکوژن، بەخەیاڵ پلاوی خۆیان له ترسی هەژاریو عەیبو لەکەدار بوون پرکێشی جەرگی خۆیان دەکەن، بەو شێوه درندانەیه له ناویان دەبەن لەبەر نەزانیو نەفامییان جیاوازی نێوان قازانجو زیانی خۆیان ناکەن، خراپەو چاکه لێك جیا ناکەنەوه! ئاشکرایه نەفامیو نەزانی گەورەترین تاوانو خراپەکارییه، ئەوانه به هۆی نەفامییەوه لەززەتو خۆشی جیهانیان له خۆ یاساغ کردووه، درۆیان بەدەم خوداوه هەڵبەستووه، سەریان لێ شێواوەو گومڕا بوون، بەرژەوەندی دونیاو ئایینی خۆیان نادۆزنەوه!

خەسارەتمەندییەکەیان ئاشکراو نومایانه، چونکه کوشتنی منداڵو زیندەبەچاڵ کردنی کچ سەرچاوەی خەسارەتمەندییەکەیانه، منداڵ پشتو پەنایه، زنجیرەی ناوو شۆرەته، مایەی شانازیو کەیفو خۆشییه، چاکەکاریو صیلەی ڕەحمە، دەی به لەناو بردنی، سۆزو پەرۆشی باوكو فرزەندی نامێنێ، له جێگای خۆشەویستیو دڵنەرمی دڵڕەقیو توندوتیژیو ڕەوشت نزمیو ژیان تاڵی دێتە کایەوه، له قیامەتیشا شیاوی سزای توندو سووتانی ناو دۆزەخ دەبن.

تاوانێکی تریان ئەوەیە: کە ﴿وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاء عَلَى اللَّهِ﴾ هەروەها لە هیچ و خۆراپی ئەو رزق و رۆزیە پاک و خاوێنەی خودا پێی بەخشیوون و بۆی حەلاڵ کردبوون لەسەر خۆیان حەرام کردبوو، هیچ بەلگەشیان بەدەستەوە نەبوو، بە درۆو دەلەسە ئەم حەلاڵ کردن و حەرام کردنەیان بەدەم خوداوە هەڵدەبەست و بە ئایینیان حلێب دەکردو پێیان وابوو خوداپەرستی دەکەن!

﴿قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾ بەراستی رێگایان لێ تێک چووەو گومڕابوون و سەریان لێ شێواوەو هیدایەت و رێبازی حەقیان نەدۆزیەوەو هەرگیز لەو گومڕاییە رزگاریان نەبوو.

ئیمامی بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتێك دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کە دەتەوێ نەزانی نەفامی عەرەبەکان بزانی لە سورەتی (الأنعام) ئایەتەکانی دوا ژمارە (١٣٠) بخوێننەوە...

ئیبنو مونذیرو ئیبنو ئەبو حاتەم لە قەتادەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: ئەمە بوو هەڵس و کەوتی عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانی و نەفامیدا کابرا کچەکی خۆی زیندەبەچاڵ دەکرد لە ترسی هەژاری، یان فڕاندن، کەچی سەگی بە ئەوپەڕی تێرو تەسەلی بەخێو دەکرد.

قورطوبی لە تەفسیرەکەیدا سەرگوشتەیەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ریوایەت کراوە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە خزمەت پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) دادەنیشت و هەمیشە بە غەمبارو دڵ تەنگ دەبینرا! رۆژێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووی: ئەوە چیتە؟ هەمیشە جۆش داماوی؟ وتی: ئەی رەوانەکراوی خودا! من لەسەردەمی نەزانیدا تاوانێکم کردووە، دەترسم خودا لێم خۆش نەبێ! تەنانەت کە ئێستا موسوڵمانیش بووم هەر دەترسم! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی تاوانەکەتم بۆ باس بکە بزانم چیە؟ کابرا وتی: ئەی رەوانە کراوی خودا! من یەکێك بووم لەوانەی کە کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکرد، کچێکم بوو دایکی لێم پاڕایەوە کە وازی لێ بێنم زیندەبەچاڵی نەکەم، منیش وازم لێ هێنا تا گەورە بوو پێگەیشت و جوانترین ئافرەتی لێ دەرچوو، خوازبێنییان لێ کردم و داواکاری زۆر بوو! دەمارگیری

گرتمیو دڵم بڕوای نەدا بە شووی بدەم، هەروەها پێشم ناخۆش بوو لە ماڵەوە بمێنێتەوە بێ مێرد، بڕیارم دا زیندەبەچاڵی بکەم. بە خێزانەکەم وت دەمەوێ بچم سەردانی فلان هۆز بکەمو، بچمە دیدەنی خزمو کەسو کارم، با ئەم کچەشم لەگەڵدا بێ، دایکەکەی بەم پێشنیارەی من دڵخۆش بوو، خێرا کچەکەی ڕازاندەوەو پۆشاکی جوانی لەبەر کردو خشڵی جۆراو جۆری پێدا کرد، پەیمانی لێ وەرگرتم کە ئاگاداریی بکەمو خیانەتی لێ نەکەم، ئیتر کچەکەم لەگەڵ خۆم برد تا بردمە سەر بیرێك، کەزانی خەیاڵم خراپەو دەمەوێ بیخەمە ناو بیرەکە باوەشی پێدا کردمو دەستی کرد بە گریان، گوتی: بابەگیان ئەوە دەتەوێ چیم لێ بکەی؟! منیش بەزەیم پێیدا هاتەوەو، دڵێ سەیری ناو بیرەکەم کردەوەو دەمارگیرییەکەم تووش بووەوە، ویستم فڕێی بدەمە ناو بیرەکەوە، ئیتر باوەشی پێدا کردبووومو دەگریاو دەپاڕایەوەو دەیگوت: بابەگیان! توخودا من سپاردەی دایکم کە لە ماڵەوە هاتین دایکم پەیمانی لێ وەرگرتی کە پارێزگاریم بکەیو نەم فەوتێنی، منیش کە سەیری بیرەکەم دەکرد تەماعی ئەوە دەیگرتم کە فڕێی بدەمە ناو بیرەکەوەو لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە، کە سەیری کچەکەم دەکردو دەپاڕایەوەو دەلالایەوە بەزەییم پێدا دەهاتەوە... تا شەیتان سواری شانم بوو گرتمو سەرەو بن فڕێم دایە ناوبیرەکەوە، گوێم لێ بوو دەیگوت: بابەگیان بۆچی کوشتتم؟ ئەمجار مامەوەو تا نوزەی لێ بڕاو دڵنیا بووم کە گیانی لەدەست داوە، ئەمجار هاتمەوە بۆ ماڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) گوێی لەمە بوو دەستی کرد بە گریانو هاوەڵانیش گریانو ماتەمینی بەسەر کۆڕەکەدا هات... دوایی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر فەرمانم پێ بکرایە یەکێك لەسەر تاوانی سەردەمی نەفامی سزا بدەم، سزای تۆم دەدا!.[1]

---

[1] – تەفسیری قورطوبی/ بەرگی حەوتەم/ ل /٦٤ طبعة دار الكتب العلمية/ ١٩٨٨...

**بەڵگەی ئاشكرا لەسەر تواناو دەسەڵاتی خودا**

﴿ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعۡرُوشَٰتٍ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرۡشًاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٍۖ مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ نَبِّـُٔونِي بِعِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ

بِهَـٰذَاۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾.

وەكوو ئاشكرايەو زانیمان قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر چەسپاندنی بنەما ئاینیەكان دەكا كە بریتین لە یەكتاپەرستیو پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوەو قەزاو قەدەر، پەروەردگار لە قورئاندا چەسپاندوونیو جەختی لەسەر كردوونەتەوەو هەڕەشەی لەو كەسانە كردووە كە بڕوایان پێ نەبوونو لە پێناو بڵاوبوونەوەو گەیاندنی ئەو جۆرە بیروباوەڕە كاریان نەكردووە. جا كە لەوەپێش ئەو مەبەستانەی پێكانو بەڵگەی لەسەر هێنانەوە، گەڕایەوە سەر مەبەستە ئەصڵیەكە كە بەڵگە هێنانەوەیە بۆ سەلماندنو چەسپاندنی تاكو تەنهایی خودای پەروەردگار، ئەوەتا لە ڕێگای چەسپاندنی خودایەتیو پەروەردگاریەتی (الألوهية والربوبة) بۆ زاتی كردگارو بەدیهێنەر، بۆ چەسپاندنی ئەو ڕاستیە كە هەر ئەو شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ كردنەو مافی ئەوەی هەیە كە تەشریع دانێ، حەڵاڵو حەرام دیاری بكا، جگە لە ئەو كەس شیاوی خودایەتیو بەندایەتی بۆ كردن نیە، كەس سەرپەرشتیارو خاوەنی بوونەوەر نیە، بەدیهێنەر خۆیەتیو بەس! كەس ڕایەی ناكەوێ لافی ئەوە لێ بداو خۆی بە یاسادانەرو بەدیهێنەر بزانێ! بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ جَنَّاتٍ مَّعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ﴾ پەروەردگار ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە بۆخۆی بەدیهێنەرو خالیقی هەموو شتێكە لە كشتوكاڵو بەروبوومو دانەوێڵەو ئاژەڵ... هتد. خودا بەدیهێنەریانە، كەچی موشریكەكان بەهەوانتەو بە ئارەزووبازی بەش بەشیان دەكەنو هەندێكی تایبەت دەكەن بە فلان شتەوە هەندێكی تر قۆرغ دەكەن بۆ فلان شت، بڕێكی حەڵاڵ دەكەن بڕێكی حەرام، ئەم هەڵس‌وكەوتانەیان ئەم بیروباوەڕە نادروستانەیان پەرە پێ دەدەنو بڵاوی دەكەنەوەو بە ئایینی حلێب دەكەن، لە كاتێكدا كە ئەوە مافی

ئەوان نیەو ئەو دەسەڵاتە تەشریعیەیان نەدراوەتێ، ئەوان هیچیان بەدەست نیە، ئەوە بەدەست خودایە، چونکە هەر خودایە ئەو شتانەی بەدیهێناوە، هەر ئەو باغ و دارستانی بەرداری دروستکردووە، داری بەرداری وای بەدی هێناوە لکەکانی دەخزێنە سەر کەپرو بەسەر کەپرەکەدا پەخش دەبێ، میوەو بەروبوومەکەی پێیەوە دەلاژێتەوە، هەروەکوو داری بەرداری واشی بەدی هێناوە کە پێویست بە کەپر بۆکردن ناکاو بۆخۆی بەسەر زەویدا پەخش دەبێ، یان قەدو لقەکانی وا دروست کردوون کە دەتوانن بۆخۆیان قورسایی بەرەکە هەڵبگرن و پێویست بە کەپر بۆ کردن و کۆڵەکە بەردان نەکا!

تەنانەت دار مێو هی وای هەیە کە کەپری بۆ دەکرێ و کۆڵەکەی بەردەدرێ، هی واشی هەیە بۆخۆی بەسەر زەویدا پەخش دەبێ کەپری ناوێ، یان کەمێك بەرز دەبێتەوەو بۆخۆی تەحەمولی بەرەکەی خۆی دەکا، ﴿وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُ﴾ هەروەها پەروەردگار دارخورمای دروست کردووە کشتوکاڵی جۆراوجۆری هێناوەتە کایەوە کە شێوەو روخسارو رەنگ و تام و بۆنی هەر یەکەیان لەوی تر جیایە، خۆراك و بژێوە بۆ ئادەمیزاد، ژیانی ئادەمیزاد پەیوەستە بەو بەروبووم و دانەوێڵەو خواردەمەنیانەی کە لەو باغ و دارستان و زەوی و زارە بەرهەم دەهێندرێ... وشەی (زرع) هەموو بەروبووم و دانەوێڵەو میوەیەك دەگرێتەوە کە لە وەرزەکانی ساڵدا بەرهەم دەهێندرێ...

﴿وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُتَشَابِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ﴾ هەروەها پەروەردگار داری زەیتون و هەنارو بەروبوومیانی دروست کردووە، هەندێکیانی لێك دەچن و هەندێکیانی لە تام و چێژدا جیاوازن، هەریەکێ لەم دارو درەخت و بەروبووم و کشتوکاڵ و دانەوێڵەو ئاژەڵ و پەلەوەرانە تایبەتمەندیی خۆی هەیە، تام و چێژو شێوەو ڕوخسارو بۆن و بەرامیان لێك جیاوازن، پرۆتینی تایبەتیان تێدایەو سروشتی جودایە! لە کاتێکدا هەموو یەك ئاو دەخۆنەوەو یەك هەوا هەڵدەمژن و لەیەك زەویدا دەڕوێن و پەروەردە دەبن! پەروەردە بوون و پێگەیشتنیان گونجاوو لەبارە بۆ پێویستی ئادەمیزاد، بڕێکیان بەسەرماو هەندێکیان بە گەرماو جۆرێکیان بە هەوای مامناوەندی بەروبووم و میوەی پێ دەگا...!

یان دەڵێن: پەروەردگار داری زەیتوونو هەناری دروست کردووە لە شێوەو ڕوخساردا لێك دەچن، بەڵام تامو شێوەو بەرەکانیان جیاوازە، هەندێکیان دەڵێن: زەیتوونو هەنار لە شکڵو گەڵادا یەکن، بەڵام میوەکانیان جیاوازە، بڕێك دەڵێن: مەبەست ئەوەیە: دار هەنارەکان لە شکڵو شێوەدا لێك دەچن، بەڵام بەرو میوەکانیان لە تامو چێژدا لێك جیان؛ هەندێکیان شیرینو بڕێکیان مزرو هەندێکیان ترشن، ڕەنگی دەنکەکانیشیان هەندێ سپیو هەندێکی سورو هەندێکی سورێکی مەیلەو ڕەشەو هەندێکی ڕەنگێکی ترە.

﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ﴾ بخۆن لە میوەی ئەو دارو درەختو باغانەی کە باس کران هەر کاتێ بەدەرکەوتو پێگەیی، با شیرینو تام گرتوو نەبووبێ بەتەواوی! ئەوەتا ترێ بە بەرسیلەییو بە ترێو بە مێوژی دەخورێ، خورما بە مزرییو بەتەڕیو بە خورمایی دەخورێ، گەنم بە فەریکیو بە گەنمیو بە شێوەی تریش دەخورێ.

بەپوختی مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە، پەروەردگار پاش ئەوە کە بە بەندەکانی خۆی ڕاگەیاند کە هەرچی لە زەویدا هەیە لە بەروبوومی دارو درەختو ڕووەكو ئەوەی بژێوی ئادەمیزادی تێدایە، حەڵاڵو بەیدەستە بۆ ئادەمیزادو دەتوانن سوودیان لێ وەربگرن، بۆ کەس نیە جگە لە خوا شتێکیان لێ حەرام بکا، چونکە حەڵاڵ کردنو حەرام کردن مافی خودایە کە خۆی بەدیهێنەری ئادەمیزادو میوەو بژێوەکانو درەختو ڕووەکەکانە، هەر کەسێ لافی ئەوە لێ بدا کە مافی حەرام کردنی هەیە، ئەوە خۆی کردۆتە هاوبەشی خودا، هەرکەسێکیش گەردنکەچی حەرام کردنەکە بێ ئەوە هاوەڵی بۆ خودا داناوە.

﴿وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ کە کاتی دروێنەو چنینی زەراعەتو میوە هات بەشی دیاری کراوی خاوەن مافەکانی لێ دەردەکەن؛ بەشی خزمو هەتیوو هەژارو نەدارای لێ بدەن، واتە: دوای ئەوەی پێ دەگاو دەدروێتەوەو گێرە دەکرێو بەشەن دەکرێ، بەشە زەکاتی دیاری کراوو پێویستی لێ بدەن بە ئاتاجان.

بەلای ئیبنو عەبباسەوە ئەو بەشە دیاری کراوە (دە یەکە) بۆ زەویو زارێك بە باراناو ئاو بدرێت، (نیوەی دە یەکە) بۆ زەویو زارێك کە بە جۆگەو ئاوی بیر ئاو بدرێن.

سەعیدی کوڕی جوبەیرو رایەکی ئیبنو عەبباسیشە دەڵێن: مەبەست بەم (حەقە) ئەو خێرو خێراتەیە کە بە هەژاران دەدرا لەکاتی دروێنەدا، ئەندازەکەی دیاری نەکراوە، دوایی کە دە یەكو نیوەی دە یەك پێویست کرا ئەو حەقە نەسخ کراوەتەوە، بەڵگەی ئەم رایە ئەوەیە: کە زەکات لە مەدینە واجب کراوە، ئەم ئایەتە لە مەککە هاتۆتە خوارێ.

گوتەیەکیش هەیە گوایە ئایەتەکە مەدینەییە!

قسەی حەقو ڕاست ئەوەیە: کە مەبەست بە (حقە) لێرەدا زەکاتی فەرزە، مانای ﴿وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ واتە: عەزم جەزمتان هەبێ لەسەر زەکات دانو گرنگی پێ بدەنو پاشگوێی مەخەنو هەر لەگەڵ کاتی زەکات دان هات تەنخیری مەکەنو هەل لەکیس مەدەن!

ئەمجار قورئان باسی هەمیشە زیندوویی خۆی ڕادەگەیەنێ، میانەڕەوی خۆی لە هەموو شتێکدا دووپات دەکاتەوە ﴿وَلاَ تُسْرِفُواْ﴾ بخۆنو بخۆنەوە لە رزقو رۆزی حەلاڵو زێدەڕەوی مەکەن، هەروەها لە خێر کردنو ماڵ بەخشینیشدا وا زێدەڕەوی مەکەنو میانەڕەو بن، ﴿إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ بێگومان خودا زێدەڕەوانی خۆش ناوێ...

ئیبنو جەریری طەبەری لە ئەبولعالیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوە بوو موسوڵمانان لە پێشدا جگە لە زەکات شتی کەشیان دەبەخشی پاشان زێدەڕەوییان تێدا دەکرد، ئیتر ئەم ئایەتە ﴿وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ هاتە خوارێ.

ڕیوایەتێکی تر هەیە دەڵێ: لە ڕۆژی دەروێنەدا جگە لە زەکات شتی کەشیان دەبەخشی دوایی پێشبڕکێو زێدەڕەوییان تێدا کرد، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتانەی ناردە خوارێ.

ئیمامی طەبەری لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس هاتە خوارێ، کاتێك باغە خورماکانی ڕنـین - کە بریتی بوو لە پێنج سەد دار خورما - وتی: ئەمڕۆ هەرکەسێك بێتە لام بەشی دەدەم، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە هەرچی چوو بۆ لایو داوای لێ کرد بەشی دا، هەتا هیچی بۆ نەمایەوە؛ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾.

وێنەی ئەم ئایەتە دەربارەی میانەڕەوی ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ - الأعراف/٣١﴾ یان کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا - الإسراء/٢٩﴾.

ئیمامی زوهری دەڵێ: مانـای ﴿وَلاَ تُسْرِفُواْ...﴾ واتـە: لەڕێگای بێدینیـدا شت مەبەخشن، موجاهیدیش مانایەکی لەم شێوەی لێ ڕیوایەت کراوە، ئـەوەتا لـە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە ڕیوایەتێك دێنێ دەڵێ: ئەگەر کێوی ئەبو قوبـەییس ئـاڵتوون بـێو پیاوێـك بیبەخـشێ بـە موسـریف حلێب نـاکرێ! ئەگـەر دیرهـەمێك لـە سەرپێچی کردنی خودادا ببەخشێ بـە موسـریف حلێب دەکرێ. هـەر لـەم ڕوانگەوەیـە بڕێـك عاقڵمەند گوتوویانە: زێدەڕەوی لە خێردا نیە، خێریش لە زێدەڕەویدا نیە...

قسەی حەقو ڕاست ئەوەیە: کە زێـدەڕەوی لـە هـەموو شتێکدا؛ خێـر بـێ یـان شەڕ بێ، کارێکی ناپەسندە، جا ئەو شتە خواردنو خواردنەوە بێ یا خێـر کـردنو بەخشین بێ!چونکە ئـادەمیزاد - مـرۆڤ - پێویـستە بـژێوی خـۆیو مـاڵو منـداڵو کەسو کاری دابین بکا، تەنانەت ئەگەر منداڵیشی نەبوو پەزمەندە کردنـی هەنـدێ ماڵو دارایی لە موچەو داهاتی خـۆی کـارێکی پەسـەندە، واباشـە ئینـسان بـۆ ڕۆژی تەنگانەو لێقەمان بڕێ پارەو پوڵ پاشەکەوت بکا، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا نەبێتە بار بەسەر شانی خەڵکەوە، هەر بۆیەشە ئینسانی بێ عەقڵو کەم فام کە زانـدرا مـاڵو دارایـی بـە فـیڕۆ دەدا قورمتێنـە (حجـر)ی لەسـەر دادەنـرێ، تەنانـەت ئەگـەر مـاڵ خەرج کردنەکەی لە کاری خێریشدا بێ هەر حیجری لەسـەر دادەنـرێو دەسـەڵاتی ماڵ خەرج کردنو کڕینو فرۆشتنی لێ دەستێندرێتەوە.

﴿وَمِـنَ الأَنْعَـامِ﴾ هـەر لـە تـەواو کردنـی نیعمـەتی خودایـە بەسـەر ئێـوەی ئـادەمیزاددا کـە وشـترو گـاو مـەڕو بزنـی بـۆ دروسـت کـردوون ﴿حَمُولَـةً﴾ هەیانـە گـەورەو بـار بـەرە، سـەرباری ئـەوەی کـە گۆشـتی دەخـورێ‌و شـیرو ماسـتی هەیـە، باریـشی پـێ هەڵـدەگرن‌و جـوتی پـێ دەکـەن‌و گالیـسکەی پـێ ڕادەکێـشن ﴿وَفَرْشًـا﴾ هەیان بچکۆلەو بەیدەست پاڵی دەخەن بۆ سەربڕین، لە خوری‌و کوڵك مووەکەیان ڕاخەرو پۆشاك دروست دەکەن‌و ڕەشماڵ‌و جەواڵ‌و هۆری لێ پەیدا دەکەن، خۆتـانی پێ لە گەرماو سەرماو باو باران دەپارێزن!

﴿كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ﴾ بخۆن‌و بخۆنەوە لە گۆشت‌و شیرو ماسـتی ئـەم ئاژەڵانـە وەکـوو چـۆن لـە بـەروبوومی کـشتوکاڵ‌و میـوەی دارو درەخـت دەخـۆن، هـەموویان دروستکراوی خودان‌و بۆ بەرژەوەندی ئێوە دروستی کردوون، بە هەموو شـێوەیەکی ڕەوا سوودیان لێ ببینن‌و بۆ بەرژەوەندی خۆتان بەکاریان بێنن!

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَـا لَهُـمْ مِمَّـا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَـالِكُونَ، وَذَلَّلْنَاهَـا لَهُـمْ فَمِنْهَـا رَكُـوبُهُمْ وَمِنْهَـا يَـأْكُلُونَ – يس/٧١ – ٧٢﴾. یان دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِـهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِلشَّارِبِينَ – النحل/٦٦﴾.

﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ بە هیچ جۆرێك شوێن ڕێبازو فـەرمانی شـەیتان مەکەون، مەچن وەکوو موشریکەکان ڕزق‌و ڕۆزییەك کە خودا بۆی حەڵاڵ کـردوون بە هەوانتـە لـە خۆتـانی حـەرام بکـەن؛ ئـەوە هەڵخەڵەتانـدنی شـەیتانەو گومڕاتـان دەکا، پەروەردگار ئەو شتانەی بۆ ئێوە حەڵاڵ کردووە، حەڵاڵ کردن‌و حـەرام کـردن بەدەست ئەوە، ئەو دروستکەرو بەدیهێنـەری هەموو بوونـەوەرە، ئـەوە دەزانـێ چـی بۆ ئێوە باشەو چی خراپە، کەسی تر ڕایەی ناکەوێ ئەوە حەڵاڵ بکاو ئـەوە حـەرام بکا. ﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ بێگومـان شـەیتان دوژمنـی ئێوەیـەو بەرژەوەنـدی ئێـوەی ناوێ، دوژمنایەتیەکەی بۆ ئێوە ئاشکراو نومایانە، هەرگیز فەرمانتان بە چاکە پـی ناکـا، لـە خراپـە بـەولاوە ڕێگـای ترتـان پیـشان نـادا، وەکـوو لـە شـوێنێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُـمْ عَـدُوٌّ فَاتَّخِـذُوهُ عَـدُوًّا إِنَّمَـا يَـدْعُو حِزْبَـهُ لِيَكُونُـوا مِـنْ

أَصْحَابِ السَّعِيرِ – فاطر/٦﴾. یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاء وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ – البقرة/١٦٩﴾.

ئەو ئاژەڵانەی کە پەروەردگار بە ﴿حَمُولَةً وَفَرْشًا﴾ ناوی بردن، هەشت جۆرن، چونکە (حموله) یان وشترە یان ڕەشەوڵاغە (فرش)یش یان مەڕ یان بزنە، هەر جۆرێکیش لەو چوار بەشە یان نێرە یان مێیە! پەروەردگار لە جۆری خاوەن دوگ‌و خوری بەران‌و مەڕی دروست کردووە، لە جۆری خاوەن (موو) نێری‌و بزنی بەدیهێناوە، لە جۆری ڕەشەوڵاغ‌و گاو مانگاو لە جۆری حوشتر وشترە نێرەو وشترە مێینەی دروست کردووە... بۆیە دەفەرموێ: ﴿ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ﴾ ئەو ئاژەڵانەی کە بۆ ئێوە ڕام کراون‌و گۆشتیان دەخورێ هەشت جۆرن. ئەمجار دێ دیارییان دەکاو دەفەرموێ: ﴿مِّنَ الضَّأْنِ اثْنَيْنِ﴾ لە مەڕدا دوو جۆری هەیە، بەران‌و مەڕ. ﴿وَمِنَ الْمَعْزِ اثْنَيْنِ﴾ لە بزندا دوو جۆری نێری‌و بزن. ﴿قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الأُنثَيَيْنِ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکە عەرەبانە بڵێ کە بە هەوانتە ئاژەڵیان دابەش کردووە بۆ جۆری – بەحیرەو سائیبەو حامی –و جۆری تریش، بڵێ ئایا نێرەکانیان کە بەران‌و نێرییە خودا حەرامی کردوون یان مێینەیان کە مەڕو بزنە؟؟ ﴿أَمَّا اشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ الأُنثَيَيْنِ﴾ یان ئەو بێچووەی کە لە منداڵدانی مەڕو بزنەکاندایە خودا حەرامی کردووە؟؟ واتە: منداڵدانی مێینەی ئاژەڵ یان نێری تێدایە یان مێ؛ دەی بۆچی برێکیان بە هەوانتە لە خۆتان حەرام دەکەن‌و هەندێکیان حەڵاڵ دەکەن، بە چ یاساو داب‌و نەریتێك ئەم حەڵاڵ‌و حەرامە دیاری دەکەن... ﴿نَبِّؤُونِي بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ بەڵگەی بەهێزو هەواڵی زانستانەم پێ بڵێن، پێم بڵێن: چۆن پەروەردگار ئەو ئاژەڵانەی کە پێتان وایە لێتان حەرام کراوە: وەکوو – بەحیرەو سائیبەو وەصیلەو حامی – لێی حەرام کردوون، بەڵگەیێ بێننەوە حەرام کردن بگەیەنێ، بەڵگەکە دەبێ لە نامەی خودادا هەبێ، یان پێغەمبەرێك هەواڵی پێ دابێ ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگە ئێوە ڕاست دەکەن‌و ڕاستگۆن لە ئیدیعاکەتاندا پەروەردگار ئەو جۆرە ئاژەڵانەی لێ قەدەغە کردوون، دەبێ یان ڕاستەوخۆ ئەم حوکمەتان لە خودا وەرگرتبێ ئەمەیان نەبووەو بۆخۆیان لافی ئەوە لێ دەدەن، یان

بـەهۆی پێغەمبـەرەوە پێتـان گەیـشتبێ، دیـارە بڕواتـان بـە پێغەمبـەر نیـە تـاکوو حوکمەی لێ وەربگرن!؟

لـە ڕاسـتیدا هـیچ عاقڵمەنـدێو کارامەیـیەك لـەم پـۆلێن کردنـەی عەرەبەکانـدا بەدی ناکرێ! دەی بە چ عەقڵێو هۆشـێك لەسـەردەمی نـەزانیو نەفامیانـدا ئـاوا بـە هەوانتە ئاژەڵیان دابەشو پۆلێن کردووە؟ ئەوەیان کردووە بە (بەحیرە)و ئەمـەیان کردووە بە (سائیبە)و (وەصیلەو حامی...) بە چ عەقڵێك ئـەم جۆرەیـان لـە خۆیـان حەرام کردووە، ئەو جۆرەیان بـە حـەڵاڵ دانـاوە؟ ئەگـەر نێرینـە حـەرام بـێ دەبـێ هەموو نێرینەیەك حەرام بن! ئەگەر مێیینە حەرام بێ دەبـێ هـەموو مێینەیـەکان حەرام بن... ئەگەر حەرامە کە بێچووی ناو منداڵدانی ئاژەڵە مێیینەکان بـێ دەبـێ هەموو بێچوویەك بە نێرو مێوە حەرام بن، چونکە هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەم بێچووەو ئەو بێچووەدا نیە، بۆچی ئەم حەرامەو ئەو حەڵاڵە؟!

نـەخێر پـەروەردگار هـیچ جـۆرێکی لـەم ئاژەڵانـە حـەرام نـەکردوون. ئـەو موشریکە خواگرتووانە درۆ دەکەن، بوختان بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن! لە دونیادا کـەس هێنـدەی ئـەو کەسـە سـتەمکار نیـە کـە بـەدەم خـوداوە درۆو بوختـان هەڵدەبەستێ! ئیـدیعای ئـەوە دەکا کـە خـودا شتێکی حـەرام کـردووە، لـە ڕاسـتیدا حەرامی نەکردووە، حەرام بوونی شتێك پاڵ خـودا بـدا کـە حـەرامی نـەکردووە بـۆ ئەوەی ڕێگا لە ئادەمیزادان گوم بکا، وەکوو عەمری کوڕی لوحەیی کوڕی قومئە کە یەکەم کەس بوو (بەحیرەو سائیبەو وەصیلەو حام)ی داهێنا، ئـایینی پێغەمبـەرانی گۆڕی، بەڕاستی ئەوانـەی شـەریعەتی خـودا دەگـۆڕن، بـەدەم خـوداوە درۆو بوختـان هەڵدەبەستن ستەمکارن، خوداش هەرگیز هیدایەتی ستەمکاران نادا!

ئـەمجار پـەروەردگار نارەزامەنـدی خـۆی بەرامبـەر هەڵوێـستی موشـریکەکان دەردەبڕێو بـە پێغەمبـەر دەفـەرموێ: بـە شـێوەی گاڵتـە پـێ کـردنو تـوانجو پـلار تێگرتن پێیان بڵێ: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ وَصَّاكُمُ اللَّهُ بِهَـٰذَا؟!﴾ ئایـا ئێـوە ئـەی گرۆهـی موشریكو ستەمکار! خودای خۆتـان چاوپێکەوتو ئـەم حـوکمی حـەرامو حەڵاڵەی پـێ ڕاگەیانـدن؟؟ ئـەو فـەرمانی پـی کـردن کـە ئـەم جـۆرە یاسایانە دابنـێن؟ ئـەو

فەرمانی پێ کردن کە بەدەم خوداوە درۆو بوختان هەڵبەستن‌و شتێك کە بۆخۆی حەرامی نەکردووە ئێوە حەرامی بکەن!

دیارە هیچ کامێ لەو جۆرە ڕووداوانە نەبوون، ئێوە تەنیا بوختان بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن، حوکم‌و یاساکانتان بێ بنج‌و بێ بناوانن‌و هیچ بەڵگەیەکی ئایینی‌و زانستیتان بەدەستەوە نیە!

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ دەی کێ لەو کەسە ستەمکار ترە کە بەدەم خوداوە شت هەڵدەبەستێ ﴿لِّيُضِلَّ النَّاسَ﴾ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد گومڕا بکا، کارە گومڕائامێزەکەشی ئەنجام دەدا ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەبێ ئەوەی بەڵگەی بەدەستەوە بێ، بەڵکوو بە نەزانی‌و نەفامی ئەم حەرام‌و حەڵاڵە دیاری دەکا ستەم لە خودا دەکا، کارێك کە تایبەتە بە خوداوە کە حەرام کردن‌و حەڵاڵ کردنە ئەوان دەیانەوێ لێی زەوت بکەن، لافی شەریعەت دانان لێ دەدەن! ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار هەرگیز هیدایەتی گرۆهی ستەمکاران نادا، حەق‌و عەدالەتیان پێ نیشان نادا، ڕێگای ڕاست‌و بەرژەوەندی ئامێزیان لێ گوم دەکا.

## تێبینی

١- ئایەتی ﴿وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زەکاتی بەروبوومی کشتوکاڵ‌و دارو درەخت واجب‌و پێویستە، ئەندازەکەشی دە یەکە بۆ زەوی‌و زارێك کە بە ئاوی باران ئاو بدرێ، نیوی دە یەکە ئەگەر بەهۆی جۆگەو بیرەوە ئاو بدرێ!

٢- کۆمەڵێك پێیان وایە ئایەتەکە دەربارەی بەخشینێکە غەیری زەکات، خودا فەرمانی پێ کردووەو فەرمانەکەشی بۆ (نەدبە) نەك بۆ وجوب.

ئەبو حەنیفە ئەم ئایەتەو حەدیثەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) - کە بوخاری‌و ئەبو داوود لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووەو دەفەرموێ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ الْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ أَوْ دَالِيَةٍ نِصْفُ الْعُشْرِ» - کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەرچی زەوی دەیڕوێنێ خواردەمەنی بێ، یان شتی تر جگە لە دارو گیاو گژ، لقە دارخورماو قەفەزاژی هیندی‌و قەفەزاژی شەکر زەکاتی تێدایە.

جەماوەری زانایان پێیان وایە کە فەرموودەکەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) ئەوە ناگەیەنێ بەڵکوو مەبەست دیاری کردنی ئەو شتانەیە کە دە یەکی تێدایە یان نیوەی دە یەکی تێدایە.

ئیبنو عەبدولبەر دەفەرموێ: شەرعزانان ناکۆکیان لەوەدا نیە کە زەکات لە گەنمو جۆو مێوژو خورمادا پێویستە.

**ئەمجار لە شتەکانی تردا زانایان دوو رایان هەیە:**

١- رای ئەبو حەنیفە وایە کە هەر بەروبوومێك لە زەوی دێتە دەر کەم بێ یان زۆر بێ، جگە لەو شتانەی کە لەوەپێش چەرتی کردن زەکاتی تێدایە!

٢- رای دووەم رای جەماوەری زانایانە؛ بە قوتابیەکانی ئەبو حەنیفەشەوە دەڵێن: زەکات لە بەروبوومی کشتوکاڵدا واجب نیە جگە لەو شتانەی کە هەڵدەگیرێنو بە بژێوی ئادەمیزاد حلێب دەکرێن...

حەنبەلیەکان دەڵێن: ئەو شتە زەکاتی تێدایە وشك بکرێتەوەو هەڵبگیرێو پێوانە بکرێ!

شافیعییەکان دەڵێن: لە میوەی دارو درەختدا جگە لە مێوژوو خورما شتەکانی تر زەکاتیان لێ ناکەوێ، چونکە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) تەنها لەو دوو جۆرە زەکاتی وەرگرتووە!

زەکات لە میوەو سەوزەدا نیە، تیرمیذی لە مەعاذەوە حەدیثێك دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: لە بارەی میوەو سەوزە لە پێغەمبەریان پرسی فەرمووی: (لیس فیها شيء) هیچ جۆرە زەکاتێکی تێدا نیە... مەرجە ئەو بەروبوومە زەکاتی تێدا واجب دەبێ پێویستە بگاتە پێنج ویسق، واتە (٦٥٣ کغم).

زەکاتی بەروبوومی زەوی پێویست بە وەرچەرخانەوەی ساڵ ناکا، چونکە مەرجی واجب بوونی زەکات تێیاندا پێگەیشتنو دوورینەوەو چنینو ڕنینو مشتاخ نانەوەو هەڵگرتنەوەیەتی... لە زەکاتی پارەو ئاژەڵدا تێپەڕ بوونی ساڵ مەرجە، چونکە ئەمانە مەزندەی گەشەکردنیان تێدا بەدی دەکرێ!

رای پەسەند رای حەنەفیەکانە کە دەڵێن: زەکات تێیاندا کاتی لێکردنەوەو دروونەوە واجب دەبێ، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ حَصَادِهِ...﴾.

مالیکییەکان دەڵێن: بەروبوم کە گەیی زەکاتی تێدا واجب دەبێ، چونکە پێش گەیشتن بە ئالف حلێب دەکرێ، هەرکاتێ پێگەیی و کاتی خواردنی هات زەکاتی تێدا واجب دەبێ!

شافیعیەکان و خەنەفیەکان دەڵێن: میوە کە لە خەم ڕەخسی و زاندرا بەکار دێ، زەکاتی تێدا واجب دەبێ و دەخەرسێندرێ، ئەمجار دوایی زەکاتیان لێ دەردەکرێ، دانەوێلە کە دەنکەکەی ڕەق بوو زەکاتی تێدا واجب دەبێ.

## خواردەمەنی حەرام لەسەر موسوڵمانان و حەرام لەسەر جوولەکە

﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٤٥ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ١٤٦

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار رەدی موشریکەکانی دایەوە کە لە خۆیانەوە شتیان حەرامو حەلاڵ دەکرد، ئەوەی روون کردەوە؛ کە حەلاڵ کردنو حەرام کردن بە نیگای خودایی دەبێ و بەس! ئەمجار لێرەدا ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەو خواردەمەنیانەی خواردنیان حەرامە تەنها چوار شتن: مردارەوە بوو، خوێنی رەوان، گۆشتی بەراز، هەرشتێك ناوی غەیری خودای لەسەر برابێ.

عەبدی کوڕی حەمید لە طاووسەوە ڕیوایەت دەکاو دەڵێ: ئادەمیزادان لە پێش هاتنی ئیسلامدا هەروا لە خۆیانەوە بڕێ شتیان حەرام کردوو بڕێ شتیان حەلاڵ کرد، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: من لەو سروشەی بۆم کراوە؛ کە قورئانی پیرۆزە، شتێکی تێدا نابینم کە بۆ بخۆر حەرام بێ ﴿إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً﴾ مەگەر مردارەوە بوو بێ – ماسیو کوللە بەرناکەون چونکە ئەوان بە حەدیثی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕوون کراوەتەوە کە مردارەوە بووی ئەو دوو گیانلەبەرە حەلاڵن.

﴿أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ یان خوێنێکی شلی رەوان، نەك خوێنی توندی تۆپەڵ بەستوو؛ وەکوو جەرگو سپڵ. ﴿أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ﴾ یان گۆشتی بەراز ﴿فَإِنَّهُ رِجْسٌ﴾ بێگومان ئەوە پیسە، ﴿أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ﴾ یان سەربڕاوێك بێ ناوی غەیری خودای لەسەر برابێ.

ئایەتەکە لێرەدا جەختی لەسەر ئەوە کرد کە چوار جۆر گۆشت خواردنیان حەرامەو یەکە یەکە دیاری کردن، لە سورەتی (النحل)یشدا بەشێوەی جەخت لەسەر کردنو کورت هەڵهێنان جارێکی تر ئەم چوار جۆرە خواردەمەنیانە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالْدَّمَ وَلَحْمَ الْخَنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – النحل/١١٥﴾ هەردوو ئایەتەکە

ئایەتی (١٤٥ الأنعام)و ئایەتی (١١٥ النحل) کە ئایەتی مەککەیین واتە لە پێش کۆچدا هاتوونە خوارێ بەشێوەی حەصرو جەخت لەسەر کردن ئەوە دەگەیەنن کە شتە حەرامەکان لەم چوار جۆرەدا کورت هەڵهێنراون، هەروەها ئایەتێکی مەدەنیش لە سورەتی (البقرة)دا هەمان حوکم جەخت دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ – البقرة/١٧٣﴾. ئەوەتا لێرەشدا وشەی (إِنَّمَا) کە حەصرەو کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ بەکارهێناوە.

لەسەرەتای سەرەتی (المائدة)شدا دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ – المائدة/١﴾ ڕاڤەکەرانی قورئان (مفسرون) لەسەر ئەوە کۆکن کە مەبەست بە ﴿إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ ئەو شتانەیە کە لە ئایەتی سێیەمی ئەو سورەتەدا واتە (المائدة)دا ڕیزی کردوون کە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ – المائدة/٣﴾ هەموو ئەو شتانە بە مردارەوە بوو حلێب دەکرێن، پەروەردگار بۆیە یەکە یەکە ناوی هێنان چونکە ئەوان پێیان وابوو: کە (الْمُنْخَنِقَةُو الْمَوْقُوذَةُ...هتد) حەڵاڵن، کەوابوو ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە شەریعەت لە بنەڕەتەوە تا کۆتایی لەسەر ئەم حوکمەو کورت هەڵهێنانە دامەزراوە.

شایانی باسە ئەو حەصرو کورت هەڵهێنانە لە ئایەتەکان وەردەگیرێ موطلەق‌و ڕەها نیە، بەڵکوو نیسبی‌و ئیظافیە؛ واتە بەنەزەر ئەو حەڵاڵ‌و حەرام کردنەی بتپەرستەکانەوەیە: کە بە هەوانتە بەدەم خوداوە هەڵیان دەبەست‌و بڕیاریان لەسەر دەدا، لە ناو شتە حەرام کراوەکانی ئەواندا تەنها ئەم چوارە حەرامن.

کەواتە: مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە دەکرێ: پەروەردگار بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەی محمد! بەو کەوسانە بڵێ: کە ڕزق‌و ڕۆزی حەڵاڵی خودا بەهەوانتە حەرام دەکەن، بڵێ: من نابینم لەو قورئانەدا کە بە سرووش بۆم هاتووە خواردنێك لەسەر بخۆر حەرام بێ جگە لەم چوار شتە.

١- مردارەوەبوو: ئەو گیانلەبەرەی بەبێ سەربڕینی شەرعی گیانی دەرچێ، ئیتر ئەم جۆرە هەموو ئەو ئاژەڵانە دەگرێتەوە کە بەهەڵدێران، یان بە خنکان، یان

بـه‌هۆی شـه‌ڕو لێـدان وه‌كـوو شه‌ڕقۆچـی كه‌ڵـه‌گاو شـه‌ڕه‌به‌رانو شـه‌ڕنێری...هتـد. گیانیان ده‌رچووبێ یان دڕنده كوشتبێتی... حه‌رام بوونی ئه‌م جۆره گۆشـته له‌بـه‌ر ئه‌وه‌یه خوێنـه‌كه‌ی تێدا ماوه‌ته‌وه‌و گۆشته‌كه ژه‌هـراوی ده‌بـێو تێكده‌چـێ؛ كه‌سـێك بیخوا له‌وانه‌یه ته‌ندروستی پێ تێك بچێ!

٢- خوێنی ڕژاوو ڕوونو ڕه‌وان: كه له ڕه‌گـو ده‌ماری سـه‌ربڕاوه‌كه‌وه ده‌رده‌چـێ. واته: خوێنێك حه‌رامه كه شلو ڕه‌وان بێو له‌كاتی سه‌ربڕین له لاشه‌كه‌وه ده‌ربچێ.

ئیبنو عه‌بباس ده‌فه‌رموێ: مه‌به‌ستی ئه‌و خوێنه‌یه كه له شا ڕه‌گه ده‌ماری ملی ئاژه‌ڵه سه‌ربڕاوه‌كه ده‌رده‌چێو هێشتا گیانی تێدا ماوه. كه‌وابێ خوێنی توند وه‌كـوو سـپڵو جـه‌رگ، یـان ئـه‌و خوێنـه‌ی كـه تێكـه‌ڵاو گۆشـته‌كه بـووه، لـه ده‌ماره‌كانیـدا ده‌مێنێته‌وه حه‌ڵاڵه، چونكه خوێنی ڕه‌وان نین.

عكریمه له‌سه‌ر ڕسـته‌ی ﴿أَوْ دَمًـا مَّـسْفُوحًا﴾ ده‌ڵـێ ئه‌گـه‌ر ئـه‌م ئایه‌تـه نه‌بوایـه ده‌بوایه خه‌ڵك ناو ده‌ماره‌كانی ئاژه‌ڵه سه‌ربڕاوه‌كانی پاك بكردایه‌وه له هه‌ر شـوێنێ دڵۆپـه خوێنـێ بمایـه ده‌بـوا ده‌ری بێـنن، وه‌كـوو جووله‌كـه ده‌یـانكرد، حـه‌دیثێكی پێغه‌مبه‌ر (دروودی خوای له‌سه‌ر بێ) هه‌یه ده‌فه‌رموێ: «أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ».[1]

هۆی حه‌رامی خوێنی ڕه‌وان ئه‌وه‌یه: كه جۆره‌ها میكرۆبو نه‌خۆشـیو گـه‌رای تێدا بڵاو بێته‌وه.

٣- گۆشتی به‌راز: هه‌روه‌ها پیو هه‌موو به‌شه‌كانی لاشـه‌ی بـه پێـستو گۆشـتو ئێسقانه‌وه گـڵاوو پیـسه، سـه‌گیش حـوكمی بـه‌رازی هه‌یـه، هـه‌موو ئه‌مانـه وه‌كـوو مرداره‌وه‌بوو پیسو ڤیز لێ كراون طه‌بیعه‌تی پاك بێزی لێیانه‌و خۆیان لێ بـه دوور ده‌گرێو توخنیان ناكه‌وێ.

٤- هـه‌ر سـه‌ربڕاوێك نـاوی خـودای له‌سـه‌ر نـه‌هاتبێ: واتـه: سـه‌ربڕینه‌كه‌ی بـۆ غه‌یری خودا بێو ناوی غه‌یری خودای له‌سـه‌ر بـبرێ، وه‌كـوو ئـه‌و حه‌یوانانـه‌ی كـه موشـریكه‌كان له‌سـه‌ر بـه‌رد (نـصب)ه‌كـانی ده‌وری كابـه یـان بـۆ بتـه‌كانیان سـه‌ریان ده‌بڕین، یان ڤومارو به‌خت گرتنه‌وه‌یان له‌سه‌ر ده‌كردن!

---

[1] – به‌یهه‌قی له سوننه‌كه‌یداو حاكم له عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ره‌وه ڕیوایه‌تیان كردووه.

ئەمجار پەروەردگار حاڵەتی ناعیلاجی لەم حوکمە چەرت دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ کەسێك کەوتە حاڵەتی تەنگانەو برسیایەتی تەنگی پێ هەڵچنیو بە هیچ شێوەیەك خواردنی حەلاڵی دەست نەکەوت بە ناچاریو بە گوێرەی پێویست هەندێکی لەو حەرامە خوارد، ئەوە خودا لێخۆشبوو بە بەزەییەو بە تاوان بۆی حلێب ناکا، چونکە ئەوە بۆ رزگار کردنی ژیانەو دابین کردنی پێویستی زەرووریيەو بەو حەرام خواردنە خۆی لە مردن رزگار دەکا!

پوختەی قسە ئەوەیە: مەبەستی ئایەتەکە رەتدانەوەی موشریکەکانە کە بە هەوانتەو لە خۆیانەوە (بەحیرە)و (سائیبە)و (وەصیلە)و (حامی)یان لە خۆیان حەرام کردبوو، ئیتر پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی کرد کە پێیان بڵێ لەو نیگایەی بۆ ئەو هاتووە ئەوەی تێدا نیە کە ئەو شتانە حەرام بن، بەڵکوو حەرام تەنها ئەو چوار جۆرەن: کە مردارەوەبوو خوێنی ڕەوانو گۆشتی بەرازو شتێك ناوی غەیری خودای لەسەر ببرێ... چونکە خواردنی ئەم جۆرە شتانە زیانی ماددیو مەعنەویان تێدایە! ئەرکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە حەلاڵ دانانی شتی پاكو حەرام کردنی شتی پیسە! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ – الأعراف/١٥٧﴾. بەڵام وەکوو وتمان: کورت هەڵهێنانی شتە حەرامەکان لەو چوار شتانەدا موتلەق نیە. بەڵکوو حەصرەکە نیسبی یە، ئەو حوکمەی ئەم ئایەتەو وێنەکانی دەیگەیەنن بە ئایەتی ترو فەرموودەی پێغەمبەر تەخصیص دەکرێ وەکوو ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ – الأعراف/١٥٧﴾ ئەوەتا ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچی پیس بێ خواردنی حەرامە، هەروەها حەدیثەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە بوخاریو موسلیم لە جابیرەوە گێڕاویانەتەوە دەڵێ: «نَهَى رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ». هەروەها بوخاریو موسلیم لە ئەبو ثەعلەبەی خوشنییەوە فەرموودەیەکی تریان گێڕاوەتەوە دەڵێ: «نَهَى النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – عَنْ كُلِّ ذِى نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ» لە گێڕانەوەی ئیبنو عەبباسدا

هاتووه «كُلِّ ذِى مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ» هەروەها فەرموودەیەكی تریان لەخاتو عائیشەو حەفصەو عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ڕیوایەت كردووە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ يُقْتَلْنَ فِى الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ الْكَلْبُ الْعَقُورُ» جا كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بە كوشتنو لە ناوبردنیان كردووە بەڵگەیە لەسەر حەرامی خواردنیان، چونكە كوشتن جودایە لەسەربڕینی شەرعی، سەربڕین پێی ناگوترێ كوشتن.

شافیعییەكان ئایەتەكەیان تەخصیص كردووە بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر كە دەفەرموێ: «واستَخبَثَتْهُ الْعُرَبُ فَهُوَ حَرَامٌ» ئەوەی عەرەبی سروشت ساغ بە پیسی دابنێن حەرامە.

پوختەی ڕایەكەیان ئەوەیە هەر ئاژەڵو پەلەوەرێك دەقێكی قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەر حەڵاڵو حەرامیان دیاری نەكردبێ، فەرمانیش بە كوشتنو لەناوبردنی نەكرابێ ئەو كاتە ئەگەر عەرەب بە پاكیان دانا بوو ئەوە حەڵاڵە، ئەگەر بە پیسیا دانا بوو ئەوە حەرامە، بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە كە دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ﴾. یان ئەو ئایەتەیە كە دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ – المائدة/٤﴾. دەڵێن: مەبەست بە ﴿الطَّيِّبَاتُ﴾ لێرەدا حەڵاڵ نیە بەڵكوو مەبەست پاكو خاوێنییە مەبەس ئەو خواردەمەنیانەیە كە عەرەبەكان بە خاوێنیان حلێب كردووە چونكە ئەگەر وانەبێ ئەو كاتە تەقریری ئایەتەكە بەم جۆرە دەبێ ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الحَلاَلَ﴾ ئەمەش بێ مانایە!!

هەروەها مەبەست بە ﴿الْخَبَآئِثَ﴾ ئەو شتانەیە كە عەرەبەكان بە پیسی دادەنێن! هەڵبەتە لە بارەی بە پاك دانانو بە پیس دانانەوە تەماشای ڕای زۆرینە دەكرێ ڕای كەمینە بەرچاو ناگیرێ، چونكە ئەگەر ڕای كەمینەو تایبەت بە بەرچاو بگرین ئەوە سەردەكێشێ بۆ تێكەڵاو بوونی حەڵاڵ بە حەرامو سەر لێشێوانی موسوڵمانان!

زۆربەی زانایانی سەلەف ظاهیری ئایەتەکەیان وەرگرتووەو جگە لەو چوار شتەی ئایەتەکە بە حەرامی داناون هەموو شتێکیان بە حەڵاڵ داناوە. ئەبو داوود دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەربارەی گۆشتی ژیشك پرسیار لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کرا، ئایەتی ﴿قُل لاَّ أَجِدُ﴾ی خوێندەوە واتە: بە حەلاڵی دانا، ئیبنو ئەبی حاتەمو هی تریش بە سەنەدی صەحیحو ڕێكو پێك دەگێڕنەوە دەڵێن: خاتوو عائیشە (حەرەمی پێغەمبەر) کە دەربارەی خواردنی گۆشتی دڕندەی خاوەن کەڵبەو باڵندەی خاوەن چنگ پرسیاری لێ دەکرا ئایەتی ﴿قُل لاَّ أَجِدُ﴾ی دەخوێندەوە!

لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) هیچ ئاژاڵێك حەرام نیە جگە لەوەی کە خودا لە قورئاندا حەرامی کردووە، کە دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ...﴾ ئەمجار لەرستەی ﴿عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ﴾ ئەو حوکمەی دەرهێناوە: کە لە مردارەوە بوو تەنیا ئەو شتانەی دەخورێن حەرامە، کەوابێ پێستو کوڵكو مووو خوری بەر ناکەوێ، پێستی مردارەوە بوو کە لە دەباغ بدرێ پاك دەبێتەوە، پێغەمبەریش (درووودی خوای لەسەر بێ) بەم جۆرە لە دەقەکە گەیشتووەو بەیانی کردوە، ئەوەتا ئیمامی ئەحمەدو هی تریش لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: مەڕێکی سەودەی کچی زەمعە مردارەوە بووە لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن: مەڕکە هی مەیموونە بووە، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەبوایە سوود لە پێستەکەی ببینن، فڕێتان نەدایە! ئافرەتە خاوەن مەڕەکە وتی: پێستی مەڕی مردارەوە بوو بەکار بێنین؟ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً﴾ دەی خۆ ئێوە نایخۆن! ئەگەر لە دەباغتان بدایەو سوودتان لێ وەربگرتایە هیچ مانیعێك نەبوو).

ئەمجار پەروەردگار لە بەراورد کردنێك لە نێوان شەریعەتی تەوراتو شەریعەتی قورئاندا هەواڵی ئەو خواردنانە رادەگەیەنێ کە لە نەتەوەی ئیسرائیلی قەدەغە کردوون وەکوو سزادانێك بۆیان، دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ﴾ بە تایبەتی لەسەر نەتەوەی جوولەکە – نەك گەلو نەتەوەکانی دیکە – هەموو خاوەن ناخونێك لە ئاژەڵو پەلەوەرمان حەرام کرد، واتە: ئەوانەی یەك

سمیـان هەیـەو قاچـیان دووفـاقو سـێ فـاق نیـە وەکـوو حوشـترو مـورغو قـازو مـراوی...هتـد. بەمەبەسـتی سـزادانو تۆڵـە لەسـەر جوولەکـە حـەرامـمان کـردنو خواردنیانمان لێ یاساغ کردن![1]

﴿وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا﴾ هـەروەها لـە ئـاژەڵی رەشـەوڵاغو مـەڕو بزنـدا بـەس ئـەو بـەزو پیـوەی بـە ئاسـانی جیـا دەکرێتـەوەو کەوتۆتـە سـەر ورگو گورچیلەیانو تێکەڵاو گۆشتو ئێسقانیان نـەبووە لێمـان حـەرام کـردن، ﴿إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا﴾ بـەڵام بـەزو پیـوی پـشتیانو کلکیـان ﴿أَوِ الْحَوَايَا﴾ یـان بـەزو پیـوی ریخۆڵـەکانیان ﴿أَوْ مَـا اخْـتَلَطَ بِعَظْـمٍ﴾ یـان ئـەو بـەزو پیـوەی کـە لکـاوە بـە ئێسقانەوە هەموو ئەو جۆرە بەزو پیوانەمان بۆ حەڵاڵ کردبـوون ﴿ذَلِـكَ جَزَيْنَـاهُم بِبَغْيِهِمْ﴾ ئـەو حـەرام کـردنو خواردەمـەنی یاسـاغ کردنـەی دەربارەیـان ئەنجامـمانـدا بەهۆی سنوور شـکێنیو سەرپێـچی کردنـی خۆیانـەوە بـوو، سـزاو تۆڵـە بـوو لێمـان سـتاندن سـزای کوشـتنی پێغەمبـەرانو بـەرگریی کـردن لـە بڵاوبوونـەوەی ئـایینی خوداو ریبا وەرگرتنو خواردنی ماڵی خەڵك بە نارەواو پێشیان حـەڵاڵ بـوو! ئەمـە رەتدانەوەی جوولەکەکانە کە دەیانگوت: خـودا هیـچی لێ حـەرام نـەکردووین، ئێمـە بۆخۆمان ئەو خواردەمەنییانـەی ئیـسرائیل لـە خـۆی حـەرام کردبـوون ئێمـەش لـە خۆمان حەرام کردن ئـیتر پـەروەردگار بـەم شـێوە بـەدرۆی خـستنەوەو دەفـەرموێ: ﴿وِإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ ئێمە راستگۆین لە گێرانەوەی ئەم هەواڵانەداو ئێمە بە مەبەسـتی تەمبێ کردنیان ئەو خواردەمەنیانەمان لێ حـەرام کـردن نـەك وەکـوو جوولەکـەکان دەڵێن: گوایـە ئیـسرائیل ئـەو خواردنانـەی لـە خـۆ حـەرام کردبـوونو ئێمـەش لـە خۆمان حەرام کردن.

ئیبنو کەثیر دەڵێ: مانای ﴿وِإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ واتە: (وانـا لعـادلون فیمـا جازینـاهم بە) ئێمە دادپەروەرین لە تۆڵە ستاندنو سزادانـدا، ستەمیان لێ ناکەین!.

﴿فَإِن كَذَّبُوكَ﴾ ئەی محمد! ئەگەر دوژمنـەکانت لـە موشـریكو جوولەکـەو هـاو وێنەکانیان بڕوایان پێ نەکردیو بە درۆیان خستیەوەو بـە پێغەمبـەریان نـەزانیو

---

[1] – ئیبنو عەبباسو موجاهیدو قەتادەو سەعیدی کوڕی جوبەیر ئاوایان مانا کردووە.

حوکمو یاسای ئیسلامیان رەت کردەوە ﴿فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ﴾ بلێ: خودای ئێوە خودایەکی خاوەن بەزەیی فراوانە، هەرکەسێك بیەوێ ئەو رەحمەتەی بەربکەوێو شوێن پێغەمبەرەکەی بکەوێ لە رەحمەتی خودا بێ بەش نابێ! ئەمەیش تەماع بەرنانو بەهیوا کردنیانە، خۆ ئەگەر لەسەر یاخی بوونو سەرپێچی کردنی خۆیان بەردەوام بن ئەوا خودا تۆڵەیان لێ دەستێنێو سزایان دەدا ﴿وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُهُ عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾ تۆڵەو سزای خودا کە هات بۆ گەلو نەتەوەی تاوانبارو یاخی بوو سەرپێچیکار ناگێردرێتەوە کەس نیە بتوانێ بەرەنگاری بکاو نەهێڵێ ئەو سزایە بە ئەنجام بگەیەنرێ. ئەمەشیان ترساندنو هەڕەشە لێ کردنیانە بۆ ئەوەی کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نەکەن! ئەم بە تەما کردنو هەڕەشە لێ کردنە (الترغيب والترهيب)ە شێوازو ئوسلوبێکی هەرە دیاری قورئانە، زۆرجار ئاوا ئادەمیزادان بە تەمای بەهەشت دەکا بە ئاگری دۆزەخیش هەڕەشەیان لێ دەکاو وەکوو لە کۆتایی ئەم سورەتەشدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾

**تێبینی**:

زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەم رایەن کە هەر شتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) حەرامی کردبێ یان لە شوێنی تری قورئاندا حەرام کرابێ ئەوە دەخرێتە پاڵ ئەم شتە حەرامانەی ئێرەو بە زیاد کردنی حوکم دەژمێردرێو پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەری خۆی بەخەڵکی ڕادەگەیەنێ. بۆ نموونە پەروەردگار لە سورەتی نیسائدا دوای دیاری کردنو باسکردنی ئەو ئافرەتانەی کە ناشیەن پیاو مارەیان بکا فەرموویە: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ – النساء/٢٤﴾. دەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکدا مارە کردنی ئافرەتی بەسەر پوریدا حەرام کردووە، واتە: ئەگەر پیاوێك ژنی هەبوو ویستی ژنێکی تر بهێنێ ئەو ئافرەتەی کە دەیەوێ مارەی بکا نابێ خوشکەزاو برازای ژنەکەی بێ چونکە نابێ دوو ئافرەتی ئاوا لێك نزیكو خزم ببنە هەوێی یەکتری. ئەم

حەرامکردنــە دەخرێتــە پــاڵ حەرامــەکانی تــرەوە لــەم رووەوە نموونــە زۆرو زەبەندەن، کتێبەکانی ئوصولو شتەریعەتو تەفسیرەکان بە درێژی باسیان لێوە کردووە.

ئیمامی مالیك دەڵێ: حەرامی روونو ئاشکرا جگە لەوەی لەم ئایەتەدا باس کراوە نییە، بۆیە برێ لە زانایانی رێبازی ئیمام مالیك پێیان وایە گۆشتی درندەو باقی ئاژەڵی تر جگە لە ئینسانو بەراز حەڵاڵە بخورێ!

هەڵبەتە لەکاتی برسیەتیو ناچاریدا هەموو خواردەمەنییە حەرامەکان جگە لە گۆشتی ئادەمیزاد خواردنیان حەڵاڵە بەڵام نابێ زێدەڕەوییان تێدا بکرێ. بابای برسی هەردەبێ ئەوەندەیان لێ بخوا کە لەمردن رزگاری ببێ.

## ئیدیعای موشریکەکان دەربارەی هاوەڵ دانان بۆ خوداو شت حەرام بوون لێیان

﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلۡ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشۡهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَاۖ فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشۡهَدۡ مَعَهُمۡۚ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ

بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار باسی نەفام و خوانەناسەکانی سەردەمی نەزانی کرد بە هەموو شێوەیەك دەمکوتی کردن، ئەمجار باسی بیرو بۆچوونی پڕوپووچی تریان دەکاو لەهەموو لایەکەوە تەنگیان پێ هەڵدەچنێ و بۆریان دەداو دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا﴾ لەوە بەولاوە ئەوانەی موشریك و خوانەناسن دەڵێن: ئەگەر خودا بیویستایە ئێمە موشریك نەبین نە خۆمان و نە باوك و نە باپیرمان موشریك نەدەبووین ﴿وَلاَ حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾ هیچ کامێك لەو شتانەی خودا حەڵاڵی کردووە حەرامیان نەدەکرد، واتە: ئەگەر بیویستایە ئێمە کافر نەبین نەیدەهێشت کافر ببین، کە مەنعی نەکردووین مانای وایە ویستی خودا وایە ئێمە کافر بین و ئەو شتانە لە خۆمان حەرام بکەین کەوابێ ئێمە عوزرمان هەیە!

لەراستیدا ئەمە شوبهەیەکە کردوویانە بە بیانوو بۆ کوفرو بێدینییەکەیان! بڕو بیانوویەکی پڕوپووچ و بێ بناغەیە. خودا بەسەر هاوەڵدانانیان بۆ خوداو حەرام کردنی شتی حەڵاڵ لە خۆیان و بناغەی بیروباوەڕو هەڵوێستیاندا زاناو ئاگادارە. هەڵبەتە ئەم ئایەتە هەواڵێکی غەیبییە، پێش بەدیهاتنی، پەروەردگار هەواڵەکەی فەرمووە، دوایش چۆنی فەرمووە ئاوا هاتۆتە دی وەکوو لە سورەتی (النحل/٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلا آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ – النحل/٣٥﴾ یان لەسەر زوبانی کافرەکان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْ شَاء الرَّحْمَنُ مَا عَبَدْنَاهُم مَّا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ – الزخرف/٢٠﴾.

ئەمجار پەروەردگار بیانووەکەیان رەت دەکاتەوەو بیروبۆچوونەکەیان بە پووچ دادەنێ و دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم﴾ وەکوو ئەو بەدرۆ خستنەوەی موشریکە عەرەبەکان و دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری کە بەبێ بەڵگە بانگەوازی

پێغەمبەریان رەت کردەوە، یەکتاپەرستیو پەروەردگاریەتی خودایان نەسەلماندو نەهاتن مافی دانانی شەریعەتی حەرام کردنو حەلاڵ کردن هەر بۆخودا بە رەوا بزانن؛ هەر بەو شێوە گەلو نەتەوە پێشینەکانیش بەبێ بەڵگەی عەقڵیو زانستی، پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکانی خۆیان بە درۆ خستوونەوە. بەدرۆ خستنەوەکەیان بە هەوانتەو لە خۆوە بووە، لە ئاکامی تێفکرینو وردبوونەوە نەبووە، خۆ ئەگەر بیروبۆچوونەکانیان راست بوونایە، خودا لەسەر ئەو کوفرو بێدینییەیان سزای نەدەدان، چونکە خودا دادپەروەرەو هەرگیز کاری ستەمکاری ناکا! ئەگەر کردارو گوفتارە کوفر ئامێزەکانیان بە زۆرو زەخت خودا پێیان بکا ئەوە شیاوی سزاو تۆڵە نەدەبوون لەسەر ئەو کوفرو بێدینییەیان، هەروەها لە قورئاندا ئەوەندە جارە ئایەتی لە جۆری ﴿فَأَخَذْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ﴾ ﴿أَهْلَكْنَاهُمْ بِظُلْمِهِمْ﴾ دووبارەو سێ بارە نەدەبوونەوە!

﴿حَتَّى ذَاقُواْ بَأْسَنَا﴾ ئەو گەلو نەتەوە بەدبەختانە بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان هەتا سزای پڕاوپڕی سەرپێچی کردنەکانیانمان بەسەردا ڕشتنو تۆڵەمان لێ ستاندن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کافر بوونو حەرام کردنی حەلاڵو حەلاڵ کردنی حەرام بە ویستو ئیرادەی خۆیان بووەو دەیانتوانی وانەکەن! هەرچەندە پەروەردگار دەیتوانی هەڵوێستیان بگۆڕێ بەم جۆرە بیروباوەڕی راستو دروستی بخستایە دڵیانەوەو لەمپەڕی دروست بکردایە لە نێوان ئەوانو کوفردا! بەڵام ئەو هەڵوێستەشیان هەر بە ویستی خودایە، چونکە هیچ شتێك لە بوونەوەردا بەبێ ویستو ئیرادەی خودا نایەتەدی.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا کە داوای بەڵگەی عەقڵیو زانستی لەسەر بیروبۆچوونەکانیان بخەنە ڕوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانە بڵێ: ﴿هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا؟﴾ ئایا لای ئێوە زانیاریو بەڵگەیەکی واهەیە کە بتوانن پشتی پێ ببەستن بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕەکەتان؟ ئەگەر لاتان هەیە دە بیخەنە ڕوو پیشانمان بدەن با بزانین چۆنە!!

ئەم پرسیار لێ کردنە بۆ گاڵتە پێ کردنەو ئەوە دەگەیەنێ مەحاڵە ئەو بیروباوەڕەی ئەوان بەڵگەی زانستی پشتگیری لێ بکا، لە هەمان کاتدا سەرزەنشتو

لۆمە كردنیانە لەسەر ئەو جۆرە بۆچوون‌و گومانەیان، ئاشكرایە كە هیچ بەڵگەی زانیارییان بەدەستەوە نیەو ناتوانن هیچ بنەمایەكی زانستی بۆ بیروباوەڕەكەیان بدۆزنەوە، كەوابێ پێیان بڵێ: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلاَّ تَخْرُصُونَ﴾ ئێوە دەربارەی ئەم بیروباوەڕە پووچەی هەتانەو لەسەر ئەم هەڵوێستە ناشیرینانەی دەیاننوێنن هیچ بەڵگەیەكی زانستی‌و ئایینیتان بەدەستەوە نیە، جگە لەوەی شوێن گومان كەوتوون‌و بەدەم قسە فڕێ دەدەن‌و شوێن خەیاڵ پڵاو بیروبڕوای گەندەڵ كەوتوون‌و بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستن‌و داواكەتان بێ بنج‌و بناوانەو بێ بەڵگەو دەلیلە! هیچتان بەدەستەوە نیە.

ئەمجار كە بەم شێوە دەم كوتت كردن‌و سەرشۆڕو دەسەوەستان كەوتن‌و هیچ بەڵگەیەكیان پێ نەبوو ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو موشریكە نەفامانە بڵێ: ﴿فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ﴾ بەڵگەی تەواو بەهێزو بێ وێنە لەسەر چەسپاندنی راستی‌و پووچەڵ كردنەوەی بەتاڵ هەر بۆ خودایە، هەر كە ویستی حەق بچەسپێنێ‌و بەتاڵ تڕۆ بكا بنەمای بیروباوەڕی راست دابمەزرێنێ، ئەحكامی راست‌و پتەو دابڕێژێ بە ئەوپەڕی رێك‌و پێكی ئەنجامیان دەدا، هەموو بیروبۆچوونەكانی ئەوان بە بەڵگەو نیشانەی پتەوو زانست ئامێز هەڵدەوەشێنێتەوە ﴿فَلَوْ شَاء لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە ئێوە كافر نەبن ئەیخستنە سەر رێگای راست‌و بە زۆر ئیمانی پێ دەهێنان‌و ناچاری دەكردن كە واز لە شەریك دانان بێنن، لە خۆتانەوە شت حەرام‌و حەڵاڵ نەكەن، هەمووتانی هیدایەت دەدا، ئێستا كە وای نەكردووە، دیارە ئێوە بە مەیل‌و ئارەزووی خۆتان ئەو تاوانانە ئەنجام دەدەن؛ كەواتە جێگای خۆیەتی خودا داواتان لێ بكا واز لەو بیروباوەڕە پڕوپووچانە بێنن! چونكە ئێوە خاوەن ویست‌و ئیرادەی خۆتانن بە زۆر پێتان ناكرێ‌و ناچار نین بۆ ئەنجام دانی.

ئەم ئایەتەو وێنەكانی بناغەی بیروباوەڕێكی ساغ‌و دروست دادەمەزرێنن... ئەوە ڕوون دەكەنەوە كە ئادەمیزاد ئازادە لەو كردەوانەی بۆخۆی هەڵیان دەبژێرێ، هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئەم بیروباوەڕە بوون‌و، دوای

ئەوانیش چین لە دوای چین موسوڵمانان ئەو بیروباوەڕەیان پەسەند کردووەو، هەڵیان بژاردووە هەر ئەم بیروباوەڕەش لەگەڵ ژیری‌و زانستدا گونجاوو ژیاوە!

ئاشکرایە کە ئێمە ئاگامان لە فەرمان‌و داواکراوەکانی پەروەردگار هەیە، فەرمانی پێ کردووین بە چاکەو جڵەوگیری لێ کردووین لە خراپە، ڕێگای راست‌و ناراستی بۆ روون کردووینەوە دەشزانین کە ئێمە لە کردەوەکانمان ئازادین‌و ناچار نەکراوین بە زۆرە ملێ پێمان ناکرێ! لە هەمان کاتدا ئاگامان لە مەیل‌و خواهیشی پەروەردگار نیە، نازانین ویست‌و ئیرادەی بە چیە، کەوابێ دەبێ هەوڵی شتێك بدەین کە ئەیزانین‌و ئازادین لە کردنیدا نەك خۆمان هەڵەوگیری ویست‌و ئیرادەی خودا بکەین کە بە هیچ جۆرێك نازانین چۆنەو چۆن نیە!!

بەهەر حاڵ پێویستە لەسەرمان هەمیشە لە خودا بپاڕێینەوە کە هیدایەتمان بداو بمانخاتە سەر ڕێگای راست‌و خواپەسەند!

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەری خۆی دەکا داوا لە موشریکەکان بکا شایەد بێنن لەسەر راستی داواکانیان گەواهیان بۆ بدەن لەسەر ئەو حەرام کردن‌و حەڵاڵ کردنەی بانگەشەی بۆ دەکەن‌و دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: ﴿هَلُمَّ شُهَدَاءكُمُ الَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ اللّهَ حَرَّمَ هَذَا﴾ ئەو شایەتانە ئامادە بکەن کە بە ئاشکرا شایەتیتان بۆ دەدەن کە ئەو شتانەی پێتان وایە حەرامە، خودا لێی حەرام کردوون، دیارە شایەتیان دەست ناکەوێت‌و بێ بەڵگە دەستەوەسان دەبن، ﴿فَإِن شَهِدُواْ فَلاَ تَشْهَدْ مَعَهُمْ﴾ ئەگەر وای دابنێین لە فەرزی مەحاڵدا شایەدیان هێنان‌و شایەتیان بۆ دان؛ ئەتۆ پێیان بڕوا مەکەو شایەتییەکەیان لێ وەرمەگرەو تەسلیمیان مەبە، بەڵکوو دژیان بوەستەو بەربەرکانێیان بکەو هەوڵ بدە بۆڕیان بدە، چونکە دڵنیابە شایەتیدانەکەیان درۆو بوختانەو ئەوانە شایەتی درۆن ﴿وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا﴾ ئەتۆ ئەی محمد! بەهیچ شێوەیەك شوێن هەواو ئارەزووبازی ئەو کەسانە مەکەوە کە نیشانەکانی تاك‌و تەنیایی خودا بە درۆ دەخەنەوەو بڕوایان بە پەروەردگاریەتی یەزدان نیەو بە خاوەنی بوونەوەری نازانن، پێیان وایە دەسەڵاتی یاسا دارشتن‌و حەڵاڵ کردن‌و حەرام کردن تایبەت نیە بە خوداوە ﴿وَالَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ﴾ هەروەها شوێن بیروباوەڕی ئەو نەفامانە مەکەوە کە دوای خەیاڵ

پلاوی خۆیان کەوتوونو بڕوایان بە هاتنی ڕۆژی قیامەت نیە، ئەوەندەیان بڕوا بە زیندوبوونەوەی ڕۆژی قیامەت نیە کە ئەو بڕوایە پاڵیان پێوە بنێ کاتێ بەڵگەو دەلیلیان بۆ هێندرانەوە گوێی لێ رابگرن ﴿وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ ئەوانە شەریك بۆ خودای خۆیان دادەنێن، شتی تر دەکەن بە هاوتایو هێنانی خێرو لابردنی شەڕ ومپاڵ ئەو شەریکە دەدەن، وەکوو خودا دەسەڵاتی حیسابو لێکۆڵینەوەی قیامەتو تۆڵە ستاندنو پاشاتدانەوەی بۆ دیاری دەکەن!

## دە سپاردە (الوصايا العشرة)

﴿ ۞ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۖ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا

صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار خواردەمەنیە حەرامەکانی روون کردەوە، رەددی ئەو موشریکانەی دایەوە کە لە خۆیانەوە شتێ خودا لێی حەرام نەکردوون لە خۆیان حەرام کردووە! ئەمجار بەشوێن ئەو حوکم‌و روون کردنەوەیەدا بنەمای شتە حەرامەکان – ماددی یان مەعنەوی کردار بێ یان گوفتار بێ – دیاری دەکا!

ئیبنو مەسعوود دەفەرمویٚ کەسێك دەیەوێ سەیری راسپاردە (وسیەتە)کانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بکا ئەو وەسیەتنامانەی تا لە دونیا دەرچوو لەسەریان بوو با ئەم ئایەتانەی قورئان ﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ﴾ تا دەگاتە ﴿تَتَّقُونَ﴾ بخوێنێتەوە.

حاکم لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «فَأَيُّكُمْ يُبَايِعُنِي عَلَى ثَلاثٍ؟» کێ پەیمانم دەداتێ لەسەر بەجێهێنانی وەسیەتنامەکانی سی ئایەت؟ ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئایەتی: ﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکانی خوێندەوە، ئەمجار فەرمووی: هەرکەسێ پابەند بێ پێیانەوە پاداشتی لای خودایە، کەسێك هەموو جێبەجێ نەکردن‌و لێی کەم کردنەوە، خودا لە دونیادا قاری لێ گرت‌و سزای دا، ئەوە تۆڵەو عیقابە، ئەگەر بۆ قیامەت بۆی هەڵگرت ئەوە کاری ئەو لای پەروەردگارە؛ بیەوێ سزای دەداو بیەوێ لێی خۆش دەبێ.

﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی محمد! بڵێ: بەو موشریکانەی غەیری خودا دەپەرستن، رزق‌و رۆزییەك خودا بۆی حەڵاڵ کردوون بۆ لە خۆیانی حەرام دەکەن! لە ترسی هەژاری‌و سەرزەنشت‌و لۆمە کردن منداڵی خۆیان دەکوژن، بەئارەزوو بە هەوانتەو راسپاردەی شەیاتینی حەڵاڵ حەرام دەکەن‌و حەرام حەڵاڵ دەکەن پێیان بڵێ: وەرن بۆلام لێم کۆببنەوە، بۆتان دەخوێنمەوە بۆتان دەگێڕمەوە، ئەو شتانەی خودا بەراستی لێی حەرام کردوون‌و فەرمانی داوە بە حەرام بوونیان‌و

نیگای پی ناردووه — نەك وەکوو ئێوه بەدەمبڕو گۆتره کاری — وەرن پێتان بڵێمو بۆتان روون بکەمەوه، چونکه هەر خودا مافی دارشتنی یاساو شەریعەتی هەیە، هەر ئەو بۆی هەیە شت حەرام بکاو شته حەڵاڵ بکا، ئەمنیش پێغەمبەرو رەوانەکراوی ئەوم چی بۆ ناردووم پێتانی رادەگەیەنم، وەرن با ئەم دە وەسیەتنامەتان پێ رابگەیەنم پێنجیتان بەشێوەی جڵەوگیریو پێنجیان بە شێوەی فەرمان.

بەتایبەتی باسی شته حەرامەکانی کرد، هەرچەنده وەسیەتەکان گشتی ترن چونکه دیاری کردنی شته حەرامەکان ئەوه دەگەیەنێ کە جگە لەوان ئەوانی تر حەڵاڵن.

١- سەرەتا بە جڵەوگیری کردن لە هاوەڵدانان بۆ خودا دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا﴾ ئامۆژگاریتان دەکا کە هیچ کەسێكو هیچ شتێك نەکەنە هاوەڵی خودا، با ئەو شته لە بارەی قەبارەوه گەورەیی؛ وەکوو مانگو خۆرو ئەستێرەی کاکەشان بێ، یان لە بارەی رێزو نرخەوه بەرزو پیرۆز بێ وەکوو فریشتەو پێغەمبەرانو پیاوچاکان، چونکه ئەوانە هەموویان دروست کراوی خودانو بەندەی خودان، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا — مريم/٩٣﴾. ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! پێویسته پەرستنو بەندایەتی تایبەت بکەن بە پەروەردگارەوەو بەس! واز لە پەرستنو بەندایەتی کردنی هەموو شتێك بێنن.

٢- چاکه کردن لەگەڵ دایكو باوکدا ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ واتە: چاکه لەگەڵ باوكو دایکتاندا بکەن بەدڵو بە گیان خزمەتیان بکەنو گوێ رادێری فەرمانەکانیان بن، بەمەرجێك فەرمانەکانیان دژی ئایین نەبێ.

زۆرجار لە قورئاندا پەروەردگار بەندایەتی کردن بۆ زاتی پاکی خۆیو چاکه کردن لەگەڵ دایكو باوکدا بەیەکەوه باس دەکا! چونکه پەروەردگار بۆخۆی سەرچاوەی دروست کردنی ئادەمیزادو ڕزقو رۆژی دەریەتی، باوكو دایکیش هۆکاری ئەو پەیدا بوونو بەخێو کردنو پارێزگاری کردنەن، ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا — الإسراء/٢٣﴾ یان دەفەرموێ:

﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ – لقمان/١٤﴾. بۆیە ئەزیەتدانی باوكو دایك لە تاوانە گەورەكانە چاكە كردنیش لەگەڵیاندا لە كردەوە چاكەكانە.

بوخاریو موسلیم لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا كرد؛ وتم: چ كردەوەیەك باشە بیكەم؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نوێژ كردن لەكاتی خۆیدا، وتم دوای نوێژ چ كارێك باشە بیكەم؟ فەرمووی: چاكە كردن لەگەڵ دایكو باوكدا، گوتم پاشان چی؟ فەرمووی: جیهادو تێكۆشان لە پێناو ئایینی خودادا.

چاكە كردن لەگەڵ باوكو دایكدا ئەوەیە: مامەڵەیان لەگەڵدا بكە مامەڵە كردنێكی دڵسۆزانەو هەڵقوڵاو لە سۆزو خۆشەویستیەوە بێ، نەك بە زۆرو لە ترسان بێ!

ئیتر كوڕ چۆن لەگەڵ باوكو دایكیدا هەڵسو كەوت بكا، منداڵەكانی ئەویش ئاوا هەڵسو كەوتی لەگەڵدا دەكەن، تەنانەت با پاش ماوەیەكیش بێ.

طەبەرانی لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «بُّروا آبَاءَكُمْ تَبُرُّكُمْ آبْنَاؤُكُمْ، وَعِفُّوا تَعِفْ نِساءكم» چاكە لەگەڵ باوكو دایكتان بكەن، منداڵەكانتان چاكە لەگەڵ ئێوە دەكەن، داوێن پاك بن لەگەڵ ئافرەتی خەڵكدا، ئافرەتی ئێوە داوێن پاك دەبن.

٣- كچ زیندەبەچاڵ كردن یاساغە...! لەم رووەوە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ﴾ لەوە پێش یەزدان وەسیەتی بۆ كردین؛ كە چاكە لەگەڵ باوكو دایكو باپیرو نەنكدا بكەین، ئەمجار گەڕایەوە فەرمانی كرد بە باوكو دایك كە چاكە لەگەڵ منداڵ بكرێو فەرمووی: بەشێك لەو وەسیەتو فەرمانو ئامۆژگاریانەی كە خودا ئاراستەی ئێوەی كردووە، ئەوەیە: كە لە ترسی هەژاری یان شتی تر منداڵی خۆتان لەناو نەبەن، چونكە ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ ئێمە رزقو رۆزی ئێوەو ئەوانیش دەدەین، رۆزی ئەوان بەهۆی ئێوەوە دابین دەكەین، نە لە هەژاری ئێستاو نە لە هەژاری داهاتوو مەترسن – سەری بێ رۆزی لە ژێر گڵدایە – پەروەردگار بۆخۆی بەر عۆدەی رزقو رۆزی بەندەكانی بوو، نموونەی ئەم

ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءًا كَبِيرًا – الإسراء/٣١﴾.

جوداوازی نێوان ئەم دوو تەعبیرە ئەوەیە: تەعبیری سورەتی (ئەنعام) مەبەستی جڵەوگیری کردنە لە کوشتنی منداڵ لەبەر هەژاری دەرحاڵ هەبوو؛ بۆیە رزق و رۆزی باوکەکانی پێش خست، چونکە ئەمان گرنگن، لەو رووەوە کە هەژارییەکە لە گۆڕێدایە، بەڵام لە تەعبیری سورەتی (ئیسرا)دا مەبەست ئەوەیە: داوا دەکا کە باوکەکان منداڵەکانیان نەکوژن لە ترسی هەژارییەك کە چاوەڕوان دەکرێ لە داهاتوودا بێتە گۆڕێ، بۆیە رزق و رۆزی منداڵەکانی پێش خست لەبەر گرنگی پێدا بەوان، واتە: لەهەژاربوونی داهاتوو مەترسن بە هۆی رزق و رۆزی منداڵەکانتان! ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە پارێزگاری رەچەڵەکی ئادەمیزاد زەروری و پێویستە، لەم رووەوە کە ئەزیەتدانی وەچە بۆ بنەچەو ئەزیەتدانی بنەچە بۆ وەچەی یاساغ کردووە، چاودێری کردنی هەریەکەیانی بۆ ئەوەی تریانی بە پێویست داناوە، هەروەکوو چۆن لە ئامۆژگاری پێنجەمدا لە ناو بردنی نەفسی ئادەمی حەرام کردووە.

٤- ئەنجامدانی هەموو تاوانێ حەرامەو پێویستە خۆی لێ بپارێزین وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ هەرگیز نزیك تاوانی فاحیشە مەبنەوە، فاحیشە بە تاوانێك دەگوترێ: گوناهەکەی گەورە بێ؛ جا کردار بێ یان گوفتار بێ وەکوو زیناو بوختان کردن بە ئافرەتی داوێن پاکی بێ ئاگا، جا زینا کردنەکە بە ئاشکرا بێ یان بە نهێنی بێ.

عەرەبەکان لە سەردەمی نەزانییاندا زینا کردنی نهێنییان بەلاوە ئاسایی بوو، بەڵام زینا کردنی بە ئاشکرایان بەلاوە کارێکی خراپ بوو، ئیتر پەروەردگار هەردوو جۆرەکەی یاساغ کردن، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ – الأعراف/٣٣﴾.

برێك پێیان وایە: تاوانی ظاهیر ئەو تاوانەیە بە ئەندامە ظاهیرییەکانی جەستە ئەنجام بدرێ، تاوانی (باطن) ئەو تاوانانەیە کە پەیوەندی بە دەروونەوە هەیە، وەکوو حەسوودیو خۆبەزلزانی.

ئیبنو حەییانی ئەنصاری لە عیکریمەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: مەبەست بە ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ ستەم کردنە لە ئادەمیزادان ﴿وَمَا بَطَنَ﴾ مەبەست زینا کردنو دزی کردنە، چونکە بەڕواڵەت تاوانکار بە دزیەوە ئەم جۆرە تاوانە ئەنجام دەدا!!

٥- لە ناو بردنی نەفسی ئادەمیزاد بەناڕەوا! دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ بەهیچ جۆرێك ئەو نەفسەی خودا کوشتنی حەرام کردووە بەهۆی ئیسلامەتیەوە یان بەهۆی وادەو پەیمانەوە وەکوو ئەهلی کیتاب کە لە ناو ئێمەدا نیشتەجێنو لە زیممەی ئێمەدان مەیکوژن، مەگەر شیاوی کوشتن بێ، بەم ڕەنگە بکوژ بێ بەناڕەوا کەسێکی کوشتبێ یان موحصەن بێو زینای کردبێ، یان لە ئایین هەڵگەڕابێتەوە.

جا هەرچەندە تاوانی کوشتن دەچێتە خانەی فاحیشەوەو جڵەوگیرییەکە ئەمیش دەگرێتەوە، بەڵام بۆیە بە تایبەتی باسی کرد بۆ زێدە گرنگی پێدانو جەخت کردن لەسەر ئەوە تاوانێکی هەند گەورەیە پێویستە بە هیچ جۆرێ توخنی نەکەون.

کە دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ ئامازەیە بۆ ئەوە: کە کوشتنی ئادەمیزاد جاری وادەبێ ڕەوایە، وەکوو ئەوە کابرا تاوانێك بکا شیاوی کوشتن بێ؛ وەکوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێ: «لآ يَحِلُّ دَمُ أمْرِىءٍ مُسْلِمٍ إلاّ بِأُمُورٍ، ثَلاثَةٍ، كُفْرٌبَعْدَ إيمانٍ، وَزِناً بَعْدَ إحْصَانٍ، وَقَتْلُ نَفْسٍ بِغَيْرِ حَقٍ» واتە: کوشتنو ڕشتنی خوێنی موسوڵمان حەڵاڵ نیە مەگەر بە سێ شت نەبێ: کافر بوونو هەڵگەڕانەوە لە ئایین، زیناکردنی پیاو کە ژنی هێنابێ یان ئافرەت شووی کردبێ، کوشتنی ئادەمیزادێك بەناڕەوا، هەرکەسێك تاوانێك لەم سێ تاوانەی لێ ڕوودرا، کوشتنی ڕەوایە.

بەکورتیو پوختی کوشتنی ئادەمیزاد بەشێوەیەکی ڕەوا ئەوە فەرمانی پەروەردگارە بەکوشتنەوەی بکوژو بەردباران کردنی زیناکەری موحصەن تا گیانی دەردەچێ!

موسلیمو بوخاری لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ» فەرمانم پێکراوە کە شەڕ لەگەڵ ئادەمیزاد دان بکەم تا شایەتی دەدەن، کە جگە لە پەروەردگار هیچ خودای تر نینو (محمد) پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خودایە، نوێژەکانیان بەرێكو پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیماڵو سامانی خۆیان دەربکەن، کە ئەوەیان کرد، ماڵو گیانیان لە من دەپارێزن، مەگەر حەقی ئیسلامیان بکەوێتە سەرێ، حیسابو لێکۆڵینەوەشیان لەسەر پەروەردگارە، واتە: هەرکەسێ بەڕواڵەت ئاوای کرد بە موسوڵمان حسێب دەکرێ... جا ئەو بە دڵ موسوڵمان بووە یان بە نابەدڵیو دووڕوویی ئەوە خوا دەزانێو ئەو حیسابی لەگەڵ دەکا!

ئەم گرنگی پێدانو نەهی کردنە لە مرۆڤ کوشتن، لەبەر ئەوەیە کوشتن تاوانێکی گەلێ گەورەو سامناکە، دەست درێژییەکی فرە دزوارە لە مافی مرۆڤایەتیدا، دەست درێژی کردنە بۆسەر دروستکراوی خودا کە بەدەستی قودرەت نەخشو نیگاری کێشاوەو لە جوانترین شێوەدا تانو پۆی لێك داوە. ﴿ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئەو کارە یاساغکراوانە لێتان لەو کارانەن کە خودا ئامۆژگاریتان دەکا بەوەی لێی دوور بکەونەوەو فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودا وەربگرن، بەو جۆرە ئامۆژگاریو وەسییەت کردنە بۆتان پەروەردەتان دەکا، بۆ ئەوەی ڕاستاڵو هۆشمەندبن، بەرژەوەندی خۆتان بزانن، ئەوەی فەرمانی پێ کردوون ئەنجامی بدەن ئەوەی جڵەوگیری لێ کردوون توخنی نەکەون.

٦- پارێزگاری ماڵی هەتیو. وەسیەتو ئامۆژگاری شەشەم پاراستنی ماڵی هەتیوە... دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ بە هیچ جۆرێك توخنی ماڵی هەتیو مەکەونو لێی نزیك مەبنەوە، هیچ ئەندازەیەك لە ماڵو

سامانی ئەو هەتیوانەی لە ژێر سەرپەرشتیکاری ئێوەدان هەڵمەگرن، دەستکاری ماڵو داراییان مەکەن، مەگەر بە شێوەیەك بێ کە سوودو قازانجی بۆ ئەوان تێدا بێ، وەکوو ئەوە ماڵەکەیان بخەنە بازرگانییەوەو گەشەی پێ بدرێو لە ناوچوون بپارێزرێو بەگوێرەی پێویست لە قازانجی ماڵەکەیان بژێویان بۆ دابین بکرێ. وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا – النساء/١٠﴾.

جڵەوگیری کردن لەنزیك کەوتنەوە لە شتێك بەو ئوسلوبە قورئانییە بەلاغێکی زۆری تێدایە، چونکە جڵەوگیری بەو شێوەیە جڵەوگیرییە لەو هۆکارو وەسیلانەی کە سەر دەکێشن بۆ خودی شتەکە، وەکوو ئەوە لەکاتی بازرگانی کردن بە ماڵی هەتیوەکە، یان رەدام هێنانی کشتوکاڵی هەتیوەکە شتێکی لێ بخوا، بێگومان پەروەردگار جڵەگیرییەکی تۆکمەی لە خواردنی ماڵی هەتیو کردووە، مەگەر لەبەر ناعیلاجیو پێویستیاتی زۆر شتێکی لێ بخوا، ئەمە دروستە بەلام بەمەرجێك زێدەرەوی نەکا وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ – النساء/٦﴾.

هەڵبەتە جڵەوگیری کردن لە نزیك کەوتنەوە لە ماڵی هەتیو بەردەوام دەبێ ﴿حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ هەتا ئەو هەتیوە پێ دەگاو رەسیدە دەبێو لە ریزی پیاوان دەژمێردرێ، مەلەکەی عاقڵو هۆشی کامڵ دەبێو دەتوانێ بەرێكو پێکی سەرپەرشتی ماڵو سامانی خۆی بکاو گەشەی پێ بکا، بۆیە شەعبیو مالیكو کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف رستەی ﴿حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ یان بە ﴿حَتَّى يحتلم﴾ مانا کردووە، واتە: هەتا ئیحتیلامی دەبێ، کاتی ئیحتیلام بوونیش بە عادەت لە نێوان تەمەنی پانزە ساڵیو هەژدە ساڵیدایە، هەرکاتێ هەتیو گەیشتە ئەو تەمەنەو دیاردەی پیاوەتیو هۆشمەندیو زیرەکی لێ دەرکەوت ئەوکاتە ماڵو سامانەکەی خۆی دەدرێتەوە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُواْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ – النساء/٦﴾.

٧ - ٨- وەسیەتی حەوتەمو هەشتەم کێشانەو پێوانەی تەواو لەکاتی کڕینو فرۆشتندایە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ﴾ ئەگەر شتی پێوانەکراوو

کێشانەکراوتان فرۆشت بەخەڵك بەتەواوەتی بۆیان پێوانەو کێشانە بکەن، کەمو کوڕی تێدا مەکەن، ئەگەر ئەو شتانەتان کڕین لەکاتی پێوانەو کێشانە کردندا زیادەی مەخەنە سەریٚ بە کورتی چ بفرۆشنو چ بکڕن لە پێوانەو کێشانەدا زیادەو کەمی تێدا مەکەن! بەڵکوو دادپەروەرانە کار بکەنو تەرازوو بازیی‌و حوقەبازیی مەکەن، بەگوێرەی توانا وریا بن ربەو قسناغو ئامێری پێوانەو کێشانەتان کەمو کوڕی تێدا نەبیٚ بەئەنقەست فرتو فیڵو تەڵەکە بازی مەکەن ﴿لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ پەروەردگار لە هیچ کەسێك زیاد لە توانای خۆی ئەرکی ناخاتە سەری، جا ئەگەر کەسێك لەکاتی پێوانەو کێشانەدا هەڵەی کردو کەمی دا، یان زیادی وەرگرت، ئەوە تاوانبار نابیٚ هەرکاتیٚ هەستی کرد دەبیٚ هەڵەکەی ڕاست بکاتەوە!

ئاشکرایە تەرازوو بازیی‌و فرتو فیڵ لە کێشانەو پێوانەدا تاوانێکی فرە گەورەیەو پەروەردگار هەڕەشەی سامناکی لە ئەنجامدەرانی کردووە، سەرەنجامی بەدبەختی‌و چارە ڕەشی دەخاتەوەو فەسادو ئاژاوە لە وڵاتدا بەرپا دەبیٚ! ئەوەتا: قورئان لە شوێنێکی تردا دەفەرمویٚ: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ – المطففين/ ١ – ٣﴾.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار لەسەر زوبانی حەزرەتی شوعەیب ئاوا ئاکامی تەرازوو بازیی‌و فرتو فیڵ لە کێشانەو پێوانەدا روون دەکاتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿وَيَا قَوْمِ أَوْفُواْ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ – هود/٨٥﴾. کەوابیٚ بیٚ بایەخ کردنو شکاندنی کاڵای خەڵك دەچێتە خانەی تەرازوو بازیی‌و حوقەبازییەوە! بەشێکە لە هۆکارەکانی ئاژاوەنانەوەو فەسادی کردن لە زەویدا.

٩- دادپەروەری لە قسەو بڕیاردا. وەکوو دەفەرمویٚ: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! کە شایەتیتاندا یان بڕیارو حوکمتان دەرکرد، دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن، با ئەو کەسەی شایەتییەکەی لە دژ دەدەن یان بڕیاری دژ دەردەکەن خزمو خوێشیش بیٚ، چونکە هەر لەرێگەی دادپەروەرییەوە کاروباری وڵات رێکدەخریٚو ئاسایش بەرپا دەبیٚو دانیشتوان مافیان پێشێل ناکریٚ، تاكو کۆمەڵ نۆخەی لە گیانی خۆیان دەکەن! دادپەروەری بناغەی فەرمانڕەواییە

سامانی ئەو هەتیوانەی لە ژێر سەرپەرشتیکاری ئێوەدان هەڵمەگرن، دەستکاری ماڵو دارایبان مەکەن، مەگەر بە شێوەیەك بێ کە سوودو قازانجی بۆ ئەوان تێدا بێ، وەکوو ئەوە ماڵەکەیان بخەنە بازرگانییەوەو گەشەی پێ بدرێو لە ناوچوون بپارێزرێو بەگوێرەی پێویست لە قازانجی ماڵەکەیان بژێویان بۆ دابین بکرێ. وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا – النساء/١٠﴾.

جڵەوگیری کردن لەنزیك کەوتنەوە لە شتێك بەو ئوسلوبە قورئانییە بەلاغێکی زۆری تێدایە، چونکە جڵەوگیری بەو شێوەیە جڵەوگیرییە لەو هۆکارو وەسیلانەی کە سەر دەکێشن بۆ خودی شتەکە، وەکوو ئەوە لەکاتی بازرگانی کردن بە ماڵی هەتیوەکە، یان رەدام هێنانی کشتوکاڵی هەتیوەکە شتێکی لێ بخوا، بێگومان پەروەردگار جڵەگیرییەکی تۆکمەی لە خواردنی ماڵی هەتیو کردووە، مەگەر لەبەر ناعیلاجیو پێویستیاتی زۆر شتێکی لێ بخوا، ئەمە دروستە بەلام بەمەرجێك زێدەرەوی نەکا وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ – النساء/٦﴾.

هەڵبەتە جڵەوگیری کردن لە نزیك کەوتنەوە لە ماڵی هەتیو بەردەوام دەبێ ﴿حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ هەتا ئەو هەتیوە پێ دەگاو رەسیدە دەبێو لە ریزی پیاوان دەژمێردرێ، مەلەکەی عاقڵو هۆشی کامڵ دەبێو دەتوانێ بەرێكو پێکی سەرپەرشتی ماڵو سامانی خۆی بکاو گەشەی پێ بکا، بۆیە شەعبیو مالیكو کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف رستەی ﴿حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ یان بە ﴿حَتَّى يحتلم﴾ مانا کردووە، واتە: هەتا ئیحتیلامی دەبێ، کاتی ئیحتیلام بوونیش بە عادەت لە نێوان تەمەنی پانزەساڵیو هەژدە ساڵیدایە، هەرکاتێ هەتیو گەیشتە ئەو تەمەنەو دیاردەی پیاوەتیو هۆشمەندیو زیرەکی لێ دەرکەوت ئەوکاتە ماڵو سامانەکەی خۆی دەدرێتەوە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُواْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ – النساء/٦﴾.

٧ - ٨- وەسیەتی حەوتەمو هەشتەم کێشانەو پێوانەی تەواو لەکاتی کڕینو فرۆشتندایە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ﴾ ئەگەر شتی پێوانەکراوو

کێشانەکراوتان فرۆشت بەخەڵك بەتەواوەتی بۆیان پێوانەو کێشانە بکەن، کەمو کورِی تێدا مەکەن، ئەگەر ئەو شتانەتان کرِین لەکاتی پێوانەو کێشانە کردندا زیادەی مەخەنە سەری بە کورتی چ بفرۆشنو چ بکرِن لە پێوانەو کێشانەدا زیادەو کەمی تێدا مەکەن! بەڵکوو دادپەروەرانە کار بکەنو تەرازوو بازیی‌و حوقەبازیی مەکەن، بەگوێرەی توانا وریا بن ربەو قسناغو ئامێری پێوانەو کێشانەتان کەمو کورِی تێدا نەبێ بەئەنقەست فرتو فیڵو تەڵەکە بازی مەکەن ﴿لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ پەروەردگار لە هیچ کەسێك زیاد لە توانای خۆی ئەرکی ناخاتە سەری، جا ئەگەر کەسێك لەکاتی پێوانەو کێشانەدا هەڵەی کردو کەمی دا، یان زیادی وەرگرت، ئەوە تاوانبار نابێ هەرکاتێ هەستی کرد دەبێ هەڵەکەی راست بکاتەوە!

ئاشکرایە تەرازوو بازیی‌و فرتو فیڵ لە کێشانەو پێوانەدا تاوانێکی فرە گەورەیەو پەروەردگار هەرِەشەی سامناکی لە ئەنجامدەرانی کردووە، سەرەنجامی بەدبەختی‌و چارە رِەشی دەخاتەوەو فەسادو ئاژاوە لە وڵاتدا بەرپا دەبێ! ئەوەتا: قورئان لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ – المطففين/ ١ – ٣﴾.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار لەسەر زوبانی حەزرەتی شوعەیب ئاوا ئاکامی تەرازوو بازیی‌و فرتو فیڵ لە کێشانەو پێوانەدا روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَيَا قَوْمِ أَوْفُواْ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ – هود/٨٥﴾. کەوابێ بێ بایەخ کردنو شکاندنی کاڵای خەڵك دەچێتە خانەی تەرازوو بازیی‌و حوقەبازییەوە! بەشێکە لە هۆکارەکانی ئاژاوەنانەوەو فەسادی کردن لە زەویدا.

٩- دادپەروەری لە قسەو برِیاردا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! کە شایەتیتاندا یان برِیارو حوکمتان دەرکرد، دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن، با ئەو کەسەی شایەتییەکەی لە دژ دەدەن یان برِیاری دژ دەردەکەن خزمو خوێشیش بێ، چونکە هەر لەرێگەی دادپەروەرییەوە کاروباری وڵات رێکدەخرێ‌و ئاسایش بەرپا دەبێ‌و دانیشتوان مافیان پێشێل ناکرێ، تاكو کۆمەڵ ئۆخەی لە گیانی خۆیان دەکەن! دادپەروەری بناغەی فەرمانرِەواییە

کۆڵەکەی ئاشتیو ئاوەدانییە، ژیان لە سایەی عەداڵەتو دادپەروەریدا بەهەشتی جاویدانییە، هەر وڵاتێك دادپەروەری تێدا بەرقەرار نەبێ دۆزەخێکی پڕ خەمو زوخاوە! بۆیە پەروەردگار لە چەند ئایەتدا بانگەوازی ئادەمیزاد دەکاو هەڵیان دەنێ کە هەمیشە هەوڵ بدەن، عەداڵەت بەرقەرار بکەنو حوکمو بڕیاریان لە چوارچێوەی دادپەروەریدا ئەنجام بدەن بەکورتی وەکوو چۆن پێویستە لە کێشانەو پێوانەدا – کە کردار ئامێزە – بە عەداڵەت ئیش بکەن لە شتی گوفتار ئامێزیشدا – کە شایەتیو بڕیار دەرکردن بەشێکن لێی دەبێت دادپەروەری ئەنجام بدەن!! وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ – النساء/١٣٥﴾.

١٠- وەفا بە وادەو بەڵێنو پابەند بوون پێیانەوە! ئەمە یەکێکە لە وەسیەتەکانی کە پەروەردگار ئاڕاستەی ئادەمیزادی کردووەو دەفەرموێ: ﴿وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُواْ﴾ وەفا بەعەهدو پەیمانی خودا بکەن، ئەو شتانەی فەرمانی پێ کردوون، ئەنجامی بدەن، ئەوەی جڵەوگیری لێ کردوون توخنی مەکەون، بە گوێرە نامەی خودا کە قورئانە کار بکەن، سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەیڕەو بکەن، هەروەها سروشتی پاکو عەقڵی ساغ بەکار بێنن، ئەم ڕستەیە لە ئایەتەکەدا هەموو وادەو بەڵێنەکان دەگرێتەوە: چ ئەو عەهدو پەیمانەی کە ئادەمیزاد لەگەڵ پەروەردگار کردوویانە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ – النحل/٩١﴾. یان ئەو عەهدو پەیمانەی کە ئادەمیزاد لەناو خۆیاندا دەیکەن وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ – البقرة/١٧٧﴾.

ئەمجار پێش کۆتایی هێنان بە وەسیەتو ئامۆژگارییەکان دەفەرموێ: ﴿ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ ئەو شتانەی باس کران؛ ئەو شتانەن کە ئامۆژگاری پێ کردوون، بەڵکوو پەندیان لێ وەربگرن بیربکەنەوە تەمبێ ببن، واز لەو کردارو گوفتارە خراپانەیان بێنن کە لەوە پێش ئەنجامتان داون، با ئێوە لە ناو خۆتاندا ئەو وەسیەتو ئامۆژگارییانەی کە خودا ئاراستەی کردوون بیر یەکتری بخەنەوە، ئامۆژگاری یەکتری پێ بکەن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ

﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ - العصر/٣﴾. ئەمجار کۆتایی وەسیەتو ئامۆژگارییەکان بەوە دەهێنێ کە ئەم ڕێبازی ئیسلامە پەیڕەوو پرۆگرامێکی راستو دروستو پتەون ڕێبازی خودا پەسەندو بە مرازگەیشتنەو دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ﴾ جا لەبەر ئەوەی هەر ئەمە ڕێبازی خودا پەسەندو راستو دروستەو ڕێگای حەق هەر ئەمەیە شوێن ئەو ڕێبازە بکەونو بە موو لێی لانەدەن، ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ﴾ نەچن شوێن ڕێبازە جیاجیاکانی ئەمو ئەو بکەون؛ ڕێبازە گومراییەکانیو قۆرتو پێچ پێچەکان، لە ئاکامدا سەرتان پێ دەکێشێ بۆ پەرتەوازە بوونو دووبەرەکیو لادان لە ڕێبازی ئایینی ئیسلامو بەرنامەو پرۆگرامە نموونەییەکەی!

ئیبنو عەبباس لە راڤە کردنی ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ﴾دا دەفەرموێ: پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد کە لە ناوخۆیاندا تەبابنو یەکیەتی ڕیزەکانی خۆیان بپارێزنو پەرتەوازە نەبن، دووبەرەکیو ئاژاوە نەخەنە نێوان خۆیانەوە، ئەوەشی پێ راگەیاندن کە گەلو نەتەوەکانی پێشوو بەهۆی دووبەرەکیو کێشەو را جیایی لە ئاییندا تووشی فەلاکەتو لەناوچوون بوون!!

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە دەستی موبارەکی خەتێکی راستی کێشا، پاشان فەرمووی: ئەمە ڕێگای راستی پەروەردگارە، ئەمجار لەلای راستو چەپی هێڵەکەوە خەتی کێشان، ئەمجار فەرمووی: ئەم ڕێگایانە هەموویان ڕێگای گومرایین؛ ڕیچکەیەک نیە شەیتانێکی بەسەرەوە نەبێو بانگەوازی ئادەمیزادی بۆ نەکا، ئەمجار ئایەتەکەی خوێندەوە ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ...﴾.

ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذیو نەسائی لە نەوواسی کوڕی سەمعانەوە کە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پەروەردگار بۆ نموونەو مەثەل باسی ڕێگای راستی کردووە، فەرموویەتی: لەهەردوو قەراخی ڕێگاکە دوو شورە هەن، دەرگای کراوەیان تێدان، دەرگاکان پەردەیان پێوەن پەردەکانیان دادراوەتەوە، لەسەر دەرگای هەر ڕێبازێک لەو ڕێبازانە بانگەوازکەرێک هەیە؛ بانگ دەکا دەڵێ: خەڵکینە! وەرن بۆ سەر ئەم ڕێبازە راستەو هەمووتان پێیدا بڕۆنو پەرتەوازە

مەبن، بانگەوازیکەرێکی تریش لە ژوور رێگاکەوە بانگ دەکا: ئەگەر یەکێك بیەوێ دەرگایەك لەو دەرگایانە بکاتەوە پێی دەڵێ: کوڕە! نەکەی! دەخیلت بم! تۆ ئەو دەرگایە بکەیەوە کێشت ئەکا... ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: رێگا راستەکە ئیسلامە، ژوورەکان پەرژینو سنوورەکانی خودان، دەرگا کراوەکان شتە حەرامەکانن، بانگەوازیکەری سەر رێگاکە قورئانی خودایە، بانگەوازیکەری ژوور رێگاکە ئامۆژگاری کردنی خودایە کە لە دڵی هەموو موسوڵمانێکدا هەیە!

## بۆچی تەوراتو قورئان نێردراون

﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ

مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنۡهَاۗ سَنَجۡزِي ٱلَّذِينَ يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾.

دوای ئەوەی یەزدانی مەزن لە ئایەتەکانی پێشوودا (دە) وەسیەتو هەندێ ئامۆژگاری ڕاگەیاندو ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ پابەندبوون پێیانەوە هۆی ناردنی تەورات بۆ حەزرەتی (مووسا)مان بۆ روون دەکاتەوە، چونکە تەورات لای موشریکەکانی عەرەب ناوبانگی هەبوو، زۆر باسو خواسیان دەربارەی بیستبوو، ئەمجار پلەو پایەی قورئانمان بۆ باس دەکاو پێمان دەفەرموێ: کە قورئان کتێبی هیدایەتو ڕەهنومایی کردنە، پێویستە بیکەینە پەیڕەوو پرۆگرامی خۆمانو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریو ئامۆژگاریەکانی بین، بڕوبیانووی موشریکەکانی ڕەت کردەوە کە گەردنکەچی فەرمانی نەدەبوون، ئەوەی چەسپاند کە بڕوبیانووەکانیان بەکەڵکی عوزر خواهی نایەنو بۆ ئەوە ناشێن بیانکەنە عوزر بۆ پابەند نەبوونیانو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾.

زانایانی تەفسیر دەفەرموون لێرەدا لە پێش ئایەتەکەدا وشەی ﴿قُلْ﴾ مەزەندە دەکرێ، واتە: ئەی محمد! بەو خەڵکە بڵێ: ئێمە نامەی تەوراتمان بە مووسا بەخشیوە! ئایەتەکەی ئێرە بە وشەی ﴿ثُمَّ﴾ عەطف کراوەتەوە بۆ سەر سەرەتای ئایەتی وەسیەتنامەکان، واتە: پێیان بڵێ: گەورەتر لەو (دە) وەسیەتە ئەوەیە: کە ئێمە نامەی تەوراتمان بە مووسا بەخشیوە؛ کەوابێ کۆی ئەو قسانەی کە پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا بە خەڵکەکەی بڵێ: بریتین لەمانە ﴿قُلْ تَعَالَوْا...﴾ وەرن ئەوەی خودا لێی یاساغ کردوون بۆتان بخوێنمەوەو پێتان بڵێم: خودا وەسیەتی بۆ کردوون کە فلان شتو فلان شت بکەن، فلان شتو فلان شت نەکەن! ئەمجار پێیان بڵێو فێریان بکەن: کە ئێمە کتێبمان بە مووسا بەخشیوە؛ تەوراتمان بۆ ناردووە، ئەمجار هەواڵیان بدەرێ بەو نیگایەی بۆ تۆ هاتووەو بەو نیگایەی بۆ مووسامان ناردووە.

بێگومان زۆرجار باسی تەورات لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، چونکە تەورات – زیاتر لە ئینجیلو زەبوور – لە قورئان دەچێ، لەم رووەوە کە وەکوو قورئان هەموو حوکمێکی تەشریعی لە خۆ گرتووەو هەریەکەیان لە تەوراتو قورئان حوکمو یاساو شەریعەتێکی تەواون، بە پێچەوانەی ئینجیل کە بریتییە لە پەندو ئامۆژگاریو مێژوو، زەبووریش ناوەرۆکەکەی بریتییە لە لاواندنەوەو پیاهەڵدانو تەنانەت زۆربەی عاقڵمەندانی عەرەب ئاواتەخوازی ئەوە بوون کە نامەیەکی وەکوو تەوراتیان هەبێو دەیانگوت: ئەگەر ئێمە نامەیەکی ئاوامان بۆ بێ زۆر باشتر لە جوولەکەکان پابەندی ناوەرۆکی دەبووینو سوودمان لێ دەبینی، چونکە پێیان وابوو: ئەوان لە جوولەکە زیرەکترو عاقڵترو تێگەیشتووترن.

جا کە لە ئایەتی پێشوودا باسی قورئانی کردو فەرمووی: ﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ﴾ ئەمجار گەڕایەوە بۆ سەر تەوراتو مەدحی کردو فەرمووی: ﴿ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾. هەروەکوو زۆرجاری تر کە باسی تەورات دەکا دوابەدوای باسی قورئانیش دەکا وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمِن قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَى إِمَامًا وَرَحْمَةً وَهَـٰذَا كِتَابٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا – الأحقاف/١٢﴾. یان لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا کە فەرمووی: ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾.

ئەو (دە) ئامۆژگارییەی کە لەسێ ئایەتەکانی پێشوودا باسی کردنو نموونەیان لە سورەتی (الإسراء)دا دووبارە بۆتەوە یەکەم ئایەت بوون کە پێش ئەحکامی عیباداتو موعامەلات لە مەککە هاتوونە خوارێ، هەروەها ئەم ئامۆژگارییانە یەکەم شت بوون کە: بۆ مووسا نێردراونو بنەمای ئایینەکەی بوون، هەروەکوو چۆن بنەمای هەموو ئایینە ئاسمانییەکانو لەسەر زوبانی پێغەمبەران راگەیەندراون، وەکوو دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ – الشورى/١٣﴾. ئەو ئەندازە هاوبەشەی کە پەروەردگار وەسیەتی بۆ پێغەمبەران کردووە کە بە گەلو نەتەوەکانیانی رابگەیەنن بریتی بووە لە یەکتاپەرستیو

پابەنـدبوون بـە ئـەخلاق‌و ڕەوشـتی جـوان‌و دوور کەوتنـەوە لـە فاحیـشەو کـاری نابەجێ!

﴿تَمَامًا عَلَى الَّذِيَ أَحْسَنَ﴾ واتە: ئێمە تـەوراتمان بـە موسـا بەخـشی بـۆ ئـەوەی نیعمەتـەو بەهرەمەنـدی‌و ڕێـزو نـرخ تـەواو بکـەین بـۆ ئـەو کەسـەی کـە بەباشـی پابەنـدی ڕێنموونییـەکانی بـێ‌و پـەیڕەوی فەرمایـشتەکانی بکـا، بـە هیدایـەت‌و ئامۆژگارییەکانی بەختەوەری بەدەست بێنێ، وەکوو لە شوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا – الأنبياء/٧٣﴾.

دەشبێ مانـای ﴿تَمَامًا عَلَى الَّذِيَ أَحْسَنَ﴾ لـە ئایەتەکـەدا بـەم جـۆرە بـێ: ئێمـە کتێبـی تـەوراتمان بـە مووسـا بەخـشی بەتـەواوی‌و بـێ کـەم‌و کـوڕی، هەرچـی ئادەمیزادانی ئەو ڕۆژگارە لەبارەی تەشریعەوە پێویستیان پێی بووبێ تێیدا بوو، لە جوانترین شێوەی کتێبدا ڕەنگی دابووەوە! باشترین ڕێبازو شێوەی لـە خـۆ گرتبـوو، بەڵام ئەوەی ئەم مانایە بە نەگونجاو دادەنێ ئەم ڕستەی دواوەیەتی کە دەفـەرموێ: ﴿وَتَفْصِيلاً لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾ واتـە: ئێمـە ئـەو کتێبـەمان پـێ بەخـشی کـە بۆمـان نـاردبوو تەواوو کامڵ بوو هەرچی خەڵك پێویستیان پێ بوو دەربارەی شەریعەت تێیدا بوو! جـا کـە مانـای ڕسـتەی پێشوو بـەو جـۆرە بکـەین لەگـەڵ ڕسـتەی دواییـدا دووبـارە بوونەوەی تێدا دێتە جێ؟؛ بۆیە ئەو مانا دووەمە بە نەگونجاو دێتە بەرچاو.

﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ ئەو کتێبەی ئێمە دابوومان بە مووسا کتێبی شارەزایی کردن بوو بۆ ڕێگای حەق‌و ڕاستی؛ هۆی ڕەحمەت‌و کامەرانی بـوو بـۆ کەسـێك پـەیڕەوەی بکردایەو پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بووایە!

ئێمە ئەو کتێبە بەفەڕە باشەمان دابوو بە مووسا ﴿لَّعَلَّهُم بِلِقَاء رَبِّهِـمْ يُؤْمِنُـونَ﴾ بەڵکوو گەل‌و نەتەوەکەی بڕوا بێـنن بـە گەڕانـەوە بـۆلای خـوداو وەدی هـاتنی ئـەو وادەو بەڵێنانەی کە خودا پێی داون لە پاداش‌و سزا، ئەگەر بڕوایان بەم شتانە کرد، ئەوە مانای وایە: بڕوایان بە تاك‌و تەنهایی خودا هەیەو هاوەڵی بۆ دانانێن.

ئەمجار پـەروەردگار دێتـە سەرباسـی پێاهەڵدانی قورئـان‌و دەفـەرموێ: ﴿وَهَـذَا كِتَابٌ﴾ ئەم قورئانە، کتێبێکی بەڕێزو پایەبەرزو سەرسوڕهێنەرە، سوودو قـازانجی بۆ دین‌و دونیا زۆرو زەبەندەیە، بەرنامەیەکی چەسپاوو خودا پەسەندە، قـانونێکی

بەردەوامەو ناسڕێتەوەو کۆن نابیٚو لەکار ناکەویٚ، زیندووەو هەستو ویژدانی شوێن کەوتووانی دەجولێنیٚو هێزو وزەیان پیٚ دەبەخشیٚ، ﴿أَنزَلْنَاهُ﴾ ئێمە ناردوومانەتە خواریٚ بۆ ڕەهنومایی کردنی ئادەمیزاد، ﴿مُبَارَكٌ﴾ کتێبێکی بەفەڕو پیرۆزە، هەموو هۆیەکانی شارەزاییو ڕێنموونی لەخۆ گرتووە، هۆی سەرفرازیو سەرکەوتنی هەمیشەییە، کەوابیٚ ﴿فَاتَّبِعُوهُ﴾ شوێن ڕێنموونییەکانی بکەون، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن ﴿وَاتَّقُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ خۆ بپارێزن لە بێدینیو کوفرو ئیلحاد، خۆ بپارێزن لە ئاکامی کوفرو ئیلحاد کە ئاگری دۆزەخە، هەرچی قورئان نەهی لیٚ کردووە توخنی مەکەون بەڵکوو بە مراز بگەنو بکەونە ژێر ڕەحمەتی بیٚ پایانی پەروەردگارو لە دونیاو قیامەتدا بەختەوەرو کامەران بن.

بەراستی ئەمە بانگەوازییەکی بیٚ پەردەو پێچو پەنایە، پەروەردگار ئاراستەی ئادەمیزادی کردووە، کەشوێن پەیامی قورئان بکەون لە مانای ئایەتەکانی بفکرنو کاری پیٚ بکەن!

قورئان کتێبێکە ناردوومانەتە خواریٚ ﴿أَن تَقُولُواْ إِنَّمَا أُنزِلَ الْكِتَابُ عَلَى طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا﴾ — خیطابەکە لەگەڵ دانیشتوانی مەککەیە — واتە: بۆ ئەوەی نەڵێن تەنیا کتێبی ئاسمانی بۆ سەر نەتەوەی جوولەکە مەسیحی نێردراوەو ئێمە نامەی ئاسمانیمان بۆ نەهاتووە، واتە: بۆ ئەوەی بەهانەتان ببڕین، بیانووتان نەمێنیٚ، بۆ ئەوەی نەڵێن ئێمە لە زانیاری کتێبە پێشینەکان بیٚ ئاگا بووینو چییان لیٚ نازانین، چونکە بە زوبانی ئێمە نەهاتوونە خواریٚ ﴿وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَافِلِينَ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی نەڵێن: ئێمە گەلو نەتەوەیەکی نەخوێندەوارین ئەوەی گەلو نەتەوەکانی دیکە دەیخوێننو دەیزانن ئێمە نایزانینو لێی بیٚ ئاگاین.

﴿أَوْ تَقُولُواْ لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَى مِنْهُمْ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی نەڵێن: ئەگەر ئەو نیگاو کتێبەی بۆ جوولەکە مەسیحییەکان نێردراوەتە خواریٚ بۆ ئێمە بهاتایە ئێمە باشتر هیدایەتمان لیٚ وەردەگرتو چاکتر فێری دەبووینو زووتر تێی دەگەیشتین! چونکە ئێمە زیرەکترو تێگەیشتووترین، بەبڕواو پشوو درێژترین، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویٚ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَى مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ — فاطر/٤٢﴾. جا پەروەردگار بەرپەرچی دانەوەو

بەشێوەیەك کە هەموو عوزرو بڕوبیانووی بڕینو فەرمووی: ﴿فَقَدْ جَاءكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ نا نا، بڕو بیانوو مەهێننەوە ئەوا لەسەر زوبانی پێغەمبەری ئێمە کە موحەممەدە قورەیشی رەگەزو زمان عەرەبیە، قورئانتان بە زمانی خۆتان بۆ نێردراوە، هەموو جۆرە حوکمو یاسایەکی تێدا روون کراوەتەوە، حەلاڵو حەرامی تێدا ئاشکرا کراوە، دەرمانی دەردانە، شیفای دڵو دەروونە، رەحمەتی پەروەردگار بۆ ئەو بەندانەی شوێن فەرمانو جڵەگیرییەکانی دەکەون، پابەندی دەبن لە ئەحکامو بیروباوەڕو رەوشتدا.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامو ئاکامی سەرپێچیکارانو ستەمکاران دیاری دەکاو بە تەعبیرێکی پرسیار ئامێز نارەزامەندی خۆی بەرامبەر ئەوانە دەردەبڕێ کە قورئان بەدرۆ دەخەنەوەو دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِآيَاتِ اللّـهِ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە؟ واتە: کەس لەو کەسە ستەمکارتر نیە کە ئایاتی قورئان بەدرۆ دەخاتەوە، بڕوای بە نیشانەکانی هەبوونی خودا نیە، پاش ئەوەی راستی بۆ دەرکەوتو حەقیقەتی بۆ روون بۆوە، یان هۆکاری فێربوونو تێگەیشتنی بۆ بەیدەست بوو کەچی پشتی لێ هەڵکاو، نەشهێڵێ کەسانی تر بیری لێ بکەنەوەو ببێتە بەربەرست لەبەردەم تێگەیشتنو فێربوونی قورئانو وردبوونەوە لە ئایەتەکانی وەکوو ئەوەی کە ملهوڕەکانی مەککە دەیانکرد وەکوو لە ئایەتێکی تری ئەم سورەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ – الأنعام/٢٦﴾.

ئەمجار پەروەردگار پاش دیاری کردنی رۆڵی قورئان لە شارەزایی کردنو هیدایەتدانی ئادەمیزاددا هەڕەشەی توند ئاراستەی هەموو ئەوانە دەکا کە ڕوو لە قورئان وەردەگێڕنو پابەندی ڕێنموونییەکانی نابنو دەفەرموێ: ﴿سَنَجْزِي الَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ آيَاتِنَا سُوءَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصْدِفُونَ﴾ ئێمە لەوە بەولاوە بە کوشندەترین سزا سزای ئەوانە دەدەین کە ڕوو لە ئایاتی قورئان وەردەگێڕن، پەردە بەسەر چاوو هۆشو بیری خۆیاندا دەدەن، لە نیشانەکانی خودا ورد نابنەوە، ڕێبازی حەق چەواشە دەکەنو دەبنە لەمپەڕ لە بەردەم بانگەوازیکەرانی ئاینی خودادا، خەڵك لە ئاین لادەدەن، ئەوانە تاوانی خۆیانو تاوانی لە خشتە بردنی

خەڵکی دیکەشیان لەسەرە. بۆ خۆیان لە ڕێبازی خودا لایان داوەو خەڵکی تریش لادەدەن، بۆیە سزایان دووچەندانەیە... وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ – النحل/٨٨﴾. ئەوەتا ئایەتەکە زۆر بە روونی ئەوەی تێدایە کە زێدە سزاکەیان بەهۆی لە خشتە بردنی خەڵکەوەیە، کە وێڕای ڕوو وەرگێڕانی خۆیان خەڵکی تریشیان گومڕا کردووە.

## هەڕەشەی توندو کۆتایی بۆ کافرەکانی مەککە

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَـٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَـٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ (١٥٨)﴾.

ئەم ئایەتە هەڕەشەیە لە کافرەکانی مەککە، لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە قورئان بۆیە نێردراوە، تا بروبیانووی کافرەکان ببڕێ و عوزریان نەمێنێ، ئەمجار لێرەدا ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەو کافرانە بەهیچ شێوەیەك ئیمان ناهێنن و هیچ هیوایەك لە بڕوا هێنانی ئەواندا نیە، ئەوەش شی دەکاتەوە کە ئەوەی لە پێشیانەوە چاوەڕوان دەکرێ بێتە رێیان، لەم سێ شتە دەرناچێ کە هاتنی فریشتەیە بۆ گیان کێشانیان، یان پەروەردگار وادەی خۆی بنێتەدی و بەوەی پێغەمبەریان بەسەردا زاڵ بکاو ئەوان تووشی سزای دونیایی بکا، یان بڕێ پەڵپ و بیانووی تر کە کافرەکان دەیانگرت، بێنێتە دی؛ وەکوو ئەوە دەیانگوت با ئاسمان پارچە پارچە ببێ و بەسەرماندا بکەوێ و ئەم جۆرە پەڵپانە!! ئەوکاتە بڕوا نەهێنن و لەناویان بەرێ، هەروەها ئەو ئاواتەیان: کە پێغەمبەر بمرێ و بە

مردنەکەی چرای ئایینی ئیسلام بکوژێتەوە هەرگیز نایەتە دی، بەڵکوو ئایین ئایینی خودایەو قورئان بەرنامەیەتیو خودا ناردوویەتیو هەر ئەومیش پارێزگاری دەکا. دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ﴾ جگە لەیەکێ لەم سێ شتە چاوەڕوان ناکەن! واتە: بەگوێرەی سوننەتی خودا ئەوەی لێیان چاوەڕوان دەکرێ یەکێ لەم سێ ئاکامو سەرەنجامەیە، فریشتەی گیان کێشان تاك تاك بێتە سەریانو گیانیان بکێشێ! یان فریشتەی سزا بێتە سەریانو بەکۆمەڵ لە ناویان بەرێ، ﴿أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ﴾ یان خودای تۆ وادەو بەڵێنی خۆی بێنێتە دی، بەوەی خۆشەویستانی خۆی سەربخاو هەڕەشەکانی بۆ دوژمنانی ئایین جێبەجێ بکا، بەوەی لە دونیادا سزایان بداو بەدبەختیو چارەڕەشی هەتا هەتایی لە خۆیان بگرێ! هیچ شتێك نەبێ بیانپارێزێ! وەکوو ئەوەی کە دەربارەی ئەوانەی پێیان وابوو قەڵاو شوراکانیان لە سزای خودا دەیانپارێزێ دەفەرموێ: ﴿فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا – الحشر/٢﴾.

﴿أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ﴾ یان بڕێ رووداوی وا روودەن کە وایان لێ بکا بە ناچاری ئیمان بێنن[١] وەکوو ئیمان هێنانی فیرعەون، هەڵبەتە ئەم جۆرە ئیمان هێنانە چ سوودێکی نیەو نابێ، چونکە ئیمان هێنانی ئاوا لە حاڵەتی غەرغەرەدا بە ئیمان هێنانی ئیختیاریو ئاسایی حلێب ناکرێ، کابرا زمندەقی دەچێو چ ئیعتیبارێك بە ئیمانەکەی ناکرێ!!

بۆیە پەروەردگار هەڕەشەی کۆتایی ئاراستەی کافرەکانی مەککەو هەموو ئەوانەی هەڵسوکەوتیان وەکوو ئەوانە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ

[١] بێگومان موشریکەکانی مەککە زۆر پەڵپو بیانووی سەیر سەیریان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگرت، جارێک دەیانگوت: با فریشتە بێتە خوارێ بۆ سەرمان، یان دەیانگەت: با خودا بۆخۆی بێ یان با ببینین وەکوو قورئان لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ أَوْ نَرَى رَبَّنَا – الفرقان/٢١﴾. یان دەفەرموێ: ﴿أَوْ تَأْتِيَ بِاللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ قَبِيلاً – الإسراء/٩٢﴾. یان داوای ئەومیان کرد کە ئاسمان بە سەریاندا پارچە پارچە بێو بکەوێتە خوارێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاء كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا – الإسراء/٩٢﴾.

رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ﴾ ئەو ڕۆژەی بڕێ لە ئایاتو نیشانەکانی پەروەردگار پەیدا دەبنو کافرەکان ناچار دەکا کە ئیمان بێننو دەرەتانیان نامێنێ، ئا لەو کاتە ناچارییەدا ئیمان هێنان هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ چونکە ئیمان هێنانەکە بە ئیختیارو خواهیشی خۆیان نیە، ئیمانیش کاتێك کەڵکی هەیە کە بە خواهیشو ئارەزوو ئیحتیار ئەنجام بدرێ، ئیمانێك کەڵکی نیە کە لە پێش ئەو حاڵەتە ناچارییەدا ئیمانی نەهێنابێ ﴿أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا﴾ یان لەوەپێش ئیمانی هێنابێ بەڵام چ کردەوەیەکی چاکی لەگەڵدا نەکردبێ پاش هاتنی ئەم نیشانانە ئەگەر کردەوەیەکی چاکیش بکا بێ سوودەو کەڵکی لێ وەرناگرێ.

بەکورتی پەڵپو داواکردنی خوانەناسان بۆ ڕوودانی کاری نائاسایی (خارقە) لە بوونەوەردا ئەگەر بڕێکیان پەیدا بوون ئیمانیان نەهێنا ئەوە یەکسەر خودا لەناویان دەباو دەیانفەوتێنێ ئەو ڕۆژەی بڕێ نیشانەی هاتنی ڕۆژی قیامەت پەیدا دەبن ئیتر ئیمان هێنانو کاری چاکەکردن دوای پەیدا بوونی ئەو نیشانانە هیچ سوودی نیە بۆ کەسێك لەوە پێش ئیمانی نەهێنابێو کردەوەیەکی باشی نەکردبێ لەگەڵ ئیمانەکەیدا، چونکە کردەوەی چاك هەمیشە هاوشانی ئیمانەو بەڵکوو کردەوە تەرازوو پێوەری ئیمانە، هەروەها چونکە دوای پەیدا بوونی نیشانەکانی قیامەت ئەوانەی ئیمان دەهێنن ئیمان هێنانەکەیان ناچارییەو لە خواهیشو مەیلەوە نیە، ئەوکاتە سەرەتای جیهانی قیامەتەو تەکلیف نامێنێو سزاو پاداشیش لە ئاکامی تەکلیفەوە دەبێ؛ چونکە تەکلیف داخوازی ویستو ئیرادەیە بەوەی کابرا لایەنی ئیمان هەڵبژێرێ یان لایەنی کوفر، کاری چاك بکا یان خراپ، سزاو پاداشیش لە ئاکامی ئەو جۆرە تەکلیفەوە دەستنیشان دەکرێن. هەندێ کەس لە سەرەمەرگو حاڵەتی غەرغەرەدا بڕێ لەو نیشانانە دەبینن هەندێکیش لەو نیشانانە تا نزیك رابوونی قیامەت نایانبینن.

ئیمامی بوخاریو موسلیمو هی تریش لە ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەدا فەرموودەیەکیان لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا رَآهَا النَّاسُ

آمَنَ مَنْ عَلَيْهَا، فَذَاكَ حِينَ ﴿لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا ، لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ﴾». له گێڕانەوەیەکی تردا «فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ، وَذَلِكَ حِينَ» ﴿لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ﴾. واتە: قیامەت بەرپا نابێ هەتا خۆر لە شوێنی ئاوابوونی ئێستاکەیەوە هەڵنەیەتەوە، جا کە هەڵهاتو خەڵك بینییان هەموو دانیشتوانی سەرزەوی بڕوا دەهێنن، ئەوە کاتێکە کە بڕوا هێنانی کەس سوودی نیە، ئەگەر لەوە پێش موسوڵمان نەبووبێ؛ ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی ئێرەی خوێندەوە.

ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذی حەدیثێکی (مەرفووع)یان لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «ثَلاَثٌ إِذَا خَرَجْنَ لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الأَرْضِ». سێ شت کە روویانداو پەیدا بوون بڕوای هیچ کەسێك کە لەوەپێش ئیمانی نەهێنابێ سوودی نیە، ئەو سێ شتەش: هەڵهاتنەوەی خۆرە لە شوێنی ئاوابوونی ئێستاکەیەوەو پەیدا بوونی (دەجالو دابەتولئەرض)ە.

ئەمجار پاش ئەم هەڕەشە سەختە، پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلِ انتَظِرُواْ﴾ ئەی محمد! بەو کافرە سەرسەختانە بڵێ: دە ئێوە چاوەڕوانی ئەو شتانە بن کە بە هیوان روو بدەن، هەروەها چاوەڕوانی ئەوە بن کە پێتان وایە: ئیسلام لەناو دەچێ، پێغەمبەر دەکوژرێ ئاسەواری ئایین نامێنێ ﴿إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ئێمەیش چاوەڕوانی ئەو وادەو بەڵێنانەین کە خودا پێی داوینو هیچ شكو گومانمان نیە لە راستیاندا، ئێمە سەردەخاو بە مراز دەگەینێو دوژمنانمان لەناو دەباو دەیانفەوتێنێ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلاَّ مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ قُلْ فَانتَظِرُواْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ – يونس/١٠٢﴾.

بێگومان ئەمە هەڕەشەیەکی توندە بۆ کافرو خوانەناسەکان، بۆ ئەوانەی بڕوا هێنان دوا دەخەن، تۆبەو ژێوان بوونەوە لە تاوان هەڵدەگرن بۆ کاتێك کە ئیمان هێنانو تۆبە کردن سوودی نابێ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ، فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا – غافر/ ٨٤ – ٨٥﴾.

## سەرەنجامی کێشەو دووبەرەکی لە ئاییندا

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩ ﴾ .

پاش ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرەکان کردو ترساندنی لە سزای سەختو ئەو رووداوە سامناکانەی کە لە پێش رابوونی قیامەت روو دەدەن، ئەمجار موسوڵمانان لە دوو بەرەکیو کێشەنانەوە لە ئاییندا دەترسێنێو هەڵیان دەنێ بۆ یەکیەتیو تەبایی لە ناو خۆیانداو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا﴾ واتە: ئەوانەی ئایینی خۆیان لێك جیا کردۆتەوەو ئیمانیان بەبڕێکی هەیەو کاری پێ دەکەن هەندێکیشی پاشگوێ دەخەنو کاری پێ ناکەن، بەگوێرەی هەواو هەوەسی خۆیان دەقەکانی دەگۆڕنو مانای ناقۆڵاو نەگونجاویان بۆ دیاری دەکەن. کۆمەڵ کۆمەڵو گرۆ گرۆ بوون؛ هەر تاقمو کۆمەڵێك ڕێبازو بیروبۆچوونێکی هەیەو لایەنگری مەذهەبێکەو کوێرانە داکۆکی لێ دەکا...

ئایەتەکە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە ئایین هەڵگەڕابنەوەو دژی ئایین هەڵسو کەوت بکەن.[1]

---

[1] – ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: ئەوانەی کە ئایینی خۆیان جیا کردۆتەوە تاقمو گرۆی بیدعەت خوازو چەواشەکارن، کۆمەڵی گومڕاو سەر لێ شێواوی ئەم ئۆمەتەن، موجاهیدیش هەر ئەم تەفسیرەی بەلاوە پەسەندە.

ئەبو ئومامە دەڵێ: مەبەست بە ﴿وَكَانُواْ شِيَعًا﴾ تاقمی خواریجو لە کۆمەڵ دەرچووەکانن.

قەتادەو ضەحاكو سوددی دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان هاتۆتە خوارێ کە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمو مووساو عیسایان تێك داوەو گۆڕانکاریان تێدا کردووە کردوویانە بە چەند ئایینێکی جیا جیاو ڕێبازی جۆراو جۆر. خاوەنی تەفسیری مەنار پێی وایە: ئایەتەکە گشتییە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە ئایین لادەدەن، دەڵێ وا چاکە تەفسیرێك بکەین هەردوو راکان بگرێتەوە چونکە پەروەردگار لەم سورەتەدا لە پێش بەڵگەی ئیسلامی هێنانەوە، شوبهەو چەواشەکاری موشریکەکانی رەت کردەوە، باسی ئەهلی کیتابو

﴿لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ﴾ ئەی محمد! تۆ لە هیچ شتێکدا لەوان نیت، تۆ لە خراپەکاری ئەوان بەرپرسیار نیو توخنیان مەکەوەو وازیان لێ بێنە، شەڕیان لەگەڵ مەکە، تۆ بەس ڕاگەیاندنی ئایینت لەسەرە، کۆمەکی بە دروشمی ئایینی حەق بکە کە ئیسلامەو بەرێك و پێکی بەو خەڵکەی ڕابگەیەنە، تۆ لە پێڕیٚ ئەوان نی لە کردەوەو گوفتارو ڕێبازی ئەوان بەرپرسیار نیت ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ ئیشی ئەوان؛ حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا پەیوەندی بە خوداوە هەیە، پاشان لە قیامەتدا ئیشە خراپەکانیان دەخاتەوە بەرچاوو هەواڵی کردەوەکانیان یەکە یەکە بەبێ زیادو کەم پێ دەداتەوەو لەسەر ئەو دوو بەرەکی نانەوەو کێشە پەیدا کردنە لە ئاییندا سزایان دەدا.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە موسوڵمانان هەڵدەنێ کە یەکیەتیو تەبایی ڕیزەکانی خۆیان بپارێزنو کێشەو دووبەرەکی لە ئاییندا بەرپا نەکەنو شتی نامۆو بیدعەت نەهێننە ناو ئایینەوە[1]. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزانەداو بۆ زیاتر شی کردنەوەو تێگەیاندن هەمیشە موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ یەکیەتیو تەباییو ترساندونی لە دووبەرەکیو پەرتەوازە بوون، ئەبو داوود لە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتاری بۆ خوێندنەوەو فەرمووی: «أَلاَ إِنَّ مَنْ قَبْلَكُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ افْتَرَقُوا عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً وَإِنَّ هَذِهِ الْمِلَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ، ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ وَهِيَ الْجَمَاعَةُ». ئاگاداربن ئەوانەی پێش ئێوە لە خاوەن نامەکان – جوولەکەو نەصرانی – بووبوون بە حەفتاو دوو کۆمەڵ، ئەم ئومەتەی منیش دەبنە حەفتاو سێ کۆمەڵو گرۆهی جیا جیا، حەفتاو دوو تاقمیان دەچنە دۆزەخەوەو تاقمێکیان لە بەهەشتدان ئەوانیش تاقمو شوێن کەوتووی ڕێبازی منن.

---

شەریعەتەکەیانی کرد، ئەمجار فەرمانی بەوانە کرد کە بە پیر بانگەوازی ئیسلامییەوە هاتن کە یەکیەتیو تەبایی خۆیان بپارێزنو دووبەرەکی نەنێنەوەو گرۆ گرۆ نەبن.

[1] –تەفسیری رازی ج ١٤/٨ .

هـۆی دووبـەرەکیو پەرتـەوازە بـوون زۆرو زەبەنـدن گرنگرتـرین ئـەو هۆکارانەپلـەو پایـەو کورسـی خۆشەویـستیە، دەمـارگیری رەگـەز پەرسـتییە، ئارەزووبـازیو را سـەپاندنە، گـوێ را گـرتن بـۆ پروپاگەنـدەی دوژمنـانو فـرتو فێڵیانـە، نـەزانی پاشکەوتوویی‌و شـوێنکەوتنی کوێرانـەی خـەڵکانی تـرە لـە دابو نـەریتو لاسـایی کردنـەوەدا، هـەروەها وازهێنـانو خـۆ دزینـەوەی زۆربـەی حکومەتـەکانی سـەرزەوی لـە ئـایینو بیروبـاوەرو پرۆگـرامو نیظامو یاسـای خـودا پەسەند!!!

## پاداشی چاکەو خراپە

﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لەم سورەتەدا بنەمای باوەڕی بۆ روون کردینـەوە، بـە شوێن ئەوەدا دە ئامۆژگاریو وەسیەتنامەی ئاراستە کـردین، هەڕەشـەی لـە کافرو تاقمی بیدعەخواز کرد، ئەمجار پاداشـتی کـردەوەی چاكو سـزای کـردەوەی خراپـی دیاری کردو فەرمووی: ﴿مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُـونَ﴾ هـەر کەسـێك رۆژی قیامـەت بێتـە دەشـتی مەحـشەرەوە تێشووی باشی پێ بێ، کردەوەی چاکی کردبێ، تۆماری ژیانی دونیای خوداپەرستیو بەندایەتی کردنو فەرمانبەرداری بووبێ، ئـەوە پاداشـی دە چـەندانەی دەدرێتـەوە، ئەمە لە رووی دادپەروەریو زێدە پێدانی سنوور دارەوەیـە، ئـەگینا جاری وا هەیـە چاکە بە حەوت سـەد ئەوەنـدەو زیـاتریش پـاداش دەدرێتـەوە وەکوو لـە شـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّـهِ كَمَثَـلِ حَبَّـةٍ أَنبَتَـتْ سَبْعَ سَـنَابِلَ فِـي كُـلِّ سُـنبُلَةٍ مِّئَـةُ حَبَّـةٍ وَاللّـهُ يُـضَاعِفُ لِمَـن يَـشَاء وَاللّـهُ وَاسِـعٌ عَلِـيمٌ – البقرة/٢٦١﴾. یان دەفـەرموێ: ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللّـهَ قَرْضًـا حَسَنًا فَيُـضَاعِفَهُ لَـهُ

أَضْعَافًا كَثِيرَةً – البقرة/٢٤٥﴾. یان دەفەرمویٚ: ﴿إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ – التغابن/١٧﴾.

ئەم جوداوازیو زیادکردنی پاداشتی چاکەیە بەدەست پەروەردگارەو چۆنی بویٚ چەندی بویٚ زیادو کەمی تیٚدا دەکا، هەوەکوو چۆن ئیخلاصو نییەتی چاکەی کارەکە رۆڵی خۆی هەیە لە زیاد کردنو کەم کردنی پاداشەکە.

کەسیٚکیش بیٚتە دەشتی مەحشەرو خراپەی کردبیٚ ئەوە بە ئەندازەی ئەو خراپەیە سزا دەدریٚ ﴿وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ هیچ کەس لە چاکەکارو خراپەکار ستەمیان لیٚ ناکریٚ، لە کردەوەی کەسدا زیادو کەمی ناکریٚ، لە پاداشتی چاکەکاران کەم ناکریٚتەوە لە سزای خراپەکارانیش زیاد ناکریٚ!

پیٚغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیٚ) لە فەرموودەیەکیدا ئەندازەو جوداوازی نیٚوان پاداشتی چاکەو سزای خراپە دیاری دەکا، ئەوەتا ئیمامی ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو نەسائی لە ئیبنو عەبباسەوە (خودای لیٚ رازیی بیٚ) دەڵیٚ پیٚغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: «إِنَّ رَبَّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ رَحِيمٌ، مَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا، كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةٌ، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ لَهُ عَشْراً إِلَى سَبْعِمِائَةٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةٌ، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ لَهُ وَاحِدَةً أَوْ يَمْحُوهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَلاَ يَهْلِكُ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى إِلاَّ هَالِكٌ». پەروەردگاری ئیٚوە بە بەزەییو خاوەن سۆزە، کەسیٚك ویستی چاکەیەك بکا، بەڵام نەی کرد چاکەیەکی بۆ دەنووسریٚ، ئەگەر چاکەکەی کرد دە پاداش تا حەوت سەد پاداشی بۆ دەنووسریٚ بەڵکوو زیاتریش، کەسیٚك ویستی خراپەیەك بکاو نەی کرد چاکەیەکی بۆ دەنووسریٚ ئەگەر خراپەیەکی کرد یەك خراپەی بۆ دەنووسریٚ.

## زانایان دەربارەی کەسیٚك کە دەیەویٚ خراپە بکاو دوایی نایکا دەڵیٚن ئەمانە سیٚ جۆرن:

١- خراپە ناکا لەبەر خاتری خودا، ئەمە چاکەی بۆ دەنووسریٚ.

٢- واز لە خراپەکە بیٚنیٚ بەهۆی لە بیرچوونەوەو بیٚ ئاگا بوون لیٚی ئەمە نە چاکە نە خراپە هیچیانی بۆ نانووسریٚ چونکە نیەتی خیٚری نەهیٚناوەو کاری خراپەشی نەکردووە.

٣- ئەگەر وازی لە خراپەکە هێنا لەبەر نەتوانین‌و تەمبەڵی‌و ویستی بیکاو بۆی نەکرا، ئەوە وەکوو خراپەکەی کردبێ وایە، چونکە لە حەدیثی صەحیحدا هاتووە دەفەرموێ: «إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ» هەرکاتێ دوو موسوڵمان بە شمشێر پەلاماری یەکیان دا، یەکیان ئەوی تری کوشت بکوژو کوژراو دەچنە دۆزەخەوە! هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمیان بکوژە، حەقی خۆیەتی بچێتە دۆزەخەوە، ئەی کوژراو بۆ؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چونکە ئەمیش مەبەستی بوو دەستی خۆی پێش بخاو بەرامبەرەکەی بکوژێ!.

## شوێن کەوتنی ئایینی ئیبراهیم لە یەکتاپەرستی‌و عیبادەتدا

﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾.

پــەروەردگار لــەم ســوورەتە پــیرۆزەدا بەڵگــەی زۆرو زەبەنــدەی لەســەر یەکتاپەرســتی هێنایــەوە، بیروبۆچــوونی کافرەکــانی رەت کــردەوە، هەڕەشــەی لــە ئەوانە کرد کە بڕوایان بە قەزاو قەدەر نیە، ئەمجار کۆتای سورەتەکە بەوە دەهێنێ کە ئایینی تۆکمەو رێك‌و پێك، رێگای راست‌و دروست ئـاییـنی حـەزرەتی ئیبراهیمـە کـە لەســەر بنــەمای یەکتاپەرســتی‌و خوداپەرســتی بــێ غــەل‌و غــەش دامــەزراوە، بەگوێرەی ئـەو ئایینـە هـەر کەسـە بەرپرسیارە لـە کارو کـردەوەی خـۆی‌و چاکەو خراپەی کەس بـۆ کـەس قازانج‌و زیـانی نیـە، هیدایـەتی‌و گەیـشتن بـە ئـاوات هـەر بەدەست پەروەردگارە، پاداش‌و سزا بۆ ئادەمیزاد لای خودا لەسەر ئـەو کردەوانەیـە کە ئەنجامی دەدا، کردارو گوفتار نیشانەی خۆشبەختی‌و کامەرانی یان بەدبەختی‌و چارەڕەشی هەموو ئادەمیزادە.

بۆیە خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەکا بـۆ ئـەوەی ئـەم راستیانە بـە گەلەکـەی بڵـێ: دەفـەرموێ: ﴿قُـلْ إِنَّنِـي هَـدَانِي رَبِّـي إِلَـى صِـرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەی محمد! بە گەل‌و نەتەوەکەت‌و هەموو ئـادەمیزاد را بگەیەنـەو پێیـان بڵـێ: خـودای خـۆم رێنمـوونی کـردووم‌و تـەوفیقی داوم بـۆ رێبـازێکی راسـت‌و بـێ قۆرت‌و پێچ، کە بریتییە لە ئایینی تۆکمەو رێك‌و پێك، کە پابەنـد بـوون پێیـەوە خۆشـبەختی دونیـاو قیامـەت دەسـتەبەر دەکـا، ئایینێکـە لەسـەر حـەق‌و راسـتی دامـەزراوە بنـەماکانی چەسپاوەو لەگـەڵ سروشـتی ئـادەمیزاددا گونجـاون، ﴿قِيَمًـا﴾ ئایینێکە راست‌و رەوانـە، خـوارو خێـچی تێـدا نیـە ﴿مِّلَّـةَ إِبْـرَاهِيمَ حَنِيفًـا﴾ ئـەویش ئایینی ئیبراهیمی خەلیلە کە لـە هـەموو ئـایینێکی بـەتاڵ‌و پـووچ پـشتی هـەڵکردو رووی کـردە ئـایینی حـەق‌و خـودا پەسـەند کـە ئـایینی ئیـسلامە، دە ئێـوە ئـەی ئادەمیزاد! هەمووتان پابەنـد بـن بـەو ئایینـە پاکە بـێ خەوشـەوەو لێـی لامـەدەن؛ چـونکە ئـایینی حـەق‌و یەکتاپەرسـتییە! ئـایینی هەڵبـژاردەی ئیبراهیمـە؛ کـە لـە هەموو ئایینێك رووی وەرگێڕاو ئەم ئایینەی هەڵبـژارد ﴿وَمَا كَانَ مِـنَ الْمُـشْرِكِينَ﴾ هـەرگیز ئیـبراهیم هـاوەڵی بـۆ خـودا دانـەناوە، بـڕوای بـە فـرە خـودایی نـەبووە، یەکتاپەرستێکی راستاڵ بووە.

ئاشكرایە ئایینی خودا، ئایینی یەكتاپەرستیو هەمیشەییو راستاڵییە بۆ خودا، ئەو ئایینەیە كە پەروەردگار هەموو پێغەمبەرانی پێ ناردووە، لە هەموو نامە ئاسمانییەكاندا چەسپاندوویەتی، فەرمانی بە هەموو فروستادەكانی خۆی كردووە كە بانگەوازی بۆ بكەن، بۆیەش ئەم ئایینەی بە تایبەت بە ئایینی ئیبراهیم ناو برد چونكە حەزرەتی ئیبراهیم دروودی خوای لەسەر بێ، پێغەمبەرێكە هەموو كەس ددان بە فەضلو رێزیدا دەنێن، هەموو كەس پێیان وایە: ئایینەكەی راستو تەواوە عەرەبەكانو جوولەكەو مەسیحییەكان هەریەكەیان لە ئاست خۆیەوە خۆیان بە شوێنكەوتووی ئەو پێغەمبەرە مەزنە دەزانێ، قورەیشییەكانو لایەنگرەكانیان خۆیان بە شوێنكەوتووی ئەو دەزانیو پێیان وابوو لەسەر ئایینی ئیبراهیمن، بۆیە پەروەردگار دوای وەصف كردنی ئەو زاتە بە (حەنیف)و پشت هەڵكردوو لە هەموو ئایینێكی بەتاڵ، وەصفی یەكتاپەرستی بۆ دیاری كردو فەرمووی: هەرگیز ئیبراهیم هاوەڵی بۆ خودا دانەناوە، جوولەكەو مەسیحییەكانیش ئیدیعای شوێنكەوتنی ئیبراهیمیان دەكردو پێیان وابوو وێڕای شوێنكەوتنیان بۆ مووساو عیسا شوێنكەوتووی ئیبراهیمیشن! دەی كە ئەوە ئایینی ئیبراهیمەو بریتییە لە یەكتاپەرستی، ئەدی ئەی موشریكەكانی عەرەب! ئەی تاقمی جوولەكەو مەسیحی! چۆن ئێوە لافی ئەوە لێ دەدەن كە شوێنكەوتووی حەزرەتی ئیبراهیمنو ئایینی ئەو زاتە پەیڕەو دەكەن؟؟ كەچی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن كوڕو كچو خێزانی بۆ بەڕەوا دەزانن!! بۆچی ئایینی ئەو؛ كە بریتیە لە كاكڵەو جەوهەری ئایینی ئیسلام، وەرناگرنو موسوڵمان نابن؟ خۆ ئیبراهیم پێغەمبەرێكی یەكتاپەرستو حەنیف بوو، ئایینی خوداپەسەندی هەڵبژارد، نە جوولەكە بووەو نە مەسیحی، وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – آل عمران/٦٧﴾.

بۆیە بانگەوازی ئیسلامیی بەجەمسەرو تەوەرەی هەموو ئایینی پێغەمبەران دەژمێردرێ، چونكە ئایینی پەسەندو هەڵبژێراوی پەروەردگارە، بەڵكوو ئایینی پەسەند لای خودا هەر ئایینی ئیسلامەو بەس! وەكوو لە شوێنێكی تردا

دەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ – آل عمران/٨٥﴾.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا کە بە موشریکەکان رابگەیەنیٚ، هەڵوێستی نەگۆڕی خۆی بۆ ئەوانە دیاریی بکا کە یەکتاپەرستی ناکەن‌و جگە لە خودا شتی تر دەپەرستن، کوشتی بە ناوی غەیری خودا سەردەبڕن، فەرمانی پی دەکا؛ پێیان بڵیٚ: نوێژو عیبادەت‌و حەج‌و عەمرە بەناوی پەروەردگارەوەو بۆ ئەوی ئەنجامی دەدا، کەس ناکاتە هاوەڵی خوداو جگە لە خودا کەسی تر ناپەرستیٚ!

ئەو کاتە موشریکەکان بتیان دەپەرست، کوشتیان بۆ سەردەبڕین‌و لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا ناوی بتەکانیان لەسەر دەبردن. بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) کرد: کە پێچەوانەی ئەوان هەڵس‌و کەوت بکا، مەبەست‌و نییەت‌و عەزم‌و کردەوەی تەنیا بۆ خودا بیٚ‌و کەسی کەی مەبەست نەبیٚ‌و پێی فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! پێیان بڵیٚ: ﴿إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ بێگومان هەموو جۆرە خوداپەرستییەکم؛ نوێژو پاڕانەوەو قوربانی‌و حەج‌و عەمرەو هەموو کردارو گوفتارێکم لە ژیانمدا ئەو بیروباوەڕی لەسەری دەمرم هەمووی بۆ خودای پەروەردگارەو مەبەستم لە ئەنجامدانیان بەندایەتی کردنی زاتی پاکی کردگارە، هەموو کارو مەبەست‌و نییەتم بۆ رازی کردنی خودای مەزن‌و بیٚ هاوەڵە!

بێگومان ئەم ئایەتە کۆکەرەوەی هەموو کردارێکی چاکەیە، هەموو کردارو گوفتارێکی باشی لە خۆ گرتووە!

پێویستە موسوڵمان مەبەست‌و کرداری، هەرچی لە ژیانیدا ئەنجامی دەدا، هەر بەرهەمێکی دەیخاتە روو بۆ خودا بیٚ‌و رەزامەندی ئەوی مەبەست بیٚ، بەڵکوو پێویستە ئەو کردارە باشانەی لە پاش خۆی بەجێیان دێڵیٚ بۆ خودا بیٚ‌و لەبەر خاتری خودا بیٚ‌و بۆ بەندایەتی کردن بیٚ بۆ خودا.

جا هەرچەندە وشەی (نسك) کە بە زۆریی بۆ قوربانی‌و ئەنجامدانی کاروباری حەج بەکار دەهێنریٚ‌و بەشێوەیەکی گشتی بەمانا عیبادەت‌و خوداپەرستییەو نوێژیش دەگرێتەوە، بەڵام بۆیە بە تایبەتی باسی نوێژی هێنا چونکە نوێژ

جەوهەرو کاکڵەی خوداپەرستییە، بە مۆرانەی شیرك زەدەدار دەبێ ﴿لاَ شَرِيكَ لَهُ﴾ پەروەردگار هاوەڵو هاوشانی نیە، نە لەزاتو نەلە صیفاتدا، کەس نیە لە خودایەتیو پەروەردگاریەتیدا وەکوو ئەو بێ، پەرستشو بەندایەتی کردن هەر بۆ ئەوە، هەر ئەو مافی تەشریعو یاسادانانی هەیە ﴿وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ﴾ من بەو بیروباوەڕە فەرمانم پێ کراوەو بە موو لێی لانادەم، ﴿وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ من یەکەم موسوڵمانی گەردنکەچم بۆ بەجێهێنانی فەرمانی پەروەردگارەو بۆ خۆپاراستن لە جڵەوگیرییەکانی، هەر شتێك ئەو نەهی لێ کردبێ هەرگیز توخنی ناکەوم!

جا کەلە ئایەتی پێشوودا تاكو تەنهایی یەزدانی لە بارەی خودایەتییەوە راگەیاندو، ئەمجار تاكو تەنهایی ئەو زاتە لە (ربوبیەت)دا رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانە بڵێ: ﴿أَغَيْرَ اللّهِ أَبْغِي رَبًّا؟﴾ ئایا دەشێ من جگە لە خودا پەروەردگارێکی تر داوا بکەم؟ لە کاتێکدا کە ئەو زاتە پاكو بەرزە خاوەنی هەموو شتێکە، چی لە بوونەوەردا هەیە دروستکراوی ئەوەو ئەو بەدیهێناوەو هەڵی دەسوڕێنێ، هەر ئەو زاتە کانو سەرچاوەی خێرو بێرەو سوود گەیەنەرو زیان دوورخەرەوەیە!! دەی چۆن دەگونجێ من جگە لە ئەو کەسێکی تر بە پەروەردگار بزانم؟

﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا﴾ هەر کردەوەیەك ئادەمیزاد ئەنجامی بدا، چاك بێ یان خراپ بێ، پاداشو سزای لەسەر ئەو ئادەمیزادە خۆیەتیو کەسێکی تر لێی بەرپرسیار نیە ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ نەفسێك هیچ تاوانی نەفسێکی تر هەڵناگرێ، هەر کەسە سزاو پاداشی لەسەر کردەوەی خۆی دەدرێتەوە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ – البقرة/٢٨٦﴾.

هەموو ئادەمیزادێك بەرپرسیاری کردارو گوفتاری خۆیەتی، چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە. ﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ ئەمجار ئەی ئەو تاقمو کۆمەڵانەی خۆتان بە حونەفاو ئایین پەسەند دەزانن! باش بزانن لە کۆتایی دا گەڕانەوەتان بۆ لای پەروەردگاری خۆتانە، نەك بۆ لای کەسانی تر، هەر ئەو ئاکامی دووبەرەکی نانەوەتان لە ئاییندا پێ ڕادەگەیەنێو بە گوێرەی

زانستو ویستی خۆی سزاتان لەسەر کردەوەکانتان دەداتەوە! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ - آل عمران/٥٥﴾.

ئایەتی ژمارە (١٦٣) لەم سورەتەدا ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە حەزرەتی موحەممەد یەکەم موسوڵمانەو کەسی تر ئەو پلەیەی نادرێتێ!

ئەگەر پرسیار بکرێو بگوترێ ئایا حەزرەتی ئیبراهیمو پێغەمبەرانی پێش ئەو لە خوداناسینو موسوڵمانیەتیدا پێش پێغەمبەری ئیسلام نەکەوتوون؟ ئەدی بۆچی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) بەیەکەم موسوڵمان حلێب دەکرێ؟

## ئیمامی قورطوبی بەسێ بەڵگە وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە دەفەرموێ:

١- حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مانادا یەکەم دروست کراوە بە گشتی، ئەبو هورەیرە (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «نَحْنُ الآخِرُونَ الأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَنَحْنُ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ».

لە فەرموودەیەکی تردا کە حوزەیفە ریوایەتی دەکا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر با) فەرموویەتی: «نَحْنُ الآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمَقْضِيُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلاَئِقِ».

٢- حەزرەتی موحەممەد لە دروست بووندا پێشیان کەوتووە وەکوو پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ﴾ قەتادە دەڵێ: ئیبنو سەعد دەڵێ: لەم بارەوە پێغەمبەر فەرموویەتی: «كُنْتُ أَوَّلَ النَّاسِ فِي الْخَلْقِ وَآخِرَهُمْ فِي الْبَعْثِ» من یەکەم پێغەمبەرم لە دروست کراویدا، دوا کەسیشیانم لە ناردندا، بۆیە لێرەدا ناوەکەی پێش حەزرەتی نووحو پێغەمبەرانی تریش خراوە.

٣- دەتوانرێ بگوترێ حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) یەکەم موسوڵمانە لە ئومەتەکەی خۆی.

## جێنشینی ئادەمیزاد لەسەر زەوی

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿١٦٥﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە سەرەنجامی هەموو ئادەمیزاد گەڕانەوەیە بۆلای خودا بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوە، بە ئایەتێکی سەرنج ڕاکێش‌و گرنگ، کۆتایی بە سورەتەکە هێنا، ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاند کە ئادەمیزاد بڕێکیان دەبنە جێنشینی بڕێکیان، وەکوو چینی بێستان چینێك دەڕواو چینێکی تر جێگایان دەگرنەوە، بۆ ئەوەی ژیان لەسەر زەوی درێژەی پێ بدرێ‌و ئادەمیزادەکان پێشبڕکێ بکەن بۆ ئەنجامدانی کاری باش‌و فەرمووی: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئادەمیزادەکانی کردوون بە جێگیرو جێنشینی یەکتری، هەندێکیان شوێنی هەندێکیان دەگرنەوە، گەلە پێشینەکانی لەناو بردوون، گەل‌و نەتەوەی تری خستنە شوێنیان بۆ ئەوەی زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ڕۆڵی خۆیانی تێدا بگێڕن، پێشبڕکێ بکەن بۆ بەکارهێنان‌و سوود بینین لە بەروبوومەکانی.

﴿وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ﴾ هەندێکیانی خستۆتە ژوور هەندێکیانەوە، جوداوازی خستۆتە نێوانتانەوە؛ لە دەوڵەمەندی‌و هەژاریدا، لە پلەو پایەو دەست ڕۆیشتوییدا، لە زانین‌و نەزانیدا، لە شێوەو شکڵ‌و سەرو سیمادا، لە جوانی ناشیرینیدا، لە عەقڵ‌و ژیریدا، لە رزق‌و ڕۆزیدا، ئەم جوداوازی‌و خوارو ژوورییە لەبەر نەتوانین‌و نەزانی خودا نیە، بەڵکوو ﴿لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بە تاقیتان بکاتەوە لەو ماڵ‌و داراییەی پێی بەخشیوون، یان لەو کەم‌و کوڕییەی کە تووشی دەبن لە ژیاندا، بۆ تاقیکردنەوەو ئەزموونە، تا دەربکەوێ چۆن هەڵس‌و کەوت لەگەڵ ئەو بەش‌و بارەدا دەکەن کە خوا پێی داون، واتە: پەروەردگار

هەرچەندە بۆخۆی پێویستی بە تاقیکردنەوە نیەو هەموو شتێك لای ئەو نومایانە. بەڵام وەكوو تاقیكەرەوە هەڵس و كەوتتان لەگەڵ دەكا؛ دەوڵەمەند بە تاقی دەكاتەوە، ماڵ و سامانی دەداتێ، تا دەربكەوێ تا چ ئەندازەیەك شوكرانە ژمێری لەسەر دەكاو بەشی فەقیر و هەژارانی لێ دەدا! هەژار بە تاقی دەكاتەوە ماڵ و سامانی ناداتێ ژیانی پڕ ئاستەنگ و دەست كورتی دەداتێ؛ تا دەربكەوێ چەند شوكرو صابیرە بەو بەشەی خودا بۆی داناوەو چۆن هەڵس و كەوت لەگەڵ هەژارییەكەیدا دەكا. ئەمجار خودا پاداش و سزا لەسەر كردەوەكانیان دەداتەوەو هەر كەسە بەپێی كردەوەو هەڵس و كەوتی خۆی لە دونیادا پاداشت و سزای ڕۆژی قیامەت وەردەگرێ!

وادەبێ ئادەمی كەمتەرخەمی دەكا لەو ئەركەی پێی سپێردراوە یان بە ڕێك و پێكی ئەركی سەرشانی جێبەجێ دەكا، ئیتر پاداش و سزا بە گوێرەی ئەو كردارو هەڵوێستە دیاری دەكا.

وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ – محمد/٣١﴾..

ئیمامی موسلیم لە صەحیحی خۆیدا لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، وَإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا، فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ، فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ، فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ». ژیانی جیهانی شیرین و جوانەو پەروەردگار ئێوەی تێدا كردووە بە جێنشین و سەیر دەكا چۆن كار دەكەن و هەڵس و كەوتتان چۆن دەبێ! خۆتان لە داوی دونیا بپارێزن، خۆتان لە داوی ئافرەتان بپارێزن، ئاگادار بن بە گوێرەی شەریعەتی خودا مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن، چونكە یەكەم فیتنەو ئاشووبێك كە لە ناو نەتەوەی ئیسرائیلدا بەرپا بوو هۆكارەكەی ئافرەت بوو!

ئیتر دوای ئەم تاقیكردنەوەیە لەبەردەم ئادەمیزاددا دوو شت هەیە: تۆڵەو عیقاب لەسەر خراپە یان پاداشت و ثەواب لەسەر چاكە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ دڵنیابە خودای تۆ زوو تۆڵە دەسێنێ، كەسێك سەرپێچی فەرمانەكانی بكا دژی ڕێبازی پێغەمبەرەكەی بجوڵێتەوە زوو سزای دەداو پاشگوێی ناخا،

هەرچەندە بۆ ماوەیەك مۆڵەتی بدا، وەصفدار كردنی تۆڵەو سزا بە زوو ئەنجامدانی لەم ڕووەوەیە كە هەموو داهاتوویەك نزیكە، عەرەب وتەنی (كُلُّ مَا هُوَ آتٍ قَرِيبٌ).. ئەو تۆڵەو سزایە یان لە دونیادا دەبێ بەزیان لێ كەوتن لە گیانو ماڵو ناموسدا یان لە هەندێكیاندا، یان لە قیامەتدا دەبێ بە ئاگری دۆزەخ! دەشێ بە هەموو سزاكان سزا بدرێ.

پەروەردگار وەكوو زوو تۆڵە لە موشریك و كافران دەستێنێ و سزای تاوانكاران دەداو لێخۆشبوو بە بەزەییە بۆ چاكەكارانی موسوڵمان، ئەوانەی شوێن پەیامی پێغەمبەر كەوتوونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەكانیان بوون، چونكە ڕەحمو بەزەیی خودا زۆر لە قارو غەزەبی زۆرترە... ڕەحمەتی پاساوی بەسەر قاریدا هەیە، ئەوەندە ڕەحمەتی زۆرە بەشی هەموو شتێك دەكا، پاداشتی چاكە بە چەندانە دەداتەوە، بگرە جاری وادەبێ – ئەگەر حەز بكا – دەگاتە حەوت سەد هێندەو زیاتریش... بەڵام سزای خراپە هەر بەئەندازەی خۆی تۆڵە دەستێنێ، بەڵكوو ئەگەر تاوانكار تۆبە بكاو لە گوناهەكەی ژێوان بێتەوە لەوانەیە لێشی خۆش ببێ، جاری وا دەبێ بەفەضلو گەورەیی خۆی لە دونیادا تاوانبار پەردەپۆش دەكاو ناوی نازڕێنێ!

زۆرجار پەروەردگار لە قورئاندا ئەم دوو صیفەتەی خۆی وێكڕا دەهێنێ؛ صیفەتی لێخۆشبوویی و بەزەیی لەگەڵ صیفەتی تۆڵەسەنیو غەزەب دەخاتە پەنا یەكترەوە، وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ – الرعد/٦﴾ یان دەفەرموێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، وَ أَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمَ – الحجر/٤٩ – ٥٠﴾. گەلێك ئایاتی تریش لەم جۆرە هەن كە موژدەو ترسانیان تێدایە بەتەما كردنو هەڕەشەیان لە خۆ گرتووە، جارێك بانگەوازی ئاراستەی بەندەكانی دەكا بە هەڵنانو تەما بەرنانو باسی خۆشی بەهەشتو شێوەی ڕازاوەی، دەمێكیش بانگەوازییەكە بە شێوەی هەڕەشەو ترساندنو باسی سەختی سزای

دۆزەخو ئـێش‌و ئـازاری ئـاگری سـوتێنەر ئـەنجام دەدا، جـاری واش هەیـە بانگەوازییەکە بە هەردوو شێوەکە ئەنجام دەدا.

بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی (الأنعام) تەواو بوو، دەست دەکەین بە سوورەتی (الأعراف).

## سورەتی الأعراف

ئـەم سـوورەتە نـاونراوە (الأعـراف) چـونکە وشـەی (أعـراف)ی تێـدا هـاتووە... (أعراف) بەو شورەیە دەگوترێ کە لە نێوان بەهەشت‌و دۆزەخدایە.

طەبەری دەڵێ: (أعراف) کۆی (عرف) هەر تەپۆڵکەو بەرزاییەك لە زەویدا پێـی دەوترێ (عرف)... هەر بۆیـە بـە کلاوەی کەڵەشێر دەوتـرێ (عـرف) چـونکە بـەرز بۆتەوە.

ئیبنـو جـەریری طـەبـەری لـە حـوذەیفـەوە حـەدیثێـك ڕیوایـەت دەکـا دەڵـێ: دەربـارەی ئەعرافیـەکان (أصحاب الأعـراف) پرسـیار لـە پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسەر بێ) کرا ئەویش فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن چاکەو خراپـەیان هاوسـەنگی یەکترن، خراپەکارییەکـەیان ڕێگـەی بەهەشـتی لێ بڕیونـەوە، چاکەکانیـشیان ڕێگـای دۆزەخیان لێ گرتوون‌و ناهێڵن بچنە ناو ئاگرەوە، لەسەر شورەی ئەعراف ڕادەگیرێـن تا پەروەردگار بڕیاریان دەربارە دەردەکا!

سورەتی (الأعراف) بە قسەی قورئان خوێنـە بەصری‌و شامییەکان دوو سـەدو پێـنج ئایەتـە، بەقسەی قورئـان خوێنـە مەدینـەیی‌و کوفیـەکان دووسـەدو شـەش ئایەتە.

ئـەم سـورەتە بـەکۆڕا (الأجمـاع) مەککەییـە، ئیبنـو عـەبباس‌و ئیبنـو زوبـەیر بەڕاشکاوی کۆڕایان لەم بارەوە فەرمووە.

قـەتادە دەڵـێ: ئایـەتی ﴿وَاسْـأَلْهُمْ عَـنِ الْقَرْيَـةِ الَّتِـي كَانَـتْ حَاضِـرَةَ الْبَحْـرِ﴾ مەدینەییە، هەندێك دەڵێن: هەشت ئایەت لە ﴿وَاسْـأَلْهُمْ عَـنِ الْقَرْيَـةِ﴾ی تـا ئایـەتی ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ﴾ مەدینەیین، بەڵام ڕای پەسەندو بـەهێز، بـەڵکوو

کۆڕا (أجماع)ی لەسەر ڕیوایەت کراوە کە هەموو سورەتەکە مەککەییەو بەیەك جار هاتۆتە خوارێ.

ئەم سورەتە بە درێژە پێدانو شیکردنەوەی سەرگورشتەو چیرۆکی بەسەرهاتی پێغەمبەرانو ڕوونکردنەوەی بنەمای باوەڕ هاتووە، ئەمیش وەکوو سورەتی (الأنعام) وایە، بەڵکوو وەکوو شیکردنەوەی ئەو وایە، لەتەوەرەی چەسپاندنی یەکتاپەرستیو زیندوبوونەوەو پاداشتو سزا، چەسپاندنی نیگاو پێغەمبەرایەتی بەتایبەتی چەسپاندنی ئەوە کە حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری هەموو ئادەمیزادە، دەخولێتەوە.

سورەتی ئەعراف لە سورەتی ئەنعام درێژترە، ئەگەر ریز کردنی حەوت سورەتە درێژەکان بەگوێرەی ئەوەبێ کامە درێژە ئەوە پێش بخرێ دەبوایە ئەعراف پێش ئەنعام بخرایە، بەلام ئاشکرایە ریزکردنی سورەتەکان لە قورئاندا (توقیفی)یە.

ئەم سورەتەش وەکوو ئامازەی بۆ کرا، وەکوو سورەتی ئەنعام باسە سەرەکیەکەی لە تەوەرەی چەسپاندنی عەقیدەو بیروباوەڕدا دەخولێتەوە... بەلام – وەکوو سەید دەفەرموێ – جوداوازیان زۆرە، هەرچەندە سورەتی ئەنعامو ئەعراف باسە سەرەکیەکەیان لە چوارچێوەی قورئانی مەککی دایەو باسی عەقیدەو بیروباوەڕ دەکەن، وەلێ جوداوازی گۆڕەپانی هاتووچۆیان بۆ چارەسەر کردنی ئەم باسە گرنگە زۆر لێك جیایە.

ئەمجار مامۆستا سەیید دەفەرموێ: بێگومان هەموو سورەتێك لە سورەتەکانی قورئان خاوەنی کەسایەتی سەربەخۆن، هەریەکەیان سەرو سیمای خۆی هەیە، ڕێبازو گۆڕەپانی تایبەتی خۆی بۆ چارەسەرکردنی ئەم باسە گرنگە هەیە.

وێنەی سوورەتەکانی قورئان لەم ڕووەوە وەکوو ئادەمیزادەکان وایە، کە پەروەردگار هەر ئادەمیزادەو کەسایەتیو شێوەو ڕوخساری تایبەتی خۆی داوەتێ. هەموویان ئادەمیزادن، هەموویان تایبەتمەندیی ئادەمیزادێتییان تێدایە، هەموو لە دروست بوونی پێکهاتەی ئەندامەکانیانو ئەرکی ئادەمیزادیەتییان وەکوو یەك وان: بەلام هەریەکەیان تا ئەوپەڕی سنوور نموونەی جیاجیایان تێدایە، هیچ ئادەمیزادێك سەد دەر سەد لە ئادەمیزادێکی تر ناچێ، بەڵکوو زۆر لێك جوداوازن.

تەنها لە تایبەتمەندیی ئادەمیزادیدا کۆدەبنەوە، ئەگینا لە راستیدا هەر ئادەمیزادەو سەرو سیماو شێوەو ڕوخسارو ڕەوشتی جۆراو جۆری هەیە، تەنانەت چاوە قامکی هیچ کەسێك لە هی کەسێکی تر ناچێ، بەئاشکرا جوداوازیان پێوە دیارە.

هەر بەو شێوەیە سورەتەکانی قورئانم دێتە بەرچاو، ئاوا هەستیان پێ دەکەم، هەر بەو شێوەیەش – پاش ئەو هەموو تەمەن بەسەر بردنەو ژیانم لەگەڵ قورئاندا – مامەڵە لەگەڵ سورەتەکاندا دەکەم...

## سورەتی ئەعراف ئەم بنەما بیروباوەڕە ئیسلامیانەی لە خۆ گرتووە:

١- قورئان نامەی خودایە؛ سەرەتای بەوە دەست پێ دەکا کە قورئانی پیرۆز موعجیزەی هەتا هەتایی پێغەمبەرەو، نیعمەتی پەروەردگارە ناردویەتی بۆ ئادەمیزادو پێویستە شوێنی بکەون.

٢- ئادەم بابە گەورەی ئادەمیزادە؛ ئادەمیزاد هەموویان لەیەك باوك کەوتوونەتەوە کە ئادەمە... پەروەردگار فەرمانی بە فریشتەکان کرد کە سوژدەی رێزو خۆشەویستیی بۆ بەرن، نەك سوژدەی بەندایەتی کردنو پیرۆزی.

٣- چەسپاندنی بیروباوەڕی یەکتاپەرستیو دان نان بە تاكو تەنهایی خودا بەندایەتی کردن بۆ ئەو زاتە پیرۆزە، دان نان بەوە کە هەر خودا مافی دانانی شەریعەتی هەیە، مافی حەرام کردنو حەڵاڵ کردن هەر هی ئەوەو کەسی تر رایەی ناکەوێ لافی ئەوە لێ بدات!

٤- سروشو پێغەمبەرایەتی؛ نیگای خودا بۆ پێغەمبەرانی شتێکی چەسپاوەو لێرەدا بریتیە لە ناردنە خوارەوەی قورئان بۆ سەر دڵو دەروونی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ).

٥- چەسپاندنی بیروباوەڕی زیندوبوونەوەو پاداشتو سزا لە رۆژی قیامەتدا.

٦- بەڵگە هێنانەوە لەسەر هەبوونی خودا؛ لەم سورەتەدا پەروەردگار بەڵگەی زۆرو زەبەندەی هێناونەوە لەسەر هەبوونی خۆی، برێك لەو بەڵگانە بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوییە، لە ماوەی شەش رۆژدا، هەروا هاتنی شەوو رۆژ یەك بەدوای یەکدا، هەروا هاتووچۆی مانگو خۆرو ئەستێرەکان هەریەکەیان لە تەوەرەی

خۆیداو بەبێ پاش‌و پێش بە فەرمانی پەروەردگار، هەروەها دەرهێنانی میوەو بەروبوومو دانەوێڵە لە زەوی.

٧- هەڕەشە کردن بە لەناوبردن؛ پەروەردگار زۆر گەل‌و نەتەوەی ستەمکارو ملهوڕی لە ناو بردوون کە دەبوایە گەل‌و نەتەوەی دوای ئەوان پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن، خەڵکانی لە هەمان شێوە سزاو تۆڵە ترساندووە. لەهەمان کاتدا ئادەمیزادانی هەڵناوە بۆ ئیمان هێنان‌و کردەوەی باش‌و خواپەسەند بۆ ئەوەی خێروبێریان بەسەردا بڕێژێ.

٨- چیرۆک‌و بەسەرهاتی پێغەمبەران؛ پەروەردگار لەم سورەتەدا کۆمەڵێك چیرۆك‌و سەرگورشتەی پێغەمبەران (نووح، هود، صالح، لوط، شوعەیب، مووسا) سەلامی خوایان لێ بێ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگارییان لێ وەربگرین‌و بزانین سەرەنجامی خواپەرستان چۆن بووە.

٩- هەڕەشە کردن لە بتپەرستان‌و لاقرتی کردن بەوانەی کە شتێك دەپەرستن کە زیان‌و قازانجی هیچیان بەدەست نیە، شتێك دەپەرستن نەدەبیستن نەدەبینن، کەڕو کوێرو بێ هەستن.

## شوێنکەوتنی قورئان‌و پابەندبوون بە فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی

﴿ الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾.

پەروەردگار ئەم سورەتە مەککەییەی بە (المص) دەست پێکرد، حیکمەتی دەست پێ کردنی ئەم سورەتەو نموونەکانی کە بەو جۆرە پیتانە کە مانایەکی ئاشکرایان

نیە، ئاگادار کردنەوەی بیسەرو خوێنەرە: کە ئەوەی لە دوای ئەم پیتانە دێ شتێکی گرنگو بەنرخەو پێویستە بە ئاگاداری گوێیان لێ بگیرێ.

بەڵێ بەڵێ وردبوونەوەو تێفکرین لە سورەتەکانی قورئان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەو سورەتانەی بەم جۆرە پیتانە یان بە وشەی (کتاب) دەست پێ دەکەن، ئەو سەرەتانەن کە لە مەککە هاتوونەتە خوارێ، بۆ بانگەوازی کردنی موشریکەکان بۆ موسوڵمان بوونو چەسپاندنی پێغەمبەرایەتیو سروش، ئەو سورەتە مەدەنیانەی کە بەو جۆرە پیتانە دەست پی دەکەن وەکوو سورەتی بەقەرەو سورەتی ئالی عیمران بانگەوازی کردنەکە تیایاندا ئاراستەی ئەهلی کیتاب کراوە... هەروەها لە سورەتی (مەریەم)و (عەنکەبووت)و (ڕۆم)و (ص)و (ن)دا بانگەوازی کردنەکە تێیاندا بریتیە لە چەسپاندنی پێغەمبەرایەتیو ناردنی قورئان لە خوداوەو باسی ئەوانەی کە لەسەر ئایین تووشی ئازارو ئەشکەنجە بوون، هەروەها گێڕانەوەی سەرگورشتەی فارسو ڕۆمو سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر کافراندا، ئەمە ئاشکراترین موعجیزەی قورئانە کە ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنێ.

هەندێ لە زانایان پێیان وایە ئەم جۆرە پیتە پچڕ پچڕانە ناون بۆ سورەتەکانو جۆرێکن لە عەلەمی مورتەجەل.

برێکی تر لە زانایان پێیان وایە حیکمەت لە هێنانی ئەم جۆرە پیتانە دەستنیشان کردنی سەرئاسایی قورئانەو ئاماژەیە بە ئەوە کە قورئان لەم پیتانە پێکهاتووە، قسەو ئاخاوتنی عەرەبەکانیش لەم پیتانە پێك دێ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا عەرەبو ناعەرەب ناتوانن لەو پیتانە نامەیەکی ئاوا بخەنە ڕوو، بۆ ئەوەی سەرەنجیان ڕابکێشێ بۆ ئەوە کە قورئان ئاخاوتنی ئادەمیزاد نیەو شاکاری دەستی پەروەردگارە:

﴿كِتَابٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ ئەم قورئانە کتێبێکی گەورەو بەفەڕو بەنرخە، ئەی محمد! لەلایەن خوداوە بۆ تۆ نێردراوە، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ شارەزا بکەیو ڕێگای ئایینی ڕاست پیشان ئادەمیزاد بدەیو لە گومڕاییو سەر لێ شێواوی ڕزگاریان بکەی.

﴿فَلاَ يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ﴾ بە سینگێکی فراوانەوە ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە، دڵت تەنگ نەبێ بەڕاگەیاندنی قورئان و ترساندنی مەردووم پێی و گەیاندنی بەو کەسانەی کە فەرمانت پێ کراوە پێیان بگەیەنی، خۆڕاگر بە بۆ فەرمانی ئێمە، ئەرکی پێغەمبەرایەتی خۆت جێبەجێ بکە؛ وەکوو چۆن پێغەمبەرە خاوەن هەڵوێست و عەزیمەکان خۆڕاگر بوون!

بێگومان حەزرەتی موحەممەد ئەرکی ڕەهنومایی کردنی هەموو ئادەمیزاد و هەموو جنۆکەی لەسەر شان بووە، نێردراوە بۆ سەر هەموویان، کەوابێ شتێکی سروشتی و چاوەڕوان کراوە کە تووشی جۆرەها نارەحەتی و ئەزیەت و ناخۆشی ببێ، چاوەڕوان کراوە تووشی بەربەرەکانی و تانووت و روو لێ وەرگێران و پشت لێ هەڵکردنی زۆر کەس ببێ! کە ئەمانە کاروبارێکن دەبنە هۆی دڵتەنگی و نارەحەتی، بۆیە پەروەردگار ئەو جڵەوگیرییەی ئاراستە کرد بۆ ئەوەی زیاتر سووربێ لەسەر جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانی و چاوەڕوانی بەدیهاتنی وادەی پەروەردگاری بێ و چاو لە پێغەمبەرە خاوەن عەزمەکانی پێش خۆی بکا وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ – الأحقاف/٣٥﴾، بۆیە دەبێ مەبەست بە جڵەوگیری ئایەتەکەی ئێرە قۆڵ لێ هەڵماڵین و تێکۆشان و شان بەردان و خۆ ئامادە کردن بێ بۆ بەرەنگاری کردنی هەموو تەنگ و چەڵەمە و ئێش و ئازارێك کە لە پێناو ڕاگەیاندنی پەیامەکەیدا تووشی دێ، وێڕای چاوەڕوانی کردنی بۆ وەدیهاتنی وادەی پەروەردگار.

ئەی محمد! ئێمە ئەم کتێبە بە فەڕ و گەورەییەمان بۆ ناردیە خوارێ ﴿لِتُنذِرَ بِهِ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ ئەوەی نەتەوەکەت و باقی ئادەمیزادی پێ بترسێنی، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە بیرەوەری و یادخەرەوە بۆ ئەو کەسانەی لە زانستی خودادا بە موسوڵمان حلێب کراون، یادکردنەوەیەکی سوودبەخش و کاریگەر بێ لە دڵیاندا.

قورئان نامەیەکی ئاسمانییە بۆ تۆ نێردراوە، بۆ ئەنجامدانی دوو کاری گرنگ: ترساندنی موشریك و جوانەناسان، وەبیرهێنانەوەی موسوڵمان، قورئان کتێبێکە نێردراوە بۆ قڵیشانەوەو شۆڕش، بۆ درکاندن و ڕاگەیاندنی حەق و ڕاستی، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئادەمیزاد بەشتێك کە لە ڕواڵەتدا دژی بەرژەوەندیانە و دژی

دەوەستن، بۆ بەگژداچوونەوەی بیروباوەڕو دابو نەریتی نەشازو پڕوپووچیانە، بۆ ڕووخاندنی قەلای کوفرو بێدینیو بارودۆخی کۆمەلگای خوا لێ ڕەنجاوە، بۆ هەلتەکاندنی هەموو بیروبۆچوونو یاساو نیظامێك کە لە ئایینی حەقی خوداوە سەرچاوەی نەگرتبێ، کەوابێ ڕێڕەوانی قورئانو هەلگرانی مەشخەلی ئەو خۆرە ڕووناکە لە هەموو ڕۆژگارو شوێنێکدا لە ناو هەموو کۆمەلو نەتەوەیەکدا تووشی جۆرەها ئاستەنگو تەنگو چەلەمە دەبن، چونکە ئیسلام ڕووداوێکی کاتی مێژوویی نیەو سەری هەلدابێو ماوەیەك ڕۆلی بینیبێو دوایی بەسەر چووبێو چووبێتە دووتوێی لاپەڕەکانی مێژووەوە، وەکوو چیرۆك بخوێندرێتەوە! بەلکوو ئیسلام بریتییە لە یاسایەکی ئاسمانی خودایی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی گومڕایی ئادەمیزاد لە هەموو چەرخو زەمانێکدا، چونکە قورئان کە بەرنامەی ئەو ئایینەیەو یاسای بوونەوەرە، بەرنامەی هەلبژاردەیە بۆ ئادەمیزاد بۆ هەتا هەتایە، هەرکاتێ ئادەمیزاد لەو ڕێڕەوە لایداو گەڕایەوە بۆ سەر ڕێبازی گومڕایی دەبێ قورئان ڕۆلی خۆی ببینێو فریای ئادەمیزاد بکەوێو لە شەوەزەنگی گومڕایی ڕزگاریان بکا، کەوابێ لە هەموو ڕۆژگارێکدا حەقخوازو قورئانخوازان دەبێ چاوەڕوانی ڕووبەڕوو بوونەوەو ئاستەنگو کێشمە کێشم بن، دەبێ لە پێناو ڕاگەیاندنی ئایینی خودادا چاوەڕوانی تووش بوونی زەرەرو زیان بن، وە بەدلێکی فراوانەوە خۆ ئامادە بکەن بۆ هەموو ناخۆشییەك، چونکە ڕێبازی بانگەوازیکارانی ئیسلام بە گول نەچێندراوەو ڕێگای هەورازو سەرەو لێژە، پڕ لە کۆسپو کەندو کەندڕە.

جا چونکە ئەم قورئانە ئەوەندە گرنگو پیرۆزو بەفەڕە، بۆیە پەروەردگار خیطابی خۆی ئاڕاستەی هەموو ئادەمیزاد کردو فەرمووی: ﴿اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئەی محمد! بەو خەلکە بلێ: هەمووتان تێکڕا شوێن ئەو قورئانە بکەون کە لە خوداوە بۆتان نێردراوەتە خوارێ، لەلایەن پەروەردگارو بەدیهێنەرو هەلسوڕێنەری کاروبارتانەوە بۆتان نێردراوە. هەر ئەوە کە تەنیا شیاوی ئەوەیە مافی ئەوەی هەیە کە شەریعەت دابنێو یاساتان بۆ دابڕێژێو عیباداتو خوداپەرستیتان بۆ دیاری بکا، شتی بە سوودتان بۆ حەلال بکاو شتی زیانبەخشتان

لێ یاساغ بکا چونکە هەر ئەو کرۆکو ماهیەتی شتەکان دەزانێ، دەزانێ چی بە سوودەو چی زیانبەخشە.

﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ ئێوە جگە لە خودا کەسی تر مەکەن بە وەلیو سەرپەرشتیاری خۆتان، نە لە ئادەمیو نە لە شەیاتینی، ئەوانە ختوکەو وەسوەسە دەخەنە دڵتانەوە، مەیانکەن بە گەورەو لێپرسراوی خۆتان، کاروباری خۆتانیان پێ مەسپێرن؛ پابەندی فەرمانەکانیان مەبن بۆ ئەنجامدانی کاری زیان ئامێزو خەتەرناك، بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕی پڕوپووچو گومڕایی شوێنیان مەکەونو شەڕو بەدبەختی بۆخۆتان دەستەبەر مەکەن! وا مەزانن ئەو بتانە، ئەو ئارامگای شێخو گۆڕو قسنانە – هەرچەندە بەردو دارو بێ گیانن – لای پەروەردگار کاریگەریان هەیە! لەو پەیامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆی هێناون لامەدەن بۆ بەرنامەو پرۆگرامی تر، ئەگەر وا بکەن لە حەق لاتان داوە بۆ گومڕایی، لە جیاتی حوکمی خودای زاناو دانا، یاسای شەیتانو هەواو هەوەستان هەڵبژاردووە، خۆتان بەدبەختو چارەڕەشی هەردوو دونیا کردووە!

بەکورتی تەنها خودا سەروکاری کاروباری بەندەکانی دەکا، ئەو بەدیهێناون، هەر ئەو شیاوی حەلاڵ کردنو حەرام کردنە، هەر ئەو مافی تەشریع دانانی هەیە، زەرەرو قازانج هەر بەدەست ئەوە، کەسی تر رایەی ناکەوێ یاسا بۆ ئادەمیزاد دابنێ، ئەگەر بۆشی دابنێ بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا نیە، لە بەدبەختیو چارەڕەشی زیاتر هیچی تری لێ دەست ناکەوێ!

بەلام ﴿قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ زۆر بەکەمی ئەو شتانەی ئەرکی سەرشانتانە بەرامبەر بە خودا دێتەوە بیرتانو پێی ئاشنا دەبن، کەمتر پەندو ئامۆژگاری لەم قورئانە وەردەگرنو واز لە لاسایی کردنەوەی کوێرانەو ئارەزوو پەرستی دەهێننو دەگەڕێنەوە بۆلای خوداو موسوڵمان دەبن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ یوسف/١٠٣﴾.

**تێبینی**:

١- ئایەتەکە بەشێوەیەکی گشتی فەرمان دەکا بە هەموو ئادەمیزاد کە شوێن ئایینی ئیسلامو بەرنامەکەی – کە قورئانە – بکەون، هەر شتێك ئەو حەلاڵی کرد حەلاڵە، ئەو حەرامی کرد حەرامەو پێویستە لێی دوور بکەوینەوە.

شوێنکەوتنی پێغەمبەریش دەچێتە چوارچێوەی شوێنکەوتنی قورئانەوە چونکە پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین کە پابەندی فەرمانەکانی بین، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ – النحل/٤٤﴾. کەوابێ ئایەتەکە بەلگەیە لەسەر پێویست بوونی شوێنکەوتنی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ).

٢- حەرامە لە ئاییندا شوێن هەر ئادەمیزادێك بکەوین کە پابەندی فەرمانی خودا نەبێ، نابێ لاسایی ئەهلی کیتاب بکەینەوە، کە پابەندی فەرمانی رەبەنەکانیان بوون، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ – التوبة/٣١﴾.

٣- لەگەڵ هەبوونی دەقی شەرعی حەرامە ئادەمیزاد شوێن ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆی بکەوێ.

٤- حەرامو یاساغە جگە لە خودای مەزن کەسێکی تر بکرێ بە وەلیو سەرپەرشتیارو بەندایەتی بۆ بکرێ.

## سەرەنجامی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران لە دونیادا

﴿وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا فَجَاءَهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا أَوْ هُمْ قَائِلُونَ ﴿٤﴾ فَمَا كَانَ دَعْوَاهُمْ إِذْ جَاءَهُم بَأْسُنَا إِلَّا أَن قَالُوا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٥﴾﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر کرد ئەرکی سەرشانی خۆی – ترساندنو ڕاگەیاندن – ئەنجام بدا، فەرمانیشی بە ئادەمیزادان کرد کە پەیامەکەی وەربگرنو شوێنی بکەون، ئەمجار لەم ئایەتانەدا باسی ئاکامی ئەوانە دەکا کە سەرپێچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی قورئان دەکەن، ئەمەش لە ڕوانگەی وەبیرهێنانەوەی هۆکارو ئاکامی لەناوبردنی گەلە پێشینەکانو فەرمووی: ﴿وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا﴾ زۆر لە شارو شارۆچکەمان ژێرو زەبەر کردنو دانیشتوانیمان لەناو بردن، بەهۆی سەرپێچی کردنیان بۆ پێغەمبەرەکانیانو بەدرۆخستنەوەیان، ئەو گەلو نەتەوانە پێغەمبەرمان بۆ ناردنو سەرپێچییان کرد ﴿ فَجَاءهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا﴾ ئیتر عەزابو تۆڵەی ئێمەیان بۆ هات، لە کاتێکا کە ئەوان لە شەودا بوونو لە شیرینی خودا غافلگیرمان کردن! ﴿أَوْ هُمْ قَآئِلُونَ﴾ یان لەکاتی قەیلولەو پشوودانی پێش نیوەڕۆدا بوون. هەردوو کاتەکە کاتی بێ ئاگاییو ئیستیراحەتو پاڵدانەوەیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا بَيَاتاً وَهُمْ نَآئِمُونَ، أَوَ أَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ – الأعراف/٩٧ – ٩٨﴾. کەواتە با خراپە نەکەنو لە خۆیان دڵنیا نەبن، بەڵکوو هەموو کاتێ خۆ لە خراپەکاری بپارێزنو لە عەزابی خودا بێ ترس نەبن، بزانن کە خودا هەمیشە ئاگادارو بەتواناو بەصەبرە بەڵام کە تۆڵەی ستاند بەزەبرە!

﴿فَمَا كَانَ دَعْوَاهُمْ إِذْ جَاءهُمْ بَأْسُنَا إِلاَّ أَن قَالُواْ إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ لەکاتی هاتنی تۆڵەو سزای ئێمە بەسەر ئەو گەلو نەتەوە ستەمکارانە هەر ئەوەندەیان پێ گوترا کە دان بە تاوانەکانیاندا بنێنو بەدەمی خۆیان بڵێن ئێمە شایانی ئەو سزایەینو ستەمکار بووین، پەشیمان دەبنەوە بەڵام تازە پەشیمانی سوودی نابێ.

مەبەست لە ئایەتەکە ترساندنو هەڕەشەکردنو پەند وەرگرتنە بە ئەو عەزابو سزایەی کە تووشی گەلە سەرپێچیکارەکان بووە، بۆ ئەوەی بیسەرانو ئادەمیزادانی سەردەم بەخۆیاندا بچنەوەو واز لە تاوانی ستەمکارییان بهێنن، بترسن لەوەی کە خودا غەزەبییان لێ بگرێو بەدەردی گەلو نەتەوەکانی پێشوویان بەرێ، چونکە سوننەتی خودا وایە کە هەتا ئەوان ڕاستاڵو خوداپەرستو گوێڕایەڵ بن، خودا بە کۆمەڵو کۆکوژی لە ناویان نابا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ - الرعد/١١﴾. چونكە تۆڵەو سزاى پەروەردگار بۆ بەندەكانى لە دونيادا حەقو دادپەروەرييەو لە ئاكامى سەرپێچىو تاوان كردندا تووشيان دەبىٚ!

## سەرەنجامى كوفرو بىٚ دينىو لێكۆڵينەوە لەسەر كردەوە لە ڕۆژى قيامەتدا

﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦﴾ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴿٧﴾ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

پاش ئەوەى پەروەردگار هەڕەشەى لە سەرپێچيكاران كرد بە لەناوبردنو ڕيشەكێش كردن، بەشوێن ئەو هەڕەشەيەدا هەڕەشەى بە سزايەكى تر لىٚ كردن، كە سزاى ڕۆژى قيامەتە؛ ئەوەى ڕوون كردەوە كە پرسيار لە هەموو كەس دەكرىٚو لە كردەوەكانى دەكۆڵدرێتەوەو حيسابى لەگەڵ دەكرىٚ، هەركەسە بە گوێرەى كردەوەكانى سزاو پاداشتى دەدرێتەوە، چاكە بە چاكەو خراپە بە خراپە! جاكە لە ئايەتى پێشوودا ئەوەى ڕوون كردەوە كە برێك لە حاڵو چۆنيەتى قيامەت لێكۆڵينەوەو حيساب لەگەڵ كردنە، ئەمجار ئەوە بەيان دەكا كە برىٚ لە حاڵو چۆنيەتى قيامەت، كێشانى كردەوەى ئادەميزادەو دەفەرموىٚ: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ﴾ دڵنيا بنو هيچ شكو گومانتان نەبىٚ ئێمە لە ڕۆژى قيامەتدا پرسيار لە گەلو نەتەوەكان دەكەين دەربارەى شێوەى وەڵامدانەوەيان بۆ پێغەمبەرەكانيان،

لێیان دەپرسین چۆن وەڵامی پێغەمبەرەکانیان داوەتەوە، واتە: پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا یەکە یەکە پرسیار لە ئادەمیزادەکان دەکا دەربارەی ئەو پێغەمبەرەی کە پێویست بوو شوێنی بکەوێ! چۆنی بانگەوازی پێ گەیشتووەو چۆن وەڵامی داوەتەوە!

هەروەها ﴿وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ﴾ پرسیار لە پێغەمبەرەکانیش دەکەین، ئاخۆ چۆن چۆنی پەیامی ئێمەیان بەخەڵکەکە گەیاندووەو چۆنیان وەڵام داوەتەوە؟ بڕوایان پێ کردوون یان لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان بەردەوام بوون؟

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، پرسیارەکەش ئەوەیە: قورئان لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْأَلُ عَن ذَنبِهِ إِنسٌ وَلَا جَانٌّ – الرحمن/٣٩﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ – القصص/٧٨﴾. دەی چۆن مەفهوومی ئەم دوو ئایەتە لەگەڵ مەفهوومی ئایەتەکەی ئێرەدا یەك دەگرنەوە؟؟ لەوەڵامدا دەگوترێ: ڕۆژی قیامەت قۆناغ قۆناغو وێستگە وێستگەیە! حاڵەتەکانی جیا جیاو هەمە جۆرن لە بڕێ وێستگەو حاڵەتدا پرسیار کردن نیە لە هەندێکیاندا بەوردی پرسیارو لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدرێ، جاری وا دەبێ پرسیار کردنەکە بۆ سەرزەنشتو ڕیسوا کردنە!

ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: ئەوانە پرسیاریان دەربارەی کردەوەکانیان لێ ناکرێ، چونکە نامەی ئەعمالیان ئەوەی تێدا چەسپاوە، بەڵکوو پرسیاریان لەوە لێ دەکرێ کە بۆچی ئەو کردەوانەیان نەکردوونو ئەم کردەوانەیان ئەنجام داون چ لەمپەرێك هەبووە نەیهێشتووە پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پێغەمبەرەکانیان بن، چ شتێك بوو بە لەمپەڕو بەربەست لە نێوان ئێوەو بەجێهێنانی حوکمی شەرعی.

هەڵبەتە ئەم پرسیار لێ کردنو بەرپرسییە، بەرپرسییەکی (تضامنی) گشتییە. کە هەرکەسە لە ئاست خۆیەوە بەرپرسیارە، گەلو نەتەوەکان بەرپرسیارن. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکدا کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕیوایەتی دەکا بەشێوەیەکی تەفصیلی ئەم بەرپرسیاریەتە دەستنیشان دەکاو دەفەرموێ: هەمووتان بەرپرسیارنو لێپێچینەوەتان لەگەڵ دەکرێ، سەرۆكو پێشەوا بەرپرسیارە دەربارەی ژێردەستەکانی پرسیاری لێ دەکرێ، نۆکەرو

خزمەتچی کاربەدەستە لە ماڵی گەورەکەیداو دەربارەی هەڵسوڕانی کاروباری ئەو ماڵە پرسیاری لێ دەکرێ، پیاو کاربەدەستە لە ناو ماڵو خێزانیدا، بەرپرسیارە لە بەڕێوەبردنی کوڕو کچی دا، ئافرەت لێپرسراوە لە ماڵی مێردەکەیداو پرسیاری لێ دەکرێ، کوڕ لە ماڵی باوکیدا بەرپرسیارەو لێکۆڵینەوەی لێ دەکرێ، بەکورتی هەمووتان کاربەدەستو لێپرسراونو لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێ.

قورئانی پیرۆز لە بارەی ئەم لێپرسینەوەیەی ڕۆژی قیامەت زۆر ئایەتی تێدان، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ – القصص/٦٥﴾. یان ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ اللَّهُ الرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ قَالُواْ لاَ عِلْمَ لَنَا إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ – المائدة/١٠٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا – الأنعام/١٣٠﴾.

بەڵام ئاشکرایە ئەم پرسیار لێ کردنو لێپێچینەوەیە بۆ زانینو ئاشکرا کردنی شتێکی نەزاندراو نیە کە لەوەپێش خودا نەیزانیبێ، بەڵکوو بۆ پێ ڕاگەیاندنو هەواڵ پێدانی خودایە بەوان کە ئاگاداری کردەوەکانیان بووەو دەزانێ چییان کردووە بۆ سەرکۆنە کردنو سەرزەنشت کردنیانە لەسەر خراپەکاری! پرسیارو لێکۆڵینەوەیەکی وردو چڕو پڕە، هەمە لایەنەو گشتیە، ڕەوانەکراوو بۆسەر ڕەوانەکراو دەگرێتەوە، ئەم لێکۆڵینەوەو پرسیارو وەڵامە بە نهێنیو پەنامەکی نیە، بەڵکوو لە پێش چاوی ئەهلی مەحشەرەو لە شاشەو فلیمی خوداییەوە ڕادەنوێندرێ بە ڕوونو ئاشکرایی دەبینرێ، پرسیار لەو خەڵکە دەکرێ کە پێغەمبەریان بۆسەر ڕەوانە کراوە ئەوانیش بەوردی بێ پێچو پەنا ڕووداو هەڵوێست چۆن بووە دانی پیا دەنێن، ئیعتیراف لە تاوانبارىی خۆیان دەکەن! پرسیار لە پێغەمبەرەکان دەکرێو وەڵام دەدەنەوە، بەڵام کار بەوەندە ناوەستێ بەڵکوو وێ دەچێ ئەوان شتێکیان لە بیر چووبێتەوە بەڵام خودا نووسیویەتیو هیچ شتێکی نەبواردووە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ – المجادلة/٦﴾ بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ﴾ دڵنیابە ئێمە زۆر بەوردیو لێزانی ڕووداو هەڵوێستو کارو کردەوەکانیان بەسەر پێغەمبەرو نەتەوەکانیاندا دەخوێنینەوە خوێندنەوەیەکی زانستیانە، تا ئەوپەڕی زانستی! بەبێ ئەوەی

تەنانەت بەئەندازەی گەردیلەیەك‌و بچووكتریشمان لێ هون نابێ، چونكە زانستی ئێمە هەموو شتێكی وردو هەراش دەگرێتەوەو ئاگاداری هەموو هەڵوێست‌و كردارو گوفتارێكیان بووین ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ﴾ هیچ كات‌و ساتێك لە هیچ پەناگەو كون‌و كەلەبەرێكدا ئێمە لە ئەوان بێ ئاگا نەبووین، بەڵكوو لەگەڵیان بووین‌و ئەوەی گوتوویانە بیستوومانە، ئەوەی كردوویانە بینیوومانە، ئاگاداری هەست‌و مەبەست‌و خەیاڵی ناو دڵیشیان بووین، خیانەتی چاویشیانمان ئاگا لێ بووە، لە ڕۆژی قیامەتدا هەواڵ بە ئادەمیزادەكان دەدەین بە كردەوەكانیان، هەرچی كردوویانە كەم بێ یان زۆر، گرنگ بێ یان پڕوپووچ دەیخەینە بەرچاویان، چونكە ئێمە ئاگاداری هەموو شتێكین، گەڵایەك كە لە درەخت دەكەوێتە خوارێ، دەنكە دانەوێڵەیەك كە دەكەوێتە درزی زەوییەوە خودا ئاگای لێیەو پێی دەزانێ، وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ – الأنعام/٥٩﴾.

ئەمجار پەروەردگار یاسای تۆڵەو حیساب‌و لێكۆڵینەوەی دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَالْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ﴾ كێشان‌و ئەندازەدار كردنی كردەوەكان بۆ پێغەمبەران‌و گەل‌و نەتەوەكان‌و سەنگ‌و سووكیان‌و باش‌و خراپیان ئەو ڕۆژە لەسەر بنەمای حەق‌و دادپەروەری ئەنجام دەدرێ، كەس ستەمی لێ ناكرێ، ماوەی بەهەڵە بردن‌و تەرازووبازیی‌و خۆ دزینەوەو دەمەدەمێ نیە، وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ – الأنبياء/٤٧﴾ جا كە تەرازووی خێرو شەڕ دانرا، كردەوەكان كێشانە كران، سەیری دەكرێ ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ كەسێك تای تەرازووی كردەوە باشەكانی قورس بوو بەسەر تای تەرازووی كردەوە خراپەكانیدا زاڵ بوو، ئەوە ئەوانە بە مراز گەیشتوون‌و دەچنە ناو بەهەشتەوەو لە سزای ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێ! چ ڕزگار بوون‌و بە مرازگەیشتنێك لەوە خۆشترە ئادەمیزاد لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری ببێ‌و بگەڕێتەوە بۆ بەهەشت؟ بۆ ئەو بەهەشتەی لەسەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزاددا ژیانی تێدا

بەسەر بردو! زێدو نیشتەمەنی خۆی بووە، دوای ئەو دابڕانە دوورو درێژە گەڕانەوە بۆ ئەو بەهەشتە، گەورەترین بە مراز گەیشتنە.

بەڵام ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِآيَاتِنَا يِظْلِمُونَ﴾ کەسێك تای تەرازووی کردەوە باشەکانی سوك بێ، چاکەی کەم بن‌و کوفرو خراپەکاری زۆر بن، ئەوانە خودی خۆیان خەسارەتمەند بوون، خودی خۆیان لەدەست داوە، خۆشبەختی‌و بە مرازگەیشتنی هەتا هەتاییان لە کیس خۆیان داوەو بەرەو دۆزەخ‌و بەدبەختی‌و چارەڕەشی هەمیشەیی بردوویانە! ئەوان دەردیان گرانە، خودی خۆیان لەدەست داوە، کەسێکیش خۆی لەدەست دا خۆی لە کیس بچێ ئیتر چی بۆ دەمێنێتەوە!!

ئەم مانایە لەچەند شوێنێکی قورئاندا دووبارەو سێ بارە بۆتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ، فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ، وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ، فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ، نَارٌ حَامِيَةٌ – القارعة/٦ – ١١﴾.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین: کە ئەو شتانەی ڕۆژی قیامەت دەکێشرێن کردەوەکانن، هەرچەندە کردەوە غەرەضی مەعنەوین، بەڵام پەروەردگار دەتوانێ ئەو غەرەضانە بکاتە قەبارەو لە نامادیەوە بیانکاتە ماددەو بیانکێشێ!

فەرموودەی پێغەمبەر زۆرن دەربارەی ئەوە کە کردەوەکان دەکرێن بە قەبارە، وەکوو ئەو فەرموودەیەی دەربارەی پرسیار کردن لە گۆڕدا کە دەفەرموێ: «فَيَأْتِي الْمُؤْمِنُ شَابٌ حَسَنُ اللَّوْنِ طَيِّبُ الرِّيحِ، فَيَقُلُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَيَقُلُ أَنَا عَمَلُكَ الصَّلِح». یان وەکوو ئەو فەرموودەی کە دەربارەی سزای زەکات نەدەر کە ئیبنو ماجەو نەسائی‌و ئیبنو خوزەیمە لە ئیبنو مەسعوودەوە کە دەفەرموێ: ئەو ماڵ‌و سامانەی زەکاتی لێ نەدرێ دەبێتە مارێکی کەچەڵ‌و سزای خاوەن ماڵەکەی پێ دەدرێ، وەکوو دەفەرموێ: «مَا مِنْ أَحَدٍ لاَ يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ إِلاَّ مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ حَتَّى يُطَوِّقَ عُنُقَهُ» ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئایەتی ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ – آل عمران/١٨٠﴾ی خوێندەوە، بەڵگە لەسەر ئەوە کە کردەوەکان دەکێشرێن ئەو فەرموودەیەیە کە ئەبو داوودو تیرمیذی بە (مەرفوعی) لە جابیرەوە دەیگێڕنەوە دەفەرموێ: (تەرازووی خێرو شەڕ

دادەنرێ کەسێك بە ئەندازەی دەنکە گەنمێك چاکەکانی قورستر بن لە خراپەکانی دەچێتە بەهەشتەوە، کەسێکیش خراپەکانی بە ئەندازەی دەنکە دانەوێڵەیەك قورستر بن دەچێتە دۆزەخەوە) گوترا ئەی ئەگەر هاوتەرازوو بوون؟ فەرمووی ئەوانەی کە چاکەو خراپەیان بەئەندازەی یەکە ئەوانە لە ئەعرافدا دەبن.

قورطوبی لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکا، دەفەرموێ: ئەوەی کە کێشانە دەکرێ نامەی کردەوەکانن، ئەمجار دەڵێ هەر ئەم رایە راستەو فەرموودەی پێغەمبەر بەم شێوەیە هاتووە؛ ئەوەتا پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إِنَّ مِيزَانَ بَعْضِ بَنِي آدَمَ كَادَ يَخِفُّ بِالْحَسَنَاتِ فَيُوضَعُ فِيهِ رِقٌّ مَكْتُوبٌ فِيهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ فَيَثْقُلُ» وادەبێ تای تەرازووی چاکەکان سوك دەبێو سڵاو ناداتەوە پەڕە کاغەزێکی دەخەنە ناوی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)ی تێدا نووسراوە ئیتر تای تەرازووەکە گران دەبێ!

دەی ئەم حەدیثە ئەوە دەگەیەنێ کە کێشانەکە بۆ ئەو نامانەیە کە کردەوەکانی تێدا نووسراون نەك خودی کردەوەکان، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە پەروەردگار ئەگەر بیەوێ تای تەرازووەکە سوك دەکا، ئەگەر بیشیەوێ قورسی دەکا، بەوەی کە پەڕە کاغەزی تری بکاتە ناو.

ماوەتەوە ئایا ئاخۆ ئەم تەرازووە تەرازووی حەقیقییە یان رەمزو تەمثیلە؟ زانایان لەم بارەوە را جیاییان تێدا پەیدا بووە.

موجاهیدو ضەحاكو ئەعمەش دەڵێن: تەرازوو کێشانەکە بەمانا عەداڵەتو بڕیاردانو یەکالاکردنەوەی کردەوەکانە. باسکردنی تەرازوو بۆ میثال هێندراوەتەوە، وەکوو ئەوە دەگوترێ ئەو کتێبە هاوتەرازووی فلانە شتە، واتە: بەرامبەرو هاوشانی ئەوە، بەئەندازەی ئەو پارە دێنێ! مەبەست بە تەرازوو لە رۆژی دواییدا دادپەروەریی تەواوو عەدالەتکارییە، لە ئەندازەدارکردنی کردەوەی ئادەمیزادانو سزاو پاداشت دانەوەیانە!

جەماوەری زانایان پێیان وایە: کە کێشانەو تەرازوو حەقیقەتنو کردەوەی ئادەمیزادانیان پێ کێشانە دەکرێ. بۆ ئەوەی زانیاری خودا دەربارەی کردەوەی

بەندەكانی پێ ئاشكرا بكرێو خەڵكی بزانن كە خودا ئاگادارو زانا بووە بە كردارو گوفتاریانو پاداشتو سزایان لەسەر بدرێتەوە.

زەجاج دەڵێ: ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەر ئەوە كۆكن كە پێویستە بڕوامان بە تەرازوو كێشانەی رۆژی قیامەت هەبێ، كردەوەی ئادەمیزادان بەو تەرازووە كێشانە دەكرێ.

قسەی هەقو ڕاست ئەوەیە كە بڵێین: تەرازوو كێشانەی رۆژی قیامەت شتێكی غەیبین، قورئانو حەدیث چۆنیان باس كردوون ئاوا بڕوایان پێ بكەین، وازبێنین لە لێكۆڵینەوە دەربارەی شێوەو چۆنیەتییان، ئەوە حەواڵەی زانیاری خودایە.

## بەخششو نیعمەتە زۆرەكانی پەروەردگار بۆ بەندەكانی

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

پاش راگەیاندنی ئەوە: كە دانەری ئایین پەروەردگارەو پێویستە شوێن فەرمانو جڵەوگیرییەكانی بكەوین، پاشان باسی تۆڵە ستاندنو سزای دونیای كرد لە سەرپێچیكاران، ئادەمیزادانی ترساند لە سزاو تۆڵەی رۆژی قیامەتو ئاماژەی بەهەبوونی تەرازووی خێرو شەڕ كرد، ئەمجار ئادەمیزادان هەڵدەنێ بۆ پەیدابوونو قەبوڵ كردنی بانگەوازی پێغەمبەران،، ئەمەش لە ڕێگەی وەبیرهێنانەوەی بەخششو نیعمەتە زۆرو هەمە جۆرەكانی پەروەردگار بەسەر بەندەكانیداو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الأَرْضِ﴾ سوێند بێ ئێمە ئێوەی ئادەمیزادمان لەسەر زەوی جێگیر كردووە، ئەو هەسارەیەمان گونجاندووە بۆ تێدا ژیانی ئێوە، زەویمان كردووە بە شوێنی حەوانەوەو تێدا ژیان، تایبەتمەندیی وامان تێدا داناوە كە لەگەڵ پێویستیاتی ئادەمیزادو ئاژەڵو پەلەوەرو خشۆكدا بگونجێ، ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ﴾ رزقو رۆزی زۆرو هەمە جۆرمان بۆ ئێوە تێدا بەدی هێناوە، سوود بینینو كەڵك وەرگرتن لە زەویمان بۆ حەلاڵ كردوون، دەریاو هەورو

بارانمان بۆ ڕام کردوون، بە گوێرەی پێویست زەوی ئاودێر بکەنو رزقو رۆزیی هەمەجۆری لێ بەدی بێنن! کێوانمان تێدا کردوون بە لەنگەرو شیوو دۆڵو چۆمو زێمان تێدا بەدی هێناونو ئاوو هەوای سازگارمان بۆ دابین کردوون...!

بەڵێ ئاشکرایەو گومانی تێدا نیە کە بەدی هێنەری ئادەمیزادو زەوی بە قودرەتو حیکمەتی خۆی ئادەمیزادی جێگیر کردووە لە زەویدا، هەر ئەوە کە تایبەتمەندیی وای لە زەویدا داناوە؛ کە لەگەڵ ژیانی ئادەمیزاد بگونجێ، نە ئەوەندە گەرم بێ شت بسوتێنێ یان ئەوەندە سارد بێ بەستەڵەك دروست بكا، پەروەردگار ئەم زەوییەی کردووە بەلانەی ئادەمیزادو شوێنگەی حەوانەوە، بژێوو بەروبوومی پێویستو هۆکاری ژیانی تێدا دەستەبەر کردووە، هەر زاتی پەروەردگار زەوی وا بەدی هێناوە کە ببێتە مەڵبەندی تێدا ژیان، پێکهاتەو قەبارەو ئاوو هەواو دوورو نزیکی لە مانگو خۆرو هەڵسوڕانی بەدەوری خۆرداو خێرای هەڵسوڕانەکەی... هتد. هەموو ئەو تایبەتمەندیانەی وا بەدی هێناون کە گونجاو بن بۆ ژیانی ئادەمیزادو تێدا حەوانەوەی، ئەگەر جێگیر کردنو دامەزراندنی پەروەردگار نەبوایە بۆ ئادەمیزاد لە زەویدا لە کوێ ئەم ئینسانە زەبوونو بێ دەسەڵاتە دەیتوانی سروشت بۆ بەرژەوەندی خۆی رام بکا؟! ئاوا دەسەڵات بەسەر ئاوو هەواو دەریاو شیوو دۆڵو دەشتو چیادا پەیدا بکا؟!

بێگومان ئێستا لەڕوانگەی گەشتە ئاسمانیەکانی فەضاو فڕینی فڕۆکە لەبەرزایی ئاسایی داو بەرز بوونەوەی ئادەمیزاد بۆ سەر هەسارەی مانگو مەریخ دەرکەوتووە ئادەمیزاد چەند پەیوەندی بە زەوییەوە هەیە! چەند پەیوەندی بە ئاوو هەوای ئەم هەسارەوە هەیە، کە لێی دوور کەوتەوە چەندە بە پەرۆشەوەیە بێتەوە باوەشیو ئارامی تێدا بگرێ.

پەروەردگار ڕزقو ڕۆزی لە زەویدا بە دوو جۆر بۆ دابین کردوون: یەکەم بە دروست کردنی رزقو رۆزی لەسەرەتادا، دووەم لە ڕێگەی کارو کاسبیو بازرگانیو رەدامهێنانی ئادەمیزاد خۆیەوە، هەردوو شێوەکەش لە ڕاستیدا بە ویستو ئیرادەو فەضلو گەورەیی خودا دێنە جێ، هەموویان نیعمەتی خودان بۆ بەندەکانی، زۆریو هەمەجۆری نیعمەتیش بێگومان خوازیاری گەردنکەچیو بەندایەتیو

سوپاسگوزاریە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە ئەی ئادەمیزادینە! ﴿قَلِيلاً مَّا تَشْكُرُونَ﴾ زۆر بە کەمی سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتانەی من دەکەن کە بەسەر ئێوەمدا ڕشتووە، وەکوو پێویست ئەرکی سەرشانی خۆتان ئەنجام نادەن‌و کوفری نیعمەتەکانم دەکەن، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا، إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ – إبراهيم/٣٤﴾، یان دەفەرموێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ – سبأ/١٣﴾.

سوپاسگوزاری نیعمەت بەوە دەبێ خاوەن نیعمەت بەچاکی بناسی، بەجۆرێك سوپاسی بکەی کە شیاوی بێ، هەموو ئەندام‌و جەستە لە شتێکدا بەکاربێنێ کە بۆی دروست کراوە، لە کاری خێرو خواناسیدا بەکاری بێنین، بۆ ئەوەی پەروەردگار لە خۆمان ڕازیی بکەین‌و نیعمەتەکانی بۆ ئادەمیزاد بەردەوام بن، چونکە بە سوپاسگوزاریی، نیعمەت‌و بەخششی خودایی بەردەوام دەبن‌و ئادەمیزاد خۆشبەخت‌و کامەران دەبێ!

## ڕێزنان لە ئادەمیزاد بەهۆی سوژدەبردنی فریشتە بۆ ئادەم‌و گومڕابوونی شەیتان‌و دەرکردنی لە بەهەشت

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ

يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ .

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئادەمیزادەکانی هەڵنان بۆ گوێڕاگرتن‌و وەرگرتنی بانگەوازی پێغەمبەران جارێك بە ترساندن‌و جارێك بە تەماع بەرنان‌و ڕانواندنی نیعمەتە زۆرو هەمە چەشنەکانی؛ ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی دروست کردنی ئادەم‌و ڕێز لێ گرتنی دەکا، بەوەی کە فەرمانی کرد بە فریشتە، کە سوژدەی ڕێزی بۆ بەرن! دیارە ڕێزگرتن لە باوك، ڕێزگرتنە لە کوڕو کچەکانی، کەوابێ وێڕای ئەم ڕێز لێ گرتنە ئەگەر ئادەمیزاد تووشی وەسوەسەو ختوکە دانی شەیتان هات حەق وایە زوو پەنا بۆ خودا بەرن‌و پەشیمان ببنەوەو واز لە سەرپێچی کردن بهێنن.

شایانی باسە قورئان لە حەوت شوێندا چیرۆکی شەیتان باس دەکا: لە سورەتی (البقرة)و سورەتی (الأعراف)و سورەتی (الحجر)و سورەتی (الأسراء)و سورەتی (الكهف)و سورەتی (طه)و سورەتی (ص).

پوختەی چیرۆکەکە لێرەدا هۆشیار کردنەوەی ئادەمیزادە بۆ ڕێزلێنانی ئادەم‌و ڕوونکردنەوەی دوژمنایەتی کردنی شەیتانە بۆ نەوەکانی‌و بانگەوازی کردنیانە بۆ ئەوەی شوێنی نەکەون‌و سوپاسگوزاری نیعمەتە زۆرو هەمەجۆرەکانی پەروەردگار بن‌و دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! ئێمە باوکی ئێوە کە ئادەمە لە قوڕ دروستمان کردو نیگارمان کێشا ﴿ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ﴾ پاشان وێنەمان کێشاو

کردمانە ئادەمیزادێکی ڕێكو پێكو لە گیانو ڕۆحی خۆمان فوومان پێدا کردو گیانی بەبەردا کرا، زانیاری تەواومان فێر کرد، ناوی شتەکانمان پێ گوتو فێریان بوو، ڕێزو عیلمو زانستی بەدەستهێنان ﴿ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ﴾ دوای ئەوە جەستەیمان ڕێکخستو گیانمان بەبەردا کردو وای لێ هات بەکەڵکی ئەوە بێ ببێتە جێنشینو ئاوەدانکەرەوەی زەویو ئامادەباشی ئەو ئەرکەی تێدا بەدی کراو فێری ناوی هەموو شتەکانمان کردو ڕەوشتی زانایی بەدەست هێنا، ئەمجار فەرمانمان بە فریشتەکان کرد کە سوژدەی ڕێزلێنانی بۆ بەرن ﴿فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ هەموو فریشتەکان جگە لە شەیتانی نەفرین لێ کراو، سوژدەیان بۆ ئادەم بردو فەرمانی خودایان بەجێ هێنا، شەیتان لوتبەرزی نواندو ملی نەدا بە سوژدەبردنو خۆی بەزلزانیو فەرمانی خودای شکاندو خۆی لە پێڕی سوژدەبەران هەڵهاوردو لە خوا یاخی بوو، ئەو لە بناغەدا لە ڕەگەزی جنۆکە بوو، نەك لە ڕەگەزی فریشتە.

ئەم سوژدەبردنە سوژدەی ڕێزو بە گەورە زانین بووە نەك سوژدەی پەرستنو تەقدیس، چونکە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر هەن لەسەر ئەوەی کە هیچ پەرستراوو خودای بەحەق نین شیاوی سوژدەبردن بن جگە لە پەروەردگار... جا کە شەیتان فەرمانی خودای شکاندو سوژدەی نەبرد ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ﴾[1]، پەروەردگار پێی فەرمووە چی ڕێگەی لە تۆ گرتو بووە لەمپەڕ لەبەردەمتا کە سوژدە بۆ ئادەم نەبەیت؟؟ کە فەرمانم پێ کردی بە سوژدەبردن بۆ فەرمانەکەت شکاندو لەگەڵ سوژدەبەراندا سوژدەت نەبرد؟

﴿قَالَ أَنَاْ خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ شەیتان لە وەڵامدا وتی: ئەوەی کە پاڵی پێوەنام ئەم هەڵوێستە هەڵگرمو سوژدە نەبەم ئەوەیە: من لە ئادەم بەڕێزترم! ڕەگەزی من لە ڕەگەزی ئەو چاکترە، چونکە ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ تۆ منت لە ئاگر دروست کردووە، ئادەمت لە قوڕ بەدی هێناوە، ئاگر کە تایبەتمەندیی ڕووناکی

[1] - لە وشەی (الا تسجد)ەدا (لا) بە زێدە حسێب دەکرێ چونکە لە سوورەتی (ص)دا ئایەتی ژمارە (٧٥) بەبێ (لا) نەهاتووە ﴿مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ – ص/٧٥﴾. دەشێ (لا) زێدە نەبێ ئەوکاتە (منع) بە مانا (حمل) بێ وە تەقدیرەکەی بەم شێوەیە بێ (ما حملك الا تسجد).

بەرزبوونەوەی تێدایە زۆر بەرێزترە لە قوڕ کە تایبەتمەندیی بێ خوستو پەستی تێدایە... کەسێك بەرزو بەرێز بێت سوژدە بۆ خوار خۆی نابا با فەرمانی خوداش بێ، ئەمە قیاسو بەرامبەر کردنی ئیبلیس بوو، بەلاَ قیاسێکی هەڵەو بێ بناغەیە، چونکە چاك سروشتی ماددی ناکرێتە بەلگە بەلگە لەسەر چاکی ماددەکە! بەلکوو چاکیەتی بە تایبەتمەندیی و سوودبەخشو مەعانی سامیە دەبێ! دەی خۆ پەروەردگار رێزو پلەو پایەو تایبەتمەندیی زانستو زانیاریەکی زۆری بە ئادەم بەخشیبوو کە شەیتان بۆخۆشی دەیزانیو لێیان بێ ئاگا نەبوو! جگە لەوەش فەرمانەکە فەرمانی خودا بوو لەبەرامبەر فەرمانی خودادا هیچ قیاسو بەلگەی تر دەوریان نیە!

بەلگە هێنانەوەشی بەچاك سروشتی ماددی ئاگر لە جێی خۆیدا نەبوو، چونکە چاکیو خراپی ماددە ئەمری ئیعتیبارینو بەگوێرەی راوبۆچوون دەگۆڕێن، جگە لەوەش زۆربەی ماددەی بەها گرانو بەنرخ لە کاربۆندا پەیدا دەبێ ئەویش لە خەڵوز وەدی دێ!

زیاد لەوەش خۆ فریشتە لە نوورو رووناکی دروست کراون شەیتان لە ئاگر خۆ نوورو رووناکی لە ئاگر باشترە دەی خۆ فریشتەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە لە نوور دروست کرابوون! سوژدەیان بۆ ئادەم برد!

ئەمەی گوترا هەمووی لەسەر ئەوە بنیات دەنرێ کە فەرمانکردنی پەروەردگار بە شەیتان بۆ سوژدەبردن فەرمانێکی تەکلیفی بووەو ئەم جۆرە گفتوگۆیەو پرسیارو وەلاَمە لە نێوان پەروەردگارو شەیتاندا ڕوویداوە.

بەلاَم بەپێی ئەو رایەی کە دەلێ: فەرمانەکە بۆ تەکلیف نیەو فەرمانێکی (تەکوینی)یەو چیرۆکەکە بۆ روون کردنەوەو دیاری کردنی سروشتی ئادەمیزادو فریشتەو شەیتانە، ئەوکاتە ئەو مانایەی لێ وەردەگیرێ کە پەروەردگار فریشتەکانی سەر زەوی وا ئاراستە کردوون کە بە فەرمانی خودا کاروباری زەوی هەڵسورێنن بەگوێرەی ئەو یاسایەی کە گونجاوە بۆ سوود لێ بینینو درێژەدان بە ژیان تا ئەوکاتەی پەروەردگار دیاری کردووە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْراً﴾ ئەم فریشتانە هەڵسورێنەری کاروباری زەوین، بە ویستو

ڕەزامەندی خودا، پابەندن بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی ئادەم و نەوەکانی، سروشتی ئادەمیزادی وا بەدی هێناوە کە ئامادەباشی تێدایە بۆ سوود وەرگرتن لە زەوی بەگوێرەی یاسای خودایی، سوود وەرگرتن لە ئاوو هەواو کانو گژوگیاو ئاژەڵو ڕووناکیو تاریکیو... هتد. بەمەش حیکمەتو دانایی و نیشانەی خودایەتی خودا لە زەویدا دەدرەوشێتەوە، هەروەکوو چۆن هەندێ لەو ئادەمیزادانەی ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە کە ببنە هەڵبژێردراوی خوداو بکرێنە پێغەمبەرو نیگای یەزدانیان بۆ بێو ببنە ڕێ نیشاندەری گەلو نەتەوەکانی خۆیانو ئایینی پەسەندکراوی خودایان پێ ڕابگەیەننو خەڵکی لە گومڕاییو بەدبەختی ڕزگار بکەن.

لەهەمان کاتدا سروشتی شەیتانو شەیتانەکانی وا دارشتووە کە کەمەندکێشی ئادەمیزاد نەبن بەڵکوو دوژمنو ناحەزیشیانن. سروشتو دەروونی ئادەمیزادی وا دارشتووە کە پلەی مام ناوەندی هەبێ، لە نێوان نەفسی فریشتەیی - فریشتەکان کە لەسەر طاعەتو گەردنکەچی سروشتیان دارێژراوە - لە نێوان گیانی ئەو جندۆکانەی کە سروشتی شەڕ تێیاندا زاڵە بە شەیاتینی دەناسرێن پەروەردگار ئیرادەو ئیختیاری داوە بە ئادەمیزاد دەتوانێ بەرز بێتەوە بۆ ئاسۆی فریشتە، ئەگەر ویستیشی نزم بێتەوە بۆ ئاسۆی جندۆکەو شەیاتینی.

ئیتر دوای ئەم گفتوگۆو پرسیارو وەڵامە ﴿قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا﴾ پەروەردگار فەرمانی بە شەیتان کردو فەرمووی: دابەزە خوارێ. لەم بەهەشتەی کە خودا تۆی تێدا دروست کردووە بڕۆ خوارەوە، بەهەشتەکە بەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرزەوە بوو؛ یان مەبەست ئەو بەهەشتەیە کە دوای دروست کردنی ئادەم لە زەوی خراوەتە ئەو بەهەشتەوەو تێیدا نیشتەجێ کراوە، ئەویش بەهەشتی پاداشتدانەوەیە.[1]

---

[1] – زانایانی ئیسلام لەبارەی ئەو بەهەشتەی ئادەمو حەوا تێیدا بوون کێشەیەکی دورو درێژیان تێدا پەیدا بووە، هەندێك دەڵێن: ئەو بەهەشتە بەهەشتێکی تایبەتی بوو خودا بۆ ئادەمیزادی دروست کردووە تا ئەو تاقی کردنەوەی تێدا ئەنجام بدا! ئەم بەهەشتە بریتی بوو لە باغو دارستانێك لە نێوان فارسو کرماندا، هەندێك دەڵێن: لە فەلەستین بووە. ئیمام ئەبو حەنیفەش هەر ڕای وایە کە ئەم بەهەشتە بەهەشتێکی تایبەتی بووە بریتی بووە لە باغێك ئادەمو حەوای تێدا بەخۆشی ژیانیان بەسەر بردووە.

پەروەردگار فەرمانی بە شەیتان کرد کە لەو بەهەشتە بڕواتە خوارێ، چونکە

خاوەنی (تفسیر المنار) لە ج ١/ل ٢٧٧دا ڕای ئەبو مەنصوری ماتوریدی دێنێو دەڵێ: ئێمە پێمان وایە: ئەم بەهەشتە بریتی بووە لە باغو دارستانێك یان دورگەیەکی ڕازاوە، ئادەمو حەوا تێیدا دەژیانو ڕایان دەبوارد، پێویست ناکا شوێنەکەی دیاری بکەین لێی بکۆڵینەوە، ئەمە ڕای زانا پێشینەکانی ئیسلامە ئەوانەی هەوڵیان داوە شوێنەکەی دەستنیشان بکەن هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە.

ئەمجار دەڵێ: بەم شێوە تەفسیرە زۆر گرێ کوێرە دەکرێنەوە. خاوەنی تەفسیری (روح المعانی) مامۆستا ئالووسی دەڵێ: ئەوەی کەپاڵپشتی ئەم رایە دەکات ئەمانەن:-

١- پەروەردگار یەکەم جار ئادەمی لەسەر زەوی دروست کردووە بۆ ئەوەی خۆیو نەوەو وەچەکانی تێیدا نیشتەجێ بن! کەوابوو جێنشین کردنی ئەوان لە زەویدا مەبەستێکی تایبەتییە، ناگونجێ بڵێین: لە تۆڵەی تاواندا فڕێ دراونە سەر زەوی.

٢- پەروەردگار لە دوای دروست کردنی ئادەمو حەوا لەسەر زەوی نافەرمووێ بەرزمان کردنەوە بۆ ئاسمان، ئەگەر شتی وا ببوایە باسی دەکرد چونکە ئەمە ڕووداوێکە گرنگە.

٣- ئەگەر ئادەمو حەوا لە زەوییەوە ببرانایە بۆ بەهەشت، - واتە: بەهەشتی پاداشتدانەوە – پەروەردگار لە جیاتی رستەی (اسکن أنت وزوجك الجنة) دەیفەرموو (ادخل أنت وزجك الجنة).

٤- بەهەشتی وادە پێدراو جگە لە خواپەرستانی تەقواکار کەسی تری تێ ناچێ، ئەدی شەیتانی نەفرین لێکراو چۆن چووە ناوی بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئادەمو حەوا؟.

٥- بەهەشت شوێنی جڵەوگیری کردن نیە لە هیچ شتێك واتە شوێنی ئەرکو تەکلیف نیە، دەی چۆن ئادەمو حەوا جڵەوگیرییان لێ کرا کە لەداری گەنم نەخۆن.

٦- لە بەهەشتدا گوناه ناکرێ، ئەدی چۆن ئادەمو حەوا ئەو هەڵەیان کردو تاوانبار کران؟!

٧- بەهەشت شوێنی پاداشتە ئەوانەی لە جیهاندا چاکەکارن خودا بەو بەهەشتە پاداشتیان دەداتەوە. دەی چۆن یەکەم جارو لەرێوە ئادەمو حەوا خرانە ناوی؟!

٨- بەهەشتی پاداشتدانەوە بە (دار الآخرة) ماڵی دوایی ناوزەد کراوە، ئەگەر ئەو بەهەشتی ئادەم بەهەشتی (دار الآخرة) بێ ئەوکاتە ناوبردنی جیهان بە ماڵی یەکەمو ناوبردنی بەهەشت بە ماڵی دوایی هەڵە دەردەچوو.

٩- بەهەشتی پاداشتدانەوە قورئان بەوە وەصفی کردووە هەرکەسێ چووە ناوی هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە، دەی کەوابێ بۆچی ئادەمو حەوا تێیدا نەمانەوە؟!

بەهەشت شوێنى بەندە موخليص‌و ڕاستاڵەکانى پەروەردگارە نەك شوێنى ياخى بوان‌و سەرپێچيکاران ﴿فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ ئەى شەيتانى نەفرين لێ کراو! بۆت نيە ڕێگات پێ نادرێ کە لوتبەرزى بنوێنيت لەم شوێنەدا کە بۆ ڕێزو نرخ ئامادە کراوە ﴿فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾ لەم شوێنە بڕۆ دەرەوە تۆ لەوانەيت سوکايەتيت پێ دەکرێ‌و بەچاوى بێ نرخ‌و ڕێزەوە سەيرت دەکرێ، بەپێچەوانەى بيروبۆچوونى خۆت کە لە خۆت ڕازى‌و خۆت پێ گەورەو بەڕێزو نرخدارە، تۆ هيچ‌و پووچ‌و کەم بايەخى، لە تاقى کردنەوە سەرکەوتوو نەبوويت‌و ئەزموونەکە حەقيقەتى تۆى دەرخست‌و هيچ ڕێزو پلەو پايەيەکت بۆ دانانرێ، نەفرين لێ کراوى‌و لەڕەحمەتى پەروەردگار بێ بەرى!

شەيتان خێرا مەقيفەکەى قۆستەوەو داواى مۆڵەت‌و تەمەن درێژى کردو ﴿قَالَ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ وتى: خودايە! مەم مرێنە مۆڵەتم بدە تا ئەو ڕۆژەى ئادەم‌و نەوەکانى زيندو دەکرێنەوە، من‌و نەوەکانم زيندو بين، ئاگامان لە ژيان‌و مردن‌و زيندوبوونەوەيان بێ. پەروەردگار وەڵامى دايەوەو فەرمووى: ﴿إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾ تۆ لەوانەى تا ڕۆژى دونيا وێران بوون‌و فوو کردن بە کەڕناى صوورو داچڵەکاندنى ئادەميزادو باقى گيانداران‌و خپ کردنيان‌و مراندنى هەموو زيندەوەرێك‌و تێکچوونى جيهان، مۆڵەتدراون وەکوو لە ئايەتێکى تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ – النمل/٨٧﴾.

واتە: شەيتان تا ڕۆژى دونيا وێران بوون دەمێنێ!! ظاهيرى ئايەتەکەى ئێرە ئەوە دەگەيەنێ کە شەيتان مۆڵەت درابێ تا ڕۆژى زيندوبوونەوە!! چونکە شەيتان داوا دەکاو دەڵێ مۆڵەتم بدە تا ڕۆژى زيندوبوونەوە پەروەردگار دەفەرموێ: تۆ مۆڵەت دراوى، بەڵام ئەم داوا کردنە لە سورەتى (الحجر)دا وەڵامەکەى بەشێوەيەکى ترە ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ، قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ، إِلَى يَومِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ – الحجر/ ٣٦ – ٣٨﴾. ئەمە ئەوە دەگەيەنێ مۆڵەتدانەکەى تا دونيا وێران بوونە، نەك تا ڕۆژى زيندوبوونەوە – کە لە نێوان دونيا وێران بوون‌و ڕۆژى زيندوبوونەوە چل ساڵە -.

ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنو مەردەویهی لە ئیبنو عەبباسەوە (خوای لێ رازیی بێ) گێڕاویەتیەوە، کە لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: شەیتان ویستوویەتی مردن نەچێژێ، بۆیە وتی: تا رۆژی زیندوبوونەوە مۆڵەتم بدە، بەڵام پێی گوترا: تا رۆژی دیاری کراو - کە رۆژی دونیا وێران بوونە - مۆڵەت دراوی، ماوەی نێوان دونیا وێران بوون‌و رۆژی زیندوبوونەوەش چڵ ساڵە.

هەر ئیبنو ئەبی حاتەم لە (السدی)یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پەروەردگار شەیتانی تا رۆژی زیندوبوونەوە مۆڵەت نەدا بەڵکوو تا رۆژی دیاری کراو کە رۆژی دونیا وێران بوونەو ئەو رۆژەیە کە هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی دەمرن‌و کەسی تێدا زیندو نامێنێ.

ئەمجار کە شەیتان دڵنیا بوو تا رۆژی دونیا وێرا بوون نامرێ ﴿قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ وتی بەهۆی ئەوەوە کە منت لەبەر خاتری ئادەم گومڕا کردو نەفرینت لێ کردم، سوێن بێ لەسەر ڕێگای ڕاستی تۆ دابنیشم‌و نەهێڵم ئادەمیزادەکان پێیدا بڕۆن‌و لە ڕێگایان لابدەم، ڕێگای تری خوارو خێچیان لە پێش چاو شیرین بکەم‌و سەریان لێ تێك بدەم، گومڕایان بکەم. ئەمجار شێوەی گومڕا کردنەکەی دیاری دەکاو دەڵێن: ﴿ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ﴾ پاشان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان بۆ دێنم لە هەر چوارلاوە دێمە وێزەیان، لە پێشیانەوە لە دوایانەوە لای ڕاستانەوە، لای چەپیانەوە، بە هەموو جۆرێك تێ دەکۆشم بۆ لەخشتەبردن‌و هەڵخەڵەتاندنیان‌و گومڕا کردنیان، لێیان لە پارێزدا دەبم‌و هەر هەلم بۆ هەڵبکەوێ بە قورتاریان نادەم! ﴿وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ﴾ زۆربەیان وا لێ دەکەم سوپاسی تۆ نەکەن، دەبینی زۆربەیان کوفرانی نیعمەتی تۆ دەکەن، سوپاسگوزاریی ئەوە نابن کە تۆ عەقڵ‌و هۆشت پێ بەخشیون، ڕزق‌و ڕۆزی هەمە جۆرت بۆ دابین کردوون، لەشی ساغ‌و تەندروستیت داونێ. بەڵکوو کەمێکیان شوێن ئایینی پەسەند کراوی تۆ دەکەون.

شەیتان کە ئەمەی گوت لە یەقینەوە نەبوو بەڵکوو بە گومانەوە وتی‌و پێی وا بوو وا دەبێ، کەچی گومانەکەی هاتە جێ‌و وا دەرچوو، ڕاستی پێکا! نەی ئەوە نیە لە شوێنێکی تردا پەروەردگار فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا

فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ، وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ – سبأ/ ٢٠ – ٢١﴾.

ئەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر نەفرین لێ کردنەوەکەی کردەوەو ﴿قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْؤُومًا مَّدْحُورًا﴾ فەرمووی لەو بەهەشتە دەرچۆ دەرەوەو ترۆ ببە؛ بڕۆ دەرەوە بە سەرزەنش کراوی‌و ریسواکراوی‌و نەفرین لێ کراوی، نەفرینی پەروەردگارو فریشتەکانت لێ بێ، تۆ بێ بەری لەڕەحمەتی ئێمە!

ئەمجار پەروەردگار سوێندی خواردو فەرمووی: ﴿لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ مەرج بێ هەرکەسێك لە ئادەمیزاد شوێن تۆ بکەوێ‌و بەو فرت‌و فێڵانەی تۆ هەڵبخەڵەتێ ڕێگای ڕاست هون بکاو ڕێگای گومڕایی بگرێتە بەرو گومانی تۆی تێدا بەجێ بێ، من دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆو لە هەندێ لەو ئادەمیزادانەی کە شوێن تۆ دەکەون، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ – ص/٨٥﴾. بەڵام پەروەردگار بەندە ڕاستاڵەکانی لەم گومڕایی کردن‌و دۆزەخ لێ پڕ کردنە چەرت (إستثناء) دەکاو لەو بڕیارە دەریان دەهاوێ، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ – الحجر/٤٢﴾، یان دەفەرموێ: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ – ص/٨٢ – ٨٣﴾.

## سەرگوزشتەی ئادەم لە بەهەشتداو دەرچوونی لێی

﴿ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ

ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّۖ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

ئایەتەکانی ئێرە درێژەپێدانی باسی چۆنیەتی دروست بوونو سەرهەڵدانی ئادەمیزادو ڕۆڵی شەیاتینی جندۆکە لە گومرایی کردنی ئادەمیزادە، مەبەست لەم چیرۆکە ڕێنومایی کردنی ئادەمیزادە بۆ ئەوەی ڕێگای هیدایەت بگرنە بەر، ترساندنیانە لە ختوکەو وەسوەسەی شەیتان، چونکە شەیتان بەهۆی حەسوودی بردنی بە ئادەمو حەوا هەوڵی دا ئەوان لەو نیعمەتو خۆشیە وەدەرنێ، ئازو نیعمەتو پۆشاکی جوانو ڕازاوەیان لێ داڕنێ! ئەو ئاواتەشی هاتە دی.

لەوساوەو تا ئێستاش و لەمەو دوا تا دونیا دونیایە شەیتان لە هەوڵو تێکۆشاندایە بۆ لەخشتە بردنی ئادەمیزادو گومراکردنیان... دەفەرموێ: ﴿وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾ ئەی ئادەم تۆ خۆتو خێزانت لەو بەهەشتەدا

نیشتەجێ ببن‌و تێیدا ڕابوێرن، ئەو بەهەشتە بەڕای زۆربەی زانایان بەهەشتی هەتا هەتایی‌و پاداشتدانەوەیە، هەندێك پێیان وایە بەهەشتێکە لە بەهەشتەکانی ئاسمان، یان باغێکە لە باغەکانی زەوی. بێگومان ئەم چیرۆکە حەوت جار لە قورئان دا دووبارە بۆتەوە، لە هیچ شوێنێکدا ئاماژە بۆ ئەوە نەکراوە کە ئادەم دوای ئەوەی لە زەوی دروست کرا، بەرز کرابێتەوە بۆ بەهەشتی پاداشتدانەوە، کەوابوو ڕای ئەوانەی کە دەڵێن: بەهەشتەکە بەهەشتی پاداشتدانەوەیە – هەرچەندە زۆرینەی زانایانیشن – ڕەت دەکرێتەوە چونکە ئادەم‌و حەوا داوایان لێ کرا کە لە داری گەنم نەخۆن‌و لێی نزیك نەبنەوە... دەی خۆ لە بەهەشتدا تەکلیف نیە، هەروەها ئادەم لەو بەهەشتەدا نووست! دوای لێی دەرکرا، شەیتان چووە وێزەی‌و هەڵی خەڵەتاند! دەی خۆ لە بەهەشتی پاداشتدانەوەدا نە نووستن هەیە نە دەرکردن هەیە، نە شەیتانیش دوای نەفرین لێ کردنی دەتوانێ بچێتە ناوی. بەهەر حاڵ زانینی شوێنی ئەو بەهەشتە واجب نیەو پێویست ناکا خۆمانی پێوە هەڵەوگیر بکەین!!

پەروەردگار کە ئادەم‌و حەوای لە بەهەشتدا نیشتەجێ کردن بۆی حەلاڵ کردن کە تێیدا بمێننەوە، فەرمانی تری ئاراستە کردن‌و فەرمووی: ﴿فَكُلاَ مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ لەهەر شوێنێك هەرچیەکتان حەز لێیە بیخۆن‌و بخۆنەوە، بە ئارەزووی خۆتان، بەروبووم‌و میوە بخۆن! بەلام ﴿وَلاَ تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ بە هیچ جۆرێك نزیك ئەو دارە تایبەتە مەکەونەوە، لەبەروبوومی مەخۆن... – قورئان جۆری دارەکەی دیاری نەکردووە – ئەمجار هۆی جڵەوگیری لە نزیك بوونەوە لە دارەکە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ئەگەر لێی نزیك بکەونەوەو لێی بخۆن دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوەو، شیاوی ئەوە دەبن سزا بدرێن.

﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ﴾ شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیانەوەو تاوان‌و سەرپێچی کردنی لە پێش چاو جوان کردن، تەفرەی دان بۆ ئەوەی بەروبوومی درەختی لێ قەدەغە کراو بخۆن، ﴿لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَاتِهِمَا﴾ هەتا لە ئاکاما بەهۆی خواردنەکەوە پێویستیان بەسەر ئاو ببێ، شەرمگایان – کە لەوەپێش بە پەردەی سرپۆشی یەزدانی داپۆشرابوو – بەدەر بکەوێ، چونکە سوننەتی خودا وایە: کە نیعمەتێکی بەخشی بە کەسێك؛ بەگەل‌و هۆزێك هەتا ئەو نیعمەت

پێدراوە لە خۆی تێك نەداو نەبێتە هۆی لابردنی، خودا نیعمەتەکەی خۆی هەڵناگری!

(لامی)ی (لیبدی)ە پێی دەگوترێ (لام العاقبە) واتە: بۆ ئەوەی لە ئاکاما شەرمگایان دەربکەوێ.

حەسەنی بەصری دەڵێ: وەسوەسەکەی شەیتان بەهۆی هێزێکی تایبەتی کە خودا بە شەیتانی بەخشیوە لە زەوییەوە بۆ ئاسمان ئاراستە کراوە، ئەم قسەیەی حەسەنی بەصری لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئادەم لە بەهەشتی پاداشتدانەوەدا بووبێ‌و لەو بەهەشتە دەرکرابێ نەك ئەو رایە کە دەڵێ بەهەشتەکە بریتی بووە لە باغێك لەسەر زەوی.

ئەمجار شەیتان کەوتە چاوو راوو ﴿وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ﴾ وتی بۆیە خواردنی بەروبوومی ئەو دارەتان لێ قەدەغە کراوە بۆ ئەوەی نەبنە فریشتە یان بۆ ئەوەی هەتا هەتایە لەم بەهەشتەدا نەمێننەوە؛ ئەگەر لەم درەختە بخۆن ئەوە ئەم مرادتان دێتە جێ، یان دەبنە فریشتەو تایبەتمەندیی فریشتەتان پێ دەدرێ، یان وەکوو ئەوان هێزو تواناو تەمەن درێژیتان دەست دەکەوێ‌و واتان لێ دێ هیچ دیاردەیەکی کەون کارتان لێ ناکا، یان دەچنە ریزی ئەوانەوە: کە هەتا هەتایە لە بەهەشتدا دەمێننەوەو مردنتان بەسەردا نایە! بەم جۆرە لە تەوەری هەستیاریدا بەم حەزو ئارەزووانەی کە لە سروشتی ئادەمیزادا شاردراونەوە سەرنجی راکێشان، ئادەمیزاد پێی خۆشە نەمر بێ، یان تەمەنی درێژ بێ، پێی خۆشە بە تەمەنی کورتیش ماڵ‌و سامانی زۆرو زەبەندەو بێ سنووری هەبێ، لەو قیرائەتەدا کە (لام)ی (ملكين)ی تێدا بە مەکسووری دەخوێندرێتەوەو بە تێروانین لە ئایەتێکی تر کە دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَى – طه/ ١٢٠﴾ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە فەرمانڕەوایی هەمیشەیی‌و تەمەنی هەتا هەتایی بەهێزترین حەزو ئارەزووی ئادەمیزادن! تەنانەت حەزو ئارەزووی (جینسی)یش خۆی لە خۆیدا هۆکارێکە بۆ دەستەبەربوونی ئەم نەمرییە کە بەهۆی وەچەو نەوەوە چین لە دوای چین دێتە جێ.

لـەم قیرائەتـەدا (لام)ی (ملکـین)ی بـە مـەفتووحی تێـدا دەخوێندرێتـەوە فریودانەکە بەوە دەبێ کە لە کۆت‌و زنجیری تایبەتمەنـدیی ئـادەمیزادیی رزگاریـان ببێ‌و بچنە پێڕی فریشتەوەو مردنیان بەسەردا نەیە، جا هەرچەندە ئەم قیرائەتـە مەشهورترە بـەڵام قیرائـەتی پێـشوو؛ کـە (لام)ی (ملکـین)ی تێـدا بـە مەکـسووری لەگەڵ دەقی ئایەتەکەی سورەتی (طه)دا گونجاوترە.

جا چونکە ئەو نەفرین لێ کراوە دەیزانی خودا نزیك کەوتنەوەی ئـەو دارەی لێ قەدەغـە کـردوون‌و دەشـیزانی ئـەو قەدەغـە کردنـە چـەند لەسـەر شـانیان قـورس‌و گرانـە، ویـستی لـەم ڕێگـەوە لـە خـشتەیان بـەرێ، ویـستی فـەرمان شـکاندنەکەی پەروەردگاریان لەسەر شان سوك بکاو لە هەمان کاتیشدا حەزو ئـارەزووی نـەمری‌و ژیـان خۆشەویـستی تێـدا وروژانـدن. چـەندێك ئـادەم‌و حـەوا باسـی سـزاو تۆڵـەی خودایان بکردایە ئەو باسی لێبوردوویی‌و لێخۆشـبوونی خودای بـۆ دەکـردن، پـەیتا پەیتا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە؛ کە ئەو بۆیان دڵسۆزەو دڵـی پێیـان دەسوتێ ﴿وَقَاسَمَهُمَا﴾ سوێندی بۆ خواردن‌و پێی گوتن: ﴿ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾ دڵنیـا بن من ئامۆژگاریکەرێکی متمانە پێ کراوم بۆ ئێوەو دڵم پێتان دەسوتێ‌و بۆتان بـە پەرۆشم، مەبەستم سوودو قازانجی ئێوەیەو دەمـەوێ بەختـەوەریتان هـەتا هەتایـە بەردەوام بێ‌و ئەم ژیانە کامەرانییەتان لێ نەشێوێ...

بەم جۆرە شەیتان، ئادەم‌و خێزانی، لە ژێر کاریگەری وروژانی حەزو ئارەزووی تایبەتی خۆیانداو بەو سـوێندە بـە درۆیانـە بەتـەواوی بـەنجی کـردن‌و لـە خـشتەی بردن؛ ئەوەیان لە بیرچۆوەوە کە شـەیتان دوژمنـی سەرسـەختی ئەوانـەو هـەرگیز ڕێگای بە سوودیان پێ نالێ‌و بەرژەوەندی ئەوانی نـاوێ! ئەوەشـیان لـە بیرچووەوە: کە پەروەردگار فەرمانی پێ کردوون‌و خواردنی ئەو دارەی لێ یاساغ کردوون‌و نابـێ سەرپێچی فەرمانەکەی بکەن! جا هۆکاری حوکمەکە بـزانن یـان نـەزانن! هـەروەها ئەوەشیان لە یاد چوو کە هەموو شتێك بە ویـستی خودایـەو خـودا چۆن تەقـدیرو ئەندازەکێشی کردووە هەر دەبێ وابێ! ئەگەر خودا ژیانی هەتا هـەتایی بـۆ تەقـدیر نەکردبن هەرگیز پێـی ناگـەن! ئـەم شـتانەیان هـەموو لـە یـاد چـوو، شـەیتان هـەڵی خەڵەتاندن‌و دڵیان نەرم بوو بۆ پەیڕەو کردنی ئامۆژگارییەکانی شـەیتان ﴿فَدَلَّاهُمَا

بِغُرُورٍ﴾ بەرە بەرە بە فرتو فێڵ لە ئاستی بەرزی خودا پەرستیو فەرمانبەرداری بۆ خودا هێنانییە خوارەوەو لەو پلەو پایە دایبەزاندنو بەرەو ئەنجامدانی تاوان پەلکێشی کردنو لە ئاکاما تاوانیان قەوماندو لە درەختەکەیان خوارد!! ﴿فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا﴾ کە لە دارەکەیان خوارد، شەرمگای یەکتریان چاو پێ کەوت هەریەکەیان چاوی بە هینی ئەوی تریان کەوت کە لەوەپێش داپۆشراو بوو! ئیتر بەهۆی ئەو خواردنەوە ئارەزووی زاوزێو حەزی منداڵ بوونو نەوە لێ کەوتنەوەیان تێدا وروژا، وێڕای ئەوەش ئادەم بە بینینی هینەکەی خۆیو بیلامانەکەی حەواش شەرمی بە خودا هاتەوە، حەواش بەهەمان شێوە بە بینی بیلامانەکەی خۆیو هینەکەی ئادەم تەریق بووەوە، هەستیان بە پێویست بوونی پۆشاك کرد، ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾ ئیتر هەریەکەیان پەلاماری پەلکە گەڵای پانی درەختەکانی بەهەشتیان دا بە جەستەی خۆیانەوە دەنووسانو شەرمگای خۆیانیان پێ دادەپۆشی!!

ئەوە ئاماژەیەکی روونو ئاشکرایە: کە ئادەمیزاد بە سروشت لە بەدەرکەوتنی شەرمگایدا شەرمی بەخۆی دێتەوە، هەتا ئەو سروشتە تێك نەچێ رێگا نادا ئادەمیزاد ئامادەبێ شەرمگای خۆی بەدەر بخاو شانازیش بە رووتو قوتییەوە بکا کە دەست کردو دیاری کۆمەڵگای نەزانییە بۆ شێواندنی شیرازەی کۆمەڵو خێزانی موسوڵمان!!

﴿وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ لەو کاتی تەنگو چەڵەمەیەی کە ئادەمو حەوا تێی کەوتبوون پەروەردگاریان بانگی لێ کردنو سەرزەنشتی کردن بە شێوەیەکی گلەیی ئامێز پێی فەرموون: ئەرێ من لە خواردنی ئەو درەختە جلەوگیریم لێ نەکردن؟؟ پێم نەگوتن توخنی ئەو درەختە مەکەونو لێی نزیك نەبنەوە؟؟ بۆچی فەرمانەکەی منتان شکاند؟ بە قسەی شەیتان لەو دارەتان خوارد؟! ئەری من پێم نەگوتن: شەیتان دوژمنی راستەقینەی ئێوەیەو نەخەڵەتابن بە قسەی بکەن؟! من پێم نەگوتن ئەگەر ئێوە بە قسەی شەیتان بکەن لە بەهەشت وەدەرتان دەنێو لە خۆشی لەززەتو رابواردنی بەهەشت دەرتان دەکاو دەتانخاتە تەنگو چەڵەمەی

ژیانی کوللەمەرگیی‌و نارەحەتی دونیا، ئەری من پێم نەگوتن! وریا بن‌و لە شەیتان حەزەر بکەن‌و نەکەونە داوی گلاوی!؟ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى – طه/١١٧﴾. ئیتر ئادەم‌و حەوا بەهۆش خۆ هاتنەوە پەشیمان بوونەوەو روویان لە بارەگای پەروەردگار کردو دەستی نزاو پارانەوەیان بەرزکردەوەو ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا﴾ وتیان پەروەردگارا! ئێمە ستەممان لە خودی خۆمان کردو هەڵخەڵەتاین‌و قاچمان هەڵخلیسکا بەوەی کە بە قسەی شەیتان فەرمانی تۆمان شکاند، سەرباری ئاگادارکردنەوەمان کە بە قسەی شەیتان نەکەین، کەچی ئێمە بە فرت‌و فێڵی شەیتان تێکەوتین‌و تاوانمان ئەنجام دا ﴿وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ ئەگەر بە لوتف‌و رەحمەتی خۆت لێمان خۆش نەبی‌و بەزەییت پێماندا نەیەتەوەو تەوفیقمان نەدەی بۆ پەیڕەو کردنی رێگای راست‌و خوداپەرستی‌و وازهێنان لە ستەمکاری‌و تۆبەمان لێ وەرنەگری‌و پەشیمانیمان لات قبوول نەبێ‌و رەزامەندیت نەبێ بەرامبەرمان ئەوە ئێمە لە پێڕو تاقمی خەسارەتمەندان دەبین خۆمان لەدەست داوەو تازە لە بەدبەختی‌و چارەڕەشی رزگارمان نابێ!

بەکورتی بە مرادگەیشتن‌و خۆشبەختی لێخۆشبوون‌و رەحمەتت بۆ کەسێک دەستەبەر دەبێ کە بگەڕێتەوە بۆلای تۆو رێبازی پیرۆزت بگری؛ کەسێک سوور بێ لەسەر تاوان ئەنجامدان‌و بەربەرەکانی پەروەردگار بکاو سەرپێچی فەرمانەکانی بکاو لوتبەرزی بنوێنێ‌و خۆ بەزلبزانێ؛ ئەوە خەسارەتمەندی هەمیشەیی‌و ماڵوێرانی دونیاو قیامەتە، ﴿قَالَ اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ پەروەردگار خیطابی ئاراستەی ئادەم‌و حەواو شەیتان کردو فەرمووی: هەمووتا بڕۆنە خوارێ‌و لەم بەهەشتە دەرچن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان بن (شەیتان دوژمنی ئادەمیزادەو بە پێچەوانەشەوە) بۆیە پێویستە ئادەمیزاد هیچ کاتی لە دوژمنایەتی شەیتان بێ خەم نەبێ، لە وەسوەسەو گومڕایی کردنی ئەمین نەبێ، هەمیشە بە دوژمنی خۆی بزانێ‌و دڵنیا بێ کە ئەو کافرە نەفرین لێ کراوە هەمیشە بۆی لە کەلێندایە! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ – فاطر/٦﴾. وەدەرنانی ئادەم‌و حەوا لەو بەهەشتە لە

تۆڵەی ئەو تاوانەدا بوو کە کردیان، بەڵام تۆڵەی قیامەتیان نیە، چونکە خودا بە تۆبە کردنەکەیان عەفوی کردن لە گوناهیان خۆش بوو وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى، ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى – طه/١٢١ – ١٢٢﴾. ئەمجار رووی خیطاب دەکاتە ئادەمو حەواو نەوەکانیان، دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ بۆ ئێوە هەیە ئەی ئادەمیزادینە! لە زەویدا مانەوەو تەمەنی دیاری کراو کە ماوەی ژیانتان تەواو بوو ئەجەلی مردنتان دێ، هەموو ئەمانە لە لەوحولمەحفوظدا دەست نیشان کراون و نووسراون ﴿قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾ پەروەردگار فەرمووی: ئەی ئادەمیزادینە! ئێوە لەسەر زەوی ژیان بەسەر بەرن، لەسەر (زەوی)یش دەمرن و دەخرێنە باخەڵی خاکەوە، هەر لە زەوی دەردەهێندرێنەوەو زیندو دەکرێنەوەو راپێچی دەشتی مەحشەر دەکرێن و کۆ دەکرێنەوە بۆ لێکۆڵینەوەو پاداشتدانەوەو تۆڵە لێ ستاندن.

**تێبینی:**

ئایەتی ﴿إِلاَّ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ...﴾ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە فریشتە لە ئادەمیزاد بەرێزترن وەکوو لە ئایەتێکی تریشدا ئاماژە بەم زێدەرێزییە کراوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ – الأنعام/٥٠﴾ یان ئایەتی ﴿وَلاَ الْمَلاَئِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ – النساء/١٧٢﴾.

بەڵام کەلبی دەڵێ: موسوڵمانان زێدە رێزیان بەسەر هەموو دروست کراواندا – جگە لە کۆمەڵێك فریشتە وەکوو جوبرائیل – میکائیل – ئیسرافیل و فریشتەی گیانکێشان – هەیە، چونکە ئەمانە لە پێغەمبەرانی خودان.

ئیبنو عەبباس و زەجاج و زۆرینەی زانایانی ئیسلام پێیان وایە موسوڵمانان لە فریشتە رێزدارترن.

ئایەتی ﴿لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَاتِهِمَا – الأعراف/۲۰﴾ ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە بەدەرخستنی شەرمگا کارێکی ناشیرینەو دیاردەیەکی قیزەونە، هەر لە کۆنەوە سروشتی پاك بێزی لێ دەکاتەوەو عەقڵو هۆش بە ناشیرینی دادەنێن پەروەردگار داپۆشینی شەرمگای بەواجب داناوە، بۆیە ئادەمو حەوا کە شەرمگایان بەدەرکەوت خێرا هەوڵیاندا بەگەڵای درەختەکان بیشارنەوە هەر کەسێك بانگەوازی بکا بۆ دەرخستنی شەرمگا ئەوە مانای وایە: پەردەی حەیاو نامووسی دڕیوە، ئادەمیزاد بۆ سەردەمی نەزانیو بەرەڵڵای دەگێڕێتەوە، ئافرەت دەکاتە ئامێری رابواردنی نابەجێو کاڵای فرۆشتن، هیچ پارێزگاری ئەو نامووسو شەرەفە ناکەن کە ئایین فەرمانی بە پاراستنی کردووەو سروشتی سەلیم داخوازی پاكو خاوێن راگرتنیەتی!

پوختەی چیرۆکەکە بۆ ئەوەیە: ئێمە رێنموونی بکا بۆ پابەند بوون بەو سروشتە پاکەی لەسەری دروست بووین، هەروەها بۆ سوپاسگوزاری خوداو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیو خۆپاراستن لە جڵەوگیرییەکانیو حەزەر کردن لە وەسوەسەو ختۆکەی شەیتان. جا کە ئێمەی ئادەمیزاد حەزو ئارەزووەکانی خۆمان زانینو هەستمان بە خەتەرناکی دوژمنی سەرسەختی خۆمان؛ شەیتانی نەفرین لێ کراو کردو دڵو دەروونی خۆمان لەسەر یادی خوداو ئەدەبو ئەخلاقی جوان پەروەردە کردو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار بووین، ئەوە لە دونیاو لە قیامەتدا خۆشبەختو کامەرانین. ئەرکی خۆمان لە ژیاندا بەجێ هێناوەو بەمراز گەیشتوو سەرکەوتووین.

## دابینکردنی پێویستی ئادەمیزاد لە دونیاو ترساندنی لە فیتنەی شەیتان

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ

يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

له ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەمان زانی: کە پەروەردگار فەرمانی بە ئادەمو حەوا کرد: کە دابەزنە سەر زەوی‌و زەوی بۆ کردن بە شوێنی تێدا حەوانەوەو ژیان بەسەر بردن، ئەمجار لێرەدا پەروەردگار ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە هەموو پێویستیاتێکی دین‌و دونیای بۆ ئادەمیزاد لە زەویدا دابین کردووە بڕێ لەو پێویستیانە پۆشاکە کە پێویستیەکی گرنگە بۆ دین‌و دونیا ئەمەش داخوازی سوپاسگوزاری ئادەمیزادە لەسەر ئەو نیعمەتە زۆرو زەبەندانەی خودا بۆ بەندەکانی‌و فەرمووی: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشًا﴾ ئەی نەوەی ئادەم یادی نازو نیعمەتی خودا بکەنەوە کەبەخشیونی بە ئێوە ئێستاو بە باوە ئادەم‌و بە دایە حەوا لەوە پێش، بەو جۆرە کە پێویستیاتی ئایین‌و ژیانی دونیای بۆ دابین کردوون، وەکوو ئەو پۆشاکەی شەرمگای پێ دادەپۆشن‌و ئەو بەرگ‌و ئامێرە جوانانەی خۆتانی پێ دەرازێننەوە، لە سەرماو گەرما خۆتانی پێ دەپارێزن، مانای ﴿أَنزَلْنَا﴾ – ناردنە خوارەوەی پۆشاکە – ئەوەیە: کە خودا بۆی کردوون بە یاساو شەریعەت‌و فەرمانی پێ کردوون کە لەبەری بکەن، ماددە خامەکەیشی بۆ دروست کردوون[1]، ماددە خامەکەی کە لە لۆکەو خوری‌و کوڵك‌و مووو ئاوریشم‌و پەڕی باڵندەیە... هتد. بەگوێرەی پێویست بۆی بەدی هێناون. ئەمجار فێری رستن‌و جۆلایی کردن‌و چنین‌و دروونی کردوون‌و شێوەی لەبەر

[1] – سەیید دەفەرموێ: (أنزلنا) لێرەدا بەمانا (شرعنا لكم في التنزيل).

کردنو بەکارهێنانی ئەو پۆشاکو هۆکارە رازێنەرەوانەی خستۆتە دڵتانەوەو بۆ بەرژەوەندی خۆتان بەکاریان دەهێنن! ئەم منەت نانەی پەروەردگار بە نیعمەتی پۆشاك بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە رەوایە ئادەمیزاد پۆشاکی جوان لەبەر بکاو خۆ برازێنێتەوە، ئەمەش لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاددا گونجاوە کە ئارەزووی خۆرازاندنەوەو خۆ قۆزکردنو ئارایشت دانی هەیە!

نیعمەتی پۆشاك نیعمەتێکی گەورەو بەنرخە، هەرکەسێك هەست بە گرنگی ئەم نیعمەتە نەکا سروشتی تێك چووە، پۆشاك وەکوو شەرمگا دادەپۆشێو زێدە جوانی بە ئادەمیزاد دەبەخشێ لەهەمان کاتدا لە سەرماو گەرماش دەیپارێزێ!

قورئانی پیرۆز کە لێرەدا باسی پۆشاکو گرنگییەکەی دەکاو بە یەکێ لە نیعمەتە گەورەکانی خودا بۆ ئادەمیزادی حسێب دەکا؛ هەروا بە ئاسانی بەسەریدا رامەبوورە! لێی وردبەرەوەو تێی بفکرە! چونکە قورئان رێنموونییەك رانانوێنێ کە پێویست نەبێو بۆ دەرمانی دەردێك نەبێت، بۆ بەرامبەری کردنو قەلاچۆکردنی حاڵەتێكو دیاردەیەکی ناشیرین نەبێ! چیرۆکێك ناگێڕێتەوە کە کاریگەریو رۆڵی خۆی نەبێ لە بزوتنەوەی ئیسلامیدا، چیرۆکی قورئان تەنها بۆ لایەنی فەنو داهێنان نیە، کە حەقیقەتێك رادەنوێنێ تەنها بۆ رانواندنی لایەنی نەظەرییەکەی نیە، بەڵکوو بۆ پەروەردەو پێگەیاندنی کەسایەتی موسوڵمانە.

قورئانی پیرۆز پرۆگرامی خودایە بۆ ئادەمیزاد بۆ ئەوەی پەیڕەوی بکا، رێنموونیو بڕیارەکانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی حاڵەتو رووداو رووداوەکانی بزوتنەوەی ئیسلامیە، بۆ چارەسەر کردنی کێشەو تەنگو چەڵەمەیە: کە ڕووبەڕوی کۆمەڵگای موسوڵمانان بۆتەوە، یان دەبێتەوە، هەر لەم روانگەوە کە سەیری ئەم ئایەتەی ئێرە دەکەین دەبینین تیماری برینێکی کۆمەڵایەتی قووڵی سەردەمی نەفامی دەکا، قەلاچۆی دیاردەیەکی قیز لێ کراوی کۆمەڵگای عەرەبو هەموو کۆمەڵگایەکی نەفامی – کە ئەو جۆرە دیاردانەی تێدا بێ – دەکا.

بێگومان قورەیشییەکان پێش هاتنی ئیسلام چەند یاساو دابو نەریتێکیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان داهێنا بوو، بۆ ئەوەی خۆیان بەسەر ئەو عەرەبە موشریکانەدا بسەپێنن کە ساڵانە بۆ ئەنجامدانی حەج ڕوویان دەکردە مەککەو کارەکانی حەجو پێداویستییەکانیان ئەنجام دەداو تەوافی کەعبەیان دەکرد؛ ئەو کەعبەیەی

کردبوویان بە خانەی بتو صەنەمو شوێنی خزمەتچی بتەکانیان، ئەم یاساو دابو نەریتەیان لەسەر بیروبۆچوونێك گەڵاڵە کردبوو کە پێیان وابوو: ئایینی خودایە، ئەمانەیان داهێنابوو بۆ ئەوەی کەسانی دیکەی پێ گەردنکەچ بکەنو بیان چەوسێننەوە! وەکوو هەموو خاوەن دێرو کاهینو ملهوڕەکانی ئەو ڕۆژگارە دەیان کردو پەیڕەویان دەکرد، قوڕەیشییەکان ناوێکیان لە خۆیان نابوو بە خۆیان دەگوت (الحمس) کۆی (أحمس)ە واتە: ئایین پەروەر، بڕێ مافو زێدە ڕێزیان بە خۆیان دابوو عەرەبەکانی تر ئەو مافانەیان بە خۆیان نەدابوو!

بەشێك لەو مافانەی کە تایبەت بوو بە قوڕەیشییەکانەوەو کەسی تر ئەو مافەی نەبوو بڕێ دابو نەریتو چۆنیەتی ئەنجامدانی تەوافی کەعبە بوو! هەر بۆ قوڕەیشییەکان ڕەوا بوو بە بەرگی خۆیانەوە تەواف بکەن؛ بەڵام جگە لە قوڕەیشییەکان عەرەبەکانی تر بۆیان نەبوو بە پۆشاکێك کە لەوەپێش لەبەریان کردووە تەواف بکەن، دەبوایە پۆشاك لەو قوڕەیشییانە وەربگرن کە ناوی (الحمس)یان لە خۆیان نابوو، یان دەبوایە هەوڵ بدەنو پۆشاکی تازە پەیدا بکەن بۆ ئەوەی تەوافی پێ بکەن، ئەگەر لەم دوو حاڵە هیچیان بۆ هەڵنەسوڕایە ئەوە دەبوو بەڕووتو قووتی تەواف بکەنو ئافرەتیشیان لەگەڵدا دەبوو!

ئیبنو کەثیر دەڵێ: عەرەبەکان – جگە لە قوڕەیش – بە پۆشاکێك کە لەوە پێش لەبەریان بکردایە تەوافیان نەدەکرد، پێیان وابوو: نابێ بە پۆشاکێك تەواف بکەن کە تاوانیان پێوە کردووە؛ تەنها قوڕەیشییەکان کە ناوی (الحمس)یان لە خۆیان نابوو بۆیان هەبوو بە بەرگی کۆنینەوە تەواف بکەن، بەڵام عەرەبەکانی تر ئەگەر کابرایەکی قوڕەیشی (أحمس)ی پۆشاکێکی بدایە ئەوە تەوافی پێوە دەکرد یان ئەگەر پۆشاکێکی تازەی دەست بکەوتایە ئەوە دەیتوانی تەوافی پێوە بکا دوای تەوافەکە دەبووایە فڕێی بدایەو کەس بۆی نەبوو هەڵی بگرێتەوە؛ خۆ ئەگەر کابرای قوڕەیشی پۆشاکی پێ نەدایەو هی تازەی چنگ نەکەوتایە ئەوە بە ڕووتو قووتی تەوافی کەعبەی دەکرد، ئەگەر ئافرەتیش بوایە هەر ئاوا بە ڕووتی تەوافی دەکرد ئەگەر شتێکی دەست بکەوتایە – وانێکەکەی – خۆی پێ دادەپۆشی!! بەڵام بە زۆری ئافرەتەکان ئەگەر ڕووت بوونایە بەشەو تەوافیان دەکرد بۆ خاتری شوێنی نالەباری نەبیندرێ!

کەوابێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم واقیعە تاڵە، بۆ قەلاچۆکردنی ئەم گومڕایی‌و سەر لێ شێوانە، بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەو شەریعەتە دەستکردە قیزەونەی کە پاڵ خودایان دەدا دەربارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی تەواف‌و پۆشاک‌و...هتد. ئەم دەقە قورئانیانە نێردرانە خوارێ، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بگەڕێتەوە بۆ سەر جادە ڕێیەکەو لەو داب‌و نەریتە نەزانیانە رزگاری بکا!

گومان لەوەدا نیە کە منەت نانی خودا بەسەر ئێوەی ئادەمیزاددا بە نیعمەتی پۆشاک‌و ئامێری خۆ جوان کردن، بەڵگەی بەهێزە لەسەر ئیباحەو حەلاڵیەتی‌و هەڵنانی موسوڵمانان بۆ پۆشینی، چونکە ئایینی ئیسلام ئاینێکە لەگەڵ سروشت گونجاوە ئایینی فیترەتە، لە ئایینی ئیسلامدا شتێك نیە سروشت‌و فیترەتی ئادەمیزاد داخوازی بێ ئەو قەدەغەی بکا؛ هەرشتێك پێویست بێ بۆ ژیانی ئادەمیزاد ئیسلام هەرگیز قەدەغەی ناکا، بەڵکوو سنووری بۆ دادەنێ‌و لە چوارچێوەی شەریعەتی پەسەندی خوداییدا بەکاری دەهێنێ‌و بە رەوای دەزانێ.

هەر کاتێ مرۆڤ پۆشاکێکی تازەی لەبەر کرد سوننەتە سوپاسی خودای لەسەر بکا. ئیمام ئەحمەد لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی لە پێغەمبەرم ژنەوت لەکاتی لەبەر کردنی پۆشاکدا دەیفەرموو: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي رَزَقَنِي مِنَ الرِّيَاشِ مَا أَتَجَمَّلُ بِهِ فِي النَّاسِ وَأُوَارِي بِهِ عَوْرَتِي».

ئەمجار پەروەردگار پۆشاکی مەعنەوی پاساو دایەوە بەسەر پۆشاکی ماددیدا فەرمووی: ﴿وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ بەگوتەی کۆمەڵی تابعین، پۆشاکی تەقوا پۆشاکی مەعنەوییە نەك حیسسی!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پۆشاکی تەقوا بریتییە لە ئیمان‌و کردەوەی باش لە پۆشاکی رواڵەتی چاکترە.

عەبدولرەحمانی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: موسوڵمان لە ترسی خودا شەرمگای دادەپۆشێ ئەوە پۆشاکی تەقوایە. کەوابێ لە نێوان تەشریع دانانی بۆ پۆشاك‌و خۆڕازاندنەوەو لە نێوان تەقوادا پەیوەندی بەهێز هەیە، تەقواو پۆشاك هەردووکیان داپۆشەری شەرمگان، تەقوا عەیب‌و عاری دڵ‌و دەروون دادەپۆشێ‌و دەیرازێنێتەوە، پۆشاکیش شەرمگای جەستە دادەپۆشێ‌و جوانی دەکا.

﴿ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ ئەوەی باس کرا لە دروست کردنو بەدی هێنانی مادده خامەکانی پۆشاك، لە دانانی یاساو شەریعەتی پۆشینی پۆشاك نیشانەی بە دەسەڵاتی خودایەو فەضلو گەورەیی زاتی پەروەردگار دەچەسپێنێ، نیشانەی رەحمو بەزەیی یەزدانە بۆ بەندەکانی، پەروەردگار ئەم نیعمەتانەی پێ بەخشیون بۆ ئەوەی بیانماڵێنێو رامیان بکا بۆ سوپاسگوزاریو شوکرانە ژمێری زاتی پەروەردگارو ناسینی نیعمەتە گەورەکانی بەسەر بەندەکانیداو دوورکەوتنەوە لە فیتنەی شەیتانو بەدەرخستنی شەرمگاوو خۆ رووت کردنەوەی ناشەرعی.

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزادانی لە فرتو فێڵی شەیتانو تاقمەکەی ترساندو ئەوەی بۆ روون کردنەوە کە شەیتانو شەیاتینییەکان دوژمنی سەرسەختی ئادەمیزادنو ئەم دژایەتییەی شەیتان دژایەتییەکی کۆنو دێرینەیەو لەسەردەمو کاتو ساتی دروستبوونی ئادەمەوە دەستی پێ کردووە! ئەوەبوو فەرمانی خوداى شکاندو سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد، دوایی هەوڵی دا بۆ وەدەرنانی ئادەمو حەوا لە بەهەشتو تووشبوونیان بە زۆر مەینەتیو تەنگو چەڵەمە.

بۆیە جارێکی تر پەروەردگار خیطابی خۆی ئاراستەی نەوەی ئادەم کردەوەو فەرمووی: ﴿يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ﴾ ئەی نەوەی ئادەم بێ ئاگا مەبن لە نەفسی خۆتانو هەمیشە ئاگاداری بکەنو مەهێڵن شەیتان فرسەتتان لێ بێنێو بە وەسوەسەو فرتو فێڵ تووشی ئەنجامدانی تاوانتان بکا وەکوو لەوە پێش باوکە ئادەمو دایکە حەواتانی بەهەمان فرتو فێڵ هەڵخلیسکاندو تاوانی پێ ئەنجام دانو لە بەهەشت دەرکرانو تووشی جۆرەها نارەحەتیو ماندووبوون هاتن، هەر شەیتان بوو: کە بوو بەهۆی دەرکەوتنی شەرمگایان!! کە لەوەپێش لێیان شاراوە بوو ﴿يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا﴾ لە بەهەشت وەدەری نانو بوو بە هۆکاری دارنینی پۆشاکیان؛ ئەو پۆشاکەی کە لە پەلکە گەڵای بەهەشت پێکیان هێنا بوو، پۆشاکیان لێ دارندرا بۆ ئەوەی شەرمگای یەکتری ببینن!!

(لام) لە وشەی (لیریهما)دا (لام)ی عاقیبەتی پێ دەگوترێ واتـە: بۆ ئـەوەی لـە ناکاما شەرمگای یەکتری ببینن، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئادەمو حەوا لەسـەر زەوی بە رووتو قووتی ژیاون چونکە ئەو کاتە لەسەر زەوی پۆشاك نەبووە!!

خۆتان بپارێزن لە شەیتانو جەندرمەکانی ﴿إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُـهُ مِـنْ حَيْـثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ﴾ شـەیتانو سـەربازانی، ئێـوە دەبیـنن بـەڵام ئێـوە ئـەوان نـابینن، زیـان پـێ گەیشتن لە دوژمنێکەوە کە نەیبینی زۆرترو کوشندەترە لە دوژمنێك کە ببینیێ.

خۆپاراستن لە شەیتان بە پەناگرتن بە خودا دەستەبەر دەبێ بە بەهێز کردنی ئیمان بە خوداو پیوەندی کردن پێوەیو بە جەنگان لەگەڵ نەفسو گوێ رانـەگرتن بۆ وەسوەسەو دەنەدەنەی شەیتانو هەوڵدان بۆ پاك کردنەوەی نەفسو مشتو ماڵ کردنی دڵو دەروون دێتە کایەوە!

ئەمجار ترساندنەکەمانی لە شـەیتان دووبـارە کـردەوەو فـەرمووی: ﴿إِنَّـا جَعَلْنَـا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُـونَ﴾ ئێمـە شـەیاتینەکانمان کـردوون بـە یارمەتیـدەرو پشتگیریکەری کافرو بێ بڕواکان، بەم جۆرە ئامادەباشییان تێدایە بۆ قبووڵ کردنی وەسوەسـەی شـەیتان وەکـوو چۆن جەسـتەی لاواز ئامادەباشـی تێدایـە بـۆ نـەخۆش کەوتنو وەرگرتنی میکرۆب.

**تێبینی**:

ئایەتی ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ﴾ ئـەوە دەگەیـەنێ کـە داپۆشـینی شـەرمگا واجبـەو دەرخـستنی یاسـاغە. چـونکە ئایەتەکـە دەفـەرموێ: ﴿يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ﴾ واتە: پەروەردگار پۆشاکی داهێناوە بۆ ئـەوەی ئـادەم بـۆ ئـەوەی شـەرمگای خۆیـانی پـێ داپۆشـن، زانایـانی ئیـسلامیش بەیـەك دەنـگ داپۆشـینی شەرمگایان بەلاوە پێویستە! کەس نیە بڵێ: دروستە ئـادەمیزاد شـەرمگای خـۆی بـۆ خەڵکی نامۆ دەربخا.

ئەمجار با بزانین شەرمگا چییەو کوێ دەگرێتـەوە؛ زانایـانی ظاهیریو ئیمـامی طـەبـەری پێیـان وایـە شـەرمگای پیـاو تـەنها پـاشو پێـشیەتی واتـە: (هـێنو بیلاماناکەی) جگە لەم دووانە شوێنەکانی تری جەستە شەرمگا نین چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ﴾ یان دەفەرموێ: ﴿بَدَتْ لَهُمَـا سَـوْءَاتُهُمَا﴾. یـان

دەفەرموێ: ﴿لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا﴾. لە هەموو دەقەکانـدا هەر باسی (پاش‌و پێشی) کردووە. هەروەها ئیمامی بوخاری لە ئەنەسەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە کۆڵانەکانی خەیبەردا راکردنی ئەنجامدا. لەو دەقە هاتووە دەفەرموێ: «ثُمَّ حَسَرَ الإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ النَّبِيِّ (دروودی خوای لەسەر بێ)». واتە ئیزارەکەی لەسەر سمتی کۆکردەوەو بە جۆرێك من بە ئاشکرا سپیایی رانی پیرۆزیم بینی.

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: ناوك شەرمگایە، بەلامەوە جوان نیە پیاو رانی خۆی بە ئاگاداریی خێزانی دەربخا! بەڵگەی مالیك فەرموودەیەکی پێغەمبەرە کە بە (جەرهەدی کوڕی خومیلیدی) فەرموو رانت داپۆشە چونکە ران شەرمگایە. (بوخاری ئەم فەرموودەیەی بە شێوەی تەعلیق ریوایەت کردووە) ئەمجار بوخاری گوتوویەتی حەدیثی ئەنەس راست‌تره حەدیثی جەرهەد ئیحتیاتی پترە. مەبەستی ئەوە بوو لە خیلافەکە خۆی رزگار بکا.

کەوابێ بەلای مالیکییەکانەوە ران شەرمگا نیە، چونکە رۆژی خەیبەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدەری خست، بەڵام بەلایانەوە مەکرووهە لەبەر حەدیثەکەی جەرهەد. ئەبو حەنیفە پێی وایە ران شەرمگایە.

شافیعی پێی وایە ئەژنۆو ناوك شەرمگا نین بەلا داپۆشینیان واجبە لەم رووەوە هەرشتێك واجبی پێ تەواو ببێ واجبە. بەلای زۆربەی زانایانەوە ئافرەتی سەربەست‌و ئازاد جگە لە دوو دەستی‌و دەم‌و چاوی هەموو جەستەی شەرمگایە. چونکە زۆربەی فوقەها دەفەرموون: کەسێك بیەوێ ژن بخوازێ‌و مارەی بکا با لە پێشدا تەماشای دەم‌و چاو هەردوو دەستی بکا. هەروەها چونکە لەکاتی ئیحرامدا پێویستە ئەم دوو ئەندامەی بەدەرەوە بن.

فەرموودەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە ئادەمیزاد جندۆکەو شەیاتینی نابینن ئیمامی ئەحمەدیش حەدیثێکی ریوایەت کردووە مانای ئایەتەکە جەخت دەکاتەوە دەفەرموێ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِى مِنِ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ». لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەو جندۆکانەی نەبینیون کە گوێیان لە قورئان خوێندنەکەی

گرت. بەلگەش ئایەتی ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ – الجن/١﴾ە بەلام لە ئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت کراوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بینیونی. فەرموودەی تریش هەن ئەوە دەچەسپێنن کە دیتوونی، شافیعیش پێی وایە: کە بینینیان تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە... بەیهەقی لە مەناقیبەکەی لە هاوەڵی خۆی ئیمامی رەبیعەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی هەر کەسێ بڵێ جندۆکەم بینیون شەهادەتی لێ وەرناگرین مەگەر پێغەمبەر بێ، دیتنیان تەنها بۆ پێغەمبەران دەستەبەر دەبێ.[1]

## شەریعەتی موشریکەکان لاسایی کردنەوەی باوك‌و باپیرانیانە، شەریعەتی خودا نیگا ناردنە بۆ پێغەمبەرەکانی

﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

[1] – تفسير المنار ج/٨/٣٦٨.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی باس کرد کە شەیاتینی کردوونە هاونشینی کافرەکان‌و بالادەستی کردوون بەسەریاندا، ئەمجار لێرەدا باسی جۆرێك لە کاریگەری بالادەستی شەیاتینییەکان دەکا بەسەر نا موسوڵمانانداکە گەردنکەچی‌و فەرمانبەرداریانە بۆ وەسوەسەو سەر لێ تێکدانیان‌و دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً﴾ ئەو موشریك‌و گومڕایانە کە تاوانێکی گەورەو ناشیرین ئەنجام دەدەن، تاوانێکی وا دەکەن کە شەرع‌و عەقڵ‌و سروشتی ساغ‌و سەلیم بە هیچ شێوەیەك وەری نەگرێ وەکوو: تەواف کردنی ژن‌و پیاو بە رووت‌و قووتی‌و هەموو تاوانێکی تری گەورەو فاحیشە ئاسا، پێیان بگوترێ بۆچی‌و بە چ پاسایەك ئێوە ئەو تاوانانە دەکەن‌و بە رەوایان دەزانن؟ ئەگەر لەسەر کردەوەکانیان خەڵکی سەرزەنشتیان بکەن، ﴿قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءنَا وَاللّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ دەڵێن: ئێمە لاسایی باوك‌و باپیری خۆمان دەکەینەوەو شوێن داب‌و نەریتی ئەوان دەکەوین، چاو لە ڕێبازیان دەکەین، جگە لەوەش خودا فەرمانی پێ کردووین‌و ئێمە فەرمانی خودا جێبەجێ دەکەین!!

سەیرە ئەوان بەڵگە لەسەر کاردروستی خۆیان دەهێننەوەو پاساوی کردەوە فاحیشەکانی خۆیان دەدەنەوە بە دوو بەڵگە، پێیان وایە: کردارەکانیان ڕەوان‌و بە خراپیان نازانن!

یەکەم: دەڵێن ئێمە باوك‌و باپیری خۆمان وا بینیوەو ئەمە داب‌و نەریتیان بووە.

دووەم: دەڵێن خودا فەرمانی پێ کردووین ئەم کارانە ئەنجام بدەین!

ئیتر خودای مەزن فەرمان بە پێغەمبەر دەکا کە بەرپەرچیان بداتەوەو بەڵگەی دووەمیان پوچەڵ بکاتەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ ئێوە ڕاست ناکەن، ئەم پاساو دانەوەیەتان درۆیە، چونکە خودا فەرمان بە کردەوەی فاحیشە ئامێز ناکا، ئەم کارانەی ئێوە وێ نەچووو نەگونجاوو قێزەونن، هەموو پێغەمبەران بە خراپ‌و نەشیاویان حلێب کردوون، خودای مەزن‌و بالادەست هەرگیز فەرمان بە کردنی کاری ئاوەها ناشیرین ناکا!

لە حەقیقەتیشدا شەیتان فەرمان بە کردەوەی فاحیشە ئامێز دەکا وەکوو قورئان ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ – البقرة/٢٦٨﴾.

ئەوەی تێبینی دەکرێ پەروەردگار دەربارەی بەلگەی یەکەمیان هیچ رەتدانەوەیەکی نەبووا! هۆیەکەی ئەوەیە: کە لاسایی کردنەوەی کوێرانە هێندە هەڵەیەکی ئاشکرایە پێویست بە رەتدانەوەی ناکا، هەموو کەس بە لایەوە کارێکی ناپەسەندە!!

ئەمجار پەروەردگار بە پرسیارکردنێکی نارەزامەندی ئامێزەوە پێیان دەفەرموێ: ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەرێ ئێوە بە چ روویەکەوە شتی ئاوا پاڵ خودا دەدەن؟ شەرمو حەیا ناتانگرێ بوختانی ئاوا بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن؟ شتێك کە حەقیقەتو راستییەکەی نازانن بۆ دەڵێن: خودا فەرمانی پێ کردووین؟ خۆ شەریعەتو فەرمانی خودا بە نیگا کردن بۆ پێغەمبەران نەبێ نازاندرێ، لە رێگەی نیگای خوداوە بۆ پێغەمبەرانی نەبێ ئادەمیزاد لە شەریعەتی یەزدان تێ ناگەن! دەی خۆ ئێوە بە ختوکەو دەنەدەنەی شەیتان رەفتار دەکەن درۆ لەسەر خودا هەڵدەبەستن!

ئایەتەکە دەربڕینی نارەزایی بەرامبەر ئەوانەی فەرمانکردن بە کردنی فاحیشە پاڵ پەروەردگار دەدەن، گوێڕایەڵی بۆ شەیتان دەکەنو بە ئامۆژگاری ئەو تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن کەچی بێ شەرمانەو نەزانانە دەڵێن: خودا فەرمانی پێ کردووین!!

لە هەمان کاتیشدا شایەتی دانە لە لایەن پەروەردگارەوە کە بناغەی قسەکانیان گێلیو نەفامییە، هۆی کەودەنیو بێ عەقڵییانە کە ئەو کردارە ناشیرینانە پاڵ خودا دەدەن! ئەمجار پەروەردگار ئەوەی رەت کردەوە کە فەرمان بە فاحیشەو خراپەکاری بکا، رووی خیتاب دەکاتە پێغەمبەرو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانە بڵێ: پەروەردگاری من فەرمان بە فاحیشەو خراپەرکاری ناکا، بەڵکوو فەرمان بە دادپەروەریو کاری چاكو سوودمەند دەکا، داوا دەکا ئادەمیزادان کاری چاك ئەنجام بدەنو میانەڕەوو بەردەوام بن لەسەر

کاری چاكو زێدەڕەوی نەکەن. فەرمانتان پێ دەکا کە: نە خۆتان رووتو قووت بکەنەوە، نە بەرگو پۆشاکی حەرامو زێدە درێژو زێدە پانو گرانبەها لەبەر بکەن.

﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ هەروەها ئەی محمد! پێیان بڵێ: لە ناو هەموو مزگەوتێك کە خواپەرستی تێدا دەکەن مافی روو تێ کردنتان بۆلای خودا بدەن، بەتەواوی روو تێ کردنەکە ئەنجام بدەن؛ نیەتی ساغو دڵئاگایی‌و لێبڕان بۆ روو تێ کردن لە پەروەردگارتان هەبێ، چ ئەو عیبادەتەی کە لە مزگەوتەکە یان لای مزگەوتەکە ئەنجامی دەدەن نوێژ بێ یان تەواف بێ یان ذیکرو خواپەرستییەکی تر بێ، دەبێ ساغ بۆ خودا بێ!

﴿وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ هاوارو پاڕانەوەو عیبادەتتان تەنها بۆ خودا بێ، هەر ئەو بپەرستن‌و روو لە بارەگای زاتی ئەو بکەن، روو مەکەنە غەیری خوداو کەسی تر جگە لە پەروەردگار بە شایستەی پەرستش مەزانن، هاوارو پاڕانەوە مەکەنە فریشتەو پیاوچاكو پێغەمبەران‌و پێتان وابێ پاڕانەوە لەوان‌و گۆڕەکانیان لە خواتان نزیك دەکاتەوە وا مەزانن پاڕانەوە لە شێخو پیاوچاكو گۆڕەکانیان بەشێکە لە ئایین‌و سوود بەخشە!!.

پاش ئەوەی بنەمای ئایینی دیاری کردو فەرمان‌و جڵەوگیری ئاراستەی پێغەمبەرو موسوڵمانان کردو نارەزایی خۆی دەربارەی هەڵوێستو کردەوەی موشریکەکان دەربڕێ، باسی زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو پاداش‌و سزا دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ، فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ﴾ وەکوو چۆن لەسەرەتاوە خودا ئێوەی دروست کردووە ئاواش بۆلای خودا دەگەڕێنەوە، واتە: هەر بەو دەسەڵاتە زیندووتان دەکاتەوە کە سەرەتا کاروانی ژیانتانی دەست پێ کرد...

دوو پێڕو تاقم بوون؛ ئادەم‌و خێزانی، شەیتان‌و جەندرمەکانی، کە دەشگەڕێنەوە بۆلای خودا کۆمەڵێکتان لەگەڵ ئادەم‌و دایکە حەواو موسوڵمانان‌و راستاڵانی خاوەن باوەڕو شوێنکەوتووانی پێغەمبەران‌و گەردنکەچ بۆ فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار، کۆمەڵێکیشتان سەرپێچیکارو تاوانبار لەگەڵ شەیتان‌و جەندرمەکانی دەگەڕێنەوە بۆلای خودا ریسواو شەرمەزار! کۆمەڵێکتان

خــودا هیدایــەتی داونو ڕێبــازی خوداتــان گرتــووە، یــا پابەنــدی فــەرمانو جڵەوگیرییەکانی بوون.

کۆمەڵێکیشتان گومڕاییـان بەسـەردا دەچەسـپێو چەسـپیوە، ئەوانـە شـەیتانیان کـردووە بـە پێـشەواو شـوێنی کـەوتوون، ئـەویش بـەرەو دۆزەخ ڕاپێـچیان دەکـا، بەراستی شەیتان ڕابەرو پێشەوایەکی خراپو گومڕاکەرە.

خـاوەنی تەفسیری (المنـار) دەفـەرموێ: ئـەم ڕسـتەیەی ئایەتەکـە بـەلیغترینو کـورتبڕترینو سەرئاسـاترینی قورئانـە، چـونکە دەعوایەکـە بەڵگـەی لێکـچواندنی زیندوبوونەوەی قیامەتی بە دروستکردنی سەرەتای ئادەمیزاد لەخۆ گرتـووە، واتـە: پـەروەردگار چـۆن سـەرەتا بەدەسـتەڵاتو تـوانی خـۆی دروسـتی کـردوونو بـەدی هێناون ئاواش دوای مردن زیندووتان دەکاتەوەو ڕۆژی قیامەت دەگەڕێنـەوە بـۆلای، بەڵام لەم حاڵەتانەدا دوو تاقمو کۆمەڵن:

١- کۆمـەڵێکتان خودا لە جیهانـدا بـەهۆی نـاردنی پێغەمبـەران هیدایـەتی داونو بڕوایان هێناوەو شوێن پەیامی پێغەمبەران کەوتوونو بە ڕاستی ڕوویـان لـە خـودا کردووە ڕاستاڵانە خودایان پەرستووەو کەسیان نەکردووە بە هاوەڵو هاوشانی.

٢- کۆمەڵێکیـشتان گـومڕایی لەسـەر چەسـپیوەو شـوێن شـەیتان کـەوتوونو گومڕای کردوونو لە ڕێگای خـودا لای داون، هـەموو تـاقمو کۆمـەڵێکیش لەسـەر چ ئایینێك ژیاوە لەسەر ئەوە دەمرێو لەسەر ئـەوە زینـدوو دەکرێتـەوە مانـای ﴿حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ﴾ واتـە: گومڕاییـان چەسـپیوە بـەهۆی چەسـپینی هۆکـارە کـردارە ناپەسەند ئامێزەکانیان، بە ویستی خۆیان هۆکاری گومڕابوونیـان پـەیڕەو کـردووە، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾ واتـە: ئەوانـە کـە گوێڕایـەڵی ئامۆژگـاری شـەیتان بـوونو ئـەو تـاوانو خراپەکارییـەی لـە پـێش چـاوان جـوان کـردو لـە دڵیـان شـیرین بـوو مانـای وایـە کاروباری خۆیان داوەتـە دەست شـەیتانو ئـەویان کـردووە بـە فەرمانـدەو گـەورەی خۆیانو وازیان لە پەروەردگاری زاناو داناو بەڕەحمو بەخشندە هێناوە؛ ڕوویان لـە ئەو خودایە وەرگێڕاوە کە فەرمان بە دادپەروەریو چاکەکاری دەکا جڵەوگیریی لـە خراپەو فاحیشە دەکا!

کەچی وێڕای ئەم بەهەڵە چوونو تاوانکارییەیان پێیان وایە ئەوان ڕێنموونی کراونو هیدایەت دراونو وادەزان ئەوەی کە شەیتان بە گوێیاندا دەدا ڕاستەو پێویستە پەیڕەوی بکەن!

ئەوانە ڕوو کردنە غەیری خوداو نوزانەوەو پاڕانەوە لە قسنو گۆڕی پێغەمبەرانو پیاوچاکان بە ئومێدی ئەوە لە خودایان نزیک بکەنەوە بە ئایینو خوداپەرستی دەزانن‌و، پێیان وایە کە ئادەمیزاد تاوانێکی کرد پێویستە هانا بۆ گۆڕی پیاوچاکێك بەرێو ئەو ئێسکە ڕزیوانە بکاتە تکاکار بۆ ئەوەی خودا لێی خۆش بێ، واتە: ئەوانە وا دەزانن: خودا وەکوو پاشایەکی ستەمکار وایە تا یەکێك لە پیاوە نزیكو دارو دەستەکان نەبێتە تکاکارو داوای لێبوردن بۆ تاوانبارێك نەکا لێی خۆش نابێ. سەیرە! خودا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ – غافر/٦٠﴾ بانگم لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە، یان دەفەرموێ: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ – ق/١٦﴾ ئێمە بۆ هەر ئادەمیزادێك لە ڕەگی لامل لێی نزیکترین، یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ – الحديد/٤﴾ خودا لەگەڵ ئێوەیە لە هەرشوێنێك بن، دەهاو سەدەها ئایەتی لەم جۆرە هەن کەچی ئەو خەڵکە گێلو نەفامانە دەچن لە دەوری گۆڕێك دەست دەکەن بە پاڕانەوەو نوزانەوە بە هیوای ئەوە ئەو ئێسکە ڕزیوانە هاواریان بگەیەننە خوداو شەفاعەتیان بۆ بکەن!! - خودایە هاوار: بە هانامانەوە وەرەو لەسەر ڕێبازی ڕاستو دروستی خۆت دڵمان بچەسپێنە – نەمانخەیتە ڕیزی ئەوانەی گومڕانو پێیان وایە: هیدایەت دراون!

سەیرە زۆربەی تاقمو گرۆهە گومڕاکانی دونیا لە کۆنو نوێدا پێیان وایە: لەسەر حەقن، ئەوانەیان لە ڕووی لوتبەرزیو سەرڕەقییەوە کافرو بێ بڕوان بەرامبەر بە حەق، وەکوو ئەوانەی دژایەتی پێغەمبەریان کردووە لەسەردەمی خۆیاندا،، ئەوەتا فیرعەونو تاقمەکەی کە نۆ موعجیزەی حەزرەتی مووسایان بینی، وتیان: سیحرو جادویەکی ئاشکرایە... سوور دەیانزانی کە ئەو موعجیزانە لە خوداوەن بەڵام موشریکەکان لەبەر لوتبەرزیو خۆبەزلزانی پشتیان لێ هەڵکردو بڕوایان پی نەکرد! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ – النمل/١٤﴾. هەروەها وەکوو ملهوڕو سەرانی

قورەیش – ئەبو جەهل – وەلیدی کوڕی موغیر – ئەلنەضری کوڕی ئەلحاریث – و زۆری تریش کە خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ئەی محمد! ﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ – الأنعام/٣٣﴾.

ئەم تاقمو گروّ کافرانەی ئەم تاقمو گروّ کافرانەی کە لەبەر لوتبەرزی ئیمانیان نەهێناوەو کۆمەڵو تاقمێکی کەمن لە چاو ئەوانەی کە لە ڕێگای لاسایی کردنەوەی کوێرانەو شوێنکەوتنی وەسوەسەی شەیتانەوە کافر بوون... ئەوانەی کە خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا، الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا – الكهف/١٠٤﴾. زوربەی زانایان پێیان وایە: کەسێك هەوڵو کۆشش بدا بۆ دۆزینەوەی ڕێبازی حەق، دوایی شتێکی بە حەق زانیو شوێنی کەوت ئەم ڕێبازەی کە ئەم بەحەقی دەزانی جیاوازبێ لەگەڵ پەیامی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەر مانای ئەم ئایەتە ناکەوێ، لای خودا بەهانەی هەیەو مەعذورە، چونکە ئەو هەوڵی خۆی داوەو وزەی خۆی بە خەرج داوەو خوداش دەفەرموێ: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا – البقرة/٢٨٦﴾.

هەندێ لە زانایان ڕستەی ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾ نیان بەم شێوە مانا کردووە چۆن لەسەرەتاوە دروستمان کردوون؛ کۆمەڵێکتان هیدایەت دراو کۆمەڵێکتان گومڕا، هەر بەو شێوە دروست دەکرێنەوە!!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پەروەردگار ئادەمیزادی دروست کردووە، هەیانە بە موسوڵمانو خاوەن باوڕ، هەیانە بە کافری دروستی کردوون، پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ – التغابن/٢﴾. پاشان زیندوویان دەکاتەوە هەیانە موسوڵمانە هەیانە کافر.

ئەم ڕایە لەگەڵ ئەو فەرموودەی کە بوخاری لە ئیبنو مەسعوودەوە ڕیوایەتی دەکا یەك دەگرێتەوە کە دەفەرموێ: «فَوَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ، إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا».

بە گوێرەی ئەم تەفسیرە دژایەتییەك لەنێوان ئایەتی ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾و ئایەتی ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا – الروم/٣٠﴾. دێتە كایەوە، فەرموودەیەكیش ئەبو هورەیرە ریوایەتی دەكاو لە صەحیحەیندا هەیە، پشتگیری ئایەتەكەی سوورەتی (الروم) دەكا دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ». پێكەوە گونجاندنی ئەم دوو ئایەتە ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ....﴾و ئایەتی ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ....﴾ بە تێبینی ئەوەش كە هەر ئایەتێك لەو دووانە حەدیثێك پشتگیری دەكا. بەم جۆرە دەبێ بڵێین: پەروەردگار سروشتی ئادەمیزادانی لەسەر خودا ناسینو یەكتاپەرستی وا دارشتووەو عەهدو پەیمانی لێ وەرگرتوون.

ئەمجار كە بەم شێوە سروشتی دارشتوونو دروستی كردوون، وای ئەندازە كێش كردوونو لە عیلمی ئەزەلی خۆیدا زانیویەتی كە كۆمەڵێكیان خاوەن باوەڕ دەبنو كۆمەڵێكیان كافر، تاقمێكیان كامەرانو خۆشبەختو دەستەیەكیان بەدبەختو چارەڕەش، پەروەردگار زانیویەتی كە گۆڕانكاری بەسەر ئەو فیطرەتو سروشتە ئەصلییەیاندا دێ كە لەسەری دروست كراون، هەندێكیان لە حاڵی دووەمیاندا لەسەر ئەو سروشتە نامێننو دوای ئیمان هێنان كافری هەڵدەبژێرن!

## ئایەتەكان راستەوخۆ ئەوە دەگەیەنن كە:

١- لاسایی كردنەوەی كوێرانەی باوكو باپیران پەسەند نیە عەقڵو سروشت رەتی دەكاتەوە، چونكە پەروەردگار هێزێكی تایبەتی بە ئادەمیزاد داوە دەتوانێ بەهۆی عەقڵ جیاوازی نێوان حەقو بەتاڵ بكا، بڕوانێو تێبفكرێ ئەگەر باوكو باپیرانی لەسەر رێگای راست بوون با شوێنیان بكەوێ، ئەگەر گومڕا بوون پێویستە لە رێبازیان دوور بكەوێتەوەو واز لە لاسایی كردنەوەیان بێنن ئەگینا نەفامو نەزانو لەسەر هەڵەن.

٢- پەروەردگار فەرمان بە دادوەریو بەردەوام بوون لەسەر چاكە كردن دەكا، هەرگیز خودا فەرمان بە خراپەكاری ناكا!

٣- پێویستە موسوڵمان لەكاتی خوداپەرستیدا دوو خاڵ بەرچاو بگرێ:

أ- دەبێ خوداپەرستییەکەی بە گوێرەی شەریعەت بێ.

ب – دەبێ خوداپەرستییەکەی لە دیاردەی هاوەڵدانان بۆ خودا دووربێ، خوداپەرستییەکەی تەنها بۆ خودا بێ خاڵصانەو راستاڵانە بێ!.

٤- پەروەردگار زیاد لە ئیمانو باوەڕە سروشتییەکە بۆ موسوڵمانان هیدایەتو تۆفیق زیاد دەکا، سەرباری یەکتاپەرستیو ناسینە فیطریەکەی، موسوڵمان بەهۆی کردەوەی چاك ئیمانو باوەڕی زیاد دەکا! هەروەکوو چۆن بەهۆی وەسوەسەو دەنەدەنەی شەیتان کۆمەڵێك لە ئادەمیزاد گومڕا دەبن.

## لەبەرکردنی پۆشاکی جوانو خواردنو خواردنەوەی خۆش حەڵاڵە

﴿ ۞ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ (٣١) قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ (٣٢) ﴾ .

پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بە بەندەکانی کرد بە دادپەروەریو عەداڵەتخوازیو بەردەوام بوون لەسەر چاکە لە هەموو ئیشێکدا داوامان لێ دەکا کە لەلای هەموو مزگەوتێکو بۆ هەموو خوداپەرستییەك پۆشاکی پاكو خاوێن بپۆشین... هەروەها خواردنو خواردنەوەی بۆ حەڵاڵ کردووین بەمەرجێك زێدەڕەوی تێدا نەکەین.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: عەرەبەکانی سەردەمی نەزانی بە رووتی تەوافی کەعبەیان دەکرد؛ پیاوان بە ڕۆژو ژنان بە شەو، جا کە دەگەیشتە لای مزگەوتی

مینا پۆشاکەکانیان فڕێ دەداو بەڕووتی دەچوونە ژووری مزگەوتەوەو دەیان گوت ئێمە لە پۆشاکێکدا تەواف ناکەین تاوانمان پێوە کردبێ!

ئیمامی موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئافرەتی سەردەمی نەزانی تەوافی کەعبەی دەکرد بە رووتو قووتی تەنها پارچە پەڕۆیەکی دەخستە سەر (بیلامانەکەی)، لەکاتی تەوافدا بە رووتی ئەم شیعرەیان دەخوێندەوە:

الْيَـوْمَ يَبْـدُو بَعْـضُهُ أَوْ كُلُّـهُ فَمَـا بَـدَا مِنْـهُ فَـلاَ أُحِلُّـهُ

ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێو ئەم دیاردانەی یاساغ کردن!

هەر ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە عورووەوە ریوایەت دەکا کە دەفەرموێ: عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانیدا جگە لە قورەیشییەکان تەوافی کەعبەیان بە رووتی ئەنجام دەدا. قورەیشییەکان کە نازناوی (الحمس)یان بۆ خۆیان دانابوو[1]. ئەوان بە پۆشاکەوە تەوافیان دەکرد، خێڵە عەرەبەکانی تر بە رووتی تەوافیان دەکرد مەگەر قورەیشییەکان پۆشاکیان پێ بدانایە! پیاو پۆشاکی بدایە بە پیاو ئافرەت بە ئافرەت.

لەلایەکی ترەوە قورەیشی (حمس)ییەکان لە موزدەلیفە دەمانەوەو خەڵکانی تر دەچوونە عەرەفات. لە سەرچاوەی تردا هاتووە دەڵێ: قورەیشییەکان دەیانگوت: ئێمە خاوەنی کەعبەین هەر عەرەبێك هات بۆ حەج دەبێت لە پۆشاکی ئێمەدا تەواف بکا کە هاتە ناوچەی ئێمە دەبێ لە خۆراکی ئێمە بخوا! کەسێك بهاتایە بۆ حەجو دۆستێکی قورەیشی نەبوایە پۆشاکی بداتێو پارەشی نەبوایە پۆشاك بە کرێ بگرێ دەبوایە یان بە رووتی تەواف بکا یان پۆشاك بکڕێ، کە لە تەوافەکەش دەبووەوە دەبوایە پۆشاکەکە فڕێ بداو کەس دەستی نەگاتێ بەم جۆرە پۆشاکە دەگوترا فڕێ دراو.

ئیتر عەرەبەکان لەسەر ئەم نەفامیو نەزانییە مانەوە هەتا پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی کردە پێغەمبەرو بانگەوازی ئیسلامی دەست پێ کرد ئەم

---

[1] – الحمس: کۆی (أحمس)ە واتە: تەند رەوو ئازاو بەغیرەت. چونکە زێدەڕەوییان لە ئاییندا کردبوو ئەم نازناوەیان هەبوو.

ئایەتانەی ناردنە خوارێ بانگدەری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بانگی راهێشتو رایگەیاند کە نابێ لەمەودوا هیچ کەس بە رووتی تەوافی کەعبە بکا.

دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! جوانیو شۆخو شەنگی خۆتان لەکاتی ئەنجامدانی هەموو تاعەتێك بنوێنن لەکاتی نوێژ یان لەکاتی تەوافدا پۆشاکی خۆتان لەبەر بکەن. مەبەست بە (زینة) پۆشاکی جوانە، کەمترین پۆشاك ئەوەیە شەرمگا دابپۆشێ، داپۆشینی شەرمگا لە نوێژو تەوافدا واجبو پێویستە! جگە لە داپۆشینی شەرمگا داپۆشینی شوێنەکانی تری جەستە سوننەتە، شەرمگای پیاو – وەکوو لە پێشەوە گوترا: نێوان ناوكو ئەژنۆیە. جەستەی ئافرەت هەمووی شەرمگایە جگە لە دوو دەستو دەمو چاو.

پۆشاك دیاردەیەکی بەرزو پیرۆزی شارستانییە، فەرمان بە داپۆشینی شەرمگا لە یاسا جوانەکانی ئیسلامە، هەر ئیسلام بوو هۆزو عەرەبو نا عەرەبی لەدواکەوتوویيو هەڵسو کەوتی ئاژەڵی رزگار کرد، حەدیثێکیش هەیە پشتگیری مانای ئایەتەکە دەکا دەربارەی پێویستی داپۆشینی شەرمگا، طەبەرانيو بەیهەقی لە ئیبنو عومەرەوە دەگێرنەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَلْبَسْ ثَوْبَيْهِ ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَحَقُّ مَنْ تُزَيَّنَ لَهُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ ثَوْبَانِ فَلْيَأْتَزِرْ إِذَا صَلَّى، وَلاَ يَشْتَمِلْ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ اشْتِمَالَ الْيَهُودِ». هەرکاتێ یەکێ لە ئێوە ویستی نوێژ بکا با دەرپێو کراسێ لەبەر بکا، چونکە پەروەردگار لە هەموو کەس شیاوترە کە لەکاتی خۆ ڕانواندنو راوەستان لە خزمەتیا پۆشاکی پاكو خاوێنو جوانی بۆ لەبەر بکرێ، کەسێك دوو پۆشاکی نەبوو با بە لایەنی کەمەوە دەرپێ لە پێ بکا...

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی ئاراستەی ئادەمیزادان کردو پێی راگەیاندن کە خواردنو خواردنەوەی پاكو خاوێنیان بۆ رەوایە بەمەرجێك زێدەڕەوی تێدا نەکەنو فەرمووی: ﴿وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! بۆ هەر یەکێك لە ئێوە رەوایە خواردنو خواردنەوەی پاكو خاوێن بخواو بخواتەوە، دەی ئێوە لە خواردنو خواردنەوەی پاكو بەتامو لەززەت بخۆنو بخۆنەوەو زێدەڕەوی مەکەن، بەڵکوو بە شێوەیەکی مام ناوەندیو میانەڕەوی

کەڵکیان لێ وەربگرن، نە ئەوەندە کەم بخۆن کە پێداویستی جەستەتان دابین نەکا، نە ئەوەندەش زۆر بخۆن کە زیان بە جەستەو بیرو هۆشتان بگەیەنێ، رژدو بەخیل مەبن بەجۆرێك دڵتان نەیە بە گوێرەی پێویست لە ماڵی خۆتان بخۆن، ئەوەندەش دەست بڵاوو موسریف مەبن زیاد لە پێویست ماڵو دارایی خۆتان خەرج بکەن! دڵنیا بن خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە زیادەڕۆی دەکەن لە خواردنو خواردنەوەدا واتە: سزایان دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ!

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ریوایەت دەکا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا وَالْبَسُوا مِن غَيْرِ مَخِيلَةٍ وَلاَ سَرَفٍ، فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُرَى نِعْمَتُهُ عَلَى عَبْدِهِ». بخۆنو بخۆنەوە، پۆشاك بپۆشن بە شێوەیەکی میانەڕەوی نە رژدی تێدا بکەن نە دەست بڵاوی، چونکە پەروەردگار پێی خۆشە دیاردەی نیعمەتی بەسەر بەندەی خۆیەوە ببینرێ...

ئیمام ئەحمەدو نەسائیو تیرمیذی لە مەعدیکەریبەوە دەڵێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو «مَا مَلأَ ابْنُ آدَمَ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنِهِ، حَسْبُ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ، فَثُلُثٌ طَعَامٍ وَثُلُثٌ شَرَابٍ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ». ئادەمیزاد هیچ کیسەیەك پڕ ناکات خراپتر بێ لە گەدەی! بەسە بۆ ئادەمیزاد سێ پارو پشتی قایم بێو هێزو توانای بدەنێ ئەگەر هەر دەبوو بخوا با گەدەی بکاتە سێ بەش بەشێك بۆ خواردن بەشێك بۆ خواردنەوە بەشی سێیەمیش بۆ هەناسەو ئیسراحەت، برێ لە زانایانی سەلەف وتوویانە: پەروەردگار هەموو زانیاری تەندروستی لە نێو ئایەتێك دا کۆکردۆتەوە ﴿وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ...﴾ ئیسراف: واتە: زێدەڕەویو سنوور شکێنی لە هەموو شتێکدا پەروەردگار پێی خۆشە ئەوەی بە حەڵاڵی داناوە بە حەڵاڵی بزانن، ئەوەی بە حەرامی داناوە بە حەرامی بزانین، ئەو فەرمانی پێ کردووین بە میانەڕەوی، کەوابی نابێ سنووربەزێنی بکەین جا سنوور بەزێنییەکە سروشتی بێ وەکوو خۆتینو کردنوخۆ برسی کردن، یان زێدەڕەوی لە ئاو خواردنەوەو زۆر خۆریدا، یان سنوور بەزێنییەکە لە رووی ماددییەوە بێت. بەم جۆرە زیاد لە دەستکەوت خەرج بکا، یان سنوور بەزێنی شەرعی بێت بەم جۆرە پەنا بەرێتە بەر خواردنی مردارەوەبووو خوێنو گۆشتی بەرازو ئەو کوشتییانەی

بۆ غـەیری خـودا سـەردەبڕێنو لـەکاتی سـەربڕیندا نـاوی غـەیری خودایـان لەسـەر دەبـرێ... هتـد. هـەروەها خـواردنو خواردنـەوە لـە نـاو ئـامێری زێـڕو زیـودا بـە زێدەڕەوەی حسێب دەکرێو حەرامە، هەروەها لەبـەر کردنـی پۆشـاکی ئاوریـشم بـۆ پیاو بە زێدەڕەوی حلێبە. هەروەها ئەگەر پیاو لە پۆشاكو هەڵسو کەوتـدا لاسـایی ئافرەت بکاتەوەو یان بە پێچەوانەوە بەر جڵەوگیری ئایەتەکە دەکەوێو کارەکـەی زێدەڕەوییە...

**بەکورتی خواردنو خواردنەوە پێویـستیاتی ژیـانی ئـادەمیزادن، بـەڵام دوو تاقم دەربارەی خواردنو خواردنەوە سەرلێ شێواون:**

أ- تاقمی بەخیلو رژدو ئەوانەی خۆیان کردووە بە رەبەنو خەڵوەکێش ئەمانە وازیان لە خـواردنو خواردنـەوەی بـە تـامو لـەززەت هێنـاوە، بـەبێ بەڵگـە بـە نـاوی ئایینەوە ئەم شتانەیان لەخۆ قەدەغە کـردووە، یـان دڵیـان نایـەو دەسـتیان ناچێتە ماڵی خۆیان.

ب- تـاقمی دەسـت بـڵاوو موسـریفەکان ئەوانـەی زێـدەڕەوی لـە خـواردنو خواردنەوە دەکەنو هەموو هیواو ئاواتیان خۆش رابواردنو خواردنو خواردنـەوەی شتی خۆشە، وەکوو ئاژەڵ دەلەوەڕێنو کۆ لە هیچ ناکەن هیچ سنوورێك بـۆ خۆیـان دانانێن.

ئەمجار پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانە دەکا کە بـەبێ بەڵگـەو بـەبێ هـۆ شـتی حەڵاڵ لە خۆیان یاساغ دەکەنو فەرمان بە پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەر بـێ) دەکا: کە بەشێوەی پرسیاری ئینکاری ئـامێزو نـاڕەزایی دەربـڕین بـەو موشـریکانە بڵێ: کە لـە خۆیانـە بـەبێ بەڵگە شتی پاكو خـاوێن لـە خۆیـان قەدەغـە دەکـەن دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ پێیان بڵێ: کـێ ئـەو کـەلو پـەلو ئـامێرو کاڵایانـەی دەبنـە هـۆی جوانی ئێـوە یـان ئـەو رزقو رۆزییـەی خـودا بـۆ بەرژەوەنـدی ئێـوە دروسـتی کـردووە، بـە حـەرام دانـاوە؟؟ کـێ پۆشاكو ئامێری رابواردنو خۆشگوزەرانی قەدەغە کردووە؟! کـێ مـاددە خامـەکانی ئەو هۆکارو ئامێرانـەی بـەدی هێنـاون کە دەبنـە مایـەی خۆشگوزەرانی ئێـوە؟ کـێ عـەقڵو زانیـاریو شـێوەی بـەکارهێنانو سـوود بیـنین لـەو ماددانـەی فێـری ئێـوە

کردووە؟ واتە: خواردنو خواردنەوەی حەڵاڵو پاكو خاوێن، هەروا لەبەر کردنی پۆشاكو خۆڕازاندنەوەو ڕێكو پێکی حەڵاڵو ڕەوایەو خودا بۆ بەرژەوەندی ئێوە مادده خامەکانی بەدی هێناوەو عەقڵو زانیاری بەکارهێنانو سوود لێ بینینیانی فێر کردوونو خیطابی ئاراستە کردوون کە بە میانەڕەوی بەکاریان بێننو سوودیان لێ وەربگرن!! جا ئەگەر کافرەکان وەڵامیان نەبوو، یان وەڵامەکەیان وەکوو پێویست نەبوو ﴿قُلْ هِي لِلَّذِينَ آمَنُواْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ بڵێ ئەو خواردنو خواردنەوە بەتامو خۆشانە، پۆشاکی جوانو ئامێری خۆڕازاندنەوە تایبەتە بۆ بڕواداران، لە ڕاستیدا خودا بۆ ئەوانی دروست کردوونو ناموسوڵمان بەهۆی ئەوانەوە سوودیان لێ دەبینن، جا ئەگەر لە ژیانی دونیادا کافرەکان هاوبەشی خاوەن بڕواکان دەکەن لەو خۆشیو ڕابواردنو خواردنو خواردنەوەیەدا ئەوە با بزانن لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ڕابواردنو خۆڕازاندنەوەیە تایبەتە بە بڕوادارانەوە، کەس لە کافرەکان هاوبەشییان ناکا، چونکە بەهەشت لە بێ بڕوایان قەدەغەیە ﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ بەم جۆرە شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەیەی کە دەربارەی ڕزقو ڕۆزیو پۆشاكو ئامێری خۆڕازاندنەوە ئەنجاممان دا هەر ئاواش نیشانەو بەڵگەکانی ڕاستی ئایینو تەواوەتی شەرعو ڕاستگۆیی پێغەمبەرو ڕێكو پێکی یاساو شەریعەت شی دەکەینەوە بۆ کەسانێك زانستی کۆمەڵناسیو دەروونناسیو تەندروستیو... هتد. دەزانن، بەرژەوەندی ئادەمیزاد دەست نیشان بکەنو هەوڵ بدەن بۆ دەستەبەر کردنی مافەکانیان، لە بوونەوەر ورد ببنەوەو پەندی لێ وەربگرن، گوێ بۆ قسەو ئاخاوتن ڕا بگرن چاكو خراپی لێك جیا بکەنەوەو شوێن قسە باشو بە سوودەکان بکەون، نەك بۆ کەسانێك کە نەفامو نەزانن ئاگاداری ئەم زانیاریو زانستانە نینو نازانن بۆ بەرژەوەندی خەڵکی بەکاریان بێنن، گوێ بە زانستو زانیاری پێویست بۆ پێشکەوتنو شارستانیەت نادەن، ئەگەر فێریشیان ببن بۆ سوودی کۆمەڵ بەکاریان ناهێنن!

بەڕاستی ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئایینی ئیسلام ئایینێکی تەواوو بێ عەیبو لەکەیە، ئایینێکی قاییمو پتەوو تۆکمەیە، لاشەو گیان بە شێوەیەکی

هاوتـەرازوو پـەروەردە دەکـا، وزە دەدا بەجەسـتەو وره دەدا بـە گیـان، بـۆ ئـەوەی ئادەمیزاد بەسەر تەنگو چەڵەمەی ژیاندا زاڵ ببێو سەرکەوتوو بێ، بتوانێ ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکا، رۆڵی خۆی – کە جێنشینییە لەسەر زەوی – وەکوو پێویست ئەنجام بدا!

ئەوەی لەم ئایەتانە تێبینی دەکرێ ئەوەیە: کە ئایینی ئیسلام بەرنامەی ژیانە، لە هەموو بوارێکدا بۆ هەموو شوێنو کاتێك یاساو نیظامی بۆ ئادەمیزاد دانـاوە، هیچ کونو کەلەبـەرێکی ژیـانی بـە بۆشـی نەهێـشتۆتەوە، بـۆ هـەموو گیروگرفتێـك حـەلی هەیـە، بـۆ هـەموو رووداوێـك بڕیـارو حـوکمی رەسـای بـێ عـەیبی هەیـە. بڕیارێـك لـەو یاسـاو نیظامـەی ئیسلام ئەوەیـە کـە پۆشـینی پۆشـاکی بـە پێویـست دانـاوە، داپۆشینی شـەرمگای لەسـەر هـەموو کـەس واجـب کـردووە، چـونکە لەبـەر کردنی پۆشاکی پاكو خاوێنو داپۆشینی شەرمگا دیاردەیەکی شارستانیو نیشانەی هەستی بەرزو سروشتی خاوێنـە، هـەروەها بـە رەوا دانـانی خـواردنو خواردنـەوەی پـاكو خـاوێنو بەلـەززەت بـە شـێوەی مـام ناوەنـدیو میانـەڕەوی بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کە ئایینی ئیسلام ئایینێکی میانەڕەوو گونجاوە بۆ هەموو کاتو شوێنێك.

داپۆشینی شەرمگا هەموو کاتێك پێویستە بەڵام لەکاتی نوێژو لـەکاتی تەوافـدا یان لەکاتی کۆبوونەوەی ئادەمیزادانـدا پێویـستترە ئایـەتی ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمْ...﴾ بـە روونی ئەوە دەگەیەنێ کـە داپۆشـینی شـەرمگا پێویـستە. زۆربـەی زانایـانی ئیـسلام پێیـان وایـە داپۆشـینی شـەرمگا فەرزێکـە لـە فـەرزەکانی نوێـژ، بـەڵکوو ئیمـامی ئەبهەری دەفەرموێ: داپۆشینی شـەرمگا بۆخـۆی فـەرزێکی سـەربەخۆیەو پێویـستە لەکاتی نوێژو غەیری نوێژدا شەرمگای خۆمان داپۆشین، ئەم رایە راسـترە چـونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کـە میـسوەری کـوڕی مەخرەمـەی بـە رووتـی بینی پێی فەرموو برۆ کراسەکەت لەبەر بکەو بە رووتی مەسوڕێرەوە.

ئایەتی ﴿وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ...﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە خـواردنو خواردنەوەی پاك حەڵاڵو رەوایە بەمەرجێك زێدەڕەوییان تێدا نەکرێ.

جەصصاص دەڵێ: ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە خـواردنو خواردنـەوە واجب بێ بەمەرجێك بە شێوەیەکی میانەڕەو بەکار بهێندرێن، جا لە هەندێ کاتو

شوێندا ئیباحە دەگەیەنێ لە هەندێ شوێندا بۆ وجوبە، لە هەرکاتێك نەخواردنو نەخواردنەوە ترسی ئەوەیان لێ نەکرا کە زیان بە جەستە بگەیەنن ئەوە ئەمرەکە بۆ ئیباحەیە ئەگەر ترسی زیان لێ کەوتنەوەیان لێ دەکرا فەرمانی ئایەتەکە بۆ وجوبە. واتە: هەرکاتی بە خۆگرتنەوە لە خواردنو خواردنەوە ترسی زیان گەیشتن بە جەستەی تێدا بوو یان بێ هێزی تێدا دروست دەبوو بەجۆرێك کە نەیدەتوانی ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام بدا ئەوە ئەوکاتە خواردنو خواردنەوە واجبە....

کەسێك شتێکی حەلاڵ حەرام بکاو بەبێ بەلگە خواردنو خواردنەوەی پاكو خاوێن یان لەبەرکردنی پۆشاکی جوانو رازاوەو خاوێن لە خەڵکی قەدەغە بکا دەچێتە پێڕی زێدەڕەوییەوە. هەروەکوو چۆن لەبەرکردنی پۆشاکی زبر نابێتە خودا پەرستیو ئەو جۆرە پۆشاکە پۆشاکی تەقواکاران نیە. بەڵکوو پیاوە زاناو خودا پەرستەکانی ئیسلام دابو نەرێتیان وابووە کە لە رۆژانی هەینیو جەژنو موناسەباتی تایبەتیدا جوانترینو پاكو خاوێن ترینو چاکترین پۆشاکیان دەپۆشی! هیچ کاتێ هەڵبژاردنی قوماشی باشو جوانیان بەلاوە ناشیرین نەبووە!

دەگێڕنەوە تەمیمی داری پۆشاکێکی کڕی بە هەزار دیرهەمی زیوو نوێژیشی پێوە دەکرد. مالیکی کوڕی دینار پۆشاکی باشی عەدەنی دەپۆشی.

بەکورتی ئایینی ئیسلام ئایینی واقیعو ژیانە ماددەو گیان پێکەوە دەگونجێنێ. ئامانجی ئەوەیە: بەهۆی بیروباوەڕو ئەخلاقو رەوشتەوە ئادەمیزاد بگەیەنێتە کەمالی مەعنەوی، لەهەمان کاتدا هەوڵی ئەوە دەدا: کە ئادەمیزاد بگاتە کەمالی ماددی جەستەی رێكو پێكو ساغو بێ دەرد پەروەردە بکا، بۆئەوەی بتوانێ ئەرکەکانی خودا پەرستی ئەنجام بدا، جیهادو تێکۆشان لە رێگەی خودادا جێبەجێ بکا، وازهێنان لە خواردنو خواردنەوە جەستە زەبوون دەکاو هێزو توانای کەم دەکاو سەرەنجام ناتوانێ ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجامبدا. ئادەمیزاد لەسەر زەوی جێنشینی پەروەردگارە، ئەمیندارو فەرمانڕەوایە بەسەر خێرو خێراتی زەویدا، بەرپرسیارە لە پێشکەوتنی وڵاتو لە ئەنجام دانی ئەرکەکانی سەرشانی لەبارەی

پێشکەوتنی وڵاتو پێشبڕکێ لە دابینکردنی پێویستییەکانی ژیانو گەشەکردنی کشتو کاڵو پیشەسازیو ئابووریو زانیاری رۆشنبیریو کۆمەڵناسی.... هتد.

## بنەمای شتە یاساغ کراوەکان لە ئادەمیزاد

﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار نارەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر بە موشریکەکان کە لە خۆیانەوە حەلاڵ حەرام دەکەن، پۆشاکی رێکو پێکو خواردنو خواردنەوەی بەتامو لەززەت بەبێ بەڵگە لەخۆیان یاساغ دەکەن! ئەمجار لێرەدا باسی جۆرەکانی حەرامو یاساغ کراوەکان دەکاو بنەماکانیان دەست نیشان دەکا.

کەلبی دەڵێ: کاتێك موسوڵمانەکان پۆشاکیان پۆشیو تەوافی کەعبەیان کرد موشریکەکان رەخنەیان لێ گرتنو لاقرتێیان پێ کردن، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ فەرمووی: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانەو خەڵکی تریش بڵێ: کە ئەوشتانەی خودا حەلاڵی کردوون ئەوان بەبێ هۆو بەڵگە حەرامیان کردوون، پێیان بڵێ: پەروەردگاری من تەنها ئەم پێنج شتانەی حەرام کردوون کە بنەمای هەموو شتە حەرامەکانن، حەرامییەکەیان بەشێوەیەکی بەردەوامو هەمە کاتییە لەسەر هەموو میللەت پێویستە کە بزانن: ئەمانە بەهیچ جۆرێكو لەهیچ شوێنێکدا حەلاڵ نینو نابن.
ئەو شتە حەرامانەش ئەمانەن:

١- فاحیشه چ بـه ئاشـکرابێ یـان بـه نهێنـی. فاحیـشه: بریتییـه لـه کـردارو گوفتارێك که لەخراپیدا تێیان پەڕاندبێ واته تـاوانی گـەورەبن وەکـوو زینـاو دزیو یاخی بوون له فەرمانڕەوای موسوڵمان.... هتد.

٢- تاوانی بچووك (اثم) بریتییه لەهەر شتێك بـەتاوان حلێـب بکرێـت نەگاتـه پلـەی تـاوانی گـەورە وەکـوو تەماشـاکردنی ئـافرەتی نامـەحرەم بەچـاوی خیانەتکارییەوە. هەندێك پێیان وایه (اثم) بەمانا تاوانه بەگشتی چ تـاوانی گـەورە بێت چ تاوانی بچوك بێ ئەوکاته عەطفی (عام)ە بۆ سەر (خاص).

٣- ستەمکاریو سنوور بەزێنی لەخراپه کاریو پێشێل کردنی مافی کەسانی تر، له ئایەتەکەدا سنوور بەزێنی پەیوەست کرد به وشەی ﴿بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ەوە واته: سنور بەزێنییەکەی بەناحەق بـێ ئەگـەر لەبـەر بەرژەوەنـدی گشتی بـوو بـه رەزامەنـدی ناحەقی لێکرابوو ئەوە بەسنوور بەزێنی حلێب ناکرێو ناحەقی نییه.

٤- شـەریك دانـان بـۆ خـودا ئەمـه گـەورەترین تاوانـەو لێخۆشـبوونی نیـه هاوەڵدانان بۆ خودا ئەوەیه: وێڕای پەرستنی خودا بتێك یان کەسێکی تر بپەرستێ. بـەبێ بەڵگـەو نیـشانەی راسـتو دروسـت، بـەبێ ئـەوەی لـەڕێگای نیگـاوە بەڵگـەی خودایەتی ئەو شتەی پێ گەیشتبێ، وەکوو له ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ – المؤمنـون/١١٧﴾. ئەمـه ئـەوە دەگەیـەنێ کـه بەڵگـەو دەلیـل بناغـەی ڕاسـتی بیروباوەڕن، هیچ ئیمانو بیروباوەڕێك پەسـەند نییـەو قبـووڵ نـاکرێ بـەبێ نیگای خودایی، بیروباوەڕ کاتێك پەسەندە که نیگای ئاسمانی گەیاندبیەتیو بەڵگەو دەلیل پشتگیری بکا.

٥- قسه هەڵبەسـتن بـەدەم خـوداوە، بـەبێ ئـەوەی بەڵگـەو زانیارییـەکی هـەبێ، بوختـان بـەدەم خـوداوە هەڵبەسـتێ ئیـدیعای ئـەوە بکـا خـودا منـداڵی هەیـه یـان خێزانو هاوەڵی هەیه، یان بەبێ بەڵگه شـتێك کـه خـودا حـەڵاڵی کـردووە حـەرامی بکا، یان به پێچەوانەوە، فتوا بەڕای خۆی بـداو تەشـریع دابنـێ، ئـەوە حـەرام بکـاو ئەمه حەرام بکا، هیچ بەڵگەو دەلیلی شـەرعیی بەدەسـتەوە نـەبێ جگـه لـه هـەواو ئارەزووبازیی خۆیو تاکڕەوی ئیدیعای نوێخوازییو ئیجتیهاد کردنو خۆگونجانـدن

لەگەڵ رۆژگاردا. رێگەی ئیجتیهاد نەبەستراوە لەهەموو کاتو شوێنێکدا دەتوانرێ ئیجتیهاد بکرێ بەڵام دەبێ مەرجەکانی بەتەواوی دەستەبەربن هەرکەسێك مەرجی ئیجتیهادو تێکۆشانو لێکۆڵینەوەی تێدا هەبوو دەتوانێ: ئیجتیهاد بکاو رای خۆی دەربڕێ ئەوکاتە: قسەو فتواکانی دەبنە شەرعو پەیرەوییان دەکرێو بەشێکن لە شەریعەتی ئیسلام.

لێرەدا پرسیارێك سەری هەڵداوەو دەگوترێ لە ئایەتەکەدا وشەی (انما) کە کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ. کەوابێ ئایەتەکەی ئێرە کە لەپێشەوە وشەی (انما) هەیەو ئینجا پێنج شتی حەرام ریز دەکا ئەوە دەگەیەنێ کە شتە حەرامەکان لەو پێنج شتانەدا کورت هەڵهێندراون. دەی خۆ جۆرەکانی حەرام زۆرنو لەو پێنج شتانە تێپەڕ دەکەن؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: جینایاتو دەستدرێژی کردن پێنج جۆرن:

یەکەم: دەستدرێژی کردنە بۆ سەر نەسەبو رشتەی خێزان کە بریتییە لە داوێن پیسیو بەشێکە لە فاحیشە.

دووەم: دەستدرێژی کردنە بۆ سەر عەقڵ کە بەهۆی عەرەقخواردنەوە پەیدا دەبێو بە (اثم) حلێبە.

سێیەمو چوارەم: دەستدرێژی کردنە بۆ سەر ناموسو گیانو ماڵو سامان ئەمەش بە رستەی ﴿وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ ئاماژەی بۆ کراوە.

پێنجەم: دەستدرێژی کردنە بۆ سەر ئایین ئەمیش بەدوو جۆر دەبێ:

یەکەمیان تانەو تەشەر دان لە یەکتاپەرستی بەم جۆرە هاوەڵ بۆ خودا دابنرێ، بە رستەی ﴿وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ﴾ ئاماژە بۆ ئەم جۆرە دەستدرێژییە کراوە.

دووەمیان دەم کوتان لە ئایینی خوداو قسە تێداکردنی بە نەزانیو بێ بەڵگە، ئەم جۆرەش بە رستەی ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئاماژەی بۆ کراوە.

کەواتە بنەماو شتە سەرەکییەکانی حەرامو یاساغ کراوەکان ئەم پێنج جۆرەن حەرامەکانی تر وەکوو لقو پۆی ئەم پێنجانە وان، باسکردنی ئەو پێنجانە بە واتا باسکردنی هەموو جۆرەکانی حەرامە. ئیتر بەکارهێنانی وشەی (انما) کە ئامێری حەصرو کورت هەڵهێنانە لەجێی خۆیدایە.

## ته‌مه‌نی ژیان‌و ده‌سه‌ڵاتی هه‌موو گه‌ل‌و تاكێك

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ (٣٤) ﴾.

پاش ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار حه‌ڵاڵ‌و حه‌رامی روون كردووه‌، پۆشاكی ره‌واو رزق‌و رۆزیی حه‌ڵاڵی ده‌ستنیشان كرد، پاشان باسی بنه‌مای شته حه‌رامه‌كانی كرد؛ ئه‌مجار لێره‌دا باسی ئه‌وه ده‌كا كه هه‌موو گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌یه‌ك، هه‌موو كۆمه‌ڵ‌و تاكێك ته‌مه‌نێكی دیاری كراوی هه‌یه‌و پاش‌و پێش ناكا! له ماوه‌ی ژیانی دا رێژه‌ی شوێنكه‌وتنیان بۆ په‌یره‌وو پرۆگرامی خودا له‌باره‌ی حه‌ڵاڵ‌و حه‌رامه‌وه ده‌رده‌كه‌وێ‌و نمایان ده‌بێ، مه‌به‌ستیش ترسی دوارۆژو له دونیا ده‌رچوونی هه‌بێ‌و لێبراوانه ئه‌ركی سه‌رشانی ئه‌نجام بدا.

فه‌رمووی: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾ بۆ هه‌موو گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌یه‌ك، بۆ هه‌موو چین‌و توێژێك، بۆ هه‌موو هۆزو بنه‌ماڵه‌و به‌ره‌باب‌و ئاده‌میزادێك، به‌ڵكوو بۆ هه‌موو شتێك له بوونه‌وه‌ردا ئه‌جه‌لێكی دیاریكراو هه‌یه، كاتێك هه‌یه دێنه سه‌ر شانۆی ژیان‌و ماوه‌ی ته‌واو بوونی ته‌مه‌نی هه‌ریه‌كێك ده‌ستنیشان كراوه‌، كه ماوه‌كه ته‌واو بوو ساتێك دواناخرێت!

جا ئه‌م ماوه‌یه چ ماوه‌ی ژیان بێ یان ماوه‌ی ده‌سه‌ڵاتداری‌و به‌خت‌و ئیقباڵ بێ؛ یان ماوه‌ی ژێرده‌سته‌یی‌و چه‌وساندنه‌وه بێ!

جا ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ﴾ ئه‌گه‌ر كاتی دیاری كراو هات‌و ماوه‌ی ده‌ستنیشان كراو بۆیان كۆتای هات ﴿لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً﴾ ساته‌وه‌ختێك دوا ناخرێت، بگره كه‌مترین كات دواناخرێت ﴿وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ هه‌روه‌كوو چۆن پێش ناخرێن.

### ده‌رباره‌ی مه‌به‌ست به ئه‌جه‌ل دوو را هه‌ن:

١- ئیبنو عه‌بباس‌و حه‌سه‌نی به‌صری‌و موقاتیل ده‌ڵێن: مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه په‌روه‌ردگار مۆڵه‌تی هه‌موو گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌یه‌كی سه‌رپێچیكه‌رو به‌درۆخه‌ره‌وه‌ی

پێغەمبەرەکەیانی داوە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو کە نەهاتنە سەر ڕێبازی ڕاستو ئیمانیان نەهێناو کاتی لەناوچوونو ڕیشەکێش کردنیان هات! ئیتر ئەو سزاو تۆڵەیە دێو هیچ دواناکەوێ. وەکوو ئەو عەزابو لەناو بردنەی تووشی نەتەوەی نووحو عادو ثەموودو فیرعەونو ئیخوانی لووطو هی تریش هات.

ئەم قەلاچۆ کردنو لەناوبردنو بنبڕکردنە تایبەت بوو بەگەلو نەتەوەی ئەو پێغەمبەرانەوە کە بانگەوازییەکەیان تایبەت بوو بە گەلی خۆیانەوە، ئەم دیاردەو شوێن بنبڕ کردنە بە هاتنی پێغەمبەری ئیسلام کۆتایی هات. هەر بۆیە کە موشریکەکان عەرەب بەڵێنیان لە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) گرت کە خودا ببینن، فریشتە بێتە خوارێو بە چاوی خۆیان ببینن قورئانیان پێ بێ لە کاغەزدا نووسرابێتەوە... هتد. پەروەردگار ئەم جۆرە داخوازیانەی بۆ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) نەهێنانە دی چونکە ئەگەر پەڵپەکەیان وەدی بهاتایەو یەکسەر ئیمانیان نەهێنایە ڕیشەکێش دەکرانو بەکۆمەڵ لەناو دەبران!

٢- ڕای دووەم ئەوەیە مەبەست بە ئەجەل تەمەنی ئادەمیزاد بێ، هەرکاتێ ئەو تەمەنە تەواو بوو ئیتر پاشو پێشی تێدا ناکرێ!

ئیمامی ڕازیی دەڵێ: ڕای یەکەم پەسەندە، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ نافەرمووێ: ﴿وَلِكُلِّ أَحَدٍ أَجَلٌ﴾ بەگوێرەی ڕای دووەم کە دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ نالێ ﴿وَلِكُلِّ أَحَدٍ﴾ لەم ڕووەوەیە کە نەتەوە بریتییە لە کۆمەڵو تاکەکان پێکهاتووە، ئەوانیش هاوتەمەنو یان لەیەکەوە نزیکن، ناوهێنانی گەلو نەتەوە لە جیاتی تاکو ئاراستەکردنی هەڕەشە بۆ سەرجەم نەتەوە کە کاریگەرترەو زیاتر هەست دەهەژێنێ! بۆیە لە شوێنی تاک، نەتەوەی بەکارهێناوە، جا بە گوێرەی ئەم ڕایە دەبێ هەریەکێك لە ئادەمیزاد تەمەنی دیاری کراوی خۆی هەبێو پاشو پێشی تێدا ڕوونەدا، بەم جۆرە کوژراو کە دەکوژرێ بە ئەجەلی خۆیەتیو تەمەنبڕی تێدا نیە!!

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە جاری وا دەبێ نەتەوە دەتوانێ سزای لە ناوچوون دوابخا، واتە: پێش ئەوەی هۆکارەکانی لەناوچوون پەرەبسێنن ئەو گەلو نەتەوەیە واز لە ستەمکاریو سنووربەزێنی بێنێ، هەموویان پەشیمان ببنەوەو

خۆیـان راسـتاڵ بکـەن‌و واز لـە بـێ ڕەوشـتـی‌و شـتـە حـەرام‌و یاسـاغەکان بێـنن، لـە خۆیانەوە شەریعەت‌و یاسا دانـەنێن‌و حـرام حـەڵاڵ نەکـەن‌و حـەڵاڵ بـە حـەرام لـە قەڵەم نەدەن، کۆمەڵێك موصلیح‌و دۆعـاگۆو دڵسۆز هـەوڵی چاکبوونەوەی کۆمـەڵ بـدەن‌و نەخۆشـیـیەکان تیمـار بکـەن، لەوانـەیـە لـەناوبردن‌و بـە هـیلاك چـوونەکە دوابکـەوێ، یـان هـەر روونـەدا، چـونکە ئاشـکرایە کاریگـەری بـێ ڕەوشـتـی‌و بڵاوبوونەوەی ستەم‌و خراپەکاری لە ناو گەل‌و نەتەوەدا دەق دەشوبهێتە نەخۆشی ناوجەستە!

واتە وەکوو چۆن پزیشکەکان کۆڕیان هەیـە لەسـەر ئـەوە کـە نەخۆشی شـەکرە نەخۆشییەکی جەستەیی‌و عەقڵییەو سەرەنجام سەردەکێشێ بۆ مردنی نەخۆشـەکە هەر بەو جۆرەش زانایانی کۆمەڵناسی کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کـە زێـدەڕەوی لـە فیـسق‌و سـتـەم‌و خراپەکاریـدا گـەل‌و نەتـەوە قەلاچـۆ دەکـا، سـنوور شـکاندن‌و زێدەڕەویی لە تەماعکاریی‌و بەخیلی‌و حەسوودی‌و داوێن پیسیدا دەبنە هۆکاری بـە هیلاك چوون‌و فەوتانی گەل‌و نەتەوە.

مێژووش شایەدە کـە هـەر گـەل‌و نەتەوەیـەك رووی لـە خراپـەکاریی‌و فیـسق‌و ستەمکاریی کردبێ خودا لە ناوی بردووەو بەکۆمـەڵ ریـشەکێش‌و بنـبڕی کـردوون‌و ئاسەواری نەهێشتوونەوە!

تەمـەنی دیـاریکراوو ئەندازەکێـشراو ئـەو تەمەنەیـە کـە زانایـان پێـی دەڵـێن تەمەنی سروشتی! بۆ نموونە پزیشك ئەگەر جەسـتەی کەسـێکی پـشکنی‌و ئەندامـە سەرەکییەکانی ئەو جەستەیەی وابینی کە ئەگەر بە ئاسایی کار بکەن لەوانەیـە بـۆ ماوەیەکی دیاری کراو درێژە بە ژیان بدەن، جا ئەگەر ئـەو کـابرا پـشکێنراوە پـێش ئەو ماوەیە خنکا یـان کـوژرا دەڵـێن پـێش هـاتنی ئەجـەلی سروشـتی مـرد! وەلێ بـە ئەجەلی خۆی‌و دیاری کراو لای خودا مردووە.

ئەو حەدیث‌و فەرموودانەی کە ئەوە دەگەیەنن نزاو پاڕانەوە، صـیلەی ڕەحـم‌و دڵخۆشی، تەمەن درێژ دەکەن ئـەوە بـە نیـسبەت تەمـەنی مەزنـدەیی‌و سروشـتییە. نەك تەمەنی حـەقیقی!! بێگومـان نـزاو پاڕانـەوە کـە لـە بـڕوای بـەهێز بـە خـوداو هیوای زۆر بە یارمەتیدانی بۆ موسوڵمانان سەرچاوە دەگرێ هۆکـارێکی گرنگـە بـۆ تەمـەن درێـژیی، هـەروەکوو چـۆن بـەجێهێنانی ئـەرکی صـیلەی ڕەحـم گـرنگترین

هۆکاری خۆشبەختیو کامەرانییە، کامەرانیش گرنگترین هۆکارە بۆ تەمەن درێژیی. هەروەکوو چۆن غەمو خەفەت بەتایبەتی دوورکەوتنەوەی خۆشەویستو نائومێدبوون لە ڕەحمەتی خوداو هیوابڕان لە یارمەتیدانو کۆمەکیی کردنی پەروەردگار هێزو وزەی ئادەمیزاد لاواز دەکاو پێش وەخت جەستە دادەوەشێنێ، هەروەها کەم بژێوییو دابین نەکردنی پێویستی جەستە، یان زێدەڕەویی لە خواردنو خواردنەوەدا هەروەها نیشتەجێبوون لە شوێنێك کە ئەوەندە هەتاوی تێ نەکەوێ میکرۆبەکانی بکوژێ دەبنە هۆکاری تەمەن کوورتییو زوو مردن!

## بانگەوازیی پێغەمبەران بۆ نەتەوەکانیان

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە هەموو گەلو نەتەوەیەك تەمەنێکی دیاری کراوی هەیە، کە ئەو تەمەنە تەواو بوو ئەجەلیان ساتەوەختێك پاشو پێش ناخرێن، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی ئادەمیزاد پاش مردنیان دیاری دەکا، ئەوە دەگەیەنێ: هەرکەسێك لە ژیانی دونیایدا فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی پەیامی پێغەمبەران بووبێ ئەوە ترسی داهاتوویان نیە، پەرۆشی رابوردوویان نیە، ئەگەر سەرپێچیکەریش بووبن دەخرێنە ناو دۆزەخو دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي﴾ لێرەدا پەروەردگار ئادەمیزاد دەترسێنێ بەوەی کە خودا پێغەمبەران دەنێرێو ئایەتەکانی ئەویان بۆ دەخوێننەوە ئەحکامو ئەرکەکانی خودایان فێر دەکەنو دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەمیزاد! ئەگەر

پێغەمبەرێك لە رەگەزی خۆتانو نەتەوەی خۆتان هاتە ناوتانو هەواڵی ئەو ئەركو فەرمانانەی ئێمەیان پێ راگەیاندن، شەریعەتو یاسای ئێمەیان بۆ روون كردنەوە، دەربارەی خواپەرستیو جۆرەكانی مامەڵەو بازرگانی، ئەخلاق، رێو شوێنیان پێ گوتن، فەرمانو جڵەوگیرییەكانی ئێمەیان پێ راگەیاندن ئەوە ئێوە لەبەردەم دوو هەڵوێستدانو لەیەكێ لەو دوو حاڵەتەدا دەبن، حاڵەتێكیان موژدەبەخشو ئەوی تریان ترسێنەر. جا ﴿فَمَنِ اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ كەسێك لە خودا بترسێو خۆ لەو كردارانە بپارێزێ كە دەبنە هۆی سزای دۆزەخو پەیوەندیی خۆی بە خوداوە بەهێز كرد وازی لە خراپەكاریی هێناو لە ماوەی ژیانیدا سەرگەرمی تاعەت كردنو خواپەرستی بوو لەسەر ئەو حاڵە گیانی سپارد، ئەوە هیچ ترسو بیمێكی داهاتووی نیەو دڵنیایە لە ئاكامی خۆیو هیچ ترسێكی لە سزای دۆزەخ نیە ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ هەروەها پەرۆشی ژیانی دونیایان نیە، لە كردەوەی رابوردوویان پەشیمان نین.

كە دەفەرموێ: ﴿مِنْكُمْ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە كە ئەگەر پێغەمبەر لە رەگەزی ئەو گەلو نەتەوە بێ كە بۆ سەریان رەوانە كراوە باشتر بیانوویان دەبڕێو بەڵگەی ئاشكراترەو سوارترە، چونكە ئاگاداریی ئەو گەلە بەحاڵو چۆنیەتی ژیانی رابردووی پێغەمبەرەكە دەبێتە هاندەرو رێنموونیكەرەكە موعجیزەی ئەو پێغەمبەرە لەخوداوەیەو بە پشتیوانی ئەو دێنە دی!

مەبەست بە وشەی ﴿آيَاتِي﴾ قورئانو بەڵگەی تاكو تەنهایی خوداو خودایەتیو ئەحكامەكانی شەرعو فەرمانو جڵەوگیریەكانی پەروەردگارە، وشەی ﴿آيَاتِ﴾ وشەیەكی گشتییە هەموو ئەمانە دەگرێتەوە، چونكە هەموو ئەو شتانە ئایاتی خودانو پێویستە پێغەمبەران بەخەڵكیان رابگەیەنن. ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا﴾ ئەوانەی نیشانەو ئایاتی خودا وەرناگرنو بەدڵ بروایان پێی نیەو لوتبەرزیی دەنوێننو پابەندی ئامۆژگارییو فەرمانو جڵەوگیرییەكانی قورئان نابن، بە ئەنقەستو سەرڕەقی بانگەوازی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رەت دەكەنەوە ﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانە گرۆو تاقمی

دۆزەخـن، جێگـای نیـشتەمەنییان ئـاگری دۆزەخـەو بـۆ هـەتا هـەتایی تێیـدا دەمێننەوەو لێی دەرناچن!

## سەرەنجامی درۆو پانۆڕامای چوونە ناو دۆزەخ لەلایەن کافرەکانەوە

﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوٓا۟ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ قَالَ ٱدْخُلُوا۟ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ فِى ٱلنَّارِ ۖ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُوا۟ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَـٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَـٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَىٰهُمْ لِأُخْرَىٰهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ .

دوای ئـەوەی پـەروەردگار سـەرەنجامی بەدرۆخـەرەوەکانی بـاس کـرد، حـاڵو چۆنیەتی ئەوانەی لوتبەرزیی دەکەن بەرامبەر پێغەمبەرو ئایەتەکانی پەروەردگار روون کردەوە، لێرەدا باسی ئـەوە دەفـەرموێ: کە ستەمکارترین کـارو گـەورەترین تاوان ئەوەیە کە بـەدەم خـوداوە شتێك هەڵببەستێ کە نەیفـەرموو بـێ یـان ئـەو شتانەی فەرموویـەتی بـەدرۆی بزانـیو بـڕوای پـێ نەکـەی، یـان پێغەمبەرایـەتی حەزرەتی موحەممەد رەت بکەیەوە! دەفـەرموێ: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ کـێ لـە ئـەو کەسـە سـتەمکارترە، تاوانبـارترە؟ واتـە: کـەس لـەو کەسـە ستەمکارتر نیە کە بەدەم خوداوە درۆ هەڵبەستێ بەم جۆرە شتێك بـەواجب بزانـێ کە خودا واجبی نەکردووە، شتێك حەرام بکا کە خـودا بـە حـەرامی دانـەناوە! یـان حوکمێك پاڵ پـەروەردگار بـدا کـە نـەی ناردبـێ! یـان هـاوەڵو منـداڵو خێـزان پـاڵ خودا بدا!

﴿أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ﴾ یان ناردنە خوارەوەی نامە ئاسمانییەکان بـەدرۆ بزانـێ، پێـی وابێ قورئان کەلامی خودا نیەو لە خوداوە نەنێردراوەتە خوارێ، وەکوو ئەوەی کە کافرەکـانی عـەرەب نەیاندەسـەلماند کـە قورئـان نیگـای خودایـە! دەمـێ دەیـانگوت جندۆکـە ئەمـە فێـری موحەممـەد دەکـەن، وەختێکـیش دەیـانگوت: مامۆسـتای ئـادەمیزادی هەیـەو ئـەو قورئانـە بـە موحەممـەد فێـر دەکـا! یـان بـڕوای بـە پێغەمبەرایەتی موحەممەد نەبێ، گاڵتەو لاقرتێ بە ئایەتەکانی خـودا بکـا، یـان بـە پێویستی نەزانێ خۆیانی پێوە خەریك بکا ﴿أُولَئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ الْكِتَابِ﴾ ئەوانە هەموویان بەشی خۆیان لە رزقو رۆزیی کە لە کتێبی مەزەندەکراوان (كتاب المقدرات)دا چەسپاوە بەردەکەوێ، ئـەوەی بۆیـان تـەرخان کـراوە لـە رزقو رۆزیـیو تەمـەنو خۆشـیو ناخۆشـی ژیـان پێیـان دەدرێ، ئەوانـە وێڕایـی سـتەمکارییو سپڵەییان، وێـڕای ئـەو هـەموو درۆو بوختانـەی بـەدەم خـوداوە هـەڵی دەبەسـتن بێبـەش نـاکرێن لـەو نـازو نیعمەتـەی کـە لـە تۆمارگـەی بوونـەوەردا بۆیـان دیـاری کراوە، هەتا تەمەنیان تەواو دەبێو لە دونیا دەردەچن بەشی خۆیان دەدرێتێو لێی بەهرەمەند دەبن!

﴿حَتَّى إِذَا جَاءتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ﴾ هەتا رەوانەكراوی ئێمە كە فریشتەی گیانكێشانە دەچن بۆ لایانو گیانیان دەكێشنو تالاّوی مردنیان پێ دەچێژن ﴿قَالُواْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ﴾ فریشتەی گیانكێشان بەمەبەستی سەرزەنشت كردنو لێ تووڕەبوونیان پێیان دەڵێن: كوان ئەوانەی كردبووتانن بە هاوشانی خوداو لە ژیانی دونیاتاندا لە جیاتی خودا بەندایەتیتان بۆ دەكردن؟ داوای دەستەبەر كردنی سوودو دوورخستنەوەی سزاتان لێ دەكردن، هاناتان بۆ دەبردنو لێیان دەپاڕانەوە؟

دە بانگیان بكەن با لەم حاڵە ناخۆشو تاڵە رزگارتان بكەن! ئەم سزاو ئێشو ئازارەتان لێ دوور بخەنەوە! ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾ وەلاّم دەدەنەوەو دەڵێن: لێمان هوون بوونو شوێنەكانیان نازانین، هیوامان پێیان نیە، ئومێدی ئەوەیان لێ ناكەین سوودیان بۆمان هەبێو زیانمان لێ دوور بخەنەوە!

﴿وَشَهِدُواْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَافِرِينَ﴾ شایەتیاندا لەسەر خۆیانو دانیان پێدانا كە ئەوان بە پاڕانەوەو هانابردن بۆ ئەو بتو صەنەمو خودا درۆزنانەو بەندایەتی كردن بۆیان كافرنو گومڕا بوون، چونكە ئەوان وایان دەزانی ئەو شتانەی ئەوان دەیانپەرستن لای خودا دەوریان هەیەو شەفاعەتیان بۆ دەكەن! وایان دەزانی ئەمانە یارمەتیدەرو قسە رۆیشتوونو لای خودا رۆڵی گرنگیان هەیە! هەروەكوو چۆن پاشاو فەرمانڕەواكانی جیهان دەستو پێوەندەكانیان كاریان تێ دەكەنو رۆڵی گرنگ لە حوكمو بڕیارەكانیاندا دەگێڕن!

پەروەردگار بێ ئاتاجەو پێویستی بە یارمەتیدەر نیە، چونكە زاتی بێچوون زانیاری رەهاو دەسەڵاتو توانای بێ سنووری هەیەو هیچ لەمپەرێك نیە بتوانێ ببێتە بەربەست لەبەردەم ویستی خودادا!

ئەمجار پەروەردگار هەواڵی ئەوەمان دەداتێ كە فریشتەكان چی بە ئەو كافرو موشریكانە دەڵێن: چی بە ئەو بوختانكەرو بەدرۆخەرەوانە دەبێژن. ﴿قَالَ ادْخُلُواْ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّن الْجِنِّ وَالإِنسِ فِي النَّارِ﴾ رۆژی قیامەت فریشتە بە فەرمانی پەروەردگار پێیان دەڵێ دە بڕۆنە پێڕی ئەو گەلو گرۆهانەی وەكوو خۆتانن، وەكوو خۆتان بوون لە هەڵوێستو رەوشتدا، ئەوانەی پێش ئێوە كافر

بوون لە جندۆکەو ئادەمیزاد، رۆژگاریان پێش رۆژگاری ئێوە بوو، بیژەرەکە یان مالیکی دۆزەخە، یان پەروەردگارە ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە پەروەردگار بە یەك وەجبە کافرەکان ناخاتە دۆزەخەوە، بەڵکوو کۆمەڵ کۆمەڵو تاقم تاقم دەیانخاتە ناو دۆزەخەوە، هەیان ماوەیەکە خراوەتە دۆزەخەوەو سزا دەدرێ هەیان هێشتا نەخراوەتە ناو ئاگرەوەو بەرەو ئەوێ پەلکێشی دەکەنو لەم حاڵەتەدا پێشکەوتووانی پێش خۆی دەبینێ لە ناو دۆزەخدا سزا دەدرێن!! ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾ هەرکاتێ تاقمو کۆمەڵێك دەچنە ناو دۆزەخەوەو دەبینێ چی بەسەر هاتووەو بەسەری دێ؛ نەفرین لە هاوەڵانی خۆیان دەکەن چونکە بەهۆی شوێنکەوتنی ئەوانەوە تووشی ئەو چارەڕەشییە هاتوونو بەسۆنگەی ئەوان ئەم ئاکامو سەرنجامانەی تووش هاتوون وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا – العنكبوت/٢٥﴾. ئاوا بەوجۆرە هەندێك لە کافرەکان نەفرین لە هەندێکی تریان دەکەن، بڕێکیان خۆیان لە بڕێکیان بێبەری دەکەن وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ، وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ: لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّؤُواْ مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ – البقرة/١٦٦ – ١٦٧﴾.

بەکورتی مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە: موشریکەکان نەفرین لە موشریکەکان دەکەن، جوولەکە نەفرین لە جوولەکەو مەسیحی لە مەسیحیو ئاگرپەرست لە ئاگرپەرست دەکەن، ﴿حَتَّى إِذَا ادَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا﴾ هەتا هەموویان خزێندرانە دۆزەخەوەو لەوێدا یەکتریان گرتەوەو کۆبوونەوەو یەکتریان ناسییەوە ﴿قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لأُولاَهُمْ﴾ پاشەتایان کە لەچوونە ناو دۆزەخ دواکەوتبوون یان پلەو مەقامیان پایینەو بۆرە پیاوو کاسەلێسو خزمەتچی بوون بە ئەوانە دەڵێن کە لە پێشیانەوە چوونە ناو دۆزەخەوە، یان کە پێشەواو کاربەدەستو دەمڕاست بوونو بەهۆی تاوانی گومڕابوونی خۆیانو گومڕا کردنی خەڵکانی دیکەوە پێشتر خراونە دۆزەخەوە، دەڵێن: ﴿رَبَّنَا هَؤُلاء أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ﴾ پەروەردگارا!! ئەو ملهوڕو فێڵبازو زمان لووسو لەخشتەبەرانە بوون ئێمەیان گومڕا کردو سەریان لێ

تێکـداین‌و نەیانهێـشت شـوێن پـەیامی پێغەمبـەرەکانت بکـەوین‌و بەختــەوەریی بەدەست بێـنین! ئەوانـە سـەرکردەو پێـشەوامان بـوون لـە رێبـازی بێدینیـدا، ئێمـە چاومان لە ئەوان کردووە! کەوابێ خودایە! سزای دووچەندانەو دووقاتیان لـە ئـاگر بەسـەردا بـدە، تۆڵـەی گـومڕایی خۆیـان‌و گـومڕا کردنـی ئێمەشیان لێ بـستێنە، لـە ئایەتێکی هەمان واتا دەردەبڕێ‌و دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا، وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا، رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا – الأحزاب/٦٦ – ٦٨﴾.

پەروەردگار وەڵامی دانەوەو ﴿قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ﴾ فـەرمووی: بـۆ هەریـەکێ لـە ئێـوەو ئـەوان سـزای دووچـوندانە هەیـە، ئـەوەمان بڕیـارداوەو ئـەنجاممان داوە، هەریەکە سزای شیاوی خۆیمان داوەتێ، سزای گومڕاکردن‌و لەخشتەبردن، یان سزای شـوێنکەوتن‌و لاسـایی کردنـەوە، چـونکە هەریەکـە لـە فـەرمانڕەواو کاربەدەسـت‌و شوێنکەوتووانیان گومڕاو گومڕاکەرن، ﴿وَلَكِن لاَّ تَعْلَمُونَ﴾ بـەڵام ئێـوە چۆنیەتی‌و حەقیقەتی سزاکان نازانن، وەکوو چۆن لـە جیهانـدا لـە بەندیخانـەدا بەنـدکراوی وا هەیە سەرسـەریی‌و شـەقاوەو ڕۆچوو لـە تاوانباریـدا هـی واشـیان هەیـە سـەرکردەو کاربەدەست بووە، هەڵبەتـە ئـەو سـزا دەروونیـەی کۆمـەڵی دووەم هەسـتی پـێ دەکا، کۆمەڵی یەکەم هەستی پێ ناکەن هەرچەندە بە ڕواڵەت وا دەبینـرێ کـە سـزاکە بـۆ هەموویان چوون یەکە، نموونەی ئەم ئایەتە لە قورئاندا زۆرن کـە ئـەوە دەگەیـەنن گومڕاکەران زێدە سزایان دەدرێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ – النحل/٨٨﴾. یـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ – العنكبوت/١٣﴾. یـان دەفـەرموێ: ﴿لِيَحْمِلُواْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ – النحل/٢٥﴾.

ئەمجار با بزانین هەڵوێست‌و وەڵامـی پێـشەواو پێـشەواکان چیەو دەڵێن چی؟ ﴿وَقَالَتْ أُولاَهُمْ لأُخْرَاهُمْ﴾ پێشەواو کۆمەڵە ڕۆچووەکان بـۆ نـاو ئـاگر یـان پێـشەواو ملهوڕو گومڕاکەرەکان بە شوێنکەوتووانی خۆیان دەڵێن: ﴿فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾ ئەگەر ئێمە ئێوەمان گومڕا کردبـێ، ئـەوە لەمبارەوە ئێـوە هـیچ حەقێکتان بەسەر ئێمەوە نیە تا داوای زێدە سزا بۆ ئێمە بکەن، بێگومان ئێوەش وەکوو ئێمـە

گومڕابوون! بۆخۆتان دانتان پێدا نا، ئێمەو ئێوە لەوەدا کە شیاوی ئەوەین سزا بدرێین چوون یەکین، ئێوەش وەکوو ئێمە کافربوون‌و خراپەکاریتان کردووە، نە ئێوە شیاوی ئەوەن سزاتان لەسەر سووك بکرێ، نە ئێمەش شیاوی ئەوەین سزامان لەسەر دووچەندانە بکرێ، جا کەوابێ ﴿فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ بچێژن سزای دۆزەخ بەهۆی ئەو هەڵوێست‌و کردەوانەتان کە بووەتە هۆی ئەو سزایە، ئەمە وەڵامی پێشەواو فەرمانڕەواو سەرۆکەکانە، یان فەرموودەی پەروەردگارە ئاراستەی هەردوو تاقم‌و کۆمەڵەکان دەکرێ! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءلُونَ، قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ، قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ، وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ، فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ، فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ، فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ - الصافات/٢٧ - ٣٣﴾.

﴿فَذُوقُواْ الْعَذَابَ﴾ لە ئایەتەکەدا ترساندن‌و سەرزەنشت کردنە، چونکە پەروەردگار کە هەواڵی ئەوەی دا کە پێشەواو شوێنکەوتووەکان لە ناو دۆزەخدا کێشەیان تێ دەکەوێ‌و هەندێکیان لە هەندێکیان خۆیان بەریی دەکەن‌و بڕێکیان نەفرین لە بڕێکیان دەکەن‌و هەرکەسە پەنجەی تاوان بۆ ئەوی دی رادەکێشێ! ئا ئەم مەوقیف‌و مەشهەدە ترسێکی زۆر دەخاتە دڵ‌و دەروونەوە!

خودایە! لە تەنگ‌و چەڵەمەی ئاوەهاو مەوقیفی ئاوا سامناك‌و تەنگانەی بێ دەرەتان بمانپارێزی‌و سەربەرزی دونیاو قیامەتمان بکەی...

## سزای بێ بڕوایان

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾﴾.

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بە ئایەتەکانی پێشەوە ئەوەیە کە ئەم ئایەتانە تەواوکەری هەڕەشەکانی پەروەردگارن بۆ کافرەکان، چونکە پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا ئەوەی راگەیاند کە ئەوانەی بڕوا بە قورئان ناکەن بڕوا بە خودا ناکەن‌و لوتبەرزیی دەنوێنن لە ئاست ئیمان بە خوداو پێغەمبەرو بە ڕۆژی قیامەت بۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێننەوە، ئەمجار هەواڵی ئەوەمان دەداتێ کە ئەو گرۆهانە بە هیچ شێوەیەك ناچنە ناو بەهەشتەوە مەحاڵە بۆنی بەهەشت بکەن‌و بەهیچ جۆرێك کردەوەی چاکیان لێ وەرناگیرێ‌و بۆیان بە خوداپەرستی حلێب ناکرێ‌و سوودی قیامەتی لێ وەرناگرن! بۆیە بەم ئوسلوبە جەخت لەسەر کراوە فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ﴾ ئەو گرۆهو کەسانەی نیشانەی راستی تاك‌و تەنهایی ئێمەو ئایاتی قورئان‌و راستی پێغەمبەرایەتی‌و هەبوونی ڕۆژی دوایی بە درۆ دەخەنەوە دەرگای ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە؛ واتە: کردەوەی چاك‌و نزاو پاڕانەوەیان بەرز ناکرێتەوە بۆ ئاسمان‌و لێیان وەرناگیرێ، هەروەها گیانەکانیان بەرز ناکرێنەوەو بەهەشت نابینن. چی کردەوەی چاك بکەن‌و بپاڕێنەوە بێ هودەیە، چونکە پەروەردگار کردەوەو پاڕانەوە لە بەندە تەقواکارەکانی خۆی وەردەگرێ، کردەوە صالح‌و قسەو پاڕانەوەی بەسۆز پەسەند دەکاو لای خودا لە نامەی راستاڵاندا تۆماری دەکا وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ – فاطر/١٠﴾، یان دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ – المطففين/١٨﴾، هەروەها ﴿وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾ ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە، ئەوانە لە ڕەحمەت‌و بەزەیی پەروەردگار بێ بەشن، چوونە ناو بەهەشت بۆ ئەوان مەحاڵەو هەرگیز نایەتە جێ؛ چونکە پەروەردگار چوونە ناو بەهەشتی بۆ ئەوان بەستۆتەوە بەشتێکی مەحاڵەوە کە ئاودیوبوونی وشترە لە کونی دەرزییەوە، دیارە

ئـاودیوبوونی وشـتر لـە کـونی دەرزییـەوە شـتێکی مەحاڵـەو بەرواڵـەت نایەتـە دی، کەوابوو چوونە ناو بەهەشت بۆ ئەو کافرانە شتێکی مەحاڵەو نایەتەدی!!

ئـەم شـێوە ئوسـلووبە، واتـە: پەیوەسـت کردنـی شـت بـە شـتی مەحاڵـەوە بـۆ چەسـپاندنی مەحاڵییـەتی شـتەکە، ئوسـلووبێکی بـەربلاوو بـەکارهاتووە، ئـەوەتا عەرەب دەڵێن: (لاَ أَفْعَلُ كَذَا حَتَّى يُشِيبَ الْغُرَابُ) یان (حَتَّى يَبْيَضَّ القَارُ) بـە کـوردیش دەڵێن: ئەو ئیشە ناکەم تا قیر سپی نەبێ!

ئیبنـو عـەبباس‌و سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر دەڵـێن: مەبەسـت بـە﴿ الجُمَّـلَ﴾ گوریس‌و حەبلی ئەستوورە، چونکە گوریس‌و حەبل لەگەڵ کونی دەرزیدا موناسیبە نەك وشتر!

زومەخـشەری دەڵـێ: وشـەکە ﴿الْجَمَـلُ﴾ە، قیرائـەتی زۆرینـەی خـەڵك وایـان خوێندۆتەوە، بەم شێوە خوێندنەوەیـەش ماناکە کاریگەرترو بـەلیغ تـرە، چـونکە کـونی دەرزی نموونـەی بـچووکی‌و تەنگییـە، وشـتریش نموونـەی قـەبارە گـەورەیی‌و زەبەللاحییە، ئەمەش زیاتر مەحالییەتەکە دەچەسپێنێ!

﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾ وەکوو ئەو سزا کوشندەیە سامناکە، سزای هـەموو کەسێکی تاوانبار دەدەین، هەرکەسێك دەرحـەق بـە خـودا تـاوان بکـاو گەردنکەچـی فــەرمان‌و نەهییــەکانی نــەبێ، ســتەم لــە خــودی خــۆی کــاو بەرامبــەر بــرا موسـوڵمانەکانی سـتەمکار بـێ؛ بـەو شـێوە سـزای کوشـندەی دەدەیـن، هەرکەسـێك تاوان‌و ستەمکاری لێ بووبێتە خوو پیشەی هەمیشەیی، ئێمە بە ئاگری دۆزەخ سزای دەدەین‌و هەرگیز لەو سزایە قوتاری نابێ‌و چاوی بە بەهەشت ناکەوێ‌و بـۆنی ناکـا، ئەم ئایەتە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە کـە تـاوان‌و سـتەم هۆکـاری سـەرەکین بـۆ سـزادان بـە ئاگری دۆزەخ‌و هەرکەسێك تاوان بکا سزا دەدرێ! بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئەوەی دووبارە کردەوەو فـەرمووی: ﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ واتـە: هـەر بـەو شـێوەیەش ئێمە سزای ستەمکاران دەدەیـن، چـونکە هـەموو تاوانکارێـك سـتەمکارەو سـتەم لـە خودی خۆی دەکا. ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ ئەو تاوانبارانـە فـەرش‌و راخەریان لە ئـاگر بـۆ تـەرخان دەکـرێ، لـەلای سەریـشیانەوە بـە ئـاگر دادەپۆشـرێ، مەبەسـت ئەوەیـە کـە ئـاگری دۆزەخ لـە هـەموو لایەکـەوە دەورەی داون‌و لـەخۆی

گرتوون! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ – الهمزة/٨﴾.
یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ – التوبة/٤٩﴾، یان دەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ – الزمر/١٦﴾.

## پاداشی موسوڵمانو خودا پەرستان

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ ۖ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ ۖ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ ۖ وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرو خودانەناسان کرد، ئەمجار دوابەدوای ئەوە بەڵێنو مـوژدە دەدا بـە خوداپەرستان، عـادەتو ئوسلووبی قورئـانیش وایـە زۆربەی کات کە باسی دۆزەخو سـزای کـافرو خودانەناسـانی کـرد، باسـی بەهەشـتو موسوڵمانانیش دەکا، بۆیە لێرەدا دوابەدوای باسـی تاوانبـارو سـتەمکارانو هەڕەشـە لێکردنیان باسی موسوڵمانانو موژدە پێدانیان دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَالَّـذِينَ آمَنُـوا﴾ ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە، بڕوایـان بـە تـاکو تـەنهایی خـوداو پێغەمبەرایـەتی پێغەمبەرو زیندوبوونەوەی رۆژی قیامەت هێناوە ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ کـردەوەی چاکیان کـردووەو دەکـەن، پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیرییـەکانی پـەروەردگارنو بـە گوێرەی شـەریعەتی ئـەو رەفتـار دەکـەن، هـەر ئەوانـە دەسـتەو تـاقمی بەهەشـتینو

دەچنە ناوی‌و لێی دەرناچن‌و بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوەو بە نیعمەتەکانی بەختەوەر دەبن...

جا وەنەبێ گەیشتن بە ئەم بەهەشتە جوان‌و قەشەنگە زۆر گران‌و لەتاقەت بەدەربێ، بەڵکوو هەموو ئادەمیزادێك دەتوانێ بەدەستی بێنێ، هەرکەسێ ئیمانی هەبێ‌و پەیڕەوی قورئان بکا پێی دەگا ﴿لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ ئێمە هەرگیز هیچ کەسێك زیاد لە توانای خۆی ئەرکی ناخەینە سەر، بەهەشت وێڕای ئەو هەموو گەورەیی‌و خۆشی‌و لەززەتەی تێیدایە بەکردەوەی ئاسان‌و لە چوارچێوەی توانای ئادەمیزاددا دەتوانرێ پێی بگەی ئەو کردەوانە دەبنە هۆی چوونە ناو بەهەشت کرداری ئاسان‌و لە تواناداڹ، ئەو کردارانە زەحمەت‌و لە تاقەت بەدەر نین، بەڵکوو هەموو ئادەمیزادێك بیروباوەڕی تەواوی هەبێ دەتوانێ ئەنجامیان بداو پێیان هەستێ ﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ هەر ئەوانە گرۆهو تاقمی بەهەشتین‌و بۆ هەتاهەتایە تێیدا دەمێننەوە لەززەت‌و خۆشی تێدا دەچێژن‌و ژیانی بەختەوەری تێدا بەسەر دەبەن، ئازارو مەینەتی تێدا نابینن‌و ناخۆشی روویان تێ ناکا، دڵخۆش‌و تەڕ دەماغ‌و لەشساغ‌و بە نەشاطن ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ﴾ برێك لە نیعمەتەکانی پەروەردگار بەسەر بەهەشتییاندا ئەوەیە کە رژدی‌و بەخیلی‌و حەسوودی لە دڵیاندا ناهێڵێ، دڵ‌و دەروونیان ساف‌و بێ گەرد دەکا، لێڵی‌و خەم‌و ناڕەحەتی‌و تەنگ‌و چەڵەمەیان تووش نابێ، شەڕو هەراو دژایەتی‌و کێشەو دووبەرەکی‌و دوژمنایەتییان لە نێواندا نامێنێ، چونکە پەروەردگار حەسوودیی‌و رق‌و کینەی لە دڵ دەرهاویشتوون‌و، لە هەموو نەخۆشی جەستەیی‌و دەروونی‌و ساخڵەمی کردوون‌و هەموویان بە چاوی برایەتی‌و دڵسۆزی تەماشایی یەکتری دەکەن، ئەوان لە حاڵێکدان جۆگەو جۆباری جوان‌و سەرنج راکێش بەژێر باڵەخانەو دارو درەختی باغەکانیاندا دەکشێن ئەوان لە ژوورو شوێنی حەسانەوەو رابواردنەوە چاویان لە دیمەنی ئەم جۆگەو روبارانەیە بە بینینی ئەم دیمەنانە ئەوەندەی تر دڵ خۆش‌و کەیف خۆش‌و تەڕ دەماخ دەبن.

ئەمە فەضل‌و نیعمەتی خودایە، لە کاتێکدا دۆزەخییەکان راخەریان ئاگری سووتێنەرەو لە ژووریشیانەوە ئاگر دایپۆشیوون، بەهەشتییەکان لەژێر خانوو

باڵەخانەو باغەکانیانەوە جۆگەو جۆباری دڵڕفێن دەکشێن هەوای عەتراویو فێنکی نەسیم ئامێز هەڵدەمژنو بەدیمەنی رازاوەو سەرمنج راکێش چاوو دڵیان رۆشن دەبێتەوە!.

لە کاتێکدا دۆزەخییەکان کێشەو نیزاعیانەو ئەو ئەو تاوانبار دەکاو ئەویان نەفرین لە ئەمیان دەکا، لە ئازارو سزادا دەتلێنەوە، موسوڵمانە بەهەشتییەکان سەرگەرمی سوپاسو ستایشی پەروەردگارن؛ تەنانەت ئەم حەمدو سوپاسەشیان هەر لەززەتو خۆشییە بەڵکوو ئەوپەڕی لەززەتو خۆشی تێدا هەست پێ دەکەن ﴿وَقَالُواْ الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللّهُ﴾ بە زوبانی سوپاسو بۆ دەربڕینی کەیفو خۆشیو رەزامەندییان دەڵێن: هەموو سوپاسو ئەنایەك بۆ ئەو پەروەردگارەیە کە رێنموونی ئێمەی کرد بۆ بەمرازگەیشتنمانو وەدەستهێنانی ئەم پلەو مەقامە! ئەگەر رێنموونی پەروەردگار نەبوایەو رەحمەتو فەضلی ئەو نەبوایە هەرگیز ئێمە ئەمەمان دەست نەدەکەوتو رێبازی بەرەو بەهەشتمان نەدەزانی! ئەگەر فەضلو گەورەیی خودا نەبوایە هەرگیز ئێمە بە عەقڵو بیروبۆچوونی خۆمان پەییمان بەم رێبازە نەدەبرد!

ئیمامی بوخاری لە صەحیحی خۆیدا لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ – صلى الله عليه وسلم – بِيَدِهِ لأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الْجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا» واتە: کە موسوڵمانان لە ئاگر رزگاریان دەبێ لە نێوان بەهەشتو دۆزەخ رادەگیرێن، زوڵمو ستەمێك کە لە نێوانیاندا هەبووە لە دونیادا لێیان وەردەگیرێتەوە تا هەموویان لە گوناهو تاوان پاك دەبنەوە، ئەمجار رێگەیان پێ دەدرێ بۆ چوونە ناو بەهەشت، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەریەکەیان بۆ شوێنو نشینگەی خۆیان شارەزاترن لە چوونەوە بۆ ماڵی خۆیان لە جیهاندا!!

ئیبنو ئەبی حاتەم لە حەسەنی بەصرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «يَحْبَسُ أَهْلُ الْجَنَةِ بَعْدَ مَا يَجُوزُونَ

الصِّرَاطَ، حَتَّى يُؤْخَذَ لِبَعْضِ ظَلاَمَاتِهِمْ فِي الدُّنْيَا، فَيَدْخُلُونَ الْجَنَةَ، وَلَيْسَ فِي قُلُوبِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ غِلٌ».

ئەمجار کە دەبینن هەرچی پێغەمبەران پێیان راگەیاندوون هەمووی راستەو راست دەردەچێ دەڵێن: ﴿لَقَدْ جَاءتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾ بێگومان پێغەمبەرانی پەروەردگارمان بەراستو رەوانی هاتوونە سەرمانو رێگای راستییان پێ نیشان داوینو چۆنیان بەڵێن پێ داوینو چۆنیان بۆ باس کردووین ئاوا دەرچووا ئەمە دەق ئەو وادەو بەڵێنانەیە کە پەروەردگار لەسەر زمانی پێغەمبەران پێی راگەیاندووین! پڕاو پڕ هاتوونە دی.

﴿وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بانگیان لێ دەکرێ، واتە: فریشتە بانگیان دەکەن: دەڵێن: سڵاوتان لێ بێ، باشتان کردووە، بڕۆنە ناو ئەو بەهەشتەوە، ئەم بەهەشتە ئەوەیە کە پەروەردگار بە میرات داویەتی بە ئێوە لە پاداشتی کردەوەی باشتان!

ئەبو سەعیدی کوڕی مەنصوورو بەیهەقی لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلاَّ لَهُ مَنْزِلاَنِ: مَنْزِلٌ فِي الْجَنَّةِ، وَمَنْزِلٌ فِي النَّارِ، فَإذَا مَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ، وَرِثَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْزِلَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ)».

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە بە میراتگرتنی بەهەشتو چوونە ناو بەهەشت لە پاداشتی کرداری چاکەیە! ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئادەمیزاد بەهۆی کردەوەی چاکی خۆیەوە دەچێتە بەهەشتەوە، بەڵام لە راستیدا چوونە ناو بەهەشت بەهۆی رەحمەتو فەضلی خودایە! چونکە لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللّهِ – النساء/٧٠﴾. یان دەفەرموێ: ﴿فَسَيُدْخِلُهُمْ فِي رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ – النساء/١٧٥﴾.

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رووبەڕووی هاوەڵان فەرموویەتی: «لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ، قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ

يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ برحمة مِنْهُ وَفَضْلٍ». هیچ کەسێ لەئێوە کردەوەی نایباتە بەهەشتەوە، هاوەڵان وتیان: ئەتۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: تەنانەت منیش، مەگەر خودا بەرەحمەت و فەضلی خۆی بمخاتەبەهەشتەوە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بەمیراتگرتنی بەهەشت بەهۆی کردەوەمیە، چوونە ناویشی بە رەحمەت و فەضلی خودایە، واتە: کردەوەی ئادەمیزاد چەندێك گەورەو زۆربن هۆی ئەو کردەوانە نابنە پارسەنگی چوونە ناو بەهەشت! ئەگەر رەحمەت و فەضلی خودای لەگەڵ نەبێ، چونکە پەروەردگار ئەو پاداشە گەورەیەی لە پاساوی ئەو کردەوە کەمەدا داناوە، کەوابوو چوونە ناو بەهەشت بە فەضل و رەحمەتی خودایە!

بەکورتی کردەوەی چاك بە گوێرەی رای ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەبێتە هۆکاری چوونە ناو بەهەشت و لە تەرازووی عەداڵەتدا دەبێ پاداشتی کردەوەی چاك چاکە بێ کە بەخشینی بەهەشتە، بەڵام پێویستە ئەو کردەوە چاکەیە رەحمەت و فەضلی خودای لەگەڵدا بێ چونکە پەروەردگار بەهەشتی کردووە بە پاداشتی چاکە بە فەضل و گەورەیی خۆی، لە جیاتی ئەو کردەوە کەمانە ئەو بەهەشتە رازاوە دەدا، ئەمەش فەضل و رەحمەتی خودایە!

نەك مانای ئەوەیە لە پاداشتی کردەوەی چاکدا پێویستە پەروەردگار بیانخاتە بەهەشتەوە وەکوو موعتەزیلە بۆی چوون، چونکە بە گوێرەی عەقڵ مەحاڵەو ناگونجێ پەروەردگار شتی لەسەر واجب بێ! خودا بۆخۆی فاعیلی موختارەو هیچی لەسەر پێویست نیە، هەرکارێك بکا یان نەیکا ئەوە بەویستی خۆیەتی!

## وتو وێژی نێوان بەهەشتی و دۆزەخی و ئەعرافییەکان

﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ

أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّۢا بِسِيمَىٰهُمْ وَنَادَوْا۟ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُوا۟ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرەکان کردو پاداش و سەرەنجامی خواپەرستانی روون کردەوە، بەشوێن ئەوەدا باسی گفتوگۆی نێوان کافرو موسوڵمانەکان دەکا، واتە: ئێمە ئێستا لەبەردەم مەشهەدێکی تری رۆژی قیامەتین. مەشهەدێك کە پەیوەندی بە مەشهەدی پێشووەوە هەیە. ئەوەتا پاش ئەوەی بەهەشتییەکان بەمراد دەگەن و بەجێگەو مەکانی خۆیان شاد دەبن دۆزەخییەکان لەسەرەنجامی خۆیان دڵنیا دەبن و سزای سەخت لە خۆیان دەگرێ و هیوا بڕاو دەبن! بەهەشتییەکان بانگ لە دۆزەخییەکان دەکەن، پرسیاریان لێ دەکەن، ئایا ئەوەی خودا لە دونیادا وادەی پێ دابوون هاتە دی؟؟

لەلایەکی ترەوە بەهەشتییەکان لەناو خۆیاندا پرسیار لە یەکتری دەکەن. هەروەها دۆزەخییەکان لە ناو خۆیاندا لە یەکتری دەپرسن، بۆ ئەوەی بەهەشتییەکان زیاتر هەست بە نیعمەتەکانی بکەن و دۆزەخییەکان پتر شەرمەزاریی و ریسوایی و پەشیمانی ئازاریان بدا.

جا هەرچەندە بەهەشت لەبەرزترین ئاسمانەو دۆزەخ لە خوارترین زەوییەو نێوان بەهەشت و دۆزەخ زۆر دوورو درێژە، بەڵام لەگەڵ ئەم دووری و مەسافە

أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّۢا بِسِيمَىٰهُمْ وَنَادَوْا۟ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُوا۟ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرەکان کردو پاداش‌و سەرەنجامی خواپەرستانی روون کردەوە، بەشوێن ئەوەدا باسی گفتوگۆی نێوان کافرو موسوڵمانەکان دەکا، واتە: ئێمە ئێستا لەبەردەم مەشهەدێکی تری رۆژی قیامەتین، مەشهەدێك کە پەیوەندی بە مەشهەدی پێشووەوە هەیە. ئەوەتا پاش ئەوەی بەهەشتییەکان بەمراد دەگەن‌و بەجێگەو مەکانی خۆیان شاد دەبن دۆزەخییەکان لەسەرەنجامی خۆیان دڵنیا دەبن‌و سزای سەخت لە خۆیان دەگرێ‌و هیوا بڕاو دەبن! بەهەشتییەکان بانگ لە دۆزەخییەکان دەکەن، پرسیاریان لێ دەکەن، ئایا ئەوەی خودا لە دونیادا وادەی پێ دابوون هاتە دی؟؟

لەلایەکی ترەوە بەهەشتییەکان لەناو خۆیاندا پرسیار لە یەکتری دەکەن، هەروەها دۆزەخییەکان لە ناو خۆیاندا لە یەکتری دەپرسن، بۆ ئەوەی بەهەشتییەکان زیاتر هەست بە نیعمەتەکانی بکەن‌و دۆزەخییەکان پتر شەرمەزاریی‌و ریسوایی‌و پەشێمانی ئازاریان بدا.

جا هەرچەندە بەهەشت لەبەرزترین ئاسمانەو دۆزەخ لە خوارترین زەوییەو نێوان بەهەشت‌و دۆزەخ زۆر دوورو درێژە، بەلام لەگەڵ ئەم دووری‌و مەسافە

زۆرییەشدا ئەم گفتوگۆیە وێ دەچێ ئەنجام بدرێ، چونکە جیهانی قیامەت جیهانێکی ترەو زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ جیهانی دونیادا، حاڵو چۆنیەتی وای هەیە ئادەمیزاد دەتوانێ لە زۆر دوورەوە ببینێو ببیستێ! دووریی‌و نزیکی لە ئەندازەبەدەر نابنە لەمپەڕی بینین‌و بیستن!!

دەی با ئێستا بە تێفکرین‌و وردبینییەوە گوێ بۆ گفتوگۆی نێوان بەهەشتی‌و دۆزەخییەکان بگرین‌و دیمەنەکان بێنینە پێش چاوی خۆمان کە دەفەرموێ: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا﴾ واتە: بەهەشتییەکان دوای جێگیربوونیان لە بەهەشتداو جێگیربوونی دۆزەخییەکان لە دۆزەخدا، روو دەکەنە لای دۆزەخییەکان‌و شانازییان بەسەرەوە دەکەن‌و بەتانەو تەشەر لێان بانگیان لێ دەکەن‌و تاوان‌و سەرپێچی کردنی دونیایان وەبیر دەهێننەوەو پێیان دەڵێن: ئەوەی پەروەردگارمان وادەی پێ دابووین هێنایە دی‌و راست‌و حەق بوو، ئێمە بە مرازگەیشتووین‌و بە بەهەشت شادبووین! ئایا ئێوەش ئەوەی خودا وادەی پێ دابوون لە ریسواکردن‌و سزادان‌و تۆڵە لێ ستاندن راست‌و حەق دەرچوو هاتە دی؟

پرسیارەکە ئەوەی لە خۆ گرتووە کە بەهەشتییەکان دان بە راستی پەیامی پێغەمبەراندا دەنێن‌و ئیعتیراف بە هاتنە دی وادەی خودای خۆیان دەکەن، لەهەمان کاتدا سەرزەنشت‌و لۆمەکردنی دۆزەخییەکانی تێدایە لەسەر کارو کردەوە خراپ‌و تاوان کردن لەخودی خۆیان کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستوونەتەوەو بڕوایان پێ نەکردوون!!

﴿قَالُواْ نَعَمْ﴾ دەڵێن: بەڵێ، ئەوەی خودا هەڕەشەی پێ لێ کردبووین‌و پێغەمبەران چۆنیان پێ ڕاگەیاندبووین هاتە دی‌و راست‌و حەق دەرچوو! ئەوەتا لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەسوتێندرێین! ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کافرەکان رۆژی قیامەت ئیعتیراف بەوە دەکەن کە وادەو هەڕەشەکانی خودا حەق‌و راستن.

﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ ئیتر ئاکام‌و سەرەنجامی ئەو گفتوگۆیەی نێوان بەهەشتی‌و دۆزەخییەکان هاوتای ئەو پرسیارو وەڵامەو بڕدانی کافرەکان‌و ریسواکردنیان بەوە تەواو دەبێ کە بانگدەرێك بانگ دەکاو دەڵێ:

نـەفرینی خـودا لـە سـتەمکاران بێهەمیـشە لـە رەحمـەتی خـودا بـەدوور بـن‌و نەحەسێنەوە چونکە ئەوانە ستەمیان لە خودی خۆیان کردووە بـەوە کـە ئیمانیـان نەهێناوەو ملکەچی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی نەبوون.

ئەو بانگکەرە یان مالیکی دۆزەخە یـان فریـشتەیەکی تـرە خـودا فـەررمانی پـێ دەکا ئەو کارە ئەنجام بدا!

ئەمجار پێناسەی ستەمکارانمان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ ستەمکار ئەوانەن ئـادەمیزاد لەرێگەی خـودا لادەدەن‌و خـەڵکی لەرێگـەی راسـتی دوور دەخەنـەوە، دەیانـەوێ ئـەو رێگایـە خـوارو خـێچ بـێ، پـڕ لەقۆرت‌و پێچ بـێ بـۆ ئـەوەی کـەس پێیـدا نـەڕواو نەیکاتـە رێبـازی خۆی! ویـستی سـتەمکاران‌و هەوڵـدانیان بـۆ خـوارکردنی رێگا بەچـەند جۆرێـك دەبـێ‌و لەچـەند شێوەیەکدا رەنگ دەداتەوە:

١- رام کردنی نەفسی خۆیان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە کە شەریك دانانـە بـۆ خوداو شێواندنی یەکتاپەرستی بەتێکەڵاوکردنی دیاردەی بتپەرستی‌و عیبادەتکردن بۆ غەیری خوداو هاوەڵدانان بۆی لە خودایەتی‌و پەروەردگاریەتیدا، بەهیوای ئـەوە کە ئەو بتە لای خودا شەفاعەتی بۆ بکا!

٢- ستەم کردن بەوە کەم‌و زیادیی لە ئاییندا بکەن، شتی وا دەهێـنن کـە نـە لـە قورئان‌و نە لە حەدیثدا نەبێ! داب‌و نەریتی جۆراو جۆر بـەناوی ئاییـنەوە بێننـە کایەوەو بە ئایینی حسێب کەن.

٣- ستەمکردن بەوە کە زندیق‌و بێ بڕوا بن، بیروباوەڕی زەندەقیی‌و دووڕوویـی بڵاوبکەنەوە، شك‌و گومان بخەنە سـەر بیروبـاوەڕی موسـوڵمانان بـۆ ئـەوەی خـەڵکی لەو رێبازە خوداییە لا بدەن.

٤- سـتەمکردن بـەوە کـە زێـدەڕەوی لـە ئاییـندا بکـەن، کـارە ئاسـانەکانی گـران بکـەن، حوکمـە فراوانـەکانی تـەنگ بکەنـەوە. زیـادو کـەمی لـە حـوکم‌و عیبـادەت‌و حەڵاڵ‌و حەرامەکان بکەن.

﴿وَهُم بِالآخِرَةِ كَافِرُونَ﴾ ئەوانـە وێـڕای ئـەو هـەموو گـومڕایی‌و گومڕاکردنـە بڕوایـان بـە رۆژی قیامـەت نیـە، بـێ بڕوایـی‌و کافربوونیـان بـە رۆژی قیامـەت لـە

ناخیاندا ره‌گی داکوتاوه که تاوانێك ده‌که‌ن ترسی تۆڵه لێ ستاندنی رۆژی قیامه‌تیان نیه، که ئینکاری رۆژی قیامه‌ت ده‌که‌ن ترسی سه‌رزه‌نشت‌و تانه‌ی رۆژی قیامه‌تیان نیه!

به‌کورتی ئه‌وانه بوونه له‌مپه‌ر له‌به‌رده‌م رێگای خوداو بڕواشیان له رۆژی زیندوبوونه‌وه نیه! بڕوایان به ڕووبه‌ڕوو بوونه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار نیه، به‌درۆی ده‌زانن، بۆیه هیچ به‌لایانه‌وه گرنگ نیه که کرده‌وه‌ی خراپ ده‌که‌ن‌و قسه‌ی نابه‌جێ ده‌ڵێن: چونکه ترسی حیساب‌و لێکۆلینه‌وه‌و سزادانیان نیه، ئه‌وان له رووی کردارو گوفتاره‌وه خراپترین ئاده‌میزادن.

﴿وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ﴾ له نێوان به‌هه‌شتییه‌کان‌و دۆزه‌خییه‌کان شووره‌و له‌مپه‌رێك هه‌یه، ناهێڵێ دۆزه‌خییه‌کان بگه‌نه به‌هه‌شت، ئه‌م شوورایه ئه‌وه‌یه: که په‌روه‌ردگار له ئایه‌تێکی تردا ده‌رباره‌ی ده‌فه‌رموێ: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ – الحديد/١٣﴾. تۆپه‌ڵاك‌و سه‌رانسه‌ری ئه‌م شوورایه بریتییه له ئه‌عراف، ده‌رباره‌ی چۆنیه‌تی ئه‌عراف زۆر رای جیاجیا هه‌ن، رای په‌سه‌ندو راست ئه‌وه‌یه؛ که ئه‌عراف ئه‌و شووره‌و په‌رده‌یه‌یه که له نێوان به‌هه‌شت‌و دۆزه‌خ‌و دانیشتوه‌کانیان دایه، یان تۆپه‌ڵاك‌و لوتکه‌ی ئه‌و شووره‌یه‌یه که کۆمه‌ڵێکی ئاده‌میزاد له‌سه‌رن، له‌وێوه چاویان له به‌هه‌شتییه‌کان‌و دۆزه‌خییه‌کانه وه‌کوو ده‌فه‌رموێ: ﴿وَعَلَى الأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلاًّ بِسِيمَاهُمْ﴾ له‌سه‌ر ئه‌و شوورایه‌ی به‌هه‌شت‌و دۆزه‌خ کۆمه‌ڵێك هه‌ن چاویان له به‌هه‌شت‌و دۆزه‌خه دانیشتوانی به‌هه‌شت، دۆزه‌خییه‌کان ده‌بینن، به‌شێوه‌و روخسارو سه‌رو سیما به‌هه‌شتی‌و دۆزه‌خییه‌کان ده‌ناسن، نیشانه‌کانیان ده‌زانن، نیشانه‌یێك له نیشانه‌ی به‌هه‌شتییه‌کان روونـاکی‌و دره‌وشانه‌وه‌و سپییه‌تی ده‌م‌و چاویانه، هی دۆزه‌خییه‌کانیش ته‌ڵخی‌و ره‌شی ده‌م‌و چاویانه! وه‌کوو له شوێنێکی تردا که قورئان نیشانه‌کانیان دیاری ده‌کاو ده‌فه‌رموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ، ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ، وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ، تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ، أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ – عبس/ ٣٨ – ٤٢﴾.

دەربارەی ئەهلی ئەعراف، ئەهلی ئەعراف کێن و چ کەسن؛ چەند راو بۆچوون هەیە، رای صەحیح و راست ئەو رایەیە کە دەڵێ: ئەوانە کۆمەڵێکن چاکەو خراپەیان هاوتەرازوون و بەرامبەرن، دەستەیەکی یەکتاپەرستن، تاوان و خراپەکانیان رێگای بەهەشتیان لێ گرتوون، چاکەو حەسانەتیان رێگای دۆزەخیان لێ قەدەغە کردوون، لەسەر ئەو شوورایە رایان دەگرن هەتا پەروەردگار دەربارەیان بڕیار دەداو سەرەنجامیان دیاری دەکا.

ئەبو بەکری کوڕی مەردەوەیهی لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرا دەربارەی ئەو کەسانەی خراپەیان بەرامبەرن ئایا چیان لێ دەکرێ؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (أولئِكَ أَصْحَابُ الْأَعْرافِ، لَمْ يَدْخُلُوهاَ وَهُمْ يُطْمَعُونَ).

ئیبنولجەییانی ئەلئەنصاری و بەیهەقی و هی تریش لە حوزەیفەوە دەگێڕنەوە گوتوویەتی: خەڵکی سەر ئەعراف کەسانێکن چاکەو کردەوەی باشیان لە دۆزەخ رزگاری کردوون و خراپەکانیان بەهەشتیان لێ قەدەغە کردوون، لەسەر ئەعراف هێڵدراونەوە هەتا بڕیاری خوداییان بۆ دەردەچێ، جا لە کاتێکدا ئەوان لەم چاوەڕوانییەدان، پەروەردگار خۆیان نیشان دەداو پێیان دەفەرموێ: بڕۆن بچنە ناو بەهەشتەوە، بێگومان من لێتان خۆش بووم!

لە گێڕنەوەیەکی تردا هەر لە حوزەیفەوە دەفەرموێ: پەروەردگار ئادەمیزاد کۆدەکاتەوە، پاشان بە تاقمی سەر ئەعراف دەفەرموێ: ئێوە چاوەڕوانی چین؟ دەڵێن: چاوەڕوانی فەرمانی تۆین، دەگوترێ بێگومان چاکەکانتان رێگای چوونە ناو دۆزەخی لێ گرتوون، خراپەکانیشتان رێگای چوونە ناو بەهەشتی لێ گرتوون دەسا بەهۆی لێخۆشبوون و رەحم و بەزەیی منەوە بچنە ناو بەهەشتەوە!

﴿وَنَـادَوْاْ أَصْـحَابَ الْجَنَّـةِ أَن سَـلاَمٌ عَلَـيْكُمْ﴾ تاقمی سەر ئەعراف بانگی بەهەشتییەکان دەکەن و پێیان دەڵێن: سەلامی خوداتان لەسەر، ئەم سەلامکردنە یان بریتییە لە دۆعاو پاڕانەوە لە خودا بۆیان، یان هەواڵ پێدانیان کە لە ناخۆشی رزگاریان بووە، ئەمە ئەگەر پێش چوونە ناو بەهەشتیان بێ، ئەگەر دوای چوونە ناو بەهەشت بێ ئەوە هەر سەلام کردنەو بەس! چونکە لە شوێنێکی تردا

دەفـەرموێ: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا، إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا – الواقعة/ ٢٥ – ٢٦﴾.

ئەعرافييـەكان بـانگى بەهەشـتييەكان دەكـەن حـاڵو وەزعيـان وەهايـە ﴿لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ﴾ هێشتا نەچوونە ناو بەهەشتەوە بەڵام بەتەماى چوونە نـاو بەهەشتن چونكە حيسابو لێكۆڵينەوەيان بە ئاسانى لەگەڵ كراوە، لەهـەمان كاتـدا بڕوايـان بـە فراوانـى رەحمـەتى خـودا زۆرە. حەسـەنى بەصـرى كـە ئـەم ئايەتـەى خوێندەوە وتى: سوێند بە خودا ئەم هيواو بەتەما بوونەى بۆيە خستە دڵيانەوە تا رێزيان لێ بنێو دەيەوێ تەكريميان بكا، خەڵكى لەو رۆژەدا لە نێوان تـرسو هيـوادا دەژين.

ئـەبو نـەعيم لـە عومـەرى كـوڕى خەتتابـەوە ريوايـەت دەكا كـە فەرموويـەتى: ئەگەر بانگكەرێك بانگ بكا بڵێ ئەى خەڵكينە! هەمووتان بـچنە نـاو ئـاگرەوە جگـە لە پياوێكتان مـن هيـواى ئـەوەم دەبـێ كـە مـن ئـەو پيـاوە لادراوە بم! ئەگـەر بـانگ بكرێ بڵێ: هەمووتان بچنە ناو بەهەشتەوە جگە لە پياوێكتان ترسم هەيە من ئەو پياوە بم.

﴿وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاء أَصْحَابِ النَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لاَ تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾

ئەعرافييـەكان كـە چـاويان بـەرەو لاى دۆزەخييـەكان وەردەگێـڕدرێو ئـەو حـاڵو فەزيعەتـەى ئـەوان دەبيـنن چـاويان لێ هەڵـدەنگوێ، دەسـت دەكـەن بـە پاڕانـەوەو لالانەوە لە پەروەردگارو دەڵێن: پـەروەردگارا! هـاوار! نەمانخەيـە ريـزى سـتەمكارو كافرانەوە، خودايە! دەخيل هانات بۆ دێنين مەمانخەرە پێڕى ئەوانەى ستەميان لـە خودى خۆيان كردووە،گوێڕايەڵى فەرمانو جڵەوگيرييەكانى تۆ نەبوون، بڕوايان بـە يەكتاپەرستىو راستى پێغەمبەرانو زيندوبوونەوە نەبووە.

ئايەتەكە تەعبيرى بە (مبنى للمجهول) لێداوەتـەوە بـۆ ئـەوەى ئامـاژەى ئـەوەى تێدا بێ كـە روو كردنـە لاى دۆزەخيـان بـە مەبەسـتو حـەزى خۆيـان نيـە بـەڵكوو پێيـان ناخۆشـە ئـەو ديمەنـە ببيـنن، بـەبێ مەبەسـت چـاويان لـە دۆزەخييـەكان هەڵدەنگوێو دەيان بينن.

## گفتوگۆی نێوان ئەعرافییەکان‌و دۆزەخییەکان

﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

لە ئایەتی پێشوودا باسی ئەوەی کرد کە ئەعرافییەکان چاویان لە دۆزەخییەکان هەڵدەنگوێ‌و ئەو دیمەنە سامناکەی ئەوان دەبینن، لەخودا دەپارێنەوە کە لە پێڕی ئەوان حلێبیان نەکا، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی ئەوە دەکا کە ئەعرافییەکان بانگی چەند کەسێکی ناو دۆزەخ دەکەن‌و ئاخاوتنیان لەگەڵ دەکەن‌و تانەو تەشەریان لێ دەدەن، دەفەرموێ: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ الأَعْرَافِ رِجَالاً يَعْرِفُونَهُمْ بِسِيمَاهُمْ﴾ ئەمە بانگەوازییەکی ترە ئەعرافییەکان ئاراستەی بڕێ لووتبەرزو ملهوڕەکانی دونیایان دەکەن کە لەناو ئاگری دۆزەخدا سزایان دەدرێ ئەو ملهوڕانەی کە لەدونیادا پشتیان بەهێزو توانای خۆیان دەبەست موسوڵمانەکانیان بەهیچ نەدەزانی‌و بەچاوی سووکایەتی سەیری موسوڵمانە هەژارو بێ نەواکانیان دەکرد، ئەم بانگکردنەی ئەعرافییەکان بەمەبەستی سەرکۆنە کردن‌و دڵناخۆش کردنی ملهوڕە موشریکەکان‌و سەرانی کوفرو ئیلحادە، کەبەشێوەو روخسارو نیشانەی تایبەتییان دەیاننناسنەوە.

واتە: بڕێ لە ئەعرافییەکان بانگی چەند کەسێکی موشریك‌و ملهوڕ دەکەن کە لەناو دۆزەخ سزا دەدرێن، ئەعرافییەکان ئەو ملهوڕانە دەناسنەوە بەشێوەو روخساری رەش‌و خەڵوزاوی‌و تەپ‌و تۆزاوی‌و چاوشین‌و شێوە شێواو! لە خەڵکانی تر جیایان دەکەنەوە، ﴿قَالُواْ مَا أَغْنَى عَنكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ پێیان دەڵێن: ماڵ‌و سامان کۆکردنەوەتان چ سوودێکی پێ گەیاندن یان کۆمەڵ‌و کوڕو

زۆری‌و دەسەڵاتی ڕەواڵەتی دونیاتان چ قازانجێکی بۆتان نەبوو، هەروەها لووتبەرزیی‌و پشت هەڵکردنتان لە ئیمان هێنان بەپەیامی پێغەمبەری ئیسلام هیچ سوودی بۆ ئێوە نەبوو! واتە: کۆمەڵ‌و زۆری‌و لووتبەرزیتان لە ئیمان هێنان لە سزای دۆزەخ ڕزگاری نەکردن، بەڵکوو ئەوەتا کەوتوونە ناو ئەو سزاو تەنگ‌و چەڵەمەیەوە کە ناتوانن خۆتانی لێ قوتار بکەن! هەروەها لووتبەرزیی‌و بەزلزانیتان بەسەر موسوڵمانە هەژارو بێ نەواکاندا چ سوودێکی پێ نەگەیاندن!

ئەمجار ئەو قسانەیان وەبیر دێننەوە کە دەربارەی موسوڵمان لەدونیادا دەیانکردن بۆ زێدەتانە لێدان‌و سەرکۆنەکردن بە ئاگاداری ئەو موسوڵمانە هەژارانەی کە لەدونیادا ئەوان دەیانچەوساندنەوە بەهۆی بڕواهێنانیان بەپەیامی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) وەکوو صوهەیبی ڕۆمی‌و خوبەیب‌و بیلالی حەبەشی‌و بنەماڵەی یاسر، ئیشارەتیان بۆ دەکەن‌و دەڵێن: ﴿أَهَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ؟﴾ ئایا ئەمانەبوون ئەوانەی لە دونیادا سوێندتان دەخواردو جەختتان لەسەر دەکردەوەو دەتانگوت: ئەمانە هەرگیز خودا ڕەحمیان پێ ناکاسەرکەوتوویان ناکا، چونکە هەژارو بێ نەواو بێ کەس‌وکارن! دەی خۆ بۆچوونەکانتان وا دەرنەچوون‌و ئەوەتا ئەو موسوڵمانە هەژارو بێ نەوایانە لەناو خۆشی‌و لەززەتی بەهەشتدا ڕادەبوێرن‌و لەبەروبووم‌و میوەی بەهەشت دەخۆن‌و دەخۆنەوە، دڵ خۆش‌و لەشساغ‌و بەمرازگەیشتوو تەڕ دەماغ‌و دەم بە پێکەنین‌و شادمانن! ئێوەی کافرو ملهوڕو لووتبەرزیش لەناو ئاگری بێ ئامانی دۆزەخدا دەتلێنەوە!!

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار ماوەیەك ئەو برە ئادەمیزادانە لەسەر شوورەی ئەعراف دەهێڵێتەوە، بەچاوی خۆیان سزای دۆزەخییەکان‌و لەززەت‌و خۆشی بەهەشتییەکان دەبینن‌و ماوەیەك دەڕواننە بەهەشت‌و زیاتر حەزیان لێ دەبێ، جارجارەش چاویان لە دۆزەخ‌و سزای ملهوڕو ستەمکاران هەڵدەنگوێ‌و ئەوەندەی تر تامەزرۆی بەهەشت دەبن، پەروەردگار پێیان دەفەرموێ: ﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ﴾ بڕۆنە ناو بەهەشتەوە، لەنیعمەت‌و خۆشییەکانی لەززەت وەربگرن، هیچ ترسی داهاتووتان نەبێ، مەترسن لەوە بەولاوە هیچ ئاستەنگ‌و

ناخۆشییەك نایەتە ڕێگاتان، تووشی تەنگو چەڵەمە نابن، هەروەها غەمو پەژارە بۆ ڕابردووتان ناخۆن، پەرۆشی شتی بەجێماوی دونیاتان نیەو هیچ شتێك نیە ژیانی كامەرانیو ڕابواردنی بەهەشتان لێ تاڵ بكا.

سوودو مەبەستی ئەم گفتوگۆیەی نێوان ئەعرافییەكان لەگەڵ دۆزەخییەكانو بەهەشتییەكان ئەوەیە كە ئادەمیزاد بزانن پاداش بەئەندازەی كردەوەیە، هەروەها بۆ هەڵنانی موسوڵمانانە كە پێشبڕكێ بكەن لە كردنی كردەوەی چاكو بەسوودا، چونكە بۆ قیامەت ئەوەی پشتی پێ ببەسترێ – دوای ڕەحمەتی خودا – كردەوەی چاكەیە نەك ماڵو داراییو خزمو كەسوكارو هۆزو عەشیرەت، بۆ ئەوەی بیسەرانی قورئان هەڵبنێ بۆ كردنی كرداری چاكو خوداپەسەند، هەروەها بۆ ئەوەی بزانن كە لەو ڕۆژەدا هەموو كەس بەشێوەو ڕەنگو ڕوخساری تایبەتی دەناسرێتەوە، خوداپەرستان دەمو چاو نوورانیو سپی ڕەنگو پرشنگدارن، تاوانباران بە تەپو تۆزاویو ڕەنگ ڕەش داگیرساویو چاوشینیو شێوە شێواوی دەناسرێنەوە!

## پاڕانەوەو داواكاری دۆزەخییەكان لە بەهەشتییەكان بۆ تۆزێ ئاوو هەندێ خۆراك

﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ

لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾.

پاش ئەوەی قورئان گفتوگۆی نێوان بەهەشتیو ئەعرافییەکانو دۆزەخییەکانیشی نمایش کرد، ئەمجار داواو پاڕانەوەی دۆزەخییەکان لە بەهەشتییەکان رادەنوێنێ: کە چۆن داوایان لێ دەکەن قوومە ئاوێکیان بدەنێ، یان پارووە خواردەمەنییەکیان بگەیەننێ، دەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەمە مەشهەدێکە لە مەشاهیدە ترسناکەکانی رۆژی قیامەت کە حاڵو چۆنیەتی دۆزەخییەکان دیاری دەکا، لەم ئایەتەدا پەروەردگار هەواڵی زەلیلیو چارەڕەشی دۆزەخییەکانمان پێ رادەگەیەنێ کە چۆن دۆزەخییەکان داوای ئاوو خواردەمەنی لە بەهەشتییەکان دەکەنو ئەوانیش گوێیان پێ نادەن.

واتە: دۆزەخییەکان داوا لە بەهەشتییەکان دەکەن کە بڕێ لەو نیعمەتانەی پێیان دراوە لە خواردنو خواردنەوە لەبەهەشتدا بنێرنە خوارێ بۆ دۆزەخو فریایان بکەون، لێیان دەپاڕێنەوە کە هەرچۆنێك بێ بڕێ لە ئاویان بۆ بڕێژنە خوارێ، هەندێ خۆراکیان بۆ بنێرنە خوارێ بەڵام وەڵامیان نادرێتەوە. لێیان دەپاڕێنەوە هانایان بۆ دەبەن دەشزانن کە وەڵامیان نادرێتەوە، بەڵام لەبەر سەرلێ شێوانو تینوایەتی زۆرو برسیایەتی لە ئەندازە بەدەر دەشزانن کە داواکەیان جێبەجێ ناکرێ ئەوان داواکەیان هەر دەکەن!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە ئەهلی ئەعراف دەبرێنە ناو بەهەشتەوە ئەهلی ناو دۆزەخ تەماعیان بەردەکەوێ هەندێ نائومێدییان دەڕەوێتەوە! دەڵێن: خودایە! ئێمە خزمو ناسیاومان لەناو بەهەشتدا هەن، رێگەمان بدە با چاومان پێیان بکەوێو ئاخاوتنیان لەگەڵدا بکەین، پەروەردگار فەرمان دەکا بە بەهەشت کەپەردە لەسەر خۆی لاداو خۆ نیشان دۆزەخییەکان بدا، ئەمجار ئەهلی جەهەنەم خزمو ناسیاوەکانی خۆیان لەناو نازو نیعمەتی بەهەشتدا دەبیننو دەیانناسنەوە، ئەهلی

بەهەشت سەیری خزمو ناسیاوەکانی خۆیان دەکەن لە ناو دۆزەخدا بەلاّم نایانناسنەوە، چونکە دەمو چاویان رەش هەلگەڕاوەو شێومیان گۆڕاوە، ئەهلی دۆزەخ بانگی ئەهلی بەهەشت دەکەن، بەناوی خۆیان بانگیان لێ دەکەن! بەتایبەتی داوای ئاویان لیّ دەکەن، چونکە بەهۆی گەرمی دۆزەخ ناوسکیان لەگەرمانا دەجۆشیّ.

سەعیدی کوڕی جوبەیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمویّ پیاو هەیە بانگی باوکی یان برای خۆی دەکا، پێی دەلیّ: وا سووتام، لەگەرماندا مردم، بڕیّ ئاو بەسەرمدا بڕێژە، پێیان دەگوتریّ وەلاّمیان بدەنەوە، ئەوانیش ﴿قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ دەلیّن: بێگومان پەروەردگار خواردنو خواردنەوەی بەهەشتی لەسەر کافران حەرام کردووە!

﴿الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا﴾ ئەو کافرانەی کە بۆخۆیان هۆکاری سەرەکی بوون لەوەی کە خواردنو خواردنەوەی بەهەشتیان لیّ قەدەغە بکریّ، چونکە ئایینی خۆیان کردبووە گالتەو گەپ، یان گالتەو کاری پڕوپووچیان کردبووە ئایین، بەژیانی دونیاو جوانیو زەرقو بەرقی ژیان لەخۆیان بایی بووبوون، وازیان لەکارو کردەوەی بەسوود هێنابوو.

واتە: ئەو کافرانە گالتەیان بە ئایین دەهاتو بەگرنگیان نەدەزانی، یان گالتەو گالتەجاڕییان کردبوو بە ئایین بۆخۆیان، هەمیشە خەریکی ئەنجامدانی کاری پڕوپووچ بوون، کارێکیان نەکردووە کە مشتو مالّی دلّو دەروونیان بکاو سوودبەخش بیّ، بەلّکوو کردەوەکانیان بریتی بوو لەو کارانەی کە ئادەمیزاد لەکاری گرنگ بیّ ئاگا دەکا، یان کارەکانیان بیّ مەبەستو ئاکامی باشە، وەکوو کاری مندالاّنە کە هەر بریتیە لە خۆخافلاّندن!

﴿وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ لە ژیانی دونیادا لە خۆیان بایی بووبوون، بەجوانیو لەززەتو خۆشییەکانی گیرۆدە بووبوون! بە تەمای تەمەنی درێژو خۆشگوزەرانیو زۆرکردنی مالّو سامانو وەدەستهێنانی پلەو پایە، ئاگایان لە قیامەتو ئیش بۆ کردنی نەبووە! بەپێچەوانەوە ئەهلی بەهەشت کە لە ژیانی دونیایاندا هەولّو تێکۆشانیان بۆ وەدەستهێنانی پلەو پایەی قیامەت بووە، دلّنیابوون لەوەی کە دونیا کێلگەی قیامەتە، هەموو هەولێکیان بۆ بەختەوەریی قیامەت تەرخان کردبوو.

تەنانەت کە پێیان خۆش بووە نیعمەتی دونیایان بەسەردا بڕێژێ بۆ ئەو مەبەستە بووە کە یارمەتیدەریان بێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە دەبنە هۆی ڕەزامەندیی پەروەردگارو خۆئامادەکردن بۆ ژیانێکی بەختەوەرو کامەرانی هەتا هەتایی!! بۆیە پاداشی ئەو خوداپەرستانە بەهەشتی رازاوەو کامەرانییە.

سزای ئەوانەی گاڵتەیان بە ئایین دەهات و گرنگیان پێ نەدەداو بەژیانی دونیا لەخۆبایی بووبوون ئاگری دۆزەخە... ئەوەتا ﴿فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَذَا﴾ ئەمڕۆ مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین بەشێوەی مامەڵە کردنی کەسێك کە شت لە بیر خۆی بەرێتەوە، واتە: لێیان دەگەڕێین با لەناو دۆزەخدا بسوتێن؛ هەر لێیان ناپرسینەوە، مامەڵەی شتی لەبیرچووەومیان لەگەڵ دەگەین، ئەگینا پەروەردگار هیچ شتێکی لە بیر ناچێ و هیچ شتێك نیە لە زانیاری خودا ون بێ، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فِي كِتَابٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى – طه/٥٢﴾.

کەوابوو ئەم لەبیرچوونەوەی پەروەردگار ئوسلووبێکی بەلاغییەو بۆ موقابەلەو بەرامبەریی کردنە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿نَسُواْ اللّهَ فَنَسِيَهُمْ – التوبة/٦٧﴾. یان دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى – طه/١٢٦﴾.

بەکورتی مانای ﴿فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ﴾ ئەمڕۆ مامەڵەی شتی لەبیرچووەومیان لەگەڵ دەکەین دوعاو پاڕانەومیان لێ وەرناگرین، بەخێرو چاکە باسیان ناکەین، لەناو ئاگردا دەیانهێڵینەوەو لێیان دەگەڕێین ﴿كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَذَا﴾ وەکوو چۆن ئەوان لە دونیادا ئەم ڕۆژەیان لە بیر خۆ بردبۆوە هەرگیز وەبیر خۆیان نەدەهێنایەوەو گرنگیان پێ نەدەدا، ﴿وَمَا كَانُواْ بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ هەروەکوو چۆن ئینکاری ئایاتی خودایان دەکردو، بڕوایان بە پێغەمبەران نەدەکردو بەدرۆیان دەخستنەوە بەردەوام دژی پەیامەکەیان دەوەستان!

## باسی فەضڵو گەورەیی قورئان بەسەر ئادەمیزاداو حاڵو چۆنیەتی کافران رۆژی قیامەت

﴿ وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ ۚ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُوا لَنَا أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ۚ قَدْ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی بەهەشتییەکانو دۆزەخییەکانو ئەعرافییەکانی بەیان کرد، گفتوگۆی نێوانی ئەم سێ تاقمەی رانواند؛ کە هەموویان نمایشو مەشهەدی سەرنج راکێش بوونو ئادەمیزاد هەڵدەنێن بۆ وردبوونەوەو تێفکرین لە ئاکامو سەرەنجام، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی شەرەفو گرنگی قورئانی پیرۆز دەکا، سوودو قازانجی بۆ ئادەمیزاد روون دەکاتەوە، ئەوە رادەگەیەنێ کە قورئان بەڵگەیە لەسەر ئادەمیزاد، هەموو بروبیانووی کافرەکانی پووچ کردەوە، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی بەدرۆخەرەوەکانو ئەو تەنگو چەڵەمانەی تووشیان دێن رادەنوێنێ، پەشیمانیو ئاهو حەسرەتو ئاواتەخوازییان بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بگەرێنەوە بۆ دونیاو بۆ چاك کردنو گۆڕینی هەڵوێستو کرداریان یان ئاواتەخوازییان بۆ ئەوەی کە شەفاعەتکارێك تکایان بۆ بکاو لەو سزا سامناکە رزگاریان ببێ دەخاتە روو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ بیگومان پەراوێکمان بۆ ئەو موشریكو بتپەرستانەی عەرەبو خەڵکانی تریش

هێنـاوە کـە ئـەحکامو دەقـەکانی روونو ئاشـکرانو چەواشـەکاریی تێـدا نیـە، ئایەتـەکانیمان بـە وتـەی پـڕ مانـاو پەنـدئامێزو ئامۆژگـاریو چـیرۆكو دیـرۆكو ئـەحکامو بـەڵێنو هەڕەشـە، شـی کردۆتـەوە، بـەزانیاری مەعریفـەتێکی تـەواوە راگەیانـدراون؛ بـۆ ئـەوەی ئادەمیزادەکـانی سـەردەمی پێغەمبـەرو دووایـیش بیروباوەڕی خۆیان راست بکەنەوە، دڵو دەروونـی خۆیـان پـاك بکەنـەوە، وەکوو لـە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ – النساء/١٦٦﴾. بۆئەوەی لەژێر رۆشنایی ئایەتەکانیدا بیروباوەڕی خۆیان راست بکەنەوە، خۆشبەختیو کامـەرانیی بەدەست بێنن، ﴿هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بۆ ئەوەی ببێتە رەهنوماو مایـەی رەحمـەت بـۆ ئەوانـەی بـڕوای پـێ دەکـەنو دەیکەنـە پـەیڕەوو پرۆگرامـی خۆیـان لـە ژیانـداو پابەندی حوکمەکانی دەبن!

خوێنـەری موسـوڵمانی هێـژا! بڕوانـە قورئـان چـۆن بناغـەی ئـایینی روون کردۆتەوە، هەڕەشەی توندی لە بتپەرستیو هاوەڵ دانـان بـۆ خـودا کـردووە، یاسـاو نیظامی رەساو لەباری بۆ مرۆڤایەتی داناوە، ئـادەمیزادانی هـەڵناون بـۆ بینـاکردنو پێشکەوتنو شارستانیەتو گەشەکردنی هەردوو لایەنی ماددیو گیـانی، ئـەویش لـە رێگەی تێفکرینو وردبونەوەو هەڵنانی ئـادەمیزاد بـۆ لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوە، لە زۆر ئایەتدارەخنـەی لـە لاسـاییکەرەوەو شـوێنکەوتنی کوێرانـە گرتـووە، مـەدحی عەقڵو عەقڵکاری کردووە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – الرعد/٤﴾. یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَـاتُواْ بُرْهَـانَكُمْ إِن كُنـتُمْ صَـادِقِينَ – البقـرة/١١١﴾. لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە ئـایینی ئیـسلام ئـایینی عـەقڵو تێفکـرینو سروشـتە، سەرچـاوەی هیدایـەتو حیکمـەتو رەحمەتـە، مایـەی خۆشبەختی ئادەمیزادە لە دونیاو قیامەتدا ﴿هَـلْ يَنظُـرُونَ إِلاَّ تَأْوِيلَـهُ﴾ ئـەو کافرو خودانەناسانە چاوەڕوانی ناکەن لەم کتێبە جگە لـە سـەرەنجامی ئـەوەی کـە لەسـەر زوبانی پێغەمبەران پێیان راگەیاندراوە لە سزاو پاداش! واتە: جگـە لـەوەدی هـاتنی ئەو هەواڵو وادەو بەڵێنو هەڕەشانەی کە تێیدا راگەیاندراون هیچی تر لە پێـشیان نیـەو چاوەڕوانی ناکـەن! جگـە لـەو سـزاو پاداشـەی لـە پێـشیانە، جگـە لـە دۆزەخو بەهەشت هیچی تر چاوەڕوان ناکەن.

لە رەبیعی کوڕی ئەنەسەوە ریوایەت کراوە کە وتوویەتی: بەردەوامو پەیتا پەیتا ئەو شتانەی قورئان هەواڵی پێداوەو ئاماژەی پێ کردووە دێنە جێو روودەدەن تا رۆژی قیامەت تەواو دەبێو حیسابو لێکۆڵینەوە کۆتایی دێو ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوەو ئەهلی دۆزەخ دەخزێندرێنە ناو ئاگرەوە ئەو کاتە هەواڵەکانی قورئان (تاویل)ەکانی کۆتاییان پێ دێ! ﴿يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾ ئەو رۆژەی هەواڵەکانی قورئان کۆتاییان پێ دێ وادەو بەڵێنو هەڕەشەکانی دێنە جێ، راستی ئەو شتانەی خەبەری پێداوە ئاشکرا دەبن، هەموو شکو گومانێک دەڕەوێتەوە، ئەوانەی پەیڕەوی ئەو قورئانەیان نەکردووەو لە دونیادا لە بیر خۆیان بردبووەوە روویان لێ وەرگێڕابوو دەڵێن: بێگومان ئەوەی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان پێیان دەوتین هەمووی راست بوو، ئەوانەی بەحەق هاتبوونو پەیامەکەیان هەقو راست بوو، ئاشکرا بوو ئەوان لەسەر حەق بوونو ئێمە بەنەفامیی پشتمان لەو پەیامە راستە کردو روومان لێ وەرگێڕا، بۆیە بەم شێوە سزامان درایەوە! خەتای خۆمانەو خۆمان بەخۆمان کرد!

ئەمجار دەکەونە مقۆمقۆی ئەوە ئایا رێگای رزگاربوونیان دەست دەکەوێ، ئاواتەخوازی ئەوە دەبن بەهەر شێوەیەک بێ رزگاریان بێو دەڵێن: ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَاء فَيَشْفَعُواْ لَنَا﴾ ئایا ئێمە تکاکارێک، شەفاعەتخوازێ دڵسۆزێکمان هەیە شەفاعەتمان بۆ بکاو لەم بەدبەختیو چارەڕەشییە رزگارمان ببێ ﴿أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾ یان دەکرێ بگێڕدرێینەوە بۆ دونیاو ژیان دەست پێ بکەینەوە جا لەوێ هەڵوێستی خۆما بگۆڕینو کردەوەی چاک بکەینو پەیڕەوی ئایینو رێبازێک بکەین کە خودا پێی رازیی بێو شیاوی چوونە ناو بەهەشت بین؟؟

هۆی ئەوەی کە ئەوان لەسەرەتادا ئاواتەخوازی شەفاعەتکارن دوایی ئاواتی گەڕانەوە بۆ دونیا دەخوازن ئەوەیە کە بەبڕوای ئەو موشریکانە رزگاربوون لە دادگای پەروەردگاردا بەهۆی شەفاعەتکارانەوە دەبێ، جا کە مایەپووچ بوونو بۆیان دەرکەوت کە رزگاربوون بەهۆی بیروباوەڕی راستو کردەوەی چاکەوە وەدی دێ ئەمجار ئاواتەخوازی گەڕانەوەی دونیایان دەکەوێتە سەرو ئەو ئاواتە دەخوازن، بەڵام تازە کار لەکار ترازاوەو ئەو ئاواتەو هیچ ئاواتێکی تریان نایەنە دی، وەکوو لە

ئایەتێکی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ – الأنعام/ ٢٧ – ٢٨﴾.

پەروەردگار بۆ خۆی دەزانێ کە ئەوانە ئەگەر بشگەڕێنەوە بۆ جیهان، دەگەڕێنەوە سەر هەڵوێستی نالەبارو بیروباوەڕی پووچی خۆیانو پەندئامێز نابن! ئەمە جگە لەوەی کە تازە کار لەکار ترازاوە ﴿قَدْ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ ئەوانە خودی خۆیان لە کیس داوە بەوە کە خراونە ناو دۆزەخەوەو بۆ هەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوەو لێی قوتار نابن، ئەو خودا درۆزنو پەرستراوانەیان کە پێیان وابوو لای خودا تکایان بۆ دەکەن هیچ ڕۆڵێکیان نیەو ناتوانن هیچیان بۆ بکەنو ئاسەواریان دیار نیە، نە شەفاعەتیان بۆ دەکەن نە یارمەتییان دەدەن، نە لەو سزایە ساتەوەختێکیش ڕزگاریان دەکەن!

بەکورتی قورئان گەورەترین نیعمەتی خودایە بەسەر ئادەمیزاددا، چونکە ڕوونکەرەوەو ڕێ نیشاندەری ڕاستو دروستە بۆ ئیمانی صەحیحو حەقو خوداپەسەند، بۆ خوداپەرستی ڕاستو وەدەستهێنانی بەختەوەریی هەدوو جیهان.

## چەسپاندنی خودایەتیو پەروەردگاریەتی بۆ زاتی (الله)

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٥٤)﴾.

پەیوەندیی ئەم ئایەتە بە پێش خۆیەوە ئەوەیە: کە قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر چوار بنەمای سەرەکی دەکاو لەم چوار تەوەرەدا دەخولێتەوە، ئەوانەش

بریتین لە یەکتاپەرستی، هەبوونی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی، زیندوبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت، بڕوا بەقەزاو قەدەر، چەسپاندنی زیندوبوونەوە پابەندە بە سەلماندنی تاك‌و تەنهایی خوداو تواناو دەسەڵاتی رەهاو زانستی بەرفراوان.

جا کە لەوەپێش پەروەردگار راستی هاتنی رۆژی قیامەتی چەسپاند، باسی گفتوگۆی نێوان دۆزەخی‌و بەهەشتی‌و ئەعرافییەکانی کرد، لای کردەوە بەلای هێنانەوەی بەڵگەی تەنهایی پەروەردگارو تواناو دەسەڵاتی رەهاو بەرفراوانی، زانستی زۆرو بێ سنووری، تا ببنە بەڵگە لەسەر پەروەردگاریەتی‌و خودایەتی حەق‌و رەسا بۆ زاتی پەروەردگارو چەسپاندنی هاتنی رۆژی قیامەت‌و فەرمووی: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ بێگومان پەروەردگاری ئێوە ئەی ئادەمیزادینە! کە ناوی (الله)یە خودایەکی ئەوتۆیە کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شەش رۆژدا بەدی هێناون، ئەمجار کۆنترۆڵی عەرشی کردو کاروباری بوونەوەری لێوە هەڵدەسوڕێنێ، کەوابوو پێویستی سەرشانی ئێوەیە کە بەتەنها هەر ئەو بپەرستن، چونکە جگە لە زاتی پاکی ئەو هیچ خودایەکی تر نین شیاوی پەرستن بن.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار هەواڵی ئەوەمان دەداتێ کە هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیاندایە لە ماوەی شەش رۆژدا بەدی هێناون.

کە باسی شەش رۆژ دەکا یەکسەر زەین بۆ ئەوە دەچێ کە ئەندازەی ئەم رۆژانە هێندەی رۆژی ئاسایی دونیا بن، چونکە ئەو دەمە خۆرو مانگ‌و ئەستێرە نەبوون! بەڵکوو دوای دروستکردنی زەوی ئەمانە بەدی هێنراون.

مامۆستا سەید دەفەرموێ: ئەو شەشە رۆژەی ئاسمان‌و زەوییان تێدا دروست کراون نهێنییەکی خوداییە جگە لە خودا کەسی تر نایزانێ، چونکە خودا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ – الكهف/٥١ ﴾.

وێ دەچێ ئەو شەش رۆژە بریتی بن لە شەش قۆناغ، یان شەشە گۆڕان‌و طەوربن. یان شەشە رۆژ بن لە رۆژانی خودا کە بەپێوەری رۆژگاری ئێمە ناپێورێن، چونکە ئەوکاتە مانگ‌و رۆژو هەڵسوڕانی قەبارەکان نەبووە.

هەر رۆژێك لەو رۆژانە هێندەی هەزار ساڵی دونیا دەبێ، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ – الحج/٤٧﴾. رۆژی قیامەتیش پەروەردگار لە ئایەتێكی تردا درێژییەكەی بە پەنجا هەزار ساڵ ئەندازە دەكا وەكوو دەفەرموێ: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ – المعارج/٤﴾.

بەكورتی: خودای ئێوە ئەی خەڵكینە! خودایەكی تاكو تەنیاو بێ هاوەڵو بێ وێنەیە، هەر ئەو ئاسمانو زەوی بەدی هێناون، نەخشەی كێشاون، كاروباری رێكخستووە، لە شەشە رۆژدا یاساو نیظامی دامەزراندوون، جا ئەو رۆژانە یان بەگوێرەی رۆژانی دونیا مەزندە دەكرێن، یان پەروەردگار بۆخۆی لە هەموو كەس زاناترە بە ئەندازەو سنووریانو ئێمە ئەندازەیان نازانین، خۆ ئەگەر پەروەردگار ئارەزووی هەبوایە دیتوانی لە كەمترین ماوەدا دروستیان بكا، بەلام بۆیە بە شێنەیی بەدی هێناون تا بەندەكانی لە كارەكانیاندا لەسەرخۆو بەشێنەیی بن، بەوردیو كارامەیی ئەنجامیان بدەن، ئەگینا پەروەردگار دەتوانێ لە كورت ترین كاتدا گەورەترین كار ئەنجام بدا؛ ئەوەتا لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ – يس/٨٢﴾.

جا وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ، وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ – فصلت/ ٩ – ١٠﴾.

دروستكردنی زەوی دوو رۆژی ویستووە، دروستكردنی كێوو چۆمو گژوگیاو كانو كانزاكانی دوو رۆژی تری ویستووە، ئەمجار ئاسمانەكانو مەجەرەو ئەستێرەكانی بە دوو رۆژی تر دروستكردوون! وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ – فصلت/١٢﴾.

ئەمجار پەروەردگار دوای دروست كردنو بەدی هێنانی زەویو ئاسمانەكانو ئەوەی تێیاندایە، كۆنترۆڵی عەرشی كردو لەوێوە كاروباری بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، یاساكانی رێك دەخا، هیچ كارو بەدی هێنانێكی لەهی ئادەمیزاد

ناچێ، کارو کردەوەو زاتو صیفاتی لە هی هیچ کەس ناچێ، بێ وێنەو بێ هاوتایەو ئێمە لێی بێ ئاگاین!

ئەمە رای ئیمان مالیكو رەبیعەی مامۆستایەتی کە فەرموویانە: کۆنترۆڵ کردنەکە ئاشکراو نومایانە بەڵام چۆنیەتییەکەی نەزانراوو پەنهانە، پرسیارکردنیش لەم بارەوە بیدعەتو نارەوایە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مەزهەبی سەلەفی صالح: لەوانە مالیكو ئەوزاعیو ثەوریو لەیثی کوڕی سەعدو شافیعیو ئەحمەدو ئیسحاقی کوڕی راهۆیەو هی تریش لە پێشەوایانی موسوڵمانان لە کۆنو نوێدا ئەم جۆرە دەقە ئایینانەیان وەکوو خۆیان مانا کردوونو هیچ جۆرە تەئویلو تەشبیهیان تێدا بەکارنەهێناوە، دەقەکە چ مانایەکی ساکارو ئاسایی هەڵبگرێ ئاوا هەڵسو کەوتیان لەگەڵ کردووە، خودا روخساری بۆخۆی باس کردووە، دەستی بۆخۆی داناوە ئێمەش دەبێ بڕوای پێ بکەین، بەڵام ئەم دەستە چۆنەو چۆن نیە ئەوە خودا بۆخۆی دەیزانێ...هتد.

نەعیمی کوڕی حەمماد کە مامۆستای ئیمامی بوخارییە فەرموویەتی: کەسێك پەروەردگار بە دروستکراوێك بشوبهێنێ، کافر دەبێ، کەسێکیش ئینکاری ئەو شتە بکا کە خودا بۆخۆی وەصفی خۆی پێ کردووە کافر دەبێ، ئەو شتانەی خودا خۆی پێ وەصفدار کردووەو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەپاڵی داوە ناچێتە خانەی تەشبیهو لێکچوونی خودا بە دروستکراوەکانی... کەسێك ئەو شتانەی خودا بۆ خۆی وەپاڵ خۆی داونو فەرموودەی صەحیحو راست لەبارەیانەوە هاتووە، بۆ خودایان بە رەوا بزانێو دانیان پێدا بنێ بەو شێوەی کە شیاوی پەروەردگارە، رەوشتی نالەبارو پلە نزمی لە خودا دووربخاتەوە، ئەوە رێگای هیدایەتی گرتووە.[1]

بەڵام زانایانی خەلەف ئەم جۆرە ئایەتو فەرموودانە تەئویل دەکەنو دەڵێن: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ یانی کاروباری بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێو بەگوێرەی ئەندازەو نەخشەکێشانی خۆیو داناییو زانایی رەهاو بێ سنووری خۆی گۆڕانکاری لە بوونەوەردا ئەنجام دەدا وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُدَبِّرُ الأَمْرَ - یونس/٣﴾.

[1] - تفسير أبن كثيرج٢/٢٢٠، تفسير المراغي ج٣/١٧٣، تفسير المنير ج٨/٢٣٣، تفسير المنار ج٨/٤٥٣.

ئـه‌مجار پـه‌روه‌ردگار بـڕێ لـه دیـارده‌ی هه‌ڵـسوڕانی بوونـه‌وه‌ر دیـاری ده‌کـاو ده‌فه‌رموێ: ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ په‌روه‌ردگار بـه‌تاریکایی شـه‌و رووناكی خـۆر دادەپۆشـێ، واتـه: تـاریکی ده‌که‌وێتـه شـوێنی رووناكیو بەسـەریا ده‌کـشێو دایده‌پۆشێ، هـه‌ر شـوێنێك تـاریکی شـه‌وی گه‌یـشتبێتێ رووناكی خـۆری لێ نامێنـێ، به‌پێچه‌وانه‌شه‌وه هه‌ر شوێنێك رووناكی خۆری گه‌یشتێ تاریکی شـه‌وی لێ نامێنـێ! هه‌ریه‌که‌یان به‌شوێن ئه‌وی تریانه‌وه راوی ده‌نێو ره‌دووی که‌وتووه! به بست بـواری نادا، ئـه‌مڕۆ کـه زانـستی تـازه لـه‌باره ماددییه‌کانـدا پێـشکه‌وتنی به‌ده‌ست هێنـاوه‌و زانست هێلکه‌یی زه‌وی زیاتر چه‌سپاندو بووته شتێکی به‌ڵگه نه‌ویست، ئه‌م راونـانو شـوێن که‌وتنـه خێرایـه‌ی شـه‌وو رۆژ بـۆ یـه‌کتری زیـاتر روون ده‌بێتـه‌وه، چـونکه هه‌موو کاتێ نیوه‌ی زه‌وی رووناکه‌و نیوه‌که‌ی تری تاریکه، هه‌موو کاتێ له ئـه‌نجامی هه‌ڵخولانی زه‌وی له‌ته‌وه‌ره‌ی خۆیدا بـه‌ده‌وری خـۆردا تاریکـایی لـه شـوێنێك ده‌ڕواو رووناکی دێته شوێنی، له شوێنێکی تریش رووناکایی ده‌ڕواو تاریکایی دێته شـوێنی، ئه‌گه‌ر له خۆرهـه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست رۆژ بـێو دونیـا رووناك بـێ، ئـه‌وه لـه ئـه‌مریکای باشوورو یابانو ده‌وروبه‌ریان دونیا شه‌وه‌و تاریکایی هه‌یه، زۆربه‌ی زانایانی ئیسلام وه‌کوو غه‌زالیو رازیـیو ئیبنـو تـه‌یمیـیـه‌و ئیبنولقـه‌یم (ألجوزيـة) ئاماژه‌یـان بـۆ ئـه‌م راستییه کردووه له نووسینه‌کانیاندا وه‌کوو حه‌قیقه‌تێکی زانستی چه‌سپاندوویانه.

رسـته‌ی ﴿يُغْـشِي اللَّيْـلَ النَّهَـارَ....﴾ وه‌کوو به‌ڵگه وایـه بـۆ پێـشه‌وه‌ی؛ چـونکه پـه‌روه‌ردگار کـه له‌پێـشدا باسـی کـۆنترۆڵکردنی عه‌رشـی کـردو باسـی هه‌ڵـسوڕانی بوونـه‌وه‌ری کـرد، ئـه‌مجار نموونـه‌ی ئـه‌م کۆنترۆڵکردنـه‌و هه‌ڵسوڕاندنی بـه ئاشـکرا پیـشان ئـاده‌میزادان دا، بـۆ ئـه‌وه‌ی بـه چـاوی خۆیـان دیـارده‌ی ئـه‌م هه‌ڵـسوڕاندنه ببیـنن‌و بـزانن پـه‌روه‌ردگار چۆن گۆڕانکاری لـه بوونـه‌وه‌ردا ده‌کـا، چۆن شـه‌و رۆژ به‌شوێن یـه‌کتردا ده‌هێنێو چۆن ئـه‌م هـه‌موو خـۆرو مـانگو ئه‌سـتێره‌و هه‌ساره‌و کاکه‌شـانه هه‌ڵده‌سـوڕێنێ هه‌ریه‌کـه‌یان کاروبـاری خـۆی بـۆ سـوودی ئـاده‌میزاد پـێ ئـه‌نجام ده‌دا، بـه‌گۆڕانی شـه‌وو رۆژ هۆکـاری ژیـان بـۆ ئـاده‌میزادان بـه تایبـه‌تی بـۆ گیانله‌به‌ران به‌گشتی ده‌سته‌به‌ر ده‌بـێ. هـه‌ر له‌دیارده‌ی رێکخستنو نه‌خشه‌کێشانی خودا بۆ بوونه‌وه‌ر، کـه ﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ﴾ خـۆرو مـانگو

ئەستێرەو هەسارەو کاکەشانە زەبەللاحەکانی بەدی هێناونو هەموویان بە گوێرەی ویستو ئیرادەی ئەو دێنو دەچن، هەموویان ملکەچو پابەندی فەرمانی زاتی پاکی کردگارن، چۆنی بوێ وا هەڵدەسوڕێن، ملیۆنەها ساڵە ئەم گەردوونە لە هاتووچۆدایە، ئەم قەبارە گەورەو زەبەللاحانە بەبێ وچان هەڵدەسوڕێن، نە لەکار دەکەونو نە بەنزینو گازیان پێویستەو نە لێیان دەبڕێ، نە بورغویان سلاك دەبنو دەسوێن، هەریەکەیان لە تەوەری خۆی بەخێراییەکی دیاری کراوو تایبەت هەڵدەسوڕێنو هیچیان لە هیچیان ناخشێنو رێگە لەیەکتر ناگرنو پێکەوە دەعەم ناکەن. ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ﴾ هۆشیار ببنەوە! هەر بۆ پەروەردگارە بەدی هێنانو دروستکردن، کارگێڕییو هەڵسوڕاندن هەر بەدەست ئەوە، هەر خودا خاوەنی بوونەورە، هەر ئەو کارگێڕو هەڵسوڕێنەرە ﴿تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ خودای بوونەوەر پاكو بێ گەردە، بەرزو بێ وێنەو هاوتایە، هەر ئەو خوداو پەروەردگارە، هەرچی خێرو بێری بوونەوەر هەیە، هەمووی لە خوداوەیە، پێویستە بەندەکانی سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتو خێرو خۆشییەی بۆ ئادەمیزادانی دابین کردووە، جگە لەخودا کەستی تر شایانی خودایەتیو پەروەردگاریەتی نیە، کەسی تر خودایەتی پێ ناکرێ، کەس رایەی ناکەوێ لافی خودایەتی لێ بدا.

**تێبینی**:

پەروەردگار لە ئایەتەکەدا جوداوازیی خستە نێوان وشەی (الخلق)و وشەی (الأمر) ئەم نێوا کردنەی بە (واوی عەطف) ئەنجام دا، جوداوازی نێوان خەلقو ئەمر بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە رای ئەوانەی دەڵێن: قورئان مەخلووقە هەڵەیە، چونکە ئەگەر قورئان – کە بریتییە لە ئەمری یەزدانی – مەخلووق بوایە، دەبوو دەقەکەی ئێرە ئاوای لێ بهاتایەوە ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالْخَلْقُ﴾ ئەمەش نارەوانیو قسە نەزانییەکە لەخودا دوورە!

هەروەها ئەگەر (ئەمر) مەخلووق بوایە پێویستی بە ئەمرێکی تر دەبوو پێیەوە بوەستێ ئەو ئەمرەش پێویستی ئەمرێکی تر دەبوو، هەروا بڕوا ئەمەش نەگونجاوو مەحاڵە، کەوابێ ئەمر کە کەلامی قەدیمی خودایە ئەزەلییەو مەخلووق

نیـە، بـەڵكوو هـەموو مـەخلووقات پێیـەوە پەیوەسـتن وەكـوو لـە شـوێنێكی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاء وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ – الروم/٢٥﴾.

ماوەتەوە ئەوە بگوترێ: كـە ئـەمرو ئـیرادە لێـك جیـاوازن، چـونكە پـەروەردگار جاری واهەیە ئەمر دەكا بەشتێك نایـەوێ ئـەنجام بـدرێ! ئـەی ئـەوە نیـە فـەرمانی كرد ئیبراهیم كە كوڕەكەی سەربڕێ! ئـیرادەی سەبڕینەكەشـی نـەكردبوو، فـەرمانی بـە پێغەمبـەر كـرد كـە پـەنجا نوێـژ بكـاو هـەر ئـیرادەی پێـنج نوێژیـشی كردبـوو، ئیرادەی شەهید بوونی حەمزەی كردبوو نەهی لە كافرەكانیش كردبوو كە بیكوژن، ئەوەتا لە سورەتی (ال عمران/١٤٠)دا دەفـەرموێ: ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُـهَدَاء﴾ كـە یـەكێ لەو شەهیدانە حەمزە بوو، كەچی نەهی لە كافرەكان كردووە لە كوشتنی.

## پەسەندی نزاو پاڕانەوە لە خوداو خراپی ئاشووب گێڕیی

﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ .

دوای ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی لەسەر تاقـە خـودایی خـۆی هێنایـەوە، توانـاو دەسەڵاتی ڕەهاو هەڵسوڕاندنی بوونـەوەری بـە ئەوپـەڕی دانـاییو لێزانـی بـۆ خـۆی چەسپاند. فەرمانی بە ئادەمیزاد كرد كە یەكتاپەرسـتی ئـەنجام بـدەنو بەندایـەتی هەر بۆخودا بكەنو هەمیشە نزاو پاڕانەوە لـەبارەگای ئـەو كردگـارە بكـەن، چـونكە پاڕانــەوە كاكڵــەی خوداپەرسـتییەو دەفـەرموێ: ﴿ادْعُـواْ رَبَّكُـمْ تَـضَرُّعًا وَخُفْيَـةً﴾ پەروەردگار بەنـدەكانی شارەزا دەكا بۆ ئەوەی لێی بپاڕێنەوە، چونكە نزاو پاڕانەوە لەخودا مایەی خۆشبـەختی دونیـاو قیامەتـەو دەفەرموێ: ئـەی بەنـدەكان! دوعـاو پاڕانــەوە ئاراســتەی پــەروەردگارتان بكــەن، بەشــێوەیەكی ملكەچــیو بەســۆزو پەرۆشـەوە لـە خـودا بپاڕێنـەوە، بـا پاڕانەوەكـەتان وێـڕای ئـەوەی كـە بـەزەلیلیو

ملکەچی دەبێ با بەدەنگی نزمو لەسەرخۆ بێ، پاڕانەوە مۆخی خوداپەرستییە، بەتایبەتی لەکاتی تەنگانەدا، یان بە زەلیلیو ملکەچی نزاو پاڕانەوە ئەنجام بدەنو هاوار بکەنە پەروەردگارتان، جارێك بەدەنگی بەرزی مام ناوەندی جارێك بە ئەسپاییو دەنگی نزم، بۆ هەر جۆرێك لەم دوعایانە کاتی تایبەتی هەیە، جاری وا هەیە نزاو پاڕانەوە بەدەنگی مەیلەو بەرزو مام ناوەندی باشە، جاری واش هەیە بەدەنگی نزمو ئەسپایی باشە ئەگەر لە شوێنێکی چۆڵو لە ژورێکدا بوویو دڵنیابووی کەس پێت نازانێو کەس گوێی لەدەنگت نیەو تەشویش ناخەیە سەریانو دیاردەی ریابازییو خۆدەرخستنت مەبەست نەبوو، ئەوە بەدەنگی بەرزو مام ناوەندیی نزاو پاڕانەوەکە بکرێ باشە، ئەگەر لەکاتی کۆبونەوەی خەڵك لە مزگەوتدا یان شوێنی تر ئەوە بە دەنگی نزم بپاڕێیەوە باشە، جگە لەو دوعاو پاڕانەوانەی کە شەرع دەنگ بەرزیی تێدا پەسەند کردوون وەکوو (الله أکبر) کردنی رۆژانی جەژنو (لبیك اللهم لبیك) گوتنی حاجیان، هەروەها خوێندنی سورەتی فاتیحەو برێ قورئانو قنووت لە نوێژە جەهرییەکاندا.[1]

بەهەرحاڵ ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە پاڕانەوە بەنهێنیو بەدەنگی نزم باشترە، چونکە لە ریابازیی دوورە، هەروەها چونکە پەروەردگار لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً – الأعراف/٢٠٥﴾.

کە مەدحی زەکەریاش دەکا بەوە مەدحی دەکا کەبەدەنگی نزم لە خودا پاڕاوەتەوە، دەفەرموێ: ﴿إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا – مريم/٣﴾.

لەصەحیحەیندا فەرموودەیەك لە ئەبو مووسای ئەلئەشعەرییەوە گێردراوەتەوە دەفەرموێ: لەسەفەرێکدا هاوەڵان بەدەنگی بەرز لە خودا دەپاڕانەوە. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! تۆزێك لەسەرخۆو کەمێك پشوو بەنەفسی خۆتان بدەن، دڵنیابن ئێوە بانگی کەسێك ناکەن کەرو بێ گوێ بێ، یان دوورو بێ ئاگابێ؛ بێگومان ئێوە لەخودایەك دەپاڕێنەوە بیسەرەو لێتان نزیکە، لەهەرشوێنێك بن لەگەڵتاندایە).

---

[1] – تفسير المنار ج٨/٤٥٦ – ٤٥٧ بەبرێ دەستکارییەوە.

ئیبنو جورمیج دەڵێ: دەنگ بەرزکردنەوەو هاوارکردن لەخودا بەدەنگی بەرز مەکرووهە، فەرمانمان پێ کراوە بەدەنگی نزم‌و نهێنی‌و ملکەچی لەخودا بپاڕێینەوە.[1]

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: موسوڵمانانی پێشوو زۆر بەنزمی‌و بەنهێنی دوعایان دەکردن، بەدەگمەن لەکاتی پاڕانەوەو دوعا کردندا دەنگیان دەبیسترا، دوعاو پاڕانەوەکانیان بریتی بوو لە سرتەسرتی نێوان خۆیان‌و پەروەردگار، مەگەر لە دوعاو پاڕانەوەیەك دا کە دەنگ بەرزکردنەوە تێیاندا پەسەندە وەکوو (لبیك) گوتنی کاتی حەج‌و (ألله اکبر) کردنی ڕۆژانی جەژن.

﴿إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆشناوێن کە لە دوعاکردن‌و پاڕانەوە لەخوداو لە شتی تریش زێدەڕەویی دەکەن، زێدەڕەویی لە دوعادا ئەوەیە کەبەشێوەی ملکەچی‌و زەلیلی‌و دەنگ نزمیی ئەنجام نەدرێ‌و خۆشەویستی خودای تێدا نەبێ، واتە: دوعاو پاڕانەوەبەشێوەی (تضرع)و پەنامەکی نەبوو، خودا وەڵامی ناداتەوەو دوعاکە گیرا نابێ، کەوابوو فەرموودەی خودا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ وەکوو هەڕەشە وایە بۆ ئەو کەسانەی کە لە نزاو پاڕانەوەدا (تضرع)و پەنامەکی ڕەچاو ناکەن!

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داوود لە سەعدی کوڕی وەققاصەوە دەگێڕنەوە: دەڵێ گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «إِنَّـهُ سَـيَكُونُ قَوْمـاً يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ، وَقَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ...» دڵنیابن لەمەودوا گەل‌و گرۆهێك پەیدا دەبن لە دوعاکردن‌و پاڕانەوەدا زێدەڕەویی دەکەن، ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ادْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ ئەوە بەسە کە بەشێوەیەکی ملکەچی‌و پەنامەکی‌و بڵێی خودایە! من داوای بەهەشت‌و ڕەزامەندیت لێ دەکەم داوات لێ دەکەم هیدایەتم بدەی بۆ ئەنجامدانی هەر گوفتارو کردارێك لەو بەختەوەریەم نزیك بکاتەوە، پەنا دەگرم بەتۆ لە دۆزەخ‌و هەر شتێك لەو چارەڕەشییەم نزیك بکاتەوە!.

[1] - تفسير المنار ج٨/٤٥٦.

جـا وەكـوو پـەروەردگار فـەرمانی كـردووە بـە دوعـاكردنو نـزاو پاڕانــەوەو هانابردن بۆ خودا، نەهی لە ئاشووبگێڕی خراپـەكاریش كـردووەو فـەرمووی: ﴿وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا﴾ ئەی نەوەی ئادەمیزاد! خراپەكارییو ئاشووبگێڕی لەسەر زەوی بەرپا مەكەن، دوای ئـەوەی پێغەمبـەرانو شـوێنكەوتووانیان كاروبـاری سەر زەوییان ڕێك خستووە، عاقڵمەندانو دڵسۆزان لـەبارەی مـاددیو مەعنەوییـەوە هۆكاری ژیانی بەختەوەرییو كامـەرانییان دەسـتەبەر كـردووە، لـەبواری بنـەماكانی ژیانــدا – كـشتوكاڵ، پیــشەسازی، بازرگــانی، بڵاوكردنــەوەی ئــەخلاقی بــەرزو دادپەروەرییو یاسای مەشوەرەتو هاریكاری...هتد – كاریان كردووە.

خراپــەكارییو ئاشــووبگێڕی لــە ئایینــدا وەكــوو كــوفرو بیدعــەت. هــەروەها خراپــەكاریو ئیفـساد لـە گـەلو كۆمەڵـدا وەكـوو كوشـتنو بـڕینو نانـەوەی شـەڕو ئــاژاوە، هــەروەها ئیفــساد لــە مــاڵو سـاماندا بــەداگیركردنو دزیــنو فــێڵ كــردن لەمامەڵەدا، ئیفسادی عەقڵ بەخواردنەوەو كێشانی ئەو شتانەی عـەقڵ دەشـێوێنن، ئیفسادی ڕەگەزو ڕەچەڵەك بەهۆی داوێن پیسیو بوختانكردن بەیەكتری.

ئەمجار پاش ئـەوەی پـەروەردگار مـەرجی وەرگـرتنو گیرابـوونی دوعـای بـەیان كرد، كە تـەضـەروعو پەنامەكییـە، ئـەوەشمان تـێ دەگەیـەنێ كـە دەبـێ پێداویـستی دوعا بەشێوەی خۆفـو ڕەجا بـێ، هەركەسـێك دوعـاكردنو پاڕانـەوەی بـەم شـێوەیە نەبێ بێ سوودەو وەڵامی نادرێتـەوە، بـەڵكوو لەفەسـادو ئاشووبەوە نـزیكترە، بۆیـە پەروەردگار فەرمانی بە ئادەمیزاد كردو فـەرمووی: ﴿وَادْعُوهُ خَوْفًـا وَطَمَعًـا﴾ وا لـە خوودا بپاڕێنەوە ترسی سزاو تۆڵەی خوداتـان هـەبێ، بەتـەمای پاداشو بەخششی نـەبڕاوەی بـن، بێگومـان دوعـاو پاڕانـەوەی شـەرعی مـۆخی خوداپـەرستنو كاكڵـەی بەندایـەتی كردنـە بـۆ خـودا، هـەركاتێ دوعـاو پاڕانـەوە مـەرجو پێداویـستییەكانی هاتنە جێ گیرابوونی چاوەڕوان كراوە، بۆیە فەرمووی: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللّـهِ قَرِيـبٌ مِّـنَ الْمُحْـسِنِينَ﴾ ڕەحمـەتو بەخـششی پـەروەردگار نزیـكو بەیدەسـتە بـۆ ئەوانــەی كردەوەكانیان بە ڕێـكو پێكـی ئـەنجام دەدەنو شـوێن فـەرمانو نەهییـەكانی خـودا دەكەون.. وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَـسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ – الأعراف/١٥٦﴾.

پێویستە لە دوعاو پاڕانەوەدا زێدەڕۆیی نەکرێ؛ بەم جۆرە دەنگ زۆر بەرز بکاتەوە، یان داوا بکا خودا پلەو پایەی پێغەمبەری بداتێ، یان داوای ئەنجامدانی کاری ناڕەوا بکا، یان وشەی قەڵەوو سەجع ئاسا بەکاربێنێ، هەموو ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی کە دوعاو پاڕانەوە گیرا نەبن!

بەکورتی دوعاو پاڕانەوە ڕێو ڕەسمی خۆی هەیە؛ پێویستە پەیڕەو بکرێن، بەم ڕەنگە دەستی بە دەستنوێژ بێ، ڕوو لە قیبلە بێ، دڵو دەروونی بە شتی ترەوە خەریك نەبێ، بەصەڵاوەتدان لەسەر پێغەمبەر دەست پێ بکاو بەصەڵاوەتدان کۆتایی بە پاڕانەوەکە بهێنێ، هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز بکاتەوە، دوعا بۆ خۆیو موسوڵمانان بکا، هەوڵ بدا دوعاو پاڕانەوەکەی لەکاتی دوعا گیرابووندا ئەنجام بدا وەکوو سێیەکی کۆتایی شەو، کاتی ڕۆژو شکاندن، ڕۆژی هەینی، لەکاتی چوون بۆ سەفەرو کاتێك کە ستەمی لێ دەکرێ، هەروەها هەموو ئەو کاتانەی کە لە کتێبی فەرموودەو شەرعدا دیاری کراونو بەکاتی دوعا گیرابوون دەزاندرێن.

### دەربارەی دەست بەرزکردنەوەی کاتی نزاو پاڕانەوە دوو ڕا هەیە:

١- کۆمەڵێك لە زانایانی ئیسلام: لەوانە عەطاو طاوسو موجاهیدو جوبەیری کوڕی موطعیمو سەعیدی کوڕی موسەیەبو سەعیدی کوڕی جوبەیر، پێیان وایە: دەست بەرزکردنەوە لە دوعادا باش نیەو مەکرووهە؛ بەڵگەیان ئەو حەدیثەیە کە ئەنەس ریوایەتی کردووەو فەرموویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جگە لە دوعای نوێژەبارانە لەهیچ دوعایەکی تردا دەستی بەرز نەکردۆتەوە، بەڵام لە نوێژەبارانەدا دەستی ئەوەندە بەرزدەکردەوە بن هەنگڵی پیرۆزی دەبیندرا.

٢- کۆمەڵێکی تر لە هاوەڵانو چینی دوای هاوەڵان (تابعین) پێیان وایە دەست بەرزکردنەوە لەکاتی دوعاو پاڕانەوەدا دروستە، ئیمامی بوخاری لە ئەبو مووسای ئەشعەری ریوایەت دەکا؛ کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پاڕایەوە دەستی بەرزکردەوەو بن هەنگڵی پیرۆزیم بینی، هەروا فەرموودەیەکی لەم شێوە لە ئەنەسەوە ریوایەت کراوە. ئیبنو عومەر دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ».

لەصەحیحی موسلیمدا لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەت دەکا؛ دەفەرموێ: رۆژی بەدر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەیری لەشکری کافرەکانی کرد کە ژمارەیان هەزار بوو، هاوەڵانیشی سێ سەدو حەڤدە بوون، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رووی کردە قیبلەو دەستی بۆلای ئاسمان بەرکردەوەو دەستی کرد بە نزاو پاڕانەوە. تیرمیذی لە عومەرەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە دەستی بەرزکردەوە بۆ دوعاو پاڕانەوە تا دوو دەستی بەسەر دەمو چاویدا نەهێنایەوەو دەمو چاوی مەسح نەکردنایە دەستی شۆڕ نەکردەوە.

ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ: ئەم حەدیثو فەرموودانە زنجیرەی گێڕانەوەکەیان راست ترەو لە حەدیثی ئەنەس بەهێزترن... ئەمجار دەفەرموێ: پاڕانەوەو دوعا لە خودا کارێکی باشە، چۆنی بۆ گونجا با ئەنجامی بدا ئەگەر ویستی با روو بکاتە قیبلەو دەستی بەرزبکاتەوە ئەوە باشە، ئەگەر ویستی با دەست بەرزنەکاتەوە چونکە وەکوو لە حەیثدا هاتووە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی دوعاو پاڕانەوەدا وابووە دەستی بەرزنەکردۆتەوە!.

## باراندنی بارانو رواندنی گژوگیا بەڵگەن لەسەر بەتوانایی خوداو زیندوبوونەوە دەچەسپێنن!

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ

رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە خۆی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، هەر خۆی هەڵسوڕێنەری بوونەوەرو چی لە بوونەوەردا هەیە بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادە، فێری چۆنیەتی دووعاکردنو پاڕانەوە لە خودای کردن، نەهی لە ئاشووبگێڕیو ئاژاوە نانەوە کرد، ئەوەشی راگەیاند کە رەحمەتو بەزەیی خۆی نزیکە لە چاکەکاران! ئادەمیزادان هۆشیار دەکاتەوە کە هەر خۆی رزقو رۆزیدەرە، وەگەرنگترین سەرچاوەی رزقو رۆزیی بارانە دەبێتە هۆی روانو دەرهاتنی گژوگیاو بەروبووم، هەر ئەویش دەتوانێ رۆژی قیامەت مردوان زیندووبکاتەوە، وەکوو چۆن زەوی وشكو برینگو مردوو بەهۆی بارانەوە زیندوو دەکاتەوە فەرمووی: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە لەپێش باران بارینددا با هەڵدەکا، ئەو بایە دەنێرێ تاببێتە مزگێنی بەهاتنی رەحمەتی خۆی کە بارانە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ – الشورى/٢٨﴾. پەروەردگار کە ویستی باران ببارێنێ با هەڵدەکا ﴿حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالاً﴾ جا کە بایەکە هەورە باراناوییەکەی هەڵگرت ﴿سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ﴾ ئەو هەورە باراناوییە بەهۆی بایەکەوە رادەفڕێنین بۆ وڵاتێکی پێویستی بە باران بێ، ﴿فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ﴾ بەهۆی هەورەکەوە لەوێ بارانەکە دەبارێنینو زەوییەکە زیندوو دەکەینەوە.

چونکە بەگوێرەی زانستی کەشو هەواناسیی ئەو هەوایەی لە رووبەری دەریاوە نزیکە بەهۆی کاریگەریی گەرماییەوە هەڵم پەیدا دەکا، ئەمجار بەرەو بەرزایی بەرز دەبێتەوە، بەهۆی هەوای ساردەوە ئەو هەڵمە کۆدەبێتەوەو تەکاثوف پەیدا دەکاو هەوری لێ پێك دێ، ئەمجار بەهۆی هێزی باوە ئەو هەورە دەڕۆیەندرێو بە ویستو ئیرادەی خودا باران دەبارێنێ.

ئەم مانایە لە زۆر ئایەتی قورئاندا دووبارە بووەتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ – فاطر/٩﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاء مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاء وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاء يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ – النور/٤٣﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاء كَيْفَ يَشَاء وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ – الروم/٤٨﴾.

ئەمجار ﴿فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ بەهۆی ئەو بارانەوە جۆرەها گژوگیاو بەروبووم لەزەوی دەڕوێنین، کە هەریەکەیان رەنگو قەبارەو شێوەو روخسارو تامو بۆنو بەرامی تایبەتی خۆی هەیەو هیچیان لە هیچیان ناچن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر بەتوانایی خودا رەحمەتو بەخششی بی پایانی، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – الرعد/٤﴾.

جا وەکوو پەندی پێشینان دەڵێ: قسە قسە دێنێ، شت بەشت دەکەوێتەوە یاد. بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْموْتَى﴾ وەکوو چۆن ئەو زەوییە مردووە بەو بارانە زیندووی دەکەینەوەو هەموو ساڵێ سەرلەنوێ ئەو هەموو گژوگیاو دارو درەختە زیندوودەکەینەوە، هەر بەو جۆرەو ئاوا بەئاسانیو بێ ماندوبوون ئادەمیزادە مردووەکان لەکاتی خۆیدا زیندوو دەکەینەوەو گیانیان بەبەردا دەکەینەوە، ئەم لێکچواندنو تەشبیهەمان بۆ ئێوە روون کردەوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵکوو ئێوە بەخۆتاندا بچنەوەو بیرێك لەخۆتان بکەنەوەو پەندئامێز ببنو بڕوا بە رۆژی قیامەتو زیندوبوونەوە بکەنو بزانن ئەو خودایەی لەسەرەتاوە ئێوەی لە نەبووەوە دروست کردووە، دەتوانێ پاش مردن سەرلەنوێ دروستتان بکاتەوە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ

وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ – الأعراف/٢٩﴾.

جا چونکە ئامادەباشی ئادەمیزادان بۆ بڕواکردن بە ڕۆژی قیامەتو زیندوبوونەوە، بەگوێرەی سروشتو دڵو دەروونیان جوداوازیی تێدایە، ئادەمیزادی واهەیە دەروون پاكو سروشت خاوێنە، بەپیر بانگەوازی ئیسلامییەوە دێو ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی دەبێ! هی وایش هەیە دەروون ناپاكو سروشت شێواوە، پشت هەڵدەکاو ڕوو وەردەگێڕێو گوێچکەی خۆی دەهاخنێ، بۆیە پەروەردگار ئەم لێکچواندنەی ئاراستە کردو فەرمووی: ﴿وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ﴾ واتە: زەوی پاكو خاوێنو گونجاو بۆ کشتوکاڵ بەفەرمانو ویستی خودا گژوگیاو ڕووەكو کشتوکاڵ بەباشیو بەرێكو پێکی دەڕوێو شین دەبێو زوو پێ دەگاو دێتە بەرهەم، ﴿وَالَّذِي خَبُثَ لاَ يَخْرُجُ إِلاَّ نَكِدًا﴾ ئەو زەوییەی گڵو خۆڵەکەی پیس بێو نەگونجاو بێ بۆ کشتوکاڵ، بارانیشی لێ ببارێ گژوگیای لێ شین نابێ، ئەگەر لێشی شین بێ بەکەمو کوڕیو بەناخۆشی؛ بێ بەرهەمو بێ خێرو بێرە!

ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: ئەم پەندو مەسەلە پەروەردگار هێناویەتەوە بۆ دەست نیشانکردنی موسوڵمانو کافر، واتە: خودای مەزن موسوڵمانی شوبهاندووە بە زەوی پڕ پیتو بەرەکەتو گونجاو بۆ کشتوکاڵ، کافرو خوانەناسیشی شوبهاندووە بە زەوی چەقەڵو بێ خێرو نەگونجاو بۆ کشتوکاڵ!

هەر لەمانای ئەم ئایەتەدا فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە ئیمامی ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو نەسائی لە ئەبو مووسای ئەشعەرییەوە دەیگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نموونەی ئەو پەیامەی کە خودا منی پێ ڕەوانە کردووە کە بریتییە لە هیدایەتو زانیاری؛ وەکوو بارانێکی خێرئامێزی زۆر وایە کە دەبارێتە سەر زەویەك هەندێ لەو زەویە نەرمانو پاكو بێ خەوشە، گونجاوە بۆ کشتوکاڵو بارانەکە وەردەگرێو هەڵی دەمژێ، گژوگیای زۆری لێ شین دەبێو بەروبوومی پێ دێتە بەرهەم، هەندێکیشی دەبێتە عەمباراو ئاوەکە پەزمەندە دەکاو خەڵکی سوودی لێ دەبینن، لێی دەخۆنەوە، کشتوکاڵی خۆیانی پێ ئاودێر دەکەن!

هەندێکی تر لەو بارانە دەبارێتە سەر زەوییەك کە دەشتێکی کاکی بەکاکییە، یان چەقەڵ و رەقەنە، ئاوەکە وەرناگرێ و هەڵی نامژێ و گژوگیای پێ لێ ناڕوێ، ئەمە پەندو نموونەیە بۆ کەسانێك کە لە ئایینی خودا شارەزا بن و سوودیان لە پەیامی من وەرگرتبێ، بۆخۆی فێری ئایین بووبێ و خەڵکی تریش فێر بکا، شوبهاندنی ئەو خوداپێداوانەیە بە زەوییە نەرمان و گونجاوەکە. هەروەها پەندو نموونەیە بۆ کەسانێك کە بانگەوازییەکەی من سەری بەرزنەکردبێتەوەو ئەو هیدایەتە خوداییەی منی پێ نێردراوم وەری نەگرێ و کاری تێ نەکاو پێی پەندئامێز نەبێ! ئەمەش شوبهاندنی ئەو بەدبەخت و چارەڕەشانەیە بەو زەوییە خراپ و بێ پیت و رووتەن و چەقەنانە.

هێنانەوەی پەندو بەراوردکردن و لێکچواندنی ئەو شتانە بەیەکتریی بۆ ئیقناع کردنی ئادەمیزادو هەڵنانیانە بۆ ئیمان هێنان و بیرکردنەوەو وردبوونەوە لە حەقائیقی شتەکان؛ بۆیە پەروەردگار فەرمووی: ﴿كَذَلِكَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ﴾ واتە: وەکوو ئەو روونکردنەوەو گۆڕانکارییەی کە لە بوونەوەردا ئەنجامی دەدەین، ئاواش ئایەتەکان دووبارە دەکەینەوە ئەو ئایەتانەی کە دەسەڵات و توانای ئێمە دیاری دەکەن و بەڵگەن لەسەر هەبوونی توانای رەهاو بێ سنوورمان، ئەم ئایەتانە دووبارە دەکەینەوە بۆ ئەوانەی سوپاسگوزاریی نیعمەتەکانی ئێمەن و نیعمەتەکانی ئێمە کە پێمان بەخشیون لە شوێنی خۆیاندا بەکاریان دێنن، بۆیە ئەوانە شیاوی ئەوەن ئێمە زیاتر نیعمەتەکانمانیان بۆ زیاد بکەین و پاداشی باشیان بدەینەوە.

## چیرۆکی حەزرەتی نووح (درووودی خوای لەسەر بێ)

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ

﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

لەسەرەتای سوورەتەکەدا چیرۆکی ئادەمی گێڕایەوە، ئەمجار لێرە بەولاوە یەکە یەکە چیرۆکی پێغەمبەران (دروودی خوایان لێ بێ) دەگێڕێتەوە، سەرەتا بەگێڕانەوەی چیرۆکی حەزرەتی نووح (علیه السلام) دەست پێ دەکا، چونکە نووح دووەم باوکی ئادەمیزادەو یەکەم پێغەمبەرە کە پەروەردگار دوای ئادەم (علیه السلام) ناردوویەتی بۆ سەر دانیشتوانی سەر زەوی...

مەبەست لە گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەران هۆشیارکردنەوەیە بۆ پێغەمبەرو شوێنکەوتووانی: کە روو وەرگێڕانی ئادەمیزادان لە بانگەوازی پێغەمبەران تایبەت نیە بە نەتەوەی قورەیشەوە کە رەگەزی پێغەمبەرن (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵکوو ئەم روو وەرگێڕانە دیاردەو هەڵوێستی هەموو نەتەوە پێشینەکان بووەو شتێکی گشتییە، موصیبەتو بەڵا کە گشتی بوو قورساییەکەی سووک دەبێ، کورد وتەنی مردنی لەگەڵ هاوەڵان جەژنە پیرۆزەیە!

بەمـەش پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئەزیەتـدانی کافرەکـانی لەسەرشـان سـووك دەبـێو تەسـەللای دڵـی دێو بەشتێکی ئاسایی دەزانـێو زیـاتر لەسەر هەڵوێستی خۆی سوور دەبێو ورەی پتر بەرزدەبێ! ئەوەتا لە شوێنێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ – هود/١٢٠﴾.

لەگێڕانـەوەی ئـەم چـیرۆکانەدا دەستنیـشان کردنـی سـەرەنجامی تیدایـە، سەرەنجامی ئەوانەی پشتیان هەڵکردووە روویان وەرگێڕاوە، کە نـەفرین لێ کـردنو خەسارەتمەندیی دونیـاو قیامەتیانـە، لـەدونیادا سەرشـۆڕو ریـسوا، لـە قیامەتیـشدا سزای ئاگری دۆزەخ.

سەرەنجامی ئاکامی موسوڵمانانیش سەربەرزیی دونیاو خۆشبەختیو کامـەرانی رۆژی دوایی!

هەروەها لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانەدا ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە پـەروەردگار – هەرچەندە ئەو تاوانکارانە بۆ ماوەیەك مۆڵەت دەدا – بـەڵام هـەرگیز لـە بیریـان ناکاو وازیـان لێ ناهێنـێ، بـەڵکوو تۆڵـەیان لێ دەستێنێ! ئەمـەش پەنـدو ئامۆژگـاری تێدایە بۆ چینەکانی ئادەمیزادو پێویستە دەرسی لێ وەربگرن، وەکوو لـە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ – يوسف/١١١﴾.

هەروەها لەگێڕانـەوەی چیرۆکەکان بـە رێكو راسـتیو بـێ گۆڕانکارییو هەڵـە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) چونکە ئەو نەخوێنـدەوار بـووەو نووسـینو خوێندنـەوەی نـەزانیوە، کـەوابوو ئـەوەمان بـۆ دەچەسـپێ کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئـەو چـیرۆکانەی بـە نیگـا بۆهـاتوونو لـە خـوداوە پێـی راگەیانـدراوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر راسـتی پێغەمبەرایەتییەکە.

حـەزرەتی نـووح (دروودی خـودای لێ بـێ) کـوڕی لامـك کـوڕی متوشـلح کـوڕی ئەخنوخ کە حەزرەتی ئیدریـسی کـوڕی یـارد کـوڕی موهـەلئیل کـوڕی قینـان کـوڕی ئەنوش کوڕی شیث کوڕی ئادەم بابە گەورەی ئادەمیزادە.[1]

---

[1] – سەرچاوەی ئەم زنجیرەو نـەژادە سەرچاوەی متمانـە پـێ کـراو نـین، زانـینو نـەزانینیان چ گرنگییەکی ئەوتۆی نیە.

حەزرەتی نووح یەکەم پێغەمبەرە کە نێردراوە بۆسەر نەتەوەیەکی موشریك‌و هاوەڵ پەیداکەر، لە صەحیحی موسلیمدا فەرموودەیەك لە ئەبو هورەیرەوە دەربارەی شەفاعەت ریوایەت دەکا دەفەرموێ: «يَا نُوحُ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى الأَرْضِ» بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە حەزرەتی نووح سەرقافڵەی پێغەمبەرانە، هەروەها یەکەم پێغەمبەرە کە یاسای یاساغکردنی مارەکردنی کچ‌و خوشك‌و پووری راگەیاندووە، لەوەپێش پیاو بۆی حەڵاڵ بووە ئەوانە مارە بکا.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: هیچ پێغەمبەرێك بەئەندازەی حەزرەتی نووح لەلایەن نەتەوەکەیەوە تووشی ئەزیەت‌و نارەحەتی نەبووە مەگەر پێغەمبەرێك کە بەدەستی گەلەکەی شەهید کرا بێ، پەروەردگار کردی بە پێغەمبەرو رەوانەی کرد بۆ سەر گەلەکەی، ئەوکاتە تەمەنی پەنجا ساڵ بووە، دارتاشی باشی زانیوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە کراوە بە پێغەمبەر تەمەنی چل ساڵ بووە، پاش زریان‌و تۆفانیش شەصت ساڵ ژیاوە.

یەزیدی رەققاشی دەڵێ: بۆیە پێی دەگوترێ نووح؛ چونکە زۆر بۆحاڵی خۆی گریاوەو ئاخ‌و ئۆفی کردووەو بەزەیی بەخۆیدا هاتووە. بێگومان لە نێوان رۆژگاری حەزرەتی ئادەم‌و رۆژگاری حەزرەتی نووحدا دە سەدە تێپەڕیوە هەموو ئادەمیزادان موسوڵمان‌و خوداپەرست بوون.

ئیمامی تیرمیذی‌و هی تریش دەفەرموون: هەموو ئادەمیزادانی ئێستا وەچەو نەوەی حەزرەتی (نووح)ن.

ئیمامی زوهری دەڵێ: عەرەب‌و فارس‌و رۆم‌و دانیشتوانی شام‌و یەمەن لە نەوەی (سام) کوڕی نووح کەوتوونەوە. سندی‌و هیندی‌و زنج‌و حەبەشییەکان‌و زوطەکان هەمووو رەش پێستەکان لە نەوەی (حام)ی کوڕی (نووح)ن.

تورك‌و بەربەرو چینییەکان‌و یەئجوج‌و مەئجوج‌و صەقالیبەکان هەموویان لە نەوەی (یافث)ی کوڕی (نووح)ن.

سەرەتا کە بتپەرستی پەیدا بوو بەم جۆرە بوو؛ کۆمەڵێك ئادەمیزادی خوداپەرستی راستاڵ مردن گەل‌و نەتەوەکانیان لەسەر گۆڕەکانیان مزگەوت‌و

پەرستگایان دروست کردو پەیکەریان بۆ تاشین‌و وێنەیان بۆ دروست کردن تا لەیادیان نەچێتەوەو شێوەو روخسارو چۆنیەتی خوداپەرستییان لەبەرچاویان بێ‌و ئەمانیش چاو لەوان بکەن، جا کە رۆژگاریان کۆن بوو ماوەیان زۆر بەسەردا تێپەڕی ئەو پەیکەرانەیان بەناوی پیاوە صالحەکانەوە ناوناو دەستیان کرد بە پەرستنیان، ناوی هەندێك لەو پەیکەرانەی بە ناوی پیاوچاکانەوە نێودێر کرابوون (ود، سواع، یغوث، یەعوق، نەسر) بوون، جا کە دیاردەی بتپەرستی بڵاوبووەوەو پەرەی سەند پەروەردگار حەزرەتی (نووح)ی نارده سەریان‌و فەرمانی پی کرد کە هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن‌و بەتەنیا خودا بپەرستن.

قورئانی پیرۆز لە چل‌و سێ شوێندا باسی حەزرەتی نووحی کردووە، لە سورەتەکانی (الأعراف، هود، المؤمنون، الشعراء، القمر، نوح)دا چیرۆکی ئەم پێغەمبەرە پایەبەرزە بەدرێژی باس کراوە، پوختەی چیرۆکەکە ئەوەیە: بانگی نەتەوەکەی کردووە بۆ یەکتاپەرستی‌و وازهێنان لە بتپەرستی، بەڵام گەلەکەی بەربەرەکانییان کردو بەرپەرچییان دایەوەو ئەزیەتیانداو لە جیاتی ئەوەی شوێن پەیامی نووح بکەون شوێن داب‌و نەریتی برێ لە ملهوڕەکانی خۆیان کەوتن، فرت‌و فێڵی گەورەو سامناکیان ئەنجامدان، بڕیاری ئەوەیان دا کە بە هیچ شێوەیەك واز لە بتپەرستی نەهێنن، سووربوون لەسەر ئەوەی کە (ود، سواع، یەغوث، یەعوق، نەسر) شیاوی پەرستن‌و بەخودایان دەزانن، سەرباری ئەوەش بە لووتبەرزیی‌و سەرڕەقییەوە بە حەزرەتی (نووح)یان گوت: تۆ زۆرت لەگەڵ وتین‌و سنوورت بەزاند، زیاد لە ئەندازە پێکێشیت لێ کردین‌و سەرت نێشاندین، وازمان لێ بێنە، دڵنیابە ئێمە واز لەو بتپەرستییەی خۆمان ناهێنین، ئەو سزایەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی بۆمان بێنەو بێ منەت بە!

حەزرەتی نووح (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وەڵامی دانەوەو فەرمووی: سزادانی ئێوەو هاتنی عەزاب بەدەست من نیەو بەدەست پەروەردگارە، خۆی چۆنی بوێ‌و کەی ئیرادە بکا عەزابتان بۆ دەنێرێ.

جا کە حەزرەتی نووح لە ئیمان هێنانی گەلەکەی نائومێدی بوو، سەرباری ئەوەی نۆسەدو پەنجا ساڵ بانگەوازی بۆ کردن‌و کاری تێ نەکردن، نزای لەناو

چوونی لە قەومەکەی کرد، پەروەردگار فەرمانی پی کرد کە کەشتی رزگار بوون دروست بکا، ئەویش کەرەستەی پێویستی ئامادەکردو دەستی بە دروست کردنی کەشتییەکە کرد، هەرکە گەلەکەی تاقم تاقم‌و پۆل پۆل بەلایدا تێدەپەڕین، گاڵتەیان بە حەزرەتی نووح‌و کردەوەکەی دەکرد، کە کەشتییەکەی تەواو بوو پەروەردگار فەرمانی بە نووح کرد – کە جگە لە ژنەکەی – هەموو خاوخێزانی بخاتە ناو کەشتییەکەوە، هەروەها هەموو ئەوانەی ئیمانیان پی هێناوە لەتەك خۆیدا هەڵیان بگرێ، هەندێك دەڵێن: ژمارەیان شەش کەس بووە، هەندێك دەبێژن ژمارەیان چل کەس بووە، هەروەها فەرمانی پێ کرا کە لە رەگەزی هەموو گیانلەبەرێك نێرو مێیەك بخاتە ناو کەشتییەکەوە، ئەمجار تۆفان هەڵساو تەندووری ماڵی حەزرەتی نووح ئاوی لێ هەڵقوڵاو لە هەموو شوێنێك ئاو هەڵدەقوڵاو لافاو هەڵدەستا، هەتا تۆفان هەڵساو هەموو کون‌و قوژبنێکی سەرزەوی گرتەوە، جگە لەوانەی لەناو کەشتییەکەدا بوون هەموو ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تر خنکان‌و لەناو چوون!

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بە زەوی کرد کە ئاوی خۆی هەڵقوڕێنێ‌و فەرمانی بە ئاسمان کرد واز لە باران باراندن بهێنێ، کار سەری گرت‌و تۆفان وەستاو کەشتییەکە لەسەر کێوی جودی – کە کەوتۆتە هەرێمی کوردستان‌و ناوچەی دیاربەکر – وەستاو لەنگەری گرت، ئەوانەی لەناو کەشتییەکەدا بوون‌و رزگاریان بووبوو دابەزین‌و ژیانی ئاساییان دەست پێ کردەوە.

زانایانی ئیسلام‌و مێژوو زانان دەربارەی تۆفانەکە دوو رایان هەیە:

تاقمێکیان دەڵێن: تۆفانەکە هەموو زەوی گرتۆتەوە، چونکە زانیاری شوێنەوارناسی دەری خستووە کە لەسەر بەرزاییەکان‌و سەرانسەری کێوو کەژەکان پاشماوەی ئاژەڵ‌و شوێنەواری تۆفانەکە هەستی پێ دەکرێ.

کۆمەڵێکی تریان دەبێژن کە تۆفانەکە تەنیا ئەو ناوچەیەی گرتۆتەوە کە حەزرەتی نووح‌و گەلەکەی تێیدا بوون، ئەویش وڵاتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە.

پێویستە ئەوە بزانرێ کە بەڵاو موصیبەت‌و سزا جاری وا هەیە گشتی‌و سەرتاسەری دەبێ، سزاو عەزابی خودا کە هات تایبەت نابێ بە ستەمکارو تاوانبارانەوە، بەڵکوو منداڵ‌و بێ تاوان‌و بەستەزمان‌و هەموو گیانلەبەرو ئاژەڵ‌و

باڵندەو خشۆك‌و پێڕۆ دەگرێتەوە! ئەی ئەوە نیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً – الأنفال/٢٥﴾.

حەزرەتی نووح دوو دوعاو پاڕانەوەی کرد دوعایەکیان بۆ موسوڵمانان‌و دوعایەکیان لە کافرەکان. دوعای یەکەمی: کە بۆ موسوڵمانانی کرد ئەوەبوو فەرمووی: ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ – نوح/٢٨﴾.

دوعای دووهەمی کە لەکافرەکانی کرد ئەوەبوو فەرمووی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا، إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا – نوح/٢٦ – ٢٧﴾.

تۆفانەکە جیاکەرەوەی خواپەرست‌و کافرەکان بوو؛ هەرچی ئیمانی بە حەزرەتی نووح هێنا لە خنکان رزگاری بوو، هەرچی بڕوای نەکرد سەری تێدا چوو، تەنانەت کوڕەکەی حەزرەتی نووح لە پێڕی خنکاوان بوو، چونکە ستەمکارو بێ بڕوا بوو، کۆمەڵێك لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە ئەو کوڕە کوڕی راستی حەزرەتی نووح بووە، هەندێکیش دەڵێن: کۆڵەبەسەی بووە؛ واتە: کوڕی ژنەکەی بووە لە مێردێکی تری نەك کوڕی خۆی!

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ قەبارەو پانتایی کەشتییەکە نەکردووە، لە سورەتی (یس/٤١)دا بە ﴿الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ دەستنیشانی کردووە، لە سورەتی (البقرە/١٣)یشدا بە ﴿ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ﴾ وەصفی کردووە.

ئەمجار بابزانین قورئانی پیرۆز چۆن چیرۆکی پڕ کارەساتی تۆفان‌و سەرگورشتەی حەزرەتی نووح دەگێڕێتەوە!

پەروەردگار لێرەدا سوێند بۆ ئەهلی مەککەو هی تریش دەخواو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ﴾ ئەی دانیشتوانی مەککە! ئەی هەموو ئادەمیزاد! سوێند بێ؛ ئێمە (نوح)مان بۆسەر گەلەکەی رەوانە کرد، بۆ ئەوەی گەل‌و هۆزەکەی لە سزای خودا بترسێنێ بەتەمای بەهەشت‌و بەخششی پەروەردگاریان بکا، بۆ ئەوەی بانگەوازییان ئاراستە بکا واز لە بتپەرستی بهێنن، خودای تاك‌و تەنیاو بێ هاوتا

بپەرستن، یەکتاپەرستی رەچاو بکەن، جگە لە پەروەردگار کەسی تر بە خودا نەزانن و بەندایەتی زاتی پاکی ئەو بکەن و بەس.

ئەویش پەیامی خۆی راگەیاندو ﴿فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ﴾ پێی گوتن: ئەی گەل و هۆزەکەم! خودا بپەرستن واز لە پەرستنی ئەو بتانە بهێنن! بەندایەتی و خوداپەرستی هەر بۆخودا بکەن، هەموو عیبادەتێکتان بۆ زاتی پاکی ئەو ئەنجام بدەن، چونکە جگە لە خودای پەروەردگارو کردگارو زاناو دانا، ئێوە خودای ترتان نین، کەسی تر شیاوی پەرستش و بەندایەتی بۆ کردن نیە، نزاو پاڕانەوە، داوای خێرو خۆشی هەر ئاراستەی خودا دەکرێ، هەر پەروەردگار بەدی هێنەرو هەڵسوڕێنەرە، ملك و دەسەڵاتی بوونەوەر بەدەست خۆیەتی چۆنی بوێ ئاوا هەڵیدەسوڕێنێ و وەگەڕی دەخا، هەر ئەو خودای حەق و خاوەن دەسەڵات و توانایە بەسەر بوونەوەردا، هەر ئەو شیاوی پەرستن و بە پیرۆز زانین و رێز لێ گرتنە.

ئەمجار هۆی فەرمان کردنی بە خوداپەرستی پێیان و جڵەوگیری لێ کردنیان لە بتپەرستی روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەگەر بەگوێم نەکەن و بە پیر بانگەوازییەکەمەوە نەیەن ئەوە ﴿إِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ من دەترسم تووشی سزای سەختی رۆژی قیامەت ببن، ئەگەر ئێوە لەسەر بتپەرستی خۆتان بەردەوام بن رۆژی قیامەت کە دەچنە بەر قاپی خودا سزای سەختتان بداو تۆڵەی ئەم سەرپێچی کردنەتان لێ بستێنێ.

ئەو رۆژەی کە پەروەردگار بە (یوم عظیم) ناوی بردووە، دەگونجێ رۆژی قیامەت بێ، یان رۆژی هاتنی عەزابەکەو هەڵسانی تۆفانەکەیە.

جا گەل و هۆزەکەی نووح لەجیاتی ئەوەی بە پیر بانگەووازییەکەیەوە بێن و واز لە بتپەرستی بێنن، ئەوەندەی تر شێتگیر بوون و یاخی بوون؛ ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ﴾ پیاوماقوڵ و قسە رۆیشتوو سەرۆك و کاربەدەستەکانی گەلەکەی بە حەزرەتی (نووح)یان گوت: ئێمە تۆ بە گومڕاو سەرلێ تێکچوو دەزانین، پێمان سەیرە تۆ ئەوەندە گومڕاو سەرلێ شێواو بی بە ئێمە بڵێی واز لە بتپەرستی ئەو بتانە بهێنن! تۆ چۆن بەخۆت رادەپەڕمووی ئەو داوایەمان لێ بکەی!؟ ئەوانە خوداو پەرستراوی ئێمەن – ودو سواع و یەغوث و

یەعوق‌و نەسر – تکاکارو شەفیع‌و واسیتەو وەسیلەی ئێمەن لای خودا؛ لەسایەی ئەوانەوە بە بەرەکەت‌و خێری ئەوان کرداری باشمان گیرا دەبێ‌و داواکانمان جێبەجی دەکرێ، ئێمە بەبێ ئەوان ناتوانین لەخودا بپاڕێینەوە، پوختەی قسەی ئەوان ئەوەیە، دەڵێن: تۆ وا لە گومڕایی دا نوغرۆ بووی هەرگیز ڕێگای ڕاست‌و باش‌و هیدایەت ئامێز نابینیەوە!

﴿قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي ضَلاَلَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ حەزرەتی نووح فەرمووی: ئەی گەل‌و نەتەوەکەم! من گومڕاو سەرلێ شێواو نیم، من کە فەرمانتان پی دەکەم بەیەکتاپەرستی‌و وازهێنان لە بتپەرستی‌و بە سەرلێ شێواو حلێب ناکرێم، بەڵکوو من ڕەوانە کراوی پەروەردگارم‌و پێغەمبەری فەرمان پێکراوم کە ئامۆژگاری ئێوە بکەم، ڕێگای ڕاست‌و سەرفرازیتان نیشان بدەم، بتانخەمە سەر ڕێبازێك بەختەوەری دونیاو قیامەتی ئێوەی تێدا بێ، لە فەوتان‌و چارە ڕەشی هەمیشەیی بتانپارێزم.

پەروەردگار منی ڕەوانە کردووە بۆ سەر ئێوەو کردوومی بە پێغەمبەر، منیش ئەرکی خۆم ئەنجام دەدەم ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي﴾ پەیامی پەروەردگاری خۆم‌و خۆتان پێ ڕادەگەیەنم، ئەوەی پێم گوتراوە بیگەیەنم بە ئێوە، بۆیە ڕەوانە کراوم یەکتاپەرستی‌و خوداناسیتان فێربکەم، بڕوا بە ڕۆژی قیامەت‌و ڕاستی پێغەمبەرایەتی‌و هەبوونی فریشتەو بەهەشت‌و جەهەننەم بکەن. فێری ئاداب‌و خوداپەرستی‌و هەڵس‌و کەوتی جوانتان بکەم. ڕێگای ژیانی بەختەوەری دونیاو قیامەتتان پیشان بدەم ﴿وَأَنصَحُ لَكُمْ﴾ ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەو خاڵصتان دەکەم، ئامۆژگارییەکی بێ فێڵ‌و دوور لە بەرژەوەندیی تایبەتی خۆمتان دەکەم، دەتانترسێنم لە سزاو تۆڵەی خودا، ئەگەر لەسەر کوفرو بێدینی خۆتان بمێننەوەو پەیامی من بە درۆ بزانن‌و ئامۆژگارییەکانم ڕەت بکەنەوە، پەروەردگار تووشی سزای بە ئێشتان دەکا.

تەمیمی داری دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «الـدِّينُ النَّـصِيحَةُ، قُلْنَـا لِمَـنْ يَـا رَسُـولَ اللهِ؟ قَـالَ: لِلّٰـهِ وَلِكِتَابِـهِ وَلِرَسُـولِهِ وَلأَئِمَّـةِ الْمُـسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ». [١]

دڵنیابن من کە ئەم بانگەوازیو ئامۆژگاریانەتان دەکەم ﴿وَأَعْلَمُ مِـنَ اللّـهِ مَـا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ شتێك دەزانم زانستو زانیارییەکم لەخوداوە بۆ هاتووە دەربارەی ئاکامو سەرەنجامی ئەم بوونەوەرە ئێوە هیچی لێ نازانن.

من دەزانم سەرەنجامی کوفرو بێدینی چۆن دەبێ، ئامۆژگارییەکانم بۆ ئێوە لە زانستو سەرچاوەیەکی یەقینەوە سەرچاوەی بەستووە ئێوە بێ ئاگانو هیچی لێ نازانن!

بەڵێ: ئەمە ئەرك‌و کاری پێغەمبەرانە، دەبێ راگەیەنەر بێ، زمان رەوانو ئامۆژگاریکەر بێ، دەبێ زانیاری تەواوو یەقینی دەربارەی یەکتاپەرستیو دەسەڵاتو صیفاتەکانی تری خودا هەبێ، دەبێ بزانی ئاکامی کوفرو بێدینیو یاخی بوون لە خودا سزای سەختو بەئێشی خودایە.

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە لە رۆژی عەرەفەدا کە زۆرترینی موسوڵمانانی لێ کۆبووبوونەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رووی کردە هاوەڵانیو فەرمووی: خەڵکینە! ئێوە دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکرێ، ئێوە چی دەڵێن: وتیان: شایەتی دەدەین کە پەیامی خۆت گەیاندو ئەرکی سەرشانی خۆت جێبەجێ کرد، بانگەوازیو ئامۆژگاری خۆت ئەنجامدا، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەنجەی پیرۆزی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو فەرمووی: «أَللّـهُمَّ اشْهَدْ، اللّهُمَّ اشْهَدْ».

ئەمجار پەروەردگار ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە حەزرەتی نووح بە گەلەکەی فەرمووی: ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ﴾ ئەرێ ئێوە من بە درۆدەخەنەوەو بڕوام پێ ناکەنو بەلاتانەوە سەیرو عەجایەبە کە لە خوداوە پێغەمبەرتان بۆسەر نێردراوەو پەیامی بۆ هێناون؛ پێتان سەیرە پەیامی یادخەرەوەتان لەسەر زوبانی مرۆیەکی لەخۆتان بۆ ناردوون؟! بۆ ئەوەی

---

[١] – ئیمامی موسلیمو ئەبو داوودو نەسائی ریوایەتیان کردووە.

بتانترسێنێ لە ئاکامو سەرنجامی سەرکێشیو کوفرو بێدینی ﴿وَلِتَتَّقُواْ﴾ بۆ ئەوەی ئامادەباشیتان تێدا بخولقێنێ بۆ تەقواکارییو پابەندبوون بە جێبەجێ کردنی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی ﴿وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی شیاوی رەحمەتی خودا بنو بەزەیی پێتاندا بێتەوە، ئەو رەحمەتەی بۆ تەقواکارانو خوداپەرستانی داناوە ئێوەش بگرێتەوە.

ئەوە جێگای سەرسوڕمان نیە کە پەروەردگار نیگای خۆی بۆ پیاوێك لە رەگەزی خۆتان بکا، رەحمتان پێ بکا، چاکەتان لەگەڵ بکا، بۆ ئەوەی بتانترسێنێ، بۆ ئەوەی ئێوە خۆتان لە سزاو تۆڵەی بەهێزو ترسناکی بپارێزن، هاوەڵی بۆ دانەنێن بەڵکوو بەزەیی پێتاندا بێتەوە بەهۆی بەندایەتی کردن بۆ زاتی پاکیو ئیمان هێنان بە پێغەمبەرانی، بەڵام گەلی نووح گوێبیستی بانگەوازیی حەق نەبوون، درێژەیان بە رەوشتی ناپەسەندی خۆیاندا، زیاتر سووربوون لەسەر بەدرۆخستنەوەی حەزرەتی نووحو رەتکردنەوەی پەیامەکەی ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ بەدرۆیان خستەوەو روویان لێ وەرگێڕا، کەمێکیان نەبێ بڕوایان پێ نەکرد، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ – هود/٤٠﴾.

هەندێك دەڵێن: ئەوانەی بڕوایان پێ کرد ژمارەیان سێزدە کەس بوون: حەزرەتی نووحو کوڕەکانی: سام، حام، یافث، خێزانەکانیانو شەش کەسی تریش کە ئیمانیان هێنابوو.

هەندێك دەڵێن: چل، یان هەشتا کەس بوون، چل پیاو چل ژن. تۆفان بەرپابوو کارەسات دەستی پێ کرد ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ﴾ نووحو ئەوانەی بڕوایان پێ کردبوو لە کەشتییەکەدا رزگارمان کردن، ﴿وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا﴾ ئەوانەی ئایاتی ئێمەیان بە درۆ خستەوەو نینکاری تۆفانیان کرد، بە تۆفان خنکاندمانن، چونکە کافر بوونو درێژەیان بە گومڕاییو هاوەڵدانان بۆ خودا دا ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْماً عَمِينَ﴾ بێگومان ئەوانە گەلو نەتەوەیەکی حەق نەبین بوون؛ لە ئاستی بینینی حەقدا کوێر بوون، بەچاوی دڵیان حەقو راستییان نەبینیو شارەزای نەبوون.

ئاوا بەو شێوە لەم چیرۆکەدا پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە تۆڵەی خۆشەویستانی لە دووژمنانیان دەستێنێ، پێغەمبەرەکەی‌و موسوڵمانانی رزگار کردن.

## چیرۆکی هوود (دروودی خوای لەسەر بێ)

﴿ ۞ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ

مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ ۖ أَتُجَٰدِلُونَنِى فِىٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾.

هۆزی عاد گەلی حەزرەتی (هوود)ن (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم نەتەوەیە کۆنترین نەتەوەیەکن کە شوێنەوارو پاشماوەی کۆنینەیان مابێ، وا پێ دەچێ رۆژگاری ئەمان پێش رۆژگاری حەزرەتی ئیبراهیم بێ، بۆیە لە بارو گونجاوە کە دوابەدوای چیرۆکی حەزرەتی نووحو گەلەکەی باسی چیرۆکی هوودو گەلەکەی بکرێ چونکە ئەم نەتەوەیە دوابەدوای گەلی نووح هاتوون بوونە میراتگری ئەوان ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ﴾ دیارە خەڵك ئاگاداری رووداوی تۆفانی نووح بوونو ئەو رووداوە مێژووییەو بێ وێنەیان لە یاد بووە، کەوابوو حەزرەتی هوود کە بەگەلەکەی دەفەرموێ: ﴿أَفَلاَ تَتَّقُونَ؟﴾ ئاماژەیە بە ترساندنیان بە سزایەکی لەو جۆرە سزایەی کە دووچاری گەلی نووح بوو!

ئیبنو ئیسحاق لە کەلبییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: گەلی عاد بتپەرست بوون، بتیان لەسەر شێوەو روخساری ودو سواغو یەغوثو یەعوقو نەسر دروست کردبوو، صەنەمێکی تریان دروست کردبوو ناویان نابوو صەمود یەکێکی تریان هەبوو پێیان دەگوت: هەتتار، پەروەردگار هوودی کردە پێغەمبەرو ناردی بۆ سەریان حەزرەتی هوود لە هۆزێك بوو پێیان دەگوت (خلوود).

حه‌زره‌تی هوود له بنه‌ماڵه‌یه‌کی مام ناوه‌ندیی بوو، پیاوێکی شۆخ‌و شه‌نگ بوو، بانگه‌وازیی گه‌له‌که‌ی کرد بۆ خوداپه‌رستی‌و فه‌رمانی پێ کردن که واز له بتپه‌رستی بهێنن‌و یه‌کتاپه‌رستی بکه‌ن، واز له سته‌مکاریی بهێنن‌و خه‌ڵکی نه‌چه‌وسێننه‌وه، ئه‌وانیش به‌گوێیان نه‌کردوو سه‌رپێچییان کرد، زێدو وڵات‌و نیشتمانیان له ئه‌حقافی یه‌مه‌ن بوو، واته: له‌کێوه‌کانی (الرحل) له نێوان عومان‌و حه‌ضره‌مه‌وتی یه‌مه‌ن نیشته‌جێ بوون، ئاشووب‌و ئاژاوه‌یان له هه‌موو دونیادا بڵاوکردبووه‌وه، سته‌میان له خه‌ڵك ده‌کرد، به‌هۆی هێزو توانای تایبه‌تی خۆیانه‌وه ئاده‌میزادیان ده‌چه‌وسانده‌وه.

گه‌لی عاد هۆزێکی عه‌ره‌ب بوون له‌یه‌مه‌ن، له باکوری حه‌ضره‌مه‌وت له ناوچه‌ی ئه‌حقافدا نیشته‌جێ بوون، چه‌ند بت‌و صه‌نه‌مێکیان هه‌بوو ده‌یانپه‌رستن، ناوی صه‌نه‌مه‌کانیان: (صه‌دا، صه‌موود، هه‌تار) بوو. ئه‌مانه عادی یه‌که‌من. عادی دووه‌م دانیشتوانی یه‌مه‌نن له قه‌حطان‌و سه‌به‌ء. جگه له قورئانی پیرۆز هیچ له‌نامه ئاسمانییه‌کانی تر باسی عادیان نه‌کردووه په‌روه‌ردگار هوودی کرد به پێغه‌مبه‌رو ناردی بۆ سه‌ریان.

حه‌زره‌تی هوود کوڕی شاڵخ کوڕی ئه‌رفه‌رخشه‌و کوڕی سام کوڕی نووحه، که حه‌زره‌تی هوود چووه سه‌ریان‌و بانگه‌وازیی کردن بۆ ئیمان هێنان، به‌پیر بانگه‌وازییه‌که‌یه‌وه نه‌هاتن، به‌درۆیان خسته‌وه‌و سه‌رڕه‌قی‌و سه‌رکێشیان کرد، په‌روه‌ردگار سێ ساڵ بارانی لێ گرتنه‌وه، هه‌تا گرانی‌و بێ بارانی ته‌واو تینی بۆ هێنان، خه‌ڵکی که تووشی به‌ڵاو ته‌نگانه ده‌بوون ده‌پاڕانه‌وه، په‌روه‌ردگار سێ جۆر هه‌وری له ئاسماندا نیشاندان — هه‌وری سپی، هه‌وری سوور، هه‌وری ره‌ش — بانگیان لێ کرا ج هه‌ورێکیان ده‌وێ بارانتان بۆ ببارێنێ وتیان هه‌وره ره‌شه‌که هه‌ڵده‌بژێرین، پێیان وابوو ئه‌و زیاتر بارانی پێیه، به‌ته‌مای ئه‌وه‌بوون خێریان لێ ده‌ست بکه‌وێ، وتیان: ﴿هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا﴾ ئه‌م هه‌وره بارانمان بۆ ده‌بارێنێ، به‌ڵام ره‌شه‌بایه‌کی سه‌ختی پێ بوو بایه‌که‌یان رێ که‌وت، هه‌موویان له‌ناو چوون جگه له حه‌زره‌تی هوودو ئه‌وانه‌ی ئیمانیان پێ هێنابوو!! حه‌زره‌تی هوود (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) دوای به‌هیلاکچوونی عاد له وڵاتی حه‌ضره‌مه‌وتدا نیشته‌جێ بوو هه‌تا له‌دونیا

دەرچوو، لە رۆژهەڵاتی زێدی عاد دوو قۆناغە رێ لەشاری (تریم) نزیک دۆڵی بەرهووت نێژراوە.

دەی با بزانین قورئانی پیرۆز چۆن ئەم چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە؟ دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً﴾ واتە: هوودمان بۆ سەر هۆزی عاد کە لەرەگەزدا یەکێک بوو لەو هۆزە – نەک برای ئایینییان بوو – واتە: لە رەگەزی خۆیان بوو لە رەگەزی فریشتە نەبوو، بۆئەوەی لە ئاخاوتنی تێبگەن‌و هەڵس‌و کەوتی کاریان تێ بکا، ئەخلاق‌و رەوشتی جوانی ببێتە پاڵپێوەنەر بۆ ئیمان هێنانی ئەوان پێی.

حەزرەتی هوود کە رەوانەکرا بۆ سەریان‌و دەستی بە بانگەوازیی کرد ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ﴾ وتی: ئەی گەل‌و هۆزەکەم! تەنها خودا بپەرستن، هەر پەروەردگار بەشیاوی بەندایەتی بۆ کردن بزانن، هیچ شتێکی تر مەکەن بە خوداو بە هاوشانی پەروەردگار، جگە لەخودای تاک‌و تەنیاو بێ وێنە ئێوە خودای ترتان نیە، لەخۆڕایی ئەو بت‌و صەنەمانە بەخودا مەزانن ﴿أَفَلاَ تَتَّقُونَ﴾ ئەرێ ئێوە بۆ لەخودا ناترسێن؟ بۆ بەندایەتی‌و ملکەچی بۆ ئەو ناکەن؟ بۆ واز لە پەرستنی ئەو بت‌و صەنەمانە ناهێنن؟ بۆ خۆتان لە سزای دۆزەخ ناپارێزن؟

وادیارە ئەم قسانەی حەزرەتی هوود لەسەر شانی گەلەکەی گەلێک قورس بوو، پێیان ناخۆش بوو یەکێک لەخۆیان بانگەوازییان بکا بۆ هیدایەت‌و خودا پەرستی! لەسەر شانیان گران بوو یەکێک لەخۆیان نارەزایی بەرامبەریان دەربڕێ‌و بەبێ دین‌و تەقوانەکەریان دابنێ! ئیتر چاویان لێ پەرییە پشتی سەرو پێیان وابوو حەزرەتی هوود نەفام‌و گێلە، بۆیە بەبێ شەرمانە پێغەمبەری خۆیان تۆمەتبار کرد بەبێ عەقڵ‌و درۆزن‌و گێل‌و نەفام ﴿قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ﴾ پیاو ماقوڵ‌و سەرۆک‌و قسە رۆیشتووەکانیان ئەوانەی ئیمانیان پێ نەهێنا لە گەلەکەی وتیان: ﴿إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆ بە گێل‌و نەفام دەزانین کە واز لە ئایینی خۆت دەهێنی‌و ئایینێکی تر وەردەگری!

﴿وِإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ ئێمە پێمان وایە تۆ لەم ئاخاوتن‌و بانگەوازییەتدا، لە ئیدیعای ئەوەدا کە دەڵێ من پێغەمبەرم‌و لەخوداوە بۆ سەر ئێوە نێردراوم

یەکێکی لەو درۆزنانەی کە بەدرۆ لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن، درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن.

بەڵێ هەروا بە هەوانتەو بێ شەرمو حەیا، بەبێ تێفکرینو وردبوونەوەو هەبوونی بەڵگە ئاوا حەزرەتی هوودیان تۆمەتبار کرد!

حەزرەتی هوود زۆر بە ئەدەبو حیشمەتەوە، بەچاو پۆشیو لێبوردوییەوە ﴿قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ﴾ ئەمیش وەکوو حەزرەتی نووح پاکانەی بۆ خۆی کردو وتی: ئەی گەلو هۆزەکەم! من هیچ دیاردەیەکی گێلیو نەفامیم پێوە نیە، هەرگیز گومڕاو ئەحمەق نیمو سەر لێ شێواو نەبووم، ﴿وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ بەڵکوو من پێغەمبەرمو لەلایەن پەروەردگاری بوونەوەرەوە رەوانە کراوم، خودا منی بۆ سەر ئێوە ناردووە بۆئەوەی ئەرکەکانی سەرشانتان بەرامبەر پەروەردگار بۆتان روون بکەمەوە، پەیامی پەروەردگارتان پێ رابگەیەنمو رێبازی ژیانی بەختەوەری هەردوو دونیاتان نیشان بدەم!

کاری سەرەکی ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاتِ رَبِّي﴾ پەیامو ئامۆژگارییەکانی خوداتان پێ رادەگەیەنم، ئایینی پەسەندو خودا ویستتان فێردەکەم ﴿وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ﴾ من لە راگەیاندنی پەیامی پەروەردگارو ئامۆژگاری کردنم دا بۆ ئێوە ئامۆژگاریکەرێکی دڵسۆزمو فرتو فێڵتان لێ ناکەم، درۆ هەڵبەستو خیانەتکار نیم!

دیارە گەلەکەی هوود پێیان سەیر بووە – وەکوو چۆن پێش ئەوان گەلی نووح سەرسام بوون – کە لەخۆیانو لە رەگەزو هۆزی خۆیان خودا پیاوێك هەڵبژێرێو بیکاتە پێغەمبەرو رەوانەی بکا بۆ سەریانو پەیامی پەروەردگاریان پێ رابگەیەنێ!! بۆیە حەزرەتی (هوود)یش هەمان ئاخاوتنو هەڵوێستی حەزرەتی نووح دووبارە دەکاتەوە، دەڵێی هەردووکیان گیانێکن لەدوو جەستەدا!؟

دەفەرموێ: ئایا ئێوە من بەدرۆ دەخەنەوەو بڕوام پێ ناکەن ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ﴾ ئەوە پێتان عەجایەبە کە لەخودای خۆتانەوە پەیامتان بۆ نێردراوە بەهۆی پیاوێك لە هۆزی خۆتان بۆئەوەی بتانترسێنێ لە سزای سەختی خودا!

پێویستە ئێوە سەیری واقیعی حاڵی خۆتان بکەن ﴿وَاذكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ﴾ بیری بەخشش‌و نیعمەتی خودا بکەنەوە کە ئێوەی کردووە بە جێنشینی گەلی نووح ئەوان لەم زێدو نیشتمانەی ئێوەدا دەژیان بەهۆی بتپەرستی‌و یاخی بوونیان لەخوداو گوێ نەدان بە ئامۆژگاری حەزرەتی نووح‌و پەیامەکەی، پەروەردگار بە تۆفان لەناوی بردن‌و فەوتاندنی، ئێوەی لەشوێنی ئەوان هێناوەتە وجوودو کردوونی بە میراتگری ئەوان، وێڕای ئەوە ﴿وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً﴾ هێزو توانای زۆری پێ بەخشیون، جەستەو ئەندامی رێك‌و پێك‌و بە شان‌و شەوکەت‌و کەڵەگەت‌و چوار شانەو تێکسمڕاو دروستی کردوون، ﴿فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ یادی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا بکەنەوە، شوکرو سوپاسی پەروەردگار بکەن لەسەر نیعمەتەکانی بە ئیخلاصەوە خودا پەرستی بکەن، خودا بەیەك بناسن‌و یەکتاپەرست بن‌و واز لە بتپەرستی‌و شەریك دانان بۆ خودا بهێنن، بۆئەوەی بە مراز بگەن‌و سەرفراز بن‌و بەهەشتی رازاوەتان بە نسیب بێ، ژیانی خۆشی‌و کامەرانی تێدا بەسەر بەرن!

بەڵام کە سروشت تێکچوو ئادەمیزاد سەری لێ شێوا، نە بیردەکاتەوەو نە ورد دەبێتەوە، بۆیە گەلی هوود ئامۆژگارییەکانی هوودیان رەتکردەوەو پشتیان هەڵکردو لەخۆیان بایی بوون‌و پەلەی هاتنی سزای خودایان کردو زوو کۆتاییان بە وت‌و وێژەکە هێنا، چونکە ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی هوودیان لەسەر شان گران بوو، گاڵتەیان بە هەڕەشەکەی حەزرەتی هوود هات‌و ﴿قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ بە ئوسلووبێکی لاقرتێ پێ کردنەوە وتیان: ئەوە تۆ بۆ ئەوە هاتووی تەنیا خودا بپەرستین‌و واز لە پەرستنی ئەو شتانە بهێنین کە باوك‌و باپیرمان دەیانپەرستن؟؟ داوای ئەوەمان لێ دەکەی ئێمە واز لە خوداکانی باوك‌و باپیرانمان بهێنین‌و تەنیا یەك خودا بپەرستن؟!

بەڵکوو زیاتر پێیان لێ هەڵبڕی‌و پتر سەر رەقی خۆیان ئاشکرا کردو ئەحمەق‌و کەللە شەقی خۆیان گەیاندە ئەوپەڕی سنوورو سووربوونی خۆیان لەسەر ئیمان نەهێنان بە پەیامی حەزرەتی هوود راگەیاندو وتیان: ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ دەبێ منەت بەا ئەوەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی بۆمان بێنە، ئەگەر

راست دەکەی ئێمە بڕوامان بـە پەیامەکـەت نەکـەین عـەزابمان بـۆ دەهێنـی دەڵێن: بۆمان بێنە!

بەم جۆرە گەلەکەی ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نەبوو رووبەڕووی حەق‌و راسـتی ببنەوە، بەڵکوو داوای هاتنی عەزابیان کردو پەلەیان لە هاتنەکەی کرد، مەبەستیان خۆدزینەوە بوو لە تێفکرینی حەق‌و راسـتی‌و رووبـەڕوو بوونـەوەی؛ نەیاندەویـست وردبوونـەوە لەکـەم بایـەخی بەتاڵـدا ئـەنجام بـدەن‌و پـۆخڵاواتی بیروباوەڕیـان دەربکەوێ! بۆیە هـیچ بەڵگەیان بەدەسـتەوە نـەما وتیـان: دە ئەگـەر راسـت دەکـەی عەزابەکەمان بۆ بێنە!

وەڵامی حەزرەتی هوود بۆیان وەڵامێکی گورجك بڕو دەست لە عاست‌و پڕاوپـڕ بوو!

﴿قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَـيْكُم مِّـن رَّبِّكُـمْ رِجْـسٌ وَغَـضَبٌ﴾ حـەزرەتی هـوود فـەرمووی: دڵنیابن کە سزاو نارەزامەنـدیی خـوداو دوور لـە رەحمـەت‌و بـەزەیی پـەروەردگارتان کەوتە سەر! ئەو عەزابەی ئێوەم پێ ترساندو ئێوەش پەلەتانە بێتە سەرتان، دێـتە سەرتان.

عەزابەکـە بریتـی بـوو لـە رەشـەبایەکی تونـدی بەگرمـە گرمـی سـامناکی ریشەکێش کەر! ئـەو زەلامـە بـەهێزو چوارشـانەو زەبەلاحانـەی لاڵ‌و پـاڵ خـستن، شێوەی ئەو زەلامە لاڵ‌و پاڵ کەوتووانە دەتگوت: کۆتەرە دارخورمـای هەڵکەنـدراون تارومار کراون!

ئەمجار حەزرەتی هوود دوای ئەم پەلەکردنەیان لە هاتنی عـەزاب، پڕوپووچـی بیروباوەڕیان روون دەکاتەوەو بیروبۆچوونی نالـەبارو بـێ جـێ‌و رێیـان دەستنیـشان دەکا، ﴿أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم﴾ ئایا ئێوە چۆن کێشەم لەگـەڵ دەکەن دەربارەی ئەم بت‌و صەنەمانەی ئێوەو باوك‌و باپیرانتان ناوتان ناون خـوداو بـەخودایان دەزانـن، کـە لەڕاسـتیدا هیـچیان پـێ نـاکرێ، نـە زیـان دەگەیـەنن‌و نـە سوودیان هەیە، بەڵکوو تەنها چەند ناوو نیـشانێکە ئێـوەو بـاب‌و باپیرانتـان بەسـەر ئەو دارو بەردە پڕوپووچانەتاندا داوە ﴿مَّـا نَـزَّلَ اللّـهُ بِهَـا مِـن سُـلْطَانٍ﴾ دەربـارەی خودایـەتی ئـەو بـت‌و صـەنەمانە پـەروەردگار هـیچ بەڵگـەو دەلیلێکـی نەناردۆتـە

خواریٔ پاڵپشتی بۆچوونی بیٔ بناغەتان بکا، هەرگیز خودا رازیی نابیٔو نەبووە کە ئەو داروبەردە بەخودا دانراوانەتان ببنە ناوەند لەنێوان ئێوەو پەروەردگاردا، هەروەها رازی نیەو نابیٔ کەئێوە ئەو داروبەردە بیٔ گیانانە بەخودا بزانن‌و بیانپەرستن.

به کورتی‌و پوختی تەنها خودا عیبادەتی بۆ دەکریٔو رووی تیٔ دەکریٔو هانای بۆ دەبریٔ! کەسی تر نابیٔ بەخودا بزاندریٔو بپەرستریٔ یان بکریٔ بە هاوەڵی‌و بە شەریکی خودا بزاندریٔ!

ئەمجار حەزرەتی هوود بەدڵنیایی‌و لەخۆڕادیویەوە، بەرەنگاری گەلەکەی بووەو پێی فەرموون: ﴿فَانتَظِرُواْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ﴾ ئێوە چاوەڕوانی هاتنی عەزابەکە بن کە بۆ خۆتان پەلەی هاتنی دەکەن‌و دەڵێن: دە بۆمان بێنە، منیش لەگەڵتان چاوەڕوانی دەکەم ئەمن دڵنیام لە هاتنی‌و ئێوە گومانتان دەربارەی هەیە.

بەڵیٔ عەزابەکە لەکاتی خۆیدا هاتە سەریان‌و ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا﴾ هوودو ئەوانەی ئیمانیان پیٔ هێنابوو بە رەحمەت‌و بەزەیی خۆمان رزگارمان کردن‌و عەزابەکە نەیگرتنەوە. ﴿وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا، وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئاسەواری ئەوانەی ئایەتی ئێمەیان بەدرۆخستەوە بڕیەوەو لەناومان بردن‌و لەبێخمان دەرهێنان‌و تاقمان لیٔ بڕین! چونکە ئەوانە ئیمانیان بەخودا نەهێناو ئایاتی پەروەردگاریان بەدرۆخستنەوە، بەهۆی ئەم دوو رەوشتە ناپەسەندەیان شیاوی عەزابی سەختی پەروەردگار بوون کە بریتی بوو لە رەشەبایەکی سەختی وێرانکەری خاوەن گەرم‌و هووڕ زەلامی زەبەلاحی هەڵدەگرت لە زەوی بەرزدەکردەوەو پاشان سەرەوبن فڕێی دەدایە سەر زەوی‌و سەریان لە جەستەیان جیادەبووەوە، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَى إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ – الأحقاف/٢٥﴾.

ئاواو بەو جۆرە لاپەڕەیەکی تر لە لاپەڕەکانی بەسەرهاتی سەر رەق‌و ملهوڕو بەدرۆخەرەوەکان پێچرایەوە هەرەشەکە هاتەدی‌و عەزابەکە دەوری دان‌و لوولی کردن‌و بەرەو تیاچوونی نەمان رای فڕاندن، کە ئامۆژگاری‌و یادخستنەوەو بانگەوازی

کاری تێ نەکردن هەڕەشەو لەناوچوونو عەزابی سەخت یەخەی پێ گرتنو لەناوی بردنو بوونە پەندی زەمانەو بەدبەختی هەردوو دونیا بوون!

## چیرۆکی حەزرەتی صالح (درووودی خوای لەسەر بێ)

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَـٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَـٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ

مُؤۡمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

پەروەردگار لە سەرەتای سووورەتەکەدا چیرۆکی ئادەم – کە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر بەتوانایی‌و تەنیایی پەروەردگاریەتی خودای مەزن – گێڕایەوە، پاشان بەڵگەی بەهێزی هێنایەوە لەسەر زیندوو بوونەوەی دوای مردن‌و هاتنی رۆژی قیامەت، ئەمجار هاتە سەر گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەرەکان‌و هەڵوێستی گەل‌و نەتەوەکانیان بەرامبەریان.

قەومی ثەموود دوابەدوای قەومی عاد هاتوونە کایەوە، وەکوو قورئان لەسەر زوبانی صالح دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ﴾ ثەموود کوڕی عاثر کوڕی ئیرەم کوڕی نووحە، برای (جەدیس)ی کوڕی عائیزە. ئەمانەو هۆزی (طسم) هەموویان لە عەرەبی عاریبەن‌و ئێستا ئاسەواریان نەماوەو پێش حەزرەتی ئیبراهیم بوون (علیه السلام).

هۆزی ئەموود – کە قەومی حەزرەتی صالح پێغەمبەرن – لەدوای هۆزی عاد هاتوونە کایەوە، لە نیشتمانو شوێنو جێگای عاددا نیشتەجێ بوون، شوێنو نیشتمانیان لە حیجرە بووە؛ لەنێوان حیجازو شامدا تا دەوروبەری مەککە. مەدائینی صالح تا ئێستاش شوێنەواری ماوە بە (فج الناقة) ناودەبرێ، حیجری ئەموود کەوتۆتە باکوری رۆژهەڵاتی خاکی مەدیەن.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ساڵی نۆیەمی کۆچی کە تەشریفی دەچوو بۆ تەبووك بەسەر شوێنەواری ئەماندا تێپەڕی! ئیمامی ئەحمەد لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوەڵانیدا دەچوو بۆ تەبووك لە حیجر لە لای خانووە کۆنەکانی ئەموود خستیانو قۆناغیان گرت، خەڵکەکە ویستیان ئاو لەو بیرانە هەڵێنجن کە هۆزی ئەموود ئاویان لێ دەخواردەوە، هەویریان شێلاو مەنجەڵیان سەر ئاگر خستن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردن کە مەنجەڵەکانیان بڕێژنو هەویرەکەش بکەن بە ئاڵف بۆ حوشترەکانیانو لەو شوێنە جێگاو قۆناغی پێ بەستنەوە چوونە سەر ئەو بیرەی کە کاتی خۆی حوشترەکەی صالح پێغەمبەر ئاوی لێ دەخواردەوە، جڵەوگیری ئەوەی لێ کردن کە بچنە ئەو شوێنەی کە جێگای قەومە سزادراوەکەیە، فەرمووی: دەترسم ئەو عەزابەی تووشی ئەوان بووە تووشی ئێوەش بێ، مەچنە ئەو شوێنو جێگایەی ئەوان!

هەر ئیمام ئەحمەد لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە حیجردا بەخەڵکەکەی فەرموو: مەچنە سەر شوێنەواری ئەو عەزابدراوانە مەگەر بە گریانەوە بچن، ئەگەر بەگریانو فیغانەوە نەچن مەچن، چونکە دەترسم ئەوەی تووشی ئەوان بووە تووشی ئێوەش بێ![1]

هۆزی ئەموود وەکوو هۆزی نووحو هۆزی عاد شەریکیان بۆ خودا دادەنا، پەروەردگار نازو نیعمەتێکی زۆری پێ بەخشیبوون! خودای مەزن حەزرەتی (صالح)ی بە پێغەمبەری بۆسەر ناردن، ئامۆژگاری کردن، نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی خودای وەبیرهێنانەوە، نیشانەو بەڵگەی تاكو تەنهایی خودای بۆ هێنانەوە بێ

(١) – بناغەی ئەم حەدیثە لە صەحیحەیندا بەچەند شێوەیەك دەرهێنراوە.

هاوەڵیی‌و بێ وێنەیی خودای بۆ باس کردن، ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە پێویستە طاعەت‌و بەندایەتی هەر بۆخودا بکرێ بۆ کەسی تر نەکرێ!

مسکین‌و بۆرە پیاو هەژارو ڕەشە خەڵکەکەی گەلەکەی ئیمانیان پێ هێنا، دەوڵەمەندو پیاو ماقووڵ‌و سەرۆکەکانیان بڕوایان پێ نەکردو ڕوویان لێ وەرگێڕاو لووتبەرزیان نواندو لەسەر کوفرو ملهوڕی خۆیان بەردەوام بوون‌و ئینکاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (صالح)یان کردو گاڵتەیان پێ کرد.

دەی با بزانین قورئانی پیرۆز چۆن ئەم داستانەی تۆمار کردووەو چۆنمان بۆ دەگێڕێتەوە؟!

بەڵێ: ئەمەش لاپەڕەیەکی ترە لە لاپەڕەکانی ئادەمیزاد! چیرۆکێکە بەڵکوو ڕووداوێکی واقیعی‌و حەقیقییە لە قوڵایی مێژووەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، چیرۆکی تێك شکاندنی ئادەمیزادە بەرەو نەفامی‌و نەزانی، دیمەنێك لە دیمەنی زۆرانبازی نێوان حەق‌و بەتاڵ، گۆڕەپانێکی ترە لە گۆڕەپانەکانی لاڵ‌و پاڵکەوتنی سەرپێچیکارو بە درۆخەرەوەکان! چیرۆکێکی ترە لە چیرۆکی زاڵبوونی حەق بەسەر بەتاڵدا، تێکشکان‌و لەناوچوونی ستەمکارو ملهوڕەکانی مێژووی کۆنینەی ئادەمیزادە، چیرۆکی سەرکەوتن‌و سەرفرازیی‌و بەمرادگەیشتنی خوداپەرستانە فەرموون گوێ ڕابگرن لە قورئانی پیرۆز چۆن ئەم چیرۆکە دێرینە دەگێڕێتەوە.

﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا﴾ بێگومان بۆ سەر هۆزی ثەموود (صالح)ی هاوزمان‌و هاوجینس‌و هاوعەشیرەتمان بۆ ناردن بە پێغەمبەریی چووە ناویان‌و بە فەرمانی ئێمە بانگەوازیی دەست پی کرد، ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ﴾ وتی: ئەی گەلەکەم! خوداپەرستی بکەن، بەتەنیا ئەو بپەرستن‌و کەس مەکەن بەهاوەڵی وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ – الأنبياء/٢٥﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ – النحل/٣٦﴾.

واز لە بتپەرستی بهێنن‌و شوێن پەیامی من بکەون ﴿قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ هَـذِهِ نَاقَةُ اللّهِ لَكُمْ آيَةً﴾ ئەو حوشترە بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی من هێناومەو پێی نێردراوم، ئەوەبوو قەومەکە داوایان لە حەزرەتی صالح کرد کە

بەڵگەو نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی خۆی نیشان بدا، بەردێکی رەق و تەقیان دەستنیشان کرد، وتیان: لەو بەردە حوشترێکمان بۆ دەربێنە ئێمە بڕوات پێ دەکەین، ئەو بەردەی دیارییان کردبوو بەردێکی بەتاقەوە بوو بوو کەوتبووە لای حیجرەوە، حەزرەتی صالحە وادەو بەڵێنی لێ وەرگرتن کە ئەگەر خودا پێشنیارەکەیان بێنێتە دی ئەوە یەکسەر ئیمانی پێ دەهێنن، کەوادەو بەڵێنی جەخت لەسەر کراویان پێدا، حەزرەتی صالح نوێژێکی کردو لە خودا پاڕایەوە داوای جێبەجێ کردنی داواکەیانی کرد؛ ئیتر بەردەکە جوڵەی پێ کەوت و شەق بوو حوشترێکی لێ هاتە دەرێ بێچووەکەی لە سکیدا دەجوڵایەوە، هەندێکیان ئیمانیان پێ هێنا، هەندێکیان لەسەر کوفری خۆیان مانەوە، وشترەکە پاش ئەوەی بێچووەکەی لێ بووەوە، رۆژێک سەرتاپا هەموو ئاوی بیرەکەیانی دەخواردەوە، رۆژێکیش بۆ ئەوانی تەرخان دەکرد، ئەو رۆژەی کە وشترەکە ئاوی بیرەکەی دەخواردەوە ئەوان شیرەکەیان دەدۆشی، هەموو مەنجەڵ و قاپ و شتومەکیان لێ پڕ دەکرد لەشیرەکەیان دەخواردەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاء قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ - القمر/٢٨﴾. یان لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ - الشعراء/١٥٥﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەو رۆژەی وشترەکە ئاوەکەی دەخواردەوە ئەوان لەجیاتی ئاو شیریان دەخواردەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿هَذِهِ نَاقَةُ اللّهِ لَكُمْ آيَةً﴾ واتە: بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی من! کە دەفەرموێ ئەمە حوشتری خودایە، واتە: حوشترەکە پاڵ خودا دراوە، ئەو بۆ رێزو قەدر زانین و گرنگی پێدانە، چونکە ئەو حوشترە بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا وەدی هاتووە، بەبێ باوک و دایک لە بەردێکی رەق پەیدا بووە.

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە ئەم حوشترە موعجیزەیە پێویستە دەستکاری نەکەن و وازی لێ بێنن، دەفەرموێ: ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللّهِ وَلاَ تَمَسُّوهَا بِسُوَءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: حوشتر حوشتری خودایە، زەوی زەوی خودایە، لێی بگەڕێن با بۆخۆی لە زەوی خودا چی دەخوا با بیخوا، ئێوە بۆتان نیە دەستی بەر

دەستی بهێنن‌و شتی لێ قەدەغە بکەن! بەهیچ جۆرێك دەستی بۆ درێژ مەکەن‌و خراپە لەگەڵ خۆی‌و خۆراکی مەکەن! وازی لێ بهێنن چی دەخواو دەخواتەوە با بیخواو بیخواتەوە. چونکە ئەگەر وازی لێ نەهێنن ئەو سزایەکی بە ئێش‌و سەخت دەتانگرێتەوەو تووشتان دێ.

ئەمجار نیعمەتەکانی خودایان وەبیر دێنێتەوە، کە پێویستە لەپای ئەو نازو نیعمەتانە سوپاسی بکەن‌و بیپەرستن، فەرمووی: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا﴾ یادی نازو نیعمەتەکانی خودا بکەنەوە کە پێی بەخشیوون، سەیری چاکەو بەرەحمی خودا بکەن بەسەرتانەوە، ئەوەتا کردوونی بە جێنشین‌و میراتگری قەومی عادو لە ژیارو شارستانیەت‌و ئاوەدانی‌و هێزو توانادا. زەوی وڵاتی ئەوانی بە ئێوە بەخشیوە، ئێوەی لە شوێنی ئەوان نیشتەجێ کردووە، لە دەشتایی‌و پێتەختیدا باڵەخانەی بەرزو رازاوە دروست دەکەن، سوود لە گڵ‌و دارو بەردی دەبینن بۆ دروست کردنی خانوو باڵەخانەکانتان، لە کێوەکان بەرد دەتاشن شوراو قەڵای قایم‌و قوڵی پێ دەکەن، لە زستاندا تێیدا دەحەوێنەوە، زریان‌و باوبۆران‌و رەشەباو باران کاری تێناکەن، لەسەرماو زریانی زستان پاریزراو دەبن، باقی وەرزەکانی ساڵیش لەدەشتایی‌و سەر دێبەرەکانتاندا بەسەر دەبەن‌و خەریکی کشتوکاڵ‌و پیشەی خۆتان دەبن.

﴿فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ واتە: ئەم هەموو نیعمەتانەی خودا یاد بکەنەوە، سوپاس‌و ستایشی زاتی پاکی خودا بکەن، عیبادەت هەر بۆ ئەو بکەن بەتاك‌و تەنهایی بناسن، لەبەرامبەر نیعمەتەکانی خودادا هەڵس‌و کەوتی ناجوامێرانە مەنوێنن، ئاژاوەو ئاشووب لە زەویدا بەرپا مەکەن، شتێك مەکەن خودا لە حۆتان برەنجێنن‌و خودا پێی رازی نەبێ!

﴿قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ﴾ پیاو ماقووڵ‌و سەرۆك‌و دەست رۆیشتووەکانیان ئەوانەی خۆیان بەزلزانی‌و لەناو قەومەکەیدا لووتبەرزییان نواندو روویان لە بانگەوازیی حەزرەتی صالح وەرگێرا وێرای ئیمان نەهێنانی خۆیان وتیان: ﴿لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ﴾ بەوانەی بۆرەپیاوو مسکێن‌و هەژارو

نەدارا بوون – کە بەروالەت ئەم توێژەی کۆمەڵ لە هەموو چەرخ و رۆژگارێکدا زوو بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرانەوە هاتوون و موسوڵمان بوون – کە ئیمانیان بە حەزرەتی صالح هێنابوو ﴿أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ؟﴾ ئەوە ئێوە پێتان وایە صالح پێغەمبەرەو لە خوداوە نێردراوە؟

هەڵبەتە ئەم پرسیارە مەبەستیان گاڵتە پێ کردن و لاقرتێ پێ کردن بوو، بۆرەپیاو مسکێنەکان کە ئیمانیان هێنابوو ﴿قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ وەڵامی ملهوڕو خاوەن دەسەڵاتە کافرەکانیان دایەوە؛ وتیان: ئێمە بڕوامان وایەو دڵنیاین کە حەزرەتی صالح لەخوداوە نێردراوە، هیچ شك و گومانمان لە پێغەمبەرایەتی ئەودا نیە، ئێمە ئیمانمان بەو پەیامە هێناوە کە حەزرەتی صالح هێناویەتی؛ کافرەکان پرسیاری ئەوەیان لێ کردن ئایا راستە صالح بووەتە پێغەمبەر؟ بەڵام موسوڵمانەکان پێغەمبەرایەتیەکەیان بەشتێکی بەڵگە نەویست زانی و وەکوو ئەوە بڵێ: ئەوە شتێك نیە جێگەی پرسیار کردن بێ، ئەوە ئێمە گومانمان لەوەدا نیە، ماوەتەوە ئایا پێویستە ئیمانی پێ بهێندرێ یان نا؟! ئەوە ئێمە پێتان رادەگەیەنین کە ئێمە بڕوامان پێ کردووەو موسوڵمان بووین.

ئەمجار کافرەکان لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەی موسوڵمانەکاندا سووربوونی خۆیان لەسەر کوفرو بێدینی راگەیاندو سەرلەنوێ گومڕایی خۆیان دووبارە کردەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾ ئەوانەی کافرو لووتبەرز بوون وتیان: دەسا ئێمە هەرگیز بڕوا بەو کەسەو بەو پەیامە ناکەین کە ئێوە ئیمانتان پێ هێناوە، ئێمە کافرو بێ بڕواین بە پێغەمبەرایەتی صالح و هەرگیز بڕوای پێ ناکەین.

ئاوا بەو جۆرەو بێ پێچ و پەنا هەڵوێستی خۆیان راگەیاندەوە سووربوونی خۆیان لەسەر کوفرو ملهوڕی دووبارە کردەوە، بەمەندەشەوە نەوەستان بەڵکوو بەکرداریش ئەوەیان جەخت کردەوە ﴿فَعَقَرُواْ النَّاقَةَ﴾ ئەو حوشترەی کە خودا بە موعجیزە لە بەردێکی رەق بۆ راستی پێغەمبەرایەتی صالح بە شێوەیەکی نائاسایی دروستی کردبوو سەریان بڕی، هیچ گوێیان بە ئامۆژگاری حەزرەتی صالح نەدا کە پێی گوتن: ئەم حوشترە موعجیزەی خودایە، وازی لێ بهێنن و دەست درێژی

مەكەنە سەر ﴿وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ﴾ پشتیان لە فەرمانی خودا هەڵكرد، كە لەسەر زەمانی صالح پێیان راگەیاندرابوو دەربارەی حوشترەكە، یان پشتیان لە ئایینی خودا هەڵكردو یاخی بوون؛ بەمەندەش وازیان نەهێنا، بەڵكوو بە تەحەدداوە ﴿وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ وتیان: ئەی صالح! دڵنیابە ئێمە بڕوات پی ناكەین‌و نایەینە سەر ڕێبازی تۆ، بێ منەت بە! ئەو عەزابەی تۆ هەڕەشەمان پێ لێ دەكەی بۆمان بێنە، ئەگەر راست دەكەی تۆ لە پێڕی پێغەمبەرانی‌و ئەگەر ئێمە ئیمانت پێ نەهێنین عەزابمان بۆ دێ‌و خودا تۆڵەمان لێ دەستێنێ! دە خێراكە بۆمان بێنە! ئیتر ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ بوومەلەزمیەكی بەهێز لێی دان‌و رای تەكاندن‌و زەندەقی بردن، بوومەلەرزەی زەوی‌و گرمەی زەندەقبەری ئاسمان تێكەڵاو بوون‌و لێی دان، هەریەكەیان لەعاست خۆیەوە بەرەو دەم قونگەولتوور كەوت‌و خپ بوو گیانی تێدا نەماو مرد!

دەربارەی لەناوچوونی قەومی صالح لێرەدا فەرمووی: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ﴾ لە سورەتی (الذاريات/٤٤)دا دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾ لە هەموویاندا مەبەستەكە پەیدابوونی دەنگێكی گەورەو گرمەو ناڵەیەكی سامناكی وەها كە بوومەلەرزەی لەزەویدا بەرپا كردو زەندەقی بردن‌و هەناوی بڕین‌و خپی كردن!

زانایان دەڵێن: هۆی پەیدابوونی ئەم بوومەلەزەو گرمەو ناڵە لێك كەوتنی كارەبایی زەوی بە كارەبایی هەوا بووە كە لەناو هەوادا هەیەو هەورە برووسكەی لێ پەیدا دەبێ.

دەشگونجێ پەروەردگار كاتی لەناوبردنەكەی ئەوان هەوری پڕ لە كارەبای لەو ولاتە كۆكردبێتەوەو لەگوێرەی سوننەتی خۆی لە كەوندا ئەو بوومەلەرزەو هەورە تریشقە هاتبێتە دی.

دەشگونجێ خودای خاوەن دەسەڵات ئەو بوومەلەرزەو هەورە تریشقەی بەشێوەی موعجیزە ئاسا هێنابێتە كایەوە... هەرچییان بووبێ؛ گرنگ ئەوەیە هەڕەشەی پێغەمبەری خودا هاتۆتە دی‌و ئەو قەومە ستەمكارە ملهوڕە بەو شێوە سامناكە لەناو چوون!

وايێ دەچێ حەزرەتى صالْح ئاگادارى لەناوچوونەكيان بووەو ديمەنى سامناكى دوا لـەناو چوونيانى بينيـوە، بۆيـە دەفـەرموێ: ﴿فَتَـوَلَّى عَـنْهُمْ﴾ پاشان پـشتى تـێ كردنو خەفەتى ئيمان نەهێنانى ئەوانى خواردو پێى ناخۆشبوو كە ئاوا خۆيان بـە فەتارە داو بەدبەختو چارەڕەشى هەردوو دونيا بوون! بەغەمبارييـەوە خيطابى خۆى ئاراستەى ئـەو كەلاكە كەوتووانـە كـردو ﴿وَقَـالَ يَـا قَـوْمِ﴾ وتـى: ئـەى گـەلو هۆزەكەم! بۆچى واتان لە خۆتان كردو ئەم دەردەتان بەسەر خۆتان هێنا؟!

﴿لَقَـدْ أَبْلَغْـتُكُمْ رِسَـالَةَ رَبِّـي﴾ بێگومـان مـن پـەيامى پـەروەردگارى خـۆمم پـێ راگەياندن، ئەوپەڕى هەولْو تێكۆشانم ئەنجامدا ئێوە ئيمانم پێ بێنن، ﴿وَنَـصَحْتُ لَكُـمْ﴾ زۆرم ئامۆژگـارى كـردن، تـەماعم بـەرنان، هەڕەشـەم لێ كـردن، بەهـەموو جۆرێـك نەصيحەتم كـردن ﴿وَلَكِـن لاَّ تُحِبُّـونَ النَّاصِـحِينَ﴾ بـەلاْم بەداخـەوە ئێـوە ئامۆژگاريكەرتان خۆش ناوێنو بەقسەيان ناكەن! هەتا ئاوا چارەڕەشىو بەدبـەختى بۆ خۆتان دەستەبەر دەكەن! بەلْێ بـەو شـێوە لاپەڕەيـەكى تـر لـە مێـژووى ملهوڕو سەرپێچيكاران پێچرايەوە.

بانگ كردنى حەزرەتى صالْح بۆ قەومەكەى دواى لەناو چوونيان وەكوو بـانگ كردنى پێغەمبەرى ئيسلام وايە كە بانگى كوژراوەكانى بەدرى كرد دواى ئەوەى كە خرابوونە بيرەكەوە دەيفـەرموو «يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، يَا عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، يَـا شَـيْبَةَ بْـنَ رَبِيعَةَ، يَا فُلاَنُ يَا فُلاَنُ! أَيَسُرُّكُمْ أَنَّكُمْ أَطَعْتُمُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا مَـا وَعَـدَنَا رَبُّنَـا حَقًّا، فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا».

ئەبو طەلحەى ئەنصارى كە راويى حەديثەكەيە دەلْێ: حـەزرەتى عومـەر وتـى: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! قـسە كـردن لەگـەل لاشـەى بـێ گيـان چ سـوودى هەيـە!؟ پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) فـەرمووى: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْـمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ، وَلَكِنَّ لاَ يُجِيبُون». [1]

---

[1] – بوخارىو هى تريش لەرێگەى قەتادەوە ئەم حەديثەيان لـە ئـەبو طـەلحەى ئەنـصارييەوە گێراوەتەوە.

ئەوانەی لەلای ئارامگای پیاوچاکان دەپاڕێنەوەو پێیان وایە کە لە خاوەن گۆڕەکە دەپاڕێنەوە خاوەن گۆڕ گوێی لێیانەو داخوازییەکانیان جێبەجێ دەکا، ئەوانەی ئەم حەدیثەو حەدیثی لەم جۆرە دەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسێك داوای ئەنجامدانی کارێك لە مردوویەکی صالّحو پیاوچاك بکا مردووەکە داواکەی دەبیستێو کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکا! واتە: قیاسی ئەم حالّەتانە دەکەنە سەر ئەو حالّەتەی کە پێغەمبەر بانگی لە کوژراوەکان کردو فەرمووشی: ئەوان لە ئێوە باشتر گوێیان لەم بانگ کردنە هەیە قیاسەکەیان بێ بنەمایە.

لەراستیدا ئەوانە پێویستە ئەوە بزانن کە ئەو حالّەتەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بانگی لە کوژراوەکان کرد کارێکی غەیبیو پەنامەکییەو موعجیزەی پێغەمبەری بووە، قیاس لەکاری ئاوا غەیبیدا ناکرێو ناگونجێ![1]

## چیرۆکی حەزرەتی لوط (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ)

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم

[1] – بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری تەفسیری مەنار ج/٨/٥٠٨ بکە.

مَّطَرًاۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾.

ئەمە چوارەم چیرۆکە لە داستانی پێغەمبەران، لەوەپێش چیرۆکی حەزرەتی نووح‌و هوودو صالّحی گێڕایەوە ئەمجار هاتە سەر داستانی حەزرەتی لووطو بەسەرهاتی لەگەڵ قەومەکەی!

حەزرەتی لووط کوڕی مارانەو برازای حەزرەتی ئیبراهیمە، هەرزوو ئیمانی بە حەزرەتی ئیبراهیم هێناوەو شوێن پەیامەکەی کەوتووە وەکوو لە شوێنێکی تردا قورئان دەفەرموێ: ﴿فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي – العنكبوت/٢٦﴾.

حەزرەتی لووط هاوسەفەری حەزرەتی ئیبراهیم بووە لە گەشتەکانیدا، لە ناو چۆمان (بين النهرين)دا لەگەڵی بووە، بۆ وڵاتی میصر لەگەڵی چووە، پاشان کە گەڕاوەتەوە بۆ شام لەتەکیا بووە، ئەمجار حەزرەتی لووط لە رۆژهەڵاتی ئەردەن لە شوێنێك کە پێی دەڵێن (سەدوم) نیشتەجێ بووە. دانیشتوانی سەدوم ئیشی ناشیرین‌و دوور لە رەوشتیان ئەنجام دەدا، لەپێش چاوی یەکتری‌و بەئاشکراو بێ لێ پرنگینەوە نێربازییان دەکرد، چەتەو رێگربوون ماڵ‌و کاڵایان لە کاروان‌و بازرگانان دەستاندو رێبواریان رووت دەکردنەوە! وەکوو قورئان لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ، وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ، وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ – العنكبوت/٢٩﴾.

حەزرەتی لووط ئامۆژگاری کردن‌و جڵەوگیریی لێ کردن لەو کردەوە ناشیرین‌و بێ رەوشتییەیان‌و ترساندنی لەعەزابی خوداو تۆڵەی بەزەبرو کوشندەی، بەڵام ئەو گومڕاو سەرلێ شێواوانە هیچ گوێیان بە ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی لووط نەداو وازیان لە نێربازی‌و کارە ناشیرینەکانی تریان نەهێناو سووربوون لەسەر هەڵوێستی نادروستی خۆیان، حەزرەتی لووط زیاتر پێکیشی لێ کردن‌و درێژەی بەبانگەوازی‌و ئامۆژگارییەکانیدا تا کار گەیشتە ئەوەی هەڕەشەی بەردباران کردن‌و دەرکردنیان لێ کرد!!

هـەتا رۆژێـك كۆمـەڵێك فریـشتە بەسـەر حـەزرەتی ئیبراهیمـدا تێپـەڕین‌و هەواڵیان پێدا كە ئەوان لەخوداوە نێردراون بۆ لەناوبردنی قەومی لووط كە بریتی بوون لە دانیشتوانی (سدوم)و (عـامووره) حـەزرەتی ئیـبراهیم ترسـا كـە حـەزرەتی (لووط)یش لەگەڵ قەومەكەی بەر عەزابەكە بكەوێ! فریشتەكان دڵنیایـان كـرد كـە حـەزرەتی لـووط بـەر عەزابەكـە ناكـەوێ‌و خـۆی‌و ئەوانـەی ئیمانیـان پـێ هێنـاوە رزگاریان دەبێ، هەواڵی ئەوەشیان پێدا كە نازڵبوونی عەزاب بۆ سەر قـەومی لـووط بڕیارێكی خوداییەو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە. وەكوو لە شوێنێكی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا، إِنَّهُ قَدْ جَاء أَمْرُ رَبِّكَ، وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْـرُ مَرْدُودٍ – هود/٧٦﴾.

فریشتەكان لەشێوەی پۆلە كوڕێكی تازە پێگەیشتوو موو لێ نـەهاتووی روخـسار جوان‌و شۆخ‌و شەنگ هاتن بوون بە میوانی ماڵی حـەزرەتی لـووط، كـە قەومەكـەی بەمەیان زانی كۆمەڵێكیان لە ئەهلی (سدوم) هاتن بۆ ماڵی حەزرەتی لـووط‌و داوای ئـەو كۆمەڵـە گەنجانـەیان لێ كـرد، بـۆ ئـەوەی كـاری ناشـیرین‌و نێربازییـان لەگەڵدا بكـەن، حـەزرەتی لـووط زۆری هـەوڵی لەگەڵدا دان كـە واز بێـنن‌و دەسـت درێـژی نەكەنە سەر میوانەكانی، تەنانەت پێشنیاری ئەوەی كرد كچەكانی خۆیـان لێ مـارە بكـاو بیانـداتێ واز لـە میوانـەكانی بهێـنن، پێـی وابـوو كـە بـەم پێـشنیارە شـەرم دەیـانگرێ‌و واز دەهێـنن، بـەڵام رازی نـەبوون‌و سـوور بـوون لەسـەر داوێـن پیـسی خۆیان‌و داوای بەدەستەوەدانی میوانەكانیان كرد.

حـەزرەتی لـووط بەفریـشتەكانی گـوت – نەشـی دەزانـی فریـشتەن – ئەگـەر دەسەڵاتم ببوایە پشتیوانێكم هەبوایـە لەسـەر ئێوە شـەرم لەگەڵدا دەكـردن‌و نـەم دەهێشت دەست درێژی بكەنە سەرتان، وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفـەرموێ: ﴿لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ – هود/٨٠﴾.

ئیتر فریشتەكان حەقیقەتی خۆیان بۆ حەزرەتی لووط روون كردەوەو ئەوەیان پێ راگەیاند كە ئەركی لەناوبردنی ئەو قەومـە سـەرلێ شێواوەیان پـێ سـپێردراوەو لەناویان دەبەن!

لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی شارەکە بەر دەرگای ماڵی حەزرەتی (لووط)یان گرتبوو هەوڵی ئەومیان بوو کە بە زۆر میوانەکانی حەزرەتی لووط بگرنو نێربازییان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، لەهەموو لایەکەوە هێرشیان کردە سەر ماڵی حەزرەتی لووط، پەروەردگار بینایی کوێر کردنو چاویان نەیبینینو نەیانزانی بۆکوێ هێرش دەکەن، ئەمجار فریشتەکان حەزرەتی لووطو کچەکانیو ژنەکەیان لەو شارە بردە دەرو پێیان گوتن بەهیچ جۆرێك ئاوڕ مەدەنەوە، بۆ کوێیان فەرمان پی دەکەن بچن بۆ ئەوێ، هەموویان پابەندی فەرمانەکە بوون جگە لە ژنەکەی ئەو ئاوڕی دایەوە تا بزانێ دانیشتوانی شارەکە چییان بەسەر دێ، چونکە دڵی لای ئەوان بوو، بەکافری مابووەوە، عەزابەکە ئەومیشی تێکەوە پێچا، ئەمجار پەروەردگار بەردی سواڵەتی بەسەردا باراندنو خاكو وڵاتی ژێرەوەو زەبەر کردنو دارو بەردی بەسەر یەکدا دان، بوونە پەندی زەمانە! وەکوو دەڵێن: ژمارەی ئەوانەی بەم عەزابە لەناوچوون هەزار یان زیاتر بوون!

دەی بابزانین لەم سورەتەدا قورئانی پیرۆز چۆن ئەم داستانەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ﴾ ئەی پێغەمبەر! داستانی لووط بۆ قەومەکەت بگێڕەوە کاتی بەشێوەیەکی سەرزەنشتو گلەیی بەگەلەکەی خۆت گوت: ﴿أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ؟ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ﴾ ئەرێ ئێوە داناوەشێن کردەوەیەکی وەها ئەنجام دەدەن پێش ئێوە کەس نەی کردووە؟ بەڵکوو بۆ خۆتان داتان هێناوە، تاوانی خۆتانو تاوانی ئەوانەی چاوتان لێ دەکەن لەسەر ئێوەیە! کرداری ناشیرینو قیز لێ کراوی ئێوە پێچەوانەی سروشتی ئادەمیزادە! تا ئێستا هیچ کەس لە ئادەمیزادان پێش ئێوە ئەو کارە ناشیرینەی نەکردووە! ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ ئێوە لە ڕێبازی سروشتی ئادەمیزاد لاتان داوە، ئێوە لە پاشەوڕا دەچنە لای پیاوو کاری سێکسی خۆتان بەو شێوە ناشیرینە ئەنجام دەدەن، وازتان لە چوونە لای ئافرەت هێناوە، لە پێشەوەڕا ناچنە لایان، چوونە لای ئافرەت لە پێشەوڕا کە کارێکی سروشتییەو جێگای هیوای منداڵبوونەو خودا بۆ ئەوەی دروست کردووە ئێوە پاشگوێتان خستووەو ماتەڵتان کردووە، شتێك کە هۆی درێژەپێدانی ژیانەو مانەوەی ڕەچەڵەکی ئادەمیزادە

بریتیە لەچوونە لای ئافرەت لە پێشەوەرا، ئێوە وازتان لێ هێناوە، تۆماوی خۆتان دەخەنە شوێنێنك كە بۆ ئەوە ناشێ! نایخەنە شوێنێكەوە كە جێگای سروشتییەو زەوقی سەلیم حەزی لێ دەكاو بەروبوومی هەیەو هۆی درێژەپێدانی زنجیرەی رەچەڵەكی ئادەمیزادە. هەربۆیەش حەزرەتی لووط وتی: ئەگەر ئێوە حەزتان لە كاری سێكسییە ئەوە كچەكانم، واتە: بۆدابین كردنی كاری جینسیو دامركاندنەوەی حەزو ئارەزووەكانتان هەوڵی پەیدا كردنی مێینە بدەن، ئەوە رێبازی سروشتییە! وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿هَؤُلاء بَنَاتِي إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ – الحجر/٧١﴾.

كە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً﴾ دیاری كردنو روونكردنەوەیە بۆ رستەی پێشوو كە دەفەرموێ: ﴿لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ﴾ كە دەفەرموێ: ﴿مِّن دُونِ النِّسَاء﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە كە ئەوان لە سنووری عەقڵو سروشت دەرچوونو ئەو حیكمەتو سوودو بەرژەوەندییانەی لە چوونە لای ئافرەتدا هەیە وازیان لێ هێناوە تەنانەت ئاژەڵیش كاری وا ناكا، هیچ گیانلەبەرێكی بێ زوبان هەوڵی ئەوە نادا شەهوەتو ئارەزووی خۆی لەرێگەی ناسروشتی خۆیەوە دامركێنێتەوە، بەڵكوو هێزی حەزو داخوازی لە مێینە كێشی دەكاو ئاوێتەی یەكتریی دەبنو شەهوەتو ئارەزووی خۆی لە مێینەیەكی هاورەگەزی خۆیدا دادەمركێنێتەوەو درێژە بە مانەوەی گەرای خۆیان دەدەن، ئەی ئەوە نیە باڵندەو خشۆكو پێرۆ نێرو مێیەكانیان ژیانی هاوسەری خۆیان بە دروستكردنی لانەی گونجاو بۆ گەرانانەوە دەست پێ دەكەن، ئەوەتا گیانلەبەری وا هەیە لەسەر تۆپەڵانی دار هێلانە دەكا، هی وا هەیە لە كونە شاخێكدا لانەو كولانەی خۆی پێكەوە دەنێ، یان لە ژێر زەویدا كونو كەلەبەرێك دروست دەكا، یان لە ئەشكەوتو لاكەندرِدا جێگاو شوێنی خۆی خۆش دەكا!!!!

بەڵام تاوانبارەكانی قەومی لووط هیچ مەبەستی تریان نەبوو جگە لە دامركاندنەوەی شەهوەتی ئاژەڵ ئاسایی خۆیانو لەززەت بینینێكی بێ ئامانجو بێ سوود! بەتەوای زێدەرەوییان لە سەرپێچی كردندا كردو جار لە دوای جار رۆژ لە دوای رۆژ كاری نێربازییان دووبارەو سێ بارە كردەوەو لێیان بووبووە كارێكی سروشتیو عادەتی! بۆیە حەزرەتی لووط لە كۆتایی ئایەتەكەدا پێیان دەفەرموێ:

﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ بەڵكوو ئێوە بە دووبارەو سێ یارە كردنەوەی ئەم كارە ناشیرینە قێز لێ كراوە كاری ناشیرینی ترتان زێدەڕەوییتان كردووەو لێی پەشیمان نابنەوەو بووتە خوو لێتان.

لە سورەتی (الشعراء/١٦٦)دا دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾. لە سوورەتی (النمل/٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ تێكڕای ئایەتەكان ئەوە دەگەیەنن كە ئەوان لە زێدەڕەویی شەهوەتبازییاندا هەموو سنوورێكی عەقڵو سروشتیان بەزاندووەو زەرەرو زیانی ئاكامی كارە ناشیرینەكەی خۆیان نازانن‌و بیر لەوە ناكەنەوە كە ئەو كردەوە ناشیرینانەیان چەند زیانی بۆ تەندروستی خۆیان هەیەو چەند نەخۆشی كوشندە دەخاتەوە! چ دەستدرێژییەكە بۆسەر گەراو رەچەڵەك‌و ئەخلاق‌و رەوشت.

ئاشكراشە كە هەستكردن‌و زانینی زیانی كارێك نابێتە لەمپەرو مانیع بۆ كردنی ئەو كارە زیان ئامێزە ئەگەر ئەخلاق‌و رەوشتی جوان‌و خوداپەسەند لەناخی كابرادا جڵەوكێش نەبن، بەڵكوو ئەخلاقی فیطری‌و مشت‌و ماڵ كراو بە پەروەردەی ئایینی دەبێتە لەمپەڕو مانیع بۆ ئەنجامدانی كاری ناپەسەند.

چونكە ئەوەتا كاری ناشیرین‌و قێز لێ كراوی نێربازیی لە پێشكەوتووترین وڵاتدا بڵاوە، لە نێوان گەل‌و كۆمەڵگایەكدا تەشەنەی كردووەو دەكا، كە خۆیان بە پێشەنگی جیهان دەزانن لەزانست‌و زانیاریدا، كەسانێك ئێستا ئەو كارە ناشیرینە بیزراوە ئەنجام دەدەن كە باش باش زیانەكانی دەزانن‌و هەست بەزیانی تەندروستی‌و كۆمەڵایەتی‌و ئاكامی چارەڕەشی خۆیان دەكەن!

تەنانەت دیاردەی نێربازیی لەناو چینی بەناو پێشكەوتوو رۆشنبیرو شارستانییەتی سەردەمداو لەو وڵاتانەی كە خۆیان بە پێشكەوتووی جیهان دەزانن تەنانەت لەناو پێری لێكۆڵەرەوەو توێژەرەوەی فەلسەفەو كۆمەڵناسیدا ئەنجام دەدرێ، ئەی ئەوە نیە لە هەندێ وڵاتدا سەرلێ شێواوو دەروون نزم لە جیاتی ئافرەت كوڕ مارە دەكەن!!!

سەیر ئەوەیە ئیعلامی جوولەكەو ماسۆنیەتی جیهانیی بانگەشەی ئەوە دەكەن كە گوایە هۆی سەرەكی بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردە ناشیرینە خۆداپۆشینی

ئافرەتە! بەلام واقیعی حاڵ ئەوە رەت دەکاتەوە ئەوەتا لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو خۆرئاوادا بەگشتی لەگەڵ ئەوەدا کە لەمپەرێك نیە لەبەردەم تێکەلاوی رەگەزی ئافرەتو پیاوو مەوزوعی جینس بووەتە شتێکی بێ یاساو بێ سنوورو مەرو بەرانی! رووتو قووتی ئافرەتیش زۆر لە سنووری عادەتی تێپەڕیوەو دەتوانین بڵێین: لەبارەی جنسییەوە ئادەمیزادی ئەو ولاتانە زۆربەیان هەڵسو کەوتیان ئاژەڵ ئاسایەو هیچ لێ پرینگینەوەیەك لای ئەوان لەگۆڕێ نیە؛ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دیاردەی نێربازیی رێژی لە زیادبووندایەو دیاردەیەکی بەرچاوو بەربلاوە؛ تەنانەت ئافرەتانیش لەناو خۆیاندا (پانپانۆکە) ئەنجام دەدەن؛ ئافرەت سواری ئافرەت دەبێو حەزی سێکسی خۆیان بەم رێگە ناسروشتیو نەشازە دابین دەکەن!

کەسێکیش ئەمەی بەلاوە سەیرەو قەناعەت ناکا با باسی (السلوك الجنسي عند الرجال)و (السلوك الجنسي عند النساء) بخوێنێتەوە کە (کنزی الأمریکی) بە راپۆرتێکی دوورو درێژ نووسیویەتی.[1]

سەیربوو ئەم هەموو ئامۆژگارییو نەصیحەتکردنەی حەزرەتی لووط کاری لە قەومە سەرلێ شێواوەکەی نەکرد! ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلاَّ أَن قَالُواْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ قەومی لووط لەوەلامی ئەم ئامۆژگاریانەدا هیچیان بەدەستەوە نەما جگە لەوەی کە گوتیان: لووطو شوێنکەوتوانی لە شارەکەتان دەربکەن، مەهێڵن هاونشینیتان بکەن، چونکە وادیارە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاكو خاوێن رادەگرنو خۆیان دەپارێزن لە نێربازیی! هەڵبەتە بەگاڵتە پێیان دەگوتنو بەشێوەیەکی قەشمەرییو لاقرتی پێیان دەگوتن ئەوانە کەسانێکن خۆیان بەخاوێنی رادەگرنو هاوبەشی ئێمە ناکەن لە ئەنجامدانی کاری نێربازیدا!

چونکە ئەوان سەرباری ئەوەی کە ئەو تاوانە گەورانەیان ئەنجام دەدا، سووربوون لەسەر بەردەوام بوون لەسەری؛ کارەکەی خۆیان بە کارێکی باش دەزانیو هەستیان بە زەرەرو زیانی تەندروستیو کۆمەلایەتی پەیدابوو لە نێربازیی نەدەکردو بەئاشکرا بە بەرچاوەوە ئەنجامیان دەداو شانازییان پێوە

[1] – في ظلال القران ج۳/۵۵۵ بەشێوەی لێ وەرگرتن.

دەکردو کەسێك خۆی لەو کارە دوورەپەرێز بگرتایە گاڵتەیان پێ دەکردو بەنەفامو پاشکەوتوویان حلێب دەکرد، ئەمەش ئەوپەڕی گومڕابوونو نوغرۆبوونە لە زەلکاوی تاواندا!

سەرەنجامی کار ئەوەبوو ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ﴾ ئێمە لووطو خاووخێزانی کە ئیمانیان پێ هێنابوو رزگارمان کردنو قوتاربوون جگە لە ژنەکەی، ئەو ئیمانی نەهێناو کەوتە پێڕی لەناوچووانو عەزابەکە ئەویشی گرتەوە، عەزابی قیامەتیشی زۆر سەختو ترسناك! چونکە ئەم ژنە بەدبەختو چارەڕەشە سەربارەی ئەوەی ئیمانی نەهێناو لەسەر ئایینی قەومەکەی مایەوە، خەڵکیشی هان دەدا بۆ ئەزیەتدانی حەزرەتی لووطو جاسووسی بەسەرەوە دەکردو هەر میوانێکی بهاتایە خێرا خوانەناسەکانی ئاگادار دەکردەوە، بەشێوەیەکی نهێنیو ناونیشانێك لەنێوان خۆیو ئەواندا دیاریی کرابوو ئاگاداری دەکردنو هەموو هەڵسو کەوتێکی حەزرەتی لووطی پێ رادەگەیاندن!

حەزرەتی لووط جگە لە خاوو خێزانی خۆی کەسی تر ئیمانی پێ نەهێنا، لە خێزانەکەشیدا ژنەکەی ئیمانی پێ نەهێنا، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئایەتەکانی سورەتی (والذاريات)ن کە دەفەرموێ: ﴿فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ الْمُسْلِمِينَ – الذاريات/ ٣٥ – ٣٦﴾.

واتە: کەس لە قەومەکەی ئیمانی پێ نەهێنا جگە لە منداڵو ئەهلی ماڵی خۆی.

جا کە لووطو منداڵەکانی لە شارەکە دەرچوونو لەو ناوچەیە دوور کەوتنەوە ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا﴾ بارانێکی سەیرو سەمەرەمان بەسەردا باراندن، بارانێکی ئاسایی نا، بەڵکوو بەردبارانمان کردن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ، مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ – هود/ ٨٢ – ٨٣﴾. یان دەفەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ – الحجر/٧٤﴾. ئەو بەردانەی بەسەر قەومی لووطدا باراندران بریتی بوون لەبەردە سواڵەت، هەموو بەردێکیش نیشانە کرا بوو، سپی مەیلەو سوور بوون!

دەشكونجێ ئەو بەردبارانە زريانو رەشەبا هەڵى گرتبنو بەسەريدا دابن، يان پارچە نەيزەك بووبن!

لە ئاكامى تێك رووخانى ئەستێرەيەكو وردوخاش بوونى پارچەكانى بەهۆى هێزى كێشيندەوە زەوى بۆ لاى خۆى كێشيان دەكا!

﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئەى محمد! هەروا هەموو كەسێك كە بەم چيرۆكانە پەند ئامێز دەبێ سەير بكە سەرەنجامى لەخودا نەترساوان چۆنە؟! تێفكرە ئەوانەى سووربوون لەسەر لەخودا ياخى بوونو بەدرۆخستنەوەى پێغەمبەران چييان بەسەر هاتو چۆن لەناوچوون!!

بەڵێ بەو جۆرە لاپەرەيەكى تر لە مێژووى گەلو هۆزى ترى لەخودا ياخى پێچرايەوەو سەرزەوى لەو گەلە ستەمكارە پاك كرايەوەو ستەمكاران لەناو بranو چوونە سەرانگوێلكى مێژووى چارەرەشانەوە!

**بێگومان پاساغكردنى نێربازيى لەبەر چەند هۆيەكە لەوانە:**

١- زيان گەيشتن بە ئيش لەگەڵ كراوەكە، چونكە زانستى پزيشكى دەرى خستووە كە ئەو كەسەى لە پاشەوڕا دەچنە لاى تووشى نەخۆشى كوشندەى ئايدز دەبێ! چونكە پەروەردگار هێزێكى تايبەتى لە رەحمى ئافرەتدا دروست كردووە بۆ هەڵمژينى تۆماوى پياو! ئەو هێزى هەڵمژينە لە (كۆم)دا نيە، كە تۆماوەكەى تێ دەكرێ خوێن ژەهراوى دەكاو دەبێتە هۆى پەيدابوونى نەخۆشى!

٢- رەوشتى (فاعيل)ە كە تێك دەداو زێدەرەوى دەكا لە ئەنجامدانى ئەو كارە قيزڵێ كراوەو خۆى پێ زەبت ناكرێ.

٣- ريسوابوونى فاعيلو مەفعوولو رسكانى دوژمنايەتى نێوانيان.

٤- رەوشتى ئافرەت تێك دەدا، چونكە پياو ناچنە لايانو ئارەزووى جنسييان دابين ناكرێ!

٥- كەم بوونەوەى گەراو رەچەڵەك، چونكە چوونە لاى ئافرەت پاشگوێ دەخرێو كەم دەبێتەوە.[1]

---

[1] - تەفسيرى مەنار ج٣/٥٢١ + تەفسيرى مونير ج٨/٢٨٥.

**دەربارەی سزادانی نێربازیی زانایانی شەرع چەند رایەکیان هەیە:**

١- ئیمام ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: نێربازی تەعزیری لەسەرە، چونکە لە نێربازیدا رەچەڵەك تێکەڵاو نابن‌و زۆڵی لێ ناکەوێتەوە.

٢- جەماوەری فوقەها – مالیکییەکان‌و شافیعییەکان‌و حەنبەلییەکان – پێیان وایە دەبێ حەدیان لێ بدرێ چونکە پەروەردگار لە قورئاندا سزاکەی گران کردووە دەبی وەکوو زینا حەدیان لێ دەربکرێ چونکە ئەویش وەکوو زینا وایە.

سزای نێرباز بەلای مالیکی‌و رای پەسەندی حەنبەلییەکان بەردباران کردنیانە کوڕبن، واتە: ژنیان نەهێنابێ یان پیاو بن، واتە: ژنیان هێنابێ،

چونکە ئەبو داوودو نەسائی‌و تیرمیذی‌و هی تریش فەرموودەیەکی پێغەمبەریان ریوایەت کردووە فەرموویەتی: «مَنْ وَجَدتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ». لە ریوایەتێکی تردا «فَارْجُمُوا الْأَعْلَى وَالأَسْفَلَ» حەدی نێربازیی بەلای شافیعییەوە وەکوو حەدی زینا وایە ئەگەر ژنی هێنابوو بەردەباران دەکرێ، ئەگەر نەی هێنابوو جەڵدەی لێ دەدرێ‌و لەوڵاتیش دوور دەخرێتەوە.

## چیرۆکی حەزرەتی شوعەیب (درووودی خوای لەسەر بێ)

﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم

مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْۖ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَاۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾﴾.

ئەمە داستانی پێنجەمە لە چیرۆکی بەسەرهاتی پێغەمبەران پاش باسکردنی چیرۆکی نووح و هوودو هۆزی ثەموودو قەومی لووط دێتە سەر باسکردنی چیرۆکی حەزرەتی شەعەیب لەگەڵ قەومەکەی کە دانیشتوانی مەدیەن بوون.

حەزرەتی شوعەیب کوڕی (میلیل) کوڕی (یەشجر)ە یەکێکە لە پێغەمبەرانی عەرەب، بەچەند ساڵێك لەپێش حەزرەتی مووسا (علیه السلام) نێردراوە، چونکە پەروەردگار دوابەدوای باسکردنی چیرۆکی ئەو پێنج پێغەمبەرانە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم مُّوسَى بِآيَاتِنَا إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ – الأعراف/١٠٣﴾.

مەدیەن یان مەدیان: وەچەو نەوەی مەدیەنی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمن، ئەم هۆزو گرۆهە لەشاری مەدیەنی نزیك مەعان لە رۆژهەڵاتی ئەردەندا نیشتەجێ بوون، عیبادەتی غەیری خودایان دەکرد، تەرازووبازییان دەکرد، ربەو فسناغیان

بچووك دەكردەوە، كێلۆو حوققەیان سووك دەكردن، حەزرەتی شوعەیب جڵەوگیری لێ كردن‌و لەتۆڵە ستاندنی خودا ترساندنی.

وەكوو ریوایەت كراوە حەزرەتی شوعەیب زمان پاراوو بەڵگە بەدەست‌و قسەزان بووە، تەنانەت پێی دەگوترێ خوتبەخوێنی پێغەمبەران (خطيب الأنبياء) قەومەكەی حەزرەتی شوعەیب لەسەر رێگا دادەنیشتن، بانگەشەیان دژی پەیامی حەزرەتی شوعەیب دەكرد.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەسەر رێگادا دادەنیشتن هەركەسێك بهاتایە بۆ لایان پێش هەموو شتێك پێیان دەگوت: شوعەیب درۆزنەو وریابن پەیوەندیتان پێوە نەكا لە ئایینی خۆتان هەڵتان نەگێرێتەوە، دەیانگوت: ﴿لَئِنِ اتَّبَعْتُمْ شُعَيْباً إِنَّكُمْ إِذاً لَّخَاسِرُونَ – الأعراف/٩٠﴾.

زۆریان هەوڵدا بانگەوازییەكەی حەزرەتی شوعەیب كپ بكەنەوە، دەیانویست زیانی پێ بگەیەنن، لەپێش چاوی خەڵك بێ رێزی بكەن، بەڵكوو بەئاشكرا هەرەشەیان لێ كردو چاویان لێ سوور كردەوە، وەكوو قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ: يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا، وَلَوْلاَ رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ، وَمَا أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ – هود/٩١﴾. بەڵكوو بەوەندەشەوە نەوەستان، رەخنەی نوێژكردنیا لێ گرت، ئەو نوێژەی كەداوایان لێ دەكا جگە لەخودا كەسی تر نەپەرستن، لەپێوان‌و كێشاندا عەدالەتكار بن؛ وەكوو دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ يَا شُعَيْبُ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا، أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاء، إِنَّكَ لَأَنتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ – هود/٨٧﴾.

كە حەزرەتی شوعەیب بە ئامۆژگاریی‌و قسە لەگەڵ كردن هەموو رێگەیەكی لێ برینەوەو سوورتر بوو لەسەر بانگەوازی كردنیان بۆ ئیمان هێنان بەخوداو جوانكردنی مامەڵەو هەڵس‌وكەوتیان، پیاوماقوڵ‌و خاوەن دەسەلات‌و قسە رۆیشتووەكانی گەلەكەی تەواو قەڵس بوون چیدی خۆیان پێ رانەگیراو كەوتنە هەرەشە لێ كردنی بەوە كەخۆی‌و ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە لەشار دەریان بكەن‌و دووریان بخەنەوە، حەزرەتی شوعەیب سەرزەنشتی كردن لەسەر ئەم هەڵوێستەیان پێی گوتن: ﴿أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ – الأعراف/٨٨﴾.

جا کە قەومەکەی هەر سووربوون لەسەر کوفری خۆیانو پەرمیان بە بەربەرەکانی حەزرەتی شوعەیب داو بەگوفتارو کردار ئەزیەتیان دا خودای مەزن بە بوومەلەرزە لەناوی بردنو هەموویان دوابڕاو بوون ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ – العنكبوت/٣٧﴾.

پاشان کە پەروەردگار حەزرەتی شوعەیبو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنابوو لەو عەزابە رزگاری کردن؛ ئەمجار ناردی بۆسەر تاقمو گرۆهێك کە بە (أصحاب الأيكة) مەشهوورن، ئەمانیش وەکوو ئەهلی مەدیەن خودا نەناسو کافر بوون، حەزرەتی شوعەیب جڵەوگیری لێ کردنو داوای لێ کردن ئیمانی پێ بهێنن، چەند ئامۆژگاری کردن بێ سوودبوو؛ نەك هەر بڕوایان پێ نەکرد، بەڵکوو تۆمەتی درۆزنیو سیحربازیشیان دایە پاڵی بڕوایان بە پەیامەکەی نەکردو وتیان: تۆیش ئادەمیزادێکی وەکوو ئێمە، کەی پیاوی وەك تۆی ئادەمیزاد دەبێتە پێغەمبەر!!

وەکوو قورئان لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ، وَمَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ – الشعراء/ ١٨٥ – ١٨٦﴾.

ئەمجار داوایان لە حەزرەتی شوعەیب کرد، وتیان: ئەگەر راست دەکەی پێغەمبەری؟ دە پارچەیەکمان لەئاسمان بەسەردا بدە! وێڕای ئەم تەحەدایەشیان زیاتر سووربوون لەسەر پشت هەڵکردن لەحەقو راستی، ئیتر پەروەردگار بەسزایەك گرتنی کە لە قورئاندا بە (عذاب يوم الظلة) ناوی براوە! ئەوەبوو حەوت رۆژ پەروەردگار بەتیشکی خۆر وڵاتی لێ گەرم داهێنان، هەموو کانیاو چۆمو سەرچاوەی ئاویان وشك بوون! ئەمجار هەورێکی نارده سەر هەموویان لەژێر سێبەری هەورەکە کۆبوونەوە، خۆشی خۆشیان بوو کە ئەو هەورە گەرمای تیشکی خۆری لێ کەم بکەنەوە، هەر ئەوەندەیان زانی ئەو هەورە ئاگری بەسەردا باراندن هەموویانی سوتاندن، وەکوو قورئان باسی دەکا؛ سزادانەکەیان سزادانێکی سامناكو کەم وێنە بووە، دەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ – الشعراء/١٨٩﴾.

ئەمجار با بزانین لێرەدا قورئانی پیرۆز چۆن داستانی ئەم پێغەمبەرە رێزدارەی تۆمار کردووە؟!

دەفـەرموێ: ﴿وَإِلَـى مَـدْيَنَ أَخَـاهُمْ شُـعَيْبًا﴾ ناردمـان بۆسـەر دانیـشتوانی شـاری مەدیەن شوعەیب کە برایان بـوو لـە رشتەی خزمایەتیـدا، فـەرمانی پـێ کـردن بـە ئەنجامـدانی پێـنج ئـەرك کـە لەڕاسـتیدا دەچـنەوە سـەر دوو بنەماڵـەی سـەرەکی: یەکەمیان خودا بەگەورە زانینە کەخوداپەرستیو دانـان بـە یەکتاپەرستیو بـڕوا بە پێغەمبەرایەتی دەگرێتەوە. دووەم دڵنەرمیو بەزەیی هاتنەوە بە دروستکراوانی خـودادا ئەمـەش وازهێنـان لـەفێڵبازییو ناشـووبگێڕی دەگرێتـەوە. ئـەو ئەرکانـەش ئەمانەن کە قورئان دەستنیشانیان دەکات:

١- ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْـرُهُ﴾ وتـی: ئـەی گـەلو هۆزەکـەم! خوداپەرستی بکـەنو جگـە لـەزاتی پـاکی ئـەو کەسـی تـر بـەخودا مـەزانن... ئەمـە بنەمایـەکی سـەرەکییە لەبانگـەوازی هـەموو پێغەمبەرێکـدا، شـەریعەتی هـەموو پێغەمبەران تێکڕا ئەم حەقیقەتەیان چەسپاندووەو بانگەوازییان بۆ کردووە.

٢- ﴿قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ مـن پێغەمبـەرمو بۆسـەر ئێـوە رەوانـە کـراوم، پەروەردگار موعجیزەو بەڵگەی بەهێزی بۆ ناردوون لەسەر راستی پێغەمبەرایـەتی من!

دەقە قورئانییەکە جۆری موعجیزەو بەڵگەکە دیاری ناکا، وەکوو هی حـەزرەتی صالحی دیاری کرد، لەشوێنەکانی تری قورئان کەباسی چیرۆکی حەزرەتی شـوعەیب دەگێڕێتـەوە، دووبارە جۆری موعجیزەی دراو بە شوعەیب دیاری ناکا.

قورئان هەر ئەوەندە دەستنیشان دەکا کـە حـەزرەتی شـوعەیب مـوعجیزەی بـۆ قەومەکەی هێناوە، راستی پێغەمبەرایەتی خۆی چەسپاندووەو پێی سەلماندوون کە فروستادەی خودایە بۆسەر ئەوان، کەوابێ فەرمانی چیتان پێ دەکا لە رێـكو پێکـی ئامێری پێوانەو کێشانەتان وەکوو ربەو قسناغو حوقەو کیلۆو گـەزو مـەتر، گوێ بیستی بن، واز لە ناشووبگێڕانو فیتنەیی بهێنن، واز لە چەتەییو رێگریی بهێنن.

بوخاریو موسلیم فەرموودەیەك لـە ئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەت دەکـەن، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویـەتی: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِـنْ نَبِـيٍّ إِلاَّ قَـدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِى أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَـى اللَّـهُ إِلَـيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

زومەخشەری دەفەرموێ: برێك لە موعجیزەكانی شوعەیب ئەو گۆچانە بوو كە دای بە مووسا، ئەو گۆچانە شەڕی لەگەل مار دەكرد، هەروەها بە مووسای راگەیاند كە ئەم مەڕو بزنانە بێچوویان دەبن رەش‌و سپییان تێدا دەبن، كە بێچووەكانیان بوون رەش‌و سپی بوون! ئەم جۆرە حاڵەتانە موعجیزە بوون بۆ شوعەیب.[1]

ئیمامی رازیی دەفەرموێ: ئەمە بەگوێرەی رای موعتەزیلەكان كە پێیان وایە موعجیزە پێش پێغەمبەرایەتی پەیدا نابێ، بەلاّم لای ئەهلی سوننەو جەماعەت دەگونجێ پێش پێغەمبەرایەتی ئەو كەسەی دەكرێتە پێغەمبەر موعجیزەی لەسەردەست روو بدا بەمە دەگوترێ (ارهاص)ی پێغەمبەرایەتی لەسەر ئەم شێوە ئەو موعجیزانە كە زومەخشەری بە موعجیزەی حەزرەتی شوعەیبی داناون دەبن بە (ارهاصات) بۆ حەزرەتی مووسا (علیه الصلاة والسلام).

٣- سێیەم ئەرك كە فەرمانی پێكردن نەهێشتنی كەم‌و كوڕی بوو لە ئامێری پێوانەو كێشانەیاندا وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ﴾ ئامێری پێوانەو كێشانەتان رێك‌وپێك بكەن، تەرازووبازیی‌و حوقەبازیی مەكەن، لە مامەڵەو بازرگانیدا فرت‌و فێڵ‌و تەڵەكەبازیی مەكەن.

ئەهلی مەدیەن زۆر حەزیان لەفرت‌و فێڵ بوو لەمامەڵەو بازرگانیدا ربەو قسناغ‌و مودیان بچووك دەكرد، گەزو مەتریان كورت دەكردەوە، حوقەو كیلۆو باتمانیان سووك دەكردن. ئەگەر شتێكیان بفرۆشتایە بە ئامێرە بچووك‌و كورت‌و سووكەكان پێیان دەفرۆشتن؛ ئەگەر شتیان بكڕیایە بە ئامێری گەورەو درێژو قورس بۆخۆیان دەپێوا، بۆیە حەزرەتی شوعەیب زۆری هەوڵدا ئەم دیاردە ناشیرینەیان لەناودا هەڵبگرێ.

٤- مەنع كردنیان لە خیانەت كردن لەخەڵك‌و ماڵ خواردنی خەڵك بەناحەق. ئەوەتا پەروەردگار لەسەر زوبانی حەزرەتی شوعەیب دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ﴾ لەماڵ گۆڕینەوەو مامەڵەو بازرگانیدا لەكالاّی خەڵك دامەشكێنن‌و بەناحەق عەیب‌و عاری لێ پەیدا مەكەن، عەیب‌و لەكەی لێ پەیدا مەكەن هەروا ماڵی خەڵك بەهەوانتە مەخۆن، واز لە ماڵ زەوت كردن‌و دزیی‌و بەرتیل وەرگرتن

[1]- تەفسیر الكشاف ج٢/٥٥٩.

بهێنن، واز لە ڕێگریی‌و چەتەیی‌و فرت‌و فێڵ بهێنن، مافی خەڵك – ماددی‌و مەعنەی – پێشێل مەکەن.

٥- مەنع کردنیان لەئاشووبگێڕی‌و فیتنەجۆیی وەکوو پێی فەرموون: ﴿وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا﴾ لەزەویدا فەساد بڵاومەکەنەوە، پاش ئەوەی پیاوچاك‌و پێغەمبەران‌و شوێنکەوتووانیان هەوڵیانداوەو خەڵکیان هێناوەتە سەر ڕێگای خوداپەسەندو ئەخلاق‌و ڕەوشتی نادەمیزادانیان ڕێك‌وپێك کردووە، یاسای کۆمەڵیان بەگوێرەی پەیامی خودا ڕێکخستووە، لەبارەی کشتوکاڵ‌و پیشەسازیی‌و بازرگانیدا پێشکەوتنیان بەدەست هێناوە، ئێوە ریسەکەیان مەکەنەوە بە خوری‌و وڵات‌و یاساو نیظام تێك مەدەن‌و ئاشووب بەرپا مەکەن!

﴿ذَلِكُمْ﴾ ئەنجامدانی ئەم پێنج ئەرکانە – خوداپەرستی‌و یەکتاپەرستی، بڕوا کردن بە پێغەمبەرایەتی من، ڕێك‌وپێك کردنی ئامێری پێوانەو کێشان، واز هێنان لە بەسووك زانینی کاڵای خەڵك، وازهێنان لەئاشووب‌و فیتنەگێڕیی لەسەر زەوی بەهەموو جۆرەکانیەوە ﴿خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ بۆئێوە باشتر‌و بەسوودترە. ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەتاك‌و تەنیایی خوداو بەڕاستی پێغەمبەرانی‌و بەشەرع‌و یاسای تۆکمەو بێ خەوش‌و بەزیندوبوونەوەی ڕۆژی قیامەت‌و پاداش‌و تۆڵەی عادڵانە هەیە!

واتە: ئەنجامدانی ئەو کارانە لەبارەی مرۆڤایەتییەوە، لەبارەی سومعەو بەدەست هێنانی سوودی ماددییەوە بۆ ئێوە باشترە لەو فرت‌و فێڵ‌و تەڵەکەبازییەتان. چونکە خەڵك کە بزانن ئێوە مامەڵە دروست‌و ئەمین‌و عەداڵەتکارن لە هەڵس‌وکەوتتاندا زیاتر تێکەڵاوتان دەبن‌و زیاتر مامەڵەتان لەگەڵ دەکەن، لە قیامەتیشدا پاداشی باش‌و ڕەزامەندیی خودا بەدەست دەهێنن.

دەتوانین بڵێین: ﴿ذَلِكُمْ﴾ ئاماژە بێ بۆ پابەندبوون بەفەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار، چونکە ئاشکرایە پەروەردگار، جگە لەچاکە، فەرمان ناکا بە هیچی تر، جڵەوگیریش هەر لەخراپە دەکا.

ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە، کەزانست بەتەنیا کیفایەت ناکا بۆ ئیصلاحی کۆمەڵ، بەڵکوو پێویستە بۆ ئیصلاحی گەل‌و هۆز، پەروەردەی ئایینی هەبێ،

پەروەردەیەك بتوانێ چین و توێژەکانی کۆمەڵ فێری ئەخلاقی جوان و پەسەند بکا وەکوو راستگۆیی و ئەمانەت و عەدالەتکاریی، لەرەوشتی ناشیرین و لادان لەرێگای خراپە بیانگێڕێتەوە،، چونکە کاریگەریی ئایین لەسەر دڵ و دەروون لەهەموو شتێکی تر بەهێزترە!

ئەمجار حەزرەتی شوعەیب جڵەوگیریی لە گەلەکەی کرد کە واز لە رێگریی و چەتەیی بهێنن، جا چ رێگریی حیسسی بێ، یان رێگریی مەعنەوەی. پێی فەرموون: ﴿وَلاَ تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ﴾ لەسەر رێگا دامەنیشن، هەڕەشە لەرێبواران بکەن گومرگ و باج لە کاسبکاران بستێنن، هەڕەشەی کوشتن لەوانە بکەن کەماڵ و کاڵای خۆیانتان نادەنێ؛ یان هەڕەشە لەوانە بکەن کە دێن بۆلای شوعەیب بۆ ئیمان هێنان! مەبنە لەمپەڕ و بەربەست لەبەردەم هاتووچۆی رێبواران و ئەوانەی دێن بۆ ئیمان هێنان کە ئیمانیان هێناوە یان دەیانەوێ ئیمان بێنن بەخوداو بە پێغەمبەرەکەی ئێوە ژیوانیان بکەنەوەو لەرێبازی حەق و راستی لایان بدەن!

﴿وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ پێتان خۆشەو رێبازی خودا خواروخێچ بکەن! چاوو راوو پڕوپاگەندە بکەن بۆ هەڵگێڕانەوەی راستیەکان.

**بەکورتی حەزرەتی شوعەیب لەسێ شت جڵەوگیری لێ کردن:**

أ- رێگریی و چەتەیی کردن بۆ رووتکردنەوەی رێبواران، باج و گومرگ لێ ستاندن بەشێوەی ناڕەوا.

ب- رێگەگرتن لە ئایینی خوداو ژیوانکردنەوەی خەڵك لە ئیمان هێنان.

ج- هەوڵدان بۆ ئەوەی رێگای راستی یەزدان بە درۆو دەلەسەو چەواشەکاریی هەڵگێڕانەوەی راستییەکان، رێگای خودا خواروخێچ بخەنە روو.

تێبینی دەکرێ کە حەزرەتی شوعەیب لە بانگەوازییەکەیدا یەکەمجار گرنگی بە ئیصلاحی ناوخۆ داوە، ئەویش بۆ رێك و پێك کردنی ئامێری پێوانەو کێشانەو وازهێنان لە ئاشووبگێڕیی و فیتنەجۆیی ناوخۆ! پاشان هەوڵی داوە بە ئیصلاحی دەرەکی ئەویش بەلابردنی لەمپەڕ و کۆسپ لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایین و ئیمان هێنانی ئەوانەی دێن بۆ موسوڵمان بوون.

ئەمجار دوای ریشەکێش کردنی فەسادو پاککردنەوەی وڵات لەکاری نابەجێ، دێتە سەر لایەنە نیجابییەکان کە پەروەردگار بۆی فەراهەم هێناون، فەرمووی: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلاً فَكَثَّرَكُمْ﴾ نیعمەتو فەضلی خودا بێننەوە یادی خۆتان کە پێی بەخشیوون، بۆ ئەوەی لەروانگەی ئەو نیعمەتانەوە روو بکەنە خوداپەرستی لەتاوانکردن دور بکەونەوە، بەشێك لەو نیعمەتانەی دراوە پێتان ئێوە ژمارەتان کەمو بێ هێزو توانا بوون، خودا ژمارەی زۆر کردنو وەچەو نەوەتان زۆر لێ کەوتەوە، بوون بەخاوەنی دەسەڵاتو توانای زۆرو زەبەندە! دەشگونجێ بڵێین: مانای بەم جۆرەیە: ئێوە هەژارو نەداراو بێ هێزو توانا بوون؛ خودا بەهێزی کردنو ماڵو سامانی زۆری پێدان. لەخودا بترسن، سەرپێچی مەکەن! ﴿وَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ سەیری ئاکامو سەرەنجامی ئاشووبگێرو موفسیدەکانی رابوردوو بکەنو پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرن، بیر لە ئاکامو سەرەنجامی قەومی نووحو عادو ثەموودو قەومی لووط بکەنەوە، بروانن خودا چۆن بەفەتارەی بردن، چۆن بەهۆی فەسادو ئاشووبگێری لەسەر زەویو جورئەتکردن بۆ لەخودا یاخی بوونو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانی دوابراوی کردنو بنبڕی کردن.

﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُواْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ﴾ هەرچەندە کۆمەڵێك لە ئێوە بڕواتان کردووە بەو پەیامەی کە من پێی نێردراوم، موسوڵمان بوون ﴿وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يْؤْمِنُواْ﴾ کۆمەڵێکیشتان ئیمانتان نەهێناوە، ﴿فَاصْبِرُواْ﴾ چاوەڕوان بن، بزانن خودا چۆن نێوانی ئەم دوو تاقمە دەکاو ئاکامو سەرەنجام چۆن دەبێ، چاوەڕوان بن ﴿حَتَّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا﴾ هەتا خودا حوکمی نێوان ئێمەی خوداپەرستو ئێوەی خودانەناس دەکا، بزانن پەروەردگار چۆن حەق بەسەر بەتاڵدا سەردەخا، چۆن موسوڵمانو خوداپەرست بەسەر کوفرو بێدینیدا زاڵ دەکا.

ئەمە هەڕەشەیە بۆ کافرانو ترساندنیان لەوەی کە خودا تۆڵەتان لێ دەستێنێو ناهێڵێ ئاوا بەسەریانەوە بچێ؛ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَتَرَبَّصُواْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ – التوبة/٥٢﴾.

یـان دڵدانــەوەو ئامۆژگارییــە بــۆ موســوڵمانانو هەڵنانیانــە بــۆ خــۆڕاگرییو بەرجەستەیی لە بەرامبەر ئازاردانی موشریكو خودانەناسان، تـا خـودا تۆڵـەیان لێ دەستێنێو سزای بە ئێشیان پێ دەنۆشێ!!

دەشگونجێ: هەردوو ماناکە مەبەسـت بـن: هەڕەشـە بـێ لـەکافرانو دڵدانــەوەی موســوڵمان بــێ. ﴿وَهُــوَ خَيْــرُ الْحَــاكِمِينَ﴾ خــودا باشــترین دادوەرە، دڵنیــا بــن سەرفرازییو سەرکەوتن بۆ خوداپەرستانە، فەوتانو تێشکان بۆ کافرو موشـریکانە، چونکە حوکمی خودا هەمووی حەقو عەدالەتەو زوڵمو ستەمی تێدا نیە!

مەبەست لەم چیرۆكو فەرمانو جڵەوگیریيانەی تیاندا هاتوون؛ بەتـەماکردنی خەڵکە بۆ بەهەشتو ترساندنیانە لەئاگری دۆزەخ بۆ هەڵنانو دەنەدەنەدانیانـە بـۆ ئیمان هێنانو کـردەوەی چاك هەرکەسـێکیش ئـەم ئایەتانـە بخوێنێتـەوە یـان بیـان بیسێ پێویستە فەرمانبەرداری بێو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بێ.

بەیارمەتی خودا شەوی ١٩٩٧/١١/١٧ لە پاکنووسی ئەم جزمە بوومەوە لەماڵی خۆمان لە سلێمانی/ مامۆستایان لەکاتێك شەڕ لەنێوان پارتیو یەکێتیدا لەناوچەی سیدەکانو چۆمانو دۆڵی خانەقاو ئەو دەڤەرانە لە ئەوپەڕی توندوتیژیدا بوو

هەروا نێوان حوکمەتی عێراقو وڵاتە یەکگرتووەکان گەیشتبووە ئەوپەڕی توندوتیژیی

**باقی مەندەی چیرۆکی حەزرەتی شوعەیب**

﴿ ۞ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾

ئەم ئایەتانە پاشماوەی چیرۆکی حەزرەتی شوعەیبە لەگەڵ گەلەکەیداو ئەو چیرۆکە تەواودەکەن.

**باسی یەکەم:** گفتوگۆی حەزرەتی شوعەیبە لەگەڵ ریش سپی و سەرانی

گەلەکەیدا، بانگەوازیکردنو تێکۆشانیەتی لەگەڵیان دا بۆ ئەوەی پێ لەکەللەی شەیتان بهێننە خواریو ئیمان بێنن..

**باسی دووەم:** دەست نیشانکردنی سەرەنجامی کافرەکان ونازلبوونی سزای گشتیو ریشەکێش کەر بۆ سەریان.گفتوگۆ یەکە، بەم شێوە دەست پێ دەکاتو دەفەرموێت: ﴿قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَكَ مِنْ قَرْيَتِنَا﴾ ئەشرافو پیاوماقووڵی گەلەکەی، ئەوانەی لوتبەرزییان کرد لەئیمان هێنانو پابەند نەبوون بە فەرمانو جڵەوگیری لێ کردن لەناشووبگێریو فیتنە جۆیی!

ئەو پیاو ماقوڵو ئەشرافانە هەڕەشەیان لەحەزرەتی شوعەیبو شوێنکەوتوانی کردو وتیان: سوێندبێ ئەگەر واز نەهێنی ئەی شوعیب! لەم هەڵوێستەت پاشگەز نەبیەوە، خۆتو شوێنکەوتوانت لەولات دەردەکەینو ناهێڵین تێی دا دانیشن! واتە: ئێوە ئێستا دوو رێگاتان لەبەردەمدایە: یان دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی خۆمانو باوکو باپیرمان، یان لەولات دەرتان دەکەینو ناهێڵین تێی دا دانیشن!!

حەزرەتی شوعەیب لەبەرامبەر ئەم هەڕەشە ئاشکراو بێپەروایەی گەلەکەی دا رویتێکردنو بەسەر سوڕمانو پرسیاری ئینکار ئامێزەوە ﴿أَوَ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ؟﴾ پێی گوتن: ئایا ئێوە داوای ئەوەمان لێدەکەن بگەڕێینەوە سەر ئایینی ئێوەو لەئایینی خودا پەسندی خۆمان پاشگەز ببینەوە تەنانەت ئەگەر پێشمان ناخۆش بێ ئێوە لەسەر هەڵوێستی خۆتان سوورنو پێکێشیمان لێدەکەن کە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایینی ئێوە؟ ئەگینا دەرمان دەکەن؟؟ دەتانەوێ بەتۆپزیو زۆرەملی ئێمە پاشگەز ببینەوەو بێینەوە سەر ئایینی ئێوە؟! بەراستی ئێوە تێنەگەیشتوونو کەمفامن! ئێوە نازانن کە ئایین بریتییە لەبیرو باوەڕو کردەوە، بەسۆنگەی ئایینەوە مرۆڤ لەخودا نزیک دەبێتەوە؟ ئێوە نازانن ئایینی ئێمە چۆن لەدڵو دەروونمان دا چەسپیوەو چەند کاریگەرە لەژیانماندا!

ئێوە نازانن خۆشەویستی زێدونیشتمان تەنگ بەبیروباوەڕمان هەڵناچنیو ناچین بۆ ئەوەی لەولات دەرنەکرێین واز لە عەقیدەو بیروباوەڕمان بێنین! ئێمە

هەرگیز ڕەزامەندی خوداو بەندایەتی بۆ کردنی ناخەینە تای تەرازووی زێدو نیشتمانەوە، هیچ شتێك نیە بەبڕوای ئێمە هاوتای ئایینو بیروباوەڕ بکا؟ بۆ هیچ شتێك ئێمە واز لە ئایینی خودا پەرستی ناهێنین!

ئەمجار بێ پەروا ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی پێشوویانو، دەفەرموێت: ئێمە ئەگەر پاشگەز ببینەوەو بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایینی ئێوە ﴿قَدْ افْتَرَيْنَا عَلَى اللَّهِ كَذِباً إِنْ عُدْنَا فِي مِلَّتِكُمْ بَعْدَ إِذْ نَجَّانَا اللَّهُ مِنْهَا﴾ ئەوە بێگومان بوختانمان بۆ خودا هەڵبەستووە، بەدرۆو بێ بەڵگە هاوەڵمان بۆ خودا بڕیار داوە، ئەگەر ئێمە دوای ئەوەی خودا لە شیرکو بیروباوەڕی بەتاڵ ڕزگاری کردوین بگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو بیروباوەڕە بەتاڵو پوچە، ئەوە ئێمە بە دەستی ئەنقەستو لەگەڵ ئەوە دا کە دەزانین ئایینی خۆمان ڕاستەو ئایینی ئێوە پووچە ئیفتیرا لە سەر خودا دەکەینو بە ناحەقو بێ بەڵگەی عەقڵی ونەقڵی هاوەڵی بۆ دادەنێین! ئای کە بوختانێکی گەورەیە ئێمە لە سەر خودا هەڵی دەبەستین ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایینی ئێوە!!؟ ئای کە تاوانێکی گەورەیە!! چونکە کوفرو داپۆشینی حەق لەگەڵ زانین خراپترن جۆری کوفرە، ئیفتیرا کردن بە خوداو هاوەڵدانان بۆی، گەورە ترین بوختانو تاوانێکە کە بە هیچ جۆرێك پاساوی نادرێتەوە!

کە دەفەرموێت: ﴿إِذْ نَجَّانَا﴾ بە شێوەی تەغلیب حەزرەتی شوعەیب خۆی خستۆتە ڕیزی شوێنکەوتوەکانی، ئەگینا هەر شوێنکەوتوەکانی مەبەستە، چونکە پێغەمبەران لە کوفر پارێزراون!

﴿وَمَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَعُودَ فِيهَا﴾ هەرگیز بۆ ئێمە نابێو لە شانی ئێمە ناوەشێتەوە کە لە ئایینی خۆمان پاشگەز ببینەوەو بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایینی پڕوپووچی ئێوە، هیچ هێزێك نیە بتوانێ ئێمە لە بیروباوەڕی خۆمان پەشیمان بکاتەوە، چونکە ئێمە دڵنیاین کە ئایینی خۆمان حەقەو ئایینی ئێوە بەتاڵە ﴿إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ مەگەر خودا بیەوێ ئێمە بێینەوە سەر ئایینی ئێوە! چونکە بڕوای پتەومان بە مەشیئەتو ئیرادەی خودا وامان لێ دەکات کە هەموو شتێك حەواڵەی پەروەردگار بکەین، خودا هەموو شتێك دەزانێو حیکمەتو دانایی لە هەموو شتێك

دا رەهاو موتلەقە.

ئەگەر ویستی شتێك ئەنجام بدا ئەوە عائید بەخۆیەتی چونکە هەر زاتی پاکی هەڵسوڕێنەری کاروباری ئێمەیە!

ئەمەش جەخت کردنەوەی حەزرەتی شوعەیبە لەسەر رەتکردنەوەی داواکاری گەلەکەیو حەزرەتی شوعەیب پێی راگەیاندن کە بەهیچ جۆرێك داواکارییەکەیان جێ بەجێ ناکا، چونکە پەروەردگار بۆ خۆی وادەی داوە وادەی ئەویش حەقەو پاشگەزبوونەوەی نیە وادەی داوە کە بەندە موخلیصەکانی لەسەر ئیمانو باوەڕ دەهێڵێتەوەو ناهێڵێ بگەڕێنەوە بۆ گومڕایی. بێگومان خودا زۆر لەوە دوورە کە پێی خۆشبێ موسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆ سەر کوفر ئەوە زۆر لە حیکمەتو دانایی خودا دوورە، هەرگیزخودا دابو نەرێتی خۆی ناگۆڕێ، بەڵگەی خۆی پووچ ناکاتەوە! کەوابێ دەستی خۆتان بن سەری خۆتان بدەنو بەتەمای ئەوە مەبن!

﴿رَبَّنَا وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً﴾ پەروەردگار هەموو حیکمەتو بەرژەوەندییەك دەزانێ، زانیاری رەهاو موطلەقە، فەضلو بەخششی زۆرو زەبەندەیە، هەموو کاروکردەوەیەکی حیکمەتو داناییە، ویستو ئیرادەی هەموو حیکمەتو خێرو بێرە بۆ مرۆڤ! ئیرادەی بە گوێرەی حیکمەتی لە کاردایە.

بە کورتی پەروەردگار زانایە بە هەموو شتێك: ئەوەی بووەو ئەوەی دەبێ، هیچی لێ هون نابێ، حاڵو چۆنیەتی بەندەکانی دەزانێ، دەزانێ چۆن گۆڕانکاری بەسەر دڵو دەروونیان دا دێ، چۆن دوای دڵ نەرمی دڵڕەقیان بەسەر دا دێ، دوای لەشساغی نەخۆش دەبن، دوای ئیمان هێنانو باوەڕ پەیداکردن کافر دەبنەوەو بە پێچەوانەشەوە! کەوابێ پێویستە کەس لە مەکری خودا ئەمین نەبێ، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێت: ﴿فَلاَ يَأْمَنُ مَكْرَ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئێمە وێرای ئەوەی کە هەرچی خودا لە سەری پێویست کردوین پابەندی دەبینو بەلێبوردوییەوە پارێزگاری شەرعو ئاینەکەی دەکەین ﴿عَلَى اللّهِ تَوَكَّلْنَا﴾ لە هەموو کارو بارێکمان دا پشتمان بەخودا بەستووە، پشتی پێ دەبەستین کە لەسەر بیروباوەڕی راست راگیرمان بکا، توفیقمان بدا بۆ زێدە یەقینو بڕوا دامەزران،

پشتگیری ئەومان بەسە بۆ بەرەنگار بوونەوەی هەڕەشەی ئێوە. ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾الطلاق/٣ مەرجی تەوەکولی راستو دروستیش ئەومیە: بەگوێرەی شەرعو بە بەرچاوگرتنی سونەتی بونەوەربێ، کەسێك هۆکارە مادییەکان بە بەرچاو نەگرێو سوننەتە کەونییەکان پاشگوێ بخا ئەوە نەزانێکی لەخۆبایی بووە، نەك خاوەن تەوەکولێکی خاوەن پاداش لای خودا!.ئەی ئەوە نەبوو کاتێك کابرا عەرەبە دەشتەکییەکە عەرزی پێغەمبەری کرد ﷺ وتی: قوربان ئەرێ وشترەکەم ببەستمەوە یان تەوەکولم لەسەر خودابێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (اعقلها و توكل) رواه الترمذي.. بیبەستەوەو، تەوەکولیشت لەسەر خوابێ.

هەروەها پەروەردگار کە خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر دەکاو فەرمانی پێ دەکات، کەراوێژ لەگەڵ هاوەڵانی بکا، دەفەرموێت ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ دیارە عەزمو جەزم کاتێك دەبێ، کە هۆکارە مادییەکان فەراهەم هێنرابن. کەرەسەی پێویست دەستەبەر کرابێ. ئەو کاتەی ئەم ئایەتە نازڵ بوو، پێغەمبەرﷺ دوو زرێی پۆشیبوو چەكو تفاقی پێویستی بۆ جەنگان لەگەڵ دوژمن دا دەستەبەر کردبوو! بەگوێرەی دەستوورو باوی ئەو رۆژگارە لەشکری موسوڵمانانی سازو تەیار کردبوو، ئەمجار لەگەڵ هەبوونی ئەو هۆکارە مادییانە فەرمانی پێکردن کە پشت بە خودا ببەستنو تەوەکولیان لەسەر ئەوبێ!

بەکورتیو پوختی حەزرەتی شوعەیب بەهەموو جۆرێك داواکارییەکانی گەلەکەی رەت کردەوەو هەموو هەوڵو تەقەللاو هەڕەشەکانی پووچ کردنەوە!.

ئەمجار حەزرەتی شوعەیبکە نائومێد بوو، لە ئیمانهێنانی گەلەکەی دەستی دوعای بۆ قاپی کردگار بەرز کردەوەو، دوعای لێکردنو وتی: ﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ﴾ پەروەردگارا! ئەتۆ بەحەقو راستی حوکم بکە لەنێوان ئێمەو گەلەکەمان دا، خوایە! بەگوێرەی سونەتی نەگۆڕاوی خۆت لە بونەوەر دا کە دادگایی نێوان پێغەمبەرانو کافران دەکەی، لەنێوان خاوەن بەرنامەی حەقو خاوەن بڕوای پوچ دا بڕیار دەدەی، خودایە! بەو قانوونە دادوەرانەی خۆت کێشەی نێوانمان کۆتایی پێبهێنەو، لە نێوانمان دا حوکم بدە! بێگومان زاتی پاکی تۆ باشترین دادوەرو چاکترین حاکمە بۆ یەکالاکردنەوەی

کێشەی نێوانمان، چونکە تۆ زانای بە هۆکاری کێشەو نیزاعی هەموو تاقمو گرۆهەکان هەرگیز حوکمی ستەمکارانە نادەی‌و، بەهەوانتە حوکم ناکەی! ئەمجار کە کافرەکان نائومێد بوون، لە پاشگەز بوونەوەی شوێنکەوتوانی حەزرەتی شوعەیب بۆ سەر ئایینی ئەوان، پەنایان برد بۆ هەڕەشەو تەهدید ﴿وَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَئِنْ اتَّبَعْتُمْ شُعَيْباً إِنَّكُمْ إِذاً لَخَاسِرُونَ﴾ ئەشرافو پیاو ماقوڵەکانی گەلەکەی شوعەیب، ئەوانەی ئینکاری ئایاتی خودایان دەکردو پێغەمبەرەکەیان بە درۆ دەخستەوەو رۆچووبوون لە گومراییدا، بە هەزارو شوێنکەوتوانی شوعەیبیان گوت: ئەگەر ئێوە شوێن شوعەیب بکەونو چیتان پێدەڵێ: بەقسەی بکەنو خودا بەیەك بناسنو شوعەیب بە پێغەمبەری ئەو بزانن، ئەوە بێگومان ئێوە خەسارەتمەندنو مایە پوچ خۆتانن!

خەسارەتمەندی مەعنەوی دەبن، بەم جۆرە شەرەفو کەسایەتی خۆتانو باوکو باپیرانتان لە دەست دەچێ، چونکە ئایینی دێرینی خۆتانو باوکو باپیرانتان لەدەست دەدەنو بناغەی خۆتان دەڕوخێنن، ئیعتراف بەوە دەکەن کەپێشینانی ئێوە گومڕاو سەرلێشێواو بوون، بەمەش رابردوی خۆتان ریشەکێش دەکەنو رەگەزی خۆتان دەبڕنەوە!

خەسارەتمەندی مادیش دەبن، چونکە قازانجی تەرازو بازی‌و فرتو فێڵ کردنی سەوداو مامەڵەتان نامێنێ، رێگای چاوبەستەکی لە غەریبی‌و نەزانانتان لێ دەگیرێ‌و ناهێڵێ ماڵو کالای خەڵك کەم نرخ بکەنو بەهەرزان بیکرنو بەگران بیفرۆشنەوە!

بەکورتی: پەروەردگار یەکەم جار وەصفی قەومی شوعەیبی بەگومڕابوو کرد، پاشان وەصفی بەگومڕاکەرو رێ لێتێکدەر کردن، ئەمجار وەصفی کردن بەوە کە تیرۆرستو راوەدونەری موسوڵمانەکان بوون، ئەمجار بەشوێن نمایش کردنی ئەم هەڵوێستو رەوشتانەیان دا کۆتایی ژیانو چۆنیەتی سزادانیانو لەناوبردنیان دیاری دەکاو دەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمْ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ بوومەلەرزە لێی دانو هەریەکەیان لە ماڵی خۆی دا سەرەنگری‌و قونگەو تلوور کەوتنو لەناوچونو مردن..

تێبینی ئەوە دەكرێ پەروەردگار لەم سورەتە دا جۆری عەزابەكەیانی بە(رەجفە-بوومەلەرزە) دیاری كرد لەسورەتی هود دا بە (صیحە- نەڕەو ناڵەوگرمە) دەست نیشان كرد، چونكە بوومەلەرزە بێ گرمەو ناڵە نابێ لە سورەتی (شعراء) دا قورئان ئەوە دەگەیەنێ كە پەروەردگار حەزرەتی شوعەیبی بۆ سەر (اصحاب الأیكە) ناردووە، كەلە رەچەڵەكو نەژاد دا برای (اصحاب مدین) بوون سزادانی دانیشتوانی مەدیەن بە (صیحة)و (رجفة)بووە. سزادانی (اصحاب الأیكە) بەرەشەبای ئاگراوی‌و گڕوگرمەی بەهێز بووە.

ئەوە بوو: هەورێكی بۆ ناردن، هەموویان لەخۆشیان چوونە ژێر سێبەرەكەیەوە وایانزانی گەرمای بەتینی خۆریان لێ كەم دەكاتەوە، ئیتر هەورەكە هەورێكی ئاگراوی‌و پڕ لە بریسوو چەخماخەبوو ئاگری غەزەبی خودای بە سەر دا باراندن.

كەوابێ قەومی شوعەیب هەموو ئەم جۆرە عەزابو سزایانەیان بەسەر دا هێنراوە، عەزابی هەوری ئاگراوی‌و ئاگربارانو شریخو هوڕو گرمەو ناڵە لەئاسمانەوە بومەلەرزەو راتڵەقاندن لەزەوییەوە، هەموو ئەمانە لەقەومی شوعەیب كۆبوونەوەو زەندەقیان چوو لاشەكانیان سلار بوونەوە چوونە زبڵدانی مێژووەوە، سزای دوا مردنیشیان بۆ هەتاهەتایێ هەر خودا دەزانێ چۆنە!.

دەی بابزانین كێ خەسارەتمەند بوو؟ شوێنكەوتوانی شوعەیب، یان ئەوانی بڕوایان پێ نەكرد؟

لە راستی دا ﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا شُعَيْباً كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا﴾ ئەوانەی حەزرەتی شوعەیبیان بە درۆ خستەوە، هەر ئەوان خەسارەتمەندو چارە رەش بوون! ئەوانە ریشەكێش كرانو لەناوبران هەر دەتگوت: قەتقەت ئەوانە لەو شارو هەرێمە دا هاتوچۆیان نەبوەو لەو خانو بەرەی خۆیان دا نیشتەجێ نەبوونو پشوویان نەداوە!!

ئەم بەشەی ئایەتەكە وەڵامدانەوەی كافرەكان بوو كەبە شوعەیبو شوێنكەوتوانی ئەوویان گوت: ﴿لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَا﴾ ئەوەتا ئەمانە بە هیلاك چونو گوندەكەشیان وێران بوو، هیچ سوودیان لێ نەبینی

وەلأمی ئەو هەڕەشەیەشیان کەوتیان: ﴿اتَّبَعْتُمْ شُعَيْباً إِنَّكُمْ إِذاً لَّخَاسِرُونَ﴾ بەشەکەی تری ئایەتەکەیە: کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا شُعَيْباً كَانُوا هُمُ الْخَاسِرِينَ﴾ واتە: ئەوانەی شوعەیبیان بەدرۆ خستەوەو پێیان وابوو هەرکەسانێك شوێن شوعەیب بکەوێ خەسارەتمەندو چارەڕەش و بەدبەختن! دونیاو قیامەتیان لە کیس چوو... شوێن کەوتوانی حەزرەتی (شوعەیب)یش سەرفرازو سەرکەوتوو بە مراز گەیشتوون! وەکوو لە شوێنێکی تر دا دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْباً وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مَّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُواْ الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴾هود/٩٤ ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کەهەرکەسێك زێدەڕەوی بکا لەنیشتمان خۆشەویستی داو بیەوێ جگە لەخۆی کەسی تر تێی دا هەوا هەڵنەمژێ و تێی دا دانەنیشێ، زۆرو ستەم لە حەقخوازان بکا تێیدا، ئەوە سەرەنجام بۆ خۆی لەو نیشتمانە بێ بەش دەبێ، هەر وەکوو چۆن هەرکەسێك هەڵپەی خواردنی ماڵی خەڵکی هەبێ بەشێوەی ناڕەواو نەگونجاو، ئەوە بۆ خۆی لەماڵ و سامانی جیهان بێ بەش دەبێ.

ئەوەش دەگەیەنێ کە هەموو کاتێ سەرەنجام بۆ تەقواکارانە، حەلاڵ بخواو خۆ دورە پەرێز بگرێ لەماڵی حەرام، هەروەها فەوتان و لەناوچوون و ئیفلاس بوون بۆ ئەو کافرو خوا نەناسانەیە کە رۆدەچن لە حەرام خواردن و ماڵی خەڵك بەناڕەواو ناحەق دەخۆن!

جا کە ئەو عەزابو سزایانە تووشی گەلە کافرەکەی شوعەیب بوو ﴿فَتَوَلَّى عَنْهُمْ﴾ پێش هاتنی عەزابەکە، حەزرەتی شوعەیب و شوێنکەوتوانی لەو ناوچەیە چونە دەری و عەزابەکە نەیگرتنەوە، ئەمجار بەدڵێکی ناخۆشەوە ﴿وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ﴾ ئەی گەل و هۆزەکەم! ئەمن بەدڵسۆزییەوە پەیامی خودای خۆمم پێ راگەیاندن، ئەو ئەرکەی پێم سپێرا بوو پێتان بگەیەنم ئەنجامم دا، زۆرم ئامۆژگاری کردن و هەوڵم لەگەڵ دان، بەلام بەداخەوە گوێتان لێ نەگرتم و بەقسەتان نەکردم، تا بەو دەردەچوون کە پێی چوون!! ﴿فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾ چۆن من غەم بۆ قەومی کافرو خوانەناس دەخۆم؟ واتە: من خەفەت

بۆ لەناوچوونی گەلو هۆزێك ناخۆم كە ئینكاری تاكو تەنهایی خودایان دەكردو پێغەمبەرەكەیان بەدرۆ خستەوەو بڕوایان پێنەكرد!!

ئەمەی بەسەرتان هاتووە ئاكامی كردەوەی ناپەسەندی خۆتانەو، پاداشی پڕاوپڕی سەرپێچیو لوتبەرزیو لەخۆبایی بوونی خۆتانە، دەبخۆنو بیچێژن عەزابی سەختی نەبڕاوەو هەتاهەتایی! نەفرەتی خودا لەستەمكاران!

## پەروەردگار پێش ئەوەی نەتەوەیەك لەناوبەرێ بەخۆشیو ناخۆشی بەتاقییان دەكاتەوە

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار حاڵەتی پێغەمبەرانی لەگەڵ گەلەكانیان باس كرد، شێوەی عەزابو چۆنیەتی لەناوبردنی گەلەستەمكارەكانی رونكردەوە، ئەمجار دێ لەم ئایەتانە دا ئەوە رادەگەیەنێ كە بەهیلاكدانو ریشەكێش كردن تەنیا هەر بۆ ئەو چەند گەلو نەتەوانە نەبووەو تایبەت نەبوە بەو رۆژگارانەوە، بەڵكوو لەگەڵ هەموو ستەمكارو سەرپێچی كارێك دا پەروەردگار دابو نەریتو سوننەتی خۆی نەگۆڕیوە..

ئەوەش روون دەكاتەوە كە سوننەتی یەزدانی دەرحەق بەو كەسانەی پێغەمبەریان بەدرۆخستونەوە وا هاتووە: لەسەرەتا دا تووشی نەخۆشیو بێ بارانیو جۆرەها نارەحەتی ترمان كردوون بۆ ئەوەی بەخۆیان دا بچنەوە، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەكانمان ببن، ئەمجار خستومانەتە حاڵەتی خۆشیو هەرزانییەوە، بۆ ئەوەی بیرێك لەخۆیان بكەنەوەو لەنازو نیعمەتی ئێمە وردبنەوەو دەست بكەن

بەخودا پەرستی، ئەمجار ئەگەر هەر لەسەر کوفرو سپڵەیی خۆیان بەردەوام بن، ئەوە عەزابی بنبڕکەرو ریشەکێشو دوا بڕوامان بەناگەهان بۆ ناردوون، تاسزای بێ رەزاو کوشندەمان یەخەی پێنەگرتوون بەخۆیان نەزانیوە.

ئەمەش هەرەشەیە لەقورەیشییەکانو هی تریش، هەڵنانیانە بۆ ئیمان هێنان بەپەیامی پێغەمبەری ئیسلامو دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ أَخَذْنَا أَهْلَهَا بِالْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ﴾واتە: سوننەتی ئێمە لەبونەوەر دا ناگۆڕێو نەگۆڕاوە، ئێمە هەرکاتێ پێغەمبەرێکمان بۆ سەر گەلو نەتەوەیەك ناردبێو بەدرۆیان خستبێتەوە یەکسەر عەزابمان بۆ نەناردونو لەناومان نەبردون، بەڵکوو بۆ ماوەیەك مۆڵەتمان داونو بەلاو موصیبەتو گیروگرفتمان تووش کردون، توشی گرانیو هەژارییو نەخۆشی جۆراوجۆر بوون، بۆ ئەوەی بەخۆیان دا بچنەوەو دڵیان نەرم بێو بەندایەتیو ملکەچیو زەلیلی خۆیان رابگەیەننو هاوارمان لێ بکەن ئەو ناخۆشیانەیان لەسەر لابەرین!

چونکە بەئەزموونو تاقیکردنەوە لای زانایان چەسپاوە کە تەنگو چەڵەمەو گیروگرفت خەڵك باش پەروەردە دەکا، ئەخلاقو رەوشتیان مشتومال دەکا!!

﴿ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ السَّيِّئَةِ الْحَسَنَةَ حَتَّى عَفَوا﴾ پاشان لەشوێن ئەو حاڵە ناخۆشەی تێی کەوتبوون، لەجیاتی ئەو تەنگو چەڵەمەی تووشیان بوبوو، خێرو خۆشیمان پێداون، لەباتی هەژاریو نەخۆشیو قاتو قڕیو کێشەو شەڕو هەرای ناویان هەرزانیو تەندروستیوماڵو سامانی زۆرو برایەتیو ئاشتیو تەباییمان خستە ناویان ﴿حَتَّى عَفَوا﴾ هەتا ژمارەیان زۆر بوو، لەشساغو تەڕدەماغ بوون، ماڵو منداڵیان پەرەی ساندو وەچەو نەوەی زۆریان لێ کەوتەوە، زەویان ئاوەدان کردەوە، خانو باڵەخانەیان هەڵچنیین.

ئەی ئەوە نیە هەر کەمێك پێش ئێستا لەم سورەتە دا لەچیرۆکی حەزرەتی هو دا باسی نازو نیعمەتی خودا دەکات بەسەر ئەو گەلە ستەمکارە داو لەسەر زوبانی حەزرەتی هود دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾الأعراف/٦٩ هەروەها حەزرەتی (صالح)یش بەقەومەکەی گوت: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ

وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُوراً وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتاً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾الأعراف/٧٤

ئێمە ئەو گەلو نەتەوانەمان بەخۆشیو ناخۆشی بەتاقی کردنەوە بۆئەوەی بەخۆیان دا بچنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خودا بەلاٚم پەندیان وەرنەگرتو تەمبێ خواردو نەبوون ﴿وَقَالُوا﴾ بەبێ ئەوەی ئەو روداوانە کاریان تێ بکەن، وتیان: ﴿قَدْ مَسَّ آبَاءَنَا الضَّرَّاءُ وَالسَّرَّاءُ﴾ بێگومان باوك باپیرانیشمان ئاوا توشی ناخۆشیو خۆشی هاتوون، دەمێك هەژارو لەش بەبارو دەربەدەرو بێ لانەو خانە بوون، کاتێکیش لەنازو نیعمەت دا گوزەراندویانە، خاوەن ماڵو ساماندارو لەشساغو تەڕدەماخ لەژێر باڵی ئاشتیو تەبایی دا ژیاون، ئەوە هەڵوێستی رۆژگارە، لەگەڵ ئادەمیزاددا، کەوابێ نە تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی سزاو تۆڵەی تاوانە، نەهەرزانیو ئاشتیو لەشساغی پاداشی کردەوەی چاکەیە!!

بەکورتی ئەوانەی لەسوننەتو دابو نەرێتی پەروەردگار لەبونەوەر دا حاڵی نەبوون، هۆکاری خۆشبەختیو کامەرانی، یان هۆکاری بەدبەختیو چارەڕەشی ئادەمیزاد تێنەگەیشتوون، ئاگایان لەیاسای خودا نیە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾الرعد/١١ جاکە ئەو گەلو نەتەوانە، بەو گۆڕانکارییانە پەندیان وەرنەگرتو تەقەلوباتی رۆژگار کاری تێ نەکردنو بەخۆیان دا نەچونەوە، گوێیان نەدایە نەصیحەتو ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرەکەیان، سەرەنجام ﴿فَأَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ لەنکاوێکو بەناگەهان عەزابمان بەسەر دا دانو تێکمانەوە پێچان بەبێ ئەوەی هەست بەئەوە بکەن کە سزایان بۆ نازڵ دەبێ، وەکوو لەئایەتێکی تر دا دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾الأنعام/٤٤

خوێنەری هێژا! مامۆستا سەیید دەفەرموێت: سییاقی قورئان لێرە دا روداو ناگرێتەوە، بەڵکوو سوننەتی پەروەردگار روون دەکاتەوە، مێژوو ژیاننامە نمایش ناکا بەڵکوو هەنگاوەکانی قەزاو قەدەری خودا رادەگەیەنێ.. ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکا: کەقانوونو یاسایەك هەیە بونەوەر بەگوێرەی ئەو یاسایە لەکاردایەو هەڵدەسوڕێ، لەسەر ئەو رێووشوێنە کارەکان ئەنجام دەدرێن، مێژووی ئادەمیزادیش

لەسەر زەوی بەو قانونە گۆڕانکاری تێدا ڕو دەدات، ئەرکی پێغەمبەرایەتی - بەو هەموو گەورەییەی - هۆکارێکە لەهۆکارەکانی ئەنجامدانی ئەو یاسا گشتییە یەزدانییە.

ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ: کە کاروباری بوونەوەر بەهەوانتە ئەنجام نادرێن، ئادەمیزاد بەتەنیا لەم زەویە دا بەڕەڵا نەکراوەو بۆ خۆی بەتەنیانیە - وەکوو مولحیدەکانی ئەم ڕۆژگارە بۆی چوون- بەڵکوو هەرچی لەم بونەوەرە دا ڕودە دا بەتەگبیرو تەقدیری خودایە، لەحیکمەتو دانایی خوداوە سەرهەڵدەداو بەرەو ئامانجێك دەڕوا........

پێویستە ئەوەش بزانین کە پەروەردگار زۆر لەوە دورە کە بەهەوانتەو بێ هۆ بەندەکانی تووشی گیروگرفتو ناخۆشی بکاو ڕقو قینی خۆی بەبەندەکانی بڕێژی‌و تەنها مەبەستی تۆڵەو دامرکانەوەی ڕقو کینە بێ، بەڵکوو پەروەردگار کە سەرپێچیکارانو بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەرەکانی بەتەنگو چەڵەمەو قاتو قڕی‌و نەخۆشی بەتاقی دەکاتەوە بۆ مشتو ماڵکردنی دڵو دەرونیانە، بۆ ئەوەی ویژدانیان بەئاگا بێتەوە، ئەگەر خێر لەدڵو دەروونیان دا مابێ، بۆ ئەوەیە دڵیان نەرم بێ، بۆ ئەوەیە بەندە بێ هێزەکان ڕوو بکەنە بارەگای خودای بەتواناو دەسەڵات، لێی بپاڕێنەوە، داوای ڕەحمەتو لێ خۆشبوونی لێ بکەن، ئیعلانی زەلیلی‌و ملکەچی‌و بەندایەتی خۆیان بۆ خودا ڕابگەیەنن. ئاشکراشە خودا پەرستی‌و بەندایەتی کردن بۆ زاتی کردگار مەبەستێکی سەرەکییە لەدروست کردنی ئادەمیزادو جندۆکە دا وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ خۆ ئەگەر ئادەمی‌و جندۆکە هەموویان بەیەکدڵو یەك زوبان طاعەتی خودا بکەن چ لەگەورەیی‌و دەسەڵاتی خودا زیاد ناکەن، ئەگەر هەمووشیان تێکڕا لەخودا یاخی بنو سەرپێچی فەرمانەکانی پەروەردگار بکەن تۆزقاڵێك لەخودایەتی‌و گەورەیی کەم نابێتەوە..

کەوابێ گەردنکەچی بۆ خوداو پاڕانەوەی بەندەکانی لەقاپی ڕەحمەتی‌و ئیعلانکردنی بەندایەتی خۆیان بۆ خودا سوودی بۆ خۆیان هەیە، ژیانو بژێوی خۆیانی پێ زیاد دەبێ، بەختەوەریی قیامەتیان دەستگیر دەبێ، هەرکاتێ بەتەواوی لێبڕان بۆ خودا پەرستی‌و ئیعلانی بەندایەتی خۆیان بۆ پەروەردگار کرد، ئەوە

لەبەندایەتیکردن بۆ شەیتانو قوتابیەکانی رزگاریان بووە، وازیان لەبەندایەتیکردن بۆ هەواو ئارەزۆی سەرکەشی خۆیان هێناوە، رێگای سروشتیو خوداپەسندیان رەچاو کردوە. بۆیە مەشیئەتو ویستو سونەتی خودا واهاتووە کەئەهلو دانیشتووی هەرشارو کۆمەڵگایەك پێغەمبەریان بۆ نێردرا بیو بەدرۆیان خستبێتەوە کە خودا بیانگریو تووشی تەنگو چەڵەمەیان بکا، بەڵاو موصیبەت لەگیانو جەستەو زەرەرو زیان لەماڵو سامانیان بدا، بۆ ئەوەی بەئازاری ئەو بەڵاو موصیبەتانە دڵیان زیندو بیتەوە، چونکە ئازارو ناخۆشی بەهێزو کاریگەرن بۆ پاڵفتەکردن، زۆر بەباشی هەستو شعور مشتو ماڵ دەکەن، کانیاوی خێریان تێدا دەتەقێنێتەوە ئەگەر خێریان تێدا بێ!.

## هەڵنانی ئادەمیزادان بۆ ئیمانو ترساندنیان لەکوفر!

﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوو دا پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە؛ کە ئەو گرۆهانەی لەخوا عاصی بوونو بەلاو موصیبەت نەرمی نەکردنو نازونیعمەت نەیکردن بەسوپاسگوزاری خودا، پەروەردگار بەناگەهان غافڵگیری کردنو لەناوی بردن، لەم ئایەتانەی ئێرش دا ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەو گرۆو دانیشتوانەی شارو کۆمەڵگاکان ئەگەر بۆ خودا لێ بپرانایەو بەندایەتی پەروەردگاریان بکردایە، خودا دەرگای خێری لێ دەکردنەوەو لەهەموو لایەکەوە خێرو خۆشیان بەسەر دا دەرژا!!

ئەمجار بۆ دووبارە کردنەوەو جەخت لەسەر کردنەوەی مانای ئایەتەکانی پێشوو ئادەمیزادان دەترسێنێ لەهاتنی سزای زوو دەستلەجێ ئەگەر پەیامی پێغەمبەران بەدرۆبخەنەوە، فەرمووی: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ ئەگەر دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری، هەروەها دانیشتووی هەموو شارو شارۆچکەیەك ئیمانیان بەخودا بهێنایەو بڕوایان بەفریشتەکانی، بەکتێبەکانی، بەپێغەمبەرانی خودا بهێنایەو رۆژی قیامەتیان بەراست بزانیایە، خۆیان بپاراستایە لەو شتانەی خودا نەی لێ کردووە: وەك هاوەڵدانان بۆ خوداو بەرپا کردنی فیتنەو ئاشووب لەسەر زەوی، ئەوە پەروەردگار خێرو بێری زۆری لەئاسمانەوە بەسەر دا دەباراندن، بارانی پڕپیتو بەرەکەتی لەکاتی پێویست دا بۆ دەرژاندن، لەزەوی خێرو خێراتی بۆ دەردەهێنان، کانو گەنجو خەزینەی نیشان دەدان، زانستو زانیاری فێردەکردن، بۆ ئەوەی لەسونەتی بونەوەر حاڵی ببن!

بەکورتی ئەگەر ئەو خەڵکە بڕوایان بکردایەو موسوڵمان بوونایە پەروەردگار هەموو خێرو بێرێکی بۆ دەستەبەر دەکردن، رزقو رۆزیی بۆ زۆر دەکردنو بیری تیژو فکری رونی دەدانێ، لەژیانی دونیاو قیامەت دا بەختەوەرو کامەران دەبوون، ئەمە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە ئیمانو باوەڕی راستو دروست هۆکاری هەرزانیو لەشساغیو کامەرانییە!!

﴿وَلَكِنْ كَذَّبُوا﴾ بەڵام دانیشتووی ئەو شارانە لەجیاتی ئەوەی ئیمان بهێننو بڕوا بەپێغەمبەرەکانیان بکەن بەدرۆیان خستنەوەو ئیمانیان پێ نەهێنان، خۆیان لەنەهییەکانی خودا نەپاراستو تەقوای پەروەردگاریان نەکرد، ﴿فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا

يَكْسِبُونَ﴾ تۆڵەمان لێ ستاندن بەلەناوبردن، بەهۆی ئەو هەڵوێستو بێ گوێییەی کە بەرامبەر پەیامی پێغەمبەرەکەیان نواندیان، لەسەر شەریك دانان بۆ خوداو ئەنجامدانی تاوانی وا کە یاسای کۆمەڵی ئادەمیزاد تێك دەدا، ژیانی دانیشتوان تاڵ دەکا!

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە سزاو تۆڵە ئاکامێکی سەد دەرسەدی تاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودایە!

ئەمجار پەروەردگار جارێکی تر هەڕەشەو ترساندنی ئادەمیزادانی دووبارە کردەوە، جارێکی تر هەڕەشەی لەناوبردنو ریشەکێش کردنی لێ کردنو لەئاکامو سەرەنجامی گوێ نەدان بەفەرمانی خودا ترساندنیو سەیری بەبێ ئاگاییو نەفامی ئەو خەڵکە هاتو فەرمووی: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَنْ يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا بَيَاتاً وَهُمْ نَائِمُونَ﴾ ئایا دانیشتوانی مەککەو دانیشتوانی شارو کۆمەڵگای تریش، ئەوانەی بانگەوازی ئیسلامیان پێگەیشتووە؟! کەمتەرخەمی دەکەنو ناترسێن لەوەی عەزابی کوشندەو ریشەکێشکەری ئێمەیان بۆبێ لەکاتی بێ ئاگاییو پاڵدانەوەیاندا، لەکاتێك دا کە ئەوان لەشیرین خەودابن! ئایا دانیشتوانی شارو گوندەکان ئەمینو دڵنیان لەوەی کە عەزابی خودایان بۆ نایە؟ ئەوە دابونەریتی خودایە لەبوونەوەردا، ئادەمیزاد تاقی دەکاتەوە بەخۆشیو ناخۆشی ئەوە پاشماوەو شوێنی سەرپێچی کارانو بەدرۆخەرەوەکانە ئەوانەی کە لەپێش ئێوە دا لەو شارو گوندانە دا نیشتەجێ بوونو تێی دا هاتوچۆیان دەکردو کاروباری رۆژانەی خۆیان ئەنجام دەدان، دوایی بەجێیان هێشتوو چوونە زبڵدانی مێژووەوە ئایە ئەو خەڵکە دڵنیانو ناترسن لەوەی کەخودا لەنکاوێك غافڵگیریان بکاو، عەزابی لەناوبردنیان بۆ بنێرێ؟! عەزابی کوشندەی زەندەق بەر، خۆیان لەناوبچنو شارو گوندیان ژێرو زەبەر بکرێ لەکاتێك دا ئەوان لەشیرین خەودابن، چونکە ئادەمیزاد لەخەو دا ئاگای لەهیچ نییە، هیچ شتێکی پێلەخۆ دوور ناخرێتەوە، تەنانەت ناتوانێ مێشوولەو مێروولە لەخۆی دووربخاتەوە ئەی دەبێ چی بکا لەبەرامبەر عەزابی سامناکی پەروەردگار کە ئادەمیزاد لەکاتی بەئاگاییو خۆئامەدەکردنیش دا کەمترین بەرەنگاری لێ پێ ناکرێ!

بێگومان عەزابی خودا زۆر لەوە بەهێزترە کە ئادەمیزادان خۆی بۆ رابگرنو بەرەنگاری بکەن: نوستبن یان بەئاگابن، خۆیان بۆ بەرەنگاری کردن ئامادە کردبێ یان نا، وەلێ قورئان لێرە دا ئەو کاتانە دیار دەکات کە مرۆڤ لەئەو پەڕی بێ دەسەڵاتی دایە، بۆ ئەوەی ویژدانی ئادەمیزاد بەهێز راتڵەقێنێ! ترسو بەئاگایی بخاتە دڵو دەروونیانەوە! ﴿أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَنْ يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾ یان ئەوە دانیشتوی ئەو شارو گوندانە ناترسن لەوەی عەزابی ئێمەیان بۆبێ لەچێشتەنگاودا، لەکاتێك دا ئەوان خەریکی گاڵتەو گەپن، سەرقاڵی ئەنجامدانی کاروباری خۆیانن کە وەکوو گاڵتەی منداڵان وایە کە ج سودێکی لێ پەیدا نابێ ﴿أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ﴾ ئایا هۆی ئەوەی کە ئەمینن لەعەزاب، ئەوەیە کە ئەمینن عەزابی ئێمەیان بەشەو یان چێشتەنگاو لەکاتی غەفڵەت دا بۆبێ، یان هۆکەی ئەوەیە لەمەکری خودا ئەمیننو لەگرتنو تۆڵەستاندنەوەی ناترسن؟ بێ ئاگان لەوەی کە خودا دەتوانێ سزایان بۆ بنێرێ بەجۆرێك کە بەخۆیان نەزانن؟! ئەگەر هۆیەکە ئەوەبێ ئەوە بابزانن کە خۆیان خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت کردوە، چونکە ﴿فَلاَ يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ﴾ کەس لەمەکری خودا ئەمین نابێ مەگەر قەومی خەسارەتمەندو بەدبەختو چارەڕەش،

ئاکامی ئەمین بوون لەمەکری خوداو غافڵ بوون لەتۆڵەی خودا خەسارەتمەندییە، کەسێك لەمەکری خودا ئەمین دەبێ کە شیاوی ئەو خەسارەتمەندییەبێ!!

ئایا وەندە نەفامن لەمەکری خودا ئەمین بوون؟ لەکاتێك دا ئەوان میراتگرو جێنشینی گەلو نەتەوەیەکن کە لەپێش ئەوانەوە بوونو بەهۆی تاوانو بێ ئاگاییان لەمەکری خودا لەناوچون، ئایا پاشماوەو ئاساری ئەو گەلە لەناوچوانە نابێتە بیرخەرەوە بۆیانو رایان ناچڵەکێنێو، بەهۆش خۆیان ناهێنێتەوە؟!

ئایا لەناوبردنی ئەو گەلو نەتەوە سەرپێچیکارانە نەبۆتە پەندو عیبرەت بۆ ئەمان.؟!

ئەمجار پاش رونکردنەوەی حاڵی ئەو کافرانەی خودا لەبێخ ریشەکێشی کردنو لەناوی بردن پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە: کە مەبەست لەگێڕانەوەی

ئـەم چیرۆکـو بەسـەرهاتانە پەنـد لێ وەرگـرتنو تـەمی خواردوبوونـە بـۆ هـەموو کەسێك کە موکەلەفـو بەرپرسیار بێ، بـۆ ئـەوەی بەرژەوەنـدیی خۆیـان دەربـارەی ئایینو خودا پەرستی لێ رەچاو بکەنو فـەرمووی: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ الأَرْضَ مِنْ بَعْدِ أَهْلِهَا ؟﴾ ئایا ئاشکرا نەبوە بۆ ئەوانەی جێگیری‌و میراتگرتنی زەوییان پێبڕاوەو دوای لەناوچوونی دانیشتوە ستەمکارەکانی پێش ئەمان، ئاوەدانکردنـەوەی زەوییـان پـێ سـپێراوە بەتایبـەتی ئـەو قورەیـشییانەی کـە زێـدو نیـشتمانی گـەلو نەتـەوە لەناوچووەکانیان پێبڕاوەو لەشوێنی ئەوان نیشتەجێ بوون!؟ ئایـا بۆیـان مـەعلووم نەبووە ﴿أَنْ لَوْ نَشَاءُ أَصَبْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ وَنَطْبَعُ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لا يَسْمَعُونَ؟﴾ کـە دابـو نـەریتی ئێمـە لەگـەڵ ئـەمانیش هـەمان سـوننەتو یاسـایە کـە لەگـەڵ ئـەوان دا بەکارمان هێنا؟ ئەگەر مـەیلمان هـەبی‌و بمانـەوێ دەیـانگرینو عـەزابیان بەسـەر دا دەدەین، تۆڵەی تاوانو کردارە خراپەکانیان لێ دەستێنین!

چۆن عـەزابـو سـزامان بەسـەر گەلو نەتـەوە سەرپێچیکارەکانی پـێش ئێـوە دادا، ئەگەر حەزمان لێ بێ میراتگرەکانیش وەکوو میرات لێ گیراوەکان دەفەوتێنین!

خۆئەگەر بەهیلاکیان نەبەینو بەعەزاب ریشەکێشیان نەکـەین ئـەوە دەرگـای دڵیان دادەخەینو مـۆری دەکـەین، بـەجۆرێك کـە نەصیحەتو ئامۆژگاری نەبیـسێ، قبووڵی رێنومایی نەکاو لەعاست بانگەوازی حەقو راست دا کەرو کوێر ببن!

وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفـەرموێت: ﴿وَمَا تُغْنِـي الآيَـاتُ وَالنُّـذُرُ عَـن قَـوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ﴾يونس/١٠١

پێویستە ئەوە بزانرێ: کە پەروەردگار بەم هەڕەشـەو ترسـاندنە، نایـەوێ کـە ئادەمیزادان هەمیشە لەترسو دڵەڕاوکی‌و زەنـدەق چوون دابـن، هەمیشە بـەترسو لەرزو هەناسە سواریەوە چاوەڕوانی بەهیلاك چونو وڵات وێـران بـوون بـن، شـەوو رۆژ لەخەیاڵی ئەوەدابن ها ئێستا نائێستا بومەلـەرزەو زریـانو رەشـەبای سـەختو ئەو جۆرە عەزابانـە لـەناویان دەبـەنو تێکیانـەوە دەپێچنو لەناودەچن!!! چونکە ترسی هەمیشەیی لەعەزابێکی مەجهوولو دیار نەبوو، دڵەراوکێ لەئایندەی نزیـکو دوور، بەتەمابوونی وێرانی‌و وڵات تێکچوون لەهەموو ئانو ساتێك دا، هێـزو توانـای ئادەمیزاد پـەك دەخـاو پەرتـەوازەی دەکـا، سـەرەنجام نائومێدی‌و رەشبینی لـەکارو

بەرهــەمهێنان دا پەیــدادەبیو پــەرە دەســێنێ، لەمپــەڕ دەخاتــە بــەردەم ئاوەدانکردنــەوەی وڵاتو نــاهێڵێ ژیــارو شارســتانیەتو ژیــان گەشــە بکــا، ئەمــەش پێچەوانەی رێبازی ئیسلامە!! پـەروەردگار بەئـەم هەڕەشـەو ترساندنانە دەیـەوێ موسـوڵمانان هەمیـشە وریـاو هەسـتیارو تـەقواکاربن، چـاودێری نـەفسو هـەوای خۆیـان بکـەنو، پەنـد لەئـەزموونو بەرسـەهاتی رابـوردوان وەربگـرن، بەچـاوێکی وردبینیـەوە سـەیری حـەرەکاتی مێـژووی مرۆڤایـەتی بکـەن، هەمیـشە بـەخوداوە پەیوەسـت بـنو پەیوەنـدیان بـەو هێـزە رەهایـە بـەهێز بکـەن، بەخۆشـگوزەرانیو هەرزانیو هاتو هەبوونی دەسەڵات لەخۆیان بایی نەبن!

چونکە پەروەردگار هەمیشە وادەی ئاسایشو دڵئـارامیو رەزامەنـدیی خـۆیو سـەرکەوتنو سـەرفرازی دونیــاو قیامــەت بەموســوڵمانان دەدا، بەمــەرجێك بەئیخلاصـەوە بەندایـەتی بکـەنو تـەقواکاربن، پێویـستە بـەم جـۆرە لەهەڕەشـەو مەکری خـودا بترسین! دەبـێ بـزانین خـودا دەیـەوێ ئێمـە هەمیـشە هۆشـیار بـینو هەسـتیار بـین، رەوڕەوەی ژیـان پـەك نەخـەین بـەڵکوو پارێزگاری بکـەین نـەهێڵین لەجادەی راسـتو دروست لابدا، پشت ئەستوور بـین بەرەحمـەتی خـودا لەرەحمـەتی بەرفراوانی نائومێد نەبین.

دەبــێ موســوڵمانان پەنــد لــەرابوردوو وەربگــرن، هەڵــەی گــەلو نەتەوەستەمکارەکان دوبارەنەکەنەوە، لەشوێنەوارو پاشماوەی ئەوان عیـبرەت پەیـدا بکەن. قورئـانی پـیرۆز لـەزۆر ئایـەت دا ئـەم راسـتییە دوبـارە دەکاتـەوە، یـەکێ لـەو شوێنانەی ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُوْلِي النُّهَى - طه/١٢٨﴾.

## پەند وەرگرتن لەچیرۆكو بەسەرهاتی دانیشتوانی شارو شارۆچکەکان

﴿ تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن

قَبْلُ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار چیرۆكو بەسەرهاتی قەومی نوحو هوودو لووطو شوعەیبی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، شێوەی ناردنی عەزابو بەهیلاك بردنی كافرەكانو رزگار كردنی موسوڵمانەكانی روون كردەوە، ئەمجار پەروەردگار دەیەوێ دڵنەوایی پێغەمبەر بكا، بۆ ئەوەی بەردەوامبێ لەسەر بانگەوازیەكەیو خۆگربێ لەبەرامبەر كافرەكانی قورەیش دا، هەروەها بۆ ئەوەی پەندو عیبرەت لەبەسەرهاتی ئەو گەلو نەتەوانە وەربگرێ، ئەوەی بۆ دوبارە دەكاتەوە، كە ئەو ئازارو نارەحەتیەی لەگەلەكەی تووشی دەبێ شتێكی تازە بابەت نیە، بەڵكوو دابو نەریتێكی كۆنە، زۆر لەگەلو نەتەوە پێشینەكان بەرامبەر پێغەمبەرەكانیان نواندویانە: دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الْقُرَى نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَائِهَا﴾ ئەوەی باسكرا بەسەرهاتی شارو شارۆچكەی ئەو پێنج نەتەوانەیە كە دوای لەناوچوونو وێران بوونو رۆژگارێكی دورو درێژیان بەسەر دا تێپەڕیوە، بڕێ لەبەسەرهاتەكانیان بەسەر تۆ دا (ئەی محمد!) دەخوێنینەوە، بۆ ئەوەی ببێتە پەندو عیبرەت بۆ خۆت بۆ قەومەكەت، بۆ ئەوەی تۆ زیاتر لەسەر بانگەوازی خۆت خۆڕاگریتو سوربی، قەومەكەشت بەخۆیان دا بچنەوەو پەندو عیبرەت لەو نەتەوە لەناوبراوانە وەربگرن، سەیری شوێنەوارو پاشماوەی شارو گوندەكانیان بكەنو فام بكەنەوە، پەروەردگار بۆیە چیرۆكو بەسەرهاتی شارو شارۆچكەی ئەم پێنج نەتەوانەی بەتایبەتی گێڕایەوە، چونكە ئەوان بەهۆی ئەوەوە كە خودا مۆڵەتی دانو نازو نیعمەتی زۆرو زەبەندەشی بەسەر دا رشتبوون، وایانزانی لەسەر حەقنو رێبازیان راستو دروستە، ئیتر پەروەردگار ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە بۆ ئەوەی قورەیشییەكانو هیتریش وەهۆشی خۆیان بێنەوەو خۆبپارێزن لەو كردارو كارانەی ئەوان ئەنجامیان داوە، هەروەها چونكە زێدو نیشتمانی ئەم قەومانە لەوڵاتی

عەرەب دا بووە، یان جیرانیان بوون..

لەلایەکی تـرەوە دانیـشتوانی مەککـە بـڕێ چـیرۆکو بەسـەرهاتی ئـەم نەتەوانەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، تێکڕای چیرۆکەکانیش یەك شێوەو شێوازبون، لەوە دا کەهەریەکێك لەو نەتەوانە پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستۆتەوەو سەرەنجام عەزابی ریشەکێش‌و بنبڕکەریان بەسەر دا نازڵ بوەو لەناوچوون، پەندو عیبرەت وەرگرتن لەهەموویان دا وەکوو یەك وایە. بۆیە لەمەودوا لەچیرۆکو بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا دا بەدرێژی چیرۆکی مووسا دەگێڕێتەوە چونکە قەومەکەی مووسا ئیمانیان هێناو موسوڵمان بوون، ئەوانەی کەبڕوایان پێنەکرد فیرعەونو دارو دەستەکەی بوون!

هۆی سزادانو لەناو بردنی ئەو گەلو نەتەوانە سەرپێچی کردنیان بووە بۆ پەیامی پێغەمبەرەکانیان...

﴿وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ بێگومان ئەو نەتەوانە یەك بەدوای یەك دا هەرنەتەوەیەك پێغەمبەرێکیان بۆ سەر هاتووە، بەڵگەی بەهێزو پێزیان پێبوە لەسەر راستی پەیامەکەیان، بەهەموو جۆرێك بەبەڵگەو دەلیل گەلەکانیان بۆڕداوە، بەڵام ئەو ملهوڕو نەفامانە ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِنْ قَبْلُ﴾ لەو گرۆهانە نەبوون کە بڕوا بەپەیامی پێغەمبەرەکەیان بکەن بەهۆی حەق بەدرۆخستنەوەیانو سووربوون لەسەر ئەو باوەڕە بەتاڵەی کە پێش هاتنی پێغەمبەرەکەیان لەسەری بوون، واتە: بەردەوام بوون لەسەر ئایینی خۆیانو هەرلەسەرەتای ئاڕاستەکردنی بانگەوازی بۆیان کە یەکتاپەرستی ئەنجام بدەنو بەدڵ عیبادەتی خودا بکەنو پێش هاتنی موعجیزەکان ئەوانە لەسەر بڕوای پووچی خۆیان بوون لێی پاشگەز نەبوونەوە، بەڵگەو موعجیزەکان کاریان تێ نەکردن.

یان مانای ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِنْ قَبْلُ﴾بەم جۆرەیە: ئەو گرۆهانە لەوانە نەبوون ئیمان بێنن، تا تەمەنیان تەواو بوو بەکافری مردن، بەهۆی ئەو هەڵوێستەی کە یەکەم جار لەکاتی هاتنی پێغەمبەر بۆ سەریان نواندیان کە بریتی بوو، لەوە پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستەوەو بڕوایان پێ نەکرد، لەسەر ئەو

کـوفرەی پێـشوویان بـەردەوام بـوون تـامردن! وێـڕای پەنـدو ئامۆژگـاری پێغەمبـەرەکانیان کـە بـەردەوام خـەریکیان بـوون نەصـیحەتیان دەکـردنو موعجیزەیان نیشان دەدان بەڵگەیان بۆ دەهێنانەوە ئەوان لەبیروباوەڕی پڕوپووچی خۆیان پاشگەز نەبوونەوە پێیان لەکەللەی شەیتان نەهێنایە خواری!!!

ئەمـە دەسـتوورو بـاوی سەرپێـچی کـارانو حـەق بەدرۆزانانـە، ئەوانـەی پێغەمبـەران بـەدرۆ دەخەنـەوە بەملهوڕیو بەئەنقەسـت یـان بەلاسایی کردنـەوەو شوێنکەوتنی کوێرانـە! ئەوانـە یـان ئینکـارو سـەرڕەقو گـومڕان، دەزانـن پـەیامی پێغەمبەرەکـە حەقـەو بەئەنقەسـت بـڕوای پێناکـەن، یـان شـوێنکەوتوو لاسـایی کەرەوەن، لەشت ورد نابنەوەو ژیرانە بیرناکەنەوە. ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّـهُ عَلَى قُلُوبِ الْكَافِرِينَ﴾ هەر بەو شێوەی کە خودا دەرگای دڵی کافرەکانی گەلە پێشینەکانی مـۆر کردوە، دڵی هەموو کافرێك کە خودا لەعیلمی خۆی دا بەکافری داناوەو دەزانـێ کـە هـەرگیز ئیمـان نـاهێنی مـۆر دەکـاو هـیچ نەصیحەتو ئامۆژگارییـەك وەرنـاگرنو لێکۆڵینەوەو باسکردن لەگەڵیان بێ سودەو چی لێ شین نابێ! ئەوانـە وەکوو پارچـە دراوێـك وان کـە لـەکاتی توانـەوە لەبۆتـەی خـۆی دا نوسـراوێکی تایبـەتی خـۆی لێ دراوەو ئیتر لەوەبەولاوە ئەو نوسراوە ناسڕێتەوەو قبوڵی هەڵوەشانەوە ناکا!!

ئایەتەکـە دڵدانـەوەی پێغەمبـەری تێدایـەو هەڵنانـە بـۆ ئـەوەی کـە لەسـەر بانگەوازی خۆی بەردەوامبێ،، هەواڵی ئەوەی پێرادەگەیەنێ: کە سەر ڕەقـیو یـاخی بوونی ئەهلی مەککە شـتێکی تازەبابـەت نیـەو نمونـەیان لەمێـژووی گـەلو نەتـەوە پێشینەکان دا زۆرو زەبەندەیە. کەوابێ ئەی موحەممەد! بەسوربونیان لەسـەرکوفر دڵ گران مەبەو خەفەتی پێ مەخۆ! تۆ پەیامی خۆت بگەیەنەو ئەرکی سـەر شانت ئەنجام بدە، چونکە تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو بەس!

﴿وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ﴾ ئێمـە لەزوربـەی زۆری ئـەو گـەلو نەتەوانـە نەمان بینی وەفا بەعەهدو پەیمانی خۆیان بکەن، جا ئەو عەهـدو پەیمانـە عەهـدو پـەیمانی فـیترەت بـێ، ئـەو عەهـدو پەیمانـەی کـە لەپـشتی بـاوە ئادەمیـان دا لێـی وەرگرتـوون، یـان ئـەو عەهـدەی کـە خـودا سروشـتی ئـادەمیزادی وا داڕشـتووە: کـە هەست بەدەسەڵاتێکی نهێنی بکەن کە لەزوور هـەموو دەسـەڵاتەکانەوەیە، هـەروەها

هەستی ئەوەی تێدا خولقاندوە: کە شتی باش هەڵبژێرن‌و خۆ لە خراپە بپارێزن، حەزیان لەشتی کامڵ‌وتەواوبی‌و کەموکوڕییان پێناخۆش بێ....

وێ دەچێ ئەو عەهدە عەهدی ئیمانهێنانی پێشینانیان بێ کە ئیمانیان بەپێغەمبەرەکەیان هێنا، دوای ئەوان چین‌و وەچەکان وردە وردە لەو رێبازە لایانداو پاشگەز بوونەوە، تاوایان لێ هات لەعەهدی ئیمان دەرچوون‌و گەڕانەوە سەر دابو نەریتی جاهیلیەت!

﴿وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ﴾ بێگومان ئێمە زوربەی ئەوانەمان بەسنور بەزێن‌و دەرچوو لەعەهدو پەیمانی سروشتی‌و شەرعی‌و عورفی دەست کەوت، ئەوانە پەیمان شکێن‌و سنووربەزێن‌و تاوانبارن!

کە لەئایەتەکە دا وشەی ﴿أَكْثَرَ﴾ واتە: زۆرینەی بەکار هێنا، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە برێك لەو گەل‌و نەتەوانە ئیمانیان هێناوەو هەموو عەهدو پەیمانێکیان لەگەڵ خوداو بەندەکانی خودا دا جێ بەجێ کردوە.

پێچەوانە جوڵانەوەی عەهدو پەیمانی فیترەتی راستو دروست کە لەسەر دانان بەیەکتاپەرستی سەرچاوەی گرتبێ هەروەها پەرستنی غەیری پەروەردگار بەبێ بەڵگەو دەلیل هەردوکیان بەهۆی کاریگەری بیئەو دەوروبەر دێنەکایەوە.

ئیمامی موسلیم حەدیثێك ریوایەت دەکا، کە دەفەرموێت: (يقول الله تعالى: اني خلقت عبادي حنفاء، فجاءتهم عن دينهم، وحرمت عليهم ما أحللت لهم) پەروەردگار دەفەرموێ: من بەندەکانم بەخواناس دروست کردون، هەموویان بەسروشت خوداناسن، شەیاتینی پەلاماریان دانو لەئایینی سروشتی خۆیان لایان دان، ئەو شتانەی بۆم بەحەڵاڵ دانابوون ئەوان لێیان حەرام کردن!

لە(صەحیحەین)یش هاتووە دەفەرموێ: (كل مولود يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه، أو ينصرانه، أو يمجسانه) واتە: هەموو کەسێك لەسەر فیطرەتی خودا ناسی لەدایك دەبێ باوك‌و دایکی دەیکەنە جولەکە، یان مەسیحی، یان ئاگرپەرست یان ........هتد

پێغەمبەرانیش هەموویان هەر لەیەکەم پێغەمبەرەوە تا پێغەمبەری ئاخر زەمان ﷺ هەموویان جڵەوگیرییان لەدژایەتیکردنی فیطرەتی سەلیم کردوە،

جلەوگیرییان لەهاوەڵدانان بۆ خودا كردوە، وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾الأنبياء/٢٥ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ - النحل/٣٦﴾.

## چیرۆكی حەزرەتی مووسا لەگەڵ فیرعەنو پیاو ماقوڵانی تاقمی فیرعەون

﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَظَلَمُواْ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓاْ إِنَّ

لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾

ئەمە شەشەمین چیرۆکە لەچیرۆکی پێغەمبەران کە لەم سورەتە دا باس کراون، ئەم چیرۆکە گەلێك رونکردنەوەو شیکردنەوەی تێدان کە لەچیرۆکەکانی تر دا نین، چونکە موعجیزەی حەزرەتی موسا لەهی پێغەمبەرەکانی تر گەورەترن، سەررەقیو نەفامی نەتەوەی فیرعەون کە مووسایان بۆ سەر نێردرابوو، زۆر لەهی نەتەوەکانی دیکە زیاتر بوو، لەلایەکی ترەوە حەزرەتی مووسا نێردراو بوو بۆ سەر گەلی خۆیو غەیری گەلی خۆیشی، بەلاَم پێغەمبەرەکانی پێشوو تەنیا بۆ گەلو نەتەوەی خۆیان نێردرا بوون! حەزرەتی مووسا لەقورئان دا زیاتر لەسەدوسی جار ناوی هاتووە، چیرۆكو بەسەرهاتی سەیرو سەمەرەی بەسەر هاتوە! هەر لەرۆژی لەدایکبونیەوە تارۆژی لەدونیا دەرچونی ژیانی پرە لەروداوی سەرسوڕهێنەر!

ئەو سەردەمەی ئەو لەسکی دایکی دا بوو دارو دەستەی فیرعەون مندالَی نێرینەی بەنوئیسرائیلیان دەکوشتنو مێینەکانیان دەهێشتنەوە، کە مووسا لەدایك بوو، دایکی بەئیلهامی خودا خستیە صندوقێکەوەو دەم روباری نیلی دا، پاشان خودا مووسای گەڕاندەوە بۆلای دایکی بۆئەوەی شیری پێبدا!! هەروەها وەکوو دەرچونی لەمیسرو رۆیشتنی بۆ ولاَتی مەدیەن لەکاتی گەنجی دا، ئەوەش لەئاکامی کوژرانی پیاوێکی میسری بەدەستی ئەو، کە ویستی یارمەتی کابرایەکی عیبری بدا کە هانای بۆ هێنا، ئەم بەسەرهاتە لەسورەتی(القصص/٢٢-٢٥)و سورەتی(طە/٤٠) باس کراوە. ئەمجار ئاودانی ئاژەڵەکانی کچەکانی حەزرەتی شوعەیب، ئەمەش لەسورەتی القصص/٢٢-٢٥ دا باسکراوە ئەمجار زاوا بەندییەتی بۆ حەزرەتی شوعەیبو رێك کەوتنی لەگەڵیدا.. القصص/٢٦-٣٨. طە/٤١ ئەمجار دەساڵ شوانی کردنی بۆ

حەزرەتی شوعەیب لەجیاتی مارەیی کچەکەی. پاشان لەکاتێك دا کە دەچوو ئاگر بێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەی دا خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە کرا بەپێغەمبەرونیگای بۆ هات. ئەم چیرۆکە لەم شوێنانە دا باس کراوە: سورەتی الأسرا/٢-٣. طه/٩-١٦و١٧-٣٦و ٤٢-٤٧. القصص/٤٥-٤٦و ٢٩-٣٥. الفرقان/٣٥-٣٦. الشعراء/١٢-١٦. النحل٧-١٢. السجدة/٢٣-٢٥. النازعات/١٥-١٩.

ئەمجار گەڕانەوەی بۆ میصر لەگەڵ هارونی برای داو بانگەوازی کردنی فیرعەون بۆ ئیمانهێنان بەپەیامەکەی ئەمەش لەسورەتی-الأعراف/١٠٤-١٠٥،سورەتی الشعراء/١٧-٢٢. باس کراوە.

ئەمجار گفتوگۆ کردنی لەگەڵ فیرعەون دا دەربارەی پەروەردگاریەتی خودای مەزنو، نیشاندانی موعجیزەی بەهێزو ئاشکرا لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی. سورە طه/٥٥ سورەتی الشعراء/٢٤-٢٨ هەروا هەڵوێستی فیرعەونی ملهوڕو خۆ بەخودا زان لەئاستی پەروەردگارێتی خودای مەزندا، هەروا فەرمانکردنی فیرعەون کە هامانی وەزیری باڵەخانەیەکی بەرزی بۆ دروست بکا، پێی دا سەربکەوێ بۆ ئاسمانو خودای مووسا ببینێ!!! سورەتی القصص/٣٨ سورەتی غافر/٣٦-٣٧ بەدەرخستنی موعجیزەی گۆچانو دەستی موبارەکی لەبەرچاوی فیرعەون. لەسورەتی الأعراف/١٠٦-١٢٦. یونس/٧٥-٨٩. طه/٥٧-٧٦. الشعراء/٢٩-٥٢. هەڵوێستی فیرعەون بەرامبەر ئەم موعجیزاتەو بەردەوامبوونی لەسەر ملهوڕیو لوتبەرزی خۆی الأعراف/١٠٧-١٢٩. غافر/٢٣-٢٧.

رێکخستنی پیلان لەلایەن دارو دەستەی فیرعەونەوە بۆ لەناوبردنی مووساو داکۆکی کردنی موسوڵمانێك لەموسا. سورەتی غافر/٢٨-٣٥و ٣٨-٤٦. گاڵتەپێکردنی فیرعەون بەموسا. سورەتی الزخرف/٥١-٥٤. النازعات/٢٢-٢٦.

ئەمجار هەندێ نیشانەو موعجیزە کە بوونە عەزاب بۆ فیرعەونو دارودەستەکەی: کە بریتی بوو لەگرانی، کەمبونی ماڵو دارایی، کەم بوونەوەی گەراو رەچەڵەکیان، کەمبوونی بەروبووم، هەڵقوڵانی ئاو، کوللە، ئەسپێ، بۆق، خوێن.

باسی ئەم موعجیزەو نیشانانە لەسورەتی: الأعراف/١٣٠-١٣٥. الأسراء/١٠١-١٠٢. طه/٥٩. النحل/١٣-١٤. القصص/٣٦-٣٧. الزخرف/٤٦-٥٠. القمر/٤١-٤٢. النازعات/٢٠-٢١. ئیتر بەو شێوە زنجیرەی بەرەنگاریکردنی فیرعەون یەك بەدوایەك دا دەست پێدەکەن، هەر لەزنجیرەی بەرەنگاریکردنی فیرعەونو دارودەستەکەی بۆ پێغەمبەرایەتی مووساو ساحیرەکان، زاڵبوونی حەق بەسەر بەتاڵدا، ئیمانهێنانی سیحربازەکان بەپەروەردگاری بونەوەرو، هەڕەشەکردنی فیرعەون لێیانو، سووربوونی باوەڕهێنەرەکان لەسەر عەقیدەی خودا پەرستیو، وازهێنان لەبیروباوەڕی فیرعەون خودایی!!!

ئەمجار چەوساندنەوەی بەنوئیسرائیلییەکانو نازڵبونی سزای جۆراو جۆر بۆ سەر فیرعەونو دارو دەستەکەی بەگرانیو کەمبوونی بەروبووم، ئەمجار هەڵقوڵانی ئاو لەژێریان کوللە بارینو ئەسپێ بارینو پەیدابوونی بۆقو خوێناوی بوونی شتومەکیان، لەهەموو جارێکیش دا هاواریان بۆ حەزرەتی مووسا دەهێنا: کە بۆیان لەخودا بپاڕێتەوە ئەو سزایەیان لەسەر هەڵبگرێ. کە سزاکەیان لەسەر لادەچوو دەگەڕانەوە بۆ سەر حاڵەتی پێشوویان لەخودا یاخی دەبوونەوە، ئەمجار ئەوەیان ڕاگەیاند کە بەهیچ شێوەیەك ئیمان ناهێنن، تا لەسەرەنجام دا فەرمانی خودایان لەسەر چەسپاو هەموویان لەئاوی دەریا دا خنکان، بەهۆی بەدرۆخستنەوەیان بۆ ئایاتی خوداو، بێ ئاگاییان لەحیکمەتی تاقیکردنەوەیان بەجۆرەها خۆشیو ناخۆشی: پێش لەناوبردنیان.

ئەمجار جێگیر کردنی نەتەوەی مووسا لەشوێن دارو دەستەی فیرعەون لەپاساوی خۆڕاگرییان لەسەر بەڵاو تەنگو چەڵەمەی کە تووشیان هات لەسەر خودا پەرستی، تێپەڕبوونیان لەو ڕۆژگارو دەردە سەرییە.

دەی با بزانین قورئانی پیرۆز لێرە دا چۆن ئەم چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو چۆن نمایشی دەکات. دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ مُوسَى بِآيَاتِنَا إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَظَلَمُوا بِهَا﴾ واتە: ئەمجار پاش ناردنی ئەو پێغەمبەرانەی کە لەوە پێش باس کران (موسا)مان کردە پێغەمبەرو بەبەڵگەو موعجیزەی ڕاستو دروستەوە ناردمان بۆ سەر فیرعەونو دارودەستەکەی، بەڵام ئەوان بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەهاتنو

ئینكاریان كردو، بڕوایان بەپەیامەكەی مووسا نەكرد، ستەمیان لەخۆیان كرد، ستەمیان لەپەیامەكە كردو مافی شیاوی خۆیان نەدایە، بەڵكوو ستەمیان لەهەموو مسكێنو بۆرەپیاوەكانی ژێر دەسەلاتی خۆیان كرد، چونكە فیرعەونو داروەستەكەی ئیمانیان بهێنایە هەموو میسرییەكان ئیمانیان دەهێنا،

﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ ئەی موحەممەد! سەیر بكەو بڕوانە ئاكامو سەرەنجامی ئاشوبگێڕانو فیتنە جۆیان لەسەر زەوی چۆن بوو؟ چییان لێ هات؟؟ ئەوانەی خەڵكیان لەڕێگای خودا مەنع كردو نەیانهێشت موسوڵمان ببن، پێغەمبەری خودایان بەدرۆ خستەوە!!

ئەی موحەممەد! سەرنج بدە چیمان پێكردن! چۆن لەناومان بردن، لەبەر چاوی مووساو نەتەوەكەی چۆن ئەو ستەمكارانەمان لەئاوی دەریا دا خنكاندن؟! بۆ ئەوەی سزاكە لەسەر فیرعەونو داروەستەكەی بەئێش تربێ، هەروەها بۆ ئەوەی مووساو بڕواداران‌و شوێنكەوتوانی زیاتر دڵیان ئارام بگرێ‌و برینی دڵیان ساڕێژ ببن: بەوە كە بینییان دوژمنی سەرسەختیان ئاوا لەناوچوو!

ئەمجار پاش ئەم سەرنج ڕاكێشانە، دوای ئەم ئاگادار كردنەوەو بەتەماكردنە، پەروەردگار چیرۆكەكە لەسەرەتاوە تا كۆتایی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ، حَقِيقٌ عَلَى أَنْ لا أَقُولَ عَلَى اللَّهِ إِلاَّ الْحَقَّ﴾ واتە: حەزرەتی مووسا ﷺ پەیامی خۆی بەفیرعەون گەیاندو وتی: ئەی فیرعەون! من رەوانەكراوم بۆ سەر ئێوە لەلایەن پەروەردگاری بونەوەرەوە، لەلایەن خودای هەموو كەسەوە، لەلایەن بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری هەموو كاروبارێكی بونەوەرەوە. ئەوەی لەسەر من پێویستەو نابێ لێی لابدەم، ئەوەیە: كە دەربارەی پەروەردگار نابێ جگە لەحەقو راستی هیچ شتێكی تر بڵێم: نابێ بەدەم خوداوە درۆ هەڵبەستم، چی حەقەو چی راستە دەبێ ئەوە بڵێم: حەزرەتی مووسا بەم وتەیەی بیروباوەڕی یەكتاپەرستی‌و عەقیدەو باوەڕی پێغەمبەرایەتی راگەیاندو بەگوێی فیرعەونو خەڵكەكەی دادا، كە ئەو پێغەمبەرە، پێغەمبەرایەتیەك كە خودا بەرەخساندنی موعجیزە پاڵپشتی لێدەكاو پێویستە بەشێوەیەكی راستو رەوان لەلایەن پێغەمبەرەكەوە ئەنجام بدرێ!

ئـــەمجار حـــەزرەتی مووســـا باســـی مـــوعجیزەو بەڵگـــەی راســـتی پێغەمبەرایەتیەکەی دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَدْ جِئْتُكُمْ بِبَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئـەمن هـاتووم بـۆ سـەر ئێـوە بەصیفەتی پێغەمبـەریو بەڵگەی بـەهێزم پێیە لەلایەن پـەروەردگاری ئێـوەوە لەسـەر راسـتی پەیامەکەمو راسـتی ئـەوەی کـە پێتـانی دەڵێم. کەواتـە: ئـەی فیرعـەون ﴿فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ هیـچی تـر نەتـەوەی بـەنی ئیـسرائیل مەچەوسـێنەوەو بەنـدیان مەکـەو مەیانکـەرە کۆیلـەو ژێردەسـتە، وازیـان لێ بێنـە باڵەگـەڵ خـۆم دا بیانبەمـەوە بـۆ خـاکی پـیرۆز بـۆ فەلەستین کە زێدو نیشتمانی خۆیانەو شوێنی لـەدایك بـوونی بـاوکو باپیرانـە، بـۆ ئـەوەی لێ بـبڕێن بـۆ خـودا پەرسـتیو بەندایـەتی کردنـی خـودای منیشو ئێـوەش، چونکە ئەم گەلـە، نەتـەوەو وەچەی پێغەمبـەرێکی بـەرێزن کـە: (یـەعقوبی کـوڕی ئیـسحاقی کـوڕی حـەزرەتی ئیـبراهیم). کـە بـە (خلیـل الـرحمن) بەناوبانگـە ئـەوەش وەکوو لەمێـژوو دا هـاتوە: کاتێ حـەزرەتی یوسـف لەدونیا دەرچـوو کـوڕو کـوڕەزاو کچەکانی لەدونیا دەرچوون، فیرعەون بەسەر نەتەوەی بـەنو ئیـسرائیل دا زاڵ بـوو، کردنی بەبەندەو کۆیلەی خـۆی، تـا لـەناکاما پـەروەردگار لەسـەر دەسـتی حـەزرەتی مووسا لەچنگی فیرعەون رزگاری کردن. نێوان ئـەو رۆژەی حـەزرەتی یوسـف چـووە میسرو ئەو رۆژەی حەزرەتی مووسا هاتە ناوی چوار سەد ساڵ بووە.

فیرعەون لەوەڵامی حەزرەتی مووسا دا ﴿قَالَ إِنْ كُنْتَ جِئْتَ بِآيَةٍ فَأْتِ بِهَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ وتی: ئەگەر ئەتۆ بەنیشانەو موعجیزەوە هاتوویو لەلایەن ئەو کەسەی کە تـۆی نـاردوە بەڵگەی بـەهێزت هێنـاوە وەکـوو دەڵێـی: دەموعجیزەکانـت بنوێنەو نیشانم بدە: بزانم چینو چۆنن؟ ئەگـەر تـۆ راسـتگۆیو لـەپێری راسـتانیو حەق بێژی!!

حەزرەتی مووسا دەست بـەجێ بەکردەوە وەڵامی دانەوە نـەك بەقـسە ﴿فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُبِينٌ﴾ عەصاکەی (گۆچانەکەی) کەبەدەسـتی راسـتیەوە بـوو لەبـــەردەم فیرعـــەون دا هاویـــشتییە ســـەر زەوی ئـــیتر خێـــرا لـــەنکاوێك بـــوو بەنێرینەمارێکی زەبـەللاحو بەئاشـکرا هـەموو خەڵکەکـە بەچاوی خۆیـان بینییـان دەجوڵایــەوە لەگۆڕەپانەکـە دا دەهـاتو دەچـوو وەکـوو ئەژدیهایـەکی راسـتی لـەم

شوێنەوە دەکشا بۆ شوێنێکی تر.

﴿وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ﴾ ئەمجار دەستی خستە باخەڵیەوەو دەری هێنایەوە سپی بوبوو بەجۆرێکی وا دەدرەوشایەوەو چاوی بینەرانی لەبەرهەڵئەدەهات، لەبەر ورشەو بریسکانەوەی دەتگوت: خۆرەو روناکی لێ هەڵدەقوڵێ، بەبێ ئەوەی سپی بوونەکەی لەبەر نەخۆشیو بەڵەکی بوبێ! وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێت: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاء مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾النمل/۱۲.

شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو، روداوێکی گۆزو گومەمەت بوو؛ گۆچان بوو بەئەژدیهایەکی راستیو گومان لە(مار)ێتی دا نەبوو، لەلایەکی ترەوە، دەستی گەنم رەنگی دەخاتە باخەڵیەوەو دەری دەهێنێتەوە، وەکوو خۆر دەدرەوشایەوە، بەبێ ئەوەی هۆی سپی بوونەکەی نەخۆشی بەڵەکی بووبێ، کە دەستی دەخستەوە باخەڵیەوەو دەری دەهێنایەوە وەکوو جاری پێشوو دەچوەوە سەر حاڵی گەنم رەنگیو وەکوو خۆی لێ دەهاتەوە!

بەلآم ئایا فیرعەونو دارودەستەکەی تەسلیم بوونو ملکەچی خۆیان راگەیاند، دانیان بەپەروەردگارێتی خودا دانا؟؟ دیارە فیرعەون شتی وا ناکا، چونکە ئەم ملهورە خۆی بەخودا دەزانێ، ئەگەر ئیعتراف بەپەروەردگاریەتی خودا بکا، تاجو کورسیو فەرمانرەوایی نامێنێ، دارو دەستەکەی پلەوپایەیان لەکیس دەچێ!

ئەگەر بانگەوازی حەزرەتی مووسا بێتەجێو زاتی (الله) بە پەروەردگاری بوونەوەر بناسرێو فەرمانڕەواییو حاکمییەت تەنها بۆ خودا بێ!! ئەدی فیرعەونی ملهوڕی خۆ بەخودازان بۆ کوێ دەچێ؟ بۆیە وێڕای ئەو موعجیزە گەورەو ئاشکرایانەی حەزرەتی مووسا، فیرعەونو داروەستەکەی هیچ سەرخۆیان نەهێناو موعجیزەکان کاریان تێ نەکردن. بەڵکوو ﴿قَالَ الْمَلأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ﴾ دارودەستەی فیرعەونو هەوادارانی وتیان: ئەم کابرایە سیحربازێکی شارەزاو لێزانە، هەموو جۆرە سیحرێك دەزانیو خەتەرە لەسەر ئێمە، بەهۆی ئەم سیحرو جادوگەریەوە خەڵك هەڵدەگەڕێتەوە لێمانو لەئاکاما ﴿يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَكُمْ مِنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ دەیەوێ بەهۆی ئەم سیحربازییەوە بەسەرمان دا زاڵ ببیو

دەسەلأتو فرمانڕەواییمان لێ داگیر بکاو لەخاکو زێدی خۆمان وەدەرمان دەنێ!!! فەرمانتان بەچیەو چی بکەین باشە؟؟ هەموو ئەم قسانەی فیرعەونو داروەستەکەی بەئاشکرا لەشوێنی تری قورئان دا تۆمار کراون. ئەوەتا رووبەڕووی مووساو هارون ﴿قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاء فِي الأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ﴾يونس/٧٨، ئەمەش رەنگدانەوەی قسەکانی فیرعەونە کە خودا لەسەر زوبانی ئەو دەفەرموێ: ﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ، يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾الشعراء/٣٤-٣٥، ئیتر هەر ئەم قسانەی فیرعەون بوون داروەستەکەی دەیانجوونەوەو ئەمیان بۆ ئەوی تریانی دەگێڕایەوە، چونکە دابو نەریتی ئادەمیزاد وایە قسەو ئاخاوتنی پاشاو سەرۆکەکانیان بۆ یەکتر بگێڕنەوەو بلأوی بکەنەوەو بەیەکتری رابگەیەنن!

ئەمجار دوای ئەوەی پیاوەکانی فیرعەون گفتوگۆی نێوان خۆیانیان تەواو کردو قسەی فیرعەونیان بەلاوە راست بوو، بۆچوونەکەی ئەویان چووە دڵەوە، کەوتنە راو تەگبیر لەناو خۆیاندا، چی بکەن باشە! چۆن پیلانی کوژاندنەوەی چرای بانگەوازی حەزرەتی مووسا دابڕێژن؟! بەترسەوە دەیانڕوانییە بانگەوازیەکەی‌و دەترسان خەڵکی لێ کۆببێتەوەو بانگەوازییەکەی پەرەبستێنێ! هەموو قسەیان هاتە سەر ئەم بڕیارەی کە پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿قَالُوا أَرْجِهِ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ﴾ داروەستەکەی بەفیرعەونیان گوت: جارێ بڕیاری خۆت دەربارەی مووساو براکەی دوا بخە، بنێرە بۆ شارو ولأتەکانی ژێر دەستت یا کاربەدەستو پۆلیسو یاساوڵەکانیان هەوڵ بدەن چی سیحربازو جادوگەر هەیە، کۆیان بکەنەوە بیانهێنن بۆ ئێرە. چونکە لەو رۆژگارە دا دیاردەی سیحربازی‌و جادوگەری باوبوو، لەهەموو شارێك کۆمەڵێك سیحرباز هەبوون، واشیان دەزانی کە موعجیزەکانی مووسا لەجۆری سیحرو جادو بازی ئەو ساحیرانەیە، بۆیە لەهەموو لایەکەوە بەتواناترین سیحربازیان بۆ کۆکردنەوە، بۆ ئەوەی بەربەرچی مووسا بدەنەوە! وەکوو پەروەردگار لەسەر زوبانی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَا مُوسَى! فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِ فَاجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِداً لَّا نُخْلِفُهُ نَحْنُ وَلَا أَنتَ مَكَاناً سُوًى، قَالَ

مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى، فَتَوَلَّى فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُ ثُمَّ أَتَى﴾ طه/٥٧-٦٠. بەفیرعەونیان وت: قوربان! ئەگەر بەرێزتان یاساوڵەکانت بنێری بۆ شارەکان ﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ﴾ هەرچی سیحربازی لێزانو لێهاتوو هەیە لەوڵات دا کۆیان دەکەنەوەو، دەیانهێنن بۆ ئێرەو، بەئاسانی بەربەرچی مووسا دەدەنەوەو، راستی ئەوەی مووسا هێناویەتی ئاشکرای دەکەنو ئیتر کەسی پێ هەڵناخەڵەتێ!!

سیحر بریتییە لەکرداری ناوازەو سەرسوڕهێنەرو فرتوفێڵ، کە حەقیقەتو راستی ئەو کردارانە لەجەماوەرەکە هون دەکرێ، چونکە هۆیەکانی نازانن.

سیحرو جادوبازی فەننێك بووە، لەو فەننانەی کە لەرۆژگاری کۆندا، میسرییەکان لەتەك زانستی تری گەردونناسی لەقوتابخانەو فێرگەکانیان دا دەیانخوێندنو، فێری دەبوون، بابلیەکانو هیندییەکانیش چاویان لێ کردنو، گرنگیان بەفێربوونو کارپێکردنی سیحر دەدا. تەنانەت تا ئێستاش هیندییە بتپەرستەکان سیحری وا دەکەن مرۆڤ سەری لێ سوڕدەمێنێ.

برێ لەلێکۆڵەرەوە ئینگلیزەکان گرنگیان بەتوێژینەوە دەربارەی سیحرداوەو، ویستوویانە حەقیقەتی سیحر بزانن و رونی بکەنەوە، پەیان بەهۆکاری هەندێك سیحر بردو، بۆ زانینی هۆکاری زوربەی زۆریشیان دەستەوەسانو کۆڵەوار مانەوە!

سیحربازیی بەزۆری لەناو کۆمەڵگای نەخوێندەوارو نەفام دا گەشە دەکاو، پەرەدەسێنێ، پێیان وایە شتێکی حەقو راستە. وەلێ لەناو کۆمەڵگاو ولاتانی پێشکەوتو دا ئەو گرنگییەی پێ نادرێو، بەخەیاڵو فرتوفێڵو چاوبەستەکێ حلێب دەکەن .

## سیحر سێ جۆری هەیە:

١- بەهۆی بەکارهێنانی هۆکاری سروشتییەوە کە لەلای سیحربازەکەوە ئاشکرایەو خەڵکانی تر پێی نازانن، وەکوو ئەوە کە دەڵێن: سیحربازەکانی فیرعەون جیوەیان کردبوە ناو گۆچانو حەبلو گوریسەکانیانەوە، بۆیە کە دەیانهاویشتن دەجولانەوە..!

ئەگەر لەرۆژگاری ئێمە دا زانا شارەزاکانی زانستی سروشتی ناسو کیمیاگەرو تەکنەلۆجیا ئیدیعای سیحرو جادوبازییان بکردایە بەتایبەتی لەولاتە دواکەوتوەکان

دا کە سیحر باوی هەیە لەناویاندا، شتی وا سەیروسەمەرەیان دەخستە روو نیشانی خەڵکیان دەدا، ئەگەر لافی خودایەتیو پێغەمبەرایەتیان لێ بدایە، خەڵکەکە باوەریان پێ دەکردنو گەردنکەچیان دەبوون.

٢- سیحربازییەك کە بەهۆی دەست سوکیو شاردنەوەی هەندێ شتی تر ئەنجام دەدرێ! کابرای ساحیر هەندێ شت نیشانی بینەرانی دەداو هەندێ شت هون دەکاو هەندێکیان لەسەر غەیری رەنگو شێوازی خۆیان دەردەخاو چاوبەستەکێ لەبینەران دەکات!

٣- سیحربازی وا هەیە: ئەنجامدانەکەی بەهۆی کاریگەری نەفسی ئیرادە بەهێز لەنەفسی زەعیفو زەبوون کە ئامادەباشی ئەوەی تێدایە قبووڵی ئەوهامو خەیاڵاتی پرو پوچ بکاو کاری تێ بکرێ، زانایانی دەروونناسی بەم جۆرە نەفسە زەبوونانە دەڵێن (نەفسی هەستیری).

بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە سیحرە، سیحربازەکان پەنادەبەنە بەر گیانی شەیاتینیو جندۆکە، هەیانە نوشتەی رەشو ویفقو تەلەسم دەنووسنو بۆ خۆشەویستی یان بۆ بوغضاندن لەنێوان ئەمو ئەو دا چل دانەو فاڵ دەگرنەوە، نووشتە دەنوسن!.......هتد

ئەوەی ئەمرۆ بەناوی زانستەوە دایانهێناوەو پێی دەڵێن: خەولێخستنی موگناتیزی جۆرێکە لەم بەشەی سیحرو فڕی بەسەر زانستەوە نیە! [١]

جیاوازی نێوان سیحرو موعجیزە ئەوەیە: موعجیزە حەقیقەتێکە لەسەر دەستی کەسێك پەیدا دەبێ کە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکاو خودا پشتیوانی لێ دەکاو زوربەی کات لەئاکامی تەحەداکردنی کافرو سەرپێچیکارانەوە لەسەر دەستی پێغەمبەر پەیدا دەبێ.

بەلاّم سیحر دیاردەیەکی خەیاڵییەو حەقیقەتێکی عیلمی نیەو لەسەر دەستی مرۆڤێکی فاسق پەیدا دەبێ.

ئیمامی ئەبو بەکری رازی ناسراو بە (الجصاص) دەفەرموێ: ئەوانەی پێیان وایە کە پێغەمبەر ﷺ سیحری لێ کراوەو سیحرەکە کاری تێ کردوە بەجۆرێك کە

---

[١] تەفسیری مەنار ج٩/٥٦-٥٧ تەفسیری مونیر ج٩/٤٣ تەفسیری مەراغی بەرگی سێهەم ج٩/٢٦-٢٧.

فەرمویـەتی: (انه يخيـل الـي انـی أقـول الـشيء وافعلـه، ولم أقلـه ولم أفعلـه) واتـە: وام لێهاتووە پێم وایە شتێکم گوتووە شتێکم کـردووە کەچی لەراستی دا نەگوتوومـەو نەکردومـە. هـەروەها دەڵێن: ئـافرەتێکی جولەکـە سـیحری لێ کـردوە لـەتوێکڵی دار خورماو شانەو ئەو موانەی کە لەکاتی سەربەشانە کردن دا بەدانی شـانەکەوە دێـن. شـانەو موەکـان خراونـە نـاو توێکڵەکـەوە ئـەمجار جیبریـل هـاتووەو پێـی گوتـوە کەسیحری لێ کراوەو سیحرەکە لەژێر ئەو بەردەدایە کە ئـەو کەسـەی ئـاو لەبیرەکـە هەڵدێنجێ لەسەری دەوەستێ، ئیتر چـوون لـەژێر بەردەکـە سـیحرەکەیان دەرهێنـاو دیاردە نەخۆشییەکە لەسەر پێغەمبەر ﷺ لاچوو.

ئیمـامی ئـەبو بـەکر دەفـەرموێ: ئەمـە شـتێکی بـێ بناغەیـەو لەراسـتییەوە دوورە، ئـەم جـۆرە چـیرۆکانە لەلایـەن مولحیـدو خوانەناسـانەوە دروسـت کـراوەو دەیانەوێ پلەو پایەی پێغەمبەران بکەنـە گاڵتـەوموعجیزەی پێغەمبـەرانﷺ بـەتاڵ بکەنـەوە، دەیانـەوێ ئـەوە بخەنـە دڵـی خەڵکەوە کـە جیـاوازی لـەنێوان مـوعجیزەو سیحر دا نیە هەردوکیان یەك جۆرن.

بـەڵێ: بابگەڕێینـەوە بـۆ سـەر تەفـسیری ئایەتـەکانو، چـیتر درێـژە بەباسـی لاوەکی نادەین!

فیرعەون ناردی ساحیرەکان گردبوونـەوەو، هـاتن بـۆ لای فیرعـەونو، لـەبارەی روبەڕوبوونەوەی مووسا وتـو وێژ کرا، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَجَاءَ السَّحَرَةُ فِرْعَـوْنَ﴾ لەهەموو لایەکەوە ساحیرەکان هاتن بۆ دەرباری فیرعەونو، ئەرکی سەر شـانیان پـێ راگەیاندرا، مەبەستی بانگ کردنەکەیان تێ گەیانـدرا، ﴿قَـالُوا﴾ سـاحیرەکان وتیـان: ﴿إِنَّ لَنَـا لأَجْـراً إِنْ كُنَّـا نَحْـنُ الْغَـالِبِينَ؟﴾ ئایـا ئێمـە پاداشمـان دەدرێتـەوە ئەگـەر سەرکەوتینو مووسامان بۆڕدا؟ ﴿قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنْ الْمُقَرَّبِينَ﴾ فیرعەون وتی: بەڵێ: ئێوە پاداشـی گـەورەو بـەنرخ وەردەگـرن لەپاسـاوی ئـەو کـارە گرنگـەتاندا، وێـڕای پاداشی ئەوانەی کە هەمیشە لێم نزیکن لەدەرباری من دا ڕێزدار دەبنو پلەوپایـەی بـەرزتان پـێ دەدرێ، ئێـوە هـەم مـاڵو داراییتـان پـێ دەدرێ هـەم پلەوپایـەی کاربەدەستیو ڕێزداریتان دەدەمێ! بەمەش خۆشبەختی دونیاتان دەست دەکەوێ!

ساحیرەکان بەم وادەو بەڵێنە دڵخۆش بوونو خۆیان بۆ ڕۆژی بەرامبەریکردن

ئامادەکرد، ڕۆژی دیاری کراو هاتو هەموویان لەشوێنی دیاریکراو دا کۆبونـەوەو ڕوبەڕوی حەزرەتی مووسا وەستانو، زۆر بەخۆشیان رادەپەرموو، ئیقەی تـەواویان بەخۆیان هەبوو، لەروانگەی ئەم بڕوا بەخۆبوونەوە ﴿قَالُوا يَا مُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ نَحْنُ الْمُلْقِينَ﴾ وتیان: ئەی مووسا! سەرپشکیە، یان تۆ لـەپێش دا مارەکـەی خۆت بهاوێژەو موعجیزەکەی خۆت بنوێنە، یان ئێمە مارەکانی خۆمان دەهاوێژین!

حەزرەتی مووسا وەڵامێکی زیرەکانەی دانـەوە، ﴿قَالَ أَلْقُوا﴾ فـەرموی: ئێـوە لەیەکەم جار دا گوریسو حەبلـەکانی خۆتـان بهاوێـژن، هەڵبەتـە حـەزرەتی مووسـا بۆیە ئەوەی هەڵبژارد کە خۆی دوا بکەوێ، چونکە ئەو کەسەی دوا دەکەوێ لەکاری ئاوادا بەتـەواوی ئاگاداری هـەوڵو تەقـەللای بەرامبەرەکـەی دەبێو، دەبینـێ چۆن کارەکـــەی ئـــەنجام دەدا، لەهـــەمان کـــات دا حـــەزرەتی مووســـا بـــڕوای تـــەواوی بەموعجیزەکەی خۆی هەبوو دەیزانی سەد دەر سەد بۆڕیان دەدا، بۆیە بەبێ ئەوەی گرنگیان پێ بـدا ﴿قَالَ: أَلْقُوا﴾ فـەرموی: ئێـوە لـەپێش دا گـوریسو حەبلـەکانتان بهاوێژن، ئەوەی دەتانـەوێ بیهاوێـژن، دەیبهاوێـژن! حـەزرەتی مووسا بـەم قسەیەی مەبەستی ئەوە بوو: خەڵکەکـە ئیشەکەیان ببینـیو تێیـان بفکـرنو ساحیرەکانیش ئەو پەڕی هێزو توانای خۆیان بخەنەکار کە ئـەوان کـاری خۆیـان ئـەنجامداو ئـەوەی پێیان بوو خستیانە گەڕو شەعوەزەو فرتوفێڵی خۆیان نواند، ئـەمجار نـۆرەی ئـەوە هات: ئەم موعجیزەی حەقو بەهێزی خۆیبنوێنێ، بۆئەوەی زیاتر کـار لەخەڵکەکـە بکا، ﴿فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾ کە ساحیرەکان گـوریسو حەبلـەکانی خۆیـان هاویـشتو، وەکـوو مـار دەجوولانـەوە، چاوبەسـتەکیان لەخەڵکەکە کرد، بینەران وایـان هاتـە پـێش چاو کەکارەکـەیان حەقیقـەتی هەیـەو شـتێکی راسـتە! تەنانـەت حـەزرەتی مووسـاش وا هاتـە پـێش چـاوی کـە حـەبلو گۆچانەکان بوونە ماری راستیو ترسێکی لەدڵ دا پەیدا بوو، وەکوو لەشوێنێکی تـر دا قورئان لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّـلُ إِلَيْـهِ مِـن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى. فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى، قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِـكَ تَلْقَـفْ مَـا صَنَعُوا إِنَّمَـا صَنَعُوا كَيْـدُ سَـاحِرٍ وَلَـا يُفْلِـحُ السَّاحِرُ حَيْـثُ أَتَـى﴾طـه/٦٦-٦٩، بەراسـتی ئـەوان سـیحری گـەورەیان ئـەنجام دا کاریگـەری

لەبینەران کرد، خەڵکەکەیان سەرسام کرد، بەلاَم حەزرەتی مووسا زۆر زوو ئەو ترسەی کە هەیبوو رەوییەوە ئیقەی تەواوی بەخۆی پەیدا کردو دەیزانی کە موعجیزەکەی موعجیزەی خوداییەو، لەجۆری سیحر نیە. وەکوو پەروەردگار لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَلْقَواْ قَالَ مُوسَى مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ إِنَّ اللّهَ سَيُبْطِلُهُ إِنَّ اللّهَ لاَ يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ. وَيُحِقُّ اللّهُ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ﴾یونس/۸۱-۸۲ واتە: مووسا وتی: ئەوەی ئێوە هێناوتانە سیحرەو خودا پوچی دەکاتەوە، بێگومان خودا کردەوەی موفسیدو ئاشوبگێڕان پەرە پێ نادا و سەریان ناخا، هەر حەق دەچەسپێنێ، با تاوانباران پێیان ناخۆش بێ.

## ئیمانهێنانی ساحیرەکان بەخودای مەزن

﴿ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

ئەمە دیمەنێکی ترە لەدیمەنەکانی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا لەگەڵ فیرعەوندا، موفاجەئەو روداوێکی ترە لەپێش چاوی فیرعەونو داروودەستەکەی، لەپێش چاوی ساحیرو کاهینەکان، لەپێش چاوی جەماوەری بینەرانو لەو گۆڕەپانەی کە ئەو سیحرە گەورەیەی تێدا ئەنجام درا، دیمەنێکە حەقو بەتاڵی تێدا دەردەکەوێو، لێك جیا دەبنەوە، با بزانین قورئانی پیرۆز چۆن ئەمە دیمەنە نیشان دەدات؟!

کە ساحیرەکانی فیرعەون حەبلو گۆچانەکانی خۆیان هاویشتو خەڵکەکەیان

سەرسام کردو، تەنانەت حەزرەتی مووساش ترسێکی لێ نیشت، چونکە سیحرەکەیان شتێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکوو سیحرێکی گەورە بوو؟! بەسە بۆ گەورەیی ئەو سیحرە قورئان بە(سحر عظیم) ناو بردوە، سیحرێك بوو جەماوەرەکەی سەرسام کرد، ترسی خستە دڵیانەوە، بەلام کاری بەتاڵ چەندێك سەرسوڕهێنەر بێ، ئاکامی پوچانەوەیە، بڵقی سەر ئاوەو پایەدار نیە، ئاگری کەڕەگەڵایەو زوو دادەمرکێتەوەو بەردەوام نابێ، ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ پەروەردگار نیگای بۆ مووسا کردو فەرمانی پێکرد، بەهاویشتنی عەصاکەی دەستیو فەرموی: عەصاکەت بهاوێژە! ﴿فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ لەپڕێکا ئەو عەصایە بووە مارەنێرینەیەکی زەبەلاحی وا کە مارە درۆزنەکانی ساحیرەکانی قوتدا، ئەو شتانەی روکەشیان کردبوو، بەحەقو راستیان حلێب کردبوو هەمووی تێکەوە پێچانو قووتی دان.

ئیبنو عەباس دەفەرموێ: عەصاکەی حەزرەتی مووسا بەلای هەر یەکێك لەعەصاو حەبلی ساحیرەکان دا بڕۆیشتایە یەکسەرقووتی دەدان، هەندێك لەراڤەکەرانی قورئان پێیان وایە: ﴿تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ مانای ئەوەیە: یەکە یەکە سیحرەکەیانی ئاشکرا کرد، حەقیقەتی سیحرەکەیانی بۆ بینەران روون کردەوە، چاوبەستەکیو فێڵەکەیانی پوچ کردەوە، ئیتر ساحیرەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەمە شتێکە لەئاسمانەوەیەو سیحرو چاوبەست نیە، بۆیە یەکسەر سیحربازەکان چوونە سوجدەو وتیان ئیمانمان بەخودای بوونەوەر هێناو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی دەبین.

بەڵێ ﴿فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ حەقو راستی چەسپا وەکوو خۆر ئاشکراو نمایان بوو، فێڵو چاوبەستەکی ساحیرەکان پوچایەوەو، کاریگەری نەما، بۆیان دەرکەوت موعجیزەی مووسا لەزوور سیحرەوەیەو، شتێکی خودا کردە!

﴿فَغُلِبُوا هُنَالِكَ وَانقَلَبُوا صَاغِرِينَ﴾ ساحیرەکان بۆڕدران، لەپێش چاوی ئەو جەماوەرە زۆرو بینەرە، سیحربازەکان بەزینو بەزەلیلیو تێشکاوی فیرعەونو قەومەکەی لەمەیدانی روبەروبوونەوە دا خۆیان دزیەوەو پاشەکشەیان کردو بۆڕدرانو هیچیان بەدەستەوە نەما خۆی پێڕانوێنن. بەلام دیمەنی گرنگو روداوی

چاوەڕوان نەکراو بۆ فیرعەونو داردەستەکەی ئەوە بوو، کە ﴿وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ﴾ ساحیرەکان بەسوجدە دا کەوتنو ئیمانیان هێنا، چونکە حەقو راستی، ئەوانی سەرسام کردو هەڵیانان بۆ سوجدە بۆ خودا بردنو ﴿قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ وتیان: بڕوامان هەیەو ئیمانمان بەخودای بونەوەر هێنا، ﴿رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ﴾ خودای مووساو هارون، خودای هەموو شتێك لەدروستکراوان، خودای ئادەمیزادو جندۆکەو شتی تریش.

بەڕاستی ئەو ساحیرانە راستگۆ بوون لەگەڵ نەفسی خۆیان، عاقلانە هەڵسو کەوتیان کرد، سەرپێچییان نەکردو لوتبەرزییان نەنواند، بەڵکوو حەقیقەتیان بۆ دەرکەوت درۆیان لەگەڵ خۆیان نەکرد، بوێرانە دانیان بەحەق داناو ملکەچی واقیع بوون!! وەکوو دەڵێن: فیرعەون لەپێش دەست پێکردنی موبارەزەکەو روبەڕوبونەوەیان لەگەڵ حەزرەتی مووسا، بانگی مامۆستاو ساحیرە گەورەکانی کرد، وتی: چیتان ئامادەکردوە، وتیان سیحرێکمان ئامادە کردوە، ساحیری هەموو دونیای پێ بۆڕ دەدەین، مەگەر کاری ئاسمانو شتێك لەئاسمانەوە بێ ئەوە ئێمە توانای بەرەنگاری ئاسمانمان نیە.

چونکە ساحیرەکان لەزانستی سیحر دا کاراماو لێهاتوو بوون دەست رەنگینو لێزان بوون، بۆیەکە بۆیان دەرکەوت موعجیزەکەی مووسا کارێکی لەتوانا بەدەری ئادەمیزادو شتێکی ئاسمانییە یەکسەر لەحاڵەتی کوفرەوە چوونە ناو نوری ئیمانەوە.

## هەڕەشەی فیرعەون لەساحیرەکانو سوور بونیان لەسەر بڕوا بەخودا

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ

أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾

ئەمەش بەشێکی تره لەچیرۆکی حەزرەتی مووسا لەگەڵ فیرعەون. لێره دا پەروەردگار هەڕەشەی فیرعەون لەساحیروکانو خۆڕاگری ساحیرەکان را دەنوێنێ: کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ آمَنتُمْ بِهِ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ﴾ فیرعەون ئیمانهێنانی ساحیرەکانی زۆر لەسەر شان گران بوو، ئەو کۆمەڵەی کە لەم روبەڕوبونەوەیە دا پشتی پێ بەستبوون لەکیسی چوون، پێی وا بوو ئەوان هەرگیز لەفەرمانی دەرناچن، وەیدەزانی ئەوان کوێرانە ئیطاعەی دەکەن، تەنانەت ئەگەر ئیمانیش بهێنن دەبێ ئەو رێگایان بداو فەرمانیان پێ بکا!!

بۆیە بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەوە ئێوە ئیمانتان هێنا پێش ئەوەی روخصەت لەمن بخوازنو منیش رێگاتان پێ بدەم؟! ﴿إِنَّ هَذَا لَمَكْرٌ مَكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا مِنْهَا أَهْلَهَا﴾ ئەم سیحر کردنەتانو زاڵبونی مووسا بەسەرتان دا لەم رۆژەداو سەرەنجام ئیمانهێنانتان بەموسا نەخشەو پلانێکە لەوە پێش لەسەری رێك کەوتوونو خۆتان پێی رازی بون!! وەکوو لەئایەتێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ﴾طـة/٧١، ئێوە خۆتان ئەم پیلانەتان دارشتووە بۆ ئەوەی بەم سیحرەتان میصریەکان لەم شارە وەدەرنێنو، خۆتان لەگەڵ بەنوئیسرائیلییەکان تیی دا نیشتەجێ بن، ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ!﴾ لەوە بەولاوە دەزانن چیتان لێ دەکەم، دەبینن چ سزاو تۆڵەیەکتان توش دێ لەسەر ئەم پیلانەو چۆن عەزابتان دەدەم!؟!

ئەمجار شێوەی عەزابو سزاکەیان بۆ شی دەکاتەوەو دەڵێ: ﴿لأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلافٍ﴾ سوێند بێ من راستو چەپ دەستو قاچتان دەبڕم، دەستی راستو قاچی چەپتان دەبڕمەوەو بەپێچەوانەشەوە. ﴿ثُمَّ لأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ پاشان

بەدەستو قاچ قرتاوی هەڵتان دەهاوەسم، نەك یەكو دو بەڵكوو یەكە یەكە هەموانتان بەسەر دار خورماوە هەڵدەهاوەسم!! وەكوو لەشوێنێكی تر دا دەفەرموێ: ﴿فِي جُذُوعِ النَّخْلِ﴾طه/٧١، بۆیەتان هەڵدەهاوەسم تاببنە پەندو عیبرەت بۆ هەركەسێك پیلان لەئێمە بكاو بیەوێ لەژێر دەسەلاتی ئێمە دەرچێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: فیرعەون یەكەم كەس بووە كە بەمەبەستی سزادان دەستو قاچی ناحەزانی خۆی بەپێچەوانەوە بڕیوەو دوایی هەڵیواسیون!!

هەڵبەتە فیرعەون ئەم قسانەی بۆ چەواشەكاری بوو، بۆ داپۆشینی تێشكانو بۆڕدانەكەی بوو، بۆ ئەوەی بوو كە ساحیرەكانی تر شوێن ئەوان نەكەونو ئەوانیش نەچنە ریزی ساحیرە ئیمانهێنەرەكانەوە، چونكە بۆخۆی دەیزانی ئەم قسانەی بۆشو بێ بناغەن! هەر ئەو بوو یاساوڵەكانی خۆی ناردن بۆ شارەكانی ژێر دەسەلاتی خۆی بۆ كۆكردنەوەی ساحیرەكان لەناوچەكانو هێنانیان بۆ دەربارەی ناموبارەكی! خۆی كۆبونەوەی لەگەڵ كردنو وادەی بەخششو دیاری بەنرخی پێدان ئەگەر سەركەوتن! حەزرەتی مووسا هیچ كەسی لەو ساحیرانە نەناسیوەو لەوە پێش كەسیانی نەدیبوو كۆبوونەوەی لەگەڵ هیچ كامیان نەكردبوو!

ساحیرەكان كە گوێیان لەم هەڕەشەیەی فیرعەون بوو زۆر نەترسانەو بوێرانە ﴿قَالُوا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ وتیان: ئێمە گوێ بەكوشتن نادەینو لەمردن ناترسین! چونكە ئێمە دڵنیاین لەوە كە دەگەڕێینەوە بۆ لای خودای خۆمانو پاش لەدونیا دەرچونمان زیندو دەكرێینەوە لەرۆژی قیامەت دا پاداشی دەستو قاچی براومانو كوشتنمان لەلایەن تۆوە لەخودا وەردەگرێنەوە، ئێمە دەمانەوێ گیانی خۆمان بەخت بكەین بۆ ئەوەی لەعەزابی خودا رزگارمان بێ، سزای پەروەردگار زۆر لەسزای تۆ بەئێش ترە، رقو غەزەبی خودا لەسەر ئەو شتەی داوامان لێ دەكەی ئەنجامی بدەین، ئەو سیحرەی بەزۆر پێمان دەكەی، زۆر لەقینو قاری تۆ بەهێز ترە، ئەمرۆ ئێمە لەسەر سزای تۆ خۆڕاگر دەبین بۆ ئەوەی لەسزای دۆزەخی سامناك رزگارمان بێ! وەكوو لەشوێنێكی تر دا دەفەرموێ: ﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ. إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا أَن كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ﴾الشعراء/٥٠-٥١.

زومەخشەری دەڵێ: دەگونجێ مانای ئایەتەكە بەم جۆرە بێ: ئێمەو تۆ ئەی

فیرعەون دەگەڕێینەوە بۆ لای خودا، ئەو لەنێوان ئێمەو تۆ دا حوکم دەکا. بەمەش ئیماندارەکان ئاماژە بۆ دوو شت دەکەن: یەکەم بەدرۆ خستنەوەی فیرعەون کە لافی خودایەتی لێ دەداو دەیگوت: من پەروەردگارو بالاّ دەستی ئێوەم. دووەم ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەوان پاداشی لای خودایان هەڵبژاردوەو پاداشی فیرعەونیان ناوی‌و لەخودا دەترسن منەتیان لەفیرعەون نیە.

﴿وَمَا تَنقِمُ مِنَّا إِلاَّ أَنْ آمَنَّا بِآيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءَتْنَا﴾ ئەمجار ساحیرەکان - پاش ئیمانهێنانیان - ئەوەیان درکاند کەزۆرانبازی نێوان ئەوانو فیرعەونو دارودەستەکەی زۆرانبازی عەقیدەو بیروباوەڕە، بۆیە رقی لێ هەلگرتون چونکە ئیمانیان بەخودای بونەوەر هێناوە، وتیان: تۆ هیچ خراپەیەك لەئێمە دا نابینی جگە لەباوەڕهێنانمان بەئایاتی خودای خۆمان، کەبریتییە لەپەیامی حەزرەتی مووساو بۆمان هات کە لەراستی دا ئەم ئیمان هێنانەمان باشترین کردەوەو هەڵوێستە، بنەمای هەموو چاکەو خێرو بێرێکە، جێگای فەخرو شانازیمانە، بەمەش ئیعلانی بڕیارێکیان کرد کەگەڕانەوەی تێدا نیەو لەمناخی دڵیانەوە بەبڕوایەکی پتەوەوە ئەم رێبازەیان هەڵبژاردوە وەکوو ئەوە دەڵێن: تازە تۆ بەهیوای ئەوە مەبە ئێمە لەئیمانهێنانی خۆمان پاشگەز ببینەوە. وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ﴾طه/٧٢، چیت لەدەست دێ بیکەو بێ منەت بە.

ئەمجار دەستی نزایان بۆ لای ئاسمان بەرز کردەوەو وتیان: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾ پەروەردگارا! هێزو توانای خۆڕاگریمان پێ ببەخشە، صەبرو خۆگری فراوانمان بەسەر دا برێژە، لەسەر بیروباوەڕی خودا ناسی‌و ئایینی خۆت بەردەواممان بکە، بەصەبرو ئارام دامان بپۆشە! ﴿وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾ بەموسوڵمانی بمان مرێنە، لەحاڵێك دا گیانمان بکێشە کە بەردەوامبین لەسەر ئیسلامەتی، پابەندی پەیامی پێغەمبەرەکەت بین کە حەزرەتی مووسایە.

ئیبنو عەبباس فەرمویەتی: ساحیرەکان دەمەوبەیانی‌و سەرەتای رۆژ ساحیرو خوا نەناس بوون، دەمەو ئێوارە خواناس‌و شەهیدبوون! وا دیارە فیرعەون هەڕەشەکەی خۆی بەجێ هێناو دەستو قاچی ساحیرە باوەڕهێنەرەکانی لەکەنار

چۆمو روبارێك بڕیەوەو ئەو سزایەی ترساندبوونی لێی بەسەری دا سەپاندن! چونكە پەروەردگار لەسەرەتای چیرۆكەكە دا دەفەرموێ: ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ كە مەبەستی بە(مفسدین) فیرعەونو داروودەستەكەیەتی.

## وتوو ویژی فیرعەونو داروودەستەكەی دەربارەی مووساو شوێنكەوتوانی، ئامۆژگاریكردنی مووسا بۆ قەومەكەی

﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَـٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓا۟ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾

ئەمە بەشی پێنجەمە لەچیرۆكی حەزرەتی مووسا لەگەڵ فیرعەون. لێرە دا پەروەردگار ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە فیرعەونو پیاوانی دەربارى، پاش ئیمانهێنانی ساحیرەكان دەستیان كرد بەوتوویژو پیلان دانان بۆ تۆڵە ستاندنەوە لەمووساو شوێنكەوتوانی. بەتایبەتی كە ساحیرەكان ئاوا بەكۆمەڵو بەئاشكراو لەپێش چاوی بینەران ئیمانیان هێناو لەژێر دەسەڵاتی فیرعەون چوونە دەرێ! ئیتر

یاساولّو چلّکاو خۆرەکانی فیرعەون بەئەندازەی فیرعەون بەلّکوو زیاتریش ترسیان لێ نیشتو هەستیان بەخەتەری پەیامی مووسا کرد، بۆیە سەرەتا ئەوان دەستیان بەئاخاوتن کردو ئەوان دەنەدەنەی فیرعەونیان دا کە نابێ ئاوا دەستەو ئەژنۆ دابنیشیو بهێڵی مووساو شوێنکەوتوانی پەیامی خۆیان پەرە پێ بدەن! ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الْمَلأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ﴾ واتە: پیاو ماقولّو دارودەستەکەی قەومی فیرعەون وتیان: ئەوە تۆی خاوەن شکۆ رێگە دەدەی مووساو شوێنکەوتوانی ئاوا بەئازادی بێ ترس پەیامی خۆیان بلاّوبکەنەوەو بەو جۆرە مسکێنو رەعییەتت تێک بدەنو لەئایینی تۆ ژێوانیان بکەنەوەو بیانخەنە سەر ئایینی خۆیان؟؟ یان بیانخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو لەژێر دەسەلاّتی تۆ دەریان بهێنن؟ ئایا لێیان دەگەرێی ئاوا بانگیان بکەن بۆ پەرستنی خودای خۆیانو واز لەپەرستنی تۆ بهێنن! ئایا دەهێڵی ئەوان واز لەخۆتو خواکانت بهێننو عیبادەتت نەکەنو سەرپێچی فەرمانەکانت بکەن؟؟

شتێکی چەسپاوە لەمێژووی میسری کۆن دا کەمیسرییەکان چەند خودایەکیان بۆ خۆیان دانابوو، یەکێ لەو شتانەی بەخودایان دادەنا (خۆر) بوو پێیان دەگوت: (رع) بەلای میسرییەکانەوە فیرعەون کورو وەچەی خۆر بووە.

شێخ حەسەنی بەصری دەفەرموێ: فیرعەون بۆخۆی بتپەرست بووە، واتە: بۆخۆی بتی دەپەرستو خۆشی دەپەرسترا.

ئیمامی تەیمی دەفەرموێ: شتێکی لەملی خۆی کردبوو ئەو شتەی دەپەرست.

فیرعەون لەوەلاّمی پرسیاری داروودەستەکەی خۆی دا ﴿وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءَهُمْ وَنَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ﴾ وتی: لەئێستا بەولاوە کورەکانیان دەکوژین، نێرینەکانی نەتەوەی ئیسرائیل لەناو دەبەینو مێینەکانیشیان بەزیندویی دەهێڵینەوە وەکوو لەوە پێش پەیرەومان دەکرد، ناهێڵین ژمارەیان زیاد بکا، ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەین هەتا بەیەکجاری ئاسەواریان نامێنیو بەتەواوی دەفەوتێن. ﴿وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ﴾ ئێمە بالاّدەستیمان بەسەر ئەوان دا هەیە، دەتوانین سەرکوتیان بکەین، ناتوانن فەساد لەخاکی ئێمە دا بلاّوبکەنەوە، توانای ئەوەیان نیە زیانمان پێ بگەیەنن، دەسەلاّتی ئەوەیان نیە لەژێر دەسەلاّتی ئێمە

بچنە دەرەوە.

لەمەوقیفێکی تر دا قورئان ئەوە دەگەیەنێ کە فیرعەون پاش ئیمانهێنانی ساحیرەکان ویستی حەزرەتی مووسا بکوژێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ﴾غافر/٢٦. جا کە فیرعەون بڕیاری ئەوەی دا کە نێرینەکانی نەتەوەی ئیسرائیل بکوژێو مێینەکان مەرەخەس بکاو بەئاشکرا رایگەیاند، ئیسرائیلییەکان ئەمەیان بیستو زانییان، ترسیان لێ نیشت خورپەیان پێ کەوت ﴿قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُوا﴾ حەزرەتی مووسا دڵنەوایی کردنو ئامۆژگاری کردن، وتی: پشت بەخودا ببەستنو داوای کۆمەگیو یارمەتی لەزاتی پاکی ئەو بکەن، لێی بپاڕێنەوە کە فیرعەون ئەم هەڕەشەیەی بۆ ئەنجام نەدرێ، خۆڕاگرو ورەبەرزبن! خودا پشتو پەنای بێ دەسەلآتانەو یارمەتی دەریانە لەکاتی تەنگو چەڵەمەدا، بەصەبرو ئارام بن، چونکە صەبر چەکی بەکاری موسوڵمانانە کلیلی دەرگای خۆشییە. دڵنیابن کە ﴿إِنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ بەراستی زەوی فەلەستین، یان هەموو زەوی ملکی خودایە، بەئارەزۆی خۆی بەمیرات دەیدا بەبەندەکانی خۆی، ئەم ولآتە دەکەوێتە ژێر دەستی ئێوەی خاوەن باوەڕەوە، ئەمەش وادەپێدانیان بوو بەسەرکەوتن.

﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ دڵنیابن کە سەرەنجام ژیانی بەختەوەریو سەرفرازی بۆ کەسانێکە کە تەقواکارو لەخوا ترسن، سەرکەوتن بۆ خوداپەرستانە نەك بۆ فیرعەونو دارودەستەکەیەتی!

بەلآم ئەم پەندو ئامۆژگارییانە کاری تێ نەکردن، ئەو ترسو بیمەی لەفیرعەون چوبوە دڵیانەوە نەڕوییەوە، بەڵکوو بەدڵ لەهەڕەشەکانی فیرعەون دەترسانو هێشتا ئازارو ئەشکەنجەی لەوەپێشیان بەدەست فیرعەون لەیاددا مابوو، ﴿قَالُوا أُوذِينَا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَأْتِيَنَا وَمِنْ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا﴾ وتیان: ئێمە پێش لەدایك بوونی تۆو پێش هاتنی تۆ بەناوی پێغەمبەریو دوا هاتنیشت تووشی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجە بووین، ئەوەی پێ کردین کە تۆ بە چاوی خۆت دەتبینی، کوڕەکانی دەکوشتین، ئازارو ئەشکەنجەی دەداین، دڕندانە لەگەڵمان دەجوڵآیەوە بەوپەڕی

دڵڕەقی‌و ستەمکارییەوە هەڵس‌و کەوتی لەگەڵمان دەکرد، وا ئەمڕۆش دەیەوێ هەمان کارەسات‌و چەوساندنەوەو ڕەشەکوژی‌و گەرا بڕینەوەمان دەست پێ بکاتەوە! کە ئەمەیان بەموسا گوت: لەوەڵام دا ﴿قَالَ عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾. حەزرەتی مووسا وەڵامی دانەوە، دڵنیای کردن کە کۆمەگی خودایان بۆدێ، لەو تەنگو چەڵەمەو چەوساندنەوەیە ڕزگاریان دەبێ‌و فیرعەون لەنادەچێ! وتی: ئۆمێدم بەخودا وایە داواکارم لە پەروەردگاری خۆم کە دوژمنی سەرسەختتان لەناوبەرێ، فیرعەون‌و داروودەستەو ڕژێمی سەرمنگون بکا! ئیوە بکاتە جێگرو جێنشینی ئەوان لەخاکی میسردا، فەرمانڕەوایی ئەم وڵاتە بەئێوە ببەخشێ، ئەمجار سەیری کاروکردەوەی هەڵوێستتان بکا چی دەکەن‌و چی ناکەن! سوپاسگوزار دەبن، یان سپڵەو پێ نەزان! بەگوێرەی کردارو گوفتارتان پاداش دەدرێنەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بە خراپە.

ئاوا بەو جۆرە پێغەمبەری خودا: (حەزرەتی مووسا) بەیارمەتی خودا هیواداریان دەکا، مژدەی لەناوچوونی دوژمنەکەیان پێ دەدا، وادەی جێنشین بوونیان لەشوێنی ئەو دوژمنە سەرسەختەیان دەداتێ.

حەزرەتی مووسا پێغەمبەرەو بەچاوی پێغەمبەرییەوە سەیری ڕوداوی ڕابردوو داهاتوو دەکا، دڵنیایە لەدابو نەریتی پەروەردگار لەبونەوەردا، دەزانێ: کە ئەم دابو نەرێتە بەگوێرەی وادەی ئەزەلی خۆی بۆ خاوەن صەبرو خۆگران‌و بەگوێرەی هەڕەشەی خۆی لەسەرپێچیکاران ئەنجام دەدابۆیە گەلەکەی هەڵدەنێ بۆ ئەوەی بچنە سەر ڕێبازی خودا پەسند، تا دابو نەریتی خودایان بەسەر دا جاری ببێ بەو شێوەی کە دەیەوێ!

ئەو پێغەمبەرەو دەزانێ جێنشینکردنیان لەسەر زەوی بۆ ئەزموون‌و تاقیکردنەوەیە، بۆ ئەوەیە پەروەردگار دەری بخا کە کرانە جێنشین چۆن هەڵس‌وکەوت دەکەن‌و ڕەفتاریان چۆن دەبێ. ئاشکراشە پەروەردگار هەموو شتێك دەزانێ چی شتێك ڕوبدا، پێش ئەوەی ڕوبدا ئاگای لێیەتی. بەڵام دابو نەرێتی خودا وا هاتووە کە هیچ کەس نەخاتە بەر لێ پرسینەوەو حیساب لەگەڵ کردن هەتا بەئاشکرا ئەو شتەی کەلەزانستی بێ سەرەتای خودا دا چەسپاوە ئەوان

ئەنجامی نەدەن و نەی هێننە ئاراوە. هەرکاتێ بەویستی خۆیان کارەکەیان کرد ئەمجار حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکا.

## جۆرەکانی سزادانی پەروەردگار لەدونیا دا بۆ فیرعەون و داروەدەستەکەی

﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُوا۟ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾

خوێنەری هێژا ئێستا سیباقی قورئانەکە پەردە بەسەر دیمەنی مووساو شوێنکەوتوانی دا دەداتەوە، بۆ ئەوەی لەلایەکی ترەوە پەردە لەسەر دیمەنێکی تر هەڵداتەوە: دیمەنی فیرعەون داروەدەستەکەی، کە خودا بەهۆی بوغرابوون و ستەمکارییانەوە لەناویان دەبا، وادەی مووسا بۆ قەومەکەی دەهێنێتە جێ، ئەو بەڵێنەی کە لەوەپێش مووسا بەشوێنکەوتوانی دابوو دێتە جێ!

دیمەنێکە بەهێدی و لەسەرەخۆ دەست پێ دەکات، بەڵام وردەوردە رەشەبای

مـەرگی سـتـەمکاران تێـی دا هەڵدەکا، پـێش ئـەوەی پەردەکـە دابـدرێتـەوە رەشـەباو زریانەکە پەرەدەسێنی‌و هەموو شتێك راپێچ دەکاو لوولی دەداو لەناوی دەبا، سەر روی زەوی لـەبوغراو مـلـهوڕو سـتـەمکارو دارودەسـتـەکانیان خـاڵی دەبـێ‌و پـاك دەبێتەوە!! ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە نەتەوەی ئیسرائیل صەبرو ئارامیان گـرتو پاداشـی خۆیـان وەرگرتـەوە، فیرعـەونو دارودەسـتـەکەی پـاخی بـوون سـزای پـاخی بوونەکـەیان لەناوچـون بـوو! پـەروەردگار وادەو هەڕەشـەکانی هێنانـەدی، دابـو نـەریتی خۆی لەئەنجامـدانی لـەناوبردنی بەدرۆخـەرەوەکان دوبـارە کـردەوە، پـاش ئـەوەی سـتـەمکارانی بەناخۆشـی‌و خۆشـی بـەتاقی کـردەوە، جۆرەهـا گۆڕانکـاری لەژیانیان دا ئـەنجامداو ئـەوان پەنـدیان وەرنـەگرتـو نەهاتنـە سـەر رێبـازی حـەقو راستی! ئەمجار لەناوی بردنو ئاسەواری بڕێنەوەو خستنیە زبڵدانی مێژووەوە. دەی بابزانین پەروەردگار چۆن ئەم دیمەنە نمایش دەکاو چۆنی رادەنـوێنێ؟! بابـەدڵێکی هوشـیارەوە گوێ بـۆ قورئـان بگـرینو بەوریاییـەوە سـەیری دیمەنەکـە بکـەین، کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾.

پاش ئەوەی کە حەزرەتی مووساﷺ مزگێنی بەقەومەکەی خۆی دا کە هومێد وایـە پەروەردگارمان دوژمنە سەرسەختەکەمان لەناوبەرێ، لێرە دا جـۆری عـەزابەکـەی - کـە پـێش عـەزابی لـەناوبردنو خنکانـدنیان - بۆیـان نێـردراوە رون دەکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی بینـەرانو بیـسەران لەهـەموو رۆژگارێـك دا لەسـزای خـودا بترسـێنی‌و خۆبپـارێزن لـەکوفرو سەرپێـچی کـردنو بەدرۆخـستنەوەی پێغەمبـەرانو پەیامەکەیان، دەفەرموێ: بەراستی ئێمە دارودەستەکەی فیرعەونمان بەگرانی‌و کەم بارانی‌و هەژاری گرت بەروبومەمان کـەم کردنـەوە، بـەڵکوو بیرێـك لـەوەزعی خۆیـان بکەنەوە، هەست بەبێ دەسەڵاتی‌و زەبوونی خۆیان بکەن لەبەرامبـەر هێـزی رەهـای پەروەردگار، بۆیان دەربکەوێ کـە فیرعـەونی ملـهوڕو پاشـایانو خـودا درۆزنـەکانیان چـەند بـێ دەسـەڵاتن لەبەرامبـەر دەسـەڵاتی خـودای باڵادەسـتو بـێ هـاوەڵ‌دا. بـۆ ئـەوەی وازبێـنن لەسـتەم کـردن لەنەتـەوەی ئیـسرائیلو بـەپیر بانگەوازییەکـەی مووسـاوە بـچنو موسـوڵمان بـبن! چـونکە بەتاقیکردنـەوە دەرکـەوتووە کـە بـەڵاو موصیبەتو ناخۆشی دڵ نەرم دەکاو سروشت پاڵفتە دەکاو دەروون واڵ دەکا هانا بۆ

پەروەردگار بەریو هەولی وەدەستهێنانی رەزامەندی زاتی پاکی خودا بداو پاڕانەوەو لالانەوە تەنیا ئاراستەی ئەو بکاو بەندایەتیو ملکەچی هەر بۆ ئەو بنوێنێ.!

پەروەردگار لەسورەتی (الإسراء) دا ئەوە رادەگەیەنێ: کە جۆری سزاکان نۆ جۆر سزای ئاشکراو نومایان بوون، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾الإسراء/۱۰۱، بەلام لێرە دا حەوت جۆر سزای تری دیاری کردوە کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾يونس/۸۸، ئەم جۆرەش دەخرێتە پاڵ حەوتەکان! بەیضاوی دەفەرموێ: نۆ جۆرە ئایەتەکانی کە درابوون بەموساو پێیان نێردرابوو بۆ سەر نەتەوەی ئیسرائیل هەندێکیان بریتی بوون لەچەند حوکمو یاسایەك فەرمانیان پێ کرابوو کە پابەندیان بن، هەروەها هەنێکیشیان نیشانەو ئایاتی سزابوون فیرعەونو داروەستەکەی پێ سزا دران، نۆ ئایەتەکە ئەمانە بوون: عەصا، دەستی سپیو ورشەدار، کوللە، ئەسپێ، بۆق، خوێن، هەڵقولانی ئاو لەبەردی رەق، لیك جودابوونەوەی ئاوی دەریا، راگرتنی کیوی طوور لەژوور سەری نەتەوەی ئیسرائیل. هەندێك لەجیاتی ئەو سێ نیشانەی دوایی سێ شتی تریان دەست نیشان کردوە - طۆفان - گرانی - کەمبوونی بەروبوم.

تەفسیری مونیر دوای راگواستنی بۆچونەکەی بەیضاوی دەفەرموێ: لەراستی دا لێك جیابوونەوەی ئاوی دەریا لەدوای تەواوبوونی نیشانەکان بووە، هەڵقولانی دوازدە سەرچاوە لەبەردەکە پاش لەناوچوونی فیرعەونو داروەستەکەی بووە، ناگونجێ بکرێ بەنیشانەو بەلگە بۆ فیرعەونو قەومەکەی کە ئیمان بەموسا بێنن! عەصاو دەستی سپیو شوعلەوەر موعجیزەی حەزرەتی مووسا بوون، نیشانەی سزا نەبوون. کەوابێ سەرجەم ئایەتەکانی بەم جۆرە ریزبەند دەکرێن. گرانی، کەمبوونی ماڵو سامانو کەمبوونی ژمارەی خودی خۆیانو کەمبوونی بەروبوم، طوفان، کوللە، ئەسپێ، بۆق، خوێن.

حەوت نیشانە لێرە واتە لەسورەتی (الأعراف) دا دەست نیشان کراون،

نیشانەیەك لەسورەتی یونس دا باس کراوە،

بابێینـەوە سـەر باسـی راڤـەکردنی ئایەتـەکانی ئێـرە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِنْ الثَّمَرَاتِ﴾ دارودەسـتەکەی فیرعـەونمان گـرتن بەکەم بارانیو گرانیو برسیایەتی، بەکەمبوونـەوەی بـەروبومو میـوە، لـەلادێکان دا کـشتوکاڵ کـەم بوبـوەو بـەروبوومی نـەدەدا، لەشـارەکان دا میـوەو بـەروبووم کـەم بـووەوە. بـەم تـەنگو چـەڵەمانە بـەتاقیمان کردنـەوە ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ بـەڵکوو بەخۆیان دا بچنەوە، پەندو عیـبرەت وەربگـرن، لـەکوفرو سەرپێـچی کـردن پاشـگەز ببنــەوە، پێغەمبـەرو ئایەتــەکانی خــودا بــەدرۆ نەخەنــەوە، واز لەســتەمکاریو چەوساندنەوەی نەتەوەی ئیسرائیل بهێنن، بـڕوا بەخودایـەتی پـەروەردگار بکـەنو بەپیر بانگەوازی مووساوە بچن، چونکە دابـو نەریتی خودا وا هاتووە کەبەنـدەکانی بەجۆرەها بەڵاو موصیبەت تاقی بکاتەوە تادڵیان نەرم ببیو بـەخۆیان دا بـچنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خودا.

جـا ئەگـەر گەڕانــەوەو رێگـای هیدایـەتیان گـرت ئــەوە خێــرو بەرەکـەتو خۆشییان بەسـەر دا دەبـارێ، ئەگـەر هـەر لەسـەر کوفرو بێـدینی خۆیـان بـەردەوام بوون ئەوە گرانیو بەڵاو موصیبەتیان لەسەر توندتر دەبیو لەئاکاما لەناوچوون.

بێگومـان فیرعـەونو دارودەسـتەکەی پـشتیان لەبانگـەواز هـەڵکردو گوێیـان بەهەرەشــەو ئامۆژگـاری مووسـا نــەدا، ئــەوە بــوو ســەرەنجام ریــشەکێش کــرانو لەناوچـوون !! ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە رون دەکاتــەوە کـە ئـەو هـەموو بـەڵاو موصـیبەتانە کاریـان لەفیرعـەونو دارودەسـتەکەی نـەکرد، بـەڵکوو زیـاتر شـێتگیر بوونو یاخی بوونو سەرپێچیکردنیان پـەرەیێ دا تەنانـەت ﴿فَإِذَا جَاءَتْهُمْ الْحَسَنَةُ قَالُوا لَنَا هَذِهِ﴾ ئەگـەر هـەرزانیان بۆ دەهـاتو رزقو رۆژیـان زۆر دەبـوو، ئاژەڵیـان زاووزێیان باش دەبوو لەنەخۆشیو بـەڵاو موصـیبەت پـارێزراو دەبـوون، دەیـانگوت: ئەمە مافی خۆمانەو بەکردەوەو زانیاری خۆمان بەدەسـتمان هێنـاوە، شـانمان هـەڵی دەگـرێ، ﴿وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ ئەگـەر بـەڵاو ناخۆشـییەك ڕوی تێبکردنایـە، گرانـیو هـەژاریان تـووش بوایـە، ﴿يَطَّيَّرُوا بِمُوسَى وَمَنْ مَعَهُ﴾ رەشـبینییان بەموسـاو شوێنکەوتوانی دەکردو وایاندەزانی سوچی موسایە، واتـە: دەیـانگوت: ئەمـە شـومی

مووساو داروده‌سته‌كه‌یه‌تی، ئه‌مه‌ پێ‌و قه‌دومی ئه‌وانه‌ ئێمه‌ تووشی ئه‌م هه‌موو به‌دبه‌ختی‌و نه‌گبه‌تیانه‌ بووین! له‌وه‌ بێ ئاگابوون كه‌ ده‌بوایه‌ ئه‌وان سوپاسگوزاری نیعمه‌ته‌كانی خودا بوونایه‌وكوفرانی نیعمه‌تیان نه‌كردایه‌، بێ ئاگان له‌وه‌ كه‌ ئه‌و به‌لاو موصیبه‌تانه‌ به‌هۆی خراپه‌كاری ئه‌وانو شه‌ڕه‌نگێزی‌و دڵو ده‌روونی پیسیان توشیان بوون!

نموونه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌ ئایه‌تێكی تره‌ كه‌ هه‌ڵوێستی كافره‌كانی مه‌ككه‌ به‌رامبه‌ر پێغه‌مبه‌ری ئیسلام دیاری ده‌كاو ده‌فه‌رموێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُواْ هَـذِهِ مِنْ عِندِ اللّهِ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُواْ هَـذِهِ مِنْ عِندِكَ قُلْ كُلًّ مِّنْ عِندِ اللّهِ﴾النساء/٧٨.

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار بۆچونه‌ بێ بناغه‌كه‌ی داروده‌سته‌ی فیرعه‌ون ره‌ت ده‌كاته‌وه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِنْدَ اللّهِ﴾ ئاگادار بنه‌وه‌ هه‌رچی كه‌ توشیان دێ له‌خێرو شه‌ڕ ئه‌وه‌ به‌قه‌زاو قه‌ده‌ری خودایه‌، په‌روه‌ردگار خێرو خۆشی كه‌ ده‌ دا به‌به‌نده‌كانی بۆ ئه‌وه‌یه‌ ده‌ری بخا كێ سوپاسگوزاره‌و كێ سپڵه‌و پێنه‌زانه‌، كه‌ به‌لاو ناخۆشی به‌سه‌ر به‌نده‌كانی دا دێنێ بۆ تاقیكردنه‌وه‌و ئیمتیحانه‌ بۆ ئه‌وه‌یه‌: ده‌ری بخا كێ خۆگرو به‌صه‌برو ئارامه‌، كێ نارازی‌و گله‌یی بازه‌، بۆ ئه‌وه‌یه‌تی سه‌رپێچیكاران له‌گومڕایی‌و فه‌سادو سه‌رلێشێواوی خۆیان پاشگه‌ز ببنه‌وه‌، واز له‌كرداری چه‌وتو ناقۆڵا بێنن، به‌خۆیان دا بچنه‌وه‌و روبكه‌نه‌ خوداو پابه‌ندی فه‌رمانو نه‌هییه‌كانی ببن.

زومه‌خشه‌ری ده‌ڵێ: مانای ﴿طَائِرُهُمْ عِنْدَ اللّهِ﴾ واته‌: هۆكاری خێرو شه‌ڕ كه‌ توشیان ده‌بێ لای خودایه‌ كه‌ بریتییه‌ له‌بڕیارو ویستی زاتی بێچونی!

واته‌: هه‌رچی توشیان ده‌بێ له‌خێرو شه‌ڕ، له‌خۆشی‌و ناخۆشی به‌گوێره‌ی قه‌زاو قه‌ده‌ری خودایه‌، چونكه‌ په‌روه‌ردگار یاساو نیظامی بۆ كه‌ون داناوه‌، بۆ هه‌موو شتێك هۆكاری خۆی بۆ دیاری كردوه‌، هه‌موو مه‌علوماتێك عیلله‌تی خۆی هه‌یه‌، به‌گوێره‌ی ئه‌م یاساو نه‌خشه‌یه‌ به‌لاو موصیبه‌تیان بۆ دێنو به‌تاقی ده‌كرێنه‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی تۆبه‌ بكه‌نو بۆ لای خودا بگه‌رێنه‌وه‌، ده‌ست له‌سته‌مكاری‌و چه‌وساندنه‌وه‌ی ژێر ده‌سته‌كانیان هه‌ڵبگرن، زێده‌ ره‌وی نه‌كه‌ن!

﴿وَلَكِـنَّ أَكْثَـرَهُمْ لا يَعْلَمُـونَ﴾ به‌لام زوربه‌ی زۆری ئه‌وان حیكمه‌تو نهێنی

کارەکانی پەروەردگار لەبوونەوەر دا نـازانن، هۆکاری خێـرو شـەڕ نادۆزنـەوە، ئـەوە نازانن کە هەموو شتێك لەبوونەوەر دا بەویستو ئیرادەی خودا دێتـە جێ. کـەوابێ ئەو بەلاو ناخۆشییانەی تووشی قـەومی فیرعـەون هـاتووە بـەهۆی شـوومی مووسـاو قەومەکەی نیە، هۆکارەکەی خراپەکاری‌و سپڵەیی خۆیانە،،

جا وێڕای ئـەم هـەموو گۆڕانکارییـەی بەسـەریان هـات، ئـەو هـەموو خۆشـی‌و ناخۆشییەی پێی تاقی کرانەوە ئەوان پەندو عیبرەتیان وەرنەگرتو ئەوەی پێویست بوو بەرامبەر بەخودا بیکەن ئەنجامیان نەدا، بەڵکوو رۆژ لەدوای رۆژو سات لەدوای سات زیاتر شێتگیر دەبوونو پەرەیان بەیاخی بوونو سەرپێچی کردندا، بەرەنگاری حـەقو راسـتی بوونـەوەو لەسـەر بیروبـاوەڕی بـەتاڵو پوچـی خۆیـان سـوور بـوونو بەئاشکرا ئەم سوور بونەی خۆیان راگەیاند. ﴿وَقَالُوا﴾ بەحـەزرەتی مووسایان گـوت: ﴿مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِ مِنْ آيَةٍ لِتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ چـەندێك تـۆ بەڵگـەو نیشانەو ئایەتمان بـۆ بێنـی! هەرچـی بەڵگـەو نیـشانە هەیـە بیهێنـی بـۆ سـەلماندنی ئەوەی کە تۆ لەسەر حەقی‌و بانگەوازییەکەت راستەو بتـەوێ ئێمـە ئیقنـاع بکـەی‌و لەئایینی خۆمان لابدەینو بێینە سەر ئایینی تۆ، ئێمـە رەتـی دەکەینـەوەو قبوڵمـان نیەو بڕوات پێ ناکەین، بەهیچ جۆرێك بڕوا بەقسەو پەیامەکەت ناکـەینو شـوێنت ناکەوین!.

بۆیە پـەروەردگار لەتۆڵـەی بـەردەوام بوونیـان لەسـەر کوفرو سـوور بوونیـان لەسەر هەڵوێستی نـاقۆڵاو تاوانکارییـان جۆرەهـا سـزای بۆنـاردن وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ﴾ لەسزای ئەو تاوانکارییەیان دا (تۆفان)مان بۆ ناردن، واتە: ئەوەنـدەمان بـاران بـۆ بارانـدن کـە کـشتوکاڵی لـەناوبردن، زەوی‌و زاری تێـك دان، گژوگیاو بەروبومیان هەموو بەئاو کەوتو رزی‌و پۆڵکا،

﴿وَالْجَرَادَ﴾ کوللەمان ناردنـە سـەر، هەرچـی کـشتوکاڵیـان هـەبوو هـەموویان خـوارد، تەنانـەت دەرگـاو هەڵاشـی خانوەکانیـشیان خـواردن، تەنانـەت پۆشاکیـشیان خواردن، بەڵام هیچ کامێ لەم کوللانە نەچوونە ماڵی نەتەوەی ئیـسرائیلییەکانەوە. دوایان لەحەزرەتی مووسا کرد کە داوا بکا ئەم بەڵایـەیان لەسـەر هـەڵگرێ، ئـەویش بۆیـان لـەخودا پاڕایـەوەو ئـەو بەڵایـەیان لەسـەر لاچـوو لـەوادەی خۆیـان پەشـیمان

بونەوەو وتيان ئێمە لەئايينى خۆمان لانەدەين!

﴿وَالْقُمَّلَ﴾ ئەمجار پەروەردگار ئەسپێی بەسەر دا زاڵ كردن هەرچی مابووەوە لەخواردەمەنیو كوللە نەيگەيشتبويە، ئەوان خواردیان، ئەم ئەسپێيە جۆرێك بووە هەرچی شيناوەردو كشتوكاڵێك مابووەوە كوللەكان نەيانخواردبوو ئەوان روتاندیانەوەو قەلاچۆيان كرد، دوبارە هانايان بۆ حەزرەتی مووسا بردەوە داوايان لێ كرد لەخودا بپارێتەوە ئەم بەلايانەيان لەسەرلابەرێ! ئەويش نزای بۆ كردنو بەلايان لەكۆڵ بوەوە، كەچی دووبارە ژێوان بوونەوەو وادەی خۆيان نەبردە سەر، ئەمجار يەزدان ويستی بەبەلايەكی تر بەتاقيان بكاتەوە، وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَالضَّفَادِعَ﴾ واتە: بۆقمان ناردنەسەر، هەموو ماڵەكانيان پڕبون گۆزەو ديزەو قاپو مەنجەڵيان پڕبوون لەبۆق. تەنانەت ئەگەر يەكێكيان بيويستايە قسە بكا خێرا بۆقێك بازی دەدايە ناودەميەوەو دەمی دەگرت! كە بۆق هەراسانيان لێ هەلگرتن، مەنجەڵيان لەسەر ئاگر دەكولا، تەنووريان لەكڵی ئاگر دا بوو بۆقەكان خۆيان تێ فرێ دەدانو بەهەموو جۆرێك تينيان بۆ هێنان ئەوانيش هانايان بۆ حەزرەتی مووسا بردو وتيان: ئەگەر ئەمجار رەحممان پێ بكەی، ئيتر تۆبەيەكی راستالآنە دەكەينو ژێوان نابينەوە، ئەويش وادەو بەڵێنی لێ وەرگرتنو بۆيان لەخودا پاڕايەوە، خودا بەلای لەسەر لابردن، كەچی سەر لەنوێ پەيمانی خۆيان شكاندو پابەندی بەڵێنەكانيان نەبوون!! ئەمجار يەزدان بەخوێن سزای دان وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَالدَّمَ﴾ واتە: بەخوێن سزامان دان، هەرچی ئاوی هەيانبوو بوو بەخوێن، لەجۆگەو جۆبار ئاويان هەڵدەگرت دەبوو بەخوێن، لەهەر شوێنێك ئاويان هەڵنجايە يەكسەر دەبوو بەخوێن! لەلای فيرعەون شەكوای حاڵی خۆيان كرد ئەويش وتی: ئەوە سيحری لێ كردون، تەنانەت ئەگەر قيبطيەكو ئيسرائيلييەك لەيەك مەنجەڵ ئاويان هەڵێنجايە لای قيبطييەكە دەبوو بەخوێن!

هەموو ئەم نيشانانە ﴿آيَاتٍ مُفَصَّلاتٍ﴾ نيشانەی ئاشكراو نمايان بوون، هەموو خاوەن عەقڵێك دەيزانی كە لەخوداوە ئاراستە كراونو كەسی تر ئەو دەسەڵاتەی نيەو ئەوە خودا بۆيان دەنێرێ بۆ ئەوەی پەندی لێ وەربگرنو تۆڵەی سووربونيانە لەسەر كوفر! بەڵگەی ئەوەيە: كە حەزرەتی مووسا پێغەمبەرەو

هەڕەشەکانی یەکە یەکە دێنە جێو پێویستە بەخۆیان دا بچنەوەو ملکەچی فەرمانو نەهیەکانی بن!!

شایانی باسە لەوە پێش حەزرەتی مووسا یەکە یەکە هەڕەشەی بەهاتنی ئەم بەلآیانە لێ کردبوون. بەلآم ئەوان ﴿فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً مُجْرِمِينَ﴾ بەردەوام بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، لەئاستی عیبادەت کردن بۆ خودا لوتبەرزیان کردو گەلو نەتەوەیەکی تاوانبار بوون بەرامبەر خۆیان خەڵکانی تریش، سوور بوون لەسەر تاوان کردنو ملهوڕی.

## هانا بردنیان بۆموسا بۆ لابردنی بەلآو پەیمان شکێنییانو خنکاندنی فیرعەونو قەومەکەی

﴿ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ۖ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَـٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾

لەم ئایەتانەش دا پەروەردگار بەشێکی ترمان لەچیرۆکی حەزرەتی مووسا لەگەڵ فیرعەون دا بۆ دەگێڕێتەوە، ئەم بەشەی چیرۆکەکە ئەوە باس دەکا: کاتێک ئەو بەلآو موصیبەتانەی لەوەپێش ئاماژەمان بۆ کردن یەك لەدوای یەکو لەکاتی جیا جیا دا نێردرانە خوارێ بۆ سەر فیرعەونو قەومەکەی، ژیانیان لێتێک چوو هەراسانیان لێ هەلگیراو تەنگیان پێ هەڵچنرا، داوایان لەحەزرەتی مووسا کرد

لەخودا بپارێتەوە ئەو سزایەیان لەسەر لابەرێ، پەیمانیان دایە کە ئەگەر سزایان لەسەر هەڵبگیرێ بڕوا بەپەیامەکەی دەکەن، کە حەزرەتی مووسا دوعای بۆ دەکردن‌و بەڵاکەیان لەسەر لادەچوو هەموو جارێك پەیمانەکانی خۆیان هەڵدەوەشاندەوە، تا لەئاکام دا خودا لەدەریا دا خنکاندنی‌و لەناوی بردن. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُوا يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ﴾ کە سزای بەئێش‌و ناڕەحەتیان هاتە سەر، ئەو جۆرە عەزابانەی کە لەئایەتەکانی پێشوو دا ئامازەیان بۆ کرا یەك بەدوای یەك دا هاتنە سەریان، ئیتر ژیانیان لێ دەشێواو ترسیان لێ دەنیشتو بەتەواوەتی تینیان بۆ دەهاتو هەموو جارێ هانایان بۆ حەزرەتی مووسا دەبردو دەیانگوت: ئەی مووسا بۆمان لەخودا بپارێرەوە، بەهۆی ئەو وادەو بەڵێنانەی پێی داوای، بەهۆی ئەو ئەرکەی خستویەتیە سەر شانت کە پێغەمبەرایەتی‌و رابەرایەتییە، لەبەر ئەو رێزو پلەوپایەی پێی داوی، لەبەر ئەوە تۆ خۆشەویستی لای خودا، بۆمان بپارێرەوە کە ئەم تەنگو چەڵەمەو بەڵاو ناخۆشیانەمان لەسەر لابەرێ. سوێندیان بۆ خوارد وتیان: ﴿لَئِنْ كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ﴾ ئەگەر ئەم سزاو ناڕەحەتیەمان لەسەر لابەرێ، بڕوا بەپەیامەکەت دەکەین، ئیمانت پێ دەهێنین‌و شوێن ڕێبازی تۆدەکەوین .﴿وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ وێڕای ئەوەش نەتەوەی ئیسرائیلت لەگەڵ دا دەنێرین بۆ خاکی فەلەستین کە بەقسەی خۆتان زێدی خۆتانەو نیشتمانی وادە پێدراوتانە! بۆخۆت لەوە پێش داوای ئەوەت لێ کردبووین، ئێمە رێگەتان دەدەین بگەڕێنەوە بۆ زەوی وادە پێدراوتان بالەوێ بەئارەزوی خۆتان خودا پەرستی بکەن!

کەچی وێڕای ئەو هەموو وادەو بەڵێنانەی کە بەموسایان دەدان ﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ إِلَى أَجَلٍ هُمْ بَالِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ﴾ هەموو جارێ کە عەزابمان لەسەر هەڵدەگرتن بۆ ماوەیەکو - تاکاتی هاتنی ئەجەلێك کەپێی دەگەن کە خنکاندنیانە - دەکەوتنەوە حاڵی پێشویان، ئەو ناکەس بەچانە وادەو بەڵێنی خۆیان هەڵدەوەشاندەوەو، ژێوان دەبوونەوە.. واتە: ئێمە عەزابمان لەسەر لابردن تاماوەیەکی دیاریکراو، کەماوەکە تەواو بوو کاتی دیاریکراو هات، سەر لەنوێ پەشیمان بوونەوە ئەمجار نەك هەر عەزابمان خستەوە سەریان‌و بەس بەڵکوو

بەخنکاندن بەهیلاکمان بردن!

ماموٚستا سەیید دەفەرموێ: لێرە دا قورئان عەزابەکەیان وا رادەنوێنێ کە بەیەکجاری هاتبن‌و ژێوان بوونەوەکانیشیان یەکجار رویدابێ، چونکە تاقیکردنەوەکان هەموویان یەك بوون، ئاکامەکانیشیان یەك بوون! ئەمەش جۆرێکە لەرانواندنی قورئانی پیرۆز بۆ چیرۆکەکان، سەرەتاکانیان کۆدەکاتەوە چونکە لێك دەچن کۆتایی‌و ئاکامەکانیشیان کۆدەکاتەوە چونکە لێك دەچن! چونکە دڵی داخراوو کوێرەوە بوو تاقیکردنەوە جۆراو جۆرەکان بەیەك جۆر دەزانی‌و هیچ کەڵکی لێ وەرناگری‌و پەندئامێز نابێ!

ماوەتەوە بزانین ئەم نیشانەو عەزابو سزا جۆراو جۆرانە چۆن بونو چۆن توشی فیرعەون‌و قەومەکەی بوون! جگە لەدەقەکەی قورئان، هیچ سەرچاوەیەکی ترمان بەدەستەوە نیە، بۆیە ئێمە لەم جۆرە باسانە دا جگە لەدەقەکانی قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ پشت بەهیچ سەرچاوەیەکی تر نابەستین، بۆ ئەوەی خۆمان لە چیرۆك‌و قسەوباسی بێ بناغەی جولەکە بپارێزین، قسەو ریوایەتی پروپوچ‌و نەخەینە نێو تەفسیری قورئانەوە، کە بەداخەوە زۆر لەو چیرۆکە ئیسرائیلیانەو قسەو باسە بێ بناغانە خزاونەتە نێو تەفسیرە کۆنەکانی قورئانەوەو تەفسیرێك نیە لەم خەرافاتە خاڵی بێ، تەنانەت تەفسیری پیرۆزی طەبەری لەگەڵ ئەو بەنرخییەی‌و تەفسیری ئیبنو کەثیر لەگەڵ ئەو پلە بەرزییەی کە هەیەتی لەم دیاردە زیان بەخشەیە رزگاریان نەبووە!! بێگومان ریوایاتو سەرگوروشتەی جوێ جوێ لەم بارەوە لەئیبنو عەباسەوە لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەقەتادەوە لەئیبنو ئیسحاقەوە گێردراونەوە ئیبنو جەریری طەبەری لەتەفسیرەکەی‌داو تاریخەکەی دا گێڕاونیەوە، ئەمەی دوای یەکێکە لەو ریوایەتانە! (ئیبنو حەمید) بۆی گێڕاینەوە، وتی: یەعقوبی قوممی بۆی باس کردین، ئەویش لەجەعفەری کوڕی موغەیرەوە لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: کاتێ حەزرەتی مووسا هاتە سەر فیرعەون وتی: نەتەوەی ئیسرائیل مەرەخەس بکە بالەگەڵمدا بێن بۆ فەلەستین، فیرعەون نەیکرد، خودا تۆفانی بۆ ناردن، بارانێکی بەلێزمەو درێژخایەنیان بەسەر دا بارێ، ترسان کە ئەو بارانە عەزاب بێ، بەحەزرەتی

مووسایان گوت: بۆمان لەخودا بپاڕێرەوە با ئەم بارانەمان لەسەر لابەرێ ئیمانت پێدەهێنینو بەنو ئیسرائیلییەکانت لەگەڵ دنێرینەوە بۆ فەلەستین حەزرەتی مووسا بۆیان لەخودا پاڕایەوە، بارانەکە وەستایەوە کەچی زێوان بوونەوە ئیمانیان نەهێناو جولەکەکانیشیان مەرەخەس نەکردن، لەو ساڵە دا کشتوکاڵیان قاتی بوو! هەرگیز لەوە پێش کشتوکاڵو زەراعەتی وایان بەخۆوە نەدیبوو، وتیان ئەمە ئەو زەرعاتو بەروبومەیە کە ئاواتە خوازی بووین! پەروەردگار سنو کوللەی ناردنە سەرێ، کشتوکاڵەکەیانی خوارد، کەدیتیان وا کوللە دەمی ژەنیوەتە کشتوکاڵیان زانیان کە هیچ شتێکیان بۆ پاشەکەوت ناکرێ وتیان: ئەی مووسا! بۆمان لەخودا بپاڕێرەوە ئەم سنو کوللەیەمان لێ دوور بخاتەوە ئیمانت پێ دەهێنینو نەتەوەی ئیسرائیلیشت لەگەڵ دەنێرینەوە، ئەویش لەخودا پاڕایەوەو سونو کوللەی لێ دوور خستنەوە، کەچی پاشان لەوادەو بەڵێنی خۆیان زێوان بوونەوە، ئیمانیان پێ نەهێناو جولەکەکانیان مەرەخەس نەکردن. کشتوکاڵیان دروێنە کردو بەرهەمیان هیناو لەماڵ دا پەزمەندیان کردو هەڵیانگرتو وتیان: سەرکەوتنمان بەدەست هێنا! ئەمجار خودا ئەسپێی بۆ ناردن دانەوێڵەکەیان لەعەمبارو کەندو دا ئەسپێ لێی دا، پیاوی وایان هەبوو (۱۰) قسناغ گەنمی دەبرد بۆ ئاش بیهاڕێ سێ گوێلکی ئارد نەدەهێنایەوە! وتیان: ئەی موسا! بۆمان لەخودا بپاڕێرەوە بائەم سزایەمان لەسەر هەڵبگرێ ئیمانت پێ دەهێنینو جولەکەکانیشت لەگەڵ دەنێرینەوە بۆ فەلەستین، حەزرەتی مووسا دوعای بۆ کردنو سزاکەیان لەسەر لاچوو کەچی لەوادەو بەڵێنی خۆیان پاشگەز بوونەوەو جولەکەکانیان لەگەڵ نەناردنەوە بۆ خاکی وادەپێدراویان!! ئەمجار پەروەردگار بۆقی بۆ ناردن، وەکوو ریوایەت کراوە دەڵێن: کاتێك حەزرەتی مووسا لای فیرعەون دانیشتبوو گوێی لەدەنگی بۆقێك بوو، بەفیرعەونی گوت: ئاخۆ خۆتو گەلەکەت لەم دەعبایە چیتان تووش دێ؟ فیرعەون گوتی: جا دەبێ ڕۆڵی ئەم گیاندارە بێ هێزە چی بێ؟! ئەو ڕۆژە هێشتا ئێوارە دانەهات بۆق هەراسانی کردن تەنانەت پیاو هەبوو دادەنیشت تا بینەقاقای بۆق دایان پۆشی بوو، پیاو هەبوو دەمی دەکردەوە قسەبکات خێرا بۆقێك خۆی فڕێدەدایە ناو دەمیەوە!! تینیان بۆ هاتو داوایان لەحەزرەتی مووسا کرد بۆیان لەخودا بپاڕێتەوە، ئەم بۆقانەیان لەکۆڵبکاتەوە، ئیتر ئیمانی پێ دەهێنینو

جولەکەکانیشی بۆ مەرەخەس دەکەن بڕۆنەوە بۆ فەلەستین. پەروەردگار ئەو سزایەشی لەسەر هەلگرتن کەچی ئیمانیان نەهێناو لەبەلێنی خۆیان پەشیمان بوونەوە. ئەمجار پەروەردگار سزای خوێنینی بۆ سەر ناردن، بەجۆرێك لەهەر سەرچاوەو بیرو جۆگاو روبارێك ئاویان بخواردایەوە یان بیان کردایە دەفرو گۆزەو دیزەو مەرکانەی خۆیانەوە یەکسەر ئاوەکە دەبووە خوێنێکی گەش! هاواریان بۆ فیرعەون برد، وتیان: ئەم دیاردەی خوێنە تەنگی پێ هەلچنیوین، ئاومان دەست ناکەوێ بۆ خواردنەوە، فیرعەون وتی: دلنیام سیحری لێ کردون! وتیان: سیحری چی؟! لەکوێ سیحری لێ کردوین. ئێمە لە هیچ شوێنێك ئاومان دەست ناکەوێ جگە لەخوێنی گەش! ئەمجار وتیان: ئەی مووسا! دوعامان بۆ بکە ئەم سزیامان لە سەر لابەرێ وئەم دیاردەی خوێنەمان لەسەر نەمێنێ! ئیتر ئێمە ئیمانت پێدەهێنین و نەتەوەی ئیسرائیلیشت لەگەل دادەنێرینەوە، حەزرەتی مووسا دوعای کردو سزاکەیان لەسەر لاچوو کەچی زێوان بونەوەو ئیمانیان پێنەهێناو جولەکەکانیشیان بۆ مەرەخەس نەکردن[٢] ئەمجار بەگوێرەی سوننەتی خودا لەتاقیکردنەوەو گیرۆدە کردنی بەدرۆخراوەکان بەخۆشیو ناخۆشی، پاش ئەوەی کەهاتنی جۆرەها سزاو بۆ سەریانو رزگار بوونیان لەو سزایانەو تەنبێ نەبوونیان، ئاکامی سەرنج راکێشانیان دیو کارەسات دەقەومێ، پاش ئەوەی پەروەردگار ترساندنی مۆلەتی دانو سودیان لێ نەبینیو فرسەتیان لەکیس چوو گەیشتنە ئەجەلی خۆیان کە دەبوایە پێی بگەن کاتی لەناوبردنیان هات ﴿فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ تۆلەمان لێ ستاندن، بەو جۆرە کە ﴿فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ﴾ لەدەریا دا خنکاندمانو ئاسەوارمان بڕینەوە ﴿بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ چونکە ئەوان ئاياتی جۆراو جۆری ئێمەیان بەدرۆخستنەوە، بەهیچ شتێك بڕوایان نەدەکردو بیریان لەنیشانەکانی خودایەتی ئێمە نەدەکردەوە، رویان لێ وەرگێڕانو هیچ گرنگییان پێ نەدان ﴿وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ﴾ وەکوو کەسێك وابوو کەغافل بێ! واتە: ئەوان لەکاتی هاتنی هەموو ئایەتێکدا، لەو ماوە دا کە عەزابەکەیان لەسەر بوو، ئیمانی خۆیان دەردەخست وادەی ئیمان هێنانیان دەدا، کە عەزابەکەیان لەسەر نەدەما زێوان دەبوونەوە! تاماوەی دیاریکراو تەواو بوو

[٢] في ظلال القرآن ج٣/٦١٨-٦١٩ بەدەستکارییەوە.

ئەجەلیان هات، ئیتر تۆڵەمان لێ ستاندنو لەناومان بردن، چونکە ئەوان هەموو ئایەتەکانیان بەدرۆخستنەوەو بێ ئاگا بوون لەوەی کە بەدرۆخستنەوەکەیان دەبێتە هۆکاری سزای دونیاو قیامەت بۆیانو خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبن.

چونکە ئەو موعجیزەو ئایەتانە بەڕاو بۆچوونی زوربەیان شتێك بوون لەجۆری سیحرو دەستکرد! بۆخۆشیان لەبواری سیحرو سیحربازی دا گەیشتبونە پلەو پایەیەکی بەرز، بۆیە لەگەڵ هاتنی هەر ئایەتێك دا هەوڵیان دەدا کەساحیرەکانیانو زاناکانیان بەرهەڵستی بکەنو دژی بوەستێنو وێنەی بخەنە روو شتی وا بکەن، کە بۆشیان نەدەکرا، دەیانکوت : خەتای مووسایەو ئەو لەسحربازی دا بەسەر ساحیرەکان دا زاڵە، پێیان وابو کە حەزرەتی مووسا هەموشتێك بۆ خودا دەکەرێنێتەوەو پاڵ ئەوی دەدا، وەکوو ئەو پاڵدانەی ئەوانە کە لەرێگەی لاسایی کردنەوەوە شتەکانیان پاڵ خودا درۆزنەکان دەدا، لە کاتێك دا حوکەماو پیاوە عاقڵەکانیان بڕوایان بەو خودا درۆزانەیان نەبو، بەلاّم بۆ ژێردەستەکردنی رەشەخەڵکەکە پارێزگارییان لەو ئایینە پووچەی خۆیان دەکرد.

بەلاّم هەندێکیان بەڵگەی موعجیزەکانی حەزرەتی مووسایان لەدڵ دا چەسپابوو برێکیان لەوانە کە گەورە ساحیرەکان بوون بەئاشکرائیمانیان بە پەیامی مووسا هێناو سوژدەی بەندایەتییان بۆ خودا برد، هەشیان بوو بەدزییەوە لەدڵی خۆیان دا موسوڵمان بووبوون

وەکوو ئەو کەسانە کە لەناو دارودەستەی فیرعەون دا پەنجەی نارەزامەندییان هەڵبڕی دژی تیرۆر کردنی حەزرەتی مووسا. هەشیان بوو بەئەنقەستو لەبەر لوتبەرزیو ئینکاری پەیامی مووسایان کرد وەکوو فیرعەونو گەورە لێپرسراوانی دەرباری فیرعەونو وەزیرەکانی.

جاوەکوو چۆن داروەستەی فیرعەونو کاربەدەستەکانی یارمەتیدەر بوون بۆ رەشەخەڵکەکە لەسەر بلاّوبوونەوەی بیروباوەڕی پووچو پەرەپێدانی لەناویاندا، دەسەلاّتدارەکانی جیهانی ئیسلامیو حکومەتەکانی بەناو موسوڵمان هاوکاری رەشەخەڵکەکە دەکەن بۆ هەرشتێك کە لەئایین دا پەیدای بکەن. با لەئایینیش دا نەبێ بۆ نمونە حکومەتە ئیسلامیەکان ماڵو سامانێکی زۆر خەرج دەکەن بۆ ئاهەنگە بیدعەتە ئاساییەکان کە سالاّنە ئەنجام دەدرێن و بەئاهەنگی ئیسلامی

حلێب دەكرێن وەكوو ئاهەنگی مەولوودنامە كە هەر لە مامۆستا ئاینییەكانەوە تارەشەخەڵكەكە تێكرابەشداری تێدادەكەن.لەكاتێك دا ئەم جۆرەئاهەنگانە چەند تاوانی گەورەیان تێدادەكرێ بەئاشكرا ئایینی ئیسلام دژی ئەو تاوانانەیەو كەسێ بەلایەوە تاوان نەبن بەكۆڕای زانایانی ئیسلام لەئایین دەردەچێ و دەچێتە ریزی كافرو هەڵگەراوە لە ئایین! زوربەی جەماوەر بێ ئاگان لەزیانی ئەم جۆرە بیدعەتانە كەكراون بەشەعائیری ئیسلامو ئاهەنگیان بەبۆنەوە دەگێڕدرێو سەفەری دورو درێژیان بۆ دەكرێو ماڵو سامانی زۆرو زەبەندەیان تێدا خەرج دەكرێ، جاری وادەبێ گەورەترین شەعائیری ئیسلام كەنوێژە بەبۆنەی گێڕانی ئەو جۆرە ئاهەنگانەوە پاشگوێ دەخرێ، خوێندنو فێركردنی عیلمو زانست لەمزگەوتو خوێندنگاكان دا رادەگیرێ![2]

من خۆم كاتێ قوتابی كۆلێژی (ئیمام ئەعظەم) بووم لەبەغدا ساڵانی ١٩٧٢ز لەوەپاشیش لەئاهەنگی مەولوودا لەئەعظەمییە دیاردەی ناپەسەندی وام بینیوە كە لەو ئاهەنگە دا ئەنجام دەدران پیاو شەرمی بەخودا دەهاتەوە، لێم روون بوو كە دەستی كوفرو نەزانی ئەو ئاهەنگە هەڵدەسوڕێنێ. تەنانەت تا ئێستاشو لەوە پێشیش هەموو ساڵێ ئەم ئاهەنگە بەو شێوە ناشەرعییە ئەنجام دەدرێ، هەر لەگۆڕەپانی عەنتەرەوە تا مزگەوتی (أعظمیة) ئەو هەموو كوڕو كچە بەتێكەڵاویو بێ پەردە پاڵەپەستۆو ترانجاندنو خۆڵێك خشاندنیانە، هەر لەنوێژی عەسرەوە تانیوە شەوێكی درەنگ دەوروبەری مزگەوتی (اعظمیة)بەو حەشاماتە زۆرەو لەكوڕی گەنجو ئافرەتی سفورو ئاپووڕە دەدرێو غەزەببارینە!

رەنگە لەوڵاتانی میسر ئەم دیاردەیە زۆر لەهی (أعظمیە)ی تێپەڕاندبێ بۆیە مامۆستای خوالێخۆشبوو مامۆستا محمد غزالی كتێبێكی نوسیوە ناوی ناوە (ثلاثة لیس من الأسلام) سێ شت لەئایینی ئیسلام دا نین یەكێك لەو سێ شتانەی كە ئایینی ئیسلام لێیان بەرییەو لەئایین دا نین بەئاهەنگی مەولوودی لەقەڵەم داوەو زۆر بەتوندی دژی ئەنجامدانی ئاهەنگی مەولوودی بەو شێوە ناشەرعییە دواوە. كەسێك مەبەستی بێ باسەیری كتێبی ناوبراو بكا.

---

[2] بۆ زێدە زانیاری لەم بارەوە سەیری (تفسیر المنار ج٩/٩٦) بكە

## نەتەوەی ئیسرائیل دوای فیرعەونەکانو عەمالیقەکان خاکی میسرو شام بەمیرات دەگرێ

﴿ وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَـٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَـٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾ ﴾

ئەمە بەشێكی تـرە یـان بلێین بەشـی دەیەمـە لەچیرۆكی حـەزرەتی مووسـا لەگەڵ فیرعەوندا.

لێرە دا سـیباقی قورئـان لاپەڕەیـەكی تـر دەخاتـە سـەر شاشـەو نمایـشی دەكا، ئەویش لاپەڕەی جێگیر كردنی هەژارو بێ نەوایەكانە لەسەر زەوی.

جا هەرچەنـدە نەتەوەی ئیسرائیل لـەو رۆژگـارو سـەرو بەنـدانـە دا كـە برێـك لەخۆشـی دا بـوونو هێـشتا بەتـەواوی لـەخودا یـاخی نـەبوو بـوونو زێـر دەسـتـەو پەرتەوازە نەبوو بوون، ئەوان دانیشتوی وڵاتی میـسر نـەبوونو لـەخاكـو نیـشتمانی فیرعـەونو دارودەسـتـەكەی دا نیـشتەجێ نـەبوون، بـەڵكوو ئـەوان لـەوڵاتی شـام دا نیـشتەجێ بـوون! دوای دەیـان سـاڵ لـەرووداوی خنكانـدنی فیرعـەونو لەناوچـوونی ئەمجار میسریان بەمیرات دەست كەوتوە دوای وەفاتی حەزرەتی مووسـا دوای رێ لێ تێكچوونو سـەر لێ شێوانیان لەدەشـتە كـاكی بەكاكییەكـە دا بـۆ مـاوەی چـل سـاڵ - ئەمجار بوونە جێگیرو میراتگری فیرعەونو لەوڵاتی میسرو شام دا نیشتەجێ بوون! بەڵام لێرە دا سـیباقی قورئانەكـە رۆژگـارو رووداوەكـانی دەپێـچێتەوەو لولیـان دەداو خێرا لاپەڕەی میراتگرتنو جێگیر بوونیان نمایش دەكا بـۆ ئـەوەی لاپـەڕەی دیمەنـە لێك جیاكان - فەوتانی فیرعەونو جێنشین بوونی نەتـەوەی ئیـسرائیل لـەو شـوێنو

جێگایانە - پێکەوە بگونجێنیو دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُوا يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ بەمیرات خاکی پڕپیتو بەرەکەتو پیرۆزمان دا بەنەتەوەی بێ دەسەڵاتو چەوساوەو ژێردەستەی ئیسرائیل. ئەو نەتەوەیەی کە فیرعەون دەیچەوساندنەوە، کوڕەکانی دەکوشتن، نەی دەهێشت نێرەکانیان دوای لەدایکبوون بژین، مێیەکانیشیانی دەهێشتەوە، کارەکەریو خزمەت چییەتی پێ دەکردن،

سەرانەو مەڕانەی لێ دەستاندن، ئەو پیاوانەی کە بەزیندویی دەیهێشتنەوە خزمەتکاری پێ دەکردن!

خاکی پیرۆزی میسرو شاممان دا بەنەو نەتەوە ژێردەستە زەبوونەو کردمانن بەجێنشینی فیرعەونی ملهوڕو داروودەستەی ستەمکاری. خۆرهەڵاتی ئەو خاکە پیرۆزە کە لەسنوری شامەوە دەست پێ دەکا تا خۆرئاوای کەسنوری میسرە هەموومان خستە ژێر دەسەڵاتی ئەوانەوە، ئەو خاکەی کە بەپیرۆزمان داناوە، خاکی پڕپیتو بەرەکەتو بەروبووەو میوەجاتە، خاوەنی سەرچاوەو کانیاوو جۆگەو جۆبارو روبارە، وڵاتێکی دڵگیرو هەوا سازو پڕ باغو دارستانە، ئەوەش بۆ بەجێهێنانی وادەو بەڵێنی خۆمان کە لەوەپێش دابوومان بەنەتەوەی ئیسرائیل!

وادەو بەڵگەکەش ئەوەیە کەدەفەرموێ: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ، وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ -القصص\٥-٦﴾

١- شێخ حەسەنی بەسریو قەتادە: لەراڤەکردنی ﴿مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ فەرمویانە مەبەست بەوخاکە خاکی وڵاتی شامە.

٢- زەیدی کوڕی ئەسلەم دەفەرموێ مەبەست گوندەکانی شامە. عەبدوڵڵای کوڕی شەوذب دەڵێ: مەبەست خاکی فەلەستینە.

٣- کە عەبولئەحبار دەڵێ: پەروەردگار پیرۆزی و بەرەکەتی خستوەتە وڵاتی شامەوە لەفوراتەوە تا ( عریش).

ئەوەی کە پاڵپشتی ئەو ریوایە تانە دەکا فەرمودەی پەروەردگارە کە لەچیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم دا دەفەرموێ ﴿وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطاً إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا

فِيهَا لِلْعَالَمِينَ﴾.

یان لەچیرۆکی حەزرەتی سولەیمان دا دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا﴾ یان لەباسی شەورەوی پێغەمبەر دا دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ﴾.

٤- ئیمامی لەیثی کوڕی سەعد دەفەرموێ: مەبەست بە(الأرض) لەئایەتەکە دا خاکی میسرە، ئەو خاکەی کە نەتەوەی ئیسرائیل تێدا بوون،.

٥- بڕێ ڕاڤەکەرانی تر دەفەرمون: مەبەست بە(الأرض) خاکی میسرو فەلەستینە.

٦- بڕێکی تر پێیان وایە مەبەست بە(الأرض) جینسی زەوییە، چونکە حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمان کە لەنەتەوەی ئیسرائیلن فەرمانڕەوایی هەموو زەویان کردوە!!

﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ الْحُسْنَى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا﴾ واتە: جێ بەجێ کراو ڕەهابوو کەلیمەی خودای تۆ بەئاکام گەیشت. مەبەست بە(کەلیمە) لێرە دا وادەو بەڵێنی پەروەردگارە بۆ نەتەوەی ئیسرائیل بەوە کە دوژمنیان بۆ لەناو بەرێو خۆیان ببنە جێگرو میراتگری دوژمنەکانیان لەسەر زەوی، ئەو وادەو بەڵێنەی کە قورئان ئاماژەی پێ دەکاو لەسەر زوبانی حەزرەتی مووسا دەفەرموێ: ﴿عَسَى رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الأَرْضِ﴾ (الأعراف/١٢٩) هەروەها ئەم وادەیەی کە ئایەتی ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ. القصص/٥﴾.

بەڵێ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ الْحُسْنَى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا﴾ فەرمانی پەروەردگاری تۆ جێ بەجێ بوو، وادەو بەڵێنی خودای تۆ بەباشیو تەواوی هاتە جێ بەسەر نەتەوەی ئیسرائیلدا، بەمرادی گەیاندنو ڕزگاری کردن، چونکە لەبەرامبەر ستەمکاری فیرعەون دا خۆیان گرتو بەصەبرو ئارام بون، زۆریان ئەزیەتو چەرمەسەری لەدەستی فیرعەونو دارودەستەکەی بینی! بەڵام ئەوان خۆیان ڕاگرتو گوێ بیسی حەزرەتی مووسا بوون کە فەرمانی پێکردن کە داوای

کۆمەکی لەخودا بکەنو خۆگر بن ﴿قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُوا – الأعراف/١٢٨﴾ بەڵێ صەبرو ئارام گرتن لە بەرامبەر بەڵاو تەنگانە دا کلیلی رزگاربوونە! کەسێك لەبەرامبەر بەڵاو موصیبەت دا دادوفیغان بکاو هاواری لێ هەڵستێ، پەروەردگار کۆمەکی پێ ناکاو بەبەڵاکەی دەسپێرێ.

کەسێکیش لە بەرامبەر بەڵاو موصیبەت دا بەصەبرو ئارام بێ، پەروەردگار رێگای رزگاربوونی بۆ دەستەبەر دەکاو سەرئەنجام بەمراز دەکا. ﴿وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ وَمَا كَانُوا يَعْرِشُونَ﴾ ئەوەی فیرعەون و دارودەستەکەی بنیاتیان نابوو روخاندمان تێکمان دا هەرچی باڵەخانەو خانوو بەرەی دروستیان کردبوو، هەرچی باغو داری بەرداری پەروەردەیان کردبوو، هەرچی کە پرو ساباتی دروستیان کردبوو بۆ دارە بەردارەکانیان، بۆ باغەکانیان دارەکان لقو پۆپی خۆیان بەسەر ئەو کەپرانە دا پەخش کردبوو. هەمومان تێك روخاندن! هەروەها هەرچی فرتو فێڵو سیحربازییەکی بەکاریان هێنا هەمووەمان پووچەڵ کردەوەو لەناومانبردن!

## هۆکاری ئەم روخاندنو تێکدانە چەند شتێکن:

١- ئەو ئایەتو نیشانانەی کە پەروەردگار بۆ پاڵپشتی کردنی حەزرەتی مووسا نیشانی فیرعەونو قەومەکەی دان وەکوو تۆفانو کوللەو خوێنو گرانیو ئەسپێو ئەم جۆرەشتانە.

٢- رزگارکردنی نەتەوەی ئیسرائیل لە چنگی فیرعەون، مەحرومبوونی فیرعەنو داروەستەکەی لەبەکارهێنانو چەوساندنەوەی نەتەوەی ئیسرائیلو سوود نەبینیان لەکارو کردەوەیان.

٣- لە ناوبردنی فیرعەونو داروەستەکەیو مەحرومبوونی گەلو وڵات لەبەروبومی ئیشو کارەکەیان لە بواری ئاوەدانبوونەوەی وڵاتدا.

خوێنەری هێژا! سەیربکە قورئانی پیرۆز چۆن پەردە بەسەر دیمەنەکان دا دەداتەوە، لەلایەك پەردەی دیمەنی لەناوچونی فیرعەونو داروەستەکەیو روخانی خانوبەرەو قەصرو باڵەخانەو، وێرانبونی باغو رەزانی کەپرو ساباتی نێو باغەکان کە بۆ دارەبەردارەکان دروستکرابوون، دادەتەوە!!

لەلایـەکی تـرەوە دیمـەنی جێگـری‌و میراتگرتنـی نەتەوەیـەکی ژێردەسـتەو چەوسـاوە لـە ولاَتێکـی پڕپیـتو بەرەکـەت دا ڕادەنـوێنێ کـە دەبنـە میراتگـری فەرمانڕەوایـەکی سـتەمکارو ملهوڕ! ئـەوەتا لـە چاولێکنانێك دا لـەدوتوێی چـەند وشەیێکدا دیمەنی لەناوچونی فیرعەونی ملهوڕو ستەمکارو داردەستەکەی بـەهۆی خنکانیان لەناو دەریادا، ڕوخانو وێرانبوونی خانو بەرەو باڵەخانەو باغو باغاتیـان هـەموو ئەمانـە ڕادەنوێنـدری‌و لاپـەڕەی ڕورەشـی مێـژوویان دەپێـچرێتەوەو دەبنـە پەندو عیبرەت بۆ هەتاهەتایە!!

## پەند وەرگرتن لەم ئایەتانە بەدووجۆرە:

١- دەبێ ئێمە کە ئەم ئایەتە پیرۆزانـە دەخوێنینـەوە ئـەوەمان بـۆ دەربکـەوێ کە بیروباوەڕی راستەقینە چ ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لەهەڵسوکەوتی حـەزرەتی مووساو حەزرەتی هاڕونی بـرای دا ﷺ کـە بـەوزەو تینـی ئـەو بیروباوەڕەیـان بەگژ پاشایەکی ملهوڕی سـتەمکاری وەکوو فیرعـەون دا چوونەوە. بەئاشکراو بـێ پـەردە داوایان لێ کـرد کـە واز لەسـتەمکاری‌و کوفرو یـاخی بـوون بێنـێ. چیدی نەتـەوەی ئیسرائیل بەکۆیلـە سـەیر نـەکاو نەیانـچەوسێنێتەوە، نـەك هـەر ئەوەنـدەو بـەس! بـەڵکوو هەڕەشـەیان لێ کـردو ترسـاندیانو بـەردەوام بـوون لەسـەر بەربـەرەکانی کردنی‌و بەڵگە هێنانەوە بۆ بۆڕدانی تا سەرەنجام بەسەری دا سەرکەوتنو نەتـەوەی ئیـسرائیلیان لەچـنگی خـۆی‌و داردەسـتەکەی ڕزگـار کـرد. کـەوابێ پێویـستە موسوڵمانان، ئەوانـەی بڕوایـان بـەخوداو پێغەمبـەر هەیـە کە سـەرنجی ئـەم جۆرە ڕوداوو سەرگوروشتانە دەدەن، بیر لەوادەو بەڵێنی پـەروەردگار بکەنـەوە کە لەسـەر زوبانی پێغەمبەران بەڵێنی یارمەتی دانو کۆمەکی پێ کردنو سـەرکەوتنی پێـداون بەمەرجێك پابەنـدی فـەرمانی خـودا بـنو شوێن پـەیامی پێغەمبـەر بکـەون، نـابێ جگـە لـەخودا لـەهیچ هێزێـك بترسـن، چـونکە هێـزی ڕاسـتەقینە تـەنها هێـزی پەروەردگارە، ئـەو هێزەیـە کـە گـەورەترین دیکتـاتۆرو ملهوڕی بـەدوو کـەس لـەناو برد! گـەورەترین دەسـەڵاتو حوکومـەتی ئـەو ڕۆژگـارەی بـەدوو کـەس ژێـرو زەبـەر کرد!.

پـەروەردگار بـۆ خـۆی دەفـەرموێ: ﴿إِن تَنـصُرُوا اللَّـهَ يَنـصُرْكُمْ﴾ هـەروەها

دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾

٢- عیبرەتــی دووەم: ئەوەیــە لــەرۆژگاری ئێمــە دا ململانییــەکی ســامناك لەگۆڕییە لەسەر ئەو خاکەی پەروەردگار بەخاکی پیرۆزو موقەدەسی داناوە. ئـەوەتا ئێستا ئـەو خاکـە پـیرۆزە بەدەسـتی جولوکەوەیـە، موسـوڵمانانی لێ وەدەر نـراونو جولەکە داگیری کردوە، مزگـەوتی قـودس کـە یەکـەم قیبلـەی موسـوڵمانانو سێیەم حەرەمی پیرۆزە کەوتۆتە ژێر چنگی ئەو خوانەناسو ناپەسەندو ئاشووبگێڕانەوەو کردویانە بەپایتەختی فیتنەو ئاشووبـو، گاڵتە بەهەسـتو شعوری زیـاد لـەملیارێك موسـوڵمان دەکـەنو، رۆژ لـەدوای رۆژ زیـاترو زیـاتر دەسـەڵاتی خۆیـان دەسـەپێننو فراوانی دەکەنو هەوڵی دامەزراندنی حکومەتی ئیسرائیلی گەورە دەدەنو دەیانەوێ هـەموو وڵاتــی نێــوان نیــلو فــورات کــۆنترۆڵ بکــەن! رۆژانــە خــەڵکی موســوڵمانی فەلەسـتینی لەزێـدو نیـشتمانی خۆیـان وەدەردەنـێن خـانو بـەرەیان داگـیر دەکـەنو دەڕوخێـنن، لەهـەر چـوار لای دونیـاوە جولەکـە کۆدەکەنــەوەو بـەرەو فەلەسـتین راکێش دەکرێنو کۆمەڵگای هاوچەرخیان بۆ دروست دەکریو نیشتەجێ دەکرێن.

هۆکاری ئەمـەش ئاشـکراو نمایانـە، هـەموو موسـوڵمانێکی خـاوەن بـیرو هـۆش دەزانـێ کـە هۆیەکـەی دورکەوتنـەوەی موسـوڵمانانە لەپـەیامی قورئـان، وازهێنانـە لـەجیهاد، دروسـت بـوونی پـارتو ئـەحزابی عیلمـانیو بێگانـە پەرسـتە کـە وەکـوو داردەسـتو مقاش وان بەدەستی داگیرکەرانەوە، موسوڵمانان بۆ خۆیان بوونە دەیەها حکومــەتو ســەدەها تــاقمو حیــزبو گرۆهــو رێکخــراوی جیــا جیــاو هەریەکــەیان لەهەوایەك دەخوێنیو شادە بەلایەك دێنێ، هەموویان لەناو خۆیان دا شەڕو هـەراو کێشەو نیزاعیانــە: بڕبــڕ بــوونو تێــك بــەر بــوون، دوژمنیــان پــاڵی لێ داوەتــەوەو ســەیریان دەکــا، کــابرا وتــەنی: ئەگــەر مێــشان کێــشەیان تێکــەوێ پیــاو خــەوی لێ دەکەوێ!

قورئانیش بەئاشکراو نمایان فەرمان بەموسوڵمانان دەکا کە پەرتەوازە نـەبن، کێشەیان تێ نەکەوێو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ بـەکورتی هەتا ئەو گیانەی کە عومەری کوڕی خـەططابـی هـەڵناو هـات قودسـی رزگار کـرد، هەروەها ئـەو گیانـەی کـە (صـلاح الـدین)ی هـەڵنا بـۆ رزگـار کردنـەوەی قـودس لـە

چـنگی خـاچ پەرسـتان هـەتا ئـەو گیانـە نەگەڕێتـەوە بـۆ نـاو موسـوڵمانانو بـەو بیروبـاوەڕەوە جـارێکی تـر ڕانەبنـەوە موسـوڵمانان حەسـودیان پێنـابرێو قودسـی پیرۆزیش ڕزگاری نابێ!!

## سپڵەیی نەتەوەی ئیسرائیل بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا

﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿١٤١﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار جۆرەکانی نیعمەتی خۆی (کە دابوونی بـە نەتـەوەی ئیسرائیل) ڕون کردنەوە، بەم شێوە دوژمنی سەرسەختی لە ناوبردنو خاکو وڵاتـو شـارو دێهـاتی فیرعـەونو قەومەکـەی بـەمیرات پێـدانو، کردنـی بـەجێگری ئـەوان. ئـەمجار بەشـوێن ئـەوە دا باسـی نیعمـەتێکی تـری گـەورە دەکـا کـە پـێی بەخـشین، ئەویش بریتی بوو لەوە کە بەسـەلامەتی لـە دەریـا پەڕاندنیـەوە! کەچی لـەجیاتی شـوکرانە ژمێـریو سوپاسـگوزاری هەڵگەڕانـەوە، داوایـان لـە حـەزرەتی مووسـا کـرد

بتپەرستی بکەنو بتیان بۆ دیاری بکا.

ئەمەش دڵدانەوەی پێغەمبەری ئیسلامە بۆ ئەوەی بەهەڵوێستی جولەکەکانی مەدینە دڵتەنگ نەبێ، چونکە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خۆیان: (حەزرەتی مووسا) کاری خراپتریان کردوە، هەڵوێستی ناشیرینتریان نواندوە، لە هەمانکات دا هەڵنانی موسوڵمانانی تێدایە بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن لەسەر نیعمەتەکانیو وەکوو نەتەوەی ئیسرائیل سپڵەو ناکەسبەچە نەبن.

بەڵێ پەروەردگار نەتەوەی ئیسرائیلی لە چنگی فیرعەونو داروەستەکەی رزگارکرد، بەسەلامەتی لە دەریا پەڕینەوە بەسەر بنگی دەریا دا بەڕۆیشتن بەبێ کەشتیو بەلەم پەڕینەوە! ئەمەش دوای ئەوەی کە یەزدان نیگای بۆ حەزرەتی مووسا کرد کە بەعەصاکەی لەدەریا بدا ئەویش لێی داو دەریا رێ رێو کۆلان کۆلان بوو، ئاوەکەی نێوان رێگاکان وەکوو کێوی گەورە بەرز بوەوە، حەزرەتی مووساو نەتەوەی ئیسرائیل بەرێبازەکان دا رۆیشتنو ئەو بەرکەوتن، فیرعەونو لەشکرەکەی شوێنیان کەوتن ویستیان پێیان بگەن، هێشتا سەرەتای لەشکری فیرعەون نەگەیشتبوونە کەنار ئەوبەرو پاشەتاکەشیان لەمبەر چوو بوونە ناو دەریاکەوە، ئیتر دەریا وێکهاتەوەو ئاو دایپۆشینو خنکان! پەروەردگار ئەم روداوە سەر سوڕهێنەرەی لەشوێنێکی تر دا باسکردوە دەفەرموێ: ﴿فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ، وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ، وَأَنجَيْنَا مُوسَى وَمَن مَّعَهُ أَجْمَعِينَ، ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ، إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ- الشعراء/٦٣-٦٧﴾ لێرەش دا زنجیرەیەکی تر لەچیروکەکە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ﴾ لەتەك حەزرەتی مووسا دا نەتەوەی ئیسرائیلمان لەدەریا ئەوبەر خستن، بەسەلامەتیو بێ دەردی سەری لەدەریا تێپەڕین، زۆر نیشانەی گەورەیی خودایان بەچاوی خۆیان بینی، دەریا بۆیان شەق بوو رێبازی تێکەوتن، بەوشکانی دا رۆیشتن، بەچاوی خۆیان بینییان فیرعەونو لەشکرەکەی لەناو دەریا دا خنکان. پاش پەڕینەوەیان لەدەریا، ﴿فَأَتَوْا عَلَى قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَّهُمْ﴾ بەلای گەلو نەتەوەیەك دا تێپەڕین کە بتیان دەپەرستن. - دەڵێن: ئەو نەتەوە بت پەرستە عەرەبە کەنعانیەکان بوون- جا کە دیتیان ئەو

قەومـە بتـەکانیان دەپەرستن ئـەوانیش یـادی بـت پەرسـتی کۆنی خۆیـان کـردەوە، داوایان لە حەزرەتی مووسا کردو ﴿قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَل لَنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ﴾وتیان: ئەی مووسا! بتـو صەنەممان بۆ پەیدابکە بۆ ئەوەی بتپەرستی بکەین! وەکوو چۆن ئەوگەلە بتیان هەنو دەیانپەرستن!

وادیارە سروشتی نەتـەوەی ئیسرائیل - وەکوو قورئـان لـە چەنـد شـوێنێك دا رای دەنوێنێ - سروشتێکی لاوازی لە فۆك بـووە، گیـانێکی لـەرزۆكو دڵێکی راڕایـان هەبوە، رێگای هیدایەتیان دۆزیوەتەوە کەمێك پـێ دا رۆیـشتوونو خێـرا رێگایـان لێ گوم بـووە، تۆزێـك بەرزبوونـەوەو ئاهێکیـان تێگەڕاوەتـەوە کەچـی لـەپڕ سـەریان لێ شـێواوەتەوەو کەوتونەتــەوە زەلکـاوی گومڕاییــەوە! ئــەگینا چــۆن بــەو جــۆرە هەڵسوکەوتیان دەکـرد!؟ ئـەوەتا لەگـەڵ ئـەوە دا کـە حـەزرەتی مووسـا بیـست سـاڵ لەهەندێ ریوایەتدا بیستو سێ ساڵ بـوو، هەمیـشە دەرسـی دادەدانو فێـری خـودا پەرستی دەکردن، کەچی هەر بەوەنـدە کـە ئـەو گەلـەیان بینـی هـەموو مـوعجیزەو نیعمەتـەکانی خودایان لـەبیر چووەوەو داوایـان لەموسا کـرد بتیـان بـۆ دیـاری بکـا بیپەرستن!

سـەیرە! ئەگـەر هـەر بـۆ خۆیـان بتێکیـان دیـاری بکردایـەو بیـان پەرسـتایە کارەکەیان ئەوەندە سەرسوڕهێنەر نـەدەبوو، بـەڵام لێـرە دا سـەیرەکە لەوەدایـە کـە داوا لەحەزرەتی مووسا بکەن پێغەمبەرو فروستادەی خـودا کـە ئـەو رازیبـێ بـەبت پەرستیانو بۆ خۆشی ئەرکی دەسنیشان کردنی بتەکـەیان بـۆ بگرێتـە ئەسـتۆ! ئـەو لەجیاتی خودای پەروەردگار بتـو صەنەمیان بـۆ دیـاری بکـاو بیـان پەرسـتن. بـەڵام دەڵێی چی ئەوە نەتەوەی ئیسرائیلەو ئەوە هەڵسوکەوتیان بووە! پاش زیاد لەبیـست سال بانگەوازی حـەزرەتی مووسـا بۆیـانو دەرس دادانو فێرکردنیـان هـەر ئەوەنـدە لەیەکتا پەرستی حاڵی بوونو ئەوەندە فێری خودا ناسی بوون! ئاشکرایە ئەم جۆرە داوایانە نیشانەی گێلیو نەزانیو زەبونی ئادەمیزادە لەهەموو چەرخو رۆژگارێکدا، بۆیــە هەنــدێ لــەهاوەڵانی پێغەمبــەرﷺ کــەتازە موســوڵمان بــوون داوایــەکی لــەم جۆرەیـان لەپێغەمبـەرﷺ کـرد چـونکە هێـشتا دەمـاری بـت پەرسـتی لـەناخیان دا مابوو!

ئیمامی ئەحمەدو نەسائی لەئەبو واقیدی لەیثییەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەر دا بەرەو حونەین رۆیشتین بەلای درەختێکی سیدردا تێپەڕین، وتم قوربان تۆیش ئەم درەختەمان بۆ بکە بە(خاوەن نوط)[4] وەکو چۆن کافرەکان درەختی (خاوەن نۆط)یان هەیە، پێغەمبەرﷺ فەرموی : (الله أكبر) ئەم داوەیەت دەق وەکوو داواکاریەکەی نەتەوەی ئیسرائیل وایە کە بەحەزرەتی مووسایان گوت: ﴿اجْعَل لَّنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ﴾ ئێوە بە ڕێبازی ئەو نەتەوانەی پێش‌خۆتان دا دەڕۆن.

بەداخەوە ئێستاش موسوڵمانان ئەم ڕەگە بتپەرستیەیان تێداماوە، لە میسر داری حەنەفی‌و داری (ست المنصورة) بەناوبانگ بوون، خەڵکی ڕێزی لێ گرتوونو بەپیرۆزیان زانیون، تا لەم ساڵانەی دوایی دا داری حەنەفییان لە بێخ دەرهێنا.[5] نازانم درەختی (ست المنصوره) ماوه یان نا؟! لەسلێمانی خۆشمان دارێك لەمزگەوتی گەورە دا هەبوە نزیك ئارامگای کاك ئەحمەدی شێخ خەڵکی بەپیرۆزیان دەزانی، لەدوای ساڵانی/١٩٥٠ی‌ز یەوە کە مزگەوتەکە تازەکرایەوە دارەکەش سەری تێدا چوو بەڵام تا ساڵی ١٩٧٨ی‌ز کۆلکە دارەکەی بنکی مابوو، خەڵکی تەڵاش تەڵاش لێیان دەکردەوە بۆ موتفەرك، تەنانەت من بۆخۆم بەچاوی خۆم بینیومە پڕوپیرێژن زەوییەکەیان بۆ هەڵدەکۆڵی بۆ ئەوەی بەئەندازەی نینۆکێکیان لەبنە تۆڵەکەی وەگیر بکەوێ بۆ ددان هێشەو سکهێشەو مندالبوونو ئەم جۆرە شتانە بەکاریان دەهێنا. چونکە بەموتەفەرکیان دەزانی! باش بوو لەدەوروبەری ساڵی١٩٨٣ز دا شوێنەکەیان کۆنکرێتو کاشی کردو ئاسەواری نەماو لەبیرچووەوە.

نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو ئێستاش لەزۆر شوێنی جیهانی ئیسلامی دا خەڵکی ئارامگایەك یان درەختێك یان بەردێك بەپیرۆز دەزانن لەدەوری کۆدەبنەوە بەدەوریا دێنو دەچن، ماچی دەکەن، خۆی تێ هەڵدەسوون دەیلێسنەوە لێی دەپاڕێنەوە نەخۆشیان بۆ چاك بکاتەوە، دوژمنیان بۆ لەناوبەرێ، نەزۆك مندالی

[4] کافرەکان لەدەوری درەختی سیدر ڕمەکانیان دەمانەوە، شمشێرو ڕمەکانیان پێ دا دەکەن بەم جۆرە درەختیان دەگوت، (ذات أنواط).

[5] تفسير المراغي ج٣/جزمی٩/٥٢.

ببێ فلان سوودیان پێبگەیەنێ، فیسارە زیانیان لێ دوور بخاتەوە. لەکاتێك دا ئەمانە بەنەصصی قورئانو بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ حەرامن ئایین بەناپەسندیان دەزانی، ئەمە بیانەوێو نەیانەوێ جۆرێك لە بتپەرستیو شەریك بۆ خودا دانانە، چونکە حەقیقەتی عیبادەت بریتیە لە وتنی قسە، یان کردنی کارەکە ئاراستەی ڕێز لێ گیراوێکی بکەیو هێوای سودت پێبێ یان ترسی زیانت لێ هەبێ!

حەزرەتی موسا کە ئەم داوا نابەجێیەی لەنەتەوەکەی بەرگوێ کەوت رقی هەڵساو تورەبوو ﴿قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ وتی: بەراستی ئێوە گەلو نەتەوەیەکی نەفامو تێنەگەیشتوون پلەو پایەی خودایەتیو یەکتاپەرستی نازانن، بەتەواوی گێلو گەوجن، تائێستا فێری ئەوە نەبوون کە تەنیا خودا شیاوی پەرستنەو هەر ئەو عیبادەتی بۆ دەکرێ. ئەمجار حەزرەت درێژە بەرەتکردنەوەی داواکاریەکەیان دەداو زیاتر نەزانیو گەوجییان دەستنیشان دەکاو هەوڵ دە دا وەهۆش خۆیان بێنەوە لەهەڵوێستیان ژێوان ببنەوە نەوەکو بەدبەختو چارە رەشی دونیاو قیامەت ببنو فەرموی: ﴿إِنَّ هَٰؤُلَاءِ مُتَبَّرٌ مَا هُمْ فِيهِ وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان ئەو بتپەرستانەی کە لەدەوری بتەکانیان کۆبوونەوەو بتپەرستی دەکەن، بڕیاری لەناوچوونیان دراوەو سەرئەنجام بەرەو فەوتان دەڕۆنو کردەوەکانیان پووچو بەتاڵەو هیچ سوودی لێ نابینن، ئەو دیاردەی بتپەرستیەی کە ئەوانە ئەنجامی دەدەنو ئەو فرە خوداییو شەریك دانانو لادان لە یەکتاپەرستیو پەیڕەو کردنی رای پووچو هەڵە هەموویان بەتاڵنو دەفەوتێنو بەرقەرار نابن .

ئەمە مژدەیە کە لەحەزرەتی مووساوە کە ئەو وڵاتە بت پەرستی تێدا نەمێنێ! مژدەکەش وەدی هاتو شکور بتپەرستی لەو خاکە دا ئاسەواری نەماوە.

ئەمجار حەزرەتی مووسا زیاتر غیرەت دەیگریو سەرسوڕمانی زیاتر لێ دیاری دەداو پێی سەیرە کە گەلەکەی ئاوا بەزوویی ئەو هەموو نیعمەتو بەخشیشانەی خودایان لەیاد کردو ئارەزۆی بتپەرستیان کەوتۆتە سەرو ﴿قَالَ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ فەرمووی ئایا چۆن دەگونجێ من جگە لەخودای پەروەردگار پەرستراوێکی ترتان بۆ دیاری بکەمو ڕێگە بدەمو رازی بم ئێوە بتپەرستی بکەن، لەحاڵێك دا کە پەروەردگار بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، ئەم

هەموو نازو نیعمەتانەی بەئێوە بەخشیون، لەدەستی دوژمن‌و ستەمکارو ملهوڕی وەکوو فیرعەون رزگاری کردن، بەهۆی یەکتاپەرستی‌و خودا ناسینەوە بەسەر هەموو ئادەمیزایانی هاوچەرخی خۆتان دا ڕێزداری کردون، بەکورتی: حەزرەتی مووسا سەرەتا وەڵامەکەی بەوە دانەوە کەئەوان نەفام‌و نەزان‌و گێلن پلەو پایەی خودایەتی یەکتاپەرستی نازانن، ئەمجار ئەوەی رونکردەوە کە ئەوەی ئەوان داوای دەکەن بەتاڵ‌و پوچەو پایەدارنیەو لەناودەچێ، ئەمجار ئەوە دەچەسپێنێ کە عیبادەتکردن بۆ غەیری خودا شتێکی نەگونجاوو نادروستە، بەهیچ شێوەیەك نابێ بیر لەوە بکەنەوە، جا پەرستراوەکە مەخلوقێکی ڕێزدار بێ وەکوو فریشتەو پێغەمبەران، یان دروستکراوێکی بێ ڕێز بێ وەکوو بتو صەنەم، ئەمجار نارەزامەندی خۆی دەربڕی بەرامبەریان کەوەندە گێلن داوایان لێ کرد ئەو خۆی بتو صەنەمیان بۆ دیاری بکا! بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێ کە داواکردنی ئەم جۆرەکارانە نیشانەی ئەوەیە هێشتا لە مانای پێغەمبەرایەتی تێنەگەیشتوون ئەمجار پەروەردگار باسی منەتو نیعمەتەکانی خۆی بەسەر نەتەوەی ئیسرائیل دا دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَنجَيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾ ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! یادی ئەو نیعمەتە گەورەیەی ئێمە بکەنەوە: کە بەهۆی ناردنی مووساو پاڵپشتی کردنمان بۆی، بۆ ئێوەمان رزگار کرد لەچنگی فیرعەون‌و دارودەستەکەی کەسزای بەئێشیان پێ دەچەشتن‌و دەیانچەوساندنەوە بەم جۆرە درندانە کە ﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ﴾ هەر منداڵێکی نێرینە لە دایك بوایە خێرا دەیانگوشتو لەناویان دەبرد ﴿وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ﴾ منداڵی مێیینە یان دەهێشتەوە بۆ ئەوەی زیاتر هێزو تواناتان کەم بێتەوە باشتر ئامادە باشیتان تێدابێ بۆ خزمەتکردن، ﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ لەوسزاو ئازار دانەتان بەوشێوە درندانەو نامرۆڤانەیە، ئەمجار رزگاربونتان لە چنگی ئەو ملهوڕە ستەمکارەو ڕێزدارکردنتان بەسەر هەموو ئادەمیزانی هاوچەرخی خۆتان‌و جێگیربونتان لەسەر خاکی پیرۆز، تاقیکردنەوەیەکی گەورە هەیە بۆ ئێوە، پەروەردگار بەو ئاڵ‌و گۆڕە تاقیتان دەکاتەوە، بەڕاستی بەتاقیکردنەوەیەکی مەزن‌و بەسوودە لەلایەن خودای خۆتانەوە! ئای کە جێی خۆیەتی ئێوە سوود لە روداوی مێژوو وەربگرن، چونکە

کەسێك دوای ناخۆشی خۆشی بدرێتێ، لە کۆیلایەتی رزگاری ببێو ئازادیو سەرفرازی دەست بکەوێ پێویستە سوپاسگوزاری خاوەن نیعمەتبێ. دەی لە هەموو شتێك سەیرتر ئەوەیە کە سەربازی ئەو هەموو نیعمەتو خۆشییەی خودا داویە بەنێوە، دوای ئەو هەموو موعجیزەو نیشانانەی بەچاوی خۆتان بینیتان لە سەر دەستی مووسا کەچی بێن داوای ئەوەی لێ بکەن کە لە پەستترین مەخلووقات بتو صەنەمتان بۆ دەست نیشان بکا بۆ ئەوەی بیپەرستن، بۆ ئەوەی بیکەنە واسیتەو وەسیلە لەنێوان خۆتانو پەروەردگاردا!!

## گفتوگۆ کردنی حەزرەتی مووسا لەگەڵ پەروەردگاردا

﴿ ۞ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ

وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا ۚ سَأُو۟رِيكُمْ دَارَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار کۆمەڵێك نیعمەتی خۆی بەسەر نەتەوەی ئیسرائیل دا ژماردن، وەکوو رزگار کردنیان لەکۆیلایەتی کردنی فیرعەون، وەدەستهێنانی سەربەخۆیی‌و سەرفرازی، ئەمجار لێرە باسی هاتنە خوارەوەی تەورات دەکات بۆ سەر مووسا، ئەو تەوراتەی کە دەستوورو یاسای ژیان بوو، رونکەرەوەی شەریعەت‌و حوکمی خودا بوو بۆیان..

وەکو ریوایەت کراوە: حەزرەتی مووسا هێشتا لە میسر بوو، وادەی بە بەنو ئیسرائیل دا: کە ئەگەر خودا دوژمنی سەرسەختی لەناوبرد، لەلایەن خوداوە پەراوێکیان بۆ دەهێنێ هەموو یاساو حوکمێکی تێدا بێ چی دەکەن‌و چی ناکەن تێی دا رون کراوەتەوە، جا کە فیرعەون بەهیلاکچوو، حەزرەتی مووسا داوای نامەی ئاسمانی لەپەروەردگاری خۆی کرد، ئەم ئایەتانەی ئێرە باسی چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی تەورات دەکەن‌و دەفەرموێ: ﴿وَوَاعَدْنَا مُوسَى ثَلاثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ واتە: پەروەردگار وادەی گفتوگۆ کردنی لەگەڵ مووسا دا دوای تەواو بوونی (سی) شەو، فەرمانی پێ کرد کە ئەو سی رۆژە بەرۆژوو بێ، ئەویش بەرۆژوو بوو، سی رۆژەکە لەمانگی (ذیلقەعیدە) دا بوو، کە تەواو بوو مووسا بۆنی دەمی خۆی پێ ناخۆش بوو بەلقەدارێك سیواکی کرد، پەروەردگار فەرمانی پێ کرد کە دە رۆژی تر لەمانگی (ذیلحیجە) بەرۆژوو بێ، کاتی ئاخاوتن‌و گفتوگۆ کردن لەگەڵ پەروەردگار دا بەرۆژوو بێ. ئیتر کاتی گفتوگۆکە کەوتە کۆتایی تەواو بوونی چل شەوەکە.

ئێستا قۆناغی یەکەم لەو ئەرکەی حەزرەتی مووسای بۆ روانە کرابوو تەواو بوو، قۆناغی رزگار کردنی نەتەوەی ئیسرائیل لەژیانی کولە مەرگی‌و چەوسانەوەو ئازار چەشتن بەدەست فیرعەون‌و دارو دەستەکەیەوە کۆتایی هات، لەژیانی ژێر

دەستەی‌و بەندایەتی رزگاری کردن بەرەو سارای بەرفراوانو هەوا ساز رەوی پێ کردن بۆ خاکی پیرۆز... بەلاّم هێشتا ئەو گەلە تازە رزگار کراوە ئامادە باشی ئەومیان تێدا نەبوو کەئەرکی جێنشینی بگرنە ئەستۆو پابەندی ئایینی پەروەردگاریان بن..! ئەی ئەوە نەبوون بینیمان هەر بەوەندە کە چاویان بەگەلێك کەوت بتیان دەپەرستن ئەوانیش خێرا دڵیان بۆ بتپەرستی کورکاندی‌و ئارەزۆی هاوەڵدانان بۆ خودایان جولا، ئەو بیروباوەڕەی مووسا فێری کردبوون دەربارەی یەکتاپەرستی‌و خوداناسی کرمۆڵ بوون لێیان تێکچوو! بۆیە پێویست بوو کتێبێکی فراوانیان بۆبێ، پەیرەو پرۆگرامێکی دورو درێژیان بخرێتە بەردەستو بەسەریان دا بخوێندرێتەوەو لەژێر رۆشنایی ئەو نامە ئاسمانییە دا پەروەردە بکرێن، ئامادە بکرێن بۆ ئەو ئەرکە گرنگەو کارەگەورەیەی لەپێشیانە، جا بۆ دەستەبەربوونی ئەم پەڕاوە پیرۆزە پەروەردگار وادەی بەحەزرەتی مووسا دا کە بچێتە سەر کێوی (طور) بەخودا بگاو پەیامی لێ وەربگرێ، ئەم وادە پێدانەی پەروەردگار بۆ حەزرەتی مووسا بووە قۆناغێك کە مووسا خۆی تێدا ئامادە بکا بۆ ئەو مەوقیفە سامناکە گەورەیەو ئامادەباشی ئەوەی تێدا بێ لەپەروەردگار پەیامی ئاسمانی وەربگرێ.

ماوەی خۆئامادەکردن سی شەو بوو دوایی دە شەوی تریشی خرانە سەر، ماوەکە بوو بەچل شەو، لەو ماوە دا حەزرەتی مووسا پراوەی بەنەفسی خۆی دەکرد بۆ ئەو موقابەلە پیرۆزەی کەوادەی پێ درابوو، لەو ماوە دا لەگشت مەشغەلەتێکی دونیایی گۆشەگیر بوبوو، لەکاروباری سەر زەوی دابڕابوو بۆ ئەوەی رۆبچێ لەنیگای ئاسمانی دا، لەو ماوە دا دوورەپەرێز بوو لەدروستکراوان تاتێی دا رۆبچێ لەوەرگرتنو بیستنی کەلامی دروستکەرو بەدیهێنەری تاکو تەنیا، بۆ ئەوەی گیانی مشتو ماڵ ببێ، چاوی دڵی روناك ببێ، هێزو تواناو عەزیمەتی بگاتە ئاستێك بتوانێ روبەڕوی ئەو مەوقیفە چاوەڕوانکراوە ببێتەوە، ئامادەباشی ئەوەی تێدا بێ ئەرکی وەرگرتنو گەیاندنی پەیامی وادەپێدراو لەئەستۆ بگرێ!

جا پێش ئەوەی حەزرەتی مووسا بنو ئیسرائیلییەکان بەجێ بێڵێ‌و بڕوا بۆ سەر کێوی (طور) حەزرەتی هاڕونی برای کردە جێنشینی خۆی‌و ئامۆژگاری کرد

﴿وَقَالَ مُوسَى لأَخِيهِ هَارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلا تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ﴾ واتە: حەزرەتی مووسا کاتێك ویستی بۆ گفتوگۆ کردنی پەیام بڕوا بۆ سەر کێوی (طور) بەحەزرەتی هارونی برای گوت کە لەتەمەن دا بالآتر بوو، ئەی برای خۆشەویستم ببە بەجێنشینمو تا دێمەوە لەشوێنی مـن کاروبـاری قەومەکەم بەڕێوەبـەرە، هەر پرسیارو کاروبارێکی ئایینی هاتە پێشتان بۆیان رون بکەرەوەو شتی ناڕێکو پێکیان بۆ راست بکەرەوە، ئاگات لەخۆت بیو وریابە شوێن ڕێبازی ئاشوبگێڕان مەکەوە لەخراپەکاریو فیتنە جۆیی دا هاوبەشییان مەکە.

هەڵبەتە حەزرەتی مووسا دەزانێ کە هارون پێغەمبەرەو لەخوداوە رەوانـە کراوە، بـەلآم پێویستە موسوڵمان ئامۆژگاری بـرای موسوڵمانی بکا، کەوابێ ئەم ئامۆژگاریو وەسییەتنامەیەی مووسا بۆ هارون ئاگادارکردنەوەو وەبیرهێنانەوەو جەخت کردنەوەیە. ئەگینا حەزرەتی هارون لای خودا پێغەمبەرێکی ڕێزدارو خاوەن پلەوپایەیەو لەسەر داواکاری حەزرەتی مووسا، هارون کرا بەوەزیرو یارمەتدەرو پاڵپشتی وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاجْعَل لِّي وَزِيراً مِّنْ أَهْلِي، هَارُونَ أَخِي، اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي، وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي -طه/٢٩-٣٢﴾.

سەرۆکایەتی نەتەوەی ئیسرائیل بەحەزرەتی مووسا سپێردرابوو، حەزرەتی (هارون)یش وەزیرو یارمەتیدەری بوو!!

﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ﴾ کاتێك مووسا هات بۆ ئەو شوێنەی بۆی دیاری کرابوو، بۆ ئەوەی ئاخاوتن لەگەڵ خودای خۆی بکاو شەریعەتی بداتێ، پەروەردگاری خۆی بەبێ ناوەندو واسیتەی فریشتە لەگەڵی دواو بەشێوەیەك ئاخاوتنی لەگەڵ دا کرد کە بەڕێکو پێکی لەهەموو لایەکەوە دەنگەکەی دەبیست ئیتر نەفسی حەزرەتی مووسا هێمن بووەوە بەتەواوی ئولفەتی بەخوداوە گرتو ئارامی گرت! ئەمجار ئارەزۆی ئەوەی کرد کە پەروەردگار خۆشی نیشان بدا، بۆیە عەرزی بارەگای بێ نیازی کردو ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾ وتی: پەروەردگارا! خۆتم نیشان بدە، با بۆت بڕوانمو بەدیدارت شاد بم، زاتی پیرۆزت ببینم، هێزو توانام بدەرێ بتوانم تێت بڕوانم! ﴿قَالَ لَن تَرَانِي﴾ پەروەردگار فەرموی: ئەتۆ ئێستاو لەرۆژگاری داهاتۆش مـن نابینی، چونکە ئادەمیزاد لەدونیا دا توانای

ئەومیان نیە بڕوانـنـە مـنو بم بیـنن! ئـەمجار پـەروەردگار نـەرمو نیـانییکی لەگـەڵ بەکاردێنیو بۆی شی دەکاتەوە کە هۆی چیە نـاتوانێ ببیـنـێ، بـۆ ئـەوەی کـەمێك لەقورسایی وەڵامـی پرسـیارەکەی کـەم بکاتـەوە، ئـەو شـتەی کـە دەربـارەی سـونەتی خودا نـەیزانیبوو فێـری ببـێ، بـۆی ئاشـکرابێ کـە هـیچ شـتێك لەبونـەوەر دا نیـە بتوانێ خودا ببیـنـێ! وەکـوو لەحـەدیثـی ئـەبو مووسـا دا هـاتووەو ئیمـامی موسـلیم ریوایـەتی کـردوە، دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (حجابـة النـور، لـو کـشفت لأحرقت سبحان وجهه-أنواره- ماانتهى اليه بصره من خلقه). فـەرموی:﴿وَلَكِـنْ انظُـرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي﴾ وەڵێ: ئەتۆ بڕوانە بـۆ ئـەو کێـوە، پرتـەوی زاتی خۆمی نیشان دەدەم ئەگەر لەکاتی دەرکەوتنی زاتی من دا بۆی لەشوێنی خۆی مایەوەو خۆی ڕاگرت، ئەوە تۆیش لەوە بـەولاوە دەمبینـی، جا ئەگـەر کێوەکە بـەو هەموو پتەوی‌و سەختیەوە خۆی ڕانەگرت ئەوە تـۆ چۆن خـۆڕادەگری بـۆ پرتـەوی زاتی مـن!! ﴿فَلَمَّـا تَجَلَّـى رَبُّـهُ لِلْجَبَـلِ جَعَلَـهُ دَكّـاً﴾ جا کاتێـك پـەروەردگار کـەمێك لـەجلیوەی نـووری خـۆی نیـشانی کێوەکـەدا، کێوەکـەی وردو خـاش کـردو بـوو بەخۆڵەمێش وەکوو سورمەی چاو نەرم بوو! ﴿وَخَرَّ مُوسَى صَعِقاً﴾ حەزرەتی مووسا کە ئەمەی بینی لەهەیبەتا لەرزەگرتی‌و لەهۆش خۆی چوو بـەرەو دەم کـەوتـو بـێ ئاگابوو! ﴿فَلَمَّا أَفَاقَ﴾ کاتێ مووسا وەهۆش خۆی هاتـەوەو بـەخۆی دا ڕوانـی‌و هێـزو توانای خۆی بۆ دەرکەوتو زانی کە ئەو لەوپرسیار کردنەکە دا زێدە ڕەوی کـردوەو لەسـنوری تێپەڕانـدوە ﴿قَـالَ سُـبْحَانَكَ تُبْـتُ إِلَيْـكَ وَأَنَـا أَوَّلُ الْمُـؤْمِنِينَ﴾ وتـی: پەروەردگارا! ئەتۆ پاکو بێ باکو گەورەو بێ هاوەڵو بێ وێنەی. ئەمن تۆبەم کردو پەشیمانم لەداواکردنی بینینی زاتی پاکت، هەرگیز شتێك داوا ناکەم کە نـەگونجێ بێتەجێ! ئەمن یەکەم کەسم لەنەتەوەی ئیسرائیل لەسـەر دەمـی خـۆم دا کـەبڕوام هەیە بەگەورەیی‌و بەرزی‌و شکۆمەندی زاتی پاکت. ئیبنو عەباس دەفەرموێ: واتە: من یەکەم کەسم کە بڕوام هەیە لەدونیا دا کەس ناتبینێ تاڕۆژی قیامەت.

ئەمجار پەروەردگار دڵدانەوەی حەزرەتی مووسای کردو ڕێزو پلەو پایـەی کـە هەیەتی لای خودا ئاشکرای کردو ﴿قَالَ يَا مُوسَى إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّـاسِ بِرِسَـالاتِي وَبِكَلامِـي﴾ فـەرمووی ئـەی مووسـا! مـن تـۆم هەڵبـژاردوە بەسـەر ئـادەمیزادانی

سەردەمی خۆت دا زێدە لەهەموو کەس بەبێ ناوەنـدو فریـشتە گفتوگۆم لەگـەڵ دا کـردی، پلـەو پایـەی پێغەمبەرایـەتیم پـێ بەخـشیوی شـەریعەتو یاسـام پـێ داوی ﴿فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ ئـەو شـەریعەتو یاسایەی پێم داوی - کـە تەوراتە - بەباشی وەری بگرەو جێ بەجێیان بکەو کاریان پێ بکە، لەتاقمو کۆمەڵی سوپاسگوزاران بـە سوپاسـی نیعمەتـەکانی مـن بکـە کـە داومـە بـەتۆو بەگەلەکـەت، چاکەو فەضلی من بەسەرخۆتەوە ببینەو یادیان بکەرەوە!

﴿وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الْأَلْوَاحِ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِكُلِّ شَيْءٍ﴾ واتـە: چـەند پارچە تەختەیـەکمان پێدا، لەهـەموو جۆرێـك حـوکمو ئامۆژگاری کاریگـەرمان بـۆ تێدا نوسیبوو، کاروبـاری ئایینمـان لەحـەڵاڵو حـەرامو بنـەمای عەقیـدەو ئـاداب بـۆ رون کردبووەوە، بەدورو درێژی نەصیحەتو ئامۆژگاری پێویـستمان تێـی دا بـۆ شـی کردبووەوە، هەرشتێك ئادەمیزاد هەڵبنێ بۆ طاعەتو لەتاوان دووری بخاتەوە، تێی دا بوو. ئەم پارچە تەختانە تەوراتیان تێدا نووسراو بوو، یەکەم شەریعەتو یاسا بوو، درا بەموسا!

﴿فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ﴾ پێمـان گـوت: ئەمـە وەسـییەتو بنـەمای شـەریعەتی ئێمەیـە بـەهێزی دڵو نیـشاطـی جەسـتەوە وەری بگـرە، بەعـەزم نییـەتێکی راسـتەقینەوە پەیڕەوی بکە! ﴿وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا بِأَحْسَنِهَا﴾ فەرمان بەگەلەکەشت بکـە فـەرمانو نەهییەکانی پەیڕەو بکەن، لەپەندو ئامۆژگارییـەکانی ورد ببنـەوە، شتـەجوانەکانی وەربگرن-هەرچی تێیدایە جوانو بەکەڵکە پـەیڕەوی فەرمانـەکانی وەکـو قیـصاص، لێبـوردن، یارمەتیـدان، خۆڕاگرتن...هتـد بکـەن. بەراسـتاڵی خـودا پەرسـتی بکـەن، چونکە خوداپەرستی راستی عەقڵ جوان دەکاو نەفس مـشتومـاڵ دەکـا. ﴿سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ﴾ واتە: ئەگـەر ئێـوە پابەنـدی ئـەو پەیامـە نـەبن کـە بۆمـان نـاردوون، شوێن یاسا جوانەکان نەکەون، ئەوە دەچنە پێڕی سەرپێچیکارانو لادەران لەرێبازی خـوداو فاسـقانەوە، ئـەو سـزایەی بەسـەر فاسـقان دا درا کـە داروەدەسـتەی فیرعـەون بـوون، دەکەوێتـە سـەر ئێـوەش. لـەوە بـەولاوە خـانوو بـەرەی فاسـقە لـەدین دەرچووەکانتان لەقیامەتا نیشان دەدەم چۆن سـزا دەدرێـن، یـان لـەدونیا دا لـەکاتی هاتوچـۆیان لێـرەو لـەوێ بـەولاتان دا شـوێنو نیـشتمانی لـەئایین دەرچـووەکانتان

نیشان دەدەم هەتا بزانن چۆن ویران بووەو دارو بەردی بەسەریەك دا ترشاوە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مانای ﴿سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ﴾ واتە: لەوە بەولاوە سەرەنجامی ئەوانەتان نیشان دەدەم کە سەرپێچی فەرمانی ئێمە دەکەن، بەچاوی خۆتان دەبینن چۆن لەناویان دەبەینو خانوو بەرمیان خاپوور دەکەین!

قەتادە دەفەرموێ: واتە خانوو بەرەی ئەو کافرانەتان نیشان دەدەم کە لەپێش ئێوە ژیاون لەناومان بردون، وەکوو جەبابیرەو عەمالیقەکان.... بۆ ئەوەی پەندیان لێ وەربگرن، مەبەست شوێنەواری گەلی عادو ثەموودو گەلەکانی تره کە بەهۆی فیسقو خراپەکاری لەناوبراون.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: وا پێدەچێ (دار الفاسقين) ئاماژەبێ بۆ خاکی پیرۆز (الأرض المقدسة) کە لەو رۆژگارە دا بتپەرستی تێدا نیشتەجێ بوون، ئەوە مژدە بووە بۆ نەتەوەی ئیسرائیل کە دەچنە ناوی. هەرچەندە لەسەردەمی مووسا دا نەتەوەی ئیسرائیل نەچوونە ناو ئەو خاکە پیرۆزەوە، چونکە هێشتا پێویستیان بەپەروەردەکردنو پێگەیاندن هەبوو، ئەوە بوو لەسەر سنووری ئەو خاکە راوەستانو قاچیان چەقاندنو بەپێغەمبەرەکەیان گوت ﴿قَالُوا يَا مُوسَى إِنَّ فِيهَا قَوْماً جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىَ يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ!﴾

پاشان کە دوو پیاوە موسوڵمانە لەخودا ترسەکان پێکێشییان لێ کردنو سەرکۆنەیان کردنو هەڵیان نان بۆ هێرش بردنو وەڵامی مووسایان بەشێوەیەکی ناشیرین دایەوە، وەڵامێکی ترسنۆکانەو حیزانە: ﴿قَالُواْ يَا مُوسَى إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَداً مَّا دَامُواْ فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ!!﴾ بەراستی ئەم جۆرە هەڵوێستەی نەتەوەی ئیسرائیل رەنگدانەوەی تێك روخاویو داوەشاوی ئەو کۆمەڵگایە بوو، نیشانەی ترسنۆکیو بێ هێزیو هیچ لەبارانەبووی ئەو گەلە بوو، کە پێویست بوو عەقیدەو شەریعەتێکی وایان بۆ بێ دەرمانی دەردەکانیان بکەن، بۆیە کە پەروەردگار تەوراتی دا بەحەزرەتی مووسا پێی فەرموو: بەهێزو توناو نیشاتەوە ئەم شەریعەتە وەربگرە، فەرمان بەگەلەکەشت بکە کە بەتەواوی بەنیشاتو دڵسۆزییەوە پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بنو خۆیان وا ئامادە بکەن: لەئاستی ئەو ئەرکەدابن!

بـەڵێ: ئاشـکرایە، دەبـێ شـەریعەت بەعەزیمـەتو هێـزو توانـاو نیـشاتەوە وەبگـیرێ، بـەلێهاتویی و لێبوردوییـەوە جـێ بـەجێ بکـرێ، بـۆ دروسـتکردنو دامەزراندنی نەتەوەی خوداپەرست بەشێوازێکی تازە بابەت! یەکەم کەسێکیش کە ئەنجامدانی ئەم ئەرکەی بەوشێوە لێ چاوەڕوان دەکرێ، پێغەمبـەرو بانگەوازیکەری ئـەو شـەریعەتەن دەبـێ بـەکردارو گوفتـار مامۆسـتاو رابـەرو پێـشەنگ بـێ، ئەمـە سوننەتی خودایە بۆ بەرێوەچوونی هـەموو ئیـنقلابـو شۆڕشێك، بۆ تازەکردنـەوەو دامەزرانـدنی هـەموو سیـستەمێکی کۆمەلایـەتی یـان رامیـاری..... تەنانـەت ئەگـەر سیستەمەکە ئایینی بوو ئەوە زۆر زیاتر پێویستی بەوە هەیە کە ئیعلامـی نـاوەوەو دەرەوەی ئادەمیزادەکان بکا،

بێگومان سەلەفی صالحی ئێمە قورئانیان بەحەزمو عەزیمەتـەوە وەرگرتـووە، بەوپەڕی لێهاتوویی و لێبوردوییەوە کاریان پێ کردوە، بۆیـە فێـری بـوون کـاری پـێ بکەن، نەك بۆ موتفەرکـو تەبەروکـو بەدەنگ خوێندنی لەتەعزییەو مونـاسـەباتـدا، یان لەپەرۆیەکیەوە پێچن لەلای ئافرەتی زەییستان داینێن بۆ ئـەوەی شـەوە دەست لەزارۆکە ساواکەی نەوەشێنێو، ئافرەتە نەخۆشەکە نەترسێنێ!؟

بۆیە لـەژێر رۆشـنایی قورئـان دا هـەموو ئـەو گـەلو ئیمپراتۆرییەتـە خـاوەن هیـزو توانـاو چـەکو جبەخانـەیان خـستە ژێـر خۆیانـەوەو، ژیـانی کامـەڕانیو خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بەدەست هێنا!! بەلام کاتێ پشتیان لەپەیامی قورئان هەلکردو پابەندی فەرمانو نەهیەکانی نەبوون ئاکامیان بەم حاڵە گەیشت کـەپێی گەییشتوون!

## سزای لوتبەرزیو کوفر ئەوەیە کە دڵی لوتبەرزو کافرەکان لادەدرێ لەتێگەیشتنی بەڵگەکانی نیشانەی خودایەتی

﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوْاْ

سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤٧﴾

ئەم ئایەتانە باسی سروشتی لوتبەرزەکانی رابوردوو هاوچەرخ دەکەن. کە لەئایەتەکانی پێشوو دا پەروەردگار ئەو رووداوانەی رون کردەوە. کە بەسەر فیرعەونو قەومەکەی هات، بەهۆی لوتبەرزیو ستەمکارییەوەو سەرەنجام لەناوچوون! ئەوە باس دەکا کە ئیمان نەهێنانی قورەیشییەکان بەپێغەمبەرﷺ لەبەر لوتبەرزیو خۆبەزل زانینیانە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هۆی پشت هەڵکردن لەئیمان هێنانو سووربوون لەسەر مانەوەی بەکافری خۆبەزلزانینو لوتبەرزییە. لوتبەرزی ئادەمیزاد لەحەق لادەداو هەڵیان دەنێ بۆ بەدرۆخستنەوەی حەقو وا دەکا لوتبەرز لەنیشانەکانی خودایەتی خودا بێ ئاگا بێو تێیان نەفکرێو لێیان وردنەبێتەوە.

واتە: ئەم ئایەتانە روونکردنەوەی سوننەتی خودان لە بوونەوەر دا دەرحەق بەو ئادەمیزادانەی بەهۆی لوتبەرزییەوە بانگەوازیکەرانی حەقو خێر (پێغەمبەرانو شوێنکەوتوانیان) بەدرۆ خەنەوەو گوێ بۆ ئامۆژگاریو پەیامەکەیان ناگرن. چونکە رەوشتی لوتبەرزی هەمیشە دەبێتە هۆکاری ئەوەی خاوەنەکەی رو لەتێفکرینو بەڵگەی حەقو راست وەربگرنو شوێنی پەیامی خودا نەکەون، لەبەڵگەو نیشانەکانی خودایەتی خوا بێ ئاگابن! ئەمە دیاردەیەکی ئاشکراو حاڵو چۆنیەتی پاشاو سەرۆکو ملهوڕە گومڕاکانی وەکوو فیرعەونو داروودەستەکەیو نەمروودو ستەمکارانی مێژووە. دەفەرموێ: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي

الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ لەوە بەولاوە وەکو لەوەپێشەوە دڵی لوتبەرزو خۆبەزلزانەکان: ئەوانەی لوتبەرزی دەکەن لەبەندایەتی کردن بۆ منو خۆیان بەزل دەزانن لەئاستی ئادەمیزادان دڵیان لادەدەین لەتێگەیشتنی بەڵگەو دەلیلی جۆراو جۆر لەسەر گەورەییو بەدەسەڵاتیو خودایەتی خۆم، چاوی دڵیان کوێر دەکەین بەجۆرێك کەهیدایەتی ناو شەریعەتی ئێمە نابینن، سوود لەئامۆژگاری پێغەمبەر وەرناگرن،بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەوە نایەن، چونکە ئەوان بەهۆی لوتبەرزیی خۆیانەوە روویان لەبانگەوازی خودا وەرگێڕاوە، خوداش دڵی ئەوان لەحەق لادە دا وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾الصف/٥.

خیطابی ئایەتەکە هەموو نەتەوەو تاکێك دەگرێتەوە بەمەرجی لوتبەرزی بکەن.

بۆ نمونە فیرعەونو دارو دەستەکەی چونکە لوتبەرزییان کرد پەروەردگاریش دڵی لادان لەوەی کە لەموعجیزەو نیشانەکانی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی مووسا حاڵی بن! وادەبێ لەهەندێکی حاڵی دەبن، بەڵام لەبەر لەخۆبایی بوونو خۆبەزلزانین ئینکاری دەکەنو گوێی پێ نادەن، حەقو راستی لای ئەوان نرخی نیەو بایەخی پێ نادەن نایانەوێ تێی بگەن، بۆیە پەروەردگار دەرحەق فیرعەونو تاقمەکەی دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً -النمل/١٤﴾ هەروەها کافرەکانی قورەیش دڵنیا بوون کە پێغەمبەر ﷺ رەوانە کراوی خودایەو پێغەمبەرایەتیەکەی حەقو راستە، وەلێ لەبەر لوتبەرزیو خۆپەسندییان دڵیان نەدەدایە موعجیزەکانیو تێیان نەدەفکرین. بیرو بۆچونیان وابوو کە ئەوان لەپێغەمبەر بەرزترن، پێیان وابوو ئەوان پیاو ماقوڵو سەرۆکو دەوڵەمەندی قورەیشن، کەوابوو شایانی ئەوان نیە کەشوێن کەسێك بکەون لەتەمەنو هێزو تواناو سامانداریو کەسداری دا لەوان نزم تربێ.

ئەمجار پەروەردگار حاڵو رەوشتی خۆبەزلزانو لوتبەرزەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لا يُؤْمِنُوا بِهَا﴾ئەو لوتبەرزو لەخۆبایی بوانە رەوشتیان وایە هەر ئایەتو موعجیزەیەك ببینن کە بەڵگە بێ لەسەر حەقو حەق سەپێن بێ ئەوان بڕوای پێناکەن، چونکە موعجیزە سوود بەکەسێك نابەخشێ

کەئامادەباشی تێدا نەبێ بۆ تێگەیشتنو تێفکرینو وەرگرتنی حەقو راستی! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ جَاءتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ -يونس٩٦-٩٧﴾.

پەروەردگار دەربارەی ئەوانەی بەناحەق لەسەر زەوی لوتبەرزی دەنوێنن ئیعلانی ویستو دابو نەرێتی خۆی دەکا؛ دڵیان لادە دا لەورد بوونەوە لەحەقو تێگەیشتنی راستی، هیدایەتیان نادا بۆ تێگەییشتنو پێگەییشتن، هەر بەندەیەك لەبەندەکانی خودا بەناحەق لەسەر زەوی خۆبەزل بزانێ بەربەرەکانی خودا دەکا، چونکە (تکبر) صیفەتێکە تەنها بۆ خودا دەشێ کەسی تر مافی تەکەبور کردنی نیە، خراپترین لوتبەرزیو خۆبەزل زانی ئەوەیە کابرا ئیدعای مافی خودایەتی بکاو حەقی تەشریع دانان بدا بەخۆیو جەخت لەئادەمیزادان بکا پابەندی ئەو یاساو تەشریعە بن کە ئەو بۆیان دادەنێ، زۆریان لێ بکا واز لەشەریعەتو یاسای حەقو راستی ئاسمانی بهێننو پابەندی شەریعەتو یاسای بەتاڵو دەستکردی پووچی ئەوبن! رەوشتێکی تری ئەو لوتبەرزانە ئەوەیە ﴿وَإِنْ يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً﴾ ئەوانە ئەگەر رێبازی هیدایەتو سەرفرازی بەدی بکەن لێی لادەدەنو لێی دوور دەکەونەوە، نایکەنە رێبازی خۆیان، شەقامەرێی سەرفرازیو رزگاربون واز لێ دێنن،﴿وَإِنْ يَرَوْا سَبِيلَ الْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً﴾، هەندێکیان بەئەنقەستو هەندێکیان بەنەزانی رێگای گومرایی دەگرنە بەر، ئەوانەی رەوشتیان بەو جۆرەیەو ئەوە هەڵسو کەوتیانە، ئەوانە خودا دەرگای دڵی داخستوونو گوێچکەی هاخنیونو مۆری کردونو، پەردەی بەسەر چاو دا هێناون، رێبازی حەق لایان ناخۆشو قێزەونە، روی تێ ناکەنو پێی دا نارۆنو رقیان لێیەتی. بۆیە هەر لەگەڵ رێبازی گومراییو فەسادیان چاو پێ دەکەوێ خێرا دەیگرنەبەرو پێی دا دەرۆن، شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەون، ئەمجار هۆکاری ئەم حاڵو چۆنیەتەی تێی کەوتوون دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ﴾ ئەو وازهێنانەیان لەرێگەی حەقو گرتنەبەریان بۆ رێبازی گومراییو هیدایەت نەدانی ئێمە بۆیانو دڵ لادانیان لەحەق، بەهۆی ئەوەوە کە بەڵگەو نیشانەکانی خودایەتی ئێمەو راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە،

بێ ئاگان لەتێفکرینو وردبوونەوە لەئایەتەکانی خودا!

بەکورتی پەروەردگار ئەو لوتبەرزو بەفیزانەی وا دروست نەکردوە کە بەسروشت ئاوێتەی کوفرو گومڕایی بووبن! بەڵکوو ئەو حاڵەتەیان بەهۆی کردەوە هەڵوێستی خۆیان بۆ هاتۆتەدی، ئەوان بەویستو ئیرادەی خۆیان بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوەو، بەحەزو ئارەزۆی خۆیان نغرۆی شەهوەتو گومڕایی بوون، پەردەیان بەسەر چاوو دڵو ئامێری بیستنی خۆیان داداوەتەوە! حەق نابیسنو راستی نابینن‌و وازیان لەشەقامەڕێی بەختەوەریو رزگار بوون هێناوە، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ -الأعراف/١٧٩﴾ ئەوانە بەئەنقەست دڵو چاوو گوێچکەی خۆیان لەکارخستووە، دڵیان بۆ تێگەیشتن بەکاری ناهێنن، چاویان شتی پێ نابینن، گوێچکەیان شتی پێ نابیستن ئەوانە وەکوو ئاژەڵ وەهان! بەڵکوو لەئاژەڵیش زیاتر بێ هۆشو بێ هەستو تێفکرینن! ئەوانە نیشانەکانی بوونی خودا (کە هەموو بوونەوەر نیشانەی هەبوونی خودان) بەدرۆ دەخەنەوە، موعجیزەی هاوکاتی پێغەمبەران رەتدەکەنەوە، ﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الآخِرَةِ﴾ ئەوانەی ئایەتە نێردراوەکانی ئێمە بەدرۆ خستەوەو دەخەنەوە ئەو ئایەتانەی بەحەقو راستی ناردومانن بۆ سەر پێغەمبەرانمانو ئەوان رەتیان کردۆتەوەو پابەندی ئامۆژگاریو فەرمانو نەهیەکانی پەیامی پێغەمبەران نەبوونو سەرەنجام زیندوبوونەوەو سزاو پاداشی رۆژی قیامەتیشیان بەدرۆ لەقەڵەمدا، ئەوانە ﴿حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ کردەوەکانیان پوچەڵ کراونەوەو ماندوبوونیان بەفیڕۆ دەچێ چونکە ئەوان کردەوەکانیان بۆ غەیری خودا بوون، خۆیان لەشتێك دا ماندو کردوە کە خودا پێی رازی نەبوە، کردەوەکانیان دەبنە هۆی سزاو نارەحەتی بۆیان. ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئایا ئەوانە پاداشیان دەدرێتەوە جگە لەوەی لەدونیا دا دەیکەن؟ واتە ئەوانە سزاو پاداشیان نادرێتەوە جگە لەو کارانەی بەردەوامن لەسەرئەنجامدانیان، ئەوانە بەردەوامن لەسەر کوفرو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا کەوابێ هەر سزای خراپەکاری خۆیان

وەدەگرنـەوە، كـوفرو بـێ دینـی دڵو دەروونو روحـی پـیس كـردونو تێكـی داوە، سـوننەتی خـوداش وەها هـاتووەو وا دەبـێ سـزاو پـاداش لەقیامـەت دا بـەگوێرەی كردەوەی دونیا دەبێ: چاكە بەچاكەو خراپە بەخراپە خودا-تەنانـەت- بەئەنـدازەی گەردیلەیەكیش ستەم لەكەس ناكا!!

## چیرۆكی بەخودا دانانی گوێلەكە لەلایەن سامیرییەوە

﴿ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾

لەئایەتەكانی پێشوو دا چیرۆكی گفتوگۆ كردنی مووسـای لەگـەڵ پـەروەردگار دا بۆ گێڕاینەوە، باسی نازڵبوونی تەوراتی كرد بۆ سەر مووسا! ئەمجار لێرە دا باسی ئـەو رووداوە سـەیرو سـەرنج راكێـشە دەكـا كەلـەكاتی گفتوگۆكـە دا لـەناو گەلەكـەی رویدا، كـەبریتی بـوو لـەوەی سـامیری لەخـشڵو گـەواهێر لاشـەیەكی دروسـت كـرد لەوێنەی گوێلەكەو، وتی: ئەمە خودای مووساو ئێوەیەو مووسا لێی هون بووە!! ئـیتر بڕوایان پێكردو دەستیان كرد بەگوێرەكە پەرستن. بەڕاستی هەڵوێـستێكی سـەیرەو رووداوێكی سەرنـج راكێشە، ئەوەتا لەو كاتە دا كە حـەزرەتی مووسا ﷺ لـە خزمـەت پەروەردگار دا یەو خەریكی گفتوگۆ كردنە لەگـەڵ زاتـی حـەق ئالـەو مەوقیفـە بـێ وێنەیـە دا كـە دڵو هەسـتو شـعوور لـە هـەوڵی تێگەیـشتنو بـەدیكردن دانو چـاو كۆڵەوارە لە دیتن، روح هەستی پێدەكاو هۆش تێی دا سەرگەردانە، لەو كاتە ناوازەو نرخدارە دا كە حەزرەتی مووسا راسـتەوخۆ پەیوەنـدی لەگـەڵ پـەروەردگار دا بـەو

شێوە بێو وێنەیە هەیەو سەرگەرمی ئاخاوتنو وەرگرتنی پەیامو یاسای یەزدانی یە... گەلەکەی سات بە سات نزم دەبنەوەو دیاردەی خۆێڕیەتیو گێلیو نەفامیان زیاد دەکا، لەجیاتی خواپەرستیو سوپاسگوزاریو شوکرانە ژمێری، لاشە گۆلەکەیەکی بێ گیان. کە بۆرەبۆڕی لێوە دێ دەیکەنە خودای خۆیانو دەیپەرستنو، واز لە خواپەرستیو، یەکتاپەرستی دەهێنن!

لێرە دا سیاقی قورئان دیار دەیەکمان نیشان دە دا کە زۆر لە دیاردەو حاڵەتی ئایەتەکانی پێشوو جیاوازە، گواستنەوەو گۆرانکارییەکی سەرنج ڕاکێش دێنێتە گۆرێ، لە کەشو هەوایەکی بەرزو عالەمێکی باڵای بارەگای ئەقدسییەوە، لە باسی پلەوپایە بەرزکردنەوەی حەزرەتی مووساوە کە خودا گەیاندیە ئەوە گوفتوگۆ لەگەڵ زاتی حەق دا بکا، سیاقە قورئانییەکە دەمانگوێزێتەوە بۆ کەشو هەوایەکی پیسو پۆخەڵی نوغرۆبوو لەگومڕایی دا، دیمەنی گەلو نەتەوەیەکی سەرلێ شێواوو پڕوپووچو خوێریو سپڵەمان بۆ دەکێشیو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَى مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلاً جَسَداً لَهُ خُوَارٌ﴾ واتە: نەتەوەی ئیسرائیل دوای ئەوەی حەزرەتی مووسا لەسەر وادەی پەروەردگار چوو بۆ سەر کێوی (طور) بۆ گفتو گۆ کردن لەگەڵ خودای مەزندا لەخشڵی زێرو زیوی قیبطییەکان کە بەئەمانەت لێیان وەرگرتبوون لاشە گوێرەکەیەکیان دروست کرد بۆرە بۆڕی لێوە دەهات! دەنگو ڕەنگی لەگوێرەکە دەچوو! دەستیان کرد بەپەرستنی! وەکوو دەڵێن: ئەو خشڵە هی قیبطییەکان بوو دوای ئەوەی پەروەردگار فیرعەونو قیبطییەکانی خنکاند لەلای نەتەوەی ئیسرائیل مابوبوەوە!

سامیری کە پیاوێکی قسە ڕۆیشتوو بوو لەناو نەتەوەی ئیسرائیل دا ئەو زێرو زیوەی کۆکردەوەو لاشەی گوێرەکەیەکی لێ پێك هێناو بۆرە بۆڕی لێوە دەهات! وتی: ئەمە خودای مووسایەو لێی هون بووە، ئیتر ئەوانیش دەستیان کرد بەگوێرە پەرستن!!

لێرە دا پرسیارێك دێتە کایەوە: دەگوترێ: سامیری خشڵەکەی کۆکردەوەو لاشەی گوێرەکەکەی لێ پێك هێنا، ئەدی بۆچی کارەکە وەپاڵ هەموان دراوە؟؟ لەوەڵام دا دەڵێن: چونکە سامیری ئەو کارەی بەرای زوربەیان ئەنجام داو، کەسیان

نـارەزایی بەرامبـەر کارەکـەی سـامیری دەرنـەبڕیو هـەموویان رایـان لەسـەر بـوو، ویستیان ئەو لاشە گوێرەکەیە بپەرستنو پێی رازی بوون! کەوابێ جێی خۆیەتی کە کارەکە پاڵ هەموویان بدرێ.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: راڤەکەرانی قورئان، دەربارەی ئەم لاشەو گوێرەکەیـە کێشەیان تێ کەوتووە: لەوە دا ئایا ئەو جەستەیە، بووە بەگۆشتو ئیسقانو خـوێنو گیـانی تێـدا بـوەو، بۆڕەکـەی سروشـتی بـووە؟؟ یـان لاشـەکە، هـەر بـەزێڕو زیـوی ماوەتەوەو، ناوەکەی بۆش بووەو کە بەرەو هەوا دانراوەو هەوای تـێ چووە، دەنگـی لێوە هاتووەو وەکوو گوێرەکە بۆڕاندویەتی!؟ دوو را هەیە:

١- قـەتادەو حەسـەنی بەصری کۆمـەڵێکی تـر پێیـان وایـە: کـە لاشـەکە بـووە بەگۆشتو خوێنو ئێسقانو گیـانی تێکەڕاوەتـەوەو بـۆڕە بۆڕەکـەی سروشـتی بـووە. دەڵـێن: ئـەو کاتـەی نەتـەوەی ئیـسرائیل لـەدەریا دەپەڕنـەوە سـامری حـەزرەتی جوبرائیلی بینی سواری ئەسپێك بـوو، ئەسپەکەی قاچی لەهـەر شـوێنێك دابنایـە یەکسەر ژیانی تێ دەگەڕاو گیاو کژی لێ شین دەبوو،، سامری هەندێك گڵ لـە شـوێن پێی ئەسپەکە هەڵگرت، جا کە دوایی جەسـتەی گوێرەکەکەی دروست کـرد لوێـچی لەو گڵەی هاویشتە ناو جەستەکەو لاشەکە بوو بەگۆشتـو خوێنو ئێـسقانو جارێـك بۆڕانـدی سامری وتی: ئەمە خودای ئێوەو خودای مووسایە!

٢- زۆربەی زۆری راڤەکـەرانی موعتەزیلە پێیـان وایـە: کـە کارەکـەی سـامیری چاو بەستەکی تێدا بووەو شێوە سیحرێکی بووە، سامیری لاشەکەی ناو کلۆر دروست کردبـو، لـەژێر ئـەو شـوێنەی کـە لاشـە گوێرەکەکـەی لێ دانـدرا بـوو بـەنهێنی ئـادەمیزادێکی لێ بـوو فـووی پـێ دا دەکـرد دەنگێکـی وەکـوو بـۆڕەی گوێرەکـەی لەکلۆرایی لاشە لەخشڵ دروستکراوەکە دا پەیدا دەکرد.

٣- هەندێکی تر پێیان وایە بۆڕەکە لەوەوە پەیدا دەبوو کە هەوا دەچـووە نـاو کلۆرایی لاشەکەو لەدەمیـەوە دەردەچوو ئـەو شـێوە بۆڕەیـەی لێـوە دەهـات: دەڵێن: سامیری پەیکەری گوێرەکەیەکی دروست کردبوو نـاوەوەی کلـۆر بـوو، بەشـێوەیەکی فـەننیو کارسـازی چـەند بۆڕەیـەکی تێـدا دانـابوو، بـەرەو هـەوا دانرابـوو کـە هـەوا دەچووە ناو کلۆرایی پەیکەرەکەوە دەنگێکی لێوە دەهات لەبۆڕەی گوێرەکـە دەچـوو،

ئەمجار سامیری ئەوەی خستە دڵیانەوە: کە ئەم گوێرەکەیە خودای ئەوانو خودای مووسایە، ئیتر جگە لەحەزرەتی هارون هەموو بەنو ئیسرائیلییەکان دەستیان بەگوێرەکە پەرستن کرد!!

مامۆستا سەیید قوطب دەفەرموێ: کە بەنو ئیسرائیلییەکان ئەو لاشە گوێرەکەیان بینیو گوێیان لەبۆڕەو قۆڕەی بوو لێی کۆبوونەوەو دەوریاندا، کە سامری پێی گوتن: ﴿هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى﴾ ئەمە خودای ئێوەو خودای مووسایەکە چووە بۆ ئاخاوتن لەگەڵی دا. مووسا مەوعیدەکەی لێ تێك چووە رەنگە بەهۆی زیاد کردنی دە رۆژەکەی کۆتای بووبێ کە سی شەوەکە، کرا بەچل شەو، بەنو ئیسرائیلییەکان بەمەیان نەدەزانیو، حەزرەتی مووسا دوای سی شەوەکە نەگەڕایەوە ناویانو، دە رۆژی تر دواکەوت! ئیتر سامیری پێی گوتن: مووسا، موعیدەکەی لەگەڵ خواکەی دا لەبیر چۆتەوەو، ئەمە خوداکەیەتی! ئیتر هەموویان دەستیان کرد بەگوێرەکە پەرستن!!!

سەیرە بەنو ئیسرائیلی هەموو راسپێریو وەسێتەکانی حەزرەتی مووسایان لەبیر کردو ئەوەیان لەیاد چووەو، کە مووسا پێی گوتن: ئێوە خودایەك دەپەرستن کە بەچاو نابیندریو پەروەردگارو بەدیهێنەری بوونەوەرە، هیچ لەحەقیقەتی ئەم لاشە گوێرەکەیە ورد نەبوونەوە کە سامیری بۆی دروست کربوون. بۆیە پەروەردگار ئەو گومراییەیان رەت دەکاتەوەولۆمەو سەرزەنشتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلاً﴾ ئایا ئەوانە لەوە وردنەبوونەوە کە ئەو گوێرەکە هیچ صیفەتێکی خودایەتی تێدا نیە، زمانی ئاخاوتنی نیە، ناتوانێ قسەیان لەگەڵ بکا، شارەزایان ناکا بۆ رێبازی خێرو چاکە، ناتوانێ خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بۆ دابین بکا، ﴿اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ﴾ ئەوان ئەو گوێرەکەیەیان لەروی بەڵگەو دەلیلەوە بەخودا نەزانی، بەڵکوو لەروی لاسایی کردنەوەی میصریە کۆنەکان کە لەوەپێش گوێرەکە پەرست بوون هەروەها لاسایی کردنەوەی ئەو قەومەی کە بینیان بتیان دەپەرستن لەفەلەستینا! کەوابێ ئەوان کە ئەو گوێرەکەیان بەخودا داناو پەرستیان ستەمیان لەخودی خۆیان کرد، چونکە شتێکیان پەرست کەسوودی پێ نەدەگەیاندن بەڵکوو زیانی بۆیان هەبوو! ئەوان هەرچەندە حەزرەتی هارون

لەناویان دا بوو هەوڵی دا لەو گەوجیو گومڕاییە بیانگێڕێتەوە هەوڵەکانی بێ سوود بوون، هەندێ عاقڵ مەندی تریشیان ویستیان بەرگری لەم کارە ناپەسەندە بکەن بەڵام هیچیان بۆ نەکرا، بەتایبەتی کە گوێرەکەکە لەئاڵتون دروستکرابوو، نەتەوەی (ئیسرائیل)یش بەسروشت ئاڵتونپەرستن.

﴿وَلَمَّا سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا﴾ کاتێك بەهۆش خۆ هاتنەوەو حەقیقەتیان بۆ روون بوەوە، زانیان هەڵەیان کردوەو گومڕابوون. ئەمجار نۆرەی پەشیمانیو پەنجە شکاندنەوە هات، پەشیمان بوونەوەو شەرمەزارو خەفەتبار بوونو نەیاندەزانی چۆن ئەم هەڵەیەیان چاك بکەنەوە، دانیان بەهەڵخلیسکانی خۆیاندانا و ﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بەزەیی پێمان دا نەیەتەوەو لێمان خۆش نەبیو تۆبەمان لێ وەرنەگرێ ئەوە ئێمە ماڵوێرانی دونیاو قیامەت بووین، دەچینە پێری ئەوانەی خۆشبەختیو کامەرانی دونیاو قیامەتیان لەدەست داوە، لەدونیا دا سەربەخۆیو سەرفرازیو ئازادی وادە پێدراومان لەخاکی پیرۆز دا لەکیس دەچێ، لەقیامەتیشا نازو نیعمەتی بەهەشتمان نادرێتێ!

مامۆستا سەید لێرە دا دەفەرموێ: ئەم گەڕانەوەو دان بەهەڵە دانانەیان ئەوە دەگەیەنێ کە تائەو کاتە بڕێ ئامادە باشییان تێدا بووە بۆ صالح بوون، وا دیارە تا ئەو کاتە نەگەیشتوونەتە ئەو دڵڕەقییەی کە پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾.

## ڕق هەڵسانی مووساو سەرزەنشت کردنی بۆ هارون لەسەر گوێرەکە پەرستی نەتەوەی ئیسرائیل!!

﴿ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى

وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِي فَلَا تُشْمِتْ بِيَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾

لەوە پێش پەروەردگار چیرۆکی سامیری باس کرد: کە گوێرەکەی کرد بەخودا بۆ نەتەوەی ئیسرائیل، دوا بەدوای ئەوە باسی کاریگەری ئەم رووداوە دەکا لەسەر دڵی حەزرەتی موسا!! چونکە ئەو کە گەڕایەوە ماندوو شەکەت بوو، هێشتا ئەو لەسەر کێوی طوور بوو پەروەردگار ئەم هەواڵەی پێ راگەیاند، جا: کە ئەو واقیعە تاڵەی بینی لەقەومەکەی، رقی هەڵساو خەفەتی زۆری خوارد، پەلاماری حەزرەتی هارونی برای دا، بەقسە سەرزەنشتی کردو، بەدەست سەری گرتو رایکێشا! وتی: بۆچی هێشتت نەتەوەکەم لەخودا پەرستی هەڵبگەڕێنەوەو گوێرەکە پەرستی بکەن!؟؟

بەڵێ: وەکوو لەسورەتی (طه)داهاتووە: هێشتا حەزرەتی مووسا لەسەرکێوی طوور بوو، پەروەردگار هەواڵی هەڵگەڕانەوەی قەومەکەی پێڕاگەیاندن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِن بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ، فَرَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفاً قَالَ يَا قَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْداً حَسَناً أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ الْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِي -طه-٨٥-٨٦﴾.

لێرەش دا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفاً﴾ کاتێ حەزرەتی مووسا، لەکێوی طوورەوە بەغەمباری گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی، بەرەق هەڵساوی لەهارونی برای، چونکە هێشتا هەر لەمیقات دا بوو، خەریکی گفتوگۆ بوو، لەخزمەت پەروەردگاردا، زاتی حەق هەواڵی پێ دا کە قەومەکەت پاشگەز بوونەوەو دەستیان کردوە بەگوێرەکە پەرستی! بەوحاڵەتە توڕەیی‌و غەمبارییەوە گەیشتەوە ناو قەومەکەی، کە ئەو واقیعە تاڵەی پاشگەزبونەوەی بەچاوی خۆی بینی، ئەوەندەی تر رقی هەڵساو تووڕەبونی زیادبوو، دەهەری بوونو توڕەیی لە

گفتارو کرداری دا دیاری دا: حەزرەتی مووسا، مافی خۆی بوو کەتوڕەبێ‌ڕوداوەکە سامناکە، گۆرانکارییەکە زۆر کاریگەرە، بۆیە: ڕویکردە گەلەکەیی‌و ﴿قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِنْ بَعْدِي﴾ وتی: بەراستی بە ناشیرنتر شێوە، بەخراپترینکار، دوای چونم بۆ خزمەت بارەگای خودا جێگای منتان گرتەوە، کە من لێرە نەبوم کاری ناشیرینتان کردو، جێگری خراپبون! من بەجێم هێشتن هیدایەتدراوو ئایین پەروەربوون کەچی دوای من گومڕابون، سەرتان لێ شێوا، من بە خودا پەرستی جێم هێشتن، ئێوە جێگری منتان بە گوێرەکە پەرستی ئەنجامدا،، ئامۆژگاری منتان لەیادچووەو شوێن سامیری کەوتن!! وازتان لەعیبادەتو یەکتاپەرستی پەروەردگار هێنا، دەستتان کرد بەگوێرەکە پەرستن! ئەمن یەکتاپەرستی‌و خوداناسیم فێرکردن، دڵودەروونم لە بتپەرستی‌و هاوەڵدانان بۆ خودا پاککردبووەوە، ترساندبوومن لەوەی وەکوو ئەو نەتەوە بتپەرستەی کە دوای ڕزگاربونتان لە چنگی فیرعەون بەلایان دا تێپەڕینو بینیتان پەیکەری مانگایان دەپەرستو ویستیان ئێوەش چاو لەئەوانە بکەنو بتپەرستی بکەن! داواتان لێ کردوم بتێکتام بۆدەست نیشان بکەمو بیپەرستن. لەبیرتانە چۆن نەهیم لێ کردنو ئامۆژگاریم کردنو خودا پەرستی‌و یەکتاپەرستیم فێرکردن؟!

کوێڕا ئەو ئامۆژگاریيانەتان لەبیر خۆتان بردەوەو لەئایین پاشگەز بونەوە؟!

﴿أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ﴾ واتە: ئایا پەلەتان لەهاتنی وادەی خودا کرد خۆتان ڕانەگرت؟ چونکە ئەوان حەزرەتی مووسا لەسەری سێیەمین شەو نەهاتەوە، وایان مەزندە کرد مردوە،، بەوەیان نەزانی بوو کەماوەی مانەوەی مووسا لە میاقاتا دە شەوی تری لێ زیاد کراوەو بووە بەچل شەو!! واتە: پەلەتان کرد بەوە کە زوو بڕیاری مردنی منتاندا.

زومەخشەری دەفەرموێ: واتە: پەلەتان لەفەرمانی خودا کرد کە بریتی بوو لەوە چاوەڕوانی حەزرەتی مووسا بکەنو پارێزگاری عەهدو پەیمانەکانی بکەنو پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی بکەن. کەچی ئێوە دوای تەواو بوونی سی شەوەکە واتان مەزندە کرد، ماوەی مانەوەی من لەمیقاتا تەواو بووە، نەگەڕاومەوە بۆ ناوتان، ئیتر -بەبێ بەڵگە- منتان بەمردوو داناو، بۆ خۆتان پاشگەز بوونەوە، وەکوو چۆن

نەتــەوەی پــێش ئێـوە دوای لــەدونیا دەرچـوونی پێغەمبــەرەکانیان لەئاینەکــەیان هەڵگەڕانەوە!

ریوایەت کراوە کەسامیری گوێرەکەکەی بۆ دروست کردن وتـی: ﴿هَـٰذَا إِلَـٰهُكُـمْ وَإِلَـٰهُ مُوسَـىٰ﴾طـە/٨٨. ئەمـە خـودای ئێـوەو خـودای مووسـایە، وتـی: مووسـا، تـازە ناگەڕێتەوە بۆ ناوتانو ئەو لەدونیا دەرچووە،

ئەی قەومەکەم! ئێـوە فـەرمانتان پـێ کـرا کـە مـن رۆیـشتم بـۆ میقـات، ئێـوە لەشوێنی خۆتان، لەسەر ئاینی یەکتاپەرستی، لەسەر یاساو حاڵو چۆنیەتی خۆتان بەردەوام بـن، دەی بۆچـی وا خۆتـان بەدبـەختـو چـارە رەش کـردنو دڵـی منیـشتان بریندار کرد؟

ئەمجار توورە بوونەکەی زیاتر بوو، رقی هەڵساوی گەیـشتە ئـەو ئەندازەیـە: کە ﴿وَأَلْقَى الْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ﴾ ئەو لەو حانەی کە پەروەردگار پێـی دابوونو ئـادابی ئاینیـان تێـدا بـوو فرێـی دانو پـەرتو بـڵاوی کردنـەوە، پـەلاماری حەزرەتی هاڕونی داو، قژی سەری گرتـو، بۆلای خۆی ڕایکێشا! چـونکە پێـی وابـو: حەزرەتی هاڕون کەمتەرخەمی کردووەو، ئەرکی پێویستی سەرشانی خۆی ئـەنجام نـەداوە، بـەرگری لەقەومەکـەی نـەکردووە: بـەم جـۆرە نـەهێڵێ گوێرەکە پەرسـتی بکەن! سەرزەنشتی بکردنایەو گوێرەکەکەی لـەناو ببردایـە: وەکـوو چـۆن حـەزرەتی مووسا بۆخۆی پەیکەری گوێرەکەکەی سوتاندو فڕێیدایە ناو دەریاوە. یان کـە هـیچ نەبێ شوێن حەزرەتی مووسا بکەوتایە بۆ سەر کێـوی طـوور.... وەکـوو لەشـوێنێکی تر دا قورئان ئاماژەی بۆ کردوەو دەفەرموێ: ﴿قَـالَ يَـا هَـارُونُ مَـا مَنَعَـكَ إِذْ رَأَيْـتَهُمْ ضَلُّوا، أَلَّا تَتَّبِعَنِ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي ؟؟-طة/٩٢ - ٩٣﴾

حـەزرەتی مووسـا کـە گەیـشتەوە نـاو قەومەکـەی باسـی گوێرەکـە پەرسـتی لەنزیکەوە بیستو، بەچاوی خۆی بینی: گەلەکەی سەرگەرمی گوێرەکە پەرسـتنن!! عەرزی بەچاوی خۆی نەدیو لەتاوی ئاینەکەی جامی غەزەبی پڕ بـوو، بەتـەواوی غیرەتـی جـوڵا! چـونکە حـەزرەتی مووسـا هـەر لەسروشـتـی خـۆی دا پیـاوێکی رق ئەسـتوور بـوو، حـەزرەتی هـاڕون لەئـەو نـەرمو لەسـەرەخۆ تـر بـوو، بۆیـە لـەناو نەتەوەی ئیسرائیل دا هاڕون خۆشەویستر بوو،

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خودا رەحم بە مووسا بکا، بیستن وەکوو دیتن نیە، پەروەردگار لەسەر کێوی طوور هەواڵی پێ دا کە گەلەکەی توشی فیتنەیی کراونو سامیری گومڕای کردون، کەچی بەبیستنی ئەو هەواڵە لەوێ لەوحەکانی فڕێ نەدان، کەهاتەوەو بەچاوی خۆی بینی قەومەکەی گوێرەکە دەپەرستن لەوحەکانی فڕێدان!

لەوحەکانی فڕێدانو قژی سەری حەزرەتی هارونی برای گرتو بۆلای خۆی راکێشی کرد، ئەم هەڵسو کەوتە نیشانەی تووڕەبوونێکی زیاد لەئەندازەبون، چونکە لەوحەکان پەیامی خودایان تێدابوو، هیدایەتو رەحمەتی یەزدانیان تێدا تۆمار کرابوو، هەڵبەتە ئەگەرتووڕەبونی حەزرەتی مووسا نەگاتە ئەوپەڕی ئینفیعال، ئەو لەوحانە فڕێ نادا، هەروەها پەلاماردانی بۆ حەزرەتی هارونی برای‌و پێغەمبەرو بەندەی راستاڵی خودا، بەوجۆرە قژ راکێشانی‌و سەرزەنشتکردنی، نیشانەیەکی تری ئەوەیە: کە رەق هەڵسانەکەی گەیوەتە ئەوپەڕی‌و لەتاوانا کەوا پاش ئەو هەمو ماندوبوونەی لەگەڵ قەومەکەی‌دا، ئاوا پاشگەزبوونەوە، نەیتوانیوە دان بەخۆیا بگری‌و بەشێوەیەکی هێمنانە بەرەو روی واقیعەکە بێتەوە!

هەڵبەتە حەزرەتی مووسا عوزری هەبوە، ئەو لەبەر خاتری حەق رقی هەڵساوەو روداوەکە ئەوەی هێناوە ئەو پێغەمبەرە ئاوا بەوجۆرە بەرەو روی بێتەوە، ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەبەر خودی خۆی رقی هەڵنەساوە، بەڵام هەرکاتێ بیدیتبا سوکایەتی بەئایینی خودا دەکرێ، بەوپەڕی رق هەڵساوییەوە بەرەنگاری بوەتەوە .

بەڵام حەزرەتی هارون لەبەرامبەر ئەو هەڵسو کەوتەی حەزرەتی مووسادا، هەڵوێستێکی نەرمو نییانی نواند، جاری سۆزی برایەتی دەخاتە کارو وەکوو ئاوێکی سارد بۆ دەروونی گەرمی حەزرەتی مووسا بەکاری دێنێ، بۆ ئەوەی رقەکەی بنیشێنێتەوە. ئەمجار راستی هەڵوێستی خۆی لەبەرامبەر کاری ناهەمواری گەلەکەیان دا بۆ حەزرەتی مووسا شی دەکاتەوە: بۆی روون دەکاتەوە: کە ئەو هیچ کەمتەرخەمی نەکردوە، وەکوو پێویست ئەرکی سەر شانی خۆی ئەنجام داوەو،

توانای خۆی بەکار هێناوە: ! ﴿قَالَ ابْنَ أُمَّ إِنَّ الْقَوْمَ اسْتَضْعَفُونِي وَكَادُوا يَقْتُلُونَنِي﴾ حەزرەتی هارون لەوەڵام دا وتی: ئەی کوڕی دایکم! تۆ مۆڵەتم بدە با رووداوەکەت بۆ روون بکەمەوە، پەلە مەکە لەسەر زەنشت کردنەم، لێم تووڕە مەبە، وا مەزانە کەمتەرخەم بووم ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانم بەرامبەر خوداو ئایینی خودا، چونکە من دژیان وەستام بەرەنگاری کارەکەیانم کرد، ئامۆژگاریم کردن، بەڵام ئەم گەلە چەقاوە سووە هیچ بایەخیان بە ئامۆژگاریەکانم نەدا، بەتەنیا بووەو دەرەقەتیان نەهاتم، گوێیان بەقسەکانم نەدا، بەبێ هێزو تواناو بێ پاڵپشتو کەسو کاریان زانیم، تەنانەت ئەوەندەم کێشمە کێشم لەگەڵ دا کردن نزیك بوو دەستم بۆ درێژ بکەن بمکوژن، ئیتر من لەبەر بێ دەسەڵاتیو ناتەوانی خۆم وازم لێ هێنان!!

ئەی برای شیرینم : ﴿فَلَا تُشْمِتْ بِيَ الْأَعْدَاءَ وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ کارێکی وەهام لەگەڵ مەکە دوژمن پێم خۆش بێ، هیواو ئاواتیان مەهێنە دی، مەمخەرە ریزی ستەمکارانەوە ئەوانە گوێرەکەیان پەرستو لەپێری ئەوان حلێبم مەکە، رقت لەمن هەڵنەستێ وەکوو لەوان رقت هەڵساوە، من لەهیچ شتێك دا لەگەڵ ئەوان نیمەو لێیان بەریم!!

ئەمجار پەروەردگار کاریگەری ئەم سکاڵایەی حەزرەتی هارون لەدڵی موسا دا دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ موسا وتی: کە موسا لەواقیعەکە حاڵی بوو، گەڕایەوە بۆ سەر حاڵی سروشتی خۆی، لەخودا پاڕایەوەو وتی: پەروەردگارا! لەمن خۆشبەو چاوپۆشی بکە لەو کردارو گوفتارانەم کە دڵشکانی هارونی برامی تێدا بوو، ئازارم بەدڵو دەروونی گەیاند، هەروەها لەهارونی براشم خۆشبە ئەگەر لەکاتی جێگری من دا کەمتەرخەمییەکی کردبیو وەکوو پێویست بەرەنگاری گەلەکەی نەبۆتەوەو ترساوە کە ئەگەر زیاتر پێکیشییان لێ بکا بیکوژن! هەردوکمان بخەرە نێو رەحمەتو بەزەیی خۆتەوە. کە بەشی هەموو کەس دەکا، بەفەضلو گەورەیی خۆت، بەرەحمەتی خۆت، دامان پۆشە! زاتی پاکت لەهەموو خاوەن رەحمێك بەرەحم ترە بۆ بەندەکانی. پەروەردگارا!وا بکە، رەحمەتو بەزەیی خۆت هەمیشە بەسەرمان دا بڕژێو لەدونیاو قیامەت دا لێ بێبەش نەبین!

حەزرەتی مووسا ئەم نزاو پاڕانەوەی کرد، بۆ ئەوەی دڵی هارونی بـرای رازی بکا، بۆ دوژمنانیشی بسەلمێنێ کە لەهارون رازییـەو دڵی لێـی نـەرمنجاوە بـۆ ئـەوەی دوژمن پێی خۆش نەبن!

ئـەم چـیرۆکە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە حـەزرەتی هـارون بەئەنـدازەی حـەزرەتی مووسا عەزیمەتو ئیرادەی بەهێز نەبوە، عوزرخواهییەکەی حەزرەتی (هـارون)یـش ئامـاژەی ئـەوەی تێدایـە کـە ئـەو لـەتاوانی گوێرەکـە پەرستی بەرییـەو، ئەوەنـدەی لەتوانای دا بووە کەمتەرخەمی لەبەرگری‌و ئامۆژگاریکردنیان نەکردوە، بـەگوێرەی توانای خۆی ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داوە! پـەروەردگاریش لێـی خـۆش بـووە! دوعاکەی حەزرەتی مووسای قبوول فەرمووە.

ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە چـیرۆکی نـاو تـەورات -کـە دروسـتکردنی گوێرەکەکە پاڵ هارون دەدا- درۆیەو بنەمایەکی راستی نیە.

## سزای ستەمکارانی گوێرەکە پەرستو قبوڵ کردنی تۆبەی تۆبەکاران

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعْدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٥٣﴾ ﴾

پەیوەنـدی نێـوان ئـەم ئایەتانـەو ئایەتـەکانی پێـشوو ئاشـکرایە، دوای ئـەوەی پەروەردگار باسی سەرزەنشتـو لۆمەکردنی حەزرەتی مووسای کرد لـەهارونی بـرای، ئەمجار نزاو پاڕانەوەی لەخودا بۆ خۆی‌و بۆ هـارونی بـرای، ئـەمجار باسـی سـزادانی ئەو ستەمکارانە دەکا، کە گوێرەکەیان پەرسـتو کردیانـە خـودای خۆیـان، هـەروەها باسی ئەوەش دەکا کە تۆبەی ئەوانەی قبوڵ کرد کە بەدڵ تۆبەیان کردو گەڕانەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾

بێگومان ئەوانەی دوای ڕۆیشتنی پێغەمبەرەکەیان (حەزرەتی مووسا) بۆ سەر کێوی طوور گوێرەکەیان کرد بەخودای خۆیانو، لەسەر گوێرەکە پەرستی بەردەوام بوون، وەکوو سامیریو دارودەستەکەی، ئەوانە لەلایەن خوداوە سزایەکی کوشندەیان پێ دەگا! سزاکەشیان ئەوەیە: کە لەسورەتی (البقرة) دا باسی کراوە، بریتیە لەوە کە تۆبەکەیان لێ وەرناگیرێ هەتا یەکتری نەکوژن، دەبێ شەریان ببیو هەندێکیان هەندێکیان بکوژن! وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَتُوبُواْ إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ-البقرة/٥٤﴾.

هەروەها توشی زەلیلیو پەراگەندەیی دەبن، لەزێدو نیشتمانی خۆیان وەدەردەنرێن، لەپێش چاوی ئادەمیزادانی تر سووکو ریسوا دەبن، بەچاوی سووکو بێ ڕێزی سەیریان دەکەن، هەمیشە هەڵپەی کۆکردنەوەی سامانی دونیایانە، هەمیشە چاوچنۆکو ماددە پەرستن، لەناو هەموو گەلو نەتەوەیەک دا بێ ڕێزو قێز لێکراونو بەچاوی ڕێزەوە سەیر ناکرێن! ئەمەش لەمانا دا ئەوپەری زەلیلیو سوکایەتی پێ کردنە، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ وَبَآؤُوْاْ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ -البقره- ٦١﴾. جا ئەم زەلیلییە نزیک بێ، یان دوور بێ، هەردیو هەردێ، وادەی خودایەو بەدی نەهاتنی محاڵە، دروست بوونی دەوڵەتۆکەی ئیسرائیل لەسەر خاکی فەلەستین، ئەوە میحنەتە بۆ موسوڵمانان. ئەگینا توێژینەوەی زانستییەکان، ئەوەیان سەلماندوە کە مانەوەی حکوومەتی جولەکە لەفەلەستین دا شتێکی محاڵە، بارودۆخی ڕۆژگار لەبەرژەوەندی مانەوەی ئەو دەوڵەتۆکە نیە، زۆر فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هەن کە مزگێنی لەناوچوونو دەرکردنی جولەکە لەخاکی فەلەستین دەگەیەنن! هەموو شتێک ئەجەلو ماوەی خۆی هەیە!

ئەگەر لەچەرخو ڕۆژگارێکی تایبەتی دا جوولەکە دەسەڵات بەسەر هەندێ وڵاتو شوێن دا بگرن، هەندێ لەماڵو سامانی جیهانیان بکەوێتە ژێر دەست، لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنو پروپاگەندەی جیهان دا دەسەڵات پەیدا بکەنو قسە ڕۆییشتوو بن، وەزعو چۆنیەتییەکانیان بۆ بڕەخسێ بتوانن ئەوەی دەیانەوێ ئەنجامی بدەن، هەندێ گەلو نەتەوە بخەنە ژێر دەستی خۆیانو لەخاکو زێدی

خۆیان وەدەریان بنێن، هەندێ دەوڵەتی جیهانخۆرو ئیستیعمارو گومڕا پاڵپشتییان بکەنو یارمەتییان بدەن.... وەکوو ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین! ئەمە مانای وانییە وادەی خودا نایەتەجێ، یان ئەوەی خودا لەچارەی نووسیون لەزەلیلیو ژێردەستەیی نایەتە دی..!! جوولەکە بەهۆی ئەو رەوشتە ناشیرینانەی هەیانە رۆژ دوای رۆژ رقو کینەی خەڵك بۆ خۆیان پەزمەندە دەکەن! بەدەستی خۆیان پلانی لەناوچونی خۆیان دەکێشن، رقو غەزەبی خودا لەخۆیان زیاتر دەکەن.... ئەوان کە ئێستە لەسەر خاکی فەلەستین ئەوهەموو تاوانبارییە دەکەنو بەرواڵەت ساڵ دوای ساڵ بەهێزتر دەبن ئەوە هۆیەکەی ئەوەیە خەڵکەکە پشتیان لەئایین کردوە، موسوڵمانی راستەقینە نەماوە، کۆمەڵ کۆمەڵو گرۆ گرۆ هەر تاقمەو خۆی خزاندۆتە ژێر شیعارو ئاڵایەکی نەتەوەیی نژادی، نایەن هەموویان لەژێر ئاڵای ئایینی ئیسلام دا کۆببنەوە، بۆیە دەبینین لەهەموو هەڵوێستو کاروبارێکیان دا سەرکەوتوو نین، ئیسرائیل لێیان بوەتە مۆرانەو کنەیان لێ دەکا! بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێ: ئەمە حاڵەتێکە بەردەوام نابێ، ئەمە حاڵەتێکی نائاساییە موسوڵمانان تێی کەوتوون، هۆکارەکەشی ئەوەیە: کە وازیان لەو چەکە، لەو مەنهەجو پرۆگرامە هێناوە کە پێش چواردە سەدە بەهۆیەوە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ئەو شیعارو ئاڵایەی لەژێر سایەیان دا هەموو دونیایان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان ئێستا وازیان لێ هێناوەو پاشگوێیان خستوون، ئەو ئاڵایەیان فڕێ داوە کە لەژێر سایەی دا لەوە پێش سەرکەوتن.. ئەمە بارودۆخێکە بەرقەرار نابێ، هەر دەبێ رۆژگارێك بێتە پێشەوە موسوڵمانان لەخەوی غەفڵەت رابن، دەبێ رۆژگارێك بێ ئەوەی داهاتووی موسوڵمانان تاودەنە چەکی کاریگەری موسوڵمانانی پێشوو، هەمان سەرکەوتنی ئەوان بەدەست بێنن! کێ ناڵێ هەموو مرۆڤایەتی رۆژێ لەرۆژان دژی ملهوڕیو لەخۆبایی بوونی جوولەکە رانەپەڕێ!؟ بۆ ئەوەی وادەی پەروەردگار بێتە جێو هەر دەبێ بێتە جێ!! دەبێ ئەو زەلیلیو ژێر دەستەییەی خودا بۆی نوسیوون تووشیان ببێو بێتە دی! ئەمە لەلای موسوڵمانان شتێکە قابیلی موناقەشە نیە!!

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ﴾ وەکوو ئەو سزایەی کە لەدونیا دا بەسەر

ستەمكارەكانى نەتەوەى ئيسرائيلمان دادا، سزاى هەموو گەلو نەتەوەيەكى بوختانكەرو هاوەڵدانەر بۆ خودا دەدەين، لەهەموو چەرخو رۆژگارێكدا، واتە: هەر كەسێك لەئايينى خودا دا بەدرۆ شت هەڵبەستىو هاوەڵ بۆ خودا دانىٚ، راستى لەئادەميزادان بشارێتەوە، خەڵكى گومڕا بكا، سزاى تاوانەكانى غەزەبى خودايە بۆى زەليلىو ژێردەستەييە لە دونيادا. وەكوو چۆن سامیرىو هەوادارانى ريسوابوونو درۆكەيان دەركەوت، هەركەسێك بوختانو درۆ لە ئايين دا هەڵبەستىٚ بەوجۆرە ريسواو فەضح دەبىٚ! (ابو قلابە الجرمى) كە ئەم ئايەتەى خوێندەوە، فەرمووى: سسوێندم بەخودا ئەمە هەمووكەسێكى بوختانكەرو بيدعەت داهێنەر دەگرێتەوە تارۆژى قيامەت. (سوفيانى كوڕى عوينە) فەرموويەتى: هەموو بيدعەتو داهێنەرێك زەليلو ژێردەستەيە!

ئوسلوبى قورئان زۆر جار بەرامبەرى شتەكان دەكا بەدژى خۆيان، واتە: كە باسى موسوڵمانى كرد، باسى كافريش دەكات، باسى دونياى هێنا باسى قيامەتيش دەكا.... هتد جاليَرە دا دواى ئەوەى باسى سزاى ستەمكارانى كرد، ئەمجار دەرگاى هيوا لە بەردەم تۆبەكاران دا دەكاتەوەو دەفەرمووىٚ: ﴿وَالَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِهَا وَآمَنُوا﴾ ئەوانەى لەوە پێش كردەوەى خراپيان ئەنجام داوە، تاوانى گەورەيان كردوە، تاوانى كوفرو شيركيان لىٚ رۆدراوە، پاشان لەو كردارانەيان پەشيمان بوونەوەو، بۆلاى خودا گەڕانەوە، ئەگەر كافر بووبىٚ ئيمانى هێنابىٚ، ئەگەر خراپەكار بووبىٚ وازى لەخراپەكەى خۆى هێنابىٚ، بەشێوەيەكى رێكو پێك پابەندى شەريعەتى خودا بىٚ، ئيمانێكى راستاڵانەى هێنابىٚو، وێراى بڕواكەى كردەوەى چاكيشى هەبىٚ، ئەوە ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارى تۆ ئەى موحەممەد!- دواى تۆبەكردن لەو تاوانانە لێخۆشبوو لێبوردەيە، تاوانيان دادەپۆشىٚ بەرەحمو بەزەييە، پاداشى چاكەيان دەداتەوە بەچەند چەندانەو دە چەندانە،

پرسار لەعەبدوڵلاى كوڕى مەسعود كرا دەربارەى پياوێك زينا لەگەڵ ئافرەتێك دا دەكاو دوايى مارەى دەكا، ئەويش ئەم ئايەتەى خوێندەوە ﴿وَالَّذِينَ

عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِهَا وَآمَنُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ عەبدوڵلا دە جار ئەم ئایەتەی خوێندوە، نەفەرمانی پێ کردن، نەنەهی لێ کردن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: ئەگەر یەکێك خراپەیەکی کرد، پێویستە پێش هەموو شتێك پەشیمان بێتەوەو تۆبە بکا، واز لەو کارە ناشرینە بێنیو بۆی نەگەڕێتەوە، ئەمجاربڕوای بە خودا پتەوبێو، لێی یەقین بێ کە جگە لە پەروەردگار هیچ خودای ترنین... ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە هەموو گوناهێك (بازۆر گەورەش بێ) قبوڵی لێخۆشبوون دەکاو دەکرێ تۆبەی لێبکرێ، ئەمەش خۆی لەخۆی دا مزگێنییەکی گەورەو دڵخۆشکەرە بۆ تاوانباران کە تۆبە دەکەنو واز لەتاوان دێنن!

## کۆتایی چیرۆکی گوێرەکە پەرستی

﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ١٥٤ ﴾

پاش ئەوەی یەزدان حاڵو چۆنیەتی نەتەوەی ئیسرائیلی بەیان کردو، کردنی بەدوو تاقم، تاقمێکیان سوور بوون لەسەر گوێرەکە پەرستی، تاقمێکشیان پەشیمان بوونەوەو بۆ لای خودا گەڕانەوە، ئەمجار باسی حاڵو وەزعی حەزرەتی مووسا دەکا: دوای ئەوەی کە رقەکەی نیشتەوەو هاتەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆی، وادیارە حەزرەتی مووسا چەند زوو تووڕە بووە هەر بەو جۆرەش زوو رقی نیشتۆتەوەو ئاسای بۆتەوە!. دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ أَخَذَ الْأَلْوَاحَ﴾ کاتێك مووسا ڕقەکەی نیشتەوەو بەهۆی عوزر هێنانەوەی هاڕونی برایو تۆبەکردنی زۆربەی قەومەکەیو ژێوان بوونەوەیان لە گوێرەکە پەرستی، ئەمجار گەڕایەوە بۆلای لەوحەفرێدراوەکانو هەڵی گرتنەوە، ئەو لەو حانەی کە گەڕایەوەو قەومەکەی بینی گوێرەکە دەپەرستن لە عەیبەتان چاوی عەرزی نەبینو فڕێی دان! کە لەوحەکانی هەڵگرتنەوەو گەڕایەوە سەرباری ئاساییو ڕێنمونی قەومەکەی، ﴿وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ﴾ لەنووسراوی سەر ئەو لەوحانە، یان لە هەر نووسخەیەك کە لەبەر ئەولەوحانە بنووسرێتەوە

ڕێنموونیو شارەزایی کردنی تێدا هەبوو، ڕەحمەتو بەزەیی خودا بۆ بەندەکانی نومایان بووتێیدا، ئەم ڕێنموونیو ڕەحمەتە بۆ ئەو کەسانەیە کە بەدڵ لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن، خۆیان دەپارێزن لەو بیروباوەڕو کردەوەنالەبارو نەگونجاوانە کە خودا لە ئادەمیزادنی قەدەغەکردون!

## هەڵبژاردنی مووسا ﷺ کە حەفتا کەسی هەڵبژارد بۆ چوون بۆ میقاتو ئاخاوتنو گفتوگۆ لەگەڵ خودادا

﴿ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ (١٥٥) ﴾

ئەم ئایەتە درێژەی ئەو باسەیە کە پەیوەندی بەگفتوگۆی حەزرەتی مووساوە هەیە لە خزمەت خودا دا لەسەر کێوی طوور. لەسەرەتاوە پەروەردگار چیرۆکی ئاخاوتنی مووسا لەگەڵ خودادا باس دەکا، ئەمجار داواکردنی بینینو شادبون بەدیدار، ئەمجار چیرۆکی گوێرەکەپەرستی هێنایە پێشەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ چیرۆکی ڕوداوی میقاتەکە کە بریتییە لە میقاتی گفتوگۆو داواکردنی بینین. واتە: ئەم میقاتەی لێرە دا هاتووە هەمان میقاتە کە لە ئایەتی (١٤٣) دا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا..﴾ ئەمجار لێرە دا دەفەرموێ: ﴿وَاخْتَارَ مُوسَى...... لِمِيقَاتِنَا﴾ کەوابێ مەبەست بەم میقاتەی ئێرە ئەو میقاتەی ئەوێیە!

مامۆستا سەیید، دەفەرموێ: ڕیوایەتی جۆراو جۆر هەن دەربارەی دەست نیشان کردنی ئەم میقاتە. وێ دەچێ ئەم چۆن بۆ میقاتە بۆ ئیعلانی تۆبەو داوای

لێخۆشبوون بۆ نەتەوەی ئیسرائیل بوو بێ، لەئاکامی ئەو کوفرو تاوانەی تێی کەوتوون -لەسورەتی (البقرە) دا ئەوە دەگەیەنێ؛ کە کەفارەتی لێخۆشبوون لێیان یەکدی کوشتن بووە، خودا پەرستەکان هەڵگەراوەکان بکوژن، ئەوە بوو دەستیان بەیەکتر کوشتن کرد تا پەروەردگار فەرمانی پێ کردن کە کۆتایی بەکوشتارەکەیان بهێنن‌و تۆبەکەیان لێ وەرگیرا!!

﴿وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِمِيقَاتِنَا﴾ واتە: پەروەردگار نیگای بۆ مووسا کرد کە حەفتا کەس لەقەومەکەی هەڵبژێرێ بۆ میقات، ئەویش لەناو قەومەکەی دا حەفتا کەسی پیاو ماقووڵ‌و رێزدار هەڵبژارد بۆ ئەو میقاتەی کە خودا بۆی دیاری کردبوو، هێنانی بۆ کێوی طوور، لەوێ حەزرەتی مووسا گفتوگۆی لەگەڵ خودا دا کرد، فەرمانی پێ کردن کە رۆژوو بگرن، خۆیان پاك‌و خاوێن رابگرن، پۆشاکیان خاوێن بێ! بەگوێرەی زنجیرەی ئایەتەکان وا پێ دەچێ هەڵبژاردنی ئەم ژمارەیەو چوونیان لەگەڵ حەزرەتی مووسا بۆ میقات لەو سەرو بەندانە دا بووە کە مووسا داوای بینینی پەروەردگاری کرد، واتە: پێش گوێرەکە پەرستنەکەیان بووە، بۆیەش لەگەڵ خۆی دا بردونی بۆ ئەوەی گوێیان لێ بێ کە مووسا لەگەڵ یەزدان دا ئاخاوتن دەکا، لێیان یەقین‌بێ کە مووسا راست دەکاو پێغەمبەرە، بیستنی ئاخاوتنەکە بەڵگەبێ لەسەر راستگۆیی حەزرەتی مووسا، کاتێ هاتن بۆ میقات وتیان: ئەی مووسا! ئێمە هەتا خودا بەچاوی خۆمان نەبینین بڕوات پێ ناکەین‌و ئیمانت پێناهێنین، ئەتۆ ئاخاوتنت لەگەڵ دا کرد، وە پیشانمان بدە! ئیتر زۆر پێکێشیان لێ کردو داوای بینینی پەروەردگاریان کرد، تا کێوەکە لەرزەی پێکەوتو رایتەکاندن‌و هەموویان لە هۆش خۆیان چوون!﴿فَلَمَّا أَخَذَتْهُمْ الرَّجْفَةُ﴾کە ئەو لەرزەو راتڵەقاندنەی کێوەکە گرتنی‌و هەموو لە هۆش خۆیان چون‌و لاڵ‌و پاڵ کەوتن،﴿قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُمْ مِنْ قَبْلُ وَإِيَّايَ﴾موسا وتی: پەروەردگارا! ئاواتە خوازی ئەوەم: کە ئەگەر لەوەپێش‌و پێش هاتنیان لەگەڵ من دا ئیرادەو مەشیئەتت وای ویستوەو وات بڕیار داوە لەناویان بەرێ، ئەگەر خواستت ببوایە ئەوانیش‌و منیشت لەناو دەبرد لە پێش ئەوە دا بێین بۆ میقات‌و من گیرۆدەی ئەم ئەم ریسوایە نەدەبوو! ئێستە من کەوتوومە حاڵەتێکی بە خۆداشکانەوەو هەزار

سوێندیان بۆ بخۆمو قسەیان بۆ بکەم گەلەکەم بڕوام پێ ناکەنو دەڵێن: مووسا فێڵی لێ کردینو بە پیلان ئەو حەفتاکەسەی کە پیاو ماقوڵی نەتەوەکەمان بوون بردنی بۆ کێوی‌و لەناوی بردن. واتە: جا چونکە زاتی پاکت لەوەپێش ئەو ئیرادەیەت نەکردوەو لەناوت نەبردون، ئێستا من داواکارمو هیوام بەرەحمەتت ئەوەیە کە ئێستاش لەناویان نەبەی‌و نەیانفەوتێنی!

ئەمجار حەزرەتی مووسا درێژەی بەتکاو پاڕانەوەو قسەکانی داو وتی: ﴿أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاءُ مِنَّا﴾ پەروەردگارا! ئەتۆ بە هۆی کردەوەی نەفامەکانمان ئێمە لە ناوەبە.

پاڕانەوەو داوا کردنەکە بە شێوەی ئیستیفهام هێندراوە، بۆ ئەوەی زیاتر داوای لە ناونەبردنەکە جەخت بکاتەوە، واتە خودایە! لەرەحمەتو عەداڵەتکاریی تۆ دوورە کە بەهۆی کردەوەی خراپی نەفامەکانمان هەڵسو کەوتی بی ئەدەبو ناشیرینیان ئێمە لەناو بەریی.

ئەمە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە عاقڵمەندو خاوەن بیرو فامەکانی نەتەوەی ئیسرائیل گوێرەکەیان نەپەرستووە، ئەوانەی گوێرەکە پەرستیان کرد بێ عاقڵو نەفامەکانیان بوون کە زۆربەی نەتەوەکەیان پێك دەهێنا!

﴿إِنْ هِيَ إِلاَّ فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَنْ تَشَاءُ وَتَهْدِي مَنْ تَشَاءُ﴾ ئەوکردەوەو هەڵوێستەی کە بوو بەهۆکاری ئەم لەرزەو راتڵەقاندنو لەهۆش خۆچونی ئەم حەفتا کەسە هەڵبژێراوەی قەومەکەم، جگە لە تاقیکردنەوەو ئیمتیحانکردنی زاتی پاکت بۆ ئەوان هیچی ترنیە. ئەم کارەساتە دەخولقێنێ بۆ ئەوەی بەندەکانت بەتاقی بکەیەوە، دەری بخەی کەتا چ ئەندازەیەك ئامادەباشیان بۆ هیدایەتو گومڕایی تێدایە، چی لە دڵیان دا شێرداوەتەوە، کامیان شیاوی سزاو تۆڵەیە، کامیان شیاوی پاداشو بەخشیشە! ئەمانە هەموویان بەگوێرەی سوننەتی خۆت لە بوونەوەر دا ئەنجام دەدرێن ئەم رووداوانە دەخوڵقێنی بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانت، جا ئەوانەی کە هەست بەسروشتی رووداوەکان دەکەنو دەزانن کە ئەو کارەساتانە ئیمتیحانی خوداییو حیکمەتێکی تێدایە، سنووری خۆیان دەزاننو زێدەڕەوی ناکەن ئەوانە لەتاقیکردنەوەکە دەردەچنو سەرفرازو بەمراز گەییشتوون.

ئەوانەشیان کە هەست بەسروشتی روداوەکان ناکەنو بێ ئاگایانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دا دەکەن لەتاقیکردنەوەکە دا گومڕاو سەرلێشێواو دەبن.

فەرمان فەرمانی تۆیەو بڕیار بڕیاری تۆیە، ئەو کەسەی خواستت لەسەر گومڕا کردنی بێ، لەرێگەی بەلآوە گومڕای دەکەی ئەو کەسەی بتەوێ هیدایەتی بدەی هیدایەتی دەدەیو رێنمونی دەکەی. کە ئەویان گومڕادەکەی ستەمی لێ ناکەیو کە ئەمیان رێنمونی دەکەی مەرایی بۆ ناکەی. بەڵکوو هەردو حاڵەتەکە - گومڕایی کردنو هیدایەتدانەکە موافیقی سروشتو کەسبو ویستی خۆیانە، ئەگەر هەردو لایەنەکە وازیان لێ بهێنرێ هەریەکەیان بۆ خۆی کاری بۆ دیاری کراوی خۆیان ئەنجام دەدەن.

حەزرەتی مووسا بەوەزانی کە قەومەکەی لەئایین هەڵگەڕانەوە کە پەروەردگار پێی فەرموو: ﴿فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِن بَعْدِكَ﴾طه/٨٥.

شایانی باسە حەزرەتی مووسا گومڕا کردنو هیدایەتدانەکەی پاڵ خودادا، فەرموی: ﴿تُضِلُّ بِهَا مَنْ تَشَاءُ وَتَهْدِي مَنْ تَشَاءُ﴾ کەسێك بتەوێ گومڕای بکەی، گومڕای دەکەی، کەسێکیش بتەوێ رێنمونی بکەیو هیدایەتی بدەی هیدایەتی دەدەی! چونکە تاقیکردنەوەو میحنەتە خوداییەکە بۆیان هۆکاری گومڕا بوون، یان هیدایەتدانیانە. ئیتر بەشێوەی مەجاز گومڕا بوونو هیدایەتەکەی پاڵ خودا دا.

﴿أَنْتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ﴾ پەروەردگارا! ئەتۆ سەرپەرشتیارو چاودێری کاروباری ئێمەی، ئاگاداری کردارو گوفتارمانی، دەزانی نەفسو دەرونمان چۆنەو چی تێدایە، خودایە! خۆشببە لەو تاوانەی لە ئاکامی کردارو گوفتارمان دێتە کایەوەو دەبێتە سەرپێچی کردنی سوننەتی تۆ لەگەڵ بەندەکانتدا، یان کەمتەرخەمی دەکەین لە ذیکرو سوپاسگوزاریو بەندایەتی بۆ کردنت.

خودایە تاوانو هەڵەمان پەردەپۆش بکە، بە عەفوو لێبوردنت وایان لێبکە کە هەر نەمانکردبن، هەرچەندە ئێمە کەمتەر خەمیمان کردبێ تۆ لێمان خۆشبە، بمانخەرە بەر رەحمەتو بەزەیی تایبەتی خۆت زیاد لە رەحمەتی گشتیت کە بەسەر مەخلوقاتی خۆت دا رشتوتە. بەراستی ئەتۆ باشترین لێخۆشبووی گەورەترین

داپۆشەری تاوانی بەندەکانتی، هەرتۆی لە تاوان خۆش دەبیو هەرتۆ بەڕاستی چاوپۆشی لە تاوانو هەڵە دەکەی، رەحمەتو بەزەییت بەشی هەموو شتێك دەکاو، لێخۆشبوونو رەحمەتی تۆ بەمەبەستی بەرژەوەندیو هۆکارو عیوض نیە، غەیری تۆ کە لێخۆشبوونێکی رواڵەتی بنوێنێ، بە حەتمی مەبەستێکی لە لێخۆشبوونەکە دا هەیە، بەرژەوەندیەکی خۆی تێدابەدی دەکا، بۆیە خۆشدەبێ. بەلاَم لێخۆشبوونی تۆ لە روانگەی فەضلو گەورەییو سەخاوەتو کەرەمی بێ شمارت هەڵدەقوڵێو هیچ بەرژەوەندی زاتی پاکت لەو لێخۆشبوونە دا نیە.

**تێبینی**:

پێویستە ئەوە بزانین کە مەبەست بەگومڕاکردن لە فەرمایشتی قورئان دا﴿تُضِلُّ بِهَا مَنْ تَشَاءُ﴾ زۆرە ملێو زەخت لێ کردن نیە بۆ گومڕا بوون، واتە: مانای ئەوە نیە خودا ئەوان بەتۆپزی گومڕا دەکا. وەکوو جەبریەکان دەڵێن. چونکە نەیفەمووە: ﴿تضل بها من تشاء من عبادك عن الدين﴾ بەڵکوو فەرمووی ﴿تضل بها﴾ واتە: بەندەکانت بە(رجفة) بەتاقی دەکەیەوە، چونکە ئاشکرایە پەروەردگار بە(رجفة=راتڵەقاندن) خەڵك گومڕا ناکا، کەوابوو دەبێ لە(تضل) مانای (تعاقب) یان (تهلك) وەربگرین، ئەو کاتە: ماناکە بەم جۆرە دەبێ: کەسێك مەیلت لێ بێ سزای دەدەی بەمەرجێ ئیمان نەهێنێ، یان کەسێك مەیلت لێ بێ بەو راتڵەقاندنە لەناوی دەبەی!

هەروەها وشەی هیدایەت لەفەرمایشتی ﴿وَتَهْدِي مَنْ تَشَاءُ﴾ مەبەست تەوفیق دانو شارەزایی کردنە بۆ لایەنەکانی هیدایەتو رێبازەکانی.

ئاشکراشە ئەو کەسەی بەدیهێنەرە بۆ داخوازی ئیمان یان کوفر پەروەردگارە، ئادەمیزاد بە هۆی ئەو توانایەوەکە هەیەتی بۆ ئیمان، یان بۆ کوفر، لایەکیان هەڵدەبژێرێ، کەوابو: هیدایەتو گومڕایی بە دروستکردنو بەدیهێنان لە خوداوەیەو ئەو بەدیهێنەریانە، بە کردەوە هی ئادەمیزادەو کەسبەکە ئەو دەیکا!

**باقی ماندەی دوعاو پاڕانەوەی حەزرەتی مووسا لە ناکامی ڕاتڵەقاندنەکەداو، پەیوەندی ئیمان بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی مووساو حەزرەتی موحەممەد ﷺ**

﴿ ۞ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾

ئەمە لە تەواوکەری پاڕانەوەی حەزرەتی مووسایە لە ناکامی (ڕەجفە= ڕاتڵەقاندنەکەدا) ئەوەبو لە سەرەتا دا ئیعلانی ئەوەی کرد کە هیچ کەس وەلی و پاڵپشتی ئەوان نیە جگە لە خودا، ئەوەبوو: فەرمووی ﴿انت و لینا﴾ هەرتۆ وەلی و

چاودێری ئێمەی! ئەوەی لەوەڵی و چاودێری چاوەڕوان دەکرێ دووشتە: یەکەمیان زیان لێ دوورخستنەوەیە، دووەمیان: . سوود پێ گەیاندنە. جاچونکە زیان لێ دوورخستنەوە لە سوود پێگەیاندن لەپێشترو گرنگترە،، سەرەتا داوای زیان لێ دوور خستنەوەی کردو فەرموی: ﴿فاغفر لنا وارحمنا﴾ ئەمجار داوای سوود پێگەیاندنی لێ کردو فەرموی: ﴿وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ﴾ پەروەردگارا! بەرەحمەتو فەضڵو کەرەمی خۆت ژیانێکی خۆشو پڕ کامەرانیو سەرفرازیمان بدەرێ، رزقو رۆژیمان گوشاد بکە، تۆفیقمان بدە بۆ خودا پەرستی لەدونیادا، پاداشتو ئەوابی چاکمان لەقیامەت دا بدەرێ، بمانخەرە بەهەشتەوە، بمانگەیەنە بەرەزامەندی خۆت، ئەم پاڕانەوەیە وەکوو ئەو پاڕانەوە وایە کە لەشوێنێکی تر دا قورئان فێرمان دەکا کە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً – البقرة/٢٠١﴾ چونکە بەروبوومی ئایین لەسەر زوبانی هەموو پێغەمبەران بریتیە لەدەستەبەربوونی خۆشبەختی دونیاو قیامەت.

﴿إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ﴾ خودایە! ئێمە تۆبەمان کردوو گەڕاینەوە بۆ قاپی رەحمەتت، پەشیمانین لەوەی کە قەومەکەمان داوای ئەوەیان کرد کە رێگایان بدەەو بتێك دیاری بکەم بۆیان بیپەرستن، ئەمجار ئەفامو بێ عەقڵەکانی قەومەکەم گوێرەکەیان پەرستو عاقڵەمەندەکانیان کەمتەرخەمییان کردو رێگەیان لێ نەگرتن، هەروەها پیاو ماقوڵانی قەومەکەم داوای ئەوەیان کرد بەچاوی خۆیان خودا ببینن، چەندەها هەڵەو تاوانی تریش.

خودایە! لەو کردارو گوفتارانە پەشیمانینو گەڕاوینەوە بۆ ژێر ئاڵای ئیمانو لەوە بەولاوە کرداری باش دەکەینو سەرپێچی فەرمانو نەهیەکانت ناکەین، خودایە! وەکوو چۆن تۆبەت لەبابە گەورەمان (ئادەم) وەرگرت هیدایەتت داو هەڵت بژارد، خودایە! بەهەمان شێوە تۆبە لەئێمەش وەربگرەو بەرەحمەتی خۆت دامان پۆشە! پەروەردگار بەم شێوە وەڵامی دایەوە ﴿قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ فەرمووی: سزای من تایبەتە بەو کەسانەی دەمەوێ سزایان بدەم لەکافرو یاخی بووان، هەرکەسێ بمەوێ سزای بدەم سزای منی دەگاتێ! بەڵام رەحمەتم بەشی هەموو کەس دەکا لەبوونەوەرداو لێیان زیادە، بێگومان رەحمەت

صیفەتێکی ئەزەلی منەو کاروباری بوونەوەر بەو صیفەتە بەندە، عەزاب صیفەتی من نیە بەڵکوو لەو کردەوانەمە، کە لەصیفەتی عادڵیمەوە پەیدا دەبیٚو سەرچاوە دەگریٚ، رەحمەتم گشتییەو بۆ هەموو کەسە. ئەو رەحمەتە گشتییە نەبوایە هەموو کافرو خودا نەناسێك دوا بەدوا بێدینییەکەی یەکسەر لەناوم دەبرد!! وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ –فاطر/٤٥﴾ مەبەست لەم ئایەتەی ئێرە کە باسی عەزاب دەکا، ئەوەیە دەفەرموێ: من هەرچی بمەوێ دەیکەم، هەر حوکمێکم بوێ بڕیاری دەدەمو کەس نیە بتوانیٚ ببێتە لەمپەرو دەستم بگریٚ. وەلیٚ لەهەموو کردارو بڕیارێکم دا حیکمەتو دانایییو عەدالەتکاری بەکار دەهێنم، ئەمجار دڵی بەندەکانی خۆش دەکا بەوەی کە رەحمەتی پێش خەشمو قاری کەوتووە، رەحمەتی زاڵە بەسەر غەزەبی دا، رەحمەتی گشتیو شامیلە هەموو شتێك دەگرێتەوەو بەشی هەموو کەس دەکا. ئەم ئایەتە وەکوو ئایەتێکی تر وایە کە لەسەر زوبانی هەڵگرانی عەرشی پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْماً –غافر/٧﴾

ئەمجار پەروەردگار وەصفی ئەوانە دەکا کە شیاوی ئەو رەحمەتەنو بەشێوەیەك باسیان دەکاو نیشانەکانیان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: دەق ئوممەتی پێغەمبەری ئیسلام، حەزرەتی موحەممەد ﷺ دەگرێتەوە، دەفەرموێ: ﴿فَسَأَكْتُبُهَا﴾ لەوە بەولاوە ئەو رەحمەتەم تایبەت دەکەمو دەیچەسپێنم بۆ:

١-﴿لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەو ئادەمیزادانەی خۆیان لەهاوەڵدانان بۆ خوداو تاوانکردن دەپارێزن، سەرپێچی فەرمانی پەروەردگار ناکەن.

٢-﴿وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ زەکاتی ماڵو سامانی خۆیان دەردەکەن دڵو دەروونی خۆیان لەرژدیو بەخیلی پاك دەکەنەوە، بۆیە بەتایبەتی لەنێو عیبادەتەکاندا باسی زەکاتی کرد، بۆ ئەوەی نەخۆشی دەروونی مادییە سوود خۆرەکانی جولەکە چارەسەر بکا، هەروەها چونکە بەگشتی دەروونی ئادەمیزاد رژدیو بەخیلی تێدایە.

٣-﴿ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ﴾ هەروەها بۆ ئەوانەیە کە بڕوایان بەهەموو ئەو ئایەتانە هەیە، کە نیشانەی تاکو تەنهایی ئێمەیە، بەڵگەن لەسەر ئەوە کە شەریعەتو یاسای ئێمە بیٚ عەیبو بیٚ کەمو کورییەو گونجاوە بۆ کارپێکردنو

بەکەڵکی هەموو نەتەوەیەك دی‌و بۆ هەموو رۆژگارێك دەبێ. بڕوایان بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەرانمان هەیە.

ئەو ئادەمیزادانەی ئەو سێ ڕەوشتانەیان تێدان: ئەوانە، ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ﴾ کەسانێکن شوێنکەوتووی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارن، ئەم صیفەتە نیشانەیەکە تایبەتە بەحەزرەتی موحەممەدەوەﷺ هیچ کامێ لەپێغەمبەرانی تر ئەو رەوشتەیان نەبوە، نەخوێنەواری نیشانەیەك بووە لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدﷺ ئەم زاتە پیرۆزە وێڕای ئەوەی کە نوسین‌و خوێندنەوەی نەزانیوە، پەیامێکی هێناوە بەسوود ترین‌و باشترین زانیاری لەخۆ گرتووە، کامڵترین زانیاری لەبارەی عەقیدەو خودا پەرستی‌و رامیاری‌و کۆمەڵایەتی ئابووری‌و ئەخلاق‌و رەوشتەوەی تێدایە، بەو شەریعەت‌و یاسایەی هێناویانە دەتوانرێ بیروباوەڕی ئادەمیزاد راست بکرێتەوە ئەخلاق‌و رەوشتی جوان فێر بکرێن، کردەوەیان بەسوود بێ ژیانیان پڕ کامەرانی‌و بەختەوەری بێ!

هەر وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ بەو شەریعەت‌و یاسایە توانی ڕەورەوەی رۆژگار بگۆڕی‌و دڕبدا بەتاریکی شەوە زەنگی کوفرو نەزانی، ئاینێکی بڵاو کردەوە کە کاریگەریەکی تەواوی لەژیانی گەلانی دەورو بەر دا هەبوو، تەنانەت ئەو کاریگەرییە شتێکی کاتی وا نەبوو کە بەلەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺو بەتێپەڕ بوونی سەردەم‌و رۆژگاری هاوەڵانی، ئەو کاریگەرییە بپووکێتەوە، بەڵکوو ئەوە چوار سەدە زیاترە ئەو کاریگەرییە زیندوویوتی خۆی لەدەست نەداوە!!!

بەراستی ئەمە هەواڵێکی گرنگە، گەواهی ئەوە دە دا کە نەتەوەی ئیسرائیل هەواڵی هاتنی پێغەمبەرێکی نەخوێندەواریان پێدراوە، زۆر لەمێژە ئەم هەواڵەیان لەسەر زوبانی پێغەمبەری خۆیان حەزرەتی مووساو حەزرەتی عیسا پێ راگەیاندراوە، خەبەری پەقینیان بەرەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام، رەوشت‌و نیشانەکانی ئەو پێغەمبەرەیان بۆ شی کراوەتەوە، شەریعەت‌و پێغەمبەرایەتی‌و تایبەتمەندی نەتەوەکەی بۆ ئەوان رونکراوەتەوەو پێیان راگەیاندراوە هەرکاتێ ئەو پێغەمبەرە رەوانەکرا خێرا بڕوای پێ بکەن‌و شوێنی بکەون. صیفاتەکانیشی

ئەمانەن!

١- ئەو زاتە: پێغەمبەرێکە نەخوێنەوار، نەخوێندنەوە دەزانێ نەنووسین.

٢- ﴿الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ﴾ ئەو پێغەمبەرەیە کە نەتەوەی ئیسرائیل رەوشتەکانی لەناو تەوراتو ئینجیل دا بەنوسراوی دەبینن‌و هیچ گومانیان لەوە دا نیە کە ئەو وەصفانە هی ئەم زاتەن کە ناوی موحەممەدەو پێغەمبەری ئیسلامە، چۆن کوری خۆیان دەناسن ئاوا ئەو پێغەمبەرە دەناسن. بەڵکوو زیاتریش دەیناسن.

٣- ٤ - ئەو زاتە پێغەمبەرێکە فەرمان دەکا بەچاکەو نەهی دەکا لەخراپە، هەر شتێك عەقڵی ساغو سەلیم بەباشی بزانی، طەبیعەتی ساغ پێی چاك بێ، ئەو پێغەمبەرە فەرمانی پێ دەکاو هەوڵی چەسپاندنی دەدا، هەرشتێك دەروونی صافو بێ گەرد قێزی لێ بکاتەوە، عەقڵ بەباشی نەزانێ ئەو پێغەمبەرە نەهی لێ دەکا!! بەکورتی ئەو پێغەمبەرە کە فەرمان دەکا تەنها فەرمان بەچاکە دەکا،، کەنەهی دەکا تەنها نەهی لەخراپە دەکا.

بۆیە عەبدوڵڵای کوری مەسعوود دەفەرموێ: هەر کاتێ پەروەردگار لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ باش گوێچکەی خۆتی بۆ کلۆر بکەو دڵی بدەرێ، چونکە یان فەرمان بەچاکە دەکا، یان نەهی لەخراپە دەکا.

بێگومان گرنگترین ئەو شتانەی پەروەردگار فەرمانی پێ دەکا عیبادەتکردنی پەروەردگارە بەشێوەیەکی یەکتاپەرستی! گرنگترین ئەو شتانەش کە نەهی لێ دەکا، بەندایەتیکردنە بۆ غەیری خودا، هەموو پێغەمبەرانﷺ یەك لەدوایەك ئەم راستییەیان دووپات کردۆتەوە: وەکوو قورئان لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللَّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ -النحل/٣٦﴾

٥ - ٦- رەوشتێکی تری ئەو پێغەمبەرە ئەوەیە: ﴿يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنْ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمْ الطَّيِّبَاتِ﴾ هەر خواردن‌و خواردەمەنییەك تەبیعەتی میانە بەپاكو خاوێنی بزانێ ئەو بۆیان حەلاڵ دەکا، وەکوو لەشوێنی تر دا قورئان دەفەرموێ: ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ -البقره/١٧٢، ٥٧ -الأعراف/١٦٠ - طة/٨١﴾ ئەو شتانەی کە بۆ خۆیان لەخۆوە لەسەر خۆیان حەرام کردبوو وەکوو

(بەحیرەو سائبةو وصیلەو الحام) شتی تریش کە خۆیان لەسەر خۆیان یاساغ کردبوو.

هەروەها هەر خواردنو خواردنەوەیەك کە تەبیعەتی میانە، بەنابارو ناشیرینی بزانیو لێی نەبان بێ، وەکو: (مرداروەوە بوو گۆشتی بەرازو خوێنی رەوانو هەر ماڵو سامانێك کە بەناحەق وەردەگیرێ وەکوو ریباو بەرتیلو داگیرکردنو خیانەتکردن) لێیان یاساغ دەکاو نەهیان لێ دەکا کە نزیکی بکەونەوە.

٧- رەوشتێکی تری ئەو پێغەمبەرە ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ ئەو ئەرکە قورسانەی کە لەسەر شانیان بووە وەکو: قیصاصی قەتڵ، کە بکوژ بەئەنقەست یان بەهەڵە ئەو کارەی لەدەست بقەومایە دەکوژرایەوە، خوێن وەرگرتن لەیاسای ئەوان دا نەبووە، یان خۆکوژی بۆ تۆبە کردن، یان ئەگەر یەکێکیان تاوانێکی بکردایە، دەبوو ئەو ئەندامەی تاوانەکەی پێ کراوە ببڕدرێ. ئەگەر پۆشاکیان پیس بوایە دەبو ببڕن چەندەها ئەرکی قورسی تریش. ) ئەم ئەرکانەیان لەسەر لادەبرێ!

بەکورتی ئەو پێغەمبەرە ئایینی ئاسانو لەتوانا دا بوویان بۆ دەهێنێ! وەکوو لەفەرمودەیەك دا کە خەطیب لەجابیرەوە ریوایەتی دەکا: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بعثت بالحنفیة السمحة) من بەئایینێکی بێ خەوشو ئاسان رەوانەکراوم، هەروەها پێغەمبەر ﷺ کاتێك مەعازو ئەبو مووسای ئەلئەشعەری ناردن بۆ یەمەن پێی فەرموون: (بشرا ولا تنفرا، ویسرا ولا تعسرا، وتطاوعا ولا تختلفا) مزگێنی بدەن خەڵك مەرەتێنن، شت ئاسان بکەن قورسی مەکەن، بەگوێی یەکتری بکەن بەربەرەکانی یەکدی مەکەن!

ئەمجار پەروەردگار چۆنیەتی شوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرە دیاری دەکاو پلەو پایەی شوێنکەوتوەکانو پاداشیان لەلای پەروەردگار رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ جا ئەو ئادەمیزادانەی ئیمانیان هێناوە بەو پێغەمبەرەی کە خاوەنی ئەم رەوشتانەیە، لەقەومی مووساو قەومەکانی تریش، وێڕای ئیمان هێنانیان پێی بەچاوی رێزەوە سەیری دەکەنو لەدوژمنو ناحەزانی دەیپارێزنو پارێزگاری لێ

دەکەن، بەزوبانو بەشمشێر یارمەتی دەدەن، پەیڕەوی ئەو نوورو روناکییە دەکەن کەبۆی نێردراوەتە خوارێ، شوێن ئەو قورئانە دەکەون کە لەگەڵ پێغەمبەرایەتییەکەی دا بۆی نێردراوە. ئەو ئادەمیزادانە رۆژی قیامەت سەرفرازو بەمراز گەیشتوون، هەر ئەوان رزگاریان دەبیو رەحمەتو رەزامەندی خودایان دەست دەکەوێ.

## پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد گشتییەو بۆ هەموو کەسە

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾

پاش ئەوەی لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە ناونیشانو رەوشتی پێغەمبەرﷺ لەتەوراتو ئینجیل دا دیاری کراون، باسی ئەوەشی فەرموو: کە هەر کەسێك شوێن پێغەمبەری ئیسلام بکەوێ، خۆشبەختی دونیاو قیامەتی بۆ دەستەبەر دەبێ، ئەمجار لایەنێکی گرنگی ریسالەی ئیسلامی روون دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە پەیامی ئیسلام گستیو بۆ هەموو کەسە، حەزرەتی موحەممەد کراوە بەپێغەمبەری هەموو ئادەمیزادو بۆ سەریان رەوانە کراوە، بانگیان دەکا بۆ ئیمان هێنان بەپەیامەکەیو هەرکەسێکیش شوێنی بکەویو پابەندی پەیامەکەی بێ خۆشبەختیو کامەرانی هەر دوو دونیای دەست دەکەوێ! دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً﴾ ئەی موحەممەد! بەهەموو ئادەمیزاد رابگەیەنە، بەهەموو عەرەبو غەیری عەرەب، بەرەش پێستو سپی پێستیان

بەهەمموو چینو توێـژو گـەلو نەتەوەیـەك بلـێ: مـن رەوانـەكراوی خـودام بـۆلای هـەموانتان، پێغەمبـەری خـودام بـۆ هـەموو كـاتو شـوێنێك تـارۆژی قیامـەت، رەوانـەكراوم بـۆ سـەر هـەموو ئـادەمیزاد بەگشتی! وەكـوو لەشـوێنێكی تـر دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ -الأنبياء/١٠٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿ وَمَـا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً -سبأ/٢٨﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿وَأُوحِيَ إِلَـيَّ هَـذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ -الأنعام/١٩﴾

زۆر فـەرموودەی چەسپاوو صـەحیحی پێغەمبـەری ئیسلامﷺ هـەن جـەخت لەسەر ئەوە دەكەن كە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر گشتیو بۆ هەموو كەسە... وەكوو ئـەو فەرموودەیـەی كـە بوخـاریو موسلیمو نەسـائی لـەجابیری كـوڕی عەبـدوڵڵاوە لەپێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕنەوە: كە فەرموویـەتی (أعطيت خمساً لم يعطهـن أحـد مـن الأنبياء قبلي: نصرت بالرعب مسيرة شهر، وجعلـت لي الأرض مـسجدا وطهـوراً، فأيمـا رجل من أمتي ادركته الصلات فليصل، وأحلت لي الغنائم ولم تحل لأحد قبلي، وأعطيـت الشفاعة، وكان النبي يبعث الى قومه خاصة وبعثت الى الناس عامـة) پێـنج بـەهرەم پـێ دراون بەهیچ كامێ لەپێغەمبەرانی تری پێش خۆم نەدراون، مانگە رێیـەك دوژمـن لێم دەترسێ، سەر زەویم بۆ كراوە بەشـوێنی نوێـژو پاكەوەكـەر، هـەر ئادەمیزادێك لەئۆمەتی من نوێژی پێ گەییشت لەهەر شوێنێك بوو بانوێژەكەی بكا. غەنیمـەتم بـۆ حـەڵاڵ كـراوە بـۆ هـیچ پێغەمبـەرێكی پـێش مـن حـەڵاڵ نـەبوە، پلـەو پایـەی شـەفاعەتكردنم پـێ دراوە پێغەمبـەرانی تـر نێـردراون بـۆ سـەر نەتـەوەكانیان بەتایبەتی! ئەمن نێردراوم بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی! ئـەمجار پـەروەردگار تاكو تەنهایی خۆی لەڕبووبیەتو ئیلاهییەت دا دەچەسپێنیو دەفەرموێ: بلـێ: مـن رەوانەكراوی خودایەكی ئەو تۆم ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِ وَيُمِيتُ﴾ كە هەرچی مڵكو سـەڵتەنەتی ئاسمانـەكانو زەوی هەیـە هـی ئـەوە، هـیچ خودا نـین جگـە لـەزاتی پـاكی، دەمرێنـیو دەژێنـێ، واتـە: مـردنو ژیـان بـە دەسـتی خۆیـەتی، دوای مـردن رۆژی قیامـەت هـەموو مـردوان زینـدو دەكاتـەوە، ئایەتەكـە هەرسێك بنـەمای سـەرەكی عەقیـدەی لـەخۆ گرتـووە: كـە ئیمـان بـەتاكو تـەنهایی خودایـــە لەڕبووبیـــەتو ئولوهیـــەت دا ئیمـــان بەپێغەمبەرایـــەتی حـــەزرەتی

موحەممەدﷺو پێغەمبەرانی تریشە.

ئیمان بەزیندوبوونەوەی رۆژی قیامەتە.

ئەمجار دوا بەدوای چەسپاندنی ئەو سێ بنەما سەرەکییانە بانگەوازی هەموو ئادەمیزاد دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ﴾ ئەی ئادەمیزادینە هەموتان! ئیمان بێنن بەخودای تاکو تەنیاو بێ شەریك لەڕبووبیەتو ئولو هییەتدا، ئەو خودایەی کە هەرچی شیاوی ژیان بێ دەیژێنێ، هەرچی شیاوی مردن بێ دەیمرێنێ ﴿وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ﴾ ئیمان بێنن بەرەوانەکراوو پێغەمبەرە نەخوێنەوارەکەی کە رەوانەیکردوە بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی بۆ ئەوەی فێری قورئانو حیکمەتیان بکا، لەبیروباوەڕی پڕوپوچو شەریك دانان بۆ خودا، لەبیروباوەڕی نەفامیو دوژمنکاری پاکیان بکاتەوە، بۆ ئەوەی بەهۆی شارەزایی کردنی پێغەمبەر بۆیان ببنە یەك ئوممەتی پتەوی خوداپەرستو هاریکار لەناوخۆیانداو، هەموویان بەچاوی برایەتی سەیری یەکتر بکەن، ﴿الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ﴾ ئەو پێغەمبەرەی بۆخۆی پیش هەموو کەسێك بڕوای تەواوی بەتاکو تەنهایی خودا هەیە، هەروەها ئیمانی بەو کەلیماتە تەشریعیانە هەیە کە نێردراونە خوارێ بۆ هیدایەتدانی ئادەمیزادو دیاردەیەکن لەدیاردەکانی عیلمو رەحمەتی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد. هەروەها بڕوای بەکەلیماتی تەکوینی خودا هەیە، کە نیشانەی دەسەڵاتو ویستو حیکمەتی یەزدانن، بڕوای تەواویشی بەو نیگایە هەیە کە بۆ سەر خۆی نێردراوە لەلایەن پەروەردگارەوە.

مەبەست بەکەلیمات: لەئایەتەکە دا ئەو ئەحکامو ئامۆژگاریو بەڵگە بەهێزانەن لەسەر هەبوونی خوداو تاکو تەنیاییو دەسەڵاتو توانای رەهای، کە لەتەوراتو ئینجیلو قورئان دا خۆیان دەنوێنن. تائێرە فەرمان بەئیمانهێنان بوو ئەمجار فەرمان دەکا بەئیسلام بوونو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ ئەی خەڵکینە! شوێن رێبازی پێغەمبەر بکەون، پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بن. هەرچی پێتان دەڵێو بۆتان دێنێ: وەری بگرن، بەڵکوو هیدایەت بدرێن بۆ شەقامەڕێی خوداپەرستی، کە هیچ کەندو لەندی تێدا نیە! یان بەڵکوو هیدایەت بدرێن بەهۆی ئیمانو شوێنکەوتنی شەریعەتەوە بۆ رێبازێك کە خۆشبەختی

دونیاو قیامەتی ئێوەی تێدایە.

لەراستیدا هیدایەتی صەحیحو بەردەوام لەقورئان دا نەبێ، دەست ناکەوێ، خێرو خۆشی هەر لەئایین دا هەیە، تەنها بەشوێنکەوتنی شەریعەتی سەرداری پێغەمبەران خۆشبەختیو کامەرانی دونیاو قیامەت دەستەبەر دەبێ، چەندێك ئادەمیزاد پابەندی شەریعەت بێ! چونکە ئەم ئایینە تەنیا بیروباوەڕێك نیە لەدەروون دا خۆی بچەسپێنیو بەس! هەر وەکوو چۆن بریتی نیە لەئەنجامدانی شەعائیرو طوقوسێکی بێ گیانو بەس! بەڵکوو ئایینی ئیسلام بریتییە لەشوێنکەوتنی تەواو بۆ ڕێبازی پێغەمبەرﷺ هەرچی لەخوداوە دەیهێنێو دەیگەیەنێ هەرچی شەریعەتو یاسایەك کە لەخوداوە پێمان دەگەیەنێ! پێغەمبەرﷺ هەر ئەوەندە نەبوە فەرمان بەخەڵکی بکا ئیمان بەخوداو پێغەمبەر بهێنن‌و بەس، هەروەکوو چۆن فەرمانی پێ نەکردون شەعائیری خوداپەرستی ئەنجام بدەن‌و بەس! بەڵکوو ئەو پێغەمبەرە بەگوفتارو کردەوە شەریعەتی پەروەردگاری پێ ڕاگەیاندون بەڵێ بەئاخاوتن‌و بەکردەوەو بەشێوەیەکی کوللیو بنەڕەتیو لەناخەوە!

ئەوەشمان لەیاد نەچێ کە تائادەمیزاد شوێن پەیامی پێغەمبەر نەکەون‌و بەگوفتارو کردەوە ڕێبازی پیرۆزی ئەو ڕەچاو نەکەن، بەهیدایەت ناگەن‌و بەختەوەر نابن! ئائەمەیە ئایینی خوداو دەبێ بەو شێوە پەیڕەویی بکرێ! جگە لەم شێوە پەیڕەویکردنە هیچ شێوەیەکی تر پەسند نیە.

## نەتەوەی ئیسرائیل هەندێکیان شوێن حەق کەوتن، پەروەردگار لەچۆڵەوانییەکەدا نیعمەتی خۆی بەسەر نەتەوەی ئیسرائیلدا ڕشت

﴿ وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾ وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ

ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١٦٠﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوو دا نەتەوەی ئیسرائیلی هەڵنا بۆ شوێنکەوتنی ئایینی حەزرەتی موحەممەدﷺ وەصفی ئەوانەی کرد کە ڕێزی لێ دەگرنو پارێزگاری لێ دەکەنو یارمەتی دەدەن فەرمووی: ئەوانەی ڕزگار بوو بەمراز گەیشتوون. ئەمجار سێ حاڵەتیان بۆ دیاری دەکا:

١- هەندێکیان شوێن پەیامی حەزرەتی مووسا کەوتوونو هەروەها شوێن پێغەمبەری ئیسلام کەوتوونو پابەندی ئایینی حەق بوونو کاریان پێ کردوە.

٢- پەروەردگار کردونی بەدوانزە کۆمەڵو گرۆو هۆز، بەئەندازەی ژمارەی کوڕەکانی ئیسرائیل.

٣- بەردەکەی کە حەزرەتی مووسا عەصاکەی پێدا دا دوانزە سەرچاوەی لێ هەڵقولا بە ئەندازەی ژمارەی کوڕەکانی ئیسرائیل. دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾ کۆمەڵێك لەنەتەوەی ئیسرائیل لەسەردەمی مووساداو پاش لە دونیا دەرچونونیشی شوێن حەق کەوتنو بە حەقو عەداڵەت حوکمیان کردوە، پابەندی فەرمانو نەهیەکانی ئایینی خودا بوون، ئەوانە خاوەن باوەڕە تۆبەکارەکان بوون لەنەتەوەی ئیسرائیل، ئیمانیان بەموسا هێناو ﷺ بۆ عوزر هێنانەوەو داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگار، بۆ ئەوەی لەگوێرەکە پەرستی نەتەوەکەیان خۆش ببێ لەگەڵ حەزرەتی مووسا دا چون بۆ میقات.... ئەوانە کۆمەڵێك بوون دڵو دەروونی خۆیان بەئیمان بەهێز کردبوو، خەڵکیان شارەزا کرد بۆ ئایین، لەپێناو ئایینەکەیان دا تێدەکۆشان، پابەندی ئامۆژگارییەکانی تەورات بوون، بەگوێرەی ئەو کتێبە ئاسمانییە لەناو نەتەوەکەیان دا حوکمیان دەکرد، هەر

لەم تاقمو گرۆهانە کەسانێك هەبوون پێشوازیان لەپەیامی پێغەمبەری ئاخر زەمان کرد، ئایینی ئیسلامیان قبوولْ کردو، گەردنکەچی فەرمانو نەهیەکانی بوون، چونکە لەتەوراتی خۆیان دا ئاماژە بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام کرابوو، نیشانەو رەوشتەکانی پێغەمبەری تێدا شی کرابووەوە بەهۆی ئەو ناوونیشانانە پێغەمبەریان وەکوو کوڕی خۆیان دەناسی! لەریزی هەرە پێشەوەی ئەو جولەکانەی ئیمانیان بەپێغەمبەرﷺ هینا، هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەرﷺ عەبدوڵلای کوڕی سەلام بوو، کە رۆڵێکی گرنگی هەبوو لەبانگهێشتنی جولەکەکان بۆ ئیمانهێنانو، بەدەقەکانی تەورات پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدی پێ دەسەلماندن.

وەکو لەشوێنێکی تر دا پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾آل عمران/١١٣. یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلّهِ...﴾آل عمران/١٩٩، یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لاَّ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلاَّ مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِماً -ال عمران/٧٥﴾ بەکورتی: ئەو هەواڵەی لەم ئایەتە وەردەگیرێ پەیوەندی بەکۆمەڵێکی خاوەن باوەڕەوە هەیە، نەتەوەی‌ئیسرائیل لەسەردەمی حەزرەتی مووساو دوای لەدونیا دەرچوونیشی! ئەم کۆمەڵە دەبنە سێ تاقمو گرۆهـ،،،

١- تاقمێکیان هاوچەرخی حەزرەتی موحەممەدﷺ بوونو بەخزمەتی گەییشتوونو ئیمانیان پێ هێناوە ئەمانە: ئەو کۆمەڵەن کە ئاماژیان بۆ کراوە، لەم ئایەتە دا کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاَوَتِهِ أُوْلَـئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ -البقرة/١٢١﴾

٢- کۆمەڵێکیان ئەوانەن کە ئیمانیان بەحەزرەتی مووسا هێناو دوایش شوێن ئەو پێغەمبەرانە کەوتوون کە بەدوا مووسا دا هاتوون. ئەمانە ئەو کۆمەڵەن کە لەم ئایەتەی ئێرە دا ئاماژەیان بۆ کراوە.

٣- تاقمێکیان دەگونجێ لەکۆمەڵی یەکەم بن یان لەکۆمەڵی دووەم بن ئەوانە بەم ئایەتە ئاماژەیان بۆ کراوە کە پێش کەمێك نوسیمان ﴿ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ......الآيە﴾.

ئەمجار دوای هاتنەوە لەمیقات بۆ جاری دووەمو دوای دامەزرانی نەتەوەی ئیسرائیل لەخاکی فەلەستینو جێگیربوون تێی دا ﴿وَقَطَّعْنَاهُمُ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أَسْبَاطاً أُمَماً﴾ نەتەوەی ئیسرائیلمان کرد بەدوازدە کۆمەڵ، حاڵو چونیەتی ئەمانە وابوو لەنەتەوەی دوازدە کوڕەکەی ئیسرائیل بوون، هەر کۆمەڵێکیان ئوممەتێ بوون لەناو خۆیاندا، هەر کۆمەڵەو دابو نەریتێکی تایبەتی هەبوو، لەبەر ئەوە لەو جێگە دا لەیەکمان جو دا کردنەوە، بۆ ئەوەی نەوەی هەر کوڕێك لەوانە خزمەتی خۆیان بکەن، لەناو خۆیان دا گەورەو بچوکی خۆیان دیاری بکەن، گەرەلاوژیو هەرچیو پەرچی لەناویان دا پەیدا نەبێو، فیتنەو ناشوبیان تێ نەکەوێ! بۆ هەر قەبیلەو هۆزێکیان حەزرەتی مووسا رابەرو پێشەوایێ دابنێ، چاودێری یاسای دینو دونیایان بکا.

﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى إِذْ اسْتَسْقَاهُ قَوْمُهُ أَنْ اضْرِب بِعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانْبَجَسَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَشْرَبَهُمْ﴾ نیگامان بۆ مووسا کرد لەو کاتە دا کە قەومەکەی لەدەشتی فەلەستین داوای ئاوی خۆشو گوارایان لێ کرد، پێمان گوت: بەعەصاکەت لەو بەردە گەورە بدە کەوا لەکێوی (حوریب)ی شیوی سینادایە!

حەزرەتی مووسا بەفەرمانی خودا بەعەصاکەی دای لەبەردەکە، دوانزە سەرچاوەی لێ هەڵقوڵا، هەریەکێ لەم سەرچاوانەی بۆ بەرەبابو هۆزێکیان دیاری کرد، بۆ ئەوەی لەسەر ئاو تێك بەرنەبنو ناشووبو ئاژاوەیان تێدا پەیدا نەبێ، هەر بەرەبابو هۆزێکیان دەیانزانی سەرچاوەی تایبەتی خۆیان کامەیەو لێیان تێك نەدەچووا!

راڤەکەرانی قورئان گەلێ راوو بۆچونی جیا جیایان دەربارەی قەبارەی ئەو بەردەو شوێنەکەی باسکردوە، زۆربەیان مۆرکی خەرافاتی ئیسرائیلیاتیان پێوە دیارەو عەقڵ وەری ناگرێ!

لەواقیع دا دەبێ ئەو بەردە بەردێکی گەورەو زەبەللاحی وابووبێ کەجێگای دوازدە سەرچاوەی جیاوازی تێدا جێ بووبێتەوەو خەڵکە توانیبێتیان بەئاسانیو بەشێوەیەکی رێكو پێك ئاویان لێ وەربگرنو پاڵە پەستۆو قەرەباڵغی دروست نەبێ.

جا چونکە ئەوان لەوە پێش لەمیصر دا ئاوو هەوای خۆشیان هەبوو، کاتێ

هاتنە ئەو دەشتە گەرمەڵانەی سینا زۆر بەگەرماکەی نارەحەت بوون زەحمەت بوو بتوانن تێی دا هەڵبکەن بۆیە ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ الْغَمَامَ﴾ هەورمان کرد بەچەترو سێبەر بەسەریاندا، لەگەرمای خۆر دەیپاراستن، ئەگەر سێبەری هەورەکە نەبوایە، گەرمای خۆر دەیسوتاندن!! چونکە لەو دەشتە گەرمە دا دارو درەخت نەبوو سێبەریان لێ بکا....!

سەرباری ئەو نیعمەتانە -هەڵقولانی ئاوو سێبەری هەور- ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى﴾ خواردنەوەمان بۆ ئاسان کردن، لەباتی نان گەزۆمان بەسەر دا باراندن،[٦] لەجیاتی گۆشت پەلەوەری (شەلاقە)مان بۆ ناردن بەئاسانی بۆیان دەگیرانو، سەریان دەبڕینو، گۆشتەکەیان دەخواردن، ئەم خواردنو خواردنەوەمان بۆ دابین کردنو لەسەر زمانی مووسا پێمان گوتن: ﴿كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ بخۆنو بخۆنەوە لەو رزقو رۆزییە خاوێنەی کە پێمان داون ئەوە نیعمەتی ئێمەیەو بەتایبەتی بەئێوەمان بەخشیوە، پێویستە ئێوە سوپاسگوزارو شوکرانە ژمێر بن!

کەچی وێڕای ئەو هەموو رزقو رۆزییەی کە پێمان دابوون،، ئەو نەتەوە بەدبەختە، کوفرانی نیعمەتی ئێمەیان کردو، پەرمیان بەسەرپێچیکردنو نافەرمانی ئێمە دا ﴿وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِنْ كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئەوان بەوەی کە کوفرانی نیعمەتی ئێمەیان کرد ستەمیان لەئێمە نەکردو زیانیان پێ نەگەیاندین بەڵکوو ستەمیان لەخودی خۆیان کرد، چونکە پەروەردگار بێ ئاتاجە لەهەموو عالەم، ئەگەر هەموویان تێکڕا نافەرمانی خودا بکەن هیچ لەخودایەتی خودا کەم ناکا، ئەگەر هەمووشیان کۆببنەوە لەسەر خوداپەرستی، هیچ لەخودایەتی زاتی پاکی زیاد ناکا.

---

[٦] گەزۆ مادەیەکی شیرینە وەکوو شەونم دەکەوێتە سەر گەڵا دارو (شوکەی) دەکەوێتە سەر بەرد، لەکوردستان ئاخرو ئۆخری بەهارو هاوین بەزۆری هەیە.

## فەرمان کردن بەنەتەوەی ئیسرائیل کە (بیت المقدس) بکەن بەنیشتەمەنی خۆیان

﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا حِطَّةٌ وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيئَاتِكُمْ ۚ سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ ﴾

دوای ئەوەی یەزدان حاڵو وەزعی نەتەوەی ئیسرائیلی بەیان کرد، جۆری نیعمەتەکانی پێی دابوون راینواندن، سەرپێچیو ستەمکردنیان دەست نیشان کرد، گونجاو بوو کە جۆرێکی تر لەسەرپێچیو ستەمو نافەرمانییان بۆ خودا، باس بکاو فەرمووی: ﴿وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ ئەی موحەممەد! باسی ئەوە بۆ گەلەکەت بکە، کە لەلایەن مووساوە بەنەتەوەی ئیسرائیل گوترا: بڕۆن نیشتەجێ بن لەو شارە ئاوەدانەی کە شاری بەیتولمەقدیسە، ﴿وَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ﴾ بەئارەزوی خۆتان لەهەر شوێنێ ویستتان لەرزقو رۆزی ئەو شارە بخۆنو بخۆنەوەو سوودی لێ وەربگرن ﴿وَقُولُوا حِطَّةٌ﴾ بڵێن خودایە! تاوانمان لێ بتەکێنەو لەگوناهمان خۆش ببە، ﴿وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا﴾ بەشێوەی خۆ بەکەم زانینو سوپاسگوزاری بۆ پەروەردگارو سەر نەوی کردنو کڕنووش بردنو لاڵانەوە پاڕانەوەو بچنە دەرگای بارەگای ئەو شارە پیرۆزەوە، بەجارێ هاوار لەپەروەردگار بکەن لێتان خۆش بێو، کامەرانیو بەختەوەریتان پێبداو، تێی دا بحەسێنەوە، دەست بکەن بەکارو کاسپیو هەوڵدان بۆ دابین کردنی پێداویستی ژیان، هەروەها پێویستە جیهاد بکەن بۆ

ئەوەی نیشتمانەکەتان لەدوژمن وەربگرنـەوەو بەسەربەسـتیو ئـازادی تێـی دا ژیـان بەسەربەرن!!

ئەگەر وا بکەن ﴿نَغْفِرْ لَكُمْ خَطِيئَاتِكُمْ﴾ لەپاداشی پابەنـد بوونتـان بەفـەرمانی ئێمەو لەپاداشی ئەو جیهادەتـان دا لەتاوانـەکانتان خـۆش دەبـینو چاو پۆشـیتان لێ دەکـەین، زیـاد لـەوەش ﴿سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ﴾ پلـەو پایـە زیـاد دەکـەین بـۆ ئەوانـەی بەدڵسۆزیو ئیخلاصەوە ئەرکی سەرشانیان ئەنجام دەدەنو چاکەکارن!

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ: کە ئەم چیرۆکە لەسـورەتی (البقـرة/٥٨-٥٩) دا هاتووە، بەسەرمان دا تێپـەری، بـەلاَم لەگـەڵ جوداوازی لەدەقەکـەیاندا، بـۆ ئـەوەی بگـونجێ لەگـەڵ بەلاغـەتو ئوسـلووبی قورئـانو سەرئاسـایی ئـەو نامـە ئاسمانییـە، چونکە دووبارە کردنەوەی وشەو رستە بەهەمان دەقی پێشوو ناچێتە چوار چێوەی بەلاغەتـەوە بـەڵکوو بەلاغـەت ئەوەیـە: کـە مانایـەك بەچـەند ئوسـلووبو شـێوازی جیاجیا بگەیەندرێ:

## ئیمامی رازی هەشت خاڵی جوداوازی نێوان دەقەکەی ئێرەو دەقی سورەتی (البقرة)ی دەست نیشان کردوە بەم جۆرەی کەدێ:

١- لێرە دا فـەرمووی: ﴿اسْكُنُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ﴾ لـەوێ فـەرمووی ﴿ادْخُلُـوا.....﴾. فائیدەی مانای ئایەتەکە لێـرە تـەواو تـرە! چونکە: نیشتەجێ بـوون، مانـای چونە ناویشی لێ وەردەگیرێ بەلاَم پێچەوانەکەی وانیە.

٢- لێرە فەرمووی: ﴿وَكُلُوا﴾ لەوێ فەرمووی: ﴿فكلوا﴾ چونکە دەسـت کـردن بەخواردن پاش چوونە ناوەوە دەبێ! کەوابێ وا جوانە بە(فا)ئی تـەعقیب بـێ نـەك بەواو، چونکە واو ئەو دەگەیەنێ کە خواردنەکە لەگەڵ نیشتەجێ بـوون دەسـتەبەر دەبێ نەك پاش نیشتەجێ بوون.

٣- لەوێ وشەی ﴿رغدا﴾ی هێناو کردی بەصیفەتی (الا) بەلاَم لێـرە دا وشـەی ﴿رغداً﴾ نەهێناوە.

٤- لێرە دا وتنی ﴿حطة﴾ پێش فەرمان بەچوونە ژورەوەی خست، بەلاَم لـەوێ بەپێچەوانەوە هێنانی.

٥- لێرە دا فەرمووی: ﴿لنغفر لكـم خطيئـاتكم﴾ لـەوێ فـەرمووی: ﴿نغفـر لكـم

خطایاکم﴾.

٦- لێره دا فەرمووی: ﴿سنزید المحسنین﴾ بەبێ واو، لەوێ فەرمووی: ﴿وسنزید المحسنین﴾ بەبێ واوە.

٧- لێره دا فەرمووی: ﴿فأرسلنا علیهم رجزاً﴾. لەوێ فەرمووی: ﴿فأنزلنا علی الذین ظلموا﴾.

٨- لێره دا فەرمووی: ﴿بما کانوا یظلمون﴾ لەوێ فەرمووی: ﴿بما کانوا یفسقون﴾.

بەکورتی مانای ئایەتەکەی ئێره ئەوەیە: پەروەردگار هەڵسوکەوتی جولەکە پێشینەکانی وەبیر جوولەکە هاوچەرخەکانی سەردەمی پێغەمبەرﷺدەهێنێتەوە: کە فەرمانی پێ کردون برۆنە ناو شاری قودسەوە (یان شارێکی تر بووە) لەخودا بپارێنەوە کە لەگوناهیان خۆش بێ، گەردنکەچی خۆیان بۆ خودا بنوێنن‌و کڕنووش بەرن‌و شوکرانە بێژی بکەن! پەروەردگار لەپاساوی ئەوە دا دوو شتی پێداون، لێخۆشبوون‌و زێده چاکەیان دەداتێ، ﴿فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ﴾ بەڵام ئەوانەی ستەمکار بوون لەنەتەوەی ئیسرائیل ئەوەی پێیان گوترابوو گۆڕییان، لەجیاتی (حطە) دەیانگوت(حبە). لەجیاتی ئەوەی ملکەچ بکەن‌و کڕنووش بەرن‌و بەسەردانەواندنەوە بچنە ناو قودسەوە بەقنگە خشکێ چوونە ناو قودسەوە.سروشتی جوولەکە هەمیشە بریتی بووە لەسەرپێچیکردن‌و یاخی بوون‌و هەڵگەڕانەوە لەیاسای خوداو نافەرمانی کردن‌و سپڵەیی‌و هەڵپەکردن بۆ سەرپێچیکردنی فەرمانی خودا بەگوفتارو کردار. ئەوە بوو لەجیاتی ئەوە بڵێن: (حطة) دەیانگوت: (حبة في شعرة) لەجیاتی ئەوەی ملکەچی‌و خوشوعو خضووعەوە برۆنە ناو بەیتولەقدیسەوە بەقنگەخشکێ‌و چاو لەحەوا چوونە ژوورەوە رۆیشتنە ناو شارەکەوە. دەی بابزانین ئاکام چۆن بوو سەرەنجام چییان بەسەرهات..؟ ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزاً مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَظْلِمُونَ﴾ لەسزای ئەو سەرپێچی‌و سەرسەختی‌و بێگوێییان دا عەزابێکی زۆرمان بۆ سەر ناردن، ئەو ئاسمانەی کە لەوەپێش لێیەوە گەزۆو گۆشتی پەلەوەری (شەلاقە)یان بۆ دەنێردرایە خوارێ، هەور سێبەری لێ دەکردن، ئیستا بەهۆی سەرپێچی‌و ستەمکارییانەوە

عەزابیان لێیەوە بۆ دەنێردرێ! عەزابێك دڵو دەروون بەلەرزە دێنیو، كاروباری ژیانیان لێ دشێوێنێ!

نەتەوەی ئیسرائیل لەكاتێك دا مووسا چوو بۆ كێوی (طوور) بۆ ئاخاوتن لەگەڵ پەروەردگار، ئەوان هیچ گوێیان بەئامۆژگاری حەزرەتی مووساو حەزرەتی هاروون نەداو گوێرەكەیان پەرست! دوایی خودا عەفووی كردن! لەمیقات دا داوای بینینی خودایان كردو (رەجفە) گرتنیو دوایی كە وەهۆش خۆ هاتنەوە خودا عەفووی كردن، چەند نیعمەتو بەخششی پێدان، كە لەوە پێش چەند جارێك ئاماژەمان بۆ كرد كەچی ئەوەتا ئەوان نافەرمانی دەكەن، قسە دەگۆڕن فەرمانیان پێ دەكرێ بچنە ناو شارێكی تایبەتییەوەو هەموو رزقو رۆژیو خێروخێراتی ئەو شوێنەیان بۆ حەڵاڵ دەكرێ بەمەرجێ دوعاو نزایەكی تایبەتی بكەنو بەشێوە كڕنووش بردن بۆ خوداو بەملكەچی بچنە ناو شارەكەوە، بەمەبەستی ئیعلانكردنی گەردنكەچی بۆ خودا لەكاتی سەركەوتنو زاڵ بوون بەسەر دوژمن دا كەچی نەیان كرد -وەكو چۆن پێغەمبەری ئیسلام لەرزگار كردنی شاری مەككە دا كاتێ چووە ناو شارەوە، لەسەر پشتی ولاغەكەی سوجدەی بۆ خودا بردو بەو شێوە ملكەچییەوە بۆ خودا چووە ناو مەككەوە.-

لەبەرامبەر فەرمانبەرداری نەتەوەی ئیسرائیل بۆ فەرمانی خودا، وادەیان دەداتێ كە لەگوناهیان خۆش بیو لەچاكەی چاكەكاران زیاد بكا. كەچی دەبینین: كۆمەڵێكیان شێوازی دوعاو پاڕانەوەكە دەگۆڕن، ئەو شێوە چوونە ژوورەوەی فەرمانیان پێ كراوە دەیگۆڕنو بەشێوەیەكی تر دەیانەوێ بچنە ناو شارەكەوە، چونكە ئەوان لاریو سەرپێچیكردن بوەتە بەشێك لەسروشتییانو هەمیشە دەیانەوێ لەرێگەی راست لابدەن. بۆیە پەروەردگار سزای دانو عەزابی زۆری بۆ سەر ناردن!

بەكورتی حەزرەتی مووسا بەنەتەوەی ئیسرائیلی فەرموو: ئەگەر ئێوە بەراستی دەتانەوێ بەندایەتی خودا بكەنو پلەو پایەی لەوەپێشتان وەدەست بهێننەوەو نیشتمانی خۆتان ئازاد بكەنەوە، پێویستە جیهاد بكەنو بەرامبەر بەدوژمن بجەنگێن... بڕۆن شاری قودس وەربگرنەوەو دوژمنی لێ وەدەرنێنو،

ئاوەدانی بکەنەوەو فەرمانڕەوایی خۆتانی تێدا بچسپێنن، ئەوسا خودا لەتاوانتان خۆش دەبی‌و پلەوپایەی دونیاو قیامەتتان پێ دەبەخشێ، بەڵام ئەوان گوێیان بەقسەکانی حەزرەتی مووسا نەداوجیهادیان نەکردو، خودا لەسارای سینا دا گیرۆدەی کردن، بەسەر شۆڕی ژیانیان بردەسەر، پاش لەدونیا دەرچوونی مووسا بەخۆیان دا چوونەوەو دەستیان کرد بەجیهاد لەگەڵ نەتەوەی یوشعدا ﷺ توانیان قودس وەربگرنەوە.

## فرت‌و فێڵی جولەکە بۆ ڕاوکردنی ماسی لەڕۆژی شەممەداو سزای سەرپێچیکاران!!

﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ۙ ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ ﴾

ئەم ئایەتە باسی جۆرێکی تر لەیاخی بوونو سەرپێچی کردنی نەتەوەی ئیسرائیل دەکەن، دوای ئەوەی لەوەپێش باسی فەرمان پێ کردنیان بۆ چوونە ناو بەیتولمەقدیس کرا، ئەمجار لێرە دا چیرۆکی فێڵ کردنیان لەبواری ماسی گرتن دا دەگێڕێتەوە،، شایانی باسە ئەم چیرۆکە لەسورەتی (البقرة) دا بەکورتی ئاماژەی بۆ کرا، کە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ﴾البقرة/٦٥.
لەسورەتی (النساء) دا لەئایەتی (٤٧، ١٥٤) دا ئاماژەی بۆ کرا، لەم سورەتەش دا واتە: سورەتی (الأعراف)ە، کەسورەتێکی مەککەییەو پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ وتوویژ لەگەڵ جولەکە بکا، نازڵ بووە تا بەڵگە بێ لەسەر ئاسایی قورئان. چونکە پێغەمبەرﷺ پیاوێکی نەخوێندەوار بووە، هیچ زانیاریو زانستێکی نەخوێندوە، لەهیچ کتێبێکی نەڕوانیوە، کەوابێ هەواڵدانی بەو چیرۆکە موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرایەتییەتیو بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو چیرۆکە لەخوداوەیەو کەلامی پەروەردگارە!

هێنانی ئەم چیرۆکە سوودێکی تریشی هەیە، ئەویش هۆشیار کردنەوەیە لەسەر ئەوە کە بەدرۆ خستنەوەی حەزرەتی موحەممەدﷺو ڕەتکردنەوەی موعجیزەکانی شتێکی تازە بابەت نیە، بەڵکوو کوفرو سوور بوون لەسەر کوفر دابو نەریتی پێشینانیانە، لەکۆنەوە ئەوە پیشەیانە!

ریوایەت کراوە کە نەتەوەی ئیسرائیل فەرمانیان پێ کرا کە رێزی رۆژی جومعە بگرنو بیکەنە رۆژی پێشووی خۆیان ئەوان رۆژی شەممەیان هەڵبژارد، ئەو رۆژە بۆ ئەوان بوو بەتاقیگەو تاقیکردنەوە، ئەوە بوو لەو رۆژە دا راوە ماسییان لێ قەدەغە کراو فەرمانیان پێ کرا کە رێزی ئەو رۆژە، واتە: رۆژی شەممە بگرنو هیچ کارێکی تێدا ئەنجام نەدەن، تاقیمان کردنەوە بەو حاڵەتە کە لەرۆژانی شەممەدا، کە رۆژی ریزگرتنە ماسییە گەورەکانی دەریا دەهاتنە قەراغ دەریاو بەئاسانی بۆیان بەیدەست دەبوون، تەنانەت لەبەر زۆریی ماسییەکان ئاوەکە نەدەبینرا! لەو رۆژانەش دا کە رۆژی شەممە نەبوایە، ماسییەکان دەرنەدەکەوتنو خۆیان ون دەکرد، بەم جۆرە ماوەیەکی زۆر مانەوە، شەیتان هاتە لایانو پێی گوتن: ئێوە لەرۆژی شەممە دا ماسی گرتنتان لێ قەدەغە کراوە، ئەستێراو دروست بکەن

لەرۆژی شەمموان دا ماسییەکان کێش بکەن بۆ ناو ئەستێراوەکان کە خستتاننە ناو ئەستێراوەکانەوە ناتوانن لێیان دەربچن، رۆژی یەکشەممە راویان بکەن.

یەکێکیان ماسییەکی گرت، گوشێکی لەکلکی خستو بەدرەختێکی نزیك قەراغ دەریاوە بەستیەوە، ئەمجار رۆژی یەکشەممە برژاندی، جیرانەکەی بۆنی کرد، تەماشای تەندورەکەیانی کردو پێگوت: من وەدەزانم خودا لەسەر ئەم کارەت سزات دەدا، کە سزا نەدرا لەشەممەی داهاتوو دا دوو ماسی گرت!! کە بینیان عەزاب نایەتە سەریان، دەستیان کرد بەراوکردنی ماسیو برژاندنو خواردنو فرۆشتنیان، ئەم بەنو ئیسرائیلییانە نزیکەی حەفتا هەزار کەس بوون، دانیشتووی ئەو شارە بوون کە نزیك دەریا بوو وەکوو ئەم چیرۆکە باسیان لێوە دەکا نزیکەی حەفتا هەزار کەس بوون، لەئاکامی ئەم فێڵەیان دا بوون بەسێ تاقم، تاقمێکیان نەهییان لێ کردن ئەمانە نزیکەی دوازدە هەزار بوون. تاقمێکیان وتیان: ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوْماً اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ﴾. بۆچی کەسانێك ئامۆژگاری دەکەن کە خودا بەهۆی تاوانەکانیانەوە لەناویان دەبا؟؟

تاقمێکیشیان ئەوانە بوون: کە تاوانەکەیان ئەنجام دەدا: کە ئەم کۆمەڵەیان وازیان لەتاوانو بێگوێیی نەهێنا، موسوڵمانەکان پێیان وتن: ئێمە لەگەڵ ئێوە دانانیشین، شارەکەیان بەدیوار ناوان کرد، بۆ موسوڵمانەکان دەرگای تایبەتی هەبوو، بۆ کافرەکان دەرگای تایبەتی هەبوو، حەزرەتی داوود نەفرینی لێ کردن، رۆژێك موسوڵمانەکان لەدانیشتنێك دا بوون روانیان ئەو رۆژە هیچ کەس لەتاوانبارەکان بەدەرەوە نیە، وتیان رەنگە ئیشێکی گرنگو گشتییان هەبێ، کە سەیریان کردن، هەموویان بوبوون بەمەیموون!! دەرگایان کردنەوەو چوون بۆ ناویان، مەیموونەکان خزمە ئادەمیزادەکانی خۆیان دەناسینەوە، بەڵام ئادەمیزادەکان مەیموونەکانیان نەدەناسینەوە، مەیموونەکان یەکەیەکە دەهاتنە لای خزمە ئادەمیزادەکانو بۆنیان پێوە دەکردنو دەگریان.. ئەوانیش پێیان دەگوتن: ئەی ئێمە نەهیمان لێ نەکردن؟ پێمان نەگوتن نافەرمانی خودا مەکەن! مەیموونەکان بەسەر ئیشارەیان دەکردو دەیانگوت: بەڵێ پێتان گوتین بەڵام ئیمە بێ گوێییمان کرد!!

هەندێ دەڵێن: گەنجەکان بوون بەمەیموونو پیرەکان بوون بەبەراز.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: بەراستی ئەوانە خراپترین خواردنیان خوارد، بەهۆی ئەو خواردنەوە قورسترین ریسواییان بەسەر هات لەژیانی دونیادا، درێژترین سزایان لەقیامەت دا بۆ خۆیان هێنا!! سوێندم بەخودا تاوانی ماسی گرتنێك کە گرتیانو خواردیان لای خودا لەکوشتنی موسولمانێك گەورەتر نیە، بەلام خودا بۆ بکوژ ناکاتە مەیموون؟؟ ئەوە ویستی خۆیەتی چۆنی دەوێ ئەوە دەکا، سزای قیامەتی بۆ داناوەو، دیارە سزای قیامەت قورسترو بەئێش ترە.

مامۆستا سەیید قوطب دەفەرموێ: ئەکتەری ئەم روداوە کۆمەڵێك بەنو ئیسرائیلی بوون، کە لەشارێکی قەراغ دەریا نیشتەجێ بوون بەنو ئیسرائیلییەکان بۆ خۆیان داوایان کرد کە لەهەفتە دا رۆژێکیان بۆ دیاری بکرێ بیکەنە جەژنی خوداپەرستیو لەو رۆژە دا هیچ کارو کاسپییەك نەکەن، رۆژی شەممەیان بۆ دیاری کرا.....

قورئانی پیرۆز خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاسْأَلْهُمْ عَنْ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ﴾ ئەی موحەممەد! لەجوولەکەکانی هاوچەرخت پرسیار بکە، دەربارەی چیرۆكو بەسەرهاتی دانیشتوانی ئەو شارەی کە لەقەراغ دەریا هەڵکەوتبوو، سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاریان کرد، ئەویش لەتۆڵەو سزای ئەو کردەوە ناشرینانەیاندا، عەزابی سەختی خۆی بەسەر دا دان، تۆڵەی کردەوەی نالەبارو فێڵو تەڵەکەبازییانی لێ سەندن. پرسیارەکە بۆ لۆمەکردنو سەرزەنشت کردنیانە، بەیان کردنو روون کردنەوە نەوەیە: کە کوفرو سەرپێچی کردنی جولەکە هاوچەرخەکانی رۆژگاری حەزرەتی موحەممەد، شتێکی تازە بابەتو تازە قەڵلا نیە، بەڵکوو دابو نەرێتو سروشتی باوكو باپیرانیانە بەمیرات بۆیان ماوەتەوە، بێگومان پێشینەکانیان تاوانی گەورەیان ئەنجام داوەو بەئاشکرا سەرپێچی فەرمانی خودایان کردوە.....

ئەو جولەکانەی هاوچەرختو ئەوانەی لەدوا ئەوانیش دێن بیانترسێنە لەوەی سەرپێچی فەرمانو نەهیەکانی پەیامەکەت بکەن، بۆ ئەوەی ئەو سزاو عەزابەی تووشی پێشینەکانیان بووە، تووشی ئەمانیش نەیە،

پرسیار لەجولەکەکانی هاوچەرخت بکە دەربارەی دانیشتوانی ئەو شارەی

قەراغ دەریای سوور کە کەوتوبوە نێوان مەدیەنو طوور، ﴿إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ﴾ کاتێك سنوور بەزێنیێیان کردو، لەرۆژی شەممە دا -کە بەلایانەوە پیرۆز بوو، کاریان تێدا نەدەکردو کردبوویانە رۆژی خودا پەرستی- ئالەو رۆژە دا سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو، فێڵیان لەراوە ماسی دا کردو، ماسییان تێدا گرتنو فەرمانی خودایان شکاند! ﴿إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا﴾ ئەومیان بۆ بگێرنەوە کە بەقودرەتی خوداو بۆ تاقیکردنەوەی نەتەوەی ئیسرائیل لەرۆژی شەممە دا کە راوە ماسییان لێ یاساغ کرابوو تێیدا، ماسییەکی زۆر دەهاتنە قەراغ دەریاو، بۆیان بەیدەست دەبوونو، گرتنیان زۆر بەئاسانی دەبوو، ﴿وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ﴾ لەرۆژەکانی تر دا جگە لەشەممە، ماسییەکان گوم دەبوونو دەرنەدەکەوتن وەکوو رۆژی شەممە سەرئاو نەدەبوونو نەدەهاتنە قەراغ دەریا!

ئەوانیش هاتن فێڵیان کرد بەوە لەقەراغ دەریا ئەستێراویان دروست کردن کە شەپۆلی دەریا رۆژی شەمموان دەهات لەگەڵ خۆی دا ماسی دەهێنان دەکەوتنە حەزەکانەوەو ئاخێ دەبوونو رێگای چوونەوە بۆ ناو دەریایان نەدەبوو، ئەمجار رۆژی یەکشەممە ئەو فێڵبازانە، دەهاتن دەیانگرتنو راویان دەکردن! ﴿كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ وەکوو ئەو تاقیکردنەوەی کە ئەنجامیاندا: بەوەی کە ماسییەکان لەرۆژی شەممە دا -کەراوکردنیان تێی دا لێ قەدەغە کرابوو- بەدەرکەوتنو لەرۆژانی تر دا -کە بۆیان رەوا بوو راوە ماسی بکەن- ماسییەکان خۆیان گوم دەکردو دیار نەدەمان!! ئاوا بەو جۆرە جوولەکە پێشینەکانو جوولەکە هاوچەرخەکانو خەڵکانی تریش بەتاقی دەکەینەوە، واتە: وایان مامەڵە لەگەڵ دەکەین وەکوو ئەوە بڵێی بەتاقییان دەکەینەوە -ئەگینا خودا بۆخۆی پێویستی بەتاقیکردنەوە نیە، پەروەردگار بۆخۆی دەزانێ سەرەنجامو ئاکام چۆن دەبێ- بۆیەش ئەو مامەڵە رواڵەتیەیان لەگەڵ دەکا، بۆ ئەوەی هەموو یەکێك لەوان بەگوێرەی کردەوەکانی سزای بدرێتەوە، هەریەکەیان بەهۆی خراپەکاری بەردەوامیانو دەرچوونیان لەتاعەتی پەروەردگار سزا بدرێن، چونکە سوننەتی خودا واهاتووە: هەر کەسێك تاعەتی خودا بکا خودا لەدونیا دا کاریان بۆ ئاسان دەکاو لەقیامەتیش دا پاداشیان دەداتەوە، کەسێکیش لەخودا یاخی بێ تووشی

جۆرەها تەنگو چەڵەمەو بەڵاو موصیبەتیان دەکا. کاتێك فێڵەکەیان کردو تاوانەکەیان ئەنجامدا، دانیشتوانی شارەکە بوون بەسێ گرۆهو تاقمو سێ هەڵوێست وەرگیران، کۆمەڵێکیان تاوانکارو کۆمەڵێك ئامۆژگاریکەرو کۆمەڵێك بێلایەن. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِنهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْماً اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَاباً شَدِيداً﴾ ئەی موحەممەد! پرسیاریان لێ بکە دەربارەی حاڵو چۆنیەتی دانیشتوانی ئەو شارە، کاتێك: کۆمەڵێك لەو دانیشتوانە، کە بێلایەن بوونو پێیان وابوو ئامۆژگاری کردنی سەرپێچیکاران چ سوودی تێدا نیەو سەرزەنشتی ئامۆژگاریکارانیان کردو پێیان وتن: ئەوە ئێوە بۆچی ئامۆژگاری کۆمەڵێك دەکەن کە پەروەردگار بڕیاری لەناوبردنی داون؟؟ ئێوە دەزانن کە خودا لەدونیا دا بەهیلاکیان دەباو لەقیامەت دا سزای سەختیان دەدا، دەی کەوابێ بۆچی خۆتانیان پێ هەڵەوگیر دەکەنو سەری خۆتانیان پێ دەهێشێنن؟؟

کۆمەڵی ئامۆژگاریکەران وەڵامیان دەدەنەوەو: ﴿قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَى رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ دەڵێن: بۆیە ئامۆژگاریان دەکەین، بۆ ئەوەی لای خودا عوزرمان هەبیو بڵێین: ئێمە ئەرکی سەرشانی خۆمان ئەنجام داوەو بەزوبان بەرهەڵستی کاری خراپمان کردوەو لەعاستی کاری خراپ بێدەنگ نەبووین، وێڕای ئەوەش ئێمە ناهومێد نابین لەگەڕانەوەیان بۆ لای حەقو هاتنەوەیان بۆ سەر ڕێبازی ڕاست بەڵکوو بەم ئامۆژگاری کردنو نارەزایی دەربڕینەمان واز لەو خراپەکاریو سەرپێچی کردنەیان بهێننو بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو تۆبە بکەن، ئەو کاتە پەروەردگار تۆبەیان لێ قبووڵ بکاو رەحمیان پێ بکاو لێیان خۆش ببێ!!

جا ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ﴾ کاتێك راوکەرەکان گوێیان بەئامۆژگاری کردنەکە نەداو، رویان لێ وەرگێڕاو، هیچ سوودیان لەنەصیحەتەکەیان نەبینیو هیچ کاریگەر نەبوو بۆیان ﴿أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ﴾ ئەوانەی نەهییان لەخراپەو سەرپێچی کردن کرد، کە کۆمەڵی ئامۆژگاری کردن هەرچەندە کۆمەڵی ئامۆژگاری کەر بڕوا پتەوترو خاوەن هەڵوێستتر بوون، چونکە ئەوان بەگوفتارو بەکردار بەرهەڵستییان کردو دژی سنوور بەزێنییەکەی سەرپێچیکاران وەستان، بۆیە قورئانی پیرۆز دەستنیشانی رزگاربوونی ئەو کۆمەڵەی کردو بەصەراحەت

رزگاربوونیانی راگەیاند! کۆمەڵی دووەم هەر بەدڵ دژی سنوور بەزێنییەکە وەستان، بۆیە قورئان لێیان بێ دەنگ بووە، ئەوان شیاوی مەدح نین تا مەدح بکرێن، تاوانیشیان نەکردوە تا زەم بکرێن.

﴿وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ تاقمی سێیەم کە کۆمەڵی سەرپێچیکارانن سزامان دان بەسزایەکی بەئێش، بەهۆی بەردەوامبوونیان لەسەر فیسقو سەرپێچی کردنو سنوور شکاندن.

بەکورتی ئایەتەکە صەریحە لەوە دا کە کۆمەڵی ستەمکاران، سەرپێچیکاران نەهییان لەکاری خراپ کرد سەرفیراز بوون. لەئاکامی ئەو کۆمەڵەی کە ئینکاری کاری ئامۆژگاریکەرانیان کرد بێ دەنگە، هەرچەندە ئەوانیش رزگار بوون چونکە ئینکاری خراپەکارییان کردو بۆیەش نەهییان لێ نەکرد پێیان وابوو نەهی بێ سوودە، ئەگەر بیانزانیایە بێ سوود نابێ ئەوانیش بەگوفتارو کردار دژی سنوور بەزێنییەکە دەوەستان!

﴿فَلَمَّا عَتَوْا عَنْ مَا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾ کاتێك ئەو کۆمەڵە سنوور بەزێنە ستەمکارە یاخی بوونو گوێیان بەئامۆژگارییەکە نەداو، فێزو لوتبەرزییان نواند ئامادە نەبوون واز لەکارە خراپەکانیان بهێننو بەقسەی ئامۆژگاریکەرانیان نەکرد، ئێمەش فارمان لێ گرتنو پێمان وتن: ببنە مەیموونی زەلیلو قێز لێکراوو سووکو گاڵتە پێکراو! واتە: ویستو ئیرادەمان وای خواست کە ئەو کۆمەڵە سەرپێچیکارە ببنە مەیموونی قێز لێکراوی ناشیرینو دوور خراوە لەکۆمەڵگای ئادەمیزاد واتە: شێوەی ئادەمیزادمان لەوانە گۆڕی بەشێوەی مەیموون! ئەمە سزای دونیایانە، سزای قیامەتیشیان زۆر بەئێش ترو توونترە. زوربەی زۆری زانایانی ئیسلام پێیان وایە: ئەوانە بەحەقیقەت بوون بەمەیموونو شکڵو شێوەو سروشتییان بوومتە مەیموونی بەراستی، چونکە سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو سوور بوون لەسەر یاخی بوونو سەرپێچی کردنی فەرمانی یەزدان.

ئەمجار ئایا ئەو مەیموونانەی ئێستا وەچەی ئەوانن؟ یان ئەوان کە بوون بەمەیموون دوایی بەهیلاکچوونو وەچەیان لێ نەکەوتۆتەوە؟! قورئان هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەمە ناکا.. موجاهید دەفەرموێ: ئەو بەنو ئیسرائیلیانە لەرەوشتو

سروشت دا وەکوو مەیموونیان لێ هات، نەك شکڵو شێوەیان بگۆڕدرێ بەمەیموون!

مامۆستا عەبدولکەریمی بیارە لێرە دا دەفەرموێ: بەبیری من گۆڕانی ئەخلاق زۆرەو تایبەتی بەنی ئیسرائیل نەبوەو نیە، گەلێ کەس هەیە: بەهۆی بێ دینیو بێ شەرمییەوە رەوشتیان چوەتە سەر رەوشتی ڕێویو گورگو مەیموونو بەرازو مارو دووپشك، بەڵکوو ئەمانە خراپترن! چونکی ئەم حەیوانانە زیانەکەیان کەمەو تەجاوز ناکا لەتەبیعەتی ئەو جۆرە، بەلام زیانی ئادەمیزادی ناهەموار. بەقەی زیانی چوار پێنج جۆر گیانلەبەری دڕندەیە: فێڵبازە وەکوو ڕێوی وا نهێنگرە وەك سەگی هارو، بێ ناموسە وەکوو بەراز، خائینەو وەکوو گورگ.

پەنا بەخودا! هەموو ئەم دەردانە لە سەر تەماعی ماڵی دونیاو دارایی، یا ئارەزوی شەهوەت رانی، یا پایەو شانی بەرز... وەکوو حەزرەت ﷺ فەرمویەتی: خۆشەویستنی دونیا سەری هەموو تاوانێکە. کەوابێ ئەو مەسخە وەکوو جومهوور فەرمویانە: هەر مەسخی شێوە بووە هەتا ببن بە پەند بۆتەماشاکەران!![7]

## ئایەتەکان ئاماژە بۆ ئەم خاڵانە دەکەن:

١- گێرانەوەی ئەم چیرۆکە نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدە: ﷺ ئاشکرایە خودا بەسەر ئەم روداوانە دا ئاگاداری کردوە، ئەگینا چۆن بەنە خوێندەواری ئەم روداوانەی زانی؟!

٢- هەر فرتو فێڵێك سەر بکێشێ بۆ راگرتنی ئەحکامی شەرع حەرامەو نابێ بکرێ.

٣- هەر هۆکارێك، هەر وەسیلەیەك سەربکێشێ بۆ شتی مەمنوعو نا شەرعی حەرامەو نابێ بکرێ.

٤- فەرمانکردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە ئەرکی سەر شانی هەموو کەسەو هەرکەسە لە عاست خۆیەوە دەبێ پێی هەستێ. هەروا پێویستە موسوڵمان لە پێڕی ئەهلی فەساد دووره پەرێزبیو هاوکارییان نەکا.

٥- کەدەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ نَبْلُوهُم﴾ بەڵگەیە لە سەر ئەوە هەرکەسێك

---

[7] تەفسیری نامی ج/٢/٣١٥

بەندايەتی خودا بكا، خودا كاری دونياو قيامەتی بۆ ئاسان دەكا، كەسێك لە خودا ياخی بێ پەروەردگار جۆرەها تەنگو چەڵەمەی توش دەكا.

٦- ئايەتەكە دەبێتە بەڵگە بۆ ئەهلی سونەتو جەماعەت كە دەڵێن: خودا لەسەری پێویست نیە چی باشە بۆ ئادەمیزاد ئەوە بكا، واتە: لە سەر پەروەردگار واجب نیە چی بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدایە لە بارەی دین‌دونیا ئەوەبكا!! چونكە پەروەردگار دەیزانی كە زۆر بوونی ماسییەكان لە رۆژی شەممە دا بەنوئیسرائیلییەكان هەڵدەنی بۆ سەرپێچیكردنو كافربون، دەی ئەگەر لەسەری واجب بوایە كە موراعاتی بەرژەوەندی ئادەمیزادبكا دەبوایە لەو رۆژە دا ماسییەكان زۆر نەكا تا ئەوانە نەكەونە هەڵەو تاوانەوە!

## بەرز كردنەوەی كێو بۆ سەر سەری بەنوئیسرائیلیو ژێر دەستیو پەرتەوازە بوونیان بەسەر زەویدا

﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ الصَّالِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن

لَا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾ ۞ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار برێ خراپەکاری جولەکەی باس کردو پاشان باسی سزادانی بەنو ئیسرائیلییەکان بەوە کە کردنی بەمەیمون رانواند، ئەمجار لێرە دا باسی ئەوە دەکا کە خودا بریاری خۆی دەربارەی ئەو جولەکانە داوە: کە تارۆژی قیامەت بەزالبلیو ژێردەستەیی بژین، ئەمەش لەسزای کردەوەکانیاندا، ئەمجار باسی ئەوە دەکا کە پەروەردگار بەسەر زەوی دا پەرتەوازەی کردوونو کردوونی بەکۆمەڵ کۆمەڵو پارچە پارچە، وەچەکانیان هەموو هەڵپەو هەوڵێکیان بۆ وەدەست هێنانی ماددەیەو ئەوان ماددەپەرستو دونیا پەرست دەبن، پێشینەکان لەترسی کەوتنە خوارەوەی کێو بۆ سەریان پابەندی تەورات بوون، هەر گەلو نەتەوەیەك لەفەرمانی خودا دەرچیو سەرپێچی فەرمانی ئایین بکەن ئەم جۆرە سزایانەو سزای تریش چاوەڕوانیان دەکا.. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾ ئەی موحەممەد! یادی ئەوە بکەو باسی ئەوە بکە، کاتێك پەروەردگاری تۆ بەپێشینانی یەهوودی راگەیاند لەسەر زوبانی پێغەمبەرانیان یەك بەدوای یەك دا ئەوەی بۆ رون کردنەوە: کە لەزانستی خۆی دا وای بریار داوەو عەزمی ئەوەی کردوە کە لەهەموو سەردەمو رۆژگارێك دا تارۆژی قیامەت کەسانێکیان بەسەر دا زاڵ بکا، کە بەناهەمواریو نالەباری مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەنو، سزای بەئێشیان پێ بچێژنو، ژێر دەستەییو کۆیلایەتییان بۆ بەرەوا بزانن، سەرانەیان لێ بستێنن، بێگاریان پێ بکەن، ماڵو

سامانیان لێ زەوت بکەن، یەکیەتی ریزەکانیان تێك بدەنو زەلیلو بێ لانە ژیان بەسەربەرن!

ئەمە ئیعلانێکی یەزدانییە، لەو کاتەوە راگەیەندراوە تەنفیز بووە ئەوەتا مێژوو شایەتە: کە پەروەردگار ناو بەناو لەرۆژگاری رابردوودا، کەسانێکی بۆ سەر جولەکە رەوانە کردوە: کە ئازاریان بدا، ئەم دیاردەیە بەردەوامەو ئەنجام دەدرێ، پەروەردگار ناو بەناو کەسانێك لەبەندەکانی زاڵ دەکا بەسەریان دا کە سزایان بدەن. هەرکاتێ ئاهێکیان هاتەوە بەرو لوتبەرزیو بوغرایيان بەخۆوە بینیو لەسەر زەوی طوغیانیان کردکرد لە لایەن ئەو کەسانەی زاڵ کراون بەسەریان دا زللەیەکی کوشندەیان لێ دەدریو دەخرێنە وە قاوغی خۆیان!! چونکە جولەکە دەستەو تاقمێکی بوغراو خۆبە زلزانو ناکەسبەچەو سپڵەو تاوانکارن، لە تاوانێك رزگارنابن دەکەونە ناو تاوانێکی ترەوە، لەسەر پێچیو لادانێك تەواو نابن هەوڵی یاخی بوونێکی تریانە،

جاری واهەیە واگومان دەبرێ کە نەفرینو چەوساندنەوەی گەلی جولەکە کۆتایی هاتووە، بالاً دەستیو سەرفرازییان بە دەست هێناوە، دەست رۆیشتوو خاوەن شانو شەوکەوتن بەلاَم لە راستی دا ئەو بالاً دەستییەیان شتێکی کاتییەو پایەدارنییە، جگە لە خودا کەسی تر نازانێ کێیان بەسەر دا زاڵ دەبیو دەیانچەوسێنێتەوە! بێگومان ئەمە ئیعلانێکی خودایی هەمێشەییە تارۆژی قامەت، پەروەردگار لەقورئانی خۆی دا هەواڵی بەپێغەمبەر داوەو ئەمجار بەشوێن ئەم هەواڵەدا، دوو صیفەتی خودا دەربارەی هەموو ئادەمیزاد رادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! زۆر زوو تۆڵەستێنە بۆ ئەو گەلو نەتەوانەی کە سەرپێچی فەرمانی دەکەنو فەسادو ئاژاوە لەسەر زەوی بەرپا دەکەن، ئەو سزادانەی بۆ گەلو نەتەوە یاخی بووەکان دواناکەوێ، وەکوو هەندێ جار سزای پەروەردگار بەو سزا حازر بەدەستەی ئەوانە دەگرێ: کە بڕیاری سزادانیان دەدا، وەکوو چۆن تاقمێکی لەدانیشتوانی شاری قەراغ دەریاکە بەسزا گەیاندن، سزایەکی عادلانە. ﴿وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان زاتی پەروەردگار لێخۆشبووە بۆ ئەوانەی لەخراپەکاری دەگەڕێنەوەو تۆبە دەکەنو واز لەتاوان

دەهێـنن، بـەرەحمو بەزەییـە بـۆ ئەوانـەی پابەنـدی فـەرمانی خـودانوتۆبـەكارو راستاڵن. بێگومان مانای ئەم ئایەتە هاتۆتە دی، حەزرەتی مووسا یەكەم كەس بـووە كـە خـەراجی لەسـەر دانـاو لێـی سـتاندن، پاشـان یۆنانییـەكانو كەلدانییـەكانو بابلییـەكانو ئـەمجار رۆمەمەسـیحییەكان سـەرانەو خـەراجیان لێ سـتاندون پاشـان موسـوڵمانەكان سـەرانەو خـەراجیان لێ سـتاندون، لـەم سـەدەی بیـستەمەش دا ئەڵمانییەكان بەسەرۆكایەتی هیتلەر زۆری لێ كوشتنو برێكی زۆریشی پەرتـەوازەی هەندەران كردن!!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفـەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوّاً كَبِيراً.........الآيـات﴾الأسـراء/٤–٨.

پێویستە بڕوای پتـەومان بـەوە هـەبێ، كـە هـەبوونی دەوڵەتۆكـەی جوولەكـە لەسەر خاكی فەلەستین لەم رۆژگارە دا دیاردەیـەكی كاتییـەو هـەردەبێ لەناوبـچێو مانەوەی مەحاڵەو نابێ پایەدار بێ!!

ئەوەی باس كرا لەبارەی ژێر دەستەییو سـەرانە لێ سـتاندنو چەوسانەوەیان جۆرێك بووە لەسزادانیان لەپاساوی سەرپێچی كردنو یاخی بوونیان لەخودا.

جۆرێكی تر لەسزادانیان ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الأَرْضِ أُمَماً﴾ بـەنو ئیـسرائیلییەكانمان پەرتـەوازە كـردن بـەناو زەوی دا، كردمـانن بـەگرۆ گـرۆو هۆزو خێڵی جیا جیا، هەر كۆمەڵێك لەوانەمان خستە ناو وڵاتێكەوە، هەرێمێك نیە جوولەكەی تێدا نەبێ، بـەڵام دەسـەڵاتو شـەوكەتیان نیـە، ئەمـەش موعجیزەیـەكی قورئانە

﴿مِنْهُمْ الصَّالِحُونَ﴾ ئەو بەنو ئیسرائیلییانە كۆمەڵی وایان تێدان صاڵحو خودا پەرسـتو چـاكەكارە، بڕوایـان بـەو پێغەمبەرانـەی دوا مووسـا هێنـاوە، ئیمانیـان بەموحەممەدﷺ هێناوە، بەختەوەری قیامەت بەسەر دونیا دا هەڵدەبـژێرن، وەكـوو ئەو دەسـتەو تاقمـەی كـە نـەهێیان لـەراوكردنی ماسی لەشـەممە دا كـرد، هـەروەها وەكوو عەبدوڵڵای كوڕی سەلامو ئەو هاوەڵانەی كە موسـوڵمان بـوون! ﴿وَمِنْهُمْ دُونَ ذَلِكَ﴾ هی وایان هەیە لەبارەی صەلاحو ئایین پەروەرییـەوە لـەخوار پلـەی كۆمـەڵی

پێشونو بەئەندازەی ئەوان پابەندی فەرمانی خودا نین..... هی وایان هەیە بێدینو سەر رەقو توندڕەوو فاسقو بێ وادەو بەڵێنن! وەکوو ئەوانەی بەناحەق پێغەمبەرانیان شەهید کردن، هی وایان هەن درۆو دەلەسە دەبیسنو بڵاوی دەکەنەوە، سوودخۆرو بەرتیل خۆرن! هەوڵو تەقەلایان داوە ئەحکامی خودا بگۆڕن، حوکم بەغەیری یاسای خودا بکرێ!!

﴿وَبَلَوْنَاهُمْ بِالْحَسَنَاتِ﴾ ئەو گرۆهو تاقمو کۆمەڵانەی نەتەوەی ئیسرائیلمان بەتاقیکردنەوە: نیعمەتو خۆشیمان پێبەخشین، تا دەربکەوێ ئاخۆ ئامادەباشی گەڕانەوەو خودا پەرستییان تێدایەو شوکرانە زمێری دەکەن؟ ﴿وَالسَّيِّئَاتِ﴾ ئەمجار بەڵاو موصیبەتمان بەسەر دا باراندن ئاخۆ بەصەبرو خۆڕاگرن؟ ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ ئەم تاقیکردنەوانەمان بەسەر دا هێنان بۆ ئەوەی لەتاوانکاری بگەڕێنەوە، واز لەخراپەکاری بێنن، شوکرانە زمێری نیعمەتەکانمان بکەنو صەبر لەسەر ناخۆشی بگرنو لێخۆشبونو رەحمو بەزەیی خودا بۆخۆیان دەستەبەر بکەن!

﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الأَدْنَى﴾ پاشان لەو کۆمەڵە صالحو باشانەی نەتەوەی ئیسرائیلو ئەوانەی لەصالحو باشی دا لەخوار ئەوانەوەن،نەوەو وەچەیەکیان لەپاش بەجێما، لەپێشینەکانیان تەوراتیان بەمیرات کەوتە لا، خوێندیانو دیراسەتیان کرد، بەڵام لەگەڵ یاساکانی دا نەگونجان کاریان پێ نەکردو کاریگەر نەبوو لەسلووکیاندا، بەسەر سەرەکی دەقەکانی تەوراتیان توتی ئاسا دەخوێندەوە، حوکم یاساکانیان دەزانین ئەمانە ئەو جولەکانە بوون کە لەسەر دەمی پێغەمبەری ئیسلام دا بوون!!-وێڕای زانیارییان بەتەورات، حوکمەکانیان پاشگوێ خستبوون، ژیانی دونیاو پڕوپیتاڵی ئەو ژیانەیان بەسەر ژیانی قیامەت دا هەڵبژاردبوو، زۆر بەلێبڕاویی هەڵپەی وەدەستهێنانی کاڵای دونیاییان دەکرد، گوێیان بەحەرامو حەڵاڵ نەدەدا، کۆیان لەسوود وەرگرتنو بەرتیل خواردن نەکردەوە، هەردەم خەریکی بازرگانی کردن بەئایینو گۆڕانکاری کردن لەدەقەکانی تەورات دا بوون، هەر قازانجو سوودێکی دونیاییان بەدی بکردایە پەلاماریان دەداو هەڵپەیان بۆ دەکردو دەیانقۆزتەوە، ئەمجار تەئویلیان دەکردو ﴿وَيَقُولُونَ﴾: دەیانگوت: ﴿سَيُغْفَرُ لَنَا﴾ رزگارمان دەبیو سزا نادرێین،

دەیانگوت: ئێمە کوڕی خوداینو خۆشەویستی ئەوین، نەتەوەی هەڵبژاردوی یەزدانین، ئەوەی پێغەمبەرانی پەروەردگارین لەسەر کردەوەی خراپ عەزاب نادرێین، ئەمە لەحاڵێك دا کە دان بەتاوانی خۆیان دا دەنێنو بەهومێدی لێخۆشبوونن. ﴿وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِنْ يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِثْلُهُ يَأْخُذُوهُ﴾ ئەگەر ئەندازەیەکی تر لەکاڵای حەرامی دونیاو بەرتیلیان لەلایەن گەورەکانیانەوە بۆ بێ وەری دەگرنو هیچ گوێ بەوە نادەن کە بەردەوام بوون لەسەر تاوانکاری دەبێتە مایەی شەرمەزاریی!

ئەوانە بەهیوان، خودا لێیان خۆش بێ، کەچی بەردەوامن لەسەر تاوانکردنو سوورن لەسەر یاخی بوونو سەرپێچی کردن. کۆ لەوە ناکەن کە حەرام بخەنە پاڵ حەرام! لەحاڵێك دا ئەوان دەزانن وادەو بەڵێنی خودا بەلێخۆشبوون تایبەتە بەو کەسانەی کە تۆبە دەکەنو واز لەخراپەکارییەکەیان دەهێنن!

ئەمجار پەروەردگار پرسیارێکی ئینکار ئامێز دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثَاقُ الْكِتَابِ أَنْ لا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلاَّ الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ﴾ چۆن وادەکەن؟ بەچ عەقڵێك هەڵوێستی ناوا دەنوێنن؟ ئایا وادەو بەڵێنیان لەتەورات دا لێ وەرنەگیراوە: کە نابێ جگە لەحەقو راستی بەولاوە هیچی تر لەسەر خودا بڵێن: ئایا بەڵێنیان لێ وەرنەگیراوە کە نابێ دەقەکانی تەئویل بکەن، دەبێ حیلە شەرعو فرتو فێڵ بەکار نەهێنن بۆ قوتار بوون لەئەرکەکانی ئایین.

نابێ ئومێدی ئەوەیان بەخودابێ کە لەو تاوانەیان خۆش بێ کە تۆبەیان لەسەر نەکردوە، لایان ئاشکرایە کە هەر کەسێك تاوانێکی گەورە بکا بەبێ تۆبە لێ کردن خودا لێی خۆش نابێ. هەروەها ئەو پەیمانەیان لێ وەرگیراوە کە دەبێ حەقو راستی بۆ خەڵك روون بکەنەوەو نەیشارنەوە. نابێ لە پێناو بەرتیل وەرگرتن دا دەقەکانی تەورات بگۆڕن، نابێ گۆڕانکاری لە شەریعەتی خودا بکەن! وەلحال ئەوانە دیراسەی تەوراتیان کردوەو تێی گەیشتوونو دەزانن چی تێدایە: دەزانن خواردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا حەرامە، درۆ هەڵبەستن بەدەم خوداوە تاوانە....

ئەمجار پەروەردگار چولەکەکانی هەڵنان بۆ وەدەست هێنانی پاداشو نزساندنی لە سزای کوشندەو فەرمووی: ﴿وَالدَّارُ الآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلا

تَعْقِلُونَ﴾ واتە: ئایا نازانن: کە خانووی قیامەتو ئەو خۆشیو لەزەتەی لە بەهەشت دا هەیە، زۆر باشترە لە پڕوپیتاڵی دونیا بۆ ئەو کەسانەی خۆیان لەتاوان دەپارێزن بەگوێی هەواو هەوەسی خۆیان ناکەنو، ڕوودەکەنە خوداپەرستیو، ناچن لەرێگەی بەرتیلو ریباو سوودەوە ماڵی حەرام کۆ بکەنەوە، ﴿أَفَلا تَعْقِلُونَ﴾ ئایا عەقڵیان بەوە ناشکێ؟ نازانن کە ژیانی بەختەوەری قیامەت زۆر باشترە لەوەدەستهێنانی کاڵای بێ بایەخی دونیا؟ خۆ ئەگەر ئەوە شتێکی ئاشکراو نمایانەو هەرکەسێ عەقڵو هۆشێکی هەبێ ئەو ڕاستییە دەزانێ!! ئەدی ئێوە بۆچی نایزانن؟؟

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە تەماعو هەڵپەکردن بۆ وەدەستهێنانی کاڵای دونیایی هۆکارێکی سەرەکی بووە بۆ فەساد کردنی نەتەوەی ئیسرائیل، خۆشەویستی دونیا دڵو دەروونی داگیر کردونو عەقڵو هۆشی لەکار خستوون. پێویستە موسوڵمانان پەند وەربگرنو ئەو رێبازە ناڕاستەی جوولەکە رەچاو نەکەنو، ژیانی دونیای بێ بەقاو بێ بایەخ هەڵنەبژێرن بەسەر قیامەتدا! بەتەمای شەفاعەتو لێخۆشبوون پەرە بەتاوانەکانیان نەدەنو نەچن بەو هیواو ئاواتە پاڵی لێ بدەنەوە.

ئەمجار پەروەردگار پەسنی ئەوانەی ڕاگەیاند کە پابەندی کتێبی ئاسمانین: کە تەوراتەو، ڕێڕەوانی هەڵدەنی بۆ شوێنکەوتنی پێغەمبەری ئاخر زەمان کە موحەممەدەﷺو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ إِنَّا لا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ﴾ ئەوانەی پابەندی فەرمانو نەهییەکانی کتێبی یەزدانینو دەستیان بەدەستبەندی ئەو کتێبەوە گرتووەو، رەفتاری پێ دەکەن بڕوا بەپێغەمبەری ئاخر زەمان دەکەنو، نوێژەکانیان بەرێکو پێکی ئەنجام دەدەن، ئەوانە لەپێری ڕاستاڵو خێرخواهو پیاو چاکانن، ئێمە پاداشی چاکەکاران زایە ناکەینو بەزیادەوە پاداشیان دەدەینەوە.

هەرچەندە ئەوەی لەناو کتێبی خودا دایە، نوێژیش دەگرێتەوە، بەڵام کە بەتایبەتی باسی نوێژی کرد بۆ ئەوەیە بزاندرێ: کە پلەی نوێژ پلەیەکی بەرزو تایبەتییەو دوا ئیمانهێنان گەورەترین عیبادەتە. بەڵکوو کۆڵەکەی ئایینەو فەرقی نێوان کوفرو ئیمان بریتییە لەنوێژ!!!

ئـەمجار پـەروەردگار کۆتـایی چـیرۆکەکە بـەوە دەهێنـێ، کـە وەبیریـان دەهێنێتەوە: کە لەکاتی نازڵ بوونی تەورات بۆ سەریان حاڵو وەزعیان چۆن بـووەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ﴾ ئـەی موحەممـەد! باسی ئەوەش بۆ جولەکەکان بکەو، بیریان بخەرەوە کە بەراستی ئەوان گەلێکی سەر رەقو دڵ سەختو سپڵەو سەرپێچیکار بـوون! لـەکاتی خۆیـان بـۆ ئـەوە بـەتوانایی‌و بەدەسەڵاتی خۆمیان نیشان بدەم! کێوی طوورم لەبێخ هەڵکەندو بەرزم کردەوە بـۆ سەریانو وەکوو چەتر لەسەر سەریان رامـان گـرتو، گومانیـان بـردو ترسـان لـەوەی بەسەریان دا بکەوی‌و بیانفەوتێنێ!

ئەمە لەکاتێك پەیمانمان لێ وەرگرتن: کە بەچوسـتو چالاکی شـەریعەتی نـاو تەورات وەرگرنو، بەدڵسۆزی‌و گورجو گۆڵی جـێ بـەجێی کـەن، کەچـی پێـچەوانەی وادەو بەڵێنی خۆیان رەفتاریان کـرد، ئامـادە نـەبوون حوکمـەکانی تـەورات تـەنفیـذ بکـەن، وتیـان: ئەرکـەکان قورسـنو نـاتوانین ئـەنجامیان بـدەین.. ئێمـەیش کێـوی طوورمان لـەبن هەڵکەنـدو وەکوو هـەور لەعاسـتی سـەریانەوە رامـان گـرتو پێیـان وابوو بەسەریان دا دەکەوێ، لەسەر زوبانی مووسا پێمان گوتن: ﴿خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ﴾ ئـەو کیتابـەی بـۆم نـاردوون بەهـەموو هێـزی دڵتـانو بەتـەواوی چوسـتو چالاکیتانەوە وەری بگرنو رەفتاری پێبکەن، چی لەو کتێبە دا هەیـە: لـەبیروباوەڕو کـردارو گوفتـارو بەندایـەتی‌و خـۆو رەوشـت وەری بگـرنو بـەدەرس بیخـوێننو، بەخەڵکی رابگەیەننو، فـێری مـاڵو منـداڵتانی بکـەنو، لـەژێر رۆشـنایی ئـەو کتێبـە پیرۆزە دا منداڵو نەوەکانتان پەروەردە بکەن. ﴿وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بـیر لـەو شـتانە بکەنـەوە کـە لـەو کتێبـە دا هـەن لەفـەرمانو نـەهی‌و لـەبیر خۆتـانی مەبەنەوە، هەمیشە خۆفـو رەجاتان هەبێ، بەتەمای پاداشی گەرەو زۆرو زەبەندەی بن، بترسێن لەسزای بەئێشو سامناکی، بەڵکوو گیانو دڵتان رووناك ببێتەوە، ترسی خودا لـەدڵتان جێـی خـۆی بکاتـەوە، لـەکردارو گوفتارتـان دا لەچوار چێوەی ئـایین دەرنەچن، سەرفرازی هەردوو جیهانتان دەست بکەوێ!!

## بەڵێنی گشتی کە لەئادەمیزاد وەرگیراوە

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾﴾

ئەم ئایەتانە: دەستکردنە بەسییاقێکی تازە دەربارەی کاروباری ئادەمیزاد بەگشتی کە پەیوەندی هەیە بەهیدایەتدانی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد، لەم رووەوە کە لەسروشتییان دا ئامادەباشی بۆ ئیمان هێنانو خودا ناسین رسکاندوە، بۆیە پەروەردگار دوا بەدوای بەیانکردنی هیدایەتدانی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد، لەم روەوە کە لەسروشتیان دا ئامادە باشی بۆ ئیمان هێنانو خوداناسی رسکاندوە، بۆیە پەروەردگار دوا بەدوای بەیانکردنی هیدایەتدانی خۆی بۆ بەندەکانی بەهۆی ناردنی پێغەمبەرانو ناردنی نامە ئاسمانییەکان بۆ سەر نەتەوەی ئیسرائیل، ئەمجار باسی وەرگرتنی بەڵێنی گشتی دەکا کە پەروەردگار لەهەموو ئادەمیزادانی وەرگرتووە، لەکاتێك دا ئەوان لەپشتی باوەئادەمیان دا بوون، ئەوان هێشتا لەعالەمی زورییەت دا بوون بەسروشتو رەچەڵەك دانیان بەخودایەتی پەروەردگار دا ناوەو بەندایەتی خۆیان بۆ زاتی پاکی راگەیاندوە! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ؟﴾ ئەی موحەممەد! ئەوە بۆ ئادەمیزادان باس بکە کە پەروەردگار لەعالەمی زورییەت دا بەڵێنێکی گشتی لەئادەمیزادان وەرگرتووە خۆیانی کردوە بەشایەت بەسەر

خۆیانداو پێی فەرموون ئایا مـن خـودای ئێـوه نـیم؟ زوربیـەتو رەچـەڵەکی ئادەمیزادان بەگشتیو تێکرا ﴿قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا﴾ وتیان: بەڵێ، شایەتی دەدەین تۆ خودای ئێمەی، تۆ شیاوی خودایەتیو شایانی ئەوەی ئێمە بەندایەتیت بۆ بکەین، ئەم ئیعترافو دان پێدانانەیان بەزوبانی حاڵ بوو، بەزوبانی ئاخاوتن نەبوو واتە: ئەم ئیعترافە لەعالەمی تەمثیل دا بووه نەك لەعالەمی حەقیقەتو بینراودا، بۆیەش ئەم ئیعترافەمان لێ وەرگرتنو ئەم شایەتیەم پێدان ﴿أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ بۆ ئەوەی -ئەگەر شەریکتان بۆ خودا دانا- رۆژی قیامەت بەهانەتان نەمێنێو نەڵێن: ئێمە لەشێوەی یەکتاپەرستی بێ ئاگا بووینو نەمانزانیوه پێویستی یەکتاپەرستی چۆنەو چۆن ئەنجامی بدەین؟! کەس نەبوه لەشێوەی یەکتاپەرستی ئاگادارمان بکاتەوه. واتە: دوای هێنانی بەڵگە لەسەر تاكو تەنهایی خوداو هەبوونی عەقڵو هۆش لەلاتانو دارشتنی سروشتتان لەسەر خودا ناسیو دانانتان بەتاكو تەنهایی خوداو شایەتیدانتان بەوەی ئەو زاتە خودای ئێوەیە، ئیتر ئەگەر ئێوه شەریك بۆ خودا دابنێن ئەوه رۆژی قیامەت هیچ عوزرو بەهانەیەکتان بەدەستەوه نابێ! ﴿أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِنْ بَعْدِهِمْ﴾ یان لەو رۆژه دا بڵێن: باوكو باپیرمان موشریك بوونو ئەوان هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو ئێمە نەمانزانیوه کە رێبازەکەیان هەڵەیە بەناچاریو کوێرانە شوێن رێبازی باوكو باپیری خۆمان کەوتوینو شارەزای رێبازی یەکتاپەرستی نەبووین.

﴿أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ؟﴾ ئایا بەتاوانبارمان دەزانیو بەهیلاکمان دەبەیو سزامان دەدەی بەهۆی داهێنانی هاوەڵدانان بۆ خودا لەلایەن باوكو باپیرانی گومڕامانەوەو ئیمەش وەکوو ئەوان سزا دەدەی لەکاتێك دا ئێمە حوسنی ظەنمان بەئەوان هەبوە؟!

بەکورتی پەروەردگار عوزریان لێ قبوول ناکاو، بەهانەی شوێنکەوتنیان بۆ باوكو باپیرانیان لێ وەرناگرێ، چونکە تەقلیدو لاسایی کردنەوه کارێکی ناپەسندەو نابێ پەنایان بۆ ببرێ، بەتایبەتی کە بەڵگە هەبنو توانای تێفکرینو بەڵگە هێنانەوه هەبێ، لەلایەکی ترەوه عوزر هێنانەوه بەنەزانینو بێ ئاگایی -پاش ئەوەی بەڵگەی سروشتیو عەقڵی جۆراو جۆریان لەسەر راست کرایەوه- وەرناگیریو

رەت دەكرێتەوە!

﴿وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بەم شێوە شیكردنەوە رەوانە، بەڵگەو نیشانەی خۆمان بۆ كۆمەڵی ئادەمیزاد شی دەكەینەوە، بۆ ئەوەی عەقڵو هۆشی خۆیان بەكار بێنن، واز لەلاسایی كردنەوەی كوێرانە بێنن، خۆیان لەكۆتو زنجیری نەزانی رزگار بكەن.

ئەم ئایاتانە لەوەتەرێكی حەساس دەدەنو باسێكی گرنگ نمایش دەكەن، قورئانی پیرۆز قەزییەكی سروشتیو عەقیدەیی لەشێوەی دیمەنێكی بێ وێنە دا رادەنوێنێ! دیمەنی گەرای ئادەمیزاد كە لەعالەمی نهێنی دا شار دراوەتەوەو لەپشتی ئادەمیزاد دا خۆی حەشار داوەو نەهاتۆتە گۆڕەپانی جیهانی بیندراوەوە. دیمەنێك، زرۆیتی ئادەمیزاد تێی دا وەڵامی پرسیاری پەروەردگار دەداتەوە وەڵامی ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ؟﴾ بەوشەی ﴿بلى﴾ دەداتەوە، ئیعتراف بەخودایەتی خودا دەكا، دان بەبەندایەتی خۆی دا دەنێ بۆ زاتی پاكی پەروەردگاری بێ هاوەڵو خاوەن دەسەڵات. بەراستی دیمەنێكی كەونی گرنگو قەشەنگە، زمان پەی پێ نابا و تێی دا كۆڵەوارەو ناتوانێ تەعبیری لێ بداتەوەدیمەنێكە عەقڵ لەدەرك پێ كردنی دا سەرگەردانو كۆڵەوارە، نازانێ چۆن تەصەووری ئەو خانە ئادەمیزادییانە بكا كە لەژمارە نایەنو كۆكرانەوەو وەكوو عەقڵمەند خیطابیان ئاراستە دەكرێ! چونكە تایبەتمەندییەكی شێردراوەیان تێدا رسكێندراوە لەلایەن بەدیهێنەری بەتواناو كارسازەوە- بۆیە وەڵامی عاقڵانەو ئیعترافی ژیرانە دەدەنەوەو عەهدو پەیمان دەدەنو دان بەخودایەتی پەروەردگار دا دەنێن.

بێگومان كییانی ئادەمیزادی وەلەرزە دەكەوێو لەناخەوە دەهەژێ كە بەخەیاڵ لەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرە دەڕوانیو ئەو زرۆیتە بەشەرییە دێنێتە بەر عەدەسەی كامێرای تەصەوورو خەیاڵی!! سوبحانەڵلا هەموو خانەیەك زیندوە، هەموو خانەیەك ئامادە باشی بۆ ئیعتراف كردن بەخودایەتی پەروەردگار تێدا حەشار دراوە، لەهەموو خانەیەك دا نمونەی ئادەمیزادێكی خاوەن هەستو هۆش كە چاوەڕوانی ئەوەیە: رێگای پێبدرێ بێتە عالەمی بوونەوەرەوەو نەشونما بكاو ئەركی خۆی ئەنجام بداو، لەعالەمی میثالەوە بگوێزرێتەوە بۆ عالەمی بوونەوەری

بیندراو بەدی دەكرێ! دیمەنێكە سروشتو رەچەڵەكی ئادەمیزاد لەعالەمی میثالو نهێنی دا وادەو بەڵێن بەسەر خۆی دا دەداو پابەندی فەرمانی یەزدانی دەبیو بەدیهێنەری بوونەوەر بەخودای خۆی دەناسێ...

سوبحانەڵلا قورئانی پیرۆز ئەم دیمەنە سەیرو سەرسوورهێنەرە رادەنوێنێو، ئەو حەقیقەتە گرنگە قووڵە لەقوڵایی سروشتی ئادەمیزادداو لەقوڵایی وجوود دا كێش دەكا بۆ سەر شاشەی تەلەفیزیۆنی بونەوەرو رایدەنوێنێ! قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدەو ئەوەندە ساڵە ئەم دیمەنە بەو شێوە سەرسوورهێنەرە نمایش دەكا!! كە ئەو كاتە ئادەمیزادێك نەبووە دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئادەمیزاد بەشێوەیەكی زانستی شتێكی وابزانێ لەسنووری وەهمو خەیاڵ دەربچێ.

پاشان ئادەمیزاد لەزانست دا پێشكەوتنی بەدەست هێناو زانست گەیشتە پلەیەك ئەوە بچەسپێنێ كە (ناسلات) لە خانەكانی زرۆێت دا خۆیان دەنوێننو پارێزگاری نژادی ئادەمیزاد دەكەن لەو كاتە دا كە هێشتا خانە خانەن لەپشت دان تایبەتمەندی تاكەكانی ئادەمیزادیان تێدا حەشار دراوە، ئەم (ناسلات)انە كە پارێزگاری نژادی چوار هەزار ملیون ئادەمیزاد دەكەنو هەموو تایبەتمەندییەكی تاكەكانی ئادەمیزادیان تێدایە، قەبارەیان لەسانتیمەترێكی دووجا تێپەرناكەن..

ئیبنو جەریرو هی تریش لەئیبنو عەباسەوە ریوایەت دەكەن كە فەرموویەتی: (مسح ربك ظهر آدم، فخرجت كل نسمة هو خالقها الى يوم القيامه....... فأخذ مواثيقهم، وأشهدهم على أنفسهم (ألست بربكم؟ قالوا: بلى) واتە: پەروەردگار دەستی قودرەتی بەپشتی ئادەم دا هێنا، گەرای هەموو مرۆڤێك كە تارۆژی قیامەت خودا دروستیان دەكا لەپشتی ئادەم هاتنە دەرێ.. وادەو پەیمانی لێ وەرگرتنو خۆیانی كرد بەشایەت لەسەر خۆیانو پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوەنیم؟ وتیان: بەڵێ: تۆ خودای ئێمەی. دەی ئەم نمایشە چۆن ئەنجام دراوە؟ چۆن پەروەردگار وادەو بەڵێنی لەئادەمیزادان وەرگرت كە هێشتا ئەوان زرۆێت بوونو لەپشتی باوە ئادەم دا بوون؟ چۆن خودا خودا خیطابی ئاراستەكردنو چۆن وەلامیان دایەوە؟؟؟ لە وەلام دا دەتوانین بڵێین: كرداری خودا وەكوو خودی زاتەكەی نهێنینو ئێمە پەیان پێنابەین، زانستو زانیاری ئادەمیزاد

نـاتوانێ چـۆنیەتی کردەوەکـانی خـودا بزانــێ هـەروەکوو چـۆن نـاتوانێ دەرکـی چۆنیەتی زاتەکـەی بکـا. چـونکە وەکـوو لـە زاراوەی زانـستی (مـەنطیـق )داهـاتوە تەصەووری چۆنیەتی شتێك لە تەصەووری ماهییەتەکەیەوە پەیدا دەبێ. کەوابوو هەرکردەوەیەك لەم جۆرە شتانە کە پاڵ خودا دەدرێ وەکو﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَـى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ﴾ یان ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ یان ﴿يَمْحُو اللّهُ مَا يَـشَاءُ وَيُثْبِـتُ﴾...یان ﴿وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ یان ﴿وَجَاء رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفّاً صَـفّاً﴾ زۆری تـری لـەم جۆرە دەقانە کە کردارێك وەپاڵ خودادەدەن پێویـستە تەسلیم بیـتو بـڕوات پێـی هەبێ، بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەی بزانـی چۆنیەتەکەی چۆنە!چونکە وەکوو گوترا: تەصەووری چۆنیەتی کردەوەکە فەرعەبۆ تەصەوری ماهییەتەکە. دەی پەروەردگار نەلەکەس دەچێ نەکەس لەودەچێ، کەوابوو هـیچ ڕێبازێـك نیـە بتـوانێ بەهۆیـەوە دەرکی زاتی پاکی بکرێ یان دەرکی چۆنیەتی کردارەکانی بکرێ.

هەر هەوڵو تەقەلایـەکیش بـدرێ بـۆ ئـەوەی تەصـەووری کردارەکـانی بکـرێ بـەو شـێوەی کـە تەصـەووری کـرداری بەنـدەکانی دەکـرێ، هەوڵـدانێکی گومڕاییـەو نـەگونجاوەو ڕەت دەکرێتــەوە، چـونکە ماهییــەتی خــودا جـوداوازە لــە ماهییــەتی بەندەکانی، بیلاتەشبیه ئەمە کورد وتەنی (قیاسی کەشکێیە لە مەشکێ!!).

زانایان لە مانای ئەم ئایەتەدا﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ...﴾ بونەدوو تاقمو دووڕا

**یەکەم ڕای زانایانی سەلەف. دووەم ڕای زانایانی خەلەف:**

١- زانا سـەلەفیەکان لەڕافەکـەران، دەڵـێن: پـەروەردگار بـاوە ئـادەمی دروسـت کرد، زروێت وەچەو نەوەکانی وەکوو گەردیلە لەپـشتی ئـادەم هێنایـە دەریو ژیـانی پێدانو عەقڵو هۆشو هەستی تێدا دروست کردنو ئەو پرسـیارەی ئاراسـتە کـردنو ئەو وەڵامەشی خستە دڵیانەوەو عەهدو پەیمانی لێ وەرگرتن: بەوەی کە هـەر خـۆی پەروەردگاریانە، ئەوانیش ئیعترافیان کردو دانیان بەم ڕاستیە دا نا!

ئــەم مانایــە بەچــەند شــێوەیەكو لەچــەند زنجــیرەو ڕێبازێکــەوە لەپێغەمبـەرەوەﷺ ڕیوایـەت کـراوە، بـڕێ لـەو ڕێبازانـە لاوازیو پـچڕانیان تێدایـە، کۆمەڵێکیش لەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئەم مانایەیان پەسەند کردوە،

٢- ڕاڤەکـەرانی (خەلـەف) دەڵـێن: ئەمـە وەکـوو تـەمثیـلو تەصـویر وایـە،

نەپرسیار کراوەو نەوەڵام هەبوە، بەڵکوو پەروەردگار بەڵگەی زۆرو زەبەندەی لەبوونەوەر دا داناون هەموویان گەواهی تاکو تەنهایی و پەروەردگارییەتی یەزدانو خودایەتی ئەو بۆ بوونەوەر دەچەسپێنن!

عەقڵو هۆشی داوە بەئادەمیزاد، بەهۆی ئەو عەقڵو ئاوەزەوە شایەتیان داوەوە دەدەن: کە زاتی پاکی، پەروەردگارو بەدیهێنەرو خودای تاکو تەنیایە!!

وەکو ئەوە بڵێن: بەخەڵکەکەی فەرمووە: دان بەوە دا بنێن: کە من خودای ئێوەمو جگە لەمن هیچ خودای تر نین، خۆشیانی کردوە بەشایەت لەسەر خۆیانو پێی فەرموون: ئایا من خودای ئێوە نیم؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ تۆ خودای ئێمەی و ئێمەت لەنەبوو هێناوەتە گۆڕەپانی ژیانەوە، ئێمە ئەم پەیمانەمان قبووڵ کرد!

مامۆستا مەلا عەبدولکەریم دەفەرموێ: ئەو پەیمانە درێژەکەی و مەعنا راستەکەی ئەمەیە: خودای تەعالا پاش دەرکردنی ئەو نەتەوانەو موشەرەف کردنیان بەعەقڵ، پێی فەرموون: من پەروەردگاری ئێوەمو لەسەر باری واقیع پەروەردگار دەبێ پەروەردەکراوەکانی خۆی تەمی و تەربیە بکاو ئامادەی بکا بۆ پیرۆزبای و بەختیاری، یانی توانای چاکەو خراپەی ببیو هێزی عەقڵو کردەوەو عەزمی پێبداو هۆشو گۆشو تێگەیشتنو تەوانای تێکۆشینی ببێ، وەبێجگە لەمانە رەهبەرێکی پیرۆزو دڵسۆزو سەر گەرمو دڵ نەرم رەوانە بکا بۆ سەری و بەقەی حاڵ یارمەتی بداو ئادگاداری بکا لە حاڵی خۆی و لە گەورەیی خوداو یاسای ژینو دینی پێ بدا.

جا من ئەوەی شیاوی پەروەردگاریی پێ، ئەیکەمو ئەبێ ئەومیش شیاوی بەندەیی و پەروەردە کراوبێ ئێوە بەجێی بێننو فەرمانی رەهبەرەکە بەجێ بێننو، ئەگەر یەکێ مەنعتان بکا لەچاکە دەری بکەنو، ئەگەر لەچینی پێشینانتان دا یاسای ناحەق دامەزرابو، پاش راگەیاندنی فەرمانی رەهبەر موبالات نەکەن بەو یاسا ناپەسندانە، ئەوانیش وتیان: باشە، تۆ خودای ئێمەیی و، ئەم فەرموودەمان وەرگرتو، عەهدو پەیمانی قەبوڵی خودایی تۆو ئیتاعەکردنی رەهبەرمان گرتە گەردنو، بەو تاری رەوانی زمانی پاکو جوان ئەم پەیمانە رابووردن[٨].

---

[٨] تەفسیری نامی ج٣٢١/٣

**تێبینی:- ئایەتەکان ئاماژەیان بۆ ئەم خاڵانە تێدایە:**

١- پەروەردگار ئادەمیزادی وا دروست کردوە: کە بە سروشت یەکتاپەرستن، هەموو کەسێك کە لەدایك دەبێ بە فیطرەت خودا ناسەو یەکتاپەرستە، دوایی باوكو دایكو کۆمەڵگا بیروباوەڕی دەگۆڕن. وەکوو لەصەحیحەین دا لەئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (كل مولد على الفطرة، فأبواه يهودانه وينصرانه ويمجسانه كما تولد بهيمة جمعاء).

٢- نەناسینی خودا بەبیانووی نەزانینەوە وەرناگیرێ، کەسێك بانگەوازی پێغەمبەری پێ نەگەیشتبێ، رۆژی قیامەت دەربارەی شەریك دانان بۆ خوداو ئەنجامدانی کردەوەی ناشیرین کە تەبیعەتی سەلیم ڤێزی لێ بکاتەوەو عەقڵی ساغ زیانەکەی هەست پێ دەکات بەعوزری لێی وەرناگیرێ. چونکە پێویستە ئادەمیزاد بە فیطرەت یەکتا پەرست بیو دژی کاری ناشیرین بێ.

٣- کەسێك بەمنداڵی بمرێ، بەهەشتییە چونکە لەپەیمانی یەکەمی دا، ئیعترافی بەتاكو تەنیایی خودا کردوە، لەعالەمی زڕوێت دا ئیمانی هێناوە. کەسێکیش رەسیدە بیو بەعاقڵی گەورە ببێ، دەبێ ئیمان بێنیو موسوڵمان بێ، ئەگەر لەعالەمی ظهور دا ئیمان نەهێنێ، ئیمان هێنانو ئیعتراف کردنی سروشتیو خودا ناسینی فیطرەتی لەعالەمی میثال دا دادی نادا. بەم پێیە منداڵی موشریکەکان کە بەمنداڵی بمرن بەهەشتین.

٤- پوچەڵ بوونەوەی بەڵگەی موشریکەکان لەرۆژی قیامەت دا کە دەڵێن: پێغەمبەرمان نەهاتۆتە سەرو، کەس نەبوە فێری یەکتاپەرستیمان بکا، واتە: لاسایی کردنەوەی باوكو باپیرانیان لێ وەرناگیرێ، وەکوو چۆن عوزری نەزانی بۆ بەڵگەی یەکتاپەرستی مەقبووڵ نیە، عوزری لاسایی کردنەوەی باوكو باپیرانیش مەقبووڵ نیە. چونکە بەڵگەی سروشتیو عەقڵی هەن لەسەر ناسینی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاکی.

## چیرۆكی بەلعامی كوڕی باعوراوو هاووێنەی گومڕاكان

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار باسی عەهدو پەیمانی وەرگرتنی كرد لەئادەمیزادان بەگشتی‌و، هەموو دانیان بەوە دانا كە (الله) پەروەردگاریانە، ئەمجار نمونەی ئەوانە دێنێتەوە كە ئایەتی خودا بەدرۆ دەخەنەوە، ئایاتی ناردراو بۆ سەر پێغەمبەرﷺ رەت دەكەنەوە، پوختەی ئەم نمونە هێنانەوە ئەوەیە: كەسێك شارەزای ئایاتی خودا بی‌و كاریان پێ نەكا، وەكوو چۆن مار توێژ فڕێ دەداو لەپێستەكەی دەردەچی‌و لەسەر زەوی فڕێی دەدا، ئەویش ئاوا لەئیمان دەردەچێ. ئەمە نمونەی لادانە لەسروشت، هەڵوەشاندنەوەیە بۆ عەهدو پەیمانێك كە لێی وەرگیراوە، هەڵگەڕانەوەیە لەئایەتی خوداو ژێوان بوونەوەیە لەهەڵوێست. ئەوەتا كابرایەك پەروەردگار ئایاتی خۆی پێداوە، شارەزای كردووە، زانستو ماریفەتی پێ بەخشی بوو، دەیتوانی بە ئاسانی رێگای راست بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو لەو عیلمو زانستە داڕندرا! وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا﴾ ئەی موحەممەد! بە سەر جولەكەكانی مەدینەدا، یان بەسەر قەومەكەت دا دەنگو باسی ئەو زانایە

بخوێنەرەوە: کە ئایاتی خۆمانمان فێرکردبوو، عیلمو ماریفەتمان پێ بەخشبوو، فێری ئایەتەکانی خۆمانمان کردبوو، بۆ ئەوەی رەفتاریان پێبکا، رێگەی سەرفرازی بگرێ، کەچی ئەو ﴿فَانسَلَخَ مِنْهَا﴾ لەو عیلمو زانستە دارنرا، کاری پێنەکرد، واتە: ئەو زانستو ماریفەتەی کە وەك پۆشاك دایپۆشیوو، لێی دارندرا، بۆ هەتاهەتایەلەو ئیمانە، لەوعیلمو زانستە رووت بوو، ئەو عیلمو ماریفەتەی وازلێهێناو ختیە پاش خۆیەوەو ئاوڕی لێ نەدایەوە، لەبەر بەدبەختیو چارەڕەشی بووبە ئادەمیزادێکی خراپی واکە ﴿فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ﴾ شەیتان شوێنی کەوتو فۆزتیەوەو، کردی بە مامۆستای خۆی. واتە: ئەوەندە کردەوەی خراپی ئەنجام دا پێی دەگوترا: مامۆستای شەیتانەو دەرس بەشەیتان دەڵێ. یان دەتوانین بڵێین: پاش ئەوەی لە رێگەی هیدایەت لایداو شەیتان کافری کرد، ئەمجار شەیتان کەوتە شوێنی، توانی بەوەسوەسە کاری تێ بکا، ئەم کابرایە بۆ هەر شوێنێك بڕۆیشتایە شەیتان بەشوێنیەوە بوو، دەنگو باسی خراپی دەخستە شوێنیو ناوی زڕاندو ﴿فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾ بەپیاوێکی گومڕاوسەر لێ شێواو دەرچوو، چوە پێڕی گومڕایانەوە. خەسارتمەندی دونیاو قیامەت بوو!

بەکورتی- ئەو کابرایە، هیدایەتی پێدرا، کەچی ئەولێی دارندرا، پشتی لەهیدایەت هەڵکردو، روی کردە دونیا، شەیتان کردی بەگاڵتەچی خۆی، سەرنجامی بەهیلاکچون بوو، ریسوای دونیاوقیامەت بوو،

ئایەتەکە، عیبرەتو ئامۆژگارییە، بۆ موسوڵمانانو ترساندنیانە لەوەی کە شوێن هەواو هەوەسی خۆیان بکەون! بۆ ئەوەی وەکوو ئەم کابرایە هەڵنەخلیسکێن.

مامۆستا سەیید(دەفەرموێ: ئایا ئەمە هەواڵێکە لە هەواڵان دەخوێندرێتەوە؟ یان (ضەربولەئەلە) لەشێوەی هەواڵ دا چونکە زۆر ڕودەدا!؟؟

هەندێ ریوایات دەڵێن: ئەمە هەواڵو بەسەرهاتی صاڵحێکی فەلەستینییە، کەپێشئەوەی نەتەوەی ئیسرائل بچنەناوی، ئەو لەوێ نیشتەجێ بووە. بەدورو درێژی چیرۆکی سەر لێ شێوانو لادانی ئەم کابرایە تۆمار کراوە، بەجۆرێك کە لە ئیسرائیلیات خاڵی نیە، یان بەلای کەمەوە دڵ لەهەموو چیرۆکەکە ئاو ناخواتەوەو هەندێکی هەزم ناکرێ، وێڕای ئەوەش ئەم ریوایەتانە ئەوەندەیان جوداوازیو

نەگونجان پێکەوە هەیە، کەوامان لێ دەکا بەحەزەرەوە مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەین.

ئــەوەتا: ریوایــەت کــراوە: ئــەو کابرایــە لەنەتــەوەی ئیــسرائیل بــووەو ناوی(بەلعامی کوڕی باعوراو)بووە.

ریوایەتێکی تر، دەڵێ: لەدانیـشتوانی فەلەسـتین بـووەو لـەپێڕی جـەبابیرەکان بووە.

ریوایەت هەیە، دەڵـێ: عـەرەب بـووە نـاوی (أميـة ابـن الـصلت) بـووە. هەنـدێ ریوایەتی تر دەڵێن: کابریەك بووە هاوچەرخی پێغەمبـەر بـووﷺ نـاوی (ابـو عـامر الفاسق) بووە. ریوایەت هەیە، دەڵێ: هاوچەرخی حەزرەتی مووسا بووە. ریوایەت هەیـە دەڵـێ: دوا زەمـانی حـەزرەتی مووسـا بـووەو هاوچـەرخی یوشـعی کـوڕی نـون بووە: ئەوەی کە دوای سـەرگەردانی نەتـەوەی ئیـسرائیلو سـارا نـشینیان بـۆ مـاوەی چل ساڵ- سەرکردایەتی نەتەوەی ئیسرائیلی کردو بەسەریان دا زاڵ بوو!

دەربــارەی ئــەو ئایەتانــەی پێـی دراونو لەئایەتەکـە دا ئامـاژەیــان بــۆ کــرا، ریوایەت هەیە دەڵێ ئایەتەکان ئیسمی ئەعظەم بوون کە بەوناوە داوای شتی دەکرد دوعاکەی گیرا بوو.

هەندێ ڕیوایەت هەن، دەڵێ: ئایەتەکان بریتی بوون لە نامەی ئاسمانیو کابرا پێغەمبەر بووە.

ئەمجار مامۆستا سەید دەفەرموێ: بۆیە ئێمە لەمەنهەجی خۆمـان (في ظلال القرآن) دا وامـان بـەباش زانـی کـە نەچـینە ناوئـەم جـۆرە ریوایاتانـەوە پاشـگوێیان بخـەین، چـونکە دەقێکـی قورئـانی نیـە ئـەوەمان بـۆ یـەکالا بکاتـەوە، حـەدیثـێکـی مـەرفوعو گەیشتو بە پێغەمبەرﷺ لەو بارەیەوە نەهاتووە. کەوابوو لەپاش پـەردەی هەواڵەکە دەدوێینو، بابزانین چی لەژێر خـۆی دا حەشـارداوە؟ هەواڵەکـە تـەمثیلـی حاڵو چۆنیەتی ئەو کەسانە دەکا، کە ئایاتی خـودا بـەدرۆ دەخەنـەوە، پـاش ئـەوەی تێیـان دەگـەنو دەیـانزانن، لێیـان پاشـگەز دەبنـەوە بـەگوێرەی تێکەیـشتنی خۆیـان کارناکەن.

ئای کەوێنەی ئەم هەواڵە لەژیانی ئادەمیزا دا رودەداو دووبارە دەبێتەوە! ئای کەزۆرن ئەوانەی زانیاری ئاینی خودایان فێر دەکریو هیدایـەت بەدەسـت نـاهێننو

زانیاریەکەیان زانیاری بەختەوەری‌و هیدایەتی حەقیقی نیە ئەو زانیارییە دەکەنە هۆکار بۆ گۆڕینی دەقەکانی ئایینی خوداو شوێنکەوتنی هەواو هەوەسی خۆیان! بۆ ڕازی کردنی ئاغاکانیان، بۆ دونیا خۆری‌و وەدەست هێنانی کالأی دونیایی. چەند زانای ئایینیمان بینین حەقیقەتی ئایینی خودایان دەزانی‌و لێیان لادا، ملکەچی یاساو نیظامی تربون. زانیاریەکەیان بەکارهێنا بۆ گۆڕانکاری مەبەستو بەئەنقەست لەئاییندا، بۆ دەرکردنی فتوایی نابەجی‌و ڕازی کردنی کار بەدەستانو ملهوڕانو دونیا خواردن. زۆرمان لەو زانایانە بینی: دەیانزانی‌و دەیانگوت تەشریع دانان مافی خودایەو بەس، کەسێك ئیدیعای ئەوە بکا ئەوە ئیدیعای خودایەتی دەکا،کەسێکیش ئیدیعای خودایەتی بکا کافر دەبێ، هەرکەسێکیش پاڵپشتی ئەو کەسە بکاو شوێنی بکەوێ ئەویش کافر دەبێ دەی ئەو زانایە لەگەڵ ئەوە دا کەئەم حەقیقەتە دەزانی‌و ئاگای لێیەتی، بانگەواز بۆ ڕێبازی ئەو ملهوڕە طاغیانە دەکا کە ئیدیعای حەقی تەشریع دانان بۆ خۆیان دەکەن! بەموسوڵمان ناویان دەباو دوعای سەرکەوتنو تەمەندرێژییان بۆ دەکا.. زۆرمان لەو زانایانە بینی ئەمڕۆ باسێك دەنوسێ ڕیبا حەرام دەکا، سبەینێ باسێك دەنوسێ حەلأڵی دەکا، بینیمان هەیانە دەست خۆشی لە بلأوکردنەوەی فیسق‌و فجور دەکا بەناو موسوڵماناندا. پۆشاکی ئایینی بەبەردادەکاو بانگەشەی بۆ دەکا.

هەندێ لەزانایان دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لەشانی ئەو کەسانە دا هاتوتە خوارێ کە پەروەردگار زانستو زانیاری پێدابی‌و کەچی پلەوپایەی خۆی نەناسی‌و هیچ سودو بەهرەیەك لەو زانیاری‌و پلەو پایە وەرناگرێ، لە شوێنی خۆی دا خەرجی ناکا، ڕو بکاتە ڕێبازی چەوتو نالەبارو گومڕایی، بەچاوی خۆمان دەبینینو بینیومانە مەلایەکی خوێندەوار، شێخێکی مورشیدو خاوەن پلەوپایە دەبێتە ئەندامی پارتێکی عیلمانی، پاڵپشتی حیزبێکی کۆمەنیستو شیوعی دەکا، لەسەر مینبەری مزگەوت دوعای سەرکەوتنو تەمەندرێژی بۆ سەرۆکێکی فاسق‌و خودا نەناس دەکا، بەڕاستی ئەوانە زانایانی بێ دینو پێشەوایانی ئایین فرۆشن، لەئایین داڕندراونو لێی دەرچوون!

﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا﴾ ئەگەر خواستمان ببوایە، ئەو کابرایەمان بەهۆی ئەو

ئایەتانەی کەپێمان دابوو لە پلەوپایەی خوداناسی دا بەرزمان دەکردەوە، پلەوپایەی شارەزاو پابەند بەئایەنمان پێ دەبەخشی! هیدایەتمان دەدا کە کار بەو ئایەتانە بکا کە پێمان داون! ﴿وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ﴾ بەلام ئەو بەدبەختە مەیلی پەستی کردو حەزی لەنزم بوونەوە بوو، خۆی دایە لای زەوی‌و سوکی‌و ریسوایی هەڵبژاردو، کەوتە شوێن هەواو هەوەسی دونیا پەرستی خۆی.... کاری بۆ سەرفرازی قیامەت نەکردو بەئایەتەکانمان هیدایەتی بەدەست نەهێنا، بەرەو ئاسۆی بەرزی‌و بەختەوەری ملی نەناو کوفرانی نیعمەتەکانی خودای کردو بۆ رەزامەندی خودا بەکاری نەهێنا.

﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ﴾ حاڵ‌و رەوشت‌و وێنەی ئەو کابرا پەستی خوازە لەرەوشتی خوێڕیەتی‌و زەلیلی دا وەکوو هی سەگ وایە لەپەست ترین رەوشت‌و سووکایەتی‌دا، کە حاڵەتی هانکە هانک‌و زمان دەرکێشانیەتی: ئەگەر هێرش ببەیتە سەری زمانی لەدەم دەردێنی‌و دەست دەکات بەهانکە هانك، ئەگەر وازیشی لێ بێنی لەبەر حیرص‌و تەماعی خۆی ئەو هەر زمان دەردێنی‌و هانکە هانکی خۆی دەکا، ئەم رەوشتە، پەست ترین رەوشتی سەگە، حاڵ‌و رەوشتی ئەو کەسەی پێ شوبهێنراوە کە لەزانینی ئایاتی خودا داڕندری‌و خۆی لەو پلەو پایە بەرزە دێنێتە خواری!!

﴿ذَلِكَ﴾ ئەو مەثەل هێنانەوە سەیرو سەمەرەیە، ئەوەی باسمان کرد لەحاڵ‌و چۆنیەتی سەگ، ئەوە ﴿مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ مەثەل‌و نمونەو حاڵی ئەوانەیە، کە ئایاتی نێردراوی من‌و موعجیزەی پێغەمبەرەکانم بەدرۆ دەخەنەوە، لەئاستی ئایاتی خودا لوتبەرزی دەنوێنن، بەئامۆژگاری دەرس دادان تەمێ خواردو نابن، ئەوانە هەمیشە هەڵپەی دونیا خواردنیانە ئارەزۆی شان‌و پلەو پایەی دونیایی دەکەن‌و هەمیشە لەهانکە هانک‌و دەمەلاسکێ دان بەدوای ئارەزۆی خۆیاندا، ئەوانە: نەتەوەی جوولەکەی دونیا پەرستن، ئەوانە لەتەورات دا رەوشت‌و نیشانەکانی پێغەمبەریان خوێندبوەوە مزگێنییان بەخەڵکی دا، کە هاتنی پێغەمبەرێکی ئاوا نزیکە، دەیانگوت: هەر لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە هات ئێمە دەیناسین‌و خێرا بڕوای پێ دەکەین‌و دەچینە ژێر ئاڵاکەیەوە، ئەمجار بەسەر دوژمنەکانمان دا سەردەکەوین،

کەچی کە پێغەمبەر ﷺ ڕەوانەکرا نیشانەکانی هەموو تێدا بوونو ئەوان لێیان روون بوو: کە ئەو زاتە ئەو پێغەمبەرمیە کە لەتەورات دا مـوژدەی هـاتنی راگەیانـدراوەو، وەکوو چۆن کوڕی خۆیان دەناسی ئاوا ئەویشیان دەناسی، بەڵام لەترسی ئەوەی کە دونیا خۆرییان لەکیس بچێ، ئینکارییان کردو ئیمانیان پێ نەهێنا!

﴿فَاقْصُصْ الْقَصَصَ﴾ ئەی پێغەمبەر! چیرۆکی ئەو کابرایە بگێڕەوە کە حاڵو رەوشتی دەشوبهایە حاڵو رەوشتی ئەو کەسانەی کە ئایینی ئێمە بەدرۆ دەخەنەوە، چونکە نەتەوەی ئیسرائیل، ئەوانەی ئاگادارییان بەسەر حاڵو چۆنیەتی بەلعامی کوڕی باعوراء دا هەیە، دەزانن چی بەسەر هاتو چۆن خودا گومڕای کرد ئەو بەدبەختە بەهۆی ئەوەوە، کە ئەو نیعمەتەی خودا پێی بەخشیبوو، کە زانینی ئیسمی ئەعظەم بوو، هەر داوایەکی پێ بکردایە جێ بەجێ دەبوو- لەغەیری طاعەتی خودا دا بەکاری هێنا، خودا لەرەحمەتی خۆی دووری خستەوە. جا تۆ ئەم سەرگورشتەیان بۆ بگێڕەوە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڵکوو ئەو جولەکانە بیرێك لەدوا رۆژی خۆیان بکەنەوە، هەوڵ بدەن بەدەردی بەلعامی کوڕی بعوراء نەچنو وەکوو ئەو بەدبەختی دونیاو قیامەت نەبن. چونکە پەروەردگار لەتەورات دا بەرەوشتو نیشانەکانی پێغەمبەری ئیسلام، موحەممەدﷺ ئاشنای کردوون. کەوابوو: ئەوان شیاوترین ئادەمیزادن بۆ ئەوەی شوێنی بکەونو یارمەتی بدەنو پشتی بگرن.

﴿سَاءَ مَثَلاً الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ﴾ خراپ نمونەیەکە، نمونەی ئەو گرۆهانەی ئایاتی نێردراوی ئێمەیان بەدرۆ خستەوە، ئەوانە بەهۆی بێ باوەڕیو بێ موبالاتی بەئایاتی ئێمە، ستەمیان لەخۆیان کردو، ئەوانە ستەمیان لەئیمە نەکرد، چونکە ئێمە ستەممان لێ ناکرێ زیانمان لێ ناکەوێ، ئادەمیزادان هەموویان خواناس بن ئێمە سوودمان پێ ناگا، ئەگەر هەموویان ستەمکارو کافر بن هیچ لەخودایەتی ئێمە کەم ناکا..

مەبەست لەم چیرۆکە پەندو ئامۆژگارییە بۆ هەموو ئەو کەسانەی پشت لەئیمان هێنان هەڵدەکەنو سەرپێچی فەرمانو نەهییەکانی خوداو پێغەمبەر دەکەن، پاش ئەوەی حەقو راستیان ناسی لێی پاشگەز ببنەوە، کەسێك خودا عیلمو

دینی پێ بەخشی، بەپێی عیلمو ئایینی خودا هەڵسو کەوت نەنوێنیو بۆ لای خودا بەرزەفر نەبیو روو بکاتە دونیا پەرستیو بەرەو زەوی خۆی نزم بکاتەوە، ئەوە دەشوبهێتە پەسترین ئاژەڵ کە سەگی زمان دەرکێشراوو دەم داپچڕاوە، کە هەردەم خەریکی کاری ناشرینو هەڵسو کەوتی قێزلێکراوە. پەروەردگار لەم ئایەتە دا تەشبیهی حاڵو چۆنیەتی هەموو کافرو بێدینێکی کردوە بەحاڵو چۆنیەتی پیاوێك ئایاتی خودا شارەزا بووبیو لەئایین حاڵی بێ کەچی وازی لێ بێنیو لێی پاشگەز بێتەوە، ئەم پەند هێنانەوە بەلعامی کوڕی باعوراو هەموو ئەوانە دەگرێتەوە: کە ئەو رەوشتە ناشرینانەیان تێدا بن.. ئایەتەکە دەست نیشانی ئەو کەسەی نەکردوە کە ئەم مەثەلو پەندەی پێ هێنراوەتەوە، ئیتر گرنگ نیە لەگەڵ ئەو ریوایەتە، یان ئەم ریوایەتە یەك دەگرنەوە یان نا. ئەو کابرایە لەنەتەوەی ئیسرائیل بووە، یان کەنعانی بووە یان یەمەنی، یان..........

ئایەتەکە هەڕەشەیە لەهەموو ئەو کەسانەی کەشوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەونو روو دەکەنە دونیا پەرستیو ئارەزۆ بازی! واز لەئایینی خودا دەهێنن بڕوا بەخوداو بەپێغەمبەری خوداو بەرۆژی قیامەت ناکەن!

ئیمام فەخری رازی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە توندترین هەڕەشەی تێدایە بۆ زاناو شارەزایانی ئایین، چونکە زانا بەئایین ئەگەر بەپێی عیلمەکەی خۆی نەجوڵایەوە، پیتو بەرەکەتی زانینەکەی نامێنێ، زۆر لەخودا دوور دەکەوێتەوە...

دیلەمی لەکتێبی (الفردوس) دا حەدیثێکی لەئیمامی عەلییەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (من ازداد علماً، ولم يزدد زهداً لم يزدد من الله الا بعداً) کەسێك زانیاری زیادی کردو خودا پەرستیو دونیا نەویستی زیاد نەبوو، جگە لەخودا دوور کەوتنەوە نەبێ هیچی تری بۆ زیاد نابێ.

## هۆکاری هیدایەتو گومڕایی

﴿ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ

وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار نمونەی ئادەمیزادی لەئایین دەرچووی هێنایەوە: بۆ ئەوەی واز لە گومڕایی خۆیان بێننو بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی حەقو ڕاستی، ئەمجار هۆکاری هیدایەتو گومڕایی دیاری دەکا، کە بریتین لەبەکار هێنانی عەقڵو هەستو شعورو بەکارهێنانی هیدایەتی سروشت بۆ پەیڕەو کردنی یەکێ لەم دوو ڕێگایە، ڕێگای خێر، یان ڕێگای شەڕ، دەفەرموێ: ﴿مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي﴾ کەسێك خودا هیدایەتی بدایبۆ ئیمان هێنانو خێرو شوێنکەوتنی شەرعو قورئان بە هۆی بەکارهێنانی عەقڵو حەواسی بەرێكو پێکی، ئەوە هەر ئەو بەڕاستی هیدایەت دراوەو کەسی تر هیدایەت دراونیە.﴿وَمَنْ يُضْلِلْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْخَاسِرُونَ﴾ کەسێکیش خودا ڕیسوای بکاو تۆفیقی نەداو، شارەزای نەکا بۆ خێرو شوێنکەوتنی قورئان، بە هۆی لەکارخستنی عەقڵو شعوری لەتێفکرینی نیشانەکانی بونەوەرو تێگەیشتن لەئایەتە شەرعیەکان، ئەوە ئەو جۆرە کەسانە خەسارەتمەندنو،دوورن لەڕێبازی هیدایەتو بەختەوەری دونیاو قیامەتیان لەکیس چووە، گومڕاو سەرلێ شێواون. هیدایەتی خودایی یەك جۆرە ئەویش ئیمان هێنانە،کە کردەوەی چاك لەوەوە سەر چاوە دەگرێ، بەڵام جۆرەکانی گومڕابوون زۆرو زەبەندەن وەکوو لەسورەتی(الانعام) دا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ﴾ بۆیە وشەی (المهتدی) بەتاك هێناو وشەی (الخاسرون) بەکۆهێناوە! ئەمجار پەروەردگار ئەو مەفهومەی لە لەئایەتی پێشو دا بەکورتی هێنای لێرە دا شی دەکاتەوەو درێژەی پێدەداو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِنْ الْجِنِّ وَالإِنسِ﴾ سوێند بێ! ئێمە زۆرمان لەئادەمیزادو جندۆکە دروست کردون، کە ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە کردارێك بکەن شیاوی چونە دۆزەخ

بن‌و تێی دا بمێنەوە. هەروەها ئادەمیزادو جندۆکەی تریشمان دروست کردوە کە ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە کردەوەی وائەنجام بدەن بچنە ناوبەهەشتەوە، چونکە ئادەمیزاد بە سروشت ئامادەباشی ئەنجامدانی کاری خێرو کاری شەڕی تێدایە، کرداری چاك بەهەشتی یەو کرداری خراپ دۆزەخیە، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾-الشورا /٧ یان دەفەرموێ: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾- هود /١٠٥.

ئەمجار هۆکاری چوونە ناو دۆزەخ‌و ئامادەباشییان بۆ ئەو کردەوە خراپانە دیاری دەکا دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ ئەوانە: دڵیان هەیە بەڵام بۆ تێگەیشتن بەکاری ناهێنن، عەقڵ‌و هۆشیان بەشێوەی ڕێك‌و پێك بەکار ناخەن تابگەنە حەقیقەتی ئیمان‌و دڵ‌و دەروونیان لەژەنگی گومڕایی پاك بێتەوە، هەست بەخۆشی‌و بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەت بکەن، ئەوانە بەوردی لەشتەکان وردنابنەوە، تێڕوانینیان بۆ ژیان تێڕوانینێکی سەطحی‌و سافیلکانەیە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾الروم /٧ ئەوان وەکوو کەسێك وان کە لەهیچ تێناگەن، چونکە نەبەتەمای پاداشتی باشن، نەلە سزای دۆزەخیش دەترسن.

﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا﴾ ئەوانە چاویان هەیە پێی نابینن، واتە: بەچاوی وردبینی‌و تێفکرینەوە سەیری شتەکان ناکەن، لەئایاتی کەونی‌و ئایاتی قورئانی وردنابنەوە، تا شارەزای ڕێبازی خۆشبەختی ببن. ﴿وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ گوێچەکەیان هەیە پێی نابیسن، گوێ ناگرن بۆ ئایاتی خودا کە بۆ پێغەمبەرانی ناردوە، هەواڵ‌و بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان نابیسن، ئاکام‌و سەرەنجامی ئەوانەی رویان لەهیدایەتی خوداو شارەزایی کردنی پێغەمبەران وەرگێڕا، ئاگادار نین، واتە: پەندو عیبرەت لەسەرەنجامی گەلە پێشنەکان وەرناگرن‌و تەمێ خواردو نابن.

جا ئەو کەسانەی کە ئەوە ڕەوشت‌و هەڵس‌و کەوتیانە ئاوا عەقڵ‌و حەواسی خۆیان لەکارخستووە ﴿أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ﴾ ئەوانە وەکوو حوشترو ڕەشە وڵاخ‌و مەڕو بزن هەر خەمی خواردن‌و خواردنەوەیانە، بەڵکوو گومڕاتریشن، چونکە ئەو ئاژەڵانە هەوڵی ئەو شتانە دەدەن کە سوودیان پێ دەگەیەنی‌و خۆ

دەپارێزن لەو شتانەی زیانیان پێ دەگەیەنن. زێدە ڕەوی ناکەن لەخواردنو خواردنەوەدا، کەچی ئەو ئادەمیزادە بەدبەختانە، بەئەنقەستو ڕەقەبەری ئەو کارانە دەکەن کە بەرەو دۆزەخیان دەبا، زێدە ڕەوی لەهەموو خواردنو خواردنەوەیەك دا دەکەن چی زیان بەخش بێ بۆ ژیانی دونیاو قیامەتیان ئەوە ڕەچاو دەکەن. ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ ئەوانە بەتەواوی بێ ئاگان لەئایاتی خودا، نازانن چۆن هەستو شعورو عەقڵیان بخەنەکار، ئەوانە نەزانو گێلو نەفامو کەودەنن. بەتەواوی ڕویان لەدونیا پەرستی کردوە، خەریکی خواردنو خواردنەوەن، وازیان لەهەوڵدان بۆ ژیانی قیامەتو خۆشی هەتاهەتایی هێناوە، چ باکیان لەبەهەشتو دۆزەخ نیە.... بەپێچەوانەی عاقڵ مەندەکانو ئەوان هەوڵی وەدەستهێنانی بەختەوەری ژیانی قیامەت دەدەنو پێویستیاتی ژیانی دونیاش پاشگوێ ناخەن، بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڵسو کەوت دەکەن کە دەفەرموێ: ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾القصص/٧٧.

لێرە دا پرسیارێك دێتە پێشەوە، دەڵێ بۆچی زوربەی ئەو خەڵکە -ئادەمیزادو جندۆکە- بۆ چونە ناو دۆزەخو تێدا مانەوەی دروست کراون؟

لەوەڵام دا دەگوترێ: پەروەردگار بەعیلمی ئەزەلی خۆی زانیویەتی ئەو خەڵکە بەرەو ڕێبازی دۆزەخ ڕێ دەکەن، ئەمەش پێویست بەوە ناکا ئەو کردارەی کە دەبێتە هۆکاری چوونە ناو دۆزەخیان بێتە عالەمی واقیعەوە، عیلمی خودا شامیلو ڕەهایە حەوێجەی بەزەمانو مەکان نیە.

یان دەڵێن: خاوەنی ئەم عیلمە ئەزەلییە ڕەهایە -کە پەروەدگارە، پێویستی بەزەمانو مەکانو جەوجۆڵی جیهانی ئادەمیزادی تازە پەیدابوونیە- ئەو نیە کە مەخلوقات هەڵدەنێ بۆ گومڕیی یەك کە دەبێتە هۆی چونە ناو دۆزەخیان بەڵکوو هۆکارەکە لەحەقیقەتدا. وەکوو ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ ئەوانە ئەو دڵانەی پێیان دراوە نایانکەنەوە بەکاریان ناهێنن بۆ ئەوەی تێبگەن. دڵی کراوەو چاوی بینا نیشانەی ئیمان هێنانو هیدایەت لەبوونەوەردا، لەپەیامی پێغەمبەراندا، بەدی دەکاو تێی

دەگا! ئەوان لەئاستی ئایاتی کەونی دا دڵی خۆیان داخستوە، چاوی خۆیان نوقاندوە، گوێچەکەی خۆیان هاخنیوە، ئەم ئامێرانەیان لەکار خستوونو لەشوێنی خۆیان دا بەکاریان نەهێناون، ژیان بەبێ ئاگاییو گێلی بەسەردەبەن، کەوابوو ئەوان وەکوو ئاژەڵ وەهان بەڵکوو گومڕاترینو گێل ترینو نەفام ترن.

بێ ئاگان لەو نیشانانەی کەون ڕۆژانەو مانگانەو ساڵانە دووبارە دەبنەوە، بێ ئاگان لەو ڕوداوانەی کە بەسەریان دێو پێیا تێپەڕ دەبنو دەستی قودرەتی خودایان تێدا بەدی ناکەن، ئەوان بەسادەیی سەیری ژیان دەکەن، بەبێ ئاگاییو گێلیو سەیری ڕۆژگار دەکەن، دڵیان ناکەنەوە ماناو مەبەستی ژیان تێبگەن، چاویان ناکەنەوە دیمەنەکانی بوونەوەر ببینن، گوێچەکەیان ناکەنەوە قسەی حەقو ڕاست ببیسن، کەوابوو ئەوان -هەروەکو لەعیلمی ئەزەلی خودا دا دیاری کراوە- شیاوی ئەوەن بچنە ناو دۆزەخەوەو بکرێنە سوتەمەنی ئەو ئاگرە بێ ئامانە..

**تێبینی: موعتەزیلەو ئەهلی سوننەو جەماعەت لەبارەی کردەوەی ئادەمیزادەوە را جیاییان هەیە:**

١-موعتەزیلەکان پێیان وایە، ئادەمیزاد بەدیهێنەری کردەوەی خۆیەتیو دەسەڵاتی رەهای هەیە لەکردن یان نەکردنی کردەوەکانی دا.

٢-ئەهلی سوننەو جەماعەت، پێیان وایە: خودا بەدیهێنەرە بۆ کردەوەکانی ئادەمیزاد خەڵقی خودی کردەوەکە خودا دەیکا، ئادەمیزاد لەبارەی کەسبەوە موختارە بیکا، یان نەیکا، بەڵام بڕێ شتی سەرەکی هەن وەکوو مردن، ژیان، بەرزبوونەوە، زەلیلی، ڕزقو ڕۆژی ئادەمیزاد کەسبو ئیختیاری تێیان دا نیە..

**هیدایەت لەخوداوە دوو مانای هەیە:**

١-شارەزایی کردن.

٢-گەیاندن بەمەبەست. واتە: پەروەردگار ئادەمیزادی شارەزا کردوە بۆ ڕێگای خێرو پاشان بەجۆرە هیدایەتێکی تر تۆفیقی داوە بۆ ئەوەی بگاتە مەبەستو ئامانجی خۆی. وەکوو ئەوە سایەقێکی نەشارەزا پرسیار لەپۆلیسێکی هاتوچۆ بکا، ئەگەر پۆلیسەکە ڕێگاکەی پێ بڵێ: ئەوە جۆرە هیدایەتێکە، ئەگەر

پۆلیسەکە لەگەڵی سوار بوو گەیاندییە ئەو شوێنەی کە مەبەستی بوو، ئەمەش جۆرە هیدایەتێکە...

ئادەمیزاد بەویستو ئیرادەی خۆی ئەو تواناو دەسەڵاتەی پەروەردگار تێی دا دروست کردوە، ئاراستەی دەکا، جا یان بۆ خێر یان بۆ شەڕ!! ئادەمیزاد لەسەر ئەم ئاراستە کردنە پاداش لەسەرچاکە وەردەگرێتەوە، یان لەسەر خراپە سزا دەدرێ!

## ناوە جوانەکانی پەروەردگار

﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار وەصفی ئەو خەڵکەی کرد کە شیاوی چوونە ناو دۆزەخنو بۆ ئەوێ دروست کراون، بەغافڵو بێ ئاگاو گومڕا لەقەڵەمی دان، چونکە عەقڵو دڵو چاوو گوێچکەی خۆیان وەکوو پێویست بەکار نەهێناون تا لەئایەتی خودا حاڵی ببنو دڵیان بەئیمان مشتو ماڵ بکرێو، زانستی بەسوود فێر ببن.....

ئەمجار دوای ئەوە فەرمان دەکا بەیادو زیکری خودا، چونکەزیکری خودا دەرمانی دەردی بێ ئاگایی‌و گومڕاییە ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾ هەر بۆ خودایەو بۆ کەسی تر نیە چەند ناوێك کە جوانترین مانایان لەخۆ گرتوون. بەو ناوە جوانانە بانگی بکەنو هاواری لێ بکەن یان بۆ پەسنی‌و وەصفو ستایش بۆ زاتی پاکی بەکاریان بێنن وەکوو ﴿اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾البقرة/۲۵۵، یان بۆ داواکاری‌و دابینکردنی پێویستی‌و لابردنی بەڵاو موصیبەت..

بێگومان ناوە جوانەکانی خودا (اسماء الله الحسنى) لەچوار سورەت دا باس کراون

۱- لەسەرەتای ئەم سورەتەدا.

۲- لەکۆتایی سورەتی (الأسراء) دا کە دەفەرموێ: ﴿قُلِ ادْعُواْ اللّهَ أَوِ ادْعُواْ الرَّحْمَـنَ أَيّاً مَّا تَدْعُواْ فَلَهُ الأَسْمَاء الْحُسْنَى﴾الأسراء/۱۱۰.

٣- لەسەرەتای سورەتی (طه) دا کە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى ﴾طه/٨.

٤- لەکۆتایی سورەتی (الحشر)دا کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى﴾الحشر/٢٤.

وەکو ریوایەت کراوە بڕێك لەموسوڵمانان لەنوێژ دا هاواریان لەخودا دەکرد، بە ناوی(الله)، یان (الرحیم) جاری واش دەبوو بە (الرحمن) بانگیان لێ دەکرد، کافرەکان، وتیان: موحەممەدو هاوەڵانی سەیرن، پێیان وایە: ئەوان عیبادەتی یەك خودا دەکەن، ئەدی بۆچی هاواری دوو خودادەکەن؟؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، ئەوەی روون کردەوە؛ کە ئەو ناوە جوانانە هی یەك خودان، نەك هی چەندخوایەك.

ناوە جوانەکانی خودا نەوەدوو نۆ ناون، لەصحیحی موسیلەو بوخاری دا هاتووە کە ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) ریوایەتی دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر فەرمویەتی: (ان لله تسعا وتسعین اسما، مائة الا واحدا، من احصاها دخل الجنة، وهو وتر یحب الوتر) واتە: خودای گەورەو باڵا دەست نەوەدو نۆ ناوی هەیە، سەد ناو یەك کەم، کەسێك بیان ژمێرێ، لەبەریان بکا، بیر لەماناکەیان بکاتەوە، دەچێتە بەهەشتەوە ئەو تاکە، جووت نیە، تاکی خۆش دەوێ.

ناوە جوانەکانی خودا بەگوێرەی ریوایەتی تیرمیذی لە طەریقی (الولید)ی کوڕی موسلیم لەشوعەیبەوە ئەمانەن:

(هو الله الذی لا اله الاهو الرحمن، الرحیم، الملك، القدوس، السلام، المومن، المهمن، العزیز، الجبار، المتکبر، الخالق، البارء، المصور، الغفار، القهار، الوهاب، الرزاق، الفتاح، العلیم، القابض، الباسط، الخافض، الرافع، المعز، المذل، السمیع، البصیر، الحکم، العدل، اللطیف، الخبیر، الغظیم، الشکور،العلي، الکبیر، الحفیظ، المقیت، الحسیب، الجلیل، الکریم، الرقیب، المجیب، الواسع، الحلیم، الودود، المجید، الباحث، الشهید، الحق، الوکیل، القوی، المتین، الولي، الحمید، المحصی، المبدیء، المعید، المحي، القیوم، الواجد، الماجد، الواحد، الصمد، القادر، المقتدر، المقدم، الموءخر، الاول، الاخر، الظاهر، الباطن، الوالی، المتعالی، البر، التواب، المنتقم، العفو، الرؤوف، مالك الملك، ذوالجلالو

الاكرام، المقسط، الجامع، الغنی، المانع، الضار، النافع، النور، الهادی، البدیع، الوارث، الرشید، الصبور).

زانایانی شارەزا لەبواری فەرموده دا دەربارەی ریوایەتی ئەم ناوه جوانانە لە پێغەمبەرەوه کەوتونەتە راجیاییەوه: هەندێك دەڵێن: فەرمودەکە مەرفووعە، هەندێکیش دەڵێن: مودەڕڕەجە، ئەمەشیان وێ چوترە، بۆیە شەیخان -موسلیمو بوخاری- تەخریجیان نەکردوه، چونکە وەلید بەتەنیا ریوایەتی کردوەو گومانی تێهەڵکێشی تێدا دەکرێ، وەکوو زانای گەورە ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لەکتێبی فەتحولباری دا فەرموویەتیو بەمودررەجی داناوه. ﴿وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ واز لەوانە بێنن کە گۆڕانکاری لەناوه جوانەکانی دا دەکەن، وشەکانیان یان ماناکانیان لەراستی خۆیان لادەدەن تەحریفو گۆڕانکارییان تێدا دەکەن، زیادو کەمیان تێدا ئەنجام دەدەن.

**ئیلحاد بەسێ جۆر دەبێ**: -

١- بەگۆڕانکاری کردن تێیان دا وەکوو موشریکو بتپەرستەکان دەیانکردو بتەکانیان بەو ناوانە ناو نابوون، لەلەفظی (الله) وشەی (اللات)یان داهێنا بوو، لەوشەی (العزیز) (العزی)یان داهێنا بوو، لەوشەی (المناف) وشەی (مناة)یان داهێنا بوو،.

٢- دانانی ناوو صیفەتێك کە خودا بۆ خۆی لەقورئان دا خۆی پێ ناو نەنا بێ، یان پێغەمبەرﷺ لەفەرموودەی صەحیحی خۆی دا نەیفەرمووبێ، وەکوو مەسیحییەکان بەخودا دەڵێن: باوکی مەسیح!! چونکە ئەهلی حەقو زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوه کە ناوه جوانەکانی خودا تەوقیفین، واتە: دەبێ قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەرﷺ دەست نیشانیان بکەن!

٣- کەم کردنو زیاد کردنی ناوه جوانەکانی، ناو هێنانی خودا بەناوێك کە لەو ناوانە بەدەرەو خۆی بۆ خۆی دانەناوه، یان ناو نەهێنانی بەو ناوەی بۆ خۆی داناوه، وەکوو ئەوه ئادەمیزاد بەناوێك هاوار لەخودا بکا کە ماناکەی نەزانێ، تەصەووری ناولێنراوەکە نەکا.

ئەی موحەممەد! تۆ واز لەو کەسانە بێنە کە گۆڕانکاری لەناوه جوانەکانی

خـودا دا دەکـەن، ئەوانـە سـزای کردەوەکانیـان دەدرێتـەوە، پـێش هـاتنی قیامـەت لەدونیا دا سزا دەدرێن

**تێبینی: ئایەتەکە ئەم مانایانەی لەخۆ گرتوون**: -

١- هەر خودا ناوی جوانی هەن‌و ناوی جوان هـەر هی پـەروەردگارن! کـەوابێ هـەر ناوێـك جوانـە هـی خودایـە، نـاوە جوانـەکانی خـودا دەکـرێ لەغـەیری خـۆی بندرێن، جگە لەناوی (الله)و (الرحمن) کە نابێ کەسیان پێوە نـاوبنرێ. واتـە: نـابێ ئادەمیزادێـك هـەبێ نـاوی (الله)ی لێ بنـێین یـان (الـرحمن). بـەڵام (عبـدالله) یـان (عبدالرحمن) ئەوە لەشەرع دا ناوی پەسندن.

هەندێ لـەناوە جوانـەکانی خـودا دەکـرێ بەتـەنیا هاواریـان لێ بکـەین وەکـوو (یـاالله) (یـارحمن) (یـاحکیم) هەنـدێ نـاوی جـوان هـەن نـابێ بەتـەنیا هاواریـان لێ بکـەین بـەڵکوو دەبـێ بڵێین: (یـامحي یامميـت)، (یاضـار یانـافع). پێویـستە ئـەوەش بزانین کە ناوە جوانـەکانی پـەروەردگار هـەر نـەوەدو نـۆنین بـەڵکوو خـودا هەنـدێ نـاوی هـەن کەسـی پـێ ئاشـنا نـەکردون. بەڵگـەمان لەسـەر ئەمـە ئـەو فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ کـە ئیمـامی ئەحمـەدو ئـەبو حاتـەمی کـوڕی حیبـانی ئەلبەسـتی لەصـەحیحی خـۆی دا لەعەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعوودەوە(رەزای خـوای لـێ بێـت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (..................أسألك بكل اسم لـك سميت به نفسك أو أنزلته في كتابك أو علمته أحداً من خلقك، او اسـتأثرت بـه في علـم الغيب عندك، أن تجعل القرآن العظيم ربيع قلبي، ونور صدري، وجلاء حزنـي، وذهـاب همي، الا اذهب الله خزنه وهمه، وأبدل مكانه فرجاً). گـوترا: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئایا ئێمـە فێریـان نـەبین؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (بلـى ينبغـي لكـل مـن سمهـا ان يتعلمها) کەوابوو جگە لەو نەوەدو نۆ ناوە پەروەردگار ناوی تریشی هەن.

ئیبنولعەرەبی سەدو چل‌و شەش ناوی لەناوە پیرۆزەکانی خـودا بـۆ پاڕانـەوەو هاوار لێ کردن هێنـاون، لەشوێنێکی تـر دا سی نـاوی پـیرۆزی تـری لێ زیـاد کـردون، واتە: بوون بەسەدو حەفتاو شەش ناو. وەکوو (الطيب، المعلم، الجميل...).[9]

[9] احکام القران ج۲/۷۹۸-۸۰۵

شاعیری خوداناسو هەست ناسك سەيید عبدالرحیمی مەولەوی دەفەرموێ:

ئەسمای (خالق الارض و الفلك)
ئەرچی مەشهوون بە هەزارو یەك
بەشەر عیچ یەکێ کەم صەد مەذکوون
لاکین وەك صیفات غەیرە مەحصوون
بۆچ؟ ئەر ئەسمایە، ئەگەر صیفاتە
مەنشەئی هەموو هەر کەمالاتە
خۆ کەمالای خالیقی ئەکبەر
غەیرە مەحصوورەو لەغایەت ئەودەر

..............................

هەر ئیسمێ کە شەرع ئیزنی ئەداوێ
ئیطلاقی وەسەر خودادانەاوێ
ئەم قەولە موختار، یەکجار ظەریفە
بەس بیناى ئەسماء لەسەر تەوفیقە[10]

موعتەزیلە لەرستەی کۆتایی ئایەتەکە، کە دەفەرموێ: ﴿سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کردەوە هی ئادەمیزادە، پاداشو سزا لەسەر کردەوەی بەندەیەو لەوەوە سەرهەڵدەدا.

ماوەتەوە ئاماژە بە ئەوە بکەین کە دوعاو پاڕانەوە شتێکی مەشروعو پەسەندەو بەعیبادەت حسێبە، بەڵکوو کاکڵەی عیبادەتو خوا پەرستییە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾البقرة /١٨٦. لەقورئانی پیرۆز دا کە باسی پرسیارو ئیستیفتاء لەگۆڕێ بێ وەلامەکەی وادە داتەوە دەفەرموێ: ﴿فقل.....﴾ واتە: ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەوە وەلامەکەیەتی .. بەلام لێرە دا ئەو ناوەندە ناهێڵێو یەکسەر دەفەرموێ:

---

[10] عەقیدەی مەرضییە، دانراوی سەيید عەبدولرەحیمی مەولەوی لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ل/٢٤٠

﴿فَإِنِّي قَرِيبٌ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من پرسیارت لێ بکەن ئەوە من لێیان نزیکم، وەڵامی بانگکەر دەدەمەوە هەرکاتێ هاوارم لێ بکەن، واتە: با راستەوخۆ بانگ لەمن بکەنو ناوەندو واسیتەو وەسیلە بەکارنەهێنن، بانگ کردنو هاوار کردن لەغەیری خودا لەهیچ مەخلوقێکی تر -زیندو بێ یان مردو- دروست نیە، تەنیا خودا هاواری دەکرێتێ، هەر ئەو صەمەدە، واتە: بۆ پێویستیو بەهانا هاتن هاواری لێ دەکریو پەنای بۆ دەبرێ، کەسی تر ناتوانێ بەهانەی لێقەوماوو داماوانەوە بێ، ناخۆشییان لەسەر لابەرێ، بەختەوەریو خۆشییان بداتێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاء الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ -النمل/٦٢﴾ واتە: جگە لەپەروەردگار کەسی تر نیە بەهانەی لێقەوماوانەوەبێ، هەر خودا شیاوی عیبادەت بۆ کردنەو دوعاو پاڕانەوەی ئاراستە دەکرێ.

حاکم لە(المستدرك) دا ریوایەتێکی هێناوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفاطیمەی کچی فەرمووە: (مایمنعك ان تسمعي ماأوصيك به؟ ان تقولي اذا اصبحتو اذا امسيت: ياحي يا قيوم برحمتك استغيث، اصلح لي شاني، ولا تكلني الى نفسي طرفة عين).

## بڕواداران‌و بەدرۆ خەرەوەکان لەئۆمەتی بانگ لێکراو بەبانگەوازی ئیسلام

﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾

﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾﴾

لەوە پێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە خەڵکێکی زۆری بۆ دۆزەخ دروست کردوە، چونکە دڵو چاوو گوێچکەی خۆیان لەکار خستوون، ئەمجار ئادەمیزادانی رێنومایی کردن بۆ شتێك کە ئیمانیان بەهێز دەکا، ئەویش یاد کردنی پەروەردگار لەروانگەی ناوە پیرۆزەکانیەوە، لێرەش دا باسی ئەوە دەکا کە ئۆمەتی موحەممەدﷺ دوو تاقمن، تاقمی هیدایەت دراو. ئەوانەی بەحەقو عەداڵەت حوکم دەکەن، تاقمی گومڕاو بەدرۆخەکەرەوەکان. ئەمجار سەرنجی ئادەمیزادانی بۆ ئەوە راکێشا، کە تێفکرینو ورد بوونەوە لەئاسمانەکانو زەوی بۆ تێگەیشتنو بەڵگە هێنانەوە لەسەر تاکو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ شتێکی واجبەو کارێکی پێویستە، کۆتایی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەوە دەهێنێ کە بەتەمای ئیمان هێنانی ئەوانە نەبێ کە بەپێی سوننەتی خودا گومڕاو سەر لێ شێواون، پەروەردگار لەزەلکاوی گومڕایی دا فەرامۆشی کردونو وازی لێ هێناون، تاکاتی دیاریکراو لەزانستی خۆی دا کە دەیانخاتە ناو دۆزەخەوەو سزایان دەدا. دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾ لەوئادەمیزادانەی ئێمە دروستمان کردون، لەناو ئەو گەلو نەتەوەی کە بەدیمان هێناون، گەلو نەتەوەیەك هەیە، کە پێك هاتووە لەچەند هۆزو خێڵو نـژادو رەگەزو نەتەوەی جیا- رێنومایی رێبازی حەق دەکەنو بەکردەوەو بەقسەو ئامۆژگاری ئادەمیزادان هەڵدەنێن بۆ پابەندبوون بەحەقو عەدالەتکاری، بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ خوداپەرستیو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی یەزدان، کردارو هەڵوێستیان حەقەو، حوکمو بڕیاریان عەداڵەتو دادپەروەرییە، لادانو ستەمکاری لەگوفتارو کرداریان دا نیە، رێبازیان یەکە، چونکە

حەق یەکەو نابێ بەدوو، ئەو گەلە هەڵوێست پەسندە کردار باشە ئۆمەتی موحەممەدە ﷺ. زۆر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەن کەمانای ئایەتەکە بەسەر گەلی ئیسلام دا دەچەسپێنن. لەو فەموودانە: ئەو فەرموودەیە، کە شەیخەین لەصەحیحەینی خۆیان دا لەموعاوییەی کوڕی ئەبو سەفیانەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاتزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق، لايضرهم من خذلهم، ولا من خالفهم حتى تقوم الساعة) لەریوایەتێکی تر دا (حتى يأتي أمر الله وهم على ذلك).

ئیبنو جەریرو ئیبنولمونذیرو ئەبو شەشەیخ لەئیبنو جورەیجەوە، پێغەمبەر ﷺ لەباسی ئایەتی ﴿وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ﴾ فەرمووی: (هذه أمتي، بالحق يحكمون ويقضون، ويأخذون ويعطون) ئەبوششەیخ ئیبنو حەییان لەعەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە فەرموودەیەکی دەرهێناوە، کە فەرموویەتی: (لتفترقنَّ هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار الا فرقة، يقول الله: وممن خلقنا أمة يهدون بالحق وبه يعدلون) تەنها هەر ئەو نەتەوەیەی کە ئەوە رەوشتو هەڵوێستیانە رزگاریان دەبێ.

بەکورتی: کە پەروەردگار لەوە پێش فەرمووی: ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾ پاشان لێرە دا هەمان رستەی دووبارە کردەوە، زوربەی راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بەو ئۆمەتە، ئۆمەتی موحەممەدە ﷺ بەڵگەش ئەو فەرمودانەن کە نوسیومانو هی تریش زۆرو زەبەندەن.

ئەمجار دوای دەستنیشانکردنی تاقمی یەکەم، باسی تاقمی دووهەم دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانەی قورئان بەدرۆ دەخەنەوە - کە قورەیشییە بێ باوەڕکانن- لەگومڕاییو سەرگەردانی خۆیان دا دەیانهێڵینەوەو، ئیستدراجیان دەکەین وازیان لێ دێنین لەگومڕاییو سەرگەردانی دا زیاتر رۆبچنو نەزانن سەرەنجامی کاریان بەچی دەگاو ئاکامیان چی دەبێ، چونکە نازانن دابو نەریتی خودا لەئاستی کێشەی نێوان حەقو بەتاڵ دا چۆنەو چۆن نیە؟ بێ ئاگان لەوەی کە هەمیشە حەقو راستی، بەتاڵو پووچ رادەماڵێو، ئەو شتەی سوودی بۆ ئادەمیزادان هەیە بەسەر شتی زیانەخرۆ دا زاڵ دەبێ! وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿بل بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ

-الأنبياء/١٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ﴾الرعد/١٧. ئیستیدراجیان دەکەین بۆ سزادان، بەجۆرێك کە بەخۆیان نازانن‌و بێ ئاگان لەوەی بۆچی وایان لێ دەکرێ، نزیك دەخرێنەوە لەو شتانەی دبنە هۆی بەهیلاك چون‌و فەوتانیان، نیعمەت‌و خۆشیان دەدرێتێ، رزق‌و رۆزییان بەسەر دا دەرژێنێ، هۆکاری ژیانیان بۆ خۆش دەکرێ، هەر کاتێ تاوانێك بکەن، کردەوەیەکی خراپ ئەنجام بدەن زیاتر ژیانی دونیایان بۆ خۆش دەکرێ، ئیتر خۆیان لەخۆ دەگۆڕێ‌و زیاتر لەزەلکاوی گومڕایی دا رۆدەچن‌و روو دەکەنە تاوان‌و تاوانکاری، چونکە تا ئەوان پێی لێ هەڵبڕن‌و درێژە بەتاوان‌و یاخی بوون بدەن زیاتر نیعمەت‌و خۆشییان بەسەر دا دەرژێ، نازانن کە ئەوە پشی پشی کردنیانە بۆ ئەوەی بەداوەکەوە ببن، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ، نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾المؤمنون/٥٥-٥٦. یان ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾الأنعام/٤٤.

موسلیم‌و بوخاری فەرموودەیەکیان لەئەبو مووسای ئەلئەشعەرییەوە گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ان الله ليملي للظالم، حتى اذا أخذه لم يفلته) پەروەردگار مۆڵەت بەستەمکار دەدا، ستەمکاری خۆی ئەنجام دەدا، هەتا کە گرتی ئیتر بەرهەڵدای ناکاو مەرەخەسی ناکا.

بێگومان مانای ئەم ئایەتەو وێنەکانی، دەربارەی کافرەکانی قورەیش هاتە دی‌و، لەسەریان جێ بەجێ بوو، ئەوە بوو لەشەڕی بەدرو خەندەق‌و فەتحی مەککەو شەڕەکانی تریشدا، ژێر کەوتن‌و، خودا پێغەمبەری خۆی بەسەر دا زاڵ کردن.

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب کاتێ گەنج‌و خەزێنەی کیسرایان بۆ بردەوە، کەوتە پاڕانەوەو لالانەوە وتی: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لەوەی کە ئەم غەنیمەت‌و دەسکەوتن‌و سەرکەوتنە ئیستدراج بێ! چونکە من بیستوومەو ئاگام لێیەتی کە دەفەرموێ: ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ ﴿وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ مۆڵەتی ئەو گرۆهە بەدرۆخەرەوانە دەدەم، تەمەنیان درێژ دەکەم، هۆکاری

ژیانیان بۆ زۆر دەکەمو، ماڵو سامانیان دەدەمێ، بەڵام بێگومان نەخشەو تەگبیری من بۆ لەناو بردنو تۆڵە لێ ستاندنیان بەهێزو تۆکمەیە!

بەکورتی نیعمەت پێ بەخشینو رزقو رۆزی پێدان نابێتە بەڵگە لەسەر راستیو راستاڵی ئادەمیزاد، بەڵکوو جاری وادەبێ ئەو نیعمەت پێ بەخشینە بۆ ئیستیدراجە، بۆ خستنە ناو داوو تەڵەومیە. ستەمکاری کە لەسەر ستەمکارییەکەی دەست لەعاست تۆڵەی لێ نەسەندرا پێویستە لەخۆی بایی نەبیو هەڵنەخەڵەتێ، چونکە وا دەبێ وازلێ هێنانەکەی بۆ ئەومیە زیاتر ملهوڕیو ستەمکاری بۆ خەڵك دەربکەوێ، بزانن چ بەد رەفتارو بەد ئەتوارێکە!! وەکوو چۆن لەم رۆژگارە دا دارو دەستەی ئاسایشو چاودێری، موراقەبەی هەڵسو کەوتی گومان لێکراوان دەکەن، تاماوەیەك چاو لەخراپە کاران دەپۆشن، پاشان کە وەختی دیاریکراو هات، راپێچی زیندانو لێکۆڵینەومیان دەکەن سزایان دەدەن.

جاوەکوو ئیبنو ئەبی حاتەمو ئەبو شەیخ، ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری لەقەتادەی کوڕی دوعامەوە دەریان هێناوە دەڵێ: بۆی باسکردین کە پێغەمبەرﷺ چووە سەر صەفاو بانگی قورەیشییەکانی کرد، یەکەیەکەو بنەماڵە بە بە بنەماڵە بانگی لێ کردن ئەی نەوەی فلان! ئەی نەوە فلتان! لەبەلاو روداوی رۆژگارو غەزەبی خودا دەیترساندن یەکێ لەقورەیشییەکان وتی: وادیارە هاوەڵی ئێوە واتە: موحەممەدشێتو نەفامە ئەم بانگە بانگوهاوار هاوارەی لەچییە؟؟ بەشەوو بەرۆژ هەتا خەریکی بانگ کردنە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِمْ مِنْ جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلاَّ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ ئایا ئەو کۆمەڵو تاقمە بەدرۆ خەرەوانەی کە ئایاتی ئێمە بەدرۆ دەخەنەوە، بیریان لەوە نەکردوەتەوە کە هەڤاڵەکەیان کە موحەممەدەﷺ هیچ جۆرە شێتیەکی لەگەڵ نیە؟! بۆ فکر لەحاڵی رابووردووناکەنەوە هەر لەسەرەتای ژیانیەوە! خۆباش ئاگاداری سەردەمەکانی پێش ئێستایینی، لەسەردەمی منداڵیو گەنجیو پیاوەتی دا باش باش دەیناسن، حەقیقەتی بانگەوازەکەشی دەزانن، بەڵگەی پێغەمبەرایەتی ئەویان لەلا ئاشکراو نومایانە، ئەو پێغەمبەری خودایە بەراستی، بانگەواز بۆ حەق دەکا،،

ئەوان ئەگەر بیر لەرابردووی بکەنەوە، خۆیان لەدەمانگیریو ئارەزۆ بازی

دوور بخەنەوە، حەقو راستییان بۆ دەردەکەوێ راستی پێغەمبەرایەتی ئەویان لەلا ئاشکراو عەیان دەبێ! دەزانن کە شاعیر نیەو، دیاردەی شێتی پێوە دیار نیەو، هیچ جۆرە شێتیو بێ ئاگاییەکی پێوە نیە،

قورئانی پیرۆز لەزۆر ئایەت دا ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە موشریکەکان پێغەمبەریان بەشێت دەزانیو ئەو حاڵەتەیان وەپاڵ دە دا وەکوو چۆن ئۆمەتەکانی تریش هەمان حاڵەتیان پاڵ پێغەمبەرەکانیان داوە. بۆیە قورئانی پیرۆز چەند جار بەدرۆی خستنەوەو پاکانەی بۆ پێغەمبەرﷺ کرد وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُون-التكوير/٢٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ أَن تَقُومُوا لِلَّـهِ مَثْنَى وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ- سبأ/٤٦﴾ یان ﴿أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ بَلْ جَاءَهُم بِالْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ- المؤمنون/٧٠﴾ یان ﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ -الحجر/٦﴾ یان ﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ -الصافات/٣٦﴾ هەموو ئایەتەکان ئەوە دەچەسپێنن کە پێغەمبەرﷺ شێت نیە، ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ بەڵکوو ترسێنەرەو ئامۆژگاری کەرە، بەئەمانەتەوە پەیامی خوای دەگەیەنیو ئەرکی سەرشانی ئەنجام دەدا، ئەو لەسزای دونیاو قیامەت دەتانترسێنێ، پێتان رادەگەیەنێ: کە ئەگەر بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەیەن تووشی سزای دونیاو قیامەت دەبن!

کە لەئایەتەکە دا وشەی ﴿بِصَاحِبِهِمْ﴾ هێناوە بۆ ئەوە هێناویەتی کە بیری قورەیشییەکان بێنێتەوە: کە ئەوان لەسەرەتای ژیانیەوە دەیناسن تا لەتەمەنی چل ساڵی تێپەڕیوە، کەوابوو ئەوان هەر ئەوەندەیان لەسەرە کە بیر لەژییاننامەی رابردووی بکەنەوە بۆ ئەوەی بزانن کە دابو نەرێتی موحەممەدﷺ درۆکردن نیە، لەوە پێش درۆی لێ نەبیسراوە، پیاو ماقوڵەکانیان بۆ خۆیان شایەتی ئەوە دەدەن کە هەرگیز موحەممەد (درووودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ کەس دا درۆی نەکردووە، ئەدی چۆن درۆ لەسەر خودا هەڵدەبەستێ، بەڵێ: ئەگەر موشریکەکانی مەککە لەشێوەی پەروەردەبوونی موحەممەد وردبوونایەوە، ئەو ئەمانەتپارێزیو راستگۆییو رەوشت جوانیەی ئەویان بهێنایەوە پێش چاوی خۆیانو ئەمجار بیریان

لەبانگەوازییەکەی بکردایەوە، کە بریتیە: لەیەکتاپەرستی‌و عیبادەتکردن بۆ خوداو، چاك کردنی حاڵەتی ئایینی‌و شارستانی‌و کۆمەڵایەتی خۆیان.. بۆیان ئاشکرا دەبوو کە ئەم هەڵس‌و کەوتو داخوازیانە لەپیاوێکی شێتەوە دەرناچن، بەڵکوو عەقڵ وانیشان دە دا بیرو فکر وای بۆ دەچێ کە ئەمە نیگای خوداییە نێردراوە بۆ سەر دڵی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندوارە. ئەمجار قورئانی پیرۆز سەرنجیان بۆ بەڵگەیەکی تر رادەکێشی‌و دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾ واتە: ئایا ئەوانە ئەو پێغەمبەرە بەدرۆ دەخەنەوە کە دەزانن ئەمین‌و راستگۆیە؟؟ سەیری جیهانی ئاسمانەکان‌و زەوی ناکەن؟؟ لەمەلەکوتی ئاسمانەکان‌و زەوی دا: بەڵگەی بەهێزو زۆرو زەبەندە هەن لەسەر هەبونی بەدیهێنەرێکی داناو بەتواناو زاناو بەئاگا. ئەگەر ئەو موشریکە بەدرۆخەرەوانە، سەیری ئایاتی ئێمە بکەن، بڕواننە مڵك‌و سەڵتەنەتی خوداو کاردروستی‌و رێك‌و پێکی لەهەموو دروستکراوێکی دا، ئەوە بەبێ شك‌و گومان ئەو سەیر کردنەیان کێشی دەکردن بۆ ئیمان هێنان بە هەبونی خودایەکی تاك‌و تەنیاو بێ هاوەڵ، دەیانزانی کە هیچ شتێ لەم بونەوەرە دا بە هەوانتە دروست نەکراوە، هەر لەذرە تامەجەرە بەڵگەن لەسەر هەبونی خودایەکی باڵا دەستو زاناو دانا.

ئەگەر ئەوانە بەوردی سەیری مەلەکوتی ئاسمانەکان‌و زەوی بکەن، دەگەنە ئەوە کە بڕوا بەراستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد بکەن. ﴿وَأَنْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ﴾ ئایا بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە لەوانەیە مردنیان نزیك بی‌و بەم زووانە دونیا بەجێ بهێڵن؟؟ با پەلە بکەن بۆ تێفکرین لەو حاڵەتەیان‌و هەوڵی وەدەست هێنانی حەق بدەن، پێش هاتنی مەرگی ناوەختو لەنکاو با بڕوا بە پێغەمبەر بکەن‌و پابەندی فەرمان‌و نەهیەکانی بن‌و بترسن لەسزای بە ئێش‌و نەبڕاوەی دۆزەخ!!

بەکورتی: لەوانەیە مەرگیان نزیك بی‌و کاتی فەوتانیان هاتبێ! دەی بەتەمای چین‌و بۆ خێرا ئیمان ناهێنن؟؟ ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ؟﴾ دەی ئەوانە ئەگەر ئیمان بەم قورئانە ناهێنن بەچ کتێبێکی تر-پاش قورئان- ئیمان دەهێنن؟ کەسێك بە قورئان موسوڵمان نەبێ کە تەواو ترین‌و بەهێزترین کتێبە، بە چی موسوڵمان

دەبێ!؟ کەسێك ئـەم قورئانـە کـاری تـێ نـەکاو، پێـی موسـوڵمان نـەبێ بەتـەمای ئەوەمەبە، بەشتی تر موسوڵمان بێ!

﴿مَنْ يُضْلِلْ اللَّهُ فَلا هَادِيَ لَهُ﴾ کەسێك خـودا گـومڕای بکـا کـەس نیـە بتـوانێ هیدایەتی بدا، واتە: پەروەردگار قورئانی کردووە بە گەورەترین هۆکاری هیدایـەت بۆ تەقواکاران، پێغەمبەریشی کردووە بە گەورە ترین پێغەمبەرو تەواو ترین عاقڵ مەندو خاوەنی جوانترین رەوشت،، جـا کەسێك ئامادەباشـی تێدانـەبێ ئیمـان بـەو قورئانە بهێنیو بڕوا بەو پێغەمبەرە بکا ئەوە خودا گومڕای کردوە، واتە: سـونەتـو دابی خودا لەدروستکردنی ئادەمیزاداوا هاتووە کە کردەوەکانی پابەندبن بـە چـەند هۆکارێك کار لێکراوی لێ پەیدابێ، جا کەسێك گومڕاییەکەی بـەگوێرەی ئـەو دابـو نەرێتو سوننەتە خوداییە بێ، دەبێ کێ -جگە لەخودا- هیدایـەتی بـدا. واتـە: هیـچ کـەس نیـە بتـوانێ ئـەو دابـو نەرێتـە بگۆڕێ. ئایەتەکە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کە هیدایەتو گومڕایی لەخوداوەن واتە: پەروەردگار بەدیهێنەری کردەوەی ئادەمیزادە، جا کردەوەکە خێر بێ یان شەڕ.. ﴿وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ واتـە: پـەروەردگار ئەو گومڕایانە لەزەلکاوی گومڕایی خۆیان دا فەرامۆش دەکـاو سـەرگەردانو سـەر لێ شێواو، رێگـای رزگـار بـوون نادۆزنـەوە لـەزەلکاوی سـەر لێ شـێواوی دا دێـنو دەچـن، هەڵبەتـە سوچـی خۆیانـەو خـەتا لـەخودی خۆیانـەو ئاکـامی بـوغرایيو سـنوور بەزێنیو ستەمکاریو ملهوڕی خۆیانە. بەکورتی مانای ئایەتەکە ئەوە نیە کە خـودا بەتۆپزی گومڕایان بکاو ناچاریان بکـا بـۆ گـومڕا بـوون، بـەڵکوو مەبەسـت ئەوەیـە، ئەوانە کە دڵیان ئاوێتەی کوفرو بێدینی بوو، زێدە ڕەوییـان لـەگومڕایی دا کـرد، تـا گەیشتنە ئەندازەی ئەوەی چاوی دڵیان کوێر ببیو رێگای هیدایـەت رەچاو نـەکـەن، وایان لێ دێ بەهیچ رۆشناییو نوورێك شارەزا نـەبنو رێگـای سـەرفرازیو هیدایـەت بەدی نەکەن!

## زانینـی هاتنـی قیامەت هەر لای پەروەردگارە

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا

بَغْتَةً يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾

لەوە پێش دەربارەی یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتیو قەضاو قەدەری خودا دوا، دوا بەدوای ئەوە باسی رۆژی دوایی کرد، ئەمجار لەئایەتی پێشوو دا کە باسی ئەجەلی ئادەمیزادی کردو فەرمووی ﴿وَأَنْ عَسَى أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ﴾ بۆ ئەوەی پەلە بکەن لەتۆبە کردنو گەڕانەوە بۆ لای خودا، دیارە کۆتایی هاتنی تەمەنی هەر ئادەمیزادێك قیامەتێکی تایبەتییە بۆی، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا، فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ﴾ بۆ رهنومایی کردنو تێفکرین لەکارو باری قیامەتی گەورەو گشتی، کە بەهاتنی ئەو رۆژە تەمەنی دونیا کۆتایی دێو، هەموو ئادەمیزادو گیانلەبەری تر -جگە لەپەروەردگار- گیانیان دەردەچیو زیندەوەر بەزیندویی نامێنێ. هەروەها بۆ رونکردنەوەی ئەوە کە زانینی کاتی هاتنی قیامەت لەخەڵك شێردراوەیەو جگە لەخودا کەس نازانێ کەی دێ!!

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئیبنو جەریری طەبەری لەقەتادەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: موشریکەکان لەبەر ئەوەی زۆر مونکیری هاتنی قیامەت بوون، وتیان: ئەگەر راست دەکەی تۆ پێغەمبەری هەواڵی قیامەتمان بەریو پێمان بڵێ: کەی دێ؟؟

هەر طەبەری لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: خەمڵی کوڕی قوشەیرو سمونەلی کوڕی زەید بەپێغەمبەریان گوت: پێمان بڵێ: قیامەت کەیە؟ ئەگەر تۆ -وەکو بۆخۆت دەڵێی- پێغەمبەری! کاتی هاتنی قیامەتمان بۆ دیاری بکە، ئێمە نازانین قیامەت چیە؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾

هەندێکیش پێیان وایە، هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە ئەوە بوو کە جولەکەکان بەپێغەمبەریان دەگوت: ئەگەر راست دەکەی تۆ پێغەمبەری؟ پێمان بڵێ: قیامەت کەی دێ؟؟

ئیبنو کەثیر، ئەوەی بەلاوە پەسەندە کەئایەتەکە دەربارەی قورەیشییەکان هاتبێتە خوارێ، چونکە ئایەتەکە مەککەییەو لەمەککە هاتۆتە خوارێ[١]، ئەوە بوو قورەیشییەکان لەروانگەی ئەوەوە کە هاتنی قیامەتیان بەلاوە زۆر دوور بوو بڕوایان بەهاتنی نەبوو دەیانگوت: کەی دێ؟! وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ -سبأ/٢٩﴾ بێگومان قیامەت غەیبییەو زانینی کاتی هاتنەکەی، خودا تایبەتی کردوە بەخۆیەوە، کەسی لەبەندەکانی لێ ئاگادار نەکردوە، بەڵام موشریکەکان پرسیار لەپێغەمبەر دەکەن دەربارەی هاتنەکەی، جا پرسیار کردنەکەیان بۆ تاقیکردنەوەیە یان پرسیاری تەعەجوبو سەرسوڕمانە، یان پرسیاری لاقرتێو گاڵتە پێکردنە ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾ ئەی موحەممەد! موشریکەکان پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی کاتی قیامەت، کەی دەبێو کەی دێ؟ کەی دەقەومێو کەی جێگیر دەبێ؟

وشەی (ارساء) واتە: ڕاوەستانو جێگیر بوونو پەیدا بوون. (مرسى): ئیسمی زەمانە واتە: کاتی ڕاوەستانی بوونەوەر. گەمیو بەلەم لەقەراغ دەریابە حەبل دەبەسترێنەوە بۆ ئەوەی لەجوڵە بکەوێو ڕاوەستێ! جا کە لێرە دا پەروەردگار وشەی (مرسا)ی بۆ قیامەت بەکارهێنا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی هەڵسانی قیامەت بریتییە لەکۆتایی هاتنی جمو جۆڵی بوونەوەرو کۆتای هاتنی تەمەنی زەوی.

﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ ئەی موحەممەد! لەوەڵامی پرسیارەکەیان دا پێیان بڵێ: زانینی کاتی هاتنی قیامەت تەنها لای خودایەو هەر ئەو دەزانێ کەی هەڵدەستێ! کەس لەبەندەکانی خودا -ئادەمیزاد، فریشتە، جندۆکە- ئاگادارییان بەسەر کاتی هاتنەکەی دا نیە، بەتەحدید کەی پەیدا دەبێ، ﴿ لا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ﴾ کەس نیە بتوانێ کە قیامەت لەکاتی دیاریکراوی خۆی دا بخاتە ڕوو بیهێنێتە ئاراوە جگە لەخودای خاوەن دەسەڵات، کەس بەوەختی هەڵسانی قیامەت نازانێ، تەنانەت فریشتەکانی نزیك بارەگای ئەقدەسو پێغەمبەرانیش هیچ زانیاریکیان لەو بوارە دا نیەو نازانن قیامەت کەی ڕادەبرێ؟! وەکوو لەشوێنێکی تر دا

---

[١] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٢/٢٧١

دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا -فصيلت/٤٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ....-لقمان/٣٤﴾ هەر یەکێ لەقیامەتی گشتیو قیامەتی تایبەتی (مەرگی ئادەمیزاد) لەو نهێنییە تایبەتیانەن کە هەر خودا خۆی کاتو ماوەیان دەزانێ کەسی تری بەسەر دا ئاگادار نەکردونو نایکا،

کە لەئایەتەکە دا فەرمووی: ﴿عِنْدَ رَبِّي﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەر شتێك تایبەت بێ بەخوداوە، مەخلوق رایەی ناکەوێ هیچی تێدا بڵێ: ئەرکی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە خەڵکی بترسێنێ لەهاتنی قیامەت نەك کاتەکەی دیاری بکات، بۆ ئەوەی کاروباری دونیا نەشێوێ! چونکە ئەگەر ئادەمیزاد بە تەحدید بزانن قیامەت کەی دێ خەڵك ئیشو کاری لێ تێك دەچیو ئاوەدانی دەشێوێ. ﴿ ثَقُلَتْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ کاتی هاتنی نادیارو نەزانراوە گرنگە لەسەر ئەهلی ئاسمانەکانو زەوی، هیچ کەسێك لەفریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەسو پێغەمبەرە خاوەن پلەو پایەکانیش نازانن کەی پەیدا دەبیو دێتە ئاراوە، هەر شتێکیش نەزانراوبێ لەسەر دڵو دەروون قورسو گرانە.

یان دەگوترێ: هاتنەکەی لەسەر ئەهلی ئاسمانەکانو زەوی گەورەو بەسامو هەیبەتە، نازانن کەی غافڵ گیریان دەکاو پەیدا دەبێ، هەموو کاتێ تەوەقوعی هاتنی دەکەنو ترس تەنگو چەڵەمەی ئەو رۆژەیان هەیە.ئیبنو عەبباس فەرموویەتی هەموو کەس زیانی رۆژی قیامەتی تووش دێ.

﴿ لا تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً﴾ پەروەردگار وای بڕیار داوە کە قیامەت بەناگەهانیو غافڵ گیر نەبێ نەیە، لەکاتێك دا پەیدا دەبێ ئادەمیزادان سەرگەرمی کاروباری رۆژانەیان بن، هەوڵی جێ بەجێ کردنو دابین کردنی پێویستیاتی رۆژانەی خۆیان بن، هەوڵی جێ بەجێ کردنو دابین کردنی پێویستیاتی رۆژانەی خۆیان بن! بوخاریو موسلیم حەدیثێکیان لەئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە پوختەی ماناکەی ئەوەیە: کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: قیامەت هەڵناسێ هەتا خۆر لەخۆرئاواوە هەڵنەیە، کە خۆر بەو جۆرە هەڵاتو خەڵکی بینیان هەموو ئیمان دەهێنن، ئەوە کاتێکە، هیچ کەسێك ئیمان هێنانەکەی سودی نابێ کە لەوەپێش موسوڵمان نەبووبێ، یان لەئیمان هێنانەکەی خێری نەدیبێ! سوێندبێ قیامەت وارا دەبیو

وەنـدە لـەنکاو پەیـدادەبیّ دوو پیـاو پارچـە قوماشـێك لێـك دەکەنـەوە بـۆ کـڕینو فرۆشتن ناگەن مامەڵەکەیان بکەنو بیپێچنەوە، سوێند بێ! قیامـەت رادەبیّ، کـابرا جامێکی شیر لەمەڕەکەی دۆشیوە بۆ خواردنەوە ناگا چێژی بکا!

سوێند بیّ قیامەت رادەبیّ، پیاو خەریکی سواخدانی ئەستێراوە، ناگا ئـاوی لیّ دەربێنیّ، قیامەت رادەبیّ کابرا پاروە نانی بەرز کردۆتەوە بۆ دەمی ناگا بیخوا!

﴿ يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا﴾ ئەی پێغەمبەر! پرسـیارت لیّ دەکـەن دەربـارەی قیامەت چۆنەو چۆن نیە وەکوو ئەوە زۆر گرنگیت پێ دابیو بزانـی کـەی دیو زۆر پرسیارو سوراخت لیّ کردبیّ، یان زۆر لێی ئاگاداریو دەیزانی، ﴿ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْـدَ اللَّهِ﴾ پێیان بڵیّ: من هیچ دەربارەی کاتی هاتنی قیامـەت نـازانم، زانیـاری ئـەوە لای پەروەردگارە، هـەر ئـەو نهێنـی ئاسمانـەکانو زەوی دەزانـیّ. هـەر ئـەو لەنەبوونـەوە بەدیهێناونو هەر ئەو دەتوانیّ وێرانیان بکـا، هـەر ئـەو دەزانـیّ کـەی کۆتـایی دونیـا دیّ! دووبارە بوونەوەی وەلام ﴿عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ﴾ پاش دووبارە بوونەوەی پرسیار، بۆ زێـدە موبالەغـەو جـەخت کردنـە کـە زانیـاری، دەربـارەی کـاتی هـاتنی قیامـەتو چۆنیەتی هاتنەکەی تەنها لای خودایەو بەس!

ئیبنو عـەبباس رسـتەی ﴿حَفِيٌّ عَنْهَـا﴾ی وا راڤـە کـردوە دەفـەرمویّ: وەکـوو ئـەوە، تـۆ دڵخـۆش بـیّ بەپرسـیارەکەیان، وەکـوو ئـەوە لـەنێوان ئـەتۆو ئـەوان دا خزمایـەتی هـەبیّ، دۆسـتایەتی هـەبیّ لـەنێوان تـۆو ئـەواندا، چـونکە کافرەکـان بەپێغەمبـەریان دەگـوت: لـەنێوان ئێمـەو تـۆ دا خزمایـەتی هەیـە، دەکـاتی هـاتنی قیامەتمان پیّ بڵیّ:

﴿وَلَكِـنَّ أَكْثَـرَ النَّـاسِ لا يَعْلَمُـونَ﴾ واتـە: زانینـی کـاتی هـاتنی قیامـەت لای خودایەو بەس! بـەلام زوربـەی ئـەو ئادەمیزادانـە ئـەوە نـازانن کـە هـەر خـودا بـەو نهێنییە دەزانیو هەر ئەو تایبەتـە بـەو زانینـە، زوربـەیان نهێنـیو حیکمـەتی ئـەو تایبەتمەندییە نازانن، دابـو نـەرێتی پرسـیار کـردن نـازانن. تـەنها کـەمێکیان ئـەوە دەزانن: کە زانینی کاتی هـاتنی قیامـەت تایبەتـە بەپـەروەردگارەوە، ئەوانـەش ئـەو کەسانەن کە بڕوایان بەقورئان هێنـاوە لەپێغەمبـەرەوە فێـری ئـەو ئـەدەبـو زانینـە بوون.

موسـلیمو بوخـاری حـەدیثیکیـان ریوایــەت کـردوە لەحــەزرەتی عومــەری خەتتابەوە، دەفەرموێ: کاتێك جوبرائیـل پرسیاری لەپێغەمبـەرﷺ کـرد دەربـارەی کاتی هاتنی قیامەت، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (ماالمسؤول عنها بـأعلم مـن الـسائل) واتە: منو تۆ وەکوو یەك واین لە نەزانینی کاتی هاتنی قیامەتو هیچی لێ نازانین. (پرسـیار لێکـراو لەپرسـیارکەر زانـا تـر نیـە)، بـەلاّم پێغەمبـەرﷺ هـەواڵی نزیکبوونەوەی هاتنی رۆژی قیامەتی داوە. لەحـەدیثیـك دا کە تیرمیـذی ریوایـەتی کـردوەو بەصـەحیحی دانـاوە، هـاتووە کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (بعثـت أنـا والساعة کهاتین) ئەمەی فەرموو: پەنجەی شایەتمانو پەنجەی پەنای جووت کـردن. جا وەنەبێ هەر کاتێ هاتنی قیامـەت لـەئادەمیزادان نهێنـی بێ، بـەڵکوو غەیبـەکان هەموو هەر خودا دەیانزانێ، زانینی غەیب تایبەتە بەخوداوەو کەسی تـری بەسـەر دا ئاگـادار ناکـا مەگـەر بـۆ کەسـانێك بیـەوێ بەشـێك لـەو غەیبـە بـزانن. ئـەویش لەکاتێکی تایبەتیداو بەئەندازەیەکی دیاریکراو لەلای خۆی. هەر بۆیـە ئـادەمیزادان دارای ئەوە نین، بزانن: فلاّن کار سوودی هەیـە بۆیـان، یـان زیـانی هەیـە، جـاری وا هەیـە کارێـك دەکـەن بەخـەیاڵی خۆیـان سـوودی لێ وەردەگـرن، کەچـی ئاکامەکـەی زیانبەخش دەبێ، وادەبێ کارێك دەکەن پێیـان ناخۆشـە، کەچی سـەرەنجامی خێـرو خۆشییە، بۆیە لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ تەنانـەت پێغەمبـەرﷺ لەگـەڵ ئـەو پلـەو مەقامـەی لای خـودا هەیـەتی، فـەرمانی پـێ کـراوە کـە لەبەرامبـەر خـەڵك دا ئـەوە رابگەیەنێ کە لەئاستی غەیب دا ئادەمیزادێکە لـەئادەمیزادان، دارایـی ئـەوەی نیـە - بەبێ ویستی خودا- سوودو زیانی داهاتوو بۆ خۆی دیاری بکا، چونکە بەسەر غـەیب دا ئاگـادار نیـە، پـێش وەخـت، ئاکـامو سـەرەنجامی روداوو کارەکـانی نـازانێ، واتـە: نـاتوانێ بەراسـتیو بەتەحدیـد سـەرەنجامی کـار بزانـێ؛ بـەم جـۆرە بڵـێ ئـەم کـارە کامەی خێرە دەیکەمو ئەو ئیشە ئاکامەکەی خراپە نایکەم!! وەکوو لەم سەرەباسەی داهاتوو دا بەدرێژی لەم بارەوە دەدوێین..

## هەموو شتێك بەدەست خودایە، عیلمی غەیب تایبەتە بە پەروەردگارەوە

﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾﴾

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە: ریوایەت کراوە کە دانیشتوانی مەککە وتیان: ئەی موحەممەد! ئەرێ خودای تۆ هەواڵی هەرزانیو گرانیت ناداتێ؟ هەتا کاڵا بکرینو قازانج بکەین، پێت ناڵێ چ زەوییەك بێ بەرەکەتە تالیی بگوێزینەوە بۆ شوێنی بەپیتو بەرەکەت!!؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

پەیوەندی نێوان ئەم ئایەتەوە ئایەتی پێشوو ئەوەیە: کە پەروەردگار لەئایەتی پێشوو دا هەواڵی ئەوەی راگەیاند کە جگە لەخۆی کەسی تر نازانێ کەی قیامەت رادەبرێ، ئەمجار لێرە دا فەرمانی بەپێغەمبەر کرد ئەوە بۆ خەڵکی روون بکاتەوە: کە هەموو شتێك بەدەست خودایە، زانیاری غەیب هەمووی لای خۆیەتیو بەدەست خودایە، زانیاری غەیب هەمووی لای خۆیەتیو تایبەتە بەزاتی خۆیەوە. وە ئەو پێغەمبەرە، ترسێنەرو مژدەدەرە، لافی زانینی غەیب لێ ناداو هیچ لەبارەی عیلمی غەیبەوە نازانێ، فەرمانی پێ کرد کە روبەڕوی ئەو خەڵکە ئەم حەقیقەتە ئیعلان بکاو رایبگەیەنیو پێی فەرموو: ﴿قُلْ لا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلا ضَرّاً إِلاّ مَا شَاءَ اللَّهُ﴾ ئەی موحەممەد! بەگرۆهی ئادەمیزاد بڵێ: من نەبۆ خۆمو نەبۆ غەیری خۆم دەسەڵاتی ئەوەم نیە خێرو خۆشی، سوودو قازانج بۆ خۆم بێنم یان زیانو ناخۆشی لەخۆم دوور بخەمەوە، مەگەر خودا مەیلی لێ بێو بیەوێ لەم بارەوە شتێکم بخاتە دڵەوەو تۆفیقم بدا بۆ ئەنجامدانی، هەروا لەخۆمەوە هیچ شتێکی پەنامەکی نازانمو ئاگاداری روداوەکانی داهاتوو نیم، مەگەر خودا بەتواناو ویستی خۆی شتێکم تێ بگەیەنیو نیشانم بدا.

بێگومان موسوڵمانەکان -بەتایبەتی تازە موسوڵمانبوەکان- پێیان وابوو: پلەو

پایەی پێغەمبەرێتی داخوازی ئەوەیە ئاگاداری شتە پەنامەکییەکان بێ‌و، دەزانێ قیامەت کەی رادەبێ، هەروەها دەتوانێ خێر بۆ خۆی‌و کەسانی تر کێش بکاو، زیان لەخۆی‌و کەسانی دیکە دوور بخاتەوە. ئیتر پەروەردگار فەرمانی پێ کرد: کە بۆ خەڵکی روون بکاتەوە: کە پلەو پایەی پێغەمبەرێتی داخوازی ئەو شتانە نیە، ئەرکی پێغەمبەرێتی راگەیاندنی پەیامی خودایە کە بۆی نێردراوەو، فێرکردنو ئامۆژگاریکردنو شارەزایی کردنی ئادەمیزادانە بۆ ئەوەی پابەندی پەیامی ئیسلام ببن. لەوە بەولاوە پێغەمبەرﷺ وەکوو ئادەمیزادانی تر وایە: چ لەزانیاری غەیب نازانێ، مەگەر خودا شتێکی لەو بارەوە فێر بکا! وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ...﴾الكهف/١١٠.

بەمەش پێغەمبەرﷺ بەندایەتی خۆی رادەگەیەنی‌و تەبەڕڕا دەکا لەوەی کە لافی زانینی عیلمی غەیب لێ بدا!! دەفەرموێ: من شتی پەنامەکی نازانمو ئاگاداریم بەسەر غەیب دا نیە ﴿وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاسْتَكْثَرْتُ مِنْ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ﴾ ئەگەر من بەقامێ خۆم شتی پەنامەکیم بزانیایەو بمزانیایە چ شتێك بۆم بەسوودە، چ شتێ زیانم پێ دەگەیەنێ زۆر شتی بەسوودم بۆ خۆم پەیدا دەکردو هەرگیز زیانم پێ نەدەگەیی! واتە: پێش وەخت خۆم لەو شتانە دەپاراست کە شەڕو زیانیان لێ دەکەوێتەوە، کەچی ئەوەتا: وانیەو گەلێ شتی بەسوودم لەکیس دەچێ‌و، زۆر جار زیانم پێ دەگاو تووشی تەنگو چەڵەمە دەبم!

ئەمجار پاساوی نەبوونی جوداوازی خۆی لەئادەمیزادانی تر دەداتەوەو نەتوانایی خۆی بۆ کێش کردنی خێر بۆ خۆی‌و دوور خستنەوەی زیان دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ من هیچ زێدە تواناو ئیمتیازێکم لەئادەمیزادانی تر نیە، مەگەر ئەوەندە نەبێ کە من ئادەمیزادێکم ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌و راگەیاندنم خراوەتە ئەستۆو ترسێنەرو موژدەدەرم بۆ ئەو گرۆهانەی ئیمانیان پێم هێناوەو باوەڕم پێ دەکەن.

من بەندەیەکم کراوم بەپێغەمبەرو لەخوداوە رەوانە کراوم: بۆ ئەوەی ئادەمیزادانی خراپەکار بترسێنم لەسزای دۆزەخو مژدەی بەهەشت بدەم بەموسوڵمانان!!

بەکورتی پوختی پێغەمبەرانﷺ بەندەی ڕێزداری پەروەردگارن، هاوبەشی خودا ناکەن نەلەصیفات دا نەلەکردەوەدا، هیچ تواناو دەسەڵاتو زەختێکیان بەسەر خوداوە نیە، ناتوانن هیچ کاریگەرییەك لەزانیاریو نەخشەی خودا دا بکەن، ئەوەندە هەیە خودا ڕێزی داونێ بەوە کە نیگای بۆ کردونو هەڵیبژاردوون بۆ پێغەمبەرایەتیو گەیاندنی پەیامەکەی؛ کردونی بەرابەرو پێشەوا بۆ ئادەمیزادان بۆ پابەند بوونو کارکردن بەپەیامەکەی کە لەخوداوە هێناویانە بۆ ئادەمیزادان.

باشترین بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ غەیب زان نیە، ئەوەیە: دەڵێین: ئەگەر پێغەمبەر پەنامەکی بزانیایە، خێرو خۆشی دونیای بۆ خۆی کێش دەکرد ماڵو سامانی زۆری بۆ خۆی دابین دەکرد، مەجدو ڕێزی فەرمانرەوایی و سەرکەوتنی جەنگیو قازانجو سوودی زۆری بۆ خۆی دەستەبەر دەکرد، زۆر نەخۆشیو تەنگو چەڵەمەی لەخۆی دوور دەخستەوە، نەیدەهێشت هەژاریو نەخۆشیو برینداریو تێشکاندنو خزم کوژرانو خۆشەویست مردنو لەدەستدانی خزمو کەسو کاری تووش ببێ. دەیتوانی جیاوازی نێوان ئەوانە بکا کە بەپیر بانگەوازییەکەیەوە دێنو ئەوانەی بەپیر بانگەوازی حەقەوە نایەن.

## یادکردنەوەی پەیدابوونی ئادەمیزادو فەرمان بە یەکتاپەرستیو شوێنکەوتنی قورئان

﴿ ۞ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشْرِكُونَ

مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾

ناوەرۆكی ئەم ئایەتانە دووبارە كردنەوەی ئەو مەبەستانەیە كە لەسەرەتای ئەم سورتە دا چەسپاندنی.....

ئەوەبوو سورەتەكە بەباسی یەكتاپەرستیو شوێنكەوتنی قورئان دەست پێكراو بەباسی یەكتاپەرستیو شوێنكەوتنی قورئانو چۆنیەتی پەیدا بوونی ئادەمیزاد لەیەكەم جار دا كۆتایی پێ دەهێندرێ، ئەمەش بۆ ئەوەی بڕوا بەهەبوونی خوداو تاكو تەنیایی ئەو زاتە زیاتر لەدڵو دەروونی ئادەمیزادان دا خۆ دابكوتێو دوور بكەونەوە لەشیركو، خۆپارێزن لەوەسوەسەو ختوكەی شەیتان. فەرمووی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾ پەروەردگار خودایەكی وەهایە نێوەی لەبنەڕت دا لەتاكە نەفسێك دروست كردوە، زۆربەی ڕاڤەكەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بەو تاكە نەفسە حەزرەتی ئادەمە. پاشان هەر لەو نەفسە یان لەگروپی ئەو نەفسە حەوای هاوسەری بۆ دروست كردوەو لەگەڵ ئادەم دا بوون بەجوتێكی نێرو مێ تا لەگەڵ یەكتر دا ئارام بگرنو پێكەوە ژیان بەسەربەرن. ئەمجار ئادەمیزادیان لێ كەوتەوە، وەكوو لەشوێنێكی تر دا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا -الحجرات/١٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء -النساء/١﴾

بڕێ لەراڤەكەران دەڵێن: ﴿خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ واتە: لەیەك رەگەزو لەیەك سروشت دروستی كردون. خێزانو هاوسەریشی بۆ ئەو نەفسە هەر لەو رەگەزە بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی ئارامی لەگەڵا بگریو ئاوێتەی یەكتر ببن. كەوابوو ئادەمیزاد لەسروشتو پەیدابوونیا لەیەك رەگەز دروست كراون هەر چەندە ئەركەكانیان جیاوازی هەیە لەنێوان نێرو مێ دا، ئەم جیاوازییەش بۆ ئەوەیە: نێر

لەتەك مێ دا ئارام بگرێو ئیستیراحەت بكا.

خوێنەری هێژا! ئەمەیە تێڕوانینی ئیسلام بۆ حەقیقەتی ئادەمیزاد، بۆ ئەركی نێرینەو مێینەیی‌و چۆنیەتی دروست بوونیان، بەراستی تێڕوانینێكی واقیعیانەو راستگۆیانەیە تێڕوانینێكی تەواوو كامڵە، پێش چواردە سەدەو ئەوەندە ساڵەیە، ئەم ئیسلامە هێناویەتی، لەچ رۆژگارێكدا؟ لەسەردەمێكدا، ئایینە شێواوەكان ئافرەتیان بەبنەمای بەڵاو موسیبەت دادەنا بۆ كۆمەڵگای ئادەمیزاد پێیان وابوو: ئافرەت بناغەی نەفرین‌و داوو كەپكی گومڕاییە، بەپیس‌و قێز لێكراویان دادەنا، یان بەلانی كەمەوە بەكاڵایەكی بێ بایەخ‌و كەم نرخیان دەزانی، یان دەیانگوت: كارەكەرو خزمەتچی پیاوە، چ حیسابێكی ئادەمیزادی بۆ ناكرێ!!

كە لێرە دا دەفەرموێ: ﴿لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾ لەسورەتی (الروم)یش دا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً -الروم/٢١﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە كە ئادەمیزاد -بەنێرو مێیەوە- هەر كاتێ گەیشتنە تەمەنی ژیانی (ژن‌و مێردایەتی) خولیایەك دەكەوێتە سەریەوە، نائارامییەك روی تێ دەكا، ئەو خولیاو نائارامییە لاناچێ تا نەبێتەهاوسەری یەكێكی تر لەرەگەزی خۆی‌و، خێزانێك پێكەوە نەنێن، ئەم حەزی بەیەكگەیشتن‌و ئاوێتە بوون‌و هاوسەریكردنە، لەناخی هەریەكێ لەپیاوو ئافرەت دا خۆی داكوتاوە، لەناخەوە دەینەهژێنێ، لەسەردەمی گەنجی دا دەروونی هەریەكێ لەكوڕو كچ ئارام ناگرێ، تابەتاكەی ترەوە جووت نەبێ‌و تێكەڵاو یەكتر نەبن! هیچ خۆشەویستیەك ناگاتە خۆشەویستی نێوان ژن‌و مێرد، هەموو رەگەزێك بەپێی سروشتی تایبەتی خۆی حەزی لەنزیكبوونەوەو ئاوێتە بوون هەیە لەگەڵ هاو رەگەزی خۆیدا، هاریكاری لەسەر بەسەر بردنی ژیان‌و پەرەپێدانی پێویستی بەهاوسەریەتی شەرعی هەیە، هەروەكوو چۆن مانەوەی رەگەزی ئادەمیزاد لەسەر زەوی پابەندە بەبەرقەرار بوونی ئەم پەیوەندییە جنسییە لەنێوان نێرینەو مێینەدا،

ئەمجار پەروەردگار باسی بەروبوومی هاوسەریەتی‌و بەیەك گەیشتنی ژن‌و پیاو دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفاً﴾ واتە: كاتێك رەگەزە نێرینەكە سواری رەگەزە مێیەكە بوو، كاری جینسی‌و سەرجێییان ئەنجامداو ئاویان

تێکەڵاو بوو، کۆرپەلە لەناو منداڵدانی ئافرەتەکە دا دروست بوو، سکی بوو، ئەم سک بوونەی لەسەرەتا دا سووکو بێ ئەرکە، لەوانەیە هەستی پێ نەکاو بەخۆی نەزانێ، مەگەر بەوە بزانێ سکی هەیە کە عادەتی مانگانەی نامێنێ. ئەم کۆرپەلە سەرەتا دڵۆپە ئاوەو دوایی دەبێ بەخوێنپارەو ئەمجار دەبێتە گۆشتپارە....

﴿فَمَرَّتْ بِهِ﴾ بەم جۆرە ئافرەتەکە لەگەڵ حەملەکەی دا کات بەسەر دەباو ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دەداو، بەبێ ئەوەی هەست بەماندو بوون بکا، کاروباری خۆی بەڕێوە دەبا!!

﴿فَلَمَّا أَثْقَلَتْ﴾ جاکە ئافرەتەکە قورس بوو سکەکەی گەورە بوو، کاتی منداڵبوونی نزیك بوەوە ﴿دَعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا﴾ هەردوك ژنو مێردەکە لەخودای خۆیان پاڕانەوەو هانایان بۆ بردو سوێندیان خوارد: ﴿لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾ وتیان: پەروەردگارا! ئەگەر منداڵێکی صالحو باشمان بدەیتێ رێكو پێكو تەواو بێ ئێمە بەکردارو گوفتارو بیروباوەڕەوە سوپاسی نیعمەتو میهرەبانیت دەکەین! ﴿فَلَمَّا آتَاهُمَا صَالِحاً جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا﴾ جاکە پەروەردگار ئاواتەکەی هێنانە دیو داواکەیانی بۆ جێ بەجێ کردن، منداڵێکی صالحو ئەندام تەواووجەستە ساغی پێدان، ئەو ژنو مێردە هاوەڵو شەریکیان بۆ خودا بڕیار دا، گومانی ئەوەیان برد کە جگە لەخودا هۆی تر هەیە بۆ پەیدابوونی منداڵەکەیان. ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خودا پاكو بەرزو دوورە لەوەی هاوەڵی هەبێ، مونەززەهە لەوەی کەسانی تر هەبن یارمەتیدەری بنو، هاوبەشی بکەن لەکارەکانیدا!!

هەندێ لەموفەسسرین، وێنەی شێخی سیوطی دەڵێن: ئەم هەڵوێستە پاڵ ئادەمو حەوا دراوەو مەبەست نەوەکانیانە. حەسەنی بەصری دەڵێ: مەبەستیش بەنەوەی ئادەمو حەوا هەندێکیان کە جولەکەو گاورەکانن، خودا منداڵی پێ بەخشین کردیانن بەجولەکەو مەسیحی. ئەمجار ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئێمە بەگوێرەی ئەم رایەی حەسەنی بەصری کە باشترین تەفسیرە بۆ ئایەتەکەو ئەوە دەگەیەنێ کە مەبەست بەسیاقی ئایەتەکە ئادەمو حەوا نیە، بەڵکوو مەبەست نەوەو وەچە هاوبەش پەیدا کەرەکانیانن بۆیە دوا بەدوا ئەوە فەرمووی: ﴿فَتَعَالَى

اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ بەشێوە جەمع هێنایو لەبارەی تەثنییە لایدا، واتە: ئادەم حەوای بۆ ئەوە باس کردن بیانکاتە پێشەکیو ڕێخۆشکەرەو پرد بۆ ئەوانەی دوا ئەوانن کە نەوەکانیانن. واتە: ذیکری شەخصەو مەبەست جیسنە. وەکوو ئەوە کە لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِّلشَّيَاطِينِ -الملك/٥﴾ ئاشکراشە ئەو مەصابیحانەی ئاسمانیان جوان کردوە ئەو تیرئەستێرانە نین کە بۆ شەیاتینیان دەهاوێژنو ئەوانیان پێ ڕەجم دەکرێن!! بەڵکوو ئەمە جۆرە ئوسلوبێکی قورئانە، بەمەجاز لەشەخصی مەصابیحەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ جینسەکەیان[١٢].

بەکورتی شەریك دانانەکە کە پاڵ ئادەمو حەوا دراوە، وەلێ مەبەستەکە نەوە کافرەکانیانن وەکوو جولەکەو گاورو بتپەرستەکان، چونکە ئادەمو حەوا هەرگیز شەریکیان بۆ خودا بەرەوا نەزانیوە.

زومەخشەری دەفەرموێ: (کەلام لەحەزفی موضافە) واتە: ڕستەی ﴿جعلا لە شرکاء﴾ بەم جۆرە بوە ﴿جعل أولادهما له شركاء﴾ وشەی (أولادهما) کەموضافە حەزف کراوەو موضاو ئیلەیهی لەشوێنی دانراوە. هەروەها ڕستەی (فیما آتاهما) بەم جۆرە بووە ﴿فيما آتى أولادهما﴾..... ئەوەی کە پاڵپشتی ئەم بۆچونەی زومەخشەری دەکا، ڕستەی دوایە کە دەفەرموێ: ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ضەمیرەکەی بەجەمع هێنا، نافەرموێ: ﴿عما يشركان﴾ کەوابوو ئادەمو حەوا لەهاوەڵدانان بۆ خودا دوورن، مانای ئەوە: کە نەوەکانی ئادەمو حەوا، شتی تریان کرد بەشەریکی خودا، ئەوەیە: کە هاتن لەجیاتی ئەوەی کە خودا منداڵی پێدان، ناوی (عبدالله - عبدالرحمن - عبدالرحیم) یان لێ بنێن، ناویان نان (عبدالعزی - عبدالمناة - عبدالشمس) هەڵبەتە ڕیوایەتی جۆراو جۆر هەن ئەم ڕوداوەو شەریك دانانە وەکوو حەقیقەتێك پاڵ ئادەمو حەوا منداڵی شێواوو ناکامڵیان دەبوون، شەیتان هات حەوای هەڵخەڵەتاندو پێی گوت: ئەوەی لەسکت دایە ناوی لێبنێ

[١٢] تەفسیری مەنار ج٩/٥٢٤-٥٢٥

تەفسیری ئیبنو کەثیر٢/٢٧٥

(عبدالحارث) الحارث ناوێكى شەيتان خۆيەتى- بۆ ئەوەى منداڵەكەت رێكو پێكو كامڵ لەدايك ببێ، حەواش بەگوێى كردو ئادەميشى هەڵخەڵەتاند............

مامۆستا سەييد كە ئەم ريوايەتە دێنێ، دەفەرموێ: ظاهيرى ئەم جۆرە ريوايەتانە مۆركى ئيسرائيلييان پێوە ديارە، چونكە هەموو كاتێ تەصەوورى ئيسرائيلىو مەسيحى -وەكو چۆن ئايينى خۆيان شێواندوە- تاوانى گومڕاىيەكە دەخاتە ئەستوى حەوا، ئەمەش سەد دەرسەد پێچەوانەى تەصەورى ئيسلامييە!

ئەمجار دەفەرموێ: ئێمە بۆ تەفسير كردنى ئەم دەقە پێويستيمان بەريواياتى ئيسرائيلى نيە، دەقەكە جۆرو شێوە لادانەكانى نەفسى ئادەميزاد وێنە دەگرىو قوناغەكانى ديارى دەكا......

بێگومان موشريكەكان لەسەردەمى پێغەمبەروﷺ پێشتريش هەندێ لەكوڕەكانى خۆيان نەذر دەكردن بۆ خواكانيان، يان تەرخانيان دەكردن بۆ خزمەتكردنى پەرستگاى بتەكانيان، بەخەياڵى خۆيان بەمە، لەخودا نزيك دەبنەوە هەرچەندە لەسەرەتاوە مەبەستيان بۆ خودا بوو، بەڵام پاش ئەوەى كە لەقەڵاى يەكتاپەرستى هەڵكەندرانو بوونە بتپەرست، دەستيان كرد بەنەزر كردنى كوڕەكانيان بۆ بتەكانيان بەهيواى ئەوە ئەو بتانە رۆڵەكانيان لەبەڵاو تەنگانە بپارێزنو، لەشساغو تەمەن درێژ بن! هەر وەكوو چۆن ئەمڕۆ كەسانێك هەن بەشێك لەجەستەى منداڵەكانيان دەكەنە قوربانى بۆ فلان گۆڕو فلان شێخ، وەكوو ئەوە: مووى سەرى منداڵەكانيان دەهێڵنەوە نايتاشن تانەچنە سەر گۆڕى پياو چاكێك ئەمجار لەوێ يەكەم جار قژەكانيان دەتاشن، كورتيان دەكەنەوە، يان هەيە: منداڵەكەى خەتەنە ناكا تانەچێتە سەر گۆڕى پياو چاكێكو لەوێ خەتەنەى دەكا. جاهەر چەندە ئەمڕۆ خەڵك ئيعتراف بەتاكو تەنهايى خودا دەكەن. بەڵام وێڕاى ئەو ئيعتراف كردنە ئەم هەڵسو كەوتە شيرك ئامێزانەش دەكەن.

بڕێ لەموفەسسرين دەڵێن: خيطابى ئايەتەكە لەگەڵ ئەو قورەيشييانەى سەردەمى پێغەمبەرەﷺ كە بريتين لەبەرەبابى (قصي)و خێزانەكەى كە هەردووكيان قورەيشى بوون داوايان لەخودا كرد كوڕى باشيان پێ بدا، كاتێ خودا كوڕەكانى پێدان، لەجياتى ئەوە ناويان بنێن (عبدالله - عبدالرحمن - عبدالرحيم)

ناویان نان (عبدالمناف ـ عبدالعزی ـ عبدالقصي ـ عبداللآت)

ئـەمجار پـەروەردگار بیروبۆچـوونی موشـریکەکانی پووچـەڵ دەکاتـەوەو، دەفەرموێ: ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لاَ يَخْلُقُ شَيْئاً﴾؟ ئایا شتێك دەكەن بەشەریكو هاوشانی خـودا كـە لەراسـتی دا نـاتوانێ هـیچ شـتێك بـەدی بێنـێ؟ پەرسـتراوێك دەكـەن بەشەریکی خودا کە هـیچ دروسـت ناكاو نـاتوانێ دروستی بكا! ﴿وَهُـمْ يُخْلَقُـونَ﴾ بەڵكوو ئەو بتانە خۆیان دروستکراونو تاشـراون. نـەك هـەر ئەوەنـدە بـەڵكوو هـەر پەروەردگار بەدیهێنەرە بۆخۆیـانو بـۆ منداڵەكانیـشیانو بـۆ هـەموو موخلوقـاتێكی تـریش.

﴿وَلاَ يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلاَ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ﴾ ئـەو بتانـە دەسـەڵاتو توانـای ئـەوەیان نیـە یارمـەتی ئەوانـە بـدەن كـە عیبادەتیـان بـۆ دەكـەن، هـەر كـاتێ ئـەو بتپەرستانە بەڵایـەك روی تـێ كـردن یـەكێك دەسـتدرێژی كردنـە سـەر بتـەكانیان ناتوانن هیچ بەرگریەكیان لێ بكەن، نەك هەر ئەوە بەڵكوو ئەگـەر دەسـتدرێژییەكە بكرێتە سـەر خـودی بتـەكان خۆشـیان، نـاتوانن بـەرگری لـەخۆیان بكـەن، یارمـەتی خودی خۆشیان پێ نادرێ! وەكوو لەشوێنێكی تر دا دەفەرموێ: ﴿........ إِنَّ الَّـذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُـوا ذُبَابـاً وَلَـوِ اجْتَمَعُـوا لَـهُ وَإِن يَـسْلُبْهُمُ الـذُّبَابُ شَـيْئاً لَّـا يَـسْتَنقِذُوهُ مِنْـهُ ضَـعُفَ الطَّالِـبُ وَالْمَطْلُـوبُ﴾الحج/٧٣. ئەمـە هـەموو نارەزامەنـدی دەربڕینە، لەلایەن خوداوە بەرامبەر ئەو موشریكانەی لەتـەك پـەروەردگار دا شـتی تر دەپەرسـتن، هـەموو بتپەرسـتێك دەگرێتـەوە، موشـریكەكانی قـورەیشو غـەیری قورەیـشیش دەگرێتـەوە ئەوانـەی هاوچـەرخی هاتنـە خـوارەوەی قورئـان بـوون سەرزەنـشت كردنیانـە بـەوە كـە ئـەوان شـتێك دەپەرسـتن كـە توانـاو دەسـەڵاتیان پێچەوانەی ئەو هومێدو هیوایەیانە كە پێیانن. ئەوانـە شـتێك دەپەرسـتن هیچیان بەدەسـت نیـە، نـەزیان دەگەیـەنن نەسـوود، نەدەبیـستن نـەدەبینن، هـیچ یارمەتیدانێكیان لەدەست نایە بۆ عیبادەتكەرەكانیان، بەڵكوو ئـەو پەرسـتراوانە بـێ گیـانو بـێ جـمو جـۆڵن، عیبادەتكـەرەكانیان لـەخۆیان تـەواو تـرن، چـونكە ئـەوان گیاندارن، دەبیسن دەبینن، ئاخاوتن دەكەن، هەڵمەت دەبەن.

ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە بـاس دەكـاو ئـەوە دەچەسـپێنێ كـە ئـەو بتانـە

بەکەڵکی ئەوە نایەن ببنە شوێنکەوتوو، چجایی ببنە رابەرو خوداو، ئێوە شوێنیان بکەون! دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَى لاَ يَتَّبِعُوكُمْ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە بانگەوازیی خۆتان ئاڕاستەی ئەو بتانە بکەن بۆ رێگەی هیدایەتو خوداپەرستی، یان ئەگەر داوایان لێ بکەن شارەزاتان بکەن: بۆ شتێك کە مەبەستانە، وەڵامتان نادەنەوە، سودتان پێ ناگەیەنن، ئەوانە لەهەردوو حاڵەتەکە دا سوودتان پێ ناگەیەنن، ئەگەر داوایان لێ بکەن -وەکو داوا لەخودا دەکەن- بۆ خێرو هیدایەت، ئەوە بێگومان ناتانگەیەننە مەبەستو داواکەتان بۆ جێ بەجێ ناکەن! ئەگەر داوایان لێ بکەن بەڵایەکتان لەسەر لابەرنو بەهاناتانەوە بێن ئەوە هیچیان پێ ناکرێو بە هاناتانەوە نایەن! وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾لاعراف /١٩٤.

ئەمجار بێ کەڵکیو هیچ لە بارا نەبوویان دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿سَوَاء عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَامِتُونَ﴾ یەکسانە بۆ ئێوە بانگیان لێ بکەنو هاواریان بۆ بەرن، یان بێدەنگ بنو هاواریان نەکەنێ! لەهەردوو حاڵەتەکە دا ئێوە هیچتان دەست ناکەوێ، چونکە ئەوان دەنگی ئێوە نابیستنو لەپاڕانەوەو هاوارو لالآنەوەی ئێوە حاڵی نابنو، نازانن چییان پێ دەگوترێو چییان ئاراستە دەکرێ!

بە کورتی ناگونجێ شتێك ئەوە هێزو توانای بێ، ئەوە تێگەیشتنو بیستنی بێ، بە خودا بزانرێو عیبادەتی بۆ بکرێ، بەڵکوو خودای پەرستراووشیاو بۆ خودایەتی کەسێکە، سود بگەیەنێ بەو بەندەیەی دەیپەرستنو، زیان بگەیەنێ بەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن، خودا دەبێ کەسێك بێ بتوانێ یارمەتی خۆشەویستانی بداو ناحەزانی ریسوابکا، کەسێك شیاوی خودایەتییە بەندە فەرمانبەرەکانی هیدایەت بداو دوعاو پاڕانەوەیان ببیستیو بە هانایانەوە بێ...

## پێناسەکردنی بتو صەنەمەکان

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٩٤

﴿أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿١٩٨﴾﴾

ئەم ئایەتانە تەواو کەرو جەخت کەرەوەی مانای ئایەتەکانی پێشوونو ئەوە دووپات دەکەنەوە کە بتو صەنەم شیاوی خودایەتی نینو بەکەڵکی پەرستن نایەن، مەبەستی سەرەکی لەهێنانی ئەم ئایەتانە چەسپاندنی یەکتاپەستی لەدەروونی ئادەمیزاددا‌و، هەڵکەندنی رەگو ریشاڵی کوفرو پاقژ کردنەوەی دڵەکانە لەچڵکی شیرکو گومڕاییو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّـهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ﴾ ئەو بتو صەنەمانەی جگە لەخودا ئێوە دەیانپەرستنو بەخودایان حلێب دەکەنو ناوی خودایەتیتان بەسەر دا بڕیون، بۆ لابردنی ناخۆشیو کێش کردنی سوودو قازانج هاواریان دەکەنیو هانایان بۆ دەبەن، لەراستی دا ئەوانیش بەندەو دروستکراوێکن وەکوو ئێوە، ئەوانیش وەکوو ئێوە گەردنکەچو بێ دەسەڵاتن لەئاست دەسەڵاتو ویستی پەروەردگاردا، بەڵکوو عیبادەتکەران لەعیبادەت بۆ کراوان بەدەسەڵاتترن چونکە بەلانی کەمەوە عیبادەتکەرەکان بیستنو دیتنو هەڵمەتو تێکۆشانێکیان هەیە، بەڵام بتەکان هەر هیچیان لەدەست نایە، جاکەوابێ ئێوە بەچ عەقڵێك داوا لەو دارو بەردانە دەکەن ئێشتان بۆ جێ بەجێ بکەنو بەهاناتانەوە بێن؟ چۆن ڕێگا

بــەخۆتان دەدەن دروســتکراوێکی پەســت تــر لــەخۆتان بــەپیرۆز تــر بــزانن‌و بەندایەتییان بۆ بکەن؟؟ ئێوە چۆن داوا لەو بتانە دەکەن کارێکتان بۆ ئەنجام بدەن کە بەخۆتان‌و وێنەی خۆتان ئەنجام نادرێ؟؟ لەکاتێك دا ئێوە لەو شتە بــێ گیانانــە بەدەســەلآت تــرن‌و تــەواو تــرن... بــەڵکوو ئــەوەی شــیاوی خودایــەتی‌و پەرســتن‌و بەندایەتی بۆکردنە پەروەردگاری بەدیهێنەرو خاوەن دەسەڵات‌و توانای رەهایە.ئەو خودایــەی هــەموو بوونــەوەر گەردنکەچیەتی هــەموو شــتێك لەئاســتی دەســەڵات‌و توانــای دا زەبــوون‌و لاوازە، هــیچ دەســەڵات‌و توانایــەك نیــە ببێتــە لەمپــەڕو کۆســپ لەبەردەم ویست‌و ئیرادەدا!! دەی چۆن ئێوە پشت لەپەیامی پێغەمبەرێك هەڵدەکەن کــە پــەروەردگار ناردوویــەتی‌و پەیامەکــەی بەزانــست‌و زانیــاری رازاندۆتــەوە، بیروباوەڕی بەنوورو رووناکی جوان کردوە؟؟ چۆن ئەو بەهرەو پیرۆزییە فەرامۆش دەکەن‌و عیبادەتی بەردو دارێکی وا دەکەن نەسوود نەزیانیان هەیە؟؟

کە دەفەرموێ: ﴿عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ﴾ بۆ گاڵتــە پێکردنــە، واتــە: ئــەو بتانــە گریمــان زیندوو بوون عەقڵیشیان هەبوو، ئەگەر وایشی خۆ بەندەیەکن وەکوو خۆتــان چ زێدە رێزێکیان بەسەر ئێوە دا نیــە... دەی کە ئێوە راسـت دەکـەن ئەوانــە خــودان‌و شــیاوی عیبــادەت بــۆ کــردن‌و ســوودو زیانیــان لێ چــاوەڕوان دەکــری‌و بەکــەڵکی پەروەردگارییەتی دێن ﴿فَادْعُوهُمْ﴾ دەبانگیان لێ بکەن‌و، هانایان بــۆ بــەرن‌و داوایــان لێ بکەن. ﴿فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ باوەڵامتــان بدەنــەوەو بەهاناتانــەوە بێن‌و، ئەوەی ئێوە بەهێزو توانای ئادەمیزادیتانەوە بۆتان ئەنجام نادرێ بائەوان بــۆ خۆیان بۆتان دەستەبەر بکەن، یان کار لەپەروەردگار بکەن‌و ئەو بۆتان بکا!

جاکــە بــۆ هــەموو هۆشمەنــدێ دەرکــەوت: کــە ئــەوان دەســەڵات‌و توانــای وەڵامدانەوەیان نیە، دیارە کە بەکەڵکی عیبادەت بۆ کردن نایەن‌و شیاوی خودایەتی نین.

شایانی باسە پەروەردگار بە ﴿إِنَّ الَّذِينَ﴾ تەعبیری لێدایەوەو نەیفەرمووە ﴿ان الــتي﴾ هەرچــەندە ئــەوان جــەمادات‌و خــاوەن عــەقڵ نــین چــونکە مامەڵــەی عاقڵمەنــدانیان لەگــەڵ کــراوەو موراعــاتی بــاوەڕی بتپەرســتەکان کــراوە، کــە پێیــان وایە: سوودو زیانیان هەیە!

ئـەمجار پـەروەردگار، پـێ لـەوە هەڵـدەبڕی‌و ئـەوە روون دەکاتـەوە: کـە ئـەو شـتانەی ئەوانـە دەیانپەرسـتن نـەك هـەر دروسـتکراوێکی وەکـوو ئـەوانن‌و بـەس! بەڵکوو زۆر لەخوار ئەوانەوەن‌و پلەوپایەیان زۆر نزم ترە.

سەیر بکەن‌و تێیان بفکرن: ﴿أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَـا أَمْ لَهُـمْ أَعْيُنٌ يُبْـصِرُونَ بِهَـا﴾ ئایـا ئـەوان قاچیان هـەن پێیـان بـڕۆن؟ دەسـتیان هـەن پەلاماری شتی پێ بدەن....؟ واتە: ئەوان قاچیان نین پێیان بڕۆن بۆ لابردنی زیان‌و هێنـانی سـوود، دەسـتیان نـین پـەلاماری پـێ بـدەن بـۆ دابـین کردنـی خێـر بۆیـان، لابردنـی زیـان لێیـان، چاویان نـین شـتی پـێ ببینـن‌و حـاڵ‌و وەزعـی ئـەوان (واتـە: عیبادەتکەرەکانیان) بزانن، گوێچکەشیان نین گوێیان لەدوعاو پاڕانەوەیان بێ!! دەی کە ئەو بتانە ئەوە حاڵ، وەزعیانـەو ئـەوە توانـاو دەسـەڵاتیانە، ئـەدی چۆن ئەوانـە دەیانکـەن بـەخوداو دەیانپەرسـتن؟! خـۆ ئـەوان ئامـادەنین هیدایـەت‌و رێنومـایی لەپێغەمبـەر وەرگـرن دەڵـێن: ئـەویش ئادەمیزادێکـە وەکـوو ئێمـەو هەنـدێکیان بەهەندێکیان دەڵێن: ﴿مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّـثْلُكُمْ يَأْكُـلُ مِمَّـا تَـأْكُلُونَ مِنْـهُ وَيَـشْرَبُ مِمَّـا تَشْرَبُونَ، وَلَـئِنْ أَطَعْتُم بَـشَراً مِـثْلَكُمْ إِنَّكُـمْ إِذاً لَّخَاسِـرُونَ﴾المؤمنـون/۳۳ - ۳٤. دەی ئێوەی بتپەرست بـەچ عـەقڵ‌و بیرێـك رازی نـین خێـرو هیدایـەت لـەئادەمیزادێکی وەکـوو خۆتـان وەربگـرن کـە موحەممـەدەو خـودا پلـەو پایـەی پێغەمبەرایـەتی پـێ بەخشیوەو کردویەتی بەڕێ نیشاندەرو هۆی هیدایەت بـۆ گرۆهـی ئـادەمیزاد. ئێوە بەچ عەقڵێك دارو بەردی بێ گیان دەگەیەننە ئاستی خودایەتی‌و دەیانپەرستن؟!

لەگەڵ هەموو ئەم راستیانە دا پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبـەرﷺ دەکـا: کـە تەحەددای بتپەرستەکان بکاو بانگیان بکا بۆ بەتاقیکردنەوەی عەمەلی‌و دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُـمْ آذَانٌ يَـسْمَعُونَ بِهَـا قُـلِ ادْعُـوا شُـرَكَاءَكُمْ ثُـمَّ كِيـدُونِ فَـلا تُنظِـرُونِ﴾ ئـەی موحەممەد! بەو بتپەرستانە بڵـێ: دە ئێوە بـانگی ئـەو شـتانە بکـەن کـە کردوتـانن بەهاوەڵ‌و هاوشانی خوداو، بەخودایان دەزانن! داوایان لێ بکەن دژی من یارمـەتیتان بدەن، کۆمەکیتان پێ بکەن بۆ زیان گەیاندن بەمن، بێ منەت بن چاو تروکانـدنێك مۆڵەتم مەدەن‌و هەموو هێزو تواناتان بخەنە گەڕ، چیتان لەدەست دێ‌و چۆنتان بـۆ دەلوێ، ئاوا زیانم پێ بگەیەنن دەفەرمون! ئەمە عەرزو ئەمـە گـەز! منـەتتان نـەبێ

ساتەوەختێك دوای مەخەن چیتان پێدەكرێ تەخسیری مەكەن!! من هیچ گرینگیتان پێ نادەم! هەڵبەتە كەسێك ئەم تەحەد دا زمقە دەكا كە بەتەواوی دڵنیا بێ كە خودا دەیپارێزیو سەری دەخا.

بەمەش شاتەشاتو هەڕەشەی كافرەكانی ڕەت كردەوە كە دەیانگوت: ﴿انّا نخاف عليك من آلهتنا﴾ ئێمە بەزەییمان پێت دا دێو ترسی ئەوەمان هەیە خواكانمان بتگرنو زیانت پێ بگەیەنن!!

ئەمجار پێغەمبەرﷺ ئیقەی تەواوی خۆی بەخودا ئیعلان دەكا وێڕای كەمی یارمەتیدەرو بێ هێزی موسوڵمانان لەمەككە، پڕوپووچی بتەكانی كافرەكان رادەگەیەنیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ وَلِيِّيَ اللّهُ الَّذِي نَزَّلَ الْكِتَابَ وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ﴾ بێگومان سەرپەرشتیارو یارمەتیدەری من بەرزو پیرۆزو باڵا دەستە، ئەو خودایەی نامەی ئاسمانی بۆ ناردووم كە بانگەوازی ئادەمیزادان دەكا بۆ یەكتاپەرستیو عیبادەتكردن بۆ خودایەك كە شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ كردنە، هەر زاتی پاكی شیاوی هاوار لێكردنە لەكاتی تەنگانەو ناخۆشی دا،

هەر زاتی پاكی سەرپەریشتیارو چاودێری بەندە صالحەكانی خۆیەتی. بەندەی صالح كەسێكە بیروباوەڕی پاكو خاوێن بێ، خەرافاتو خەیاڵی پڕوپووچی تێدانەبێ، كردارو گوفتاری رێكو پێك بن. دابو نەریتو سوننەتی خودا وا هاتووە كە یارمەتی بەندە راستاڵەكانی بداو ریسوایان نەكا، بەسەر بەرزیو مەردانە بژین، كەلانەو سەرفرازانە بمرن. بەپێچەوانەوە موشریكو كافرەكان سەرپەرشتیارو خۆشەویستیان شەیتانی نەفرین لێ كراوە! وەكوو لەشوێنێكی تر دا دەفەرموێ: ﴿اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ﴾البقرة/۲۵۷.

ئەمجار پەروەردگار نەتوانایی بتەكان بۆ سوود گەیاندنو زیان لێ خستن دووپات دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلا أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ﴾ ئەو بت صەنەمانەی ئێوە دەیانپەرستنو عیبادەتیان بۆ دەكەن، جگە لەخوداو، هاواریان لێ دەكەن بۆ یارمەتیدانو زیان لێ دوورخستنەوەتان، دڵنیا بن هیچیان لەدەست نایەو ناتوانن یارمەتیتان بدەن، تەنانەت ناتوانن یارمەتی

خۆشـیان بـدەن دژی ئـەو کەسـانەی سـووکایەتیان پێدەکـەن، یـان ئـەو شـتانەی پێیانەوەیـە لەخـشڵو بـۆنی خـۆش لێیـان دەفـڕێنن. ئـەوەتا حـەزرەتی ئیـبراهیم بتەکانی شکاندنو ئەوپەڕی سووکایەتی پێ کـردن، نـەیانتوانی بـەرگری لـەخۆیان بکـەن، نـەیانتوانی تۆڵـەی خۆیـان لەحـەزرەتی ئیـبراهیم بکەنـەوە، وەکوو قورئـان لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿ فَـرَاغَ عَلَـيْهِمْ ضَـرْباً بِـالْيَمِينِ –الـصافات/٩٣﴾ یـان دەفەرموێ: ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَاذاً إِلَّا كَبِيراً لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾الأنبياء/٥٨.

موعـازی کـوڕی عـەمری کـوڕی ئەلجـەمووحو موعـازی کـوڕی جەبەلـە، کـە هـەردووکیان لەئەنـصار بـوونو دوای کۆچـکردنی پێغەمبـەرﷺ بـۆ مەدینـە، موسوڵمانان بوون، ئەم دوو گەنجە موسـوڵمانە شـەوانە هەڵمـەتیان دەبـرد بـۆ سـەر بتـەکان دەیانـشکاندنو دەیـانکردن بـەداری ئـاگر کردنـەوە بـۆ پیرێـژنان بـۆ ئـەوەی خەڵکی عیبرەتیان لێ وەربگرنو بیرێك لەخۆیان بکەنەوەو رای خۆیان بگۆڕن!

عەمری کوڕی ئەلجەمووح. سەرۆکی خێڵەکەی خـۆی بـوو، ئـەم پیاوە بتێکی هـەبوو زۆری رێـز لێ دەگـرت، ئـەم دوو گەنجە شـەوانە بـۆی دەهـاتن سـەرەو بنیـان دەکـرد، پیـساییان تێهەڵدەسـوو! عـەمر بـەیانی کـە دەیبینـێ بتەکـەی وای بەسـەر هێنـراوە، دەیشۆردەوەو بۆنی خۆشی پێـوە دەکـرد، ئـەمجار شمـشێرێکی لـەلا دادەنـاو دەیگـوت بـەم شمـشێرە پارێزگـاری لـەخۆت بکـە، بـۆ شـەوی دوایـی ئـەو دوو گەنجە دەهاتنـەوە وێـزەیو هـەمان حاڵیـان بەسـەردەهێنایەوە، ئـەویش دووبـارە پـاکی دەکردەوەو بۆنی خۆشی لێ دەدایەوە، هەتا جارێکیـان بتەکـەیان بـرد لەگـەڵ سـەگە تۆپیوێك تێکیان بەستو لەحەبلێکیان بەستنو فڕێیان دانـە نـاو بیرێـك، کـە دوایـی عـەمر هـاتو بتەکـەی بـەم شـێوە بینـی، زانـی کـە ئـەو ئایینـەی ئـەو لەسـەریەتی بەتاڵەو ئەم شیعرەی خوێندەوە:

(تالله لو كنت إلها مُسْتَدَنْ لم تك والكلب جميعاً في قَرَنْ). پاشـان موسـوڵمان بـوو بـووە پیـاوێکی بـاشو لەجـەنگی ئوحـوداو شـەهید کـرا! خـوای لێ رازی بـێ[١٣]

[١٣] تەفسیری مەراغی ج٣/١٤٦

تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٢/٢٧٦

جا وەکوو چۆن ئەو بتانە دەسەڵاتی یارمەتیدانیان نیە، دەسەڵاتی هیدایەتو ڕێنمونیشیان نیە، لەم بوارەش دا بێ دەسەڵاتو هیچ لەبارەنەبوون! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَى لا يَسْمَعُوا﴾ ئەگەر هاوار لەو بتانە بکەنو لێیان بپاڕێنەوە کە هیدایەتتان بدەنو، ڕێگای واتان نیشان بدەن کە سەرکەوتنو بەختەوەری تێدا بەدەست بێنن، گوێیان لەنزاو پاڕانەوەکەی ئێوە نیە، چ جای بتوانن یارمەتیان بدەن. وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ -فاطر/١٤﴾ ئەگەر بانگیان بکەن گوێیان لەبانگی ئێوە نیە، ئەگەر لێیان بپاڕێیتەوە گوێیان لێ نیە، ئەگەر -لەفەرزی مەحاڵدا- گوێیان لێ بێ توانای وەڵامدانەوەیان نیە، ﴿وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لا يُبْصِرُونَ﴾ ئەی موخاطەب! تۆ دەبینی ئەو بتانە بەرواڵەت سەیرت دەکەن، بەهۆی ئەو چاوە لەشوشەو مەعدەن دروستکراوەیانەوە وا دەزانی چونکە دەزانی بۆت دەڕوانن، بەڵام لەراسی دا ئەو بتانە هیچ نابینن چونکە ئەوانە بێ گیانن، ئەوان شکڵی چاویان هەیە نەك چاوی بینین، چونکە چاوی بینین -یان هێزی بینین- تایبەتمەندی زیندوویی‌و گیانە، هێزێکە تەنیا خودا توانای هەیە لەو ئەندامەی گیانلەبەر دا دروستی بکا.. ئەوانە بەقوڵنگو قەڵەمو ئامێری تاشین چاوێکی زەقی نەقوچاویان بۆ کراوە، هێزی بینینی تێدا نیە، بێ گیانو بێ هەستو بێ شعوورن!

## بنەماکانی رەوشتی کۆمەڵایەتی‌و خۆپاراستن لەشەیتان

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ

﴿يَمُدُّونَهُمْ فِي ٱلْغَيِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ (٢٠٢)﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوو دا ئەوەی روون کردەوە کە هەر خـۆی سەرپەرشـتیارو چـاودێری پێغەمبەرەکـەی‌و موسـوڵمانە راسـتاڵەکانە، پشتگیرییان لێ دەکاو رێنموییان دەکا بۆ رێگای هیدایەت‌و خۆشبەختی‌و کامەرانی! هەروەها ئەوەشی روون کـردەوە کـە بتـەکان‌و بتپەرسـتەکان نـاتوانن زیـان بەکـەس بگەیەنن یـان سـوود بـەخش‌بـن. ئـەمجار لـەم ئایەتـە دا رێگـای راسـت نیـشان خـودا پەرسـتان دەداو پـەیڕەوو پرۆگرامێکـی سـوود بـەخش فێـری ئـادەمیزادان دەکـا، رێنماییان دەکا چۆن هەڵس‌و کەوت لەگەڵ خۆیان دا بکەن‌و پەیوەنـدی نێوانیـان چۆن بـی‌و چـۆن نـەبێ. سـەرەتا بەئایـەتێك بنـەماکانی ئـەخلاق‌و رەوشـتی جـوان دیاری دەکا، کە لەراستی دا ئەم جۆرە رەوشتانە بنەمای شەریعەتن‌و دوا بنـەماکانی بیروبـاوەڕی یەکتاپەرسـتی دێـن کەلـەوەپێش بـەجوانترین شـێوە ئـەم لایەنـەی روونکردەوە.

ئەمجار پاش فەرمانکردن بە موسوڵمانان کە روو لەنـەفامو نـەزانان وەرگێـڕن فەرمان دەکا بەخۆپاراستن لەختوکەی شەیتانەکان‌و دەفـەرموێ: ﴿خُـذِ الْعَفْـوَ وَأْمُـرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ﴾ پەروەردگار لەم ئایەتە دا فەرمانی بەپێغەمبەرەکەی کرد بەسێ شت، بەئەنجامدانی سێ رەوشتی بـەرز! کـە لەراسـتی دا بنـەمای گـشتی‌و سەرەکین بۆ شەریعەتی ئیسلام چ لەبواری ئادابـو هەڵس‌وکەوتی دەروونییـەوە بـێ، یان لەبواری ئەحکامی عەمەلییەوە بێ. ئەم سێ رەشتانەش ئەمانەن: -

١- خۆئارایشتدان بەعەفوو لێبـووردوویی بەرامبـەر ئـادەمیزادان.. واتـە: ئـەی پێغەمبەر! تۆ بەگوێرەی یاسای رەسای پەروەردگارت بژی، هـەر رێگـەیێ ئاسانە بـۆ بەردەوام بوونت لەسەر ئەو یاسایە، پێـی دا بـڕۆ، ئەوەنـدە خـۆت مانـدو مەکـە کـە نـەتوانی پـەرە بەئـەرکی سەرشـانت بـدەی، بەرامبـەر پـەیرەوکارانت چاوپۆشـی‌و لێبوردنت هەبێ، هەر خزمەتێ کە ئاسایی‌و ئاسانەو بەوان دەکرێ، لێیان وەربگرەو، داوای ئەنجامـدانی کـاری قـورس‌و نابارێـان لێ مەکـە، فـەرمانیان پـێ بکـە بەچاکە کـردن‌و ئەنجامـدانی کـردەوەی سـوود ئـامێز، هـەر کاروگوفتارێـك ئـادەمیزاد جـوان دەکـاو لەچوارچـێوەی بیروبـاوەڕی چـاكو خوورەوشـتی کۆمەڵایـەتی بـەرزەوە

هەڵدەقوڵێ بائەوان پێیەوە پابەندبنو ئەنجامی بدەن، پێغەمبەرﷺ هەر کاتێ لەنێوان دووشت دا سەرپشك کرابێ لایەنە ئاسانەکەی هەڵبژاردوە.

پێغەمبەرﷺ لەفەرمودەیەك دا دەفەرموێ: (یسروا ولاتعسروا، وبشروا ولاتنفروا) [٤] ئاسانخوازبن گرانخواز مەبن، مژدە دەربنو گەشبین بن رەشبینو تەرەکەرە مەبن، خەڵك لەئاین تەرەمەکەن. پەیوەندی کردنەوە لەگەڵ ئەوانەی دەنگیان لێك دابڕیوە بەتایبەت ئەگەر خزم بن، چاوپۆشی کردن لەتاوانباران، هەڵسو کەوتی هێمنانە لەگەڵ موسوڵمانان دا بە عەفوو لێبوردەیی دەژمێرێ! واز هێنان لەدڵڕەقیو روگرژیی لەگەڵ موسوڵمانان بە عەفوو حلێب دەکرێ! بۆیە پەروەردگار پێغەمبەر بەوە هەڵدەنێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾آل‌عمران/١٥٩.

٢- ئەمر بەمەعروف: ئەمە بریتییە لەفەرمان بە چاکە، فەرمان بە چاکەش بریتییە لەو شتانەی شەرع فەرمانی پێکردووە، بەعورفو عادەت موسوڵمانان بە خێری دەزانن، عاقڵ مەندان بە جوانی حسێب دەکەن، وشەی (مەعرووف) وشەیەکە: هەموو خێرو چاکەیەك دەگرێتەوە وەکوو گوێڕایڵی بۆ فەرمانەکانی خوداو چاکە کردن لەگەڵ ئادەمیزادان. بێگومان وشەی (معروف) لەقورئان دا لەسورەتە مەککیو مەدینیەکانیش دا هاتووە لەسورەتە مەدینیەکان دا لەچوارچێوەی حوکمە شەرعییە عەمەلیەکان دا هێندراوە وەکوو ئەو ئایەتەی کە وەصفو ثەنای نەتەوەی ئیسلامو حوکمی ئیسلام دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ﴾- الحج/٤١ یان کە دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾- ال عمران /١٠٣ یان کەباسی ژنو مێردایەتی دەکا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ البقرة-٢٢٨ یان دەربارەی ئەحکامی طەلاقی ریجعی کە دەفەرموێ: ﴿..... فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾- البقرة/٢٢٩. یان کە دەفەرموێ:

---

[٤] الحديث اخرجه، احمد والشيخان والنسائى عن أنس بن مالك.

﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾- البقرة/۲۳۱ زۆر شوێنی تریش. لەمەوە بۆمان مەعلوم دەبێ کە وشەی (معروف) لەقورئان دا لەحوکمەو کاری گرنگ دا بەکار هێنراوەو مەبەستیش بەمانای ئەو وشەیە ئەو مامەڵەو دابو نەریتانەن کە لەناو خەڵکی دا باون. گومانیش لەوە دا نییە کە دابو نەریت بەگوێرەی وڵاتو ناوچەو گەلو نەتەوە دەگۆڕدرێن. بۆیە بڕێ لەزانایانی ئیسلام فەرموویانە: مەعروف ئەوەیە: عەقڵ کردنی بەجوان بزانێ.

۳- رو وەرگێڕان لەنەفامو نەزانان: بەم جۆرە خۆتیان لێ دوورە پەرێز بگرەو، تێکەڵاویان مەکە، سەرمەنێرە سەریانو خۆتیان لەگەڵ ماندو مەکە، ئەگەر کردارێکی ناشرینیان لەگەڵ دا کردی وەڵامیان مەدەرەوە، چاوپۆشیان لێ بکەو گوێچکەی خۆتیان لێ بهاخنە، لێیان گەڕێ، مرۆڤی خراپ چەرخی گەردوون نەرمی دەکاو بەر شەقی رۆژگار دەکەوێ، جا یان دەمرێو لەکۆڵ دەبێتەوە، یان مل رادەکشێ بۆ فەرمانی ئایینو دێتە سەر رێگای راستو رەوان!

بەڵێ: لەراستی دا لێبووردوویی‌و رق خواردنەوە رەوشتی موسوڵمانی راستاڵە. وەکوو قورئان لەپەسنی موسوڵمانان دا دەفەرموێ: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾آل عمران/۱۳٤

ئەم سێ بنەمایە بناغەی هەموو قەواعیدی شەریعەتن، چاکەیەك نیە ئەم ئایەتە لەخۆی نەگرتبێ، فەضیلەو بەهایەك نیە ئەم ئایەتە شەرحی نەکردبێ، رەوشتێکی جوانو پەسند نەماوە ئەم ئایەتە نەیگرتبێتەوە«.

عیکریمە دەڵێ: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، پێغەمبەرﷺ بەجوبرائیلی فەرموو: ئەمە چیە؟ جوبرائیل فەرمووی: ئەی موحەممەد! خودای تۆ دەفەرموێ: ئەوە مانای ئەوەیە: صیلەی رەحم بەجێ بێنێ، پەیوەندی لەگەڵ ئەوان دا بکەی کە دەنگیان لێت دابڕیوە، بەخشندە بێ بەرامبەر ئەوانەی چروکییان لەگەڵ دا کردووی، لێبووردوو بێ بۆ ئەوانەی ستەمیان لێ کردووی!

ئیمام جەعفەری صادق دەفەرموێ: پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەری خۆی کردوە کە ئەخلاقو رەوشتی جوان بێ لەگەڵ ئادەمیزاداندا، لەقورئان دا ئایەتێکی تر نیە وەکوو ئەم ئایەتە ئەوەندە مانای رەوشتی جوانی لەخۆ گرتبێ!

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دەفەرموێ: سوێند بەخودا! پەروەردگار ئەم ئایەتەی تەنیا دەربارەی ڕەوشتی ئادەمیزاد ناردۆتە خوارێ. تیرمیذی فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (أثقل شيء في الميزان: خلق حسن تام) قورسترین شت لەتەرازووی ئەعمال دا ئەخلاقی جوانو تەواوە.

ئەمجار دوابەدوای فەرمانکردنی بەرو وەرگێڕان لەنەفامو هەرزە گۆیان بەمەبەستی خۆپاراستن لەشەڕو نەگبەتییان گونجاوو موناسیبە کە پەروەردگار فەرمانمان پێ بکا بەخۆپەناگرتن لەشەیاتینیی بۆ ئەوەی نەکەوینە داوی شەڕو فەسادییانەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنْ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ﴾ هەر کاتێ بەهۆی کارەساتی ڕۆژگار، یان بەهۆی گیرۆدە بوون بەئادەمی ناهەموار، نەگەیشتیتە مەبەستی خۆتو شەیتان فرسەتی لێ هێناو ختوکەی دالغەی خستە دڵتەوە، ئاگری شەڕو فەسادی لەدەروونتا هەڵگیرساند، ڕقو ئارەزۆت جۆشان، نزیک بوو لەرێبازی ڕاست لات بداو بتخاتە زلکاوی تاوانەوە یان وای لێکردی ڕو لەنەفام وەرنەگێڕیو وەڵامی بدەیەوە، ڕقی هەڵساندیو ویستت تۆڵە بکەیەوە! ئەوە گورج پەنابەرە بۆ خودا، پەنای ئەمان داوا بکە لەو زاتە خاوەن دەسەڵاتەی کە ناوی (الله)یە. بەدڵ ڕو بکەرە خودا بۆ ئەوەی لەو شەڕە بتپارێزێو نەکەویە زلکاوی سەرپێچیکردنەوە، نەك هەر بەدڵ بەڵکوو بەروبانیش ئەو پەنابردنە بدرکێنەو بڵێ (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنادەگرم بەپەروەردگار لەشەیتانی نەفرین لێکراو، ﴿إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار ئەوەی داوای لێ دەکەی دەیبیسیو گوێی لێیە، زاناو ئاگادارە بەوەی کە لەدەروونت دا دێتو دەچێ، بڕیاری ئەوەی داوە فریای ڕەهبەرانی خۆی بکەوێ، هەر کەسێ پەنای بۆ بەرێ پەنای بداو بیخاتە ژێر حیمایەی خۆیەوە، بەتاقیکردنەوە ئەوە چەسپاوە کە پەنابردن بۆ خوداو یادکردنی بەدڵو بەزوبان، ختوکەی شەیتان لەدەروونی ئادەمیزاد دەردەهاوێو کاریگەری نامێنێ، (کافی خیطاب) لە ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ﴾و وێنەکانی دا هەموو موکەللەفێك دەگرێتەوە پێش هەموشیان ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ کراوە، شەیتانیش دابی وایە وەسوەسە دەخاتە دڵی هەموو ئادەمیزادێکەوە،، ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکی

لەخاتو عائیشەو ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبە ﷺ فەموویەتی: (مامنکم من أحد الا وقد کل به قرینه من الجن، قالوا: وایاك یارسول الله؟ قال وایّاي الا ان الله أغانني علیه فأسلم منه) هیچ کەسێك لەئێوە نیە مەگەر شەیتانێکی هەیەو وەسوەسەو ختوکەی دەخاتە دڵو دەروونەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا بۆ جەنابیشت هەیە؟ فەرمووی بەڵێ بۆ منیش هەیە، بەڵام من خودا یارمەتی داوم بەسەری دا زاڵمو ناتوانێ کارم تێ بکا..

ئەمجار پەروەردگار رێگای رزگار بوون لەوەسوەسەی شەیتان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی بەندەی لەخودا ترسنو، پابەندی فەرمانی پەروەردگارن، پەیوەندی راستیان لەگەڵ دا هەیە، هەر کاتێ وەسوەسەو ختوکەیەکی شەیتان لێیان بداو هەڵیان نێ بۆ کردنی تاوانێك، یان بەرپابوونی فیتنەیی‌و ناخۆشی لەناو خۆیاندا، یەکسەر بیریان دەکەوێتەوە: کە ئەوە ختوکەو گومڕایی شەیتانە، دەزانن خودا فەرمانی چی پێ کردونو لەچی نەهی لێ کردوون، رێگای حەقو خێر ئامێز دەدۆزنەوە، وەسوەسەی شەیتان لەدڵی خۆیان دەردەهاونو، ئیتر شوێن هەواو ئارەزۆی خۆیان ناکەون، هانا بۆ خودا دەبەنو پەنا بەئەو دەگرن، پەروەردگاریش بەهانایانەوە دی‌و لەو پەرێشانحاڵییە رزگاریان دەکاو دەیانخاتە حاڵەتی دڵئارامی‌و شادمانییەوە، لەو سەرگەردانی‌و نەفامییە قوتاریان دەبی‌و دەکەونەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆیان، ئیتر چاویان دەکرێتەوە رێگەی راست دەبینن.

بێگومان پەناگرتن بە خودا لەشەیتان. کارێکی خۆپارێزییە، ئاشکراشە خۆپارێزی باشترە لەدەرمانکردن، عەرەب وتەنی (الوقایة خیر من العلاج) جا هەر کاتێ ئادەمیزاد تووشی تاوانێك بوو، ئێویستە خێرا یادی خودا بکاتەوە، تۆبە بکاو بگەڕێتەوە بۆ لای خودا، بۆ ئەوەی کاریگەری تاوانەکە نەمێنێ، چونکە هیچ شتێك بەئەندازەی یادی خودا بەهێز نیە بۆ دەرکردنی وەسوەسەی شەیتان لەدەروونی ئادەمیزاددا، لەم روەوە کە یادی خودا خۆشەویستی حەقو خێرخوازی لەنەفس دا بەهێز دەکا، ئارەزۆی شەڕو تاوان لاواز دەکا، نمونەی موسوڵمانی خوداپەرستی راستاڵ کە شەیتان ناتوانێ گومڕای بکا، تەنانەت ئەگەر ختوکەو وەسوەسەشی

بخاتە دڵەوە کاریگەری نابێ، دەبێتە نمونەی ئەوە، ئادەمیزادی لەشساغی جەستە تەواوو میزاج خاوێنو پۆشاك خاوێن کە ڤایرۆس توخنی ناکەوێ، خۆ ئەگەر ڤایرۆسێکیش رێگای خۆی کردەوە چووە ناو جەستەیەوە، ئەوە مەناعەی بەهێزەو زوو ئەو جهازی مەناعەیە فەلاجۆی دەکا.

ئاشکراشە لەناخی ئادەمیزاد دا حەز بۆ خێرو حەز بۆ شەڕ هەیە چەند ئادەمیزاد کۆشش بکاو بیەوێ بەسەر هەواو ئارەزۆ بۆ شەڕ دا سەربکەوێ، ئەوەندە خێرو ثەوابی دەگاتیو لەخودا نزیك دەبێتەوە... پێغەمبەر ﷺ وەکوو تیرمیذی و نەسائیو ئیبنو حەببان لەئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە: فەرموویەتی: (ان للشیطان لمة بابن آدم، للملك لِمَةً، فاملة الشیطان فایعاد بالشرّ وتکذیب بالحق، وأمّا لمة الملك فایعاد بالخیر وتصدیق بالحق فمن وجد ذلك، فلیعلم أنه من الله، فلیحمد الله علی ذلك، ومن وجد الأخری فلیتعوذ من الشیطان ثم قرأ (الشیطان یعدکم الفقر، ویأمرکم بالفحشاء).

ئەمجار پەروەردگار کاریگەری وەسوەسەی شەیتان لەدەروونی نەفامو ناشوبگێڕەکان دا باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِخْوَانُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِي الْغَيِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ﴾ برایانی شەیاتینییەکان، ئەوان لەخودا ناترسنو تەقواکارنین ئەوە شەیاتینی فرسەتیان لێ دێننو گومرایان دەکەن، پشتگیریان دەکەن بۆ درێژەدان بەگومراییو سەر لێ شێوان، ساتەوەختێك کەمتەرخەمی ناکەن لەهەڵنانیان بۆ گومراییو پەرەپێدان بەسەر لێ شێوانو تێکدانی بیروباوەڕیان، هەتاوایان لێ دەکەن خوو بەگومڕاییەوە دەگرنو سوور دەبن لەسەر پەرەپێدانی. چونکە ئەوان کە شەیتان بەهەڵەی بردن یادی خودا ناکەن، لەشەڕو وەسوەسەی شەیتان پەنا بەخودا ناگرن، جا یان ئیمانیان بەخودا نیە، یان دڵیان لەتەقوا خاڵییە، یان بڕوایان بەوە نیە کە هەموو ئادەمیزادێك شەیتانێکی هەیە وەسوەسەو ختوکەی دەدا بۆ ئەنجامدانی کاری شەڕ.

## پێغەمبەر پابەندی نیگای خودایەو شوێن قورئان دەکەوێ

﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَـٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوو دا پەروەردگار باسی ئەوەی کرد کە شەیتانەکانی ئادەمیزادو جندۆکە هەمیشە خەریکی گومڕا کردنو سەر لێ شێواندنن..... ئەمجار لێرە دا بەشوێن ئەوە دا باسی جۆرێك لەگومڕایی تایبەتی دەکا، ئەویش بریتییە لەوەی کە کافرەکانی قورەیش داوای موعجیزەی سەیر سەیریان لەپێغەمبەر دەکرد، بۆ ڕقەبەریو ئەزیەتدانی پێغەمبەر داوای موعجیزەی کەونی جوراو جۆریان لێ دەکرد، وەکوو قورئان لێیان دەگێڕێتەوە ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الأَرْضِ يَنبُوعاً، أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الأَنْهَارَ خِلالَهَا تَفْجِيراً﴾الأسراء/ ٩٠-٩١.

ئاوا بەو جۆرە موشریکەکان کۆڵیان نەدەداو داوای شتی نائاسییان لەپێغەمبەر دەکرد، سیباقی قورئان لێرە دا بڕی داواکاریو هەڵسوکەوتیان دەردەخا: کە ئەوە دەگەیەنێ: ئەوان حەقیقەتی پێغەمبەرایەتیان نەزانیوەو شارەزای سروشتی پێغەمبەر نەبوون، ئەگەر ئەو حەقیقەتو سرشتەیان بزانیایە هەرگیز ئەو جۆرە داوایەیان لەپێغەمبەر نەدەکرد! وابەبێ ئەدەبیو نەفامانە لەگەڵی دا نەدەجوڵانەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِمْ بِآيَةٍ قَالُوا لَوْلا اجْتَبَيْتَهَا؟﴾ قورەیشییەکان داوات لێ دەکەن، یان ئەگەر ماوەیەك نیگات بۆ نەهات، دەڵێن: ئەوە بۆچی داوات لەخودا نەکردو ئیلحاحت لێ نەکرد موعجیزەکە بنێرێ، یان ئایەتە قورئانیەکانییەکە بنێرێتە خوارێ، یان دەڵێن: بۆچی بۆخۆت ئەو کارەت ئەنجام نەدا؟ چما تۆ پێغەمبەر نیی؟.. چونکە پێیان وایە: قورئان هەڵبەستراوی موحەممەدە، وە ئەو دەتوانێ ئایاتی کەونی، موعجیزەی تایبەتی بێنێتە دی!

لەراستی دا ئەوان سروشتی پێغەمبەرو ئەرکی سەرشانی نازانن چیەو چ نیە!

هەروەها نازانن ئەدەبی پێغەمبەر لەگەڵ خودا دا چۆنەو چۆن نیە، نازانن کە پێغەمبەر ڕاگەیەنەرەو چی پێ بگوترێ: لەخوداوە ئەوە ڕادەگەیەنێ! هیچ لەسەر خودا فەرز ناکاو پێشنیاری بۆ ناکا، هیچیش لەخۆیەوە نالێو ئیشی خۆبەسەریش ناکا! بۆیە پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا کە ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوەو حەقیقەتی فرستادەیی خۆی بۆ ئەوان شی بکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَتَّبِعُ مَا يُوحَى إِلَيَّ مِنْ رَبِّي﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: من ڕایەی ئەوەم ناکەوێ پێشنیار بۆ خودا بکەمو ڕێگای نیشانبدەمو شتی لەسەر فەرز بکەم، من شوێن نیگای خودا دەکەوم، چاوەڕوانی ئەو پەیامو نیگایەم کە لەخودای خۆمەوە بۆم دێ، هەر شتێك بەفەضلو گەورەیی خۆی بۆی ناردم دەیڵێمو شوێنی دەکەوم، لەخۆمەوە هیچ شتێك هەڵنابەستمو ناتوانم بەخودی خۆم هیچ موعجیزەو خاریقەیەك نیشان بدەم. ناتوانم لەخۆمەوە ئایەتێ دروست بکەم، هەر کاتێ موعجیزەیەك کە لەمنەوە ڕوبداو بەڵگە بێ لەسەر پێغەمبەرایەتیم، ئەوە لەو بەڵگانەیە کە لەخوداوە بۆم هاتووە. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَـذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾يونس/١٥.

بەکورتی: من بۆخۆم دەسەڵاتو توانای هێنانی ئایاتی کەونیم نیە، ئیلحاحیش لەخودا ناکەم بۆ موعجیزەو ئایات، من شوێن ئەو نیگایە دەکەوم کە بۆم دێو خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی منی کردوە بەڕاگەیەنەرو پێغەمبەر!!

**ئەمجار پەروەردگار سێ صیفەتی بۆ قورئان دیاری دەکاو دەفەرموێ:**

١- ﴿هَـذَا بَصَائِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾ ئەم قورئانە چرای ڕۆشنەو ڕێگا نیشاندەرە، بەڵگەو نیشانەیە لەسەر یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوە، واتە: ئەم قورئانەی خودا بۆ منی ناردووە ڕێپیشاندەرەو بەڵگەیە لەخوداوە بۆمان هاتووە، کەسێك بەجوانی تێی بفکرێو لێی وردبێتەوە عەقڵی تیژو هۆشیار دەبێ، وەکوو ئەوە پێیان بڵێ: ئەوە چیتانە داوای شتێك دەکەن کە سوودتان پێ بگەیەنێ،؟ لەکاتێك دا ئەم قورئانەتان بۆ نێردراوە کە دڵو دەروون ڕۆشن دەکاتەوە، بەڵگەو

نیشانەیە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی مەنو هاتنی ئەم پەیامە لەخوداوە. پێی بیناو شارەزا دەبن، چاوی دڵتان دەکرێتەوە، زاناو شارەزا دەبنو راستییەکان وەکوو خۆیان دەبینن! وەکوو لەشوێنێکی تردا، دەفەرموێ: ﴿قَدْ جَاءكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا﴾الأنعام/١٠٤.

بەڵێ: ئەم قورئانە: چرایە، رێنیشاندەرە، رەحمەتە، فەیضو بەخششە بۆ کەسانێك ئیمانی پێ بهێنن، ئەم خێرو بێرە لەکیس خۆیان نەدەن، بیکەنە بەرنامەی ژیانی خۆیانو کاری پێ بکەن، لەکاروبارو هەڵسو کەوتیان دا رەنگ بداتەوە.

٢- ﴿وَهُدًى﴾ ئەم قورئانە هیدایەتدەرە بۆ حەقو رێگای راست. ئەم قورئانەی کە هیچ موعجیزەو خاریقەی مادی کەونی ناگەنە ئاستی سەر ئاسای ئەمو، لەهیچ رۆژگارو شوێنێك دا موعجیزە نیە پێشی بکەویو بەئەندازەی ئەم هیدایەت ئامێز بێ!

٣- ﴿وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەم قورئانە، رەحمەتو فەیضو ئیحسانی یەزدانییە لەدونیاو قیامەت دا بۆ ئەو کەسانەی ئیمانی پێ دەهێنن، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾الأنعام/١٥٥ جا کەسێك پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بیو کاری پێ بکا ئەوە سەرفرازو بەمراد گەیشتوو هەر ئەوانو کەسی تر ئەو بەهرەو بەهایەی دەست ناکەوێ!

## گوێ گرتن بۆ قورئانو شێوەی یادکردنی خودا

﴿ وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ وَلاَ تَكُن مِّنَ الْغَافِلِينَ ﴿٢٠٥﴾

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾﴾

لەوە پێش پەروەردگار باسی ئەوەی کرد کە قورئان چراو ڕێ نیشاندەرە، بەڵگەو نیشانەی ئاشکرایە بۆ ڕەهنومایی کردنی موسوڵمانان، هیدایەتو ڕەحمەتە بۆیان، ئەمجار لێرە دا فەرمان دەکا: بەموسوڵمانان، کە لەکاتی خوێندنی قورئان دا گوێی بۆ بگرنو دڵی بدەنێ، بەمەبەستی ئیحتراموو ڕێز لێ گرتنو گەییشتن بەرەحمەتی خوداو بەمراز گەییشتنو دەسکەوتنی ئەو سوودو قازانجانەی لەخۆی گرتوون.

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا......الآيَة﴾ ئەبوحاتەمو هی تریش وتوویانە دەربارەی دەنگ بەرزکردنەوەی ناو نوێژ لەکاتی نوێژ کردن لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ هاتۆتە خوارێ.

هەر ئەبو حاتەم ئەوەی دەرهێناوە: کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەنوێژ دا قسەیان دەکرد. ئیتر ئایەتی ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ......﴾ هاتە خوارێ...

هەر ئەبو حاتەم لەعەبدوڵلای کوڕی موغەففەلەوە شتێکی لەم جۆرە ریوایەت کردوە. ئیبنو جەریری طەبەری لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە هەمان شت ریوایەت دەکا،

ئیمامی زوهری دەڵێ: ئەم ئایەتە دەرحەق بەکۆمەڵە لاوێکی ئەنصاری هاتۆتە خوارێ کە دابو نەرێتیان وابوو هەر کاتێ پێغەمبەر ﷺ شتێکی لەقورئان بخوێندایە، ئەوانیش لەگەڵی دا دەیانخوێند. شێخی سیوطی دوای ڕیز کردنی ئەم ریوایەتانە دەفەرموێ: وا پێدەچێ ئەم ئایەتە مەدینەیی بێ.

لەم ریوایەتانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ: کە ئایەتەکە لەبارەی نوێژەوە هاتبێتە خوارێ، ئیبنو مەسعودو ئەبو هورەیرەو جابیرو زوهری‌و عوبەیدوڵلای کوڕی عومەیرو عەطای کوڕی ڕەباحو سەعیدی کوڕی موسەیەبە ئەمەیان ریوایەت

کردوە. سەعید دەفەرموێ: موشریکەکان لەمەککە دەهاتنە نزیك پێغەمبەرﷺ، کە نوێژی دەکرد هەندێکیان بە هەندێکیان دەگوت: ﴿لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ﴾- فصيلت/٢٦ گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن هانی هانی بخەنە سەر، باکەس لێی حاڵی نەبێ، ئیتر پەروەردگار وەکوو وەڵامدانەوەیەك بۆیانو ئامۆژگاری بۆ موسوڵمانان: ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! هەرکاتێ قورئانی پیرۆز خوێندراو گوێتان لێ بوو، گوێی بۆ بگرنو دڵی بدەنێ، بۆ ئەوەی لەمانای ئایەتەکانی حاڵی ببنو پەند لەئامۆژگاریەکانی وەربگرن، کە قورئان خوێندرا، واز لەقسەو ئاخاوتن بێنن، بەهێدیو هێمنی، بەترسو وریاییەوە گوێچکەتانی بۆ کلۆر بکەن، بۆ ئەوەی تێی بگەنو بزانن چیتان ئاراستە دەکرێ. بۆ ئەوەی لەروانگەی تێگەیشتنو پابەند بوونتان بە پەیامەکەی بەحراز بگەنو رەحمەتو فەضلی خوداتان بەسەر دا برێژێ! سەر فرازی دونیاو قیامەت ببن.. لەکاتی خوێندنی دا دەنگە دەنگو لەغوە بەرپا مەکەن، بۆ ئەوەی تێی بگەن، بزانن: ئەرکی سەر شانتان چیەو چی نیە، چونکە کەسێك بێ دەنگ بوو گوێی بۆ خوێندنی قورئان گرت، شیاوی ئەوەیە کە بەر رێژنەی رەحمەتی خودا بکەوێ.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بێدەنگ بوونو گوێ گرتن بۆ خوێندنی قورئان واجبە، جا خوێندنەکە لەنوێژ دا بێ، یان لە خاریجی نوێژ دا بێ، فەرمانەکە گشتیو بۆ هەموو کاتێکە، بەڵام لەنوێژ دا پێویست تروجەخت لەسەرکراوترە، ئەگەر ئیمام بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، بەڵگەش لەسەر ئەوە جگە لەمانای خودی ئایەتەکە ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی موسلیم لەئەبو مووسای ئەشعەرییەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺفەرموی: (انما جعل الامام ليوءتم به، فاذا كبرفكبروا، واذا قرا فانصتوا) (پێش نوێژ بۆیە دانراوە: کە چاوی لێ بکرێ، کە ئەڵلاهو ئەکبەری کرد ئێوەش ئەڵلاهو ئەکبەر بکەن، کە قورئانی خوێند بێ دەنگ بنو گوێی بۆ بگرن...) شایانی باسە خاوەنانی سونەن لەئەبو هورەیرەوە هەمان فەرموودەیان ریوایەت کردوە. ئەمەی گوترا: دەربارەی ئەوە کە گوێ گرتن بۆ قورئان هەموو کاتو شوێنێك دەگرێتەوەو فەرمانێکی

گشتیو هەمەکاتییە رای شێخ حەسەنی بەصرییە.. ئەگینا زووربەی رافەکەران دەڵێن فەرمان بەگوێ گرتنو بێدەنگ بوون لەکاتی خوێندنی قورئاندا، تایبەتە بەخوێندنی قورئان لەلایەن خودی پێغەمبەرﷺو لەسەردەمی خۆیداو هەروەها بۆ دوا پێغەمبەریش تایبەتە بەخوێندنی قورئان لەنوێژداو خوێندنەوەی خوتبەی رۆژی جومعە، چونکە واجب کردنی بێدەنگ بوونو گوێ گرتن لەدوا رۆژگاری پێغەمبەرﷺ لەغەیری نوێژو خوێندنەوەی خوتبەی جومعە دا ئەرکێکی قورسەو زەحمەت ئەنجام دەدرێ، چونکە بەجێ هێنانی ئەم جۆرە ئەرکە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك واز لەزۆر کاروباری رۆژانەی خۆیان بهێنن! قوتابی واز لەخوێندنو مامۆستا واز لەوانە گوتنەوە بێنن، دادوەر دەست لەکاری خۆی هەڵگریو شۆفێر لەلێخوڕینی ئوتومبێلەکەی بوەستێ.........هتد. بەڵام گوێ گرتن بۆ قورئانخوێندنی پێغەمبەرﷺ جیاواز بووە، بڕێکی ئامۆژگاریو رێنمونی بووە، بۆ هیچ موسوڵمانێك رەوانەبوە گوێی لەقورئانخوێندنی پێغەمبەربوویو پشتی لێ هەڵکردبێ، یان لەو کاتە دا قسەی کردبیو خۆی لەگوێگرتنەکە بێ ئاگا کردبێ، یان هی تری بێ ئاگا کردبن، بۆ دوا لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ هەمان حوکمو یاسا بۆ نوێژکەر لەگەڵ ئیماو خەتیب دا رەچاو دەکرێ، چونکە بێدەنگیو گوێگرتن بۆ قورئان خوێندنی پێش نوێژو خوتبە خوێن واجبو پێویستە ئەمڕۆ هەڵسوکەوتی زوربەی موسوڵمانان کە لەتەعزییەو موناسەباتو رۆژانی جومعە دا قورئان دەخوێندریو ئەوان گوێی بۆ ناگرنو خەریکی گفتوگۆن لەگەڵ یەکتریدا، بەقسە کردنەکەیان کەراهەتی هەیەو تاوان ئەنجام دەدەن! بەتایبەتی بۆ کەسێك لەقورئانخوێنەکەوە نزیك بیو بەباشی گوێی لێ بێ، هەروەکوو چۆن دروست نیە بۆ قورئانخوێن کە قورئان بۆ کۆمەڵێك بخوێنێ کە گوێی بۆ نەگرن، ئەگەر زوربەی خەڵکەکە گوێیان بۆ دەگرتو بڕێکیان جارجار بەبێ شێواندنی کۆڕەکە قسەیان دەکردو گوێگرتنەکەیان لەوانی تر نەدەشێواند ئەوە ئەوە نابێتە بیانوو بۆ واز هێنان لەقورئانخوێندن.

ئەوەی پێویستە لەسەر موسوڵمانان بەرامبەر قورئان ئەوەیە: کە هەوڵ بدەن کاتی خوێندنی گوێی بۆ بگرنو لەماناو مەبەستەکانی ورد ببنەوە، یان بۆ خۆیان بیخوێنن. بەرێزەوە لەکۆڕی قورئانخوێندن دا دابنیشن!

پوختەی قسە لەم شوێنە دا ئەوەیە: گوێگر کارێك نەکا بەبڕوای خۆی، یان بەگوێرەی دابو نەرێتی خەڵك بەبێ ئەدەب حلێب بکرێ..

چ خراپیەك لەوە دا نیە کابرا بەراوەستانەوە، یان بەدانیشتنەوە، یان بەراکشانەوە، یان لەکاتی ڕۆیشتن دا یان بەسواری وڵاخو ڕۆیندە قورئان بخوێنێ، هەروەکوو چۆن دروستە کابرا بەبێ دەستنوێژ یان بەپۆشاکی پیسەوە قورئان بخوێنێ، هەرچەندە سوننەت ئەوەیە: دەستنوێژی هەبێ لەکاتی قورئان خوێندندا، بەتایبەتی بۆ کەسێك کە لەقورئان دا بخوێنێ. وا پەسندە، قورئان خوێن بەشێوەی لەسەرەخۆیی و تەرتیلەوە بەدەنگو ئاوازێکی وا قورئان بخوێنێ کە خوشووعو کاریگەری پێوە دیاربێ، زۆر لەخۆ کردنو ڕواڵەتکاری تێدا نەبێ قاعیدەو یاسای زانیاری تەجوید بەرچاو بگرێ، زێدەڕەوی لەمەددەو شەددەکان دا نەکا.

هەردو پیری فەرموودە موسلیمو بوخاری فەرموودەیەکیان لەئەبو هورەیرەوە بەمەرفووعی ڕیوایەت کردوە، کە دەفەرموێ: (ماأذن الله لشيء ماأذن النبي حسن الصوت، يتغني بالقرآن). خێرو پاداشی گوێگرتن وەکوو پاداشی خوێندن وایە.

ئیمامی ئەحمەد لەئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردوە: کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من استمع الى آية من كتاب الله، كتبت له حسنة مضاعفة، ومن تلاها كانت له نوراً يوم القيامة) کەسێك گوێ لەئایەتێکی قورئان بگرێ چاکەی دوو چەندانەی بۆ دەنووسرێ، کەسێك ئایەتێك بخوێنێتەوە بۆی دەبێتە ڕوناکایی ڕۆژی قیامەت!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەیادکردنەوەی خۆی دەکا، لەسەرەتای ڕۆژو لەکۆتایی ڕۆژداو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ﴾ واتە: یادی خودای خۆت بکە، ئەو خودایەی دروستی کردویو بەنیعمەتەکانی پەروەردەی کردوی، لەدڵی خۆت دا یادی بکە، ناوە جوانەکانی، صیفاتەکانی بێنەرە پێش چاوی دڵت، بەدڵ یادی بکە، سوپاس گوزاریبە، داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، بەیادی خودا دڵ ئادام دەگرێ. وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾الرعد/٢٨ یادی خودا

بکە، بەلێپاڕانەوەو گەردنکەچی هانای بۆ بەرە، لەسزاو تۆڵەی بترسە، بەتەمای پاداش‌و فەضل‌و رەحمەتی بە! بەزوبان یادی بکە بەشێوەیەکی مام ناوەندی، نەزۆر دەنگ بەرز کەرەوە، نەزۆر دەنگ نزم بکەرەوە، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾الأسراء/١١٠ خیطاب لەئایەتەکە دا ئاراستەی پێغەمبەرﷺ کراوە.

هەندێکیش دەڵێن: بۆ گوێگری قورئانە، رای پەسند ئەوەیە: کە بگوترێ خیطابەکە گشتییەو هەموان دەگرێتەوە.

(چونکە عیبرەت بەعموومی لەفظە نەك بەخصوصی سەبەب) یادکردنی خودا بەزمان‌و بەبێ یادکردنی بەدڵ، بێ سوودە، زۆر سوفیلکە دەروێشۆکە ذیکری خودا بەسەدان‌و هەزاران ئەنجام دەدەن، بەتەسبیحی سەدویەك دەنکی، رۆژانەو حەفتانە چەند جار ناوی خودا دەڵێن، ذیکری دەکەن، بەڵام هیچ سوودیان پێ ناگا، چونکە ذیکرو یادکردنەوەکەیان هەر بەزمانەو دڵیان ئاگای لێ نیە، ئەوانە بەعادەت ئەوە دەکەن عیبادەت نیە، بۆیە پەروەردگار بەواجبی داناوە کە بەدڵ‌و زوبان یادی بکرێ، بەزوبان یادەکە ئەنجام بدری‌و لەدڵ‌و دەروون دا ئامادە بکری‌و مانای بەرچاو بگیرێ! دڵ پێیەوە خەریك بێ!

گونجاو ترین کات بۆ ذیکرو یادی خودا کاتی بەیانی‌و کاتی ئێوارەیە، واتە: سەرەتاو کۆتایی رۆژ باشترین کاتی یادکردنەوەی پەروەردگارە، چونکە باقی ماوەی رۆژ بۆ کار کردن‌و هەوڵدانی ژیانە. بەڵام دەبێ هەموو کات یادی خودا لەدڵ دا بێ. کەسێك سەرەتای رۆژ بەخودا پەرستی‌و یادکردنی خودا دەست پێبکاو کۆتاییشی بەو ذیکرو یادە بهێنێ، لەوانەیە لەباقی رۆژەکە دا خودای لەبیرنەچی‌و یادی بکاتەوە. برێ لەئەم ذیکرو یادە، لەنوێژی بەیانی‌و نوێژی عەسر دا ئەنجام دەدرێن لەئەم دوو کاتە دا فریشتەی چاودێری کرداری شەوو فریشتەی چاودێری کرداری رۆژ ئامادە دەبن‌و، دەبنە شایەت لای پەروەردگار کەکاتێ چوونە لایان لەخوداپەرستی دا بوون کاتێکیش بەجێیان هێشتوون خەریکی خودا پەرستی بوون! یادی خوداوذیکر کردنی لەکاتی بەرەبەیان‌و دەمەو ئێوارە دا بەتایبەتی - هەرچەندە هەموو کاتێك یادی خودا پێویستە- لەم بارەوەیە کەهەستی ئادەمیزاد

لەم دوو کاتە دا گۆڕانکارییەکی ئاشکرا لەصەفحەی بوونەوەر دا دەبینێ، بوونەوەر لەحاڵەتی تاریکییەوە بۆ حاڵەتی رووناکی‌و بەپێچەوانەشەوە دەبینندرێ! دڵی ئادەمیزاد پەیوەندار دەبێ بەبوونەوەرو دەوروبەری خۆیەوە، بەئاشکرا دەبینێ دەستی قودرەت شەوو رۆژ دەگۆڕێ، دیاردەو حاڵەتەکانی ئاڵوگۆڕ دەکات.

پەروەردگار دەزانێ کە دڵی ئادەمیزاد لەم دوو کاتە دا -بەیانی‌و ئێوارە- پتر ئامادەباشی تێدایە بۆ خوداپەرستی‌و ملکەچی‌و پابەند بوون،... بۆیە جەند جار لەقورئان دا خیطابی ئاراستەی بەندەکانی کردوە، کە بەتایبەتی لەم دوو کاتە دا ذیکرو تەسبیحاتی خودا بکەن، هاوبەشی بوونەوەر بکەن لەگەردنکەچی‌و پابەندبوون بۆ فەرمانی یەزدان، بۆ ئەوەی دڵیان نەرم بی‌و نەفسیان مشتو ماڵ بکرێ بۆ پەیوەندی بەخاوەنی بوونەوەرو دارای دەسەلاتی ئەم گۆڕانکارییە. وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾ق/٣٩ یان ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْراً كَثِيراً، وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾الأحزاب/٤١- ٤٢ یان ﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾الأنسان/٢٥

ئەم تەسبیحاتو ذیکرەی کە ئەم ئایەتانە دەیگەیەنن، لەذیکرو تەسبیحاتی ناو نوێژەکان فراوان ترن‌و کاتەکەشیان لەسەر کاتی نوێژی بەیانی‌و نوێژی عەسر کورت هەڵنەهێندراوە، هەروەکوو چۆن لەشێوەی غەیری شێوەی نوێژیش دا ئەنجام دەدرێن، چونکە ئەم ذیکرو تەسبیحاتە، جاری وادەبێ بەدڵ دەبێ، جاری وا هەیە بەدڵ‌و زوبان دەبێ،ئەوەی پێویستە لەسەر ئادەمیزاد ئەوەیە دەبێ هەموو کاتێ خودای لەیادبێ، بەنهێنی‌و ئاشکرا موراقەبەی پەروەردگار بکا، لەهەموو کارو کردارێکدا، لەگشت هەڵسان‌و دانیشتنی دا، لەجموجۆڵ‌و وەستانی دا، لەکردەوەو لەنییەتی دا وابزانێ خودا چاوی لێیەتی‌و ئاگاداری هەڵسوکەوتییەتی. کە بەتایبەتی باسی دەمەوبەیان‌و دەمەوئێوارەی کرد، ئەوە دەگونجێ لەم کاتە دا کاریگەری تایبەتی هەبی‌و خودا بۆخۆی دەزانێ چۆن دڵی ئادەمیزادان دەگۆڕی‌و کاریان لێ دەکرێ!! چونکە پەروەردگار خۆی بەدیهێنەری ئادەمیزادەو دەزانێ چی کاریگەرە تێیدا!! ئەوەی پێت راگەیەندرا ئەنجامی بدەو ﴿وَلا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾

لەپێری غافڵو بێ ئاگایان مەبە، نەك هەر بەدەمو زوبان بەڵكوو بەدڵو گیان! ذیكرو یادێك ئەنجام بدە، دڵت گەشەی پێ بكا، خاوەنەكەی وا لێ بكا هەمیشە وابزانێ خودا چاوی لێیەتی، هەر هەنگاوێك بنێ، هەر جموجۆڵێك ئەنجام بدا، لایەنی خودای لەدڵو دەروون دا هەبێ، حیساب بۆ ئەو چاودێرە بكا، شەرمو حەیا بكا لەوەی كارێك ئەنجام بدا خودا پێی ناخۆش بێ! یادی خودا بكەو بێ ئاگا مەبە لەبێ چاودێرو موراقەبە كردنێ، چونكە ئادەمیزاد، هەموو كاتێ پێویستی بەوە هەیە كە پەیوەندی بەپەروەردگارەوە هەبێ، هەموو دەمێ ئاتاجی پارمەتیو كۆمەگی خودایە بۆ زاڵبوون بەسەر وەسوەسەو ختوكەی شەیتاندا!

ئەمجار پەروەردگار دوای فەرمان بەیادكردنی خوداو گوێگرتن بۆ قورئانو نەهی كردن لەغەڵەتی جەخت كردەوەو نمونەی بەفریشتەی نزیك بارەگای ئەقدەس هێنایەوە ئەو فریشتانەی لەسروشتیان دا شەهوەتو ئارەزۆ نیە، شەیتان ناتوانێ وەسوەسەو ختوكەیان بدا، كەچی هەردەم خەریكی ذیكرو تەسبیحاتی یەزدانن‌و ساتەوەختێك لەیادی خودا غافڵ نین‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ﴾ بێگومان ئەو فریشتە بەرێزانەی نزیكی بارەگای ئەقدەسن، نزیكی یەك كە هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چەندەو چۆنەو چیە، ئەو فریشتە نزیكانە لەعیبادەتكردن دا لوتبەرزی نانوێنن، ساتەوەختێك لەخودا بێ ئاگا نین ﴿وَيُسَبِّحُونَهُ﴾ بەرزیو پیرۆزیو بێ شەریكی پاڵ خودا دەدەن، لەهەموو عەیبو ناتەواوییەك بەدوری دەگرن. ﴿وَلَهُ يَسْجُدُونَ﴾ هەر بۆ خودا نوێژ دەكەن‌و هەر بۆ زاتی پاكی سوژدە دەبەن‌و كەس ناكەن بەشەریكو هاوەڵی، هەموو عیبادەتو بەندیەتێكیان خالص بۆ خودایە.

عیبادەتو ذیكركردن لایەنێكی گرنگن لەپەیرەوو پرۆگرامی ئەم ئایینەدا، چونكە ئایینی ئیسلام مەنهەجێكی تیۆری نیە، پرۆگرامی بزتنەوەیەكی واقیعییە بۆ گۆڕینی واقیعی ئادەمیزاد، هەڵبەتە گۆڕینی ئەو واقیعە نەفامییەو ئاراستە كردنی بۆ پەیڕەو كردنی كۆمەڵگای ئادەمیزاد بەرەو مەنهەجی رەببانی: ئەركێكی قورس‌و گرانەو پێویستی بەتێكۆشان‌و هەوڵدان هەیە، صەبرو ئارامییەكی زۆری گەرەكە، پێویستی بەتوێشوو پشتگیری خوداوەند هەیە، وزەو توانایەكی تایبەتی

دەوێ، عیبادەت بۆ خوداو داوای پشتگیری لێی باشترین تویشوو چاکترین پشتیوانو گۆمەگییە بۆ ئەو رێگا ئەستەمو زەحمەتەیە. بۆیە لەسەرەتای سورەتەکە دا کە دەفەرموێ: ﴿كِتَابٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ فَلاَ يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ لِتُنذِرَ بِهِ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ لێرەش دا کۆتایی سورەتەکەی بەو ئایەتە پیرۆزانە هێنا!!

تێبینی: ئەوەی لەم ئایاتەنانە وەردەگیرێ ئەوەیە: پێویستە ئادەمیزاد لەخزمەت قورئان دا بەندەبو ویقار بیو رێزی لێ بگرێ.

ئاشکرایە ئایەتەکە بەرروونی ئەوە دەگەیەنێ کە لەکاتی خوێندنی قورئان دا بێدەنگیو گوێ بۆگرتنی، لەهەموو حالێك دا لەنوێژو غەیری نوێژ دا پێویستە.

وەلێ شەرعزانان لەبارەی خوێندنی مەئمووم لەپاش ئیمامەوە سێ رایان هەیە، ئایا خوێندنی ئیمام لەنوێژ دا خوێندن لەسەر مەئموومییەکان لادەبا؟ بری خوێندنەکەیان دەکەوێ لەهەموو نوێژێکدا چ نوێژی جەهری بێ یان نوێژی سیرری بێ، یان پێویستە مەئموومییەکانیش بیخوێنن، یان خوێندنەکە تایبەتە بەو نوێژانەی کە ئیمام تێیان دا بەدەنگی بەرز دەخوێنێ؟؟

١-حەنەفییەکان، دەڵێن: مەئمووم لەدوا ئیمامەوە هیچ کاتێ قورئان ناخوێنێ نوێژەکە جەهری بێ یان غەیری جەهری بێ چونکە ظاهیری ئایەتەکە داوای بێدەنگیو گوێگرتن دەکا، لەنوێژی جەهری دا هەردووکیان دێنەجێ. لەنوێژی غەیرە جەهری دا بێدەنگییەکە دێتەجێو هەر ئەوەش لەتوانا دا هەیە، ئیمام دەخوێنێو مەئمووم پێویستە بێدەنگ بێ. ئەوەی پشتگیری ئەم رایتە دەکا ئەو فەرموودەیەیە کە ئیبنو ئەبی شەیبە لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ئیمام بۆیە دانراوە کە شوێنی بکەوێ، کە ئەللاهوئەکبەری کرد ئێوەش ئەللاهوئەکبەر بکەن، کە قورئانی خوێند ئێوە بێدەنگ بن..[١٥])

هەر ئیبنو شەیبە لەجابیرەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (من كان له امام، فقراءته له قراءة) کەسێك لەپاش ئیمامەوە نوێژی کرد خوێندنی ئیمام بری خوێندنی ئەو دەکەوێ. ئەم حەدیثە هەرچەندە مورسەلە

[١٥] ئیمام موسلیم ریوایەتی کردوە.

بەلام لای حەنەفییەکان دەبێتە بەلگە، ئەبو حەنیفە بۆ خۆشی بەمەرفوعیو بەسەنەدی راست ریوایەتی کردوە.

زوربەی هاوەلانیش: عەلی، ئیبنو مەسعود، سەعد، جابیر، ئیبنو عەبباس، ئەبو داود، ئەبو سەعیدی خودری، ئیبنو عومەر، زەیدی کوڕی ثابیت، ئەنەس. -خودا لەهەموویان رازی بێ- ئەو رێزەیان هەبوە.

٢-مالیکییەکانو حەنەفییەکان، پێیان وایە: نوێژکەری دوا ئیمام ئەگەر نوێژەکە لەو نوێژانە بوو، کە ئیمام تێیان دا دەنگ بەرز ناکاتەوە ئەوە دەبێ (فاتحە) یان سورەتی تری قورئان بخوێنێ، ئەگەر نوێژەکە جەهری بوو واتە: ئیمام دەنگی تێدا بەرز دەکردەوە، ئەوە نابێ مەئمومی هیچ بخوێنێ. ئەمە رای عوروەی کوڕی زوبەیرو قاسمی کوڕی موحەممەدو زوهریشە.

٣-شافیعییەکان، دەلێن: هەموو کاتێ نوێژکەر دەبێ فاتیحە بخوێنێ، ئیمام بێ یان مەئمووم بێ، یان بەتەنیا نوێژەکە بکا. چەند بەلگەیەکیان لەسەر مەذهەبەکەیان هێناوەتەوە: لەو بەلگانە: ئایەتی: ﴿فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾الزمر/٢٠ هەروەها ئەو حەدیثەی کە ئەحمەدو خاوەنانی شەش کتێبەکانو هی تریش لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە ریوایەتیان کردوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لاصلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب) بەنوێژ حلێب ناکرێ، کەسێك نوێژ بکاو فاتیحەی تێدا نەخوێنێ.. ئیمامی بوخاریو بەیهەقیش ئەم رایەیان پەسند کردوە!!

ئایەتی: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ....﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ لەکاتی ذکر کردن دا دەنگ بەرز بکرێتەوە، واتە: ذکردەبێ بەدەنگی نزم بکریو نابێ دەنگی تێدا هەلبڕێ! ئایەتی: ﴿... وَلَهُ يَسْجُدُونَ﴾ ئەوە دەگەیەنێ: کە هەر کەسێك ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە، یان گوێی لێ بێ دەبێ سوژدە بۆ خودا بەرێ، سوژدەی خوێندنەوەی قورئان (سجدة التلاوة) دانراوە: بۆ ملکەچ کردنی ئەوانەی موشریكو خوانەناسنو سوژدە نابەن، هەروەها بۆ شوێنکەوتنو چاو لەفریشتە کردنو رانواندنی بەندایەتی کردن بۆ پەروەردگار.

ئیمامی موسلیم فەرموودەیەکی لەئەبوهورەیرەوە ریوایەت کردوە، دەلێ:

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (اذا قرأ ابن آدم السجدة، فسجد، اعتزل الشيطان يبكي، يقول: ياويله، امر ابن آدم بالسجود فسجد، فله الجنة، وأمرت بالسجود، فأبيت فلي النار). هەر كاتێ ئادەميزاد ئايەتێكى خوێند سوجدەى تێدا بوو سوجدەى برد، شەيتان گۆشەگير دەبێو دەگرياو هاوار دەكاو دەڵێ: هاوار بۆ خۆم، ئادەميزاد فەرمانى پێ كراوە بەسوژدەبردنو شوژدەى برد، بەهەشتى دەدرێتێ! من فەرمانم پێ كرا بەسوژدە بردن، سەرپێچيم كرد دەخرێمە دۆزەخەوە.

ئيبنوماجە فەرموودەيەكى لەئيبنوعەبباسەوە ريوايەت كردوە: دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لەسوژدەى قورئان خوێندن دا ئەم دوعايەى دەفەرموو: (اللهمَّ! احطط عني بها وزراً، واكتب لي بها أجراً، واجعلها لي عندك ذخراً) خودايە! بەم سوژدەيەم گوناهم لێ هەڵوەرێنە، پاداشم بۆ بنووسە، لەلاى خۆت بۆم بكە بەپەزمەندەو توێشوو.

لەريوايەتێكى تر دا هاتووە: كە پێغەمبەرﷺ فەرموويەتى: (اللهمَّ! لك سجد سوادي، وبك آمن فؤادي، اللهمَّ ارزقني علماًينفعني، وعملاً يرفعني) خودايە! جەستەم سوژدەى بۆ زاتێ پاكت برد، دڵم ئيمانى پێت هێناوە، خودايە زانيارييەكم بدەيە سوودم پێ بگەيەنێ، ئيشو كارێكم پێرەچاو بكا رێزم بداتێ.

ئەمجار ماوەتەوە ئەوە ئايا سوژدەى تيلاوەت واجبە يان سوننەتە؟؟

ئيمامى ماليكو ئيمامى شافيعىو ئيمامى ئەحمەد دەفەرموێ: واجب نيە. چونكە ئەو فەرموودەيەى حەزرەتى عومەر چەسپاوەو لەصەحيحى بوخارى دا هەيە، كە (رۆژێك ئايەتى سەجدەى لەسەر دوانگە خوێندەوە ئيتر لەسەر دوانگە هاتە خوارەوەو سوژدەى بردو خەڵكەكەش لەگەڵيا سوژدەيان برد، لەرۆژێكى هەينى تر دا لەسەر دوانگە هەمان ئايەتى خوێندەوە، خەڵكەكە خۆيان ئامادەكرد بۆ سوژدە بردن، بەڵام عومەر دانەبەزىو بەخەڵكەكەى وت: خەڵكينە! هێواش بن، خودا ئەمەى لەسەر پێويست نەكردوين، لەم جۆرە كاتانەداو لەكاتى خوێندنى ئايەتى سەجدە دا حەزمان لێ بوو سوژدە دەبەينو حەزمان لێ نەبوو ناچينە سوژدە، ئەمە رووى دا بەبەرچاوى هاوەڵان لەكۆچەرانو يارمەتيدەران (خودا لێيان رازى بێ)

پێغەمبەرﷺ کە سوور بووە لەسەر سوژدە بردن، نیشانەی ئەومیە سوننەت بووە.. فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: (أمر ابن آدم بالسجود) ئەوە هەواڵدانە لەسوژدەی واجب. ئەبوحەنیفە، دەفەرموێ: سوژدەی تیلاوەت واجبە، چونکە ئەمر کردن بەسوژدە بردن، وجووب دەگەیەنێ، هەروەها حەدیثەکەی پێشوو کە دەفەرموێ: (اذا قرأ ابن آدم سجدة، اعتزل الشیطان یبکی یقول یاویلە - لەریوایەتی ئەبوکورەیبدا- یاویلی). هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ کە دەربارەی شەیتان فەرموویەتی‌و موسلیم ریوایەتی کردوە: کە دەڵێ: (أمر ابن آدم بالسجود فسجد فله الجنة وامرت بالسجود فأبیت فلی النار) نیشانەن لەسەر ئەوە کە سوژدە واجبە.

هەموو زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوە کە سوژدەی تیلاوەت وەکوو نوێژە پێویستی بەهەبوونی دەستنوێژو پاکو خاوێنی پۆشاکو شوێن هەیە، هەروەها پێویستی بەنییەت‌و روکردنە روگەو کاتیش هەیە!

دەربارەی کات: شافیعییەکانو کۆمەڵێك لەزانایان پێیان وایە: سوجدەی تیلاوەت هەموو کاتێ دروستە ئەنجام بدرێ چونکە وەکوو (صلات ذات السبب) وایە.

حەنەفییەکانو وتەیەکی مالیکییەکانیش هەیە دەڵێن: نابێ سوژدەی تیلاوەت لەو کاتانە دا ببرێ نوێژی سوننەتی تێدا مەکروهە وەکوو دوا نوێژی عەصرو دوا نوێژی بەیانی.

بسم الله الرحمن الرحیم

## ســـورەتـــی ئـەنـفـال

سورەتی ئەنفال سورەتێکی مەدینەییە، دەربارەی ئەحکامی جیهادو تێکۆشان لەرێگەی خودا دا دەدوێ. باسی یاسای جەنگو خۆئامادەکردن بۆی شی دەکاتەوە. دەربارەی هەڵبژاردنی ئاشتی بەسەر شەڕدا، دەدوێ هەر کاتێ دوژمن ملی بۆ ئاشتی دا، هەروەها حوکمی شوێندەستی شەڕو کاریگەری لەئەشخاصەکان (دیلەکان)داو لەماڵو سامان (دەستکەوتی شەڕ) دا دەستنیشان دەکا. سورەتی ئەنفال لەدوا سورەتی (البقرة) هاتۆتە خوارێ، بەڵام ئەمە بەتەواوی ناچەسپێو نابێتە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگر، چونکە سورەتی (البقرة) هەمووی بەجارێ نەهاتۆتە خوارێ، بەڵکوو هەندێکی لەسەرەتای سەردەمی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە هاتۆتە خوارێوهەندێکیشی لەئاخرو ئۆخری ئەم سەردەمە مەدەنییە دا هاتوەتە خوارێ، ماوەی نێوان سەرەتاو کۆتایی سەردەمی مەدینە نزیکەی نۆ ساڵ بووە. ئاشکراشە سورەتی (الانفال) لەنێوان ئەم سەرەتاو کۆتاییە دا هاتوەتەخوارێ، کەواتە سورەتی (البقرة) هەندێکی لەپێش هاتنە خوارەوەی سورەتی ئەنفال نازڵ بووەو هەندێکی دوای ئەو هاتوەتە خوارێ!

بەهەر حاڵ سورەتی ئەنفال پاش روداوی جەنگی بەدری گەورە هاتوەتە خوارێ، یەکەم جەنگێك بوو کە سەرفرازیو سەرکەوتنی بۆ موسوڵمانان (هەرچەندە کە کەمبوو) بەسەر کافرەکاندا (هەر چەندە زۆر بوون) تێدا بوو، جەنگێك بوو مێژووی بزوتنەوەی ئیسلامی گۆڕی، مێژووی ئادەمیزادی گۆڕی، جەنگێك بوو فەقیرو هەژارو بۆرە پیاو تێی دا بەرەنگاری ملهوڕو دەرەبەگەکانی ئەو رژگارە بوونەوەو بەسەریان دا زاڵ بوونو تێکیان شکاندن بۆیە قورئان: ئەو رۆژەی ناو ناوە رۆژی (الفرقان) واتە: جیاکەرەوەی حەقو بەتاڵ، رۆژی سەرکەوتنی حەقو راستی بەسەر بەتاڵو ناحەقدا. رۆژی سەرکەوتنی کۆمەڵی کەمو هەژارو نەدارا -بەڵام خاوەن باوەڕو خودا پەرست، بەسەر کۆمەڵی زۆرو پڕچەکو سامداری فورمیشی -بەڵام بتپەرست-، رۆژێك بوو، بناغەی شکۆمەندی ئیسلامی تێدا دارێژرا،

ڕۆژی کوفری تێدا شکێندرا، ڕۆژی بەدر ڕۆژێکی مێژووی بوو، بەراستی ڕۆژی فورقان بوو، نەك هەر لە دونیاداو بەس! یان لەمێژووی ئادەمیزاداو بەس! بەڵکوو لەقیامەتیشداو بۆ هەتا هەتایی حەقو بەتاڵی لێك جیاکردەوە هەرچەندە ئەم جەنگە ئەوەندە بەنرخ و بەهایە، بەڵام بەنرخیو گرنگییەکەی ناتوانێ مەبەستە بنەڕەتیو حەقیقییەکانی دەربخا، مەگەر کاتێك دەربکەوێ کە ئێمە طەبیعەتو چۆنیەتی ئەو جەنگە تێ بگەینو بەقوناغێك لەقۆناغەکانی جیهادو تێکۆشانی ئیسلامی بزانن، واتە: بەراستی هۆکارو مەبەستی ئەم جیهادە تێ بگەین، هەروەها ناتوانین سروشتی جیهاد لەئیسلامداو هۆکارو مەبەستی سەرەکی تێ بگەین هەتا سروشتی ئەم ئایینە وەکوو خۆی نەناسین.

هەر کاتێ ئێمە وەکوو پێویست لەئیسلام حاڵی بووین، سروشتی ئەم ئایینەمان ناسی، بەوورد بینی ئیسلامو ئایینی ڕاستەقینە وەسەیری جیهادو تێکۆشان لەئیسلام دا بکەین بەباشی لێی حاڵی دەبینو هۆکارو مەبەستەکانی تێدەگەین!!

مامۆستا سەیید دەربارەی سروشتو قۆناغەکانی جیهادو تێکۆشان لەئیسلام دا لەکتێبی (زاد المعاد)ی ئیبنولقەییم ڕادەگوێزیو دەڵێ: یەکەمجار کە پەروەردگار نیگای بۆ حەزرەتی موحەممەدﷺ نارد: فەرمانی پێ کرد بەخوێندن، بۆ خۆی لەگەڵ نەفسی بخوێنێ، فەرمانی پێ نەکرد تەبلیغو بانگەوازیی بکا، پاشان ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ﴾ی ناردەسەری! پێغەمبەرایەتییەکەی بە ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ دەست پێکرد، ڕەوانە کردنی بە﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ بوو. ئەمجار فەرمانی پێ کرد بەرەبابو خزمو کەسوکاری نزیکی بترسێنێ، ئەمجار عەرەبەکانی دەوروبەر هۆشیار بکاتەوە، ئەمجار بانگەوازی ئاڕاستەی هەموو عەرەب بکا بەگشتیو بیانترسێنێ، ئەمجار هەموو عالەم بانگ بکا بۆ خودا پەرستیو لەسزای خودا بیانترسێنێ!

نزیکەی سێزدەساڵ بەسەر بوون بەپێغەمبەری دا تێپەڕی بەئامۆژگاریو ترساندنو بەتەماکردن بانگەوازی کرد، نەجەنگی لەگەڵ نەیارانی بەرپاکرد، نەداوای سەرانەو جیزیەی لێکردن، پەیتا پەیتا لەخوداوە نیگای بۆ دەهاتو

فەرمانی پێ دەکرا کە بەئارام بێو چاوپۆشی بکا.

پاشان رێگای پێدرا بەکۆچکردنو رێگەی پێدرا بەشەڕ کردن. پاشان فەرمانی پێ کرا کە شەڕ لەگەڵ ئەوانە دا بکا کە شەڕی لەدژ بەرپا دەکەن، واز لەوانە بێنێ کە گۆشەگیرنو جەنگی لەدژ بەرپاناکەن. ئەمجار فەرمانی پێ کرا کە جەنگ لەگەڵ موشریکو خودا نەناسان بەرپابکاو هەوڵ بدا هەموو کەس ملکەچی ئایینی خودا بێ..

لەدوای ئەوەی فەرمان بەپێغەمبەر کرا بەجیهادو تێکۆشانو جەنگان دژی کافرەکان. کافرەکان لەئاستی دا بوون بەسێ تاقم. کۆمەڵێکیان پەیمانی صوڵحو ئاشتیان لەگەڵ دا مۆر کردن تاقمێکیان ئیعلانی جەنگیان لەدژی راگەیاند. برێکیشیان بوونە ئەهلی ذیمەو سەرانەیانداو پابەندی ئەحکامی تایبەت بەئەهلی ذیمە بوون!

فەرمانی پێکرا کە پابەندی پەیمانو عەهدی خۆی بێو وەفا بەڵێنی خۆی بکا، لەگەڵ ئەوانە دا کە پەیمانیان لەگەڵ دەبەستێ، ئەگەر لەپەیمان لەگەڵ بەستراوەکان ترسان کە خیانەتی لەگەڵ بکەن، نابێ جەنگیان لەگەڵ دا بکا، هەتا بەئاشکرا پەیمانەکەیان لەگەڵ هەڵنەوەشێنێتەوە. فەرمانی پێکرد کە شەڕ لەگەڵ ئەوانە دا بکا کە پەیمان هەڵدەوەشێنێتەوە.

کە سورەتی (براءة) نازڵ بوو، هەموو ئەو حوکمو یاسایانەی تێدا بوو کە چۆن پێغەمبەرﷺ هەڵسوکەوت لەگەڵ کافرەکان دا بکا، فەرمانی پێکرا کە لەگەڵ جوولەکەو گاورەکان دا بجەنگێ تا سەریان پێ شۆڕ دەکاو سەرانە دەدەن، یان موسوڵمان دەبنو دێنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە، هەر لەسورەتی (براءة) دا فەرمانی پێکرا: جیهاد لەگەڵ کافرو دووڕووەکان بکاو دڵڕەق بێ بەرامبەریانو توندوتیژی بەکاربهێنێ! پێغەمبەریشﷺ بەشمشێرو تیر دژی کافرەکان جەنگاو لەگەڵ دووڕووەکانیش بەبەڵگەو دەلیل جیهادی کرد، هەر لەم سورەتە دا فەرمانی پێ کرا کە ئیتر هەموو پەیمانو بەڵێنێکی لەگەڵ کافرەکان دا هەڵوەشێنێتەوەو چی تر پابەندی بەڵێنەکانی نەبێ لەگەڵیاندا. ئیتر پەیمان لەگەڵ بەستراوان لەبەرامبەری دا بوون بەسێ تاقم: دەربارەی تاقمێکیان فەرمانی پێکرا کە دژ یان بجەنگێو

شـەڕیان لەگـەڵ دا بکـا، ئەمانــە ئـەو کۆمەڵـە بـوون کـە لـەوەپێش پـەیمانیان هەڵوەشاندبوەوە، شەڕی لەگەڵ دا کردنو بەسـەریان دا زاڵ بـوو، برێکیـان پـەیمانی کـاتی لەگـەڵ دا بەسـتبوونو پابەنـدی بـەڵێنو پـەیمانی خۆیـان بـوون، دەرحـەق بەئەمانــە فــەرمانی پــێ کــرا کــە تاکــاتی دیــاریکراو پەیمانەکــەیان لەگــەڵ دا بەسەربەرێ.. هەندێکی تریان نەپەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەستبوو نەشەڕیان لەگـەڵ دا کردبـوو، یـان عەهـدو پـەیمانی رەهایـان لەگـەڵ دا بەسـتبوو، دەرحـەق بەئەمان فەرمانی پێکرا کە بۆ ماوەی چوار مانگ مۆڵەتیان بـدا، دوای چـوار مانگە کە شەڕیان لەگەڵ دا بکـا، ئـەوەی پـەیمانی شکاندبوو شـەڕی لەگـەڵ کـردن، ئـەوەی پەیمانی نەبوو، یان پـەیمانی بـێ سنوورو رەهـای هـەبوو چـوار مـانگ مۆڵـەتی دان، فەرمانی پێ کرا کـە هـەر کـامێ لەمانـە پابەنـدی پـەیمانی خـۆی بـوو پەیمانەکـەی تەواو بکا، هەموو ئەمانە پێش تەواو بوونی ماوەی پەیمانەکەیان موسوڵمان بـوونو لەسەر کوفری خۆیان نەمانەوە.. سـەرانەی لەسـەر ئـەهلی ذیمـمە دانـاو بـەگوێرەی یاسای خودا لەگەڵیان دا جوڵایەوە.

هەڵــسوکــەوتی کافرەکــان، دوای نــازڵبوونی ســورەتی (بــراءة) لەگــەڵ پێغەمبەرداﷺ لەسێ جور دا رەنگی دایەوە:

دوژمن ـ پەیمان لەگەڵ بەستراو ـ ئەهلی ذیممە.

پاشـان ئـەهلی بـەڵێنو صـلح موسـوڵمان بـوون، دوو تـاقم مانـەوە دوژمـن (محـاربین)و ئـەهلی ذیممـە. دوژمنـەکان هەمیـشە لێـی دەترسـانو نەیانـدەزانی لەترسانی چی بکەن!

ئیتر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی لەئاست پێغەمبەرداﷺ بوون بەسێ تـاقم، موسـوڵمانو بـڕوادار ئـەهلی ذیممـەو سـەرانەدەر دوژمـنو ناحـەز بـەڵام ترسـاو لەپێغەمبەر.

بەڵام هەڵسوکەوتی لەگەڵ دووڕووەکاندا، ئەوە بوو فەرمانی پێ کرابـوو کـە شایەتو ئیمانی ظاهیرییان لێ قبووڵ بکاو، بیروباوەڕی نـاو دڵو دەروونیـان بـەخودا بسپێرێ، بەهۆی زانستو بەڵگەوە لەگەڵیان بدویو هەوڵ بـدا بیانکاتـە موسـوڵمانو خـاوەن بـاوەڕی تـەواو، فـەرمانی پـێ کـرا کـە روویـان لێ وەرگێـڕیو توندوتیـژییان

لەگەڵ دا بەکاربێنیو بەڵگەو دەلیلی کاریگەرو بەهێز ئاراستەی دڵیان بکاو بۆڕیان بدا، نەهی لێ کرا کە نوێژ لەسەر لاشەی مردویان بکاو بچێتە سەر قەبرانیان. هەواڵی یەزدانی پێ ڕاگەیەندرا: کە ئەگەر داوای لێخشبوونیشیان بۆ بکا خودا لێیان خۆش نابێ، ئەمە بەکورتی شێوەی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر بوو ﷺ بەرامبەر بەکافرو دووڕووەکان.

پەیوەندی نێوان ئەم سورەتەو سورەتی (الأعراف) ئەوەیە سورەتی (الأعراف) باسی بەسەرهاتو چیرۆکی پێغەمبەرە ناودارەکانی تێدا بوو لەگەڵ گەلو نەتەوەکانیان، ئەم سورەتەش واتە: (الأنفال) باسی حاڵو چۆنیەتی پێغەمبەرﷺ دەکا لەگەڵ قەومەکەی!

ئێمە لەپێشەکی بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرە پیرۆزەدا، ئەوەمان نووسیوە کە دانانی سورەتەکانی قورئان، هەر یەکەیان لەشوێنی خۆی، کارێکی (تەوقیفی)یەو لەخوداوە دەست نیشان کراوەو پێغەمبەرﷺ شوێنی هەموو سورەتو ئایەتێکی دیاری کردوە، کە دوایی لەسەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکرداو پاشان لەرۆژگاری جێنشینی حەزرەتی عوسمان دا قورئان کۆکرایەوەو نووسرایەوەو تەرتیب کرا، ئیشی هاوەڵانی نووسەرەوە، بریتی بوو لەجێ بەجێ کردنی فەرمانی پێغەمبەرﷺ.

بەڵام لێرە دا واتە: دەربارەی دانانی سورەتی (الأنفال) لەم شوێنە دا جێگای سەرنجی زانایانی تەفسیرو علوومی قورئانە.

تەفسیری مەنار لەتەفسیری (روح المعاني)یەوە نەقڵ دەکاو دەڵێ: وا پێ دەچێ، دانانی سورەتی (الأنفال) لەم شوێنە دا (تەوقیفی) بێ، هەروا دانانی سورەتی (براءة) لەدوایەوە (تەوقیفی) بووە، کەوابوو ئەم دوو سورەتەش وەکوو سورەتەکانی تر تەوقیفین، ئەمە ڕای زۆرینەی زانایانە، کەچی جەلالی سیوطي دەڵێ: ئەم سورەتی ئەنفالە لێرە دا (تەوقیفی) نیە، بەڵکوو بەئیجتیهادی حەزرەتی عوسمان بووە، بەظاهیری عەقڵیش وا گونجاو بوو کە بە دووا سورەتی (الأعراف) سورەتی یونسو هود بێن! چونکە ئەوانیش چیرۆکی پێغەمبەرانیان لەخۆ گرتووە، لەمەککەش هاتوونە خوارێو فەرمووودەی پێغەمبەریش هەیە دەربارەی گەورەیی حەوت سورەتە درێژەکانو سورەتی (یونس)یان بەحەوتەم داناوە، دەی ناوانخستن

لـەنێوان سـورەتی (الأعـراف)و سـورەتی (یـونس) دا بـەو دووو سـوورەتە، جـو دا کردنەوەی هاووێنەیـە لەهاووێنـە. زیـاد لـەوەش سورەتی (الأنفـال) لەچاو سـورەتی (الأعـراف)و (بـراءة) دا کورتـە. هەربۆیـەش کـاتی خـۆی حیـبری نەتـەوەی ئیـسلام، عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس ئـەم ئیـشکالەی گـرتو پرسـیاری ئاراسـتەی ئیمـامی عوسمان کردو وتی: چی وای لەئێوە کرد سورەتی (الأنفال) کە پێـڕی (مـەثانییـە)و سورەتی (براءة) کە لەپێڕی (میئین)ە جوتتان کردونو، (بسم الله الرحمن الرحیم)تـان لەنێوان دا نەنووسیوەو خستوتاننە پێڕی حـەوت سورەتە درێژەکانـەوە؟ هەڵبەتـە ئیمامی عوسمان وەڵامی (حبر الأمة)ی داوەتەوە. کتێبە تەفسیرەکانی (مەنار) و(روح المعانی) بەدورو درێژی بەڵام ئێمە راگوێزی ئێرەمان نەکردن.

یەکێ لەوەڵامەکان ئەوەیە: کە (الأنفال) بۆیـە پـێش (بـراءة) خـراوە چونکە: (بـسم الله)ی لەپێـشەوەیە (بـراءة)ش (بـسم الله)ی نیـە کـەوابێ (الأنفـال)و (بـراءة) هـەردوکیان بەیـەك سـورەت حـسێب دەکـرێنو بەیەکـەوە دەچـنە پێـڕی سـورەتە درێژەکانەوە!!

## یاسای دابەشکردنی دەسکەوتی شەڕو دەستنیشانکردنی رەوشتی موسوڵمانان

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ

يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی یەکەم، ئەحمەدو ئیبنو حەببانو حاکیم لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: موسوڵمانان دەربارەی دەسکەوتەکانی جەنگی بەدر کێشەیان تێکەوتو لەچۆنیەتی دابەشکردنی دا راجیبیان تێدا پەیدا بوو، پرسیاریان لەپێغەمبەرﷺ کرد چۆن دابەشی بکەنو کێ حوکمی تێدا بکا، ئایا بۆ کۆچکەرانە یان بۆ یارمەتیدەران (الأنصار)ە، یان بۆ هەردولایانە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ئیمامی ئەحمەد لەئەبو ئومامەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: دەربارەی ئەنفال پرسیارم لەعوبادەی کوڕی صامیت کرد لەوەڵام دا وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی جەنگاوەرانی بەدر هاتۆتە خوارێ، کاتێك لەبارەی دەسکەوتی جەنگەکە کێشەمان تێکەوتو رەوشتی ناشیرینمان تێدا نواند! ئیتر پەروەردگار دەسەڵاتو دارایی دابەشکردنەکەی لەدەستی ئێمە دەرهێناو خستیە ژێر دەستی پێغەمبەرەوەﷺ ئەویش بەیەکسانی بەسەر موسوڵمانان دا دابەشی کرد.

ئەبوداوودو نەسائیو ئیبنوحەببانو حاکیم لەئیبنوعەبباسەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك لەئێوە کافرێك بکوژێ ئەوەو ئەوەی دەدرێتیو هی خۆیەتی، کەسێك کافرێك دیل بکا، ئەوەو ئەوەی هی خۆیەتی: ئیتر گەنجەکان هەڵمەتیان بردو پەلاماری سوپای کافرەکانیاندا، پیرەکان لەلای ئاڵاکانیان مانەوەو پشتی جەبهەیان قایمو پتەو کرد، کە شەڕ تەواو بوو کافرەکان شکانو دەسکەوت کۆکرایەوە، جەنگاوەران هاتن هەریەکەیان داوای بەشی خۆی دەکرد، پیرەکان، وتیان: ئێمەتان لەیاد بێ، ئێمە پشتیوانتان بووین، ئەگەر بشکانایە بۆ لای ئێمە دەگەڕانەوە، ئێمە بەرگریمان لێ دەکردن، کێشەیان تێکەوتو هەریەکەیان رۆڵی خۆی لەسەرکەوتنەکە دا دیاری دەکرد، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ........الآية﴾.

ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی لەسەعدی کوڕی ئەبو وەققاصەوە

ریوایەت دەکەن، دەڵێ سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص: سەعیدی کوڕی (عاص)ی کوشتو شمشێرەکەی هەڵگرت، ئەمجار داوای لەپێغەمبەر کردﷺ کە پێی ببەخشێ، ئەویش نەیدایە، ئەم ئایەتە ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ........﴾ دەربارەی ئەوە نازڵ بوو، پاشان پێغەمبەرﷺ شمشێرەکەی پێ بەخشی.

ئەم ریوایەتانە، هەموویان ئەوە دەگەیەنن، کە ئەم ئایەتە دەربارەی دەسکەوتەکانی جەنگی بەدر هاتۆتە خوارێ، وەهیچ دژایەتیەك لەنێوان ریوایەتەکان دا نیە، تەنیا ئەوەندە هەیە، بڕێ ریوایەت هۆکاری تایبەتی باس دەکەن هەندێکیان هۆکاری گشتی! چ مانیعێکیش نیە کە هەموو هۆکارەکە هەبووبن.

ئیمامی جەصصاص لەئەحکامولقورئان دا دەڵێ: ئەوەی راستو دروستە ئەوەیە: پێغەمبەرﷺ پێش رووداني جەنگەکە هیچی دەربارەی دەسکەوتەکانی جەنگ نەفەرمووە، کاتێك جەنگ تەواو بوو، هاوەڵان لەچۆنیەتی دابەشکردنەکەی دا کێشەیان تێکەوت، ئیتر پەروەردگار ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ﴾ی ناردە خوارێ. دەسەڵاتی دابەشکردنی بە پێغەمبەر ﷺ سپارد، بەئارەزۆی خۆی دابەشی بکا، ئەویش بەیەکسانی دابەشی کرد بەسەریاندا. شایانی باسە حەڵاڵبوونی دەسکەوت بۆ جەنگاوەران یاسایەکی تایبەتییە بەموسوڵمانانەوەو بۆ هیچ گەلو نەتەوەی پێغەمبەرێکی تر رەوانەبوە. بەڵگەمان لەسەر ئەم رایە، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرەﷺ کە لەصەحیحەین دایەو جابیر ریوایەتی کردوە: دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أعطيت خمساً لم يعطهن أحد قبلي) تادەگاتە ئەوە: کە دەفەرموێ: (وأحلت لي الغنائم، ولم تحل لأحد قبلي) واتە: دەسکەوتی جەنگ بۆ منو ئۆمەتەکەم حەڵاڵ کراوە، بۆ هیچ پێغەمبەرێکی پێش من حەڵاڵ نەبوە.. بەهەر حاڵ ئێستا دێینە سەر راڤەکردنی ئایەتەکانو دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ﴾ ئەی موحەممەد! هاوەڵانت پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حوکمی دەسکەوتی شەڕ، کێ حوکمی تێدا دەکاو چۆن دابەش دەکرێ؟ ئایا دەدرێ بەگەنجەکان، یان بەپیرەکان؟ یان دەدرێ بەکۆچکەران یان بەیارمەتیدەران، یان دەدرێ بەهەموانیان؟ ﴿قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: حوکمو بڕیار دەربارەی دەسکەوت هەر بۆ

خودایەو، چۆنی بوێ ئاوا بڕیار دەردەکا، ئەمجار بۆ پێغەمبەرە، بەگوێرەی فەرمانی خودا دابەشی دەکا بەسەرتاندا، بڕیارو حوکم دەربارەی دەسکەوتی جەنگو شتی تریش عائید بەخودایەو پێغەمبەر بەگوێرەی حوکمی خودا رەفتاری تێدا دەکا!!

هەڵبەتە ئەم ئایەتە ئایەتێکی موحکەمو موجمەلە، ئایەتێکی تر حوکمە ئیجمالییەکەی شی دەکاتەوە ئەویش ئایەتی ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾الأنفال/٤١ ئەم ئایەتە نەسخی ئایەتی پێشوو ناکاتەوە، بەڵکوو چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوتەکە دیاری دەکا، پێنجیەکی دەسکەوتەکە بۆ ئەوانەیە کە ئایەتەکە دیاری کردون، چوار بەش لەپێنج بەشەکەی بۆ جەنگاوەرانە.

سەرکردەو رابەری سوپا یان بڵێین: ئیمام- دەتوانێ پێش دەرکردنی پێنج یەکەکە،زێدە بەش بدا بەهەندێ جەنگاوەر، بەمەبەستی هەڵنانو تەشجیع کردن. ئەوەتا لەجەنگی حونەیندا وەکوو: شەیخانو ئەبوداوودو تیرمیذی لەئەبوقەتادەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لەو رۆژە دا فەرمووی (من قتل قتيلاً فله سلبه) هەرکەسێ شەڕ کەرێکی کافر بکوژێ، ئامێری شەڕکردنی کوژراوەکە بۆ خۆیەتی: یان ئەوەتا -وەکوو لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ کرد- ریوایەتکراوە لەسەعدی کوڕی ئەبووەققاصەوە دەڵێ: رۆژی جەنگی بەدر عومەیری برام شەهید بوو، ئەمنیش لەتۆڵەی ئەو (سەعیدی کوڕی ئەلعاص)م کوشتو شمشێرەکەم هەڵگرتو هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ وتم: قوربان! تەسکینی دڵم هاتو تۆڵەی خومم لەکافرەکان کردەوە، دە جەنابیشت ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە! پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەمە بەدەست منەو نەبەدەست تۆیە. شمشێرەکە دانێو بیخەرە پاڵ دەسکەوتەکانەوە، منیش بەناچاری دامنا، هەر خودا دەزانێ چەند دڵم نارەحەت بوو، براکەم شەهیدو دەسکەوتەکەشم لەکیس چوو، لەخزمەت پێغەمبەرﷺ دەرچوم زۆری پێنەچوو ئایەتی سورەتی ئەنفال هاتە خوارەوە، پێغەمبەرﷺ بانگی کردمو پێی فەرمووم: ئەی سەعد! داوای ئەو شمشێرەت لێ کردم، هی منیش نەبوو، نەمتوانی بتدەمێ، ئێستا بوو بەهی من، بۆ خۆتی ببە!

جا کە کاری دەستکەوت تایبەت بێ بە پەروەردگارەوە، حوکمو بڕیار بۆ ئەو

بیّو، پێغەمبەرﷺ بە پێی فەرمانی خودا هەڵسوکەوت بکا، ئەوا ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ ئێوە ترسی خوداتان هەبێ لەگوفتارو کردارتاندا، خۆ بپارێزن لەکێشەو نیزاعو دژایەتیکردنی یەکتری، وا مەکەن خودا لێتان بڕەنجێ، ڕاجیایی و کێشەو دوبەرەکی هەموو دەم زیانتان پێ دەگەیەنی و دەبێتە هۆی تێشکانو ژێرکەوتنتان لەبەرامبەر هێزی دوژمن.

﴿وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ﴾ پەیوەندی نێوان خۆتان ڕێکوپێك بکەن، هەموو حاڵو وەزعتان یەکێتی و تەبایی و خۆشەویستی بێ، یەکێتی و برایەتی لەناو خۆتان دا بلاوبکەنەوە، مەهێلن بناغەی برایەتی و هاریکاریتان تێك بچێ،

﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ لەبارەی چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوت پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەربن، بەڵکوو بۆ هەموو فەرمانو نەهییەکی خودا گەردنکەچ بن، فەرمانبەرداری هەموو حوکمو بڕیارێکی خوداو پێغەمبەری خودا بن. ئەم پابەندبوونو فەرمانبەردارییە بناغەی هەموو بەمرازگەیشتنو سەرفرازییەکی دونیاو قیامەتتانە! خۆشبەختی و کامەرانی کۆمەڵگای ئیسلامی پێوە بەندە.

.....چونکە کارکردن بەگوێرەی پەیامی خوداو پێغەمبەر، مانای یەکیەتی و برایەتی و پابەند بوون بەئەحکامی شەریعەتەوە بەنهێنی و بەئاشکرا لەدڵو دەروون دا دەچەسپێنێ، طاعەتی جەماوەر بۆ سەرکردایەتی دڵسۆزو لێهاتوو دەستەبەر دەکات.

سەرپێچیکردنی فەرمانی پێغەمبەرﷺ سەردەکێشێ بۆ ئاشووبو پشێوی لەناو کۆمەڵداو گەلو وڵات دەفەوتێنێ، سامو شەوکەتی موسوڵمانان قەلاچۆ دەکات، تەماع بەر دوژمنان دەنێ کە پەلاماریان بدەن.

کەوابێ پێویستە ئێوە فەرمانبەرداری ئەو سێ فەرمانە ئیلاهییانە بن ﴿إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواتان بەنامەی خودا هەیەو ئیمانتان تەواوو کامڵە، پابەندی ئەو فەرمانانە بن، چونکە بڕوا بەخوداو بەنامەی خودا داخوازی ئەو پابەند بوونەیە.، ئیمانی کامڵ ئەم ڕەوشتانە بەدی دێنێ، کەسێك بڕوای تەواو بێ، تەقواو ڕاستاڵی و ڕێکو پێکی لەهەڵسوکەوتی داو بەگوێکردنی فەرمانو

نەهییەکانی خوداو پێغەمبەر دەبێتە دروشمو ڕێبازی، شەرم دەکا لەخودا یاخی بێ، بیرو باوەڕەکەی هەڵیدەنێ بۆ طاعەتکردنی خودای خۆیو ڕێکخستنو ڕێکو پێك کردنی نێوان خۆیو غەیری......

ئەمجار پەروەردگار پێنج ڕەوشتی موسوڵمانان باس دەکا: کە دەبنە بەڵگە لەسەر پێویستی تەقواو، ڕێکخستنی نێوان موسوڵمانانو بەگوێکردنی خوداو پێغەمبەری خوداو فەرمووی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ﴾ موسوڵمانو خاوەن باوەڕانی حەقانیو ڕاستاڵ ئەوانەن کە ئەم پێنج ڕەوشتانەیان تێدا بن:

١- ﴿الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ بەتەواوی لەخودا بترسن، ئەوانەی هەر کاتێ یادی خودایان بەدڵ دا هات، لەبەر گەورەیو دەسەڵاتو بەتوانایی ئەو پەروەردگارەو ترسان لێی موچوڕکەیان پێدا بێ، بیری هەڕەشەو بەڵێنەکانی بکەنەوە، بەتەواوی ترسیان لێ بنیشیو پێستیان گرژ بیو دیاردەی ترسانیان پێوە دیار بێ، وەکوو لەئایەتێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ، الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ.....﴾الحج/٣٤-٣٥ ئەمە بەلەرزەکەوتنی ویژدانە لەناخەوە، ڕاچەنینێکە لەکاتێك دا ئادەمیزادی موسوڵمان خودای بیر دەکەوێتەوە، ئەمرو نەهییەکی ئەو زاتەی دەکەوێتەوە یاد، ئەو ڕاچەنینە بەتەوژمە، دڵی دەهەژێنێو ترسی ئەو دەسەڵاتو شەوکەتە حەجمینی لێ هەڵدەگرێو لەترسان، لەعەیبەتان، هانا بۆ طاعەتو خودا پەرستی دەباو ملکەچیو بەندایەتی خۆی ڕادەگەیەنێ!

ئەمە حاڵەتێکە دڵ ڕادەگرێو پێویستی بەدوعاو پاڕانەوە لەخودا هەیە بۆ دامەزرانو پابەند بوون بەفەرمانو نەهی پەروەردگار.

٢- بەهێز بوونو زیاد بوونی ئیمان بەهۆی قورئانخوێندن بەسەریاندا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ هەر کاتێ ئایاتی پەروەردگار -کە نێردراون بۆ سەر پێغەمبەری خۆی- بەسەریان دا دەخوێندرێتەوە، ئیمانیان زیاد دەکاو بەهێز دەبێ، بۆ ئەنجامدانی کاری پەسند چوستو چالاك دەبن، یەقینو بڕوایان زۆر پتەو دەبێ، ڕودەکەنە کردنی کرداری چاكو پەسند، چونکە زۆر بوونی بەڵگەو نیشانەو یادکردنەوەیان سەردەکێشێ بۆ زیادبوونی یەقینو بڕوا، لەم ڕووەوە کە بینینی چاویان هەسکردن بەهەستیارەکانی تر قەناعەتی دڵو دەروون

زیاد دەکەن! ئەوەتا حەزرەتی ئیبراهیم وێڕای ئەوەی کە خاوەن باوەڕبوو، دڵنیابوو لەهەبوونی خوداو گەیشتبوە پلەوپایەی پێغەمبەری کەچی داوای کرد پەروەردگار چۆنیەتی مردوو زیندو کردنەوەی نیشان بداو بەچاوی سەر ببینێ ﴿قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾البقرة/ ٢٦٠ پەروەردگار پێی فەرمووە بۆچی بڕوات نیە کە خودا مردوو زیندوو دەکاتەوە؟ حەزرەتی ئیبراهیم لەوەڵام دا وتی: بەڵێ، بڕوام هەیە کە پەروەردگار دەتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوەو زیندووشیان دەکاتەوە. بەڵام دەمەوێ زیاتر دڵنیابمو بڕوام پتەوبێ....

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پلەوپایەی دڵنیابوون لەئیمان دا لەژوور ئیمانی ڕواڵەتییەوەیەوە. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَاناً مَّعَ إِيمَانِهِمْ﴾الفتح/٤ یان ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَـذِهِ إِيمَاناً فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾التوبة/١٢٤ زانیاری تەفصیلی لەئیمان دا بەهێز ترە لەزانیاری ئیمانی ئیجمالی، ئیمانێك کە لەڕێگەی عیلمو زانستەوە پەیدابووبێ بەهێزترە لەئیمانی کەسێك کە کوێرانەو بەلاسایی کردنەوە پەیدا بووبێ، کەسێك ئیمانی وابێ کە خودا زاناو دانایەو هەموو شتێك دەزانێو سیستەمی ئاسمانەکانو زەوی بەقودرەتو دانایی خۆی هەڵدەسوڕێنێ، بەڵام کە پرسیاری لێ بکرێ لایەنێك لەم دەسەڵاتە شیبکاتەوە نەتوانێ چ شیکردنەوەیەکی تێدا بکا، ئەوە ئیمانو باوەڕی ئەم کابرایە ناگاتە ئیمانو باوەڕی زانایەکی شارەزا بە چۆنیەتی دابو نەرێتی خودا لەبوونەوەر دا کە بتوانێ لەهەموو جۆرو ڕەگەزو کروپەکانی مەخلوقاتدا دەسەڵاتو زانایيو دانایی خودا دەست نیشان بکا، بەتایبەتی لەم سەردەمە دا کە زانیاری مرۆڤ پێشکەوتووە، گەلێ نهێنی بوونەوەریان شیکردۆتەوە، زۆر لەزانایانی زانستە جیاجیاکان لەڕوانگەی زانیارییەکانەوە موسوڵمان بوون!!

٣- ﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ڕەوشتێکی تری ئەو موسوڵمانانە ئەوەیە: پشتو پەنایان هەر بەخودایە، بتمانە هەر بە ئەو دەکەن، هانا بۆ لای کەسی تر نابەن! پێویستی خۆیان هەر لەقاپی پەروەردگار داوا دەکەن! چونکە کەسێك دڵنیا بوو: کە

خودا هەڵسورێنەری کاروباریەتی، بەڵکوو بەرێوەبەرو کارگێڕی هەموو بونەوەرە هەرگیز هیچ شتێك پاڵ غەیری خودا ناداو هەموو کارو هەڵسو کەوتێکی بەپشتیوانی زاتی پاکی ئەو ئەنجام دەدا، جاکە شەرعو عەقڵ هەردوکیان پێیان وابێ کە ئینسان کەسبی ئیختیاری هەیەو، خودا ئەرکی خستۆتە سەر، کە بەویستی خۆی لەچوار چێوەی دەسەلاتو توانای خۆیدا کاربکاو پاداشو سزای لەسەر لەسەر کردارەکانی دەدرێتەوە: چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە، ئەوە پێویستە ئادەمیزاد هەوڵ بدا بۆ ئەنجامدانی کاروباری خۆی بەگوێرەی ئەو یاسایەی خودا دایناوە لەنیوان سەبەبو موسەبەبدا، دەبێ بڕواشی وابێ کە پەیوەندی نێوان (سبب) و (مسبب)یش هەر بەدەست پەروەردگارە، ئەو ئاکامو نەتیجەی لێیان پەیدا دەبێ فەضلو بەخششێکی خودایە: کە فێری کردوە ئەو هۆکارانە بەکاردێنێ بۆ گەیشتن بەو ئاکامانە. هەڵبەتە وازهێنان لەبەکارهێنانی ئەسبابو خۆپاراستن لەپەیڕەوکردنی سونەنی پەروەردگار لەبوونەوەر دا نیشانەی نەزانیو نەفامییە بەرامبەر بەخوداو بەرامبەر بەئاینی خوداو بەدابو نەرێتی خودا لەبوونەوەر دا کە هەرگیز گۆڕانو لادانیان بەسەر دا نایە.

پێویستە ئەوە بزانین: کە نابێ پشت بەستن بەخودا ببێتە لەمپەرو بەربەست، لەبەکارهێنانی ئەسباب بۆ ئەنجامدانی کارەکانمان، بەڵکوو موسوڵمان هەر لەروانگەی ئیمان بەخوداو پەیڕەوکردنی فەرمانەکانیانەوە ئەسباب بەکاردێنێ، بەڵام بڕوای بەوە نیە کە ئەسبابەکان ئاکامو نەتیجەکان بەدی دەهێنن! بەڵکوو ئەوەی نەتیجەکە دێنێتە دیو سەبەبەکە دەڕەخسێنێ بریتییە لەقودرەتو دەسەلاتی پەروەردگار، هەردوکیان (سببو مسبب) خودا دەیانخوڵقێنێ..... کەوابوو لەهەستی موسوڵمان دا بەکارهێنانی سەبەب عیبادەتو خودا پەرستییە، بەدیهێنانی ئاکامەکەشی بەویستو قەدەری خودایە، جگە لەخودا هیچ کەسێكو هیچ شتێك نیە دەسەلاتی بەدیهێنانی هەبێ!! ئابەم شێوە هەستی موسوڵمان رزگاری دەبێ، لەوەی ئەسباب بەبەدیهێنەر بزانیو پێی وابێ ئەو هۆکارانە ئاکامەکە دەخولقێنن، لەهەمان کات دا بەگوێرەی توانای خۆی هۆکارەکان بەکاردێنێ بۆ ئەوەی پاداشی فەرمانبەردارییەکەی پەروەردگاری دەستکەوێ!

٤- ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ﴾ ئەوانەی نوێژەكانیان بەرێكو پێكی لەكاتی خۆی دا بەجێ دێنن، شێوەو ئەركانو هەیئەتەكانی بەتەواوی ئەنجام دەدەن، نییەتو راوەستانو ركوعو سوژدەو دانیشتەكانو خوێندنی قورئانو ذیكرەكان بەرێكو پێكی بەجێ دەهێنن، بەخوشوعو ئەدەبەوە، بەتێفكرینو شێوە ملكەچییەوە ئاخاوتن لەگەڵ پەروەردگار دا ئەنجام دەدەن، بەئەنجامدانی ئەم هەڵسوكەوتانە بەرو بوومی نوێژ دێتەدیو نوێژكەر واز لەتاوانو فەحشا دەهێنێو لەخراپە دوور دەكەوێتەوە.

٥- رەوشتی پێنجەمیان ئەوەیە كە ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ برێك لەو ماڵ، سامانەی پێمان داون دەبەخشن، زەكاتی واجب دەردەكەن، بژێوی خزمو ئاتاجان دەدەن، لەپێناو بەرژەوەندی گەلو وڵاتدا، بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی گشتیو سوود بەخش برێك لەماڵی خۆیان تەرخان دەكەن، هەر كارێك خێری تێدا بەدی بكەن هاوكاری تێدا دەكەنو ماڵی خۆیانی تێدا دەبەخشن!

ئەم رەوشتانە باسكران هەموو جۆرە خێرو سوودێك دەگرێتەوە، بۆیە دوابەدوای هێنانی رەوشتەكان فەرمووی: ﴿أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾ واتە: ئەوانەی ئەوە رەوشتو هەڵسوكەوتیانە، بیروباوەڕو هەڵوێستیان بەو جۆرەیە، هەر ئەوان - نەك كەسانی دیكە- موسوڵمانو خاوەن باوەڕی راستین، خاوەنی پلەوپایەی شكۆمەندن لەلای پەروەردگار.

طەبەرانی لە(الحارث)ی كوڕی مالیكی ئەلئەنصاری دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەلای پێغەمبەرداﷺ تێپەڕیم، بانگی لێ كردمو پێی فەرمووم: ئەی حارث وەزعت چۆنە؟ منیش عەرزم كرد سوپاس بۆ خودا بوومە خاوەن باوەڕی تەواو. فەرمووی: بزانە دەڵێی: چی؟ بێگومان هەموو شتێك حەقیقەتێكی هەیە، حەقیقەتی ئیمانتەواوی تۆ چیە؟! وتم وازم لەدونیا هێناوە زۆربەی شەو بەخەبەرم خەریكی شەو نوێژم، بەرۆژ بەڕۆژووەو خۆم تینو برسی دەكەم، وام لێ هاتووە دەڵێی چاوم لەعەرشی خودای خۆمە، چاوم لێیە دانیشتوانی بەهەشت هاموشۆی یەكتری دەكەن، هەر دەڵێی چاوم لەدۆزەخیانو گوێم لەناڵەو هاوارو فیغانیانە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی حارث! زانیوتەو پێی گەیشتووی بەردەوامبە! سێ جار ئەمەی فەرموو!

ریوایــەت کــراوە: پیاوێــك لەحەســەنی پرســی وتــی: ئــەی ئەبوســەعید! ئــەتۆ موسوڵمانیو، خاوەن باوەڕی؟ ئەویش پێی گوت ئیمان دوو ئیمانە. ئەگەر لەوەم لێ دەپرســی ئایــا ئیمــانم هەیــە بــەخوداو بەفریــشتەو بەنامــەکانی خــوداو بەپێغەمبەرانیو بەبەهەشت، دۆزەخو زیندوبوونەوەو حیسابو کیتاب ئەوە ئیمانم هەیەو خۆم بەموسوڵمانو خاوەن باوەڕ دەزانم! ئەگەر پرسیارم لەفەرموودەی پەروەردگار لێ دەکەی کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ تادەگاتە ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾ ئەوە بەخوا نازانم ئاخۆ من لەوپێڕەم یان نا؟!

ئــەمجار پــاش ئــەوەی پــەروەردگار ســیفەتەکانی دیــاری کــردن، پاداشــی پەزمەندەکراویان لای خودا دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ﴾ ئەوانــە لای پــەروەردگاری خۆیــانن بــەگوێرەی کردەوەکانیــان پلەوپایــەیان هەیە، ڕێزو نرخێکیان بۆ دیاری کراوە، هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چەندەو چۆنە، هــەر ئــەو دەتــوانێ ئــەو پاداشــە زۆرو بەنرخــە بداتــەوە، پــەروەردگار هەنــدێ ئادەمیزادی بەسەر هەندێکی تریان دا ڕێزدار کردوە، هەندێ پلەوپایە هەیە دەدرێ بــەبرێکیانو نــادرێ بــەوانی تــر!! تەنانــەت پێغەمبــەرانیش ڕێــزو پلەوپایــەیان جوداوازە هەندێ پلەوپایە هەیە دراوە بەئەمیان نەدراوە بەئەوانی تریان ﴿وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ هــەروەها لەلایــەن خــوداوە لێخۆشــبوون لــەتاوانی پێــشوویان دەکــرێ بەخەڵات، پەروەردگار لەخراپەکارییان خۆش دەبێ، لەسەر چاکەو کرداری باشیان ســوپاس دەکــرێن، رزقو رۆزی بەهەشــتیان دەدرێتــێ، خواردەمــەنی بــەتامو خوردنەوەی خۆشو گوارایان پێشکەش دەکرێ!

ئیمــامی (ضــحّاك) دەفــەرموێ: مانــای ﴿لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ﴾ واتــە: دانیشتوانی بەهەشت لەبارەی پلەوپایەو ڕێزەوە هەندێکیان لەژوور هەندێکیانەوەن ئــەوەی پلەوپایــەی بــەرزترە پلەوپایــەی خــوار خۆیــەوە دەبینــێ، بــەلام کــەس پلەوپایەی ئەوانەی لەژوور خۆیەوەن نابینێ. بۆ ئەوەی دڵیــان بــەخۆیان نــەمێنیو خــەمو خەفــەت نــەخۆن. هەربۆیــە لەصــەحیحین‌دا هــاتووە کــە پێغەمبــەرﷺ فەرموویەتی: (ان اهل علیین لیراهم من أسفل منهم، كما ترون الكوكب الغابر في أفق

مـن آفـاق الـسماء) دانیـشتوانی عیلـیین هێنـد دوورن ئەوانـەی لەخواریانـەوەن بەشێوەیەك چاویان لێیانـە، وەكوو چۆن تەماشای ئەستێرەیەك بكەن كە نزیكە لەكەناری ئاسمانەوە ئاوابێ. هاوەڵان وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەوە شوێن مەنزڵگای پێغەمبەرانە كەسی دی نایگاتێ: پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: بـەڵێ: سوێندم بەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە كەسانی دیكـەش دەیگـەنێ، كەسانێك بڕوایـان بـەخودا هـەبوبی‌و پێغەمبـەرانیان بەراسـت زانـیبن‌و شـوێنیان كـەوتبن لەفەرموودەیـەكی تـر دا كـە ئەحمـەدو خاوەنـانی سـونەنەكان لەئەبوسـەعیدی خودرییـەوە ریوایـەتیان كـردوە، دەڵێ: پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (ان أهـل الجنـة ليتراءون أهل الدرجات العلى، كما تراءون الكوكب الغابر في أفق الـسماء، وان أبـابكر وعمر منهم، وأنعما).

بـەڵێ موسـوڵمانان لەقیامـەت دا پلەوپایـەیان جـۆێ جوێیـە، هـەروەها پێغەمبەرانیش شوێن‌و مەنزڵگایان خوارو ژوورە، هەریەكـەیان پلەوپایـەی تایبـەتی خـۆی هەیـە، بەڵگـەمان زۆرن یـەكێك لـەو بەڵگانـە كـە خـوارو ژووری پلەوپایـەی پێغەمبەران دیاری دەكا ئەم ئایەتەیە: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ﴾البقـرة/٢٥٣ هـەروەها لەمزێـدە رێـزداری كۆچكەران‌و موجاهیدان دا دەفـەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ التوبـة/٢٠ هـەروەكوو چۆن لەجیهانیش دا پلەوپایەی ئادەمیزادان خواروژوورەو هەنـدێكیان دەوڵەمەنـدو هەندێ هەژار، ئەم باڵا بەرزو ئەو كورتەباڵا، ئەم جوان‌و ئـەو ناشیرین، فلان ئازاو لێهاتوو فیسار ترسنۆك‌و هیچ لەبارانەبوو........هتد.

قورئانیش دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾الأنفـال/١٦٥

## پێناخۆشبوونی بڕێ لەهاوەڵانی دەربارەی شەڕکردن لەگەڵ قورەیشییەکان لەبەدردا

﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨﴾ ﴾

سەرەتا دەمانەوێ لەڕوی ئیعرابەو تێکسەوە سوڕێکی خامە بەدەوری ﴿كَمَا أَخْرَجَكَ....﴾ دا بدەین و دەڵێین: هەڵبەتە کافەکە بۆ تەشبیهو لێکچواندنە، ئەم لێکچواندنەش سێ جۆری هەیە:

١- لەشوێنی (نەصب)بێ لەم رووەوە کە صیفەتی مەصدەرێکی حەزف کراو بێ، واتە: لەبنەما دا رستەکە بەم جۆرە بێ ﴿یجادلونك جدالاً اخرجك.....﴾.

٢- لەشوێنی (نەصب)بێ، لەم رووەوە کە صیفەتی مەصدەرێکی حەزف کراو بێ، لەناو دەقەکە دا ئاماژەی بۆ کراوەو دەیگەیەنێ واتە: رستەکە بەم جۆرە دەبێ: ﴿قل الأنفال ثابتة لله والرسول ثبوتاً كما أخرجك ربك....﴾

٣- دەکرێ: بڵێین: صیفەتی (حقا)نە لەرستەی ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقّاً﴾ واتە: وای لێ بکرێ ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقّاً كَمَا أَخْرَجَكَ﴾

ئیمـامی زومەخـشەری دەفـەرموێ: وێ دەچـێ بگـوترێ (مەحـەلی کافەکـە) مەرفوعەو خەبـەری موبتەدایـەکی حـەزف کـراوە، واتـە: لەئەصل دا رستەکە بـەم جۆرە بووە: ﴿هذا الحال كحال أخراجك....﴾ واتە ئەو حالەی کە لـەبرِی هاوەڵانت بینیـت دەربـارەی دابەشـکردنی دەسـکەوتی جـەنگـو پێناخۆشـبوونیان بـەو شـێوە دابەشکردنە وەکوو ئەو حاڵەیان وایە: کە پێیان ناخۆشبوو لەمەدینە دەرچووی بـۆ شەرِ لەگەڵ قورەیشییەکان. رستەی ﴿وَإِنَّ فَرِيقاً مِنْ الْمُـؤْمِنِينَ لَكَـارِهُونَ﴾ لەمەحـەلی نەصب دا دەبێتە حاڵ لەکافی ﴿أَخْرَجَكَ﴾.

موناسـەبە لـەنێوان ئـەم ئایەتانـەو ئایەتـەکانی پێـشوو دا لـەکافی ﴿كَمَـا أَخْرَجَـكَ﴾ دا خـۆی دەنـوێنێ. چـونکە کافەکـە بـۆ لێکـچواندنەو داخـوازی ئەوەیـە: شتێکی تر بەم (اخراج)ە بشوبهێندرێ، جوانترین شێوە لێکچواندنیش ئەوەیە: پـێ ناخۆشبوونی هاوەڵان بۆ بریاری دابەشکردنی دەسکەوتی جەنگ -هەرچەندە پێشی رازی بوون بشوبهێنین بەبێ ناخۆشبوونی ئـەوان بەرامبـەر دەرچوونت لـەماڵ بـۆ شەرِ کردن لەگەڵ قورەیشییەکان لەبەدردا. ئەوان بەناچاری بەبریاری دابەشکردنی دەسکەوتی جەنگ رازی بوون بەڵام لەواقیع دا پێیان ناخۆش بوو، هەر وەکوو چۆن خـودای تـۆ تـۆی لەلـەماڵ دەرهێنـا بـۆ جـەنگ کـردن لەگـەڵ کافرەکـان لەبـەدر دا هەرچەندە هاوەڵانت پێیان ناخۆش بوو.

لەلایەکی تـرەوە دەتـوانین لێکچواندنەکە بـەم شـێوە ئـەنجام بـدەین دەڵێین: صەلاحییەتی چۆنیەتی دابەشـکردنی دەسـکەوتی جـەنگ تایبـەتـە بـۆ تـۆو بەتۆیـە ئەی پێغەمبەر! وەکووو دەرهێنانی تۆ لەلایەن لەخوداوە کە لـەماڵی خـۆت بەحـەق دەرهێنـانیو بـەرەو جـەنگی بـەدر رەوانـەی کـردی. واتـە: دەربـارەی دابەشـکردنی دەسکەوتی جەنگ دەسـتبەکاربـەو کـاری خـۆت ئـەنجام بـدە بـا ئەوانـە پێشی رازی نەبن.

هەندێکیش دەڵێن: رستەی ﴿كَمَـا أَخْرَجَـكَ....﴾ پەیوەسـتە (موتەعەلەقـە) بەرستەی ﴿لَهُمْ دَرَجَاتٌ﴾ی پێشوو! ئـەو کاتـە ماناکـە بـەم جۆرە دەبـێ: ئـەم وادەو بەڵێنەی کـە ئێمـە دەیـدەین بەموسـوڵمانان دەربـارەی پلەوپایـەی رۆژی قیامـەتیان حەقو راستەو شکو گومانی تێدا نیە، وەکوو چۆن بەراستیو بەحەقیقـەت خـودای

تـۆ تـۆی لـەماڵی خـۆت دەرهێنـاو لەمەدینـە دەرچـووی بـۆ جـەنگ کـردن لەگـەڵ کافرەکانو بەسەر دوژمن دا زاڵی کردیو سەری خستی! وەکووو چۆن ئـەم وادەیـەی لەدونیا بۆ هێنایە دیو راست بوو، لەقیامەتیش دا ئەو وادەو بەڵێنانەی پێـی داون، بۆتان دێنێتە دیو بەمراز دەگەن!

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتی ژمـارە(٥) وەکـوو ئیبنـو ئـەبی حاتـەمو ئیبنومەردەوەیهی لەئەبوئەییوبی ئەلئەنـصارییەوە ریوایـەتی دەکـەن دەڵێ: هێشتا ئێمـە لەمەدینـە بـوینو پێغەمبـەرﷺ زانـی کـەوا کـاروانی ئەبوسـەفیان لەشـامەوە گەڕاوەتەوە، پێی فەرموین: ئێوە چی دەڵێن: ئەگـەر پـەلاماری ئـەو کاروانـە بـدەین بەڵکوو بیکەین بەدەستکەوتی خۆمانو خودا بەنسیبمان بکا؟ ئـیتر چـوینە دەرەوەو رۆژێك دوو رۆژ رۆیشتین

لەلایەکی ترەوە ئەبوسەفیان جاسووسو خەفیەی ناردبوون لـەپێش خۆیـەوە رێگای بۆ بەتاقی بکەنەوە، پاشان هەواڵی پێگەیشت کە موحەممەدﷺ بەهێزێکـەوە هاتووە پەلاماری کاروانەکە بدەنو بیانکەنە دەسکەوت.

کـە ئەبوسـوفیان بەمـەی زانـی هـەواڵی نـارد بـۆ مەککە بەهاوارییـەوە بـێنو رێگای کاروانەکەشی گۆڕی بەرێگایەکی تر دا بۆی دەرچووا!

قورەیشییەکانیش لەشکریان پێکەوەناو بـەرەو (بـەدر) هـاتن... ئەبوئـەییوبی ئەلئەنصاری دەڵێ: ئەمجار پێغەمبەرﷺ روی تێکردینو فەرمووی راتان چیە ئـەگەر جەنگیان لەگەڵ دا بکـەین؟؟ ئێمـەش وتمـان ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئێمـە توانـای شەڕکردنی ئـەو لەشـکرە زۆرەی ئـەوانمان نیـە ئێمـە هـاتووین پـەلاماری کاروانەکە بدەین. ئیتر میقداد هەڵسایە سەرپێو وتی: ئـەی هەڤاڵینـە! ئێوە وەکوو نەتـەوەی موسا ترسینۆك مەبنو مەڵێن: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّـا هَاهُنَـا قَاعِـدُونَ﴾ تـۆو خوداکەت بچن شەڕ بکەن ئێمـە لێـرە دادەنیـشین. ئـیتر پـەروەردگار ئایـەتی ﴿كَمَـا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِـالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقـاً مِـنْ الْمُـؤْمِنِينَ لَكَـارِهُونَ﴾ی نـاردە خـوارێ.

## کورتە باسێك دەربارەی چۆنیەتی بەرپابوونی جەنگی (بەدر)

کە بانگەوازی ئیسلامی لەمەککە دا بڵاو بوەوە، کۆمەڵێك لەقورەیشییەکانو هی تریش موسوڵمان بوون، قورەیشییە کافرەکان تەنگیان بەپێغەمبەرو هاوەڵانی هەڵچنی، پێغەمبەرﷺ لەتەك هاوەڵانی دا کۆچیان کرد بۆ مەدینە، چی ماڵو سامانیان هەبوو لەمەککە بۆ کافرەکانی قورەیشییان بەجێهێشت. ساڵی دووەمی کۆچی بوو، پێغەمبەرﷺ هەواڵی بیست کە کاروانێکی قورەیش بەچل قەتار چییەوە بەسەرکردایەتی ئەبوسوفیان بەکاڵاو سامانێکی زۆرەوە لەشامەوە دەگەڕێتەوە بەرەو مەککە، پێغەمبەرﷺ موسوڵمانانی هەڵنان بۆ ئەوەی بچن پەلاماری کاروانەکە بدەن، فەرمووی ئەوە کاروانێکی قورەیش بەماڵو کاڵایەکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بابچین بەری ڕێگایان پێ بگرین بەڵکوو خودا ئەو ماڵو سامانەمان دەست بخا!

پێغەمبەرﷺ لەگەڵ سێصەدو ئەومندە کەس لەهاوەڵانی ڕۆژی هەشتەمی مانگی رەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی لەمەدینە دەرچوو! بەرەو کەناری دەریا لەسەر ڕێگای بەدر کەوتنەڕێ جەنگاوەران هەشتاوسێ کەسیان لەکۆچەران بوون، شەصتویەك کەسیان لەهۆزی ئەوس بوون، ئەوانی تر لەهۆزی خەزرەج بوون،

لەلایەکی ترەوە ئەبوسوفیان کە لەشامەوە گەڕایەوەو لەوڵاتی حیجاز نزیك بوەوە، جاسووسو خەفیەی نارد بۆ ئەوەی ڕێگای بۆ تاقی بکەنەوە، ئیتر هەواڵی لەشکرکێشی پێغەمبەرو هاوەڵانی بیست، بۆیە یەکسەر ضەمضەمی کوڕی عەمری ئەلغەفاری نارد بۆ مەککەو داوای بەپیرەوە هاتنی لێ کردنو هەواڵی بۆ ناردن کە موحەممەدو هاوەڵانی ڕێگایان لەکاروانەکەی گرتووە. ئەوانیش خێرا نزیکەی هەزار کەسیان کۆکردەوەو بەهانای کاروانەکەوە هاتنو گەیشتنە سەر ئاوی بەدر.

ئەبووسوفیان هاوکات لەگەڵ ئەم هەواڵ ناردنو داوای کۆمەکی کردنە، ڕێگای کاروانەکەشی گۆڕیو قوتاری کردو بۆی دەرچوو! لەکاتێکا موسوڵمانان چاوەڕێی ئەوە بوون کاروانەکە بگاو بیگرن، هەواڵیان پێگەیشت کە کاروانەکە تێپەڕیوەو تازە دەستیان پێی ناگا، لەهەمان کات دا شەڕکەرانی قورەیش لێیان نزیك بوونەوەو لەوانەیە پەلاماریان بدەن!

ئەبوسوفیان کەرزگاری بوو، کاروانەکەی قوتار کرد، وەڵامی بۆ لەشکری قورەیشییەکان نارد، وتی: ئێوە بۆ رزگارکردنی کاروان لەشکرتان کردوە واتە: لەسایەی خوداوە کاروانەکە رزگاری بوو، دە ئێوەش بگەڕێنەوە بۆ مەککە. چەند کەسێکی تریش لەقورەیشییەکان ئەم رایەیان لا گەلاڵە بوبوو، کاتێ سەرکردەی لەشکری قورەیش، ئەبوجەهل بەمەی زانی وتی: نەخەیر شتی وانیەو نابێ، ئێمە ناگەڕێینەوە، تا لەسەر ناوی (بەدر) حوشتر سەر نەبڕینو شەرابو عەرەق نەخۆینەوە، ئێمە دەمێنینەوەو دەیکەین بەئاهەنگو سەیران، هەموو عەرەب بەم ئاهەنگو مانەوەمان بزانن، ئەم لەشکرکێشیو مانۆڕەمان ببیسنو کەس نەوێرێ جارێکی تر بەخەیاڵیش رێگە لەکاروانی ئێمە بگرێ! پێغەمبەرﷺ ئەم هەواڵانەی بیستو دەستی کرد بەراوێژ کردن لەگەڵ هاوەڵانیدا، حەزرەتی ئەبوبەکر قسەی خۆی کرد پەسەند بوو، حەزرەتی عومەر رای خۆی دەربڕیو پەسەند بوو، ئەمجار میقدادی کوڕی عەمر هەستایە سەرپێو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمانی چی پێ کردوی ئەنجامی بدە، وەکووو بەنوئیسرائیلی بەموسایان گوت، ئێمە نالێین: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾المائدة/٢٤. ئێمە دەلێین: فەرموو تۆو پەروەردگارت بچن بۆ جەنگ ئێمەش لەگەڵتا نین، سوێندمان بەو کەسەی تۆی کردوە بەپێغەمبەر ئەگەر بمانبەی بۆ (برك العماد) (شارێکی لەیەمەن) لەگەڵتاین (نەسرەوتن تا سەرکەوتن)

پێغەمبەرﷺ ئەم هەڵوێستەی زۆر پێخۆش بوو دوعای خێری بۆ کرد.

ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أشهدوا علی أیها الناس!) ئەی خەڵکینە! رای خۆتانم بۆ دەربڕن -مەبەستیشی یارمەتیدەران بوو، چونکە لەپەیمانی (العقبة) دا کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵی بەستبوون ئەوەی تێدا بوو کە لەناو مەدینە دا بەرگری لێ بکەنو یارمەتی بدەن، ترسی ئەوەی هەبوو کە لەدەرەوەی مەدینە ئەو کۆمەکییەی پێ نەکەن، هەروەکوو چۆن ئەم خاڵەیان لەپەیمانەکە دا بەمەرج گرتبوو..... ئیتر سەعدی کوڕی مەعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! واتە: دیارە مەبەستت ئێمەیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی بەڵێ: ئەمجا سەعد وتی: بێگومان ئێمە بڕوامان پێ کردویو شایەتیمان داوە، بەڵێنی خۆمانمان پێ داوی چی بفەرمووی بەقسەت

بکەین‌و فەرمانبەردارت بین! فەرمووی: خودا فەرمانی چی پێ کردووی ئەنجامی بدە! سوێندمان بەو کەسەی تۆی بەحەق‌و راستی ناردوەو پلەوپایەی پێغەمبەری پێ بەخشیوی، ئەگەر بەرەو دەریا بمانبەی‌و خۆتی تێ فڕێدەی ئێمەیش لەخزمەتتا خۆی تێ فڕێ دەدەین‌و یەکێکمان ناگەڕێینەوە، هیچ پێمان ناخۆش نیە کە سبەینێ بەرەوڕووی دوژمنمان بکەیەوە، ئێمە لەجەنگا خۆڕاگرین‌و کاتی بەرەو روبونەوە لەگەڵ دوژمن دا راسگۆین!! خوا یاربێ هەڵوێستو چالاکی وا لەئێمە دەبینی کەیف خۆش ببی‌و چاوت فێنکایی پێ دا بێ، پشتیوان بەخودا فەرموو پێشمان کەوە بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا. پێغەمبەر ﷺ بەم وتارەی سەعد دڵخۆش بوو فێنکایی بەدڵی هات. ئەمجار فەرمووی: بەپشتیوانی خودا بڕۆن بۆ جەنگ! هەر لەئێستاشەوەموژدەتان دەدەمێ: کە بێگومان پەروەردگار بەڵێنی یەکێك لەم دوانەی داومێ: یان کاروانی گەڕاوەو بارگران لەشامەوە بەسەرۆکایەتی ئەبوسوفیانمان دەستکەوت دەبێ، یان لەشکری بەهانا هاتووی کاروانەکە بەسەرۆکایەتی ئەبوجەهل تێك دەشکێنین. سوێندم بەخودا ئێستا من چاوم لەشوێنی هەریەکێ لەکوژراوانی دوژمنە، بەچاوی خۆم تێکشکانەکەیان دەبینم.....

بەهەرحاڵ پاش ئەم بەرکوڵە رێخۆشکەرە دەگەڕێینەوە بۆ سەر راڤەکردنی ئایەتەکان‌و دەست دەیکەین بەئایەتی ﴿كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِالْحَقِّ﴾ واتە: وەزع‌و حاڵی هاوەڵان لەوە دا کە پێیان ناخۆش بوو دەسکەوتەکانی جەنگ بەیەکسانی دابەش بکرێ وەکووو ئەو حاڵەیان وایە: پێیان ناخۆش بوو تۆ لەماڵ دەرچووی لەمەدینە بۆ شەڕ، بەراستی ئەم لەماڵ دەرچوونە شتێکی حەق‌و راست بوو، دانایی بوو، خێری تێدا بوو، خاڵی وەچەرخان بوو، جو دا کەرەوەی حەق‌و بەتاڵ بوو، ﴿وَإِنَّ فَرِيقاً مِنْ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ﴾ بێگومان کۆمەڵێك لەموسوڵمانان چوونە دەرەوەیان بۆ شەڕ بەلاوە ناخۆش بوو، چونکە ئامادەباشی شەڕیان تێدا نەبوو، خۆیان بۆ جەنگ ئامادە نەکرد بوو، کەوابوو پەروەردگار تۆی لەماڵ هێنایە دەر لەحاڵێك دا ئەو تاقمە هاوەڵانەت چوونە دەرەوەکەتیان بەلاوە ناخۆش بوو. لێکچواندنەکە لەنێوان دوو حاڵەکەدا پێ ناخۆشبوونە، چونکە بڕێ لەموسوڵمانەکان لە(بەدر) دا دوو شتیان بەلاوە ناخۆش بوو.

یەکەمیان: پێیان ناخۆش بوو دەسکەوتەکانی جەنگ وەکوو یەك بەسەریان دا دابەش بکرێ، ئەم پێناخۆشبوونە لەلایەن گەنجەکانەوە دیاریداو درکاندیان وتیان: ئێمە شەڕمان کردوەو دەسکەوتمان هەبوە.

دوەمیان: پێیان ناخۆش بوو شەڕ لەگەڵ لەشکری قورەیش بکەن، چونکە ئەوان لەمەدینە دەرچوون بەمەبەستی گرتنی کاروانو بۆ دەسکەوتنی کاڵاو ماڵو سامان، خۆیان بۆ شەڕ ئامادە نەکردبوو، ئێستا کە کاروان لەکیس چوەو لەشوێنی ئەوە تووشیان بووە بەتوشی لەشکری زۆرو پڕچەکو تەیارکراوی قورەیشەوە زوربەی زۆری هاوەڵان پێیان ناخۆش بوو شەڕ لەگەڵ لەشکری قورەیش بکەن، بەئاشکرا نارەزاییان پیشاندا، وتیان: ئیمە بۆ گرتنی کاروان هاتوین، هاتوین شەڕ لەگەڵ ئەو کۆمەڵە قەتار چییە کەمە بکەین کە لەگەڵ کاروانەکە دا بوون نەهاتوین شەڕ لەگەڵ ئەو لەشکرە زەبەلاحەی قورەیش دا بکەین کەسێ بەرامبەری هێزی ئێمەیە.

ئیتر پەروەردگار دەربارەی هەردوك حاڵەتەکان پێیان دەفەرموێ: ئێوە دەربارەی چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوتەکان کیشەتان تێکەوت، پەروەردگار لەژێر چنگی ئێوەی دەرهێناو، صەلاحیەتی دابەشکرنەکەی دا بەپێغەمبەرو، ئەویش بەیەکسانی بەسەری دا دابەش کردن، ئەمە بەرژەوەندی تەواوی ئێوەی تێدا بوو، هەروەها کاتێك ئێوە پێناخۆشبوونی خۆتان پیشان دا بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی دوژمن، ئاکامی پێناخۆشبوونەکەتان ئەوە بوو خودا ئەو شەڕەی بۆ ڕەخساندنو ئێوەو دوژمنی سەرسەختتانی لەبەدر دا بەیەك گەیاندو ئێوەی بەسەر ئەوان دا زاڵ کردو سەرکەوتنو سەرفرازی بەنسیب کردن.

بەکورتی سەرەنجامی هەردوو حاڵەتەکە ئەوە بوو بەگوێکردنی فەرمانی پێغەمبەرﷺ خێرو دەسکەوتو تەبایی‌و شکۆمەندی بوو بۆ موسوڵمانان!!

بێگومان پێناخۆشبوونی کۆمەڵێك لەهاوەڵان دەربارەی ڕوبەڕوبوونەوەی کافرەکان بەزەقی دیار بوو، هەرچەندە کاتێك پێغەمبەرﷺ راوێژی پێکردن، حەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عومەرو میقدادو سەعدی کوڕی مەعاذو کۆمەڵێکی تریش قسەی باشو گونجاویان کردن، ئازایەتی وچاو نەترسییان نواندو

پابەندبوونی خۆیان بۆ فەرمانی پێغەمبەرﷺ نیشاندا! بەڵام دیاردەی نارەزایی‌و پێناخۆشبوون لەدڵو دەروونی زوربەی هاوەڵان دا بەتەواوی پەردەی سەندو کەوتە ئاستێك کە قورئان دەربارەی دەفەرموێ: ﴿يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ﴾ ئەی موحەممەد! هاوەڵانت کێشەت لەگەڵ دەکەن دەربارەی روبەڕوبوونەوەی سوپای قورەیش، پاش ئەوەی بۆیان ئاشکرابوو، زانییان کە پەروەردگار بەڵێنی یەکێك لەدوو دەسکەوتی پێداون، جاکە ئێستا کاروانەکە لەکیس چووە، تەنیا جەنگان لەگەڵ لەشکرەکەیان لەبەردەمدایە، پێویستە روبەڕووی دوژمن ببنەوە، ئیتر پێویست ناکا دەمەودەمێ بکەنو بیانوو بهێننەوە، پێویست ناکا بڵێن: ئێمە ژمارەمان کەمەو پێداویستی جەنگمان وەکوو ئەوان نابێ، هیچ مافی ئەوەیان نیە جەدەل بەرپا بکەن بەتایبەتی پاش ئەوەی کە حەقو راستییان بۆ دەرکەوت، ئەو حەقەش بریتی بوو لەوەی کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێداون بەسەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر دوژمن دا کەوابێ هیچ بیانوو بەڵگەیان بەدەستەوە نیە جگە لەترسانو بێ ورەیی بەرامبەر دوژمن. تەنانەت ئەوانە لەکاتێك دا کە بەرەو جەنگی سەرفرازی دەچن ئەوەندە ترسو لەرزیان پێوە دیارە، ﴿كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾ دەڵێی بەرەو مردنی راستی رایان دەکێشنو کێشیان دەکەنو هۆکاری مردن بەچاوی خۆیان ببینو خەریکە زەندەقیان بچێ!! چونکە ئەوان کە سەیری هێزو تواناو ژمارەی خۆیان دەکەنو لەگەڵ ژمارەو هێزو توانای دوژمن دا بەراوردی دەکەن ئەو حەقیقەتەیان بۆ دەردەکەوێ: بەڵام پەروەردگار بەڵێنی بەپێغەمبەری خۆی‌و موسوڵمانان داوە: کە سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، ئاشکراشە بەڵێنی خودا پاشگەزبوونەوەی نیە، ئەو هۆکارە مادییانەی ئەوان حیسابیان بۆ دەکردن زۆر جار دەوریان نابێ، بەڵکوو زۆر جار وادەبێ ئاکامو سەرەنجام پێچەوانە دەشکێتەوە: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ پەروەردگار بەسەر هەموو شتێك دا خاوەن دەسەڵاتە، بەڵێ، بەو جۆرە پەروەردگار، بەڵێنی خۆی بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان هێنایە دی‌و سەرکەوتنیان بەدەست هێناو، ناو شۆرەتیان بەناو جیهان دا بڵاو بوەوە، لەدورو نزیك دوژمن لێیان دەترسا!!

﴿وَإِذْ يَعِدُكُمْ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ﴾ ئەی موسوڵمانینە! لەگەڵ پێغەمبەر دا بیر لەوە بکەنەوەو ئەوە بێننەوە یادی خۆتان، کە پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەر بەڵێنی ئەوەی پێدان کە بەسەر یەکێك لەو دوانە -کاروانەکە، یان لەشکرەکە- دا زاڵتان دەکاو دەبێتە دەسکەوتی ئێوەو بەئارەزوی خۆتان تەصەرروفی تێدا دەکەن. واتە یا کاروانەکە بەهەموو کاڵاکەیەوە دەبێتە دەسکەوتتان، یان بەسەر لەشکرەکە دا زاڵ دەبن، بەم شێوە زۆر لەپاڵەوانەکانیان دەکوژنو زۆریشیان بەدیل دەگرن وەلحال ﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ﴾ ئێوە داخوازی ئەوە بوون کە کاروانە بێ دڕکەکە بۆ ئێوە بیو دەسکەوتتان بێ، چونکە بێ نارەحەتیو بێ ماندونو شەڕ لەگەڵ دا کردن بۆتان دەستەبەر دەبوو، تەنیا چل قەتارچی شمشێر بەدەستی لەگەڵ بوو، ئەوانیش بەرامبەر هێزی سێسەدو ئەوەندە کەسی موسوڵمانان چ نەبوون! بەلام: ئەوەی لای ئادەمیزاد خەیاڵە، لای خودا بەتاڵە!

﴿وَيُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ﴾ پەروەردگار بەم بەڵێنەی کە پێی داون دەیەوێ شتێك بێتە ئاراوە کە جوداوازە لەویستی ئێوە، خودا دەیەوێ حەق بچەسپێنیو بەهۆی ئایاتی نازڵکراوی خۆیەوە بەرزی بکاتەوە، خواستی خودا وایە ئایینی ئیسلام دابمەزرێنیو رەگو ریشەی کافرەکان لەبێخ دەربێنێ بەکورتی ئێوە ویستان ماڵو سامانتان -بەبێ جەنگ دەست بکەوێ، ویستی پەروەردگاریش ئەوە بوو، کە کوفر بڕوخێو ئیسلام سەربکەوێ، بەتاڵ بڕواو حەق بچەسپێ! ئاشکراشە کە جەنگی بەدر کلیلی سەرکەوتنی ئیسلام بوو بەسەر کوفردا، خاڵی وەچەرخان بوو لەمێژووی پڕشانازیو سەروەری هاوەڵانی پێغەمبەردا..

زومەخشەری دەفەرموێ: واتە ئێوە سودو بەرژەوەندی کاتیتان دەوێ، نەتاندەویست خۆ لەشتێك بدەن کە تێدا ماندو ببنو ماڵی تێدا خەرج بکەن، پەروەردگاریش خواستی وابوو ئێوە شکۆمەند ببن، ئایینتان بچەسپێ، حەق سەرکەوێ، سەرفرازی دونیاو قیامەت بن. ئاشکراشە جوداوازی نێوان خواستی ئێوەو خواستی خودا عاسمانو رێسمانە! بۆیە پەروەردگار کۆمەڵی خاوەن دڕکی بۆ ئێوە هەڵبژارد ویستی وابوو ئێوە لەگەڵ ئەو لەشکرە بەهێزەی دوژمن بجەنگن،

ئێوەی کەم‌و بێ هێزی بەسەر ئەوانی زۆرو بەهێزدا زاڵ کرد زۆرو هێزی ئەوانی بەکەمی‌و بێ هێزی ئێوە شکاند، ئێوەی سەرفرازو سەرکەوتوو کرد ئەوانی زەلیل‌و ریسوا کرد..!! پەروەردگار ئەوەی کرد کە کردی، بەڵێنی ئەوەی پێدان کە پێی دان، موسوڵمانانی زاڵ کردو سەرفرازی کردن ﴿لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ﴾ بۆ ئەوەی حەق بچەسپێنێ، ئیسلام دابمەزرێنێ‌و، بڵاوی بکاتەوە، شیرك‌و كوفرو بێدینی لەناوبەری‌و پوچەڵیان بکاتەوە، هەرچەندە کافرو سەرپێچیکاران پێیان ناخۆشبێ!!

هەڵبەتە ئەم مەبەستو ئاکامە پیرۆزانە بەدەست بەسەراگرتنی کاروان دەستەبەر نابن، بەڵکوو بەکوشتن‌و لەناوبردنی سەرانی کوفر دێتە جێ، بەتێشکاندنی ئەوانەی لەمەککەوە لەشکریان هێناوە ئێوە لەناوبەرن‌و قەڵاچۆتان بکەن، ئەو مەبەستە پیرۆزانە دێنە دی!

## کۆمەکیرکردنی فریشتە لەجەنگی بەدردا، هەنۆزو خەوەنوچکەی هاوەڵان‌و بارانبارین بەسەریاندا

﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ١٠ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ

ٱلۡأَقۡدَامَ ﴿١١﴾ إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٤﴾

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتانـە بەئایەتـەکانی پێـشووەوە ئەوەیـە: پـەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوو دا ئەوەی ڕاگەیانـد: کـە حـەق‌و ڕاسـتی دەچەسـپێنێ‌و، ئـایینی ئیسلام دادەمەزرێنێ، کوفرو بێدینی لەبێخ دەردێنـێ، ئـەمجار لێـرە دا ئـەوە بـەیان دەکا کە کـاتێ موسـوڵمانان داوای کۆمـەکییان لێ کـرا بەهانایانـەوە هـاتو فریـشتەی ناردە کۆمەکی!!

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، ئەحمەدو تـیرمیـذی‌و ئیبنوجـەریرو ئیبنو ئەبی حاتـەم لەعومـەری کوڕی خەتتابـەوە دەگێڕنـەوە دەفـەرموێ: کـەرۆژی (بەدر) هات، پێغەمبەرﷺ سەیرێکی هاوەڵانی کرد، سێ‌سەدو ئەوەندە کەسـە بـوون، سـەیری موشـریکەکانی کـرد لـەژور هـەزارەوە بـوون، ئـیتر پێغەمبـەرﷺ ڕوی کـردە قیبلە عـەباو ئیزارەکـەی بەسـەر شـانەوە بـوون، پاشـان فـەرمووی: (اللّهـم أنجـز لـي ماوعدتني، اللّهم ان تهلك هذه العصابة من اهل الأسلام فلا تعبد في الأرض ابداً) ئەمجار حـــەزرەتی عومـــەر دەڵـــێ: پێغەمبـــەرﷺ درێـــژەی بەپارانەوەکـــەی داو لـــەخودا دەپارایەوە، ئەوەندە دوو دەسـتی بـەرز کردنـەوە عەباکـەی لەشانی کەوتـە خـوارێ، حـەزرەتی ئـەبو بـەکر هـات عەباکـەی بەسـەر شـانی پـیرۆزی دادایـەوەو لەپاشـیەوە وەستا، ئەمجار فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا! بەستە پاڕانـەوە لـەخودا، بێگومـان

زاتی حەق ئەو وادەو بەڵێنەی پێی داوی بۆت جێبەجێ دەکا، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ.....﴾. جاکە ئەو رۆژە جەنگ بەرپا بوو، پەروەردگار موشریکەکانی شکاندن، حەفتا جەنگاوەریان لێ کوژرا، حەفتا کەسی تریشیان بەدیل گیرا!

ئیمامی بوخاری لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ رۆژی بەدر فەرمووی: (اللّهم انی أنشدك عهدك ووعدك، اللّهم ان شئت لم تُعْبَد) ئیتر ئەبوبەکر بەدەست گرتی‌و وتی قوربان پاڕانەوە بەسە! ئیتر پێغەمبەرﷺ هاتە دەرەوەو دەیفەرموو: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾البقرة/٤٥

جا بەم پێیە دەبێ ئیستیغاثەکە. لەپێغەمبەر خۆیەوە بوو بێ ئەمەش باوەو مەشهورە...

جاوەکووو دەڵێن: کاتێك هەردوو لەشکر بەرامبەر بەیەك ئامادە بوون‌و ریز بوون ئەبوجەهل وتی: خودایە! کێ لەسەر حەقە یارمەتی بدە! پێغەمبەریش ﷺ دەستی بەرز کردەوەو هەمان پاڕانەوەی فەرموو!

قسەیەکی تریش هەیە: دەڵێن: ئیستیغاثەکە لەلایەن کۆمەڵی موسوڵمانانەوە بووە، چونکە ترسی ئەوان لەهی پێغەمبەر زۆرتر بوو!

قسەو رای وێچوو ئەوەیە: دوعاو پاڕانەوەکە پێغەمبەرﷺ کردویەتی‌و موسوڵمانیش بەدڵ هەمان دوعایان دەکردو بەدەنگی بەرزیش دەیانگوت: ئامین!!!

بەهەرحاڵ لەئاکامی ئەو دوعاو پاڕانەوەیە دا پەروەردگار ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! یادی ئەو کاتە بکەنەوە کەهاناو پەناتان بۆ پەروەردگاری خۆتان برد، کاتێك زانیتان جگە لەروبەروبوونەوەی دوژمن‌و شەڕ لەگەڵ دا کردنی -هیچ رێگا چارەیەکی ترتان نیە، هاوارتان کردە خوداو لێی پاڕانەوەو، وتتان: خودایە! بەسەر دوژمن دا زاڵمان بکە، ئەی پشتو پەنای بێ نەوایان! فریامان بکەوە، ببە بەفریادڕەسمان‌و بەهانامانەوە وەرە!! مەبەستی ئایەتەکان بیرهێنانەوەی موسوڵمانانە بەفەضل‌و نیعمەتی خودا بەسەریاندا، بۆ ئەوەی سوپاسی بکەن‌و بزانن نیعمەتی خودا بەسەریانەوە چەند زۆرو زەبەندەن!

﴿فَاسْتَجَابَ لَكُمْ﴾ وەڵامی دوعاو پاڕانەوەکەی دانەوە، بەوە کە ﴿أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِنْ الْمَلائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ من کۆمەکی بەئێوە دەکەمو یارمەتیتان دەدەم بەهەزار فریشتەی بژاردەو ناودارو پیرۆزو یەکی یەکی.. کە بەڕیز بەشوێن یەك دا دێنو بازێکیان بەشوێن بازێکیان دا دادەبەزن، بڕێکیان دەگەنە جیو هی تریشیان بەشوێن دا دێن! ئەم هەزار فریشتە پێشەنگو پێشەتابوون، ئەمجار هی تریان بەشوێن دا هاتن، ژمارەیان بوو بەسێ هەزار فریشتە، پاشان بوون بەپێنج هەزار!! ئابەم شێوە راڤەکردنە واتە: ئەم هەزار فریشتەیەی ئێرە بەماقووڵو هەڵبژاردەو پیرۆزو پێشەنگ مانا بکەین بۆ ئەوەی لەگەڵ ﴿بِثَلاَثَةِ آلاَفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾آل‌عمران/١٢٤. و ﴿بَلَى إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلافٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾آل‌عمران/١٢٥. بگونجیو دژایەتی لەنێوان دەقەکانی بەدی نەکرێ.

هەڵبەتە دەربارەی کۆمەکی کردنی فریشتە بەموسوڵمانان لە بەدردا بەهەزار فریشە شتێکی چەسپاوەو قورئان بەئاشکراو بەدەقێکی روون ئاماژەی بۆ دەکا، بەلام ریوایەتی جۆراوجۆر لەم بوارە دا تێکەڵاوی‌و شێواندنێکیان تێدا هەیە، ریوایەتەکان لەنێوان ﴿مِنْ الْمَلائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ و ﴿مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ و ﴿مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ دا تێکەڵاوییەکیان تێدایە لەرستەی ﴿مِنْ الْمَلائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ مەبەست ئەو فریشتانەن کە خودا کردنی بەیارمەتیدەری موسوڵمانان لەجەنگی بەدردا، بەلام (منزلين) و (مسومين) کە لەسورەتی (آل‌عمران/١٢٤-١٢٥) دا هاتوون، لەسیاقی جەنگی ئوحو دا هێندراون، ئەوە بوو پێغەمبەرﷺ هەواڵی بەموسوڵمانان دا کە خودا بەفریشتە یارمەتیان دەدا، بەلام یارمەتیدانەکەی بەستەوە بەمەرجێك کە خۆڕاگری‌و تەقوا بوو دەی شەرتە کە نەهاتە دی‌و هاوەڵان خۆڕاگر نەبوونو وەصیەتی پێغەمبەریان پەیڕەو نەکرد کەوابوو مەشروطەکەش نەهاتۆتە دی‌و لەجەنگی ئوحوددا بەفریشتە کۆمەکی نەکراون[16] ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ

[16] ئەم باسەمان لەچوارچێوەی راڤەکردنی ئایەتی (١٢٤-١٢٥)ی آل‌عمران لەبەرگی دووەم جزمی سێ دا شیکردۆتەوە.

بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ﴾ پەروەردگار ناردنی ئەو فریشتانەی کە ناردنی بۆ کۆمەکی، کردی بەمزگێنی بۆ ئێوە، لەسەر زمانی پێغەمبەر هاتنی فریشتەی پێی ڕاگەیاندن، بۆ ئەوەی موژدە بێ بەسەرکەوتنتان، وە بۆ ئەوەی دڵتان دابمەزرێ‌و ئارام بگرێ، ترسی زۆری‌و بەهێزی دوژمنتان نەمێنێ، بەدڵێکی دامەزراوو پشت ئەستورەوە بەرەنگاری دوژمن ببنەوە، دڵنیابن لەسەرکەوتن‌و تێکشکاندنی دوژمن!

لەڕاستی دا پەروەردگار پێغەمبەری لەناردنی فریشتە بۆ کۆمەکیکردنی موسوڵمانان ئاگادار کردەوەو ئەویش بەهەڤاڵانی خۆی ڕاگەیاندوە، ئەگینا هیچ کامێ لەیاران بەچاو فریشتەیان نەدیوە.

هەرچەندە ڕیوایەت هەن: کە برێ لەهاوەڵان فریشتەکانیان دیون، تەنانەت ئەبووئوسەید کە یەکێکە لەئامادەبووانی بەدرو دوایی کوێر بووە -لێیەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەگەر ئیمڕۆ لەبەدرا لەگەڵتان بوومایەو چاوم ببینایە ئەو شوێنەم نیشان دەدان کە فریشتەی لێ بەدەر کەوتن!!

﴿وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ﴾ سەرکەوتنی ڕاستی‌و حەقیقی لەجەنگ دا هەر لای پەروەردگارە، بەدەست هیچ کەس نیە بێجگە لەخودا کەس ناتوانێ سەرخستن دابین بکاو کۆمەکی فەراهەم بێنێ جگە لەخودا، نەفریشتەو نەغەیری فریشتە لەهۆکارە ڕواڵەتیەکان بەبێ ڕەزامەندی خودا یارمەتیدان‌و سەرکەوتنیان پێ ئەنجام نادرێ ، هەموو کارێك‌و یارمەتیدانێك لەراستی دا خودا دەیکات‌و دەیخوڵقێنێ! ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار بەسەر هەموو شتێك دا باڵا دەستەو هیچی لێ عاسێ نابی‌و هەرچی بیەوێ دەیکا، داناو کار دروستە، هەرچی دیکا ڕاست‌و بەجێیە، هەموو شتێ لەکاتی خۆی دا ئەنجام دەدا، کاری بێ جێ ناکا!!

ئەمجار لێرە دا پرسیارێك سەر هەڵدەداو دەڵێ:

ئایا لەجەنگی بەدر دا فریشتە بەفیعلی هاوبەشی جەنگیان کردو دژی کافرەکان جەنگین؟؟

برێ لەزانایان لەوانە مامۆستا شێخ موحەممەد عەبدەو هەوا خواهانی پێیان وایە: کە فریشتەکان شەڕیان نەکردوە تەنیا ورەی موسوڵمانەکانیان بەرز کردۆتەوەو، قەبارەی سوپاکەیان زۆر کردوەو دڵی جەنگاوەرانیان بەهێز کردوە.

ئەگینا ئەگەر شەڕیان بکردایە تاقە فریشتەیەك بەس بوو، پێویست بەهەزارو زیاد لەهەزار نەبوو، فریشتەیەك دەیتوانی هەموو جیهان خاپوور بکا! ئەی ئەوە نیە حەزرەتی جوبرائیل بەپەڕە باڵێکی شارەکانی گەلی حەزرەتی لووطی تێکو پێکدا، گەلی ثەموودی بەیەك گرمە لەناوبردا......

زوربەی زانایانی ئیسلام دەڵێن: حەزرەتی جوبرائیل لەرۆژی بەدر دا هاتۆتە خواریو لەناو پێنج سەد فریشتەدا بووە، لەلای راستی سوپای موسوڵمانانەوە بووەو حەزرەتی ئەبوبەکریش لەو جەبهە بووە.

حەزرەتی میکائیلیش لەناو پێنجسەد فریشتە دا هاتۆتە خواریو لای چەپی سوپای موسوڵمانانیان گرتبوو عەلی کوڕی ئەبوطالیب لەو جەبهەوە بووە. هەموو ئەم فریشتانە لەشێوەو پیاوان دا بوونو پۆشاکی سپیو مێزەری سپیان بەسەرەوە، لفکەی مێزەرەکانیان بەناو شانیان دا بەردابووەوە بەفیعلی شەڕیان کرد!!؟

ئەم رایە باوو مەشهورەو لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەت کراوە، دەڵێ: پەروەردگار رۆژی بەدر پێغەمبەری خۆیو موسوڵمانانی بەهەزار فریشتە یارمەتیدا، جوبرائیل لەلایەکی ترەوە بوو ژمارەی ئەوانیش پێنجسەد فریشتە بوون میکائیل لەلایەکی ترەوە بوو ژمارەی ئەوانیش پێنجسەد فریشتە بوون.

ئەم رایە پەسەندەو، فەرموودەی پێغەمبەرﷺ لەم بارەوە زۆرنو پشتگیری ئەم رایە دەکەن.ئەگەر ئەم فەرموودانە نەبوونایە، رای شێخ موحەممەد عەبدەو هاوڕایانی زیاتر دەچێتە دڵەوە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەبوجەهل بەئیبنومەسعودی گوت: ئەو دەنگە لەکوێوە دەهات دەمان بیستو کەسمان نەدەدی؟؟ ئیبنومەسعود لەوەڵام دا فەرمووی: ئەوە لەفریشتەکانەوە بوو، ئەبوجەهل دەڵێ: کەوابێ ئەوان ئێمەیان شکاند نەك ئێوە.

هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن: کە لەجەنگی ئوحوود دا فریشتە هاوکاری شەڕیان نەکردوە، چونکە پەروەردگار -وەکوو وتمان- بەڵێنی سەرکەوتنو ناردنی فریشتە بۆ کۆمەکی پێ کردن پێدان، بەلام بەشەرتێك خۆگربنو، تەقواکاربنو سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر نەکەن، دەی زوربەی هاوەڵان شەرتەکەیان بەجێ نەهێنا، کەوابێ مەشروطەکەش نەهاتۆتە دی!!

هاوکاری کردنی فریشته بۆ موسوڵمانان لەجەنگی بەدر دا هیچ لەئازایەتیو نەبەردیو فیداکاری هاوەڵان کەم ناکاتەوە، چونکە ئەوان بەلێبوردوویی فیداکارییەوە بەرەنگاری دوژمن بوونەوە، بەئەوپەڕی نەبەردیو مەردایەتییەوە جەنگان، بەجۆرێك کەشایستەی هەموو وەسپو ئەناو ڕێزو نرخێکن!!

ئەوەتا لەصەحیحەین دا هاتووە: عومەری کوڕی خەتتاب کاتێك ویستی رای پێغەمبەرﷺ وەربگرێ دەربارەی کوشتنی (حاطب) کوڕی (أبی بەلتەعە) پێغەمبەر لەوەڵام دا فەمووی: (انه شهد بدراً، ومایدریك لعل الله قد اطلع علی اهل بدر، فقال: اعملوا ماشئتم، قد غفرت لکم) ئەو ئامادەی جەنگی بەدر بووە، چوزانی، بەڵکوو پەروەردگار بەئەهلی بەدری فەرموویێ: چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم.

بەکورتیو پوختی: هەرکاتێ پەروەردگار بیەوێ: فریشتە بنێرێ بۆ یارمەتیدانو کۆمەکی کردن بەموسوڵمانان، لەگەڵ ڕەحمەتو پیرۆزی مەعنەویی دا دەیان نێرێ، چۆنی بویو چەندێك توانایان بداتێ بەو شێوە دێن، ئەوەی پێیان سپێراوە ئەوە ئەنجام دەدەن، لەجەنگی بەدر دا فریشتە هاتنە خوارێ بەجۆرێك کە لەشکری موسوڵمانانیان سەرمەستو سەرفراز کرد، دڵنیاییان خستە نێو جەنگاوەرانەوە، بەراستی گۆڕەپانی مەیدانیان گرتو جیهادیان کرد، ئیتر پێویست ناکا کاتێ فریشتە هاتنە خوارێ خودا سونەتو باوی خۆی بگۆڕێ، ئەوەندە هێزو توانا بەفریشتە بدا بەجارێ دونیا وێران بکا، ویستی خودا وابووە کە بەو شێوە هاریکاری بکەنو لەو سنووره تێپەڕ نەکەن.........

بێگومان کاریگەری جەنگی بەدر لەسەر شانی قورەیشییەکان زۆر گران بوو، چونکە زوربەی زۆری پیاو ماقوڵو پاڵەوانو جەنگاوەرانیان بەدەستو شمشێری گەنجو لاوە موسوڵمانەکان کوژران، لووتی بەرزییان شکاندنو ریسوابوون، ئەم تێشکانو کوشتنو برینە سزای کوفرو سەرپێچیو لووتبەرزیو دڵرەقییان بووە، پەروەردگار گەلە پێشینەکانی کە پێغەمبەرانیان بەدرۆخستۆتەوە بەسزای ریشەکێش لەناوی بردون؟ گەلی نووحی بەتۆفان لەناوبرد، گەلی عادی بەرەشەبای سەختو زریان فەوتاند، گەلی ئەموودی بەگرمەو ناڵەی وێرانکەر لەناو برد،

قەومی لووطی بەرۆچوونی زەوی بەردەباران خەپکرد، نەتەوەی شوعەیبی بەهەورە تریشقەو باوو بۆران فەوتاند، گەلی فیرعەونی لەدەریا دا خنکاند!!

ئەمجار پەروەردگار دوای وەبیر هێنانەوەی موسوڵمانان دەربارەی نیعمەتی ناردنی فریشتە بۆ یارمەتیدانی موسوڵمانان، دوو نیعمەتی تری خۆی بەسەریان دا بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِنْهُ﴾ واتە: بیر لەنیعمەتەکانی خودا بکەنەوە کە بەسەری دا رشتن، کە یەکێك لەو نیعمەتانە هێنانی وەنەوزو خەوەنوچکە بوو بەسەرتاندا، بەجۆرێك خەوە نوچکە دایگرتن وەکوو پەردە دایپۆشین بۆ ئەوەی ئەمینیو دڵنیایی لەسەرکەوتن بکەوێتە دڵتانەوە، ئەو ترسو بیمەی کە لەبینینی ژمارە زۆری دوژمنو کەمی خۆیانەوە کەوتبوە دڵتانەوە بڕەوێتەوە، ماندویەتیو شەکەتی رێگایان نەمێنێ، چونکە کەسێك خەوەنوچکە دایگریو هەنۆز بیباتەوە، دیارە هەست بەترس ناکاو نیشاتو هێزی بۆتازە دەبێتەوە.

بەیهەقی لەدەلائیل دا فەموودەیەك لەئیمامی عەلییەوە دەگێڕێتەوە کە فەموویەتی: رۆژی جەنگی بەدر جگە لەمیقداد ئەسپ سوارمان تێدا نەبوو! ئەگەر تۆ سەیری ئێمەت بکردایە تێمان دا نەبوو نەنووستبیو خەوی لێ نەکەوتبێ جگە لەپێغەمبەرﷺ ئەو تەشریفی هەتا رۆژ بوەوە لەژێر درەختێك دا نوێژی دەکرد؟!

ئەم وەنەوزو خەوەنوچکەیە لەو شەوە دا بوو کە بۆ بەیانی شەڕەکە دەستی پێکرد، خەولێکەوتنو وەنەوزبردن بەشێوەیەکی سەرتاسەری بۆ ئەو کۆمەڵە قەرەباڵغەو لەو کاتە ترسناکە دا شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەر بوو، وەکووو موعجیزە وابوو! وێڕای ئەو کارە گرنگەی لەپێش ئەوان بوو خەو هاتنو وەنەوز داگرتن نیشانەی ئەوەبوو خودا ئارامیو بێ باکی خستە دڵو دەروونیانەوەو دڵنیایی پێ بەخشین، چونکە وەکوو دەگوترێ ئەمینیو دڵنیایی خەو هێنەرە، ترسو دڵەراوکی خەوڕەوێنەو خەوزڕێنە!

نیعمەتێکی تر لەنیعمەتەکانی خودا ئەوە بوو کە ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾ واتە: پەروەردگار باراندی بەسەرتان دا لەئاسمانەوە بارانێکی زۆر پڕ خێر، بۆیەش

ئەم بارانەی بەسەر دا باراندن تالەچڵکو چەپەڵیو لەبێ دەستنوێژیو لەسپێسی پاکتان بکاتەوەو رزگارتان بکا. هەروەها بۆ ئەوەی ختوکەو وەسوەسەی شەیتان لەدڵ دەربهاوێ کە لەوەپێش لەبێ ئاویو تینوایەتی دەیترساندنو هەروەها بۆ ئەوەی دڵتان قایم بکاو صەبرو ئارامی تێ بچێ، ئازایەتیو فیداکاریتان تێدا بخولقێنێ، قاچتان لەزەوی قایم ببیو ورەتان بەرز بێ.

**واتە**: **باران بارینەکە چوار جۆر سوودی بەموسوڵمانان گەیاند**:

١- پاکو تەمیزی جلو بەرگو روخسار.

٢- غوسڵی لەشگرانیو لابردنی بێ دەستنوێژی!

٣- وەدەرنانی وەسوەسەی شەیتان لەدڵو دەروون!

٤- رامکردنی دڵو دەروون لەسەر صەبرو ئارامیو قاچ وەستان لەسەر لمبەلان! کە بەئاسانی دەیانتوانی بەسەری دا هاتووچۆ بکەنو قاچیان لەلمبەکە دا رۆنەچێ، ئەگەر بارانەکە نەبوایە نەیاندەتوانی بەسەری دا برۆن!

ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنی کە هەنۆزو خەوەنوچکەکە پێش باران بارینەکە بووە، کە رێکەوتی شەوی حەڤدەی رەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بووە!!

موجاهیدو ئیبنو ئەبو نەجیح دەڵێن: بارانەکە پێش هەنۆزو خەوەنوچکەکە بووە.

ئیبنولونذیر لەرێگەی ئیبنوجەریری طەبەرییەوە لەئیبنوعەبباسەوە (رەزای خوای لێ بێت) دەگێرێتەوە: دەفەرموێ: لەسەرەتاوە موشریکەکان سەرچاوەو شوێنی ئاوەکانیان لەموسوڵمانەکان داگیر کردبووو خستبویانە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. موسوڵمانەکان لەبەر بێ ئاوی تینویان بوو، بەلەشگرانیو بێ دەستنوێژی نوێژیان کرد، شوێنەکەشیان لمبەلان بوو بەناخۆشی دەیانتوانی بەسەریدا هاموشۆ بکەن. شەیتان وەسوەسەی خستە دڵی هاوەڵانەوەو وتی: ئێوە لای خۆتان پێغەمبەرتان لەناودایەو گوایە خۆشەویستی خودان؟! کەچی ئەوەتا تەنانەت ئاوی خواردنەوەو ئاوی دەستنوێژییشتان پێ رەوا نابینن؟ ئیتر پەروەردگار لەئاسمانەوە بارانی پڕ خێرو بەرەکەتی باراند، لافاو هەستان لەهەموو لایەکەوە ئاو زۆر بوو، موسوڵمانەکان ئاویان خواردەوە، خۆیان شتو پاکو خاوێنی خۆیان

ئەنجامدا، لەهەمان کات دا بارانەکە لمبەلآنەکەی کوتایەوە، بەجۆرێك کە بەئاسانی دەیانتوانی بەسەری دا هاموشۆ بکەن. ئیتر بەتەواوی وەسوەسەی شەیتانیان لەدڵ دەرچووا

ئیبنولقەیم دەفەرموێ: ئەو شەوە پەروەردگار بارانێکی وای باراند، بۆ کافرەکان بووە تۆفانو لێزمەیەکی وەها کە نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن، بۆ موسوڵمانانیش وەکوو رشێنەو بارانی بەهاری وابوو، خۆیان بەئاوی بارانەکە پاك کردەوە، وەسوەسەو ختوکەی شەیتانیان لەدڵ دا نەما، لمبەلآنەکەی کوتاو زەوییەکەی پەستاوت، قاچیان رۆنەدەچوو بەخۆشی دەیانتوانی بەسەری دا بڕۆن، پێغەمبەرو هاوەڵانی پێشڕەوییان کرد بۆ سەر ئەو ئاوەی بەهۆی بارانەکەوە کۆبوبووەوە، نیوە شەو خۆیان گەیاندە نزیکیو بەئەندازەی پێویستی خۆیان ئەستێراویان دروست کردن، ئاوەکەی تریان پڕ کردنەوەو وایان لێ کردن سوودیان لێ وەرنەگیرێ! پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی بارەگای خۆیان لەسەر ئاوەکە داناو، بەسەر تەپۆڵکەیەکەوە کە دەیڕوانییە گۆڕەپانی شەڕەکە شوێنو سەنگەرو ساباتێکیان بۆ بارەگای پێغەمبەر پێکەوەنا، ئەمجار پێغەمبەرﷺ بەناو گۆڕەپانی شەڕەکە دا گەڕاو شوێنی کوژراوانی کافرەکانی یەکە یەکە دەست نیشان کردو فەرمووی: خودا یار بێ ئەوە شوێنی کوژرانی فلآنەو ئەمە شوێنی سەرنگری بوونی فلتانە..... هتد دوایی کە شەڕ دامەزرا، پێغەمبەرﷺ چۆنی دەست نیشان کردبوو ئاوا هەریەکەیانی لەو شوێنە دا کوژران!

ئیبنوئیسحاق لەسیرەکەی دا هەروا ئیبنوهیشامیش، دەڵێن: کاتێك پێغەمبەرﷺ بەرەو بەدر بەڕێکەوت گەیشتە بەدر، لەسەر یەکەم ئاو کە بینیان بارگەی خست، حوبابی کوڕی مونذیر چووە خزمەتیو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا جەنابت ئەم شوێنە دەبینی؟ ئایا ئەم شوێنە شوێنێکە خودا بۆی دیاری کردووی؟ بۆمان نیە ئێمە گۆڕانی تێدا بکەین؟ یان ئەمە رای خۆتەو فرتو فێڵی شەڕە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ: ئەمە فرتو فێڵی شەڕە. حوباب وتی: دەی کەوابێ ئەم شوێنە بۆ ئێمە ناگونجیو بەرژەوەندی ئێمەی بۆ شەڕ تێدا نیە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بەهاوەڵان بفەرموو: باخۆ بپێچینەوەو بڕۆین تا دەگەینە ئاخر ئاوێ کە لەدوژمنەوە نزیکە لەوێ بارەگا دەخەین گۆلاوو

ئەستێراوەکانی تر پڕ دەکەینەوە، گۆلاوو ئەستێراوی ژێر دەستی خۆمان ڕێکو پێك دەکەین، ئێمە ئاومان دەبیو ئەوان ئاویان نابێ!! پێغەمبەرﷺ ڕایەکەی پەسند کردو فەرمانی دا بەئەنجامدانی.[١٧]

ریوایەتی تر هەیە، دەڵێ: باران بارینەکە پێش ئەوە بووە بگەنە بەدر[١٨] ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ واتە: پەروەردگار هێزی ئەژنۆتان دەداتیو قاچتان لەزەوی قایم دەکا بەهۆی باران بارینو پەستاوتنی لمبەلأنەکە، لەکاتی شەڕوبەرەنگار بونەوەی دوژمن، کەلەو شەڕو جەنگە دا پەروەردگار نیگای بۆ فریشتە کرد کەمن وام لەگەڵ ئێوەدا، بەیارمەتیو کۆمەکی کردن بۆ موسوڵمانەکان ئێوەش ئەی فریشتە! دڵی موسوڵمانەکان قایم بکەنو لەسەرجیهاد کردنو تێکۆشان دایان بمەزرێنن! .مەبەست بەلەگەڵ بوون، لەگەڵ بونی یارمەتیدانو کۆمەکیکردنو پشگیری کردنە لەکاتی ناخۆشیو جەنگدا، ئەمە نیعمەتێکی پەنامەکیو شاراوەیە پەروەردگار ئاشکرای کرد: بۆئەوەی موسوڵمانەکان سوپاسی بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە ...

یان ئەی موسوڵمانینە! یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە پەروەردگار نیگای بۆ فریشتەکان کرد، کە ئەو لەگەڵ موسوڵمانانداییەو، ئێوەش ئەی فریشتەکان! یارمەتیان بدەنو لەمەیدانی جەنگدا جێگیریان بکەن!

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەم مانایەی ئەخیریان وێچوترە چونکە مەبەست لەناردنی فریشتە لابردنی ترسو بیمە لەدڵی موسوڵمانان دا، دەی خۆ ئاشکرایە کە فریشتە لەکافرەکان نەترساون بەڵکوو ئەوانەی ترساونو خودا ویستویەتی ترسیان لەدڵ دەربهاوێ موسوڵمانەکان بوون!

ئیتر فریشتەکان دڵ ئارامیو خۆگرییان خستە دڵی موسوڵمانانەوە ورەو عەزیمەتییان بەهێز کردن، بەڵێنو پەیمانی خودایان وەبیر هێنانەوە، کە بەڵێنی داوە یارمەتی پێغەمبەرەکەی بداو موسوڵمانان سەربخا هەرگیز خوداش لەبەڵێنی خۆی پاشگەز نابێتەوە!!

---

[١٧] فی ظلال القران ج٢/٨١٨.

[١٨] تەفسیری قورطوبی ج٣٧٣.

ئەمجار ئایا یارمەتیدانی فریشتە چۆن بوەو چۆن نەبوە. هەندێك دەڵێن: خۆیان بردۆتە شێوەی پیاوانی ناسراو لەلای موسوڵمانەكانو لەشێوەی ئادەمیزاد دا یارمەتییان داون، بەیهەقی لە(الدلائل) دا ریوایەتی كردوە دەڵێ: فریشتە لەشێوەی پیاوێكی ناسراو دەهاتە لای موسوڵمانەكەو پێی دەگوت: موژدە بێ ئەوان هیچ نین، ئێوە خوداتان لەگەڵە، مەترسن هەڵمەتیان بۆ بەرن!

فریشتە ئازایەتیو چاونەترسی خستۆتە دڵی جەنگاوەرانەوە، وەسوەسەو ختوكەی شەیتانیان لەدڵی موسوڵمانەكان وەدەرناوە. واتە: وەكوو چۆن شەیتان هێزی وەسوەسە خستنی هەیە بۆ ناو دڵی ئادەمیزاد، فریشتەش هێزی پوچەڵكرنەوەی وەسوەسەی شەیتانی هەیەو، صەبرو ئارامی فرێ دەداتە ناو دڵی موسوڵمانانەوە. ئەمجار دەڵێ مەبەست بەرستەی (أنى معكم) ئەوەیە: دەفەرموێ: ئەی فریشتەكان! منیش لەگەڵ ئێوە ترسو بیم دەخەمە ناو دڵی كافرەكانەوە. بۆیە دوابەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ كە مانای(أنى معكم)شی دەكاتەوەو دەفەرموێ: من لەگەڵ ئێوەم ئەی فریشتەكان! ترسو بیم دخەمە ناو دڵی ئەوانەی كافرن.

ئەمجار ئێوەش ئەی خاوەن باوەڕان! یان ئەی فریشتەكان! -بەڵام خیطابەكە روبكاتە خاوەن باوەڕان باشترە- ﴿فَاضْرِبُوا فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ لەسەریان بدەنو بەشمشێر سەریان ببڕن، بدەن لەگێزەرەی ملیانو سەریان لێ بكەنەوە! لەپەنجەكانیان بدەن دەستو قاچیان بپەڕێنن.

ئەمجار پەروەردگار هۆی یارمەتیدانی موسوڵمانەكان بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ ئەم یارمەتیو كۆمەكی كردنە بەموسوڵمانان، ئەم كوشتنو بڕینە، ئەو هەموو ئازارو بڕینە بۆ كافرەكان بەهۆی ئەوەوە بوو كە ئەو بێ بڕوایانە زۆر دوژمنایەتی خوداو پێغەمبەریان كرد، پابەندی فەرمانی خودا نەبوون، شوێن پێغەمبەر نەكەوتن، زیاد لەوە دژایەتیشیان كردن. ئاشكراشە ﴿وَمَنْ يُشَاقِقْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ هەر كەسێ سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بكا، دوژمنایەتیو دژایەتی ئەوان بكا، ئەوە خودا بەرامبەر بەئەوان سزای سەختو بێ ئامانە..

کێ لەو کەسە شیاو ترە بەسزا کە شیرکو عیبادەتکردن بۆ طاغووت بۆخۆی هەڵبـژێری‌و واز لەیەکتاپەرستی‌و بەندایـەتیکردن بـۆ خـودا بێنـێ؟؟ دەسـتدرێژی بکاتە سەر خۆشەویستانی خوداو بەرپەرچی پەیامەکەیان بداتـەوە، لەسـەر مـاڵو سامانی خۆیان وەدەریان نێ؟؟

﴿ذَٰلِكُـمْ﴾ ئـەو سـزا بەپەلەیـەی کـە پـێم نۆشـین ئـەی گرۆهـی کـافرو سەرپێچیکاران! ئەو تێشکانو ریسوابوونەی بەسەرم هێنان لەسەر دەستی کۆمەڵێکی کەمو بێ چەکو بێ ئامێری شەڕ ﴿فَـذُوقُوهُ﴾ لـەدونیا دا ئـەو سـزایە بـچێژنو نـەم هێشت بەسەرتانەوە بچێ‌و مۆڵەتم نەدان، ﴿وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابَ النَّارِ﴾ دڵنیـابن کـە لەقیامـەت دا سـزای دۆزەخـم هەیـە، ئەگـەر بـەردەوام بـن لەسـەر کـوفرو بێـدینی، لەقیامەت دا ئەو سزایەتان دەدەم کە سزایەکی کوشندەو نەبڕاوەیە!

### ئایەتەکان لەسێ تەوەرە دا دەسوڕێنەوە:

١- ژماردنی نیعمەتەکانی خودا بەسەر موسوڵمانانەوە.

٢- فێرکردنی موسوڵمانان بۆ چۆنیەتی شەڕ.

٣- سزای سەرپێچیکاران.

### نیعمەتەکانی باسکراو لەم ئایەتانە دا دە نیعمەتن:

١- یارمەتیدان کاتێ هاواریان لێ کردو هانایان بۆ برد!

٢- هێنـانی حاڵـەتی هـەنۆزو خەومنوچـکە بەسـەریان دا لـەو شـەوە دا کـە بـۆ بەیانی شەڕ دەستی پێ کرد.

٣- بارانـدنی بـاران بـۆ خۆشـتن‌و دەسـتنوێژ گـرتن پـاکو خـاوێنی کـردن‌و ئـاو خواردنەوە.

٤- دڵ قایم کردن‌و لابردنی ترس‌و بیم لەدڵیان دا.

٥- جێگیر کردنی قاچیان لەسەر لمەلانەکە، کە بەهۆی بارانەکەوە کوترابوەوە.

٦- نیگا کردن بۆ فریشتە کە یارمەتی موسوڵمانان بدەن.

٧- ترس خستنە ناو دڵی کافرانەوە.

٨- فێر کردنی موسوڵمانان بۆ فێر بـوونی چۆنیەتی ئەنجامـدانی شـەڕ، لـەوە دا

رەنگ دەداتەوە کە پەروەردگار فەرمان بەموسوڵمانان دەکا: کە بەشمشێر لەملیان بدەن، دەستو پەنجەیان بقرتێنن، قاچیان ببڕنەوەو کۆڵەواریان بکەن.

٩- سزای سەرپێچی کردنو یاخی بوونیان لەخودا، تێشکانو ریسوا بوونیانە لەدونیاداو، سزای سەختی دۆزەخە لەقیامەت دا.

١٠- رێزو پلەوپایەی ئەهلی بەدر لەبەر خودی خۆیان نەبوە بەڵکوو لەبەر جیهادو فیداکارییانە.

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: بۆیان گێڕاوەتەوە کە جوبرائیل بەپێغەمبەری فەرمووە: ئەهلی بەدر لەنێو ئێوەی ئادەمیزاد دا چۆنن؟ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ئەوان لەناو ئێمە دا چاکەکانمانن، جوبرائیل فەرموویەتی لەناو ئێمەش دا هەمان پلەوپایەیان هەیە، ئەوەیش لەبەر خاتری جیهادوتێکۆشانیانە، گەورەترین جیهاد شەڕی بەدر بوو، چونکە ئیسلام دوای ئەو جەنگە پەرەی سەندو بڵاو بووەوە!

- ئایینی ئیسلام ژێر خاك کردنی لاشەی کوژراوانی دوژمنیشی بەپێویست داناوە، ئەوە بوو پاش کۆتایی هاتنی جەنگی بەدر پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە کوژراوانی قورەیش کە حەفتا کەس بوون، بیانخەنە ناو بیرەوە.
- موسلیم لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا، کە پێغەمبەرﷺ کوژراوانی بەدری سێ رۆژ هێشتەوە، پاشان چووە سەریانو بانگی کردن! فەرمووی: ئەی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف، ئەی عوتبەی کوڕی رەبیعە! ئایا ئەوەی خودا وادەی پێ دابوون هاتە دی؟ ئەمن ئەوەی خودا بەڵێنی پێ دابووم هاتە دی! ئیمامی عومەر گوێی لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر بوو، وتی ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە چۆن دەبیسن؟ چۆن وەڵام دەدەنەوە؟ خۆ ئەوانە پۆڵکاونو بۆگەنیان کردوە؟! پێغەمبەر فەرموی: (والذی نفسی بیده، ماأنتم بأسمع لما أقول منهم، ولکنهم لایقدرون ان یجیبوا) واتە سوێندم بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئێوە وەکوو ئەوان ئەم وتانەم نابیسن، بەڵام توانای وەڵامدانەوەیان نیە!

ئـەمجار فـەرمانی کـرد رایـان کێـشانو خـستیاننە بیرێکـەوە، قـورطـوبـی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئـەوە مـردن بریـتی نیـە لەناوچوونی تەواو، بەمردن ئادەمیزاد ناچێتە خانەی نەبوونەوە. بەڵکوو مردن بریتییە لە لێك دابڕانی گیانو جەسـتەو جـودا بوونـەوەی گیـان لەلاشـە! گۆڕانی لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی ترو گواستنەوە لەخانووی دونیا بۆ خانووی قیامەت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ان الميت اذا وضع في قبره وتولى عنه أصـحابه: انـه ليسمع قرع نعالم)[١٩] کە مردو خرایە گۆڕەوەو داپۆشراو هەڤاڵانی جێیـان هێـشت ئـەو گوێی لەدەنگی پێڵاوەکانیانە!.

## هەڵهاتن لەبەرامبەر لەشکری کوفر حەرامەو، یارمەتی لەخوداوەیە

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ

---

[١٩] تەفسیری قورطوبی ج٣٧٧

ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتانـە بەئایەتـەکانی پێـشەوە ئەوەیـە کـە ئـەمانیش موسوڵمانان فێری یاسای شەڕ دەکەن!

لەئایەتەکانی پێشوو دا پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد کە بەشمشێر لەملی کافرەکان بدەنو دەستو قاچو پەنجەیان بقـرتێنن، لێـرەش یاسـایەکی گـشتی بـۆ شـەڕ بـەیان دەکـا ئـەویش حـەرامی هەڵاتنـە لەبەرامبـەر دوژمـن. نـابێ بـەهیچ جۆرێك لەبەرامبەر دوژمن دا موسوڵمان هـەڵبێ مەگـەر بـۆ فێـڵو بـۆ بەرژەوەنـدی جەنگەکەبێ ئەوە قەیناکە، چونکە شەڕ پیلانو فرتو فێلی تێدا دروستە.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمْ الأَدْبَارَ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی بڕواتـان بـەخوداو بەپێغەمبەرەکـەی هێنـاوە هـەرکاتێك ئێـوە لەدوژمن نـزیك بوونەوە بینیتان شوێنی پەیامی ئەوان لەشێوەی لەشکرو سـوپایەك دا بـۆ لای ئێـوە دەجمـێنو هەڵمـەتیان بـۆ دەهێنـان ئێـوە لەبـەریان هەڵمەیـەن! هەرچەندە ئەوان زۆربنو ئێوە کەم لێیـان مەترسـنو لەبـەریان رامەکـەن! بـەڵکوو خۆبگرنو شەڕیان لەگەڵ دا بکەنو لێیان دەنو بیانکوژن، خوداتـان لەگەڵـە. ﴿وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ﴾ کەسێك لەرۆژی جـەنگ دا هـەڵبێ، کارێکی خـراپ دەکـاو تاوانـە غەزەبی خودا بۆخـۆی دێنـیو شـوێنی حەوانـەی قیامـەتی دۆزەخـە هـەڵاتن لەبـەر دوژمن هەموو کاتێ حەرامە، مەگەر لەدوو حاڵ دا نەبێ رەوایە:

یەکەمیان: ئەوەیە شـەڕکەرەکە بـەفێڵ خۆبـشکێنیو هـەڵبیو واخـۆی پـیشان بدا کە هەڵدێ ئەمجار هەڵمەتیان بۆ بەرێتەوەو لێیان بدا، ئەمە جۆرێکە لـەپیلانی جەنـگ.

دووەمیـان: ئەوەیـە بیـەوێ خـۆ بگەیەنێتـە کۆمـەڵی موسـوڵمانانی تـرو لەسەنگەرێکەوە بگوێزێتـەوە بـۆ سـەنگەرێکی تـر بـۆ ئـەوەی لەجەبهەیـەکی تـرەوە

شەڕ لەگەڵ دوژمن بکاو یارمەتی کۆمەڵێکی تری موسوڵمان بداو ئەوانیش یارمەتی بدەن، لەم دوو حاڵە دا هەڵهاتن لەبەرامبەری دوژمن دا ڕەوایە. بەڵام ئەگەر هەڵاتنەکەی لەبەر ئەم دوو هۆیە نەبوو، لەمەیدانی جەنگ دا هەڵهات، ئەوە ﴿إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنْ اللَّهِ﴾ ئەوە بەخەشمو غەزەبی خوداوە دەگەڕێنەوە، خودا لێی نارازییە، ﴿وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ شوێنی حەوانەوەی ڕۆژی قیامەتی دۆزەخە، دۆزەخیش خراپترین شوێنی حەوانەوەیە، کابرا ویستی پەنابەرێ بۆ شوێنێك لەهیلاکەت ڕزگاری بیو نەکوژرێ، بۆیە شوێنی حەوانەوەی قیامەتی خانووی بەهیلاکچوونو دۆزەخە، واتە بەپێچەوانەی مەبەستی خۆی پاداشی دەدرێتەوە. ئەمە ئەگەر دوژمن لەدوو چەندانەی موسوڵمانان زیاتر نەبوو ئەگەر لەدوو چەندانەی زیاتر بوو، ئەوە هەڵهاتن تاوان نیە، چونکە خودا لەم سورەتە دا جارێکی تر دەفەرموێ: ﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ.....الآية﴾الأنفال/٦٦

ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: کەسێك لەبەر سێ کەس هەڵبێ بەهەڵاتوو حسێب ناکرێ، کەسێك لەبەر دوو کەس هەڵبێ بەهەڵاتوو حلێبە.

ئایەتەکە بەڕونی ئەوە دەگەیەنێ: کە هەڵاتن لەبەردەم دوژمن حەرامەو تاوانێکی گەورەیە، بەڵکوو بەیەکێ لەحەوت تاوانە گەورەکان دەژمێردرێ، شەیخان لەئەبوهورەیرەوە فەرموودەیەك بەمەرفوعی دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (اجتنبوا السبع الموبقات) ئەی موسوڵمانینە! خۆتان لەحەوت تاوانە بەهیلاکبەرەکان بپارێزن! هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو حەوت تاوانە چیو چین؟ پێغەمبەرﷺ فەرموو: (هاوەڵدانان بۆ خودا، سیحرو جادو بازی، کوشتنی ئادەمیزادێك بەبێ تاوان، کەخودا کوشتنی وی حەرام کردووە، سوود خواردن، خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵاتنو پشت هەڵکردن لەبەرامبەر دوژمن، بوختانکردن بەئافرەتی داوێنپاکو بێ ئاگا لەوەی پاڵی دەدەن!).

ئەمجار پەروەردگار پاساوی ئەوە دەداتەوە: کە خۆڕاگریو سەنگەر بەرنەدانو سەبرو ئارام لەبەرامبەر دوژمن دا شتێکی پێویستەو فەرموی: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئێوە بەهیچ جۆرێك لەشەڕ دا پشت

لەدوژمن مەکەن، ئێوە شیاوترن بەخۆراگری‌و بەسەرکەوتن‌و پاشان بەیارمەتیدانی خودا بۆتان، سەیر بکەن خودا چ سەرکەوتنێکی پێ بەخشین؟ چۆن لەگەڵ ئەوە دا خۆتان بۆ شەڕ ئامادەنەکردبوو ژمارەو کەلوپەلی شەڕتان زۆر لەهی کافرەکان کەمتر بوو، کەچی خودا سەری خستن، بێگومان ئەوە یارمەتیدانی خودایە بۆ ئێوە شانازی بەکوشتنی ئەو کوژراوانە مەکەن، چونکە ئێوە بەهێزو بازوی خۆتان نەتانکوشتن، بەڵکوو بەدەستی ئێوە لەناوی بردن، بەئێوەی بەکوژ دان! هەر ئەو فریشتەی ناردنە خوارێ بۆ یارمەتیدانتان، ترس‌و بیمی خستە دڵی کافرەکانەوە، دڵ‌و دەروونی ئێوەی بەهێز کرد، ترس‌و لەرزی لێ رەواندنەوە وەکوو لەئایەتێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿قاتلوهم يعذبهم الله بأيديكم، ويخزهم وينصركم عليهم، ويشف صدور قوم مؤمنين﴾التوبة/ ١٤

ئەمجار پەروەردگار لەخیطاب بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە کافرە ملهوڕەکانی قوڕەیشییان کوشتن دەگوێزرێتەوە بۆ خیطاب بۆ پێغەمبەرو دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾ زوربەی راڤەکەران (مفسرون) پێیان وایە: کە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو چنگەبەردەی کە پێغەمبەرﷺ رۆژی بەدر بەرەو روی کافرەکان هاویشتنی -هاتۆتە خوارێ لەو کاتە دا کە چنگە زیخەکەی بۆ هەڵدان، فەرمووی: (شاهت الوجوه) هەر یەکێك لەو موشریکانە شتێکی چووە چاوانیەوە.!

ئیبنوجەریری طەبەری‌و ئیبنو حاتەم‌و طەبەرانی لەحەکیمی کوڕی حیزامەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: کە رۆژی بەدر هات: دەنگی شتێکمان بیست لەئاسمانەوە کەوتە سەر زەوی، دەتگوت دەنگی وردە بەردن دەکەونە ناو تەشتەوە پێغەمبەرﷺ ئەو وردە بەردانەی هاویشتن، ئێمە شکاین، ئەوەیە مەبەست بەفەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٩)ش ریوایەت زۆرو جۆراوجۆرن.

حاکم لەعەبدوڵلای کوڕی ثەعلەبەی کوڕی صەغیر ریوایەت دەکا دەڵێ: کاتێك لەشکرەکان بەیەك گەییشتن ئەبوجەهل گوتی: خودایە! کام لامان صیلەی رەحمی پچڕاندوە، کێهەمان ئایینێکی نەزانـدراوی هێناوە، خودایە سبحەینێ

بیفەوتێنە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَاءكُمُ الْفَتْحُ....﴾ تا دەگاتە ﴿وَأَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ی نازڵ کرد!

ئیبنو ئەبی حاتەم لەعەطییەوە دەگێڕێتەوە: دەڵێ: ئەبو جەهل وتی: خودایە! بەهێز ترو ڕێزدار ترمان بەسەر لایەنەکەی تر دا زاڵ بکە، ئیتر ئایەتی ﴿إن تستفتحوا....﴾ نێردرایە خوارێ.

(السدی)و کەلەبی دەڵێن: کاتێك موشریکەکان لەمەککە دەرچوون بۆ بەرنگاریکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی، چۆن پەردەی کەعبەیان ڕاتەکاندو وتیان: خودایە! یارمەتی باشترین سوپاو لەشکر بدە، کام لایەمان هیدایەتدراوترو ڕێزدار ترەو دینەکەی باشترە خودایە! زاڵی بکە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ!

عیکریمە دەڵێ: موشریکەکان وتیان: خودایە! ئێمە نازانین ئەو ئایینەی موحەممەد هێناویەتی چۆنەو چیە، خودایە لەنێوان ئێمەو ئەو دا بەراستی حوکم بکەو کێمان لەسەر حەقین زاڵی بکە! ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِن تَسْتَفْتِحُواْ.....﴾ ناردە خوارێ.

تائێرە خیطابی ئایەتەکان ئاراستەی جەنگاوەران کراون، ئەمجار لێرە بەولاوە خیطابەکە ڕودەکاتە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللّهَ رَمَى﴾ ئەی پێغەمبەر!ئەو کاتەی کە بەرواڵەت چنگە خۆڵو زیخو وردە بەردەکانت گرتە موشریکەکانو هەریەکەیان شتێکی لەو گڵو خۆڵو وردە بەردانە بەرکەوتو کاریگەری تەواویان لەسوپای دوژمن کرد، ئەوە لەحەقیقەتو ڕاستی دا تۆ نەتهاویشت، چونکە هاویشتنی تۆ کاریگەری وەکوو هی ئادەمیزادانی تر وایەو ئەو کاریگەرییەی نیە، بەڵکوو هاویشتنەکە لەلایەن خوداوە بوو، واتە: خودا ئەو کاریگەرییە بەهێزەی تێدا خولقاندو گڵو خۆڵەکەی گەیاندە چاوی شەڕکەرانی دوژمنو وەرەی ڕوخاندن، شێوەی هاویشتنە ڕواڵەتییەکە لەپێغەمبەرەوە بوو، بەلام کاریگەرییەکە خودا خولقاندی گرنگیش کارتێکردنە!

ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەرﷺ ئەو ڕۆژە چنگێ گڵو خۆڵی بەڕوی سوپای دوژمن دا هەڵداو سێ جار فەرمووی: ڕیسوا بنو لەناوبچنو ڕورەش بن، ئیتر دوا

بەدوای ئەو گڵو خۆڵ هەڵدانە بەرویان دا تێشکانو ئەو حاڵەیان بەسەر هات کە بەسەریان هات.

لەعەلی کوڕی ئەبو طەلحە ئەویش لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: کاتێك پێغەمبەرﷺ ڕۆژی بەدر لەنزاو پاڕانەوەکەی دا فەرمووی: (خودایە! ئەگەر ئەم کۆمەڵە -واتە: موسوڵمانەکان- بفەوتێنی ئیتر کەس نامێنێ بەندایەتیت بکا.) جوبرائیل هات پێی فەرموو: مشتێ خۆڵ هەڵبگرەو بیهاوێژە بۆ رووی دوژمن، ئەویش وای کرد، کەس نەبوو لەشەڕکەرانی دوژمن کە ئەو گڵو خۆڵو زیخەی نەچووبێتە ناو چاوو دەمو لوتیەوە، ئیتر ئەمە کاری لێکردنو ورەیان روخاو تێشکان.

جوداوازی نێوان کردەوەی پەروەردگارو کردەوەی پێغەمبەرو هاوەڵانی لەکوشتنی موشریکەکان، ئەوەیە: پەروەردگار بۆخۆی خوڵقێنەری حەقیقییە بۆ هەموو کاریگەریو ئاکامو ئەنجامێك، بەڵام کردەوەی کردارێکی ئادەمیزاد سەربەخۆ نیە، بەبێ خوڵقاندنی کاریگەری تێیان دا لەلایەن خوداوە هیچیان پێ ناکرێ! پەروەردگار ئەم کارانەی ئەنجام دانو ئەو رووداوانەی خوڵقاندن، ئەو هەموو میهرەبانییەی لەگەڵ خوداناسان دا کرد بۆ پوکانەوەو پوچانەوەی سوپای کوفرو ﴿وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلاءً حَسَناً﴾ بۆ ئەوەی نیعمەتو فەضلی خۆی بەخوداناسان بناسێنێ، نیعمەتی سەرکەوتن بەسەر دوژمن دا، نیعمەتی بڵاوبوونەوەی ئایینو شکاندنی دوژمنی سەرسەختیان سەرەڕای زۆری دوژمنو کەمی ئەوان، بۆ ئەوەی فەضلو نیعمەتی خودا بەسەر خۆیانەوە ببینن، سوپاسی نیعمەتە زۆرو هەمەجۆرەکانی بکەن ﴿إِنَّ اللَّـهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار هەموو قسەو باسێك دەبیسی، کەبرێ لەو قسانە پاڕانەوەو دوعاو نزای پێغەمبەرو هاوەڵانی بوو کە لەو رۆژە دا پێش هەڵگیرسانی شەڕ لەخودا دەپاڕانەوەو داوای سەرکەوتنو زاڵبوونیان دەکرد بەسەر دوژمن دا، زاناو ئاگادارە بەهەموو هەستو رازو مەبەستێك هیچی لێ گوم نابێ،

ئەمجار پەروەردگار مزگێنییەکی تر دە دا بەموسوڵمانەکان، دەفەرموێ: ﴿ذَلِكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ الْكَافِرِينَ﴾ ئەو بەتاقیکردنەوە پیرۆزو بەفەڕە ئەوە بوو:

کە زانیتانو گوێتان لێ بوو، سەرەڕای ئەوەش پێتان ڕادەگەیەنین کە پەروەردگار لەداهاتوو دا مەکرو فرتو فێڵی کافرەکان هەڵدەوشێنێتەوە، پوچەڵیان دەکاتەوە، ڕێگەیان پێنا دا پێغەمبەرو موسوڵمانان بفەوتێنن، لەمپەر لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایین دا دروست بکەن!

دوای ئەوە پەروەردگار ڕووی خیطاب دەکاتە کافرەکانی مەککەو لەروی سەرزەنشتو تەحقیرو لاقرتێ پێکردنەوە دەفەرموێ: ﴿إِنْ تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ﴾ ئەی خەڵکی مەککە! ئەگەر ئێوە داوای سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر موسوڵمانەکان دا دەکەنو، کە هاتن بۆ جەنگ چوونە ناو کەعبەو لەخودا پاڕانەوەو پەردەی کەعبەتان ڕاتەکاندو داواتان کرد سەرکەوتن بدا بەلایەنی حەقخوازو خاوەن هیدایەت، ئەوا سەرکەوتنو نەصرەتی خودایی هات بۆ لاتان، بەڵام نەبوو بەماڵی ئێوە بەڵکوو بوو بەماڵی خوداناسان، بوو بەنسیبی شوێنکەوتوانی پێغەمبەر، سەرکەوتن بۆ خاوەن هیدایەتو حەقخوازان بوو، تێشکانو فەوتانو ڕیسوایی بۆ بتپەرستو ملهوڕانی قورەیش بوو، ئەمە کاری خودایەو خودا هەموو کارێکی پڕ حیکمەتو دانایییە ئیشی بێ جێ ناکا!

ئەمجار هەڕشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَنْتَهُوا﴾ ئەگەر واز لەبتپەرستیو بەدرۆخستنەوەی خوداو پێغەمبەر بهێنن، چیدی دژایەتیو بەرهەڵستکاری پێغەمبەری خودا نەکەن، ئەوە ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ ئەو ڕەفتارەتان باشترە بۆ ئێوە لەدونیاو قیامەت دا، ئەو باشترە لەو شەڕە سامناکەی هەڵتان گیرساند، کە ئاکامی ئەو هەموو کوژراوو دیلو بریندارەی لێ کەتەوە.

﴿وَإِنْ تَعُودُوا نَعُدْ﴾ ئەگەر بەم تێشکانە عار نەنێنو جارێکی تر شەڕ لەگەڵ پێغەمبەرو هاوەڵانی دا بکەنەوە، دژی ئایینی خودا بوەستنو بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەم حاڵەتە گومڕاییو بێ دینییەی ئیستا تێیدان، ئەوە ئێمەش دووبارە یارمەتی پێغەمبەرو هاوەڵانی دەدەینەوە، وەکوو ئەوەی بەچاوی خۆتان بینیتانو زانیتان، بەو جۆرە یارمەتی موسوڵمانان دەدەینەوەو ئێوە دەشکێنینەوە، ﴿وَلَنْ تُغْنِيَ عَنْكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْئًا وَلَوْ كَثُرَتْ﴾ وەلحال ئەو کاتەی ئێمە بگەڕێینەوە بۆ کۆمەکی کردن بەموسوڵمانان، فەرەباڵغیو زۆری هێزی هەوا خواهانی ئێوە هیچ سوودو قازانجتان

پێ ناگەیەنن، یارمەتیدانی تاقمو کۆمەڵی هەواخواهانتان لەئاست دەسەڵاتو توانای خودا دا هیچ دادتان ناداو چ بەرگرییەکتان پێ ناکرێ، هەرچەندە زۆریش بن.

چونکە هەموو کاتێ زۆری جەنگاوەرانو زۆری ئامێری شەڕ نابنە هۆکاری سەرکەوتن، بەڵکوو جاری وا دەبێ -ئەگەر لایەنە کەمەکە بڕواپتەوو خۆگرتوو بنو پشتیان بەخودا قایم بێ- بەسەر لایەنە زۆرە بێ بڕواکە دا زاڵ دەبن چونکە سەرکەوتنو زاڵبوون بەدەستی خودایە،

﴿وَأَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ باش بزانن خودا یارمەتیدەری موسوڵمانانەو کۆمەکییان پێ دەکا، ئەگەر جارێکیش لەبەر کەمتەرخەمیو هەڵەیەکی خۆیان نزم ببنەوە، ئەوە هەر بەرز دەبنەوەو بەمرازی خۆیان دەگەن، چونکە ئاشکرایە سەرکەوتنی حەقیقی بەدەست خودایە کێ‌ی بوێ سەری دەخاو زاڵی دەکا، خوداش بۆخۆی‌بەڵێنی داوە کە سەرەنجامو بەمراز گەیشتن هەر بۆ خودا پەرستانە. وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾الصافات/١٧٣. یان دەفەرموێ: ﴿حِزْبَ اللهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾المائدة/٥٦. یان ﴿أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾المجادلة/١٩.

## فەرمانبەرداری بۆ خوداو پێغەمبەری خوداو سەرپێچی نەکردنی فەرمانەکانیان

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ قَالُوا سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ

﴿ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ۝٢٢ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ۝٢٣﴾

لەئایـەتی پێـشوو دا پـەروەردگار خیطـابی خـۆی ئاراسـتەی کافرەکـان کـردو فـەرمووی: ﴿وَإِنْ تَنتَهُوا فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ ئـەمجار بەشـوێن ئـەوەداو لەشـێوەی عـادەتی قورئان کە هـەرکاتێ باسـی شـتێکی کـرد باسـی دژەکەشـی دەکا. خیطـاب ئاراسـتەی موسوڵمانان دەکاو فەرمانیان پـێ دەکا کـە ملکەچـی فـەرمانی خـوداو پێغەمبـەرﷺ بـن، هـەرکاتێ فـەرمانیان پـێ کـردن بـەجیهادو تێکۆشـان پێویـستە بـێ سـێودوو پابەندی فەرمانەکە بن‌و بەپیر بانگەوازی خوداو پێغەمبەری خوداوە بچن.

جاکـە لەئایـەتی پێـشوو دا هەڕەشـەی لـەکافرەکان کـرد، لێـرە دا وا گونجـاوو پێویست بوو کە موسوڵمانان بەئاگا بێنێتەوەو هۆشیاریان بکاتەوە، بۆ ئـەوەی پـاڵی لێ نەدەنەوەو تەمبەڵی بەسیپاڵی خۆی دایان نەپۆشیو هەمیشە ئامادەباشییان تێدا بێ بۆ بەرەنگار بوونەوەو بەرگریکردن، بەلێبڕانەوە بەپیر بانگەوازی پێغەمبـەرەوە بین‌و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتـان بـەئایینی حـەق‌و راست کـردوە، ملکەچـی خۆتـان بـۆ فەرمانـەکانی خـوداو پێغەمبـەرﷺ راگەیانـدوە، زانیوتانـەو دەزانـن کـە هـەموو یارمەتییـەك بەپیـشتیوانی خـوداو گوێڕایـەڵی پێغەمبەر دەسـتەبەر دەبـێ، بـەهیچ شـێوەیەك رەفتـاری کـافرو خودانەسـان رەچاو مەکەن! ئەی خاوەن بڕواو ئیمانداران! ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ بـەردەوام بـن لەسـەر گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا کاتێك بانگتـان دەکـەن بـۆ جیهادو ماڵبەخـشین لـەپێناو ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام دا، فـەرمانو ئامۆژگاریـەکانی خـوداو پێغەمبـەری خـودا پاشـگوێ مەخـەن، هـەر کـاتێ پێغەمبـەر فـەرمانی پـێ کـردن بەتێکۆشانو ماڵبەخشین لەرێگای شکۆمەندی ئایین دا بەقسەی بکەن‌و گوێ بیـسی فەرمانەکانی بن. وەلحال ﴿وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنْتُمْ تَسْمَعُونَ﴾ ئێوە ئامۆژگارییـەکانی دەبیـسن‌و دەزانـن بۆچـی بانگتـان دەکـاو، لەمەبەسـتو مانـای پەیامەکـەی تێگەیشتوون‌و دەزانن چیتان پـێ دەڵێ، قورئانتـان گوێ لێیـە فـەرمانتان پـێ دەکا

بەفەرمانبەرداری بۆ فەرمانی پێغەمبەرﷺ. چونکە وا لەموسوڵمانان چاوەڕێ دەکرێ؛ کە بەیەکدەم بڵێن: ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾البقرة/٢٨٥. گوفتارو ڕەفتارتان یەك بێ ئەوەی بەدەم دەیڵێن بەکردەوە بیسەلمێنن، ﴿وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ قَالُوا سَمِعْنَا وَهُمْ لاَ يَسْمَعُونَ﴾ خۆ بپارێزن لەوەی وەکوو ئەو کافرو دووڕووانە بن کە ڕەوشتیان وایە بەقسەو سەرزارەکی دەڵێن: ئایینی حەقمان بیستو لێی حاڵی بووینو فەرمانبەرداریِنو پەیڕەوی فەرمانەکانی دەکەین، بەڵام لەراستی داو بەکردەوە پەیڕەوی ناکەنو بڕوایان پێی نیەو، پابەندی فەرمانو نەهیەکانی نابن، هەروەکوو هیچیان نەبیستبیو گوێیان لێ نەبووبێ!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەوانە لەئاژەڵ بێ عەقڵ ترنو بەدبەختترین زیندەوەری سەر زەوینو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لا يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان خراپترینو بێ فەڕ ترین گیانلەبەرو چوار پێ لای پەروەردگار ئەو ئاژەڵانەن کە کەڕن ئامۆژگاری حەق نابیسن تا پەیڕەوی بکەن، لاڵن ناتوانن حەق بڵێنو تێی بگەن، ناتوانن جوداوازی نێوان حەقو بەتاڵ بکەن، خێرو شەڕ لێك جیا بکەنەوە، هیدایەتو گومڕایی پۆلێن بکەن، بەختەوەری ئیسلامو بەدبەختی کوفر دەست نیشان بکەن!

ئەمانە وەك ئەو ئاژەڵانە نین کە فیعلەن کەڕو لاڵ بن، وەلێ چونکە هەستەکانی خۆیان لەکار خستووە، لە بەرژەوەندیو قازانجی خۆیان دا بەکاریان نەهێناون وەکوو ئەوە وان کە هەر لەبنەڕەت دا ئەم هەستانەیان نەبن، ئەوان لەحەقیقەت دا وەکوو ئاژەڵ وەهانو عەقڵیان بەقازانجو زیانی خۆیان ناشکێ، ئەوان چاوی دڵیان کوێرەو گوێچکەی دڵیان کەڕەو زوبانی دڵیان لاڵە!!!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەو کافرو دووڕووانە نەتێگەیشتنیان تەواوە، نەنیازو مەبەستیان پاکوخاوێنە ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْراً لَأَسْمَعَهُمْ﴾ ئەگەر ئەمانە حاڵیان وابوایە: پەروەردگار مەبەستو نیازێکی باشی لەدەروونیان دا بەدی بکردایە، بیزانیایە کە ئامادەباشییان تێدایە بۆ خێرو ئیمانهێنانو شوێنکەوتنی پەیامی ئیسلامی پیرۆز، ئەوە ئامۆژگاریو ئایاتی خۆی دەخستە دڵیانەوە، تەوفیقی دەدان کە کەلامی پەروەردگار تێبگەن، بەجۆرێك کە

سوودی هەردوو جیهانی لێ وەربگرن، بەڵام ئەوانە خێریان تێدا نیە، چاکەو ئیمانیان لێ چاوەڕوان ناکرێ، جا خوداش ئەو جۆرە دەرسو بیستنەیان فێر ناکاو تێیان ناگەیەنێ، تەنانەت ئەگەر فێریشیان بکا فێری بیستنێکی ئاساییان دەکا. جاکە ئەوانە بەو جۆرەبن نیازی خێریان نەبێ خودایش پێیان نابیسێنێ چونکە ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ خودا بۆخۆی دەزانێ ئەگەر دەرزێکی عادەتیشیان دابداو تێیان بگەیەنێ دوای تێگەیشتنیش ئەوان بەنەنقەستو قینەبەری پشتی لێ هەڵدەکەنو گوێی پێ نادەن، ئەوانە لەوەپێش بەدڵ پشتیان لەوەرگرتنی ئەو ئامۆژگاریو دەرزو تەمبێ کردنە هەڵکردوەو بڕیاریان داوە کاری پێ نەکەن، ئەوانە دابو نەریتیان پشت تێکردنو رو وەرگێرانە لەحەقو راستی. بەکورتی ئەوانە، ئەگەر ئامادە بوونایە بۆ ئەوەی رێگای راستو حەق بگرنەبەرو بەدوای ئایینی حەق دا بگەڕانایە خودا شارەزای دەکردنو هیدایەتی دەدان، ئەوانە ئەوەندە سوورن لەسەر پشت هەڵکردن لەمئایین تەنانەت ئەگەر پەروەردگار بیخستنایەتە سەر رێگای حەقو شارەزای بکردنایە بۆ پێدارۆییشتن، بەویستو خواهیشی خۆیان لەو رێگایە لایان دەداو رێبازی گومڕاییان دەگرتە بەر!!!!

## بەپیرەوەچوونی ئەو ئایینەی مایەی ژیانی خۆشبەختی هەتا هەتاییە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةًۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ

فِي ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کە پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بن بۆ جیهادوماڵبەخشینو شتی تریش. ئەمجار بەشوێن ئەوە دا فەرمان دەکا بەوەی کە بەپیر بانگەوازی خوداو پێغەمبەرەوە بچن هەرکاتێ بانگیان بکەن بۆ پەیڕەو کردنی ئایینێك کە دەبێتە مایەی خۆشبەختیو کامەرانی ژیانی هەتاهەتاییو نەبڕاوە......

هەردەڵێی ئەم ئایەتانە هۆکارو بەڵگەن بۆ مانای ئایەتەکانی پێشوو کە فەرمانی بەگوێکردنی خوداو پێغەمبەریان تێدایە کە بەگوێکردنیان دەبێتە مایەی دەستەبەر بوونی خێرو خۆشیو کامەرانی هەمیشەیی دونیاو قیامەت.

جارێکی تر بانگەوازی بۆ خاوەن باوەڕان دووبارە دەکاتەوە، بانگیان دەکا بۆ وەڵامدانەوەی بانگەوازی خوداو پێغەمبەرﷺ بانگکردنەکە هەڵتانو هەڕەشەی لەخۆگرتووە، هەڵتان بۆ بەپیرەوە هاتنو هەڕەشەی لەپشت هەڵکردن، نیعمەتی خودایان وەبیر دەهێنێتەوە بەسەریان دا ئەگەر وەڵامی بانگەوازییەکە بدەنەوە. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەحەق کردووە گەردنکەچی بوون ﴿اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ﴾ بەدڵسۆزیو لێبڕاوانەوە وەڵامی بانگەوازی خودا بدەنەوە، چیتان فەرمان پێ دەکا ئەنجامی بدەنو پابەندی بن. ﴿وَلِلرَّسُولِ﴾ هەروەها وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەریش بدەنەوە، ئەوەی لەخوداوە فەرمانتان پێ دەکا جێبەجێی بکەن! ﴿إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ هەرکاتێ بانگی کردن بۆ بەرنامەو ئایینێك کە ژیانێکی بەختەوەریو هەتاهەتاییتان پێ دەبەخشێ، کامەڕانی دونیاو قیامەتتان بۆ دەستەبەر دەکا، هەموو خۆشیو سەرفرازیو خێرو بێرێکتان تێی دا دەست دەکەوێ، ڕستەی ﴿لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ قورئانو ئیمانو جیهادو تێکۆشانو زانستو هەموو کارێکی خێر دەگرێتەوە.

بێگومان پێغەمبەرﷺ بانگەوازی ئادەمیزادەكان دەكا بۆ ئایینێك كە مایەی ژیانی كامەرانییە بەهەموو مانای ژیانەوە!

بانگەوازییان دەكا بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕێك دڵو عەقڵو هۆش زیندوو دەكاتەوە، لەكۆتو زینجیری نەزانیو نەفامیو كاریگەری خەیاڵی پووچ رزگارتان دەكا!

بانگەوازییان دەكا بۆ شەریعەتێك كە لەخوداوە نێردراوە، بانگی ئازادیی مرۆڤ هەڵدەدا، رێزی ئادەمیزاد رادەگەیەنێ! بانگی رێز گرتنی مرۆڤو یەكسانی نێوانیان رادەگەیەنێ، هەموو بەندەكان بەیەك چاو سەیر دەكاو، هەموویان یەكسانو ئازادو سەربەستن لەژێر سایەی شەریعەتی خاوەنی بوونەوەر دا، كەس بەسەر كەس دا زێدە فەضلو شكۆمەندی نیە مەگەر بەتەقواو خوداپەرستی!

بانگەوازییان دەكا بۆ پەیڕەوو پرۆگرامی ژیان، بۆ پرۆگرامی فیكرو بیروبۆچوونی راست، بۆ ئەوەی لەهەموو كۆتو زنجیرێك رەهایان بكا جگە لەقانوونی سروشتو فیطرەت كە پەروەردگار لەسەر ئەو فیطرەتە ئادەمیزادی خولقاندوە!

بانگیان دەكا بۆ بەهێز بوونو سەركەوتنو پێشكەوتن بەهۆی بیروباوەڕو پرۆگرامی یەزدانییەوەو متمانەیان بەپەروەردگاری خۆیانو ئایینی بێ خەوشییان، بۆ ئەوەی بەرەهاییو هێزو تواناو زانیارییەوە لەسەر زەوی هەوڵو تەقەللای خۆیان بدەن بۆ رزگار كردنی ئادەمیزاد، هەموو ئادەمیزاد لەبەندایەتیكردنیان بۆ بەندەی ترو ئاراستەكردنیان بۆ بەندایەتی كردنی خودای پەروەردگارو گێڕانەوەی مرۆڤایەتیو كەسایەتیو سەرفرازی بۆ بەندەكان دەستەبەر ببێ، ئەو مرۆڤایەتیو كەسایەتییەی خودا پێی داونو ملهوڕەكان لێیان داگیر كردوون.

بانگیان دەكا بۆ جیهادو تێكۆشان لەپێناو ئایینی خودا دا، بۆ چەسپاندنی پەروەردگاریەتی یەزدان لەسەر زەویو لەژیانی ئادەمیزادەكان دا، بۆ روخاندنی خودا درۆزنەكانو قەلاچۆ كردنی ئەو دەستدرێژیكەرانەی خۆیان بەسەر خەڵك دا سەپاندوەو حوكمو یاسای دەستكردو ناڕەوای خۆیان لەشوێنی حوكمی پەروەردگاری بونەوەر چەسپاندوەو سەپاندوە، بانگیان دەكا بۆ جیهادو تێكۆشان

لەپێناو بەدەستهێنانی ئەو بەها سەروەرییانە، تەنانەت ئەگەر لەپێناو بەدیهێنانی ئەو بەها سەروەرییانە دا گیانیش لەدەست بدەنو پلەو پایەی شەهادەتیان بەنسیب بێ، ئەو شەهید بوونەیان بۆ دەبێتە ژیانێکی خۆشبەختیو کامەرانیو نەبڕاوە!

ئەمەیە پوختەی ئەو شتەی پێغەمبەرﷺ بانگەوازی بۆ دەکا، ئەوەی پێغەمبەرﷺ بانگی بۆ دەکا مایەی خۆشبەختیو کامەرانی دونیاو ژیانی پڕ لەزەتی نەبڕاوەی ڕۆژی دواییە، کەوابێ پێویستە هەموو خاوەن باوەڕێکی ژیرو هۆشمەند بەئەوپەڕی دڵسۆزیو پەرۆشیو لێبڕانەوە بەپیر ئەم بانگەوازییەوە بێت، چونکە بانگەوازییەکە بۆ وەرگرتنی ئایینێکە کە پرۆگرامی ژیانە، مەنهەجێکی واقیعیو عەمەلییە لەژێر سایەی دا ژیان گەشە دەکاو پێش دەکەوێ کەوابێ بانگەوازییەکە بۆ زیندوبوونەوەو گەشە پێدانی ژیانە بەهەموو جۆرو شێوەکانیەوە، لەهەموو بارو زروفێك دا. خودای گەورە میهرەبانو بەلوتفە بەرامبەر بەندەکانی بۆیە: بەو نوسلووبە ناسكو هەستە هەژێنە بانگیان دەکا، کە بەویستو ئیرادەی خۆیان وەڵامی بانگەوازی خوداو پێغەمبەر بدەنەوە، پێی خۆشە بەندەکانی بەخواهیشو پێخۆشبوونی خۆیان بەپیر بانگەوازییەکەوە بچنو گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ بکەن، ئەگینا خودا دەتوانێ بەزۆر بڕوایان پێ بهێنێو ملی ڕێگای ڕاستیان پێ بگرێتەبەر، واتە: خودا ڕێزی بەندەکانی دەگرێو کەسایەتییان دەداتێ کە بانگیان لێ دەکا بەویستو ئارەزووی خۆیان بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەوە بینو ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن تاشایستەی پاداش ببن، کەسایەتیو مرۆڤایەتییان بەرز بێتەوەو شیاوی ئەوە بن پلەی ئەمینداریەتیو جێنشینی سەر زەویان ئەنجام بدەن، ئەو سپاردەی کە خودا پێی داون بەجێگای خۆی بگەیەنن! ئەرکی سەرشانیان ئەنجام بدەن. هەر کاتێ پێغەمبەرﷺ بانگی کردن هەل لەکیس مەدەن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾ بزانن کە خودای خاوەن دەسەڵات دەتوانێ بەزۆر بتانخاتە سەر ڕێگای ڕاستو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، دەتوانێ بکەوێتە نێوان مرۆڤو دڵەکەیەوە، دڵەکە لەمرۆڤ داگیر دەکاو چۆنی بوێ ئاوا هەڵیدەسووڕێنێو، خاوەنەکەی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر دا نیە. بەڕاستی ئەمە وێنەکێشانێکی

قورئانییە، وێنەکێشانێکە داخوازی ئەوەیە ئادەمیزاد هەمیشە هۆشیارو بەئاگا بێ، وریا بێ ئەو دڵە لەچوارچێوەی فەرمانی خودا دەرنەچێ، لەخودا بێ ئاگا نەبێ، هەمیشە ئەو دڵە حەساسە پەیوەست بێ بەپەروەردگارەوە وەرنەگەڕێ، هەر بۆیەش پێغەمبەرﷺ بەزۆری ئەم نزایەی دەکردو دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (اللهم یامقلب القلوب ثبت قلبي علی دینك) پەروەردگارا! ئەی ئەو کەسەی دڵەکان دەگۆڕی! دڵم لەسەر ئایینی خۆت دامەزراو بکەو مەهێڵە لەو چوارچێوە دەرچێ! هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە بڕوامان بەخۆتو پەیامەکەت هەیە ئایا ترسی ئەوەت لێمان هەیە پاشگەزببینەوە؟ فەرموی بەڵێ: (ان القلب بین اصبعین من اصابع الله تعالی یقلبها) دڵ لەنێوان دوو پەنجەی قودرەتی خودادایە چۆنی بوێ ئاوا هەڵی دەسوڕێنێ.

ئەمە ڕای زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئانە بۆ مانای ئەم ئایەتەو زۆرباش دەچێتە دڵەوەو طەبەری‌و قورطوبی پەسندیان کردوە! ڕاڤەکەرانی قورئان تەفسیری تریان بۆ ئایەتی ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾ کردوە. وەکوو:

١- پەلە بکەن بۆ وەڵامدانەوەو بەپیرەوە هاتنی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ هەتا بەهۆی نەقڵتانەوە دەسەلاتتان بەسەرخۆتاندا دەشکێ، لەم ڕووەوە کەدڵ کانی عەقڵ‌و تێفکرینە. موجاهید دەفەرموێ: واتە خودا دەکەوێتە نێوان مرۆڤو دڵەکەیەوە تاوای لێدێ هیچ تێناگا، واتە: خودا دەکەوێتە نێوان مرۆڤو عەقڵیەوە، تاوای لێ دێ نازانێ چی دەکاو چ ناکا. ئەم کۆمەڵە دەڵێن: (قلب) واتە: (عقل) وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿ان في ذلك لذكرى لمن كان له قلب﴾ واتە: عەقل.

٢- هەندێکی تریان دەفەرموون: خودا بەمردن لەمپەڕ دەخاتە نێوانی مرۆڤو دڵەکەی، ناتوانێ تازە شتی لەدەستچووی بۆ خۆی دەستە بەربکا، زومەخشەری دەفەرموێ: واتە: دەیمرێنی‌و فرسەتی لەکیس دەدا.

٣- هەندێکی تر لەروانگەی جەبرو ئیختیارەوە ئایەتەکەیان مانا کردوە ئەوانی بڕوایان بەجەبر هەیە: دەڵێن: مانای ﴿أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾ واتە: خودا دەکەوێتە نیوان ئادەمیزادی کافروطاعەتکردنی، دەکەوێتە نێوان ئادەمیزادی

خواپەرستو تاوانەکانی، پیاوی چاك ئەو کەسەیە خودا چاکی بکا، گومڕا ئەو کەسەیە خودا گومڕای بکا.

ئەوەی کەدەبێتە پاڵپشتو پشگیری ئەوە دەکا: کەمەبەست بەئایەتەکە هەڵنانی ئادەمیزادانە بۆ بەندایەتیکردنو خودا پەرستی پێش ئەوەی هەلیان لەکیس بچی، ئەو رستەیەی کۆتایی ئایەتەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ واتە: پەلە بکەن لەچاکە کردنو تێشوو ئامادە بکەن بۆ رۆژی قیامەت، چونکە ئێوە دڵتان لەنێو پەنجەی خودا دایە، پاشانیش گەڕانەوەو کۆبونەوەتان لای پەروەردگارە، پاداشو سزای کردەوەکانتان دەداتەوە. چارتان ناچارە هەربۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە دەراوی روونی ترتان نیە، نە لەدونیا دا، نە لەقیامەت دا پەنای ترتان نیە، کەچی لەگەڵ ئەوەش دا بانگتان لێ دەکا بۆ ئەوەی بەپیر بانگەوازییەکەیەوە بچن، بەپیرەوە چوونی ئازادانەو سەربەستو پاداشیش پەزمەندەو مەضمون! نەك بەپیرەوە چوونی رۆرەملێو توپزی!

ئەمجار پەروەردگار موسوڵمانان دەترسێنێ لەوازهێنان لەجیهادو پاڵدانەوەو تەمبەڵی، بەپیرەوە نەچوونی بانگەوازی ژیانو هۆی سەرکەوتنو سەرفرازیو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾. دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، زوبەیری کوڕی عەوامو حەسەنی بەصریو سوددیو هی تریش فەرموویانە دەربارەی شەڕی (جەمەل) هاتۆتە خوارێ کەساڵی سیو شەشی کۆچی روی دا، زوبەیر دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە هاتۆتە خوارێ، ساڵو عەیامێك دەمانخوێندەوەو نەماندەزانی مەبەست کێیە! کەچی کاتێك زانیمان: خۆمان مەبەستین.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی عەلیو عەممارو طەلحەو زوبەیر نازڵ بووە.

سوددی دەڵێ: دەربارەی جەنگاوەرانی بەدر نازڵ بووە کە هەمان جەنگاوەران دوایی لەجەنگی رۆژی (جەمەل) دا شەڕی براکوژیو خۆخۆرییان کرد، ریوایەت کراوە دەڵێن: رۆژێك زوبەیر لەخزمەت پێغەمبەر دا بوو، حەزرەتی عەلی هات بۆ لایان، زوبەیر بەدەمیەوە پێکەنی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی خۆشەویستیت بۆ عەلی

چۆنە؟ زوبەیر وتی: بەباوكو دایكەوە بەقوربانت بم، من عەلیم بەئەندازەی كوڕەكەم خۆش دەوێ بەڵكوو زیاتریش. پێغەمبەرﷺ فەرمووی دەڵێی چی كە رۆژێك دابێ تۆ لەدژی بجەنگی؟!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارێ، دەڵێ: پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان كرد كە نەهێڵن مونكەرو خراپەكاری لەناویان دا بچەسپێ، ئەگەر رێگە بدەن خراپەكاری جێگیر ببێ خودا بەگشتی سزایان دەدا.

حوذەیفەی كوڕی (الیمان) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی شەڕو ئاشووب لەنێوان كۆمەڵێك هاوەڵانی من دا بەرپا دەبێ، خودا بەهۆی هاوڕێیەتییان بۆ من لێیان خۆش دەبێ، پاشان خەڵكی تر چاویان لێ دەكەنو لەناوخۆیان دا ئاشووب بەرپا دەكەن خودا دەیانخاتە دۆزەخەوە[٢٠]

ئەم تەئویلاتو بیروبۆچوونانە بەفەرموودەی صەحیحو راست پشتگیری دەكرێن، لەصەحیحی موسلیم دا فەرموودەیەك لەخاتو زەینەبی كچی جەحش دەگێڕنەوە: كە پرسیاری لەپێغەمبەرﷺ كردو عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێمە بەهیلاك دەچین وەلحال پیاو چاكیشمان تێدا هەبن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی (نعم اذا كثر الحبث) بەڵێ: هەركاتێ خراپە زۆر بوو!

لەصەحیحی تورمذی دا هاتووە: (هەركاتێ خەڵك ستەمكاریان بینیو بەرپەرچیان نەدایەوەو دەستیان نەگرت، نزیكە خودا بەگشتی هەموو خەڵكەكە، بێ تاوانو تاوانبار، ستەمكارو ستەم لێكراو سزا بدا؟!

لەصەحیحی بوخاریو تورمذی دا هاتووە: نوعمانی كوڕی بەشیر لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەكا كە فەرموویەتی: (مثل القائم علی حدود الله والواقع فیها كمثل قوم استهوا علی سفینة فاصاب بعضهم أعلاها، وبعضهم أسفلها، فكان الذین فی أسفلها اذا استقوا من الماء، مرّوا علی من فوقهم، فقالوا لو أنا خرقنا فی نصیبنا خرقاً ولم نؤذ من فوقنا، فان یتركوا وما أرادوا، هلكوا جمیعاً، وان أخذوا علی أیدیهم نجوا ونجوا جمیعاً).

[٢٠] تەفسیری قورطوبی ج٧/٣٩١.

چۆنە؟ زوبەیر وتی: بەباوکو دایکەوە بەقوربانت بم، من عەلیم بەئەندازەی کوڕەکەم خۆش دەویّ بەڵکوو زیاتریش. پێغەمبەرﷺ فەرمووی دەڵێی چی کە رۆژێك دابیّ تۆ لەدژی بجەنگی؟!

ئیبنو عەبباس دەفەرمویّ: ئەم ئایەتە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خواریّ، دەڵیّ: پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد کە نەهێڵن مونکەرو خراپەکاری لەناویان دا بچەسپیّ، ئەگەر رێگە بدەن خراپەکاری جێگیر ببیّ خودا بەگشتی سزایان دەدا.

حوذەیفەی کوڕی (الیمان) دەڵیّ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی شەڕو ئاشووب لەنێوان کۆمەڵێك هاوەڵانی من دا بەرپا دەبیّ، خودا بەهۆی هاوڕێیەتییان بۆ من لێیان خۆش دەبیّ، پاشان خەڵکی تر چاویان لیّ دەکەنو لەناوخۆیان دا ئاشووب بەرپا دەکەن خودا دەیانخاتە دۆزەخەوە[٢٠]

ئەم تەئویلاتو بیروبۆچوونانە بەفەرموودەی صەحیحو راست پشتگیری دەکرێن، لەصەحیحی موسلیم دا فەرموودەیەك لەخاتو زەینەبی کچی جەحش دەگێڕنەوە: کە پرسیاری لەپێغەمبەرﷺ کردو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێمە بەهیلاك دەچین وەلحال پیاو چاکیشمان تێدا هەبن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی (نعم اذا كثر الحبث) بەڵیّ: هەرکاتیّ خراپە زۆر بوو!

لەصەحیحی تورموذی دا هاتووە: (هەرکاتیّ خەڵك ستەمکاریان بینیو بەرپەرچیان نەدایەوەو دەستیان نەگرت، نزیکە خودا بەگشتی هەموو خەڵکەکە، بیّ تاوانو تاوانبار، ستەمکارو ستەم لێکراو سزا بدا؟!

لەصەحیحی بوخاریو تورموذی دا هاتووە: نوعمانی کوڕی بەشیر لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا کە فەرموویەتی: (مثل القائم على حدود الله والواقع فيها كمثل قوم استهوا على سفينة فاصاب بعضهم أعلاها، وبعضهم أسفلها، فكان الذين في أسفلها اذا استقوا من الماء، مرّوا على من فوقهم، فقالوا لو أنا خرقنا في نصيبنا خرقاً ولم نؤذ من فوقنا، فان يتركوا وما أرادوا، هلكوا جميعاً، وان أخذوا على أيديهم نجوا ونجوا جميعاً).

---

[٢٠] تەفسیری قورطوبی ج٧ ٣٩١.

﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾ کۆمەڵی موسوڵمانان! وریابن، خۆبپارێزن لەهۆکاری ستەمو تاوانێك کە تۆڵەو سزاکەی بەتایبەتی دووچاری ئەوانەتان نابێ کە ستەمو تاوانەکەی کردوە، بەڵکوو سزاو تۆڵەکە گشتی دەبیو تەرپوش پێکەوە دەسووتێنێ، چاکو خراپ دەگرێتەوەو بەر هەمووتان دەکەوێ. لەهەموو تاوانێکیش گەورەتر کەنارگیر کردنی شەریعەتی خودایەو کار پێ نەکردنیەتی.

ئەمەش وەکوو وازهێنان لەجیهادو تێکۆشان لەرێگەی خودا دا. بێدەنگ بوون لەئاست خراپەکارانو جڵەوگیری نەکردن لەخراپەو بەرپەرچ نەدانەوەی ئاشوبگێڕان، هەرکاتێ کۆمەڵگا وای لێ هات فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەی تێدا نەما، کەس نەبوو بەرەنگاری خراپەو خراپەکاری بوەستێ خودا سزاو تۆڵە لەهەموو خەڵکەکە دەستێنێ، چاکو خراپ پێکەوە تووشی سزاو نارەحەتی دەکا، هەموویان دووچاری نەگبەتیو سزا دەبن کەواتە: ئەو کەسانەی خۆیان بەپیاوی چاك دەزانن‌و لەئاستی خراپەی خراپەکاران بێدەنگ دەوەستن‌و گوێی خۆیان کەڕ دەکەن‌و گۆشەگیری دەکەن (ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە) شیاوی ئەوەن دووچاری ئەو سزایە ببن کە تووشی خودی خراپەکارەکان دەبێ، چونکە بێدەنگیو گۆشەگیری ئەوانیش بەشێکە لەخراپەکارییەکە، ئەوانیش وەکوو ئەوان تاوانبارن!

ئەگەر هەرلەیەکەم رۆژەوە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئەو بێ دەنگیو گۆشەگیریەیان نەبوایەو چاکەکانیان بەرگریو بەرهەڵستی نەفامو ئاشووبگێرەکانیان بکردایە یەکەم بەڵاو سەر لێ شێوانو دووبەرەکیو شەڕو ئاژاوەو کوشتن‌و بڕین پەیدا نەدەبوو، ئەو هەموو بەڵاو ناخۆشییانە بەسەر کۆمەڵی موسوڵمانان نەدەهات، ئاوا کار نەدەگەییشتە ئەو رادەیە بەناڕەوا خەلیفەی سێیەم حەزرەتی عوسمان شەهید بکرێ: کە بەراستی فیتنەی حەزرەتی عوسمان‌و شەهید کردنی بەو جۆرە یەکەم فیتنەی هەڵگیرساوی ناو موسوڵمانان بوو تا ئیستاش ئاسەواری ماوەتەوەو رۆڵی گرنگی هەیە لەپەرتەوازە بوونی موسوڵمانان!

هەر ئەم فیتنەیەی عوسمان بوو سەر کێشایە بەبەرپا بوونی جەنگو کوشتار لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەر داﷺ کار گەییشتە ئەوە هاوەڵانی وەکوو (طـلحەو

زوبەیرو عەممار) بەدەستی هاوەڵانی تر شەهید بکرێن، شێری مەیدانی نەبەردیو ئامۆزاو زاوای پێغەمبەر شەهید بکرێ! دەیانو سەدان لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەجەنگی جەمەڵو صەفین دا شەهیدد بکرێن!!!

ئەمجار کار گەیشتە ئەوە پیسو ناپاکان دەستیان چووە زاتێکی وەکوو حەزرەتی حوسەینو شەهیدیان کرد! ئیتر فیتنەو ئاشووب بەزنجیرە بەدووی یەك دا هاتن، شەڕو ئاژاوە لەنێوان موسوڵمانان دا بەبەردەوامیو نەپچڕاوەیی درێژەیان کێشاو لەچەند شێوەو شێوازێك دا سەریان هەڵداو خۆیان نواند شەڕی رەگەزایەتیو چینایەتی، دروسبوونی پارتی ئایینیو رامیاری جۆراوجۆر، تاوای لێ هاتووە ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینینو بەگوێچکەی خۆمان دەبیسین کۆمەڵگای موسوڵمانانو ئۆمەتی ئیسلامی پارچە پارچە بووە بەسەر چەند حکوومەتو دەوڵەتدا، هەر حکوومەتو هەرێمێکیش چەندان پارتو رێکخراوی ئایینیو سیاسی تێدان هەریەکەیان بەخوێنی سەری ئەوی تریان تینووە. تاڵانو برۆ، کوشتن بڕین گرانیو برسیایەتی چەوسانەوەو ژێردەستەیی، خەمو خەفەتو دڵەراوکێ شەڕو هەراو راوەدونانو بگرەوبەردە هەموو کونو قوژبنێکی جیهانی ئیسلامی گرتۆتەوەو چاكو خراپ تێکڕا دووچاری سزاو تۆڵەی خودایی بوون،

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ بزانن: کە خودای پەروەردگارو باڵادەست سزای توندو بەئێشە لەدونیاو قیامەت دا بۆ ئەو گەلو نەتەوەو تاكو کۆمەڵانەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەنو بەگوێرە ئایینی خوداو شەرعو یاسای بێ خەوشی رەفتار ناکەن!.

ئەم هەڕەشەو ترساندنە هاوەڵانی پێغەمبەرو غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە، هەرچەندە یەکەم جار خیطابەکە ئاراستەی ئەوان کراوە.

ئەوەی ئەم هەڕەشە دەیگەیەنێ ئەوەیە: موسوڵمانان هەوڵ بدەن نەهێڵێن ئەو شتانە بێنە کایەوە کە سەر دەکێشن بۆ هاتنی سزای گشتی، هەوڵ بدەن خراپەکاریو مونکەر قەڵاچۆ بکەن، جیهادو تێکۆشان پاشگوێ نەخەن، یەکیەتیو تەبایی ریزەکانی خۆیان بپارێزن، فەرمان بەچاکەو نەهی لەمونکەر واز لێ نەهێنن!!

بێگومــان زۆر فــەرموودەی پێغەمبــەرﷺ هــەن موســوڵمانان لەبــەرپابوونی فیتنەو ئاشووب دەترسێنێ، یەکێك لەو فەرموودانە ئەو فەرموودەیەیە کە ئیمامی ئەحمــەدو ئــەبوداوود لــەمونــذیــری کــوڕی جــەریر ئــەویش لەباوکییــەوە دەڵــێ: پێغەمبەر فــەرمووی: (مامن قوم يعملون بالمعاصي، وفيهم رجـل أعـز وأمنـع لايغـير الا عمهــم الله بعقــاب أو اصــابهم العقــاب) هەرگــەڵو نەتــەوەو کــۆڕو کۆمــەڵێك تــاوان کردنیان تێدا بڵاو بێتەوە، پیاوێکیان تێدا بێ دەسـت ڕۆیـشتوو بـەتوانا، ئـەو پیـاوە بەرگری لەبڵاو بوونەوەی مونکەرو تاوان نـەکاو بـێ دەنـگ بـێ ئـیللا خـودا هـەموو خەڵکەکە سزا دەداو چاكو خراپ بەیەکەوە تووشی ئەو سزایە دەبن.

ئەمجار پەروەردگار سەرنجی بەندەکانی رادەکێشیو هۆشیاریان دەکاتـەوە کـە نیعمــەتو چــاکەی خــودای خۆیــان کــە بەســەری دا رشــتوون بێننــە بەرچــاوو سوپاسگوزار بن‌و دەفـەرموێ: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الأَرْضِ تَخَـافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمْ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنْ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بیری ئەو سەردەمو رۆژگارانە بکەنەوە کە ئێوە ژمارەتان کەم بوو خودا زۆری کـردن، بـێ دەسەڵاتو نەدارا بوون، ترسی دوژمنتان هەبوو، لەمەدینە حەواندنیەوە، لەجـەنگی بەدرو جەنگەکانی تر دا خودا بەهێزی کردن‌و یارمـەتی دان، هـەژارو نـەبوو بـوون، خودا دەوڵەمەندی کردن، رزقو رۆژی بەسەر دا رشتن واتـە: ئـەوە حـاڵو چۆنیەتی موسوڵمانان بوو پێش کۆچکردنیان لەمەککەوە بۆ مەدینە، پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد بەبەندایەتیکردن بۆ خوداو گوێڕایـەڵی بـۆ ئامۆژگـاری پێغەمبەرﷺ ئەمجار فەرمانی پـێ کـردن بەخۆپاراسـتن لـەتاوان‌و سەرپێچی کـردن، ئەمجار جەخت لەسەر ئەو ئەرکانە دەکاتەوە بەم ئایەتەو فـەرمووی: ئـەی کۆمـەڵی کۆچەران! یان ئەی گرۆهی موسوڵمانان! یادی ئەو سـەردەمو رۆژگـارە بکەنـەوە، کە ئێوە کـەمو بـێ نـەواو بـێ دەسـەڵاتو هـەژار بـوون لەمەککـە دا، موشـریکەکان زۆرو بــەهێزو خــاوەن دەســەڵات بــوون، ســزایان دەدان، بەهــەموو جۆرێــك نارەحــەتیان دەکردن، ئێـوە دەترسـان دڵـە راوکێتـان بـوو، لـەخۆتان دڵنیـا نـەبوون، دەترسـان کـە لـەناکاو موشـریکەکان بتـانفرێنن، بتـان بـەن بـۆ کوشـتن، یـان بێنـە سـەرتان بـۆ روتکردنەوەو ماڵ تاڵان کردنتان، وەکوو چۆن لـەدەرەوەی شـاری مەککـە وا بـاوبوو

خێڵە عەرەبەکان بەغافڵگیری یەکتریان تاڵان دەکرد، لەیەکتریان دەفڕاند، شەوکوتی کورتی یەکتریان دەکرد، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَماً آمِناً وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ﴾العنكبوت/٦٧ یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَماً آمِناً يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾القصص/٥٧.

ئەی کۆمەڵی موسوڵمان! بیر لەو ڕۆژگارە بکەنەوە، بۆ ئەوەی باش دڵنیا بن کە بانگەوازی پێغەمبەرﷺ بۆ ژیانەوەتان بۆ کارێکە پێی زیندو دەبنەوە، بیری لێ بکەنەوە بۆ ئەوەی بەرامبەر خراپەو خراپەکاران، لەناست ستەمو ستەمکاران لەرووی ئاشووبگێڕان دەستەو ئەژنۆ دانەنیشن!

بیر لەسەردەمی زەبوونیو کەم دەسەڵاتیتان بکەنەوە بیر لەترسو لەرزی پێش ئەو کاتەتان بکەنەوە کە هێشتا فەرمانتان پێ نەکرابوو بەکۆچکردنو ئیزن نەدرا بوون شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەن، پێش ئەو کاتە کە پێغەمبەر داوای لێ کردن لەبەدر لەگەڵ لەشکری کوفر دا بجەنگنو ئێوەش پێتان ناخۆش بوو!! پاشان بڕوانن: گەییشتنە چ ئاستێکو چۆن بەهۆی بەپیرەوە چوونتان بۆ بانگەوازی پێغەمبەرﷺ ئێوە ژیانەوە، بەهێز بوون، سەرکەوتن، لای خودا پاداشی باشتان بۆ نووسرا، رزق ڕۆزی زۆرو زەبەندەتان بەسەر دا رژا، خودا رزقو ڕۆزی پاکو خاوێنی بەسەر دا رشتن بۆ ئەوەی ئامادەباشیتان تێدا بخولقێنێ بۆ سوپاسگوزاریو سوپاسی نیعمەتەکانی بکەنو پاداشتان بداتەوە لەسەر سوپاسەکە.

ئیبنو جەریری طەبەری لەقەتادەی کوڕی دەعامەی سەدوسییەوە دەگێڕێتەوە: کە دەربارەی ئایەتی ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ﴾ وتوویەتی: ئەم خێڵەی عەرەب لەهەموو کەس زیاتر ژێر دەستەو چەوساوە بوون، ژیانیان بەکولەمەرگی بەسەر دەبرد، لەهەموو کەس زیاتر برسیو تینوو بوون، لەهەموو کەس روتو رەجاڵ تر بوون، لەهەموو کەس زیاتر گومڕاو سەر لێ شێواو بوون، لەنێوان فارسو ڕۆم دا بستە خاکێکی بەردەڵانیان بەدەستەوە بوو، سوێند بەخودا لەوڵاتەکەیان دا شتێکیان نەبوو حەسوودییان پێ ببرێ، ئەوەی دەژیا ژیانی بەدبەختیو چارە رەشیو کولەمەرگی بوو، ئەوەی لێیان دەمرد یەکسەر بۆ ناو سزاو

ئەندێشە گلۆر دەکرایەوە. وەڵڵاهی لەو رۆژگارە دا خێڵێك نەبوو لەسەر زەوی بەئەندازەی ئەوان ژیانی کولەمەرگی بێ!![31]

کەئیسلام هات حاڵو وەزعی ئەوانی گۆڕی، وایان لێهات لەوڵات دا جێگیرو سەرفرازو خاوەن دەسەڵات بن، رزقو رۆژییان زۆرو زەبەندەو وڵاتیان پڕ لەئاسایشو ئارامی بوو، بوون بەپادشاو فەرمانڕەوای جیهان.

کەوابێ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان بینیتان بەهۆی ئیسلامەوە چیتان پێ دراو چ پلەوپایەیەکتان بەدەست هێنا! چ نازو نیعمەتێکتان دەسکەوت دەسوپاسی خودا بکەن لەسەر نیعمەتەکانی، چونکە خودای ئێوە خاوەن نیعمەتە، پێی خۆشە شوکرو سوپاسی بکەن. شوکرو سوپاسیش هەموو کاتێ نازو نیعمەت زیاد دەکا!

بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەم دیمەنە دا ژیابوونو دەژیان، هەمیشە بیریان لەرابوردووی خۆیان دەکردەوەو سەیری وەزعو حاڵی خۆشیان دەکرد دوای بەهرەمەند بوونیان بەئیسلام، کە رابوردوو حازری خۆیان بەرامبەری دەکرد، هەستیان بەنیعمەتو فەضلی خودا دەکرد لەسەر خۆیان، بۆیە ئەم قورئانە تامو چێژێکی تایبەتی هەبوو لەهەستو فیکرییان داو لەززەتێکی تایبەتیان لێ وەردەگرت!! ئەمڕۆش کە ئاخرونۆخری سەدەی بیستەمەو رابوونێکی ئیسلامی لەسەرتاسەری جیهان دا هەستی پێ دەکرێ. ئەرکی سەرشانی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەیە کە خۆیان لەگۆڕەپانی رابوونەکە دا دەبیننەوەو تێدەکۆشن بۆ گێڕانەوەی ئەم ئایینە بۆ واقیعی ژیانی موسوڵمانانو دەیانەوێ مەنهەجی خودا پەیڕەو بکرێو یاسای دەستکردو دانراوی رۆمانو فرەنسا وەلابخرێو قورئان بگەڕێتەوە بۆ شوێنی سروشتی خۆیو ببێتە سەرچاوەی حوکمو یاسا! ئائەو کۆمەڵە لەخۆبردوە موسوڵمانە هەرچەندە وێدەچێ ئەو دوو قۆناغەی بەسەر هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ دا هاتوو پێی دا تێپەڕ بوون ئەمان پێی دا نەروییشتبن یان ئەو چێژەی لێ نەکەن، وەلێ پێویستە کە ئەم قورئانە بەم حەقیقەتە لەگەڵیان

[31] ئەمە بەنیسبەت ئەو حاڵەیانەوە کە لەسایەی ئیسلامەوە بەسەریان هاتو ئەو رێزو شکۆمەندییەی دەستیان کەوت ئەگینا ئەوان ئەو کاتە خاوەنی (بەیت) بوون (رحلة الشتاء والصيف)یان هەبوو، حاڵیان لەعەرەبەکانی دەوروبەریان باشتر بوو!!؟

دەدوی‌و بانگەوازیان دەکا بۆ بەپیرەوە چوونی ئەم ئایینە کە مایەی ژیانەوەو زیندو بوونەوەیانە، بەبێ سێودوو بەپیر بانگەوزییەکەوە بچن‌و بەدڵنیایی‌و بتمانەی تەواوەوە تێبکۆشن‌و چاوەڕوانی ئەو وادەو بەڵێنانە بن کە خودا بۆ موسوڵمانانی پێشووی هێنانە دی‌و سەرفرازی کردن، دڵنیا بن هەمان وادەو بەڵێن بۆ ئەمانیش دێنێتە دی‌و هەرتاقەو کۆمەڵێك بەلێبوردوویی‌و راستاڵی رێبازی شەقامەڕێی خودا بگرنە بەرو لەپێناو ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانیان خۆگرو بارقووڵ بن بێگومان هەمان سەرفرازی‌و شکۆمەندی کە دای بەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ دەی دا بەئەمانیش!

***دەبا هەڵگرانی مەشخەڵی رابوونی ئیسلامی لەهەموو پەناو پاسارێکی سەر زەوی چاوەڕوانی هاتنی یارمەتی‌و کۆمەکی رزق‌و رۆژیی خودا بن کە بەڵێنی خودایەو بەڵێنی خودای پەروەردگاریش هەرگیز پاش‌و پێش ناکاو بەدرۆ دەرناچێ!***

## خیانەتکردن لەخوداو پێغەمبەرو خیانەت لەسپاردە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشو دا پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: کە رزق‌و رۆزی پاك‌و خاوێنی داوە بەبەندەکانی‌و، نازو نیعمەتی جۆراو جۆری بەسەر دارشتوون.. ئەمجار لێرە دا جڵەوگیری ئەوەیان لێ دەکات. کە نەچن خیانەت لەدەسکەوتەکانی جەنگ‌و ئەرکە ئایینیەکان دا بکەن....

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، وەکوو: سەعیدی کوڕی مەنصوورو هی تریش لەعەبدڵلای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕنەوە، دەفەرموێ: ئایەتی ﴿لا تَخُونُوا

اللَّهَ وَالرَّسُولَ﴾ دەربارەی ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونذیر هاتۆتە خوارێ، کە هاوپەیمانی هۆزی قورەیظەی جولەکە بوو، کاتێك پێغەمبەرﷺ هۆزی بەنو نەضیری شاربەدەر کردن، ئەمجار نۆرەی دەرکردنی بەنوقورەیظە هات، دوای قوڕمتێنە خستنە سەریان بۆ ماوەیەکی درێژ، ویستیان لەسەر حوکمو شەرەفی سەعدی کوڕی مەعاز کە ئەویش لەوەپێش هاوپەیمانیان بوو، لەقەڵاکەیان بێنە دەرێ. جا لەئەبولوبابەیان پرسی: وتیان: دەبێ سەعد دەربارەی ئێمە چ حوکمێك بدا؟ ئەبوولوبابە دەستی بۆ ملی خۆی برد. ئاماژەی بەوە کرد: کە سەعد حوکمی سەر بڕین دەربارەیان دەدا. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ. ئەبوولوبابە دەڵێ: کە ئەو ئیشارەیەم بۆ جولەکەکان کرد هێشتا لەشوێنێ خۆم نەجووڵابووم یەکسەر هەستم بەوە کرد: کە خیانەتم لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودا دا کردوە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: پێغەمبەرﷺ پرسیاری لەخێزانی ئەبوولوبابە کرد: ئایا ئەبوولوبابە بەرۆژوو دەبێ، نوێژ دەکا؟ غوسلی لەشپیسی لەخۆی دەردەکا؟

خێزانەکەی وتی: بەڵێ قوربان رۆژوو دەگرێو نوێژ دەکاو غوسل لەخۆی دەردەکا! خوداو پێغەمبەریشی زۆر خۆش دەوێن.

ئیمامی زوهری دەفەرموێ: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ئەبوولوبابە خۆی بەکۆڵەکەیەکی مزگەوتەوە پێچا، وتی: وەڵلاهی خواردن ناخۆمو هیچ ناخۆمەوە تا دەمرم یان خودا تۆبەم لێ قبووڵ دەکا، نۆ رۆژ بەو حاڵەوە مایەوە، لەریوایەتێك دا حەوت رۆژ مایەوە، هیچی نەخوارد تا لەهۆش خۆی چوو، ئەمجار خودای میهرەبان تۆبەی لێ قبووڵ کرد، پێیان گوت: ئەی ئەبوولوبابە تۆبەت لێ وەرگیرا، وتی: وەڵلاهی خۆم ناکەمەوە تا پێغەمبەرﷺ تەشریفی نەیە بەدەستی خۆی نەمکاتەوە، ئیتر تەشریفی هاتو بەدەستی موبارەکی کردیەوە.

ئەبوولوبابە بەماڵو سامانیو خێزانو منداڵی لەناو جولەکەکانی بەنوقورەیظە دابوو کە تۆبەی لێ وەرگیرا وتی: دەبێ بەمەبەستی تەواو کردنی تۆبەکەم ئەو خانوەی تاوانەکەم تێی دا ئەنجام دا چۆڵی بکەم هەرچی ماڵو سامانیشم هەیە بیبەخشم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی نەخەیر سێیەکی ماڵەکەت بکە بەخێر بەسە!

ریوایـەتی تـریش هەیـە دەربـارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـە بـەڵام موفەسسیرین بەلایانەوە بەهێز نیەو ئێمەیش پاشگوێمان خست:

بەهـەر حـاڵ هـۆی هاتنـە خوارەوەکـە چـیرۆکی ئەبوولوبابـە بـێ، یـان هـۆی تـربن. چ لەمەوزوعەکـە نـاگۆڕێ، وەکـوو چـەند جـاری تـر گـوتراوە (عیـبرەت بـەعوموومی لـەفظـە نـەك بەخوصووصـیەتی سـەبەب.). دەقەکـەش سـەرلەنوێ بانگەوازیکردنو هوتافە بۆ موسوڵمانان: کە وریابنو سووربن بـۆ بـەپیرەوە چوونی بانگەوازی خواداو پێغەمبەرﷺ........

چـونکە مـاڵو منـداڵ زۆر جـار دەبنـە کۆسـپو تەگـەرە لەبـەردەم بـەپیرەوە چوونی بانگەوازییەکەدا، ترسو بەخیلی دەخەنـە دڵی ئـادەمیزادەوە. پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: (ألْوَلَدُ مجبنة مبخلـة) واتـە: منـداڵ پیـاو ترسـنۆك دەکـاتو رژدو چروکی دەکا.

ئاشکراشـە ئـەو ئایینـەی پێغەمبـەرﷺ بانگـەوازی بـۆ دەکـاو هـۆی ژیانـەوەو زیندو بوونەوەیەوە، ژیانی سەرفرازی بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکا لەهـەردو جیهـان دا، پێویستی بەفیداکاریو لەخۆبوردنە، پێویستی بەگیانبەخشینو ماڵبەخشین هەیـە، بۆیـە قورئـانی پـیرۆز چارەسـەری حـیرصو تـەماعی ئـادەمیزاد دەکـا، بـەوە کـە ئاگاداریـان دەکاتـەوە: مـاڵو منـداڵ کاریـان تـێ نەکـەنو پاڵیـان پـێ لێ نەدەنـەوە، دەفـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی بڕواتـان بـەخوداو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو بەقورئان هێناوە: ﴿لا تَخُونُـوا اللَّـهَ﴾ خیانـەت لەگـەڵ خودا مەکەن، بەم جۆرە ئەو ئەرکانەی خستویەتیە سەر شانتان ئەنجامیان نـەدەن، یان سنوورەکانی بشکێننو سنوور بـەزێنی بکـەن، ﴿وَالرَّسُـولَ﴾ هـەروەها خیانـەت لەگـەڵ پێغەمبـەر مەکـەن، بـەم جۆرە شوێن ئامۆژگارییـەکانی نەکـەونو پابەنـدی فەرمانو نەهیـەکانی نـەبنو شوێن هەواو ئارەزۆی خۆتـان بکـەونو لاسای بـاوکو باپیرانتـان بکەنـەوە. ﴿وَتَخُونُـوا أَمَانَـاتِكُمْ وَأَنْـتُمْ تَعْلَمُـونَ﴾ هـەروەها خیانـەت لەسپاردەی ناو خۆیشتان مەکەن، بەم جۆرە پارێزگاری سپاردەو شتی لەلا دانراوتان نەکەنو گرنگی پێ نەدەن، بەڵکوو پێویستە وێڕای خیانەت نەکردن لەگەڵ خوداو پێغەمبەرﷺ ئاگاداری سپاردەی نێوان خۆشتان بـنو خیانـەت لەئەمانـەت مەکـەن.

ئەمەش سپاردەو (وەدیعە)ی مادیو هەواڵی نهێنی گشتی پەیوەند بەگەلو ولاتەوەو نهێنی تایبەت بەتاکەکانی کۆمەڵ دەگرێتەوە. نابێ رێگا بدەن دوژمن بەسەر نهێنی گەلو ولات دا ئاگادار بێ، هەروەها نابێ بهێڵێ نهێنی تاکەکان بەناو خەڵك دا بلاوبێتەوە.

ئەمانەت هەموو ئەو گوفتارو کردەوانە دەگرێتەوە کە خودا بەبەندەکانی سپاردونو لەسەری پێویست کردونو بۆی دیاری کردون، خییانەت لەئەمانەتیش بریتییە لەبەجێ نەهێنانی ئەرکە پێویستییەکانی ئاینو پابەند نەبوون بەبڕیارەکانی خوداو پێغەمبەرو شوێن نەکەوتنی سونەتەکانی پێغەمبەرو پێشێل کردنی مافی خەڵك.

﴿وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ وەلحال ئێوە کە ئەو خییانەتە ئەنجام دەدەن دەزانن، کە خییانەت دەکەنو دەزانن سزاکەی بەئێشو سامناکە، ئێوە جیاوازی چاكو خراپ دەکەنو دەزانن: ئاکامی خییانەت چۆنە، واتە: ئێوە کە خییانەت دەکەن بەئەنقەست دەیکەن نەك بەنەزانی.

خییانەت گوناهی بچووكو گەورە دەگرێتەوە، جا گوناهەکە زیانی هەر بۆ خودی گوناهکارەکە بێ، یان زیانەکەی بۆ خەڵکانی تریش بێ، خییانەت رەوشتی دووڕوو خوانەناسانە، هەروەکوو چۆن ئەمانەت رەوشتی موسوڵمانانە.

ئیمامی ئەحمەد لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کەم جار وا بووە پێغەمبەرﷺ وتاری خوێندبێتەوە نەیفەرموو بێ (لا ایمان لمن لا عهد له) ئیمانی نیە کەسێك وادەو بەڵێنی خۆی بەجێ نەهێنێ.

هەردوو پیری فەرمووده (موسلیمو بوخاری) لەئەبوهورەیرەوە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (آية المنافق ثلاث: إذا حدّث كذب، وإذا وعد أخلف وإذا ائتمن خان، وان صام وصلى وزعم انه مسلم) نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کە قسەی کرد درۆ بکا، کە وادەو بەڵێنی دا نەیباتەسەر، کە سپاردەی لا دانرا خییانەتی لێ بکا، ئەو کەسەی ئەمە رەفتاریەتی دووڕووە تەنانەت با رۆژووش بگریو نوێژ بکاو پێی وا بێ موسوڵمانە.

جا چونکە هۆیەك لەهۆیەکانی خیانەتکردن، خۆشەویستی ماڵو منداڵە، پەروەردگار بەندەکانی هۆشیار دەکاتەوە، کە خۆیان لەزیانو ناکامی ئەو خۆشەویستییە بپارێزنو فەرمووی: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ واتە: باش بزانن کە بێگومان ماڵو سامانتان ئەزمونو تاقیکردنەوەمن بۆ ئێوە، پەروەردگار بەتاقیتان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بۆتانی دەربخا چۆن پارێزگاری سنوورەکانی خودا دەکەنو رەفتارتان چۆن دەبێ، کەسێك لەتاقیکردنەوە دا سەرکەوتوو نەبێ، تووشی تاوانو سزا لێ ستاندن دەبێ، چونکە ماڵو منداڵ وا لەئادەمیزاد دەکا بەتەواوی هەڵەوگیری دونیا بێو، واز لەهەوڵدان بۆ قیامەت بێنێ: لەم رووەوە کە ئادەمیزاد بەسروشت ماڵو سامانی خۆش دەوێ، بەتەماعو هەڵپەیە بۆ وەدەست هێنانیو کۆکردنەوەیو پەزمەندە کردنی، جا رژدیو چروکی تێدا دەنوێنیو حەقی خودای لێ ناداو زەکاتو سەرفیترەی واجبو خێری تری لێ ناکا، یارمەتی هەژاران ناداو، لەرێگەی خێرو چاکە دا لەماڵو سامانی نابەخشێ!

هەروەها خۆشەویستی (منداڵ)یش یەکێکە لەو شتانەی لەسروشتی ئادەمیزاد دا رەگی داکوتاوە، وا دەبێ ئەم خۆشەویستییە ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ وەدەستهێنانی ماڵو سامان لەرێگەی نابەجێوەو بۆ بەخێوکردنی خاوو خێزانی، بۆیە پێویستە موسوڵمان وریا بێ، بۆ ماڵو منداڵ خۆی نەخاتە بەر لێپرسینەوەو سزاو تۆڵە. بەڵکوو پێوستە موسوڵمان هەوڵ بدا ماڵو سامان لەرێگەی حەلاڵو مەشروعەوە پەیدا بکا، ئەمجار بەشی لێقەوماوانی لێ بدا، لەرێگەی خێرو چاکە دا لێی ببەخشێ، ماڵو منداڵی بەشتی حەلاڵ پەروەردە بکا، هەوڵ بدا بەخواردنو خواردنەوەی حەلاڵو زولاڵ جەستەی ماڵو منداڵی گەشە بکاو پەروەردە ببن، بۆ ئەوەی منداڵەکانی نەبنە هۆی ترسنۆکیو رژدیو چروکی!

لەهەمان کات دا پێویستە موسوڵمان لەئاست پەروەردەی منداڵی دا کەمتەرخەمی نەکا، هەوڵ بدا لەسەر رەوشتی بەرزو پابەند بوون بەئەحکامی شەرعو ئاینەوە ماڵو منداڵی پێ بگەیەنیو نەهێڵێ نزیك شتی حەرامو یاساغ بکەونەوە.

ئـەمجار پـەروەردگار بەرسـتەیەکی سـەرنج راکـێش کۆتـایی بەئایەتەکـە دەهێنـیو دەفـەرموێ: ﴿وَأَنَّ اللَّـهَ عِنْـدَهُ أَجْـرٌ عَظِـيمٌ﴾ خـودا خـۆی مـاڵو منـداڵ دەبەخـشێ بـەئادەمیزاد، هەرئـەو خودایـەی مـاڵو منـداڵ بـەئادەمیزاد دەبەخـشێ، پاداشو ئـەجرێکی گـەورەو فـرە مـەزنی لایـە بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە بـەهۆی مـاڵو منداڵـەوە تووشـی کـاری خـراپ نـابنو لەتاقیکـەو ئـەزموونی مـاڵو منـداڵ بەسـەر بـەرزیی دەردەچـنو سـەرکەوتوو دەبـن، مـاڵو منـداڵیان نابێتـە کۆسـپو تەگـەرە لەبـەردەم بـەجێهێنانی ئـەرکی سەرشـانیانو لەخۆبـەختکردنو جیهـاد سـاردیان ناکەنەوە.

واتـە: بـزانن کـە پاداشو بەخشـشی خـوداو بەهەشـتی رەنگـینو رازاوەی زۆر باشترە بۆ ئێوە لەماڵو منـداڵ، ئاگاتـان لـەخۆتان بـێ بـۆ مـاڵو منـداڵ ئـەو پاداشو بەخششە لەکیس خۆتان مەدەن، هەمیشە هـەوڵ بـدەن رەزامەنـدی خـودا بەدەست بێنن، پابەندی حوکمو شەریعەتو ئاییني خودا بن، بەگوێرەی ئـاییني خـودا مـاڵو سامان پەیـدا بکـەنو خـەرجی بکـەن منـداڵتان پـەروەردە بکـەنو پێیـان بگەیـەنن. چونکە سامانو منداڵ تاقیکردنەوەی ئادەمیزادن، کەسێك لەرێگـەی حەڵاڵـەوە مـاڵ پەیدا بکـاو لـەخێرو چاکە دا خـەرجی بکـا، خاوەنەکـەی لـەتاوانو طـوغیـان رزگـار دەبـێ. هـەروەها ئەگـەر بـاوك منداڵـەکانی پەروەردەیـەکی ئـاییني رەوشـت جـوانی پـەروەردە بکـا، خواردەمـەنی پـاكو حـەڵاڵیان دەرخـوارد بـدا رۆژی قیامـەت لەلێکۆڵینەوەو حیساب دەربارەی خاوو خێزانـی رزگـاری دەبـێ، ئەگـەر بەپێـچەوانە بوو ئەوە خۆی تووشی سەختترین سزاو تۆڵە دەکا!

## تەقوای خوداو پلەو پایەی تەقواو تەقواکاریی

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشودا، پەروەردگار ئادەمیزادانی ترساندن لەفیتنەی سامانو ماڵو منداڵ. ئەمجار لێرە دا خەڵك هەڵدەنێ بۆ تەقواو خودا پەرستییەك کە مرۆڤ وا لێ دەکا واز لەزێدەڕەوی لەخۆشویستنی ماڵو منداڵ بێنێو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَاناً﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەپەیامی ئیسلام کردوە! ئەگەر لەخودا بترسن، پابەندی فەرمانەکانی بنو خۆ بپارێزن لەجلەوگیرییەکانی، بەگوێرەی یاسای پەروەردگار رەفتار بکەن، لەناو دەروونی خۆتان دا، زانیاریو مەلەکەیەکتان بۆ دەرەخسێنێ دەتوانن بەهۆیەوە حەقو بەتاڵ لێك جیا بکەنەوە، قازانجو زیانی خۆتان بزانن، ئەم زانیاریو مەلەکەو روناکییە بەبێ تەقواو لەخودا ترسان دەستەبەر نابێ، کەوا بوو زانیارییەك کە لەتەقواوە سەرچاوە بگرێ بریتییە لەحیکمەتو دانایی، کەسێکیش حیکمەتی بدرێتێ خۆشبەختو کامەڕانە، وەکوو لەئایەتێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾(البقرة:٢٦٩) یان دەفەرموێ: ﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ نُوراً تَمْشُونَ بِهِ﴾(الحديد:٢٨). کەسێك تەقوای هەبێ، لەخودا بترسێ، پەروەردگار زانستو زانیارییەکی پێ دەبەخشێ کە رێگای ژیانی بۆ روناك بکا، جیاوازی نێوان گومڕاییو هیدایەت بکا، حەقو بەتاڵ لێك جیا بکاتەوە، ئیسلامی راستو کوفر لێك هەڵهاوێرێ، بەجۆرێك حەقانیو رەبانی بێ، بەمو لەشەریعەتی خودا لا نەداو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی ئایینی ئیسلام بێ. ﴿وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾ هەروەها ئێوە ئەگەر تەقوای خوداتان هەبێ، تاوانەکانتان دادەپۆشێو لێتان خۆش دەبێ، لەسەر تاوانی لەوەپێشتان سزاتان ناداو تۆڵەتان لێ ناسێنێ: ﴿وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ پەروەردگار کە ئەم هەموو چاکەیەتان لەگەڵ دەکا، فەضڵو نیعمەتی گەورە گەورەی بەسەر ئێوەو غەیری ئێوەش دا هەیە، نیعمەتو بەخششەکانی هێندە زۆرو بەرفراوانن بەشی هەموو کەس دەکا،،،

**تێبینی**:

لەقورئانی پیرۆز دا فەرمان بەتەقوا زۆر جار دووبارە بۆتەوە، بەڵام لێرە دا فەرمان بەتەقوا لەشێوەی مەرج دا هاتووە، پەروەردگار لەم ئایەتە دا خیطابی ئاڕاستەی بەندەکانی کردوە بەجۆرێك دڵی خۆیان لەگەڵ یەکتری دا ئاخاوتن

دەکەن، هەرکاتێ بەندە تەقوای خودای خۆی کرد، بەم جۆرە پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بێ، واز لەشتی گومان لێکراویش بێنێ لەترسی ئەوەی تووشی حەرام نەبێ، دڵو دەروونی خۆی شەحن بکاتەوە بەنیازی پاکو مەبەستی خاوێن، ئەندامەکانی جەستەی لەکارو کردەوەی باش دا بەکار بهێنێ، خۆ بپارێزێ لەهەرشتێك کە بۆنی شیرکی نهێنیو ئاشکرای لێ بێ! خودا پاداشتی باشی دەداتەوە: لێرە دا قورئانی پیرۆز سێ جۆر پاداشی بۆ تەقواکارن دیاری کردوە:

١- فەرمووی ﴿ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَاناً﴾ فرقان: وشەیەکە زێدە موبالەغەی تێدایە، مەبەست پێی هەرشتێکە کە جوداوازی لەنێوان حەقو بەتاڵ دا بکا، زانیاری بەسوود، سەرکەوتن بەسەر دوژمن دا پێیان دەگوترێ: (فرقان) ئەم وشەیە بۆ قورئانیش بەکاردەهێنرێ! چونکە هۆکاری سەرەکی جیاکردنەوەی نێوان حەقو بەتاڵی لەخۆگرتووە.

٢- فەرمووی ﴿وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾ واتە پەروەردگار پاشماوەی تاوانەکانی لەوە پێشیان -بەگەورەو بچووکەوە- پاك دەکاتەوەو لەدونیا دا پەردەپۆشیان دەکا، بەمەرجێ تۆبە لەو تاوانانە بکەنو جارێکی تر بۆیان نەگەڕێنەوە.

٣- فەرمووی ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾ واتە: لەرۆژی قیامەت دا لەتاوانەکانتان خۆش دەبێ، سزاو تۆڵەی بەرامبەریان لێ ناستێنێ!

بەکورتیو پوختی تەقوا نوورو روناکییە لەدونیاو لەقیامەت دا، هۆی خۆشبەختیو کامەرانی هەردوو دنیایە، کەشتی رزگار بوونە لەهەموو خراپەو شەڕو گێژاوێك بۆیە پەروەردگار لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ﴾(البقرة:١٩٧).

## فێڵو پیلانە جۆراو جۆرەکانی موشریکەکان دژی پێغەمبەر ﷺ

﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾

وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ: عەبدوررەزاق بۆی گێڕاینەوە: کە ئەویش لەموعەمەرەوە دەگێڕێتەوە: ئەویش لەعوسمانی ئەلجەریری ئەویش لەمەقسەم کە مەولای ئیبنوعەبباسە، دەڵێ: ئیبنو عەبباس دەربارەی ئایەتی ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ...﴾ بۆی گێڕامەوە فەرمووی: شەوێك قورەیشییەکان لەناو خۆیان دا لەمەککە دەربارەی پێغەمبەرﷺ راوێژیان کرد: هەندێکیان وتیان: بەیانی کە رۆژ بووەوە دەیگرینو پێوەندی دەکەین، بڕێکیان وتیان: نا، وا باشە بیکوژین، کۆمەڵێکیشیان وتیان: نەخەیر لەوەڵات دەری بکەینو نەهێڵین لەناومان دا دانیشێ! پەروەردگار پێغەمبەری خۆی لەم پیلانو کەینوبەینە ئاگادار کردەوە پێغەمبەرﷺ بڕیاری کۆچکردنی دا بۆ مەدینە عەلی کوڕی ئەبوطالیبی لەجێگەی خۆی نواندو پێغەمبەرﷺ لەمەککە دەرچو بەرەو ئەشکەوتی حیرا کەوتە ڕێو گەییشتە ناو ئەشکەوتەکە؛ لەلایەکی ترەوە موشریکەکان ئێشکیان لەعەلی دەگرتو وایان زانی پێغەمبەرە لەناو جێگەکەدا، کە رۆژ بووەوەو دونیا روناك بوو هەڵمەتیان بۆ برد بیگرن، کە لێی نزیك بوونەوە بۆیان دەرکەوت عەلی کوڕی ئەبوطالیبە. وتیان: کوا موحەممەد؟ کوا خاوەنی ئەم جێگەیە؟ وتی: نازانم بۆکوێ چووە. ئیتر شوێن پێیان هەڵگرت تاگەیشتنە کێوی حیرا، لەوێ لێیان تێکچوو بەکێوەکە هەڵگەڕان، بەبەردەم ئەشکەوتەکە دا ڕۆیشتن بینیان جاڵجاڵۆکە دەرگای ئەشکەوتەکەی تەنیوە، لەدڵی خۆیان دا وتیان: ئەگەر بچوایە ناو ئەشکەوتەکە دەرگاکەی ئاوا بەتەندراوی جاڵجاڵۆکە نەدەمایەوە، سێ رۆژ لەو شاخو کێوە مانەوە هیچیان دەس نەکەوت.[٢٢]

ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو ئیسحاق لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە: کە فەرموویەتی: چەند کەسێك لەقورەیشییەکانو لەپیاو ماقوڵانی هەرخێڵێك کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بچن بۆ (دار الندوة) شەیتان لەشێوەی پیاو ماقوڵێکی ریش

[٢٢] في ظلال القرآن ج٣/٨٤٤

سپی پێشی پێ گرتن، کە چاویان پێ کەوت، وتیان: جەنابت کێی؟ وتی: من پیرێکی نەجیبم، زانیومە بۆ چ مەبەستێك کۆدەبنەوە، ویستم منیش ئامادەبم، راو بۆچوونو ئامۆژگاری خۆم بخەمە پێش چاوتان، وتیان باشە فەرموو: تۆش وەرە ژوورەوە، لەگەڵیان چووە ناو (دار الندوة) ئەمجار وتی: دەی بابزانین دەربارەی ئەم پیاوە -واتە پێغەمبەر- چیتان بڕیار داوە؟ یەکێکیان وتی: پێوەندی دەکەینو بەندی دەکەین تادەمرێ. وەکوو چۆن شاعیرەکانی پێشوو -زوهەیر، نابیغە- لەناو چوون!

شەیتان کە لەشێوەی پیاوێکی پیر دا بوو، وتی: نا ئەم رایە پەسند نیە، چونکە خزمەکانی کۆدەبنەوەو بەزۆر لەبەند رزگاری دەکەنو لەوانەیە یارمەتی بدەنو ئێوە لەولات دەربکەن، بزانن چارەیەکی تر بۆ ئەم کابرایە بدۆزنەوە!!

یەکێکی تر، لەولات دەری بکەنو مەهێڵن بێتەوە ناو ولاتو بۆخۆتان ئیستراحەت دابنیشن. چونکە ئەو کە لەولات دەرکرا هەرچی بیکا زیان بەئێمە ناگەیەنێ!

پیرەمێردی نەجدی (شەیتان) وتی: نەوەڵڵا ئەوە پەسند نیە، ئێوە نازانن چەند زمانی لووسە؟ چەند گوفتوگۆ خۆشە؟ چۆن دڵو دەروون داگیر دەکات، سوێند بێ، ئەگەر ئێوە ئەوە بکەن پەیوەندی بەعەرەبەکانی ترەوە دەکاو کۆیان دەکاتەوەو پاشان هەڵمەتتان بۆ دێننو لەولات دەرتان دەکەن، پیاو ماقوڵەکانتان دەکوژن!! وتیا: راستەو قسەکەت بەجێیە، بزانن شتێکی تر بدۆزنەوە، ئەبوجەهل وتی: بەخودا من رێگا چارەیەکم دۆزیوەتەوە باشترین رێگایەو تا ئێستا کەستان پەیتان پێ نەبردوە، وتیان: ئەو رێگاچارەیە چییە؟ وتی: بێنن لەهەموو خێڵو بنەماڵەیەك گەنجێکی بەهێزو توانــاو نــازا هەڵبــژێرن، ئــەمجار هەریەکەیان شمشێرێکی برندەی دەدەینە دەست، هەموویان بچن پەلاماری بدەنو بەیەکەوە لێی راکێشنو بیکوژن، جا کە کوشتان خوێنەکەی دەکەوێتە سەر هەموو خێڵە عەرەبەکان، بڕواناکەم بەنووهاشم دوایی بتوانن شەڕ لەگەڵ ئەم هەموو خێڵە عەرەبانە بکەن، خۆ ئەگەر ویستیان خوێنەکەی دەدەینو بەئیستراحەت دوایی دادەنیشین.

پیرە پیاوی نەجدی، وتی: ئافەرین ئەوە رای باش‌و رێگاچارەی چاکە، تەگبیر لەوە باشتر نابێ!

ئیتر لەسەر ئەمە پێك هاتن‌و رایان لەسەر بوو: کە ئەنجامی بدەن.

ئیتر حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەرو هەواڵی تەگبیری کافرەکانی پێدا، پەروەردگار رێگەی بەپێغەمبەر دا کە کۆچ بکا بۆ مەدینە، جا کە پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو پاش گەیشتنی، پەروەردگار نیعمەتی خۆی وەبیر دەهێنێتەوەو ئەم ئایەتەی بۆ دەنێرێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا....الآية﴾.

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەئایەتەکانی پێشیانەوە ئەوەیە: کە پەروەردگار لەوەپێش نیعمەتەکانی خۆی بەسەر موسوڵمانان دا بەگشتی وەبیر هێنانەوەو فەرمووی: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ......﴾(الأنفال:٢٦) گونجاو بوو کە نیعمەتە تایبەتیەکانی بەسەر پێغەمبەرﷺ خۆی دا وەبیر بێنێتەوە: کە بریتییە لەپووچەڵ کردنەوەی فێڵی موشریکەکان کە ویستیان پێغەمبەر تیرۆر بکەن. خودا پیلانەکەیانی پووچ کردەوە. دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ئەو نیعمەتە گرنگە یاد بکەرەوە کە خودا پێی دای، بیری ئەو کاتە بکەرەوە کە موشریکەکان کۆبوونەوە بۆ دارشتنی پیلانێکی خەتەرو سامناك دژی شەخصی خۆت‌و پەیامەکەت، بێگومان پوچەڵکردنەوەی ئەو پیلانە نیعمەتێکی ئەوەندە گرنگە شیاوی ئەوەیە: تۆ هەمیشە سوپاسگوزار بێ، رووداوێك بوو پەندو عیبرەتی لێ وەردەگیرێ، بەڵگەیە لەسەر راستی بانگەوازی‌و پەیامەکەت، نیشانەی ئەوە بوو خودا لەکاتی تەنگانەو ناخۆشی دا پشتگیریت دەکا، ناهێڵێ دوژمن فرسەتت لێ بێنن بێگومان موشریکەکان نەخشەو پیلانیان لەدژ دارشتی، هەموویان لەسەر ئەوە رێکەوتن‌و بەنهێنی لەناو خۆیان دا بریاریان دا ﴿لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ﴾ کە بەیەکێك لەم سێ جۆرە زیانت پێ بگەیەنن، یان بتخەنە بەندیخانەوەو نەهێڵن پەیامەکەت بەخەڵکی بگەیەنێ، یان گەلەکۆمەکیت لێ بکەن‌و بتکوژن، یان لەوەڵات دەرت بکەن‌و نەهێڵن لەزێدی خۆت دابنیشی.

﴿وَيَمْكُرُونَ﴾ ئەوان بەنهێنی پیلانیان لەدژ دادەڕشتی بەجۆرێك كە تۆ ئاگات لێ نەبوو، ﴿وَيَمْكُرُ اللَّهُ﴾ بەڵام پەروەردگار پیلانەكەیانی پووچ دەكردنەوە فرتو فێڵەكانیانی هەڵوەشاندنەوە، چ پیلانو نەخشەی كێشابوویانن بەفیڕۆ چوون چونكە كۆچكردنی بۆ مەدینە بەساغو سەلامەتی بۆ رەخساندیو بەناو ئەوان دا لەماڵ هاتیە دەریو پێیان نەزانیو لەدەستیان رزگارت بوو، لەمەككەوە كۆچت كرد بۆ مەدینە. ﴿وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ پیلانی خودا باشتر جێ دەگریو كاریگەرترە بەڵكوو هەرنەخشەی خودا جێبەجێ دەبیو هەر پیلانی ئەو سەركەوتوو دەبێ!

بەراستی ئەو تابلۆیەی لێرە دا قورئان كێشاویەتی: ﴿وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ﴾ تابلۆیەكی سەرنج راكێشو كاریگەرە، دەتۆ بەخەیاڵ كۆڕو كۆبوونەوەی قورەیشییەكان بێنەوە بەرچاوو تێیان بفكرە كە پیلانو نەخشەكان دادەڕێژن، تەگبیر دەكەنو راوو بۆچوون دەگۆڕنەوە، پەروەردگاری باڵا دەستو زاناو بەتوانا لەپشتیانەوە پیلانو نەخشەكانیان پووچ دەكاتەوەو ریسەكەیان دەكاتەوە بەخوریو ئەوان بەخۆیان نازانن و هەست بەنەخشەی خودا ناكەنو ئاگایان لەهیچ نیە!!

ئەم تابلۆ قورئانییە لەسەرێكەوە قەشمەریو لاقرتێیان پێ دەكاو لەلایەكی ترەوەو لەهەمان كات دا وێنەیەكی ترسناكو دڵ دا خورپێنە! چونكە ئەو ئادەمیزادە نەزانو زەبوونو بێ دەسەڵاتانە دەبێ چی بنو بتوانن چی بكەن؟! زانینو توانای ئەوانو لە كوێیو تواناو زانیاری پەروەردگار لە كوێ!؟ دەبێ ئەو نەفامانە چییان پێ بكرێ بەرامبەر زانیاریو دەستەڵاتی پەروەردگاری بەدیهێنەری بونەوەر؟ ئەمجار سیاقی ئایەتەكە درێژە بەرانواندنی رەوشتی كافرەكان دەدەنو رەفتارو كردەوەكانیان دەخەنەڕو، پڕوپاگەندەو درۆو بوختانیان دیاری دەكەن، لافو گەزافو خۆهەڵكێشانی ئەو موشریكانە دەگاتە ئاستێك كە بڵێن: جا قورئان چیە؟ ئێمەش ئەگەر بمانەوێ دەتوانین پەراوێكی ئاوا بخەینەڕو! قورئان بریتییە لەداستانو چیرۆكی گەلەپێشینەكانو ئێمەش دەتوانین لەو چیرۆكو داستانانە بڵێین!!

بۆیە قورئانی پیرۆز دوا بەدوای باسكردنی پیلانو نەخشەكێشانی كافرەكان دژی خودی پێغەمبەرﷺ خۆی، دێتە سەر باسكردنی پیلانەكانیان دژی ئایینو

قورئانەکەی‌و دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا!﴾ ئەگەر ئایاتی قورئانی پیرۆز بەسەر ئەو موشریکانە دا بخوێندرێتەوە، -هەرچەندە ئایەتەکان وەکوو خۆری روناك وان، ئاشکراو نومایانن- ئەوانە لەبەر نەفامی‌و سەررەقی‌و بێ هۆشی‌و لوتبەرزی خۆیان دەڵێن: گوێمان لێ بوو بیستمان، جا ئەوە چیەو گرنگی لەچی دایە؟ ﴿لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَذَا﴾ ئەگەر ئارەزۆمان لێ بێ، ئێمەیش کتێبی وەك ئەم قورئانە دادەنێین، دەتوانین ئایاتی ئاوا بڵێین!! ئەمجار باییسی وتەکەی خۆیان دەدەنەوەو دەڵێن: ﴿إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ ئەم قورئانە بریتیە لەکۆمەڵێك درۆو دەلەسەو چیرۆکو داستانی پێشینان، جگە لەمە هیچی تری تێدا نیە.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ئیبنو کەثیر لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەو لە (السدی)و لەئیبنو جورەیجو کەسانی دیکەشەوە ریوایەتی کردوە کە بێژەری ئەم وتە نابەجێیانە (النضر)ی کوڕی (الحارث)ە دەڵێ: ئەم پیاوە نەفرەت لێکراوە، لەکاتی خۆی دا چووە بۆ وڵاتی فارس‌و هەندێ چیرۆکو داستانی پادشاکانی ئێرانی بیستبوو لەبەری کردبوون، برێ سەرگوزشتەی روستەمو ئەسفەندیاری دەزانین. کە گەڕابۆوە بۆ مەککە دیتی تازە پێغەمبەرﷺ رەوانەکرابوو، قورئانی پیرۆزی بۆ قورەیشییەکانی دەخوێندەوە، وا دەبوو (النضر)یش ئامادە دەبوو، جا کە پێغەمبەرﷺ ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەی بەجێ دەهێشتن ئەمجار (النضر)ی مەلعوون چیرۆکی پاشاو پاڵەوانەکانی فرسی بۆ دەگێڕانەوەو دوایی دەیگوت: دەی توخوا کێمان چیرۆك بیژترین؟ من یان موحەممەد؟

بۆیە کە لەجەنگی بەدر دا خودا کردی (النضر) بەدیلی گیراو کەوتە بەردەستی پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا کە بەشمشێر لەملی بدری‌و بکوژرێ!! فەرمانەکە جێبەجێ کراو کوژرا. ئەو کەسەی (النضر)ی دیل کردبوو (المقداد)ی کوڕی (الأسود)بوو.......... جا کە پێغەمبەر فەرمانی دا بەئیعدام کردنی (النضر). (المقداد) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە من بەدیل گرتوومە! بۆ دەیکوژن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ئەمە دەربارەی کەلامی خودا واو وای دەگوت.) ئیتر فەرمانی بەکوشتنی دا، میقداد دوبارە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە دیلی منە! پێغەمبەرﷺ فەرمووی خودایە! بەفەضڵ‌و بەخششی خۆت میقداد دەوڵەمەند بکەو

ئاتاجی نەمێنێ) میقداد وتی: ئەوەی من دەمەویست ئەمە بوو... ئەم ئایەتە دەربارەی (النضر)ی ناوبراو هاتۆتە خوارێ. بێگومان چەند جار لەقورئان دا ئەوە دووبارە بۆتەوە: کە موشریکەکان قورئانیان بەوە عەیبدار دەکرد کە چیرۆکو داستانی پێشینانە، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾(الفرقان:٥). یان دەفەرموێ: ﴿....... يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾(الأنعام:٢٥).

ئا ئەم پروپاگەندەو لەدژ دوانەی موشەریکەکان زنجیرەیەك بوو لەزنجیرە دورو درێژەکانی درۆو بوختانو چاوو راوی کافرەکان کە دژی پێغەمبەرو پەیامەکەی ئەنجامیان دەداو دەیانەویست بەم هەوڵە بێهودەو تێکۆشانە بێ ئاکامەیان بەربەتیشکی خۆری روناك بگرنو پەیامی ئیسلام بەدرۆ بخەنەوەو، قورئان لەپێش چاوی خەڵك سووك بکەنو، بێ بایەخ سەیری بکەنو لەکاریگەری بخەن!!

بێگومان پیاو ماقوڵانی قورەیش سروشتی بانگەوازی پێغەمبەریان دەناسی، مانای رستەو وشەکانی زمانی خۆیان تێدەگەیشتن، دەیانزانی شایەتیدانی (أشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان محمد رسول الله) مانای وایە: مافی تەشریعو فەرمانرەوایی هەر بۆ خودایەو پێویستە ئادەمیزادەکان هەموویان تێکرا ئیعلانی یاخی بوون لەفەرمانرەوایی ئادەمیزاد بکەن! بچنە ژێر خێمەی فەرمانرەواییو پەروەردگارییەتی رەهاو بێ سنووری یەزدان! ئەمجار شێوەی ئەنجامدانی ئەو بەندایەتییە بۆ خودا لەرێگەی پێغەمبەری خوداوە، حەزرەتی موحەممەدﷺ وەربگرێ، نەك لەوانەی بەناوی خودا درۆزنەکان، یان بەناوی خوداوە قسەدەکەن!

بەڵێ قورەیشییەکان دەیانزانی کەسێك ئەو شایەتیە بدا ئیتر لەژێر دەسەڵاتی مهورەکانی قورەیش دا نامێنێتەوە، رابەرایەتیو حاکمییەتی ئەوان رەفض دەکاو پاڵ بەئەو کۆمەڵو گرۆهە راپەریوانە دە دا کە حەزرەتی موحوممەد رابەرایەتییان دەکاو گەردنکەچی فەرمانو دەسەڵاتی ئەو دەبنو خۆیان لەکۆت، زنجیری دابو نەرێتی تایەفەگەریو خێڵایەتیو سەرکردایەتی نەزانی رزگار دەکەنو وەلاو گەردنکەچی خۆیان بۆ پێغەمبەر ئیعلان دەکەنو سەرکردایەتی تازە هەڵدەبژێرنو

دەچنە ریزی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەی کە ئەو سەرکردایەتیە تازە رابەرایەتی دەکا!!

ئەمە بوو مەعنای شایەتیدانو وتنی: (أشهد ان لا الـه الا الله، اشـهد ان محمـد رسـول الله) ئەمـە واقیعێـك بـوو، ملـهوڕەکانی قـورەیش هەسـتیان پـێ کردبـوو، دەیـانزانی چ خەتـەرێکی هەیـە بـۆ سـەر کییـانو بـاری کۆمەڵایـەتیو رامیـاریو ئابوریو بیرو باوەڕیان کە کۆمەڵگاکەیان لەسەری دامەزرا بوو!

ئەوان لـەمانای (أشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان محمد رسول الله) ئـەو مانـا بـێ هێزو بۆشە تێنەگەیشتبوون کە ئـەمڕۆ هەنـدێ کەسـی خـۆ بەموسوڵمان زان تێـی گەییـشتوونو هـەر بەوەنـدە کـە بـەزمان ئـەم شـایەتیە دەدەنو بـڕێ شـەعائیرو طوقووسی خودا پەرستی ئەنجام دەدەن،، لـەکاتێك دا حاکمییـەتو خودایـەتی خـودا لەسـەر زەوی بەرچـاو نـەگیراوەو لـەژیانی خەڵکەکـە دا رەنگـی نەداوەتـەوە، سەرکردایەتی نەزانو یاسادانەری نەزان فەرمانڕەوایی کۆمەڵو کاروباریان دەکا!!

لەراسـتی دا هەرچـەندە ئـەو کاتـە لەمەککـە ئیـسلام نەشـەریعەتی هـەبوو نەحکوومەتی هەبوو، بەڵام ئەوانەی کە ئەم شایەتمانەیان دەهێنا، یەکسەر جڵەوی خۆیـان دەدایـە دەسـت رابەرایـەتی حـەزرەتی موحەممـەدﷺو خۆشەویـستیو وەلای خۆیـان بـۆ کۆمـەڵی موسـوڵمان رادەگەیانـدو، خۆیـان لەهـەموو وەلاو خۆشەویـستی خێـزانو بنەماڵەو خێـڵو هـۆزو رەگەزپەرسـتی سـەردەمی نـەزانیو لـەوە پێشیان رزگار دەکرد، ئەوان کە دەیانگوت: (أشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان محمد رسـول الله) لــەناخی دڵیانــەوە دەیــانگوتو بــەکردەوە ماناکــەیان دەســەلماندو لــەژیانو هەڵسوکەوتو رەفتاریان دا رەنگی دەدایەوە.

ئەمە بوو هۆی ئـەوەی کـە قورەیشییەکان بـەبڵاو بوونـەوەی ئـایینی ئیـسلام قەڵس دەبـوونو بەبیـستنی قورئـان تەنگـەتاو دەبوونو جـەجمینیان لێ هەڵدەگیرا، دەیـانزانی چ خەتـەرێکیان لەسـەرەو چـۆن دەسـەڵاتو، فـەرمانڕەواییان لـەکیس دەچێ!

ئەوان لەپێش هاتنی ئیـسلام بـەو خوداپەرستانە قـەڵس نـەبوون کـە خۆیـان بـە(حونـەفا) دەزانـیو وازیـان لـەبیرو بـاوەڕی موشـریکەکان هێنـابوو بتپەرسـتیان

نەدەكردو خودا پەرست بوون، چونكە گۆشەگیری و دێر نشینی ئەو حونەفایانە خەتەری بۆ فەرمانڕەوایی ملهوڕی موشریكەكان نەبوو (كوردوتەنی زەرەری بۆ پەزەكان نەبوو)! ئا ئەوە بەئایینی خودا حلێب ناكرێ!

كەوابێ ئەو ئیسلامەی كە ئەمڕۆ برێ سوفیلكەو بەناو موسوڵمان دەیانەوێ جۆرێكە لەو ئایینەی كە حونەفاو دێرنشینەكانی پێش هاتنی ئیسلام پەیڕەویان دەكردو بەئیسلامی راستەقینە ناژمێردرێ، ئیسلامی راستەقینە بریتییە لەو رابونو بزوتنەوە ئیسلامییەی كە وێڕای گوتنی شایەتمان (أشهد ان لا الـه الا الله، اشـهد ان محمـد رسـول الله) خۆ لەهەموو بیرو بۆچونو دابو نەریتی كومەڵگای نەزانی دەپارێزێ، هەموو تەصەوراتو یاساو شەریعەتو فەرمانڕەوایی و رابەرایەتی جاهیلییەت رەت دەكاتەوە، (وەلای) رەهاو بێ سنوور بۆ كۆمەڵی موسوڵمانان رادەگەیەنێ و ملكەچی فەرمانڕەوای بانگەوازی ئیسلامی دەبیو دەیەوێ بەكردەوە ئیسلام لەژیانی كۆمەڵ دا رەنگ بداتەوەو شەریعەتی قورئان پایەدار بێ، كۆمەڵگایەك بخولقێ خودایەتی و پەروەردگاریەتی، (ربوبیەتو ئولوهییەت) تێی دا تەنها بۆ خاوەنی بوونەوەر بێ!

ئا ئەم ئیسلامە بوو قورەیشییەكانی تەنگەتاو كردبوو حەراسانی لێ هەڵگرتبوون، بۆیە بەهەموو جۆرێك بەرەنگاری بوونەوەو دژی وەستان، جۆرێك لەشێوە بەرەنگار بوونەوەكەیان بلاو كردنەوەی ئەو پروپاگەندەو چاوو ڕاوو درۆو بوختانانە بوون كە دژی قورئان ئەنجامیان دەدا، دەمێك دەیانگوت: قورئان چیرۆكو داستانی هەڵبەستراوو سەرگوزشتەی پێشینانە. جاخێك دەیانگوت: ئەگەر بمانەوێ قورئانێكی ئاوا دەخەینەرو، یان دەیانگوت: شیعرەو موحوممەد شاعیرە، برێ كاتیش پێغەمبەریان بەشێت لەقەڵەم دەداو دەیانگوت: قوتابیەكی فێركراوی شێتو پێتە، هەندێ جاریش دەیانگوت: جندۆكە دەرسی پێ دەڵی و فێری دەكا!

پێویستە ئەوە بزانرێ كە بلاوكردنەوەی ئەو پڕەپاگەندەو چاوو ڕاوە لەناو كومەڵگای نەفامو رەشە خەڵكەكەی مەككە دا كاریگەری خۆی هەبوو، بەتایبەتی لەسەرەتاوە پێش ئەوەی جوداوازیی نێوان ئوسلووبی قورئانو چیرۆكو داستانەكانی كە هی وەكوو نەضری كوڕی حاریث دەیانگێڕانەوە دەربكەوێ. ئەگینا

بۆچی کە نەضری کوڕی حاریث لەجەنگی بەدر دا دیل کرا، پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا بەکوشتنیو وەکوو گیراوەکانی تر فیدیەی لێ وەرنەگیرا. بەلام ئەم حالەتە هێندە درێژەی نەکێشا، بەری خۆر بەبێژنگ نەگیراوو ئەو پروپاگەندەو چاوو راوە کاریگەریی خۆیان لەدەست داو، قورئانی پیرۆز بەهێزی بەلاغەتو رەوانیو لەبەر ئەوەی لەخوداوە هاتووەو گونجاو بوو لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد داو پێداویستی دەروونی ئادەمیزادی دابین دەکردو دەچووە دڵانەوەو لەناخەوە هەستی خەڵکەکەی دەهەژاند، هەموو ئەو کۆسپو تەگەرانەی رامالینو گەسکی لێدان، ئیتر موشریکەکان نەیان توانی چی دی بەم چاوو راوە خەڵکی هەڵبخەڵەتێنن!! ئەمجار ملهوڕەکانی قورەیش بەهەناسە سواریو دڵەتەپەو لێوە لەرزەوە دەیانگوت: ﴿لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، کە خوێندرا بیکەنە گاڵەو بوغڵ، گرمەرگرم، با کەس لێی تێ نەگا، بەڵکوو نەهێڵین بلاو بێتەوەو سەرکەوتن بەدەست بێنین! لەهەمان کات دا پیاوماقوڵو سەرانی قورەیش، هی وەکوو ئەبو سوفیانو ئەبو جەهلو ئەخنەسی کوڕی شورەیق هەریەکەیان بەدزی ئەوی تریان گوێیان بۆ قورئان دەگرتو بەبیستنی دڵیان دادەخورپاو ترسو لەرزیان پێ دەکەوتو ئەژنۆیان نەدەکردن شەوێکی تر بچنەوە بۆ ئەو شوێنە بەدزییەوە گوێ لەقورئانخوێندنی پێغەمبەرﷺ بگرن، ئەمجار پەیمانیان بەیەکتری داو لەسەر خۆیان پێویست کرد کە نەچنەوە بۆ ئەو شوێنەو بەهیچ شێوەیەك گوێی بۆ قورئان نەگرن، نەوەکوو کوڕە گەنجەکانیان بیان بینن کە دەچن بۆ گوێگرتن لەقورئانو ئەوانیش چاویان لێ بکەنو ئەم قورئانو ئایینە کاریان لێ بکەنو موسوڵمان ببن!

تەنانەت قورئانخوێندنی پێغەمبەرﷺ ئەوەندە کاریگەر بوو لەسەر هەستی وەلیدی کوڕی موغیرە -کە یەکێك بوو لەملهوڕەکانی قورەیش- بەئاشکرا لەوەسپی قورئان دا، وتی: (انه يعلو ولا يعلى عليه وأنه يحطم ما تحته) ئیتر عەرەبەکان ترسان کە ئەم وتەی وەلید بلاوبێتەوەو کار لەخەڵك بکا، داوایان لەوەلید کرد کە وتەیەکی وا بڵێ: خەڵك لەقورئان دوور بکەونەوە، ئەوەبوو خۆی جەرەبابە داو دەروونی خۆی

هەڵپشكنى تاتوانى ئەم وتە مەشهورەى بڵێ: كە گوتى: (انه سحر يؤثر) بەراستى ئەم قورئانەى موحەممەد دەيخوێنێتەوە سيحرێكى كاريگەرە.[٢٢]

پێويستە ئامازە بۆ ئەوەش بكەين كە هەوڵو تەقەڵلاى نەضرى كوڕى حاريث بۆ دوورخستنەوەى خەڵك لەقورئان دوا هەوڵو تەقەڵلا نەبوو، دوايين هەوڵو تەقەڵلاش نابێ..... بێگومان ئەو هەوڵو تەقەڵلايانە چەندەهاجارى تر بەڵكوو مليۆنەها جارى تر دووبارە بوونەوە بەلام بەشێوەو شێوازى جۆراو جۆرو لەبەرگو پۆشاكى تردا... بەڵێ دوژمنانى ئايين بەدرێژايى مێژووى پڕ لەشانازىو سەروەرىى ئيسلامى، هەميشە لەهەوڵو تەقەڵلاى جۆراو جۆر دا بوون بۆ ئەوەى خەڵكى لەقورئان لابدەنو نەهێڵن كاريگەرى هەبێ لەژيانيان دا، بەتەواوى لەگۆڕەپان دوورى بخەنەوە، كە ئەمەيان بۆ نەكرا، ئەمجار هەوڵيان دا قورئان بكەن بەكەرەسەى تەراتيلو شێوە گۆڕانى كە قورئانخوێنەكان لەكۆڕو فيستيڤاڵو ئێزگەو تەلەفيزيون دا برێك لەو قورئانە بەدەنگى بەرز بخوێننو دەنگى خۆيانى تێدا بەتاقى بكەنەوەو گوێگرەكان بەدەم نەك بەدڵ (الله الله)يان بۆ بكەن، يان هەندێ لەئايەتەكانى بكەنە نوشتەو دوعا خەڵكى بيخاتە باخەڵى، يان بەسەر سنگى خۆيان يان لەژێر سەرينى نووستنيان هەڵى بگرنو پێيان وا بێ موسوڵمانى ئەمەيەو ئەوە مافى قورئانەو قورئان بۆ ئەوە هاتووە كە بەم جۆرانە رەفتارى لەگەڵ بكرێ. بەڵێ قورئان ئەمرۆ لەژيانى ئادەميزادان دا، بەكانو سەرچاوەى تەوجيهو ئامۆژگارى حليب ناكرێ، دوژمنانى ئايين وايان كردووە موسوڵمانان تەوجيهات دەربارەى كاروبارى ژيانيان لەسەرچاوەى ترەوە راگوێزنو لەدادگاو بازارو فەرمانگەو قوتابخانەو ناو خێزانو دەرەوەى خێزان دا قانوونو ياسا دەسكردەكان لەگەڕدابنو كاريان پێ بكرێو قورئان وەلابنرىو كارى پێ نەكرێ، ئەمجار بۆ لەخشتە بردنو هەڵخەڵەتاندن دەڵێن: ئيسلام ئايينى رەسمى حكوومەتەو ئەم ئايينە پيرۆزەو قورئان پەراوێكى موقەددەسەو رێزدارە، ئەى ئەوەنيە بەيانىو ئێوارەو هەموو كاتێك بەبۆنەى جيا جياوە قورئان دەخوێندرىو قورئانخوێنەكان بەدەنگى بەرز لەتەعزييەو فيستيڤاڵو كۆڕو كۆبوونەوە جۆراو جۆرەكان دا دەيخوێنن؟ ئيتر چى

[٢٢] تەفسيرى مەنار ج٩/٦٥٤-٦٥٥

تریان دەوێ؟ ئەی ئەوە نیە کە ئافرەت منداڵی دەبێ خەڵکەکە قورئانی ئەوەندە بەلاوە پیرۆزو موقەدەسە دەیخەنە پەڕۆیەکەوەو لەژوور سەری ژنە زەییستانەکەوە دایدەنێن؟؟ ئەی ئەوەنیە لەدادگا دانراوە -نەك بۆ حوکم پێ کردن بەڵکوو بۆ سوێند پێ خواردن- هەر شایەتێك بانگ دەکرێ دەبێ سوێندی پێ بخوا؟؟ جا شایەدەکە باوەڕی پێیە، دەستنوێژی هەیە، دادگایەکی ئیسلامییە ئەمانە گرنگ نین؟! بەڵێ: ئەمانە هەموویان نمونەو لاسایی کردنەوەی چاوو راوەکەی نەضری کوڕی حاریثە بەلام بەشێوەیەکی ترو لەبەرگو پۆشاکێکی تردا! بەلام ئەوەی سەر سوڕهێنەرەو جێگای سەرنجە، ئەم قورئانە پیرۆزە لەگەڵ ئەو هەموو پیلانو نەخشانەی دژی دادەڕێژرێن، وێڕای ئەو هەموو فێڵو چاوو راوەی دژی دەکرێن، تائێستا لەو هەموو ململانێو زۆرانبازییەی دا سەرکەوتووە، ئەو هەموو یاسا دەسکردو بیرو بۆچوونو فەلسەفەو تیۆرەی بۆڕداون!!

بەڵێ: ئەم قورئانە تایبەتمەندییەکی سەرسوڕهێنەری هەیە، بەجۆرێك کە توانیویەتیو دەتوانێ هەموو فرتو فێڵی سەرڕووی زەوی، فرتو فێڵی شەیتانە جولەکەو ماسوونیو صەلیبییو دارو دەستەکانیان بۆڕ بداو لەگۆڕنێ؟!

بەڵێ: وێڕای ئەو هەموو پڕوپاگەندەو چاوو راوەی کە دەزگا جۆراو جۆرەکانی کوفری عالەمی دژی قورئان بلاویدەکەنەوە، لەگەڵ ئەو هەموو دارایيو هێزو توانایەی خراوەتە گەڕ بۆ گۆشەگیر کردنی قورئانو دوورخستنەوەی لەگۆڕەپانی ژیانو هەوڵدان بۆ وەلاخستنو ریشەکێش کردنی کاریگەری قورئان لەسەر دڵی موسوڵمانان، هێشتا لەهەموو کونو قوژبنێکی سەر زەوی کۆمەڵێك موسوڵمان هەن یەکیان گرتووەو کار دەکەن بۆ گەڕانەوەی قورئان بۆ گۆڕەپانی ژیانو رەنگدانەوەی لەژیانی ئادەمیزادەکان داو لەهەڵسو کەوتو رەفتارو رەوشتیان داو چاوەڕوانی وادەو بەڵێنی خوداو هەردەبێ بێتە جێ هەر دەشهێتە جێ، ئەمڕۆ نا سبەینێ.

ئەم رابوونە ئیسلامییە سەرانسەرییەی ئەم رۆژگارەش کە ئێستا کۆتایی سەدەی بیستەمە دیاردەیەکی دڵخۆشکەرەیەو پشتیوان بەخودا سەرەتاو پێشەتای ئەو وادە خودایيە.

## موشریکەکان داوای سزای ئاسمان دەکەن‌و پەروەردگار لەبەر خاتری پێغەمبەر سزایان نادا

﴿ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٣٢) ئیبنو جەریری طەبەری لەسەعیدی کوڕی جوبەیر ڕیوایەت دەکا دەڵێ: ئایەتی ﴿قَالُوا اللَّهُمَّ...﴾ لەشانی نەضری کوڕی حاریث دا هاتۆتە خوارێ، کاتێ کە گوتی: ﴿إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ماڵوێرانو بەدبەخت! ئەمە کەلامی خودای بوونەوەرە، ئەویش وتی: ﴿اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ....﴾!!

دەربارەی ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ﴾ ئیمامی بوخاریو موسلیم لەئەنەسەوە ڕیوایەت دەکەن، دەڵێ: ئەبو جەهلی کوڕی هیشام وتی: ﴿قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ

كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوْ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئیتر ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ﴾ هاتە خوارێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەباسەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: موشریکەکان بەدەوری کەعبە دا دەسوڕانەوەو دەیانگوت: (غفرانك غفرانك) ئیتر پەروەردگار ﴿وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ﴾ی ناردە خوارێ، داوای لێخۆشبوون هەرچەندە لەو بێدینو کافرانەوە بووە، وەلێ بوومەتە هۆی جۆرێك لەلاچوونی زیانو عەزابی دونیایی!!

بەکورتی دەربارەی بێژەری ﴿قَالُوا اللَّهُمَّ....﴾ راجیایی هەیە، موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیر: دەڵێن بێژەرەکە نەضری کوڕی حاریثە. ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ بێژەرەکە ئەبو جەهل بووە.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ صَلاتُهُمْ....﴾ واحیدی لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: موشریکەکان طەوافی کەعبەیان دەکردو فیکەیان دەکێشاو چەپڵەیان لێ دەدان، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ئیبنو جەریری طەبەری لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: قورەیشییەکان موعارەضەی پێغەمبەریان دەکرد لەتەواف کردن داو گاڵتەیان پێ دەکردو فیکەیان دەکێشاو چەپڵەیان لێ دەدا. ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو: بەهەر حاڵ سیاقی ئایەتەکان درێژە بەرانواندنی چۆنیەتی عەنادو رقەبەری موشریکەکان دەدەن، ئەوە رون دەکەنەوە: کە لوتبەرزیو ملهوڕی ئەو کافرانە بەجۆرێکە: کە رێگا بەخۆیان نادەن گەردنکەچی حەق بنو مل شۆڕکەن لەبەرامبەری راستی پێغەمبەرایەتی موحوممەدﷺ ئیمان بێنن! تەنانەت سەر رەقییان گەییشتۆتە ئاستێك لەجیاتی ئەوە داوای هیدایەت بکەن، ئاواتە خوازن خودا لەئاسمانەوە بەردەبارانیان بکاو بەسزا لەناویان بەرێ بەلام ئیمان نەهێنن.

وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! یادی ئەوە بکەرەوە، ئەو کاتەی قوڕەیشییەکان وتیان: پەروەردگارا! ئەگەر راستە هەر ئەم قورئانە حەقەو لەتۆوە هاتووە، ﴿فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوْ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ دەسزامان بدە بەبەردە بارانکردنو

لەئاسمانەوە بەردەبارانمان بکە، وەکوو چۆن لەشکری (ئەبرەھە)ت بەردەباران کرد، یان عەزابێکی ترمان بەسەر دا بدە، بەسزایەکی کوشندە لەناومان بەرە.

ئەمە ھەواڵدانی پەروەردگارە، ھەواڵی کوفرو سەررەقی قورەیشییەکانو یاخی بوونو پشت ھەڵکردنیان لەکاتی بیستنی ئایاتی قورئان دا بۆ ئێمە بەیان دەکا.

بەراستی دوعاو پاڕانەوەکەیان شتێکی سەیرو سەمەرەیە، ڕەنگدانەوەی چۆنیەتی سەر ڕەقیو چەموشییانە، کە بەھیلاکچوونو فەوتانی خۆیان بەلاوە باشترە لەوەی گەردنکەچی حەق ببنو بڕوا بەئایین بکەن ( پەندێکی کوردی ھەیە: دەڵێ: کەری دێز بەتۆپینی خۆیو زەرەری خاوەنی ڕازییە)!!

بێگومان سروشتی سەلیم کاتێ دەکەوێتە شكو گومانەوە، داوا لەخودا دەکا کە ڕێگای ڕاستی نیشان بدریو بەحەق بگا. بەڵام کە سروشت تێك چوو لوتبەرزیو سەرکەشیو سەررەقی تێدا پەیدابوو، ئەوە فەوتانی خۆی بەلاوە باشتر دەبێ لەگەردنکەچ کردن بۆ حەق، ئەوەتا کافرەکانی مەککە. سزادانو تێداچوونی خۆیان بەلاوە باشتر بوو لەوەی ئیمان بھێننو ئایینی حەق قبووڵ بکەن!!

ئا بەم جۆرە سەررەقیو عەنادییە، موشریکەکانی مەککە بەرەنگاری بانگەوازییەکەی پێغەمبەر بوونەوە، بەڵام سوپاس بۆ خودا لەسەرەنجام دا بانگەوازییەکە سەرکەوت.

بێگومان ئەوان کە دەڵێن: (خودایە! ئەگەر ڕاستە، ھەر ئەم قورئانە حەقەو لەتۆوە ھاتووە دەبەردە بارانمان بکە....) مەبەستیان ئەوەیە: کە بڕوا بەقورئان ناکەنو بەحەقی نازاننو پێیان وانیە: لەخوداوە ھاتبێ، تەنانەت ئەگەر لەخوداوەش ھاتبێ، ئەوان ھەر باوەڕی پێ ناکەن، بەڵکوو تێداچوونی خۆیان بەلاوە باشترە، لەوەی کە بڕوای پێ بکەن!! گاڵتەیان بەو کەسانە دێ کە دەڵێن: قورئان حەقو ڕاستە! ئەمەش ئەوپەڕی سەررەقیو ئینکارییە. ئەوان بەھۆی نەزانیو بەدرۆ خستنەوەیان بۆ پێغەمبەرو پەیامەکەی، لەنەحمەقیو خراپەکارییان دا گەیشتوونە ئاستێك داوای پێش وەخت ھاتنە سزا دەکەن. وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ (العنكبوت:٥٣)

ئەمجار پەروەردگار هۆی مۆڵەتدانو گیرانەبوونی دوعاکەیانو سزانەدانی دونیایان رون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! دابو نەریتی خودا وا نەهاتووە، باوی وانیە، رەحمەتو دانایی داخوازی ئەوە نیە کە عەزاب بۆ ئەوانە بنێرێ، بەبەردەباران، یان بەسزای تر لەناویان بەرێ لەکاتێك دا ئەتۆ پێغەمبەریان بیو بانگەوازییان دەکەی بۆ ئیمان هێنان، مادام پێغەمبەر لەناویان دا بیو بانگەوازییان بکا بۆ ئیمان هێنان، هومێدی ئەوە هەیە: برێکیان ئیمان بهێنن، ئەوان کە مۆڵەت دەدرێنو لەدونیا دا عەزابی ریشەکێشکەریان نانێردرێتە سەر، لەبەر خاتری پێغەمبەرە ﷺ و بۆ رێز لێنان لەو خۆشەویستەیە، ئەگینا لەناومان دەبردن. چونکە پێغەمبەر ﷺ مایەی رەحمەتە بۆ ئادەمیزد بەگشتیو نابێتە هۆکاری زەحمەت..

﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ پەروەردگار لەروی رەحمەتو فەضڵو بەخششی خۆیەوە مامەڵە لەگەڵ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بەو شێوە ناکا کە لەگەڵ گەلەپێشینەکان دا کردیو لەبێخی دەرهێنان، لەحاڵێك دا ئەوان داوای لێخۆشبوونو چاوپۆشیکردن لەتاوان دەکەن.

لێرە دا پرسیارێك دێتە پێشەوە دەگوترێ: ئەوانە کێ بوون داوای لێخۆشبوونو چاوپۆشی لێ کردن دەکەن؟!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست کافرەکانن، کە لەکاتی تەواف کردن دا دەیانگوت (غفرانك) خودایە! لێخۆشبوونی تومان دەوێ، داوای لێخۆشبوون هەر چەندە لەکافرو بێدینانەوە دەرچووە، وەلێ برێ شەڕو ناخۆشی لێ لاداون... هەندێکی تر دەڵێن: داوای لێخۆشبوونەکە ئەو موسوڵمانانە کردویانە کە لەناو کافرەکاندا بوون، ئەو کاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبێ:

پەروەردگار ئەوان بەسزا ریشەکێش ناکا، لەحاڵێك دا لەنێوانیان دا کەسانێك هەبن موسوڵمانو خوداپەرستنو داوای لێخۆشبوون دەکەن! جا کە ئەوانە لەناویان دەرچوون کۆچیان کرد بۆ مەدینە، خودا کافرەکانی سزا داو تووشی چەند ناخۆشیو لەناوچوونی وەکوو هی رۆژی بەدری کردن!

هەندێکی تر دەڵێن: ﴿يَسْتَغْفِرُونَ﴾ بەمانا ﴿يسلمون﴾ واتە: یەك بەدوای یەك دا موسوڵمان دەبن، یان منداڵو وەچەکانیان ئیمان دەهێنن، داوای لێخۆشبوونو لێبوردن لەخودا دەکەن!

ئەمجار دوای ئەوەی کە پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند کە سزای ڕیشەکێشیان نا دا لەدونیا دا ئیحتیمالێکی تر دەچەسپێنێ ئەویش ئەوەیە: کە دوور نیە لەکاتی پێویستیو داخوازی دا جۆرە سزایەکی تریان بەسەر دا بدا، دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ چ شتێك هەیە ببێتە کۆسپو تەگەرە کە خودا بەجۆرە سزایەکی تر سزایان نەدا؟؟ کێ هەیە بتوانێ نەهێڵێ: خودا ئەو جۆرە عەزابەیان بەسەر بدا؟ لەحاڵێك دا ئەوان موسوڵمانان مەنع دەکەن لەماڵی خوداو نەهێڵن بچنە ناوی شەعائیری خوداپەرستی تێدا ئەنجام بدەن!. ئاماژەیە بەوە کە کافرەکان نەیاندەهێشت موسوڵمانەکان بچنە ناو کەعبەوە، پێغەمبەر و هاوەڵانیشیان لەماڵی خودا دەرکردو چوونە ناو کەعبەیان لێ قەدەغە کردن. لەڕاستی دا ئەوان شیاوی ئەوەن کە خودا سزایان بدا، بەڵام کە سزایان نا دا لەبەر ڕێز لێنانیەتی لەپێغەمبەر ﷺ کە لەناویاندایەو بانگەوازییان دەکا بۆ ئیمانهێنان.

جا کەسانێك ئەمە حاڵ، ڕەفتاریان بێ، شیاوی ئەوە نین خاوەنو سەرپەرشتیارو لێپرسراوی کەعبەبن، بەڵکوو ئەوانە شیاوی ئەوەن بەشمشێر لێیان بدرێو بکوژرێن، شەڕیان لەگەڵ بکرێ، بۆیە پەروەردگار لەجەنگی بەدردا بەدەستی موسوڵمانان بەکوشتی دانو سزای مادیو مەعنەوی لێ ستاندن، زوربەی زۆری سەرانی ملهوڕیان کوژرانو بەدیل گیران، ڕیسوای دونیاو قیامەت بوون!

﴿وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ﴾ ئەوانە خاوەن، سەرپەریشتیاری کەعبە نین، ئەوانە شیاوی ئەوە نین. کافرەکان دەیانگوت: ئێمە خاوەنو سەرپەریشتیاری حەرەمین، هەرکەسێك حەزمان لێ بێ ناهێڵین بێتە ناوی، حەزیشمان لێ بێ دەهێڵین، ئیتر خودا ڕەدی دانەوەو فەرمووی: ئەوانە شیاوی ئەوە نین کاروباری کەعبەیان بەدەستەوە بێو خاوەن حەرەم بن، لەکاتێك دا ئەوان شەریك بۆ خودا دادەنێنو دژایەتی پێغەمبەر دەکەن. ئەوانە دوژمنی کەعبەن دوژمنی خاوەنی کەعبەن،

داگیرکەری کەعبەن. خانەی خودا کەلەپوور نیە بەمیراتی وەربگیرێ، داهاتوو لەرابوردوان بەمیرات وەری بگرن ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ﴾ کەعبە خانەی خودایە، خانەی خوداش هەر خوداپەرستو تەقواکار خاوەنو سەرپەرشتیارینی، ئەم دەعوایەشیان وەکوو دەعوای ئەوە وایە: کە دەڵێن: ئێمە میراتگری حەزرەتی ئیراهیمین، ئەوانە درۆ دەکەن میراتگری حەزرەتی ئیبراهیم نین، خۆمیراتی ئیبراهیم کەلەپوور لێگرتنی خوێنو رەچەڵەك نیە بەڵکوو میراتی ئیبراهیم ئایینو بیرو باوەڕە، کەوابێ تەنها خودا پەرستان میراتگری ئیبراهیمن، خاوەنی خانەی خودان، سەرپەرپشتیاری ئەو خانوەن کە ئیبراهیم دروستی کردوە! دەی ئەو کافرانە سەرباری ئەوەی کە خاوەنی کەعبە نین خاوەنە ئەصلییەکانیشی لێ مەنع دەکەن، پەیڕەوکارانی رێبازی ئیبراهیم لەو خانووە یاساغ دەکەن، ناهێڵن بچنە ناوی و شەعائیری خۆیانی تێدا ئەنجام بدەن.

ئەوانە خاوەنی کەعبە نین هەرچەندە لەپەنایەوە نوێژی خۆیان بکەن، ئەوەی دەیکەن نوێژ نیە، بەڵکوو بەدەم فیکەو فیتەیان لێ دەداو بەدەست چەپڵەیان لێ دەدا، غاڵو بوغڵو تێکەوەهاویشتنو هاتوچۆیان بوو، کارەکەیان رێز گرتنی کەعبەو ترسی خودای تێدا نەبوو!

ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێ: دابو نەرێتیان وا بوو، روومەتیان دەخستە سەر زەوی و چەپڵەیان لێ دەداو دەیانقولاندو فیکەیان دەکێشا!

بەراستی ئەمە ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە لەم رۆژگارە دا، هەندێ سوفیلکەو دەروێشی نەفام دەمو چاوی خۆیان لەدارو دیواری گۆڕو ئارامگاکان دەخشێننو دەست دەکەن بە(هاووهوو حایووحوو لرفە لرف)!!

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زوربەیان نازانن کە ئەوان خاوەنو سەرپەرپشتیاری ماڵی خودا نین، نازانن کە تەقواکاران خاوەنی کەعبەنو خۆشەویستی خاوەنی کەعبەن کە خودایە، ئەوان لەسزاو عەزابی خودا ئەمینو ئەو خوداپەرستانە شیاوی ئەوەن سەرپەرپشتیاری کەعبە بن!

جا کە ئەوە هەڵسوکەوتو رەفتارتان بێ ئەی بێ باوەڕان! ﴿وَمَا كَانَ صَلاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاءً وَتَصْدِيَةً فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ دەبچێژن

سزای کوشتنو دیل کردنو ریسوا بوون، وەکوو ئەوەی رۆژی جەنگی بەدر تووشیان هات بەدەستی کۆمەڵێك موسوڵمان. بەهۆی کوفرو کرداری وا هەر لەکافران پەیدا دەبێ، بەڵام عەزابی ریشەکێشکەرو لەبێخ دەرهێنەر ئەوە دوا خراوە لێیانو رەحمەتی خودایە پێیانو لەبەر رێزی پێغەمبەرە ﷺ.

## بەفیرۆ چوونی ماڵبەخشینی کافرەکان بۆ کۆسپ دانان لەرێگەی خودادا

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا......﴾ موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەزوهریو کەسانی دیکەشەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێن: کاتێك قورەیشییەکان لەجەنگی بەدر دا تووشی ئەو شکستییە بوونو سوپای تێکشکاوو شەکەتیان گەڕایەوە بۆ مەککە، ئەبو سوفیانیش کاروانەکەی گەیاندەوە بۆ مەککە، عەبدوڵای کوڕی رەبیعەو عەکرەمەی کوڕی ئەبوو جەهلو صەفوانی کوڕی ئومەییە، لەگەڵ چەند کەسێکی تر دا کە باوکو کوڕیان لەجەنگی بەدر دا کوژرابوون، رۆیشتن چوون ئاخاوتنیان لەگەڵ ئەبو سوفیانی کوڕی حەرەبو ئەو قورەیشییانەی کە ماڵو سامانیان لەناو کاروانەکە دا هەبوو، کرد وتیان: ئەی

کۆمەڵی قورەیش! ئەوەتا: موحەممەد ئاوای لێ کردن، هەرچی پیاو ماقوڵو ئەشرافتان هەیە کۆمەکیمان بکەن، بەڵکوو بتوانین تۆڵەی خۆمان لەموحەممەدو هاوەڵانی بکەینەوە، ئەوانیش رازی بوون. جا وەکوو ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوان هاتۆتە خوارێ، واتە: دەربارەی پیتاڵو کۆمەکی کردن بۆ جەنگی ئوحود هاتۆتە خوارێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم دەڵێ: دەربارەی ئەبو سوفیان هاتۆتە خوارێ: کە چل ئوقیە زێڕی بەکافرەکان بەخشی بۆ شەڕ.

ئیبنو جەریر لەئیبنو ئەبزیو سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەت دەکا: کە گوتویانە: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو سوفیان هاتۆتە خوارێ کە رۆژی ئوحود دوو هەزار ئەحباشی بەکرێ گرت بۆ ئەوەی دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی شەڕی بۆ بکەن، ئەمە جگە لەو عەرەبانەی بەشدارییان کرد.

موقاتیلو کولەبی دەڵێن: ئایەتەکە دەربارەی ئەوانە هاتۆتە خوارێ: کە رۆژی بەدر خۆراکیان بۆ شەرکەرە کافرەکانیان دابین کرد.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەوانەی کافرو خودا نەناسنو پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، ماڵو دارایی خۆیان دەبەخشن بۆ ئەوەی خەڵك لەرێبازی خودا مەنع بکەن، نەهێڵن ئایینی خودا بڵاو بێتەوە، کۆسپ بخەنە بەردەم ئەوانەی کە دەیانەوێ شوێن پێغەمبەر بکەون! هەر چۆنێك بۆیان بکرێ ئادەمیزادان لەرێبازی خودا لابدەن. جا ئەوانە کە ئەمە رەفتارو کردەوەیانە ﴿فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ ماڵەکەیان دەبەخشن، سەرەنجامی ماڵبەخشینەکەیان بۆ دژایەتیکردنی پێغەمبەرو خەڵك لادان لەئایین دەبێتە پەشیمانیو خەمو خەفەت بۆیان، هیچیان دەست ناکەویو مەبەستیان نایەتە دی، بەڵکوو پێچەوانەی مەبەستیان دێتە دیو پەنجەی پەشیمانی دەگەزن! ماڵی خۆیان لەپێناو شەیتان دا دەبەخشنو ماڵبەخشینەکەشیان سەرکەوتنیان بۆ وەدی ناهێنێ، بەڵکوو بەپێچەوانەوە ﴿ثُمَّ يُغْلَبُونَ﴾ ئاکامی ماڵبەخشینەکەیان تێکشکانو ژێر کەوتنە، ئەمە سزای دونیایانە، ماڵ لەکیس چوونو تێشکان. ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ جا ئەوانەی لەسەر کوفرو بێدینی دەمێننەوەو موسوڵمان نابن

لـەرۆژی قیامـەت دا راکێـشی دۆزەخ دەکـرێنو فـڕێ دەدرێنـە نـاو ئـاگرەوە. بـەڵام ئەوانەی موسوڵمانن ئەگەر ماڵو دارایی خۆیان لەرێگەی خودادا ببەخشن ئەوە یـان لەدونیادا سەرکەوتوو دەبن، یان لەقیامـەت دا پاداشـی باشـیان دەسـت دەکـەوێ، یـان لەهەردوو دونیا بەهرەمەند دەبنو بەختەوەری دونیاو قیامەت بەدەست دێنن!

بێگومـان ئەمـە بڕیـاری پـەروەردگارە، سـەرکەوتنی بـۆ موسـوڵمانان دانـاوەو تێشکانی بۆ کافران وێڕای ماڵ لەکیس چوونیانو خەمو خەفەتبارییان، بـۆ؟ ﴿لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنْ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعاً فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ أُوْلَئِكَ هُمْ الْخَاسِرُونَ﴾. بۆ ئەوەی کۆمەڵو تاقمی پیس لەکۆمەڵی پاك جیا بکاتەوە، کافرەکـان لەخوداناسـەکان هـەڵهاوێرێ، گـرۆی خۆشـبەختو کامـەران لـەگرۆی بەدبەخت جیا بکاتەوە، ئەمجار پیسەکان هەموو یـەك دەخـاو دەیانخاتـە سـەریەكو لەدۆزەخیان دەخزێنێ، ئا ئەوانە خەسارەتمەندو ماڵوێرانی دونیاو قیامـەتن، رەنـج بەخەسارو مایە پووچن!!

بەڵێ: ئەم ماڵەی دەیبەخشن بەتاڵ کۆدەکاتـەوە دژی حـەق، مۆڵەتیان دەدرێ بـۆ دەسـتدرێژیو خراپـەکاری، لەبەرامبەریـشی دا حـەق دەکەوێتـە کـارو هـەوڵو تێکۆشان، بۆ ئەوەی هێزی بەتاڵ لەپەلوپۆ بخاو جوڵەی لێ ببڕێ، لەم بەرامبـەریو بەگژیـەك دا چوونە دا حـەقو بـەتاڵ لێـك جیـا دەبنـەوە، تەنانـەت ورەو توانـای ئەوانـەش دەردەکـەوێ کـە هـەر لەسـەرەتاوە لـەژێر ئـاڵای حـەقو راسـتی دا پـێش تاقیکردنــەوەو بەگــژ دا چــوونی بــەتاڵ، خۆیــان پــۆڵێن کردبــوو، خــۆڕاگریو جەربـەزەیو مـەردو نەبـەردییان دەردەکـەوێ، دەردەکـەوێ کـێ شـیاوی یارمـەتی خوداییەو بەکاری هەڵگرتنی ئەمانەت دێ کێ پیاوی ئەو گۆڕەپانە نیە!

## لێخۆشبوون بۆ کافرەکان ئەگەر موسوڵمان ببن، بەپێچەوانەوە شەڕکردن لەگەڵیان بۆئەوەی فیتنە بەرپا نەبێ

﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾

وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

جا کە سیاقی ئایەتەکانی پێشوو گەییشتە ئەم ئاکامە یەکالا کەرەوەیە، ئاکامو سەرەنجامی کوفری هاریکارو سەرەنجامی پیسی کۆبوبوەوەی دیاری کرد، خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! لەژێر رۆشنایی بڕیاری پەروەردگار کە لەئایەتەکانی پێشوو دا رایگەیاند، دەربارەی مالوێرانی کافرەکانو خەسارەتمەندیو خەفەتباریو بێهوودەیی مالبەخشینیان، وێرای ریسوایی‌و تۆپەلکردنی کارە پیسەکانیانو فرێ دانیان بۆ ناو دۆزەخ بەخۆیانو کردەوەیانەوە، لەژێر رۆشنایی ئەم بڕیارە دا بەو کافرو خودانەناسانە بلێ: ئەگەر واز لەکوفرو بێدینی خۆیان بێنن، چی دی دژایەتی پێغەمبەر ﷺ نەکەنو بێنە ژێر ئالای ئیسلامو موسولمان بنو گەردنکەچی خۆیان رابگەیەنن، ئەوە گوناهو تاوانی رابوردوویان رەش دەکرێنەوە، لەگوناهەکانیان خۆش دەبین. ئیسلام تاوانو گوناهی رابووردووی پاك دەکاتەوە وەکوو: ئەو رۆژەی کە لەدایك دەبێ ئاوا بێ تاوانە، بەلام ﴿وَإِنْ يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ﴾ ئەگەر دوای ئەم رونکردنەوە بگەرێنەوە بۆ سەر کوفرو بێدینی واتە: لەسەر کوفرو بەردەوام بن، ئەوە دابو نەریتی خودا دەربارەی پێشینان بەموو پاشو پێشی نەکردوە، با ئەوانیش دلنیا بن کە هەمان دابو نەریتی خۆمانیان بەسەر دا جێبەجێ دەکەین، دوای پێراگەیاندنو رونکردنەوە، بەدرۆ خەرەوەو سەرپێچیکاران لەناو دەبەینو دەیانفەوتێنین. ئەمە دابو نەریتی خودایە، هیچ گۆرانکاری بەسەر دا نەهاتووەو نایە، دەی با ئەو کافرانە بۆخۆیان سەرپشك بنو کام رێبازە هەلدەبژێرن با هەلیبژێرن. ئەمجار

خیطاب ئاراستەی موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! دژی دوژمنە موشریکو خودانەناسەکان بجەنگێن، بۆ ئەوەی بتپەرستیو شەریك بۆ خودا دانان نەمێنێ، جگە لەخودا هیچ شتێکی تر نەپەرسترێ، هیچ موسوڵمانێك تووشی فیتنە نەبێ، تەنها خودا بپەرسترێو بەس. ئاڵای (لا الـه الا الله، محمد رسول الله) بەرز بکرێتەوە، هەموو شیعارو پەیڕەوو پرۆگرامی تر بپووچێنەوە، ئایینە بەتاڵو دەس لێدراوەکان نەمێنن؛ جگە لەئایینی ئیسلام هیچ ئایینێکی تر پەیڕەو نەکرێ. ئەمە لەکەعبەو دەورو بەری دا، لەنێوە دوورگەی عەرەب، ئیمامی بەیهەقی لەمالیکەوە ئەویش لەزوهرییەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەری ﷺ ریوایەت کردوە فەرموویەتی: (لا يجتمع دينان في جزيرة العرب) لەریوایەتێکی تردا (لا تبقينّ في جزيرة العرب دينين) هەر بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە حەزرەتی عومەر لەسەردەمی خەلافەتی خۆی دا جولەکەو مەسیحییەکانی دەوروبەری مەدینەو شوێنەکانی تری دەوروبەری راگوێزان بۆ باشووری نێوەدورگەی عەرەب. لەدەرەوەی نێوەدورگەی عەرەب نیشتەجێی کردن.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ناگونجێ ئەم ئایەتە وا مانا بکەین هەموو جیهان بگەرێتەوە، چونکە ئەگەر ئەوە مەبەست بوایە، دەبوو لەهیچ شوێنێك کوفر ئاسەواری نەمایە، بەتایبەتی پاش ئەنجام دانی ئەو جەنگەی خودا فەرمانی کرد بەئەنجامدانی.

کەوابێ مەبەست لەجەنگانو جیهادو تێکۆشان، دابین کردنی ئازادی خوداپەرستییە، واتە: کەس بەزۆر لەسەر ئایین لانابرێ، وەکوو لەشوێنێکی تر دا دەفەرموێ: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾(البقرة:٢٥٦).

بێگومان ئایینی ئیسلام راگەیاندنێکی گشتییە بۆ ئازادی ئادەمیزاد لەسەر زەوی لەبەندایەتیکردنی هەموو شتێك جگە لەخودا، ئەمەش لەرێگەی راگەیاندنی کورتهەڵهێنانی (ئولووهییەتو ربووبیەت) بۆ زاتی پەروەردگارو بەس، ئەم راگەیاندنەش بەم جۆرە شۆرشێکی گشتیو هەمەلایەنە دژی فەرمانڕەوایی ئادەمیزاد بەهەموو جۆرەکانیەوە.

ئاشکراشە بۆ چەسپاندنو دەستەبەرکردنی ئەم ئامانجە گرنگە پێویستمان بەدوو شتی بنەماو سەرەکی هەیە:

یەکەمیان رامالینی ئەزیەتو فیتنەیی لەبەردەم ئەوانەی ئەم ئایینە قبوول دەکەن، ئازادیو سەرفرازی خۆیان لەئاستی حاکمیەتی ئادەمیزاد دەردەبڕن. بەندایەتی خۆیان بۆ خودا رادەگەیەننو بەهیچ شێوەیەك بەندایەتی غەیری خودا ناکەن. ئەمەش بەبێ بزوتنەوەیەکی ئیسلامی یەکگرتووی تێکۆشەر لەژێر فەرماندەی سەرکردایەتیەکی بڕوا پێەو بەو راگەیاندنە، دەستەبەر نابێ. دەبێ کۆمەڵێك بەواقیعی ئەو ئەرکە ئەنجام بدەنو کاری بۆ بکەن.

دووەمیان وردوخاش کردنی هەموو هێزێکی سەر زەوی کە لەسەر بناغەی بەندایەتیکردنی ئادەمیزاد بۆ ئادەمیزاد دامەزرا بێ بەهەموو جۆرەکانیەوە، ئەمەش بەمەبەستی زەمینە خۆشکردنو پارێزگاریکردنی ئامانجی یەکەمو راگەیاندنی ئوولوهیەت تەنها بۆ خوداو بەس! ئولوهیەتی موتلەقو بێ سنوور. ﴿فَإِنْ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ جا ئەگەر ئەو کافرانە وازیان لەکوفرو بێدینی خۆیان هێناو دژی موسوڵمانان نەجەنگانو گەردنکەچی خۆیان بۆ ئایین راگەیاند، ئەوە ئێوەش وازیان لێ بێننو شەڕیان دژ مەکەن، لەنیەتو مەبەستیان مەکۆڵنەوە، پێویست ناکا بزانن چی لەدڵیان دایە، ئەوە حەواڵەی خودا بکەن، چونکە خودا ئاگادارو بیناو بیسەرە بەوەی لەدڵیان دایە، پڕاوپڕ سزاو پاداشیان لەسەر ئەوە دەداتەوە، هیچی لێ گوم نابیو هیچی لێ تێك ناچێ. ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَوْلاكُمْ نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ ئەگەر پشتیان هەڵکردو رویان وەرگێڕا لەبیستنی بانگەوازی ئێوەو وازیان لەکوفرو بێدینی خۆیان نەهێنا، ئەوە بایەخیان پێ مەدەن، بزانن: کە خودا سەرپەرشتیاری ئێوەیەو یارمەتیدەرتانە، کەسێکیش خودا سەرپەرشتیارو یارمەتیدەری بێ، لەهیچ ناترسێ. بێگومان خودا باشترین سەرپەرشتیارو یارمەتیدەرو پشتیوانە. هەرکەسێك پشتی پێ ببەستێ رەنجەڕۆ نابێ، کەسێك خودا یارمەتیدەری بێ کەس بەسەریا زاڵ نابێ!

**بەڵام یارمەتیدانی خودا پابەندە بەدوو شت:**

١- ئامادەکردنی ئامێری ماددیو مەعنەوی بۆ بەرەنگار بوونەوەی کوفرو پەیڕەوانی، دەبێ بەگوێرەی تواناو رۆژگار پێداویستی جیهادو تێکۆشان دەستەبەر بکرێ، وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ......﴾(الأنفال: ٦٠)

٢- یارمەتیدانی ئایینی خوداو تێکۆشانو خۆبەختکردنو ماڵ بەختکردن لەپێناوی دا، هەوڵدان بۆ جێبەجێ کردنی شەریعەتی خوداو حوکمو بڕیارەکانی وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾(محمد: ٧)

***بەپشتیوانی خودا لێرە دا جزمی نۆ تەواو بوو..***
***دوا بەدوای ئەمە جزمی دەیەم دەست پێ دەکات***